سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٩

# ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی

لە نووسینی خۆی و قوتابیانی

فاروقی رەسول یەحیا

کردوویە بە کوردی

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بسم الله الرحمن الرحيم

# ژیاننامەی

به‌دیعوززه‌مان

# سه‌عیدی نوورسی

سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٩

# ژیاننامەی

## بەدیعوززەمان

# سەعیدی نوورسی

لە نووسینی خۆی و قوتابیانی

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی




نورسی، سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹۶۰م.Nawrasi, Said
ژیاننامەی بە دیعوززەمان سەعیدی نوورسی؛ وەرگێر فاروق رسول یحیی.— تهران: احسان، ۱۳۹۲.
[۸۹۶] ص.ISBN: 978-600-349-000-0
چاپ اول: ۱۳۹۲.
کتابنامه: به صورت زیرنویس.
۱. اسلام — اسماء الله. صفات خداوند الف. یحیی، فاروق رسول، ۱۹۵۵ - م. مترجم. ب.عنوان.
۲و۹ن/۷/BP۲۳۳ ۲۹۷/۳۸
۱۳۹۲
کتابخانه ملی ایران ۱۵۱۷۷-۸۳م




## ژیاننامەی بە دیعوززەمان سەعیدی نوورسی


❖مؤلف: بدیع‌الزمان سعید نورسی
❖مترجم: فاروق رسول یحیی
❖ناشر: نشر احسان
❖چاپ: مهارت
❖تیراژ: ۳۰۰۰ نسخه
❖نوبت چاپ: اول ـ ۱۳۹۲
❖شابک: ۹۷۸-۶۰۰-۳۴۹-۰۰۰-۰





فروشگاه :
تهران ـ خ انقلاب ـ روبروی دانشگاه.
مجتمع فروزنده ـ شماره ۴۰۶
تلفن : ۶۶۹۵۴۴۰۴

# پێشەکیی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

ئەم بەرگەی بەردەستی خوێنەری ئازیز، تایبەتە بە ژیـانی بـەدیعوززەمان مامۆستا سـەعیدی نوورسـی، ڕەحمەتی خوای لێ بێت. ئێمە لە کتێبی (سيرة ذاتية)وە کردوومانە بە کوردی، کە وەرگێڕان و ئامادەکردنی مامۆستای بەڕێز "ئیحسان قاسم سالحی"یە بە زمانی عەرەبی.

کتێبی ناوبراو لە "سێ سەرچاوە"ی باوەڕ پێ کراوی دوور لە گومان وەرگیراوە:

یەکەمیان: کتێبی "تاریخچەی حەیات"ە، کە مێژوونامەیەکی ژیانیەتی، قوتابیانی بـە زمـانی تورکی نووسیویانە. ئنجا مامۆستا نوورسی بۆ خۆی پاکژی کردووە و، لە پێش وەفاتی بڵاوی کردووەتەوە.

دووهەمیان: ئەو بڕگە پەرش و بڵاوانەی ناو "سەرجەمی پەیامـەکانی نـوور"ە کـە نوورسـی خۆی لە بارەی قۆناغەکان و لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانیەوە نووسیویەتی.

سێهەمیان: هەندێکی کەمی "وتەی شایەتحاڵەکان"ە، کە یاداشـت و بینینـەکانی خۆیـان و یادگارییەکانیان لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا دەگێڕنەوە.

ئەم کتێبەی کە مامۆستا ئیحسان ئامادەی کردووە، چەند کەسێك لـە قوتابییـە لـەمیندار و میراتگرەکـانی مامۆسـتا بـەدیعوززەمان، هـەڵیان سـەنگاندووە و، ڕەزامـەندییان لەسـەری نواندووە و، ڕیش سپییەکیان لە بریی هەموویان، پێشەکیی بۆ نووسیوە.

ڕێبازی مامۆستا ئیحسان لە هێنانی دەقەکانی ئەو سێ سەرچاوەیەدا، بەم جۆرەیە:

دەقەکانی "تاریخچـەی حـەیات" و "سـەرجەمی پەیامـەکانی نـوور" بەشـی هـەرە زۆری کتێبەکەی پێکدەهێنن و، بە ڕوونـی هـەردووکیانی لـە یـەك جیـا کردووەتـەوە و لـە پـەراوێزدا سەرچاوەکەی دیاری کردووە.

زۆربـەی وتـەی شایەتحاڵەکانیشی کـردووە بە بـەند(فصـل)ێکـی سـەربەخۆ لـە کۆتـایی کتێبەکەدا و، جێی بۆ یەك دانەیان بە ناوی "دوا کۆچ" لە دەقی کتێبەکەدا کردووەتـەوە، ئنجا ئەوانی تری بە گوێرەی پێویست خستووەتە پەراوێزەوە، کە چەند بڕگەیەکی کەمن.

مامەڵەی ئێمەش لەم وەرگێڕانە کوردی‌یەدا بە هەمان جۆر بوو لەگەڵ هێنانی دەقەکانی ئەو سەرچاوانەدا، ئەو بەندەی کۆتایی کتێبەکە نەبێ کە لە قسەی شایەتحاڵەکان پێکهاتووە؛ بە پێویستمان نەزانی بیکەین بە کوردی، چونکە سەرجەمی یادگاریی شایەتحاڵەکان کە ئەو بەندەی لێ وەرگیراوە، لە لایەن لیژنەیەکەوە کراوە بە کوردی و، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە "چوار بەرگ"دا چاپ دەکرێت.

ئنجا تایبەتمەندیی ئەم وەرگێڕانەی کە بۆ خوێنەری کورد ئامادە کراوە، هەندێ جیاوازیی لەچاو عەرەبی‌یەکەدا دەخواست، کە ئەوانەش لەم دوو خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

یەکەم: ئەو بەندەی کە لە دوا باسەکانی کتێبەکەدا تایبەت کراوە بۆ "قوتابخانەی زەهراء" (زانکۆی زەهراء) ئێمە پێشمان خست بۆ ئەو شوێنەی کە باس لە هەوڵی مامۆستا نوورسی دەکات بۆ دامەزراندنی. خۆ هەرچەندە باسەکەی کەمێك پێ درێژ بووەتەوە، بەڵام پێمان وابوو پێشخستنی بۆ ئەوێ پتر بابەتەکە ڕوون دەکاتەوە.

دووهەم: ئەو بڕگە و باسانەی کە تایبەتن بە داواکاری‌یەکانی مامۆستا نوورسی چ لە سوڵتان عەبدولحەمید و چ لە دەستەی ئیتیحاد و تەرەقی، ئێمە سەر لەنوێ بە شێوەیەکی ڕوونتر و فراوانتر ڕێکمان خستەوە. بۆ ئەم مەبەستەش هەندێ زانیاریی ترمان لە نووسینەکانی نوورسی خۆی هێناوە، وەك ئەو وتارەی کە بە زمانی کوردی بڵاوی کردووەتەوە.

*دوو تێبینی:*

١ - بۆ جیاکردنەوەی دەقەکان، هەرچی لە "تاریخچەی حەیات" وەرگیراوە نەمان خستووەتە ناو کەوانەوە، بەڵام لە پەراوێزی کۆتایی دەقەکەدا ڕوونمان کردووەتەوە کە لەوێ هێنراوە.. ئەوانەی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"یش سەرچاوەکەمان لە پەراوێزدا دیاری کردووە و دەقەکەشمان لەناو دوو کەوانەی گەورەی لاوا( )دا داناوە، چونکە کەوانە بچووکەکانی تایبەت بە دەقمان بۆ وشە و دەقی تر بەکارهێناوە. ئنجا هەر تێهەڵکێشێکی ئامادەکاری کتێبە عەرەبی‌یەکە و ئێمەش هەبێت، کە ناچار بووین بۆ پەیوەستکردنی باسەکان زیادی بکەین، ئەوا خستوومانەتە نێوان دوو کەوانەی لەم جۆرەوە: [ ].

٢ - پەراوێزەکانی مامۆستا ئیحسان لە پەراوێزەکانی تر زیاترن و، بەوە جیامان کردنەوە کە لە کۆتاییاندا ناوی کەسمان نەهێناوە. بەڵام لە داوێنی پەراوێزەکانی مامۆستا نوورسی‌یەوە لە کەوانەدا وشەی (دانەر) و بۆ پەراوێزەکانی خۆیشمان وشەی (وەرگێڕ)مان داناوە.

فاروق ڕەسووڵ یەحیا

سلێمانی - باشووری کوردستان

٢٠١٣/٧/٢٧

# پێناساندن

## پێشەکیی برای بەڕێز مستەفا صونگور[1]

"بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" کێیە کە لە ڕێی ئەو پەیامانەیەوە کە ناویان "پەیامەکانی نوور"ە و پتر لە سەد و سی پەیامن و، بەهۆی کۆمەڵەکەشیەوە (قوتابیانی نوور) کە وانەی ئەم پەیامانە لە نێوان خۆیاندا دەڵێنەوە و، بە هەموو ئاسۆکانی زەویدا بڵاوی دەکەنەوە، بانگەوازەکەی بە هەموو جیهاندا بڵاو بووەتەوە؟

ئەوەتا لە هەموو شارەکانی تورکیا و لە شارۆچکە و گوندەکانی، تەنانەت لە چەندین شوێنی جیهانی ئیسلامی و سەرجەمی مرۆڤایەتیدا پەیامەکانی دەخوێندرێنەوە.. ئیتر لە ناوەندی توێشوو وەرگرتن لە چەندین وانەی زانستی و ئیمانی و، لە گۆڕەپانێکی فراوانی هێندەی جیهاندا گیانی زانستخوازیی لەم سەردەمەدا بووژاندەوە. چونکە ئەو پەیامانە جگە لە وەرگێڕانیان بۆ زمانی عەرەبی، بۆ زمانە جۆراوجۆرەکانی جیهان وەرگێڕراون و، خەڵکی بە حەز و تاسەیەکی لە سنوور بەدەر باوەشیان بۆ کردووەتەوە. بە ڕادەیەکی وا کە ئەم پەیامانە گەیشتنە چەندین شوێنی یەکجار دووری ئاسیای ناوەڕاست و ڕووسیا و، بوونە هۆی ڕزگارکردنی گەلێ کەسی لە ژمارە بەدەر لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی و، لە کوفرەوە بۆ ئیمان و، لە گومڕاییەوە بۆ هیدایەت. لەمەشەوە بەختەوەرییەکی نەبڕاوە و هەمیشەیی پێ بەخشین.. ئیتر بەم جۆرە و بە فەزڵی خوای گەورە، بازنەی ئەم بانگەوازە ئیمانییە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فراوانتر دەبێت.

---

(١) لە قەزای "ئەفلانی"ی سەر بە پارێزگای "زەنگولداغ" لە ساڵی ١٩٢٩زدا لەدایك بووە و، لە هەموو بارودۆخێکی ژیانی مامۆستا نوورسیدا هاودەمی بووە و، تا پلەی "فناء في رسائل النور" - وەك مامۆستا خۆی وتوویەتی - قوتابێتیی ئەوی کردووە. هەروەك مامۆستا نوورسی دوای خۆی ئەمانەتی سەرپەرشتیی قوتابیانی نووری بەم و بە چەند برایەکی تری بەڕێزی هاوونەی ئەم سپاردووە. لە ڕۆژی شەممە بەرواری ١/١٢/٢٠١٢ز کۆچی دوایی کرد. خوای گەورە لێی خۆش بێت و پلەی بەرز بکات. (وەرگێڕ)

ئایا ئەم نوورسی‌یە کێ‌یە؟ ژیانی چۆن بووە؟ بانگەوازەکەی چی‌یە؟ بەرهەم و دانراوەکانی چین؟ مەبەست و ئامانجی چی‌یە؟

ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بە ژیانە پڕ لە ڕووداوەکانی ئەو زاتە دانراون، وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە دەدەنەوە.

بێ گومان کتێبی "ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" کە ئەو قوتابیانەی خۆی ئامادەیان کردووە کە لەگەڵی ژیاون و لە کاروبارێدا یارمەتی‌یان داوە و، بۆ خۆیشی دوای ڕاستکردنەوە و پوختەکاری، ڕەزامەندیی لەسەر نواندووە.. ئەم کتێبە، لەناو خەڵکدا بڵاوە و لە بەردەستیاندایە. ئنجا خودی دانەر چەند بەشێکی لە پەیامی "الآیة الکبری - بینینەکانی گەشتیارێك" و پەیامی "موناجات" و چەند بەشێکی زۆری لە پەیامەکانی تر تێهەڵکێشی ئەو کتێبە کردووە. هەروەك لە نامەکانیدا ڕوونی کردووەتەوە کە نرخی ئەو کتێبە هێندەی نرخی بیست کۆمەڵە پەیامی نوورە!

کتێبی ناوبراو ئێستا لە قۆناغی وەرگێڕاندایە بۆ زمانی عەرەبی، هەروەك بەشێکی زۆری لێ کراوە بە زمانی ئینگلیزی.

وا ئێستا وەرگێڕی بەڕێز "ئیحسان قاسم صالحی" بە شێوازێکی نایاب و ڕێبازێکی تەواو ڕەسەن ئەم "ژیاننامە"یە پێشکەش دەکات، ئەوەش بە کۆکردنەوەی دەقە ئەسڵی‌یەکان لە گوفتاری خودی مامۆستا لە "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" و لە "ژیاننامە"کەی. بەمەش ئەم "مێژووی ژیان"ە گرنگی‌یەکی زۆر بەدەست دەهێنێت و قەشەنگی‌یەکی نوێ و جوانی‌یەکی تر دەخاتە سەر باسی مێژووی ژیانی مامۆستا.

بە سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە، ئەم دەستەوسانە هەژارەی دەرگانەی خوای گەورە و برایانی تری، لە نیعمەتی ژیان لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا، بۆ زیاد لە دە ساڵی کۆتایی ژیانی پڕ پیت و بەرەکەتی، بەهرەمەند بووین. جا بە ناوی ئەو برایانە و لە زمانی ئەوانەوە دەمەوێت وەك هەوڵێکی وەفاداری بۆ چاکەی مامۆستا و، بۆ هێنانەدیی خواستی وەرگێڕی بەڕێز ئیحسان قاسم، زۆر بە پوختی لە چەند بابەتێك بدوێم کە پەیامەکانی نوور بە درێژی باسیان کردوون.

پێویستە ئەوەمان لەیاد بێت کە بۆ ئەوەی بتوانین گوزارشت لە گرنگیی پەیامەکانی نوور بکەین و ڕێزی شایانی ئەو پەیامانە بزانین، دەبێ لە پێشدا بیر لە قۆناغی دانان و نووسینەوە و بڵاوبوونەوەیان بکرێتەوە.

پەیامەکانی نوور دوای دوورخستنەوەی مامۆستا نوورسی لە شاری "وان"ی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵەوە بۆ "بارلا"ی خۆرئاوای ئەنادۆڵ و، لە پاش بزووتنەوەی "شێخ سەعیدی پیران" دەست کراوە بە دانانیان. ئەم ماوەیە سەرەتای پیادەکردنی چەندین توندوتیژیی ئیستیبدادێکی ڕەهایە کە چارەکە سەدەیەکی خایاند.

بەڵێ، ئامانجی ڕێکخراوە ئیلحادییە پەنهانەکان لابردنی یەك لە دوای یەکی دروشمەکانی ئایین و، سڕینەوەی گیانی ئیسلام بوو لەو نەتەوەی تورکەدا کە بۆ ماوەی شەش سەدە، تەنانەت لە سەردەمی عەبباسییەکانەوە ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتبوو.

ئەو ڕێکخراوانە بۆ هێنانەدیی ئەم ئامانجەیان لە پێشدا دەستیان دایە جێبەجێ کردنی پلانی پێگەیاندنی نەوەیەك کە هەر بۆ خۆی دوای سی ساڵ قورئان لابدات و لەناو دڵاندا دەری بهێنێت.. هەر لە ڕاستیدا ئەم پلانەشیان خستە بواری جێبەجێ کردنەوە. هەروەك لە پچڕاندنی پەیوەندییەکانی ئەم نەتەوەیەدا بە ئیسلامەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و، بە چەندین هۆکاری جۆراوجۆر هەوڵیان بۆ خستەگەڕ.

کەواتە کێشەکە گرفتێکی جوزئیی شوێنێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو کێشەیەکی گشتی و هەمەلایەنگیرە و، پەیوەندیی بە ئیمانی ملیۆنەها کەسەوە هەیە لە ڕۆڵەکانی نەوەی داهاتوو، هەروەك پەیوەندیی بە ژیانی هەمیشەیی سەرانسەری گەلی ئەنادۆڵەوە هەیە. چونکە ئەو ماوەیە چەندین ئاڵوگۆڕی ترسناك و، دارمانی مەترسیدار و، هەوڵی سڕینەوەی مێژووی پڕ لە شکۆی ئەم نەتەوە قارەمانە و، دوژمنایەتیی دڕندانەی بەرامبەر بە ئیسلام و قورئان بە خۆوە بینی، بە ڕادەیەك کە ئەو ڕێکخراوە ئیلحادییانە نەوەی نوێیان، بە تایبەت قوتابیی قوتابخانەکانیان، بەرەو لەبیربردنەوەی ڕابوردووی باپیرانیان هان دا، کە پڕە لە خەبات و تێکۆشان لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی ئیسلام و وشەی "الله"دا. ئەوەش بە گوتارێکی ئەوتۆ کە ڕواڵەتەکەی باق و بریق بوو، تاکو پەیوەندیی ئەوان بە ئیسلامەوە بپچڕێنن و، بەوەش کەشێکی گونجاو ساز بکەن بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی بێ پەردەی ئیلحادی.

کەواتە لە دەمی توێژینەوەی بانگەوازی مامۆستا نوورسی و خزمەتیدا بۆ ئیمان و قورئان، پێویستە ئەو ڕۆژگارە تاریك و دژوار و ترسناکانە لە پێش چاو دابنرێت و بە هەند وەربگیرێت.

لەوانەیە هەندێ لەو ئاماژە غەیبی‌یانەی پەیوەندی‌یان بەو چاودێری‌یانەی خواوەندەوە هەیە کە هاورێی بانگەوازی "پەیامەکانی نوور" بوون و، ئەو پشتگیری‌یە پەروەردگاری‌یەش کە لە دانەریان دانەبڕاوە، بۆ خودی کەسی دانەر نەبوو‌بێت، بەڵکو بۆ گرنگیی ئەم خزمەتە قورئانی‌یە بووبێت لەو کاتە دژوار و پڕ لە گرفتانەدا.

مامۆستا نوورسی هۆی ئەم گرنگی‌یە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت:

(ئاشکرایە هەندێ جار تەنها یەك خولەك بە ئەندازەی سەعاتێکی تەواو بایەخدار دەبێت و، بە قەدەر ئەو سەعاتە تەنانەت ئەوەندەی بەرهەمی ڕۆژێکی تەواو، بەڵکو بە ئەندازەی بەرهەمی چەندەها سالیش بەپیت و بەرەکەت و بەرهەمدار دەبێت. هەندێ جاری تریش تەنها یەك سەعات بە ئەندازەی ساڵێکی تەمەن، تەنانەت هەموو تەمەنیش بەرهەم بەخش و بایەخدار دەبێت.

بۆ نموونە:

ئەو کەسەی لە ڕێی خوادا شەهید دەبێت - کە یەك خولەك دەخایەنێت - پلەی ئەولیایانی دەست دەکەوێت.. هەروەها ئەو کەسەی بۆ ماوەی تەنها یەك سەعات لەسەر سنوورێك لە سنوورەکانی وڵاتی ئیسلام و لە دەمی توندوتیژیی سەرما و سەختیی هێرشی ترسناکی دوژمندا ئێشك دەگرێت، لەوانەیە ئەوەندەی ساڵێکی تەواوی خواپەرستی کارەکەی بایەخدار بێت و بەو ئەندازەیە پاداشتی بۆ بنووسرێت..

پەیامەکانی نووریش بە هەمان جۆرن.. چونکە هۆی ئەو گرنگی و بایەخەی بەدەستیان هێناوە دەگەڕێتەوە بۆ:

گرنگیی ئەو کات و چەرخەی تیایدان و.. سەختی و مەزنیی ئەو کاولکاری‌یانەی کە ئەم سەردەمە لە شەریعەت و دروشمەکانی ئایینی پێغەمبەرماندا ﷺ ئەنجامی داون و.. ئەم فیتنە و ئاشووبەی ئێستای ئاخر زەمان کە نەتەوەی ئیسلام هەر لە مێژە لەتاو مەترسی‌یەکانی پەنایان بە خوا گرتووە و.. لەو گۆشەیەشەوەیە کە ئەم پەیامانە ئیمانی باوەڕداران لە هێرش و پەلاماردانی فیتنە و ئاشووبەکان ڕزگار دەکەن.

بەڵێ، قەڵا تەقلیدی‌یەکانی ئیمان لە ئەنجامی هێرشە سامناکەکانی ئەم چەرخەوە، تێکڕا لەرزەیان پێ کەوتووە و، درز و کەلێنیان تێدا پەیدا بووە و، ئیمان لە خەڵکی دوورکەوتووەتەوە و، چەندین پەردەی بەسەر ڕوودا دادراوەتەوە. ئەمەش داخوازی

ئەوەیە کە (هەموو یەکێك) لە باوەڕداران خاوەنی ئیمانێکی تەحقیقیی یەکجار بەهێز بێت تاکو بتوانێت (هەر بە تەنها خۆی) بەرامبەر "هێرشی بەکۆمەڵی گومڕایان" بەرهەڵستی بنوێنێت و خۆی پێ ڕاگیر بکرێت.

جا پەیامەکانی نوور لە تاریکترین و سامناکترین و پێویستترین و تەنگانەترین کاتدا ئەم فەرمانبەری و ئەرکە جێبەجێ دەکەن و، خزمەتی ئیمانیی خۆیان بە شێوازێك بەجێ دەهێنن کە هەموو کەسێك لێیان تێبگات و، بە چەندین بەڵگەی بەهێزیش قووڵترین و وردترین و پەنهانترینی ڕاستییەکانی قورئان و ئیمانیان چەسپاندووە، بە ڕادەیەك کە هەر قوتابییەکی ڕاست و وەفاداری پەیامەکانی نوور ئیمانی تەحقیقیی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتبێت، لە ڕووی خزمەتگوزارییەکانیەوە بۆ ئیمان وەکو "قوتب"ێکی شارراوەی ئەولیاکان و بنکەی مەعنەویی ئیمانداران وایە لەو شار و دێهاتانەی تیایاندا دەژین، ئەوانە هەرچەندە ئاشکرا نین و نەناسراون و هیچ کەسێك ئاوڕیان لێ ناداتەوە و بایەخیان پێ نادات، بەڵام هەر یەکەیان بەو عەقیدە و بیروباوەڕە مەعنەوییەی هەیەتی، وەك ئەفسەرێکی ئازای ناو سوپا وان، هێز و پێز و یاریدەی مەعنەوی بە دڵی ئیمانداران دەبەخشن و گیانی ورە و ئازایەتی و حەماسەتیان تێدا دەبزوێنن)[1].

هەروەها دەڵێت:

(پەیامەکانی نوور تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن و، پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە قورئانەوە هەیە، کە ئەویش کتێبێکی شکۆدارە و بە عەرشی هەرە مەزنەوە پەیوەستە. کەواتە هەڵە و ناتەواوییە کەسییەکانی من ئاراستەی پەیامەکان ناکرێن)[2].

ئەم "ژیاننامە"یە، کە لە گوفتارەکانی مامۆستا نوورسی خۆیەوە ئامادە کراوە، هەروەك مێژووی ژیانی مامۆستا دەخاتە پێش چاوی خوێنەری بەڕێز، لە هەمان کاتدا ڕێباز و مەشرەبی ئەویش لە بانگەوازدا بۆ ئیمان و قورئان، لە زاری خودی مامۆستاوە، پێشکەش دەکات.

ئێمە لێرەدا هەندێ لەو شتانە باس دەکەین کە بە هەمان جۆر پەیوەندییان بە شێواز و ڕێبازی بانگەوازەکەی مامۆستاوە هەیە، لە ناوەندی ئەو باس و بابەتانەدا کە لە دەمی

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٣١٦-٣١٨. (وەرگێڕ)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٣٠٣. (وەرگێڕ)

وتنەوەی وانەکانی نوور و لەو ڕۆژانەدا لە نزیکەوە ئامادەی لای ئەو بووین، لێیان دەدوا. هەروەها لەو دە ساڵەی کۆتایی ژیانیدا کە بە فەزڵی خوای گەورە سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور بووین.

بە جەختکردنەوە دەڵێین:

شتی زۆرمان لە مامۆستا دەبیست، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندیی بە ئێمەوە، یان بە شێوەیەکی تایبەتی پەیوەندیی بە منەوە هەبوو، ئاشکرامان نەدەکرد و دەمانشاردەوە. کەچی دوای ماوەیەك دەردەکەوت کە هەموو ئەو شتانە لە پەیامەکانیشدا باس کراون!

زۆر جار لەمە سەرسام دەبووم! تەنانەت لە بەڕێز "محەممەد فەیزی"م پرسی، کە هەشت ساڵ لە قەستەمۆنی لە خزمەتی مامۆستادا بووە، وتم: چ نهێنییەك لەوەدا هەیە کە مامۆستا ناوی "نووسەرەوەی نهێنییەکان"ی لە ئێوە ناوە؟ بە زەردەخەنەوە وەڵامی دامەوە کە:

"مامۆستا لە دەرەوەی ئەو شتانەی کە لە پەیامەکاندا نووسیونی هیچ شتێکی تری بە گوێی مندا نەچپاندووە".

بەو واتایەی کە ئەم پەیامانە هەموو شتێکیان دەربڕیوە و، ئێمە شتێکمان لە لا نییە کە لە دەرەوەی پەیامەکاندا بێت.

وا لە خوارەوە نموونەیەك بۆ ئەمە دەهێنمەوە:

ڕۆژێکیان لە "بارلا" لە ماڵی بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەکە من و جەیلان و زوبەیر لەگەڵ مامۆستادا بووین. مامۆستا بە منی وت: تۆ و جەیلان وەرن بۆ لام. کە ڕۆشتینە ژوورەکەی، بینیمان سەرقاڵی خوێندنەوەی "ئەورادی قودسییە"ی شاهی نەقشبەندە. ئێمەش ڕاوەستاین چاوەڕوانی هەر فەرمانێك بووین کە پێمان بسپێرێت.

لێی پرسین: ئایا پەیامی "الآية الكبرى"تان خوێندووەتەوە؟

وتمان: بەڵێ خوێندوومانەتەوە.

وتی: ئایا دەزانن ئەو گەشتیارە کێیە کە بەناو چەرخەکاندا گەڕاوە و چینەکانی بوونەوەرانی پشکنیوە؟ دەزانن ئەو گیانە چالاکە کێیە کە گەشتی بەناو ئاسۆکانی جیهاندا کردووە؟

ئێمەش "لە دڵی خۆماندا" وتمان: بەڵێ، ئێوەن ئەو گەشتیارەی کە بەناو ئاسۆکانی جیهاندا گەڕاون.

پاشان وتی: ده فەرموون بڕۆن!

ئێمەش ڕۆشتینە دەرەوە.

من ئەم یاداشتەم وەکو یادگاری‌یەکی خۆشی مامۆستا باس دەکرد. بەڵام ڕۆژێکیان کە ئەو بڕگەیەم خوێندەوە لە سەرەتای مەقامی دووهەمی پەیامی "الحجـة الزهـراء"دایە، بۆم دەرکەوت کە گەلێ نموونەی وەك ئەم نموونەیە لە پەیامەکاندا هەیە.

بەو واتایەی کە زۆربەی ئەو یادگاری‌یانەی باسیان دەکەین لە پەیامەکاندا هەن.

بڕگەکەش ئەمەی خوارەوەیە:

(ئەو گەشتیارەی کە لە پەیامی "الآية الكبرى"دا گەشتی بە ناو دنیادا دەکرد و لە دەمی گەڕانی بە دوای بەدیهێنەریدا پرسیاری لە هەموو بوونەوەران و جۆرەکانی کرد و، پاشان بەدیهێنەری خۆی دۆزی‌یەوە و، بە سی و سێ ڕێگە و بەڵگەی بەهێزی گومان بڕ و بە "علم اليقين" و "عين اليقين" خوای خۆی ناسی، هەر ئەو گەشتیارە - بێ ئەوەی ماندوو بێت - بە ژیری و دڵ و ئەندێشەی، گەشتێکی بەناو چینەکانی چەرخەکان و زەوی و ئاسمانەکاندا کرد، تەنانەت تا ئێستاش بۆ ئەوەی تینوویێتیی ناخی خۆی بشکێنێت لە گەشتەکەیدا هەر بەردەوامە و، وەك کەسێك بە ناو شارێکدا بگەڕێت گەشتی بە ناو هەموو شوێن و لایەنێکی ئەم دنیا فراوانەدا کردووە..

لەم گەشتەشیدا لە ڕێی ژیری‌یەوە هەندێ جار پشتی بە دانستی قورئان و هەندێ جاری تر بە دانستی فەلسەفە دەبەست و، بە دووربینی ئەندێشە دوورترینی چینەکانی دەردەخست، هەتا سەرجەمی ڕاستی‌یەکانی وەك واقیعی ڕاستەقینەی خۆیان بینی و، هەواڵی هەندێکیشیانی لەو پەیامی "الآية الكبرى"یەدا ڕاگەیاند)[1].

وا ئێستا یەك دوو یادگاری دەهێنمەوە کە شایانی باسکردنن:

لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٤ز)دا تازە لە بەندیخانەی "سامسۆن" دەرچووبووم، مامۆستاش ئەو دەمە لە "ئەمیرداغ" بوو، چونکە لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٥٣ز)دا لە ئیسپارتەوە هاتبووە ئەوێ و خانوویەکی بە کرێ گرتبوو، لەو قوتابخانە نووری‌یە سێ‌هەمەدا نیشتەجێ بووبوو. ئێمەش لەگەڵ برایان تاهیری و زوبەیر و جەیلان و بەیرام لە ژوورێکی خانووەکەدا بووین..

---

(١) تیشکەکان، تیشکی پازدەهەم، ل: ٨٧١-٨٧٢. (وەرگێڕ)

ڕۆژێکیان مامۆستا لە پێش نوێژی خەوتناندا هاتە ژوورەوە بۆ لامان و، وتی: شتێکم بە دڵدا هاتووە.. فێری زمانی عەرەبیتان دەکەم و، لە سبەینێ بەیانی‌یەوە دەست دەکەین بە "المثنوي العربي النـــوري". ئیتر بۆ ڕۆژی دوای ئەوە دەستی کرد بە وانە وتنەوەی "المثنوي العربي النوري" بە ئێمە. وانەکەش زۆربەی جار سێ چوار سەعاتی دەخایاند و، هەندێ جاریش بە دەگمەن بۆ پێنج سەعات درێژەی دەکێشا. خۆی بە زمانی عەرەبی بۆی دەخوێندینەوە و، بە زمانی تورکی ڕوونی دەکردەوە بۆمان.

گرنگیی (المثنوي العربي النوري) لای کەس شاراوە نی‌یە، چونکە بناغە و ڕیشەی پەیامەکانی نوورە. مامۆستا دوو جار مەسنەویی پێ وتینەوە، بە هەمان جۆر "إشارات الاعجاز"ی عەرەبیش.

لە ڕاستیدا ئێمە ناتوانین ڕادەی سوود وەرگرتنمان و مەودای بەدەستهێنانی خۆراکی ڕۆحی و مەعنەویمان لەو وانانە، دەرببڕین. چونکە ئەو ڕۆژگارانە بە ڕاستی بەختەوەرترینی ڕۆژەکانی ژیانمان بوون، ئەوەبوو پێکەوە دەڕۆشتین بۆ "بارلا" یان بۆ سەر "چیای چام" و، لەوێ ئەو دەرسانە بەردەوام دەبوون و نەدەوەستان.

ڕۆژانی یەکەمی وانەکان بە تەواوی لە هەموو وانەکە تێنەدەگەشتین، چونکە بە باشی زمانی عەرەبیمان نەدەزانی، بەڵام وەك کەسێك لە هەمووی تێگەشتبێت سوود و پیتمان لە وانەکان وەردەگرت و، وەکو ئەوەی کە باڵندە بە سەرمانەوە نیشتبێتەوە گوێمان لە مامۆستا ڕادەگرت و، تامی وتە و گوفتارەکانی ئەومان وەکو "شیلە"ی هەنگوین و بە وێنەی تینوو بۆ ئاوی زوڵاڵ دەچەشت و، وەکو کەسێك دوای ماندووبوونێکی زۆر هەوای پاك هەڵبمژێت، ئێمەش بەو جۆرە سروەی ئەو گوفتارانەمان دەنۆشی.

لە ڕاستیدا گیان و ژیری و سەرجەم لایەنە نیانەکانمان گەلێ وانەی زۆریان لە مامۆستا وەرگرت. ئێمەش سوپاس و ستایشی نەبڕاوە پێشکەش بە خوای گەورە دەکەین. ئەوەش فەزڵ و چاکەی پەروەردگارە.

چەندین ڕۆژمان لەسەر چیای چام و لەسەر لوتکەی ئەو درەختی سنەوبەرەی کە جێی تێڕامانی مامۆستا بوو، بردەسەر. دوای دوو ساڵ "حوسنی"ش، کە لە "ئوورفە" خزمەتی پەیامەکانی نووری دەکرد، هات و لەگەڵ ئێمەدا هاوبەشی وانەکان بوو.

بەڵێ، ناتوانم یادگاری‌یەکانی ئەو ڕۆژگارە جوانانە لەیاد بکەم کە لەگەڵ مامۆستادا بەسەرمان برد.

بەم بۆنەیەوە ئەوەش باس دەکەم کە مامۆستا لە دوای بەندیخانەی ئافیوونەوە لە سالی (١٩٤٨ز) هەتا سالی (١٩٥٠ز) هەندێ جار لە لای خۆی دەیهێشتینەوە و، هەندێ جاری دیکەش دەیناردین بۆ ئەنقەرە و ئەستەمبووڵ و ئوورفە و شارەکانی تر بۆ خزمەتی پەیامەکانی نوور. بەڵام لە دوای ئەم سالە، لای خۆی دەیهێشتینەوە بۆ هاوکاری کردنی لە ئیشوکاریدا. پێشتریش برای بەرێز "عەبدوڵڵا یەگن" بۆ ماوەی دوو ساڵ لە خزمەتی مامۆستادا بوو. کەسانی تریش هەبوون کە لەگەڵ مامۆستادا و بۆ خزمەت کردنی دەمانەوە.

مامۆستا "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"ی، چ تورکی‌یەکان و چ عەرەبی‌یەکان، بە دەرس پێ وتینەوە و، فەرمانی دا کە "المثنوي العربي النوري" بە ئامێری لەبەرگرتنەوەی "رۆنیۆ" چاپ بکرێت و بە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا بڵاوبکرێتەوە.

سالی (١٩٥٦ز) پەیامەکان چاپ دەکران و، فۆرمەکانی دەهاتنەوە و، لە دەمی وانەکاندا دەخوێندرانەوە و، مامۆستا لەبەر نوسخە ئەسڵی‌یەکەدا، کە بە پیتی عەرەبی بوو، بەدواداچوونی بۆ ئەو فۆرمانە دەکرد. پاشان فەرمانی دەدا بە دەستکردن بە چاپ.

پاش ئەوە ئەستەمبوولیش دەستی دایە چالاکی‌یەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی پەیامەکان. ئەوەبوو هەریەك لە (بریسکەکان و، ئاماژەکانی ئیعجاز و، مەسنەویی نووری و، عەسای مووسا و، ژیاننامە و، تیشکەکان و، مۆری تەسدیقی غەیبی) لەگەڵ چەند پەیامێکی بچووکدا، لەوێ چاپ کران.

رۆژانە دوای نوێژی بەیانی، هەندێ جار دوای نوێژەکانی تریش، لەو پەیامانەمان دەخوێندەوە. ئیتر مامۆستا بەم کارە رێورەسمی خوێندنی "پەیامەکانی نوور"ی دامەزراند کە هەر ئەوەیە قوتابیانی نوور لە کاتی ئێستادا لەسەری بەردەوامن.

بەم جۆرە، ساڵ هات و رۆشت هەتا نزیك بووینەوە لە سالی (١٩٦٠ز). ئیتر "پاشبەندەکان" و گفتوگۆکانی مامۆستا چاپ کران، ئەوانەی کە لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا وترابوون لە سەردانەکانیدا بۆ هەریەك لە بارلا و ئەمیرداغ و ئەسکی‌شەهر و ئەگریدر و ئیسپارتە و شوێنانی تر.

وا یەکێك لەو یادگاریانە باس دەکەم:

رۆژێکیان مامۆستا وتی:

(کاتێك کە لە "وان" بووم والیی شار "تاهیر پاشا" ژوورێکی لە قاتی سەرەوەی میوانخانەکەی بۆ تەرخان کردبووم، منیش شەو لەوێ دەمامەوە، ئەو کاتە نزیکی نەوەد کتێبم لە حەقیقەتەکان لەبەر کرد. ئیتر هەموو ڕۆژێك ماوەی سێ سەعات دەوری ئەو شتانەم دەکردەوە کە لەبەرم کردبوون و، هەموو سێ مانگ جارێك ئەو دەورکردنەوەیەم تەواو دەکرد. جا برایانم! من سوپاسی زۆری خوای گەورە دەکەم بۆ دەورکردنەوەی بەردەوامی ئەو شتانەی کە لەبەرم کردبوون، چونکە بوونە هۆیەك بۆ سەرکەوتنم بەرەو ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز، ئنجا گەیشتم بە قورئانی پیرۆز و، بینیم کە هەموو یەکێك لە ئایەتە پیرۆزەکانی بە تەواوی دەوراندەوری گەردوونیان داوە. ئیتر دوای ئەوە قورئان بێ نیازی کردم لە هەموو شتێکی تری غەیری خۆی).

مامۆستا لە "بریسکەی سێیەم"دا شتێکی باس کردووە کە پشتی ئەم یادگارییە دەگرێت سەبارەت بەوەی پەردە لەسەر چەندین ئایەت لە پێش چاویدا لادراوە، لە دەمی ڕاڤەکردنیدا بۆ ئەم ناوە جوانانەی خوای گەورە: "الفرد، الحي، القيوم، الحكم، العدل، القدوس".

ئەوەتا دەڵێت:

(لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و لە مانگی "شەوال"دا، سەرنجێکی وردی ئەم دوو ئایەتە ناوبراوە و[1]، یەکێك لە درەوشانەوەکانی نووری ئیسمی "الحي" کە ئیسمی ئەعزەمە، یان یەکێکە لە دوو نوورەکانی ئەو ئیسمە[2]، یاخود نوورێکە لە شەش نوورەکانی[3]، لە ئاسۆی ژیرمدا دەرکەوت. لەو کاتەشدا نەمتوانی ئەو باڵندە بەرزە بگرم، بەڵام پاش دوورکەوتنەوەی شەوقە درەخشانەکەی، ناچار بووم بە دانانی چەند "هێما"یەك، کە ڕەمزی تیشکەکانی ئەو حەقیقەتە مەزن و نوورە هەرە گەورەیەن، ئاماژەی بۆ بکەم)[4].

---

(١) مەبەست لەم دوو ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم: ٥٠)؛ ﴿اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ﴾ (البقرة: ٢٥٥). (وەرگێڕ)

(٢) مەبەستی لە دوو نوورەکە (حيّ، قيوم)ە. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەستی لە شەش نوورەکە: (فرد، حي، قيوم، حكم، عدل، قدوس)ە. (وەرگێڕ)

(٤) بریسکەکان، بریسکەی سێیەم، ل: ٦٩٥. (وەرگێڕ)

نیازم لە خستنەڕووی ئەم نموونانە، پشتگیریی مامۆستا نوورسی‌یە لەوەدا کە وتوویەتی:

(پەیامەکانی نوور تەفسیرێکی مەعنەویی قورئانی پیرۆز و موعجیزەیەکی مەعنەویی ئەون)[1].

وا یادگاری‌یەکی تر دەهێنم، وەکو نموونەیەك بۆ ئەو ڕاستی‌یانەی کە باس کراون:

لە بەهاری سالّی (١٩٥٤ز)دا من و زوبەیر لەگەڵ مامۆستا لە ژووری باخێکدا بووین لە کەناری دەریاچەی بارلا "ئەگریدر". مامۆستا فەرمووی:

"نزیکی سی ساڵ پێش ئێستا و لەم وەرزەدا کە گوڵی درەختەکانی چوالە دەمیان دەپشکوێت لێرەدا (ئاماژەی بۆ درەخت و باخەکان کرد) هاتووچۆم دەکرد. کتوپڕ ئەم ئایەتە پیرۆزە:

﴿فانظُرْ إِلى آثارِ رَحْـمَتِ اللهِ كيفَ يُحيِ الأَرضَ بعد موتِـها إِنَّ ذلك لمحيِ الموتى وهو على كلِّ شيءٍ قدير﴾ (الروم: ٥٠)..

هاتە دڵمەوە و، خوای گەورە دەرگای واتاکانی ئەم ئایەتەی لەو ڕۆژەدا لێ کردمەوە، ئیتر بەدەم هاتووچۆکردنەوە و بە دەنگی بەرز چل جار خوێندمەوە..

بۆ ئێوارەکەی پەیامی حەشر (وتەی دەهەم)م لەگەڵ "حافز تۆفیقی شامی"دا دانا". (واتە مامۆستا دەیوت و ئەویش دەینووسی‌یەوە).

خوالێخۆشبوو "خلووصی یەحیا گیل" کە یەکەم قوتابیی نوورە، دەگێڕێتەوە کە مامۆستا پێی وتووە:

"کاتێ وتەی دەهەمم دادەنا، دووسەد ئایەتی پیرۆز پشتیان دەگرتم و بە دەممەوە دەهاتن"!

مامۆستا خۆیشی دەڵێت:

(ئەم قسەیەی کە سەبارەت بە "وتەکان"ەوە دەیکەم، لە ڕووی تەوازوعەوە نی‌یە، بەڵکو ڕوونکردنەوەی حەقیقەتە:

ئەو ڕاستی و تایبەتکاری‌یانەی لە "وتەکان"دان، هەرگیزاو هەرگیز زادەی بیری من نین، بەڵکو تەنها هی قورئانی پیرۆزن. چونکە ئەو وتانە چەند نمێکن لە ئاوی زوڵاڵی

(١) بڕوانە: پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٣١٢. (وەرگێڕ)

قورئان، بە ڕادەیەك كە وتەی دەهەم(پەیامی حەشر) لە ڕاستیدا چەند دڵۆپێكی نمنم داتكاوی سەدان ئایەتی قورئانی پیرۆزە. هەروەها پەیامەكانی تریش)[1].

مامۆستا لە زۆر نامەیدا بۆ قوتابیانی جەختی لەوە دەكردەوە كە خۆی خاوەنی "پەیامەكان" نی‌یە و ناشتوانێ بیانكات بە موڵكی خۆی. وا یەكێك لەو نامانەی دەهێنین:

(ئەگەر من دەنگم بە هەموو جێگایەكی جیهان بگەیشتایە، ئەوا بە هەرچی هێز و توانام هەیە دەموت:

"وتەكان" تێكڕا حەقیقەتن و تابڵێی جوان و ڕەنگینن. بەڵام لە منەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵكو چەند تیشكێكن لە ڕاستی‌یەكانی قورئانی پیرۆزەوە پەیدا بوون و درەوشاونەتەوە. كەواتە جوانیی ڕاستی‌یەكانی قورئان لە لایەن منەوە نی‌یە و من نەمڕازاندووەتەوە، تەنانەت هەر نەشمتوانیوە جوانی‌یەكەی دەربخەم، بەڵكو ڕاستی‌یە جوانەكانی قورئانی پیرۆز، وشە و دەربڕینەكانی منیان ڕازاندووەتەوە)[2].

لە پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"دا ڕوونكردنەوەیەك هەیە سەبارەت بەوەی كە لە سەرەوە باس كرا، ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

(ڕاستترین و ڕوونترین بەڵگە لەسەر پایەبڵندیی قورئانی حەكیم و لەسەر ئەوەی كە قورئان ڕاست و ڕەوایە و، بەهێزترین بەڵگە و نیشانەش لەسەر ئیعجازەكەی ئەوەیە كە:

قورئانی پیرۆز لە دەمی باسكردنی "تەوحید" و هەموو بەشەكانیدا هاودەم لەگەڵ باسكردنی گشت پلەكانی ئەو بەشانە و سەرجەم پێداویستی‌یەكانیان و، بێ ئەوەش "ڕێكوپێكی"ی هیچ كامێكیان تێك بدات، بە تەواوی "هاوسەنگی"ی خۆی پاراستووە! هەروەك پارێزگاریی "هاوسەنگی"ی نێوان گشت حەقیقەتە خواییە بەرزەكانیشی كردووە و، سەرجەمی ئەو حوكمانەشی لە خۆدا كۆكردووەتەوە كە هەموو ناوە جوانەكانی خوای گەورە داخوازی دەبن، هاودەم لەگەڵ پاراستنی ڕێكوپێكی و پەیوەندیی دەست لەملانی نێوان ئەو حوكمانەدا.. هەروەك بە هاوسەنگیی تەواو كاروباری "ڕبووبییەت" و "ئولوهییەت"یشی پێكەوە لە خۆدا كۆكردووەتەوە!

---

(١) مەكتووبات، مەكتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٢-٦٢٣. (وەرگێڕ)

(٢) مەكتووبات، مەكتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٤. (وەرگێڕ)

جا ئەم "پارێزگاری" و "هاوسەنگی" و "کۆکردنەوە"یە، تایبەتکاری‌یەکی قورئانە کە هەرگیز لە هیچ ئاسەوارێکی مرۆڤدا نی‌یە. تەنانەت نە لە بەرهەمە فیکری‌یەکانی گشت بیریارە مەزنەکان و، نە لە ئاسەواری ئەولیایانی پیاوچاکدا کە ڕۆشتوونەتە ناو جیهانی مەلەکووت و، نە لە کتێبی ئەو ئیشراقی‌یانەی کە لە ناخی دیوی ناوەوەی شتاندا ڕۆچوون و، نە لە عیرفانی ئەو ڕۆحانی‌یانەشدا کە ڕۆشتوونەتە ناو جیهانی پەنهانی غەیبەوە، تایبەتکاریی وا دەست ناکەوێت. بەڵکو هەموو بەش و تاقمێکی ئەوان دەستی بە تەنها لقێك یان دوو لقی درەختە مەزنەکەی "حەقیقەت"ەوە گرتووە و، بە تەواوەتی بە گەڵا و بەری ئەو لقەوە سەرقاڵ بووە و، چ لەبەر پێنەزانی و چ لەبەر بۆ نەڕوانین، ئاوڕی لە هیچ کامی لقەکانی تر نەداوەتەوە، دەڵێی جۆرە کار دابەشکردنێك لە نێوانیاندا ڕووی داوە!

بەڵێ، ڕوانینە "بەرتەسکە پابەندەکان" هەرگیز ناتوانن دەوراندەوری "حەقیقەتی ڕەها" بدەن و هەموو لایەکی ببینن. چونکە ئەم کارە پێویستی بە ڕوانینێکی کوللی و گشتگیری وەك "قورئانی پیرۆز" دەبێت!

کەواتە هیچ شتێکی تری غەیری قورئانی پیرۆز - با دەرس و ڕێنماییشی لە قورئان وەرگرتبێت - ناتوانێت بە "ژیری"یە سنووردار و جوزئی‌یەکەی خۆی جگە لە چمکێك یان دوو چمکی حەقیقەتە کاملەکە هیچی تر بە تەواوی ببینێت! بۆیە بە گەرموگوڕی لەو چمك و لایەنەدا سەرقاڵ دەبێت و لێی ناترازێت و، لە ئەنجامدا "هاوسەنگی"ی نێوان "حەقیقەتەکان" دەشێوێنێت و، یان بە "زیادەڕۆیی" یاخود بە "کورتبڕی" ڕێکوپێکیی نێوانیان دەشێوێنێت)[1].

لەم بڕگەیەوە و لە گوفتاری خودی مامۆستاوە تێدەگەین کە "پەیامەکانی نوور" لەبەر ئەوەی تەفسیری قورئانی پیرۆزن، ئەوا بریسکەیەکی ئەم تایبەتمەندی‌یە دەراسا و گشتی‌یەیان وەرگرتووە. وا تەنها یەك نموونە بۆ ئەمە دەهێنینەوە:

(برام! تۆ لە نامەکەتدا دەڵێیت: تەفسیرنووسان لە دەمی تەفسیرکردنی: ﴿رب العالمين﴾دا وتوویانە: هەژدە هەزار جیهان هەیە و، پرسیار لە حیکمەتی ئەم ژمارەیە دەکەیت!

---

(١) وتەکان، وتەی بیست و پێنجەم، ل: ٦٤١-٦٤٢. (وەرگێڕ)

برام! من ئێستا حیکمەتی ئەو ژمارەیە نازانم، بەڵام تەنها ئەمەی خوارەوە دەڵێم:

ڕستەکانی قورئانی حەکیم تەنها یەك واتایان لەخۆ نەگرتووە، بەڵکو هەر یەکەیان لە حوکمی "کوللی"یەکدایە کە گەلێ واتای بۆ هەموو چینێك لە چینەکانی مرۆڤ لەخۆ گرتووە. چونکە قورئانی پیرۆز گوفتارێکە ئاراستەی سەرجەم چینەکانی ئادەمیزاد کراوە. کەواتە ئەو واتا ڕوونکراوانە لە حوکمی "جوزئییات"ی ئەو قاعیدە و یاسا "کوللی"یەدان و، هەر تەفسیرنووس و هەر خواناسێك بەشێك لەو واتا کوللییە باس دەکات و، لەو تەفسیرەشدا یان پشت بە کەشفییات یان بەڵگە یان مەشرەبەکەی خۆی دەبەستێت و، یەکێك لەو واتایانە تەرجیح دەدات و هەڵی دەبژێرێت. هەر لە ڕاستیشدا کۆمەڵێك لەو تەفسیرنووسانە لەم ڕووەدا واتایەکی موافیقیان لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا دەرخستووە.

بۆ نموونە: ئەولیاکان، بە گرنگیپێدانێکی زۆرەوە، بەیانی و ئێوارە لە نێوان ویردەکانیاندا ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنن کە دەفەرموێ:

﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لاَ يَبْغِيَانِ﴾ (الرحمن:١٩-٢٠)..

ئەم ئایەتە گەلێ واتای زۆری هەیە، هەر لە دەریای پەروەردگارێتییەوە لە بازنەی "وجووب" و دەریای بەندایەتییەوە لە بازنەی "ئیمکان".. تا دەگاتە هەردوو دەریای دنیا و ئاخیرەت و جیهانی شەهادە و جیهانی غەیب و، هەروەها تا دەگاتە زەریاکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باکوور و باشوور و دەریای ڕۆم و دەریای فارس و دەریای سپی و دەریای ڕەش و گەرووەکەی نێوانیان کە ئەو چەشنە ماسییەی لێ دەردەچێت کە پێی دەڵێن "مەرجان" و.. تا دەگاتە دەریای سوور و نۆکەندی سوێس و، دەریای ئاوە سازگار و ئاوە سوێرەکان و، دەریای ئاوە سازگارە پەرتەوازە بڵاوەکانی ناو زەوی و، دەریا سوێرەکانی سەر ڕووی زەویش کە بە یەکترەوە لکاون و، ئەو ڕووبارە گەورانەی چەشنی نیل و دیجلە و فورات کە پێیان دەوترێت: دەریا سازگارە بچووکەکان و، ئەو دەریا سوێرانەش کە تێکەڵیان دەبن..

هەموو ئەم جوزئییاتانە، لە ناوەندی واتاکانی ئەو ئایەتە پیرۆزەدان و هەر هەمووشیان دروستە ئامانج و جێی مەبەست بن، کەواتە هەموو ئەوانە واتای حەقیقی و مەجازیی ئەم ئایەتە پیرۆزەن.

به هەمان جۆر: ﴿الحمد لله ربّ العـــالمين﴾یش، وەك ئەمانەی باس کران، گەلێ حەقیقەتی زۆری لە خۆدا کۆکردووەتەوە و، ئەهلی کەشف و حەقیقەتیش بەپێی کەشفییاتی خۆیان بە چەند ڕوونکردنەوەیەکی جۆراوجۆر ئەو ڕاستییانە دەردەخەن.

منیش بەش بە حاڵی خۆم ئەم واتایەی خوارەوە لەم ئایەتە تێدەگەم:

ئاسمانەکان هەزاران جیهانیان تێدایە و، دەگونجێ هەر ئەستێرەیەك لەناو کۆمەڵەکەی خۆیدا جیهانێکی سەربەخۆ بێت و، هەموو ڕەگەزێکی ناو گۆی زەوییش جیهانێکی سەربەخۆیە لە خۆیدا. تەنانەت هەموو مرۆڤێك جیهانێکی بچووکە. کەواتە وشەی: ﴿ربّ العالمين﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە کاروباری هەموو یەکێك لەو جیهانانە ڕاستەوخۆ لە لایەن پەروەردگارێتیی خواوەندەوە بەڕێوە دەبرێت و پەروەردە دەکرێت و کاروبارەکانی بەڕێ دەخرێت)[1].

لێرەدا یادگارێك لە مامۆستامانەوە دەگێڕمەوە:

لە "ئیسپارتە" بووین.. وانەی ئیمانیی پەیامەکانی نوورمان لە نێوان خۆماندا دەخوێند و، مامۆستاش لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشتبوو بەدواداچوونی بۆ وانەکە دەکرد لە پەیامێکدا کە بە پیتی عەرەبی نووسرابوو. کتوپڕ هەڵسایەوە و چاویلکەکەی لابرد و، ڕووی تێکردین و، وتی:

"ئێوە لاون، بیرکردنەوەتان بەهێزە.. بەڵام من پیر بووم و بیرکردنەوەم لاواز بووە. لەگەڵ ئەوەشدا سوێندتان بۆ دەخۆم بە خوای گەورە کە هێندە سوودم لەم وانەیە وەرگرت دەڵێی یەکەم جارە دەیخوێنمەوە، لەکاتێکدا کە تا ئێستا دە هەزار جار خوێندوومەتەوە"!

دوای چەند ڕۆژێك وتی:

"پێش چەند ڕۆژێ ئاوا و ئاوام پێ وتن. بەرزبوونەوە لەم وانانەدا سنوورێکی نییە، چونکە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزن".

مامۆستا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە سەرنجەکان لە کەسی خۆی لابرێن و بەرەو پەیامەکانی نوور ئاراستە بکرێن. دەیوت:

"پەیامەکانی نوور وانەیەکی قورئانی پیرۆزن لە ئاستی تێگەیشتنی ئەم سەردەمەدا".

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و شەشەم، ل: ٥٤٨-٥٤٩. (وەرگێڕ)

هەروەك تابلۆیەكی لە دیوی پشتەوەی دەرگای ژوورەكەی لە شوێنی مانەوەی هەڵواسیبوو، چ لە ئیسپارتە و چ لە ئەمیرداغ، هەركەسێك سەردانی بكردایە پێی دەوت بیخوێنێتەوە. لەو تابلۆیەدا نووسیبووی:

"پەیامەكانی نوور هیچ پێویستییەكی بە من نەهێشتووەتەوە. هەر پەیامێك لەو ملیۆنەها نوسخانەی كە دەیانخوێننەوە، دە هێندەی چاوپێكەوتنی من سوودی لێ وەردەگرن".

لە شوێنێكی تردا دەڵێت:

"لە رووی كاركردنەوە بۆ قورئانی پیرۆز، خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی چەندین برای چوست و چالاكی لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا پێ بەخشیووم، كە دوای مردنم ئەو خزمەتە ئیمانییە، لە بریی یەك مەڵبەند، لە چەندین مەڵبەندی زۆرەوە ئەنجام دەدرێت. خۆ ئەگەر "مردن" زمانم بێدەنگ بكات، ئەوا لە بریی من چەندین زمانی بەهێز دەكەونە گۆ و، ئەو خزمەتەش بە بەردەوامی ڕایی دەكەن".

هەروەها دەڵێت:

(خزمەتگوزارییەكانم و ڕووداوەكانی ژیانم لە حوكمی "تۆو"ێكدان تاكو ببن بە سەرەتا و بنەمای خزمەتێكی ئیمانیی مەزن. ئەوەتا چاودێریی خوای گەورە لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا درەختێكی بەرداری بە "پەیامەكانی نوور" - كە لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە - لەو تۆوە پێگەیاندووە و بەخشیوەتی)[1].

خۆ كاتێ باسی چاودێرییە پەروەردگارییەكان دەكرا لە ڕۆژانی سەرەتای دانانی پەیامەكاندا، دەیوت:

(ماوەیەكی زۆر پێش ئێستا لە وەلییەكی پیاوچاكم بیست، وتی:

"لە ئاماژە غەیبییەكانی چەند ئەولیایەكی پێشینەوە دەرەنجامێكی ئەوتۆی بەدەست هێناوە كە قەناعەتی ئەوەی داوەتێ: لە خۆرهەڵاتەوە ڕووناكییەك پەیدا دەبێت و تاریكیی بیدعەتەكان دەرەوێنێتەوە"!

ماوەیەكی زۆر چاوەڕوانی سەرهەڵدانی ئەم چەشنە ڕووناكییەم كرد و ئێستاش هەر چاوەڕوانم. بەڵام خۆ گوڵەكان لە بەهاردا دەمیان دەپشكوێ! كەواتە دەبێ هەر لە

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٣. (وەرگێر)

ئێستاوە ڕێ بۆ پشکووتنی ئەو چەشنە گوڵە خاوێنانە ئامادە بکەین و، زانیمان ئێمە بەم خزمەتەمان ڕێ بۆ هاتنی ئەو نوورانییە بەرێزانە خۆش دەکەین)[1].

سوپاس بۆ خوا ئەو گوڵانە دەمیان پشکووت و، گوڵ و بەروبوومی نوورانییان گرت. بە پشتیوانیی خوا هەر دەشیگرن.

بە بۆنەی ئەم ژیاننامەیەوە، وا لە خوارەوە ئەو نووسینەی هەردوو برای بەرێز "محەممەد فەیزی" و "ئەمین چایچی" دەهێنین کە لەبارەی مامۆستاوە تۆماریان کردووە. ئەم دوو بەرێزە لە دەمی مانەوەی مامۆستادا لە "قەستەمۆنی" بەردەوام لە خزمەتیدا بوون. ئەوەتا دەڵێن:

(ئێمە قەناعەتی خۆمان بۆ هەموو ئەو کەسانە تۆمار دەکەین کە دەیانەوێ بە کەسایەتیی مەعنەویی مامۆستاکەمان ئاشنا بین.

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی لەبەر ئەوەی بەهرەمەندی درەوشانەوەکانی هەردوو ناوی جوانی "النور" و "الحكيم"ی خوای گەورە بووە، ئەوا لە گەنجینەی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزەوە گەلێ ڕاستی و زانستی مەزنی بەدەست هێناوە و، وەك شوکرانە و ڕاگەیاندنی نیعمەتی خوای گەورەش ئەو ڕاستییانەی قورئانی خستووەتە پێش چاوی گرۆی ئادەمیزاد.

مامۆستا سەرجەم بەربەستەکانی دەروون و هەوا و ئارەزووی تێپەڕاند و، ڕەوشتە محەممەدییەکانی کرد بە ئاکاری خۆی، تەنانەت لەم سەردەمەدا بوو بە نموونەیەکی کەم وێنە و بەرجەستەی ئاکارە بەرزەکان. ئیتر ژیانی خۆی لەگەڵ هیممەتێکی بڵند و متمانەیەکی دامەزراودا، بە خاوێنییەکی تەواوەتی بردەسەر. هاوکات لەگەڵ خۆ لەبیربردنەوەیەکی ڕاستەقینەی ئەوتۆدا کە ژیرییەکان لێی سەرسامن..

هەموو ئەمانە، بەهۆی ئەو دڵپاکی و تەوەککول و قەناعەتە تەواوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، ئەوەبوو ئەوپەڕی سادەییمان لە گوزەران و پۆشاك و هەموو بارودۆخێکی ئەودا دەبینی، تەنانەت هێندەی گەردیلەیەکیش حەز و خۆشەویستیی دنیای لەگەڵ خۆدا هەڵنەگرتبوو.

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٥. (وەرگێڕ)

تابلێی بە تەواوی "عیززەتی زانست"ی دەپاراست و، هەژاریی خۆی لە پێش چاوی کەسێکی جگە لە خوای گەورەدا دەرنەدەخست. ئەوەش مەزنترین دەستووری ژیانی بووە، هەرچەند دنیا ڕووی لەو بوو کەچی ئەو پشتی تێ کردبوو. ئێمە لەو دڵنیاییەداین کە ئەم پارێزگاری و پابەندبوونەی بە دەستپاکی و خاوێنییەوە، یەکێکە لە چاودێرییەکانی خوای گەورە سەبارەت بەو، چونکە صەدەقە و زەکاتی وەرنەدەگرت، تەنانەت هەر بۆ خۆی کرێی خانووەکەشی دەدا.

پاشان مامۆستا لەڕادەبەدەر بێزی دەهاتەوە لە خۆنواندن و ڕیا و خۆ بە گەورە گرتن. داوای لە قوتابیانیشی دەکرد کە لە خۆنواندن دوور بکەونەوە و، پێی دەوتن:

"خۆنواندن لە ڕووی شەرع و حیکمەتەوە نەهیی لێ کراوە، چونکە مرۆڤ بەرەو بەزاندنی سنووری ڕێ پێدراو دەداتەبەر. ئەوانەش کە خۆیان دەنوێنن، لە شانازی و ڕیاکاریی قەبە و قورس ڕزگاریان نابێت، خۆ هەموو ئەوانەش ئیخلاس دەشێوێنن".

پاشان مامۆستا لەوپەڕی خۆنەویستیدا بوو، زۆر بە توندی لە هۆکارەکانی (زاڵبوون بەسەر خەڵکدا و خۆ جیاکردنەوە لێیان) دوورەپەرێزیی دەکرد. بە باشی مامەڵە و بەرخوردی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکرد، بە تایبەت پیران و منداڵان و هەژاران، هەروەك بە نەرم و نیانی و خۆشەویستیی برایانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن. ئیتر خۆشەویستی و ڕووخۆشیی ئاوێتە لەگەڵ نووری ویقاردا هەردەم بە ڕوخسارە گەشاوەکەیەوە دەبریسکایەوە و، جگە لە نیشانەکانی هاوڕازی و سام و شکۆ شتی ترمان لێ نەدەبینی. بەڵێ، هەمیشە خەندەی لەسەر لێو بوو، هەندێ جاریش هەیبەت و توندیی لێ دەبینرا بە ڕادەیەك کە زمانمان لە بەردەمیدا گۆی نەدەکرد و هیچمان پێ نەدەوترا.

گوفتارەکانیشی کەم و پوخت بوون.. هەرگیز زەمی کەسمان لێ نەبیستووە.. ڕێی نەدەدا کەسێك لە لای ئەودا غەیبەت بکات، بەڵکو هەڵەکانی خەڵکی دەپۆشی و، هەمیشە گومانی باشی بە کەسانی تر دەبرد، تاکو بوار بە کەس نەدات قسەی خراپی بۆ بگێڕێتەوە. وەك ئەوەی ئەگەر کەسێك بیوتایە: "فڵانە کەس دەربارەی تۆ ئاوا و ئاوای دەوت" مامۆستا بەرپەرچی دەدایەوە و دەیوت:

"نەخێر ئەمە ڕاست نییە، فڵانە کەس هەرگیز شتی وا نالێت".

ئیتر ئەو کەسە بێدەنگ دەبوو!

مامۆستا پێگەیەکی دامەزراوی هەبوو لە موجاهەدەی دەروون و لێپرسینەوەیدا. هەرگیز حەز و خواستەکانی دەروونی خۆی نەهێناوەتەدی، تەنانەت لە ژەمی خواردندا هێندەی دەخوارد کە پێی بژی و، زۆر بە کەمی دەنوست و، شەوگاری بە خواپەرستی‌یەکی ملکەچانەی وا دەبردەسەر کە سەرنجەکانی ڕادەکێشا. ئەمەش ڕەفتاری بوو چەندەش وەرزەکان گۆڕانیان بەسەردا بهاتایە..

هەرگیز نەبینراوە کە دەستی لە شەونوێژ و ویردەکان و موناجاتەکانی هەڵگرتبێت، تەنانەت لە کاتەکانی نەخۆش بوونیشیدا. بگرە ئەو کاتەش کە لەبەر سەختیی نەخۆشی‌یەکەی شەش ڕۆژی ڕەمەزان نەیتوانی بەربانگ بکاتەوە، هێشتا هەر وازی لە خواپەرستی و شەونوێژ نەهێنا، بە ڕادەیەك کە دراوسێکانی سەریان لە خواپەرستی و ملکەچی و لاڵانەوەی شەوانەی مامۆستا لە زستان و هاویندا سووڕمابوو، بۆیە گوێ بیستی موناجاتەکانی دەبوون کە لە دڵێکی زامدارەوە هەڵدەقوڵا.

مامۆستامان زۆر بە توندی چاودێریی پاکوخاوێنیی دەکرد بەو جۆرەی کە شەرع داوای کردووە و، بەردەوام دەستی بە دەستنوێژەوە بوو. هەروەك چاودێریی کاتی دەکرد، چونکە هەرگیز کاتی بە خۆڕایی نەدەبردەسەر، ئەوەبوو یان پەیامەکانی نووری دادەنا، یان هەڵەگیری و ڕاستکردنەوەی لە دەستنووسی پەیامەکاندا دەکرد، یاخود زیکر و ویردەکانی دەخوێند، یان نوقمی پەرستنی فیکری و تێڕامان دەبوو لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوای گەورەدا..

ئەمە کار و پیشەی بوو چ لە ماڵ و چ لە سەفەر و دەرەوەدا، چونکە ڕۆژگارانی هاوین لەگەڵ ئەودا دەڕۆشتینە دەرەوە بۆ دارستانە دوورەکە و، لە ڕێگادا هەڵەگیریی لە دەستنووسی پەیامەکاندا دەکرد، یان گوێی لە خوێندنەوەی پەیامەکان دەگرت کە بۆمان دەخوێندەوە، یاخود وانەی یەکێك لە کتێبە دانراوە پێشینەکانی خۆی پێ دەوتینەوە.. بەم جۆرە هتد..

هەرکات لەگەڵ مامۆستادا بووینایە هەستمان بە ماندووبوون و بێزاری نەدەکرد، تەنانەت گەر وانەکان لە بەیانیەوە هەتا ئێوارەشی بخایاندایە و بە پێ بڕۆشتینایە.

مامۆستا دەیوت:

"ماوەی بیست ساڵە جگە لە قورئانی پیرۆز و پەیامەکانی نوور هیچ کتێبێکم لە لای خۆم گل نەداوەتەوە و نەمخوێندووەتەوە".

لەبەر ئەوە، کارکردنی بۆ پەیامەکانی نوور، کە تەفسیری قورئانن، لە هەموو شتێکی دیکە پێ باشتر بوو. ئایا کەسێك خوای گەورە پیت و بەرەکەتی لە قورئانە پیرۆزەکەیەوە بە سەر دڵدا ڕشتبێت چ پێویستی‌یەکی بە غەیری قورئانە؟

بەڵێ، لە دەمی دانانی پەیامەکانی نووردا خوای گەورە توانایەکی ڕەوانبێژی‌یانەی سەرسووڕهێن و توانستێکی ناوازەی گوفتاری بە مامۆستامان بەخشیبوو کە زۆر کەس بۆیان نارەخسێت. چونکە ئەو پەیامانە لە چەندین بارودۆخی غەریبی و نەخۆشی و، لە ژێر چاودێری و تەنگانە و، لە هەلومەرجی ئەوتۆدا دانراون کە لە توانای کەسدا نی‌یە، بەڵام بە یارمەتی و پشتگیریی خوای گەورە و، بۆ بە هاناوە چوونی ئیمانداران و، سەرباری ئەو هەموو کێشە و گرفتانە، پەیامەکان لەناو دۆڵ و چیا و دەشت و دەر و باخەکاندا، دوور لە چاوی چاودێران و هەندێ جاریش بێ ئەوەی نووسەرەوەیەکی یارمەتیدەری لە لا بێت، دانراون.

بەم جۆرە، چاودێریی خوایی بە شێوەیەکی نائاسایی لە دەمی دانانی پەیامەکاندا دەوراندەوری مامۆستامانی دابوو.

سوپاس و ستایش هەر تەنها بۆ خوای گەورەیە کە بوونەوەرانی لە بەردەم مامۆستادا بە وێنەی کتێبێکی ڕوون و ئاشکرا یەکالا کرد و، بە کەشف و شهوود تا پلەی "حق الیقین" توانای خوێندنەوەی ئەو کتێبەی پێ بەخشی.

کەواتە ئەم بەرهەمانە تەنها و تەنها ئەنجامی پشتگیری و یارمەتی‌یەکی پەروەردگارە، چونکە ڕاستی و زانستەکانی قورئانی پیرۆزی، بە ئایەتە تەشریعی و گەردوونی‌یەکانەوە، لەو بەرهەمانەدا ڕوون کردووەتەوە.

جا لەو کاتەدا کە پێویست بوو ئەم "سەعید"ە بەختەوەرە لە لایەن هەموانەوە مایەی فەخر و شانازی بوایە، بەهۆی ئەوەی کە بە نووری قورئان ڕێی بەرزبوونەوەی بەرەو بەرزترینی پلەکانی خواناسی بۆ گرۆی مرۆڤ لە ڕێی "پەیامەکانی نوور"ەوە ڕوون کردەوە، کەچی بەدبەختەکان بە پێچەوانەی ئەمە پرکێشی‌یان کرد و، چەندین جار ژەهریان دەرخوارد دا. لەوانەیە ئەوەش یەکێك بێت لە خواستەکانی حیکمەتی خوای

گەورە، چونکە بەڵا و گرفتەکان بەسەر میراتگرانی پێغەمبەران و پیاوچاکاندا دەبارێت، وەك لە فەرموودەی پیرۆزدا سەلماوە:

(أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الصالحون ثم الأمثل فالأمثل)[1].

ڕۆژێکیان لە "قەستەمۆنی" کە مامۆستا بە نیازی دەستنوێژ گرتن لە کانی‌یەکە لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە، منالان بەر بەردیان دا! کەچی مامۆستا ئارامی و خۆڕاگریی دەربڕی و، لە دڵ و دەروونی خۆیدا هیچ شتێکی جگە لە خاوێنی و سەلامەتی بەرامبەر بەو منالانە هەڵنەگرت! ئنجا هەروەك ڕقی لێ هەڵنەگرتن و لێیان تووڕە نەبوو، دوعای خێریشی بۆ کردن و، فەرمووی:

"ئەو منالانە بوون بە هۆی ئەوەی کە یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئایەتێکی مەزنی سوورەتی یاسینم بۆ دەربکەوێت".

پاشان ئەو منالانە، بە فەزڵی خوای گەورە و بە بەرەکەتی دوعاکانی مامۆستا بۆیان، وایان لێ هات کە لە هەر شوێنێکدا مامۆستایان ببینیایە بە ڕاکردنەوە بەرەوپیریی دەڕۆشتن و دەستیان ماچ دەکرد و تکای دوعای خێریان لێ دەکرد!

مامۆستاکەمان هێندە حاڵەتی نائاسایی و لەعادەت بەدەری هەیە کە لە ژمارە نایەن، لە پێشەکیی ئەوانەدا دانانی "پەیامەکانی نوور"ە.

بەڵێ، ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە مامۆستامان لە خۆمان زیاتر و وردتر ختوورەکانی دڵی ئێمەی دەخوێندەوە. زۆر جار بۆ هەندێ شتی ئەوتۆ بێداری دەکردینەوە و وریایی دەداینێ کە بە خەیاڵماندا نەدەهات، ئێمەش لەوە سەرسام دەبووین. کەچی دوای چەند ڕۆژێك ڕووبەڕووی ئەو شتانە دەبووینەوە کە پێشتر ئاگاداری کردبووینەوە لێیان. ئیتر ئێمەش بێدار دەبووینەوە.

کاتێ لەگەڵ مامۆستادا دەڕۆشتین بۆ چیاکە، هەندێ جار دەمانبینی پێش ئەوەی کاتی گەڕانەوە بێت بەرەو ماڵەوە، کتوپڕ هەڵدەستا و فەرمانی بە ئێمەش دەدا کە هەڵبسین و بگەڕێینەوە. کە هۆکاری ئەو گەڕانەوە پێش وەختەمان لێ دەپرسی، دەیوت:

---

(١) صحيح، رواه الترمذي وابن ماجه وأحمد، وابن حبان والحاكم. (وەرگێڕ، لە چاپە تازە عەرەبی‌یەکەوە)

"با بە خێرایی بگەڕێینەوە بۆ ناوشار، لەوێ بۆ خزمەتی پەیامەکانی نوور چاوەڕوانمانن".

کاتێ کە دەگەڕاینەوە، دەمانبینی هەر لە ڕاستیدا یەکێك لە قوتابیانی نوور بۆ کارێکی گرنگ چاوەڕێمان دەکات.. یان دراوسێکان هەواڵیان پێ دەداین کە کەسێك پرسیاری لەبارەی ئێوە دەکرد و چەند جارێك سەردانی ماڵەکەی کردن، پاشان ڕۆشت بە ڕێی خۆیەوە!

ڕۆژێکیان خوشکی بەڕێز "ئاسیا خانم" کە لە نەوەی "عاشقە بچکۆلە"یە، کە ئەویش یەکێکە لە قوتابیانی مەولانا خالید (قدس سره) جوببەیەکی مەولانا خالیدی هێنا کە ساڵانێکی زۆر بوو پارێزگاریی لێ کردبوو، جوببەکەی دا بە "فەیزی". کەچی بینیمان مامۆستا فەرمانی دا بە "ئەمین" کە جوببەکەی بۆ بشوات و، ئنجا سوپاس و ستایشی خوای کرد لەسەر جوببەکە! "فەیزی"یش سەری لەوە سووڕما و، ئەوەی بە دڵدا هات کە ئەم خوشکە جوببەکەی بۆ ماوەی بیست ڕۆژ بە من دا، ئیتر بۆچی مامۆستا هەڵی دەگرێت بۆ خۆی؟

"فەیزی" دوای ماوەیەك "ئاسیا خانم" دەبینێت، ئەویش بە فەیزی دەڵێت:

کە جوببەکەم هێنا، بۆیە بەو جۆرە لەگەڵ تۆ دوام تاکو مامۆستا - گیانمان بە قوربانی بێت - قبووڵی بکات و جوببەکە هی ئەوە، چونکە دەزانم ئەگەر ڕاستەوخۆ بۆم بهێنایە دیاریی وەرنەدەگرت!

بەڵێ، وەرگرتنی ئەو جوببەیە لە لایەن مامۆستامانەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەرکی نوێکردنەوەی ئایین لە دوای مەولانا خالید گوێزراوەتەوە بۆ مامۆستامان. ئەوەتا لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە:

(خوای گەورە سەری هەموو سەد ساڵێك کەسێك دەنێرێت کە کاروباری ئایین بۆ ئەم نەتەوەیە نوێ بکاتەوە).

دەبینین بەرواری لەدایکبوونی مەولانا خالید ساڵی "١١٩٣"ی کۆچییە و، بەرواری لەدایکبوونی مامۆستاشمان "١٢٩٣"ی کۆچییە!

مامۆستا زۆر جار گاڵتەی لەگەڵ ئێمەدا دەکرد و، دەیوت:

"لەمەولا سزا دەدرێن.. دەڕۆنە بەندیخانە".

هەر لە ڕاستیدا ماوەیەکی زۆری پێ نەدەچوو قسەکانی دەهاتنەدی.

لە پێش بەندیخانەی "دەنیزلی"شدا هەمان شت ڕووی دا، چونکە مامۆستا وتی:

"ماوەیەکە لە هەشت ساڵ زیاتر لە هیچ شوێنێك نەماومەتەوە، وا هەشت ساڵ تێپەڕی بەسەر هاتنمدا بۆ ئێرە، جا یان ئەوەیە ئەمساڵ دەمرم، یاخود دەگوێزرێمەوە بۆ شوێنێکی تر".

بەمەش هەواڵی بەجێهێشتنی "قەستەمۆنی"ی ڕاگەیاند.

ڕۆژێکیان وتی:

"زۆر زۆر وریابن! چونکە هەست دەکەم لە چەند لایەکەوە هێرشی سەخت دەکرێتە سەر پەیامەکانی نوور".

لە ڕاستیدا زۆری پێ نەچوو ڕووداوی ئیعتیرازی مەلا زاناکەی ئەستەمبووڵ لەسەر مەسەلەیەکی یەکێك لە پەیامەکانی نوور ڕووی دا و، بەڕێز "عەلی ڕەزا"ش، خوا لێی خۆش بێت - کە ئەمینداری فەتوا بوو - بەرپەرچی دایەوە و، پشتی حەقتربوونی پەیامەکانی نووری گرت.

مامۆستامان دەیوت:

(با ئەهلی دنیا خۆیان بپارێزن لە هێرش کردنە سەر پەیامەکانی نوور، چونکە بەو کارەیان دەبنە هۆی دابارینی بەڵا و موسیبەتەکان، لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور سەدەقەیەکە لە جۆری "وشەی خاوێن". خۆ سەدەقەش بەڵا دەباتە دواوە).

پێش ڕوودانی بەندیخانەی دەنیزلی، پێی وتین:

(پلانێکی سامناك لە دژی پەیامەکانی نوور داڕێژراوە، بەڵام مژدە بێت چاودێریی خوای گەورە پشتمان دەگرێت، چونکە ئەمڕۆ کاتێ "الحزب الأعظم"ی ویردە قورئانییەکانم کردەوە، ڕووبەڕووی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوومەوە:

﴿واصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنا﴾ (الطور: ٤٨).

ئەم ئایەتە لە ناوەڕۆکدا پێی وتم: ورد بەرەوە لە من، منیش لێی ورد بوومەوە و، بینیم کە بە یەکێك لە واتا ئاماژەییەکانی ئاماژە بۆ موسیبەتی بەندیخانە و، پاشان بۆ ڕزگاربوون دەکات لێی).

ئەمەش نۆ مانگ پێش بڕیاری بێ تاوانیمان بوو لە بەندیخانەی دەنیزلی. ئیتر بەوە گەوهەرێکی گەنجینەکانی ئەم ئایەتە مەزنە و سەرنجێکی ئیعجازی ئایەتەکەی پیشاندایین و، مژدەی بە ئێمەی لاواز دا و دڵخۆشی کردین.

بە پوختی:

چەندەش ئێمەی لاواز لە بارەی مامۆستاوە بڵێین و بنووسین، هێشتا هەر خوای گەورە گەلێ سیفەتی تایبەتیی بە مامۆستا بەخشیوە لە بانگەوازەکەیدا.

دەسا بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی لە خزمەتی پەیامەکانی نووردایە، کە تەفسیرێکی بەنرخی قورئانی پیرۆزن.. خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەش کە وانەکانی لەو پەیامانە وەردەگرێت.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە لەگەڵ مامۆستامان بەدیعوززەمانی گەنجینەی زانستەکان و گەورە زانای سەردەمدا حەشرمان بکات، کە بە درێژایی مانەوەی لە شارەکەماندا "قەستەمۆنی" ڕاستییەکانی ئیمان و قورئانی بڵاو دەکردەوە و، هەموو توانایەکی خۆی خستەکار تاکو ئێمە بەختەوەری بەدەست بهێنین. هەروەك لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە لە ڕۆژی حەشری مەزنیشدا لەگەڵ ئەودا بین و بە دەستە میهرەبانە ڕوونـاك و پاکەکەی دەستمان بگرێت و بە پشتیوانیی خوا بمانباتە خزمەت ڕەسوولی ئەکرەم ﷺ[1].

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

دەستەوسان

مستەفا صونگور

خزمەتکاری

خزمەتکاری قورئان

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی

---

(١) لێرەدا دەقی نووسینەکانی هەردوو بەڕێز "محەممەد فەیزی" و "ئەمین چایچی" تەواو بوو. (وەرگێڕ)

## ئەم ژیاننامەیە

بە پێنووسی مامۆستا:
**ئیحسان قاسم صالّحی**

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين
محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

لەوانەیە خوێنەری بەڕێز لەگەڵ مندا هاوهەست و ڕابێت کە نووسینی "مێژووی ژیان" بە تایبەت "ژیاننامەی خۆیی" یەکێکە لەو نووسینە دژوارانەی کە زۆرێك لە نووسەران خۆیانی لێ دەبوێرن، لەبەر ئەوەی بابەتی لەم جۆرە کۆمەڵێك پابەندبوون و شێواز و خواستی تایبەت بە خۆی هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ نووسەر و توێژەر، بە چەند شێوازێکی جۆراوجۆر، ژیانی پڕ لە ڕووداوی "مامۆستا نوورسی"یان تاوتوێ کردووە. هەندێك لەوانە تەنها پابەندی گێڕانەوەی مێژوویی ڕووداوەکان بوون و، هەندێکی تریان ڕێبازی نووسینی ڕۆمانیان گرتووەتەبەر و، هەندێکی دیکەش شێوازی زانستی و ئەکادیمیان بۆ نووسینەکەیان هەڵبژاردووە.. هتد.

یەکەم کەس کە مێژووی ژیانی مامۆستا نوورسیی نووسیبێت (عەبدوڕڕەحمان)ی برازا و قوتابیی دڵسۆزیەتی، ئەوەش لە نامیلکەیەکدا کە ساڵی (١٩١٩ز) بڵاوی کردووەتەوە[1].

---

(١) لە پێش (عەبدوڕڕەحمان)دا، بەڕێز (حەمزە موکسی)ی قوتابیی مامۆستا نوورسی لە ساڵی (١٩١٨ز) لە نامیلکەیەکدا پوختەیەکی ژیانی مامۆستا نوورسیی نووسیوە. کە ئێمە لە کۆتایی بەرگی شەشەمی سەرجەمی پەیامەکانی نوور (داوەرییەکان)دا بڵاومان کردەوە. (وەرگێڕ)

لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجادا (واتە هی سەدەی بیستەم) قوتابیانی نووری زانکۆ بە ئامێری لەبەرگرتنەوەی "ڕۆنیۆ" و بە پیتە عەرەبی‌یەکان کتێبێکیان (لە ژیانی مامۆستادا) بڵاوکردەوە بە ناونیشانی:

"لە تورکیاوە خۆر بەسەر جیهانی زانست و عیرفاندا هەڵدێت".

دوای ئەوە "ئەشرەف ئەدیب"ی نووسەر و ئەدیبی بەناوبانگی تورك زنجیرە وتارێکی لە بارەی ژیانی مامۆستاوە لە گۆڤارەکەی خۆیدا "سبیل الرشاد" بڵاوکردەوە.

پاشان ئەو قوتابیانەی مامۆستا نوورسی کە وانەیان لە لا خوێند و، بە وێنەی سێبەر لە بەندیخانە و دوورخستنەوەکانیدا لێی جیا نەبوونەوە، مێژوویەکیان بۆ ژیانی مامۆستاکەیان نووسی کە هێشتا لە ناویاندا دەژیا. ئنجا نووسینەکەیان خستە بەردەستی مامۆستا نوورسی و، ئەویش دوای لابردنی هەرشتێك مەدح و پیاهەڵدانی خۆی بووبێت، کارەکەی ئەوانی پەسەند کرد و، پاش ئەو پوختەکاری‌یانە ساڵی (١٩٥٨ز) لە ژێر ناونیشانی (تاریخچەی حەیات) واتە (ژیاننامە)دا بڵاویان کردەوە.

دوای ئەوە، چەند توێژەرێك لەم بوارەدا پەیدا بوون کە بە زمانی تورکی باس و توێژینەوەکانیان نووسی، ئەم توێژینەوانەش بوون بە چەند سەرچاوەیەکی ئەوتۆ کە لە دەمی نووسینی ژیانی نوورسیدا پشتگوێ ناخرێن و نووسەر ناتوانێت لێیان بێ نیاز بێت.

لە نێوان ئەوانەشدا بە تایبەت هەردوو برای بەڕێز "عەبدولقادر بادللی" و "نەجمەدین شاهێنەر" کە یەکەمیان لە سێ بەرگدا کتێبێکی نووسی بە ناوی:

(بدیع الزمان سعید نورسی مفصل تارخچەء حیات). واتە "ژیان نامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بە دووروودرێژی"..

ئەوی دیکەشیان دوو کتێب بە ناوی: (بیلینمەیەن طرفلریلە بدیع الزمان سعید نورسی) واتە "چەند لایەنێکی نەزانراوی بەدیعوززەمان" و، (صۆن شاهدلر) واتە "دواهەمین شایەتەکان" لە چوار بەرگدا[1].

(١) ئەمەی دوایی لە دەرەنجامدا بە زمانی تورکی بوو بە شەش بەرگ، کە بە زمانی عەرەبی هەڵبژاردەیەکی چوار بەرگیی لێ بڵاوکرایەوە. بە پشتیوانیی خوای گەورە بە کوردیش بڵاودەکرێتەوە. (وەرگێڕ)

هەریەك لـەو دوو بـەڕێزەش بەڵگەنامـەی مێژوویـی و ڕەسمـی و زانستـییان لـەناو کتێبـەکانیاندا پێشـکەش کـرد، دوای ئـەوەی کـە ئـەرکی چـەندین سـەفەر و گـەڕانی مـەیدانیی دوور و درێژیـان گرتـە ئەستۆ لـە پێنـاوی بەدەسـتهێنانی زانیاریـیـەکاندا لـە سەرچاوە ڕەسەنەکانەوە.

بەڵام سەبارەت بە خۆم، ئەوا لە دەمی کاری وەرگێڕانمدا بۆ "سـەرجەمی پەیامـەکانی نوور" (واتە بۆ زمانی عەرەبی) تێبینیم کرد، بەڵکو بەوپـەڕی بێگومـانی هەستم کـرد کـە خودی مامۆستا نوورسی زۆربەی ئەو ڕووداوانەی هاتوونەتە ڕێی ژیانی، بگرە ختوورە و ڕەنج و تەقالا دەروونی و ڕۆحیـیەکانی و، تەنانـەت ڕا و تێڕوانین و شیکردنەوەکانیشی بۆ ڕووداوەکان، لە پەیامەکانی نووردا تۆمار کردووە..

مامۆستا هەموو ئەمانەی لە سەرجەمی پەیامەکاندا بە پەرش و بڵاوی داناوە و ئاوێتەی بڕگە و دەستەواژەکانی ئـەو پەیامانـەی کـردووە و، وەکـو چـەند هۆکـارێك لـە خزمـەتی ئیمـان و هێنانـەدی و جێگیرکردنی لـە دڵ و ژیریـیەکاندا بـە کـاری هێنـاوە. ئیـتر ئـەو یاداشتانە تەنها بە چەند یاداشتێکی سەرپێیی و مێژوویی نەماونەتەوە، بەڵکو بوونەتە چەند ڕووداوێکـی ئاوێتـە و هاوئاهـەنگ لەگـەڵ ژیـان و ئیمـاندا و، چـەند هۆکـار و بەڵگـە و ئاماژەیەکیشن بۆ باس و بابەتەکانی ئیمان.

لێرەوە پێم باش بوو کە لە نووسینی ئەم مێژووی ژیانەی مامۆستادا ڕێبازێکی جیـاواز بگرمەبەر، ئەویش دەرهێنان و کۆکردنەوەی ئەو یادگاری و ڕووداوە پـەرش و بڵاوانـەی نێـوان دێڕەکـانی هـەر هەشـت بەرگەکـەی "سـەرجەمی پەیامـەکانی نـوور"ە، پاشـان ڕیزکردن و ڕێکخستنەوەیانە، سەرلەنوێ، بە پێی ڕیزبەندیی مێژووی ڕووداوەکان.

هۆکاری بنەڕەتی بـە لامـەوە بـۆ هـەڵبژاردنی ئـەم جۆرە نووسـینە دژوارە، ئەوەیـە کـە خوێنەری بـەڕێز لـەم مێژووی ژیانـەدا ڕاستەوخۆ گـوێ بیسـت و ڕووبـەڕووی خـودی مامۆسـتا نوورسـی بێـت، بێ ئـەوەی خـۆم بخەمـە نێوانیانـەوە، تـاکو هیـچ دەسـتێکم لـە هەست و نەسـتی خوێنـەردا نـەبێت. چونکـە نووسـەر چـەندەش هـەوڵی دەستبەرداری و بابەتی بـوون بـدات لـە نووسینەکەیدا هێشتا بـە چـەند وشـەیەکی ستایش و پیاهـەڵدان هەندێ ڕێز و سەرسووڕمانی خۆی بۆ کەسی لەسەر نووسراو دەردەخات.

ئەمە لە لايەكەوە.. لە لايەكی ديكەوە هيچ سەرچاوەيەك - چەندەش ڕاست و دروست بێت - ناگاتە ڕادەی ڕاست و دروستيی ئەوەی كە مامۆستا نوورسی لە بارەی خۆيەوە تۆماری كردووە.

جگە لەوەش، پێم خۆش بوو زۆرترينی ئەو بڕەی كە لە توانادايە لە باس و، يادگاری و، ڕووداوەكان و، بەڵگەنامە ڕاست و دروستەكان، بە زمانی عەرەبی بخەمە بەردەستی خوێنەری بەڕێز. لە هەمان كاتيشدا ئەركی گەڕان و توێژينەوە لەسەر شانی ئەو توێژەرانە هەڵبگرم كە ئارەزوومەندی نووسينی ژيانی مامۆستا نوورسين.

لەبەر ئەوە، دەقی كتێبەكەم لە گوفتاری خودی مامۆستا نوورسی‌يەوە هێناوە (لە سەرجەمی پەيامەكانی نوور)، هاوكات لەگەڵ چەندين بڕگەی كتێبی "تاريخچەی حەيات"دا كە مامۆستا بۆ خۆی ڕەزامەنديی لەسەر نواندووە.

ئنجا هەموو ئەوانەم بە پێی زنجيرەی مێژووی ڕووداوەكان ڕێكخستەوە. هەروەك ئەو شتانەم لە سەرچاوە توركی‌يەكانەوە وەرگرت كە پشتی دەقی كتێبەكە بگرێت و لە پەراوێزدا دامنان. تەنانەت لە هەندێ شوێندا ئەوانەشم بۆ زياد كرد كە ڕاستەوخۆ لەو قوتابيانەی مامۆستا نوورسيم بيستووە كە لە ژياندان، وەك "مستەفا صونگور" و "بايرام يوكسەل"[1] و "محەممەد فرنجی"[2] و كەسانی تر، هەروەها ئەوەش كە توێژەران لەو كەسانەيان بيستبوو مامۆستا نوورسيان بينيوە..

ئيتر لەنێو ئەم يادگاری و بينينانەدا ئەوانەيانم هەڵبژارد كە لە لايەن چەندين شايەتی زۆرەوە پشتڕاست كراوەتەوە، ياخود بە تەواتور يەكيان گرتووە لەسەری.

شاراوە نی‌يە كە ئەم شێوازەی باسمان كرد، لايەنی باش و خراپی خۆی هەيە..

---

(١) بايرام يوكسەل" سالی (١٩٣١ز) لە دايك بووە. لە تەمەنی شازدە ساليدا بە پەيامەكانی نوور ئاشنا بووە. ئيتر پاشماوەی تەمەنی خۆی، تەنانەت لە بەنديخانەشدا، وەك قوتابی‌يەكی دڵسۆز لە خزمەتی مامۆستا نوورسيدا بەسەربردووە. ئەم ياداشتانەشی دوو مانگ پێش وەفاتی لە (١٩٩٧ز)دا بە كارساتێكی ئازاربەخش و لە ڕووداوی ئوتۆمبێلدا، بۆ مامۆستا ئيحسان قاسم گێڕاوەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) محەممەد نووری فرنجی. سالی (١٩٢٩ز) لە قەزای "ئەينە گول"ی سەر بە پارێزگای "بوورسە"ی خۆرئاوای توركيا لەدايك بووە. لە سەرەتای ساڵەكانی پەنجای سەدەی زايينيی پێشوو بە پەيامەكانی نوور ئاشنا بووە. قوتابی‌يەكی وريا و چالاكی‌مامۆستا نوورسی‌يە. لەو كاتەوە هەتا ئێستا ئەركی بڵاوكردنەوەی "پەيامەكانی نوور" ڕادەپەڕێنێت. مرۆڤێكی ڕۆح سووك و خۆش مەشرەب و خاكی‌يە. (وەرگێڕ)

یەکێك لە لایەنە باشەکانی ئەوەیە کە ڕاستترین و پاکترینی مێژووی ژیانی مامۆستا نوورسی پێشکەش بە خوێنەر دەکات، بێ ئەوەی خۆمان لە ڕادەربڕین و لێکدانەوەی هیچ دەستەواژەیەکدا تێهەڵکێش بکەین، تاکو باسەکە گوزارشت بێت لە خودی مامۆستا نوورسی، نەك لەو خۆشەویستی و ڕێز و سەرسووڕمانەی کە مامۆستا شایانیەتی و لە دڵماندایە..

کەواتە لەم کتێبەدا جگە لە ڕیزبەندی و ڕێکخستن، جێدەستێکی دیکەی منی تێدا نییە. بۆیە هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە هەتا کۆتایی، خوێنەری بەڕێز لە بیرکردنەوەیدا ئازادە و، دوورە لە هەست و نەستەکانی نووسەر. جگە لەوەی کە ئەندازەیەکی زۆری لە زانیاری و یادگارییەکان لە بەردەستدان.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناتەواوییەك لەم شێوازەدا هەیە کە خوێنەر هەستی پێ دەکات و، لەوەدایە کە برگەکانی گوفتاری خودی مامۆستا نوورسی، کە لە پەیامەکانی نوورەوە وەرگیراون و، ئەوانەش کە لەو ژیاننامەیەوە هێنراون ڕەزامەندیی لەسەر نواندووە، لە دوو جۆرە داڕشتنی جیاوازدا بەدی دەکرێن؛ دەبینیت جارێك لەسەر زمانی "کەسی یەکەم" و جارێکی تر لە شێوازی قسەی "کەسی سێهەم"دا داڕێژراون..

بۆیە ناچار بووم کە چەند ناونیشانێکی بچووك، یاخود چەند کورتە ڕستەیەك، لەوانەشە تەنها یەك وشە، لە ناوەندی ئەم دوو کەوانە گۆشەدارەدا [ ] بخەمە نێوان برگەکان، تاکو ئەڵقەکانی زنجیرە بیری خوێنەری بەڕێز لە یەکتر دانەبڕێن.

لەوانەشە ئەم کارەمان، کە بۆ پڕکردنەوەی کەلێن و ناتەواوییەکانە، هۆکارێك بێت هانی خوێنەر بدات بۆ بەکارهێنانی زەین و، خوێندنەوەی نێوان دێڕەکان و، شیکردنەوە و، پەیوەستکردن، بەوەش لە خوێندنەوەی سەرپێیی دەربازی ببێت. ئیتر لەو کاتە شێوازی نووسینەکە دەبێتە یەکێك لە لایەنە باشەکانی ئەم کتێبە، نەك خراپەکانی.

بێ گومان ئەم ژیاننامەیە، بەم شێوازە، ئێمەی بەرەو قسەکردن لەسەر وتارەکانی مامۆستا نوورسی و، کتێبەکانی و، پەیامەکانی و، بەرگرییەکانی لە دادگاکاندا و، شتی تری جگە لەمانەش، دایەبەر.

لەبەر ئەوە، بۆ هەریەك لەوانە لە دەقە ئەسڵییەکانەوە، نموونەیەك یاخود چەند برگەیەکم هێناوە و، لە پەراوێزدا شوێنی هەریەکەیانم لە سەرجەمی پەیامەکاندا دەست

نیشان کـردووە، تـاکو خوێنـەری بـەڕێز تامـەزرۆی سـەردانی تـەواوی دەقەکە ببێـت لـە شـوێنی خۆیـدا، لـە هـەمان کاتیشـدا بـە هێنـانی دەقـە دوور و درێژەکـان لـە هاوڕێیــەتیی مامۆستا نوورسی بێ بەشی نەکەین.

هـەروەها بـە مەبەسـتی ئاسـانکاری، لـە پێشـەکیی هـەندێ بەشـی کتێبەکـەدا سەرەتایەکمان داناوە کە ڕووداوەکانی پێشووی تێدا پوخت دەکەینەوە، تاکو یارمەتیی خوێنەر بدات لە پەیوەست کردن و یادخستنەوەی زنجیرەی ڕووداوەکان.

یەکێك لەو گرفتانەی کە لە دەمی نووسینی ئەم کتێبەدا دەبووە لەمپەر لەسەر ڕێمـدا، مێژووی ڕووداوەکان بوو..

چونکە جارێك ئەو مێژووە بە پێی تەقویمی "ڕۆمی" بوو، کە بـە شـێوەیەکی ڕەسمی لـە کۆتـایی دەوڵـەتی عوسمـانیدا کـاری پێ دەکرا، جـارێکی تر بـە مێـژووی "کۆچـی" و، جارێکی دیکەش بە مێژووی "زایینی". بۆیە ناچار بووم سەرجەم ئەو بەروارانـەی کـە لـە سەرچاوەکاندا هاتوون بیانخەمەوە سەر تەقویمی زایینی و کۆچی. کە ئەمەش بوو بە هۆی پەیدابوونی هەندێ جیاوازی لە مانگەکاندا، نەك ساڵەکان.

ئنجا چەند برایەکی ئازیزم لەگەڵ خۆمدا هاوبەش کرد بۆ وەرگێڕانی هەندێ بابەت. زۆرێکیشـم لـە کتێبـی "ذکریـات عـن سـعید النورسـي" وەرگـرت کـە لـە وەرگـێڕانی "ئوسەید"ی کوڕی خۆشەویستمە.

هەروەك سوودم لە نەخشەکانی کتێبی: (The Author of the Risale-i Nur) Bediuzzaman Said Nursi) وەرگرت لـە نووسـینی خوشـکی بـەڕێز (شـوکران واحیـدە) کـە وەرگـێڕی "سـەرجەمی پەیامـەکانی نـوور"ە بـۆ زمـانی ئینگلـیزی. خـوای گەورە هەموویان بپارێزێ و پاداشتی زۆریان بداتەوە.

دوای لێبوونەوەم لە کارەکەم، برای بـەڕێز "فـارووق ڕەسـووڵ یـەحیا"م لـە تەنیشـتی خۆمەوە بینی، کە مامۆستای ئەدەبی عەرەبی و وەرگێڕی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"ە بۆ زمانی کوردی، ئیتر بە تێبینییە بەنرخەکانی و ڕاستکردنەوە وردەکانی، یارمەتیی دام. خوای گەورە لە بری ئێمە پاداشتی چاکەی بداتەوە.

ئومێدەوارم ئەم کارە بە قبووڵ بوونی لای خوای گەورە بەهرەمـەند ببێـت. هاوکـات لەگەڵ داننانم بە کورتی و ناتەواوییەکانیدا، کە هی دەست کورتیمە لەم مەیدانەدا.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لە داهاتوودا کەسێك بۆ ئەم کارە بنێرێت شایانی بێت و، بەو شێوەیە لێی بدوێت کە برای خۆشەویستم "ئەدیب ئیبراهیم دەباغ" وەسفی کردووە لەو نامەیەیدا کە بۆی ناردم و، تیایدا دەڵێت:

(برای خۆشەویستم!

لە نامەکەتدا باست لەوە کردووە بە نیازیت مێژوویەکی "خۆیی" بۆ ژیانی مامۆستا نوورسی بنووسیت کە لە بەرهەمە فیکری و ئیمانییەکەی خۆی دەرهێنرابێت. ئەوەش بێ گومان کارێکی باشە و تاج دەخاتە سەر کارە گەورەکانت لە دانان و وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەدا. بۆیە لە لایەنی خۆمەوە بە کتێبێکی نایابی وای دەخەمڵێنم کە کاریگەرییەك لە ناوەندی ڕۆشنبیر و بیریاراندا دەهێنێتە کایەوە، یاخود پێویستە بیهێنێتە کایەوە کە مامۆستا نوورسی شایانیەتی و، سەرنجیان بە چوستی بۆ لای ئەم پێشەوا مەزنە و بەرهەمە مەزنە فیکرییەکانی ڕابکێشێت.

برای بەڕێزم!

تکایە بە کەسێکی خۆهەڵقورتێنم دامەنێ کاتێ کە دەڵێم:

بە نازی برایەتیی نێوانمان تکات لێ دەکەم ئەو کتێبە دوور بخەیتەوە لەوەی کتێبێکی ئاسایی و کلاسیکی بێت! چونکە ئەو کەسەی مێژووی ژیانی دەنووسیت هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان لە نووسینەکانی و ئەو بەرهەمانەیدا کە بە جێی هێشتوون، کەسێکی ئاسایی و کلاسیکی نەبووە!

کەواتە برای بەڕێزم! هەرگیز پەلە مەکە و.. لەسەرخۆ بە، لەسەرخۆ!

ئەو کتێبەی کە لە ناخی دڵمەوە ئاواتەخوازم بینووسیت، نابێ کتێبێکی ئەکادیمیی سارد و سڕ بێت و هەر لە لانکەوە سارد و سڕی کۆتایی بە ژیانی بهێنێت!

ڕاستە کە "ڕێڕەوی زانستی" لە نووسیندا پێویستە و، ڕاستییەکانیش خۆیان بەسەر نووسەردا دەسەپێنن. بەڵام دەبێ "ڕاستی" قەڵەمێکی گەرموگوڕی بەتین لێی بدوێت، دەنا قەڵەمی سارد هەرگیز ناتوانێت خوێنەری خۆی ببزوێنێت و بەرەو ئەو "ڕاستی"یە هانی بدات!

جا تۆ – ئازیزەکەم! – بە قەڵەمەکەت لە کەسایەتییەکی هێندە بەگڕوتین دەدوێیت کە کانیاوێکی زیندووی بە گوڕ تەقیوە و، چەندەها بیر و هزری گەرم و بە بڵێسەی لێ

هەڵدەقوڵێت. دەسا قەڵەمەکەت لەم بڵێسە ئیمانی و نوورانی‌یە هەڵبکێشە، تاکو بڵێسە بە هزرەکان بدەن و دڵەکانیش ڕووناك بکەنەوە. لەوانەشە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە تەنیشتی خۆتەوە بم، تاکو لە نووسینی هەندێ بەشیدا بەشداریت بکەم)[1].

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە حەز و ئارەزووی ئەم برا بەڕێزە و هی هەمووشمان بهێنێتەدی و، کەسێك بۆ ئەم کارە ئامادە بکات کە شایانی بێت.. هەروەها یارمەتیمان بدات بۆ نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستی و دروستی لە گوفتار و کرداردا.

وصل اللهم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

ئیحسان قاسم ساڵحی

(١) خوای گەورە لەبەر نیازخاوێنی ئەم برایە، ئاواتە ڕاستەکەی هێنایەدی و، لە کاتی پێویستدا لە تەنیشتمەوە بوو. ئیتر بە خوێندنەوەیەکی ورد کتێبەکەی خوێندەوە و تێبینی‌یە ڕاست و وردەکانی پێشکەش کرد، پێش ئەوەی بەجێمان بهێڵێت و بڕوات بۆ ئەنجامدانی کارەکەی وەك مامۆستای ئەدەبی عەرەبی لە زانکۆی تایبەتیی داغستان.

## تێڕوانینی بەدیعوززەمان

## بۆ مێژووی ژیانی خۆی

## ژیانم "تۆو"ێکە بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان

(بەوپەڕی دڵنیاییەوە بۆم دەرکەوتووە کە زۆربەی ڕووداوەکانی ژیانم بە بێ توانا و هەست و تەگبیری خۆم ڕوودەدەن، چونکە ڕەوتێکی سەیریان پێ گیراوەتەبەر تاکو ئەم هەموو پەیامانە بەرهەم بێنن کە خزمەتی قورئان دەکەن. بەڵکو هەر هەموو ژیانی زانستیم - بە گشتی - وەك چەند پێشەکییەك وان بۆ ئەوەی بە "وتەکان" ئیعجازی قورئان ڕوون بکەمەوە، بە ڕادەیەك کە بەسەرچوونی ئەم حەوت ساڵەی ژیانم بە ئاوارەیی و دوورخرانەوەم لە خەڵکی، بێ هیچ هۆیەك و لە دژی ئارەزووی خۆم و، بەسەرچوونی ژیانم لە گوندێکی دووردا بە پێچەوانەی مەشرەبەکەم و، دوورەپەرێزیم لە زۆر پەیوەندیی کۆمەڵایەتی کە زووتر لەگەڵیاندا ڕاهاتبووم..

هەموو ئەمانە، قەناعەتێکی تەواوی دوور لە گومانیان پێ داوم کە هەموویان بۆ ئەوەن من تەنها بۆ خزمەتگوزاریی قورئان ئامادە بکەن، خزمەتگوزارییەکی بێگەردی وا کە هیچ خڵتەیەکی ئاوێتە نەبێت.

تەنانەت قەناعەتێکی یەکجار تەواوم بەوە هەیە کە هەموو ئەو تەنگانانەی زۆربەی کات دەیانهێننە ڕێم و، ئەو کۆڵی ماندووبوونەی بە ناڕەوا لە ژێریدا دەناڵێنم، هەموویان کاری دەستێکی نادیاری میهرەبانن، بۆ ئەوەی وام لێ بکەن تەنها بۆ ڕازەکانی قورئان بڕوانم و، ئاوڕم بەم لا و ئەو لادا پەرتەوازە نەکەم و، بە هیچ شتێکی ترەوە سەرقاڵ نەبم.

هەرچەند من پێشتر گەلێ حەزم لە خوێندنەوەی کتێب بوو، کەچی وا ئێستا دوورەپەرێزی و توخن نەکەوتنی هەموو کتێبێکی غەیری قورئان بە ڕۆحم بەخشراوە.

لەمەوە تێگەیشتم کە ئەو شتەی وازی لە کتێب خوێندنەوە پێ هێنام - کە دڵدەرەوەی من بوون لەم چەشنە ئاوارەییەدا - تەنها ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان بە تەنیا خۆیان مامۆستا و ڕابەرم بن)[1].

(بەڵێ، تۆوی درەختی سنەوبەر، کە قەبارەکەی بە ئەندازەی دەنکە گەنمێکە، دەبێت بەهۆی پەیدا بوونی درەختێکی گەورەی سنەوبەر. واتە توانستی خوای گەورە ئەو درەختە سەرسوورهێنەرە لەو تۆوە بەدی دەهێنێت..

لەوانەشە ئەو تۆوە جگە لە ڕێژەی یەك لە ملیۆن هیچ بەشێکی تری لەو بەدیهێنانەدا نەبێت، چونکە قەڵەمی توانستی خوایی پێرستێکی مەعنەویی ئەو درەختەی لەو تۆوەدا تۆمار کردووە.

جا ئەگەر ئەم کارە هی توانستی خوای گەورە نەبێت، ئەوا دەبێ پڕ بە شارێکی گەورە کارگەی زۆر و زەبەندە بۆ بەدیهێنانی درەختەکە (لەو تۆوەدا) هەبێت، تاکو ئەو درەختی سنەوبەرە بە لق و پەلەکانیەوە دروست ببێت!

بەم جۆرە، یەکێك لە بەڵگەکانی مەزنی و توانستی خوای گەورە لەوەدایە کە لە شتێکی یەکجار بچووکی وەك "تۆو" گەلێ شتی مەزنی بە ئەندازەی چیاکان بەدی دەهێنێت.

جا بە وێنەی ئەم نموونەیە، وا من بە نیازێکی خاوێن و قەناعەتێکی تەواوی ئەوتۆ کە هیچ خۆنەویستی و تەوازوعێکی دەستکردی تێدا نییە، ڕایدەگەیەنم کە:

خزمەتگوزارییەکانم و ڕووداوەکانی ژیانم لە حوکمی "تۆو"ێکدان تاکو ببن بە سەرەتا و بنەمای خزمەتێکی ئیمانیی مەزن. ئەوەتا چاودێریی خوای گەورە لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا درەختێکی بەرداری بە "پەیامەکانی نوور" - کە لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە - لەو تۆوە پێگەیاندووە و بەخشیوە.

جا بۆ ئەوەی دڵنیا بن، سوێندتان بۆ دەخۆم و دەڵێم:

هەرگیز من هیچ توانا و تایبەتکارییەکم لە خۆمدا شك نەدەبرد بۆ ئەو کارە دەراسایانەی کە بەسەر ژیانمدا هاتن. بۆیە هەرکاتێ بیرم لێ دەکردنەوە و، بۆ توانا و لێهاتنەکانی خۆمم دەڕوانی، تووشی سەرسوڕمان دەبووم. تەنانەت هیچ لێهاتنێکیشم

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٤.

لـە خۆمـدا نـەدەبینی بـۆ بـەڕێکردنی کاروبارەکـانی ژیـانی خـۆم و پەیوەندیـیـەکانم بـە کۆمەڵەوە، چ جای ئەوەی خاوەنی دەهاء و زیرەکی و ویلایەتی نائاسایی بم!

بەڵێ، چەند حاڵەتێك لە منەوە دەرکـەوتن کـە سـەرنجی خـەڵکی‌یان بـۆ لا ڕاکێشـام، بەڵام هەر هەموویان لـە دەرەوەی ویست و ئیختیـاری منـدا بـوون، کـەچی بـە چەشـنێك پێش چاو دەکەوتن کە وەك بڵێی جۆرێك بن لە ڕاکێشانی سەرنجی خـەڵك بـۆ لای مـن. لە ڕاستیدا لەو ڕووەوە بوون کە ئەو گومانە باشەی خەڵکی بەرامبەر بە مـن هـەیان بـوو، بە درۆ نەخرێتەوە.

جا لەبەر ئەوەی حیکمەتی ئەوەم نەدەزانی کە بۆچی من لە ڕاستیدا بەو جۆرە نیم کە خەڵکی بە گومـانی باشـی خۆیـان بـۆم دەڕوانـن و، بۆچـی مـن هیـچ سـوودێکم بـۆ دنیـا نی‌یە و، کەچی خەڵکیش ڕوویان تێکردووم و هەزار و یەك ئەوەندەی پلەی خۆم بـەرزتر بۆم دەڕوانن..

لەبەر ئەوە، هەمیشە ئەم کارەم بە پێچەوانەی حەقیقەتەوە دادەنا!

بەڵام هەزار شوکر و سوپاس بۆ ئەو خواوەندە گەورەیەی کـە بـە چاکـە و بەخششـی خۆی لە ڕۆژگارانی کۆتایی ژیانم و دوای بەسـەرچوونی نزیکـەی هەشـتا سـاڵی تەمـەنم، شتێکی لە حیکمەتی ئەم کارە تێگەیاندم)[1]!

(بۆ نموونە:

ئـەم سـەعیدە هـەژارە هەرچـەند پێویسـتی‌یەکی لەڕادەبەدەری بــە نووسـین و خـەت خۆشی هەبوو، چونکە وا ماوەی حەفتا ساڵە بەو کارەوە سەرقاڵە و هەندێ جـار ناچـارە ڕۆژانـە دووسـەد لاپـەڕە بخوێنێتـەوە و هەڵـەکانیان ڕاسـت بکاتـەوە.. کـەچی لەگـەڵ ئەوەشدا هێندە شارەزای نووسین و خەت نی‌یە کە منداڵێکی زیرەکی دە ساڵی لـە مـاوەی دە ڕۆژدا فێری دەبێت!

ئەم کارە – لە ڕاستیدا – جێی سەرسووڕمانە! چونکە سەعید بە تەواوی لە توانـا و لێهـاتنەکان بێ بەهرە نـەبوو. جگـە لـەوەش، براکـانی هـەموویـان خـەتیان خۆشـە و بـە باشی و جوانی دەنووسن.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٢-٥١٤.

وا ئێستا قەناعەتێكی تەواوم پەیدا كردووە بەوەی كـە حیكمـەتی مانـەوەم بـە "نیمچـە نەخوێندەوار" – لەبەر خەت ناخۆشیم – لەم مـاوە دوور و درێژەی تەمـەنمدا، سـەرباری ئەو هەموو پێویستی‌یەشم بە نووسین و خەت خۆشی، ئەوەیە كە:

ڕۆژگار و زەمانێك دێتە پێش كە هێز و توانا و بەهرە كەسی و جوزئی‌یـەكان نـاتوانن بەرەنگاری هێرشی دوژمنە سامناكەكان ببنەوە، لـەو ڕۆژگـارەدا "سـەعید" بەوپـەڕی گـەرموگوڕی بـە دوای كەسـانێكدا دەگـەڕێت كـە بـەهرەی خـەت خۆشی‌یان هـەبێت، تـاكو لەگـەڵ خـۆی لـە خزمـەتێكی گشـتی و هەمـەكی و بـەهێزدا بەشداریان بكـات و، پێكـەوە هـەزاران پێنـووس پێـك بـهێنن كە ئەو خزمەتە كەسی و جوزئی‌یە بگـۆڕن بـە خزمەتێكی هەمـەكی و گشـتی و بەهێز. چونكـە هەمـوویان – بـە وێنـەی كۆبوونـەوەی هـەوا و ڕوونـاكی و ئـاو – لـە دەوری ئـەو "تۆو"ە كۆدەبنـەوە و یارمـەتیی ئـەو درەختـە مەعنەوی‌یە دەدەن.

ئنجا جگە لەم حیكمەتە، حیكمەتێكی تر لەم كـارەدا هەیـە و مرۆڤ بـەرەو خزمـەتی ئیمـان دەداتەبـەر، ئـەویش بریتی‌یـە لـە: تواندنـەوەی خۆویسـتی‌یەكەی لـەنـاو حـەوزی بـەپیت و پیرۆزی كۆمـەڵدا، بـە وێنـەی تواندنـەوەی قـاڵبی سـەهۆڵ لـەناو ئـاودا. تـاكو ئیخلاسی ڕاستەقینە و بێگەرد بەدەست بهێنێت.

ئەمەش حیكمەتێكی ترە و بۆ خزمەتی ئیمان دەمانداتە بەر)[1].

(من بە وێنـەی تـۆوی ڕواوی نـاو خـاك پووكاومەتـەوە و، لـەو بـاوەڕەدام كـە هـەموو گرنگی و نرخ و زیندەیی و شەرەفمەندی و پلەوپایەیەك كە لەو تۆوەدا بوو، ڕۆشتووە بـۆ "پەیامەكانی نوور". لەبەر ئەوەیە كە نرخ و بەها و گرنگیی پەیامەكانی نوور دەردەخـەم، تاكو ئیعجازی قورئان پێش چاو بخەم)[2].

---

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٩-٥٢٠.

(٢) هێمای هەشتەمی تیشكی هەشتەم.

## چەند ڕووداوێکی گرنگ

### لە ژیانی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"دا

### بە پێی زنجیرەی مێژووی ڕووداوەکان

**١٨٧٦-١٨٧٧ز/١٢٩٤ك**

- لە دایکبوونی و ڕۆژگارانی منالّیی.

**١٨٨٥ز/١٣٠٣ك**

- هەنگاونانی یەکەمی بەرەو خوێندن و فێربوونی زانست.
- وانە خوێندنی لە گوندی "تاغ".

**١٨٨٨ز/١٣٠٦ك**

- بوونی بە قوتابی لای مامۆستا "سەیید نوور محەممەد".

**١٨٩١ز/١٣٠٨ك**

- خەون بینینی بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە ئامێزی دایك و باوکیدا.
- دەستکردنی بە خوێندنی ڕاستەقینە لە لای مامۆستا "محەممەد جەلالی" لە "بایەزید".

**١٨٩٢ز/١٣٠٩ك**

- تاقیکردنەوەی زانستییانەی لە لایەن "مامۆستا مەلا فەتحوڵلا"وە.
- مونازەرەی لەگەڵ زانایان لە شاری "سیرت"دا.
- پێ بەخشینی نازناوی "بەدیعوززەمان".

**١٨٩٣ز/١٣١٠ك**

- مانەوەی لە "شێروان".

**١٨٩٤ز/١٣١١ك**

- گۆشەگیریی لە "تیللۆ".

- بەرەنگاربوونەوەی بۆ ستەمی "مستەفا پاشا"ی سەرۆك عەشرەتی میران.
- مونازەرەی لەگەڵ زانایاندا لە "جزیرە".
- ڕۆشتنی بۆ "ماردین" و بایەخدانی بە سیاسەت.

١٨٩٥ز/١٣١٢ك

- دوورخستنەوەی لە "ماردین"ەوە بۆ "بەدلیس".

١٨٩٧ز/١٣١٤ك

- ڕۆشتنی بۆ "وان" لەسەر بانگهێشتی والی‌یەکەی.
- شارەزابوونی لە زانستە تازەکاندا لە کتێبخانەی میوانگەی والیی "وان" و لەبەرکردنی مەتنەکانی نەوەد کتێب.
- ئاگاداربوونەوەی لە وتەیەکی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لە دژی قورئان و موسڵمانان.
- کەوتنەخوارەوەی لە قەڵای "وان".

١٨٩٩ز/١٣١٦ك

- ڕوودانی ئاڵوگۆڕی فیکری.

١٩٠٦ز/١٣٣٤ك

- خزمەتگوزاریی قورئان.

١٩٠٧ز/١٣٢٥ك

- ڕۆشتنی بۆ "ئەستەمبوڵ" بە نیازی دامەزراندنی "قوتابخانەی زەهراء"(زانکۆی زەهراء).
- ڕاگەیاندنی ئامادەبوونی خۆی بۆ مونازەرەی زانایان لە "خانی شەکرچی".
- وەڵامدانەوەی بۆ پرسیارەکانی سەرکردەی ژاپۆنی.
- پێشکەش کردنی داواکاری‌یەك بۆ سوڵتان عەبدولحەمید لەمەڕ چاکسازیی بارودۆخی ناوچەی کوردستان و دامەزراندنی قوتابخانەی "زەهراء".
- بەرێکردنی بۆ خەستەخانەی شێتان!
- گفتوگۆی لەگەڵ پزیشکی خەستەخانەکەدا.
- گفتوگۆی لەگەڵ وەزیری ئاسایش (شەفیق پاشا)دا.

١٩٠٨ز/١٣٢٦ك

- ڕاگەیاندنی "مەشرووتییەتی دووهەم" (ڕژێمی پەرلەمانی) لە ١٩٠٨/٧/٢٣زدا.
- وتارەكەی بۆ ڕاڤەكردنی واتای ڕاست و دروستی ئازادی و مەشرووتییەت.
- كۆبوونەوەی لەگەڵ "عەمانۆئیل قەرەسۆ"دا و هەڵهاتنی عەمانۆئیل لەو چاوپێكەوتنە لە مەترسیی ئەوەی نوورسی بەرەو موسڵمانكردنی ببات!
- چاوپێكەوتنی شێخ "بەخیت"ی موفتیی میسر.
- بەرپەرچدانەوەی بۆ نووسینی ڕۆژنامەكان.
- هێوركردنەوەی هەست و نەستە ورووژاوەكان بە وتارێك لەسەر شانۆی "فەرەح"دا.
- وتاردانی بۆ هێوركردنەوەی حەماڵەكان لە كێشەی "مامەڵە دابڕین لەگەڵ كەلوپەلەكانی نەمسا"دا.

١٩٠٩ز/١٣٢٧ك

- وتاردانی بۆ هێوركردنەوەی قوتابیانی زانستە شەرعی‌یەكان لە گۆڕەپانی "بایەزید" لە ١٩٠٩/٢/٢٧زدا.
- بەشداریی لە ئاهەنگی دامەزراندنی كۆمەڵەی "ئیتتیحادی محەممەدی" لە ١٩٠٩/٤/٥زدا بە ئاراستەكردنی وتارێك بۆ ئامادەبووان.
- بێداركردنەوەی ڕۆژنامەنووسان.
- ڕووداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ی ڕۆمی لە (١٩٠٩/٤/١٣ز)دا.
- وتاردانی بۆ هێوركردنەوەی ئەو بەربادی‌یەی كە لە ئەنجامی ڕووداوەكانەوە سەری هەڵدابوو. هەروەها گێڕانەوەی هەشت تیپی سەربازی بۆ گوێڕایەڵیی ئەفسەرەكانیان.
- بردنی بۆ دادگای عورفیی سەربازی بەهۆی ڕووداوەكانی (٣١)ی مارتەوە، پاشان دەرچوونی بە بێ تاوانی لە دادگا.

١٩١٠ز/١٣٢٨ك

- دەرچوونی لە "ئەستەمبووڵ"ەوە بەرەو "وان".
- گفتوگۆی لەگەڵ پۆلیسێكی ڕووسی لە "تەفلیس".

- گەشت و گەڕانی بەناو هۆزەکاندا و دانانی پەیامی "مونازەرات".

١٩١١ز/١٣٢٩ك

- ڕۆشتنی بۆ شام لە وەرزی زستاندا (لە کۆتایی ١٩١٠و سەرەتای ١٩١١زدا).
- ئاراستە کردنی وتارێك بە زمانی عەرەبی لە سەر مینبەری مزگەوتی ئەمەویی دیمەشق.
- گەڕانەوەی بۆ ئەستەمبووڵ لە ڕێی "بەیرووت - ئیزمیر"ەوە.
- هاوڕێیەتی کردنی سوڵتان ڕەشاد لە گەشتەکەیدا بۆ "ڕۆمەلی" لە ماوەی نێوان (٧-١٩١١/٦/٢٦ز)دا.
- دانانی بەردی بناغەی قوتابخانەی "زەهراء" (زانکۆی زەهراء) لەسەر لێواری دەریاچەی وان.

١٩١٣ز/١٣٣١ك

- بەرەنگاربوونەوەی بۆ چەکدارەکانی ئەرمەن.
- مەشق پێکردنی قوتابی‌یە گیانفیداکانی، هاودەم لەگەڵ بەردەوامبوونی چالاکیی زانستی‌یانەی لە قوتابخانەی "خوڕخوڕ"دا.

١٩١٥ز/١٣٣٣ك

- خەونێکی ڕاست سەبارەت بە ئیعجازی قورئانەوە.
- دامەزراندنی هێزی خۆبەخشەران.
- لە بەرەی جەنگدا لەگەڵ ڕووسەکان.

١٩١٦ز/١٣٣٤ك

- دانانی کتێبی "ئاماژەکانی ئیعجاز".
- هەوڵدانی بۆ ڕزگارکردنی دانیشتووان.
- دیل بوونی بە دەستی ڕووسەکان لە ١٩١٦/٣/٢زدا.
- بردنی بۆ "کۆسترما" و، بەردەوامبوونی لە وتنەوەی وانەکانی ئیمان بە هاوەڵە دیلەکانی.
- یەکەم "بێداریی ڕۆحی"ی لە مزگەوتێکی تەتارەکاندا.

**١٩١٨ز/١٣٣٦ك**

- ڕاکردنی لە دیلی و گەڕانەوەی بۆ ئەستەمبووڵ لە ١٩١٨/٦/١٧زدا.
- دامەزراندنی بە ئەندام لە "دار الحكمة الإسلامية"دا لە بەرواری ١٩١٨/٨/١٣زدا.

**١٩١٩ز/١٣٣٧ك**

- گفتوگۆیەك لە خەونێكدا (مانگی ئەیلوولی ساڵی١٩١٩ز).
- مانەوەی لە چامڵجە لەگەڵ "عەبدوڕڕەحمان"ی برازایدا.
- نوێ بوونەوەی بێداریە ڕۆحیەکەی.

**١٩٢٠ز/١٣٣٨ك**

- داگیرکردنی ئەستەمبووڵ لە لایەن ئینگلیزەکانەوە لە ١٩٢٠/٣/١٦زدا.
- بڵاوکردنەوەی نامیلکەی "شەش هەنگاوەکان" بە هەردوو زمانی تورکی و عەرەبی.
- گۆشەگیریی لەسەر گردی "صاری یەر" لە ئەستەمبووڵ لە ناوەڕاستی ئەم ساڵەدا.
- وازهێنانی لە دەوام لە "دار الحكمة الإسلامية"دا.

**١٩٢١ز/١٣٣٩ك**

- وەڵامدانەوەی بۆ کەنیسەی ئەنگلیکی.
- وەڵامدانەوەی بۆ ئەو فەتوایەی کە مەشیەخەت لە ژێر پاڵەپەستۆی داگیرکەراندا لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخواز دەری کردبوو.

**١٩٢٢ز/١٣٤٠ك**

- گۆشەگیریی لە "گردی یووشەع" و گۆڕانی بۆ "سەعیدی نوێ" لە ئەنجامی کرانەوەیەکی ڕۆحی و ئاڵوگۆڕێکی قەلبی و فیکریدا.
- ڕۆشتنی بۆ ئەنقەرە لە ١٩٢٢/١١/١٩زدا.
- تێڕامانی لەسەر لوتکەی قەڵای ئەنقەرەدا.
- پێشوازی لێکردنی لە لایەن ئەنجومەنی پەرلەمان(مەبعووسان)ەوە لە ١٩٢٢/١١/٢٢زدا.

**١٩٢٣ز/١٣٤١ك**

- بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەك بەسەر ئەندامانی پەرلـەمان (ئەنجومـەنی نوێنـەران)دا لـە ١٩٢٣/١/١٩زدا.
- ژەهر پێدانی بۆ یەکەم جار.
- بڵاوکردنەوەی نامیلکەی (حَباب) و پاشکۆکەی.
- بەجێهێشتنی "ئەنقەرە" لە دوای ١٩٢٣/٤/٣٠ز.
- گەڕانەوەی بۆ "وان" لە سەرەتای مانگی حوزەیراندا.

**١٩٢٤ز/١٣٤٢ك**

- بەسەربردنی دوو ساڵ لەسەر چیای "ئەرەك"دا.

**١٩٢٥ز/١٣٤٣ك**

- داگرتنی لەسەر چیای ئەرەکەوە لە ١٩٢٥/٢/١٠زدا.
- دوورخستنەوەی لە "وان"ەوە بۆ "بوردوور" لە ١٩٢٥/٢/٢٥زدا.

**١٩٢٦ز/١٣٤٤ك**

- بردنی لە مانگی (نیسان – مایس)دا بۆ ئەستەمبووڵ.
- ئاگربەربوونەوە لە باڵەخانەی "مەشیەخەتی ئیسلامی" لە ١٩٢٦/٤/٢٩زدا.
- بردنی بۆ "بوردوور" لە ڕێی "ئیزمیر – ئەنتالیا"وە.
- دانانی پەیامی "دەروازەی نوور" لە شاری بوردووردا.

**١٩٢٧ز/١٣٤٥ك**

- گەیشتنی بۆ "بارلا" سێ ڕۆژ پێش هـاتنی مـانگی ڕەمەزانی پیرۆز، لـە ڕۆژی سێ شەممە ١٩٢٧/٣/١زدا.
- سەرەتای بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور.

**١٩٢٩ز/١٣٤٧ك**

- یەکەم دەستدرێژی بۆ سەر مزگەوتەکەی.

**١٩٣٢ز/١٣٥٠ك**

- پەلاماردانی مزگەوتەکەی لە لایەن جەندرمەوە لە ١٩٣٢/٧/١٨زدا.

١٩٣٤ز/١٣٥٢ك

- بردنی لە "بارلا"وە بۆ "ئیسپارتە" لە ناوەڕاستی هاویندا.

١٩٣٥ز/١٣٥٣ك

- گرتنی قوتابیانی نوور لە ١٩٣٥/٤/٢٥زدا.
- هاتنی وەزیری ناوخۆ لە ١٩٣٥/٤/٢٧زدا بۆ ئیسپارتە و، بردنی بەندکراوان بۆ "ئەسکی شەهر".
- بەرگری کردنی مامۆستا و بڕیاری دادگای گەورەی جەزا لە ١٩٣٥/٨/١٩زدا بە مەحکووم کردنی لەسەر دانانی "پەیامی پۆشتەیی".
- ژەهرپێدانی بۆ دووهەم جار.

١٩٣٦ز/١٣٥٤ك

- ئازادکردنی لە ١٩٣٦/٣/٢٧زدا و دوورخستنەوەی بۆ "قەستەمۆنی" و، نیشتەجێ کردنی ئیجباریی لەوێ بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا.
- ژەهردەرخواردانی بۆ جاری سێهەم و چوارەم و پێنجەم لەم ماوەیەدا.

١٩٤٣ز/١٣٦٢ك

- پەلاماردانی ماڵەکەی سێ جار و، پاشان گرتنی لە ١٩٤٣/٩/٢٠زدا و ناردنی بۆ "ئەنقەرە".
- بردنی خۆی و قوتابیانی بۆ دادگای گەورەی جەزا و بەندیخانەکەی لە دەنیزلی لە ١٩٤٣/١٠/٢٥زدا.

١٩٤٤ز/١٣٦٣ك

- دادگای "دەنیزلی" و وردبوونەوە لە پەیامەکانی نوور لە لایەن خەبیرەکانەوە.
- ژەهرپێدانی لە ماوەی (١٩٤٣-١٩٤٤ز)دا بۆ جاری شەشەم و حەوتەم و هەشتەم و، شەهیدبوونی "حافز عەلی" لەمەی دواییدا.
- ڕاگەیاندنی بێ تاوانیی مامۆستا لە ١٩٤٤/٦/١٥زدا.
- مانەوەی لە "دەنیزلی" بۆ ماوەی دوو مانگ.
- نیشتەجێ کردنی زۆرەملێیی لە قەزای "ئەمیرداغ" بە فەرمانێك لە ئەنقەرەوە لە کۆتایی مانگی هەشتی ئەم ساڵەدا.

- ڕێ پێ نەدانی کە بڕوات بۆ مزگەوت لە "ئەمیرداغ".
- ژەهردەرخواردانی بۆ جاری نۆهەم و دەهەم و یازدەهەم و، شەهیدبوونی "حەسەن فەیزی" لەمەی دواییدا.

١٩٤٨ز/١٣٦٧ك

- بردنی خۆی و قوتابیانی بۆ دادگای "ئافیوون" لە ١٩٤٨/١/٢٣زدا.
- بڕیاردەرچوون لە سەریان لە ١٩٤٨/١٢/٦زدا.
- ژەهردەرخواردانی بۆ جاری دوازدەهەم و سیازدەهەم و چواردەهەم.

١٩٤٩ز/١٣٦٨ك

- ئازادکردنیان لە بەندیخانەی ئافیوون لە ١٩٤٩/٩/٢٠زدا.
- هێنانەوەی بۆ ئەمیرداغ لە بەرواری ١٩٤٩/١٢/٢ز و، مانەوەی لەژێر چاودێریدا.

١٩٥٠ز/١٣٦٩ك

- ناردنی برووسکەیەکی پیرۆزبایی بۆ سەرۆك كۆماری نوێ بە بۆنەی سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکان لە ١٩٥٠/٥/١٤زدا.
- وەڵامدانەوەی برووسکەکەی.
- لاچوونی یاساغیی یاسایی لەسەر بانگی شەرعی و، پیرۆزبایی کردنی مامۆستا لە قوتابیانی و لە سەرجەم جیهانی ئیسلامی بەم بۆنەیەوە لە ١٩٥٠/٦/١٦زدا.

١٩٥١ز/١٣٧٠ك

- ناردنی نامەیەك و چەند پەیامێکی نوور بۆ "ڤاتیکان".
- برووسکەی وەڵامدانەوە لە لایەن ڤاتیکانەوە لە١٩٥١/٢/٢٢زدا.
- ڕۆشتنی بۆ "ئەمیرداغ" بۆ ماوەی یەك هەفتە لە ١٩٥١/١١/٢٠زدا.
- ڕۆشتنی بۆ "ئەسکی شەهر" لە ١٩٥١/١١/٢٩زدا و مانەوەی لەوێ لە ئوتێلی "یەڵدز"دا
- ڕۆشتنی بۆ "ئیسپارتە" لە ١٩٥١/١٢/٢٩زدا.

١٩٥٢ز/١٣٧١ك

- ڕۆشتنی بۆ ئەستەمبوڵ لە ١٩٥٢/١/١٥زدا بۆ ئامادە بوونی لە دادگا لەسەر بڵاوکردنەوەی کتێبی "ڕابەری لاوان".

- دانیشتنەکانی دادگا لە ڕۆژانی: ١/٢٢ و ٢/١٩ و ٣/٥ی ئەم ساڵەدا.

**١٩٥٣ز/١٣٧٢ك**

- بێ تاوان بوونی لە کێشەی "ڕابەری لاوان"دا.
- گەڕانەوەی بۆ ئەمیرداغ لە سەرەتای مانگی نیساندا.
- ڕۆشتنی بۆ "ئەستەمبووڵ" تاکو لەوێوە بڕوات بۆ دادگای "سامسۆن".
- مانەوەی لە "ئەستەمبووڵ" نزیکەی سێ مانگ و، ئامادەبوونی لە بەردەم دادگای "ئەستەمبووڵ"دا لە بریی دادگای "سامسۆن" و بەرگری لەخۆکردن و بێ تاوان بوونی.
- دەرچوونی لە ئەستەمبووڵ لە ناوەڕاستی هاویندا بەرەو "ئەسکی شەهر" و، لەوێشەوە بۆ "ئەمیرداغ" و، ئنجا بۆ "ئیسپارتە" و لەوێشەوە بۆ "بارلا".
- چەند سەفەرێکی ناوبەناو لە نێوان: "بارلا، ئیسپارتە، ئەمیرداغ"دا و هەندێ جار بۆ "ئافیوون" و "ئەسکی شەهر"یش.

**١٩٥٦ز/١٣٧٥ك**

- دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی "پەیامەکانی نوور" لە دادگای ئافیوون لە ١٩٥٦/٥/٢٣زدا و، دەسپێکی چاپکردنی ئەم پەیامانە بە شێوەی ڕەسمی.

**١٩٥٧ز/١٣٧٦ك**

- هەڵوێستی لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا.

**١٩٥٨ز/١٣٧٧ك**

- کێشەی ئەنقەرە و گرتنی قوتابیانی نوور لە (ئەنقەرە، ئەستەمبووڵ، ئیسپارتە) لە ١٩٥٨/٤/١٦زدا.

## سەردانەکانی ماڵئاوایی

**١٩٥٩ز/١٣٧٨ك**

- ١٩٥٩/١٢/٢ز، ڕۆشتنی لە ئەمیرداغەوە بۆ ئەنقەرە و گەڕانەوەی بۆ ئەمیرداغ لە ڕۆژی دوای ئەوەدا.

- ١٩٥٩/١٢/٣ز، ڕۆشتنی بۆ ئیسپارتە و گەڕانەوەی بۆ ئەمیرداغ دوای پازدە ڕۆژ.
- ١٩٥٩/١٢/١٩ز، ڕۆشتنی بۆ "قۆنیە" و گەڕانەوەی بۆ ئیسپارتە و لەوێشەوە بۆ ئەمیرداغ.
- ١٩٥٩/١٢/٢٠ز، ڕۆشتنەوەی بۆ قۆنیە بۆ جاری دووهەم و گەڕانەوەی بۆ ئەمیرداغ لە دوای نوێژی بەیانی.
- ١٩٥٩/١٢/٣١ز، ڕۆشتنی لە ئەمیرداغەوە بۆ ئەنقەرە.

١٩٦٠ز/١٣٧٩ك

- ١٩٦٠/١/١ز، ڕۆشتنی بۆ ئەستەمبوڵ.
- ١٩٦٠/١/٣ز، گەڕانەوەی بۆ ئەنقەرە (دواهەمین وانە).
- ١٩٦٠/١/٥ز، دیداری پەیامنێری ڕۆژنامەی "تایمس" لەگەڵیدا.
- ١٩٦٠/١/٦ز، ڕۆشتنی بۆ قۆنیە و لەوێشەوە بۆ ئیسپارتە و ئەمیرداغ.
- ١٩٦٠/١/١١ز، گەڕانەوەی بۆ ئەنقەرە و ناچارکردنی لە لایەن حکوومەتەوە کە لە ئەمیرداغ دابنیشێت!
- ١٩٦٠/١/٢٠ز، ڕۆشتنی لە ئەمیرداغەوە بۆ ئیسپارتە و دوای مانەوەی دوو ڕۆژ لەوێ ڕۆشت بۆ ئافیوون ئنجا دوای ڕۆژێك لەوێوە گەڕایەوە بۆ ئەمیرداغ.
- ١٩٦٠/٣/١٩ز، ڕۆشتنی لە ئەمیرداغەوە بۆ ئیسپارتە .
- ١٩٦٠/٣/٢٠ز، مانەوەی لە ئیسپارتە دوو ڕۆژ، پاشان ڕۆشتنی بەرەو "ئوورفە".
- ١٩٦٠/٣/٢١ز، تێپەڕبوونی بە شارەکانی: (قۆنیە، ئەدەنە، غازی عەنتاب)دا.
- ١٩٦٠/٣/٢٢ز، گەیشتنی بۆ "ئوورفە" و سەردانی لە لایەن خەڵکی شارەوە.
- ١٩٦٠/٣/٢٣ز، گیان سپاردنی بە پەروەردگاری لە سەعات سێی شەودا. خوای گەورە لێی خۆش بێت و نوقمی ڕەحمەتی فراوانی خۆی بکات.
- ١٩٦٠/٣/٢٤ز، ڕێ و ڕەسمی بە خاك سپاردنی لە شاری ئوورفەدا.
- دەرهێنانی تەرمەکەی لە لایەن کاربەدەستانەوە لە مانگی حەوتی ئەم ساڵەدا و گواستنەوەی بۆ شوێنێکی تا ئێستا نەزانراو!

# پێشەکی [1]

لە دەمی خوێندنەوەی ژیاننامەی گەورە مەردان و گوێ ڕاگرتن لە باسی مەناقیبی بەرزیان و یادکردنەوەی هەڵوێستی قارەمانانەی ئەواندا، مرۆڤ لە ناخی دەروونەوە هەست بە گواستنەوەی خۆی دەکات بەرەو جیهانێکی تر. گەرموگوڕیی ئەو بڵێسە بڵندەی کە لەو هەست و ئەستە خاوێنانەوە پەیدا دەبن، بێ ئاگایی دڵی مرۆڤ دەسووتێنن و نوقمی ناو ڕێژنەی ئیلاهیی دەکەن.

مێژوو لەم بوارەدا ناوی چەندین مەردی ئەوتۆی بۆ تۆمار کردووین کە گەورەیی پیاوانی مەزن لە ئاستیاندا بچووك دەبێتەوە!

لە کاتی یادکردنەوەی قارەمانە بەهرەمەندەکانی مێژوودا "گیان"ی مرۆڤ لە چنگی قوڕ و لیتەی زەوی دەربازی دەبێت و، بە ئاسمانی جیهانە فراوانەکاندا دەفڕێت. دەڵێی بۆن و بەرامەی هەزاران عەتر و گوڵاو دەورەیان داوە، وەك ئەوەی بەناو گوڵ و ڕێحانەی باخ و گوڵزارە بۆن خۆشەکاندا گوزەر بکات.

من بۆ خۆم لە دەمی نووسینی ئەم پێشەکی‌یەدا هەست بەم ڕاستی‌یە بەرزە دەکەم، بە هەموو مەزنی‌یەکی و بە تەواویی سەرجەم واتاکانی..

چونکە ئەم کتێبەی کە ئێستا بەوپەڕی ڕاستی و دڵسۆزی‌یەوە پێشکەشی خوێنەرانی خۆشەویستی دەکەین، باس لە مێژووی ژیانی "فاتیحی دڵان" مامۆستای مەزن سەعیدی نوورسی دەکات لە ماوەی ئەو تەمەنەیدا کە لە سەدەیەك نزیك دەبێتەوە و، هەموو یەکێکی لاپەڕەکانی بە هەزاران قارەمانێتی و کاری نائاسایی لێوانلێوە. هەروەك ناوەرۆکی پەیامەکانی ئەو زاتە لەخۆ دەگرێت کە ژمارەیان دەگاتە سەد و سی پەیام و،

---

(١) ئەم پێشەکی‌یە زانای پایەبەرز و شاعیری گەورەی تورك "عەلی عولـــــوی قوروجو" (١٩٢٠-٢٠٠٢ز) نووسیویەتی کە لە مەدینەی مونەووەرە بووە. لە کاتی چاپی ئەم ژیاننامەدا ناردوویەتی بۆ مامۆستا نوورسی. ئەویش ئاماژەی داوە بە قوتابیانی کە لە سەرەتای ژیاننامەکەیەوە دابنرێت کە بە زمانی تورکی نووسراوە.

چاکە و مەردایەتیی قوتابیی‌یە شکۆدار و پایەبەرزەکانیشی دەردەخات کە هەریەك لە "ئیمان و زانست و ئیخلاس و ڕاستگۆیی" ئاکاری ئەوانی ڕازاندووەتەوە و، بوونەتە پێشەنگێکی ناوازەی جوان نەك تەنها بۆ یەك وڵات بەڵکو بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی.

بەڵێ، "پێشەکیی کتێب" کورتەیەکی ئەو کتێبە و پوختەی ناوەرۆکەکەیەتی. کەچی ناساندنی ناوەرۆکەکانی ئەم کتێبە مەزنەی کە چەندین لق و پەلوپۆی بەربڵاوی لێ بووەتەوە و هەریەك لە بابەتەکانیشی کتێبێکی سەربەخۆی لەخۆ گرتووە، هەرگیز لە پێشەکیی‌یەکدا جێی نابێتەوە کە لە چەند لاپەڕەیەك پێکهاتبێت.

لە هیچ کامی نووسینەکانمدا، چ پەخشان بن و چ هۆنراو، تووشی دەستەوسانی و سەرسامی نەبووم، وەك ئەوەی کە لە نووسینی ئەم پێشەکیی‌یەدا دووچاری بووم! ئەو کەسانەی کە ئەم کتێبە دەبینن و بە تامەزرۆیی و کێش بوونێکی بڵندەوە دەیخوێننەوە، بە سەرسوووڕمانەوە بۆیان دەردەکەوێت کە "بەدیعوززەمان" کەسایەتیی‌یەکی نایاب و زانایەکی تاقانەی ڕۆژگارە، کە هەر لە منداڵیی‌یەوە لە ژێر چاودێریی‌یەکی کەم وێنەی خواوەندا بە شێوەیەکی ناوازە پێگەیشتووە.

دوای ئەوەی بە جوانی ڕوانیمە ئەم زانا مەزنە و، بە گەرموگوڕی لە کتێبەکانی ورد بوومەوە و، لە نزیکیشەوە قوتابیانی ئەوم ناسی و، بە هزر و هەست و گیانیشم لەناو ئەم جیهانی نوورەدا ژیام، ڕادەی ڕاستیی ئەو وتەیەم بۆ دەرکەوت کە دەڵێت:

بۆ خوا ئاسانە سەرانسەر جیهان    کۆبکاتەوە لەناو یەك ئینسان

* * *

ئەوانەی کە لە دەورانەوری ئەم جەمسەرە ئیمانیی‌یەدا دەفڕن و، لەبەر بڵندیی ئامانج و مەزنیی بانگەواز و گەورەیی ئیمان و خاوێنیی ڕێبازەکەی کەمەند کێشی دەبن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندان. جا هەروەك ئەم زیادبوونە شکۆمەندەی کە دڵان سەرسام دەکات، دەبێتە مایەی ئەوەی داخ بە دڵی سەرسەختاندا بکات و بڵێسەی شەوقیان بکوژێنێتەوە، ئەوا لە هەمان کاتدا دڵخۆشی و شادمانی و دڵنەوایی بەردەوام بە ئیمانداران دەبەخشێت.

یەکێك لە تێکۆشەرە مەزنەکان، بە شێوازێك کە سۆز و دڵنیایی بە دڵان ببەخشێت، گوزارشت لەم ڕووداوە دەکات کە لە دەستاویزێکی مەعنەوی‌یەوە درێژە بە ژیان و گوڕوتینی دەدات لە ناودڵە ئیمانداره‌کاندا، دەڵێت:

"کاتێ کە لە ڕۆژگارێکی تاریك و نووتەکدا "بەدڕەوشتی" بە وێنەی تۆفانی ڕامالەر بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە و خەریك بوو هەموو ئاکارێکی بەرز بخنکێنێت و کپی بکات، دەبینین ڕێژنەی بەرەکەتی مامۆستا بەدیعوززەمان، بە هۆی نهێنی‌یەکی خواییەوە و بە وێنەی ئەو لافاوەی کە بەرگریی لێ ناکرێت، لە دڵەکانەوە بۆ ناو یەکتر خوڕ دەبنەوە و، دڵنەوایی و ورە و هێز و پێز بە ئاواتەکانمان دەبەخشن. بەڵێ، شەوگارەکانمان بە ڕەشاییەکی خۆسەپێن لێ تاریك بووە، کەواتە سپێدەی بەیان نزیك بووەتەوە"!

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا پێت و بەرەکەتی ئەم نوورە و کاریگەریی بڵاوبوونەوەیان – بە پشتیوانیی خوا – لە دڵێکەوە بۆ دڵێکی تر بینی، کە بە شێوەیەکە ئەستەمە بتوانرێت بەربەست بکرێت و کەسێك ڕووبەڕووی ببێتەوە، هەموو ئەوانە نوقمی سەرسامی بوون و، دەیان پرسی:

ئایا ئەم مرۆڤە کێ‌یە کە ناوبانگی سەرانسەری وڵاتی گرتووەتەوە؟ ئایا ژیان و بەرهەمەکانی و ڕێبازەکەی چی‌یە؟ ئایا ئەو ڕێبازەی گرتویەتەبەر تەریقەتێکی سۆفی؟ یان کۆمەڵەیەك؟ یاخود پێڕێکی سیاسی‌یە؟

کار لەمەدا نەوەستا، بەڵکو پشکنینەکانی کارگێڕیی حکومەت و دامودەزگای داد و، لێ وردبوونەوەی جیددی و توندوتۆڵ دەستی پێکرد و، دادگایی درێژخایەن و یەك لە دوای یەك خرانەگەڕ، هەتا لە دواییدا بۆیان دەرکەوت کە ئەم درەوشانەوە خواییە جگە لە "دامەزراوەیەکی ئیمانی و زانستی" کە خێوەتی خۆی لەناو جیهانی دڵاندا هەڵداوە، شتێکی تر نی‌یە..

ئیتر دادپەروەریی قەدەری خوای گەورە بەم شێوەیە هاتەدی کە بە ڕەسمی بێ تاوانیی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی و سەرجەم پەیامەکانی نوور ڕاگەیەنرا و، ڕاستیی ئەو یاسا خواییانەش کە لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد بەردەوامن، وەکو خۆری درەخشان دەرکەوت، کە بریتی‌یە لە زاڵبوونی ڕۆح بەسەر ماددەدا و، سەرکەوتنی حەق بەسەر

ناحەقدا و، شکستی تاریکی لە ئاستی ڕووناکیدا و، پاشەکشێی کوفر لە بەردەم ئیماندا.

دەڵێن:

ڕاستترین پێوەر و وردترین تەرازوو بۆ ڕاست و دروستی و لێبڕانی هەر چاکسازێك کە لە هەر شوێنێکدا سەرهەڵبدات، لە دووتوێی ئەو گۆڕانکارییانەدایە کە بەسەری دێت لە دوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحیدا، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژگارانی یەکەمی بانگەوازەکەی..

بۆ نموونە:

با سەیری کەسێك بکەین کە لە سەرەتای بانگەوازەکەیەوە بە خۆنەویست و جوانکار و جوامێر و ڕێزدار و گیانفیدایەك بینراوە کە پەنای بۆ دەبرا و، پێشەنگێکی بلیمەت و نموونەیەکی سەرڕاست و نایاب بووە کە سەرجەم ڕەوشتە باش و ئاکارە بەرزەکانی پێوە بینراوە و، بە ئەندازەی پاك و خاوێنیی "بەفر" و بە هەموو واتایەکی ئەم وشەیە پاك و خاوێن بووە.. با لە دوای گەیشتنی بە ئامانج و بەدەستهێنانی سەرکەوتن و جێگرتنی بەرز و بلندی لە ناو هەست و نەست و دڵاندا بۆی بڕوانین و، بزانین ئایا لەسەر پاك و خاوێنیی پێشووی ماوەتەوە؟ یان بە هۆی مەستیی سەرکەوتن و پایەبەرزی، لەخۆی بایی بووە و خۆی لە چیاکان بە گەورەتر دەبینێت؟

بەڵێ، ئەم ئاوێنەیە ڕوونترین و خاوێنترینی ئاوێنەکانە بۆ پیشاندانی ڕووکاری ڕاستەقینەی ناوەڕۆك و کاکڵەی خاوەنی بانگەوازەکان و گەوهەری کەسایەتییان.

مێژوو بە ڕووداوەکانی خۆی شایەتە کە پێغەمبەران - درووددیان لەسەر بێت - لە پێشەنگی هەموو شیانەوە پێشەواکەیان محەممەدی سەرووەرمان ﷺ، دوای ئەویش جێنشین و هاوەڵە بەڕێزەکانی و، هەرکەسێکی دیکەش لە گەورە مەردان کە لەسەر ڕێبازی ئەوان و لەبەر ڕووناکیی ئاکاریاندا هەنگاوی نابێت، باشترین نموونە و پێشەنگی جوان بوون لە بەدەستهێنانی ئاواتەکان و، یەکەم گرەویان لەم تاقیکردنەوە سەرسووڕهێنەرەدا بردووەتەوە.

* * *

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە ڕەوانبێژییە خاوەن ئیعجازەکەی خۆی لەم فەرمووده پیرۆزەیدا: "العلماءُ ورثة الأنبيــــاء"[١] قورسیی ئەرکی سەرشانی زانایان و مەودای سەختیی کارەکەیان ڕوون دەکاتەوە.

جا مادەم ئەرکی سەرشانیان بەم جۆرە بێت، دەبێت لە ڕاگەیاندنی حەق و ڕاستیی ئاشکرا و بەرز و بڵنددا چاو لە پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - بکەن و ڕێگای ئەوان بگرنەبەر، هەرچەندەش بەربەستی جۆراوجۆریان بێتەڕێ، تەنانەت گرتن و، دوورخستنەوە و، زیندانی تاکەکەسی و، ژەهرپێدان و، پەتی سێدارە و، ئەو شێوازانەی ستەم و ئازاردانیش کە بە ئەندێشەی کەسدا نایەن.

مامۆستا نوورسی بە درێژایی ژیانی و بۆ ماوەی زیاد لە نیو سەدە، بە جیهادە موقەددەسەکەی خۆی ئەم ڕێگا سەختەی بری و، بە وێنەی هەورە بروسکە هەزاران ڕێگری جێهێشت و، بە کردار سەلماندی کە زانایەکە لە میراتگرانی پێغەمبەران، درووديان لەسەر بێت.

لە نێوان فراوانیی زانست و، بڵندیی ئەدەب و، باشیی ڕەوشت و ئاکارە زۆرەکانیدا، "فراوانیی ئیمانەکەی"، منی لە ناخەوە کەمەندکێش کردووە، کە ئیمانێکە هێندەی چیا گەردنکەشەکان جێگیر و، بە وێنەی دەریا گەورەکانیش قووڵ و بێ بنکە!

خوایە گیان! چ ئیمانێکی مەزن و، ویستێکی سەختی پۆلایین و، ئارام گرتنێکی بەرزی بێ کۆتایی و، سەرێکی بەرزی نەوی نەبوو بۆ کۆیلەکان و، دەنگێکی کپ نەکراوی بڵند و، هەناسەیەکی بەهێزی نەخنکاوی هەیە، وێڕای ئەو هەموو گوشار و هەڕەشانەی کە تەنانەت خەیاڵیش دەترسێنێت و دیمەنی یادگارییەکان بە تارمایی سام و مەترسی ڕەنگ دەکات!

بڕوانن خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا چ بەڵێنێکی بە موجاهیدان داوە:

﴿وَالَّذِينَ جاهَدُوا فِينا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنا وَإِنَّ اللهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (العنكبوت: ٦٩).

بەڵێ، ئەو موجاهیدانەی کە لە ڕێی ئیمان و قورئاندا خۆیان و دنیاکەیان بە خوای گەورە بەخشیوە، خواوەند مژدەی ڕێنماییان بۆ سەر ڕێی خۆی پێ دەدات. بێ گومان

(١) رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه وأحمد.

خواوەند بەڵێنی خۆی دواناخات، گەر ئەو مەرجانە کۆببنەوە کە هۆی هاتنەدیی ئەم بەڵێنەی خوای گەورەن.

ئەم ئايەتە پيرۆزە ڕێبەرێکی نوورانیيە بۆ شيکردنەوەی کەسايەتی و مێژووی ژيانی مامۆستا نوورسی، بە چەشنێك دەتوانين وردترين ڕوخسارەکان و بچووکترين خاڵەکان ببينين وەك ئەوەی هەموويان چەپکێکی بريسکاوەی ڕووناکی بەخش بن.

خۆ هەرکات خوای گەورە نيعمەتی "پارێزگاری"ی خۆی بە مرۆڤێك بەخشی، ئەوا هيچ گرنگیيەك بۆ ترس و بيم و بێزاری و هەڵگەڕانەوە و هاوشێوەی ئەمانە نامێنێتەوە، چونکە ئايا چ پەڵە هەورێکی ڕەش و تاريك دەتوانێت سێبەری خۆی بهاوێتە سەر دڵێك کە بە نووری خوای گەورە ڕووناك بووبێتەوە؟ يان چ هيوا و ئاواتێکی فانی و خواستێکی لەناوچوو، يان چ ئاوڕدانەوەيەکی کاتی و، ڕووتێکردنێکی دەستەوسان و، ئامانجێکی بێ نرخ و، دەستکەوتێکی نزمی دەروون، دەتوانێت گيانی بەندەيەك ئاسوودە بکات کە بەهرەمەندی پەيوەست بوون بێت بە پەروەردگاريەوە و، لە هەموو سات و چرکەيەکدا شەرەفمەندی حزووری لای خوای گەورە بێت!

بەديعوززەمان کەسايەتیيەکە بەهرەمەندی "چاودێری"يەکی نائاسايی پەروەردگارە. هەر لەبەر ئەوەشە کە بەندیخانەکان سەبارەت بەو وەکو چەند باخچەيەکيان لێ هات کە لێيانەوە ئاسۆی نوورانيی جيهانە هەميشەييەکان دەبينیێ..

هەروەك داری سێدارە و سەکۆی ئيعداميش بۆ ئەو بريتين لە کورسيی ئامۆژگاری و ڕێنمايی، کە لەوێوە وانەکانی ئارامی و خۆڕاگری و توندوتۆڵی و مەردايەتی، لە پێناوی ئامانجێکی بلندا، بە مرۆڤايەتی دەڵێتەوە!

بەندیخانەکانيش دەبنە چەند قوتابخانەيەکی يووسفی کە بە وێنەی مامۆستايانی زانکۆ دەڕواتە ناوی بۆ پێشکەش کردنی وانەکانی، چونکە بەندکراوانی ئەویێ چەند قوتابیيەکن پێويستيان بە پيت و ڕێنمايی ئەو هەيە. پێی وايە ڕزگار کردنی چەند هاوولاتیيەك و هێنانيان بۆ ناو بازنەی ئيمان، هەروەها گۆڕينی چەند تاوانبارێك بە مرۆڤی وەك فريشتە، بەختەوەریيەکە نايگۆڕێتەوە بە هيچ کەرەسەيەکی دنيای فانی.

مرۆڤێك کە ئەم چەشنە ئيمان و ئيخلاسەی لە دڵی خۆيدا هەڵگرتبێت و، هەموو چرکەيەك لە ناخی خۆيدا هەستی پێ بکات، بێ گومان واز لە کاريگەريی ئەو بريق و

بـاقە درۆینەیـە دەهێنێـت کـە هـەردوو چـەمکی "کـات" و "شـوێن" لەسـەر ڕۆڵـە دەستکورت و دەستەوسانەکانی جیهانی مادده بە جێی دەهێڵن! بۆیە گیانی خۆی بەرەو جیهانی مەعنەوی پەرواز دەکات کە ئاسۆکانی تـا بڵێی فراوانـە و بەهرەمەندی نـوور و هیدایەتە.

خۆ ئەو پلەوپایە تەواو گەورەیەی کـە قوتبەکانی ڕێبـازی تەسـەووف لێی دەدوێن و وەسفی دەکەن و، بریتی‌یـە لـە "الفنـاء فی الله والبقـاء بـالله" جگـە لـە بەدەستهێنانی ئـەم شەرەفە مەزن و بڵندە، شتێکی دیکە نی‌یە.

ڕاستە هەموو ئیمانداریك حاڵێکی تایبەت بە خۆی هەیە لە دڵنیایی و، دڵئامـادەیی و، ملکەچی و، دەستبەرداری و، پیت و بەرەکەت و، نوقم بوون لە یادی خـوای گـەورەدا. هەرکەسەش بە ئەندازەی ئیمان و، زانست و، تەقواکەی و، بە ڕێژەی بەهرەمـەند بوونـی لێیان، لەم ئارامی‌یە خواییە هەڵدەگۆزێت..

بەڵام ئەم حاڵە نمەدار و جوانە و، ئەم بە یەك شـادبوونە سـازگارە تـەڕ و پـاراوە و، ئـەم ئارامی‌یە کەم وێنە هەمیشە نوێ‌یـە، بـە بـەردەوامی بەسـەر ئەوانـەدا دەبـارێن کـە خـاوەنی پلەی "ئیحسان"ن، واتە ئەو موجاهیدە مەزنانەی کە لە ئایەتەکەی پێشوودا باس کراون. هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەوان دووچاری بێ ئاگایی نابن لە یادی خاوەنی بەخشندەیان و، بە درێژایی ژیانیـان وەکـو شێر زۆران لەگەڵ دەروونـی بـەدخوازیاندا دەگـرن و، هــەموو چرکەسـاتێکی تەمەنیشیان جوانـترین یادگـاریی خـۆ کـامڵ کردن و بەرزبوونـەوە تۆمــار دەکەن. ئەوان بە هەموو بـوون و قـەوارە و بـەردەوامیی ژیـانی خۆیـان لـەناو ڕەزامـەندیی پـەروەردگاری جیـهانیاندا دەتوێنـەوە، کـە خـاوەنی هـەموو سـیفەتەکانی جوانــی و شکۆمەندی و کەماڵە.

ئێمە تا ئێستا لەبارەی گەورەیی ئیمانەکەیەوە دواین، کە بە شێوەیەکە دۆسـتان بـەرەو ڕووی کێش دەبـن و دوژمنانیشـی لـێ دەسـڵەمێنەوە. دەبـێ لـەبارەی کەسـایەتی و، تایبەتمـەندی و، ڕەوشـتەکانی و، ئـەو کەماڵاتانەشـی بدوێـین کـە وەك خەرمانەیــەکی ڕووناکی دەوراندەوری ئەویان داوە.

وەك ئاشکرایە هەموو مرۆڤێکی گەورە چەندین خەسڵەتی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە و، خاوەنی چەند نیشانەیەکی جیاوازە کە لە کەسانی تر جیای دەکەنـەوە. بـە هـەمان شێوە

"مامۆستا نوورسی" ش لـە پێکهاتـەی کەسـایەتیی خۆیـدا بـەم سـیفەتانەی خـوارەوە تایبەتمەندە:

خۆبەختکاری

"خۆبەختکردن" لـە گرنگـترینی مەرجەکانی سەرکەوتنی خـاوەن بانگەوازەکانـە. چونکە دڵ و چاوەکـان حەزیان لـە بینینی ئەم سیفەتە گرنگەیە و بەوپەڕی هەستیاری چاوەڕوانی دەکـەن. ژیـانی "مامۆستا نوورسی"ش لێوانلێـوە بە جوانـترینی نموونەکانی گیانفیدایی و خۆبەختکاری.

لـە گەورە زانـای خوالێخۆشبوو "شێخولئیسلام مستەفا سەبری"م بیست کە لـە گوفتارێکیدا وەسفی "خۆبەختکاری"ی دەکرد، دەیوت:

"پێویستە هەڵگرانی ئاڵای خاوێنی جیهادی ئیسلامی لەم سەردەمە پڕ لە تەنگانەیـەدا، نەك هەر تەنها ژیانی دنیایان بەخت بکەن، بەڵکو دەبێت قوربانی بە ژیـانی دواڕۆژیشیان بدەن"!

ئەم گوفتارەی کە لـە نـاوەڕۆکدا قـورس و تـابلێیی پڕ واتایـە و، لـە زاری مرۆڤێکـی گەورەوە دەرچـووە، یەکـەم جـار پێـم هـەرس نـەدەکرا و، بـە هاوشـێوەی گوفتـار و مەتەڵەکانی ئەو سۆفی‌یانەم وێنا دەکـرد کە لـە دەمی نوقم بوونیـان لـە حاڵـەتی ڕۆحیـدا دەری دەبڕن، بۆیە بڕیارم دا لای کەس باسی نەکەم و لە هیچ کۆڕێکیشـدا لێـی نـەدوێم! بـەڵام کاتێ کـە هـەمان گوفتـارم لـە دووتوێـی دەسـتەواژە حەماسـی‌یە هـەڵچووەکانی مامۆسـتا نوورسـیدا خوێنـدەوە، تێگەیشـتم کـە پێوەرەکـانی "خۆبـەختکاری" بـەپێی گەورەیی مرۆڤە مەزنەکان گەورە دەبن! بەڵێ: "وتصغر في عين العظيم العظائم"[1].

بـەڵێ، ئـەو تێکۆشـەرانەی کـە هـەموو شتێکی بـەنرخیان بـەخت دەکـەن و، خۆیـان لەسەر کارەساتە ئازاربەخشەکان ڕادەگرن و بەئارام دەبن، خواوەندی مەزن کە بـەرز و

(١) نیوە بەیتێکی موتەنەبیی‌یە، تەواوەکەی بەم جۆرەیە:

وتعظم في عين الصغير صغارها      وتصغر في عين العظيم العظائم

واتە:

بچووك لای "بچووك" گەورە دەنوێنێ      "گەورە"ش هی گەورە بچووك دەبینێ

(وەرگێڕ)

خاوێن و بەخشندەیە لە بەرزایی خۆیدا و، لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانترە، چۆن دەستیان لێ هەڵدەگرێت؟ خوای گەورەی شکۆمەند گەلێ بەرز و مەزنترە لەوەی کە ئەو بەندەیەی لە ڕێی ئەودا هەموو شتێکی خۆی بەخشیوە، لە سۆز و بەخشندەیی و چاودێریی خۆی بێ بەش بکات.

بەم جۆرە، بەدیعوززەمان بە باشترین نموونەی ئەم دەستبەرداری‌یە ناوازەیە دادەنرێت، چونکە تەمەنی بەپیتی خۆی بە دوورەپەرێزیی لە هەموو کەرەسەیەك و بێ بەشیی لە سەرجەم چێژە ڕەواکان بەسەر بردووە. ئیتر هیچ هەلێکی ڕەخساوی بۆ نەهاتووەتە پێش کە بیر لە پێکهێنانی ژیانێکی خێزانیی کامەران بکاتەوە و لە ژێر سایەیدا ژیانێکی بەختەوەرانە بەسەر ببات. بەڵام خوای گەورە چاکەیەکی ئەوتۆی پێ بەخشیوە کە پێنووسەکان لە ناساندنی و وەسفی مەوداکانیدا دەستەوسان دەبن.

ئایا چ خێزاندار و خاوەن ماڵێك ئەمڕۆ لەو بەختەوەرترە؟ ئایا چ باوکێك هەیە ژمارەی منداڵەکانی بە ملیۆنەها بێت، کە مەگەر تەنها خوا بزانێت چۆن ڕۆڵەیەکی باش و گوێڕایەڵن! یان ئایا چ مامۆستا و فێرکارێك ئەم ژمارە زۆرەی قوتابیان لەسەر دەستی پێدەگەن.

بە پشتیوانیی خوای گەورە ئەم ئەڵقە پاك و پیرۆزە، هەتا ئاسمانەکان و زەوی بمێنن بەردەوام دەبێت و، هەتاهەتایە بە وێنەی لافاوێکی ڕووناکی خوڕ دەبێتەوە. چونکە ئەم بانگەوازە خواییە لە کانیاوی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاوە و لە دەریای نووری ئەویش سەرچاوەی گرتووە، کەواتە "بوون" و "ژیان"ی تەنها لەو بەدەست دەهێنێت.

### سۆز و میهرەبانی

مامۆستا نوورسیی خواناس هەر لە منالی‌یەوە حەق و ڕاستیی دۆزیوەتەوە، لەو ڕۆژگارانەوە کە پەنای دەبردە بەر چۆڵەوانی و ئەشکەوتەکان بۆ گوێ ڕاگرتن لە ئاخ و حەسرەتی دڵی خۆی و، گەڕانەوە و پاڕانەوەکانی گیانی، هەتا ئەو دەمەی کە تامی "گوێڕایەڵی"ی خوای گەورەی چەشت و، شیلەی "پەرستش"ی نۆشی و، بۆنی خۆشی "بیرکردنەوە" بەسەر دڵیدا هەڵی کرد و، لە "پەروەردەی ڕۆحی و دەروونی"شدا هێندە ڕێی بڕی تا گەیشتە لوتکەی دڵنیایی و ئارامی.

خۆ کاتێ کە دێوەزمەی ئیلحاد بە وێنەی چەند شەپۆلێکی شەوگاری تاریك دای بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، بە تایبەتی وڵاتەکەمان، مامۆستا نوورسی لەو ڕۆژگارە ترسناك و نەگریسانەدا بە وێنەی ڕاپەڕینی شێر لە لانەکەی، بە گوڕ و تینەوە هاتە مەیدانی خەبات، دەتوت گڕکانێکە تەقیوەتەوە و، هەموو بوون و قەوارەی خۆی کردە قوربانیی ئەم بانگەوازە پاك و خاوێنە. ئیتر لەو ڕۆژەوە هەموو یەکێکی وشەکانی و یەك بە یەکی هزر و بیرەکانی بە وێنەی پزیسکی ئاگر لە ناو دڵاندا هەڵدەگیرسێن و، وەکو پشکۆ لەناو هەست وهزرەکانیشدا دەگەشێنەوە.

گەڕانەوەی مامۆستا نوورسی بۆ ناو کۆمەڵگا بە مەبەستی بانگەواز و ڕێنمایی، لە دوای گۆشەگیری و دوورەپەرێزی، وەکو گەڕانەوەکەی ئیمامی غەزالی وایە. بێ گومان خوای گەورە بەندە پاڵاوتە و هەڵبژاردەکانی خۆی و ڕابەرە مەزنەکان، ماوەیەك لە گۆشە چۆڵەکاندا پوخت و خاوێن دەکاتەوە، پاشان ئەرکی ڕێنمایی و بانگەوازیان دەخاتە ئەستۆ. ئیتر هەرکات هەناسەی ئەو مەردە گەورانە بەر دڵان دەکەون، ژیانیان تێدا دەبووژێننەوە.

مامۆستا نوورسی چەندین فتووحاتی لە بواری ئیمان و ئیخلاسدا بەدەست هێنا، وەك ئەوەی کە ئیمامی غەزالیی مامۆستای، نۆسەد ساڵ پێش ئێستا چەندین فتووحاتی لە مەیدانەکانی ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکاندا ئەنجام دا.

بەڵێ، سۆز و میهرەبانیی مامۆستا نوورسی هەمیشە بەرەو مەیدانەکانی ئەم خەباتە ترسناکەیان بردووە. دەبا ئەم ڕاستییە لە خۆی ببیستین:

"پێم دەڵێن: بۆچی فلان و فیسار زامدار دەکەیت؟ نازانم.. هەستم نەکرد و بەرپێی خۆم نەبینی.. لەبەر ئەو ئاگرە گەورەیەی کە لە بەردەممدا بڵێسەکەی بەرز دەبێتەوە و منالەکانم دەسووتێنێت و گڕ لە ئیمانەکەم بەردەدات. جا لەو کاتەدا کە لە هەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکە و ڕزگارکردنی ئیمانەکەمدام، کەسێك تەگەرەم دەخاتە پێش و پێی منی بەردەکەوێت..

ئایا ئەم ڕووداوە جوزئییە چ نرخ و گرنگییەکی هەیە لەچاو هەڵمەتی دڕندانەی ئاگرە سووتێنەرەکەدا؟ ئنجا بزانە کە ژیریی ئەوانە چەندە بچووك و تێڕوانینیشیان تا چ ڕادەیەك کەم و کۆتایە"!

بێ نیازی

مامۆستا نوورسی لە درێژایی ژیانی خۆیدا جوانترین نموونەی "بێ نیازیی لە خەڵك" پێش چاوی توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگاکەمان خستووە، بە ڕادەیەکی وا کە ئەو نموونانە بوونەتە چەند داستانێك و لەسەر زارەکاندا دەماودەمیان پێ دەکرێت. ئیتر بە هەموو قەوارە و کەسایەتی و فراوانیی گیانی خۆی و بە تەواوەتی لە هەموو کەسێکی جگە خوای گەورە بێ نیاز بووە و، پەنای بۆ سایەی پەروەردگار بردووە و، پشتی بە فراوانیی گەنجینەکانی میهرەبانیی ئەو بەستووە کە چەندین گەنجینەی بێ کۆتایین.

وەنەبێ ئەم بێ نیازییەشی هەر تەنها عادەتێك بووبێت، بەڵکو ڕێباز و ڕێچکەیەك بووە کە لە ماوەی ساڵەکانی تەمەنیدا گرتوویەتەبەر و، تا ئێستاش هەنگاوەکانی بەوپەڕی دامەزراوی هەر لەسەر ئەم ڕێگایە دادەنێت، چەندەش گیروگرفتی زۆری لەو پێناوەدا بۆ دروست ببێت.

سەرنج ڕاکێش لێرەدا ئەوەیە کە ئەم ڕێبازە تەنها بە کەسی خۆیەوە قەتیس نەبووە، بەڵکو گواستراوەتەوە بۆ قوتابیانی و، بووەتە ئامانج و ئاواتی پیرۆزی ئەوانیش لە ژیاندا!

مرۆڤ ناتوانێت خۆی ڕابگرێت و قوتابیی نووری خۆش نەوێت، کە مرۆڤێکە لە دەریای نووردا خۆی شۆردووە و، لە سەرچاوەی ئەو ئاوە سازگارەشی نۆشیوە.

بڕوانن کە چۆن مامۆستا نوورسی لە مەکتووبی دووهەمی "مەکتووبات"ەکەیدا ئەم خاڵەی بە هەست و نەستێکی ئیمانی و زانستی، لە شەش ڕوودا ڕوون کردووەتەوە:

(یەکەم:

گومڕایان هەمیشە "زانایان" بەوە تۆمەتبار دەکەن کە گوایا زانستەکەیان وەك داوێك بۆ ڕاوکردنی دەستکەوتەکانی دنیا بەکاردەهێنن! ئا لێرەوە بە ناحەق هێرشیان دەکەنە سەر و پێیان دەڵێن: "ئەوانە زانست و ئایینیان دەکەن بە هۆکارێك بۆ بەدەستخستنی گوزەرانیان".

کەواتە دەبێ بە کردار و ڕەفتار ئەو گومڕایانە بەدرۆ بخرێنەوە.

دووهەم:

دەبێ ئێمە لە ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی "حەق"دا شوێن پێی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - هەڵبگرین. ئەوەتا قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەوانەی

"حەق"یان بڵاو کردووەتەوە، بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا ڕایانگەیاندووە کە: پێویستییان بە هیچ کەسێك نییە و، فەرموویانە:

﴿إن أجريَ إلاّ على الله﴾ ، ﴿إن أجريَ إلاّ على الله﴾[1].

ئنجا ئەو ئایەتەی سوورەتی "یاسین"یش کە دەفەرموێ: ﴿اتّبعوا مَن لا يسئَلُكم أجراً وهم مُهتدون﴾ (يس: ٢١) چەندین واتای زۆر و ناوەڕۆکی قووڵی تێدایە سەبارەت بەم مەسەلەیەی کە لێی دەدوێین)[2].

پشتگیریی خواوەند لە سەرکەوتنەکانی پەیامەکانی نووردا، تەنها بەرووبوومێکن بۆ جوامێریی خۆڕاگری لەسەر ڕێبازی پێغەمبەران (درووديان لەسەر بێت) و کردنیان بە پێشەنگ. هەر لەم ڕەهەندەوەیە کە مامۆستا نوورسی توانیویەتی عیززەتی زانستیی خۆی بپارێزێت، ئەوەی کە بە پڕاوپڕی دنیا لە ئاڵتوون ناگۆڕدرێتەوە.

ئاخر چۆن ئەو کەسە نابێتە "فاتیحی دڵان" کە بەستێنەکانی مووچە و پلە و، کۆت و زنجیرەکانی سامان و، هیچ کام لە بەرژەوەندییە ماددییەکان، کە خەڵکی بە دوایاندا لە هەناسەبڕکێدان، ڕێگا بۆ ناو دڵی ئەو نەدۆزنەوە؟ ئیتر چۆن دڵە ئیماندارەکان لە نوور و بەرەکەتی ئەو پڕ نابن؟!

## دەست پێوەگرتن لە گوزەراندا

"دەست پێوەگرتن" ڕوونکردنەوەی واتای ئەو بێ نیازییەیە کە باسکرا.

مرۆڤ بۆ ئەوەی بڕواتە ناو دیوانی دەست پێوەگرتنەوە، دەبێ لە دەروازەی بێنیازییەوە بڕواتە ژوورەوە! لەبەر ئەوە، ئەگەر یەکێکیان "لازم" بێت ئەوی تریان دەبێتە "مەلزووم"ی.

تێکۆشەرێکی ڕووسپیی وەکو مامۆستا نوورسی، کە لە دەستبەرداری و بێ نیازیدا پێغەمبەرانی - درووديان لەسەر بێت - کردووە بە پێشەنگ و پێشڕەوی خۆی، بێ گومان "دەست پێوەگرتن"ی لێ جیا نابێتەوە، هەتاکو دەبێتە ڕەفتار و خوویەکی

---

(١) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە. وەك: (يونس:٧٢)، (هود:٢٩)، (سبأ:٤٧). (وەرگێڕ)

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی دووهەم، ل: ١٩.(وەرگێڕ)

سروشتی و ڕەوشتێکی ئاسایی ئەو، ئیتر کەمێك شۆربا و پەرداخێك ئاو لەگەڵ لەتێك ناندا سەروزیادی بژێوی ڕۆژانەی دەبێت، چونکە ئەم مرۆڤە گەورەیە، وەك "لامارتین" شاعیری بە ویژدانی فەرەنسی دەڵێت:

"بۆ ئەوە ناژی کە بخوات، بەڵکو هێندە خۆراك دەخوات کە برسێتیی بشکێنێ، تاکو درێژە بە ژیانی بدات".

دەست پێوەگرتنی مامۆستا نوورسی تەنها لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و کاروبارە سادەکانی تردا نی‌یە و لەو سنوورەدا نەیوەستاندووە، بەڵکو واتایەکی فراوانی بە "دەست پێوەگرتن" بەخشیوە، ئەوەش بە ئیسراف نەکردن لە بەها پەتی و کاروبارە مەعنەوی‌یەکانی وەك هزر و توانا و لێهاتن و کات و دەروون و تەنانەت هەناسەشدا! ئیتر ئەم شێوازی لێپرسینەوە وردەی بۆ خۆی پەسەند کرد کە بە درێژایی ژیانی گرتیەبەر و، بە وێنەی یەکێك لە ئاکارەکانی خۆی پێش چاوی سەرجەم قوتابیانیشی خست. بەم پێ‌یە، تەڵقیندانی هزرەکان - هەرچی‌یەك بن - بە گوێی ئەواندا و، کتێب پێ خوێندنەوەی قوتابیی نوور بە هەر شێوەیەك ڕێك بکەوێت، کارێکی یەکجار دژوارە. چونکە تیشکۆی دڵی ئەو، کە وشەی "وریابە"ی لەخۆ گرتووە، بەهێزترین پارێزەریەتی لە گەشتی ژیانیدا.

بەم جۆرە و بە دامەزراندنی پێشەنگێکی پاك و خاوێن، نوورسی سەلماندی کە یەکێکە لە مرۆڤە دەگمەنەکان و، چاکسازێکی بە توانا و پەروەردەکارێکی زانا و شارەزایە بە دەروازە و کەلەبەرەکانی دەروونی مرۆڤ و، لاپەڕەیەکی فراوانی نوێی خستە سەر "مێژووی دەست پێوەگرتن" کە بە نوورێکی درەخشان نووسراوەتەوە.

### خۆ بە گەورە پیشان نەدان و دەستبەرداری

ئەم دوو سیفەتە کاریگەری‌یەکی یەکجار گرنگیان لە بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نووردا هەیە لە سەرانسەری دنیادا. چونکە مامۆستا نوورسی خەرمانەی "قطب العارفین" و بریق و باقی "غوث الواصلین"ی لە دەوری خۆی نەئاڵاندووە! لەبەر ئەوەیە کە دڵەکان خۆشیان ویست و، بەوپەڕی حەز و گەرموگوڕی‌یەوە بەرەو ڕووی ڕۆشتن و، دەرگاکانی خۆیان بۆ خستە سەرپشت، تاکو پێشوازی لە ئامانجە بڵند و مەزنەکەی بکەن..

بۆ نموونە: زۆرێك لە ئامۆژگاری و وانەكانی لە ڕەوشت و ئاكارە بەرزەكان و پەند و حيكمەتەكاندا، ڕاستەوخۆ ئاراستەی خۆی دەكات و، دەروونی خۆی دەكاتە تاقانە و يەكەم گوێ بيست بۆ گوفتارە بەهێز و وشە توندوتيژەكانی. ئيتر ڕووناكی‌يەكان لەو مەڵبەندەوە بڵاودەبنەوە بەرەو ئەو دڵانەی كە تامەزرۆ و تينووی دڵنەوايی و بەختەوەری و ئاسودەيين، بە وێنەی بڵاوبوونەوەی شەپۆلە هەڵچووەكانی دەريا لە سەنتەرەوە بۆ دەورووبەر.

مامۆستا نوورسی لە ژيانی كەسيی خۆيدا هەتا بڵێی خاكی و لەسەرخۆيە و، بە هەموو توانايەكی لە ئازاردانی خەڵك، تەنانەت لە ئازاردانی بچووكترين زيندەوەريش خۆی دەپارێزێت. بەم پێ‌يە چەندين سەختيی بێ سنوور و تەنگانەی جۆراوجۆر و گرفتی جيا جيا دەچێژێت، بەو مەرجەی پەنجە بۆ ئيمانەكەی نەبرێت و، بە خراپيش دەست بۆ كتێبە پيرۆزەكەی درێژ نەكرێت كە قورئانی پيرۆزە! چونكە لەو كاتەدا ئەم دەريا ئارامە دەشڵەقێت و شەپۆلەكانی هێندە بەرز دەبنەوە و تۆفانێكی وەها پێكدەهێنن كە سەرسامی دەهاوێت و، سام و ترس و لەرزيش لە كەنارەكانيدا هەڵدەڕێژێ! كەواتە پاڵەوان و سەربازێكی هێندە ئازا و بەجەرگە كە سنووری ئيمان دەپارێزێت..

ئاخر چۆن نا؟ ئەی ئايا ئەو خزمەتگوزارێكی ئەمينی قورئانی پيرۆز نی‌يە كە بەوپەڕی ڕاستی بەرگريی لێ دەكات؟!

مامۆستا نوورسی بۆ خۆی ئەم ڕاستی‌يە بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون دەكاتەوە:

"هەروەك ئەو سەربازە ئێشكگرەی لە شوێنی دياريكراودا ڕاوەستاوە، نابێ دەستبەرداری چەكی خۆی ببێت، تەنانەت گەر سەركردەی گشتيی سوپاش بێت بۆ سەردانی.. منيش سەربازێكم لە سەربازەكانی قورئان و، يەكێكم لە خزمەتگوزارەكانی و، لە ڕووی سەرسەختترين كەسدا حەق ئاشكرا دەكەم، بێ ئەوەی سەری خۆمی بۆ نەوی بكەم".

* * *

ئاواتەخواز بووم كە پێش دەستكردن بەم كتێبە، لە لايەنی زانستی و، هزر و، سۆفێتی و، ئەدەبی مامۆستا بەديعوززەمان بدوێم. بەڵام بە دڵنيايی زانيم كە ئەم بابەتە

گشتگیر و خاوەن ناوەڕۆکە قووڵانە ناتوانرێت لە چەند لاپەڕەیەکدا سنووردار بکرێن، بۆیە تەنها بە چەند ڕستەیەك ئاماژەیان بۆ دەکەم:

زانستەکەی

شاعیری خوالێخۆشبوو "زیاء پاشا" لە بەیتێکیدا حەقیقەتێکی مەزنی دەربڕیوە، کە نەوەکان یەك لە دوای یەك دەیلێنەوە و، بریتی‌یە لەوەی:

"کردار" نەك گوفتار نمای ئینسانە "بەرهەم" پێوەری پلەی مەردانە

بەڵێ، بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی کە لە کتێبخانەی زانست و ئیماندا "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"ی کردووە بە دیاری بۆ گەلی موسڵمانی ئێمە و، لە ناو دڵەکانیشدا قوتابخانەیەکی پیرۆزی نوورانیی دامەزراندووە، کەسایەتی‌یەکی کەم وێنەی ئاوا، بێ نیازە لەوەی کە درێژە بە باسی توانای زانستیی بدرێت، بە وێنەی بێ نیازیی "خۆر" لە وەسف کردنی بە ڕۆژی ڕۆشنادا.

بەڵام وەك شاعیرێکی دڵ سوتاو دەڵێت:

جوانی ئەوەیە "ویست" دامالێت

توێژەری ژیان و کەماڵ و ڕەوشت و ڕەفتارەکانی ئەم مەردە گەورەیەی کە لە سایەی چاودێریی خوای گەورەدایە، لە هەموو چرکەیەکی ژیانیدا هەست بە چێژێکی خاوێن و بەرز و، ئارامی‌یەکی بلند دەکات. بۆیە ویست و ئیختیاری لێ دادەماڵرێت و ناتوانێ درێژە بە گوفتارەکەی نەدات!

مامۆستا نوورسی لە "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"دا لە گرنگترینی بابەتە سەرەکی‌یەکانی" ئایین و، کۆمەڵناسی و، ئەدەب و، یاسا و، فەلسەفە و، تەسەووف" دواوە و، هەتا بیشڵێی تیایاندا سەرکەوتوو بووە..

ئەو شتەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە خۆی لە دەریای ئەو مەسەلە و بابەتە سەخت و ئاڵۆزانەش داوە کە زۆرێك لە زانایان تیایدا سەرگەردان بوون و، لە چارەسەریاندا دەستەوسان مان و لە ڕێی ڕاست ترازان! کەچی ئەم بەوپەڕی ئاسانی و بە شێوەیەکی بێگومان ڕوونی کردنەوە و، بۆ خۆی گەیشتە لێواری ئاسوودەیی و، خوێنەرانیشی گەیاندە ئەو لێوارە، ئەوەش بە گرتنەبەری ڕێی ئەهلی سوننەت و جەماعەت!

لەم ڕوانگەیەوە خۆمان بە بەختەوەر دەزانین کە "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" بەوپەڕی ئەمانەت و سنگ فراوانییەوە پێشکەش بە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگاکەمان بکەین.

ئەم پەیامانە چەند دڵۆپێکی بریسکاوەن لە زەریای قورئانی پیرۆز و، چەند چەپکێکی نوورانین لە تیشکی خۆری هیدایەت. بۆیە ئەو کارە بە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی هەموو موسڵمانێکی بەغیرەت دادەنرێت کە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم پەیامانە هەوڵ بدات، لە پێناوی ڕزگار کردنی ئیمانی کەسانی تردا.

مێژوو بە گەلێ نموونەی خۆی شایەتە لەسەر ئەوەی کە چەندین کەس و خێزان و گەل و کۆمەڵگای بێ سنووری ئادەمیزاد لە ڕێی تەنها یەك دانە کتێبەوە هیدایەت دراون و بەختەوەرییان بەدەست هێناوە.

ئەو مرۆڤە چەندە دڵخۆش و شادمانە کە دەبێت بە هۆی هیدایەت و ئیمان هێنانی برایەکی مرۆڤی خۆی!

### هزر و بیری

ئاشکرایە کە هەموو "بیریار"ێك ڕێبازێکی جیاواز و هزرێکی تایبەت بە خۆی هەیە و، خاوەنی ئامانجێکە لە ژیانی فیکریی خۆیدا کە لە پێناویدا تێدەکۆشێت و لە ناخی دڵەوە پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵدا هەیە. بەڵێ، دەبینین بۆ باسکردنی هزری مامۆستا نوورسی و قبوولکردنی ڕێباز و ئامانجەکەی، گەلێ پێشەکیی دوور و درێژ دەهێنرێتەوە. کەچی زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت هزر و ڕێباز و ئامانجی مامۆستا لەم دەستەواژەیەدا دەربهێنرێت کە:

"تاقانە ئامانجی کتێبە ئاسمانییەکان و، تەنیا بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بریتییە لە ڕاگەیاندنی "خوایەتی" و "یەکتایی" بەدیهێنەری بوونەوەران و، سەلماندنی ئەم بانگەوازە هەرە مەزنە بە بەڵگە زانستی و مەنتیقی و فەلسەفییەکان".

ئایا واتای ئەم دەستەواژەیە ئەوەیە کە مامۆستا نوورسی پەیوەندیی بە مەنتیق و فەلسەفە و زانستە گەردوونییەکانەوە هەیە؟

بەڵێ، مامۆستا نوورسی بۆ خۆی زانایەکی گەورەی مەنتیق و فەیلەسووفێکی بەتوانایە، مادەم فەلسەفە و مەنتیق لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا لە ئاشتەواییدا بن و، ڕێی خزمەتکردنی حەق و ڕاستی بگرنەبەر، لە پێناوی چەسپاندنی مەودای حەقتر بوونی بانگەوازە جیهانیی‌یە پیرۆزەکەی قورئاندا. هەروەك زانستیش بە دەستەوە دەگرێت تاکو جارێکی دیکە لەو ڕێیەوە و بە درەخشانترین بەڵگەی بێ گومان بیسەلمێنێت کە قورئانی پیرۆز گوفتاری ئەزەلیی خوای گەورەیە.

خۆ هەتا فەلسەفە لە واتای "حیکمەت" نزیك بێتەوە، ئەوا هەموو کتێبێکی فەلسەفە دەبێتە "حیکمەت"ێکی مەزن و، دانەرەکەشی دەبێت بە "حەکیم"ێکی کارامە لە ڕێی چەسپاندنی بوونی بەدیهێنەری بەخشندەدا، بەو سیفەتە موقەددەسانەی کە شایانی ئەون.

مامۆستا نوورسی، بە گرتنەبەری ئەم ڕێگا زانستیی‌یە توندوتۆڵ و نوورانیی‌یەی قورئانی پیرۆز، شەرەفی ڕزگار کردنی ئیمانی هەزاران کەسی دەست کەوتووە لە قوتابیانی زانکۆ، هەروەك گەلێ تایبەتمەندیی زانستی و ئەدەبی و فەلسەفیی تریشی بەدەست هێناوە.

تەسەووفی

ڕۆژێکیان لە زانایەکی گەورەی تەریقەتی نەقشبەندیم پرسی، کە بە هەموو توانایەکی تێدەکۆشێت لە سەرجەم جموجووڵەکانیدا شوێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت، وتم:

هۆی تێکچوونی پەیوەندیی نێوان سۆفی و زانایان چی‌یە؟

وتی: " زانایان "زانست"ی پێغەمبەر ﷺ و، سۆفی‌یەکانیش "کردار"ەکانی ئەو سەروەرەیان بە میرات وەرگرتووە. لەبەر ئەوە، هەرکەسێك زانست و کرداری ئەوی پێکەوە بەرکەوتبێت پێی دەڵێن: "ذو الجناحین". کەواتە مەبەست لە تەریقەتدا کارکردنە بە عەزیمەتەکان، نەك ڕوخسەتەکان. هەروەها ڕەوشت گرتنە بە ئاکارە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ و خۆ پاك کردنەوەیە لە سەرجەم نەخۆشی‌یە مەعنەوی‌یەکان و، توانەوەیە لە ڕەزامەندیی خوای گەورەدا..

ئەو کەسەی کە ئەم پلە یەکجار بەرزەی دەست دەکەوێت، بێ گومان لە ئەهلی حەقیقەتە. واتە گەیشتووەتە ئەو ئامانجەی کە لە تەریقەتدا جێی مەبەستە. جا لەبەر ئەوەی

بەدەستهێنانی ئەم پلە بڵندە بۆ هەموو کەسێك مەیسەر نابێت، ئەوا گەورە مەردانمان چەند دەستوورێکی دیاری کراویان داناوە کە بە ئاسانی مرۆڤ دەگەیەننە ئەو ئامانجە.

بە پوختی: "تەریقەت" لە ناوەندی بازنەی "شەریعەت"دا دەخولێتەوە. خۆ ئەگەر کەسێك لە تەریقەتەوە بەربێتە خوارەوە، دەکەوێتە ناو بازنەی "شەریعەت". بەڵام ئەو کەسەی – پەنا بە خوا – لە بازنەی شەریعەت دەردەچێت، ئەوا زیانێکی گەلێ ئاشکرا دەکات".

بە پشت بەستن بە وتەی ئەم زانا مەزنە، هیچ جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان ناوەرۆکی ئەو ڕێگا نوورانییەدا کە بەدیعوززەمان گرتوویەتەبەر و ئەو تەسەووفە ڕاستەقینەیەدا نییە کە شتێکی دیکەی تێکەڵ نەبووبێت جگە لەوەی باسکرا. هەردوو کیشیان مرۆڤ دەگەیەننە ڕەزامەندیی بەدیهێنەر، کە ئەویش دەیگەیەنێتە بەهەشت و بینینی جوانیی خوای گەورە.

بەم پێیە، هەموو یەکێکی برایانمان لە ئەهلی تەسەووف کە بۆ ئەو ئامانجە ڕەسەن و بەرزانە تێدەکۆشن، دەتوانن بەوپەڕی خۆشەویستی و بە بێ هیچ ڕێگرێك "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" بخوێننەوە. تەنانەت پەیامەکانی نوور بە گرتنەبەری ڕێگای قورئانی پیرۆز بازنەی "موراقەبە"ی تەسەووفیان فراوان کردووە و، ئەرکی "بیرکردنەوە"شی وەکو ویردێکی گرنگ بۆ ئەوان زیاد کردووە.

بەڵێ، ئەو ڕێبوارەی ڕێی تەسەووف کە سەرقاڵی چاودێریی دڵی خۆیەتی، بەم "بیرکردنەوە"یە چەندین ئاسۆی فراوان لە پێش چاوی خۆی و دڵیدا دەکاتەوە، هەروەك بە دڵ و سەرجەم لەتائیفەکانی تری دەروانێتە بوونەوەران بەو مەزنییەی خۆیانەوە، هەر لە گەردیلەکانەوە هەتا هەسارەکان و، بەوپەڕی شادمانییەوە هەزار و یەك درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و سیفەتە شکۆمەندەکانی لەو جیهانانەدا دەبینێت. ئیتر بە "علم الیقین" و "عین الیقین"، تەنانەت بە "حق الیقین"یش دەبینێ و هەست دەکات لە ناو مزگەوتێکی هێندە فراواندایە کە ئەو کۆمەڵانەی دەڕۆنە ناوی لە سنووری ژمارە و ڕەنووس بەدەرن و، هەر هەمووشیان، بەوپەڕی شەوق و ملکەچی و مەستی و خۆشەویستییەوە و بە یەك دەنگ، یادی بەدیهێنەریان بە شێوەیەك دەکەنەوە کە

ئاوازە تەبا و سازگارەکانی ئەو زیکر و یادە بە چەندین زمانی جیا جیا لەو مزگەوتەدا دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن:

"سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر".

بەم جۆرە، ئەو کەسەی بەم ڕێگا نوورانی و ئیمانی و بەڵگەییەدا دەڕوات کە پەیامەکانی نوور بەرەو قورئان و ئیمان و زانست کردوویانەتەوە، دەڕواتە ناو ئەم چەشنە مزگەوتە مەزنەوە. هەرکەسەش بە ئەندازەی ئیمان و ئیخلاس و زانستی خۆی، لەم سەرچاوە بە خوڕەمە بەهرەمەند دەبێت.

### ئەدەبەکەی

ئەدیبان و شاعیران و بیریاران و زانایان، هەر لەمێژە، لە ڕووی وشە و واتا و شێواز و ناوەرۆکەوە بوون بە دوو بەشەوە. هەندێکیان تەنها بایەخی بە شێواز و گەیاندنی مەبەست و کێش و سەروا داوە و، واتایان بۆ شێواز بەخت کردووە. کە ئەمەش بە جوانی لە شیعردا دەردەکەوێت.. بەڵام بەشەکەی تر لایەنی ناوەرۆك و واتایان کردە مەبەست و نەیانکرد بە قوربانی بۆ وشە و شێواز.

جا لەبەر ئەوەی مامۆستا نوورسی بلیمەتێکی کەم وێنەیە، ئەوا تەمەنی بەپیت و پڕ لە بەخششی خۆی لە ڕیزکردن و ڕێکخستنی وشەکاندا بەسەر نەبردووە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، کاری سەرەکیی ئەو بریتی بووە لە زیندووکردنەوەی هەستی ئایینی و ئیمانی، هەروەك زیندوو ڕاگرتنی چەمکی ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکانی کردووە بە ئاوات و ئامانجی خۆی. ئەوەش بە دامەزراندن و جێگیرکردنیان لە گیان و ویژدان و هزرەکاندا، تاکو لە ناوەندی چەرخ و سەردەمەکانەوە بۆ بەرەکانی داهاتوو بگوێزرێنەوە.

شتێکی سروشتییە بۆ کەسێکی وەك ئەم تێکۆشەرەی کە هەموو هەناسە و ژیانی خۆی لە پێناوی هێنانەدیی ئەم ئامانجە بەرزەدا بەخت کردبێت، سەرقاڵی وشەی ڕازاوە و لایەنە ڕووکەشەکانی شێواز نەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت بوترێ:

مامۆستا لە ڕووی جوانیی چێژ و، ناسکیی هەست و، قووڵیی هزر و، دووربیی ئەندێشەوە، خاوەنی مەلەکەیەکی ئەدەبیی داهێنەر و نائاساییە. بۆیە بەپێی جۆراوجۆریی

"بابەت" شێوازی تایبەتی و داڕشتنی جیاوازیش لە نووسینەکانیدا بەکار دەهێنێت. ئەوەتا کاتێ لە بابەتە فەلسەفی‌یەکاندا دەیەوێت بە بەڵگەی مەنتیقی قەناعەت بە ژیری ببەخشێت، دەچێ دەستەواژە کورت و پوختەکان بەکار دەهێنێت. بەڵام کاتێ کە دەیەوێت دڵ و ڕۆح بەرەو بەرزاییەکان ببات، ئەوا بە تەواوی دەروونەکان کەمەندکێش دەکات..

بۆ نموونە: کاتێ لە ئاسمان و خۆر و ئەستێرەکان و ڕووناکیی مانگ دەدوێت، بە تایبەت لێدووانەکانی لەبارەی وەرزی بەهار و درەوشانەوەی توانست و مەزنیی بەدیهێنەر لەم جیهانانەدا، ئەوا شێوازەکەی نەرمونیانی‌یەکی تایبەتی بەدەست دەهێنێت، وەك بڵێی هەموو یەکێك لەو تەشبیهانەی کە دەیانهێنێت یادکردنەوەی تابلۆیەکی هونەریی ڕەنگین بێت کە خەرمانەی جوانترین و سازگارترین ڕەنگ دەورەیان دابێت. لە بەکارهێنانی وێناکانیشدا ژیان بە بەر جیهانێکی پڕ لە گەورەترین کاری دەراسادا دەکات.

لەم نهێنی‌یەوەیە کە قوتابیی نووری زانکۆ دەتوانێت بە خوێندنەوەی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" هەموو هەست و هزر و گیان و ویژدان و ئەندێشەی خۆی تێر بکات. ئەی ئایا چۆن دڵ ئارام نابێت، لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور چەپکێکی هەڵبژاردەن لە گوڵزاری ئەو قورئانە پیرۆزەی کە هەموو جیهانەکانی لە ئامێز گرتووە! ئەوەتا بۆن و بەرامەی باخچەی پیرۆزی خوای میهرەبان و ڕووناکی‌یەکانی ئەو باخە، لەو پەیامانەوە بڵاو دەبنەوە.

# بەندی یەکەم

## لەدایکبوون و گەورەبوون

## سالّی ١٨٧٧ز/١٢٩٤ك

❑ ناسنامەی کەسیی:

ناو و نازناوی: بەدیعوززەمان سەعید.

ناوی باوکی: میرزا[١].

ناوی دایکی: نوورییە[٢].

بەرواری لەدایکبوونی: سالّی ١٢٩٣[٣].

شوێنی لەدایکبوونی: گوندی "نوورس"ی سەر بە ناحیەی "ئیسپاریت" کە سەر بە قەزای "خیزان"ە و لە شوێنەکانی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ە.

ئایینی: موسلّمان.

---

(١) "سۆفی میرزا"ی باوکی لە "وەرع"دا هێندە بەناوبانگ بووە کە بە نموونە هێنراوەتەوە و، تامی پارووی حەرامی نەچەشتووە و، جگە لە حەلاڵ هیچ شتێکی دەرخواردی منالەکانی نەداوە. تەنانەت کە ئاژەڵەکانی لە کێلگە و لەوەڕگاکان دەهێنایەوە، دەمی دەبەستن تاکو لە گیا و دەغڵ و دانی خەلّك نەخۆن (ش ١/٥٤). لە سالەکانی بیستی سەدەی بیستەمدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" ئەسپەردەی خاك کراوە و لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسراوە: (مرزە).

(٢) کاتێ پرسیار لە دایکی کراوە: بە چ جۆرێك منالەکانت پەروەردە کردووە وا هێندە لە ڕادەبەدەر زیرەکن؟ لە وەڵامدا وتوویەتی: مەگەر لەو کاتانەی عوزری شەرعیم بووبێت، دەنا هەرگیز دەستبەرداری شەونوێژ نەبووم و، دەستیشم بە دەستنوێژەوە نەبووبێت شیرم بە منالەکانم نەداوە. (ب ١/٥٩) لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گوندەکەیان لە نێوان گۆڕی سۆفی میرزا و مەلا عەبدوڵلای کوڕە گەورەیدا نێژراوە.

(٣) بە پێی مێژووی ڕۆمی کە لە کۆتایی دەولەتی عوسمانیدا کاری پێ دەکرا و، سالْ لەو تەقویمەدا لە یەکی مارتەوە دەستی پێ دەکرد. ئەم سالەش دەکاتە سالی ١٢٩٤ کۆچی (١٨٧٦ - ١٨٧٧ز).

ڕوخساری: باڵا بەرز، چاو هەنگوینی، گەنم ڕەنگ.
نیشانەی جوداکەرەوەی: نی‌یە[١].

* * *

[ جگە لەمانەی ڕابورد، لەو داخوازی‌یەشدا کە پڕی کردووەتەوە بۆ "دار الحكمة الإسلامية" ئەم زانیاری‌یانەی خوارەوەی تۆمار کردووە ]:

ناوم: سەعید.

نازناوم: بەدیعوززەمان.

ناوی باوکم: میرزا.

لە هیچ بنەماڵەیەکی ناسراو نیم.

شافیعی مەزهەبم.

یەکێکم لە هاووڵاتیانی دەوڵەتی پایە بڵندی عوسمانی.

لە سەرەتای خوێندنی زانستیمدا نزیکەی دوو ساڵ لە ناحیەی "ئیسپاریت" لای کاکە مەلا "عەبدوڵڵا"ی برا گەورەم وانەم خوێندووە. پاشان لە شارۆچکەی "بایەزید"ی سەر بە پارێزگای "ئەرزڕۆم" ڕۆشتمە ئەڵقەی دەرسی "مامۆستا محەممەد جەلالی" و سەرجەم وانە دیاری کراوەکانم لەوێ تەواو کرد. پاشان بۆ ماوەی پازدە ساڵ وانەی زانستە جۆراوجۆرەکانم لە شاری "وان" بە دەرس وتووەتەوە.

کاتێکیش کە ئەم جەنگەی ئێستا – جەنگی جیهانیی یەکەم- ڕاگەیەنرا، بە سیفەتی فەرماندەی خۆبەخشەران بەشداریم تێدا کرد، ئنجا لە شاری "بەدلیس" بە دیل گیرام و کەوتمە بەردەستی ڕووسەکان. پاشان لە دیلی هەڵهاتم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ و، بووم بە ئەندام لە "دار الحكمة الإسلامية"دا لە سەرەتای دروست بوونیەوە.

لە دەمی دیلیمدا ئەو ئیجازەنامەیەم ون کرد کە لە مامۆستا "مەلا محەممەدی جەلالی"م وەرگرت.

---

(١) لەو بەڵگەنامەیە وەرگیراوە کە مامۆستا نوورسی لە کاتی وەرگیرانی بە ئەندام لە "دار الحكمة الإسلامية"دا پێشکەشی کردووە. (ش ١٩٨/١).

حەڤدە دانراوم هەیە، کە ئەمانەن:

بە زمانی عەرەبی: "إشارات الإعجاز، تعليقات، قزل إيجاز، الخطبة الشامية"[١].

پاشماوەی کتێبەکانی تر بە زمانی تورکین، کە بریتین لە:

"خالێك لە نووری ناسینی خوای گەورە، تیشکەکانی ناسینی پێغەمبەر ﷺ، سنووحات، مونازەرات، موحاکەمات، گزنگەکان، چەند بریسکانەوەیەك، هێماکان، ئاماژەکان، شەش هەنگاوەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ناوکەکانی حەقیقەت".

بە تورکی و کوردی قسە دەکەم، هەروەك بە عەرەبی و فارسیش دەخوێنمەوە و دەنووسم[٢].

□ خێزانەکەی

(لە تەمەنی نۆ ساڵییەوە دایکی میهرەبانم نەدیوە و بەهرەمەندی لەگەڵ دانیشتن و گفتوگۆی نەبووم، بۆیە لەو خۆشەویستییە بەرز و بڵندە بێ بەش بووم.

هەروەها لە تەمەنی پازدە ساڵیشمەوە نەمتوانیوە هەر سێ خوشکەکەم ببینم[٣]، چونکە - بە وێنەی دایکم - کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کرد. بۆیە من لە زۆر لوتف و سۆزی ڕێز و میهری ئەو چەشنە دانیشتن و بە یەك شادبوونەی "خوشك و برا" لە دنیادا بێ بەش بووم.

هەروەها وا پەنجا ساڵە دوانم لە سێ براکانم نەدیوە[٤]، خوا لێیان خۆش بێت. بەم جۆرە، من لەو شادمانی و دڵخۆشییە بێ بەش بووم کە ئەنجامی برایەتیی پڕ سۆز و

(١) پاشماوەی دانراوە عەرەبییەکانی تر، خرانە ناو کۆمەڵە پەیامی (مەسنەویی نووری).

(٢) ش١/٢٠٤.

(٣) ئەو سێ خوشکەی بریتین لە: "دورڕییە" کە دایکی "عوبەید"ە و پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کۆچی دوایی کردووە. هەروەها "خانم" کە ئافرەتە زانایەکی بەڕێز بووە و ساڵی ١٩٤٥ لە حەج و لە دەمی تەوافدا کۆچی دوایی کردووە (تیشکەکان، ل: ٤٣١). هەروەها "مەرجان" کە لە هەموویان بچووکتر بووە.

(٤) براکانی ئەمانەن "عەبدوڵڵا" لە ساڵی ١٩١٤ز کۆچی دوایی کردووە کە باوکی "عەبدوڕەحمان"ە، ئەوەی کە مامۆستا نوورسی بە قوتابی و کوڕی مەعنەویی خۆی ناوی دەبات. هەروەها "محەممەد" لە ساڵی ١٩٥١ زدا کۆچی دوایی کردووە، ئنجا "عەبدولمەجید" کە لە ساڵی ١٩٦٧ زدا کۆچی دوایی کردووە. کەواتە منداڵەکانی صۆفی "میرزا" یەك لە دوای یەك ئەمانەن: (دورڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).

میهرەبانی‌یە و، لە تێکەڵی و پێکەوە ژیانی ئەو ئازیزە زانا و خاوەن تەقوایانەوە مرۆڤ هەستی پێ دەکات.

ئەمڕۆ کە لەگەڵ ئەو چوار کەسەدا دەگەڕام کە لە کاروبارەکانمدا هاوکاریم دەکەن، بە یەقین و دڵنیاییەوە بەشێکم لەو تۆوەی بەهەشت بە دڵدا هێنرا کە لە ئیماندا هەیە، وەك ئەوەی "پەیامەکانی نوور" بە ڕوونی لێی دواون و پێش چاویان خستووە.

جا لەبەر ئەوەی من ژنم نەهێناوە و بە بێ هاوسەر ژیانم بەسەر بردووە، ئەوا مناڵیشم نەبووە و، لە چێژی خاوێن و بەرائەتی مناڵ و خۆشحاڵی و شادمانییان بێ بەش بووم.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز هەستم بەم نەبوونی و کەمی‌یە نەکردووە. هەر ئەمڕۆ خوای گەورە واتایەکی تابلێی بەتام و لەزەتی پێ بەخشیم و لە سێ ڕووەوە هەر چوار زامە ناوبراوەکانی بۆ تیمار کردم:

یەکەمیان: لە بریی ئەو سۆز و میهرەبانی‌یە تایبەتی‌یەی کە لە لایەن دایکمەوە ئاراستەم دەکرا، خوای گەورەی میهرەبان، بە چاکە و بەخشندەیی خۆی، هەزاران دایکی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە سوودی لە ڕادە بەدەر لە پەیامەکانی نوور وەردەگرن و چەندین تام و لەزەتی ڕۆحیی خاوێن و بێگەردی لێ دەچێژن. وەك فەرموودەی: "علیکم بدین العجائز"[١] دەری خستووە کە لە پەیامەکانی نووردا باس کراوە.

هەروەها لە بریی ئەو شادمانی و خۆشحاڵی و سۆزی خوشك و برایەتی‌یەی کە دەبوو لە تێکەڵی و پێکەوە ژیان و لەگەڵ دانیشتنی هەر سێ خوشکەکانمەوە - خوا لێیان خۆش بێت - بەدەستم بهێنایە، خوای گەورەی بەخشندە هەزاران خوشکی بەڕێز و لاوی پێ بەخشیم. منیش هەزاران سوود و بەروبوومی مەعنەوی و شادمانیی ڕۆحیم لە دوعا و نزاکانی ئەوان و پەیوەندی‌یان بە پەیامەکانی نوورەوە، دەست دەکەوێت. گەلێ نیشانەی زۆر هەن لەسەر ڕاستیی ئەم بەشەی دووهەم کە براکانم دەیانزانن و ئاگایان لێیەتی.

هەروەها لە بریی ئەو یارمەتی‌یە ماددی و مەعنەوی‌یەی کە چاوەڕوان دەکرا ئەو دوو برا خوا لێخۆشبووەم لە ڕووی سۆز و بەزەیی و میهرەبانی‌یەوە فریایان بخستمایە و بە

---

(١) الغزالي، إحياء علوم الدين، ٧٨/٣؛ الآمدي، الإحكام، ٢٣٠/٤؛ العراقي، تخريج أحاديث الإحياء، ٣٧٠/٦؛ السخاوي، المقاصد الحسنة، ٢٩٠؛ السيوطي، الدرر المنتثرة، ١٤، علي القاري، الأسرار المرفوعة، ١٢٤؛ العجلوني، كشف الخفاء، ٩٢/٢. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

دەممەوە بهاتنایە، خوای گەورە - بە میهرەبانیی خۆی - سەدان هەزار بـرای ڕاستەقینە و فیداكـاری لـە خزمـەتی پەیامـەكانی نـووردا پێ بەخشـیم كـە خـاوەنی سـۆزی خـاوێن و بێگـەردن و یارمـەتیم دەدەن و، نـەك هـەر تەنـها ژیـانی دنیایـان بـەڵكو سـەرمایەی ژیـانی ئەودنیاشیان لەو پێناوەدا بەخت دەكەن.

هەروەها لە بەرامبەر بێ بەش بوونم لە چێژی ئەو سۆز و بەزەییەی كە مرۆڤ بەرامبەر منالەكانی هەستی پێ دەكات، چونكە لە دنیادا ژنم نەهێناوە و منالم نییە، خوای گەورە - لە بریی ئـەوە - سـەدان هـەزار منـالی بێ گوناهـ و خـاوێن و بـەریی پێ بەخشیم لـەو ڕووەوە كە لە ئایندەدا سوود لە "پەیامەكانی نوور" وەردەگرن.

بەم جۆرە خوای گەورە ئەم سێ جۆرە سۆز و شەفەقەت و میهر و بەزەییە جوزئییەی بۆ گۆڕیم بە سەدان هەزار سۆز و شەفەقەت و میهرەبانی)[1].

○ عەبدولمەجیدی برای

("عەبدولمەجید"ی برام[2] بە هـۆی كۆچی دوایـی "عـەبدوڕەحمان"ی برازامـەوە و، لـەبەر چەند بـارودۆخێكی ئازاربـەخش و خـەمگین، هەسـتی بـە شـڵەژان و داڕمـانێكی توند و بەهێز دەكرد لە ناخی خۆیدا. ئنجا ئومێدەواری هیممەت و مەدەدێكی مەعنـەویی ئەوتۆ بوو لە لایەن منەوە كە لە توانای مندا نین..

خۆ هەرچەندە من نامەم بۆ نەدەنارد، كەچی كتوپڕ چـەند پـەیامێكم لـە "وتـەكان" بـۆ ڕەوانـە كـرد، ئـەویش لـە دوای خوێندنـەوەی ئـەو وتانـە نامەیـەكی بـۆ نـاردم كـە تیـایدا نووسیبووی:

"سوپاس بۆ خوا! ڕزگارم بوو.. چونكە پێش ناردنی ئەم وتانە وەخت بوو شێت ببـم! بەڵام هەریەك لەو وتانە جێی ڕابەرێكیان بۆ من گرتەوە. خۆ ئەگەر تەنها یەك ڕابـەرم لـێ

---

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی لەمیرداغ: ٢/٥٦٨-٥٧١.

(٢) بچووكترینی براكانی مامۆستا نوورسییە. بەشێكی لـە پەیامـەكانی نـوور كـردووە بـە عـەرەبی، هـەروەك "ئاماژەكانی ئیعجاز" و "مەسنەویی نووری"شی كردووە بـە توركی. لـە پێشـدا مامۆستای زمـانی عـەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانستە ئیسلامییەكان بـووە لـە پەیمانگای بـاڵای شـاری "قۆنیـە". لـە سـاڵی ١٩٦٧ز لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵیدا كۆچی دوایی كردووە و، لە گۆڕستانی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمـی لـە "قۆنیە" نێژراوە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

دوور کەوتبێتەوە، ئەوا بە یەك جار چەندین ڕابەری زۆرم دەست کەوت[1] و، سوپاس بۆ خوا لەو بارە پەرێشانە ڕزگارم بوو". منیش لـە لایـەنی خۆمـەوە کە سـەیری حـاڵی ئـەوم کرد و سەرنجم دا، بۆم دەرکـەوت ڕێگـا و ڕێبـازێکی جوانـی گرتووەتەبـەر و، بـە فـەزڵی خوای گەورە لەو حاڵەت و بارودۆخانەی پێشووی ڕزگاری بووە)[2].

(عەبدولمەجیدی برام یەکێکە لە قوتابی‌یە خۆبەختکار و کارگوزار و دڵسۆزەکانم.

کـاتی خـۆی خانوویـەکی جوانـی لـە شـاری "وان" هـەبوو، گوزەرانیشـی لـەوێ بـە گوێرەی دڵ بوو. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بە دەرس وتنەوە خەریك و سەرقاڵ بوو.

جا کاتێ کە خزمەتکردنی قورئان پێویستی کرد بەرەو شوێنێکی دووری سەرسـنوور بڕۆم، ویستم لەگەڵ خۆمدا بیبەم. بەڵام ئەو بەمە ڕازی نـەبوو، وەك بڵێـی پێـی بـاش بێـت منیش نەڕۆم، چونکە لەوانەیە کارەکە شـتێکی لـە بـارەی سـیاسەتەوە تێکـەڵ بێـت و، دوور نی‌یە دووچاری ڕەهەندەییشی بکات و، وای بە باش زانی کە هەر لەوێ بمێنێتـەوە. ئیتر بەم جۆرە لەگەڵماندا بەشـداریی نەکرد.

بەڵام زللەیەکی میهـرەبانیی وای لـێ درا کـە پێچـەوانەی مەبەسـتەکەی خـۆی هاتـە دی و، هەرگیز چاوەڕێی شتی وای نەدەکرد. ئەوەبوو لەوێ و لـە خانووە جوانکیلەکەی دوور خرایەوە و ناچار کرا بڕوات بۆ "ئەرگانی")[3]!

○ عوبەیدی خوشکەزای

("عوبـەید"ی خوشـکەزام یـەکێك بـوو لـە قوتابی‌یـەکانم و، لـە جـەنگی جیـهانیی یەکەمدا لە نزیکی منەوە و لە بریی من شەهید بوو. جا هەرچـەندە مـن لـە دیلیـدا بـووم و نەمدەزانی لە کوێ نێژراوە و سێ مانگە ڕێش لە شوێنی ناشتنیەوە دوور بووم، کەچی لە خەونێکدا کە پێم وایە "رؤيا صادقة" بوو، ڕۆشتمە نـاو گۆڕەکەیـەوە کـە لـە خانوویـەك دەچوو لە ژێر زەویدا بنیات نرابێت..

---

(١) چونکە خۆی دوورخرایەوە بۆ "ئەرگانی" و مامۆستا نوورسیش دوورخرایەوە بۆ "بوردوور". مەبەستیشی لە "چەندین ڕابەری زۆر" پەیامەکانی نوورە.

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٠٢-٦٠٣.

(٣) بریسکەکان، بریسکەی دەهەم، ل: ٨٥. ئەرگانی: قەزایەکی سـەر بـە پارێزگـای "ئەلازیغ"ی تورکیایە و (٥٠٠کم) بەرەو خۆرئاوا لە "وان"ەوە دوورە! (وەرگێڕ)

لەو خەونەدا ئەوم لە چینی پلەی شەهیداندا بینی. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە من مردووم و پێی ڕاگەیاندم کە گەلێ بۆم گریاوە! باوەڕیشی وابوو کە هێشتا خۆی ماوە، بەڵام لەتاو مەترسیی داگیرکردنی ڕووس خانوویەکی جوانی لە ژێر زەویدا بۆ خۆی بنیات ناوە)[1]!

○ عەبدوڕەحمانی برازای

("عەبدوڕەحمان"ی برازام[2] هەشت ساڵ پێش ئێستا بەجێی هێشتم و لێم دوور کەوتەوە. خۆ هەرچەندە لەم ماوەیەدا لەکەی بێ ئاگایی و شوبهە و گومان و وەهمەکانی دنیای بەرکەوتبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گومانێکی باشی لە ڕادەی خۆم زیاتری پێم هەبوو. بۆیە داوای لێ کردم هیممەتێکی ئەوتۆی فریا بخەم کە من شکی نابەم و لە توانامدا نییە..

بەڵام هیممەت و یارمەتیی فریاگوزاریی "قورئانی پیرۆز" فریای کەوت و ڕۆشت بە هانایەوە، چونکە سێ مانگ پێش وەفاتی، "وتەی دەهەم"ی بەدەست گەیاندبوو، کە تایبەتە بە "حەشر"ەوە!

ئەو پەیامەش لە ڕووی پاکژکردنیەوە لە چڵك و چەپەڵییە مەعنەوییەکان و لێڵاییەکانی وەهم و گومان و بێئاگایی، ڕۆڵی خۆی لەودا بینیبوو. تەنانەت بەرەو پلەیەکی وەك پلەی "ویلایەت" بەرزی کردبووەوە، چونکە سێ دانە کەرامەتی ئاشکرای لەو نامەیەدا دەرخستبوو کە پێش وەفاتی بۆی نووسیبووم! ئەو نامەیەش لە ناوەندی بڕگەکانی "مەکتووبی بیست و حەوتەم"دا تۆمار کراوە. با سەیر بکرێت)[3].

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی یەکەم، ل: ٨.

(٢) ناوی "عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا"یە و برازای مامۆستا نوورسییە. لە ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی "نوورس" لە دایك بووە و، لە ساڵی ١٩٢٨زیشدا لە گوندی "زولفەزل"ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسیی نووسیوە کە هەر لە سەرەتای ژیان و لەدایکبوونی مامۆستاوە تا ساڵی ١٩١٨ز باسی ژیانی ئەوی تێدا کردووە و، لە کتێبێکدا کە لە ئەستەمبوڵ چاپی کردبوو، بڵاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٣) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٠١، هەروەها بۆ بینینی نامەکەی عەبدوڕەحمان با سەیری پاشبەندەکان بکرێت، ل: ٣٨-٤٠.

□ بنەچە و ڕەچەڵەکی[1]

(خەبیرەکان لە دادگای "دەنیزلی"دا، بەپێی باوەڕی هەندێکیان، سەبارەت بە قوتابیانی نوورەوە وتیان:

ئەگەر سەعیدی نوورسی خۆی بە "مەهدی" لە قەڵەم بدات، ئەوا هەموو قوتابییەکانی بە سنگێکی فراوانەوە قسەکەی دەسەلمێنن!

منیش لە دادگادا پێم وتن: من ناتوانم خۆم لە ئالی بەیت دابنێم، چونکە نەسەبەکان لەم سەردەمەدا بە جۆرێکی وا تێکەڵی یەکتر بوون کە ناتوانرێت لەیەك جیا بکرێنەوە، لە کاتێکدا کە مەهدیی ئاخر زەمان لە ئالی بەیت دەبێت.

خۆ هەرچەند لەو ڕووەوە کە من وەکو کوڕێکی مەعنەویی حەزرەتی عەلیم - خوا لێی ڕازی بێت - و، وانەی حەقیقەتم لەلا خوێندووە و، یەکێك لە واتاکانی "ئالی محەممەد ﷺ" قوتابییە ڕاستەقینەکانی نوور دەگرێتەوە و، دەگونجێ لەم ڕووەوە لە ئالی بەیت دابنرێم.. بەڵام ئەم زەمان و ڕۆژگارە هی کەسی مەعنەوییە و، ڕێبازی پەیامی نووریش بە هیچ جۆرێك بوار بە حەزی خۆویستی و خۆدەرخستن نادات و، بە دوای پلەوپایەدا ناگەڕێت و، جێی بەدەستهێنانی شەرەفمەندی و ناوبانگی تێدا نابێتەوە. چونکە هەموو ئەمانە بە تەواوی دژی نهێنیی ئیخلاسن.

---

(١) هەر سێ توێژەری بەڕێز (نەجمەدین شاهێنەر) و (عەبدولقادر بادللی) و خوالێخشبوو (مەلا محەممەد زاهیدی مەلازگوردی) لە ڕەچەڵەکی مامۆستا کۆڵیونەتەوە و گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامە: سۆفی میرزا کوڕی عەلی کوڕی خزر کوڕی خالید کوڕی میرزا ڕەشانە لە هۆزی ئیسپاریت. دایکیشی: نووریەی کچی مەلا تاهیر لە گوندی "بەڵکان"ە کە سێ سەعات لە گوندی "نوورس"ەوە دوورە و سەر بە هۆزی (خاکیف)ە. هەردوو هۆزەکەش لە کوردانی هەکارین.
هەتا ئێرەی نەسەبی مامۆستا نوورسی بێگومان و جێی متمانەیە. خۆ هەرچەندە لە نووسینەکانیدا خۆی لە ئالی بەیت (سەیید) دانەناوە، بەڵام هەندێ کەس پێیان وایە کە لە دانیشتنە تایبەتەکانیدا بۆ هەندێ لە قوتابیانی ئەوەی باس کردووە کە لە باوکەوە دەڕواتەوە سەر ئیمامی حەسەن و لە دایکیشەوە بۆ سەر ئیمامی حسەین، خوا لێیان ڕازی بێت. جا ئەگەر بە بەڵگە ئەوە بسەلمێت ئەوا هیچ جێی مشتومڕ نابێت. بڕوانە: پەراوێزی ل: (٥٥)ی (سيرة ذاتية). شایانی باسە ماوەیەك لە دوای وەفاتی، هەندێ کەسی دەمارگیر هەوڵی ئەوەیان دا کە ڕەچەڵەکی نوورسی بۆ نەتەوەی تورك بگێڕنەوە، بەڵام نەیانتوانی بە بەڵگە بیسەلمێنن. ئێستا هەندێ دەمارگیری تر هەوڵێکی سەروبڕ دەدەن بۆ ئەوەی کە زنجیرە نەسەبێکی بۆ سەر ئالی بەیت بۆ بهۆننەوە، لەو گومانەدان کە ئەگەر لە بنەڕەتدا "سەیید" بێت ئەوا سەلماندوویانە کە کورد نییە! دەك نەفرەت لە دەمارگیریی جاهیلی کە مرۆڤ دووچاری هەڵەی وا دەکات! (وەرگێڕ)

کەواتە شوکر و سوپاسی بێ سنوور پێشکەش بە پەروەردگاری شکۆمەندم لەسەر ئەوەی کە وای لێ کردووم لە خۆم ڕازی نەبم. بۆیە هەرگیز ئاوڕ لەم چەشنە پلەوپایە کەسییانە نادەمەوە، کە زۆر لە سەرووی توانا و پلەی خۆمەوەن. تەنانەت گەر چەندین پلەی بەرزی سەر بە قیامەتیشم بدرێتێ، هەر هێشتا خۆم بە ناچار دەزانم کە واز لە هەموویان بهێنم، تاکو ئەو ئیخلاسە زامدار نەکەم کە لە ڕێبازی پەیامەکانی نووردا هەیە.

ئاوام بە خەبیرەکانی دادگا وت و، ئەوانیش بێ دەنگ بوون)[1].

❐ ئەندێشەکانی بەهرەداری لە دەمی منالّیدا

(جارێکیان لە کاتی منالّیمدا - هەروەك لە پەیامی حەشردا ئاماژەی بۆ کراوە - لە ئەندێشەی خۆمم پرسی:

کام لەم دوانەت بەلاوە باشترە: تەمەنێکی پڕ بەختەوەریت لەگەڵ دەستەلاّتداری و خۆشیی دنیادا بێت، بەلاّم بە نەمان و نەبوون کۆتایی پێ بێت.. یان بە هەمیشەیی بمێنیتەوە لەگەڵ ژیانێکی ئاسایی سەختدا؟!

سەیرم کرد حەز لە دووهەم دەکات و بێزاری لە یەکەم دەردەبڕێت و دەڵێت:

من "نەبوون"م ناوێت، بەڵکو مانەوەم دەوێت با لە دۆزەخیشدا بێت)[2]!

(لە تافی منالّیمدا جارێکیان مانگ گیرا. لە دایکمم پرسی: چی بەسەر مانگدا هاتووە؟ وتی: مار قووتی داوە! وتم: خۆ هێشتا هەر دەبینرێت؟ وتی: ماری ئاسمان وەك شووشە وایە، ناوەوەیان دیارە!

زۆر جار کە ئەم ڕووداوەم دەهاتەوە یاد، لە خۆمم دەپرسی: خورافەتێك کە تا ئەم ڕادەیە لە ڕاستییەوە دوورە، چۆن کەوتووەتە سەر زاری ئەو دایکە ژیرەی کە لە گوفتارەکانیدا تابڵێی جیددییە و هەرگیز توخنی گاڵتەوگەپ ناکەوێت؟!

پاشان کە زانستی گەردووناسیم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت کە ئەوانەی بە چەشنی دایکم دیاردەی مانگ گیران لێکدەدەنەوە، تەشبیهیان بە وێنەی ڕاستییەکی بەرجەستە وەرگرتووە!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٥٣-٤٥٤.

(٢) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٣٦٨.

چونکە گەردوونناسەکان، لە تەشبیهێکی جواندا، ئەو دوو کەوانەیەی کە لە تێکەڵبوونی بازنەی خۆر - کە ناوچەی بورجەکان و خولگەی پلەکانیانە - و بازنەی مانگ - کە میل و خولگەی مەنزڵەکانی مانگە - پێکهاتووە، بە دوو ماری گەورەیان شوبهاندوون و ناوی هەژدیهایان لێ ناون. ئنجا یەکێك لە دوو خاڵی یەکتربڕینی ئەو دوو بازنەیان ناو ناوە "سەر" و ئەوی تریشیان ناو ناوە "کلك". جا کاتێ کە مانگ دەگاتە ئاستی "سەر" و خۆریش دەگاتە ئاستی "کلك" ئەوا - وەك گەردوونناسەکان دەڵێن - زەوی دەکەوێتە نێوان هەردووکیانەوە و دیاردەی مانگ گیران ڕوو دەدات. واتە بەپێی ئەو تەشبیهەی پێشوو مانگ دەچێتە گەرووی هەژدیهاکەوە!

بەم جۆرە، ئەم تەشبیهە زانستی‌یە بەرزەی کە بە تێپەڕبوونی کات کەوتە ناو گوفتاری عەوامەکانەوە، کرا بە هەژدیهایەکی بەرجەستەی هێندە گەورە کە مانگ قووت بدات)[1]!

(لە دەوروبەری تەمەنی نۆ ساڵیمدا بووم کە هەموو کەسوکار و خزمانم پەیوەندی‌یان بە تەریقەتی نەقشبەندی‌یەوە هەبوو، هەر هەمووشیان ئیستمدادیان لە شێخێکی بەناوبانگی ئەوێ دەکرد کە ناوی "غەوسی خیزانی"[2] بوو. منیش بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەم وت: ئەی شێخی گەیلانی[3]! سوورەتی فاتیحەت بۆ دەخوێنم، تۆیش ئەو گوێزەی ونم کردووە - یان هەر شتێکی تری بێ نرخی وەك ئەمە - بۆم بدۆزەرەوە! لە ڕاستیدا کارێکی گەلێ سەرسووڕهێن بوو، چونکە سوێند بە خوا هەزار جار شێخ بە دوعا و هیممەتی خۆی هاتووە بە هانامەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەرچی ویرد و زیکرم لە درێژایی ژیانمدا خوێندووە یەکەم کەس پێشکەشم کردووە بە پێغەمبەری سەروەر و خۆشەویست ﷺ و، دوای ئەو بە شێخی گەیلانی (قُدِّسَ سِرُّهُ)!

---

(١) بریسکەکان، ل: ١٨٢-١٨٣، ٧٨٨؛ داوەری‌یەکان ل: ٦٢.

(٢) ناوی "شێخ صیبغەتوڵڵای ئارواسی"یە و، خەلیفەی شێخ تاهای نەهری‌یە، کە ئەویش خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی‌یە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

(٣) شێخ عەبدولقادری گەیلانی (٤٧٠-٥٦١ك) یەکێکە لە گەورە زانایان و پێگەیشتووان و خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام. چەندەها کەسی گاور و جوولەکە لە خزمەتیدا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە و، گەلێ بەرهەمیشی بەجێ هێشتووە. بڕوانە: "رجال الفكر والدعوة في الإسلام"؛ "هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس". (وەرگێڕ)

ئنجا هەرچەندەش من لە سێ ڕووەوە پەیوەندیم لەگەڵ تەریقەتی نەقشبەندیدا هەیە[1]، کەچی بە بێ ئیختیاری خۆم خۆشەویستیی تەریقەت و مەشرەبی قادری حوکمی خۆی لە مندا ڕایی دەکات. بەڵام ئەوەندە هەیە سەرقاڵ بوونم بە زانستەوە بواری ئەوەی نەدام بە تەریقەتەوە خەریك بم)[2].

(کاتێ کە لە تەمەنی دە ساڵیدا بووم حاڵەتێکی بەخۆنازین و شانازیم لە "ڕۆح"ی خۆمدا دەبینی، تەنانەت هەندێ جار لە شێوەی پێ خۆش بوونی مەدح و سەنادا ئەو حاڵەتە دەردەکەوت! ئەوەبوو - بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووی خۆم - وەك پاڵەوانێکی گەورە و پێشەوایەکی مەزن و خاوەن کارێکی گرنگ خۆم پیشان دەدا! هەر بۆ خۆیشم لە خۆمم دەپرسی:

ئەم خۆدەرخستن و فیز و دەمارەت لەبەر چی‌یە، بە تایبەت لە بواری ئازایەتیدا، لە کاتێکدا کە خۆت پێنج پارە ناهێنیت[3]؟ ئیتر بە سەرسامی دەمامەوە و وەڵامی ئەم پرسیارەم نەدەزانی.

بەڵام دوو مانگ پێش ئێستا بەمەی خوارەوە وەڵامی ئەو سەرسامی‌یەم درایەوە:

"پەیامەکانی نوور" بە "هەستی پێش وەخت" هاتنی خۆیان بە گوێی هەستی تۆدا چرپاند.

تۆ بۆ خۆت هەر تەنها دەنکە تۆوێکی بچووکی بێ بایەخیت، بەڵام لەبەر ئەوەی پێش هاتن و سەرهەڵدانی ئەو پەیامانە هەستت بە هاتنیان کردووە، ئەوا هێشتووە بەهەشتی‌یەکانت (پەیامەکانی نوور) بە هی خۆت زانیوە و شانازیت پێیانەوە نواندووە.

سەبارەت بە گوندەکەشمان (نوورس) ئەوا خەڵکی ئەوێ و قوتابی‌یە دێرینەکانیشم ئاگادارن کە خەڵکی ئەو گوندە مەدح و ستایشیان گەلێ پێ خۆش بوو، تاکو دەری بخەن کە هەر ئەوان یەکەم کەس و پێشەنگی هەڵمەت و ئازایەتین! بۆیە پێیان خۆش بوو لە شێوەی قارەمانەکاندا خۆیان دەربخەن، وەك بڵێی وڵاتێکی گەورەیان فەتح کردبێت!

---

(١) چونکە دایك و باوك و مامۆستاکەی سەر بەم تەریقەتە بوون.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی هەشتەم.

(٣) چل "پارە" دەکاتە یەك "قورش" دە قورشیش دەکاتە یەك لیرەی تورکی! (وەرگێڕ)

ئیتر زۆر سەرم لە خۆم و گوندەکەم سوور دەما. وا ئێستا لە ڕێی ئاگادارکردنەوەیەکی حەقیقیەوە لەو نهێنیە تێگەیشتم کە:

ئەو خەڵکانەی گوندی نوورس بۆیە شانازییان دەنواند چونکە گوندەکەیان لە دواییدا بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە شانازییەکی مەزن بەدەست دەهێنێت. تەنانەت ئەو کەسانەی کە زووتر ناوی پارێزگا و ناوچەکەشیان نەبیستووە، دوایی لە ڕێی پەیامەکانەوە و بە گرنگی پێدانەوە بە گوندەکەش ئاشنا دەبن.

کەواتە ئەو نوورسیەیانە، لە ڕێی هەستێکی پێش وەختەوە و لە شێوەی فەخر و شانازیدا، شوکرانە بژێریی خۆیان بەرامبەر بەم نیعمەتە دەردەبڕن.

بەڵێ، لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی کوردستان شانازییان بە زۆریی قوتابیان و زانایانەوە دەکرد، کە بەهۆی هیممەت و تێکۆشانی مامۆستا مەلا "عەبدوڕەحمان"ی تاغیەوە - کە لە ناوچەکەمان (ئیسپاریت) و قەزاکەمان (خیزان) بە "سەیدا" بەناوبانگە[1] - پێگەیشتبوون و کۆتاییان بە خوێندن هێنابوو.. منیش لە نێوان ئەواندا و لە ناوەندی ئەو مونازەرە بەرز و هیممەتە بڵند و بازنە فراوانە زانستی و سۆفیانەدا، وا هەستم دەکرد کە ئەو زانایانە سەرانسەری گۆی زەوی فەتح بکەن!

ئەو کاتە کە من هێشتا لە دەهەم ساڵی تەمەنمدا بووم، کاتێ مەناقیبی زانایانی بەناوبانگی پێشین و ئەولیا مەزنەکان و قوتبە گەورەکانم دەبیست، وام بە دڵدا دەهات کە ئەم قوتابی و زانایانەش گەلێ ئاسۆی فراوانی زانست و ئایین فەتح دەکەن. چونکە گەر هەر کامێکیان کەمێ زیرەکیی زیاتری تێدا ببێت، ئەوا سەرنجی بایەخ پێدانی ئاراستە دەکرێت و، گەر هەرکامێکیشیان لە مونازەرەیەکی زانستیدا سەرکەوتن لە هەر مەسەلەیەکدا بەدەست بهێنێت، گەلێ شانازی بەو سەرکەوتنەیەوە دەردەبڕێت.

---

(١) یەکێکە لە ئەولیا و پیاوچاکانی هەلکەوتووی گەلەکەمان. لە نێوان ساڵەکانی (١٢٤٧-١٣٠٤ك/١٨٨٤ز) ژیاوە. ناوی: شێخ "زیائەددین عەبدوڕەحمان تاغ"ە و، بە "سەیدا" بەناوبانگە و، خەڵکی گوندی "نوورشین"ی نزیك مەڵبەندی پارێزگای "مووش"ی باکووری کوردستانە. لە جیهادی جەنگی یەکەمی جیهانیدا قزڵێکی لە دەست داوە و، سوڵتان ڕەشاد مەدالیایەك و قزڵێکی دەستکردی پێ بەخشیوە. پاشان لە جیهادی جەنگەکانی سەربەخۆیی وڵاتدا (کە لە پیناوی وەدەرنانی داگیرکەران بەرپا کرابوو) بەشداریی کردووە. (وەرگێڕ)

جا من سەرم لەمە سوورِ دەما! چونکە ئەو هەستانە لە خۆیشمدا هەبوون!

تەنانەت لە نێوان شێخانی تەریقەت و بازنەی تەسەووفی ناوچە و قەزا و پارێزگاکەشماندا پێشبڕکێیەکی سەرسووڕهێن و سەرنج ڕاکێش هەبوو کە لە هیچ شارێکی تردا بەو ڕادەیە نەم بینیوە)[1]!

(ئەگەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا فەرموو بە ئەندێشە بڕۆ بۆ کۆڕی "سەیدا" - قدس سره - لە گوندی "نوورشین" و، لەوێ ئەو شارستانێتییەی ئیسلام ببینە کە بە هاودەمیی خاوێن و قودسیی ئەو زاتە لەو کۆڕ و مەجلیسەدا دەرکەوتووە. لەو ئەنجومەنەدا چەندین پادشا لە پۆشاکی هەژاران و مەلائیکەتانیش لە بەرگ و پۆشاکی مرۆڤدا دەبینیت. پاشان بڕۆ بۆ "پاریس" و بچۆرە ناو کۆڕی گەورە پیاوانیانەوە، دەبینیت چەندەها دووپشك بەرگ و پۆشاکی مرۆڤیان پۆشیوە و چەندەها دێو و درنجیشت پێش چاو دەکەوێت کە لە شێوە و ڕوخساری ئادەمیزاددا خۆیان دەنوێنن)[2]!

## ساڵی ١٨٨٥ز/١٣٠٣ك

### ☐ هەنگاوەکانی بەرەو زانست و مامۆستاکانی

(سوێند بە خوای گەورە، قوولترین و دامەزراوترین دەرسێك وەرم گرتووە و هەمیشە لە دەروونمدا نوێ دەبێتەوە: ئامۆژگاری و وانە مەعنەوییەکانی دایکمن - خوا لێی خۆش بێت - بە چەشنێ کە لە ناخی سروشتمدا ئەو دەرسانەی ئەو جێگیر بوون و، لە جەستەشمدا وەك "تۆو"یان لێ هات لە درێژایی ماوەی تەمەنمدا کە خۆی لە هەشتا ساڵ دەدات، هەرچەندەش دەرسم لە هەشتا هەزار کەس وەرگرتووە[3]. تەنانەت لەو

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی لەمیرداغ: ١/٣٥٧-٣٥٩.

(٢) مەسنەویی نووری، کەفێك لە دەریای قورئان.

(٣) واتە: دەرس و وانەی لە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆی، تەنانەت لە "مێش"یش وەرگرتووە. لەوەتا دەڵێت: "جارێکیان بینیم نەفسی خۆم لە خۆی بایی بووە و شانازی بە چاکەکانیەوە دەکات. پێم وت: تۆ خاوەنی هیچ شتێك نییت تا شانازیی پێوە بکەیت! وتی: کەواتە بایەخ بە لەشم نادەم.. وتم: نابێت لە مێش کەمتر بیت، گەر دەتەوێ ئەمە بزانیت ئەوا سەیری ئەم مێشە بکە و بزانە چۆن بە هەردوو قاچەکانی باڵەکانی

دڵنیاییەشدام کە دەرسەکانی تر لەسەر بناغەی ئەو تۆوانـە سـەوز بـوون و بنیـات نـراون. واتە ئامۆژگـاری و دەرسـەکانی دایکـم کـە لـە سـاڵانی یەکـەمی تەمـەنمدا ئاراسـتەی سروشـت و گیـانی منـی کـردن، من بـە چـەند تۆوێکـی بنـەڕەتی‌یان دەزانم لـە نێـوان ئـەو ڕاستی‌یە مەزنانەی کە ئێستا لە تەمەنی هەشتا ساڵیمدا دەیانبینم)[1].

(سەرەتای خوێندنی ساڵی ١٨٨٥ز (١٣٠٣ك) بوو کە تیایدا دەسـتی بـە خوێنـدن و فێربوونی قورئانی پیرۆز کرد)[2].

ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یەی تیایدا بوو هانی دا کە سەرنجی ئەو دەستکەوتانە بـدات کاکـە "مـەلا عـەبدوڵلا"ی لـە زانستەکانەوە بەدەستی هێنـابوون، ئـەوەبوو ئـەو تایبەتکاری‌یـە بـەرزانەی بـرا گـەورەکـەی و کـامڵ بـوون و پێگەیشـتنی ڕەفتـارە جـوانەکانی لـە ڕێـی خوێندن و فێربوونی زانستەکانەوە سەرنجی سەرسووڕمانی ئەمیان ڕاکێشابوو. بە چاوی خۆی دەیبینـی کـە چۆن براکـەی پێش هاوەڵـەکانی خـۆی داوەتـەوە لـە گوندەکـەدا و، ئەوان وەك ئەم توانای نووسین و خوێندنەوەیان نی‌یە..

ئەم سەرسووڕمانە شەوق و تاسەیەکی گەرموگوڕیان پێ بەخشی کە ئـەمیش بـڕوات بخوێنێت و زانست بەدەست بهێنێت. بۆیە ڕێی گوندەکانی نزیکی گوندی نوورسی لـەو پێناوەدا گرتەبەر، هەتا لە گوندی "تاغ" لە قوتابخانەکەی "مەلا محەممەد ئەمین ئەفەندی"دا گیرسایەوە..

بـەڵام نـەیتوانی لـەوێ بمێنێتـەوە و وازی لـەوێ هێنـا، چونکـە خـاوەنی دەروون بەرزی‌یەکی ئـەوتۆ بـوو ستەمی پێ قبـووڵ نـەدەکرا و، ڕازی نـەدەبوو ڕێـز و کەرامـەتی تەنانـەت بـە بچووکـترین قسـەش بڕووشـێنرێت کە خۆسەپاندنی پێـوە دەربکـەوێت، کە لەوێ ئەوەی بۆ مەیسەر نەبووە. بۆیە گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی (نـوورس) کـە هیـچ فێرگە و قوتابخانەیەکی تێدا نـەبوو بـۆ خوێنـدن و فـێربوونی زانسـت، تەنـها ئـەو دەرسـانە

---

خاوێن دەکاتەوە و بە دەستەکانیشی سەر و چاوی دەسڕێتەوە! کەواتە خاوێنی و بێگەردی بۆ ئەو خوایـەی کە ئەم کارەی ئیلهامی مێش کردووە و، ئەم ڕێیەوە کردی بە مامۆستایەك بۆ من تاکو دەروونی خۆمی پێ تـەمێ و دەمکوت بکەم"! مەسنەویی نووری، دڵۆپێك لە دەریای قورئان، پاشکۆ.

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و چوارەم، ل: ٤٠٤.

(٢) تیشکی یەکەم

نەبێت کە مەلا عەبدوڵڵای برا گەورەی لە سەردانی هەفتانەیدا بۆماڵەوە پێی دەوت و فێری دەکرد.

پاش ماوەیەکی کەم ڕۆشت بۆ گوندی "پیرمس" ئنجا بۆ "هاوینە هەواری شێخی خیزان" ئنجا بۆ گوندی "نوورشین" پاشان بۆ گوندی "خیزان".

جا لەبەر ئەوەی هەرگیز بواری خۆسەپاندنی بە کەس نەدەدا، لە گوندی "پیرمس" لەگەڵ چوار قوتابیدا بوو بە شەڕی، چونکە ئەو چوار کەسە هەمیشە بۆ شەڕ پێ فرۆشتنی یەکیان گرتبوو! ئەمەش ناچاری کرد کە بچێت بۆ لای مامۆستا "سەیید نوور محەممەد" سکاڵای ئەو چوار کەسەی لە لا بکات و، بە شانازی و سەربەرزییەوە بڵێت:

– مامۆستای بەڕێزم! تکات لێ دەکەم بەو چوار کەسە بفەرموو کە هەموویان بە یەکەوە شەڕم پێ نەفرۆشن، با دوو دوو بێن شەڕم لەگەڵدا بکەن!

مامۆستا "سەیید نوور محەممەد"یش بەم مەردی و جوامێرییە پێش وەخت و زووەی سەعیدە بچکۆلە گەلێ دڵشاد بوو، بۆیە بۆ دڵدانەوەی پێی وت:

– تۆ قوتابیی خۆمی! کەس ناتوانێت توخنت بکەوێت و ڕێت پێ بگرێت!

دوای ئەم ڕووداوە، پێی دەوترا "قوتابیی مامۆستا".

ماوەیەك لەم قوتابخانەیەدا مایەوە، پاشان وازی لێ هێنا و لەگەڵ کاکە "مەلا عەبدوڵڵا"یدا ڕۆشت بۆ گوندی "نوورشین".

ئەو دەمە هەر زانایەك ئیجازەی زانایی ببوایە مافی ئەوەی هەبوو قوتابخانە (حوجرە) لە هەر گوندێکدا بکاتەوە، تەنها بۆ مەبەستی ڕەزامەندیی خوای گەورە و بێ هیچ دەستکەوتێکی دنیایی.

خەرجی و مەسرەفی قوتابییانی ئەو قوتابخانەیەش دەکەوتە ئەستۆی ئەو مامۆستایە، ئەگەر خۆی توانا و دەستەڵاتی ببوایە، دەنا خەڵکی گوندەکە لە زەکات و سەدەقە و خێر و بەخششەکانی خۆیان ئەو ئەرکەیان هەڵدەگرت. بەو واتایەی دەبوو ئەو زانایە بە خۆڕاییی دەرسی بەو قوتابیانە بوتایەتەوە و، کەسانی نیشتەجێی گوندەکەش پێداویستی و خەرجی و مەسرەفی ئەوانیان بگرتایەتە ئەستۆ.

جا لەو گوندەدا هەموو قوتابیان لەو زەکات و خێرەیان وەردەگرت، تەنها سەعیدی بچکۆلە نەبێت کە زەکاتی لە کەس وەرنەدەگرت[1]!

□ سەربەرزی و ملکەچ نەکردن

(هەرچەندە "سەعیدی کۆن" هەر لە ڕۆژگارانی منالی‌یەوە هەژار و، باوکیشی کەم دەرامەت بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەدەقە و دیاریی لە خەڵك وەرنەدەگرت. تەنانەت هەر نەیدەتوانی وەری بگرێت، مەگەر لە بەرامبەر شتێکەوە، هەرچەندەش لەو کاتانەدا تابڵێی موحتاج بوو.. هەروەها هیچ کاتێك "سەعید" نەدەڕۆشت بۆ وەرگرتنی "ئازووقە" یان - پێی بزانێت - "زەکات"ی لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە، بە وێنەی داب و عادەتی ئەوسای کوردستان کە ئازووقەی قوتابیان لە لایەن خەڵکەکەوە دەدرا و خەرجیشیان لە زەکاتی ئەوان دابین دەکرا..

جا ئێستا قەناعەتێکی تەواوم هەیە بەوەی کە حیکمەتی ئەم دیاردەیەی ژیانی "سەعیدی کۆن" بریتی‌یە لەوەی کە:

لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنمدا "پەیامەکانی نوور" - کە خزمەتێکی بەرز و بلند و بێگەردن بۆ ئیمان و ئاخیرەت - نەکەم بە هۆکار و پلیکانەیەك بۆ دەستکەوتەکانی دنیا و بیانوویەك بۆ دەستخستنی بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکان!

لەبەر ئەم حیکمەتەیە کە ئەم حاڵەتەم پێ بەخشرا، کە حاڵەتی نەفرەت و دوورەپەرێزیمە لەو ڕەفتارە بێ زیانە و دەست نەگرتنەوەیە لە خەڵکی. ئەوەبوو من بە ڕۆزیی مایەی بژێو و فەقیری و هەژاریی سەخت و گوزەرانی کولەمەرگی ڕازی بووم، تاکو ئەو ئیخلاسە ڕاستەقینەیە نەشێوێت کە هێزی ڕاستەقینەی پەیامەکانی نوورە!

هەروەها هەست دەکەم کە ئەم کارە ئاماژەیەکی پڕ واتای وەك ئەمەی خوارەوەشی تێدایە:

هەر ئەم موحتاجی‌یەیە کە زانایان ناچار دەکات نوقمی خەمی ژیان و گوزەران بن، تا لە ئەنجامدا وایان لێ دێت دەستەڵاتیان بەسەر خۆیاندا نامێنێت و ژێردەستی ئەم و ئەو دەبن)[2]!

---

(١) Tarihce-i Hayat. Ilk hayati.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٧-٥١٨.

## ساڵی ١٨٩١ز/١٣٠٨ك

### ❐ مژدەدانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

ماوەیەك لە گوندی "نوورشین" مایەوە. ئنجا ڕۆشت بۆ "خیزان". پاشان وازی لە خوێندن هێنا و، گەڕایەوە بۆ لای دایك و باوكی لە گوندی "نوورس" هەتا وەرزی بەهار.

لەم ماوەیەدا خەونێكی بینی، لەو خەونەدا بینیی قیامەت بەرپا بووە و سەرلەنوێ بوونەوەران زیندوو كراونەتەوە. بیری كردەوە چۆن بە زیارەتی پێغەمبەری مەزن ﷺ شەرەفمەند بێت؟ پاشان ئەوەی بە یاددا هات كە لە سەرەتای پردی سیراتدا چاوەڕێی بكات كە هەموو كەسێكی پێدا تێدەپەڕێت. بۆیە بە خێرایی ڕۆشتە ئەوێ.. بەم جۆرە هەموو پێغەمبەران – درووديان لەسەر بێت – لەوێوە تێپەڕین و یەك بە یەكیانی زیارەت كرد و دەستی هەموویانی ماچ كرد. ئنجا بە زیارەتی پێغەمبەری مەزن ﷺ شەرەفمەند بوو و خۆی هاویشتە سەر دەستە پیرۆزەكانی و ماچی كردن، ئنجا داوای "زانست"ی لێ كرد. پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ مژدەی دایە كە:

"سيوهبُ لك علمُ القرآن ما لم تسألْ أحداً"[1].

ئەم خەونە شەوق و تاسەیەكی مەزنی لەودا بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی زانست ورووژاند. بۆیە مۆڵەتی لە باوكی وەرگرت و ڕۆشت بۆ ناوچەی "ئارواس" تاكو لای "مامۆستا مەلا محەممەد ئەمین ئەفەندی" بخوێنێت. كەچی كاتێ ئەم مامۆستایە دەرس پێ وتنی ئەمی بە یەكێكی تر سپارد، "سەعیدە بچكۆلە"ش گەلێ دڵگران بوو بەوەی كە

---

(١) ناوەرۆكی ئەو خەونە، سوننەتێكی پێغەمبەرە ﷺ، لە چەند ڕیوایەتێكدا هاتووە، وەك ئەم ڕیوایەتە:
"كنا عند رسول الله ﷺ تسعة أو ثمانية أو سبعة. فقال ألا تبايعون رسولَ الله؟ وكنا حديثي عهد ببيعة، فقلنا: قد بايعناك يا رسول الله. ثم قال: ألا تبايعون رسول الله؟ فقلنا: قد بايعناك يا رسول الله. ثم قال: ألا تبايعون رسول الله؟ قال: فبسطنا أيدينا وقلنا: قد بايعناك يا رسول الله فعلام نبايعك؟ قال: (على أن تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئاً، والصلوات الخمس، وتطيعوا. وأسرَّ كلمةً خفيةً: ولا تسألوا الناسَ شيئاً). فلقد رأيت بعض أولئك النفر يسقط سوط أحدهم فما يسأل أحداً يناوله إياه"! رواه مسلم (١٠٤٣). (وەرگێڕ)
مامۆستا نوورسی خەونێكی تری بەو سەروەرەوە بینیوە، لە كتێبی "سنوحات"دا تۆماری كردووە. بڕوانە: داوەرییەكان، ل: ٧٣٥-٧٣٦.

مامۆستا ئەم ڕەفتارەی نواند و خۆی بەرزتر ڕاگرت لەوەی کە دەرس بەم بڵێت.
تەنانەت جارێکیان لە دەرسێکدا ڕەخنەی لە مامۆستاکەی گرت و، پێی وت:
- گەورەم! وا نی‌یە!
پاشان ئەو هەڵوێستەی یادخستەوە کە خۆی بەرزتر نواندووە لەوەی دەرس بەم بڵێتەوە.
دوای ئەوەی کە ماوەیەکی کەمی لە "ئاروواس" بردەسەر، ڕووی کردە قوتابخانەی "میر حەسەن وەلی"[1]. بەڵام کە لەوێ بایەخ نەدانی بە قوتابی‌یە تازەکان بینی، خوێندنی حەوت کتێبی پەڕاند لەو کتێبانەی کە لە حوجرەکاندا بڕیاری خوێندنیان دراوە و، یەکسەر دەستی بە خوێندنی کتێبی هەشتەم کرد!
پاشان بۆ ماوەی مانگێك و بۆ مەبەستی گەشت و سەیران ڕۆشت بۆ شارۆچکەی "وەستان"(گەواش).
دوای ئەو مانگە لەگەڵ "مەلا محەمەد"ی هاوڕێیدا بەرەو "بایەزید" کەوتەڕێ کە سەر بە ویلایەتی "ئاگری"یە و دەکەوێتە سەر سنووری ئێران[2].

□ خوێندنی ڕاستەقینە:
خوێندنی ڕاستەقینەی لە "بایەزید" دەستی پێ کرد، چونکە تا ئەو کاتە تەنها سەرەتاکانی "نەحو" و "صەرف"ی هەتا کتێبی "ئیزهار" خوێندبوو[3].
(لەو کاتانەدا، نەك هەر تەنها زیرەکی‌یەکی نائاسایی و هێزێکی مەعنەوی، بەڵکو جگە لەوە حاڵەتێکی سەرسووڕهێنەریش لە سەعیدەوە دەرکەوت و سەری هەڵدا، کە لە دەرەوەی بازنەی گشت توانا و لێهاتنەکانیەوە بوو. چونکە تەنها دوای چاوگێڕانی بە ناو بابەتە سەرەتاییەکانی صەرف و نەحوو لە ماوەی یەك دوو ساڵێکدا، ئەو حاڵەتە سەرسووڕهێنەرە سەری هەڵدا، وەك بڵێی لە ماوەی سێ مانگدا نزیکەی پەنجا کتێبی

(١) لە شارۆچکەی "موکس". (وەرگێڕ)
(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.
(٣) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. "إظهار"ی "بەرکەوی" کتێبێکە لە زانستی نەحوودا، لە حوجرەکاندا دەخوێنرێت.

خوێندبێت! ئەوەبوو لەو ماوەیەدا لە هەموویان تێگەیشت و ئیجازە و بەڵگەنامەی تەواوکردنیانی بەدەست هێنا)[١]!

ئەم وانە خوێندنە چڕوپڕە، ماوەی سێ مانگی خایاند لە لای "مامۆستا مەلا محەممەدی جەلالی". جێی سەرسوڕمانە کە هەر لە کتێبی "جامی"[٢]یەوە خوێندنی هەموو ئەو کتێبانەی لەو ماوەیەدا تەواو کرد کە لە کوردستاندا بۆ قوتابیان دەستنیشان کرابوون بخوێنرێت. چونکە لە هەر کتێبێك یەك وانە، یان دوو، یاخود هەتا دە وانەی دەخوێند و، ئیتر بێ ئەوەی ئەو کتێبە تەواو بکات دەستی بە کتێبێکی تر دەکرد! کاتێك مامۆستاکەی (مامۆستا مەلا محەممەدی جەلالی) هۆی ئەم کارەی لێ پرسی - کە پێچەوانەی ئەو کلتوور و نەریتەیە لە حوجرەکاندا باو بووە - وەڵامی بەوە داوەتەوە کە:

- ناتوانم هەموو ئەم کتێبانە بخوێنم و لێیان تێبگەم. ئەم کتێبانە وەك سندووق و گەنجینەی گەوهەر وان و، کلیلەکانیشیان لە لای جەنابتانە، تکای من لە ئێوە تەنها ئەوەیە کە ڕێنماییم بکەن بۆ ئەو شتانەی کە لەناو سندووقەکاندان، واتە تێم بگەیەنن کە ئەم کتێبانە لە چی دەدوێن، تاکو منیش ئەو شتەیان لێ هەڵبژێرم کە لەگەڵ سروشتمدا بگونجێن.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٤.

(٢) مەولانای جامی (٨١٧-٨٩٨ك/١٤١٤-١٤٩٢ز) ناوی تەواوی: (نوورەدین عەبدوڕەحمان کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەد)ە و، لە (جام)ی سەر بە (هەرات)ی ئەفغانستانی ئێستا لە دایك بووە و لە بنەچەدا خەڵکی ناوچەی ئیسفەهانە. شاعیر و نووسەر و زانا و عارفێکی ڕەبانی و مەزنی سەدەی نۆهەمی کۆچی بووە و، پاش تەواوکردنی خوێندن حەزێکی زۆری لە تەسەووف کردووە و لای مامۆستا سەعدەدینی کاشغەری (٨٦٠ ك) کە زانایەکی سەردەمی خۆی و شێخی نەقشبەندیی ئەو ڕۆژگارە بووە، تەسەووفی وەرگرتووە. سالی (٨٧٧ ك) لە ڕێی (هەمەدان - کوردستان - بەغدا)وە ڕۆشتووە بۆ حەج. لە تەمەنی هەشتا و یەك سالیدا کۆچی دوایی کردووە. جگە لە نووسینەکانی کە دەگەنە سی و یەك کتێب و نامیلکە، سێ دیوانی شیعری ویجدانی و حەوت دیوانی مەسنەویشی بەجێ هێشتووە. مەبەست لە کتێبی "جامی"ش لێرەدا ئەو شەرحەیەتی کە لەسەر کتێبی "الكافية"ی "ابن الحاجب" نووسیویەتی و، بە باشترین شێوە هەموو شەرحەکانی تری کافیەی تێدا بە پوختی هێناوە و لە لایەن خۆیشیەوە هەندێکی تری جوان و ڕێکوپێکی لێ زیاد کردووە و، ناوی ناوە: "الفوائد الضيائية". بەڵام لەناو فەقێ و حوجرەکانی کوردستاندا هەر بە کتێبی (جامی) بەناوبانگە. بڕوانە: (نقد و بررسی آثار وشرح احوال جامی، تالیف: اعلاخان افصح زاد، چاپ اول، ١٣٧٨ هـ.ش. تهران) هەروەها: (تاریخ ادبیات ایران، تالیف: ذبیح الله صفا، تنخیص: سید محمد ترابی. ج٣/ص١٥٢-١٥٥، چاپ پنجم ١٣٨٠ هـ.ش. تهران). هەروەها: (كشف الظنون ٣/١٣٧٢) و (الأعلام ٣/٢٩٦). (وەرگێڕ)

کاتێ کە مامۆستاکەی لێی پرسی:

- باشە ئایا کام لەم زانستانە لەگەڵ سروشتی تۆدا دەگونجێن؟

وتی:

- ناتوانم لێکیان جیا بکەمەوە، هەموویان لای من یەکسانن.. یان ئەوەیە بە تەواوی لە هەموویان تێدەگەم. یان هیچیان لێ تێناگەم!

لە ماوەی ئەم سێ مانگەدا هەرچی ڕۆژە نزیکەی دووسەد لاپەڕە یاخود زیاتری دەخوێند لە مەتنی کتێبەکانی وەك "جمع الجوامع"[1] و "شرح المواقف"[2] و "ابن حجر"[3]. لەگەڵ تێگەیشتنی تەواوەتی لە هەموویان، بە بێ یارمەتیدانی هیچ کەسێك. بە ڕادەیەك شارەزایی تیایاندا پەیدا کردبوو کە هەر پرسیارێکی لە بارەی هەر زانستێکەوە ئاراستە بکرایە، یەکسەر وەڵامی تێروتەسەلی دەدایەوە..

بەم جۆرە، لەو ماوەیەدا بە تەواوی بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لێ برا، بە ڕادەیەك کە پەیوەندیی بە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە نەما و، بە دەگمەن قسەشی دەکرد و، زۆربەی کاتەکانی لە تەنیشت ئارامگای ئەدیبی خواناس و بەناوبانگی کورد "ئەحمەدی خانی"[4] بەسەر دەبرد بە تایبەت لە شەودا. لە کاتێکدا خەڵك لە ڕۆژی ڕۆشنادا دەترسان بڕۆنە

(١) جمع الجوامع: کتێبێکە لە زانستی "أصول الفقە"دا، تاجەدین عەبدولوەهابی سەبوکی (٧٢٧ - ٧٧١ك) دایناوە کە لە نزیکەی سەد کتێبەوە کۆی کردووەتەوە و، پوختەیەکی بەناوبانگە لەو زانستەدا. گەلێ ڕاڤە و پەراوێزی بۆ کراوە.

(٢) المواقف: کتێبێکە لە زانستی "کەلام"دا عەزودەدینی ئیجی دایناوە کە لەساڵی (٧٥٦ك)دا کۆچی دوایی کردووە. کتێبێکی بەنرخە و گەلێ زانای پایەبەرز شەرحیان کردووە، وەك: جورجانی و، کرمانی و، ئەبەری و، جگە لەوانیش. مەبەست لەو شەرحەی کە لە دەقەکەی سەرەوەدا ناوی هاتووە، شەرحەکەی سەیید شەریفی جورجانی‌یە.

(٣) مەبەست کتێبی: "تحفة المحتاج في شرح المنهاج"ە کە ئیبن حەجەری هەیتەمیی مەککی دایناوە و، شەرحی "منهاج الطالبین"ی ئیمامی نەوەوی‌یە لە مەزهەبی شافیعیدا.

(٤) شێخ ئەحمەدی خانی: لە "خان"ی سەر بە پارێزگای "هەکاری"ی لە باکووری کوردستان ساڵی ١٦٥٠ز لە دایك بووە. زانستە ئیسلامی‌یەکانی لە گوندەکانی نزیکی خۆیان خوێندووە تا شارەزایی تەواوی تیایاندا بەدەست هێناوە. دیوانێکی شیعر و چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "نوبهار" و "مەم و زین". ئەمەی دوایی یەکێکە لە شاکارە بەرهەمەکانی ئەدەبی کوردی. "خانی" بە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی شیعری نووسیوە. ساڵی ١٧٠٦ز لە شاری بایەزید کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش بە خاك سپێرراوە.

ناو ئەو ئارامگایە کـە لـە شوێنێکی چۆڵەوانیدایـە. هـەر لەبەر ئەوەش بوو کە خەڵکی دەیانوت: نوورسی بەهرەمەندی بەرەکەتی ئەحمەدی خانی بووە و، ئەم حاڵـەت و دیـاردە ناوازەیەی ئەویان بە کەرامەتی شێخ ئەحمەدی خانی لە قەڵەم دەدا.

پاشان بڕیاری دا بڕوات بۆ بەغدا بۆ مەبەستی سەردانی زانایانی ئەوێ. ئیتر پۆشاکی دەروێشانی پۆشی و بە ڕۆژ و شەو ڕێی چیا و شاخە هەڵەت و دارستانە چڕەکانی بڕی و ڕێبازی زاهیدانی گرتەبەر و، دەستی دایە وەرزشی ڕۆحـی و بـەکارهێنانی زوهـدی خواناسان، هەتا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هێندە لاواز بوو کە ئەم چەشنە وەرزشەی لـە توانـادا نەما، چونکە بە ماوەی سێ ڕۆژی ڕەبەق تەنها یەك پارچە نانی دەخواردا بەو نیازەی کـە بگاتە حاڵـەتی ئەو حەکیمانەی پێیان وا بووە وەرزشی ڕۆحی زەینی مرۆڤ ڕۆشـن دەکات..

هـەروەها لـە گۆشەی ئەو تەسەووفەی کـە ئیمامی غـەزالی لـە کتێبی "إحياء علـوم الدين"دا وەسفی کردووە، ئەو قاعیدە نەبەوی‌یەی کـرد بـە دەسـتووری خـۆی کـە دەفەرموێ: "دعْ ما يَريبك إلى ما لا يَريبك"[(١)].. لەبەر ئەوە، وازی لە هەموو ئـەو شتانە هێنا کە شوبهەیان تێدایە، تەنانەت وای لـێ هات کە بـە خواردنی گژو گیا دەژیـا.. ئیتر بەم جۆرە ڕێگای بڕی تاکو گەیشتە بەدلیس[(٢)].

☐ بەرگ و پۆشاکی زانایان:

(کاتێ کە تەمەنم چواردە ساڵان بوو چەند ڕێگرێك بوون بەهۆی ئەوەی کـە هیچ مامۆستایەك مێزەرم بۆ نەپێچێتەوە و جوببـەم لەبـەر نـەکات، وەك نیشـانەیەك لەسـەر بەڵگەنامەی زانستی، کە جاران وەك نەریتێك لە ئاهەنگی وەرگرتنی ئیجازەی زانستیدا باو بوو. چونکە لەبەرکردنی جوببە، کـە پۆشـاکی زانایـان و کەسانی تەمـەن گەورەیـە، لەگەڵ تەمەنی بچووکی ئەو کاتەی مندا نەدەگونجا..

هـەروەها زانایـانی ئـەو کـات و سـەردەمە، لـە بەرامبـەر منـەوە یـان لـە هەڵوێستی مونافیسدا بـوون، یـان بـە تـەواوی تەسلیم بووبوون. بۆیـە نـەیانتوانی وەك مامۆستا لـە

(١) ئیمامی تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە، كتاب صفة القيامة: (٢٥٢٠).

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

بەرامبەرمەوە خۆیان بنوێنن. پاشان لەبەر ئەوەی کە چەند ئەولیایەکی مەزن کۆچی ماڵئاواییان لەم دنیایە کردبوو، ئەوا کەس ئەو شایستەییەی لە خۆیدا نەدەبینی جوببەم لەبەر بکات و مێزەرم بۆ بپێچێتەوە)[1].

ئەوەش لە "بەدلیس"دا بوو کاتێ کە ڕۆشت بۆ لای مامۆستا "محەممەد ئەمین ئەفەندی" و دوو ڕۆژ ئامادەی ئەڵقەی وانەکانی بوو. ئەم مامۆستایە داوای لێ کرد پۆشاکی زانایان (جوببە) بپۆشێت و، واز لە پۆشاکی دەروێشانە بهێنێت. بەڵام داواکاریی مامۆستاکەی نەهێنایەدی و، وتی:

– هێشتا من باڵغ نەبووم و، خۆم بە شیاوی پۆشینی بەرگ و پۆشاکی زانایان نازانم.. ئایا چۆن دەمە زانا کە هێشتا من مناڵم؟[2].

□ بۆ لای کاکە "مەلا عەبدوڵڵا"ی:

پاشان ڕۆشت بۆ شاری "شێروان" بۆ لای کاکە "مەلا عەبدوڵڵا"ی برای. مەلا عەبدوڵڵا پێی وت:

– من کتێبی: "شرح الشمسية"م[3] تەواو کردووە، ئەی تۆ لەم ماوەیەدا چیت خوێندووە؟

– هەشتا کتێبم خوێندووە!

– مەبەستت چی‌یە؟

– هەموو ئەو کتێبانەم خوێندووە کە بڕیارە بخوێنرێن و، زیاد لەوانە چەند کتێبێکی تریش.

– ئاخر تاقیت دەکەمەوە؟

– ئامادەم.. چی دەپرسیت بپرسە!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٩١-١٩٢.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٣) (الشمسية) کتێبێکە لە زانستی مەنتیقدا کە (الكاتبي القزويني ٦٠٠-٦٧٥ك) بە عەرەبی دایناوە. هەریەك لە (تەفتازانی ٧٩٣ك) و (تەحتانی ٧٦٦ك) شەرحێکی باشیان بۆ نووسیوە. ئەمەی دووهەمیان بە ناوی (تحرير القواعد المنطقية في شرح الشمسية) ناسراوە و لە حوجرەکاندا خوێنراوە.

پاشان "مەلا عەبدوڵڵا" پرسیارەکانی ئاراستە کرد، کاتێ گوێی لە وەڵامە ڕاستەکانی بوو، ڕێزی لە توانست و لێهاتنە زانستییەکەی براکەی نا، تەنانەت کردیشی بە مامۆستای خۆی. لە کاتێکدا کە هەشت مانگ لەوەوپێش بەدیعوززەمان قوتابی بوو لە لای[1]!

[ هەر لەم ماوەیەدا ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان هەردووکیاندا ڕووی دا کە تەرازوویەکی وردی تێدایە ]:

□ تەرازوویەکی ورد لەناو گفتوگۆیەکدا

(نزیکەی پەنجا ساڵ پێش ئێستا ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوان من و کاکە مەلا عەبدوڵڵامدا - خوا لێی خۆش بێت - ڕووی دا. وا بۆ ئێوەشی دەگێڕمەوە:

کاکی خوا لێخۆشبووم یەکێك بوو لە موریدە تایبەتمەندەکانی "شێخی زیائەددین" - قُدّس سرّه - کە یەکێکە لە ئەولیا و پیاوچاکەکان[2].

وەك ئاشکرایە سۆفییانی تەریقەت خۆشەویستیی لە ڕادەبەدەر و زیادەڕەوی لە گومان باشیدا بە مورشیدەکەیان بە شتێکی ئاسایی دەزانن، بەڵکو پێیشی ڕازین. لەبەر ئەوە، ڕۆژێکیان کاکم پێی وتم:

- شێخی "زیائەددین" زانیارییەکی یەکجار فراوانی هەیە و، بە چەشنی "قوتبی ئەعزەم" ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە کە لە بوونەوەردا ڕوودەدەن!

ئنجا گەلێ نموونەی لەسەر پایەبڵندی و کارە لەعادەت بەدەرەکانی ئەو بۆ گێڕامەوە، بۆ ئەوەی هانم بدات منیش پەیوەندیی لەگەڵدا ببەستم!

بەڵام من پێم وت:

- کاکی بەڕێزم! تۆ زیاد لە پێویست ڕۆدەچیت.. ئەگەر ڕووبەڕووی شێخی "زیائەددین" خۆیشی ببمەوە لە زۆر مەسەلەدا بە بەڵگە دەیبەستمەوە. ئەوەش بزانە تۆ - وەك من - بە خۆشەویستیی ڕاستەقینە ئەوت خۆش ناوێت، چونکە تۆ ئەو "زیائەددین"ەت خۆش دەوێت کە لە زەینی خۆتدا بە شێوەی قوتبێکی ئەعزەم و ئاگادار بە هەموو شتێك لە بوونەوەردا ئەندێشەت پیشانتی دەدات! کەواتە تۆ بەم ناونیشان و

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٢) بڕوانە پەراوێزی ل: ٨٦. (وەرگێڕ)

سیفەتەوە پەیوەندیت لەگەڵ بەستووە و خۆشت دەوێت. خۆ ئەگەر پەردە لە ڕووی لاببرێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، ئەو خۆشەویستی‌یەت نامێنێت، هیچ نەبێ کەم دەبێتەوە!

بەڵام من – ئەی کاکی بەڕێزم! – ئەو مرۆڤە پیاوچاك و وەلی‌یە موبارەکەم وەك تۆ خۆش دەوێت، تەنانەت ڕێزی شایانیشی لێ دەگرم، چونکە:

ڕابەرێکی مەزنی ئیماندارانە و، لەسەر ڕێی حەقیقەتی شوێنکەوتەی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ. جا ئیتر پلەی ڕاستەقینەی ئەو هەرچی‌یەك بێت با بێت، من ئامادەم گیانی خۆم بۆ ئەو خزمەتگوزاری‌یە ببەخشم کە ئەو پێشکەشی ئیمانی دەکات. خۆ ئەگەر پەردە لە ڕووی پلەی ڕاستەقینەی لابدرێت، من پشتی لێ هەڵناکەم و وازی لێ ناهێنم و پلەی خۆشەویستی‌یەکەشم بۆی دانابەزێت، بەڵکو پتر پەیوەندیی لەگەڵدا پتەو دەکەمەوە و زیاتر ڕێزی دەگرم و خۆشم دەوێت.

کەواتە – کاکی بەڕێزم! – من "زیائەددین"م خۆش دەوێت بەو جۆرەی کە هەیە و لەسەر ئەو حەقیقەتەی کە تیایدایە. بەڵام تۆ ئەو "زیائەددین"ەت خۆش دەوێت کە لە ئەندێشەتدایە[1]!

جا لەبەر ئەوەی کاکی خوالێخۆشبووم بە ڕاستی زانایەکی "بەویژدان" بوو، ڕاکەی منی پەسەند کرد و ڕەزامەندیی لە بەرامبەرەوە دەربڕی و وەری گرت و ڕێزی لێ نا)[2].

### ❑ مەردایەتیی پێش وەخت

(گفتوگۆ و مونازەرەی ڕۆژگارانی دێرینی "سەعید" کە هێشتا منداڵ بوو لەگەڵ زانا بەڕێز و پایەبەرزەکاندا.. هەروەها وەڵامدانەوەی ڕاست و دروستی بۆ پرسیارەکانیان، بێ ئەوەی خۆی هیچ پرسیارێك ئاراستەی ئەوان بکات، هەرچەندەش پرسیارەکانیان لە قورسترین بابەت و مەسەلەدا هەڵبژێررابوون..

---

(١) چونکە لە بەرامبەر خۆشەویستی‌یەکەتەوە نرخێکی زۆر گرانت دەوێت، لەوەتا لە بەرامبەر ئەو خۆشەویستی‌یەوە بیر لە شتێکی سەد قاتی ئەو نرخە دەکەیتەوە، لە کاتێکدا کە مەزنترین خۆشەویستی لە بەرامبەر پلە و پایەی ڕاستەقینەی ئەو زاتەوە هێشتا هەر بە کەم دادەنرێت. (دانەر)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٨١–١٨٣.

ئەم حاڵەتەی کە ئەوسا بە منەوە بینرا، پڕ بە دەم دەڵێم و دان بەوەدا دەنێم کە هی ئەوە نەبوو خاوەنی زیرەکی‌یەکی لەڕادەبەدەر یان توانا و لێهاتنێکی نائاسایی بم. نەخێر هی ئەوە نەبوو، چونکە من ئەو کاتە هێشتا منداڵێکی بچووك و گیرۆدەی زۆر دەردیسەری بووم و، تازە دەستم دابووە خوێندن و، بیرم پەرتەوازە و خۆیشم مایەی وورووژاندنی موناقەشەی خەڵکی بووم.

کەواتە من هەرگیز ئەوەم لە تواناد‌ا نەبوو کە وەڵامی پرسیاری زانا پایە بەرزەکان بدەمەوە، چونکە من هەر لەو کاتانەدا هەندێ جار لە موناقەشەی زانا بچووکەکان و قوتابیانی بچووکی زانستدا شکستم دەهێنا و بەسەرمدا سەردەکەوتن!

لەبەر ئەوە، قەناعەتی تەواوم هەیە بەوەی کە وەڵامە ڕاست و دروستەکانی ئەو کاتەم هی توانا و لێهاتنم و، لە زیرەکیی خۆمەوە نەبوون..

خۆیشم ماوەی حەفتا ساڵی ڕەبەق سەرم لەم دیاردەیە سووڕمابوو. بەڵام وا ئێستا – بە فەزڵ و بەخشندەیی خوای گەورە – یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەو دیاردەیە تێگەیشتم.

ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

ئەو زانستانەی کە لەناو قوتابخانە ئایینی‌یەکاندا دەخوێنرێن – کە وەك تۆوی ئەو زانستانەن – درەختێکی بەرداریان لێ پێ دەگات و، خزمەتگوزاری ئەو درەختەش گەلێ حەسوود و نەیاری دەبێت..

جا هەروەك لە سەردەمەکانی پێشوودا "ئەهلی سوننەت" و "موعتەزیلە" لە دژی یەکتر دەدوان و بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕا و بۆچوونەکانی یەکتری و سەرکەوتنیان بەسەر ئەوی تردا کتێبیان دادەنا.. دەبوو – بەو پێیە – خاوەن مەشرەب و ڕێبازە جیاجیاکانی موسڵمانانی ئەم سەردەمەش ڕەخنەیان لە خزمەتگوزاری ئەو درەختە – درەختی نوور – بگرتایە، بە تایبەت زانایانی ئایین، کە چ لەبەر مونافەسە و چ بەهۆی جیاوازیی مەشرەب و چ لەبەر ئەوەی کە "پەیامەکانی نوور" گەلێ جار دەماریان دەورووژێنێت، چاوەڕوان دەکرا ڕەخنەیان ئاراستە بکردایە..

جا لە کاتێکدا کە دەبوو ئەمە ڕووی بدایە.. کەچی خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوە بوو کە بە پێچەوانەی ئەم عادەتە دێرینەیە ئەم کارە بەڕێ بکات!

کەواتە هەزار و یەك جار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر ئەم نیعمەتە مەزنەی کە بە فەزڵی خۆی بەخشیی.

ئێستا من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە هۆی نەنووسینی هیچ کتێبێك لە لایەنی زانایانەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە "پەیامەکانی نوور"، وەڵامدانەوە ڕاست و دروستەکانی ئەوسای "سەعیدە بچکۆلە"یە بۆ زانا مەزنەکانی سەردەمی زوو! چونکە وەڵامە ڕاست و تەواوەکانی ئەو کاتەی سەعید، غیرەت و ئازایەتیی زانایانی ئێستای بە ئەندازەیەك خاو کردەوە کە خۆیان لە قەرەی پەیامەکانی نوور نەدا و ڕووبەڕووی نەبوونەوە! هەرچەندەش مەشرەبیان لەگەڵ هی پەیامەکانی نووردا جیایە و، گیانی مونافەسە و غیرەتی زانستیشیان لە خۆدا هەڵگرتووە!

لەبەر ئەوە، من لەو قەناعەتە تەواوەدام کە ئەمە یەکێکە لە حیکمەتەکانی ئەوەی زانایان ڕەخنەیان لە پەیامەکانی نوور نەگرت. چونکە ئەگەر ڕەخنەیان لێ بگرتایە، ئەوا دوژمنە پەنهانەکانمان و مولحیدان و شوێنکەوتووانیان ڕەخنەکەی ئەوانیان دەقۆزتەوە و، بە وێنەی بەڵگە و بەهانەیەکی یەکجار گرنگ دەیانگرت بەدەستەوە، ئنجا بۆ شکاندنی شان و شکۆی "پەیامەکان" و "زانایان"یش پێکەوە بەکاریان دەهێنا!

کەواتە سوپاسی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە، کە تەنانەت لە لایەن ئەو زانا ڕەسمییانەشەوە کە پەیامەکان گەلێ جار قسەی بەجێی تێ سرەواندوون، هیچ بەرەنگاری و ڕەخنەیەك ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" نەکران)[1]!

## ساڵی ١٨٩٢ز/١٣٠٩ك

□ بۆ سیرت (سیعرد):

دوای ئەوەی کە دوو مانگ لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برای " مایەوە، ڕۆشت بۆ "سیرت" بۆ قوتابخانەکەی "مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا".

مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا لێی پرسی:

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥١٥-٥١٧.

سالی پار "سیووتی"ت[١] دەخوێند، ئایا ئەم ساڵ "جامی"[٢] دەخوێنیت؟

- خوێندنی "جامی"م تەواو کردووە.

ئنجا مامۆستا ناوی هەر کتێبێکی لێ دەپرسی، ئەو لە وەڵامدا دەیوت:

- تەواوم کردووە.

بۆیە مامۆستا سەری لێ سوورِما! چونکە کێ دەتوانێت لەم ماوە کەمەدا ئەو هەموو کتێبانە بخوێنێت؟ تەنانەت ئەم سەرسوورِمانەی لە شێوەی گاڵتەدا دەربڕی و، وتی:

- سالی پار شێت بوویت، ئێستاش هەر بە شێتی ماویتەوە؟!

وەڵامی دایەوە کە:

- لەوانەیە مرۆڤ "حەقیقەت" لە خەڵکی بشارێتەوە، تاکو دووچاری لەخۆبایی بوون نەبێت و، دەروونی بەدخوازیشی بشکێنێت. بەڵام قوتابی لە بەردەم مامۆستاکەیدا، کە لە باوکی خۆی زیاتر رێزی لێ دەگرێت، جگە لە حەقیقەتی پەتی و بێ گومان ناتوانێت شتێکی تر بڵێت. جا ئەگەر بفەرموون ئەوا من ئامادەم لەو کتێبە ناوبراوانەدا تاقیم بکەنەوە!

دوای ئەم گفتوگۆیە، مامۆستا مەلا فەتحوڵلا پرسیارەکانی ئاراستە کرد. لە هەر کتێبێکدا پرسیاری لێ بکردایە، یەکسەر وەڵامی تێروتەسەلی دەدایەوە!

یەکێك لەوانەی کە ئامادەی ئەم گفتوگۆیە بوون "مەلا عەلی سۆران" بوو، کە دوای ئەم رووداوە دەستی کرد بە دەرس خوێندن لای "مەلا سەعید". لە کاتێکدا کە سالی پێشوو مامۆستای مامۆستاکەی مەلا سەعید بوو!

پاشان مامۆستا مەلا فەتحوڵلا لێی پرسی:

- باشە.. وا دیارە زیرەکی یەکەت نائاساییە.. بەڵام با توانای لەبەرکردنت ببینین! بزانین دەتوانیت تەنها بە دوو جار خوێندنەوە چەند دێرێك لە کتێبی "مەقاماتی حەریری" لەبەر بکەیت؟

---

(١) واتە کتێبی: "البهجة المرضية في شرح الألفية" لە زانستی "نەحوو"دا، دانراوی جەلالەددینی سیووتی یە، کە "ئەلفییەی ئیبن مالیك"ی تێدا راڤە کردووە.

(٢) واتە کتێبی: "الفوائد الضيائية"ی "جامی" کە باسی رابورد.

مەلا سەعید کتێبەکەی لێ وەرگرت و، تەنها یەك جار لاپەڕەیەکی لێ خوێندەوە و، یەکسەری لەبەری کرد و، لەبەر بۆ مامۆستاکەی خوێندەوە! بۆیە مامۆستاکەی لە سەرسووڕماندا خۆی بۆ ڕانەگیرا و، وتی:

"کۆبوونەوەی زیرەکی‌یەکی نائاسایی و، توانای دەراسا بۆ شت لەبەرکردن، گەلێ نایاب و دەگمەنە".

هەر لەوێ مەلا سەعید لە ماوەی یەك هەفتەدا و ڕۆژی بۆ ماوەی یەك دوو سەعات وانە خوێندن، کتێبی "جمع الجوامع"ی لەبەر کرد! ئەمەش وای لە مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا کرد کە ئەم دەستەواژەیەی خوارەوە لەسەر بەرگی کتێبەکە بنووسێت:

"قد جمعَ في حفظِه جمعَ الجوامعِ جميعه في جمعة"!

ئیتر دوای ئەم ڕووداوانە، مامۆستاکەی (مەلا فەتحوڵڵا) لە هەموو کۆڕ و دانیشتنێکی لەگەڵ زانایاندا مەدحی دەکرد و، سەرسووڕمانی خۆی لە بارەوە دەردەبڕی و، دەیوت:

"قوتابی‌یەك لە هەرەتی لاویدایە، هاتووە بۆ قوتابخانەکەمان و، بە بێ ڕاوەستان و یەك کەوتن وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە ئاراستەم کردووە. بۆیە گەلێ سەرم لە زیرەکی‌یە دەگمەن و زانستە زۆرەکەی سووڕماوە"[1].

لەبەر ئەمە بوو کە دەنگ و باسی لە "سیرت"دا بڵاو بووەوە، ئەمەش سەرنجی زانایانی ئەوێی ورووژاند و، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد و تاقی‌یان دەکردەوە و، دەیانویست بە پرسیار لێکردن سەخڵەتی بکەن. ئەمەش لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا ڕووی دا کە "مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا "ش ئامادەی بوو..

لەو کۆڕەدا هەر پرسیارێکیان ئاراستەی بەدیعوززەمان دەکرد، لە پێشدا سەیری ڕووی مامۆستاکەی (واتە سەیری ڕووی مەلا فەتحوڵڵای) دەکرد ئنجا وەڵامێکی هێندە تەواوی دەدایەوە وەك بڵێی لە کتێبدا بیخوێنێتەوە. جا ئەو زانایانەی کە ئەم دیمەنەیان بینی، وتیان ئەم لاوە مرۆڤێکی دەراسایە.. ئنجا تێکڕا مەدح و ستایشی زیرەکی و زانست و پلەی بەرزی ئەویان کرد.

---

(١) وەك دوایی ڕوون دەبێتەوە: مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا یەکەم کەس بوو کە نازناوی "بەدیعوززەمان"ی بۆ مامۆستا سەعیدی نوورسی دانا.

هێندەی نەخایاند ئەم هەواڵە لەناو خەڵکی شاری "سیرت"دا بڵاو بووەوە، تەنانەت خەڵکی بە وێنەی ڕێزگرتنیان لە وەلی‌یەکی پیاوچاك ڕێزیان لێ دەگرت. ئەمەش دەماری حەسوودیی لای هەندێ زانا و قوتابیانی تر وروژاند. جا لەبەر ئەوەی ئەوانە نەیاندەتوانی لە بواری زانستدا زۆرانی لەگەڵ بگرن و بە سەریدا سەربکەون، هەندێ لەو لاوانە ویستیان لە ڕێی بەکارهێنانی هێز و شەڕ پێ گێڕانەوە ئازاری پێ بگەیەنن!

ئەم هەواڵە کەوتەوە بەر گوێی خەڵکی سیرت، خێرا فریای کەوتن و لە ژێر دەستی ئەو لاوانە دەربازیان کرد و، بۆ مەبەستی پارێزگاری لێکردنی خستیانە ژوورێکەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی زانست و زانستخوازانی گەلێ خۆش دەویست، لە ژوورەکە دەرپەڕی‌یە دەرەوە و بڕیاری دا - گەر کوشتووشیانە - بەرگری و داکۆکی لە قوتابی‌یە نەیارەکانی بکات، تاکو نەبن بە نیشانەی تیری نەزانەکان!

بۆیە ڕووی کردە یەکێك لەو قوتابیانە و، پێی وت:

"بمکوژن.. بەڵام پارێزگاریی شەرەف و پلەوپایەی زانست بکەن"!

ئەمەی وت و، ڕێی خۆی گرتەبەر، بێ ئەوەی هیچ کام لەو قوتابیانە ڕێی پێ بگرێت! بەم جۆرە کۆتایی بەو ناکۆکی‌یە هات.

کاتێ پارێزگاری "سیرت" هەواڵەکەی بیست، چەند جەندرمەیەکی نارد بۆ لای بەدیعوززەمان تاکو پێی ڕابگەیەنن کە فەرمانی داوە نەیارەکانی دوور بخاتەوە، بۆ ئەوەی لە شەڕی ئەوان بیپارێزێت، هەروەها تاکو ئاگاداری بکەنەوە کە پارێزگار دەیەوێ چاوی پێی بکەوێت.

بەڵام بەدیعوززەمان بە سەرکردەی جەندرمەکانی وت:

"ئێمە قوتابیی زانستین، هەندێ جار دەچین بەگژی یەکتریدا، پاشان ئاشت دەبینەوە و هیچ لە دڵماندا نامێنێت. بۆیە بە کارێکی شیاوی نازانین کەسێکی تری دەرەوەی ڕێبازەکەمان خۆی لە ڕووداوەکانی نێوانماندا هەڵبقورتێنێت. ئنجا ئەوەش هەیە کە هەڵەکە لە لایەن منەوە بوو. بۆیە تکام وایە پۆزشم بگەیەننە پارێزگار کە ناتوانم سەردانی بکەم"!

مەلا سەعید لەم کاتەدا تەمەنی پازدە ساڵان و لەوپەڕی هێز و چالاکیدا بوو. جگە لەوە، سەرکەوتنیشی بەسەر هەموو زانایاندا بەدەست هێنابوو. هەر بۆیە ناوی "سەعیدی مەشهوور"یان لێ نا. چونکە لە "سیرت"دا ڕایگەیاند کە ئامادەیە وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوە، بێ ئەوەی خۆی پرسیار لە کەس بکات!

جارێکی تر ڕۆشتەوە بۆ "بەدلیس" و، لەوێ بیستی کە گرژی کەوتووەتە نێوان "مامۆستا محەممەد ئەمین ئەفەندی" و شێخانی خیزان. بۆیە نەسیحەت و ئامۆژگاریی خەڵکیی کرد کە خۆیان لە غەیبەت بپارێزن، کە ڕەفتارێکە شایانی موسڵمانان نییە. ئەوانیش لای "مامۆستا مەلا محەممەد ئەمین" سکاڵایان لەدەست کرد، ئەویش وتی:

- ئەو هێشتا منالە.. شایانی قسە لەگەڵ کردن نییە!

ئەم قسەیە بەرگوێی مەلا سەعید کەوتەوە، لە کاتێکدا کە سووکەڵەترین قسەی قبووڵ نەدەکرد!

بۆیە ڕۆشت بۆ کۆڕی ئەم مامۆستایە و، دەستی ماچ کرد و پێی وت:

- گەورەم! تکام وایە بفەرموون تاقیم بکەنەوە.. من ئامادەم بیسەلمێنم کە شایانی ئەوەم گفتوگۆم ئاراستە بکرێت!

"مامۆستا محەممەد ئەمین"یش لە قورسترین مەسەلەی زانستەکاندا شازدە پرسیاری ئامادە کرد تاکو "مەلا سەعید"یان پێ تاقی بکاتەوە[1]. ئەویش بە بێ ئەوەی لە هیچیاندا دابکێنێت، وەڵامی هەموویانی دایەوە!

دوای ئەم ڕووداوە ڕۆشتە مزگەوتی "قورەیشی" و، لەوێ دەستی دایە ئامۆژگاری و ڕێنمایی خەڵکی.

پاش ئەمە، خەڵکی "بەدلیس" بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان پشتگیرییان لە "بەدیعوززەمان" دەکرد و، هەندێکی تریشیان لە "مامۆستا مەلا محەممەد ئەمین". پارێزگاری شاریش کە بەمەی زانی ترسا لەو دوو کۆمەڵە دەستەویەخەی یەك ببنەوە. بۆیە فەرمانی دەرکرد مەلا سەعید بۆ شاری "شێروان" دوور بخرێتەوە.

(١) یەکێك لەو پرسیارانە لە کۆتایی کتێبی (قزل إیجاز) لە کۆمەڵە پەیامی عەرەبیی "صیقل الإسلام"دا بڵاو کراوەتەوە.

ڕۆژێکیان ویستی خوای گەورە وابوو کە "بەدیعوززەمان" نوێژی بەیانیی بچێت! هەر هێندەی نەیارەکانی بەمەیان زانی یەکسەر کردیان بە مقۆمقۆ لە شاردا کە مەلا سەعید وازی لە نوێژ هێناوە!

کاتێ خەڵکی لێیان پرسی:

– بۆچی هەموو خەڵکی ئەم قسەیە دەڵێنەوە؟

وتی:

– هەر قسەیەك گەر بناغەیەکی نەبێت، ئاوا بە خێرایی لەناو خەڵکدا بڵاو نابێتەوە. کەواتە هەڵەکە لە خۆمەوەیە و، دوو سزاش درام لەسەری: یەکەمیان گلەیی خوای گەورە و، دووهەمیشیان قسەی خەڵکی!

بەڵام هۆکاری سەرەکیی ئەم کارە ئەوەیە بە شەو ئەو ویردە شەریفەم نەخوێند کە ڕاهاتووم هەموو شەوێك بیخوێنم. کەواتە ڕۆحی ئەو خەڵکە هەستیان بەو ڕاستییە کردووە، بەڵام بە تەواوی لێی تێنەگەیشتوون و نەیانزانیوە هەڵەکە لە کوێدایە، بۆیە ناوێکی تریان لەو ڕاستییە ناوە.

هەر لەو ماوەیەی کە لە "شێروان"دا بوو، پیاوێکی خەڵکی یەکێ لە گوندەکانی "سیرت" هات بۆ لای و، پێی وت:

– لە "سیرت"دا زانایەکی بچووك پەیدا بووە کە تەمەنی لە نێوان چواردە و پازدە ساڵاندایە و، بەسەر هەموو زانایانی شاردا سەرکەوتووە. بۆیە تکات لێ دەکەم کە بڕۆیت بۆ ئەوێ تاکو مونازەرەی لەگەڵ بکەیت.

سەعیدیش بەدەم خواستی ئەم مرۆڤەوە ڕۆشت و، خۆی ئامادە کرد سەفەری لەگەڵدا بکات بۆ "سیرت". ئنجا دوای ئەوەی شاریان بەجێ هێشت و ماوەی دوو سەعات ڕێگایان پێکەوە بڕی، سەعید وەسفی ئەو لاوە زانایەی لە هاوڕێکەی پرسی.

ئەویش وتی:

– ناوی نازانم، بەڵام کاتێ کە هاتە شارەکەمان بەرگ و پۆشاکی دەروێشانەی لەبەردا بوو، پاشان پۆشاکی قوتابیانی قوتابخانەی ئایینی پۆشی و، لە مونازەرەدا بەسەر هەموو زانایاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

ئا لێرەدا سەعید زانیی کە ئەو کەسەی ئەم پیاوە باسی دەکات خۆیەتی! واتە دەرۆشت مونازەرە لەگەڵ خۆیدا بکات! لەبەر ئەوە، یەکسەر گەڕایەوە بۆ شێروان.

پاشان ڕۆشت بۆ یەکێ لە شارۆچکەکانی سەر بە "سیرت" کە ناوی "تیللۆ"یە[1] و لەوێ ڕۆشتە ئیعتیکاف و گۆشەگیرییەوە[2].

## ساڵی ١٨٩٤ز/١٣١١ك

☐ گۆشەگیریی لە "تیللۆ"دا:

(ئەو کاتە من – وەك ئێستام – گۆشەگیر بووم لە ژێر گومەزێکی چۆڵدا. کاتێ کە شۆربایان بۆ دەهێنام، دەنك و دانەکانی ناو شۆرباکەم دەردەهێنا و بۆ مێروولەکانم ڕۆدەکردن، خۆیشم نانەکەم بە شلەکەی تەڕ دەکرد. جا ئەو کاتە کە لێیان پرسیم بۆچی وات دەکرد، وتم:

– نەتەوەی مێروولە و هەنگ لە ژێر سایەی سیستەمێکی کۆماریدا دەژین، منیش لەبەر ڕێزنانم لە ڕژێمە کۆمارییەکەیان دانی ناو شۆرباکەم بۆ ڕۆ دەکردن.

پێیان وتم:

– تۆ بەم کارەت ڕەفتارێکی پێچەوانەی سەلەفی صالحت کردووە.

لە وەڵامدا وتم:

– خەلیفە ڕاشیدەکان هەروەك خەلیفە بوون، لە هەمان کاتدا سەرۆك کۆماریش بوون. ئەوەتا صیددیقی مەزن (خوای لێ ڕازی بێت) بێ هیچ گومانێك وەك سەرۆك کۆمار وا بووە بۆ عەشەرەی موبەششەرە و سەرجەمی هاوەڵان، بەڵام نەك لە ژێر ناونیشان و لە قاوغێکی بەتاڵدا، بەڵکو هەریەکەیان سەرۆك کۆمارێکی ئاییندار بوون و، واتای دادگەریی ڕاستەقینە و سەربەستیی شەرعییان لەخۆدا هەڵگرتبوو)[3].

---

(١) "تیللۆ" شارۆچکەیەکە لە باکووری کوردستان حەوت کیلۆمەتر لە سیرتەوە دوورە، تا ئێستاش بە پێگەباندنی زانایانی خواناس و پیاوچاك تایبەتمەندە.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٣) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٦١.

لە دەمی گۆشەگیری و ئیعتیکافیدا لە "تیللۆ"، فەرهەنگی "القـــاموس المحیــط"ی فەیروزئابادیی هەر لە سەرەتاوە هەتا (باب السین) لەبەر کرد!

کاتێ هۆی ئەم کارەیان لێ پرسی، وتی:

ئەم فەرهەنگە بۆ هەموو وشەیەك چەندین واتـای جیـاواز دەهێنێـت. منیش ئـەوەم بـە ئەندێشـەدا هـات کـە فەرهـەنگێك بـە پێچەوانـەی ئەمـەوە دابنێـم، واتـە چـەند وشـەیەکی جیاجیا بهێنم کە ئاماژە بۆ هەمان واتا بکەن[1]!

□ لابردنی ستەم:

شەوێك لە خەونیدا چاوی بە "شێخ عەبدولقادری گەیلانی" - قدس سره - کەوت. شێخ فەرمانی پێ دا کە:

مەلا سەعید! هەڵسە برۆ بۆ لای "مستەفا پاشا"ی[2] سەرۆك عەشرەتی "مـیران" و، بۆ رێی ڕاست و دەست هەڵگرتن لـە ستەم بـانگی بکـە و، پێـی بڵـێ نوێژەکـانی بخوێنێـت و فەرمان بە چاکە بکات.. گەر نەهات بەدەم داواکارییەکانتەوە بیکوژە.

کە لە خەو هەڵسا، یەکسەر کەوتە رێ بۆ نـاو عەشـیرەتی مـیران و ڕاستەوخۆ ڕووی کردە خێوەتەکەی "مستەفا پاشـا".. بـەڵام کـە زانیـی لـەوێ نییـە دانیشـت تـاکو کـەمێ بحەسێتەوە.

هەر کە مستەفا پاشا خۆی کرد بە خێوەتەکەدا، ئامادەبووان هـەموویان بـۆ ڕێزلێنـانی لەبەری هەڵسانە سەر پێ، جگە لە مـەلا سـەعید کـە لـە شـوێنی خـۆی نـەجووڵا! مستەفا پاشا بە تیلی چاو هەستی پێ کـرد، بۆیـە لـە "فـەتاح ئاغـا"ی پرسـی، کـە یـەکێك بـوو لـە میرانی عەشرەت: ئەم لاوە کێیە؟

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. بەڵام دوایی وازی لەو نیازەی هێنا، چونکە بیستی کە لە وڵاتی میسر بەرهەمێکی لەو جۆرە دانراوە. بڕوانە: داوەرییەکان، ل: ٨٦٠. (وەرگێڕ)

(٢) سوڵتان عەبدولحەمید پلەی "پاشا"ی - کـە ڕوتبەیـەکی سـەربازی بـووە - بـەم مستەفایە و چـەند سـەرۆك عەشیرەتێکی تری کورد بەخشیوە، چونکـە ئەوانـە بـە خۆیـان و چەکدارەکانیانـەوە ڕۆڵـی پاسـەوانیان دەبینـی لەسەر سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیا، هەروەك هاوکاریی سوپای نیزامیشیان دەکرد و، خـەڵکی ناوچەکەیان لە هێرشی چەکدارەکانی ئەرمەن دەپاراست. جگە لەم هۆکارانەش دەوڵەتی عوسمانی بـەم کـارە "لایەنگیری"ی ئەوانەی بۆ دەوڵەت مسۆگەر دەکرد و بواری نەدەدا کە لە دەوڵەت هەڵبگەڕێنەوە!

پێی وت: مەلا سەعیدی مەشهوورە!

ئەم پاشایە، خۆی لە خۆیدا ڕقی لە زانایان بوو، ویستی ڕقەکەی بخواتەوە و دەری نەبڕێت. لە مەلا سەعیدی پرسی:

بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە؟

وتی: بۆیە هاتووم کە ڕێی حەق و ڕاستت پیشان بدەم. جا یان ئەوەیە دەست لە ستەم هەڵدەگریت و نوێژەکانت دەکەیت، یان دەتکوژم!

مستەفا پاشا بیستنی ئەم گوفتارەی گەلێ پێ قورس بوو. بۆیە لە تاوا ڕۆشتە دەرەوەی خێوەتەکە و، نەختێ هاتوچۆی بەو ناوەدا کرد. ئنجا هاتەوە هەمان پرسیاری لێ کردەوە.

مەلا سەعیدیش وەڵامی دایەوە:

بۆ ئەوە هاتووم کە پێم وتیت!

"پاشا" ئاماژەی بۆ شمشێرەکەی ئەو کرد، کە بە ستوونی خێوەتەکەدا هەڵی واسیبوو، ئنجا بە سووکایەتی‌یەوە وتی:

بەم شمشێرە ژەنگاوی‌یە دەمکوژیت؟

ئەویش وتی: ئەوەی کە دەبڕێت دەستەکەیە، نەك شمشێرەکە!

جارێکی تر پاشا بەوپەڕی تووڕەییەوە خێوەتەکەی بەجێ هێشت. پاشان کە هاتەوە ژوورەوە بە "بەدیعوززەمان"ی وت:

من لەم ناوچەی "جزیرە"یەدا (جزیرەی بۆتان) گەلێ زانام هەیە. کۆڕێکی مونازەرەی زانستی لە نێوانتاندا ساز دەکەم. جا ئەگەر توانیت بە سەریاندا زاڵ بیت، ئەوا داواکاری‌یەکەت جێبەجێ دەکەم، دەنا دەتهاوم‌ە ناو ڕووبارەکەوە.

مەلا سەعید وتی:

هەروەك من بۆم نی‌یە سەرجەمی زانایان بێدەنگ بکەم و بە سەریاندا زاڵ بم، تۆش ناتوانیت من بخەیتە ناو ڕووبارەکەوە، بەڵام گەر بە سەریاندا سەرکەوتم دەبێ تفەنگێکی "ماوزەڕ"م بدەیتێ، تاکو - گەر بەڵێنەکەت نەبەیتە سەر - بەو تفەنگە بتکوژم!

دوای ئەم دەمەقرە توندوتیژە، پێکەوە بە سواری ئەسپ بەرەو "جزیرە" کەوتنە ڕێ. بە درێژایی ڕێگا پاشا هیچ قسەیەکی لەگەڵ مەلا سەعیددا نەکرد.

کاتێ گەیشتنە ناو دارستانەکانی "بانی خانی" و دوای ماندووبوونێکی زۆر، مەلا سەعید خەوی لێ کەوت. کاتێ لە خەو هەڵسا بینیی زانایانی جزیرە هەموویان کۆبوونەتەوە و کتێبەکانیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە و، چاوەڕوانی کاتی دەست پێکردنی مونازەرەن.

کۆڕ ساز کرا و، پاش سڵاو کردن "چا" بۆ ئامادەبووان هێنرا. بەڵام زاناکان لە تاوا ئاگایان لە "چا"کانیان نەمابوو، بەڵکو هەر خەریکی پەڕە هەڵدانەوەی کتێبەکانی بەردەستیان بوون و، ناوبانگی "مەلا سەعید" ترسی هاویشتبووە ناو دڵیان و، خۆیان بۆ وەڵامی پرسیارەکانی ئامادە دەکرد. کەچی لەو لاشەوە مەلا سەعید زۆر ئاسایی بوو، گوێی بەو مونازەرەیە نەدەدا، تەنانەت جگە لە "چا"کەی خۆی، چای یەك دوانێکی تری دەوروبەری خۆیشی خواردەوە لەوانەی کە لەبەر سەیر کردنی کتێبەکانیان ئاگایان لای خۆیان نەمابوو!

ئا لەو کاتەدا مستەفا پاشا – کە سەرنجی هەموویانی دەدا – ڕووی کردە زاناکان و پێی وتن:

هەرچەندە من نەخوێندەوارم، بەڵام پێم وایە لە بەردەم مەلا سەعیددا هەمووتان دەدۆڕێن، چونکە سەرنجم دا سەرقاڵ بوونتان بە کتێبەکانتانەوە ئاگای چا خواردنەوەی لە لا نەهێشتن، کەچی ئەو جگە لە "چا"کەی خۆی چای یەك دوانێکیشتانی خواردەوە!

مەلا سەعید بە نەرمونیانی زانایانی هێور کردەوە و، هەندێ قسەی خۆش و گاڵتە ئامێزی لەگەڵدا کردن. ئنجا پێی وتن:

بەڕێزان! من بڕیارم داوە پرسیار ئاراستەی هیچ کەسێك نەکەم. بەڵام وا ئامادەم بۆ وەڵامی پرسیارەکانتان!

دوای ئەم گوفتارە، دڵنیایی ڕووی تێکردن و، ئنجا نزیکەی چل پرسیاریان ئاراستە کرد.

مەلا سەعیدیش وەڵامی هەر هەموویانی بە ڕاستی و دروستی دایەوە، هی یەکێکیان نەبێت، کە ڕاستیی نەپێکابوو، بێ ئەوەی زانایان بەو هەڵەیەی بزانن! چونکە هەموویان سەری تەسدیقیان بۆ دانەواند.

دوای ئەوەی کۆڕەکە کۆتایی پێ هات، مەلا سەعید بە دوایاندا ڕۆشت و، پێی وتن:

داوای لێبوردن دەکەم.. لە وەڵامی فلانە پرسیاردا سەهووم کرد و، ئێوەش پێتان نەزانی. بەڵام وەڵامە ڕاستەکەی ئاوا و ئاوایە!

تێکڕا وتیان:

بە ڕاستی تۆ ئێمەت بە بەڵگە بەستەوە.. هەمووومان دان بەوەدا دەنێین.

دوای ئەم ڕووداوە، هەندێ لەو زانایانە وەك قوتابی لە بەردەم مەلا سەعیددا دادەنیشتن و، بە وانە خوێندن لە سەرچاوەی زانستی ئەویان هەڵدەگۆزی.

سەبارەت بە "مستەفا پاشا"، ئەوا بەڵێنەکەی بردەسەر و، تفەنگێکی ماوزەری بە دیاری دا بە "مەلا سەعید" و، دەستی کرد بە ئەنجامدانی نوێژەکانی.

ڕۆژێکیان بە هاوڕێیەتیی مستەفا پاشا ڕۆشت بۆ پێشبڕکێی ئەسپ سواری، بەڵام پاشا بە پەنهانی فەرمانی دابوو ئەسپێکی سەرکەش بۆ مەلا سەعید ئامادە بکەن!

ئەویش لە دەمی لاوی و لە سەرەتای تەمەنی شازدە ساڵیدا بوو، ئەسپەکەی بە ڕاست و چەپدا غار دەدا، کەچی ئەسپەکە بەرەو شوێنی تر ڕادەپەڕی و غاری دەکرد، خۆ هەرچەندە ویستی بە سەریدا زاڵ بێت، کەچی هیچ سوودێکی نەبوو، تا لە ئەنجامدا بە غاردان خۆی کرد بە ناو جێگایەکدا منداڵان یارییان تێدا دەکرد و یەکێك لەو منداڵانەی خست و کەوتە ژێر پێی ئەسپەکەوە، ئەو منداڵەش کوڕی یەکێك لە پیاوە گەورەکانی جزیرە بوو..

کە خەڵکەکە بینیان منداڵەکە جووڵەی لێ براوە، یەکسەر ویستیان مەلا سەعید بکوژن و خەنجەریان بۆ دەرهێنا، مەلا سەعیدیش دەستی خستە سەر دەمانچەکەی و، پێی وتن:

لە ڕووی حەقیقەتەوە خوا منداڵەکەی مراندووە و، لە ڕواڵەتیشدا ئەسپەکە کوشتوویەتی، بەڵام ئەگەر لە گۆشەی هۆکارەوە بڕوانینە مەسەلەکە ئەوا "مچە

کەچەڵ" کوشتوویەتی کە ئەم ئەسپە شێتەی پێ دام! کەواتە با لە پێشدا سەیری منالەکە بکەین، ئەگەر مردبێت، با شەڕ بکەین..

پاشان لە ئەسپەکەی دابەزی و منالەکەی گرتە باوەش، کە بینیی هیچ جموجوولێکی نەماوە، یەکسەر لە ئاوێکی ساردی هەڵکێشا. دوای ئەوە کتوپڕی منالەکە بە زەردەخەنەوە چاوەکانی کردەوە، خەڵکەکەش گەلێ لەو ڕووداوە سەرسام مابوون.

دوای ئەوەی کە ماوەیەك لە "جزیرە" مایەوە، لەگەڵ یەکێ لە فەقێکانیدا کە ناوی "مەلا صالح" بوو، ڕۆشت بۆ "پیرۆ" کە نیشتەجێی عەرەبە دەشتەکییەکان بوو، ماوەیەکیش لەوێ مایەوە. هەتا بیستی "مستەفا پاشا" گەڕاوەتەوە بۆ سەر خووە نالەبارەکەی پێشووی کە ستەمکردن بووە لە خەڵك. بۆیە ڕۆشتەوە بۆ لای و ماوەیەك ئامۆژگاریی دا بە گوێیدا، ئنجا هەڕەشەی لێ کرد و وتی:

- ئایا دەستت دایەوە ستەمکردن؟ ئەمجارە بە ناوی "حەق"ەوە دەتکوژم.

بەڵام کاتبەکەی پاشا بووە ناوبژیوان و هەڵوێستەکەی هێور کردەوە. کەچی لەبەر ستەمە زۆرەکانی پاشا لە خەڵکی ناوچەکە، مەلا سەعید دەستی لە سەرزەنشت کردنی پاشا هەڵنەگرت.

پاشا ئەم سووکایەتییانەی پێ هەڵنەگیرا، بۆیە ویستی مەلا سەعید بکوژێت. ئیتر پیاوماقووڵانی عەشرەتی میران کەوتنە نێوانیانەوە و نەیانهێشت دەست بۆ مەلا سەعید بیات.. پاشان "عەبدولکەریم"ی کوڕی مستەفا پاشا بە مەلا سەعیدی وت:

- لە ڕەفتاری باوکم دڵگران مەبە، چونکە قسەی هیچ کەسێك وەرناگرێت.. باوەڕێکی بێ کەڵکی هەیە. بۆیە تکایەکی دڵسۆزانەت لێ دەکەم کە تەشریفت بەیت بۆ شوێنێکی تر.

مەلا سەعید قسە و تکای عەبدولکەریمی پەسەند کرد و، لەوێی جێ هێشت و، ڕۆشت بۆ ناو دەشتایی "پیرۆ".

لەوێ تووشی بوو بە تووشی کۆمەڵێك پیاوخراپەوە کە هەر هەموویان قەمە و خەنجەریان لە دەستدا بوو. جا لەبەر ئەوەی مەلا سەعید تفەنگی پێ بوو، چەند

فیشەکێکی بە سەردا تەقاندن، لە ترسا لێی دوور کەوتنەوە. دوای ئەوە، لە ڕۆشتنی خۆی بەردەوام بوو هەتا کەوتە ناو بۆسەی دەستەیەك چەتەوە، کاتێ ویستیان بیکوژن، یەکێکیان ناسی‌یەوە و، وتی:

ئەمە پیاوێکی بەناوبانگە و، من لەناو عەشیرەتی "میران"دا دیومە.

کە ئەمەیان لە هاوەڵەکەیان بیست، ڕێیان بۆ چۆڵ کرد و پۆزشیان بۆ هێنایەوە، تەنانەت ویستیان ڕەوانەی بکەنەوە تاکو لەو شوێنە پڕ لە دزی‌یەدا تووشی هیچ گیروگرفتێك نەبێت. بەڵام مەلا سەعید ئەم داوایەی ئەوانی گێڕایە دواوە و بە تەنیایی ڕێگای گرتەبەر.

دوای چەند ڕۆژێك گەیشتە "ماردین". یەکەم جار زانایانی ئەم شارە ویستیان پەلپ بە مەلا سەعید بگرن و لە مونازەرەدا بێدەنگی بکەن و بەسەریدا زاڵ ببن. بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا و، دوای ئەوەی کە توانای زانستیی لە ڕادە بەدەری ئەویان بینی، ڕازی بوون کە بیکەن بە مامۆستای خۆیان، هەرچەندە لە هەرەتی لاوی و لە تەمەنی کوڕی ئەواندا بوو.

لەم کاتەدا دوو فەقێی بینی، یەکێکیان لە قوتابیانی "سەیید جەمالەدینی ئەفغانی" و، ئەوی تریشیان سەر بە تەریقەتی "سەنووسی" بوو. لە ڕێی ئەم دوانەوە زانیاری و ئاگاداریی لە ڕێبازی سەیید جەمالەدین و تەریقەتی سەنوسی پەیدا کرد[١].

□ سەرەتای بایەخدانی بە "سیاسەت" و بە کاروباری جیهانی ئیسلامی

(شازدە ساڵ پێش ئێستا[٢] لە دەوروبەری شاری "ماردین"دا زاتێکم بینی کە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی کردم و، ڕاستیی کاری سیاسەتی پیشان دام. منیش تا ئەو کاتە لە خەونێکی وەك "خەون"ەکەی کەمالدا[٣] بووم)[٤].

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٢) مەبەست ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەمە لە ١٩٠٨/٧/٢٤زدا. واتە ساڵی ١٨٩٢ یان ١٨٩٣ز گەیشتووەتە ماردین.

(٣) مەبەست کتێبێکی نووسەری تورك "نامیق کەمال"ە بە ناوی "خەونێك" ساڵی ١٩٠٨ز لە میسر بڵاوکرایەوە. تیایدا "ئازادی" بە حۆری دەچوێنێت و بە "خەون" وەسفی دەکات!

(٤) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٧٨.

(من بەیعەتم بە "سولتان سەلیم"[1] داوە و بیرۆکەی ئەوم سەبارەت بە "یەکگرتنی ئیسلامی" لە لا پەسەندە، چونکە هەر ئەو بیرۆکەیە بوو کوردەکانی بەخەبەر هێنا و، لەسەر ئەوە بەیعەتیان پێ داوە[2]. کوردەکانی ئێستا هەر ئەوانەی پێشوون و نەگۆڕاون.

پێشینانی من لەم مەسەلەیەدا: سەیید جەمالەدینی ئەفغانی یە و، لە زانا پایەبەرزەکانیش: شێخ محەممەد عەبدەی موفتیی وڵاتی میسرە و، عەلی سواعی و، زانا: تەحسین و، نامیق کەمالی شاعیرە[3] کە بانگەشەی بۆ "یەکگرتنی ئیسلامی" کردووە..

---

(١) "سولتان سەلیم" کوڕی سولتان بایەزیدی دووهەمە و کوڕەزای محەممەد فاتیحە. لە نێوان ساڵەکانی (١٤٧٠-١٥٢٠ز)دا ژیاوە و، لە بەرواری (١٥١٢ز)شدا ڕۆشتووەتە سەر تەخت و، یەکەم خەلیفەیە لە سولتانە عوسمانییەکاندا. (وەرگێڕ)

(٢) دانەر ئاماژە بەو فەرمانی خود موختارییە دەدات کە سولتان سەلیم سەبارەت بە کوردستان دەری کردبوو. ئەوەبوو دوای جەنگی بەناوبانگی "چالدێران" (١٥١٤ز) و سەرکەوتنی سوپای عوسمانی بەسەر سەفەوییەکاندا و دابەشبوونی کوردستان بە دوو بەشەوە، بەهۆی تێکۆشانی "مەلا ئیدریسی بەدلیسی" کە ڕاوێژکاری سولتان بوو لە کاروباری کورد و کوردستاندا، سولتان سەلیم "فەرمان"ێکی دەرکرد بۆ میرنشینە کوردییەکانی سنووری عوسمانی کە سەربەخۆ لە لایەن میرەکانیانەوە بەڕێوەببرێن، بەرامبەر بەوەش باجێکی ساڵانە بدەن بە دەوڵەتی عوسمانی و، لە کاتی پێویستیشدا بە ناردنی جەنگاوەر یارمەتیی دەوڵەت بدەن. بە پێی ئەو فەرمانە میرنشینەکانی (بۆتان، بادینان، سۆران، بابان) خاوەنی خود موختاری بوون و، کۆمەڵە ماف و ئیمتیازێکیان هەبوو، دەوڵەتیش دەستی نەدەخستە ناو کاروباری ناوخۆییان. بەڵام بە درێژایی کات دوا حکومەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەو پەیمانەیان لەبیر خۆیان بردەوە و، دەسەڵاتە کوردییەکانیان نەهێشت. بڕوانە: (الأكراد حتى معاهدة سيفر ١٩٢٠، سایتی: http://www.kdps.info/tarikh). (وەرگێڕ)

(٣) (سەیید جەمالەدینی ئەفغانی): کەسایەتیی ناوداری خۆرهەڵاتە. داواکاری یەکێتی و شووڕای ئیسلامی بووە. بە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا گەڕاوە و بیروباوەڕی خۆی بە گەلان و حکوومەتەکانی گەیاندووە. ساڵی (١٨٩٧ز) لە ئەستەبووڵ کۆچی دوایی کردووە. (شێخ محەممەد عەبدە): (١٨٥٠-١٩٠٥ز) زانایەکی هەڵکەوتووی میسرە. لە هەڵگرانی هزری سەیید جەمالەدینە. دوورخراوەتەوە بۆ سوریا. پاشان ڕۆشتووە بۆ پاریس. کە گەڕاوەتەوە بووە بە مامۆستا لە ئەزهەر، پاشان هەتا کۆچی دوایی موفتیی میسر بووە. (عەلی سواعی): (١٨٣٩-١٨٧٨ز) شاعیر و نووسەرێکی شارەزای زانستە ئیسلامی و کۆمەڵایەتییەکانە و، نەیاری سیاسەتی عوسمانی و ئیستیبداد بووە. ماوەیەك لە فەرەنسا ماوەتەوە. لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی "تورکیای لاو"ە. لە ڕووداوێکدا کوژراوە. زانا (تەحسین): ناوی حەسەن تەحسین عوسمانە (١٨١١-١٨٨١ز). خوێندنی لە ئەستەمبووڵ و پاریس تەواو کردووە. کراوە بە سەرۆکی زانکۆی ئەستەمبووڵ. دیوانێکی شیعری چاپ نەکراوی جێ هێشتووە. (نامیق کەمال): (١٨٤٠-١٨٨٨ز) ئەدیب و شاعیر و ڕۆژنامەنووسێکی نوێخوازی بەناوبانگی تورکە. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی "تورکیای لاو". گەلێ شیعر و ڕۆمانی نووسیوە. باوەڕی بە یەکێتیی ئیسلامی و، شەریعەت بە سەرچاوەی یاسا، بووە.

هەروەها "سولتان سەلیم"یش کە وتوویەتی:

جیاوازی و دووبەرەکی تەنانەت لەناو گۆڕەکەشمدا حەوانەوەم لێ دەسێنێت. چەکمان لە شکاندنی هێرشی دوژمناندا تەنها یەکگرتنە. گەر نەتەوەی ئیسلام یەك نەگرێت، من بە خەفەتەوە دەتلێمەوە)[1].

☐ کەرامەتی نوێژکردن:

لەبەر ئەوەی چالاکی‌یەکی گەرموگوڕی بۆ "سەربەستی" پێوە دەرکەوت و پشتگیریی بانگەشەچیانی سەربەستیی دەکرد و، بایەخی بە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی دەدا، پارێزگاری "ماردین" بە کەلەپچەکراوی بە دوو جەندرمەدا بۆ شاری "بەدلیس" دووری خستەوە.

لە ڕێگەدا کاتی نوێژکردن داوای لە جەندرمەکان کرد کەلەپچەکانی دەستی بکەنەوە، بەڵام ئەوان کەلەپچەکەیان لە دەستی نەکردەوە. کەچی خۆی بەوپەڕی ئاسانی، وەك ئەوەی دەستەسڕێك یەکاڵا بکات، کەلەپچەکانی لە دەستی خۆی کردەوە و فڕێی دایە بەردەمیان! جەندرمەکان لە تاوا حەپەسان و، ئەم کارەیان بە کەرامەتێك دانا. بۆیە لێی پاڕانەوە و وتیان:

ئێمە تا ئێستا پاسەوانت بووین، بەڵام لەمەولا دەبینە خزمەتکارت!

دوایی هەرکاتێ کە پرسیاری لێ دەکرا: چۆن ئەو کەلەپچانە کرانەوە؟

دەیوت: خۆیشم نازانم.. بەڵام پێم وایە کردنەوەی ئەو کەلەپچانە هی کەرامەتی "نوێژ" بوو[2].

لە بەدلیس ڕۆژێکیان بیستی کە پارێزگار و چەند کارمەندێك خەریکی مەی خواردنەوەن. بەمە زۆر تووڕە بوو، وتی:

---

تێبینی: هەموو یەکێکی ئەو کەسایەتی‌یە ناوبراوانە - وەك هەموو مرۆڤێکی تر - لایەنی ئیجابی و سەلبی‌یان هەبووە. مامۆستا نوورسي وەکو زانایەکی چاکساز و شەریعەتخوازی ئەو دەمە و، بە پێی ئەو دەستوورەی ژیانی: (خُذْ ما صفا، دَعْ ما كَدَر) سوودی لە لایەنە ئیجابی‌یەکانیان وەرگرتووە. (وەرگێڕ)

(١) داوەری‌یەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢١-٤٢٢.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. ئەم ڕووداوە لە یاداشتنامەکەی مەلا عەبدولمەجیدی برایدا باس کراوە و، بۆ خۆی لەو "ئیبراهیم" ناوەی بیستووە، کە یەکێك بووە لەو دوو جەندرمەیەی سەعیدی لاویان بردبوو بۆ بەدلیس. ب١/٩٧؛ ش١/٧٤.

کەسێك لە شارێکی موسڵمانی وەك "بەدلیس"دا نوێنەری حکوومەت بێت، نابێ کاری وای لێ بووەشێتەوە.

ئەمەی وت و، یەکسەر ڕۆشت بۆ کۆڕی مەی خواردنەوەکەیان. لەوێ ئامۆژگاری‌یەکی جوانی کردن و، سەرەتاکەشی بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دامەزراند لە بارەی "خەمر"ەوە. پاشان گەلێ قسەی زبری ئاراستە کردن..

لەم کاتەدا دەستیشی لەسەر دەمانچەکەی دانابوو، بە دووری نەدەزانی کە پارێزگار ئاماژەیەك بکات بۆ پیاوەکانی دەستدرێژیی بکەنە سەر. بەڵام پارێزگار زۆر ئارام بوو، دانی بە خۆدا گرت و هیچ شتێکی نەوت.

کاتێ مەلا سەعید لە کۆڕەکە هاتە دەرەوە، یاوەرەکەی پارێزگار پێی وت:

تۆ چیت کرد؟! ئەم قسانەت داخوازی لە سێدارەدانە!

وەڵامی دایەوە:

ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو کە لە سێدارە بدرێم، بەڵام وام دانابوو سزای ئەم کارەم یان "بەندی" یان "دوورخستنەوە" بێت.. بە هەرحاڵ، چ زیانێك دەکەم گەر لە پێناوی نەهێشتنی مونکەرێکدا بمرم؟!

نزیکی دوو سەعات دوای گەڕانەوەی لەو کۆڕە، پارێزگار دوو پۆلیسی نارد بە شوێندا. کە چوو بۆ لای و ڕۆشتە ژوورەوە، پارێزگار بەوپەڕی ڕێز و قەدرزانی‌یەوە پێشوازیی لێ کرد و، ویستی دەستیشی ماچ بکات. ئنجا پێی وت:

"هەموو کەسێك مامۆستایەکی پێشڕەوی هەیە.. تۆ لەمەولا مامۆستا و پێشەنگی منیت"[١].

## ❑ شەفەقەتی دایك و باوك

(هەرکاتێ هەواڵی ناخۆش بۆ دایك و باوکم بێرایە، وەك ئەوەی یەکێك پێی بووتنایە: "کوڕەکەتان کوژراوە.. یان لێی دراوە.. یان بەند کراوە" باوکم بە بیستنی ئەم چەشنە هەواڵانە دڵخۆش دەبوو.. بە پێکەنینەوە دەیوت:

---

Tarihce-i Hayat, ilk Hayati (١)

– ماشەڵڵا! کەواتە کوڕەکەم هێندە گەورە بووە کە قارەمانێتی بنوێنێت و، کارێکی وا مەزن ئەنجام بدات کە خەڵکی باسی بکەن!

کەچی دایکم لە بەرامبەر ئەم خۆشحاڵی‌یەی باوکمەوە، بەکوڵ دەگریا!

دوایی ڕۆژگار دەری خست کە زۆر جار باوکم لەو هەڵوێستەیدا لەسەر حەق بووە)[1]!

□ نەڕوانینی حەرام

(دوای ئەوەی کە "عومەر پاشا" هەوڵێکی یەکجار زۆری لەگەڵ دام بڕۆمە ماڵیان، چونکە ڕێزێکی زۆری لە زانست و زانایان دەگرت، دوو ساڵ لە ماڵی خوالێخۆشبوو عومەر پاشای ناوبراودا لە "بەدلیس" مامەوە..

ئەم پیاوە شەش کچی هەبوو؛ سیانی بچووك و سیانی گەورە. جا هەرچەندە من ماوەی دوو ساڵ لەو ماڵەدا ژیام، کەچی کچە گەورەکانیم نەدەناسین، چونکە بۆم نەدەڕوانین تا بیان ناسم و لێکیان جیا بکەمەوە.

جارێکیان زانایەك بوو بە میوانم و، لە ماوەی دوو ڕۆژدا ئەو کچانەی ناسی و لە یەکی جیا کردنەوە!

ئەو کەسانەی لە دەوروبەرمدا بوون، سەریان سووڕدەما لەوەی کە چۆن من نایان ناسم و.. پرسی‌یان: بۆچی سەیریان ناکەیت؟

منیش پێم وتن:

"پارێزگاری کردنی عیززەت و سەربەرزیی زانست نایەڵێت بە ڕوانینی حەرام سەیر بکەم"!)[2].

□ لەبەرکردنی مەتنی کتێبەکان.

کاتێ مەلا سەعید لە بەدلیسدا گەیشتە تەمەنی باڵغ بوون، بەهرە و بۆهاتەکانی هەروەها ئەو پیت بەرەکەتانەی کە پێی بەخشرابوون و لە موناظەرەکانی لەگەڵ زانایاندا

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٠٤.
(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٤٧.

بەهۆیانەوە سەركەوتنی بەدەست دەهێنا، وردە وردە بەرەو كەمبوونەوە دەڕۆشتن! خۆیشی هۆكاری ڕاستەقینەی ئەم ئالوگۆڕەی نەدەزانی چییە، لەوانەیە لە داخوازییەكانی باڵغ بوون، یان هی بایەخدانی بوو بێت بە كاروباری كۆمەڵایەتی و سیاسی..

بۆیە دەستی دایە لەبەركردنی مەتنەكان[1] لە هەموو زانستێكدا، تاكو پارێزگاریی پلەوپایەی زانستیی خۆی بكات لەناو زانایاندا..

ئەوەبوو لە ماوەی دوو ساڵدا گەلێ "مەتن"ی كتێبی لەبەر كرد، وەك "المطالع"[2] و "المواقف" و هاوچەشنیان لەو كتێبانەی كە بەرپەرچی ئەو دوودڵی و گومانانە دەدەنەوە ئاراستەی ئایین دەكرێن، جگە لەوەش لە مەتنی كتێبە ئالییەكانی وەك نەحوو، صەرف، مەنتیق و، هی كتێبە زانستییەكانیش وەك تەفسیر و كەلام و فەرموودە و فیقهی لەبەر كرد. لە پێشدا دەستی دایە لەبەركردنی مەتنی كتێبی "المرقـــاة"[3] بە بێ ڕاڤە و پەراوێزەكانی. پاشان بەراوردێكی سازكرد لە نێوان بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی لەو مەتنە و، پەراوێزەكان و ڕاڤەی كتێبەكەدا. لە ئەنجامدا بۆی دەركەوت كە هەموو مەسەلەكانی ناو پەراوێز و ڕاڤەكان، لە سێ و شەدا نەبێت دەنا لەگەڵ ئەوەی زەینی خۆیدا یەكاویەك دەرچوون. زانایان ئەم ڕەفتارەی ئەویان گەلێ پێ جوان بوو، هەر بۆیە سەریان لەو كارەی سووڕما.

لەبەر ئەوەش بایەخی دا بە لەبەركردنی مەتنی سەرچاوە بنەڕەتییەكانی كتێبە ئیسلامییەكان، لە بابەتە جۆراوجۆرەكانی زانست و فەلسەفەدا، تاكو بیانكات بە كلیلێك بۆ كردنەوەی ڕاستییە پەنهان و داخراوەكانی قورئانی پیرۆز و، بەرپەرچی ئەو گومانانە بداتەوە كە ئاراستەی ئایین دەكرێن[4].

---

(١) زۆربەی كتێبەكانی جاران لە (مەتن) و (شەرح) پێكدەهاتن. مەتن بە چڕوپڕی بابەتەكەی تێدا دەنووسرا. بەڵام شەرحەكە ڕاڤە و ئاسانكاریی تێگەیشتنی دەكرد. زۆر جار خوێنەری ئەو كتێبانە دەقی مەتنەكانی لەبەر دەكرد و، زانیاریشی لەبارەی شەرحەكانەوە دەبوو. (وەرگێڕ)

(٢) "مطالع الأنوار" كتێبێكە لە "مەنتیق"دا و، گەلێ شەرح و پەراوێزی لە لایەن زانایانەوە لەسەر كراوە.

(٣) "مرقاة الوصول الى علم الأصول" كتێبێكی زانستی ئوسوولی فیقهە لەسەر مەزهەبی حەنەفی، محەممەدی كوڕی فەرامورزی خەسرەوی دایناوە كە لە ساڵی "٨٨٥ك"دا وەفاتی كردووە.

(٤) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

[ هەر لەسەر ئەم حاڵە هەتا کۆتایی تەمەنی بەردەوام بوو. ئەوەتا لەبارەی خۆیەوە دەڵێ ]:

(بەشێکی کەمی بریسکانەوەی نوورێکی مەعنەوی، لە شێوەی زانستێك لە مێشکی مرۆڤێکدا دەردەکەوێت کە بەهۆی ئەو هێزی پارێزگار(حافظـــة)ەی بە ئەندازەی نینۆکێك دەبێت، دەتوانێت شت لەبەر بکات.. ئەم مرۆڤە وشەکانی نەوەد کتێبی لە مێشکی خۆیدا جەم کردووە و، هەموو ڕۆژێك سێ سەعات لە خوێندنەوەی تەنها ئەم بەشەی حافیزەیدا بەردەوام دەبێ تا ماوەی سێ مانگ ئنجا تەواوی دەکات!

هەر ئەم مرۆڤە کاتێ هەر شتێکی بوێت، لەوانەی کە بینیونی یان بیستوونی، یان هەر شێوە و واتایەك هاتووەتە پێش چاوی، یان هەر وشە و گوفتارێك کە پێی جوان بووە یاخود سەری لێی سووڕماوە، یان هەر شتێك حەزی لێی بووە، لەگەڵ سەرجەمی ئەو دەنگ و ڕەنگانەی کە هاتوونەتە ڕێی ژیانی لە ماوەی تەمەنی خۆیدا کە خۆی لە هەشتا ساڵ داوە، دەتوانێت لەو حافیزەیە دەری بهێنێت!

هەموو ئەو شتانەی ناویان برا لە لاپەڕەی ئەو حافیزەیەدا کۆکراونەتەوە. لەبەر ئەوە، پێی وایە ئەو حافیزەیە بە وێنەی کتێبخانەیەکی گەورەی ئەوتۆ وایە کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك زانیارییەکانی تێدا ڕێکخرابن)[1].

(ئەو توانا و بەهرەیە سەبارەت بە من نیعمەتێکی گەورە بوو. خۆ ئەگەر بتوانیایە بە جوانی بنووسم و خەتم خۆش بوایە، ئەو مەسەلانە لە دڵمدا جێگیر نەدەبوون. چونکە پێشتر من دەستم بە خوێندنی هەر زانستێك کردبێت، لەبەر ئەوەی لە خەتی خۆش بێ بەش بووم، لەپێشدا لەناو ڕۆحمدا دەمنووسییەوە)[2].

❑ دوا وانە:

ڕۆژێکیان کەسێك پڕوپاگەندەیەکی بڵاوکردەوە کە گوایا "مامۆستا مەلا محەممەدی کوفرەوی"[3] دوعای شەڕی لە مەلا سەعید کردووە.

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥٩٢.
(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ١١٠.
(٣) لە گوندی "کفرە"ی سەر بە "سیرت" لەدایك بووە. لە بەدلیس نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش ساڵی ١٨٩٧ز (١٣١٣ك) کۆچی دوایی کردووە.

هەر ئەوەندەی ئەم هەواڵەی بیست، یەکسەر ڕۆشت بۆ سەردانی مامۆستای کوفرەوی..

مامۆستاش بە ڕووی خۆشەوە بەخێرهاتنی کرد و، ئەمیش لەوێ ئامادەی دەرسێکی ئەم مامۆستایە بوو کە دوا وانەیە سەعیدی لاو خوێندوویەتی[١]. ئەوەبوو مامۆستای ناوبراو وانەکەی بەم دەستەواژەیە دەست پێکرد:

(الحمدُ لله الذي قدَّر مقاديرَ الأشياءِ بقدرتِه وصوَّرَ تصاويرَ الأشـكالِ بحكمتِه. والصلاةُ والسلامُ على محمد محيطِ مركزِ دائرةِ النبوة وعلى آله حبيبِ كسوةِ الفتوة والمروة، ما دارَتْ على سطوحِ الأفلاكِ النجوم وما سارت في زوايا الغبراء الغيوم)[٢].

بەڵێ دواهەمین دەرس و بەپیتترین وانەم لە خزمەت "مامۆستا مەلا محەمەدی کوفرەوی"دا – قُدِّسَ سِرُّه – خوێند کە زۆر لە سنووری خۆم زیاتر سۆز و شەفەقەتی بۆ نواندم"[٣].

شەوێك لە خەوندا مامۆستا مەلا محەممەدی کوفرەویی بینی، پێی وت:

مەلا سەعید! وەرە بۆ سەردانم، وا من کۆچ دەکەم و دەڕۆم.

هەر لە خەونەکەیدا ڕادەپەڕێت کە بچێت بۆ سەرلێدانی، بەڵام دەبینێت مامۆستای کوفرەوی باڵی گرتووە و ماڵەکەی خۆی بەجێ هێشت. ئیتر خەبەری دەبێتەوە و، یەکسەر سەیری کاتژمێرەکەی دەکات، دەبینێ سەعات حەوتە – بە کاتی خۆرئاوابوون – (کە دەکاتە نیوە شەو). پاشان نوستەوە و، بۆ سبەینێ گوێی لە دەنگی گریان بوو لە ماڵی مامۆستای ناوبراو دەهاتە گوێی. کە ڕۆشت بزانێت چی ڕووی داوە، پێیان وت:

مامۆستا سەعات حەوتی شەو کۆچی دوایی کردووە!

ئیتر بە دڵێکی خەمبار و، بە دەم وتنی: "إنا لله وإنا إليه راجعون"وە گەڕایەوە.

دەسا خوای گەورە لێی خۆش بێت. ئامین[٤].

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٢) ب١/١٠١؛ ش١/٧٠

(٣) ب/١٠١ ئەویش لە پاشکۆی بارلا، ل: ١٦٦، چاپی" دار الأنوار".

(٤) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

# ساڵی ١٨٩٧ز/١٣١٤ك

❐ هەوڵەکانی بۆ ئاشتەوایی لەناو هۆزەکاندا:

لەبەر ئەوەی شاری "وان" زانایەکی گەورە و بەناوبانگی تێدا نەبوو، "حەسەن پاشا"ی پارێزگاری شار ناردی بە شوێنیدا. ئەویش ڕۆشت بۆ ئەوێ و، ماوەی پازدە ساڵ لەوێ مایەوە. لەو ماوەیەدا بە گەڕان بەناو هۆزەکاندا و، ڕێنمایی کردنیان و، بە وانە وتنەوە بە قوتابییەکانی، کاتەکانی بەسەر دەبرد. جگە لە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ پارێزگار و کارمەندانی شاردا.

لەم ماوەیەدا بایەخی زۆری بە ئاشتەوایی نێوان هۆزەکان دەدا؛ هەر ئەوەندەی بەرگوێی بکەوتایە ناکۆکی لە نێوان هۆزەکاندا هەیە، خێرا دەڕۆشت بۆ ناویان و ڕێنمایی دەکردن. تەنانەت توانیی "شوکور ئاغا" و "مستەفا پاشای سەرۆك عەشیرەتی میران" پێك بهێنێت، لە کاتێکدا کە هەوڵی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ڕێکخستنیان شکستی هێنابوو.

لە کاتی ئەم سوڵحەدا بە مستەفا پاشای وت: ئایا تا ئێستا تۆبەت نەکردووە؟!

وتی: سەیدا! [١] من لە قسەی تۆ دەرناچم!

ئنجا "ئەسپ"ێك و هەندێ پارەی پێشکەش بە بەدیعوززەمان کرد. بەڵام وەری نەگرت و، پێی وت:

ئایا نەتبیستووە کە من هیچ پارە و پوولێکم لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە؟ ئێستا چۆن لە کەسانی ستەمکاری وەك تۆی وەردەگرم! دیارە ئێوە تۆبەکەتان شکاندووە! دە یاخوا بە سەلامەتی نەگەیتەوە جزیرە.

هەروەهاش بوو، چونکە پێش ئەوەی مستەفا پاشا بگاتەوە جزیرە، لە ڕێگادا مرد. وەك بڵێیت خوای گەورە دوعاکەی مامۆستای گیرا کردبێت[٢].

---

(١) وشەی ڕێزلێنانە، لە کرمانجیی ژووروودا بۆ برای گەورە و زانای پایەبەرز بەکار دەهێنرێت. (وەرگێڕ)
(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. چونکە ستەمی لە میللەت دەکرد. (وەرگێڕ)

☐ شارەزابوونی لە زانستە تازەكاندا لە شاری "وان"

لەو ماوەیەدا بە تەواوەتی دڵنیا بوو لەوەی كە زانستی "كەلام" لە شێوە دێرینەكەیدا بۆ بەرپەرچدانەوەی گومان و دوودڵییەكانی سەردەم، كە ڕوو دەكەنە ئایین، كەم و كورتە و، دادی گیروگرفتەكانی ڕۆژگار نادات. بۆیە بەدەستهێنانی زانستە تازەكانی بە كارێكی پێویست دەزانی.

ئەم جۆرە دەستنیشان كردنەی ئەوی بە تەمەن لاو بۆ گرفت و دەردەكانی سەردەم، ڕێگای بۆ خزمەتێكی قورئانی و كارێكی ئیسلامیی مەزن لە دواڕۆژدا خۆش كرد، چونكە دوای سی ساڵ لەم پەی بردن و دەستنیشان كردنە، خوای گەورە لە دانانی "پەیامەكانی نوور"دا پشتی گرت، كە لە ڕاستیدا نوێكردنەوەن لە زانستی "كەلام"دا.

ئیتر دەستی دایە خوێندنەوەی كتێبی زانستە تازەكان و، توانیی شارەزای بناغەكانیان بێت وەك: مێژوو، جوگرافیا، بیركاری، زەوی ناسی، فیزیك، كیمیا، گەردوونناسی، فەلسەفە و، زانستە تازەكانی تر. هەموو ئەمانەش لە ماوەیەكی زۆر كەمدا و، هەر بە تەقالای خۆی شارەزایان بوو، بێ ئەوەی كەسێك یارمەتیی بدات، یاخود پەنا بۆ مامۆستایەك ببات بۆ فێربوونیان!

بۆ نموونە: لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا كتێبێكی جوگرافیای لەبەر كرد، پێش ئەوەی بۆ ڕۆژی دوایی مونازەرە لەگەڵ وانەبێژێكی جوگرافیادا بكات لە ماڵی تاهیر پاشای والیدا و، بە سەریدا سەربكەوێت!

بە هەمان جۆر بەسەر وانەبێژێكی كیمیاشدا سەركەوت، دوای ئەوەی كتێبێكی لە كیمیای ئالۆزگانیدا لەبەر كرد.

"تاهیر پاشا"ی پارێزگار دەچوو چەندین پرسیاری زانستی و فەلسەفیی لەناو كتێبە ئەورووپییەكان دەردەهێنا و ئاراستەی "بەدیعوززەمان"ی دەكردن. ئەویش وەڵامی تەواوەتیی ئەو پرسیارانەی ئەوی دەدایەوە، بێ ئەوەی ئەو كتێبانەی بینیبێت و بە تەواویش فێری زمانی توركی بووبێت، چونكە تازەكی دەستی دابووە قسەكردن بە توركی. ئنجا كە دوای ماوەیەك ئەو كتێبانەی بینی، تێگەیشت كە تاهیر پاشا ئەو

پرسیارانەی لەو کتێبانە دەرهێناوە! بۆیە دەستی دایە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەیان و، توانیی لە ماوەیەکی کەمدا شارەزایی تەواویان تێدا پەیدا بکات.

لە ماوەی مانەوەیدا لە "وان" ڕێگایەکی تایبەتیی بۆ "وانە وتنەوە" دانا کە جیاواز بوو لە شێوەی وانە وتنەوەی ئەو دەمەی قوتابخانە ئایینییەکان. ئەمەشی لەو کتێبە تازانەی کە خوێندبوونیەوە و، لە ئەزموونی وانە وتنەوەی خۆی و، لە شێوازی وانە وتنەوەی ناوچەکەوە هەڵێنجابوو، کە خواستی پێداویستییەکانی سەردەمی تێدا ڕەچاو کردبوو.

بناغەی ئەم شێوازە لەسەر ئەوە دامەزرابوو کە ڕاستییەکانی ئایینی لەگەڵ زانستە تازەکاندا تێکەڵ دەکرد، بە شێوازێکی نزیك لە تێگەیشتنی خەڵکی سەردەم، هەروەها پێش‌چاو خستن و چەسپاندنی ئەو ڕاستییانە بۆ خەڵکی بە ڕوونترین شێوازی ئەوتۆ کە لەگەڵ تێگەشتنی ئەواندا بگونجێت.

ڕۆژێکیان لای تاهیر پاشا باسی ئەوەی کرد کە لە مانگی تەممووزیشدا بەفر و شەختە لەسەر لوتکەکانی چیای "باشید" دەمێنێت. کەچی تاهیر پاشا پێی وابوو نامێنێت و، وتی:

"هەرگیز بەفر لەوێ تا مانگی تەمموز بڕ ناکات و دەتوێتەوە".

لە کاتی بەسەربردنی هاوینی دوای ئەو ڕووداوە لە هاوینەهەوارەکانی "باشید" و "بەیتوششەباب"دا، ئەم گفتوگۆیەی نێوان خۆی و تاهیر پاشای بیرکەوتەوە، ئیتر ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ نووسی، کە یەکەم نامەیەتی بە زمانی تورکی:

"پاشا! بەفر لوتکەی باشیدی داپۆشیوە.. ئەوەی بە چاو نایبینیت ئینکاریی مەکە.. چونکە هەموو شتێك لە ناوەندی زانیارییەکانی تۆدا نییە.. والسلام"[1]!

جارێکیان لە کاتی موناقەشە زانستییەکانی لەگەڵ تاهیر پاشادا، پاشا ئەم پرسیارەی خوارەوەی ئاراستە کرد:

---

(١) ڕۆژی چوارشەمە، بەرواری ٢٠٠٧/٧/٢٥ز لە فرۆکەخانەی شاری "وان"ەوە بەرەو "ئەستەمبووڵ" کەوتمە ڕێ. فرۆکەکە لە دەمی بەرزبوونەوەیدا، بەسەر لوتکەکانی چیای "باشید"دا پێچی کردەوە و، بە چاوی خۆم پەڵە بەفرە زۆرەکانی سەر چیای باشیدم بینی لەو مانگی تەمموز و چلەی هاوینەدا! یەکسەر ئەم بەسەرهاتەی نێوان مامۆستا نوورسی و تاهیر پاشام بیرکەوتەوە کە سەدەیەکی بەسەردا تێپەڕیبوو! لەبەرخۆمەوە وتم: ڕاستت فەرموو مامۆستای بەڕێزم! (وەرگێڕ)

گریمان پازدە کەسی موسلمان و پازدەی تری ناموسلمان هەبێت کە هەموو ناموسلمانێك لە پشتی موسلمانێکەوە و لە یەك ڕیزدا ڕاوەستابن و هێڵێکی ڕاستیان پێکهێنابێت. ئنجا داوا بکرێت کە پازدە جار تیروپشکیان لەسەر ئەنجام بدرێت بە چەشنێك کە هەموو جارێ ئەنجامی تیروپشکەکە بەر ناموسلمانەکە بکەوێت.. ئایا چۆن ئەم کارە ڕایی دەکرێت؟

بەدیعوززەمان وتی:

– ئەمە سەد و بیست و چوار گریمانی تێدایە!

پاشان وتی:

– من مەسەلەیەکی لەمە ئاڵۆزتر دەهێنمە گۆڕێ، کە دوو هەزار و پێنج سەد گریمانی تێدا بێت!

ئەوەبوو مەسەلەیەکی هێنایە کایەوە کە دوو هەزار و پێنج سەد گریمانی تێدا بوو. بە چەشنێك کە ژمارەی موسلمانان پەنجا کەس و ناموسلمانانیش پەنجا بێت. ئنجا بە نامیلکەیەك کە لە "بیرکاری"دا دایناو ئەوەی ڕوون کردەوە و دای بە تاهیر پاشا. بەڵام نوسخەی ئەو نامیلکەیە لە ئاگرکەوتنەوەیەکی شاری "وان"دا تیاچوو.

ئیتر بەم جۆرە، گەلێ موناقەشەی بیرکاری و زانستیی وەکو ئەمە لە نێوانیاندا ڕووی دەدا، هەر هەمووشیان زیرەکیی نائاسایی "بەدیعوززەمان"ی دەردەخست. تەنانەت هەر پرسیارێکی بیرکارییان دەخستە بەردەستی، یەکسەر لە زەینی خۆیدا شیتەڵی دەکرد و پێش هەموو خەڵکی وەڵامەکەی دەدایەوە.

بەم جۆرە و، لەبەر بەهرە زۆرەکانی و زیرەکییە نائاساییەکەی و هێزی بیر و زەینی، زانایان نازناوی "بەدیعوززەمان"یان پێ بەخشی[1].

□ نازناوی بەدیعوززەمان

(ئەم نوورسییە هەژار و غەریبەی کە شایانی ئەوەیە ناوی "بیدعەتوززەمان"ی لێ بنرێت، کەچی – بە ناڕەزایی خۆی – ناوبانگی "بەدیعوززەمان"ی دەرکردووە، ئاگر لە

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

هەناوی بەربووە بۆ دواکەوتنی ئەم نەتەوەیە و، هاوار دەکات و دەڵێت: ئاخ.. بەداخەوە کە خەڵەتاین و، کاکڵە و گەوهەری ئیسلامیان پشتگوێ خست و، ڕوانینی خۆمان ترنجاندە ڕواڵەت و توێکڵەکەی)[1].

[ کاتێ پرسیاری لێ کرا ]:

(تۆ کۆتایی وتارەکانت بە ناوی "بەدیعوززەمان" واژوو دەکەیت، خۆ ئەمەش هێمایەکە بۆ مەدحی خۆ کردن!

وەڵام: نەخێر بۆ مەدح کردن نییە، بەڵکو دەمەوێ بەم واژووە قسوورەکانم و بەڵگەی کەموکورتیی خۆم دەربخەم.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش بریتییە لەوەی کە:

"بەدیع" واتە: نامۆ. چونکە ڕەوشتەکانم بە وێنەی ڕواڵەتم غەریب و نامۆن و، شێوازی نووسینەکانیشم وەکو بەرگ و پۆشاکەکانم پێچەوانەی خەڵکانی ترن.

جا من بە زمانحاڵی ئەم ناونیشانە تکای ئەوە دەکەم کە داوەرییە ژیرییەکان و شێوازە باوەکانی نووسین نەکرێت بە پێوەرێك بۆ داوەرییە ژیرییەکانم و سەنگی مەحەك بۆ شێوازەکانی نووسینم.

پاشان مەبەستم لە بەدیع "عەجیب"ە، چونکە واتای ئەو وتەیەم تێدا هاتووەتە دی کە وتراوە:

إِلَيَّ لَعَمْرِي قَصْدُ كُلِّ عَجِيبَةٍ    كَأَنِّي عَجِيبٌ فِي عيونِ الْعَجائِبِ[2] )[3].

(پاشان ئەو نازناوی "بەدیعوززەمان"ەی من شایانی نیم و پێم دراوە، لە ڕاستیدا هی من نییە، بەڵکو ناوێکی مەعنەوییە بۆ پەیامەکانی نوور، بە شێوەی ئەمانەت خوازراوە بۆ دانەرەکەیان. وا ئێستا من ئەو ناوە ئەمانەتە بە خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆی دەسپێرمەوە)[4].

---

(١) داوەرییەکان، موحاکەمات، ل: ٣٥.

(٢) ئەم بەیتە هی موتەنەبییە. بڕوانە: ديوان المتنبي ص ٢٧٨ چاپی دار النيل. دون تأريخ. واتە: بۆ هەموو شتێکی سەرسووڕهێنەر بێگومان ڕوو لە من دەکرێت، وەك بڵێی من شتێکی سەیرم لە پێش چاوی شتە سەیرەکاندا. (وەرگێڕ)

(٣) داوەرییەکان، پاشکۆی وتاری شام، ل: ٥٥٦-٥٥٧.

(٤) هێمای حەوتەمی تیشکی هەشتەم.

(بەڵێ، هەموو گرنگییەك هی پەیامەکانی نووره کە موعجیزەی قورئانن. تەنانەت ناوی "بەدیعوززەمان" کە جاران من هەڵم دەگرت، لە ڕاستیدا هی ئەو پەیامانەیە، هەر بۆیە درایەوە پێیان. خۆ گومانیش لەوەدا نییە کە پەیامەکانی نوور موڵك و تەفسیری قورئانی پیرۆزن)[١]..

(ئەوەبوو پەنجا و پێنج ساڵ پێش ئێستا لە "سیرت" مامۆستای خوا لێ خۆشبووم "مەلا فەتحوڵڵا"[٢] سەعیدی کۆنی چواند بە "بەدیعوززەمانی هەمەدانی"[٣] و ناوی "بەدیعوززەمان"ی بە سەردا بڕی)[٤].

## ساڵی ١٨٩٩ز/١٣١٦ك

□ ئاڵوگۆڕی فیکریی بەدیعوززەمان

(ئەوەی شایانی بایەخدان و تێڕامانە ئەوەیە کە دانەری پەیامەکانی نوور لە دەوروبەری ساڵی١٨٩٩ز (١٣١٦ك)دا ئاڵوگۆڕێکی فیکریی گرنگی بە سەردا هات، چونکە تا ئەم مێژووە بایەخی بە زانستە جۆراوجۆرەکان دەدا تاکو بیانقۆزێتەوە و بیری خۆی ڕووناك بکاتەوە پێیان..

بەڵام دوای ئەم بەروارە، لە ڕێی تاهیر پاشاوە بیستی کە ئەورووپا پیلانێکی چەپەڵ لە دژی قورئانی پیرۆز ساز دەکات، چونکە لە تاهیر پاشای بیست کە وەزیری موستەعمەراتی بەریتانی[٥] وتوویەتی:

---

(١) هێمای هەشتەمی تیشکی هەشتەم.

(٢) ساڵی ١٣١٧ك (١٩٠٠ز) کۆچی دوایی کردووە.

(٣) مەبەست "بەدیعوززەمانی هەمەدانی"یە کە ناوی "ئەحمەدی کوڕی حسەین"ە و لە نێوان ساڵەکانی (٣٥٨-٣٩٨ك)دا ژیاوە. لە زیرەکی و خێرا لەبەرکردن و زەین ڕوونی و بەهێزیی دەرووندا بێ وێنە و ناوازە بووە. گەر قەسیدەیەکی بۆ بخوێنرایەتەوە یەکسەری هەمووی لەبەر دەکرد و، گەر سەیری چوار پێنج پەڕەی لە هەر کتێبێك بکردایە تەنها بە یەك جار هەمووی لەبەر دەکردن. (معجم الأدباء ١/١٦١ - ٢٠٢ بە کورتی).

(٤) (ب: ١/ ٧٦) لە دەستنووسێکی (پاشبەندی ئەمیرداغ)ەوە.

(٥) ئەو وەزیری موستەعمەراتەی بەریتانیا ناوی: "ولیام گلادستۆن"ە. لە نێوان ساڵەکانی: (١٨٠٩ – ١٨٩٨ز)دا ژیاوە و، چەند جارێك پلەی وەزاریی گرتووەتە ئەستۆ و، چوار جاریش بە سەرۆکی وەزیران

"هەتا ئەم قورئانە لە بەردەستی موسڵماناندا بێت ناتوانین بە تەواوی حوکمیان بکەین. کەواتە با هەوڵ بدەین ئەو قورئانەیان لێ دابماڵین".

بیستنی ئەم هەواڵە ئەوی وروژاند و لە ڕادەبەدەر پێی تووڕە بوو، بە ڕادەیەکی وا کە لە ئەنجامی ئەم ئاڵوگۆڕە فیکرییەوە ڕووکاری بایەخدانی خۆی بە ئاراستەیەکی تردا گۆڕی و، سەرجەمی ئەو زانستە جۆراوجۆرانەی کە لە زەینیدا کۆی کردبوونەوە وەك پلیکانە بەکاری هێنان بۆ پەی بردن بە واتاکانی قورئان و چەسپاندنی ڕاستییەکانی. ئیتر دوای ئەو ڕووداوە جگە لە قورئان هیچ ئامانجێك لە زانست و ژیانی ئەودا نەما و، موعجیزەی مەعنەویی قورئانی پیرۆزی کرد بە مامۆستا و ڕابەری خۆی)[1].

تەنانەت بۆ هەموو کەسانی دەوروبەری خۆی ڕاگەیاند کە:

"دەبێ بە بەڵگە بۆ هەموو جیهانی بچەسپێنم و پێیان بسەلمێنم کە قورئانی پیرۆز خۆرێکی مەعنەوییە، تیشکی ئەو خۆرە هیچ کاتێ کز نابێت و ڕووناکییەکەشی بە هیچ کەسێك ناکوژێتەوە"[2].

## ساڵی ١٩٠٦ز/١٣٢٥ك

□ خزمەتگوزاری قورئان:

(لەم بەروارەوە دانەری پەیامەکانی نوور ڕۆشتە دۆخی "خزمەتگوزاری قورئان"ەوە، لەو ڕووەوە کە ڕاستەوخۆ ڕووی کردە حیکمەتی قورئان، دوای ئەوەی کە زانستە

---

هەڵبژێرراوە. لە تاوتوێ کردن و لێکۆڵینەوەی ئایندا هێندە قووڵ بووەتەوە تا پسپۆڕیی تێدا پەیدا کردووە. یەکەم دانراوی کتێبێکە بە ناوی: "دەوڵەت و پەیوەندیی بە کەنیسەوە". لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا کەنیسەی ئێرلەندیی هەڵوەشاندووەتەوە.

(١) تیشکی یەکەم. بەڕێز مستەفا صونگور (١٩٢٩-٢٠١٢ز) کە قوتابییەکی دێرینی مامۆستا نوورسییە، دەڵێت لە مامۆستا نوورسیم بیستووە وتوویەتی: "نزیکی نەوەد کتێب کە زووتر لەبەرم کردبوون بۆ من بوون بە پلیکانە تاکو بەهۆیانەوە بۆ ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز سەربکەوم. کاتێکیش گەیشتم بەو ڕاستییانە بینیم هەموو بەکێك لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان دەوراندەوری گەردوونیان داوە و گەردوونیان لە ئامێز گرتووە. بۆیە ئیتر قورئانی پیرۆز خۆی بوو بە سەرووزیادم و پێویستم بە هیچ شتێکی تر نەما بیکەم بە سەرچاوەم". مستەفا صونگور دەڵێت: چەندین جار ئەمەم لێ بیستووە. (ش ١/٨١)؛ (ب ١/١١٩).

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

ئامراز(ئالی)ەکانی تەواو کردبوو. ساڵێکیش دوای ئەم بەرواره ڕۆشت بۆ "ئەستەمبووڵ" و، لەوێ جیهادە مەعنەوی‌یەکەی دەستی پێ کرد)[١].

[ ئیتر هەتا لە ژیاندا ما هەر خزمەتگوزاری قورئان بوو. تەنانەت لە دواهەمین دادگاییدا وەڵامی دادوەری بەوە دایەوە کە ]:

من خۆم بە شایانی ئەو ڕێزلێنانە نازانم کە پارێزەرە بەڕێزەکانم لە وتەکانیاندا بەرامبەرم دەریان بڕی. من جگە لە خزمەتگوزارێکی دەستەوسانی قورئان و ئیمان شتێکی تر نیم. وتەیەکی تری جگە لەمە شك نابەم بیلێم[٢].

(١) تیشکی یەکەم. چونکە هەوڵەکانی خۆی خستەکار بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی "زەهراء" و، بڵاوکردنەوەی وتارەکانی لە ڕۆژنامەکاندا و، گەلێ خزمەتی تر.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

## بەندی دووهەم

## لە ئاسۆی ئەستەمبوولّدا

## سالّی ۱۹۰۷ز/۱۳۲۵ك[1]

□ لە ڕێی ئەستەمبوولّدا

(کاتێ – پێش سەردەمی سەربەستی – هاتم بۆ ئەستەمبوولّ، هەندێ کتێبی تایبەت بە "زانستی کەلام"م کڕی و بە وردی خوێندمنەوە. ئنجا کە هاتم بۆ ئەستەمبوولّ زانایان و مامۆستایانی قوتابخانە ئایینی‌یەکانم بۆ موناقەشە و وتوویژ بانگهێشت کرد و، ڕامگەیاند کە: "وەلاّمی هەموو پرسیارێکتان دەدرێتەوە"..

بەلاّم لەوەدا سەرسام بووم کە ئەو کەسانەی دەهاتن بۆ سەردانم پرسیاریان لە بارەی ئەو شتانەوە ئاراستە دەکردم کە لە ڕێی سەفەری هاتنمدا بۆ ئەستەمبوولّ وەلاّمەکانیانم خوێندبووەوە، یان ئەوانە بوون کە لە یادم مابوون! چونکە هەموو ئەو مەسەلانەی کە فەیلەسووفەکان بەرچاویان خستبوون لە زەینمدا مابوونەوە و، پرسیارەکانی ئەوانیش هەر لەو بابەتانەدا بوون!

وا ئێستا [واتە دوای نزیکی پەنجا سالّ] نهێنیی ئەمەم بۆ ڕوون بووەتەوە و، تێدەگەم کە ئەو سەرکەوتنە ئاشکرا و ڕاگەیاندنە سەیرەم و، دەربڕینی ڕێز و سەرسووڕمانی خەلّکیش، کە زۆر لە سەرووی سنووری خۆمەوە بوون، تەنها لەبەر ئەوە بوو کە ناوەندێکی گونجاو بۆ وەرگرتنی "پەیامەکانی نوور" لە ئەستەمبوولّ و لای زانایانی ئەوێ ساز و ئامادە بکرێت و، ڕادەی گرنگیی ئەو پەیامانە لەوێ بزانرێت)[2].

---

(۱) تێبینی: هەندێ ڕووداوی تری دوای ئەم سالّەش، کە پەیوەستن بەم بەروارەوە، تێهەلّکێشی ئەم بەندە بوون. (وەرگێڕ)

(۲) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ۱/۳٦۲.

(شەش مانگ پێش ڕاگەیاندنی "سەربەستی"، زانایان و ئەهلی قوتابخانە نوێیەکانی لە ئەستەمبوولٚ بۆ وتوویٚژ و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان – بێ ئەوەی خۆی هیچ پرسیارێك لەوان بکات – بانگ کرد و، لە ئەنجامیشدا وەڵامی ڕاست و دروست و بێ کەموکووڕیی سەرجەم پرسیارەکانی دانەوە)(١).

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و دووهەم، ل: ٣٤٥
بەڕێز (حەسەن فەهمی پاشا ئۆغلو) کە لە دواییدا بوو بە ئەندامی (دەستەی ڕاوێژکاریی کاروباری ئایینی لە تورکیا) دەگێڕێتەوە و دەڵێت:
کاتێ لە سەردەمی "مەشرووتیەت" لە قوتابخانەی "فاتیح"دا دەمخوێند، هەواڵی لاوێکمان بیست کە هاتووە بۆ ئەستەمبوولٚ و ناوی "بەدیعوززەمان"ە و، تابلۆیەکی بە دەرگای ژوورەکەی خۆی لە ئوتێلەکەدا هەڵواسیوە تیایدا نووسیویەتی: (لێرەدا وەڵامی هەموو پرسیارێك دەدرێتەوە، بێ ئەوەی پرسیار لە کەس بکرێت)! یەکەم جار وام بە بیردا هات کە خاوەنی ئەم چەشنە ئیدیعایە دەبێ کەسێکی شێت بێت! کەچی ئەو مەدح و ستایشە یەك لە دوای یەکەی کە دەمبیستەوە لەو قوتابی و زانایانەی سەردانیان کردبوو، ئارەزوویەکی زۆری لە دەروونمدا هەژاند کە منیش بڕۆم بۆ سەردانی. بۆیە بڕیارم دا قورسترین پرسیاری لە وردترین بابەتی زانستیدا بۆ هەڵبژێرم و ئاراستەی بکەم. من لەو کاتەدا بە یەکێك لە قوتابییە زیرەکەکانی قوتابخانە دادەنرام. ئێوارەی ڕۆژێك خۆم ئامادە کرد و لە زانستەکانی "عەقائید"دا قورسترینی ئەو بابەتانەم هەڵبژارد کە مەگەر بە چەند کتێبێك وەڵام بدرێنەوە. پاشان بۆ ڕۆژی دوای ئەوە ڕۆشتم بۆ لای و ئەو پرسیارانەم ئاراستە کرد. لە ڕاستیدا وەڵامەکانی نائاسایی و سەرسووڕهێن بوون و، دەتوت دوێنێ لە لای من بووە و ئەو کتێبانەی لەگەڵدا خوێندوومەتەوە، چونکە وەڵامەکانی هەموو ڕاست و دروست بوون! ئیتر من لە زانستی فراوانی ئەو دڵنیا بووم و بۆم دەرکەوت کە زانیارییەکانی ئەو وەکو هی ئێمە کەسبی نییە، بەڵکو زانستێکی "لَدُنّي"یە.
پاشان نەخشەیەکی پیشانداین کە لەسەر ئەو نەخشەیە ڕادەی گرنگی و پێویستیی کردنەوەی قوتابخانە زانستییەکانی پێ سەلماندین لە خۆرهەڵاتی وڵات(کوردستان)دا، کە ئەو دەمە لە لایەن "سوارەی حەمیدی"یەوە بەڕێوە دەبرا. هەروەك ڕوونی کردەوە کە ئەم چەشنە ئیدارەیە دادی ئەو ناوچەیە نادات و، بە شێوازێکی قەناعەت بەخش تێی گەیاندین کە پێویستە ئەو ناوچەیە لە ڕووی زانستییەوە بێدار بکرێتەوە و، تەنها بۆ ئەو ئامانج و مەبەستەش هاتووە بۆ ئەستەمبوولٚ. هەروەك دەیوت: "ئایین ڕووناکیی دڵانە و زانستە تازەکانیش نووری ژیرییەکانە".
هەروەها مێژوونووسی تورك: "ماهیر ئیز" دەڵێت:
کاتێ "بەدیعوززەمان" هات بۆ ئەستەمبوولٚ، لە هەرەتی لاویدا بوو، بە پۆشاکی ناوچەکەیانەوە دەگەڕا و، کەسێکی گەلێ ڕەوانبێژ و وتارخوێنێکی تەواو بەتوانا و خاوەنی زیرەکییەکی نائاسایی بوو لەناو هەموو خەڵکی خۆرهەڵاتدا. هەموو زانایانی بانگ کرد بۆ مونازەرە و تەحەددای هەموویانی کرد، چونکە باوەڕ و متمانەی بە خۆی هەبوو.
هەروەها بەڕێز "عەلی هیممەت بەرقی" کە یەکێکە لە سەرۆکە پێشینەکانی دادگای تەمییز، لە بیرەوەرییە تایبەتییەکانیدا سەبارەت بە هاتنی "بەدیعوززەمان" بۆ ئەستەمبوولٚ، دەڵێت: ئەو دەمە من لە قوتابخانەی قازییەکان (واتە کۆلیجی یاسا) دەمخوێند کاتێ هەواڵێك بڵاو بووەوە کە مرۆڤێك لە خۆرهەڵاتەوە هاتووە و،

□ **پرسیارەکانی سەرکردەی ژاپۆنی**

(چل ساڵ پێش ئێستا، واتە یەك ساڵ پێش ڕاگەیاندنی سەربەستی[١]، هاتم بۆ ئەستەمبووڵ، فەرماندەی گشتیی ئەو کاتەی سوپای ژاپۆن هەندێ پرسیاری ئایینیی ئاراستەی زانایانی ئیسلام کردبوو، ئەوانیش پرسیارەکانی ئەو کەسەیان ڕووبەڕووی من کردەوە، هەروەك بەو بۆنەیەوە هەندێ پرسیاری تریشیان لەگەڵدا ئاراستە کردم.

یەکێك لەو پرسیارانە لەسەر ئەو فەرموودە پیرۆزە بوو کە دەفەرموێ:

"لە ئاخرزەماندا کەسێکی سامناك بەیانی‌یەك کە ڕۆژی لێ دەبێتەوە لە ناوچاویدا نووسراوە: ئەمە کافرە".

منیش وتم:

کەسێکی سەیر و سەرسووڕهێن کاروباری ئەم نەتەوەیە دەگرێتە دەست و، ڕۆژێك دێت کە شەپقە لەسەر دەکات و خەڵکیش بە زۆرەملێ ناچار دەکات بیکەنە سەریان.

دوای ئەم وەڵامە، لێیان پرسیم:

ئایا ئەو کەسەی کە لەو ڕۆژگارەدا شەپقە لەسەر دەکات پێی کافر نابێت؟

وتم: کاتێ شەپقەکە لەسەری جێگیر دەبێت بەو مرۆڤە دەڵێت: سوژدە مەبە. بەڵام پشت بە خوا ئیمانی ناو سەری ئەو کەسە شەپقەکە ناچاری سوژدە بردن دەکات و موسڵمانی دەکات)[٢]!

---

بەرگ و پۆشاکێکی نامۆی لەبەردایە و، ناوی "بەدیعوززەمان"ە و، هەر پرسیارێکی لێ بکرێت وەڵامی دەداتەوە. حەزێکی زۆرمان تێدا ورووژا کە بزانین کێیە؟ بۆیە ڕۆشتین بۆ ئەوەی ببینین. سەیرمان کرد دانیشتووە بە بەڵگەی مەنتیقی و عەقلی، فەلسەفەی سۆفستائی هەڵدەوەشێنێتەوە. بە ڕاستی شایانی نازناوی: "بەدیعوززەمان" بوو! چونکە زانیاری‌یەکانی لە فەلسەفەی ئیسلامی (زانستی کەلام) و لە زانستەکانی زماندا سنووری نەبوو. (ش: ١/٨٣).

هەروەها زانای بەڕێز: (حەربی زادە حەسەن ئەفەندی) کە مامۆستای قوتابخانەی فاتیح و کەسایەتی‌یەکی زانستیی مەزن بووە و، هەتا تەمەنی نەوەد ساڵی وانەی وتووەتەوە و لێی دانەبڕاوە، تەنها یەك ڕۆژ نەبێت کە ئەو ڕۆژەیە سەردانی بەدیعوززەمانی کردووە. لەگەڕانەوەیدا بە سەرسووڕمانەوە ڕووی کردە قوتابی‌یەکانی خۆی و پێی وتن: تا ئێستا ڕۆژگار هاوشێوەی ئەوی بە خۆیەوە نەبینیوە و، هەڵکەوتەی سەرسووڕهێنەری سەردەمەکەیەتی، پێم وایە لەمەولاش هاوشێوەی ئەو هەڵناکەوێ! (ش: ١/٩٠١)

(١) مەبەست ڕاگەیاندنی دووهەم جاری دەستوورە لە دەوڵەتی‌عوسمانیدا، کە بە "مەشرووتیەتی دووهەم" ناسراوە و، لە ١٩٠٨/١/٢٣زدا لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمەوە ڕاگەیەنراوە. (وەرگێڕ)

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥١.

(پاشان هەندێ پرسیاری تریان لە بارەی بەربەستی "زولقەرنەین" و "یەئجووج و مەئجووج" و "دابة الأرض" و "دەجالْ" و "هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - " لێ کردم و، منیش وەڵامم دانەوە. تەنانەت هەندێ لەو وەڵامانە لە دانراوێکی کۆندا تۆمار کراون)[1].

## داواکارییەکانی لە سوڵتان عەبدولحەمید:

### داواکاریی یەکەم: ئەنجامدانی چاکسازی لە کۆشکدا

(لە رووی چەمکی پارێزگاری کردنی مەڵبەندی خەلافەتەوە، کە لە راستیدا مەڵبەند و چەقە خاڵی موسڵمانانە و شوێنی پەیوەندییانە و، بۆ ئەوەی رێ نەدرێ بەوەی گرفتاری تیاچوون ببێت..

هەروەها بەو بۆچوونەی کە وامدەزانی سوڵتانی پێشوو[2] ئامادەیە کارەکان روون بکاتەوە و لە هەڵە کۆمەڵایەتییەکانی رابوردووی پەشیمان ببێتەوە..

هەروەها بە پێی رەفتار کردن بە دەستووری: ﴿والصُّلْحُ خيرٌ﴾ تاکو رووداوەکانی ئێستا کە بە توندوتیژییەوە روویان دا و تۆوی ئاشووب و دووبەرەکییان چاند، سووك و تەنك بکرێنەوە..

لەبەر هەموو ئەمانە، بە زمانی رۆژنامەکان بە سوڵتانی پێشووم وت:

(کۆشکی یەڵدز کە ئەستێرەیەکی کزی تێن لێ براوە، بکە بە زانکۆی زانست، تاکو بە وێنەی ئەستێرەی "کۆ"(ثریا) بەرز ببێتەوە..

لە بریی گەشتیاران و دەرگاوانی دۆزەخ، راستیخوازان و فریشتەی میهرەبانیی تێدا نیشتەجێ بکە، تاکو بە وێنەی بەهەشت خۆش و دڵرفێن بێت..

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٢. مەبەستیشی لە دانراوە کۆنەکە پەیامی "موحاکەمات"ە کە لەو دەمەدا دایناوە. "وەڵامە ژاپۆنییەکان"یشی لە وتاری سێهەمی ئەو کتێبەدا داناوە. هەروەك "تیشکی پێنجەم"ی کۆمەڵە پەیامی "تیشکەکان"یش نیشانەکانی قیامەتی باس کردووە و، فەرموودە پیرۆزەکانی سەبارەت بەو نیشانانە و تەئویلەکانیشیانی لەوێ روون کردووەتەوە.

(٢) مەبەستی (سوڵتان عەبدولحەمید)ە. (وەرگێر)

ئەو سەروەت و سامانانەی ناو کۆشك کە نەتەوە پێشکەشی کردوویت، لە ڕێی دامەزراندنی زانکۆ ئاییینی‌یەکانەوە بیانگێڕەوە بۆیان، تاکو ئەو نەزانی‌یە لەناو ببەیت کە دەردێکی کوشندەیە و ئەم نەتەوەیە پێوەی گیرۆدەیە..

پڕ بە دڵ متمانەت بە خۆشەویستی و جوامێریی نەتەوەکەت ببێت، چونکە هەر ئەوە کە ویستی پادشایی ئێوە لە ئەستۆ دەگرێت..

پێش ئەوەی دنیا واز لە تۆ بهێنێت تۆ واز لەو بهێنە و.. زەکاتی تەمەنت لە پێناوی تەمەنی داهاتووتدا سەرف بکە. دەبێ لە دوای ئەم تەمەنەت تەنها بیر لە دوارۆژت بکەیتەوە)[1].

☐ ڕەخنەگرتنی لە حوکمی تاکڕەوی (إستبداد)

(ئیستیبداد خۆسەپاندنە.. واتە مامەڵەی ئارەزووکارانەیە.. واتە "زەبر"ی پشت بەستووە بە "هێز".. واتە ڕای تاکڕەوانەیە.. واتە ڕێخۆشکەرە بۆ خراپە ڕەفتار کردن.. واتە ئەوەیە کە دەرگاکانی لەسەر پشتن بۆ خۆتێهەڵکێشانی خراپکاری‌یەکان..

ئەوەش لە ڕاستیدا بناغەی ستەم و لەناوبەری مرۆڤێتی‌یە.. هەر ئەوە کە مرۆڤی ڕێزلێگیراوی بەرەو نزمترینی نزمی‌یەکان تلۆر کردەوە.. ئەوەیە کە جیهانی ئیسلامیی خستە ژیانی زەلیلی‌یەوە.. هەر ئەوە کە ئامانجە بەدە کەسی‌یەکان و ڕقەبەرایەتی‌یەکانی بێدار کردەوە.. هەر ئەوە کە ژیانی موسڵمانانی ژەهراوی کردووە و ژەهرەکەشی بەناو دەمارەکانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بووەتەوە.. هەر ئەویشە کە جیاوازی‌یە سەرسووڕهێنەرەکانی خستە ناوەندەکانەوە)[2].

(ئیستیبدادی خۆسەپێن هیچ پەیوەندی‌یەکی بە شەریعەتی خاوێنی ئیسلامەوە نی‌یە. شەریعەت بۆ ئەوە هاتووە کە سەرانسەری جیهان هیدایەت بدات، تاکو خۆسەپاندنی ستەمکاران و ئیستیبدادیان نەهێڵێت)[3].

---

(١) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٩-٤٣٠.

(٢) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٢٩٣.

(٣) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٤.

(سی ساڵی ڕابوردوو کە تیایدا ڕۆژوومان لە قسە گرتبوو و، ئارامی و خۆڕاگریمان کردبوو بە پیشە و، پشتمان بە خوای گەورە بەستبوو، بە کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشتی پێشکەوتن.. دەرگاکانی شارستانێتییەك کە ئازار و ئەشکەنجەی تێدا نییە، پاداشتی ئەو سی ساڵە دەدرێنەوە)[١].

□ ئیستیبدادێکی لاوازە لەچاو ئەوەی کە لەمەولا دێت

(کاتێ کە "سەربەستی" بوو بە هاوتای "شێتی"، ئیستیبدادی لاواز "خەستەخانەی شێتان"ی بۆ کردم بە قوتابخانە)[٢].

(وا دەردەکەوێ کە مەبەست لەو ڕووداوە[٣] سەندنەوەی "سەربەستی" نەبوو لە سوڵتان عەبدولحەمید، بەڵکو گۆڕینی ئیستیبدادێکی بچووك و لاواز بوو بە ئیستیبدادێکی گەورە و بەهێز)[٤]!

(کەسانێکی زۆرم بینی هێرشیان دەکردە سەر "سوڵتان عەبدولحەمید" زیاتر لەو هێرشەی کە دەیانکردە سەر "ئازادیخوازەکان"[٥] و، دەیان وت:

گەلێ هەڵە بووە کە سی ساڵ پێش ئێستا "سەربەستی" و "یاسای بنەڕەتی"ی[٦] پەسەند کرد.

ئایا ئێوە ڕا و بۆچوونتان بەرامبەر بەو کەسە چییە کە ئەو "ئیستیبداد"ەی سوڵتان عەبدولحەمید ناچار بوو بیکات بە "سەربەستی" دادەنێت و، لەتاو ئەو "یاسای بنەڕەتی"یەش لەرزی لێ دێت کە ناوێکی بێ ناوەڕۆکە؟ ئایا نرخی ئەو قسەیەی چەندەیە)[٧]؟

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٤.

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٠٩.

(٣) واتە ڕووداوی (٣١)ی مارت، کە لەمەولا باسی دێت.

(٤) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٤١.

(٥) (ئازادیخوازەکان) حیزبێکی ڕکەبەری دەستەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بوون لەو ماوەیەی پێش لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەتا ئیتتیحادییەکان بە تەواوی دەسەڵاتیان گرتەدەست.

(٦) مەبەست لە یاسای بنەڕەتی "دەستوور"ە.

(٧) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٢٤-٣٢٥.

(ئاخر چۆن ڕەخنە لە کەسێك ناگرم کە ئیستیبدادی پێشووی بە سەربەستی داناوە و هێرشی کردووەتە سەر "یاسای بنەڕەتی"؟

بەڵام ئەوانە هەرچەندە نەیاری حکوومەت بوون و ڕەخنەیان لێ دەگرت، کەچی ئیستیبدادێکی سەخت و دژوارتریان دەویست. لەبەر ئەوە، دەستم بە ڕوویانەوە دەنا و بەرپەرچم دەدانەوە)[1].

(سەعیدی کۆن، بە وێنەی چەند کەسێك لە سیاسەتمەدارانی بلیمەت و ئەدیبانی وریا و زیرەك، زووتر هەستی کردبوو کە "ئیستبداد"ێکی سامناك بۆ ئەم نەتەوەیە بەڕێوەیە، بۆیە هەموویان بەرەنگاری بوونەوە..

بەڵام ئەم هەستە پێش وەختە پێویستی بە لێکدانەوە بوو. چونکە ئەوان هێرشیان بۆ سەر سێبەرێکی لاوازی شتێك برد کە بینیبوویان و لە "ئیستبداد"دا هەر تەنها ناوەکەی پێ برا بوو، بەڵام هی چەندین ئیستبدادی تر بوو کە دوای ماوەیەکی درێژخایەن هاتە گۆڕێ و، هەر ئەو کاتە ترس و سامی هاویشتبووە دڵی ئەمانەوە.

کەواتە ئامانجەکەیان ڕاست بوو، بەڵام نیشانەکەیان نەپێکابوو)[2]!

□ داکۆکی‌یەك[3] لە سوڵتان عەبدولحەمید

("پادشایی" و "خەلافەت" یەکیان گرتووە و، هەرچەند ڕووکاری هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە، کەچی لە یەکتر جیا ناکرێنەوە.

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٧٩.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٦٩-١٧٠.

(٣) "مستەفا صونگور" (١٩٢٩-٢٠١٢ز) کە یەکێکە لە قوتابیانی نزیکی مامۆستا نوورسی، دەگێڕێتەوە کە: دوای ئەوەی مامۆستا نوورسی ئەو هەموو گیروگرفتەی لە سەردەمی حوکمی تاکە حیزبدا (واتە سەردەمی مستەفا کمال، عیسمەت ئینۆنۆ) هاتە ڕێ، لەگەڵ خۆی دەدوا و دەیوت: دەسا ئەی سەعید! لە تۆڵەی ئەو ڕەخنەیەدا کە لە سوڵتانێکی بەسۆز و میهرەبانت دەگرت و دەتوت پادشایەکی خۆسەپێنە، ئێستا ئازاری ئەم ئیستیبدادە سامناکە بچێژە"! (ب: ١/١٨٤) هەروەها مستەفا صونگور دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان مامۆستامان سەبارەت بە سوڵتان عەبدولحەمید وتی: سوڵتان عەبدولحەمید یەکێکە لە پیاوچاکان و لە ناوەندی دوعا تایبەتی‌یەکانمدا جێم بۆ کردووەتەوە و هەموو بەیانی‌یەك لە دوعاکانمدا دەڵێم: خوایە گیان! لە سوڵتان عەبدولحەمید خان و سوڵتان وەحیدەدین و بنەماڵەی حوکمڕانی عوسمانی خۆش بە". (ب: ١/١٨٤)

لەسەر ئەم بناغەیە.. پادشاکەمان هەروەك "پادشا"یە، لە هەمان کاتدا "خەلیفە"شە و، نوێنەری ڕەمزی جیهانی ئیسلامە.

لەو ڕوانگەیەوە کە پادشا و سوڵتانە سەرپەرشتیی "سێ ملیۆن" کەس دەکات. بەڵام لە ڕوانگەی ئەوەی کە خەلیفەیە، دەبێ پاڵپشتی "سێ سەد ملیۆن" موسڵمان بێت، کە بە پەیوەستێکی نوورانی پەیوەندییان پێیەوە هەیە. هەروەها دەبێ خەلیفە مایەی یارمەتیدانی سەرجەمی موسڵمانان بێت)[1].

[ئەو قسەیەش کە وتراوە]:

(بە ستەم و زۆرداری ناتوانیت "سەربەستی" بسڕیتەوە..

گەر دەتوانیت "هەست و پەی بردن" لە مرۆڤایەتی بسێنەرەوە[2]!

ئەم وتە بەهێز و توندوتۆڵە، بە هەڵە، لە ڕووی پیاوێکی خاوەن پایەدا وترا کە ئەم چەشنە زللەیە شایانی ئەو نەبوو..

بەڵکو ئەم وتەیە شایستەی ئەوەیە کە بە وێنەی زللەیەك لە سەروگوێلاکی ڕووی غەدداری ئەم چەرخە بدرێت کە لە ژێر پەردەی "سەربەستی"دا ستەمێکی سامناکی لە خۆیدا هەڵگرتووە)[3]!

☐ خەونێك بە سوڵتان عەبدولحەمیدەوە

(لە جیهانی مەعنادا پادشام بینی. وتم:

تۆ زەکاتی تەمەنی خۆت لە ڕێبازەکەی عومەری دووهەمدا [واتە کوڕی عەبدولعەزیز] بەسەر ببە، تاکو گشتینەی خەڵکی ڕووی خۆیانت ئاراستە بکەن، کە هەر ئەوەش واتا و ناوەڕۆکی بەیعەتە و لە پێداویستیی سەرۆکایەتیی مەشرووتیەتە.

پادشا وتی:

باشە ئەگەر من بە ڕێی ئەودا ڕۆشتم، ئایا ئێوەش دەتوانن بە وێنەی خەڵکانی ئەو کاتە بن؟ پاشان ئەی ئەو هێزە ئیسلامی و، پاکی و، ڕەوشت جوانییەی ئەوان؟..

---

(١) داوەرییەکان، سنووحات، ل: ٧٣٧.

(٢) تەرجەمەی دێڕە شیعرێکی "نامیق کەمال"ە.

(٣) بریسکەکان، بریسکەی بیست و دووهەم، ل: ٣٤٠.

من وتم: ئـەم بێداربوونەوەیـە لـە هـزر و بـیری گشـتیدا و، کـامڵ بوونـی بنـەما و هۆکارەکان و، گشتگیریی شارستانێتی لە لای ئێمە، جێی ئەو خاڵانە دەگرێتەوە. ئنجا نەك تەنـها ئـەو خاڵانـە بـە دەسـت دەهێنێـت، بەڵکو پێشکەوتنیش بەرهـەم دەهێنێـت کـە دەرەنجامە خوازراوەکەیە. دادگەریی دەوڵەتانی بیانی ئەمە دەسەلمێنێت.

ئەو وتی: من چۆن بکەم؟

وتم: لەبەر ئەوەی ئیستیبداد خوێنی لەو ئەستەمبوولەدا نەهێشتووە کە دڵـی وڵاتـە، تۆ نیازخاوێنی بنوێنە..

هەروەك بە بێ ڕشتنی خوێن "مەشرووتیەت"ت قبووڵ کرد و شەفەقەتت پیشان دا، بە هـەمان شـێوە یـەڵدزی نـەفرەت لێکراویـش بکـە بـە خۆشەویسـتی دڵان و، لـە بریـی زەبانیەکانی پێشوو پڕی بکە لە زانایانی لێکۆڵەر کە مەلائیکەتی میهرەبانین، با یەڵدزیش وەکو زانکۆی لـێ بێت..

زانستە ئیسلامی‌یەکان ببووژێنەرەوە و، "خەلافەت" و "مەشیخەتی ئیسـلامی"یـش بـۆ پێگەی بڵندی خۆیان بەرز بکەرەوە..

نەخۆشیی دڵی میللـەت کـە لاوازیی ئایینـە و نەخۆشیی سەریشـی کـە نەزانی‌یـە، بـە سەروەت و سامانەکەت چارەسەر بکە، تاکو یـەڵدز هێنـدەی هێشـووە ئەسـتێرەی "کـۆ" بـەرز ببێتـەوە و، خانـەدانی عوسمـانیش لــە بورجـی خەلافـەتدا ببێتـە ڕوونـاکی پرژێنـی دادپەروەری..

لە پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکاندا دەست پێـوە بگـرە، تـاکو ئـەو میللـەتـە دامـاوەی کـە لەسەر هەڵەخەرجی ڕاهێنراوە و هیچ دەسەڵاتێکیشی بەسەردا نی‌یە، چاوت لـێ بکـات، مادەم ئیمامیانیت.

لەناکاو بە ئاگا هاتم. بینیم:

ئەم جیهانی بێداری‌یە خەونە و، حەقیقەت و بێداربوونەوەی ڕاستەقینەش ئـەو خەونـە بوو کە بینیم)[1].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٧٥-٦٧٦.

□ نامەیەکی تایبەت[1] بۆ گومان لابردن لەسەر سولتان عەبدولحەمید:

[قوتابیانی لەو بارەیەوە دەڵێن]:

(یەکێ لەو برایانەمان کە ئەرکی مامۆستایی جێبەجێ دەکات، گومانی بۆ پەیدا بووە لەوەی کە مامۆستامان ڕێزی شایانی سولتان عەبدولحەمیدی نەزانیوە و، وەك لە وتارەکانیەوە کە لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا ئاراستەی کردوون، وا دەردەکەوێت کە هێرشی کردووەتە سەر ئەو پادشا مەزنە.

وەڵام:

وا ئێمە لە ڕاستیی ئەو حاڵەی کە لە مامۆستامانەوە وەرمان گرتووە، وەڵام دەدەینەوە و، دەڵێین:

یەکەم: مامۆستامان بە درێژایی ژیانی لەسەر ئەم دەستووره قورئانی و قاعیدە مەزنە ڕەفتاری نواندووە کە ئەم ئایەتە دەری دەخات:

﴿ولا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخرى﴾ (فاطر: ١٨)..

بەو واتایەی کە هەڵە و کەموکووڕییەکانی حکوومەتی ئەو سەردەمە ناخرێنە ئەستۆی سولتانەوە..

بۆیە دڵی پاك بووە بەرامبەری و گومانی باشی پێی بووە. تەنانەت هەوڵی داوە - لە بەرامبەر نەیارەکانی سولتانەوە - ئەو هەڵە و کەموکووڕییانەی کە سولتان ناچار کراوە ئەنجامیان بدات، بە باشی لێکیان بداتەوە.

دووهەم: لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا مامۆستامان گەلێ ستایشی سەربەستیی شەرعی کردووە و لە وتارەکانیدا خەڵکی بۆ بانگ کردووە و، بە نەیارانیشی وتووە:

گەر "سەربەستی" بە "شەریعەت" سنووردار نەکرێت و یاسای بۆ دانەنرێت ئەوا ئەو شتە لاواز و جوزئییەی کە ناوی تاکڕەوی(ئیستیبداد)تان لێ ناوە و تەنها یەك کەس

---

(١) بەڕێز "موحسین ئالوو" یەکێکە لەو قوتابیانەی نوور کە لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا ژیاوە، دەڵێت: کاتێ مامۆستا نوورسی بیستی کەسێك لە ئەستەمبوول کتێبێکی بڵاو کردووەتەوە و هێرشی تێدا کردووەتە سەر سولتان عەبدولحەمید، وتی: سولتان عەبدولحەمید خەلیفەی شەست ملیۆن موسڵمان بوو، من بە وێنەی یەکێك لە ئەولیاکان بۆی دەڕوانم و حسابی بۆ دەکەم. پاشان نامەیەکی تایبەتیی لەم بارەیەوە بڵاو کردەوە. (ش: ٤/٣١٢).

ناچار کراوە بیکات، دەبێت بە "ئیستیبداد"ێکی هێندە گەورە کە بەسەر هەموو خەڵکیدا دابەش دەبێت و، هەموو کەسێك لە شوێنی خۆیدا دەبێت بە خۆسەپێنێك. ئنجا لەوەشەوە تاکڕەوی‌یەکی ڕەها پەیدا دەبێت و، ئەو یەك دانە ئیستیبدادەش دەبێت بە هەزاران..

بەو واتایەی کە "سەربەستی" دەمرێت و، ئیستیبدادێکی ڕەها لەدایك دەبێت.

تەنانەت مامۆستامان ئەم گوفتارەی خوارەوەی ئاراستەی ئەو دادگایە کرد کە بۆ لە سێدارەدانی خەڵك ئامادە کرابوو..

پێی وتن:

"گەر مەبەست لە "مەشرووتیەت" ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەت و خۆسەپاندنی کۆمەڵێکی دیاری کراو - واتە ئیتتیحادی‌یەکان - بێت، ئەوا با هەموو گرۆی جیننی و ئادەمیزاد شایەت بن کە من کۆنەپەرستم"!

سێ‌هەم: مامۆستامان لە ڕێی هەستی پێش وەختەوە، هەستی بە ڕزگاربوونی جیهانی ئێستای ئیسلامی کردبوو لە زاڵبوونی بیانی‌یەکان و، بەرەو ڕێکەوتن چوونی ئەوان لە شێوەی چەند جەماوەرێکی ئیسلامیی یەکگرتوودا. بۆیە هەمیشە ئەمە ئاواتی بووە کە بێتەدی، تەنانەت بە هەموو هێزێکیەوە خەڵکی بۆ ئەم ئامانجە بانگهێشت کردووە..

لەبەر ئەوەیە کە ڕێزی شایانی لە سەربەستیی شەرعی ناوە و، لە وتارەکانی ئەو کاتەیدا وتوویەتی:

ئەگەر "سەربەستی" بە پەروەردەی ئیسلامی گۆش نەکرێت، ئەوا دەمرێت و ئیستیبدادێکی ڕەها لە جێیدا لەدایك دەبێت.

چوارەم: لە مامۆستامان بیستووە و لە نزیکیشەوە ئاگادارین کە لە نێوان سوڵتانە عوسمانی‌یەکاندا، سوڵتان عەبدولحەمید بە لایەوە وەك وەلی‌یەکی پیاوچاك وایە، چونکە:

بەوپەڕی چاوقایمی و خۆڕاگری‌یەوە لە بەردەم فڕوفێڵ و هێزی دوژمناندا ڕاوەستاوە و..

خەلیفەی زۆربەی جیهانی ئیسلامی بووە و..

عەشیرەتە ڕەوەندەکانی پارێزگاکانی خۆرهەڵات(کوردستان)ی لە ڕێی "سوارەی حەمیدییە"وە بەرەو پێشکەوتنی شارستانی و سەربازی بردووە و..

هەتا لە توانایدا بووە چاودێریی دروشمەکانی ئیسلامی کردووە و..

نوێژی هەینیی لە مزگەوتدا خوێندووە و..

لە کۆشکەکەیدا مامۆستایەکی بەڕێز و ڕابەرێکی مەعنەویی دەستگیری بۆ خۆی دانا بوو..

جگە لە کردەوە چاکەکانی تری).

ئەو قوتابیانەی نوور

کە لەگەڵ "مامۆستا نوورسی"دان

١٩٥٣ز ئەستەمبووڵ[1]

## داواکاریی دووهەم: دامەزراندنی (قوتابخانەی زەهراء)

[ لە ئەستەمبووڵ داواکارییەکی پێشکەشی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم کرد سەبارەت بە پێویستیی کردنەوەی چەندین قوتابخانە بە زمانی کوردی لە ناوچەکانی کوردستاندا، لەوانەش دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء. کە لە ڕۆژنامەی (شەرق و کوردستان)دا بڵاو کرایەوە. ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی ]:

(خەڵکی کوردستان کە توخمێکی گرنگی قەوارەی کۆمەڵگای عوسمانی پێکدەهێنن، هەر چەندە بارودۆخیان لە لای حکوومەت ئاشکرایە، بەڵام داواکارم دەرفەتم بدەن هەندێ داواکارییان بخەمە ڕوو کە تایبەتە بە خزمەتی پیرۆزی "زانست"ەوە:

لەم دنیای شارستانێتییەمان و لەم چەرخی پێشکەوتن و پێشبڕکێیەدا و بۆ مەبەستی بەرزبوونەوەی پلەی زانیاری، کوردەکان - وەك برایانی تر - پێویستیان بە کردنەوەی قوتابخانە هەیە لە ناوچەکانیاندا.

هەرچەندە کۆششی حکوومەت جێی سوپاسە لە ڕووی کردنەوەی چەند قوتابخانەیەك لە مەڵبەندی قەزا و گوندەکاندا، بەڵام جگە لە منداڵە تورك زمانەکان

---

(١) (ب: ١/١٨٣).

کەسی تر سوودیان لێ وەرناگرێت، ئەو قوتابیانەش کە کورد زمانن هەر ئەوەندە لە قوتابخانە تێدەگەن کە سەرچاوەی زانستە، یان دەزگایەکی زانستییە و، هیچی تر سوودی لێ وەرناگرن.

خۆ نەشارەزایی مامۆستایانی ئەو قوتابخانانە لە زمانی خەڵکی ناوچەکە، کۆڵێکی تری قورسی خستووەتە سەر ئەستۆی قوتابیان و، بووەتە هۆی بێ بەش بوونیان لە زانست لە ئەنجامدا.

ئەم بارە نامۆیە کارێکی وای کردووە کە خۆرئاواییەکان بەو دواکەوتنەی کوردان خەنی و شاد ببن، لە لایەکی تریشەوە گەر خەڵکی ئەو ناوچانە هەر بەو جۆرە لە کەنارگیری و ژیانی دەشتەکێتی و سەرەتاییدا بمێننەوە، ئەوا چەندین دوودڵی و گومانیان لە بارەوە دروست دەبێت.

ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو نەتەوانەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە پلەیان لە خوار پلەی کوردەوە بووە، وا ئێستا سوود لە باری دواکەوتووی کورد وەردەگرن و پێشیان دەکەون، ئەم دۆخەیش کارێکی کردووە کە غیرەتمەندانی کورد بکەونە بیرکردنەوە.

ئەم سێ خاڵەی باس کران وەك مستەکۆڵێکی جەرگبڕ وان ئاراستەی کورد کراون و، دڵی کەسانی خاوەن بەسیرەتیان ئاگر تێ بەرداوە..

چارەسەرکردنیشیان بە کردنەوەی چەندین قوتابخانەی نموونەیی دەبێت لە هەموو ناوچەیەکی تیرە و هۆزەکاندا، تاکو ببێت بە هۆیەك بۆ خوێندن و هانیان بدات بۆ بەدەستهێنانی زانست. هەروەها لە شوێنە جیاجیاکانی ناو کورددا وەك عەشیرەتەکانی "ئارتووش"و مەڵبەندەکەیان کە"بیت الشباب"ە. یەکێکی تریش لە مەڵبەندی "مۆتکان، بەڵکان، ساسۆن"دا. یەکێکی تر لە ناوەندی "سیپکان، حەیدەران" وەك ئەوەی کە لە "وان"دا هەیە و، هەر بە ناوی "مەدرەسە"وە زانستە ئایینی و سروشتییەکانی پێکەوە تێدا بخوێنرێت و، بەلای کەمەوە پەنجا قوتابیی تێدا بێت و گوزەرانیشیان لە لایەن حکوومەتەوە مسۆگەر بکرێت..

بەم پێیە سێ مەڵبەندی زانستی پێویستە دابمەزرێن.

زیندوو کردنەوەی هەندێ لەم قوتابخانانە دەبێتە هۆی زیندوو کردنەوەی ژیانی ماددی و مەعنەوی لە کوردستاندا و، ژیانی ئایینەشی دەستەبەر دەکات و، دەبێ بە بەردی بناغەی بینای زانستی. هەر لەم سەرەتای دامەزراندنەشەوە یەکێتی دروست دەبێت.

ئیتر ئەو هێزە مەزنەی ئەوان کە لە ناکۆکیی ناوخۆدا تیادەچێت، ئەو کاتە دەدرێتە دەست حکوومەت، تاکو لە بەرامبەر دەرەوە بەکاربهێنرێت.

ئەمە هەروەك مافی ڕەوا و دادگەرانەی خۆیانە، بە هەمان جۆر گەوهەری ناو سروشتی ئەوانیش دەردەخات لەوەدا کە شایانی پێشکەوتن و شارستانێتین)[1].

❐ هۆکارەکانی دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء (زانکۆی زەهراء)

[ پێویستیی دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء لەبەر چەند هۆکارێکە، لەوانە ]:

◆ هۆکاری یەکەم: دابەزینی ئاستی زانست لە قوتابخانە ئایینیەکاندا

(دەست هەڵگرتنی کەسی لێهاتوو لەو شتانەی کە شایانیەتی ئەنجامیان بدات و، دەستگرتنی بە داوێنی ئەو شتەی شایانی نییە، لە ڕاستیدا سەرپێچییەکی گەورە و پشتگوێ خستنێکی ئابڕووبەرە سەبارەت بە گوێڕایەڵیی شەریعەتی گەردوون..

چونکە یەکێ لە خواستەکانی ئەم شەریعەتە: بڵاوبوونەوەی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ و چوونە ناوەوەی بەهرەکانیەتی بۆ ناو سنعەتەکە و، ڕێز گرتن و خۆشەویستیی سنعەتەکەیە و، لەخۆدا پیادەکردن و بەرجەستە کردنی یاساکانیەتی.

بە پوختی: ئەم شەریعەتە داخوازی توانەوەیە لە سنعەتدا.

مادەم ئەرکی سەرشانی "بەدیهاتن" ئەمەیە.. ئەوا ڕەفتارکردنی مرۆڤ بە پێچەوانەی ئەم شەریعەتە، لە ڕاستیدا شێوەی شیاوی سنعەتەکە دەگۆڕێت و، یاساکانی تێکدەدات. هەروەك شێوەی سنعەتە ناسروشتییەکەش کە دەستی لە داوێنی گیر کردووە دەشێوێنێت بەوەی کە مەیلی ناخی خۆی بەلای سنعەتەکەی تردایە، هۆکەشی ئەوەیە کە مەیل و سنعەتەکە ئاوێتەی یەکتر نابن و، لە ئەنجامدا شیرازەیان تێکدەچێت.

---

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٠-٦٤١.

لەسەر بناغەی ئەمە: کەسانێکی یەکجار زۆر بە مەیلی سەرکردایەتی و، فەرماندەیی و، خۆگەورە دانان بەسەر خەڵکانی تردا ڕەفتار دەکەن. دەبینی "زانست" کە شتێکی شەوق بەخش و ڕابەر و ئامۆژگار و نەرم و نیانە، بە وێنەی هۆکارێکی زەبر و زۆرەملێی "خۆسەپاندنی کەسی" بەسەر خەڵکانی تردا بەکار دەهێنێت، واتە لە بریی ئەوەی خزمەت بە زانست بکات دەچێ لە خزمەتی خۆیدا دەیخاتەکار! بەم پێیە کارمەندییەکان – نەخوازەڵا هی قوتابخانە ئایینییەکان – کەوتە دەست کەسانێکی نەشیاو. لە ئەنجامی ئەمەشدا قوتابخانەکان بەرەو پووکانەوە و نەمان ڕۆشتن.

تەنها چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێ: وانەبێژەکان، کە وەکو کارگوزارانی یەك فەرمانگە وان، لە چەند بازنەیەکی زۆردا بە وێنەی زانکۆ و، هەریەکەیان لە بواری پسپۆڕیی خۆیدا ڕێکبخرێن، تاکو هەرکەس بازاڕی مرۆڤایەتیی خۆی بەڕێوە ببات و، ڕووی لە مافی خۆی بێت و، بە مەیلی سروشتی و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی مەعنەویی دانستی ئەزەلییش دەستووری "کار دابەشکردن" جێبەجێ بکات.

ئەو هۆکارە گرنگەی کە زانستی ناو قوتابخانە ئایینییەکانی لە ئاستی خۆی دابەزاند و، لە ڕێڕەوی سروشتیی خۆی ترازاند ئەوەیە:

کاتێ کە "زانستە ئامراز"ەکان[1] خرانە ناوەندی زانستە مەبەستەکانەوە، زانستە باشەکان پشتگوێ خران. چونکە شیکردنەوەی دەستەواژەی عەرەبی، کە پۆشاکەکەی (وشەکەی) لە حوکمی واتاکەیدایە، بەسەر زەینەکاندا زاڵ بوو. ئنجا ئەو زانستەش کە مەبەستی سەرەکییە لە خوێندندا بوو بە پاشکۆی ئەو! جگە لەوەش، ئەو کتێبانەی کە لە زنجیرەی خوێندنی زانستدا بوون بە کتێبی ڕەسمی و دەستەواژەکانیان تا ڕادەیەك دەماودەمیان پێ دەکرا، هەموو کات و بیر و هزرەکانیان لە خۆیاندا بەند کرد و بواریان نەدا بە دەرچوون لێیان[2].

---

(١) زانستە ئامرازەکان (العلوم الآلية) وەکو: نەحوو، صەرف، مەنتیق و زانستەکانی تری هاوشێوەیان کە دەبنە ئامراز و هۆکار بۆ تێگەیشتن لە زانستە باڵاکان (العلوم العالية) وەکو: تەفسیر و، حەدیس و، فیقهـ و زانستەکانی تری هاوشێوەیان. (وەرگێڕ)

(٢) داوەرییەکان، موحاکەمات، ل: ١٠٣-١٠٤.

◆ هۆکاری دووهەم: چاکسازی لە ویلایەتەکانی کوردستاندا

(من بارودۆخی پەرێشانی کوردەکانی دانیشتووی کوردستانم بینی و، تێگەیشتم کە روویەکی بەختەوەریی دنیامان بە زانستە نوێیەکانی ئێستا دێتە دی..

زانایانیش یەکێك لە رووبارە سازگارەکانی ئەو زانستانە دەبن و، سەرچاوەکەی تریشی بە بێ گومانی، قوتابخانە ئایینییەکان دەبێت، تاکو زانایانی ئایین لەگەڵ زانستە نوێیەکاندا رابێن.

جا لەبەر ئەوەی جڵەوی ئیختیاری کوردەکان بە دەست زانایانەوەیە، ئەوا ئەم هەستەم هانی دام بێم بۆ ئەستەمبووڵ، چونکە ئەو کاتە پێم وابوو کە بەختەوەری (السعادة) لە "دار السعادة"[1]دا بەدەست دەهێنین)[2]!

◆ هۆکاری سێهەم: بەرپەرچدانەوەی پلانێکی چەپەڵ لە دژی قورئان

(شەست و پێنج ساڵ لەمەوپێش[3] یەکێك لە والییەکان هەواڵی دامێ کە:

لە رۆژنامەیەکدا وتارێکی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیای خوێندووەتەوە کە لەو وتارەیدا نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی بە دەستەوە گرتووە و وتوویەتی:

"تا ئەم کتێبە لەناو دەستی موسڵماناندا بمێنێت، ناتوانین جڵەوی حوکمڕانییان بگرینە دەست، کەواتە چار تەنها ئەوەیە کە ئەم قورئانە لەسەر رووی زەویدا نەهێڵین، یان پەیوەندیی موسڵمانانی پێوە بپچڕین".

بەم جۆرە، رێکخراوە خراپکارە ترسناکەکان بە گەرموگوڕییەوە هەوڵیان دا ئەم دوو پلانە لە زەمینەی واقیعدا بهێننە دی: شکاندنی شان و شکۆی قورئانی پیرۆز لە بەرچاوی خەڵکیدا و، دوورخستنەوەیان لێی. ئەوەبوو زۆر بە چوست و چالاکی لەم بوارەدا هەوڵەکانیان خستەکار، تاکو زیان بەم نەتەوە خۆبەختکارە بەری و کڵۆڵە بگەیەنن.

---

(١) "دار السعادة: یەکێکە لە ناوەکانی "ئەستەمبووڵ" لەو کاتەدا. (وەرگێڕ)

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٨.

(٣) ئەمە دەقی نامەیەکە دانەر لە دوای ساڵی ١٩٥٠ز لە سەردەمی عەدنان مەندەرس و جەلال بایاردا ئاراستەی سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆماری کردووە.

منیش هەر ئەو کاتە و شەست و پێنج ساڵ پێش ئێستا، بڕیارم دا ڕووبەڕووی ئەم پلانە ترسناکانە ببمەوە، بۆ ئەمەش پشت بە قورئانی پیرۆز ببەستم و، هێز و پێز و پشت و پەنا هەر لە خۆی وەرگرم.

ئەوەبوو دڵم ئیلهام و ڕێنمایی ڕێگایەکی کورتی کردم بەرەو حەقیقەت و، بیرم لە دامەزراندنی زانکۆیەکی مەزن کردەوە.

ئیتر لەو کاتەوە ئێمە بۆ ڕزگار کردنی دواڕۆژمان تێدەکۆشین. یەکێ لە بەروبوومەکانی ئەم کارەش لە دنیادا بریتییە لە ڕزگاربوونی خەڵکی لە "ئیستیبدادی ڕەها" و، قوتار بوونیان لە دەردە کوشندەکانی "گومڕایی"، هەروەها پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی "برایەتی" لە نێوان نەتەوە موسڵمانەکاندا.

بۆ ئەم مەبەستەش و لەم ڕێیەدا دوو هۆکارمان گرتە بەرچاو:

*هۆکاری یەکەم:*

"پەیامەکانی نوور"ە کە لە ڕێی بەهێز کردنی ئیمانەوە پەیوەندییەکانی برایەتیی ئیمانیی نێوان ئیمانداران توندوتۆڵ دەکەن.

بەڵگەش لەسەر ئەمە: دانان و نووسینی ئەو پەیامانەیە لە دەمی ستەم و تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفتی سەختدا و، کاریگەریی لەڕادەبەدەریانە لە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامی و ئەوروپا و ئەمریکا - لەم کاتەدا - و، زاڵبوونیانە بەسەر تێکدەرانی ڕێسا و فەلسەفەی مولحید و ئەو چەمکە ئیلحادییانەشدا کە لە بڵاوبوونەوە و پەرەسەندندان، وەك: فەلسەفەی سروشتی و ماددی، بێ ئەوەی لە هیچ دادگایەك یان لیژنەیەکی خەبیرەکاندا زامدار بکرێن.

پشت بە خوا کەسانی وەك ئێوە لەوانەی کە کلیلی "برایەتیی ئیسلامی"یان دۆزیوەتەوە، ئەم پەیامانە دەگرنە خۆیان کە نوورێکی نێوان ڕووناکییەکانی قورئانی پیرۆز دەنوێنن و، لە سەرجەمی جیهانی ئیسلامیدا بڵاویان دەکەنەوە.

*هۆکاری دووهەم:*

شەست و پێنج ساڵ لەمەوپێش ویستم بڕۆم بۆ "مزگەوتی ئەزهەر" تاکو زانستەکانی تێدا هەڵبگۆزم، لەو ڕووەوە کە ئەزهەر قوتابخانەی جیهانی ئیسلامە..

بەڵام دەرفەتی ئەم کارەم بۆ نەڕەخسا و، لە بریی ئەوە خوای گەورە بۆ هێنانەدیی بیرێك ڕێنمایی کردم کە بریتی‌یە لەوەی:

مزگەوتی "ئەزهەر" قوتابخانەیەکی گشتی‌یە لە کیشوەری ئەفریقیادا. کەواتە کارێکی گەلێ پێویستە کە لە کیشوەری ئاسیاشدا قوتابخانەیەکی وەك ئەو بنیات بنرێت، تەنانەت بە ڕێژەی فراوانیی ئاسیا لەچاو ئەفریقیادا ئەم قوتابخانەیەش لەچاو ئەزهەردا فراوان بێت. تاکو بیری "دەمارپەرستی"، برایەتیی نێوان نەتەوەکانی وڵاتە عەرەبی‌یەکان و هیندستان و ئێران و قەفقاس و تورکستان و کوردستان تێك نەدات و، "گیانی ئیسلامەتی"ش - کە نەتەوایەتیی ڕاستەقینە و ڕاست و دروست و بەرز و هەمەلایەنەیە - لە نێوانیاندا ببووژێنرێتەوە و، شەرەفمەندی ئەم دەستوورە قورئانی‌یە بن کە دەفەرموێت: ﴿إنَّما المؤمنون إخوة﴾ (الحجرات: ١٠)..

هەروەها بۆ ئەوەش کە ئەو زانستانەی لە فەلسەفەوە سەریان هەڵداوە لەگەڵ ئاییندا دەست لە ملی یەکتری بکەن و، شارستانێتیی ئەورووپاش بە تەواوەتی لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا بسازێن و، قوتابخانە تازەکانیش لەگەڵ قوتابخانە شەرعی‌یەکانی ئەنادۆڵدا هاوکار بن و ڕێك بکەون.

بۆیە هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆمم بۆ دامەزراندنی ئەم زانکۆیە لە مەڵبەندی پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا (کوردستان) خستەگەڕ کە ناوەندێکە لە نێوان: هیندستان و وڵاتە عەرەبی‌یەکان و ئێران و قەفقاس و تورکستاندا و، ناوی "قوتابخانەی زەهراء"م لێ نا، کە قوتابخانەیەکی نوێ و شەرعی‌یە لە هەمان کاتدا.

جا هەروەك هەموو هەوڵ و تەقالایەکی خۆمم لە پێناوی دامەزراندنی ئەم زانکۆیەدا خستە گەڕ، بە هەمان جۆر بۆ بڵاوکردنەوەی "پەیامەکانی نوور"یش ئەو توانایەی خۆمم خستە کار)[1].

◆ هۆکاری چوارەم: سەقامگیرکردنی "ئاشتی" و، بوارنەدان بە "دەمارگیری"

(هەر لە سەردەمی ئەمەوی‌یەکانەوە زیانی بانگەشەی نەتەوایەتی و دەمارگیری دەرکەوتووە، هەروەك لە سەرەتای سەردەمی "سەربەستی" و "ڕاگەیاندنی دەستوور"یشدا خەڵکیی شپرزە و پارچە پارچە کرد..

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی لەمیرداغ: ٢/٥٩٩-٦٠٤.

ئەوەبوو "یانە" و "کۆمەڵە"کان لەو سەردەمەدا دامەزرێنران..

هەروەك سەرلەنوێ بانگەشەی نەتەوایەتی بەکارهێنرایەوە بۆ دووبەرەکی نانەوە لە نێوان برا عەرەبە نەجیب و تورکە موجاهیدەکاندا و، لەم رێیەوە پشێوی هەموو لایەکی گرتەوە و حەوانەوەش لە خەڵکی سەنرایەوە و زەوت کرا.

خۆ ئاشکرایشە کە سروشتی "نەتەوایەتی" و "دەمارگیری" بریتی‌یە لە زیاندان لە خەڵکی لە رێی ئەنجامدانی کاری سەلبی‌یەوە.

ئنجا نەتەوەی "تورك"یش لە هەموو شوێنێکی جیهاندا موسڵمانن، واتە نەتەوایەتی‌یەکەیان بە چەشنێك لەگەڵ "ئیسلام"دا ئاوێتە بووە کە هەرگیز ناتوانرێت لێك جیا بکرێنەوە..

کەواتە کاتێ وترا: "تورك". ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسە موسڵمانە. تەنانەت ئەو تورکانەی کە موسڵمان نین بە تورك لە قەڵەم نادرێن.

"عەرەب"یش بە هەمان جۆرن؛ چونکە ئەوانیش نەتەوایەتی‌یەکەیان ئاوێتەی ئیسلام بووە و نەتەوایەتیی ڕاستەقینەیان بریتی‌یە لە ئیسلام. واتە ئیسلام سەروزیادیانە.

بەڵام دەمارگیری و بانگەشەی نەتەوایەتی مەترسی‌یەکی گەلێ مەزنی تێدایە)[1].

[ "سەعیدی کۆن" بەمەی خوارەوە وەڵامی ئەو پەرلەمانتارانەی دایەوە کە ڕایان لەسەر دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء نەبوو ]:

(با بە فەرزی مەحاڵ وا گریمان بکەین کە ئێوە پێویستتان بەمە نی‌یە، بەڵام خۆ سەرهەڵدانی زۆربەی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لە کیشوەری ئاسیا و خۆرهەڵاتدا، هەروەها پەیدا بوونی زۆربەی حەکیم و فەیلەسووفەکانیش لە خۆرئاوادا، بەڵگەی ئەوەیە کە ئاسیا زیاتر هەست و شعووری ئایینی بەرەو پێشکەوتنی ڕاستەقینەی دەبات، تا فەلسەفە و زانستەکان.

جا ئەگەر ئێوە ئەم یاسا سروشتی‌یە وەرنەگرن و، بە بیانووی لاسایی کردنەوەی خۆرئاوا، نەریتە ئیسلامی‌یەکان پشتگوێ بخەن و دەوڵەتەکەتان لەسەر بناغەی ئیلحاد بنیات بنێن، ئەوا هێشتا هەر لە پێناوی بەرژەوەندیی نیشتمان و نەتەوەدا ناچارن کە

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٥٩٨/٢.

لایەنی ئیسلام بگرن، تاکو بتوانن ئاشتی لە پاریزگاکانی خۆرهەلاتدا(کوردستان) سەقامگیر بکەن کە کەوتوونەتە نێوان چوار پێنج دەولەتی مەزنەوە!

وا لە نێوان هەزاران نموونەدا یەك نموونەتان پێش‌چاو دەخەم:

کاتێ کە لە شاری "وان" بووم، بە یەکێك لە قوتابی‌یە کوردە بەغیرەتەکانی خۆمم وت:

تورکەکان گەلێ خزمەتیان بە ئیسلام کردووە، رات بەرامبەریان چی‌یە؟

وتی:

"من تورکێکی موسلمانم پێ باشترە لە برایەکی فاسقی خۆم، تەنانەت لەبەر ئەوەی تورکەکە خزمەتی ئیسلام دەکات لە باوکم زیاتر پەیوەندیی لەگەلدا دەبەستم".

پاشان رۆژگار گۆرا و سالان هاتن و رۆشتن.. هەر ئەو قوتابی‌یە - خوا لێی خۆش بێت - لە سەردەمی دیلیمدا رۆشتبووە ناو قوتابخانە نوێ‌یەکانەوە لە ئەستەمبوول. ئنجا پاش گەرانەوەم لە دیلی چاوم پێ کەوتەوە، هەستم کرد لە ئەنجامی "دەمارگیریی تورکی" لە لایەن هەندێ کەس لە مامۆستاکانیەوە "دەماری نەتەوایەتیی کوردی" لای ئەمیش بزواوە و، دەیوت:

"من ئێستا کوردێکی بە ئاشکرا فاسق، تەنانەت مولحیدیشم لە تورکێکی پیاوچاك پێ باشترە"!

پاشان چەند دانیشتنێکم لەگەلدا ساز کرد و، بە ئیزنی خوا لەو حالەتە رزگارم کرد و، قەناعەتی بۆ دروست بوو کە تورکەکان سەربازی پالەوانی ئەم نەتەوەیەن.

دەسا ئەی پەرلەمانتارە پرسیارکەرەکان!

نزیکەی پێنج ملیۆن کورد و سەد ملیۆن ئێرانی و هیندی و حەفتا ملیۆن عەرەب و چل ملیۆن قەفقاس لە خۆرهەلاتدان و، هەموویشیان پەیوەندی‌یەکانی: برایەتی و دراوسێ‌یەتی و پێویستی‌یان بە یەکەوە گرێ‌یان دەدات..

جا من پرسیار لە ئێوە دەکەم:

ئەم دوانە کامیان زیاتر پێویستن: ئەو دەرس و وانەیەی کە قوتابی لە زانکۆکەی "وان"دا دەیخوێنێت کە قوتابخانەیەکە گەلان و نەتەوەکان لە خۆدا کۆدەکاتەوە.. یان

ئەو وانەیەی کە نەفرەت دەخاتە نێوان ئەو گەلانەوە و، بیری ئەو قوتابی‌یە تەنها لە نەتەوەکەی خۆیدا دەبەستێتەوە و، ئینکاریی برایەتیی ئیسلامەتی دەکات و، هەموو توانایەکی بۆ فێربوونی زانستە فەلسەفی‌یەکان دەخاتە کار و، هیچ بایەخێك بۆ زانستە ئیسلامی‌یەکان دانانێت؟!

ئایا حاڵی ئەم یەکەیان وەك حاڵەتی دووهەمی قوتابی‌یەکەم دەرناچێت؟

دوای ئەم پرسیارە، ئەو پەرلەمانتارانەش کە شوێن پێی خۆرئاوایان هەڵدەگرت و دەستیان لە نەریتە ئیسلامی‌یەکان داشۆردبوو، هەڵسان و بڕیارەکەیان ئیمزا کرد. پێویست ناکات ناویان بهێنم، چونکە کۆچی دواییان کردووە. خوا لێیان خۆش بێت)[1].

(ئەم زانکۆیە بەردێکی بناغەیە بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا و، دەبێ بە قەڵایەکی قایمی ئاشتی و ئاسایش لەوێدا، هەروەك - بە پشتیوانیی خوای گەورە - گەلێ سوودیش لە بەرژەوەندیی ئەم گەل و وڵاتەدا بەرهەم دەهێنێت.

زانستە ئیسلامی‌یەکان لەم زانکۆیەدا بناغەیی دەبن، چونکە هێزە دەرەکی‌یە ڕووخێنەرەکان چەند هێزێکی ئیلحادین و "مەعنەوییات" لەناو دەبەن. خۆ مەگەر هێزێکی مەعنەویی گەورەی وەك خۆی، دەنا هیچ هێزێك ناتوانێت لە ڕوویدا بووەستێت، بەڵکو تەنها ئەو هێزەیە کە بە وێنەی بۆمبای ئەتۆمی بەسەر ئەو هێزە ئیلحادی‌یەدا دەتەقێتەوە)[2].

◆ هۆکاری پێنجەم: مردنی قوتابخانە ئایینی‌یەکان

(بە مردنی قوتابخانەی خوڕخوڕی ژێر قەڵا سەختەکەی وان، کە قوتابخانەیەکی سەرەتایی قوتابخانەی زەهرایە و، بە مردنی سەرجەمی قوتابخانە شەرعی‌یەکانی ئەنادۆڵ، هەموو قوتابخانەکان مردن و گیانیان لەدەست دا. وەك بڵێی قەڵاکەی وان بووە بە کێڵێك بۆ گۆڕە مەزنەکەیان.

دەسا ئەی ئەوانەی کە دوای سێ سەد ساڵ دێن!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٦٠٢-٦٠٣.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٦٠٤.

گوڵی قوتابخانەیەکی نوور لەگەڵ خۆتاندا بهێنن و لەسەر لوتکەی ئەم قەڵایە بیڕوێنن)[١].

❑ شوێنی دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء

(داوای دامەزراندنی "قوتابخانەی زەهراء" دەکەین، کە خوشکی مزگەوتی ئەزهەرە و زانکۆی لەخۆ گرتووە. داواکارین لە "بەتلیس" کە وەك مەڵبەندی کوردستان وایە دابمەزرێت و، لە هەردوو باڵەکەشی کە "وان" و "دیاربەکر"ە زانکۆی هاوشێوەی ئەوەی بەتلیس بکرێتەوە. بێ گومان ئێمەی کورد وەك خەڵکانی تر نین؛ دڵنیاین لەوەی کە ژیانی کۆمەڵایەتیمان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و بەختەوەریی تورکەکانەوە سەرچاوە دەگرێت)[٢].

❑ مەرجەکانی قوتابخانەی زەهراء

(یەکەمیان: ناوی "قوتابخانە"ی لێ بنرێت[٣]. چونکە خەڵکی لەگەڵ ئەو ناوەدا ڕاهاتوون وسەرنج ڕاکێشە و بەلایانەوە ئاساییە.

خۆ هەرچەندە ناوی "قوتابخانە" ناونیشانێکی ئیعتیباریییە، بەڵام ڕاستییەکی مەزن لەخۆ دەگرێت، کە ئەوەش دەبێتە هۆی بزواندنی حەز و شەوقەکان و بێدارکردنەوەی ئارەزووەکان.

دووهەمیان: تێکەڵ کردن و خوێندنی زانستە گەردوونییە نوێیەکانە لەگەڵ زانستە ئایینییەکاندا، هاودەم لەگەڵ ئەوەشدا زمانی عەرەبی واجب و کوردی دروست و تورکی پێویست بێت کە زمانی خوێندنی ناو ئەو قوتابخانەیە بن. ئەوەش بۆ دەربازکردنی

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥٤٨.

(٢) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٠.

(٣) لە دەقە ئەسڵییەکەدا لە جێی "قوتابخانە" نووسراوە: "مەدرەسە". لێرەدا ئەوە بۆ خوێنەری بەڕێز روون دەکەمەوە کە لە باکووری کوردستان وشەی "مەدرەسە" زاراوەیەکی تایبەتە بە خوێندنی ئایینی، وەك ئەوەی لای خۆمان وەك زاراوەیەکی تایبەت بەو جۆرە خوێندنە دەڵێین: خوێندنی "حوجرە". بەڵام خوێندنی ناو قوتابخانە تازەکان پێی دەڵێن: خوێندنی "مەکتەب". جا مامۆستا نوورسی جەخت لەوە دەکاتەوە کە "زانکۆی زەهراء" هەر بە ناوی "مەدرەسە"وە بێت، لەبەر ئەو ڕێزەی لەناو دڵی خەڵکی ناوچەکەدا هەبووە بەرامبەر بەو وشەیە، تاکو پتر نرخی ئەو زانکۆیە بزانرێت. (وەرگێڕ)

داوەریی زەین و ژیریی‌یە لە تاریکستانی فێڵ و گزیی چوار پێوەری نموونەیی بەد و بێ کەڵك و[1]، لەبەر لابردنی ئەو بەهەڵەدا بردنەی کە بەهرە و توانای "خۆ بە دانا زان" لە بواری چاولێکەریی خۆهەڵقورتێنەر و مشەخۆردا بەرهەمی دەهێنێت.

بەڵێ، ڕووناکیی دڵ: زانستە ئایینی‌یەکانە و، نووری عەقڵیش: زانستە گەردوونی‌یە نوێکانە. بە تێکەڵ کردنی ئەم دوانە "ڕاستی" دەردەکەوێت و، هیممەتی قوتابی پەروەردە دەبێت و بە هەردوو باڵەکە بەرز دەبێتەوە. بە لێك جیابوونەوەشیان: دەمارگیریی بێ کەڵك و نەفرەت لێکراو لە یەکەمیاندا و، فڕوفێڵ و گومانیش لە دووهەمیاندا، سەر هەڵدەدات.

مەرجی سێهەم: هەڵبژاردنی وانەبێژەکانیەتی، یان لە زانایانی کوردی خاوەن دوو باڵ، واتە لەوانەی کە لە لایەن زانایانی کوردەوە بڕوایان پێ کراوە و پشتیان پێ دەبەسترێ.. یان لەوانەی کە زمانی خۆجێیی ناوچەکە دەزانن، تاکو هۆگری و هاودەمی‌یان لەگەڵدا دروست ببێت.

مەرجی چوارەم: ڕاوێژ و پرس و ڕایە بە توانا و لێهاتنی کوردەکان و، ڕەچاو کردنی قۆناغی منالیی میللی‌یان و، سادە و ساکاری‌یان. چونکە گەلێ پۆشاك هەیە بە قەد و بالایەك جوانە، بەڵام بۆ قەد و بالایەکی تر ناشیرینە. دیارە فێر کردن و پێ خوێندنی منال یان بە زۆرەملێ و سەپاندن دەبێ، یان بە ناز هەڵگرتنی حەز و ئارەزوویان.

مەرجی پێنجەم: جێبەجێ کردنی سەرتاسەریی یاسای "کار دابەشکردن"ە، تاکو هەموو لق و بەشێك کەسانی پسپۆڕ و کارامەی لێ دەربچێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم لق و بەشانە تێهەڵکێشی یەکترین)[2].

---

(١) لە نموونەکانی ئەو پێوەرە هەڵە و بێ کەڵکانە:
یەکەم: قیاس کردنی شتانی مەعنەوی‌یە لەسەر شتانی ماددی و، بە بەڵگە دانانی هەرچی ئەوروپا لە بواری مەعنەوییاتدا دەیڵێ. واتە: هەروەك لە شتانی ماددیدا کارامەن و چاویان لێ دەکرێ، وا بزانرێت لە بابەتەکانی عەقیدە و باوەڕیشدا ئاوا کارامە بن.. دووهەمیان وەرنەگرتنی وتەی ئەو زانایانەی شارەزای زانستە نوێکان نین، لە بواری زانستە ئایینی‌یەکاندا.. سێهەم: پشت بەخۆبەستن و بەخۆنازین لە بواری ئاییندا، تەنها لەبەر ئەوەی کە لە زانستە نوێکاندا کارامەیە.. چوارەم: قیاس کردنی پێشینانە لەسەر پاشین و، ڕابوردووە لەسەر ئێستا، پاشان هێرش کردن و دەربڕینی ڕەخنەی ناڕەوا و نابەجێ‌یە. (عەبدولمەجیدی برای بەدیعوززەمان)

(٢) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٨١-٣٨٢.

(پەیڕەوی و گوێڕایەڵی بۆ یاسای "تەواوکاری و پێشکەوتن" - کە یاسایەکی بەدیهێنەری شکۆمەندە و لە گەردووندا بەپێی دابەشکردنی ئەرکەکان لەکاردایە - واجب و پێویستە، کەچی مافی تەواو نەدرا بە گوێڕایەڵیی ئەو ئاماژە و ڕەزامەندی‌یەی خوای گەورە کە لەو یاسایەدا هەیە. لەکاتێکدا کە دەستی چاودێریی دانستی خوایی - کە دەستووری "کار دابەشکردن" دەخوازێت - چەندین توانا و لێهاتنی لە ماهیەتی مرۆڤدا داناوە بۆ ئەنجامدانی زانست و پیشەسازی‌یەکان، کە لە حوکمی "فەرزی کیفایە"ی شەریعەتی گەردوونیدان.

وێڕای ئەم فەرمانە مەعنەوی‌یەش بۆ بەجێهێنانیان، کەچی بە ڕەفتاری هەڵەی خۆمان ئەو حەز و شەوقەمان لەدەست دا کە پشتی ئەو مەیلە دەگرێت و لەو توانا و لێهاتنەوە سەرچاوەی گرتووە..

هەروەك بەم هەڵپە و سووربوونە درۆینەیەمان و، بەم حەزی سەرکەوتنەش بەسەرخەڵکدا - کە سەری ڕیاکاری‌یە - بڵێسەکەمان کوژاندەوە!

بێ گومان سزای سەرپێچیکار دۆزەخە.. ئێمەش بە "دۆزەخی نەزانی" سزا دراین، چونکە فەرمانەکانی شەریعەتی فیترەتمان لە خۆماندا جێبەجێ نەکرد کە یاسای بەدیهاتووانە..

خۆ تەنها کارکردن نەبێت بەپێی یاسای "دابەشکردنی کار" هیچ شتێکی تر لەم سزا و ئازارە ڕزگارمان ناکات. ئەوەبوو پێشینانمان بەهۆی جێبەجێ کردنی ئەم یاسایەوە ڕۆشتنە ناو بەهەشتی زانستەکان)[١].

(مەرجی شەشەم: دوای تەواو کردنی خوێندن و دەرچوونی خوێندکارانی ئەم قوتابخانەیە، چەند ڕێگایەك بگیرێتە بەر بۆ دەستەبەرکردنی بەرەو پێش چوون و سوود وەرگرتنیان، تاکو لەگەڵ دەرچووانی قوتابخانە باڵاکان و پەیمانگا ڕەسمی‌یەکاندا یەکسان بن و، بە هەمان شێوەی ئەوان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و، تاقیکردنەوەکانیشیان بە وێنەی ئەو قوتابخانانە بەرهەم بەخش بێت، نەك نەزۆك و بێ ئەنجام.

---

(١) داوەری‌یەکان، موحاکەمات، ل: ٦٧-٦٨.

مەرجی حەوتەم: بە جۆرێکی کاتی (خانەی مامۆستایان) بکرێت بە کۆڵەکە و پاڵپشتی ئەم قوتابخانەیە و تێکەڵ بکرێت لەگەڵیدا، تاکو "ڕێسا" و "بەهرە وەرگرتن لە زانست" لەو خانەیەوە بۆ ناو ئەم قوتابخانەیە و، ڕەوشت بەرزی و ئاینداریش لەم قوتابخانەیەوە بۆ ناو ئەو خانەیە بڕوات و تەشەنە بکات، هەتا هەردوو کیان بەم ئاڵوگۆڕە دەبن بە خاوەنی هەردوو باڵەکە.

مەرجی هەشتەم:

گۆڕینی ئەو نەریتە بەردەوامەی کە لە کوردستاندا هەیە، ئەوەی کە خوێندن و فێرکردن بۆ تاکە کەسە. بەوەی کە تایبەت بکرێت بە کۆمەڵ و بازنەیەك لە خەڵکان)[1].

☐ دەرامەتەکانی قوتابخانەی زەهراء

(دەرامەتەکانی ئەم قوتابخانەیە بریتییە لە غیرەت و پەرۆشی..

پاشان ئەم قوتابخانەیە بە وێنەی "تۆو" درەختێکی تووبا - لە دۆخی هێزدا - لەخۆ دەگرێت. جا ئەگەر بە "غیرەت" و "پەرۆشی" سەوز بوو، ئەوا پێویستی بە ئێوە و گەنجینە وشك و برنگەکانتان نابێت، بەوەی کە بە جۆرێکی سروشتی ژیانی ماددیی خۆی کێش دەکات. ئەوەش لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم: ئەوقاف. ئەگەر بە جۆرێکی ڕاستەقینە ڕێك بخرێت، ئەوا بە یەکخستنی قوتابخانەکان کانیاوێکی بەخوڕ دەکاتە سەر ئەم حەوزە.

دووهەم: زەکات. چونکە ئێمە شافیعیین[2]. جا ئەگەر دوای ماوەیەك ئەم قوتابخانەی زەهرایە خزمەتگوزارییەکانی بۆ ئیسلام و مرۆڤایەتی خستە ڕوو، ئەوا بێ گومان و، بە شایستەیی، بەشێکی زەکات ڕووی تێدەکات و بۆ خۆی دەستەبەری دەکات. تەنانەت گەر زەکاتی زەکاتیش بێت سەروزیادیەتی.

سێهەم: نەزر و سەدەقەکان. چونکە هەروەك ئەم قوتابخانەیە لە لای ژیرییەکان بەرزترین قوتابخانە پێکدەهێنێت، لە بەرچاوی دڵ و ویژدانەکانیش خاوێنترین تەکیە و

---

(١) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٢-٣٨٣.

(٢) مەبەست ئەوەیە کە بە پێی ئەو مەزهەبە ناوبراوە دەتوانرێت بەشێك لە زەکات بدرێت بە قوتابیانی زانست کە بە ڕاستی لێبڕاون بۆ خوێندن. (وەرگێڕ)

خانەقا دەنوێنێت، ئەوەش بەهۆی ئەو بەروبوومانەی بڵاویان دەکاتەوە و، ئەو ڕووناکی‌یانەی کە بە هەموو لایەکیان دەگەیەنێت و، ئەو خزمەتە مەزنانەی پێشکەشیان دەکات بە ئیسلام.

واتە: هەروەك قوتابخانەی ئایینی‌یە.. قوتابخانەی نوێیە..بەڵکو تەکیە و خانەقاشە. دیارە ئەو کاتە بەشێکی نەزر و سەدەقەکان - کە لە نێوان هاوبەرپرسیی کۆمەڵایەتیی موسڵمانانداندان - ڕوو دەکاتە ئەو قوتابخانەیە.

چوارەم: خواستن. ئەویش بە فراوانکردنی ڕێژەی دەرامەتەکانی خانەی مامۆستایان، دوای ئەو تێکەڵ کردنەی لەبەر ئاڵوگۆڕی ناوبراو ئەنجام دەدرێت. چونکە دەگونجێ بە جۆرێکی کاتی دەرامەتەکەی بۆ ئەو قوتابخانەیە بخوازرێ. خۆ کە دوای ماوەیەك ئەو قوتابخانەیە کەوتە سەرخۆ و دەوڵەمەند بوو، ئەو دەمە ئەمانەتە خوازراوەکە دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی)[1].

☐ سوود و بەروبوومەکانی قوتابخانەی زەهراء

(ئەو سوود و بەروبوومانە بە کورتی و پوختی بریتین لە:

دابین کردنی ئایندەی زانایانی کورد و..

تێخزاندنی زانست بۆ ناو کوردستان لە ڕێی قوتابخانەوە و..

دەرخستنی لایەنە جوانەکانی "مەشرووتیەت" و "سەربەستی" و، سوود وەرگرتن لێیان.

بەڵام بە دوور و درێژی بریتین لەمانە:

یەکەم: یەکخستنی قوتابخانە ئایینی‌یەکان و ئەنجامدانی چاکسازی تیایاندا.

دووهەم: ڕزگارکردنی ئیسلام لە ئەفسانە و ئیسرائیلیات و دەمارگیریی بێزلێکراو، کە هەر ئەمانە بوون شمشێری بەبڕشتی ئیسلامیان ژەنگاوی کرد.

بەڵێ، ئیسلام داخوازی توندوتۆڵیی موسڵمانە لە ئاییندا، کە بریتی‌یە لە دین قایمی و دامەزراوی و پابەند بوون بە "حەق"ەوە.. نەك "دەمارگیری" کە ئەنجامی نەزانی و بەکارنەهێنانی داوەریی ژیری‌یە.

---

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٣-٣٨٤.

من لام وایە مەترسیدارترین جۆرەکانی دەمارگیری ئەوەیە کە لای هەندێ چاولێکەرانی ئەورووپا و مولحیدانی دەبینرێت، چونکە بە سەرسەختی‌یەوە سوورن لەسەر گومانە بێ بنەماکان!!

دیارە ئەوە هەرگیز ڕەفتار و خووی زانایان نی‌یە کە پابەندی بەڵگەکانن.

سێهەم: کردنەوەی دەرگایەك بۆ بڵاوبوونەوەی لایەنە جوانەکانی مەشرووتیەت.

بەڵێ، لەناو هۆزەکاندا هیچ هزر و بیرێك نی‌یە "مەشرووتیەت" زامدار بکات. بەڵام گەر بەلایانەوە جوان نەبێت سوودی لێ وەرناگرن. دیارە ئەمەش زیانی گەلێ زیاترە.

بێ گومان نەخۆش دەرمانێك بەکار ناهێنێت کە پێی وابێت ژەهری ئاوێتە بووە.

چوارەم: کردنەوەی دەرگایەك بۆ ڕۆشتنی زانستە گەردوونی‌یە نوێکان بۆ ناو قوتابخانە ئایینی‌یەکان. ئەوەش بە کردنەوەی کانیاوێکی سازگاری بێ خڵتە لەو زانستانە، بە جۆرێك شوێنکەوتووانی قوتابخانە ئایینی‌یەکان نەفرەتی لێ نەکەن.

چەندین جار وتوومە: تێگەیشتنێکی هەڵە و گومانێکی شووم تا ئێستا دوو بەربەستیان لە بەردەم ڕۆشتنی زانستەکاندا "بۆ ناو قوتابخانە ئایینی‌یەکان" داناوە)[1].

(گرنگترین ڕێگر، کە بەڵایەکی داباریوە بەسەرماندا: گومان بردنی ئەندێشەیی و ناحەقی ئێمە و بیانی‌یەکانیشە کە گوایا ناسازی‌یەك لە نێوان هەندێ ڕواڵەتی ئیسلام و هەندێ بابەتی زانستیدا هەبێت!

دەسا ئافەرین بۆ تەقالای بڵاوبوونەوەی ڕێژنەی زانیاری‌یەکان و، دەستخۆشی لە ماندووبوونی زانستە بەغیرەتەکان کە پشتی لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕانی ڕاستی‌یەکانیان گرت و، هێز و وزەیان بەبەر مرۆڤایەتیدا کرد و، حەزی بەکارهێنانی ویژدانیان لە گرۆی ئادەمیزاددا چاند و، "ڕاستی‌یەکان"یان بە کەرەسە و تفاقی جەنگ و بە مەبەستی دوورخستنەوەی ڕێگرەکان پڕ چەك کرد، تا لەناویان بردن و لەمەولاش بە تەواوی نایانهێڵن.

بەڵێ، گەورەترین هۆکاری ئەوەی کە حەوانەوەی دنیای لە ئێمە گرتەوە و، بیانی‌یەکانیشی لە بەختەوەریی ئەودنیا بێ بەش کرد و، پەردەی بەسەر ڕووی خۆری

---

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٤-٣٨٦.

ئیسلامدا هێنا و، بوو بەهۆی گیرانی ئەو خۆرە، تەنها بەد تێگەیشتن و گومان بردنی ناسازی و نەگونجاویی ئیسلام بووە لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی زانستدا.

گەلێ سەیرە!! ئاخر چۆن بەندە دەبێتە دوژمنی گەورەکەی و، خزمەتگوزاریش دەبێتە نەیاری سەرۆکی خۆی و، مناڵ چۆن لە باوکی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە؟! خۆ ئیسلام سەروەر و ڕابەری هەموو زانینەکان و، سەرۆك و باوکی سەرجەم زانستە ڕاستەقینەکانە!

بەڵام - بە داخەوە - ئەم تێگەیشتنە ناڕەوا و هەڵەیە تا ئێستاش فەرمانی خۆی ڕایی دەکات! ئەوەتا گومانەکانی خۆی دەهاوێتە ناو دەروونەکان و، دەرگای شارستانێتی و زانیاریی لە ڕووی کوردەکان و هاوشێوەیان داخستووە. ئیتر سامیان لە گومانی بوونی نەگونجاویی نێوان چەند ڕواڵەتێکی ئایین و چەند بابەتێکی زانستی لێ نیشت)[1].

(پێنجەم: ئەوە دووپات دەکەمەوە کە چەند جار - بەڵکو سەد جاریش - وتوومە:

ئەم قوتابخانەیە ئاشتی و سازش دەخاتە نێوان ئەهلی "قوتابخانەی ئایینی" و "قوتابخانەی نوێ" و شوێنکەوتووانی "تەکیە و خانەقاکان" و، وایان لێ دەکات- بە لای کەمەوە - لە ئامانجدا یەك بگرن، بەهۆی گۆڕینەوەی مەیل و بیروڕاکان کە لە نێوانیاندا پێکدێت.

بەڵێ، بەوپەڕی داخ و پەژارەوە دەبینین کە هەروەك جیاوازیی بیر و بۆچوونەکانیان یەکێتیی نێوانیانی لەتوپەت کردووە، جیاوازیی مەشرەبەکانیشیان پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی ئەوانی لە شوێنی خۆیدا ڕاگرتووە..

چونکە بەهۆی دەمارگیریی هەریەکەیان بۆ ڕێبازەکەی و، ڕوانینی ساکار و ڕواڵەتیی بۆ ڕێبازی ئەوی تر، ملیان بەرەو زیادەڕەوی و گوێ پێ نەدان ناوە. ئەوەتا ئەمیان بەوە زیادەڕەوی دەکات کە ئەو بە "گومڕا" دادەنێت و، ئەویش بەوە تەقسیربارە کە ئەم بە "نەزان" لەقەڵەم دەدات!

*پوختەی ئەمانە:*

ئەگەر ئایینی ئیسلام بەرجەستە ببێت، ئەوا لە شێوەی کۆشکێکی هێندە ڕووناك و درەخشاندا دەبێت کە سەرانسەری زەوی ڕووناك دەکاتەوە و دەیخەملێنێ..

---

(١) داوەرییەکان، موحاکەمات، ل: ٣٦-٣٧.

یەکێك لە مەنزڵەکانی ئەو کۆشکە: "قوتابخانەیەکی نوێ" و، ژوورێکی: "قوتابخانەیەکی ئایینی" و، گۆشەیەکیشی: "تەکیە" و، هەیوانەکەشی شوێنی کۆبوونەوەی هەموویان و ئەنجومەنی شووڕای نێوانیان دەبێت، بە جۆرێ کە هەریەکەیان ناتەواویی ئەوانی تر پڕ بکاتەوە.

جا هەروەك ئاوێنە خۆری تێدا دەردەکەوێ و وێنەکەی دەداتەوە، ئەم قوتابخانەی زەهرایەش بە هەمان جۆر لە لای وڵاتە بیانییەکان و لە پێش چاویاندا وێنە و شێوەی ئەو کۆشکە ئیلاهییەی تێدا دەردەکەوێ)[1].

## هەڵوێستی کاربەدەستان بەرامبەر بەم داواکارییەی بڵاوکردنەوەی زانست لە کوردستاندا

□ تۆمەتی "شێتی"!

"لە کۆتایی مونازەرە زانستی و گفتوگۆ بڵندەکانیدا، کە زۆر سەرکەوتووانە چەند ڕۆژ و حەفتەیەکیان خایاند، وتیان: ئەم پیاوە شێتە، چونکە هەموو شتێك دەزانێ! ئیتر ناوی سەعیدی هەژاریان لە لیستی شێتاندا تۆمار کرد، ئەوی شەیدای زانست و نیشتمان و شارستانێتی و مرۆڤایەتییان بەرەو خەستەخانەی شێتان بەڕێ کرد!

لە کۆشکەوە پزیشکێکیان نارد کە توانستە عەقڵییەکانی بپشکنێ، بەڵام سەعیدی دێوانە! بارودۆخی خۆی و هۆکاری هاتنی بۆ ئەستەمبووڵ بۆ پزیشکەکە ڕوون کردەوە، پێی وت:

من نەخۆش نیم، بەڵکو نەتەوە و وڵات دووچاری نەخۆشی بووە، من هاتم دەردەکانیان چارەسەر بکەم.

ناوچەی کوردستان لەو کاتەوە کە خوا دروستی کردووە هەتا ئێستا وەکو خۆی ماوەتەوە، خەڵکەکەشی نوقمی زۆنگاوی نەزانییە..

منیش بە هیوای ڕزگارکردنیان هاتم بۆ ئێرە. کەچی کاتێك هەوڵەکانم لەو پێناوەدا خستە کار، تۆمەتی "شێتی"م درایە پاڵ!

---

(١) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٦.

زۆر ڕاستە هەر کەسێ تێکەڵیی شێتان بکات، ئەویش شێت دەبێ. ئەوەبوو هاتم بۆ ئەستەمبوڵ و بە شێت دانرام"[1]!

❐ بەرەو نەخۆشخانەی شێتان!

(جاران پێم وابوو تێکچوونی بارودۆخی کوردستان هی ئەوەیە کە ئەندامێکی جەستەی گرفتاری نەخۆشی بووە. بەڵام کە هاتم بۆ ئەستەمبوڵ و ترپەی دڵ و دەمارەکانیم تاقی کردەوە و نەشتەرگەریم تێدا ئەنجام دا، تێگەیشتم کە نەخۆشی‌یەکە لە "دڵ"ەوە پەرەی سەندووە و پاشان بە هەموو لایەکی تردا بڵاو بووەتەوە. بۆیە هەوڵی چارەسەر کردنی ئەو نەخۆشی‌یەم دا، کەچی بە نازناوی "شێتی" ڕێزم لێ نرا)[2]!

(چونکە کەسانی حەسوود و نەیار لە لای کاربەدەستان بۆیان تێچاندم و، بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید – خوا لێی‌خۆش بێت – بەرەو نەخۆشخانەی شێتان درامەبەر)[3].

❐ گفتوگۆی لەگەڵ پزیشکی نەخۆشخانەکەدا

(ئەی پزیشکی بەڕێز! من دەدوێم و، تۆش گوێم لێ ڕابگرە..

وا بەڵگەیەکی ترت دەدەمێ لەسەر شێتی‌یەکەم! ئەویش وەڵامدانەوەی خەڵکە، بێ ئەوەی پرسیارم لێ کرابێت!

---

(١) یاداشتەکانی عەبدولمەجیدی برای مامۆستا سەعیدی نوورسی، ل: ٦ (ب/١٥٥). "ئەشرەف ئەدیب"ی نووسەری بەناوبانگ، لە باسی ئەو دەمەی ژیانی مامۆستا نوورسیدا دەڵێت: بەدیعوززەمان بۆ ئەوە هات بۆ ئەستەمبوڵ تاکو چەندین قوتابخانەی نوێ لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا دامەزرێنێت، لە پێناوی پەرەپێدانی گیانی زانست و بڵاوکردنەوەیدا لەو ناوچانە. ئەو لە هەموو کەسێك زیاتر شەیدای "سەربەستی" بوو، هەروەك کەسێکی گەلێ ئازا و شارستانی بوو.. نوورسی ئەو ڕادە زۆرەی بوێری و ئازایەتیی لە پێناوی ئازادیدا لە کاتێکدا دەربڕی کە خەڵك نەیاندەوێرا تەنانەت یەك دانە وشە لەو بارەیەوە دەربڕن و، تەنها بە هێما و ئاماژەکان دەیاندرکاند. جا سەرهەڵدانی کەسێك لە هەرێمەکانی خۆرهەڵات کە تا ئەم ڕادەیە بوێری و ئازایەتی دەربڕێت لە کاتێکدا کە هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی "پاشاکان" و "کۆشك"دا بوو، زۆر سروشتی بوو کە سەرکەوتنی بەسەر ئەواندا سەرسامی و مەترسی بهاوێتە دڵیان. بۆیە ئەو "پاشا" خۆسەپێنانەی کە میللەتیان بە کۆیلەی خۆیان دەزانی نەیانتوانی ڕێیەك بدۆزنەوە خۆیانی لە دەست ڕزگار بکەن ئەوە نەبێت کە بڵێن: "دەربڕینی ئەم بوێری‌یە، ئاماژەیە بۆ ناتەواویی ژیریی ئەم کەسە"! ئیتر خستیانە نەخۆشخانەی شێتان. ئەمە هۆکاری بردنی نوورسی بووە بۆ ئەو خەستەخانەیە! (وەرگێڕ، لە شوکران واحیدەوە: ٨٩-٩٠)

(٢) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦١٥.

(٣) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٠٤.

بێ گومان ئێوە حەز لە بیستنی گوفتاری شێتێکی نامۆ دەکەن!

من داواکارم لە شێوەی داوەری‌یەکی ژیریدا پشکنینم بۆ ئەنجام بدەن، با ویژدانیشت لەمەدا حەکەم بێت.

دیارە وتنەوەی وانەیەك لە زانستی پزیشکیدا بە پزیشکێك کارێکی بێهوودەیە، بەڵام دەبێ نەخۆش لە دەستنیشان کردنی نەخۆشی‌یەکەیدا یارمەتیی پزیشکەکەی بدات.

هەروەها بە پێویستی دەزانم کە بە باشی گوێ بیستم بن، تاکو ئاینده بە درۆتان نەخاتەوە..

کەواتە بە بایەخ پێدانەوە سەرنج لەم چوار خاڵە بدەن:

*یەکەمیان*: من لە چیاکانی کوردستاندا گەورە بووم. کەواتە ئەو حاڵەتانەی من کە ئێوە پەسەندی ناکەن و بە قەبەی دەزانن، دەبێ بە تەرازووی کوردستان هەڵیان بسەنگێنن، نەك بە تەرازووی هەستیار و شارستانیی "ئەستەمبووڵ"..

خۆ ئەگەر بە تەرازووی ئەستەمبووڵ هەڵیان بسەنگێنن، ئەوا بەربەستێکی ئەوتۆ لەبەر دەمماندا دادەنێن کە ڕێی سەرچاوەی بەختەوەریی دوارۆژمان لێ دەگرن و، دەبێ ئەو کاتە زۆربەی کوردەکان بەرەو نەخۆشخانەی شێتان بەرێ بخەن!

چونکە ئەو ڕەوشتانەی کە بەلای خەڵکی کوردستانەوە پەسەند و جوانن، بریتین لە: جەسارەت و، عیززەتی نەفس و، دین قایمی و، یەکبوونی دڵ و زمان..

کەچی ئەو شتەی لە شارستانێتیدا پێی دەڵێن نەزاکەت و نەرمونیانی، بەلای ئەوانەوە ڕیا و دووڕوویییە!

*دووهەمیان*: خوو و ڕەفتارەکانم - بە وێنەی بەرگ و پۆشاکم - پێچەوانەی خەڵکی‌یە. کەواتە سەرنجی خۆتان ئاراستەی واقیع و ڕاستی بکەن و، ئەو نەریت و باوە خراپانە مەکەن بە تەرازوو بۆ پێوانەی شتانێ کە ڕۆژگار بەرەوی پێ داون و بوونەتە نموونەی سەرمەشق بۆ خەڵکی..

من موسڵمانم، لەم ڕووەوە ئەرکی سەرشانمە کە وەفادار و پابەند بم بە ئایینەکەمەوە..

کەواتە دەبێ بیر لەو شتانە بکەمەوە سوودی نەتەوە و ئایین و دەوڵەتیان تێدایە و، ئەو قسە بێ گیان و مردووە نەڵێمەوە کە خەڵك دەیڵێن:

(من چیم لەمە داوە، با کەسانی تر بیری لێ بکەنەوە)!

*سێ‌هەمیان*: زووتر گەلێ کەسی "دەگمەن" هاتوون و ڕۆشتوون لەوانەی کە هەریەکەیان پێش کات و زەمانی خۆیان کەوتبوون..

خەلّکی ئەو سەردەمانە یەکەم جار هەلّسوکەوت و ڕەفتاری ئەوانیان بە شێتی و بێ سەرەوبەرە دەدایە قەلّەم، پاشان بە سیحر و شتی نائاسایی..

دیارە دژایەتیی نێوان خاڵی یەکەم و دووهەم ئاماژەیە بۆ دژایەتیی نێوان ئیددیعا و بەلّگەکانی ئەوانەی کە بڕیاری "شێتی"یان بۆ دەرکردووم. چونکە بە کردەوە و زمانی حالّ وتبوویان:

"ئەم کەسە شێتە؛ چونکە وەلاّمی هەموو پرسیارێك دەداتەوە و گشت گرێ کوێرەیەکیش دەکاتەوە"!

خۆ بێ گومان ئەو کەسە شێتە کە ئەم بەلّگەیە دەهێنێتەوە!

*چوارەمیان*: هەرکەسێك خاوەنی میزاجێکی تووڕەی - بە تایبەت - وەك میزاجی من بێت، بێ هیچ گومانێك دەبێ کەسێکی تووڕە بێت! چونکە ئەو کەسەی کە ماوەی پازدە ساڵە بیرێکی بەرزی - واتە سەربەستیی شەرعی - لەگەلّ خۆیدا هەلّگرتووە و، نزیك بوو بە چاو ببینێت هاتبێتە دی، کەچی لەم کاتەدا خۆی لە مەترسیدا ببینێتەوە و، خەریك بێ تیابچێت و، بەهۆی ڕوودانی ئالّوگۆڕێکی مەزنەوە لە بینینی ئاواتەکەی بێ بەش ببێت.. کەسێکی وا چۆن تووڕە نابێت؟!

پاشان وەزیری ئاسایش گەلێ لە من شێت ترە، چونکە لەچاو من تووڕەترە! لە کاتێکدا کە مەگەر یەك لە هەزاری ئەو خەلّکە، دەنا کەس لەم شێتی‌یە کاتی‌یە ڕزگاری نابێت:

فکلُّ الناسِ مجنــــونٌ ولکن  علی قَدْرِ الهوی اختلفَ الجنونُ!

جا ئەگەر ماستاوچێتی و مەرایی و لالاّنەوەی پشیلەئاسا و کلکەلەقێی سەگانە و بەختکردنی بەرژەوەندی گشتی لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیدا، بە "ژیری" دابنرێت.. ئەوا ئێوە شایەت بن کە من دەست لەم جۆرە "ژیری"یە هەلّدەگرم و، شانازی بەو شێتی‌یەوە دەکەم کە بە ڕای من وەك پلەیەك وایە لە پلەکانی بێ تاوانی.

ئنجا چەند "خالّ"ێك هەن کە گومان و دوودلّی‌یان سەبارەت بە من ورووژاندووە. لە کاتێکدا کە من لەسەر بناغەی زانین و لەبەر هەندێ حیکمەتی پەنهان ئەنجامم داون.

● یەکەمیان: شکڵ و شێوە نامۆکەمە.

من بەم بەرگ و پۆشاکانەم کە لە هی خەڵك ناچێت، ڕایدەگەیەنم کە هیچ نیازێکم بە ئامانجە دنیاییەکان نییە و.. بەهانە دەهێنمەوە بۆ گوێ نەدانم بەو عادەتانەی کە لەناو خەڵکی ئەم وڵاتەدا پیادە دەکرێن و، دەری دەخەم کە خوو و ڕەفتارەکانم وەك هی خەڵکی تر نین و، ئەوەش دەخەمە پێش چاو کە مرۆڤایەتییەکەم بریتییە لە یەکبوونی ناوەوە و ڕواڵەتی دەرەوەم.. هەروەها خۆشویستنی میللەتەکەم بەمە دەردەخەم..

پاشان "واتای نامۆ" بۆ ئەوەی سەرنج ڕابکێشێت دەبێ لەناو "وشەیەکی نامۆ"دا بێت.. ئنجا لە ڕێی ئەم شێوە نامۆیەمەوە بە ڕەفتار و کردار ئامۆژگاری پێش چاوی خەڵکی دەخەم کە هاندەری بەرهەمی ناوخۆیی بن و برەوی پێ بدەن.. هەروەها ئەو شێوەیەم ئاماژەیە بۆ ئەو مەیلی نوێ بوونەوەیەی کە لە زاتی خۆمدا هەستی پێ دەکەم، لە هەمان کاتیشدا ئاماژەیە بۆ تازەبوونەوەی زەمان و ڕۆژگار.. هەروەها من پەیمانم بە سوڵتان سەلیم داوە.

● دووهەمیان: مونازەرە کردنمە لەگەڵ زانایاندا.

هۆکاری ئەمە بریتی بوو لەوەی کە کاتێ هاتم بۆ ئەستەمبووڵ بینیم قوتابخانە ئایینییەکان، بە وێنەی بوارەکانی تری ژیان، لە وڵاتدا پێش نەکەوتوون. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کتێب خوێندنەی ئامادەکارییە بۆ هەڵێنجانی مەسەلەکان، خراوەتە جێی "مەلەکەی زانست"[(١)].

ئنجا لە ئەنجامی نەبوونی مونازەرەی زانستی و پرسیار و وەڵام لە نێوان قوتابیاندا، هەندێ حاڵەتی وەك پشتگوێ خستنی خوێندن و، نەمانی شەوق و، لاوازیی "مەلەکە" لەناویاندا سەری هەڵداوە.

---

(١) "مەلەکە": سیفەتێکی جێگیرە لە دەروونی مرۆڤدا. واتە: بەهۆی یەکێك لە کردارەکانەوە شتێك لە ناخی مرۆڤدا دروست دەبێت پێی دەڵێن: "چۆنێتیی دەروونی". جا ئەگەر ئەو چۆنێتییە بە خێرایی نەما پێی دەوترێ: "حاڵەت". بەڵام ئەگەر چەند جارێك دووپات بووەوە و جێی خۆی گرت و بوو بە چۆنێتییەکی بەردەوام کە لابردنی ئەستەم بێت، پێی دەوترێ: "مەلەکە". خۆ ئەگەر بە کرداریش بەرجەستە بوو، پێی دەڵێن: ڕەوشت و خوو. بڕوانە: (التعريفات) للسيد الشريف الجرجاني. ص: ١٢٦، طبع ونشر دار الشؤون الثقافية - بغداد. هەروەها: (كشاف اصطلاحات الفنون) للتهانوي. ١٦٤٢/٢. (وەرگێڕ)

دەبێ بزانین کە "زانستە خواییـەکان" بـە وێنـەی زانستەکانی تـر بەدەسـت نـاهێنرێن، چونکـە خۆیـان لـە خۆیـاندا مەبەسـت و جێـی ئامـانجن و، لـەزەتێکی ڕاسـتەقینە بەرهـەم دەهێنن. کەواتە نـە وەکـو زانسـتە گەردوونیـیەکانن - کـە سەرسـامی و سەرسـووڕمان دەورووژێنن - نە وەکو ئەو زانستانەشـن کـە بـۆ گاڵتـە و گـەپ بـەکاردێن و کاتیـان پـێ بەسەر دەبرێت..

لەبەر ئەوە، فێربوون و دەستخستنیان پێویستی بە هیممەتێکی بەرز، یان ڕۆچوونێکی تەواوەتی، یان هاندەرێکی شەوق بزوێـن و دەرەکـی هەیـە کـە بـە وێنـەی پرسیار و وەڵام پێشبڕکێ بەرهـەم بـهێنێت، یـان دەبـێ بـەپێی جێبـەجێ کردنـی دەسـتووری "کـار دابـەش کردن" هەر یەك لە قوتابیان بە گوێرەی توانای خۆی لە هەندێ زانستدا ڕۆبچێت، تـاکو تیایدا ببێت بە پسپۆڕ و زانینەکەی ڕووکەش و سەرپێیی نـەبێت. چونکـە هـەموو یـەکێك لەو زانستانە "وێنەیەکی ڕاستەقینە"ی خۆی هەیە، جا هەرکاتێ مرۆڤ "مەلەکـە"ی نـەما زانستەکەشی وەکو وێنەیەکی ناتەواو دەردەچێت..

چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێ کە هـەموو قوتابیـیەکی لێـهاتووی بـەتوانا یـەکێك لـە زانستەکان بکات بە بەردی بناغەی زانستەکانی خۆی، ئنجا چەردەیەك لە یەك بـە یـەکی ئەو زانسـتانەی تریـش دەسـتی خـۆی بخـات کـە پەیوەندییان بـە زانسـتە سـەرەکییەکەوە هەیە، تاکو "وێنـەی ڕاسـتەقینە"ی ئـەو زانسـتەی تـەواو بکـات. چونکـە هـەموو پوختـە و چەردەیەکی ئەو زانستانەی تر دەکرێت ببێت بە تەواوکەری زانسـتە سـەرەکییەکە، بـێ ئەوەی بتوانێت "وێنە"یەکی سەربەخۆ پێکبهێنێت!

ئەی قوتابیانی زانستە شەرعییەکان لەوانەی کە گوێیان لە دەنگمە!

دەبا وەك ئەوەی کـە قوتابیـانی قوتابخانـە نوێیـەکان بـوون بـە باشـترین "جێنشـین" بـۆ "پێشینان"ە ناتـەواوەکانیان، بـا ئێمـە ببـین بـە باشـترین "جێنشـین" بـۆ "پێشینان"مـان کـە گەیشتبوونە چڵەپۆپەی "تەواوی"!

جا مەبەستی من لەو مونازەرانە ئەوەبوو کە - بە کردەوە - بۆ ئەم دوو خاڵە بێداریان بکەمەوە.

● سێ‌هەمیان: من - وێڕای ناشایستەییم - ئەم دوو چەمکەی خوارەوەم ڕوون کردەوە:

*یەکەم*: ئیسلام - کە بریتی‌یە لە شارستانێتیی ڕاستەقینە - لەم چەرخی پێشکەوتنەدا بە وێنەی شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە هەنگاوی بەرەو پێش نەناوە.

گەورەترین هۆکاری ئەمە بریتی‌یە لە جیاوازیی بیروڕا و مەشرەبەکان لە نێوان ئەهلی قوتابخانە ئایینی‌یەکان و، قوتابخانە نوێیەکان و، تەکیە و خانەقاکاندا، ئەوانەی واتای ئەو پەندەیان تێدا هاتووەتە دی کە دەڵێ: "ئامانجیان یەکە و جیا جیا لێی دەدوێن"..

ئەوەتا ئەهلی قوتابخانەی ئایینی کەسانی قوتابخانە نوێیەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن کە دەڵێن: بیروباوەڕیان لاوازە، لەبەر ئەوەی دەچن ڕواڵەتی هەندێ ئایەت و فەرموودەی پیرۆز بە شێوەیەك لێکدەدەنەوە کە واتایەکی تری جگە لە مەبەستی خۆیان بە دەستەوە بدەن..

ئنجا ئەوانیش ئەمان بە باوەڕ پێنەکراو دادەنێن، چونکە بایەخ بە زانستە نوێیەکان نادەن..

پاشان ئەهلی قوتابخانە "ئایینی‌یەکان" خەڵکانی ناو تەکیە و خانەقاکان بە ئەهلی بیدعەت لە قەڵەم دەدەن و، ئەم ڕا و بۆچوونە بەتاڵەشیان لەسەر ئەو گومانە ناڕەوایەی عەوام و هەندێ نەزان بنیات ناوە کە پێیان وایە هەندێ لەو جموجووڵ و هەڵسوکەوتە شەوق بەخش و موباحانەی لە زیکردا دەکرێن لە خودی زیکرەکە بێت..

لە کاتێکدا ئەوەی "عیبادەت"ە تەنها زیکرەکەیە و، ئەو جموجوولانەش بەشێك لە زیکرەکە نین..

ئنجا کردنەوەی دەرگای گوێ پێ نەدان و چاوپۆشی لە هەندێ شت، لە ڕێی گوێ نەدانی ئەوان و ڕۆچوونی زیاد لە پێویستی ئەمانیش، کارێکی کرد کە هەندێ "بیدعەت" ئاوێتەی زیکر ببێت!

ئەم جیاوازی‌یەی کە لە نێوان بیر و بۆچوون و مەشرەبەکاندا بەدی دەکرێت، ڕەوشتی موسڵمانانی ترازاندووە و لە کاروانی شارستانێتی دوای خستوون.

چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێت کە:

بە چەشنێکی دروست و ڕاستەقینە زانستە ئایینی‌یەکان لە قوتابخانە نوێ‌یەکاندا بخوێنرێن..

لە قوتابخانە ئایینی‌یەکانیشدا لە جێی ئەو زانستی حیکمەتە کۆنەی کە هیچ جێ‌یەك ناگرێت، هەندێ لەو زانستە نوێ‌یانە بخوێنرێت..

هەروەها دانانی زانای پایەدار و ئاگادار بۆ تەکیە و خانەقاکان..

ئەو کاتە و دوای ئەم چارەسەرانە، ئومێدێکی توندوتۆڵ دەبێت بەوەی کە ئەم سێ لایەنە ببن بە دەزگایەکی هاوکار و تەبای ئەوتۆ کە پێکەوە پلەکانی پێشکەوتن ببڕن.

*بیری دووهەم:* تایبەتە بە واعیزەکان، کە وانەبێژی گشتین.

کاتێ گوێم لە واعیزەکان ڕاگرت، بینیم وەعز و ئامۆژگاری‌یان هیچ کارێکی تێ نەکردم.

کە بیرم لە هۆکاری ئەمە کردەوە، بۆم دەرکەوت، جگە لە دڵڕەقیی خۆم، سێ هۆکاری تر هەن:

یەکەمیان:

ئەو واعیزانە لە دەمی ڕوونکردنەوەی مەبەستەکاندا، بە یەك چاو سەیری ئێستا و کاتەکانی ڕابوردوو دەکەن و، ئەوە ڕەچاو ناکەن کە سەردەمەکانی پێشوو لەبەر ئەوەی خاوێنیی دڵ و دەروون و چاولێکردنی زانایان بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوو، ئەوا زانایان پێویستیان بە هێنانەوەی بەڵگە نەبوو لەسەر قسەکانیان..

بەڵام ئێستا هەرکەسەو بۆ خۆی حەزی بەدواداچوونی حەقیقەتی تێدا ورووژاوە. لەبەر ئەوە، ڕوونکردنەوەکان بە بێ هێنانەوەی بەڵگە بۆیان کاریان تێناکات.

جا بۆ ئەوەی لەم سەردەمەدا کاریگەرییان هەبێت، پێویستیان بە سەلماندن و قەناعەت پێ بەخشین هەیە.

هۆکاری دووهەم:

ئەوان کاتێ خەڵکی بۆ کارێکی چاك هان دەدەن.. یان مەترسی‌یەکانی کردارێکی خراپیان پێش چاو دەخەن، دەچن لەو پێناوەدا نرخ و بەهای شتە گەورەکان دەهێننە خوارەوە!

بۆ نموونە دەڵێن: دوو ڕکاتی شەونوێژ خێری حەجێکی هەیە و، هەرکەسیش غەیبەت بکات هێندەی زینایەك پێی گوناهبار دەبێت!

سێ‌هەمیان:

ئەوان گوفتارێك ئاراستەی خەڵکی ناکەن، کە وەك "ڕەوانبێژی" دەخوازێ، لەگەڵ حاڵ و مەقامی ڕۆژگار و سەردەمدا یەکاویەك بێت. وەك بڵێی خەڵکی ئێستا بەرەو سەردەمە پێشووەکان کێش بکەن، ئنجا بە زمانی ئەو سەردەمانە لەگەڵیان بدوێن!

من دەمویست ئەوە بخەمە ڕووکە مەرجە "واعیزەکان" هەم "زانای لێکۆڵەر"بن، تاکو بتوانن گوفتارەکانیان بچەسپێنن.. هەم "دانای وردەکار" بن، تاکو هاوسەنگیی شەریعەت لێك نەترازێن.. هەم "ڕەوانگۆی قەناعەت‌بەخش" بن.

چوارەمیان:

من وتوومە: "زەینم شێواوە".

مەبەستیشم لەم قسەیە ئەوە بوو کە "بیر"م گرفتاری لە بیرچوونەوە بووە و، هەست بە زەین تەسکی و بێ تاقەتی لە سروشتمدا دەکەم.

خۆ مادەم شێت بە خۆی ناڵێت "شێت" ئیتر چۆن ئەم قسەیەم دەبێت بە بەڵگە لەسەر شێتیم؟!

هەروەها وتبووم: دوای خوێندنی کتێبی "إظهار" تەنها سێ مانگ دەرسم خوێندووە.

جا ئەم قسەیەم لە دوو ڕووەوە گومان و دوودڵی دەوروژێنێت:

چونکە یان ئەوەیە پێچەوانەی ڕاستی‌یە، لە کاتێکدا کە زۆربەی خەڵکی کوردستان پشتڕاستی دەکەنەوە..

یان هەرچەندەش ڕاستە، بەڵام ئاماژەی تێدایە بۆ مەدحی خۆکردن و لەخۆ بایی بوون - کە یەکێکە لە توخمەکانی شێتی - وەك تۆ دەڵێیت کاکی دکتۆر!

وەڵامی ئەمەش:

ئەو قسەیەم بە ویستی ڕاست و دروستی خۆم بوو لە وەڵامی پرسیارێکدا کە یەکێك لە پیاوانی دەوڵەت لێی کردم، هەرچەند خۆمەدحکردنی پێوە دەبینرێت.

ئێستاش پێم وایە دوای نەمانی گومانتان لە "هەست و شعوور"م، دوودڵیتان لە "بیر و بۆچوون"م هەبێت. خۆ ئەوەش بە بچووکترین داوەریی ژیری نامێنێت..

چونکە مرۆڤێکی کوردی دەشتەکی و ئازاد، گەر وەفا و ڕاستیی تێدا نەبێت بۆ نەتەوەیەکی پێشکەوتووی چەشنی ئەلّماس و، لە خۆیدا خاوەنی بیرێکی بەرزی وەکو گەوهەر نەبێت، چۆن دەتوانێت فڕوفێڵەکانی و بیری بێ کەڵك و خراپی خۆی بە درێژایی ئەم هەموو کاتە بشارێتەوە، بەم هەموو جیاوازییانەوە کە پێوەی دەبینرێت؟

لای من فێڵ لەوەدایە کە واز لە فێڵ بهێنرێت!

کەواتە لە دڵی خۆیدا هەستی بە وەفایەکی بێگەردی ئەوتۆ کردووە کە لە هی هەموو کەس زیاتر بێت، چونکە کەسی ڕاستگۆم لەگەڵ میللەتدا نەبینی. بۆیە خۆی لەو جۆرە بارودۆخانەدا بینییەوە.

وكم من عائبٍ قولاً صحيحاً وآفتـه من الفهم السـقيم[١]!

بەو واتایەی "تێگەیشتن"ی پزیشکەکانمان تێگەیشتنێکی نەخۆشە و، هەر ئەوان بەپێی ڕاپۆرتە پزیشکییەکانیان تووشی شێتی بوون!

یەکێکی تر لەو شێتانە وەزیری "ئاسایش"ە، چونکە زیاد لە پێویست هەڵدەچێت!

جا ئەی کاکی پزیشك!

تۆ پزیشکێکی وریا و کارامەیت.. فەرموو ئەو بێچارانە پێش من چارەسەر بکە!

ئەی ئەو کەسانەش کە سەیری ئەم گوفتارەم دەکەن!

گەر ئەم قسانەم شتێکی ئەوتۆی تێدایە هەستی ئێوە زامدار بکات، یان گەدەی لاوازتان پێی هەرس(هضم) نەکرێت، داوای لێبوردن دەکەم، چونکە لە کاتی شێتی و لە نێوان چوار دیواری نەخۆشخانەی شێتاندا وتوومە!

خۆ کاریگەریی دەوروبەر لە گوفتاردا شتێکی سەلماوە، چونکە: "دیوانەرا قلم نیست" واتە: قەڵەم لەسەر شێت هەڵگیراوە.

دیارە نەخوێندەوارێکی دەشتەکی، واتە کوردێکی ئازاد کە تورکی بە باشی نازانێت، هەر ئەوەندە دەتوانێت مەبەستی خۆی دەربڕێت.

والسلام)[٢].

---

(١) ئەم شیعرە هی موتەنەببییە. واتە:

هەندێ توانجیان لە قسەی جوانە دەردی ناساغیی تێگەشتنیانە

بڕوانە دیوانەکەی: ٤/٢٤٦. (وەرگێڕ)

(٢) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٤٩-٤٥٨.

(پاش بیستنی ئەم گوفتارە، پزیشکەکە نوقمی سەرسامی بوو، چونکە مەودای دڵسۆزی و هەوڵ و تێکۆشانی ئەوی بۆ دەرکەوت لە پێناوی خزمەتی نیشتمان و سوودگەیاندنی بە هاوولاتیان لە رێی بەدەستهێنانی زانستەوە. هەروەها بۆی دەرکەوت کە چۆن لە چلەپۆپەی زیرەکیدایە. بۆیە راپۆرتێکی ئامادە کرد و ئەم گوفتارەی تێدا نووسیبوو:

" لە نێوان هەموو ئەوانەی کە هاتوونەتە ئەستەمبوولەوە هیچ کەسێك نییە کە وەك ئەو وریا و زیرەك بێت. لە هەموو جیهاندا دەگمەن و بێ وێنەیە".

لە ئەنجامی ئەم راپۆرتەدا سەرسامی و ترس کەوتە ریزەکانی بەرپرسانی کۆشك. بۆیە لەگەڵ "شەفیق پاشا"ی وەزیری "ئاسایش"دا فەرمانێکی کارگێرییان بۆ نارد کە مووچەیەکی مانگانەیان تێدا بۆ بڕیبووەوە بە بڕی سی لیرەی زێڕ، جگە لەو بەخششانەی کە بۆیان دەستنیشان کردبوو، هەموو ئەمانەش بۆ مەبەستی دوورخستنەوەی لە ئەستەمبووڵ)[1].

☐ گفتوگۆی لەگەڵ "شەفیق پاشا"ی وەزیری ئاسایشدا

(وەزیری ئاسایش:

سولتان سلاوت لێ دەکات و، "هەزار قروش" مانگانەشی بۆ بڕیویتەوە و، دەڵێ کە دوایی بۆت دەکات بە "بیست - سی لیرە".

وەلامم دایەوە:

من سوالکەری مووچە نیم. ئەگەر هەزار لیرەشم بدەنێ هەر وەری ناگرم. من بۆ مەبەستی کەسیی خۆم نەهاتووم، بەلکو لە پێناوی بەرژەوەندیی نەتەوەکەمدا هاتووم. ئەوەی ئێوە دەتانەوێ پێشکەشی منی بکەن بەرتیلێکە بۆ بێدەنگ کردنم.

وەزیر: بەم کارەت دەست بە رووی فەرمانی سولتانەوە دەنێیت، فەرمانی ئەویش رەت ناکرێتەوە.

لە وەلامدا وتم: رەتی دەکەمەوە، تاکو سولتان لەم کارەم بێزار بێت و بنێرێت بە شوێنمدا، ئەو کاتە دەتوانم راستەوخۆ لای خۆی قسەی هەق بکەم.

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، پەراوێزی ل: ٤٥٨ لە یاداشتنامەی مامۆستا عەبدولمەجیدی نوورسییەوە.

وەزیر: ئاخر ئەنجامی ئەمە باش نابێت!

وتم: ئەگەر ئەنجامەکەی ئەوە بێت بمخەنە ناو دەریاوە، ئەوا دەریا دەبێتە گۆڕێکی فراوان بۆم.. گەر لە سێدارەشم بدەن ئەوا لە ناو دڵی نەتەوەکەمدا ئەسپەردە دەکرێم.

بیشزانە کاتێ کە هاتم بۆ ئەستەمبوولْ گیانی خۆمم - لەو پێناوەدا - بەخشیبوو.. چیتان لە دەست دێت درێغی مەکەن.

من بە دڵسۆزی پێتان دەڵێم: ویستم بە کردار ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم بێدار بکەمەوە کە هەرکامێکیان پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە هەبێت با تەنها لە پێناوی خزمەتی نەتەوەدا بێت، نەك بۆ لێکێشانەوەی مووچە و مانگانە.

هەروەها خزمەتی کەسێکی وەکو من بۆ میللەت و دەوڵەت تەنها بە پێشکەشکردنی ئامۆژگاری دەبێت، ئامۆژگاریش دەبێ کاریگەریی جوانی هەبێت، ئەوەش بە وازهێنان لە بەرژەوەندیی خۆیی دێتە دی، ئەوەش بەوە دەبێت کە ئامۆژگارییەکە بێ بەرامبەر بێت و واز لە سوودە کەسییەکان بهێنرێت.

بەم پێیە من بەهانەم بە دەستەوەیە بۆ وەرنەگرتنی مووچە و مانگانە.

وەزیر: ئەو مەبەستەی بۆی هاتوویت، کە بڵاوکردنەوەی زانستە لە کوردستاندا، لە بەردەستی ئەنجومەنی وەکیلاندایە و لێی دەکۆڵنەوە.

وەڵامم دایەوە: ئەمە جێی سەرسووڕمانە!

بە چ یاسایەك دەچن مەسەلەی بڵاوکردنەوەی زانست دوادەخەن و، بۆ بڕینەوەی مانگانەش پەلە دەکەن؟

بۆچی بەرژەوەندیی کەسیم بەسەر بەرژەوەندییە گشتییەکانی میللەتدا پێش دەخەن[1]؟!

(دەسا ئەی کوردەکان!

من نەخۆشخانەی شێتانم قبووڵ کرد، بەڵام بۆ ئەوەی "کوردایەتی" لەکەدار نەکەم ویستی پادشا و، مووچە و چاکەی شاهانەم قبووڵ نەکرد)[2]!

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٥٩-٤٦١.

(٢) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٣٤.

## دەرەنجامی هەوڵەکانی بۆ دامەزراندنی قوتابخانەی زەهراء

[ مامۆستا سەعیدی نوورسی لە یەکەم ڕۆشتنیەوە بۆ ئەستەمبووڵ هەتا دوا ساڵەکانی تەمەنی کۆڵی لەو داواکاری‌یەی نەداوە و، ئەم مەسەلەیەی ڕووبەڕووی هەموو دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا کردووەتەوە. ئەمانەی خوارەوە بە کورتی قۆناغەکانی ئەو هەوڵە و دەرەنجامەکانیەتی کە هەموو تەمەنی ئەوی گرتووەتەوە: ]

❑ حکوومەتەکانی دواتر پێشوازی لەو داوایە دەکەن

(سێ‌هەم ساڵی ڕاگەیاندنی "سەربەستی" ئەم باسانەم لە شێوەی وتاردا بە گوێی خەڵکی شارەکانی بەتلیس و وان و دیاربەکر وشوێنەکانی تردا دا، هەمووشیان پشتگیری‌یان لێ کردم و پێیان وابوو کە ئەمە بابەتێکی ڕاستەقینەیە و، لە توانادا هەیە بێتە دی. بۆیە دەتوانم بڵێم: من لەم مەسەلەیەدا هەموو ئەو شتانەم درکاندووە کە بە دڵی ئەواندا هاتووە)[1].

(سوڵتان ڕەشاد - خوا لێی خۆش بێت - یەکەم کەس بوو بایەخی بە دامەزراندنی ئەم زانکۆیە دا و بیست هەزار لیرەی زێڕینیشی بۆ تەرخان کرد. خۆ کاتێکیش کە لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە دیلی گەڕامەوە، سەد و شەست و سێ کەسی پەرلەمانتار لە نێوان دوو سەد پەرلەمانتاردا ئیمزایان لەسەر تەرخان کردنی سەد و پەنجا هەزار لیرە کرد - بەو نرخە زۆرەی ئەو دەمەی لیرە - بۆ هەمان مەبەست، کە خودی مستەفا کەمال یەکێك بوو لەوانە. ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە ئەوان لە هەموو شتێکی تر زیاتر بایەخیان بە دامەزراندنی ئەم زانکۆیە داوە.

تەنانەت ئەو پەرلەمانتارانەش کە لاسایی خۆرئاوایان دەکردەوە و هیچ بایەخێکیان لە دوور و نزیکەوە بە ئایین نەدەدا و پەیوەندی‌یان بە نەریتە ئیسلامی‌یەکانەوە پچڕابوو، هەموو ئەوانەش - دوانیان نەبێت - بڕیارەکەیان ئیمزا کرد. بەڵام ئەو دوو کەسەیان وتیان: ئێمە زیاتر پێویستمان بە شارستانێتیی خۆرئاوایە تا ئەوەی پێویستمان بە کۆکردنەوە و پێکەوە گرێدانی زانستە ئایینی و زانستە نوێکان بێت)[2].

---

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٤ (پەراوێز).

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٦٠١/٢.

(پرۆژەی دامەزراندنی زانکۆیەکم لە شاری "وان"دا پێشکەش کردن کە وەك "زانکۆی ئەزهەر" وابێت و ناوی "زانکۆی زەهراء" بێت، تەنانەت بە دەستی خۆیشم بناغەی زانکۆکەم دانا..

بەڵام جەنگی جیهانیی یەکەم بەرپابوو، ناچار لە قوتابیانی خۆم و خۆبەخشەران تیپەکانی "یاریدەدان"م پێکهێنا و خۆم سەرکردەییم دەکردن و، لە بەرەی قەفقازدا بۆ بەرگری کردن لە شاری "بەدلیس" بەشداریی چەندین جەنگی سەخت و خەتەرناکمان کرد لە دژی دەستدرێژییەکانی "ڕووس"ی دەستدرێژی کەر)[١].

(پاشان دوای نزیکەی شەش ساڵ ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە و لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئەو ڕاستییەدا هەوڵەکانی خۆمم خستەوە گەڕ. ئەوەبوو لە کۆی دووسەد ئەندامی پەرلەماندا سەد و شەست و سێ ئەندام ڕەزامەندییان لەسەر ئەوە نواند کە پازدە هەزار لیرەی وەرەقی بۆ بنیاتنانی قوتابخانەکەمان تایبەت بکرێت. بەڵام هەزار هەزار داخ و ئەسەف بۆ ئەوەی کە هەموو قوتابخانە ئایینییەکان داخران و، منیش ئیتر نەمتوانی لەگەڵ ئەواندا خۆم بگونجێنم و، دیسانەوە پرۆژەکە دواکەوتەوە)[٢].

(جێی خۆشحاڵی و مایەی گەشبینییە کە دوای شکست هێنانی زەبر و زەنگی ئەو ئیستبدادە ترسناکەی کە بیست و پێنج ساڵی خایاند و کۆتایی بە ژیانی قوتابخانە شەرعییەکان هێنا، "تۆفیق ئیلەری"ی وەزیری پەروەردە بڕیاری دامەزراندنی قوتابخانەی زەهرای داوە لە "وان"دا بە ناوی "زانکۆی خۆرهەڵات" و، "جەلال بایار"ی سەرۆك کۆماریش - بێ ئەوەی پێی بزانێت - بڕیارەکەی وەزیری پەسەند کردووە و خستوویەتیە لیستی مەسەلە گرنگەکانەوە. خۆ ئەمەش ئەو شتەیە کە چل ساڵ پێش ئێستا "سەعید" ئاواتەخوازی بوو. پشت بە خوا ئاواتەکەی دێتە دی)[٣].

("سەرۆك کۆمار" دامەزراندنی ئەو زانکۆیەی لە خۆرهەڵاتدا لە ناوەندی بابەتە سیاسییە گرنگەکاندا دانا و، تەنانەت ویستی یاسایەك دەربکات بۆ تەرخان کردنی شەست ملیۆن لیرە، بۆ مەبەستی بنیاتنانی ئەو زانکۆیە)[٤].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٠٤.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٧١.

(٣) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥٤٨-٥٤٩.

(٤) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٦٠٣.

❐ هاتنەدیی ئەو قوتابخانەیە بە ڕێباز و قوتابیانی پەیامەکانی نوور

(میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەی بەتوانا تایبەتکاریی‌یە مەعنەوی‌یەکان و کاکڵە و جەوهەری ئەو قوتابخانەیەی لە "ئیسپارتە"دا دامەزراند و، "پەیامەکانی نوور"ی هێنایە وجوود. پشت بە خوا "قوتابیانی نوور" ڕووە ماددی‌یەکەی ئەو ڕاستی‌یەش دەهێننەدی و دایدەمەزرێنن)[1].

(بەڵام لەبەر ئەوەی گەلێ ڕێگری زۆر هەبوون کە نەیاندەهێشت قوتابخانەی زەهراء لە شێوە ماددی‌یەکەیدا دروست ببێت، ئەوا ئێستا بریتی‌یە لە بازنە فراوانە گشتی‌یەکەی قوتابیانی نوور)[2].

(قوتابیانی نووری زانکۆ نوێنەرایەتیی چەند سەعیدێکی لاو دەکەن و، بە ڕاستی ئەرکی سەرشانی "قوتابخانەی زەهراء" چ لە ئەستەمبووڵ و چ لە ئەنقەرەدا ڕادەپەڕێنن و، هیچ ئەرکێك بۆ ئەم سەعیدە لاوازە ناهێڵنەوە)[3].

(ئاشکرایە کە "قوتابخانەی زەهراء" بەهۆی نهێنیی ئیخلاسی ڕاستەقینە و فیداکاریی گەرموگوڕ و دەستبەرداربوون لە خۆپەرستی و نواندنی خۆنەویستیی تەواوەتی لە بازنەی نووردا هەردەم فراوان دەبێت و، ئەم ڕەوشتە جوانانە لەناوەندەکاندا بڵاو دەکاتەوە)[4].

(شوکر و سوپاسی نەبڕاوە بۆ خوای گەورە کە پارێزگای ئیسپارتەی کرد بەو قوتابخانەی زەهرا و مزگەوتی ئەزهەرەی کە لە مێژە ئامانجی ئەندێشەم بووە. چونکە قەڵەمەکانتان جێی چاپخانەیان بۆ پەیامەکانی نوور گرتووەتەوە و، بڵاوبوونەوەی ئەم ژمارە زۆرەی نوسخە بێ هەڵە و خاوەن تەوافوقانەی کە بە ڕۆنیۆ و لە ماوەیەکی کەمدا بڵاوتان کردنەوە)[5].

(لە چەند "پارێزگەیەك"دا دەمبینی ئافرەتان بایەخێکی گەلێ گەرموگوڕ و خاوێن بە "پەیامەکانی نوور" دەدەن. کاتێکیش بۆ جاری سێ‌هەم هاتم بۆ ئەم قوتابخانەی زەهرای

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٧١.
(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی (تورکی): (١٧٨٣/١).
(٣) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٤٧٨/٢.
(٤) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٢٧.
(٥) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٩٤.

مەعنەوی‌یە، کە شاری پیرۆزی "ئیسپارتە"یە، بیستم ئەو ئافرەتە پاك و پیرۆزانەی خوشکانی دوارۆژم چاوەڕوانی ئەوەن دەرسێکیان پێ بلێم)[1].

[یەکێك لە ئەرکانی قوتابخانەی زەهراء دەڵێ:]

(کاتێ کە مامۆستامان بەهۆی نەخۆشی‌یەکەیەوە منی دانا بە بریکاری خۆی بۆ بەدواداچوونی کاروباری "پەیامەکانی نوور" لە دادگاکانی ئەنقەرەدا، ئەم نامە هاوپێچەی خوارەوەمان خستە بەردەست پەرلەمانتارە بەڕێزەکان.

وا ئێستاش بەهۆی بەردەوامبوونی هەمان مەسەلە، سەرلەنوێ پێشکەشی ئێوە و ئەندامانی بەڕێزی پەرلەمانی دەکەینەوە، بە تایبەت دوای ئەو هەولانەی کە لەم مانگانەی دواییدا بۆ دامەزراندنی زانکۆ تازەکەی پاریزگاکانی خۆرهەڵات دراوە:

بڵاوبوونەوەی فراوان و بەربڵاوی "پەیامەکانی نوور" لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوو، چ لە ناوخۆ و چ لە دەرەوەی وڵاتدا و، کاریگەریی باشیان لەسەر خەڵکی..

هەروەها هەوڵدانی بەردەوامی پەنجا و پێنج ساڵ پێش ئێستا بۆ دامەزراندنی زانکۆیەك لە پاریزگاکانی خۆرهەڵاتدا..

ئەمانە دوو مەسەلەی گرنگی یەك لە دوای یەك و تەواوکەری یەکترین و، جێی بایەخی جیهانی ئیسلامین.

چونکە ئەم نەتەوەیە (بە تایبەت خەڵکی پاریزگاکانی خۆرهەڵات) و، چوار سەد ملیۆن کەسی نەتەوەی ئیسلام و، جیهانی نەصرانییەتی موحتاج بە ئاشتی لە سەرتاسەری جیهاندا، بایەخ بەم دوو ئەنجامە مەزن و ڕووداوە گرنگە دەدەن. لەبەر ئەوەی کە دوو سەرچاوەی بەرفراوانن بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی ڕاستی‌یەکانی قورئان.

مامۆستای بەڕێزمان پەنجا و پێنج ساڵ پێش ئێستا بە هیممەتێکی یەکجار بەرز و لە ڕێی بەکارهێنانی گەلێ هۆکارەوە هەوڵی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی وەك زانکۆی ئەزهەر و بە ناوی قوتابخانەی زەهرائەوە لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا داوە و، دەری خستووە کە دامەزراندنی ئەم زانکۆیە گەلێ پێویستە، وەك لە پیرۆزباییەکەیدا بۆ سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران لەم ڕووەوە وتوویەتی:

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و چوارەم، ل: ٤٠٢.

"ئـەو زانکۆیـەی خۆرهـەڵات بـەهۆی ئـەوەی لـە شـوێنێکی نـاوەندیی جیـهانی ئیسلامیدایە، ئەوا پلەوپایەیەکی بەرزی لـەناو موسـڵمانانلدا دەبێـت. چونکـە هـەموو ئـەو خزمەتـە ئایینیـیە مـەزن و بەرزانـەی پێشـین و گشـت ڕەوشـتە مەعنەویـیـە نـەمرەکانی هەزاران باپیری زانا و خواناس و شـەهید و لێکۆڵـەران کـە لـەو پارێزگایانـەدا ئەسپەردە کراون، هەموویان لەو زانکـۆیەدا دەبووژێنـەوە و بەرجەسـتە دەبنـەوە و، لـە فراوانـترین بوار و مەیداندا ئەرکە ئیمانییەکانیان سەرلەنوێ ڕادەپەڕێنن".

ئەو وانە بناغەییەش کە شایانی ئەوەیە بەرنامە و پرۆگرامی ئەو زانکۆیەی خۆرهەڵات بێـت، بریتییـە لـە "پەیامـەکانی نـوور" کـە تەفسـیری ڕاسـتییە ئیمانییـەکانی قورئـانی پیرۆزن و، بەڵگەی ژیری و مەنتیقی و ئیمـانی بـۆ چەسپاندنی مەسـەلە و بابەتـە گـەورە و گرنگەکانی قورئان دەهێننەوە.

کەواتـە ئـەم پەیامـانە شـایانی ئـەوەن کـە لـە زانکـۆ و قوتابخانـە نوێـیـەکاندا بابـەتی خوێندن و لێکۆڵینەوە بن.

"پەیامەکانی نوور" بەهۆی یەکێك لە قوتابیانی مامۆستایان و قوتابخانە ئایینییە زۆر و بڵاوەکـانی سەرانسـەری خۆرهەڵاتـەوە سـەریان هـەڵداوە و، ئـەو سـەرچاوە مەعنەوییانەشیان تەقاندووەتەوە کە مایەی ژیانن.

ئێمە بە هەموو گیان و قەوارەیەکی خۆمان لە میهرەبانیی خواوەنـد ئومێدەواریـن کـە ئـەو مامۆستا بەڕێزانـە سـەرلەنوێ ئەرکـەکانی سەرشـانیان بگرنـەوە ئەستۆ و، لــە ڕێـی بەروبومـە ڕووناکـەکانی ئێسـتای هـەوڵ و کۆششـەکانیانەوە بازنـەی کـارە فیکـری و خزمەتگوزارییە قورئانییەکانیان فراوان بکـەن و، لـەم ڕێـیـەوە بارودۆخـەکانی لەمـەڕ ژیان و کات و شوێن و ئاشتی و ئاسایشی گشـتی، بـۆ هاتنـەدیی ئـەم ئاواتانـەمان، ئامادە بین.

بـەڵێ، "پەیامـەکانی نـوور" کـە تەنـها یـەك بەروبووم و ئەنجامی گـەورە و هەمـەکیی چالاکییـە زانسـتییەکانی خۆرهـەڵاتن، شـایانی ئـەوەن کـە لـە لایـەن کـارگوزارانی ئیسلام و ئەم نەتەوەیە و جیهانی ئیسلامییەوە بایەخیان ئاراستە بکرێت.

بایەخدان بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور لە ئەمریکا و ئەورووپادا و بڵاوبوونەوەیان لەو شوێنانەدا، گرنگیی ئەم داوایەمان دەردەخات). مستەفا صونگور[١].

☐ قوتابخانەی یووسفی هەمان ئامانجی زەهراش دەهێنێتەدی

(چاودێریی پەروەردگار فریام کەوتەوە و، ئەو بەندیخانە سامناکەی بۆ گۆڕیم بە قوتابخانەیەکی نوور و، دەرکەوت کە بە ڕاستی "بەندیخانە" قوتابخانەی یووسفی‌یە! ئەوەبوو پەیامەکانی نوور کەوتنەوە بڵاوبوونەوە و، پاڵەوانانی قوتابخانەی "زەهراء"یش بە قەڵەمە ئەڵماسی و کارامەکانیان دەستیان دایە نووسینەوە و لەبەر گرتنەوەی پەیامەکان)[٢].

(پشت بەخوا قوتابخانەی یووسفیش شوێنێکی پیرۆزی لەمەڕ لێکۆڵینەوەی سەر بە قوتابخانەی "زەهراء" دەبێت)[٣].

(برا بەوەفا و ڕاست و ئازیزەکانم!

مادەم بە نیازی دەستکەوتنی پاداشتی دواڕۆژ و ئەنجامدانی جۆرە پەرستنێکی تایبەتی، پەیوەندیتان بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە - کە پەیامی دواڕۆژ و ئیمانن - ئەوا بێ هیچ گومانێك هەموو یەکێك لە سەعاتەکانی تەمەنتان لەم بار و دۆخ و هەل و مەرجە سەخت و قورسانەی ئێستادا لە حوکمی بیست سەعات خواپەرستیدایە و، بیست سەعاتی کارگوزاریی خزمەتی ئیمان و قورئانیش، لەبەر ئەوەی بە جیهادێکی مەعنەوی دادەنرێت، بایەخ و گرنگیی سەد سەعاتی هەیە و، سەد سەعاتیش کە لە چاوپێکەوتن و بەیەك گەیشتنی چەندین موجاهیدی ڕاستەقینە و چەند برایەکی باشدا بەسەر ببرێت، کە هەریەکەیان بەرامبەر سەد کەسن و.. بەستنی پەیوەندیی برایانە لەگەڵیاندا و.. یارمەتیدانیان بە: هێزی مەعنەوی و.. یارمەتی لێ وەرگرتنیان و.. دڵدانەوەی ئەوان و دڵی خۆدانەوەش پێیان و.. بەردەوامیی دامەزراویی تەواوەتی و پەیوەندیی ڕاستەقینە لەگەڵیاندا بۆ مەبەستی خزمەتگوزاریی ئیمان و.. سوود وەرگرتن و بەهرەوەر بوون لە

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥٦٤-٥٦٦.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٥-٥٢٦.

(٣) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٩٠.

ڕەفتار و ڕەوشتە بەرزەكانيان و.. بەدەستهێنانی شايستەيی قوتابیبوون لە قوتابخانەی زەهرائدا، كە ئەويش بەوە دەبێ مرۆڤ بێتە ناو ئەم كۆڕی ئيمتيحانە لەم قوتابخانە يووسفیيەدا و.. وەرگرتنی ئەو ڕۆزیيەش كە قەدەر بۆ هەر يەكەيانی نووسيوە، بە نيازی پاداشت وەرگرتن..

هەموو ئەمانەی باس كران، داخوازی ئەوەن پڕ بە دڵ شوكرانەبژێری خوای گەورە بن كە ئێوەی گەياندووەتە ئێرە و، پێويستە هاودەم لەگەڵ بيركردنەوە لەو سوودانەی باس كران، لە بەرامبەر هەموو گيروگرفت و تەنگانەكانەوە بەئارام و خۆڕاگر بن)[1].

(چاوپێكەوتنی ئەو خۆشەويستە ڕاستەقينە و ميهرەبانانەی كە زۆر زياتر لە سۆزی برا بۆ برای خۆی ميهرەبانترن، لەم زستانە ماددی و مەعنەوييە دووچەندانەيەدا كە كاروباری تێدا ڕاوەستاوە و لەم قوتابخانە يووسفیيەدا كە يەكێكە لە قوتابخانەكانی زەهراء..

بەيەك شادبوون لەگەڵ برايانی ئاخيرەتدا كە وەكو چەند ڕابەرێكی ئامۆژگار وان، هەروەها سەرلێدانيان و بەهرەمەندبوون لە تايبەتكاريی يەك بە يەكيان و سوود وەرگرتنيش لە كردەوە چاكەكانيان كە بە وێنەی تەشەنەكردنی نوور و ڕووناكی لە ماددە ڕوونەكاندا، پەرە دەسێنێت و بڵاو دەبێتەوە، ئەمانەش بەوپەڕی ئاسانی و هەرزانی و بە چەند ئەركێكی تابلێی كەم..

سەرەڕای سوود و يارمەتی وەرگرتن لە هاوكارییە مەعنەوييەكانيان و شادمانی و دڵدانەوەكانيان..

هەموو ئەمانە، كارێك دەكەن كە ئەم گرفت و تەنگانەيە شێوەی خۆی بگۆڕێت بە جۆرە دیمەنێكی چاودێريی مەعنەويی پەروەردگار)[2].

(١) تيشكەكان، تيشكی سيازدەهەم، ل: ٤٨٦-٤٨٧.

(٢) تيشكەكان، تيشكی سيازدەهەم، ل: ٤٩١.

# بەندی سێهەم

## سەرەتای وەرچەرخان لە مێژووی ژیانیدا

## ساڵی ١٩٠٨ز/١٣٢٦ك

☐ ڕاگەیاندنی "مەشرووتیەت" [١] و، ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی

(مەشرووتیەت دەرخەر و ڕاڤەکاری ئەم دوو ئایەتەیە:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)..

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُم﴾ (الشورى: ٣٨)..

کەواتە مەشرووتیەت "شووڕای شەرعی"یە. هێزی ئەو بوونە ڕووناکەش بریتی‌یە لە "حەق" و.. ژیانەکەی "دادگەری"یە و.. دڵیشی بریتی‌یە لە "زانین" و.. زمانەکەی "خۆشەویستی"یە و.. ژیری‌یەکەشی بریتی‌یە لە "یاسا" نەك هیچ کەسێك) [٢]!

(گیانی "مەشرووتیەت" بریتی‌یە لەوەی کە هێز لە یاسادا بێت و، فەرمان و نەهی بە دەستی حەق بێت و، مرۆڤیش خزمەتگوزار بێت) [٣].

---

(١) مەبەست لە "مەشرووتیەت" ڕاگەیاندنی سیستەمی پەرلەمانی‌یە لە دەوڵەتی عوسمانیدا و، بەو پێ‌یە وەزارەت دەبوو لە بەردەم پەرلەماندا – نەك سوڵتان – بەرپرس بێت. هەروەك ئەرکی یاسادانانیش کەوتە ئەستۆی پەرلەمان. سوڵتان عەبدولحەمید دوو جار "مەشرووتیەت"ی ڕاگەیاندووە. یەکەم جار لە سەرەتای حوکمی خۆیدا کە پێی دەوترێت "مەشرووتیەتی یەکەم" و لە بەرواری ١٨٧٧/٣/١٩دا بووە. بەڵام لەبەر ئەوەی پەرلەمانتارە ناموسڵمانەکان ئەنجومەنەکەیان بۆ ئامانجەکانی خۆیان قۆزتەوە و لە هەمان ساڵدا دەوڵەتی عوسمانی‌یان گرفتاری جەنگێکی سەخت کرد لەگەڵ ڕووسیادا و، لەبەر پەیوەندی‌یەکانی ئەو ئەندامانەی پەرلەمان بە کۆمەڵە نهێنی‌یە چەکدارەکان و دەوڵەتە بیانی‌یەکانەوە، سوڵتان ئەم ئەنجومەنەی هەڵوەشاندەوە، بە بێ ئەوەی خودی مەشرووتیەت هەڵبووەشێنێتەوە. پاشان لە ١٩٠٨/٧/٢٣زدا جارێکی تر مەشرووتیەتی هێنایەوە گۆڕێ کە پێی دەوترێت "مەشرووتیەتی دووهەم". ئەوەش هەتا هودنەی مۆندرۆس لە ١٩١٨/١٠/٣٠ز بەردەوام بوو.

(٢) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٢٩٤.

(٣) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٠٤.

(مەشرووتیەت بریتی‌یە لە فەرمانڕەوایی نەتەوە. خۆ حکوومەتیش لە خزمەتکار زیاتر شتێکی تر نی‌یە.. ئەگەر مەشرووتیەت بە ڕاستی پیادە بکرێت، ئەوا قایمقام و پارێزگار لە خزمەتکارێکی کرێ گرتە بەولاوە زیاتر نین)[1].

□ "مەشرووتیەت" و ئازادی"ی شەرعی، یاخود "ئیستیبدادێکی نوێ"

(هەڵگرانی هزر و بیرە بێ کەڵکەکان دەیانەوێت لە ژێر پەردەی سەربەستی و ئازادیدا خۆسەپاندن و ستەمکاری بالادەست بێت.

جا بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەو خۆسەپاندنانەی کە لە گۆڕی ڕابوردوودا ئەسپەردە کران و ئەو ستەمکاری‌یانەش کە لافاوی ڕۆژگار ڕایماڵین، نەیانبینینەوە.. دەمەوێ بەربەستێکی ئاسنین لە نێوان ڕابوردوو و داهاتوودا بنیات بنێم، ئەوەش بە ڕوونکردنەوەی " مێژووی ژیانی سەربەستی"..

بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەم ڕۆڵەی "سەربەستی"یەی کە ئەم ئالوگۆڕە بوویەتی، گەر بیخاتە باوەشی شوورای شەرعی‌یەوە بۆ پەروەردە و بەخێوکردنی، ئەوا شانازی‌یەکانی ڕابوردووی ئەم نەتەوەیە بە شێوەیەکی بەهێز و دەستەڵاتدار زیندوو دەکاتەوە. بەڵام گەر ئەو سەربەستی‌یە لەگەڵ ئامانجە کەسی‌یەکاندا بکەونە یەك، ئەوا دەبێت بە ئیستیبدادێکی ڕەها)[2].

(ئەی ڕۆڵەکانی نیشتمان!

نەکەن بە هەڵە و شێوەیەکی خراپ سەربەستی لێك بدەنەوە، با لە دەستمان دەرنەچێت.. بە دەرخواردانی کۆیلایەتی‌یە بێ کەڵکەکەی پێشوو، لە دەفرێکی تردا، مەمان خنکێنن[3])[4].

---

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٤١.

(٢) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٩.

(٣) بەڵێ، بە ئیستیبدادێکی ترسناکتر و توندوتیژتر، کۆیلایەتی‌یەکی یەکجار لەوە ژەهراوی تریان دەرخوارد داین. (دانەر)

(٤) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٧.

(چونکە تەنها بە چاودێری کردنی فەرمان و دابەکانی شەریعەت و، ڕەفتار کردن بە ڕەوشتە جوانەکان، سەربەستی و ئازادی پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات.

بەڵگەی درەخشانیش لەسەر ئەم دەعوایە، بریتی‌یە لەو سەربەستی و دادگەری و یەکسانی‌یەی کە وێڕای وەحشیگەری و خۆسەپاندنی نەفرەت لێکراوی ئەو قۆناغەی مێژوو، کەچی سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکانی - خوایان لێ ڕازی بێت - ڕازاندبووەوە)[1].

(لە سەرەتای ڕاگەیاندنی "سەربەستی"دا نزیکەی پەنجا شەست بروسکەم لە ڕێی دیوانی سەرۆکایەتیی وەزارەتەوە بۆ هۆزە کوردەکان نارد. ناوەرۆکی ئەو بروسکانەش بریتی بوو لەوەی کە:

"ئەو مەسەلەیەی بیستووتانە، کە مەشرووتیەت و یاسای بنەڕەتی‌یە، لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە دادگەریی ڕاستەقینە و شوورای شەرعی. ئێوە بە نیازێکی باش وەری بگرن و هەوڵی پاراستنی بدەن، چونکە بەختەوەریی دنیامان بەندە بە "مەشرووتیەت"ەوە. ئەوەبوو ئێمە لە هەموو کەسێ زیاتر تاڵی و سوێریمان لە دەستی "ئیستیبداد" چەشت".

وەڵامی ئیجابیی ئەو بروسکانەم لە هەموو شوێنێکەوە بۆ هاتەوە. بەو واتایەی کە من کوردەکانم بێدار کردەوە و نەمهێشت لێی بێ ئاگا بن و ئیستیبدادێکی نوێ بیانخەڵەتێنێت)[2].

(لە یەك بە یەکی مزگەوتەکانی: "ئەیاصۆفیا و بایەزید و فاتیح و سولەیمانییە"دا چەندین وتارم ئاراستەی زانایان بە گشتی و زۆر کەس لە قوتابیانی شەریعەت کرد و، پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان شەرعی ڕاستەقینە و مەشرووتیەتم دەرخست و، ئەوەشم ڕوون کردەوە کە ئیستیبدادی خۆسەپێن هیچ پەیوەندی‌یەکی بە شەریعەتی خاوێنی ئیسلامەوە نی‌یە. شەریعەت بۆ ئەوە هاتووە کە سەرانسەری جیهان هیدایەت بدات، تاکو خۆسەپاندنی ستەمکاران و ئیستیبدادیان نەهێڵێت)[3].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٧.

(٢) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٣.

(٣) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٣-٤١٤.

هەروەها وتم: (ڕێبازی ڕاستەقینەی شەریعەت لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە حەقیقەتی "مەشرووتیەت"ێك كە مەشرووع و ڕەوا بێت.

بەو واتایەی كە من بە مەشرووتیەتێك ڕازیم بەڵگەكانی شەرع پشتی بگرێت، نەك بەو جۆرەی كە هەندێ لە هەڵگرانی بانگەشەی شارستانێتیی خۆرئاوایی پێی ڕازین. چونكە ئەوانە بە چەشنێكی چاولێكەری وەریان گرتووە و بە پێچەوانەی شەریعەتیش لێی تێگەیشتوون. بۆیە من هەرگیز دەستم لە شەریعەت هەڵنەگرت و نەمدا بە بەرتیل بۆ هیچ شتێك)[1].

(چونكە كاتێ مەشرووتیەت لەسەر تەخت و عەرشی هزر و بیرەكان دانیشت، پەت و گوریسی قایمی نەتەوایەتیی ڕاتەكاند و، "ئیسلام"یش - كە دەستاوێزێكی مەحكەمە - لە لایەنی خۆیەوە ڕاتەكانی پێ كەوت و، هەموو موسڵمانێك تێگەیشت لەوەی كە بەری بۆ بەرەڵا نەكراوە، بەڵكو بە چەند هۆكارێكی وەك: بەرژەوەندی و، سوودی هاوبەش و، هەستی موجەڕڕەد، پەیوەستی كەسانی ترە. لەبەر ئەوەی موسڵمانان بە وێنەی یەك هۆز و تیرە وان هەموویان پەیوەندی‌یان بە یەكترەوە هەیە)[2].

(ئەورووپا وا گومان دەبات كە "شەریعەت" هێز و پێز بە ئیستیبداد دەدات و پشتی دەگرێت..

نەخێر هەرگیز وا نی‌یە.. لە ڕاستیدا ئەو نەزانی و دەمارگیری‌یەی لەناو ئێمەدا بڵاوبووەتەوە، یارمەتیی ئەورووپایان داوە كە لەو گومانە هەڵەیەدا بێت گوایا شەریعەت یارمەتیدەری ئیستیبدادە. بۆیە لە ناخی دڵەوە گەلێ ئازارم بەم گومانە هەڵەیە چەشت كە بەرامبەر شەریعەت هەیانە.

جا من بۆ ئەوەی گومانەكەیان بەدرۆ بخەمەوە، ئەوا لە هەموو كەس زیاتر بە ناوی شەریعەتەوە چەپڵەم بۆ "مەشرووتیەت" لێدا..

بەڵام ترسم لێ نیشت كە ئیستیبدادێكی تر بەرپا ببێت بۆ پشت ڕاستكردنەوەی ئەو گومانەی ئەورووپایی‌یەكان..

---

(١) داوەری‌یەكان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٤.

(٢) داوەری‌یەكان، مونازەرات، ل: ٣٦٥.

لەبەر ئـەوە، بـە هـەموو هێزێکمـەوە لـە وتـارێکمدا لـە مزگـەوتی ئـەیاصۆفیا بـە پەرلەمانتارەکانم وت:

"مەشرووتیەت" لە ڕووناکیی "مەشرووعیەت"دا وەربگرن و، لەسـەر ئـەو بناغەیـەش لێی تێبگەن و، خەڵکیشی لـێ تێبگەیـەنن، تـاکو دەستی چەپەڵی ئیستیبدادێکی نوێ و پەنهان و خوانەناس لەکەداری نـەکات و، ئـەو بارودۆخـە خـاوێن و پیرۆزە بۆ مەبەستە کەسی‌یەکانی خـۆی وەك قـەڵغانێك بـەکار نـەهێنێت. هـەوڵ بـدەن کـە "سەربەستی" بـە "ئادابی شـەرع"ەوە گـرێ بـدەن، دەنـا عـەوامی خـەڵکی و نەزانـەکان دەبـن بـە کەسـانی هەرزە و چەتە و ملنەدەر. ئەو کاتەش کە سەربەستیی بێ قەید و شەرتیان پـێ درا، مـل بـۆ فەرمانـەکان کـەچ ناکـەن.. بـا قیبلـەتان لـە نوێـژی "دادگـەری"دا لەسـەر هـەر چـوار مەزهەبەکە بێت، تاکو ئەو نوێژەتان دروست بێت، چونکە من ئەو دەعوایەم ڕاگەیاند کە چ بە "ڕاشـکاوی" و چ بـە جۆرێکـی "نـاوەکی و ڕوخسـەت وەرگرتـن" دەتوانرێـت ڕاستی‌یەکانی "مەشرووتیەت" لە چوار مەزهەبەکان دەربهێنرێت)[١].

پاشان (هۆی شەیدا بوونم بە "واتا"ی مەشرووتیەت، ئەوەیە کە لەو بـاوەڕەدام یەکـەم دەروازەی پێشـکەوتنی ئاسـیا و جیـهانی ئیسـلامی لـە ئـایندەدا بریتی‌یـە لـە "مەشرووتیەت"ێك کە ڕەوا بێـت و، "سەربەستی"یـەك کـە لـە چوارچێوەی شـەریعەتدا بێـت.. کلیلـی بەختـەوەری و پێشـکەوتنی موسـڵمانانیش لـەو "شـورا"یەدایـە کـە "مەشرووتیەت" لە خۆی دەگرێت. چونکە - تا ئێستا - سـێ سـەد ملیـۆن موسـڵمان لـە ژێر پێی ئیستیبدادی مەعنەویی بیانی‌یەکاندا پلیشاونەتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئێستا فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام لە جیهاندا - بـە تایبـەت لەمـەودوا لـە ئاسیادا - زاڵە، ئەوا هەموو موسـڵمانێك بەشێکی ڕاستەقینەی لـەو فەرمانڕەوایەتی‌یـەدا هەیە. هەروەها ڕێگا چارەی ڕزگار کردنی سێ سـەد ملیـۆن موسـڵمان لـە دیلـی، تەنـها "سەربەستی"یە. خۆ ئەگەر بە گریمانی مەحاڵیش لە کاتی دامەزراندن و سەقامگیر کردنی "سەربەستی"دا بیست ملیۆن کەس زیانیان پێ بگات، ئەوا با ئەو زیانە ببێت بە قوربـانیی ئەو ئامانجە، چونکە بیست دەبەخشین و سێ سەد وەردەگرین.

---

(١) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٦-٤١٧.

بە داخەوە کە ڕەگەز و نەتەوەکانی لای ئێمە بە وێنەی بەشەکانی هەوا لەگەڵ یەکدا تێکەڵ بوون و، هێشتا وەکو بەشەکانی ئاو ئاوێتەی یەکتری نەبوون..

لەمەولا ئەم ڕەگەز و نەتەوانە، بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە، بە تەواوی تێکەڵی یەکتر دەبن، کە ئایینێکە بە وێنەی تەزووی کارەبا کاریان تێدەکات. پشت بە خوای گەورە ئاوێتەی ئەو دادگەرییە بەویژدانەی کە لە گەرمی و تینی نووری زانستە ئیسلامییەکانەوە سەری هەڵداوە، دێتە کایەوە.

دەسا هەر بژی "مەشرووتیەتی ڕەوا"..

ئەو "سەربەستی"یە ڕووناکەش هەر بەردەوام بێت کە ڕێنمایی لە پەروەردەی ڕاستیی شەریعەت وەردەگرێت[1])[2].

(بە بێ نیازی شانازی کردن دەڵێم:

"ئێمەی کورد دەخەڵەتێنرێین، بەڵام کەس ناخەڵەتێنین و لە پێناوی ژیانێکدا [واتە ژیانی دنیا] دانابەزینە ئاستی درۆکردن"..

چونکە دەزانین کە "فێڵ لەوەدایە واز لە فێڵ بهێنرێت"!

بەڵام من لەبەر ئەوەی پەیمانم بە مەشرووتیەتی ڕاستەقینە و ڕەوا داوە، گەر ئیستیبدادم بێتە ڕێ - هەر پۆشاکێکی لەبەردا بێت - زللەی تێ دەسرەوێنم، تەنانەت گەر بەرگی مەشرووتیەتیشی پۆشیبێت، یاخود ناوی ئەوی هەڵگرتبێت!

من لەو باوەڕەدام دوژمنانی مەشرووتیەت ئەوانەن کە شێوەکەی دەشێوێنن و، بە شتێکی پێچەوانەی "شەریعەت"ی پیشان دەدەن و، بە وێنەی ستەمکارێك دەری دەخەن. بەم کارەیان دوژمنانی "شوورا" زیاد دەکەن..

لە کاتێکدا کە دەستوورێکی چەسپاو هەیە دەڵێت:

"بە گۆڕینی ناو ڕاستییەکان ناگۆڕێن")[3].

---

(١) تا ئێستا ئەم ئومێد و هیوا سیاسییانەت مایەپووچ دەرچوون. بە پشتیوانیی خوا لە داهاتوودا بە شێوەیەکی تر دەردەکەون. (دانەر)

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٤٧-٤٤٨.

(٣) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٢.

❑ دیدارێك لەگەڵ موفتیی میسردا:

(لە یەکەم ساڵی سەردەمی سەربەستیدا "شێخ بەخیت"ی موفتیی میسر[١] لە "سەعیدی کۆن"ی پرسی:

"ڕات چۆنە سەبارەت بەم سەربەستی‌یەی دەوڵەتی عوسمانی و، شارستانێتی ئەوروپا"؟

سەعیدی کۆن وەڵامی دایەوە:

"دەوڵەتی عوسمانی سکی بە دەوڵەتێکی ئەوروپایی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەزێت..
ئەوروپاش سکی بە ئیسلامەتی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەبێت"!

شێخی بەڕێز وتی: "منیش تەسدیقی قسەکەی دەکەم"!

پاشان بە زانایانی دەوروبەری خۆی وت:

"من مونازەرەی ئەم لاوە ناکەم و ناتوانم بەسەریدا زاڵ بیم".

ئەوەبوو دوایی بە چاوی خۆمان لەدایکبوونی یەکەمان بینی، کە بریتی بوو لەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە دوورکەوتنەوەیدا لە ئایین چارەکە سەدەیەك پێش ئەوروپا کەوتەوە!

بەڵام لەدایکبوونی دووهەم – پشت بە خوا – دوای نزیکەی سی ساڵێك دێتە دی و، چ لە خۆرهەڵات و چ لە خۆرئاوادا دەوڵەتێکی ئیسلامی پەیدا دەبێت)[٢].

❑ وتارێك بۆ سەربەستی[٣]:

(ئەی سەربەستیی شەرعی!

---

(١) ناوی شێخ "محەممەد بەخیتی کوڕی حسەینی موتیعی"ی حەنەفی‌یە. لە نێوان ساڵەکانی: (١٢٧١-١٣٥٤ك/١٨٥٤-١٩٣٥ز)دا ژیاوە. لە شارۆچکەی "موتیعە"ی سەر بە پارێزگای "ئەسیووت"ی میسر لەدایك بووە. لە ئەزهەر خوێندوویەتی و، دوایی لەوێ بووە بە مامۆستا. هەر لەو ماوەیەشدا سەردانی ئەستەمبوولی کردووە. ساڵی ١٢٩٧ك بووە بە مامۆستای قەزای شەرعی. پەیوەندیی بە سەیید جەمالەدینی ئەفغانی‌یەوە کردووە، بەڵام نەیاری ئەو بزووتنەوەی چاکسازی‌یە بووە کە شێخ محەممەد عەبدە ئەنجامی داوە. لە نێوان ساڵەکانی (١٣٣٣-١٣٣٩ك/١٩١٤-١٩٢١ز)دا موفتیی وڵاتی میسر بووە. زیاد لە پازدە بەرهەمی بەنرخی نووسیوە. بڕوانە: (الأعلام للزركلي ٦/٥٠) ط٥، ١٩٨٠م، بيروت، دار العلم للملايين. (وەرگێڕ)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٥٥١.

(٣) مامۆستا نوورسی لە سێهەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی "سەربەستی"دا ئەم وتارەی لە ئەستەمبووڵ بە ئیرتیجالی ئاراستە کردووە، پاشان لە گۆڕەپانی ئازادی لە شاری "سەلانیك" دووبارەی کردووەتەوە. لێمە لێرەدا چەند بڕگەیەکمان لێ هێناوە. هەرکەس دەیەوێت هەمووی ببینێت با لەم سەرچاوەیەدا دەقە تەواوەکەی بخوێنێتەوە: داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٣-٦١٧

گوێم لێیە کە تۆ بە دەنگێکی دلێر بانگمان دەکەیت.. بەڵام دەنگێکی خۆش و سازگار کە مژدەیەکی خۆشی پێیە و، کوردێکی گوندنشینی وەك منی پێ بێدار دەکەیتەوە کە لە ژێر چینەکانی بێ ئاگاییدا خەوی لێ کەوتووە. گەر تۆ نەبوویتایە من و سەرجەمی نەتەوەش لە بەندیخانەی کۆت و دیلیدا دەماینەوە..

من مژدەی تەمەنیکی بێ کۆتاییت دەدەمێ.

خۆ ئەگەر شەریعەت - کە کانیاوی ژیانە - بکەیت بە سەرچاوەی ژیان و لەو بەهەشتە دڵگیر و خەملاوەدا گەشە بکەیت، ئەوا مژدەیەکی تر رادەگەیەنم کە ئەم نەتەوە ستەم لێکراوە هەزار هێندەی حاڵی رابوردووی پێش دەکەوێت..

جا ئەگەر نەتەوە تۆ بە رابەری خۆی پەسەند بکات و، بە ڕەنگی ئامانجە کەسییەکان و حەزی تۆڵە سەندنەوە ڕەنگاوڕەنگت نەکات، ئەوا ئیتر ئەو کەسەی کە خاوەنی گەورەیی و منەت لێنانە ئێمەی لە گۆڕی ستەم و بێزاری دەرهێناوە و، بۆ ناو بەهەشتی یەکێتی و خۆشەویستی بانگهێشتی کردووین..

ئەم یەکێتییە، واتە یەکێتیی دڵان و خۆشویستنی سەرجەمی نەتەوە لە بازنەی شەریعەتدا، کە کانگای بەختەوەری و ئازادییە، خوای گەورە بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر پێی بەخشیوین، لە کاتێکدا نەتەوەکانی تر دوای بەخشینی ملیۆنەها گەوهەری بەنرخی مرۆڤەکان بەدەستیان هێناوە.

زایەڵەی "سەربەستی" و "دادگەری" لە فووی ئیسرافیل دەکات و، ژیان لە ناو هەست و نەستی شارستانێتیی ئێمە و ئاواتە کپ بووەکانمان و حەز و ئارەزووە نەتەوەییە بەرزەکانمان و ڕەوشتە ئیسلامییە جوانەکانماندا دەبووژێنێتەوە، بە ڕادەیەك کە گوێی زەویی حاڵ لێهاتووی چەشنی موریدی مەولەوی دەزرنگێتەوە و، سەرجەمی نەتەوە دەهەژێنێت و، بە وێنەی کەسێکی جەزبە لێهاتوو ڕایدەوەشێنێ.

دەسا ئەی برایانی نیشتمانم!

نەکەن جارێکی تر بە هەرزەیی و پشتگوێ خستنی ئایین بڕیاری مردنی بۆ دەر بکەن. ئەو یاسا بنەڕەتییەی کە لە سەر بناغەی ئەم شەریعەتە خاوێنە دامەزراوە، بووە بە مەلائیکەتی گیان کێشانی سەرجەم بیر و هزرە بێ کەڵك و ڕەوشتە ناشیرین و پلانە شەیتانی و ڕیا نزمەکان.

دەسا برایانی بەپەرۆشی نیشتمان!

هەرگیز بە ئیسراف و رەفتاری پێچەوانەی شەریعەت و تام و چێژە حەرامەکان، ژیان بە بەر ئەو شتە نزمانەدا مەکەنەوە..

کاری پێچەوانەی ئەمە و لێکدانەوەی "سەربەستی" و "کار پێکردنی" بەو تێگەیشتنەی کە رزگاربوون بێت لە پابەندی بە یاسا و، نوقم بوون بێت لە هەرزەیی و چێژ و لەزەتە ناڕەواکان و هەڵەخەرجی و ئیسرافدا و، شکاندنی سنووری هەموو شتێك بێت لە پێناوی هەوا و ئارەزووی دەرووندا..

کاری لەم جۆرە، وەك رەفتاری ئەو کەسە وایە کە خۆی لە دیلیی دەسەڵاتی یەك پادشا دەرباز دەکات و، دەڕواتە ژێر ركێفی خۆسەپاندنی چەندین کەسی نزمی بێ نرخەوە! ئەمە وێڕای ئەوەی کە تێگەیشتنی لەم شێوەیە بۆ "سەربەستی" دەری دەخات کە ئەم نەتەوەیە نائاوزێ و، هێشتا لە قۆناغی منداڵیدایە و، شایانی "سەربەستی" نییە. کەواتە هەرزەیە و، دەبێ مامەڵەکردنی لێ قەدەغە بکرێت. ئەوەش بە گێڕانەوەی بۆ ژێر دەسەڵاتی ئیستیبدادی پێشوو..

لە سەر بناغەی ئەمانەی رابورد:

ئێمە نابێ بخەڵەتێین، بەڵکو دەبێ ئەم یاسایەی خوارەوە بکەین بە یاسای کارمان، کە بریتییە لە: "خُذ ما صفا دع ما كدر"..

ئیتر لەبەر رووناکیی ئەم دەستوورەدا بە سوپاسەوە ئەو زانست و پیشەسازییانە لە بیانییەکان وەردەگرین کە یارمەتیی پێشکەوتنی شارستانیمان بدات. بەڵام داب و رەوشتە خراپەکان لە راستیدا بریتین لە گوناهـ و خراپکارییەکانی شارستانێتی، کە لەبەر ئەوەی چاکەکارییە زۆرەکانی شارستانێتی دەورەی داون چەپەڵی و ناشیرینییان بە زۆری دەرناکەوێت.

جا ئەگەر ئێمە بەهۆی بەدبەختی و خراپیی هەڵبژاردنمانەوە، بە وێنەی منداڵ، ئەو شتانە لە شارستانێتی وەربگرین کە لەگەڵ هەوا و ئارەزووەکاندا یەکدەگرن و، واز لە چاکەکارییەکانی شارستانێتی بهێنین کە بۆ بەدەستهێنانی دەبێ هەوڵ و تەقالا بدەین، کتومت وەکو پیاوی ژنانی و ژنی نێرەکوڕەمان لێ دێت و دەبینە گاڵتەجاڕی خەڵك،

چونکە هەروەك ژن ئەگەر پۆشاکی پیاوان و پیاویش پۆشاکی ژنان بپۆشێت دەبێتە مایەی گاڵتە و سووکایەتی، ئێمەش وەهامان لێ دێت.

کەواتە نابێ مەردی خاوەن هیممەتی بڵند بە وێنەی خانمێکی بەناز وابێت کە بە هۆکارەکانی ئارایشت ڕازێنرابێتەوە..

دەبێ ئێمە لە بواری شارستانێتیدا چاو لە ژاپۆنی‌یەکان بکەین؛ ئەوەتا پارێزگاریی داب و نەریتە نەتەوەییەکانی خۆیان کردووە کە هۆکاری مانەوەیانە و، لە هەمان کاتدا چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتیشیان لە ئەورووپا وەرگرتووە.

جا مادەم داب و نەریتە نەتەوەییەکانمان لە ئیسلامەوە پەیدا بووە و هەر بە ئیسلامیش گەشە دەکات، ئەوا پێویستی وا دەخوازێ کە بە توندی لە دوو ڕووەوە دەست بە ئیسلامەوە بگرین..

ئێمە ئومێدێکی گەورەمان بەوە هەیە کە کێڵگەی ئەنادۆڵ و ڕۆمەلی گەلێك لاوی بەغیرەت بەرهەم بهێنێت. بێ گومان وڵاتەکانی قەڵەمڕەوی عوسمانی شوێنی پەیدا بوونی پێغەمبەران و لانکی دەوڵەتە خاوەن شارستانێتی‌یەکان و هەڵاتگەی خۆری ئیسلامە.

جا ئەگەر ئەم توانا و لێهاتنانەی کە لە سروشتی مرۆڤایەتیدا ڕیشکی داکوتاوە بە باراناوی سەربەستی گەشە بکات، ئەوا دەبێت بە درەختێکی تووبای درەخشان و، لق و پەلەکانی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکاتەوە و، خۆرهەڵات دەکات بە هەڵاتگەی خۆری ڕووناکی بەخش بۆ خۆرئاوا، بە مەرجێ مۆرانەی "تەمبەڵی" کرمۆڵی نەکات و، ژەهری "ئامانجە کەسی‌یەکان"یش تێکی نەدات و نەیشێوێنێت..

شەریعەتی خاوێن لەبەر ئەوەی لە لایەن گوفتاری ئەزەلی‌یەوە هاتووە، ئەوا بەرەو ئەبەدیش دەڕوات. چونکە درەختی "مەیلی بەرەو کامڵ چوون" بە ڕێژەی خۆراك وەرگرتنی لە پوختەی توانای "بەدوای یەکدا هاتنی هزرەکان" گەشە دەکات، کە دەستکەوت و بەرهەمی مەیلی پێشکەوتنە لە مرۆڤدا، کە ئەویش لقی "بوون"ە.

بەڵگەی درەخشان لەسەر ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە شەریعەت بە وێنەی گەشەکردنی زیندەوەر گەشە دەکات و فراوانی بەدەست دەهێنێت[1].

---

(١) ئاشکرایە مەبەستی دانەر "فیقهی شەریعەت" و "بوارەکانی جێبەجێ کردنیەتی". دەنا "شەریعەت" بۆ خۆی کاملە، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُم﴾ (المائدة:٣). (وەرگێڕ)

جا ئەو سەربەستی و دادگەری و یەکسانی‌یەی کە باشترین سەدەکان و سەردەمی چوار جێنشینەکان لە سایەیدا دەژیان، بە تایبەت لەو کات و ڕۆژگارەدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی پاکی ئیسلام سەرجەم پەیوەندی‌یەکانی یەکسانی و دادگەری و ئازادیی ڕاستەقینەی لە خۆیدا کۆکردووەتەوە..

ئاسەوارەکانی ئیمامی عومەر و ئیمامی عەلی و صەلاحەددینی ئەیووبیی کوردی - خوایان لێ ڕازی بێت - باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم دەعوایە.

ئا لێرەوە من بڕیارێکی بێ گومان دەدەم کە:

دواکەوتن و نزمبوونەوە و بەدحاڵیی ئێستامان، ئەنجامی ئەم چوار هۆکارەی خوارەوەیە:

١- چاودێری نەکردنی فەرمانەکانی شەریعەتی خاوێن.

٢- هەڵسوکەوتی هەڕەمەکیی هەندێ کەس لە مەراییکەران.

٣- دەمارگیریی نەفرەت لێکراوی نابەجێ، ئیتر چ لە لایەن زانایەکی نەزان و چ لە لایەن نەزانێکی زاناوە بێت.

٤- لاسایی کردنەوەی تووتی ئاسا بۆ خراپکاری‌یەکانی شارستانێتیی ئەورووپا، بەهۆی بەدبەختی، یان بەهۆی خراپ هەڵبژاردنی خۆمان. هەر ئەمەش بوو بەهۆی وازهێنانمان لە چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی، کە بە چەندین گیروگرفت و دەردیسەری بەدەست دێن.

جا ئەگەر کارمەندان بە ڕێکوپێکی ئەرکەکانی سەرشانیان جێبەجێ بکەن و، خەڵکانی تریش بەپێی بارودۆخی دەوروبەر و خواستی زەمان و ڕۆژگاری ئێستا تێبکۆشن، ئەوا هیچ کەسێك کاتی زیادی لێ نامێنێتەوە کە لە هەرزەییدا بەسەری بەرێت.. خۆ ئەگەر هەرکامیان خۆی بە کاری هەرزەییەوە سەرقاڵ بکات، ئەوا دەبێت بە میکرۆبێکی ترسناك لە جەستەی کۆمەڵگادا..

هەروەك مەحاڵە بە یەکجار جەستەی زیندەوەر هەڵبووەشێتەوە و ببێتەوە بە گەردیلەکان..

هەر بەو جۆرەش مەحالە بە کتوپڕی و بە یەکجاری ئەو جەستەیە لە گەردیلەکان پێکبێت.

لەبەر ئەوە، لابردنی کارمەندەکانی پێشوو لە جەستەی دەوڵەت و دانانی کارمەندانی نوێ لە جێیاندا کارێکی دژوارە، گەر نەڵێم مەحالە..

ئاشکراشە جەستەی دەولەت دواتر ئەو کارمەندانە لادەبات کە چەپەڵییەکی ئەوتۆیان لە خۆدا شاردووەتەوە چاکسازی هەڵنەگرێت، بەڵام دەرگای تۆبە و پەشیمانی بۆ ئەوانەیان لەسەر پشتە کە دەگونجێت چاکسازییان تێدا بکرێت، بە مەرجێك خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت.

ئەوانە دەبێت سوود لە ئەزموونیان وەربگیرێت، چونکە پڕکردنەوەی شوێنەکانیان بە کارمەندانی نوێ چل ساڵی تر دەخایەنێت.

دەنا زمان درێژ کردن بە خراپی بۆ هەموویان و سووکایەتی پێ کردنیان کارێك دەکات یەکێتیی ئەم نەتەوە مەزنە دووچاری پەتایەکی ترسناك و کوشندەی هزر و بیرە بێ کەڵك و ڕەوشتە خراپەکان بکات)[1].

❑ لەگەڵ "عەمانۆئیل قەرەصۆ"[2]دا:

"عەمانۆئیل قەرەصۆ"ی جوولەکە، لە هەوڵێکدا بۆ کارکردنە سەر "بەدیعوززەمان" ویستی چاوی پێی بکەوێت. ئەویش لاریی لەم چاوپێکەوتنە نەبوو. بۆیە ڕۆشت بۆ لای "بەدیعوززەمان". بەڵام زۆری نەخایاند ئەم جوولەکەیە دیدارەکەی بەجێ هێشت و، لە ترسی کاریگەریی کەسایەتیی "بەدیعوززەمان" بە پەلە هەڵهات! هێندە پەشۆکابوو خەریك بوو باوەڕ بە خۆیشی نەکات کاتێ کە وتی:

"ئەم پیاوە سەرسووڕهێنەرە خەریك بوو بە قسەکانی خۆی کارم تێبکات و بمخاتە ناو ئایینی ئیسلامەوە"[3]!

---

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٠٣-٦١٧.

(٢) ئەندامێکی بلندی مەحفەلی ماسۆنی و سەرۆکی حاخامەکانی ئەستەمبووڵ و نوێنەری شاری سەلانیك بووە لە پەرلەماندا. لە دواییدا ڕۆڵێکی کاریگەری بووە لە ڕووداوی لەسەر کار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا!

(٣) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

❐ هەڵوێستەکانی بەرامبەر "جۆن تورك"[١] و "ئیتتیحاد و تەرەقی"[٢]

[ مامۆستا نوورسی یەکەم جار مرۆڤە باشەکانی ئەوانی بە چاك زانیوە، وەك لە گفتوگۆکەی لەگەڵ هۆزەکاندا (پەیامی مونازەرات) بە ڕوونی دەردەکەوێت: ]

(پرسیار: ئێمە لە مێژە و تا ئێستاش دەبیستین کە زۆربەی ئەندامانی "جۆن تورك" ماسۆنین، کە دوژمنایەتیی ئایین دەکەن؟

وەڵام: ئیستیبداد لە پێناوی هێشتنەوەی خۆیدا ئەم جۆرە پروپاگەندانەی خستووەتە ناوتانەوە[٣]! بایەخ نەدانی هەندێکیان بە ئایین، پشتی ئەم گومانەی گرتووە و هێزی داوەتێ!

بەڵام دڵنیا بن! ئەوانەیان کە نەرۆشتوونەتە ناو ماسۆنییەتەوە، ئامانجیان زیان گەیاندن نی‌یە بە ئایین، بەڵکو خزمەت کردن و دابین کردنی ئاسایشی نەتەوەیە. بەڵام هەندێکیان

---

(١) جۆن تورك (تورکیای لاو) لە دەستەواژەی (Jeunes Turces)ی فەرەنسی وەرگیراوە. ئەم ناوە بەو کۆمەڵ و کەسانە وتراوە کە هەر لە سەردەمی سولتان عەبدولعەزیزەوە نەیاری ڕژێمی فەرمانڕەوا بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا. پوختەی داواکاری‌یەکانی ئەم کۆمەڵ و کەسانە بریتی‌یە لە ڕاگەیاندنی "دەستوور" و "دامەزراندنی پەرلەمان". بەهێزترینی ئەو کۆمەڵانەش کۆمەڵەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بوو.

(٢) "ئیتتیحاد و تەرەقی" کۆمەڵەیەکی نهێنی بووە و، قوتابی‌یەکی ئەلبانی بە ناوی "ئیبراهیم تەمۆ" لە قوتابخانەی پزیشکی سەربازی، لەگەڵ چەند قوتابی‌یەکی هاوەڵی لە ساڵی ١٨٨٩زدا دایمەزراندووە. ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە لەسەر کار لابردنی سولتان عەبدولحەمیدی دووهەم بووە و، دروشمی "سەربەستی، یەکسانی، دادگەری"ی هەڵبڕیبوو. مەحفەلە ماسۆنی‌یەکان پشتیان گرت و گەلێ کەس لە ئەندامەکانیان ڕۆشتنە ناویەوە، هەروەك چەند دەوڵەتێکی زۆری ئەورووپاش دەستی یارمەتی‌یان بۆ درێژ کرد. ئەم کۆمەڵەیە کاتێ لەناو سوپای سێی عوسمانیدا لە "سەلانیك" کە مەڵبەندی جوولەکەی "دۆنمە" و مەحفەلی ماسۆنی بووە، تەشەنەی کرد، مەترسی‌یەکەی لەسەر دەوڵەت پەرەی سەند و، بزووتنەوەیەکی هەڵگەڕانەوە لەم سوپایەدا بەرپا بوو، سەرکردەکانی ئەم هەڵگەڕانەوەیە چەندین برووسکەیان ئاراستەی سولتان کرد تیایدا داوای دەستوور و هێنانەدیی "پەرلەمان"یان پێش چاو خست، سولتانیش بۆ ڕاگرتنی بارودۆخ مەشرووتیەتی دووهەمی لە ساڵی ١٩٠٨زدا ڕاگەیاند. بەڵام پاش ساڵێك لە ڕاگەیاندنی دەستوور لەسەر تەختی حوکمڕانی لابرا و، "محەممەد ڕەشاد"ی برای خرایە شوێنی. هەرچەند "ئیتتیحاد و تەرەقی" لە ماوەی حوکمڕانیی خۆیدا هەندێ چاکسازیی لە کارگێڕیی وڵات و سوپای عوسمانیدا بە ئەنجام گەیاند، بەڵام بە دەستێکی ئاسنین حوکمی گرتبووە دەست و، دیکتاتۆریێتی‌یەکی ستەمکارانەی دامەزراند و، دەوڵەتی عوسمانیی بە جەنگی جیهانیی یەکەمەوە گلاند. لە دوای هودنەی مۆندرۆس لە ١٩١٨/١٠/٣٠زدا سەرکردەکانی ئەم کۆمەڵەیە هەڵهاتن بۆ دەرەوەی وڵات!

(٣) هەروەك ئەوانەی کە بیست و پێنج ساڵ بە ئیستیبدادی ڕەها حوکمیان دەکرد، ئاینداراەکانیان بە "کۆنەپەرست" ناو دەبرد، تاکو ئەو لە ڕێ ترازانەی پێ بشارنەوە کە هاودەمی ئیستیبدادی ڕەهایە! (دانەر)

زیاد لە پێویست هێرش دەکەنە سەر ئەو دەمارپەرستی‌یە نەفرەت لێکراوەی کە شایانی ئایین نی‌یە.

وا دیارە ئێوە ناوی "جۆن تورك" لەو کەسانە دەنێن کە پێشتر چەند خزمەتێکیان پێشکەشی مەشرووتیەت کردووە، یان ئەوانەی کە بە سەربەستی و مەشرووتیەت ڕازی بوون.

بەڵام باش بزانن کە هەندێك لەوانە موجاهیدی ئیسلامن و هەندێکی تریشیان خۆیان بۆ سەلامەتی و ئاسایشی نەتەوە بەخت کردووە. بەشی هەرە زۆری ئەوان و پێکهێنەری گرێی ژیانیان لە غەیری ماسۆنی‌یەکانن و، زۆرینەی ئیتتیحاد و تەرەقی لەوان پێکهاتووە..

ئەوەتا بە ئەندازەی ژمارەی هۆزەکانی ئێوە شێخ و زانا لەناو ڕیزەکانی "جۆن تورك"دا هەیە؛ هەرچەندەش تاقمێکی هەرزە و خراپکاری "ماسۆنی"یان لە نێواندایە، بەڵام ئەوانە ژمارەیان کەمە و لە سەدا دە زیاتر نابن. لە کاتێکدا کە نەوەد کەسەکەی تریان موسڵمان و باوەڕداری وەك ئێوەن. خۆ دیارە بڕیاریش بە گوێرەی زۆرینە دەردەکرێت..

کەواتە گومانی باشیان پێ ببەن، چونکە گومان خراپی زیان بە ئێوەش و بەوانیش دەگەیەنێت)[1].

(پرسیار: بۆچی - هەرکات بۆت بلوێت - گومانی باش بەرامبەر حکوومەتی مەشرووتیەت و کەسانی نامولحیدی دەستەی "جۆن تورك" دەردەبڕیت؟

وەڵام: لەبەر ئەوەی هەرکات ئێوە بۆتان بلوێت گومانی خراپیان پێ دەبەن، ئەوا من گومانی باشیان پێ دەبەم!

جا ئەگەر بەو جۆرە بن ئەوا شتێکی باشە، دەنا بەو باسکردنەم ڕێنماییان دەکەم بەرەو ڕێی ڕاست، تاکو بیگرنەبەر.

پرسیار: ڕات سەبارەت بە "ئیتتیحاد و تەرەقی" چی‌یە؟

---

(١) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٤٢-٣٤٣.

وەڵام: هەرچەندە من نرخ و بەهایان دەزانم، بەڵام ڕەخنە لە توندوتیژیی سیاسی‌یەکانیان دەگرم و، لە هەمان کاتیشدا و هەتا ڕادەیەك پیرۆزبایی لە بەش و لقە ڕۆشنبیری و ئابووری‌یەکانیان دەکەم، بە تایبەت لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا[١])[٢].

(هەرچەند ئەو کاتە "سەعیدی کۆن" زۆر بە توندوتیژی لە دژی ڕێکخراوی "ئیتیحاد و تەرەقی" ڕاوەستا، بەڵام لایەنی حکوومەتەکەی، بە تایبەت سوپاکەی، گرتن. ئەوەبوو هەڵوێستی ڕێز و سەرسووڕمان و گوێڕایەڵیی لە بەرامبەرەوە نواندن..

ئەمەش هی ئەوەبوو کە بە "هەستی پێش ڕوودان" پەیی بەوە بردبوو کە ئەو دەستە و تاقمە سەربازی و کۆمەڵە میللی‌یانە، دوای حەوت ساڵ، یەك ملیۆن شەهیدیان لە نێواندا پەیدا دەبێت، کە لە پلەی ئەولیادان.. بۆیە بە بێ ویست و ئیختیاری خۆی، دوای چوار ساڵ لایەنی گرتن، کە ئەمەش پێچەوانەی مەشرەبی خۆی بوو.

بەڵام هەر کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپا بوو، هەموو ئەوانی ڕاتەکاند و، ڕۆن و کەرەی پیرۆز و بەنرخی لەو ماستە جیا کردەوە و، پاشماوەکەی کرد بە دۆیەکی بێ نرخ. ئیتر "سەعیدی نوێ" دەستی دایە جیهادەکەی خۆی و بە پێچەوانەی سەعیدی کۆنەوە ڕەفتاری نواند)[٣].

(لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا چەند کەسێکی مولحیدم لە ناوەندی ئیتیحادی‌یەکاندا دەبینی کە دەیان وت:

ئایینی ئیسلام و شەریعەتی محەممەدی چەندین یاسا و دەستووری یەکجار بەنرخ و گشتی و سوودبەخشیان تێدایە کە شایانی جێبەجێ کردنن لە کۆمەڵگای ئادەمیزاد بە تایبەت لە سیاسەتی عوسمانیدا.

واتە: بە هەموو هێزێکیانەوە لایەنی شەریعەتی محەممەدی‌یان دەگرت.

---

(١) "ستەم" لە دابەشکردنی نادادگەرانەی "دادگەری"دا دەردەکەوێت! چونکە ناکرێ لەبەر خراپیی یەك دانە کەس هەست و نەستی هەزاران زامدار بکرێت. "توندوتیژی" جیایە لە "پەرۆشی". چونکە ئەگەر کەسێکی لەخۆبایی و لەخۆڕازی لایەنی "حەق" بگرێت ئەوا زۆر کەس بەرەو "ناحەق" دەبات، لەوانەشە لەبەر ئەو توندوتیژی‌یەی دەینوێنێت، بەرەو ناحەق ڕاپێچیان بکات! (دانەر)

(٢) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٩.

(٣) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٧١-١٧٢.

جا ئەوان لەم حاڵەدا موسڵمانن. واتە: هەرچەند بێ ئيمانن، بەڵام لايەنی حەقيان گرتووە و جێبەجێی دەکەن. بەو واتايەی کە شايستەی ئەوەن پێيان بوترێت: موسڵمانی بێ ئيمان!

بەڵام ئێستا کەسی وا هەيە لە خۆيدا خۆی بە ئيماندار دەزانێت و باوەڕی بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و ڕۆژی دوايی هەيە، کەچی بە ناوی "مەدەنييەت"ەوە دەچێت پشتگيری لەو تەوژمانە دەکات کە دژی شەريعەتن و لەگەڵ بيانی‌يەکاندا ڕێك و هاوبيروڕان!

جا لەبەر ئەوەی ياساکانی شەريعەتی ئەحمەدی جێبەجێ ناکات - کە حەق و حەقيقەتن - و، بە چەشنێکی ڕاستەقينە لايەنی ئەو ياسايانە ناگرێت، ئەوا دەبێت بە ئيمانداريکی ناموسڵمان!

دەتوانرێ بوترێت: هەروەك ئيسلامی بێ ئيمان نابێت بە مايەی ڕزگاربوون، بە هەمان جۆر ئيمانی بێ ئيسلاميش - کە لەسەر بناغەی زانين بێت - خۆی ڕاناگرێت و ڕزگاريش بۆ مرۆڤ بەدەست ناهێنێت)[1].

## داواکاری‌يەکانی لە "ئيتتيحاد و تەرەقی":

### داواکاريی يەکەم: دامەزراندنی "قوتابخانەی زەهراء"

[ لە فەسڵی پێشوودا ئەم داواکاری‌يەی مامۆستا سەعيدی نوورسيمان بە دوور و درێژی ڕوون کردەوە. بۆ بەدەستهێنانی زانياری لەبارەيەوە با خوێنەری بەڕێز سەردانی ئەوێ بکات ][2].

### داواکاريی دووهەم: ڕاستگۆيی و، ئەمانەتپارێزی و، دەستبەرکردنی ئايندەی زانايان

(داوايەکم هەيە دەمەوێ لەگەڵ تايبەتمەنداندا لێی بکۆڵمەوە و، مەسەلەيەکی گرنگيشم هەيە لەگەڵ حکوومەت و ئەشرافدا.. لەگەڵ ئەوانەی کە ماسۆنی نين لەناو کۆمەڵی "ئيتتيحاد و تەرەقی"دا:

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ١٢٢-١٢٣.

(٢) بروانە ل: (١٤٠-١٧٤)ی ئەم کتێبەی بەردەستت.

ئەی چینی تایبەتمەندان!

ئێمەی عەوام و کەسانی ناو قوتابخانەی ئایینی، داوای مافی خۆمانتان لێ دەکەین:

داواتان لێ دەکەین گوفتارەکانتان بە کردار بسەلمێنن و.. قسووری غەیری خۆتان بە بەهانە مەهێننەوە و.. لە نێوان خۆتاندا کار مەخەنە ئەستۆی یەکترەوە و.. لە خزمەتی ئێمەشدا – کە واجبی سەرشانتانە – تەمبەڵی مەکەن و.. ئەو شتانەی کە بەهۆی ئێوەوە لە دەستمان دەرچوون، فریایان بکەون و بیانخەنەوە دەستمان و.. گوێ لە بارودۆخی ئێمە رابگرن و، لە پێداویستییەکانماندا راوێژمان پێ بکەن و، لە چۆنێتیی ژیان و گوزەرانمان بپرسن و.. گاڵتەوگەپی خۆتان بخەنە لاوە!

*بە پوختی:*

داوای دەستەبەرکردنی دوارۆژی کوردەکان و زانایانیان دەکەین و، داواکاری بەشی خۆمانین لە واتای "ئیتتیحاد" و واتای "تەرەقی" نەك ناوەکەی!

داوای شتێکتان لێ دەکەین کە لای ئێوە ئاسانە و، بە لای ئێمەشەوە گەلێ گرنگ و مەزن و بایەخدارە)[1].

## داواکاریی سێهەم: دامەزراندنی ئەنجومەنێکی راوێژکاری بۆ "ئیجتیهاد" و، بووژاندنەوەی "مەشیەخەت"

(لە کاتێکدا کە دەبینین "وەزارەت" لە بنەڕەتدا پشت بە سێ ئەنجومەنی راوێژکاری دەبەستێت و، هەندێ جاریش ئەم سێ ئەنجومەنە پێداویستییە زۆرەکانی وەزارەت ئەنجام نادەن، کەچی لە هەمان کاتدا "مەشیەخەت" تەسلیمی ئیجتیهادی یەك کەس کراوە!

بە تایبەت لەم کات و سەردەمەدا کە پەیوەندییەکانی نێوان هەموو شت و کاروبارێك، تەنانەت لە وردترین شتانیشدا، تابڵێی ئاڵۆز بووە. سەرەڕای ئەو فەوزا سامناکەی لە را ئیجتیهادییەکاندا هەیە و، ئەو بیر پەرتەوازەیی و رەوشت نزمییە ترسناکەش کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی مەدەنییەتی درۆینەوە، لەناوماندا بڵاوبوونەتەوە.

---

(١) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٨٠.

ئاشکرایە بەرەنگار بوونەوەی کارتێکردنە دەرەکی‌یەکان لە لایەن تەنیا کەسێکەوە، بەرهەڵستێکی لاواز دەبێت. ئەوەتا بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو کارتێکردنە دەرەکی‌یانەدا قوربانی بە زۆر لە ئەحکامی ئایین دراوە و لەو پێناوەدا بەخت کراوە!

خۆ ئەو کاتەی کە کاروبارەکان ساکار و ئاسایی بوون و بەم چەشنەی ئێستا ئاڵۆز نەبووبوون و، خەڵکی لە خۆ تەسلیم کردن و تەقلیدیان بۆ زانایان بەردەوام بوون، مەشیەخەت تەسلیمی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری کرابوو، کە لە کەسانی بەرز پێکهاتبوو، هەرچەندەش ئەنجومەنەکە بە تەواوی ڕێکوپێك نەبوو..

کەچی ئێستا، کە هەرچی کاروبارە ئاڵۆز بووە و جڵەوی تەقلیدی زانایان و شوێنکەوتنیان شل بووە، چۆن تەنها یەك کەس دەتوانێت ئەم هەموو ئەرکانەی ئەستۆی ئەنجام بدات؟

ڕۆژگار دەری خست ئەم مەشیەخەتە، کە نوێنەری خەلافەتە، تەنها تایبەت نی‌یە بە خەڵکی ئەستەمبووڵ و دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە، بەڵکو دەزگایەکی مەزنە و هی هەموو موسڵمانانە بە گشتی.

بەڵام بەم بارەی ئێستای، تەنانەت ڕێنمایی خەڵکی ئەستەمبوولی پێ هەڵناسوورێت، چ جای ڕێنمایی کردنی جیهانی ئیسلامی!

لەبەر ئەوە، پێویستە ئەم مەشیەخەتە بگەیەنرێتە پلەیەکی ئەوتۆ کە بتوانێت ببێت بە جێی بڕوای جیهانی ئیسلامی و، وەکو ئاوێنەیەك وا بێت بۆ دەرخستن و پیشاندانی گیروگرفت و کێشەکانی موسڵمانان بە گشتی و، ببێت بە سەرچاوەیەکی بەپیتی بیرکردنەوە و ئیجتیهاد.

تەنها ئەو کاتە دەتوانێت بە تەواوی پێویستی و ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر بە جیهانی ئیسلامی ئەنجام بدات)[1].

(لە کاتی ڕاگەیاندنی دەستووردا هێنانەدیی ئەم فیکرەیەم[2] لە ئەندامانی "تورکیای لاو" داوا کرد. بەڵام بە دەنگمەوە نەهاتن. دوازدە ساڵ دوای ئەوە داوام لێ کردنەوە،

---

(١) داوەری‌یەکان، سنوحات، ل: ٧٣٧-٧٣٨.

(٢) واتە: دامەزراندنی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری بۆ ئیجتیهاد.

ئەمجارە پێی ڕازی بوون، بەڵام ئەنجومەنی نوێنەران هەڵوەشێنرابووەوە. وا ئێستا جارێکی تر دەیخەمە پێش چاوی خاڵی چەقەهێز(نقطة تمركز)ی جیهانی ئیسلامی)[1].

## داواکاریی چوارەم: چاکسازی لە ئیدارەی "حەمیدیە"[2] لە کوردستاندا

(ئەو سەربازە نەتەوەییانەی کورد کە پێیان دەوترێت "حەمیدیە" پێویستیان بە ڕێکوپێکی هەیە و هەرەمەکێتی قبوڵ ناکات..

چونکە "ڕێکوپێکی" هەم زیان ناهێڵێت و هەم سوودە گەورەکانیشی بۆ دەستەبەر دەکات.

بەڵام "هەرەمەکێتی"ی برای مردن و نەمان - کە دوورخستنەوەی زیانە بە زیانێکی تر - پێچەوانەی یاسای ئوسووڵە)[3].

(ماوەی پازدە ساڵە لە نێوان ئەو پێداویستییانەدا کە بیرم لێ کردوونەتەوە، دوانیانم کردووە بە ئامانجی سەرەکیم. جگە لەو دوانەش هیچ هۆکارێکی تر شك نابەم کە داهاتووی کوردستان دەستەبەر بکات.

یەکەمیان: یەکێتیی نەتەوەیی.

دووهەمیان: گشتاندنی ئەوەی کە هاوکات لەگەڵ زانستە ئایینییەکاندا زانستە شارستانییە تازەکانیش لە قوتابخانەکاندا بخوێنرێن، کە بناغەی ئەمەش سوارەی عەشیرەتەکانن.

---

(١) داوەرییەکان، سنووحات، ل: ٧٣٦، (پەراوێز).

(٢) دەوڵەتی عوسمانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا چەند قوتابخانەیەکی لە کوردستاندا دامەزراند بە ناوی "قوتابخانەی عەشیرەتەکان" کە منالی هۆزە کورد و عەرەبەکانی تێدا وەردەگیران. هەروەك چەند لیوایەکی سوپای سوارەی لە هۆزە کوردەکان پێکهێنا بە ناوی "سوارەی حەمیدیە" کە سوپایەکی نانیزامی بووە و، پتر خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەرۆك هۆزە کوردەکانی کردووە تا ئەوەی خزمەت بە میللەت بکات. دوای ڕاگەیاندنی دەستوور لە ساڵی (١٩٠٨ز) سەرلەنوێ ئەم سوارانە ڕێکخرانەوە، بەڵام لە دووهەم ساڵی جەنگی جیهانیی یەکەمدا هەڵوەشێنرانەوە. مامۆستا نوورسی دەیویست سوودی ئیجابی لەم هەنگاوانەی دەوڵەت لە کوردستاندا وەربگیرێت و بە ئاراستەیەکی باشدا ببرێت، تاکو بکرێت بە بناغەیەکی توندوتۆڵ بۆ ئایندەیەکی باشتر. (وەرگێڕ)

(٣) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٣٦.

بە پشت بەستن بەم نهێنی‌یە، دەتوانم بێ پەروا بڵێم:

پێویستە ئەو کەسانەی کە لە ناو عەشیرەتەکاندا نەبوونەتە سەرباز، بکرێن بە سەربازی میللی، تاکو ئەو سەربازێتی‌یەی کە وەك تیشکی کارەبا وایە، پەیوەندی‌یەکی کیمیایی ئاسا لە نێوان ئەم عەشیرەتە جیاوازە هاوسێیانەدا پێکبهێنێت.

بە تێکەڵکردنی هزرەکان و ئاواتەکان، جەوهەری ئەوان و بەهای ڕاستەقینەیان دەردەکەوێت و، ڕووناکیی زانستەکان و گەرموگوڕیی هێزی کوردەکانیش لە دایك دەبن)[1].

(تەنها چارەسەر بریتی‌یە لە:

کردنەوەی دەرگای بڵندی سەربازی و سوارەی عەشیرەتەکان بە ڕووی قوتابخانە و زانستە تازەکاندا. هەروەها زیندووکردنەوەی قوتابخانە ئایینی‌یە پووکاوەکانیش کە کانزای بەختەوەری‌یانە و، وتنەوەی وانەی زانستە پێویستە شارستانی‌یەکان، شان بەشانی زانستە ئایینی‌یەکان، لە لایەن زانایانی کوردەوە.

بە پوختی: هەموو میللەتێك، بە تایبەت کوردەکان، دەستاوێزی مەحکەم و ماکی ڕاستەقینەیان "یەکگرتن"ە.

جا ئەگەر ئەم یەکگرتنە کۆشکێك بێت، ئەوا "سوارەی عەشیرەتەکان" هەروەها "سەربازی" لە ژێر هەر ناونیشانێکدا بێت، بناغەیەکی درێژ و سەقفێکی توندوتۆڵی ئەو کۆشکە پێکدەهێنێت.

هەروەها ئەو شتەی کە ڕووناکی بەو کۆشکی یەکگرتن و یەکبوونە دەبەخشێت، یاخود سووری خوێنی ژیانی نەتەوەکان، کە بە وێنەی سەرچاوەی گازی هەوایە. بریتی‌یە لە زانستەکان..

سوارەی عەشیرەتەکانیش دەبن بە قوتابخانەیەکی مەزنی زانستە تازەکان و کارگەیەکی پیشەسازیی یەکجار گەورە. دەبێ حکومەتی مامۆستاشیان، بەپێی ئامادەیی و لێهاتنی سوارەکان، وانەیەکی ڕێکوپێکی‌یان پێ بڵێتەوە)[2].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٥.

(٢) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٧.

## داواکاریی پێنجەم: پیادەکردنی "دادگەری" بە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی شەرع

(ئەی نوێنەرانی خەڵك! ئەو سوود و بەرژەوەندییانەی میللەت کە بە "مافەکانی خوا" گوزارشتیان لێ دەکرێت، لە بێستانی شارستانێتیدا بە "شەریعەت" ئاودێری بکەن کە ئەو کانیاوی ژیانەیە خوا ناردوویەتی، تاکو شارستانێتییەکەمان هەتاهەتایە بەم ژیانە، درێژە بە لاوییەکەی بدات و، "دادگەریی خوایی"ش مافی پێ بدرێت و وەك خۆی دەربکەوێت. چونکە دادگەریی خوایی لەسەر عەرشی شەریعەتدا دەردەکەوێت..

ئەو ئەحکامانەش بکەن بە بەرنامەی کارتان کە لەوێوە هاتوونەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی پێویست بەوە نەبێت کە بە بێ ڕوخسەت دەستکاری لە مافەکانی خوادا بکرێت. دەست تێوەردانیان بە بێ مۆڵەتی خاوەن ماف کارێکی دروست نابێت)[1].

(ئەو گەنجینە نەبڕاوە و ناکۆتایەی چوار مەزهەبەکە، بە هەڵێنجان و نووسینی بێ گومانی ملیۆنان بلیمەت داڕێژراوە و، بە وێنەی درەختی تووبا پەلوپۆی بڵاوبووەتەوە. چ لە ڕووی سیاسەت و چ لە ڕووی بەرژەوەندییەوە دەستگرتن بە هەر بابەتێکی هەر کامێکیان بە کارێکی دروست بینراوە و، نهێنیی: ﴿ولا رطبٍ ولا يابسٍ إلاّ في كتابٍ مبين﴾ی تەفسیر کردووە.. ئەو گەنجینەیە، لێوانلێوە لەو گەوهەرانە..

کەواتە بۆ ڕێکخستن و بە دەستوور کردنی ئەو ئەحکامە دادپەروەرانە و ئەو ڕاستییە بەرزانەی شەریعەتی خاوێن، سەردانی بیر و بۆچوونی گشتیی هەڵگرانی شەریعەت بکەن، تاکو ڕاستییەکانی مەشرووتیەت و بڕیارەکانی یاسای بنەڕەتی بە شێوەیەکی تۆکمەتر و ڕوونتر لە شەریعەتی خاوێنەوە هەڵبگۆزن و ڕێکی بخەن، وەك ئەوەی کە بە هیممەتێکی کەم "مجلة الأحكام"یان[2] ڕێکخست..

---

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٨.

(٢) (مجلة الأحكام) کتێبێکە یاسای مەدەنیی دەوڵەتی عوسمانیی تێدا تۆمار کراوە، کۆمەڵێك زانای فیقهی ئیسلامی بە سەرۆکایەتیی زانای گەورە و وەزیری دادی ئەو ڕۆژگارە "ئەحمەد جەودەت" بابەتەکانی فیقهی مەزهەبی حەنەفییان بە شێوەی قانوون داڕشتووەتەوە. دواتر "مامۆستا عەلی حەیدەر" کە سەرۆکی یەکەمی داداگای تەمییز و ئەمینی فەتوا و وانەبێژی ئەو کتێبە بووە لە کۆلێجی مافەکان لە ئەستەمبوڵ، شەرحێکی

چونکە "یەکێتیی گشتی" کە پەتی توندوتۆڵی دەست پێوەگرتنە بۆ ژیانمان، بەم شێوەیە بەهێز دەبێت و دێتەدی)[1].

(پیشاندانی هەژاری بۆ ئەوروپا لە بواری "ئەحکام"دا و سواڵکردنی "ئەخلاق" لێیان، لە کاتێکدا کە خۆمان خاوەنی گەنجینەی گەوهەرەکانین، خیانەتێکی گەورەیە لە ئایینی ئیسلام و کوشتنی ژیانی نەتەوەیە.

ئایین بۆ دنیا بەخت ناکرێت. ئایینی ئیسلامیش، کە لەسەر بەڵگە عەقڵییەکان بنیات نراوە، بە پێوەری ئایینێکی دیکە بەراورد ناکرێت.

بەڵێ، ئێمە پێویستمان بە "وەرگرتن" هەیە لە ئەوروپا.. پێویستمان بە وەرگرتنی ئەو لایەنانەیە کە لە بەڕێوەبردنی ماڵ و سامان و، ڕێکخستنی هێزی جەنگی و دەریایی و، هونەری پیشەسازیدا بەکەڵکمان دێن. ئەمەش بە فەرمانی ئایینەکەمان..

ئەوروپاش تەنها "دادگەری"ی لە ئێمە دەوێت و، چاوەڕوانی "شارستانێتی"مان لێ دەکات، تاکو هاوسەنگییەکە تێکنەچێت.

ئێمە شەریعەتەکەمان لەسەر ئەم دوو بناغەیە بنیات نراوە و، بە تەواوەتی چاودێرە بەسەریانەوە)[2].

(هەروەها با "هێز" لە یاسادا بێت، دەنا ئیستبداد دابەش دەبێت. هێزی "یاسا"ش لە بەهێزیی یاسادانەرەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەو هێزەی کە لەو یاسا خواییەدا هەیە و، لەو ڕووەوە کە بیروباوەڕی ڕاستەقینەیە، لە ماوەیەکی کەمدا هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای نوقمی دادگەریی خۆی کرد.

لە شەریعەتدا گوێڕایەڵی کردن بۆ گەورە و کاربەدەستەکان جیاوازە لە ئیستیبداد، چونکە پایەبەرزترین کەس لە شەریعەتدا ئەوەیە کە لە دیلێتیی "دەروون"ی ڕزگاری بووە و، بەهۆی سەربەستیی شەرعییەوە بووەتە مرۆڤێکی کامڵ! هەر لەبەر ئەمەشە کە ڕێزی لێ دەگیرێت و گوێڕایەڵییەکی ئاوێتەی خۆشەویستیی لە ڕوودا دەنوێنرێت.

---

گرنگی بۆ نووسیوە. لە لایەن پارێزەر "فەهمی حسەینی"یەوە بەشی "موعامەلات و جینایات"ی کراوە بە عەرەبی. (وەرگێڕ)

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٩.

(٢) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٥٤-٦٥٥.

ئەمە جیاوازە لەو ئیستیبدادەی کە لەسەر ترس و زۆرەملێ بنیات نراوە و، لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەهۆی بێداربوونەوەی بیری خەڵکییەوە توانای لەدەست داوە)[1].

(بە هەموو هێزێکمەوە دەڵێم: هیچ لایەنێکی جوانی شارستانێتی نییە کە ئایینی ئیسلام، چ بە ڕاشکاوی چ بە ناوەرۆك چ بە ڕێپێدان، لە خۆی نەگرتبێت، یاخود باشتری لە لا دەست نەکەوێت)[2].

* * *

❑ نەیاری کردنی بۆ "ئیتتیحاد و تەرەقی و، بە نارەوا دانانی خۆشویستنیان

(هەڵەی "تورکیای لاو" لەوەدا بوو کە نەیاندەزانی ئایین بناغەی ژیانە؛ پێیان وابوو: نەتەوە شتێکە و ئیسلامیش شتێکی تری جیاوازە!

هۆکار و هاندەری ئەم هەڵەیەشیان شارستانێتیی سەردەم بوو کە ئەو چەشنە بۆچوونەی بڵاو دەکردەوە و، بەوەی کە دەیوت: "بەختەوەری تەنها لە ژیاندایە" بەسەر بیری خەڵکدا زاڵ بووبوو.. بەڵام ڕۆژگار دەری خست کە ڕێسای ئەم شارستانێتییە، بێ کەڵك و زیانبەخشە[3]!

ئنجا تاقیکردنەوە بێ گومانەکانیش چەسپاندیان کە: "ئایین" ژیان و ڕووناکی و بناغەی "ژیان"ە..

زیندوو کردنەوەی ئەم نەتەوەیە بە ژیاندنەوەی ئایین دەبێت، هەر تەنها ئیسلامیش پەیی بەم ڕاستییە بردووە.

ئەندازەی بەرەوپێش چوونی نەتەوەی ئێمە بە ڕێژەی دەستگرتنیەتی بە ئایینەوە و، مەودای دواکەوتن و نزمبوونەوەشی بە ئەندازەی پشتگوێ خستنی ئایینەکەیەتی.. بە پێچەوانەی ئایینەکەی ترا ئەمەش ڕاستییەکی مێژووییە، لە بیر براوەتەوە)[4]!

---

(١) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٥٨-٦٥٩.

(٢) داوەرییەکان، وتارەکان، ل: ٦٧٢.

(٣) ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ شارستانێتیی موڵحیدی ستەمکار کە ئێستا بە ئازاری سەرەمەرگەوە گیرۆدەیە! (دانەر)

(٤) بریسکەکان، بریسکەی سی و دووهەم، ل: ٧٨٩.

(وتیان: جاران نەیاری ئیتتیحاد و تەرەقی بوویت، کەچی ئێستا لێیان بێدەنگیت؟

وتم: لەبەر زۆریی هێرشی دوژمنان لەسەریان.

ئامانجی ئەو هێرشەی کە دوژمنان دەیکاتە سەریان ئەو دامەزراوی و تین و غیرەتەیە کە لەواندا هەیە و، ئەوەشە کە نابن بە هۆکار و ئامرازێك بۆ پیادەکردنی ئامانجی دوژمنان لە ژەهراوی کردنی هزر و بیری موسلمانان‌اندا. ئەمەش لە چاکەکاریی‌یەکانی ئەوانە.

من لام وایە بە وێنەی دوو تای تەرازوو ڕێگاکەش دوانە؛ سووکیی تایەکیان قورسیی تاکەی تر بەرهەم دەهێنێت. هەر بۆیە من لە تەنیشتی "ئەنترانیك"وە[١] زللەی خۆم لە "ئەنوەر"[٢] نادەم و، لە پاڵ "فینزیلیۆس"یشدا[٣]دا لە "سەعید حەلیم"ی[٤] ناسرەوێنم. پێم وایە ئەو کەسەی زللەیان ئاراستە دەکات نزم و بێ نرخە)[٥].

(بەڵێ، من نەیاری ئەو لقە خۆسەپێنەی ئێرەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بووم کە شەوقی خەڵکیی نەهێشت و، خۆشحاڵیی لێ زڕاندن و، دەماری دووڕوویی و لایەنگیریی تێدا

---

(١) سەرۆکی ڕێکخراوی "تاشناق"ی ئەرمەنیی‌یە کە سەردەمانێکی زۆر دەوڵەتی عوسمانیی بە شۆڕشەکانی سەرقاڵ کردبوو.

(٢) ئەنوەر پاشا: (١٨٨١-١٩٢٢ز) لە حکوومەتی ئیتتیحاد و تەرەقیدا ساڵی (١٩١٣ز) وەزیری جەنگ بووە. دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بۆ ئەڵمانیا هەڵهات و، پاشان ڕۆشت بۆ تورکستان و سوپایەکی بۆ بەرەنگاریی رووسەکان پێکهێنا و لەوێ لە جەنگێکدا شەهید بوو.

(٣) فینزیلیۆس (١٨٦٤-١٩٣٦): سیاسەتمەدارێکی ناوداری یۆنانیی‌یە و یەکێکە لە پیاوە بەناوبانگەکانی دەوڵەت. لە پێشدا پارێزەر بووە، پاشان ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی کرێت (١٨٩٦-١٨٩٧)دا لە دژی دەوڵەتی عوسمانی. ساڵی ١٩١٠ز وەزارەتی یۆنانیی پێکهێناوە. گەلێ ئاشووبی چەکدارانەی لە دژی حکوومەتی پاشایەتی ڕێکخستووە، بەڵام هەر هەموویان سەرکوت کراون. ساڵی (١٩٢٥ز) ڕایکردووە بۆ فەرەنسا و لەوێ دوای ساڵێك کۆچی دوایی کردووە.

(٤) سەعید حەلیم پاشا: (١٨٦٣-١٩٢١ز) سەرۆك وەزیرانی حکوومەتی ئیتتیحاد و تەرەقی بوو لەو دەمەدا کە "ئەنوەر پاشا" وەزیری جەنگ بوو. لەگەڵ شەست و حەوت کەسی‌تری هاوڕێیدا بەوە تاوانبار کران کە دەوڵەتی عوسمانی‌یان لە جەنگی جیهانیدا ڕاپێچی جەنگ کردووە و، لە ئەنجامی ئەوەدا بۆ دوورگەی "مالتە" دوورخرایەوە. دوو ساڵ لەوێ ماوەیەوە. ئنجا پەنای بردە بەر ئیتالیا، چونکە ڕۆشتنی بۆ ناو تورکیا و میسر لێ قەدەغە کرابوو لەبەر لەوەی ئەو دەمە لە لایەن بەریتانیاوە داگیر کرابوون. لە بەرواری: ١٩٢١/١/٦ لە نزیکی ڕۆما بە دەستی کەسێکی ئەرمەنی کوژرا.

(٥) داوەری‌یەکان، سنووحات، ل: ٧٥٣-٧٥٤.

وورووژاندن و، بوو بە هۆی نانەوەی جیاوازی و پەرتەوازەیی لە نێوان خەڵکیدا و، حیزب و دەستە و تاقمە قەومی‌یەکانی هێنایە گۆڕێ و، بە ڕواڵەت ناوی "مەشرووتیەت"ی لە خۆی نا، بەڵام لە ڕاستیدا "ئیستیبداد"ی ڕاستەقینەی نواند، تەنانەت ناوی ئیتتیحاد و تەرەقیشی چەپەڵ کرد)[١].

(لە سەدا نەوەدی ئەم بزووتنەوەیە[٢] لە دژی ئیتتیحاد و تەرەقی و دیکتاتۆریەتیان ئاراستە کرابوو)[٣].

(ئەم حکوومەتە چەتەیە لە ڕۆژگارانی "ئیستیبداد"دا دوژمنایەتیی "ژیری"ی دەکرد. کەچی وا ئێستا دوژمنایەتیی سەرانسەری "ژیان" دەکات. جا ئەگەر حکوومەت بەم شکڵ و شێوەیە بێت، ئەوا با بژی "شێتی".. بژی "مردن".. "دۆزەخ"یش هەر بژی بۆ ستەمکاران)[٤]!

("قەدەری خوا" لەسەر ئەو مەیلەی بەلای ئەهلی دنیادا هەمە و ئەوانیش شایانی نین، بە دەستی ئەو ستەمکارانەی ئەهلی دنیا سزام دەدات! بەپێی ئەو دەستوورەی کە دەڵێت: "پاداشت و ئەنجامی خۆشەویستیی نامەشرووع، دوژمنایەتی‌یەکی ستەمکارانەیە"!

جا بۆیە لایەنی بێ دەنگیم گرت، چونکە دەمزانی شایانی ئەم زللەیەم.. ئەوەبوو من بە سیفەتی سەرکردەی خۆبەخشەران لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەشدار بووم و، ڕۆشتمە ناو چەندین جەنگەوە و قوتابی‌یە باش و خۆشەویستەکانیشم لەو جەنگانەدا بەخت کرد و، تەقدیر و ڕێزی "ئەنوەر پاشا"ی سەرکردەی گشتیی سوپام بەدەست هێنا و، لە جەنگدا پێکرام و، بە زامداری‌یەوە دیل کرام.

ئنجا دوای گەڕانەوەشم لە دیلی، بەهۆی دانانی پەیامی "شەش هەنگاوەکان"ەوە، کە بەربەرەکانێی ئینگلیزم تێدا کرد لەو دەمەی کە ئەستەمبوولیان داگیر کردبوو، خۆم خستە ناو باوەشی مردنەوە..

---

(١) داوەری‌یەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣١.

(٢) واتە ڕووداوی "٣١"ی مارت.

(٣) داوەری‌یەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٥.

(٤) داوەری‌یەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٠.

واتە هاوکاریی ئەو برادەرانەم کرد کە بێ هیچ هۆکارێك منیان خستە ناو ئازار و سزای دیلیەوە.

ئەمەش پاداشتی ئەوان بوو بۆ یارمەتیەکانم، ئەوەبوو لە ماوەی سێ مانگدا هێندە گیروگرفت و ئازاریان هێنایە ڕێم کە گەلێ زیاتر بوو لەو ئازاری دیلیەی بۆ ماوەی سێ ساڵ لە ڕووسیادا پێوەی تلامەوە)[1].

☐ هەڵوێستی بەرامبەر پشێوی دوای ڕاگەیاندنی سەربەستی

(لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا [ واتە ڕاگەیاندنی دەستوور ] چەند کۆمەڵێکی جۆراوجۆر لە ژێر ناوی چەندین "یانە"ی زۆر و زەبەندەدا بۆ پەناهێنەرەکان، لە پێشەنگیانەوە "ڕۆم" و "ئەرمەن" دامەزران و، وەك چۆن بە ڕووخانی بورجی بابل نەتەوەکانی ژێر سایەی ئەو دەوڵەتە پەرتەوازە بوون و بڵاو بوونەوە، ئەوانیش بوون بەهۆی پارچە پارچەبوون و پەرتەوازەبوونی دڵەکان. تەنانەت هەندێکیان بوون بە پارووێەکی ئامادەی ئەوتۆ کە بیانیەکان قووتیان دان و، هەندێکی تریشیان هێندە گومڕا بوون کە بە تەواوی لە ڕێ ترازان)[2].

(بە هۆی ئەو وتارە هاندەرانەی کە ڕۆژنامەکان لە ماوەی هەشت نۆ مانگدا بڵاویان کردەوە و.. ناونووس کردنی خۆبەختکاران لە لایەن دەستە و پێڕە جیاجیاکانەوە و.. زاڵبوونی سەرکردەکانی کوودەتاکە و.. تەشەنە کردنی سەربەستیی ڕەها بۆ ناو سەربازەکان بە شێوەیەك کە دژی بنەمای گوێڕایەڵیی سەربازی بێت و.. تەڵقیندانی سەربازەکان لە لایەن کەسانی نابەرپرس و بێ ئامانجەوە بەو شتانەی کە پێیان وابوو دژ و پێچەوانەی ئادابی ئایین بێت.. بەهۆی هەموو ئەمانەوە، تۆقاندن و بەربادی و هەرەمەکێتی سەرانسەری ناوەندەکانی گرتەوە.

ئنجا دوای ئەوەی کە شیرازەی گوێڕایەڵی پچڕا، کەسانی خۆسەپێن و دەمارگیرە نەزانەکان و ئەوانەش کە بێ بەشن لە داوەریی ژیری لە ئاییندا، بە گومانی چاکەکاری، تۆوی خۆیان لەو زەلکاوە بۆگەنەدا چاند و، سیاسەتی گشتیی دەوڵەت کەوتە دەستی

(١) مەکتووبات، مەکتووبی شازدەهەم، ل: ١٢٥-١٢٦.
(٢) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و شەشەم، ل: ٥٣٨.

نـەفامان و، نزیکـەی یـەك ملیـۆن گوللـە بـە هـەوادا تـەقێنرا و، دەسـتە نـاوخۆ و دەرەکییەکانیش خۆیان لە بارودۆخەکەدا هەڵقورتاند)[١].

□ وتارێك بە زمانی کوردی بۆ گەلی کورد[٢]

(ئەی گەلی کوردان!

ئیتیفاقێ دە قووەت، ئیتیحادێ دە حەیات، د برایەتی دە سەعادەت، حکومەتێ دە سەلامەت هەیە.

کابیکا ئتیحادێ و شریتا موحەبەتێ قەوی بگرین، دا وەژ بەلایێ خەلاس کە.

قەنج گوهێ خووە بدەنێ، دا ئەزی تشتەکی ژ وەرا بیێژم:

هوون بزانن کو سێ جەوهەرا مە هەنە، حیفزا خووە ژ مە دخوازن:

یەك: ئیسلامییەت، کو هەزار هەزار خوینا شەهیدان بەهایێ وێ دانە.

ئێ دوودووا: ئینسانییەت، کو لازمە ئەم خووە نەزەرا خەلقێ دە ب خدمەتا عەقلی، جوامێری و ئینسانییەتی ئو خووە نیشانی دنیەیێ بدین.

ئێ سسیان: میللییەتا مەیە، کو مەزەبییەتێ دا مە.

ئی بەرێ کو ب قەنجی ئو خـووە ساغین، ئەم ب کـارێ خـووە، ب حیفـزا میللییـەتا خووە، ڕووحێ وان قەبرا وان دە شاد بکین.

پشتی وێ، سێ دوژمنێ مە هەنە، مە خەراب دیکین:

یەك: فەقیرتییە. چیل هەزار حەمالێ ئیستەنبولێ، دەلیلێ وێیە.

ئێ دوودوویان: جەهالەت و بێ خواندەنی. کو هەزار ژ مەدا یەك قازەتە نیکارن بخوینن، دەلیلا وێیە.

ئێ سسیان: دوژمنی و ئیختیلافە. کو ئەڤ عەداوەت قووەتا مە وندا دکە، مە ژی موستەحەقێ تەربیەتێ دیکە و، حکوومەت ژی ژ بێ ئینسافیا خووە زوڵم ل مە دیکیر.

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٧.

(٢) بە پێی ئەو زانیارییانەی کە تا ئێستا لە بەردەستدان، ئەم وتارە تاقانە بەرهەمی بڵاوکراوەی مامۆستا سەعیدی نوورسییە بە زمانی کوردی (کرمانجیی ژووروو) لە یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی "تەعاون و تەرەقیی کورد"دا کە لە بەرواری ١٩٠٨/١١/٢٢ز دەرچوو، بڵاوی کردووەتەوە. ئێمە دوابەدوای دەقی وتارەکە، لە پەراوێزدا خستوومانەتە سەر شێوە زاری کرمانجیی خواروو. (وەرگێر)

کو وە ئەو سەح کر، بزانین چارا مە ئەوە کو ئەم سێ شووریێ ئەلماس ب دەستێ خووە بگرین، تاکو ئەم هەر سێ جەوهەرا خووە ژ دەستێ خووە نەکین، هەر سێ دوژمنێ خووە سەر خووە ڕاکین:

ئەو شووریێ عەدل و مەعاریف و خواندنە.

ئێ دوودوویان: ئیتیفاق و موحەببەتا میللی‌یە.

ئێ سسیان: ئینسانی ب نەفسا خووە شوغلا خووە بیکە و، مینا سەفیلان ژ قودرەتا خەلقێ هێڤی نەکە و پشتا خووە نەدەنێ.

وەسیەتا پاشی:

خواندن.. خواندن.. خواندن!

دەستێ هەڤ گرتین.. دەستێ هەڤ گرتین.. دەستێ هەڤ گرتین)[1].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتارەکان، ل: ٦٤٢-٦٤٣. ئەمەش لە خوارەوە دەقی وتارەکەیە بە زاری کرمانجیی خواروو:

(ئەی گەلی کوردان!

لە یەکگرتندا هێز و.. لە یەکێتیدا ژیان و.. لە برایەتیدا بەختەوەری و.. لە حکوومەتدا سەلامەتی هەیە.

بە توندی دەست بە گوریسی یەکێتی و پەتی خۆشەویستی‌یەوە بگرن، تاکو لە بەڵا ڕزگارتان بێت.

باش گوێم لێ بگرن هەتا شتێکتان پێ بڵێم: بزانن! ئێمە سێ گەوهەرمان هەیە کە دەخوازن بیانپارێزین:

یەکەمیان ئیسلامەتی‌یە، کە هەزار هەزار خوێنی شەهیدانمان لە بەهایدا داوە.

دووهەمیان: ئینسانییەتە، کە پێویستە لە پێش چاوی خەڵکیدا، بە خزمەتی عەقلی، جوامێری و مرۆڤ پەروەریی خۆمان پیشانی دنیا بدەین.

سێ‌هەمیان: نەتەوایەتیمانە، کە تایبەتمەندیی بە ئێمە داوە.

پێشینانمان کە بۆ خۆیان کاردروست و ڕێکوپێك بوون، دەبێ ئێمە بە کارەکانمان و پاراستنی نەتەوایەتیی خۆمان، گیانی ئەوان لە گۆڕەکانیاندا شاد بکەین.

دوای ئەوە.. سێ دوژمنمان هەیە کە ئێمە لەناو دەبەن:

یەکەم: هەژاری‌یە. چل هەزار حەماڵ لە ئەستەمبوڵدا بەڵگەیە لەسەری.

دووهەم: نەزانی و نەخوێندەواری‌یە. کە لە هەزار کەسدا یەکێکمان ناتوانێت ڕۆژنامە بخوێنێتەوە، بەڵگەی ئەوەیە.

سێ‌هەم: دوژمنایەتی و دووبەرەکی‌یە. کە ئەم دوژمنایەتییەش هێزی ئێمە لەناو دەبات و، ئێمەش شایستەی تەمێ و پەروەردە دەکات. حکوومەتیش لە بێ ویژدانیی خۆیدا ستەمی لێ دەکردین.

دوای ئەوەی کە ئێوە لەمە تێگەشتن، بزانن چارەی ئێمە لەوەدایە کە سێ شمشێری ئەلماس بە دەستەوە بگرین، تاکو پارێزگاری لە هەر سێ گەوهەرەکانمان بکەین و، هەر سێ دوژمنەکەشمان لە خۆمان دوور بخەینەوە. ئەو سێ شمشێرەش:

❐ هێور کردنەوەی هەستە ورووژاوەکان

(لە چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی گەورەدا هەستم کرد خەڵکی ورووژاوە، ئیتر ترسی ئەوەم لێ نیشت کە عەوامی ئەو خەڵکە بە خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری سیاسەتدا سیستەم و ئاسایشی وڵات تێکبدەن. بۆیە بە گوفتارێکی گونجاو بۆ زمانی کوردێکی زانستخواز، ئەو هەست و نەستە ورووژاوەم هێور کردەوە.

بۆ نموونە:

لە کۆبوونەوەی قوتابیاندا لە مزگەوتی بایەزید و، ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی ئەیاصۆفیا و، لە شانۆی فەرەحدا، تا ڕادەیەك هەڵچوون و تووڕەیی خەڵکەکەم هێمن کردەوە. خۆ ئەگەر ئەو وتارانە نەبوونایە، ئەوا زریانێکی گێژەڵووکاوی دەپێچانەوە)[1].

❐ هێور کردنەوەی حەماڵەکان

(هەستم بە مەترسیی ئەوە کرد کە دڵپاکیی کوردەکان ببێتە هۆی ئەوەی هەندێ لە بانگەشەچیانی حیزبەکان ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم لەخشتە بەن و، بەمەش نەتەوەی کورد

---

یەکەم: دادپەروەری و زانست و خوێندنە.

دووهەمیان: یەکگرتن و خۆشەویستیی نەتەوەییە.

سێهەمیان: مرۆڤ بۆ خۆی کاری خۆی بکات و، بە وێنەی کەسانی نزم بە هیوای توانا و یارمەتیی خەڵکی نەبێت و، پشتیان پێ نەبەستێ.

دوا وەسیەتم:

خوێندن.. خوێندن.. خوێندن!

دەستی یەك گرتن.. دەستی یەك گرتن.. دەستی یەك گرتن).

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٨. چونکە نزیك بوو ئاژاوە و پشێویی ناو شانۆکە بگۆڕێت بە شەڕێکی خویناوی لە نێوان لایەنگران و نەیارانی کۆمەڵەی "ئیتیحاد و تەرەقی"دا. خێرا مامۆستا نوورسی سەرکەوت بۆ سەر سەکۆی شانۆکە و بە دەنگی بەرز گوتارێکی ئاراستەی ئامادەبووان کرد. لە پێشدا داوای بێدەنگی و ڕاگرتنی ئارامیی لێکردن، ئنجا ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە کە دەبێ خۆیان ڕابهێنن لەسەر ڕێزگرتنی ڕای بەرامبەر و ئازادیی گفتوگۆ. هەروەك پێی وتن شوورەییە بۆ نەتەوەیەك مەشرووتیەتی ڕاگەیاندبێت چاودێریی لەمانە نەکات. بەم بۆنەیەشەوە سنگ فراوانیی پێغەمبەری ﷺ هێنانەوە یاد کاتێ ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد. ئیتر بەم ئامۆژگارییانە توانیی ئارامی بگێڕێتەوە بۆ ناو ئەو کۆبوونەوەیەی کە خەریك بوو ببێت بە قەسابخانە.

لەکەدار بکەن، کە ژمارەیان نزیکەی بیست هەزار کەس[1] دەبێت و لە ئەستەمبووڵدا کاری حەماڵی دەکەن و خەڵکانی ساویلکە و خۆش باوەڕن..

بۆیە ساڵی پار ڕۆشتم بۆ هەموو ئەو شوێنە گشتی و چایخانانەی کە ئەو کوردانەی تێدان و، بە ڕادەی تێگەیشتنی خۆیان "مەشرووتیەت"م بۆ ڕوون کردنەوە و، بەم واتایەی خوارەوە پێم وتن[2]:

"ئیستیبداد ستەم و خۆسەپاندنە بەسەر خەڵکانی تردا، بەڵام مەشرووتیەت دادگەری و شەریعەتە.

ئەگەر سوڵتان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بێت و لەسەر ڕێبازە پیرۆزەکەی ئەو بڕوات، ئەوا خەلیفەیە و ئێمەش گوێڕایەڵی دەبین. دەنا ئەو کەسانەی کە سەرپێچی لە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ و ستەم لە خەڵکی دەکەن، تەنانەت گەر سوڵتانیش بن هەر چەتە و ڕێگرن.

دوژمنانی ئێمە (هەژاری و، نەزانی و، دووبەرەکی)یە و.. بە چەکی (پیشەسازی و، زانست و، یەکگرتن) بەگژی ئەو سێ دوژمنەدا دەچینەوە.

بەڵام بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە دەبینە دۆستی ئەرمەنەکانی دراوسێمان، کە تا ڕادەیەك و لە ڕوویەکەوە هۆکاری بێداربوونەوەمان بوون لە بێ ئاگایی و هانداغان بۆ گرتنەبەری ڕێی پێشکەوتن، هەروەها دەست لەناو دەست هاوکاری و هاوڕێیەتیی ئەو تورکانەش دەکەین کە برای ڕاستەقینەمانن.

بەڵێ، لەگەڵ ئەوان و هەموو هاوسێکانماندا هاوکاری دەکەین، چونکە ناکۆکی و دوژمنایەتی کارێکی لەڕادەبەدەر تێکدەرانە بوو. ئێمەش کاتی دوژمنایەتیمان بە دەستەوە نییە.

هەروەها خۆمان لەکاری حکوومەت هەڵناقورتێنین، چونکە حیکمەتی کارەکانی نازانین".

---

(١) لە هەندێ شوێنی تردا ژمارەیان بە چل هەزار دەخەمڵێنێت. (وەرگێڕ)

(٢) دەقی تەواوی ئەم وتارەی کە ئاراستەی حەماڵە کوردەکانی ئەستەمبوڵی کردووە، لە کتێبی "داوەرییەکان" ل: ٦٢١-٦٢٢دا بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

ئەم ئامۆژگارییانەش کاریگەریی خۆیان لەسەر ئەو حەماڵانە بەجێ هێشت کە بەرامبەر کەلوپەلی نەمسا - بە وێنەی من بەرامبەر کەلوپەلی هەموو ئەوروپا - مامەڵەیان دابڕیبوو[1]. ئەوەبوو لەو بارودۆخە یەکجار شڵەژاوەدا ژیرانە ڕەفتاریان نواند)[2].

## ساڵی ١٩٠٩ز/١٣٢٧ك

### ❑ پشتگیریی کۆمەڵەی "یەکێتیی محەممەدی"

(بیستم کۆمەڵەیەك بە ناوی "یەکێتیی محەممەدی" دامەزراوە[3]. لە لایەنی خۆمەوە مەترسییەکی زۆرم لێ نیشت کە لە ژێر پەردەی ئەم ناوە پیرۆزەدا هەندێ لە ئەندامەکانی جموجوڵی هەڵەیان لێ بووەشێتەوە.

پاشان بیستم کە چەند کەسێکی دیار و بەڕێزی چەشنی "سوهەیل پاشا" و "شێخ صادق"[4] ناوەڕۆکی ئەم ناوەیان گۆڕیوە بە شتێکی ساکار و ئاسان، چونکە تایبەتیان کردووە بە تەنها پەرستش و شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێن و، پەیوەندییان بەو کۆمەڵەوە پچڕیوە و دەست وەرنادەنە سیاسەت.. بۆیە جارێکی تر ترسم لێ نیشتەوە و، پێم وتن:

ئەم ناوە مافی سەرجەمی موسڵمانانە، تایبەتکردن و سنوور بۆ دانان هەڵناگرێت.

---

(١) لە بەرواری ٩/ڕەمەزان/١٣٢٦ك (٩/١٠/١٩٠٨ز) وڵاتی نەمسا سوودی لە ئاوابوونی ئەستێرەی سوڵتان عەبدولحەمید وەرگرت و ڕایگەیاند کە "بۆسنە و هەرسك"ی خستووەتە سەر وڵاتەکەی! دوای ئەوە لە ئەستەمبووڵ بایکۆتێکی جەماوەری ڕاگەیەنرا بەرامبەر کەرەسە و شمەکی نەمسا و ئەو گۆگایانەش کە دەیانفرۆشت. حەماڵەکانیش لە لایەنی خۆیانەوە بایکۆتیان سەبارەت بە داگرتنی شتومەکی نەمسا ڕاگەیاند. بەڵام کار لەم سنوورەدا نەوەستا، بەڵکو هێندە تەشەنەی کرد کە ژیانی بازرگانیی لە ئەستەمبووڵدا خستە مەترسییەوە. هەروەك ئەو ئاراستەیەشی گرتەخۆ کە حەماڵەکان سەرپێچیی فەرمانی سەرۆکەکانی خۆیان بکەن و، لە هەندێ چایخانە و لە سەنتەرێکی سەرەکیی خۆیاندا لە (خانی عەشیرەت) کۆبوونەوە بکەن و، کەش و هەوا لەبار بوو بۆ تەقینەوە. لەم کاتەدا بەدیعوززەمان ڕۆشت بۆ لایان و، وتارێکی جوانی لە ئاستی تێگەیشتنی ئەواندا ئاراستە کردن، بەوەش توانیی ڕێ لەوە بگرێت کە ڕووداوەکان بەرەو خراپتر تەشەنە بکەن. تەنانەت پشکنیاری گشتیی پۆلیسی ئەستەمبووڵ سوپاس و ڕێزی پێشکەش کرد لەسەر هەوڵ و تەقالا باشەکانی.

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٥-٤١٦.

(٣) ئەو کۆمەڵەیە لە بەرواری: ٥/٤/١٩٠٩زدا پێکهات و، لە کۆبوونەوەیەکی ئایینیی پڕشکۆدا لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا ڕاگەیەنرا. "مامۆستا نوورسی" وتارێکی ڕەنگینی تێدا ئاراستەی ئامادەبووان کرد.

(٤) ئەم دوو بەڕێزە لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی "یەکێتیی محەممەدی"ن. (وەرگێڕ)

جا هەروەك لە ڕوويەكەوە من پەيوەنديم بە حەوت كۆمەڵەوە هەيە، چونكە بينيم ئامانجەكانيان يەكێكە، پەيوەنديشم بەم ناوە پيرۆزەوە هەيە.

بەڵام ئەو "يەكێتيی محەممەدی"يەی كە من دەيزانم و پەيوەنديم پێوەی هەيە: بازنەيەكی پەيوەستە بە زنجيرەيەكی نوورانيی ئەوتۆ كە هەر لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا و لە باشوورەوە بۆ باكوور درێژ بووەتەوە.. ئەو كەسانەش كە لە ژێر ئاڵاكەيدا ڕيزيان بەستووە لەم سەردەمەدا ژمارەيان لە سێ سەد مليۆن زياترە و.. لايەنی يەكبوون و پەيوەندی لەم كۆمەڵەيەدا "تەوحيد"ی خوای گەورەيە و.. سوێند و پەيمانی بريتييە لە ئيمان و.. ئەوانەش كە پەيوەندييان پێوە كردووە هەموو ئيماندارانن هەر لە سەرەتای بەديهێنانی مرۆڤەوە و.. تۆماری ناوی ئەندامەكانيشی لەوحی مەحفووزە و.. بڵاوكەرەوەی بير و بۆچوونەكانيان سەرجەم كتێبە ئيسلامييەكانە و، ڕۆژنامەكانيشيان هەموو ئەو ڕۆژنامە ئايينييانەيە كە ئامانجيان بەرزكردنەوەی ئاڵای ئيسلامە و.. شوێنی كۆبوونەوەكانی سەرجەم مزگەوت و تەكيە و خانەقا و قوتابخانە ئايينييەكانە و.. مەڵبەندەكەشی هەردوو حەرەمی پيرۆزە..

ئيتر كۆمەڵەيەكی وەك ئەمە، سەرۆكەكەی فەخری عالەم پێغەمبەری سەروەرمانە ﷺ.. بەرنامە و ڕێبازيشی ئەوەيە كە هەموو كەسێك موجاهەدەی دەروونی خۆی بكات، واتە ڕەفتار كردنە بە ڕەوشتە بەرز و بڵندەكانی پێغەمبەری خۆشەويست ﷺ و، زيندوو ڕاگرتنی سوننەتی پيرۆزی و، خۆشەويستيی خەڵكانی تر و، ئامۆژگارييان بە گوفتارێكی هێندە نەرم كە زيانی لێ نەبێتەوە.

پرۆگرامی ناوخۆييشی سوننەتی پيرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و.. ياساكانی فەرمان و نەهييەكانی شەرعە و.. شمشێرەكانی بەڵگە بەهێز و گومان بڕەكانە، چونكە سەركەوتن بەسەر خەڵكانی شارستانی و ڕۆشنبيردا بە قەناعەت پێ بەخشين دەبێت، نەك بە گوشار و زۆرەملێ.

سۆراخ كردن و بەدواداگەڕانی "ڕاستی"ش بە "خۆشەويستی" ئەنجام دەدرێت، كەچی دژايەتی تەنها بەرامبەر وەحشيگەری و دەمارگيری دەبێت.

ئامانجيشی بەرزكردنەوەی ئاڵای ئيسلامە.

ئەوەش هەیە کە ڕێژەی ڕەوشت و پەرستش و ڕەفتارە بەرزەکان لە شەرعدا لە سەدا نەوەدونۆیە و، ڕێژەی سیاسەتیش لە سەدا یەك تێپەڕ ناکات. دەبا کاربەدەستانمان بیری لێ بکەنەوە.

ئێستاش ئامانجمان ورووژاندنی شەوق و حەزی ناو ویژدانی هەموانە لە ڕێی پێشکەوتنەوە بەرەو کەعبەی ئاکارە بەرز و بڵندەکان. ئەمەش بە بزواندنی ئەو زنجیرە نوورانی‌یە، چونکە پێشکەوتنی ماددی لەم سەردەمەدا هۆکارێکی گەلێ مەزن و گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی وشەی "الله" و ئاڵای ئیسلام.

بەم جۆرە، من یەکێکم لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵەیە و، هەوڵدەران بۆ شەکاندنەوەی ئاڵاکەی و، دەرخستنی ناوەکەی..

دەنا هەرگیز لەو جۆرە حیزب و کۆمەڵانەدا نیم کە دووبەرەکی و جیاوازی لە نێوان خەڵکیدا دەنێنەوە)[1]!

(لە یەکەم ڕۆژەکانی لێکۆڵینەوەدا[2] لێیان پرسیم، وەك لە کەسانی تریشیان پرسی:

ئایا پەیوەندیت بە "یەکێتیی محەممەدی"یەوە کردووە؟

وتم:

بەڵێ، من بە سەربەرزی و شانازی‌یەوە بچووکترینی ئەندامەکانیم. بەڵام بەو ڕووەی کە خۆم دەیناسێنم.

دەسا فەرموون کەسێکم نیشان بدەن - جگە لە مولحیدان - کە لە دەرەوەی ئەو یەکێتی‌یەدا بێت؟

وا من ئەمڕۆ بەم جۆرەی خوارەوە وتارەکەم بڵاو دەکەمەوە، تاکو "مەشرووتیەت" لە چەپەڵ بوون بپارێزم و، "ئەهلی شەریعەت"یش لە نائومێدی ڕزگار بکەم و، "ڕۆڵەکانی ئەم چەرخ"ەش لە بەرچاوی ڕوانینی مێژوودا لە ناتۆرەی شێتی و نەزانی دەرباز بکەم و.. "ڕاستی"ش لە ناو گومان و دوودڵی‌یەکان دەربهێنم)[3].

---

(١) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٩-٤٢٠.

(٢) واتە لە دادگای عورفیی سەربازیدا. (وەرگێڕ)

(٣) داوەری‌یەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١١.

(من لە پێناوی دوو ئامانجی مەزندا بە ئاشکرا بانگهێشتی خەڵکیم بۆ ئەم "یەکێتیی محەممەدی"یە دەکرد:

*ئامانجی یەکەم:* پاراستنی ئەو ناوە لەوەی کە بخرێتە ناو سنوورێکەوە و تایبەت بکرێت پێی، بەڵکو ڕایبگەیەنم کە سەرانسەری ئیمانداران دەگرێتەوە، تاکو جیاوازی و دووبەرەکی ڕوو نەدات و، شوبهە و گومانەکانیش ڕووی تێ نەکات.

*ئامانجی دووهەم:* بۆ ئەوەی ببێت بە بەربەستێك لە بەردەم جیابوونەوە و لێکترازانی ئەو حیزب و دەستە و تاقمانەی کە هۆکاری ڕوودانی ئەم گرفتە مەزنە بوون کە ڕابورد[1]، ئەوەش بە هەوڵی یەکخستنیان. کەچی بە داخەوە کات یارمەتیی نەداین و، لافاوەکە هات منیشی لەگەڵ خۆیدا ڕامالی!

پاشان من دەموت: گەر ئاگرێك بکەوێتەوە، لانی کەم هەوڵی کوژاندنەوەی بەشێکی دەدەم، کەچی تەنانەت بەرگ و پۆشاکە زانستییەکەی خۆیشم سووتا و، بە سوپاسەوە ئەو ناوبانگە درۆینەیەم تیاچوو کە ناتوانم پارێزگاریی لێ بکەم)[2]!

❑ وتاری: بەرپەرچدانەوەی گومانەکان[3]

لێرەدا ئەو نۆ دانە گومانە هەڵەیە دەهێنم کە دراونەتە پاڵ کۆمەڵی "یەکێتیی محەممەدی":

*گومانی یەکەم:*

باسکردنی بابەتی ئایینی لە ناوەندەکاندا بۆ ئەم چەشنە بارودۆخە ناسکە ناگونجێت.

*وەڵام:*

یەکەم: ئێمە ئایینمان خۆش دەوێت و، هەر لەبەر ئایینیش دنیامان خۆش دەوێت (لا خير في دنيا بلا دين).

دووهەم: مادەم لە سیستەمی مەشرووتیەتدا میللەت فەرمانڕەوایە، ئەوا دەبێ میللەت بوونی خۆی بەرجەستە بکات.

---

(١) مەبەست ڕووداوی "٣١"ی مارتە. (وەرگێڕ)

(٢) داوەرییەکان، پرانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٢.

(٣) ئەم وتارە لە دوو ژمارە (٩٠-٩١)ی ڕۆژنامەی ئایینیی (وولقان) لە بەرواری ٣/٣١ و ١٩٠٩/٤/١زدا بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

میللەتی ئێمەش هەر تەنها موسڵمانە. چونکە جگە لە ئایینی ئیسلام هیچ پەیوەستێکی ڕاستەقینە و بەهێز نی‌یە کە (عەرەب و تورك و کورد و ئەلبان و چەرکس و لاز) پێکەوە گرێ بدات.

ئاشکرایە کە پشتگوێ خستنێکی یەکجار کەمی ئایین، بوو بەهۆی قایمکردنی بناغەی دەستە و تیرە جیاجیاکان و پاشاگەردانی و، زیندوو بوونەوەی دەمارگیریی جاهیلیی مردووی پێش سیازدە سەدە و، سەرهەڵدانی ئاشووب و پشێوی. ئەوەبوو هەموو ئەمانە هاتنە دی و بە چاوی خۆشمان بینیمانن.

*گومانی دووهەم:*

تایبەت کردنی ئەم ناونیشانە (واتە یەکێتیی محەممەدی) ئەو کەسانە دەخاتە گومان و دوودڵی‌یەوە کە پەیوەندییان پێوە نەکردووە.

*وەڵام:*

پێشتر وەڵامی ئەمەم داوەتەوە. یان نەخوێندراوەتەوە، یاخود بە هەڵە لێکدراوەتەوە. بۆیە ناچارم دووپاتی بکەمەوە و بڵێم:

ئێمە کاتێك کە دەڵێین: (یەکێتیی محەممەدی) کە یەکێتیی ئیسلامە، مەبەستمان ئەو یەکێتی‌یە جێگیر و دامەزراوەیە کە چ لە ڕاستیدا هەیە و چ لە دۆخی هێز و توانا و لێهاتندایە لە نێوان سەرجەمی ئیمانداراندا و، هەرگیز مەبەست کۆمەڵە خەڵکێك نی‌یە لە ئەستەمبووڵ یان لە ئەنادۆڵدا. چونکە یەك دڵۆپ "ئاو" سیفەتی ئاوی لە خۆگرتووە. کەواتە کەس لەم یەکێتی‌یە بەدەر نی‌یە و، ئەم ناونیشانەش تایبەت نەکراوە بە هیچ کەسێکەوە.

پێناسە ڕاستەقینەکەی ئەمەیە:

بناغەی ئەم یەکێتی‌یە: لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا و لە باشوورەوە بۆ باکوور درێژەی هەیە و..

مەڵبەندەکەشی: هەردوو حەرەمی پیرۆزە و..

لایەنی یەکبوونی: تەوحیدی خوای گەورەیە و..

سوێند و پەیمانی بریتی‌یە لە: ئیمان و..

پەیڕەو و پڕۆگرامی ناوخۆشی: سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و..

یاساکانی: فەرمان و نەهی‌یەکانی شەرعە و..

شوێنی کۆبوونەوەکانی: سەرجەم قوتابخانە و مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانە و..

بڵاوکەرەوە هەمیشەییەکانی بیر و بۆچوونەکانی ئەو کۆمەڵە: هەموو کتێبە ئیسلامی‌یەکانە، کە لە پێشەنگیانەوە قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکانیەتی (پەیامەکانی نوور یەکێکن لەو تەفسیرانە لەم ڕۆژگارەی خۆماندا) هەروەها سەرجەمی ئەو ڕۆژنامە ئایینی و خاوێنانەیە کە ئامانجیان بەرز کردنەوەی ئاڵای ئایینی ئیسلامە و..

شوێنکەوتووانیشی: هەموو ئیماندارانە و..

سەرۆکەکەشی: فەخری عالەمە ﷺ.

ئێستا ئەو خاڵەی مەبەستمانە: بێداربوونەوەی ئیمانداران و ڕۆشتنیانە بەرەو ئیسلام. دیارە کاریگەریی ڕای گشتی ئینکاری ناکرێت..

ئامانج و مەبەستی ئەم یەکێتی‌یە: بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامە و..

ڕێبازیشی: جیهادی هەرە گەورەی دەروون و، ڕێنمایی خەڵکانی ترە و..

هیممەت و لێبڕانی ئەم کۆمەڵ و دەستە پیرۆزە بە ڕێژەی لە سەدا نەوەد و نۆ لە شتانی غەیری سیاسەتدا وەك: پاکژ کردنی ڕەوشت و ڕێککردنەوەی ڕەفتارەکان و ئامانج و فەزیلەتە ڕەواکانی هاوشێوەیاندا، بەکار دەبرێت. چونکە ئەو کۆمەڵانەی کە بایەخ بەم شتانە بدەن زۆر دەگمەن و کەمن، لە کاتێکدا کە بوونیان زۆر گرنگە. تەنها یەك لە سەدی ئامانجەکانی ئەو کۆمەڵە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە، ئەویش ڕێنمایی کردنی سیاسی‌یەکانە.

شمشێرەکانیشی: بەڵگە بەهێز و گومان بڕەکانە.

مەشرەبی: خۆشەویستی‌یە و پەرەپێدانی ئەو خۆشەویستی‌یەیە کە لەناو تۆوی برایەتیی ئیمانداراندا هەیە، تاکو ببێت بە درەختێکی تووبای بە فەڕ و پیرۆز.

*گومانی سێ‌هەم:*

ئەم کۆمەڵەیە زیاد لەوەی کە دووبەرەکی دەنێتەوە و کەسانی تر تووشی نائومێدی دەکات، چ سوودێکی هەیە؟

*وەڵام:*

ئەمە دووبەرەکی نییە، یەکگرتنە.. نائومێدی نییە، بەڵکو ئومێد بەخشینە.

ئەو ڕاستییە زۆر گەورەیەی کە وەك گەنجینەیەکی ئاڵتوون وایە، بە دۆزینەوەی سوچێکی لە نیوەی گۆی زەویدا، وەك مەشخەڵێك درەوشاوەتەوە.

هەروەك دەریایەکی گەورە لە پیاڵەیەکدا جێی نابێتەوە، "یەکێتیی محەممەدی"ش نە لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆژنامەی "وولقان" و نە لە ئەستەمبوولیشدا قەتیس نابێت.

بەڵکو ئەو "یەکێتیی محەممەدی"یەی کە ئێستا بەشێکی لە دۆخی "هێزە"وە ڕۆشتووەتە دۆخی "کردار" - چەشنی لێدانی دکتۆرێك بە مەبەستی پشکنین - بریتییە لە وریاکردنەوەیەك.

هەروەها بزواندنی ئەو زنجیرە درێژ و یەك لە دوای یەکە نوورانییەی کە مەڵبەندەکانی موسڵمانان بە یەکەوە دەبەستێتەوە، بێدارکردنەوەی هەموو ئەو موسڵمانانە دەگەیەنێت کە پێیەوە پەیوەستن و، هاندانیانە - بە حەز و فەرمانێکی ویژدانی - بۆ پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی کە لەم سەردەمەدا گەورەترین هۆکارن بۆ بەرزڕاگرتنی وشەی "اللّٰه" (ئاڵای ئیسلام)..

چونکە ڕزگار بوون لە ئیستیبداد، بە هاندەری حەز و شەوقی ویژدان دەبێت..

دەبینیت لە نێوان هەزار کەسدا تەنها یەك دانەیان ڕۆشنبیرە و، لە ناخی ویژدانیدا هەست بەو حەز و شەوقە دەکات، جا ئەگەر بە هەستی ئایینی بێت، ئەوا لە ڕێی پێشکەوتندا تایبەترین کەسی چینی تایبەتمەندان و عەوامترین کەسی ئاسایی، وەکو ڕۆشنبیرەکەوان و، لەو هەستە ئایینییەدا یەکسانن.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئێمە زانیاریی گشتی و شارستانێتی تەواوەتیمان لە بەردەستدا نییە - کە هۆکاری ڕۆشنبیر کردنن - ئەوا دەبێت ئایینی ئیسلام، کە ڕۆشنایی هەموو ڕووناکییەکانە، بکەینە مەشخەڵێکی ڕووناکی بەخش، تاکو ئاهەنگی پێشکەوتن نەشێوێت.

*گومانی چوارەم:*

ناموسڵمانەکانی ناومان دەترسن، یاخود ورك دەگرن!

*وەڵام:*

ورك گرتن پیشەیەكی منالآنە و ناپاكانەیە.. ترسانیش نەزانییە، یان خۆدانە لە نەزانی..

بەرزیی ئایینی ئیسلام و نەبوونی ئەو گرفتەش كە ئەوان بە گومان دروستی دەكەن، لێرەدا وەك خۆر ئاشكرایە. چونكە ناموسڵمانان لە سەدەكانی ناوەڕاستدا و لەو كاتەدا كە نەزان و ناشارستانی بوون، بە فەرمانی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ هاوڕێ لەگەڵ سەرجەم ئایین و نەتەوە جیاوازەكانی ناو شارستانێتیی ئیسلامدا بە پارێزراوی ماونەتەوە. هەروەها سەلامەتیی ناموسڵمانان لە ئاسوودەیی وڵاتدایە.

"بەردەوامیی گیان" و "خاڵی پشت پێ بەستن" و "ڕابەر"ی مەشرووتیەتیش ئایینی ئیسلامە، كە شەریعەت و نەتەوایەتیمانە. كەواتە ناموسڵمانەكان نابێت لەم یەكێتییە بترسن، بەڵكو دەبێت دڵیان پێی خۆش بێت و بە پیرۆزی ڕایبگرن.

*گومانی پێنجەم:*

لەوانەیە بیانییەكان لەم یەكێتییە بێزار بن.

*وەڵام:*

ئەو كەسەی كە ئەم گریمانە دادەنێت بێ گومان كەسێكی بێ ئاگا و نەزانە، چونكە ئەو هەموو وتار و موحازەرانەی كە لە كۆنفرانسەكانیاندا سەبارەت بە گەورەیی و بەرزیی ئیسلام لە مەڵبەندی دەمارگیریی پایتەختەكانی ئەواندا پێشكەش دەكرێن[1]، دەست بە ڕووی ئەم گریمانەوە دەنێت.

پاشان دوژمنانی ئێمە ئەو بیانییانە نین، بەڵكو ئەو شتەی كە ئێمەی بەرەو ئەم بارودۆخەی ئێستامان دابەزاند و ڕێی بەرزكردنەوەی ئاڵای ئیسلامی لێ گرتین، تەنها سەرپێچی كردنمانە لە فەرمانەكانی "شەریعەت" كە ئەویش ئەنجامی "نەزانی"مانە و، هی "هەژاری"یەكە بەدڕەوشتی و بەدڕەفتاری لە ئێمەدا بەرهەمی هێنا و، هۆكاری "دووبەرەكی"ی نێوانمانە كە ئامانجە كەسییەكان و دووڕوویی لە ئێمەدا هێنایە دەرخستن. كە هێرشی ئەم یەكێتییەی ئێمە بۆ سەر ئەم سێ دوژمنە بێ ویژدانیە.

---

(١) ئاماژەیە بۆ وتار و ڕوونكردنەوەكانی بسمارك و میستەر كارلایل و هاوشێوەكانیان. (دانەر)

نەزانی و بێ ئاگایی بیانییەکانیش سەبارەت بە ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەوا ئیسلام هەرچەندە ناچار بووە دوژمنایەتیی نەزانی و وەحشیگەری بکات، کەچی پارێزگاریی دادگەری و میانەڕەویی لەگەڵ ئەواندا کردووە، ئەوەتا لە مێژووی ئیسلامدا شتانی وەك "دادگاکانی پشکنین" نەبینراوە. ئنجا لەبەر ئەوەی لەم سەردەمی شارستانێتییەدا "بیانییەکان" هێز و شارستانێتییان بەدەست هێنا، ئەوا دەمارگیریی نەفرەت لێکراویان لە لا نەما.

لە ڕوانگەی ئاینەوە سەرکەوتن بەسەر کەسانی خاوەن شارستانێتیدا بە "قەناعەت" پێ کردن دەبێت، نەك بە زۆرەملێ.. هەروەها بە پیشاندانی ئیسلام لە پێش چاویاندا لە شێوەیەکی بەرز و خۆشەویستدا، ئەویش بە گوێڕایەڵیی جوان و ڕێکوپێکی فەرمانەکان و پێش چاو خستنی ڕەوشتە بەرزەکان.

بەڵام دوژمنایەتی و بەکارهێنانی زەبر و زەنگ تەنها بەرامبەر دڕندەیی وەحشیگەرەکانە.

*گومانی شەشەم:*

هەندێ کەس دەڵێن: هەڵبژاردنی "پەیڕەوی کردن لە سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ" وەك ئامانجی "یەکێتی"یەکە، سنوورێك بۆ ئازادی دادەنێت و لەگەڵ خواستەکانی شارستانێتیدا ناگونجێ.

*وەڵام:*

یەکەم: ئیماندار لە ماف و زاتی خۆیدا ئازادە. چونکە ئەو کەسەی بەندەی خوای گەورەی پەروەردگاری جیهانیانە، هەرگیز نابێ زەلیلی بۆ هیچ کەسێك بنوێنێت. بەو واتایەی کە: هەتا ئیمان دامەزراوتر بێت، ئازادی و سەربەستی پتر بەهێز دەبێت.

هەرچی ئازادی و سەربەستیی ڕەهایە، لە ڕاستیدا بریتییە لە وەحشیگەریی ڕەها، تەنانەت "ئاژەڵێتی"یە. لە گۆشە ڕوانینی مرۆڤایەتییەوە سنوور دانان بۆ ئازادی گەلێ پێویستە.

دووهەم: ئەوانەی کە وەکو منداڵ حەزیان لە هەوا و هەوەس و ئارەزووەکانە، خراپکارییەکانی شارستانێتی بە چاکە دەزانن. لە کاتێکدا کە هیچ چاکەیەکی

ڕاستەقینەی شارستانێتی نییە لە ئایینی ئیسلامدا چ بە ڕاشکاوی و چ بە شێوەیەکی ناوەکی نەبێت، یاخود ڕوخسەتی پێ نەدرابێت، یان لەوەی ئیسلام جوانتر و باشتر بێت.

سێهەم: هەندێ کەسی هەرزە و بێ ئامانج دەیانەوێت هەر لە زەلیلی و دیلیی دەروونی بەدخوازدا بمێننەوە و، ژیانی ئازادانە و سەربەستییان پێ خۆش نییە.

*بە پوختی:*

ئەو ئازادییەی کە لە بازنەی شەرع بەدەرە، لە ڕاستیدا بریتییە لە ئیستیبداد، یان دیل بوونە بە دەستی دەروونی بەدخواز، یاخود دڕندەیی و ئاژەڵێتییە.

جا با ئەو مولحید و بێ ئامانجانەی کە ئایینیان پشتگوێ خستووە، بزانن کە هەرگیز بە ئیلحاد و هەرزەیی ناتوانن لە لای هیچ بیانییەکی خاوەن ویژدان خۆیان خۆشەویست بکەن، تەنانەت هەر ناشتوانن کارێك بکەن لەوان بچن! چونکە ئەو هەرزە و نەفامەی کە بێ ئامانج و بێ بەرنامەیە و بێ هیچ بەرچاو ڕۆشنییەکە، لە ڕاستیدا کەس خۆشی ناوێت. ئەوەتا پۆشاکێك بۆ قەد و باڵای ئافرەت بشێت گەر پیاو لەبەری بکات دەبێتە مایەی سووکایەتی و گاڵتەجاڕی!

*گومانی حەوتەم:*

کۆمەڵەی "یەکێتیی ئیسلام" لە ڕاستیدا دووبەرەکی لە نێوان سەرجەمی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی تردا دەنێتەوە و حەسوودی و نەفرین بەرهەم دەهێنێت.

*وەڵام:*

*یەکەم:* کاروبارە قیامەتییەکان حەسوودی و پاڵپاڵێن و موناقەشەیان تێدا نییە. جا هەر موناقەشە و ئیرەییەك سەبارەت بەو کۆمەڵانە، وەکو ئەوە وایە کە دووڕوویی و ڕیاکاری لە خواپەرستیدا بکرێت.

*دووهەم:* ئێمە بە دوو مەرج لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا یەکدەگرین و پیرۆزباییان لێ دەکەین کە بە هاندەری خۆشەویستیی ئایین و خزمەتکردنی پێکهاتوون:

مەرجی یەکەم: پاراستنی ئاسایشی گشتیی وڵات و سەربەستیی شەرعی.

مەرجی دووهەم: گرتنەبەری ڕێبازی خۆشەویستی لە هەموو جموجووڵێکدا و، هەوڵ نەدان بۆ لەکەدارکردنی کۆمەڵەکانی تر بۆ ئەوەی بەها و برەوی زیاتر بە خۆی

بدات. خۆ ئەگەر هەڵەیەکیش پێش چاو کەوت، بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی بۆ لای موفتیی نەتەوە و کۆمەڵەی زانایان بگەڕێنەوە.

*سێهەم:* ئەو کۆمەڵەی کە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام بێت هەرگیز نابێت بە هۆکار و ئامراز بۆ هیچ چەشنە ئامانجێك، هەرچییەك بێت..

خۆ ئەگەر دەست بە داوێنی هەر ئامانجێکی ترەوە بگرێت، ئەوا لەبەر ئەوەی دەبێ بە نیفاق و دووڕوویی، هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. کەواتە شان و شکۆی حەق بەرز و بڵندە و لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت ناکرێت. چونکە چۆن دەکرێ هێشووە ئەستێرەی کۆ(سورەیا) بکرێت بە گسك؟ یان بە وێنەی هێشووی ترێ بخورێت؟ ئەو کەسەی دەیەوێت بە فووی دەم خۆری "حەقیقەت" بکوژێنێتەوە شێتیی خۆی دەردەخات!

دەسا ئەی ڕۆژنامە ئایینییەکان!

ئامانجمان یەکگرتنی کۆمەڵە ئایینییەکانە لە مەبەست و ئامانجەکاندا. چونکە یەکگرتن لە ڕێباز و مەشرەبەکاندا هەروەك لە تواناداا نییە، دروستیش نییە، چونکە چاولێکەری ڕێی خۆی لەوێدا دەکاتەوە و وا لە مرۆڤ دەکات بڵێ: "من چیم لەم کارە داوە؟ با یەکێکی تر بیری لێ بکاتەوە".

*گومانی هەشتەم:*

زۆربەی ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بە "یەکێتیی ئیسلام"ەوە کردووە - چ لە ڕاستیدا و چ لە ناوەڕۆکدا - لە چینی عەوامن و، هەندێکیشیان نەناسراون. ئەمەش هۆکارێکە بۆ سەرهەڵدانی ئاشووب و دووبەرەکی.

*وەڵام:*

پەیوەندی کردنی ئەوانە تەنها لەبەر ئەوەیە کە لەم یەکێتییەدا بوار بە جیاوازی و ئامانجە کەسییەکان نەدرێت. پاشان لەبەر ئەوەی مرۆڤ لەم یەکێتییەدا بانگەشە بۆ بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلام دەکات، ئەوا هەر کردارێك لەو پێناوەدا ئەنجام بدات پاداشتی پەرستشی بۆ دەنووسرێت. نابینی مزگەوت کە شوێنی خواپەرستییە پادشا و

سوالكەر بە بێ هيچ جياوازی‌يەك تيايدا يەكسانن، تەنانەت يەكسانيی ڕاستەقينە دەستوورێكی جێبەجێ كراوە و، ئيمتيـاز بۆ كەس نی‌يە، چونكە بەڕێزترين كەس لای خوا ئەوەيە لە هەموويان زياتر خاوەنی تەقوا بێت، خۆ ئەو كەسە هەرە بەتەقوايە بريتی‌يە لە مرۆڤی خۆنەويست.

جا لەسەر بناغەی ئەم ياسايە، ئەو كەسەی بە نيازی خزمەتی ئايين و بانگەواز بۆ قيامەت پەيوەندی بەم كۆمەڵە ئايينی و قيامەتی‌يەوە دەكات، خۆی شەرەفمەندی و سەربەرزی بەدەست دەهێنێت، دەنا هيچ شەرەف و سەربەرزی‌يەك بۆ ئەم يەكێتی‌يە زياد ناكات، چونكە بە دڵۆپێك ئاو هيچ لە دەريا زياد نابێت..

پاشان هەروەك مرۆڤ بە كردنی گوناهی كەبيرە كافر نابێت، دەرگای پەشيمانی و تۆبەش هەتا هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە هەر كراوەتەوە و، دەرياش بە لەوێچێك ئاو پيس نابێت، بەڵكو دەستەكە پاك دەكاتەوە.

جا ئەو كەسەی پەيوەندی بەم نموونە بچووكەی "يەكێتيی ئيسلامی"يەوە دەكات، ئەوەی لێ دەگيرێت بە مەرج كە: شوێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بكەوێت و، لە ژيانی خۆيدا زيندووی بكاتەوە و، فەرمانەكانی ئەو سوننەتە جێبەجێ بكات و، لەو شتانەش دوورەپەرێزی بكات كە سوننەت نەهيی لێ كردوون و، ئاسايش و سيستەمی وڵات تێك نەدات.

جا ئەگەر كەسێكی نەناسراو بە نيازی خراپ پەيوەندی بەم يەكێتی‌يەوە بكات، هەرچەندەش هەوڵ بدات ناتوانێت ئەم ڕاستی‌يە چەپەڵ بكات، تەنانەت گەر مرۆڤ سەبارەت بە خۆی گوناهباريش بێت، خۆ ئيمانەكەی پاك و خاوێنە و، ئەو پەيوەندی‌يەش كە بە يەكێتيی ئيسلامەوە پەيوەستی دەكات تەنها "ئيمان"ە، نەك شتی تر.

ئيتر شێواندن و ناشيرين كردنی ئەم ناونيشانە پاك و پيرۆزە بەم چەشنە بڕوبيانووە لاوازانە، تەنها ئەنجامی بێ ئاگاييە لە مەزنيی ئيسلام، جگە لەوەی كە ئەو كەسەی بەهانە و بڕوبيانووی لەم جۆرە دەهێنێتەوە دەری دەخات كە لە هەموو كەسێك گەوج و نەزانترە.

ئێمە بە هەموو هێزێکمانەوە ڕووبەڕووی هەر هەوڵێك دەوەستین کە بیەوێت ناوبانگی باشی "یەکێتی"یەکەمان بشێوێنێت کە نموونەی (یەکێتی)یە، یان بە وێنەی کۆمەڵە دنیاییەکان توانجی تێ بگرێت. ئێمە ئەوپەڕی ئامادەباشیمان بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیار و ڕەخنەیەك تێدایە.

ئەو کۆمەڵەی کە پەیوەندیم پێوە کردووە ئەم یەکێتی‌یە ئیسلامی‌یەیە کە بە درێژی لێی دوام. ئەوەتا شتێك نی‌یە لەوانەی کە بیانووگران بە ئەندێشەی ناڕەوای خۆیان بیری لێ دەکەنەوە. تاك تاکەکانی ئەم دەستە و کۆمەڵە ئایینی‌یە هەمیشە پێکەوەن، چ لە خۆرهەڵات بن یان خۆرئاوا، چ لە باشوور بن یان باکوور.

*گومانی نۆهەم:*

لە کاتێکدا کە کۆمەڵەکانی تر "نهێنی پاراستن"ی تێدایە، کەچی لە "یەکێتیی محەممەدی"دا دەرخستنی نهێنی‌یەکان بە پێویست زانراوە؟

*وەڵام:*

ئایینی ئیسلام ئاشکرایە.. خۆ ئەگەر ئەو هێزی فراوانبوونەی کە لە خۆی گرتووە، بەرتەسك بکرێتەوە، ئەوا بوومەلەرزە بە هەموو "بوون"ی دەخات..

ئنجا "شاردنەوە"ش لەبەر ئەوەی فێڵ و گومان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ئەوا ئەو ڕاستی‌یەی کە لە فێڵ و گومان بەری‌یە، لە "پەنهانی"ش بێ باکە! فێڵیش - لە ڕاستیدا - بریتی‌یە لە وازهێنان لە فێڵ!

"سەرڕاستیی" ئەم کۆمەڵەیە، لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکەدا بەراورد ناکرێت. چونکە ئەوان وا تازە خەریکن بناغە دادەنێن، کەچی ئەم لە کاتێکدا کە خۆی دامەزرێنەرە، لە هەندێ گۆشەیەوە خەریکە دەبریسکێتەوە.

هەروەها ئەم لە سەرەتای ئیسلامدا - کە ژمارەی هەڵگرانی چل کەس بوو - نەشاررایەوە، ئێستا چۆن دەشارڕێتەوە کە هەڵگرانی سێ سەد ملیۆن کەسن؟

هەروەها شتێك کە "ژیری" ببینێت و پەسەندی بکات، "هزر"یش سەرقاڵ دەبێت پێیەوە و ملی بۆ نەوی دەکات.. "حەقیقەت"یش پەردەی پەنهانی قبووڵ ناکات)[1].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتاری شام، ل: ٥٤٧-٥٥٦.

❑ بێدارکردنەوەی ڕۆژنامەوانان

(ڕۆژنامەکان لە ڕێی دوو پێوەری نـاڕەوا و بێ کـەڵك و، بە چەند بڵاوکراوەیـەکی سەربەرزی شکێن، لەرزەیان بە ڕەوشتە ئیسلامیەکان خست، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بیروڕای گشتییان لەناوبرد. بۆیە منیش بە چەند وتـارێك ڕووبەڕوویان بوومـەوە کە لـە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرانەوە و، پێم وتن:

ئەی ڕۆژنامە نووسەکان! دەبێ ئەدیبان پابەند بن بە ئەدەبـەوە و، بـەو ئادابـەی شـایانی ئیسلامە ڕەفتار بکەن. هەروەها دەبـێ گوفتارەکانیـان لـە سینەیەکی دوور لـە لایـەنگری دەربچێت و لە دڵ و دەروونێکـەوە سـەرچاوە بگرێـت کـە گوزارشـت لـە ڕای گشـتیی خـەڵکی بکـات و، سەرانسـەری نەتـەوە لـە وتارەکانیـاندا هـاوڕا و هاوسـۆزیان بێـت. هەروەها دەبێ ئەو هەستە ئایینی و نیـازە پاکـەی کـە لـە ویـژدان و ناخیاندایە، بەرنامـەی چاپەمەنی ڕێك بخات..

کەچی ئێوە بە پێوەرێکی بێ کەڵك، واتە: سەیرکردنی لادێ بە چاوی ئەستەمبووڵ و ئەستەمبووڵیش بە چاوی ئەورووپا، ڕای گشتی و بیروڕای باوی ناو کۆمەڵتان خستـووەتە نـاو زەلکـاوێکی بۆگەنـەوە. بـەم کارەشتان دەمـاری ئامانجـە کەسـیـیەکان و، سـوودە خۆییەکان و، حەزی تۆڵەسەندنەوەتان لەو خەڵکەدا بێدار کردووەتەوە..

"فەلسەفەی سروشتی" بەگوێی منداڵێکدا نادرێت کە هێشتا نەڕۆشتووەتە قوتابخانە!

جا هەروەك پۆشاکی ئافرەتان شایانی پیاو نییە، بە هەمان جۆر نابێ هەسـت و نەستە ئەوروپاییـەکان لـە ئەستەمبووڵدا پیـادە بکرێن. چونکـە جیـاوازیی نەتـەوە و شـوێنەکان وەکو جیاوازیی کات و سەردەمەکان وایە؛ پۆشـاکی ئـەم بـۆ ئـەو نـابێت. واتـە شۆڕشـی فەرەنسی ناگونجێ بکرێت بە دەستوور بـۆ ئێمـە. هەڵـە لەوەدایـە کـە تیۆرەکـان جێبـەجێ بکرێن و، ئاوڕ لە داخوازییەکانی ڕۆژگار و سەردەم نەدرێتەوە)[1].

(بەپێی زانیارییەکانم "ئەدیبـەکان" بـە ئـەدەبن و پـەروەردەی بیری خـەڵکی دەکـەن! کەچی دەبینم هەندێ لە ئەدیبەکان لـە ئـەدەب بێ بەشـن و لـە ڕۆژنامـەکاندا دووڕوویی بڵاو دەکەنەوە..

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٧-٤١٨.

جا ئەگەر "ئەدەب" بریتی بێت لەمە و، بیر و ڕا گشتییەکان تا ئەم ڕادەیە تێکەڵ و پێکەڵ بن، ئەوا ئێوە بە شایەت بن کە وازم لەم ئەدەبە هێناوە و تیایدا بەشدار نیم. بەڵکو دەچم لەسەر لوتکەی چیا بەرزەکانی کوردستان ، لەسەر دوندی چیای "باشید" لە بریی خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامانە، تەن و قەبارەکانی ئاسمان و تابلۆ ڕەنگین و ڕووناکەکانی دەخوێنمەوە)[1].

(من ڕەخنە لە بناغەی ئەو بیروبۆچوونانەی ڕۆژنامەکان دەگرم کە لە ناوەڕاستی مانگی نیسان بە دواوە سەری هەڵدا.

چونکە ئەوان دەلاقە و پاساوێکیان بۆ ڕەخسا بۆ لەدەستدانی سەربەرزی و کەرامەت و بنەمای گوێڕایەڵیی سەربازی، کە چەند شتێکن لە "ژیان" بەنرخترن، تەنانەت ژیانیان لە پێناودا بەخت دەکرێت. ئەوەش لە پێناوی چەند کردارێکی ناڕەوا و نزمی ئەوتۆدا کە لای کەسانی خاوەن ویژدان ئەو کردارانە بە "خزمەتکاری خودی ژیان" دادەنرێن.

ئنجا ئەو "شەریعەت"ەی کە هەموو ڕاستی و حاڵ و بارودۆخەکان بە لایدا کێش دەبن و پەیوەستن پێوەی، ئەوان لەو گومانە هەڵەیەدا بوون کە شوێنکەوتەی دەستەڵاتدارانە و، جڵەوی بە دەست خەلافەتەوەیە، یان ئامرازی دەستی هەر سیاسەتێکی ترە..

بەم باوەڕەشیان وایان پیشان دا کە خۆری درەخشان شوێنکەوتەی ئەستێرەیەکی گیراوی ڕۆچووی پووکاوە بێت. بەمەش ناڕەواییان کرد.

وا من بە هەموو هێزێکم دەڵێم:

بە پێشکەوتنی ئەم ئیسلامە نەبێت کە ئایین و نەتەوەمانە، هیچ پێشکەوتنێك بە خۆمانەوە نابینین و.. بە دەرکەوتنی ڕاستییەکانی شەریعەتیش نەبێت، هیچ بەرزبوونەوەیەك بەدەست ناهێنین. دەنا هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمە واتای ئەو پەندەمان تێدا بەرجەستە دەکات کە دەڵێت: "أضاع المشيتين"[2].

---

(١) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٤٦.

(٢) پەندێکی عەرەبییە. لە واتای ئەو پەندە کوردییەدایە کە دەڵێت: (بوو بە کوردەکەی لە هەردوو جەژن بوو)! واتە هەردوو کیانی لە کیس دەچێت. (وەرگێڕ)

بەڵێ، دەبێ هەست بە شەرەف و سەربەرزیی نەتەوە و، پاداشتی دواڕۆژ و ، کاروبار و بەهاکانی کۆمەڵ و، پەرۆشیی ئیسلامی و، خۆشەویستیی نیشتمان و ئایین بکەین. چونکە لە دوو چەندانەکاندا هێزێکی گەورەی لەبن نەهاتوو هەیە)[1].

❑ وتاری: بژی شەریعەتی ئەحمەدی[2]

(شەریعەتی خاوێن هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، چونکە لە گوفتاری ئەزەلیەوە هاتووە. ڕزگاربوونیش لە خۆسەپاندنی دەروونی بەدخواز تەنها بە پشت بەستن بە ئیسلام و دەست گرتن دەبێت بە پەتی مەحکەم و توندوتۆڵی ئەو [ واتە قورئانی پیرۆز ].

بەدەستهێنانی سوودەکانی سەربەستیی ڕاستەقینە، بە جۆرێکی تەواوەتی، پەیوەستە بە سەرچاوە گرتنی هەموو هەڵسوکەوتێك لە "ئیمان"ەوە. چونکە هەر کەسێك خوازیاری بەندایەتیی پوخت و خاوێن بێت بۆ پەروەردگاری جیهانیان، نابێ لە لای خەڵکی خۆی زەلیل بکات و ببێت بە بەندەی کۆیلەکان.

ئنجا مادەم هەموو مرۆڤێك لەناو موڵك و جیهانی خۆیدا سەرپەرشتیاری ئەو جیهانەیە، ئەوا جیهادی گەورەی لەو جیهانە بچکۆلەیەدا لە ئەستۆدایە و، دەبێ ڕەوشت و ڕەفتارە شیرینەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە خۆیدا بهێنێتە دی و سوننەتە خاوێنەکەی ئەو زیندوو بکاتەوە.

ئەی کاربەدەستان!

ئەگەر دەتانەوێ لە کاروبارتاندا سەرکەوتوو بن، ئەوا بە یەکخستنی کارەکانتان لەگەڵ یاسا گەردوونیەکانی خوای گەورەدا، ئەو سەرکەوتنە بەدەست دەهێنن. دەنا لە هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمەدا جگە لە بەزین و شکست هێنان دروێنەی هیچ بەرهەمێکی تر ناکەن..

چونکە سەرهەڵدانی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بە گشتی لە وڵاتەکانی ئیسلام و قەڵەمڕەوی عوسمانیدا هێما و ئاماژەیەکی قەدەری خوای گەورەیە بۆ ئەوەی

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٨-٤٣٩.

(٢) ئەم وتارە لە ژمارە (٧٧)ی ڕۆژنامەی ئایینیی (ووڵقان) لە بەرواری ١٩٠٩/٣/١٨زدا بڵاو کراوەتەوە.

کە تەنها ئایین ڕۆڵەکانی ئەم وڵاتە بەرەو پێش دەبات و، گوڵزارەکانی کێڵگەی ئاسیا و ئەفریقا و بێستانەکانی نیوەی ئەورووپاش بە نووری ئیسلام دەپشکوێن.

باش بزانن کە:

هەرگیز ئایین لە پێناوی بەدەستهێنانی دنیادا بەخت ناکرێت.

جاران بابەتەکانی شەریعەت دەدران بە بەرتیل لە پێناوی هێشتنەوە و پاریزگاری کردنی ئیستیبدادی لەناوچوودا.

فەرموون پیشانم بدەن جگە لە زیان و نائومێدی چییان دروێنە کرد لە بەختکردن و واز لێ هێنانی بابەتەکانی ئاییندا؟

پێکان و زامدار کردنی جەرگ و دڵی نەتەوە هی لاوازیی ئایینە و، هەرگیز نیعمەتی تەندروستی بەدەست ناهێنرێت گەر هێز و گوڕ و تین بە ئایین نەدرێتەوە.

مەشرەبی ئێمە: خۆشویستنی خۆشەویستی و، ڕقەبەرایەتیی دوژمنایەتی‌یە.

واتە پشت گرتنی سەربازەکانی خۆشەویستی‌یە لە نێوان موسڵماناندا و، پەرتەوازە کردنی سوپای دوژمنایەتی‌یە لە نێوانیاندا.

ڕێبازمان: پابەندبوونە بە ڕەوشتە محەممەدی‌یەکان ﷺ و، زیندوو کردنەوەی سوننەتی خاوێنی ئەوە.

ڕابەرمان لە ژیاندا: شەریعەتی خاوێنە.

شمشێرمان: بەڵگە گومان بڕەکانە.

ئامانجمان: بەرز کردنەوەی ئاڵای ئایینی ئیسلامە.

هەموو ئیماندارێك لە واتا و ناوەرۆکدا پەیوەندیی بە کۆمەڵەکەمانەوە کردووە. شێوەی ئەم پەیوەندی کردنەش بڕیاری یەکجاری و بێ گومانیەتی بۆ زیندوو کردنەوەی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ لە جیهانە تایبەتی‌یەکەی خۆیدا.

ئنجا ئێمە بە ناوی شەریعەتەوە داوا لە هەموو ڕابەران (لە زانایان و شێخان و قوتابیانی هەموو زانستەکان) دەکەین کە پێش هەموو خەڵکانی تر یەکبگرن)[1].

---

(١) داوەری‌یەکان، وتاری شام، ل: ٥٤٢-٥٤٤.

☐ ڕووداوی (٣١)ی مارت (١٣/٤/١٩٠٩ز)[1]

(بۆ ماوەی چەند خولەکێك ئەو جموجوولە ترسناکەم لە دوورەوە بینی کە لە (٣١ ی مارت)دا ڕووی دا..

گەلێ داواکاریم بەر گوێ کەوت، بەڵام هەروەك ئەگەر حەوت ڕەنگ لە بازنەیەکدا بە خێرایی بخولێنرێنەوە تەنها ڕەنگی سپی دەردەکەوێت، بە هەمان جۆر لە نێوان ئەو داواکارییانەدا تەنها وشەی "شەریعەت" دەرکەوت، کە ئەویش ڕێژەی خراپیی ئەو داواکارییە جۆراوجۆرانە لە هەزارەوە دەهێنێتە خوارەوە بۆ یەك و، عەوامی خەڵکی لە نانەوەی ئاژاوە و پشێوی دەپارێزێت و، بە شێوەیەکی دەراسا سیاسەت لەوە ڕزگار دەکات کە بکرێت بە گەمەی دەستی تاکە کەسەکان.

پاشان هەستم کرد ڕووداوەکە بەخراپی دەشکێتەوە، چونکە گوێڕایەڵی شێواوە و ئامۆژگاری بێ سوودە. دەنا هەڵمەتم دەبرد بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە، وەك ئەوەی کە ئاگرەکانی ترم دەکوژاندەوە. بەڵام کە سەرنجم دا زۆرینەی خەڵکەکە لە توێژی عەوام بوون و، کوردەکانیشمان کەسانێکی بێ ئاگا و ساویلکەن و، منیش بە ڕواڵەتی ناوبانگی درۆینەوە دەردەکەوم..

---

(١) ڕووداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ (بە تەقویمی ڕۆمی) بریتییە لە هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی و ملنەدانی سەربازەکان بۆ فەرمانی فەرماندەکانیان. ئەم ڕووداوە یەکەم جار لە سەربازگەی "تاش قشلە"ی ئەستەمبووڵ سەری هەڵدا، پاشان سەربازگەکانی تری شاری گرتەوە و، ئنجا سەربازە هەڵگەڕاوەکان ڕژانە ناو شەقامەکان و هەندێ وەزیر و پەرلەمانتار و ئەفسەریان کوشت. خۆ ئەگەر ئەو وتارانەی "مامۆستا نوورسی" نەبوایە کە دەڕۆشت لەناو سەربازگەکانیاندا ئاراستەی دەکردن، لەوانەبوو گەلێ ئاکامی ناهەموارتر لەو هەڵگەڕانەوە سەربازییە بکەوتایەتەوە، بەڵام وتارەکانی مامۆستا هۆکارێکی گرنگ بوون لە هێدی کردنەوەی سەربازە هەڵگەڕاوەکاندا. ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژی ١٣/نیسان/١٩٠٩زدا دەستی پێ کرد، واتە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتیەت(ڕژێمی پەرلەمانی)ی دووهەم و هاتنەسەرحوکمی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی. ئنجا سوڵتان عەبدولحەمید تاوانبار کرا بە سازدانی ڕووداوەکە و، کۆمەڵەی ناوبراو کۆمەکی سەربازیی لە شاری سەلانیکەوە - کە بنکەی سەرەکییانی لێ بوو - هێنایە ناو شاری ئەستەمبووڵ. دوابەدوای گەیشتنی هێزە سەربازییەکەش بەکسەر باری نائاسایی لە شاردا ڕاگەیەنرا و، هەڵگەڕانەوەکە سەرکوت کرا و، دادگای سەربازی پێکهێنرا و، گەلێ کەسی پێ لە سێدارە درا. ئنجا کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ئەم ڕووداوەی قۆزتەوە و لە ٢٧/نیسان/١٩٠٩دا سوڵتان عەبدولحەمیدی لەسەر کورسیی خەلافەت و پادشایی لابرد. بەم جۆرە و لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت کە ڕووداوەکە هەر لە بناغەدا بۆ ئەو دەرەنجامە ساز کرابوو!

بۆیە دوای سێ خولەك کشامەوە و، ڕۆشتم بۆ "مەقری کۆی"[(١)] تاکو نەهێڵم هاوەڵانم خۆیانی تێوە بگلێنن و، هەر کەسێکم بینی ئامۆژگاریم کرد خۆی دوور بگرێت.

خۆ ئەگەر هێندەی گەردیلەیەك خۆم تێوە بگلاندایە ئەوا بە جوانی دەردەکەوتم، چونکە بەرگ و پۆشاکەکەم دەرم دەخات و ناوبانگەکەشم لەناو خەڵکدا بڵاوە، بەهۆیەوە دەردەکەوتم. دوور نەبوو کە بوونی خۆمم بەوە دەربخستایە - تەنانەت گەر بە تەنیا خۆیشم بوومایە - بەرهەڵستی سوپای بزووتنەکەم تا "ئەیاستافانووس"[(٢)] بکردایە، پاشان بە مردنێکی شەرفمەندی و مەردانە بمردمایە. ئەو کاتەش خۆهەڵقورتاندنم شتێکی بەڵگەنەویست دەبوو، بێ ئەوەی پێویست بە لێکۆڵینەوە بکات!

لە ڕۆژی دووهەمدا پرسیارم لە سەربازە گوێڕایەڵەکان کرد، کە گرێی ژیانی ئێمە دەنوێنن، وتیان: ئەفسەرەکان پۆشاکی سەربازیان پۆشیبوو. کەواتە "گوێڕایەڵی" زۆر نەشێواوە.

پاشان پرسیم:

چەند ئەفسەر پێکراون؟

خەڵەتاندمیان و، وتیان:

تەنیا چوار، ئەوانەش لە خۆسەپێنەکان بوون، دواتر ئادابی شەریعەت و سزاکانی جێبەجێ دەکرێن.

پاشان دەستم دایە ڕۆژنامەکان، بینیم کە ئەوانیش ڕووداوەکە بە بزووتنەوەیەکی ڕەوا دەبینن و، لەسەر ئەو شێوەیە وێنەکەی دەکێشن. ئیتر لە ڕوویەکەوە دڵخۆش بووم، چونکە پیرۆزترین ئامانجی من جێبەجێ کردنی تەواوەتیی فەرمانەکانی شەرعە.

بەڵام لە لایەکی ترەوە گەلێ نائومێد بووم و، بە تێکچوونی گوێڕایەڵیی سەربازی ئازارم پێ گەیشت. بۆیە بە زمانی ڕۆژنامەکان گوفتارم ئاراستەی سەربازەکان کرد و، پێم وتن:

---

(١) لە چاپێکی تردا: "باقر کۆی". یەکێکە لە گەڕەکەکانی "ئەستەمبوڵ". (وەرگێڕ)

(٢) ناوچەیەك بووە لە کەناری "ئەستەمبوڵ". ئێستا بەشێکیەتی و پێی دەڵێن: "یەشیل کۆی".

ئەی سەربازەکان!

ئەگەر ئەفسەرەکان بە یەك دانە گوناهـ ستەم لە خۆیان بکەن، ئێوە بـە هەڵگەڕانـەوە و سەرپێچیتان لە فەرمانەکان، ستەم لـە مـافی سـی ملیـۆن هـاوولاتیی دەوڵـەتی عوسمـانی و سێ سـەد ملیـۆن موسـڵمان دەکـەن، چونکـە شـەرەف و بەختـەوەری و ئـاڵای یـەکێتیی هاوولاتیانی عوسمانی و سەرجەمی موسڵمانان لە ڕوویەکەوە بەندە بە گوێڕایەڵیتانەوە بۆ فەرمانەکان.

پاشـان داواکـاریی ئێـوە جێبەجێ کردنـی شـەریعەتە، کـەچی بـەم سـەرپێچییەتان کارێکی پێچەوانەی خواستی شەریعەت ئەنجام دەدەن.

ئافـەرین و پیرۆزبـاییم بـۆ بزووتنەوەکـەیان و ئازایەتییەکـەیان دەربـڕی، چونکـە ڕۆژنامەکان - کـە زمـانێکی درۆزنی ڕای گشتین - بزووتنەوەکەی ئـەوانی بـە "ڕەوا" پیشان دا.

جا بەپێی ئەو هەڵسەنگاندنەی ئەوان، توانیم کاریگـەریی ئامۆژگارییـەکانم لـەواندا بەجێ بهێڵم و، تا ڕادەیەك هەڵگەڕانەوە و سەرپێچییەکەی ئـەوان هێـور بکەمـەوە، دەنـا کارەکە ئاسان نەدەبوو)[1].

بـەڵام (بـە داخـەوە، ئـەو کەسـانەی کـە زیادەڕەوییـان پـێ خۆشـە، لـەم ڕووداوەدا بەربەستێکی قایمیان لە بەردەم حەز و ئارەزووەکانی ئەم نەتەوەیەدا دانا کە تاسـەمەندە بۆ ئـەو مەشرووتیەتە ڕەوایـەی بەختـەوەریی ئێمـەی لـەخۆ گرتـووە و، سـەرچاوەی ژیـانی کۆمەڵایەتیمانە.. ئەم نەتەوەیەی کە تینووی ئەو چەشنە زانستانەیە و ئـەو زانستانەش کـە لەگەڵ ئیسلامدا تەبا و گونجاون.

بەڵێ، ئەو زیادەڕەوانە بەربەستێکی قایمیان لە بەردەم ئاواتەکانی ئـەم نەتەوەیـەدا دانـا، بەوەی کە ئامانجی کەسی و ئاژاوەکانیـان خستە نـاو مەشرووتیەتەوە. جگـە لـە کـردارە ئیلحادییەکانی ڕۆشنبیران و بایەخ نەدانیان بە ئایین)[2].

(لە ڕووداوی "٣١ی مارت"دا بە چاوی خۆم حاڵەتێکی نزیك لەمەم بینی:

---

(١) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٢-٤٢٥.

(٢) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٠-٤٣١.

ئەوەبوو کاتێ ئەو کەسە هیممەت بەرزانەی کە گیانی خۆیان پێشکەش بە ئیسلام دەکەن، بانگەشەیان بۆ مەشرووتیەت کرد و، ئەوانەی کە لەو باوەڕەدا بوون نیعمەتی مەشرووتیەت ئەوپەڕی ئاوات و کاکڵەی ژیانە و، بە چوست و چالاکی بۆ جێبەجێ کردنی لق و پەلەکانی لێبڕان بەپێی شەریعەت و، بەرپرسانی دەوڵەتیان ڕێنمایی دەکرد تاکو لە نوێژی دادگەریدا ڕوو لە قیبلە بکەن و، داواکاری ئەوە بوون کە بە هێزی مەشرووتیەت ناوی خاوێنی "شەریعەت" بەرز ڕابگیرێت و، بە هێزی شەریعەتیش "مەشرووتیەت" بمێنێتەوە و، هەموو خراپکارییەکانی پێشوویان خستە ئەستۆی گوێ نەدان بە شەریعەت..

هەر هێندەی ئەو کەسانە دەنگی ئەم بانگەشەیان بەرز کردەوە و هەندێ کاروباری لاوەکیشیان جێبەجێ کرد، چەند کەسێکیان لێ پەیدا بوو لەوانەی کە ڕاست و چەپی خۆیان لە یەك جیا ناکەنەوە و، لەو گومانەدا بوون کە - حاشا وا نییە - شەریعەت پشتی ئیستیبداد دەگرێت. ئیتر وەکو تووتی لاسایی ئەوانیان کردەوە و وتیان:

"ئێمە داواکاری شەریعەتین"!

ئەوەبوو ئامانجەکە بەم جۆرە لەو ناوەدا ون بوو، تەنانەت وای لێ هات کە مەبەستە ڕاستەقینەکە نەدەزانرا و، بارودۆخەکە گەیشتە ئەوەی کە بینیتان. ئاشکرایە کە پێشتر پلانەکان سازکرابوون و داڕێژرابوون!

کاتێ کار گەیشتە ئەوە، هەندێ لەوانەی کە بە درۆ دەمامکی پەرۆشی و غیرەتیان پۆشیوە، هێرشیان کردە سەر ئەو ناوە بەرز و پیرۆزە و، ڕەخنە و تەنانەت دەستدرێژییان ئاراستە کرد.

جا ئەمەی سەرەوە خاڵێکی ڕەشی شایانی پەند لێ وەرگرتنە)[1]!

(ئەو تۆفانە ترسناك و زریانە سووتێنەرەی کە ناوی ڕووداوی "٣١ی مارت"ی لێ نراوە، لە ژێر کاریگەریی چەند هۆکارێکی ئاساییدا توانا و لێهاتنێکی سروشتیی ئەوتۆی ئامادە کرد کە ناوی ئەو "شەریعەت"ەی هەمیشە موعجیزەی خۆی دەردەخات،

(١) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٤٥-٣٤٦.

لـە لایـەن خـوای گـەورەوە، بەسـەر زمـانی هەڵسـووڕێنەرانی ئـەو ڕووداوەدا هێنـا، هەرچەندەش ئاکامەکەی پشێوی و ئاڵۆزی بوو.

جا لەبەر ئەوەی ناوی "شەریعەت" ئەو تۆفانەی بەو ئاراستەیەدا برد کە بە بێ وەی تێپەڕ ببێت، ئەوا ئەم ناوە لە بەردەم خوای گەورەدا هەموو ئەو ڕۆژنامانە تاوانبار دەکات کە لە ناوەڕاستی مانگی نیسان بەولاوە زمانی بەدیان درێژ کرد.

خۆ ئەگەر ئەم حەوت هۆکار و بارودۆخەی خـوارەوە ڕەچـاو بکرێـن کـە ئـەو ڕووداوەیان هێنایە گۆڕێ، ئەوا "ڕاستی" بە ڕوونی دەردەکەوێت:

١ – لە سەدا نەوەدی ئـەم بزووتنەوەیـە لـە دژی ئیتیحـاد و تـەرەقی و دیکتاتۆریـەتیان ئاراستە کرابوو.

٢ – هـەروەها ئامـانجێکی تـری: گۆڕینـی ئـەو وەزیرانـە بـوو کـە مایـەی قسـە لەسـەر کردنی پیر و حیزبەکان بوون.

٣ – دەرباز کردنی سوڵتانی ستەم لێکراو لەوەی لەسەر کـار لابـبرێت، کـە پێشـتر بڕیار و نەخشەی بۆ دارێژرابوو.

٤ – ڕێ نـەدان و کۆتـایی هێنـان بـەو ڕێنمـایی و دەرس دادانـەی کـە لەگـەڵ نـەریتی سەربازی و ئادابی ئایینیدا یەك ناگرنەوە.

٥ – دۆزینـەوەی بکـوژی بـەڕێز "حەسـەن فـەهمی"[1] دوای ئـەوەی کـە بابـەتی کوشتنەکەی گەڵێ بە گەورە گیرا.

٦ – چارەسەر کردنی بە ویژدانانەی کێشەی ئەفسەرانی "ئەلایلی"[2] کە لە خزمـەتی سەربازی کەنار دران.

٧ – ڕێ گرتن لە گشتاندنی چەمکی "ئازادی" بۆ ڕەفتارە هەرزەکان.

---

(١) حەسـەن فەهمی: ڕۆژنامەنووسێکی نەیاری کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی بووە. لەسەر پردی "گەڵەتە سەرای" لە ئەستەمبوڵ لە لایەن ئەو کۆمەڵەیەوە تیرۆر کراوە. ئەم کردارە، بێزاری و ڕقێکی گشتیی لـە دژی ئیتیحادییەکان لە ناوەندی خەڵکیدا وروژاند.

(٢) ئەفسەرانی ئەلایلی: ئەوانە بوون کە لە پێشدا سەربازی ئاسایی بوون و دواتر پلەیان بەرز کرابـووەوە، بێ ئەوەی قۆناغەکانی خوێندنی کۆلیجی سەربازییان بڕیبێت.

واتە سنووردانانێك بە ئادابەکانی شەرع بۆ واتای "سەربەستی".

پاشان جێبەجێ کردنی یاسا و سزاکانی شەرع کە عەوام جگە لە دەست بڕینەوە و تۆڵە سەندنەوە هیچی تری لێ تێنەگەیشتوون.

بەڵام پێشتر زەمینەی بۆگەن ساز کرابوو، هەروەك پیلان و پێخلیسکە ئامادەکانیش بە ڕادەیەك داڕێژرابوون کە گوێڕایەڵیی یەکجار بەرز و بڵندی "سەربازی" لەو پێناوەدا کرا بە قوربانی.

بناغەی هەموو بناغەکانی ئەو هۆکارانەش وتوویژی توندوتیژ و، لایەنگریی دەستە و پێرەکان بوو، هاودەم لەگەڵ ڕۆچوونی ڕۆژنامەکان لەو گفتوگۆیانەدا کە لە بریی "ڕەوانبێژیی گوفتار" زیادەڕەویی درۆی تێدا بەکارهاتبوو)[1]!

❐ هێنانەوەی سەربازەکان بۆ ژێر گوێڕایەڵیی فەرماندەکانیان

(ڕۆژی هەینی هاوڕێ لەگەڵ زانایاندا ڕۆشتم بۆ لای ئەو سەربازانەی کە لە وەزارەتی جەنگدا بوون..

لەوێ بە چەند وتارێکی یەکجار کاریگەر، هەشت تیپی سوپام هێنایەوە ژێر فەرمان و گوێڕایەڵی..

ئامۆژگاریەکانیشم پاش ماوەیەك سوودەکانیان دەرکەوت.

وا وێنەی وتارەکەمتان بۆ دەهێنم:

ئەی سەربازە یەکتاپەرستەکان!

شەرەف و کەرامەت و بەختەوەری و هێمای یەکێتیی سی ملیۆن هاوڵاتیی عوسمانی و سێ سەد ملیۆن موسڵمان - لە ڕوویەکەوە - پەیوەستە بە گوێڕایەڵیتانەوە بۆ فەرماندەکانتان.

گەر ئەو فەرماندانە بە یەك دانە گوناهـ ستەمیان لە خۆیان کردبێت، ئێوە بەم سەرپێچییەتان ستەم لە سێ سەد ملیۆن موسڵمان دەکەن، چونکە بەم کارەتان برایەتیی ئیسلامی دەخەنە مەترسییەوە.

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٥-٤٣٦.

باش بزانن کە ڕێ و شوێنی سەربازان گەلێ مەزنە، چونکە وەکو کارگەیەك وایە. ئەوەتا ئەگەر هەر کارگەیەك چەرخێکی تێکبچێت ئەوا سیستەمی کار لەناو سەرجەمی کارگەکەدا دەشێوێت.

هەرگیز نابێ سەربازەکان "وەك تاکە کەس" خۆیان لە سیاسەتدا هەڵبقورتێنن. "ئینکیشاریەکان"[1] باشترین بەڵگەن لەسەر ئەمە.

ئێوە داواکاری شەریعەتن، کەچی ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەت دەنوێنن و بە ناشیرینی ناوی دەزڕێنن.

بە شەریعەت و قورئان و فەرمودە و دانست و ئەزموونەکان سەلماوە کە: گوێڕایەڵیی کاربەدەستی دینداری ڕاستڕەوی پابەند بە حەق کارێکی فەرزە. کاربەدەستان و مامۆستایانی ئێوەش ئەفسەرەکانتانن.

جا هەروەك ئەگەر ئەندازیاری لێزان، یان دکتۆری شارەزا، گوناهباری و ڕەفتاری ناڕەوایان لێ بووەشێتەوە، زیان لە پیشەی "پزیشکی" و "ئەندازیاری" نادات، بە هەمان جۆر ئەفسەرە ڕووناکبیرەکانتان کە شارەزای هونەری جەنگن و کەسانی ئیماندار و خاوەن غیرەت و حەماسەتی ئیسلامین کە هەریەکەیان بەرامبەر بە هەزارن، گەر هەندێکیان لە ئەنجامی جموجوڵێکی جوزئییەوە کارێکی ناڕەوای لێ ڕوو بدات، نابێت بکرێت بە بیانوو بۆ سەرپێچی نواندن لە فەرمانەکانیان و، لەم ڕێیەوە ستەم لە هاووڵاتیانی دەوڵەتی عوسمانی و سەرجەمی موسڵمانان بکەن..

---

(١) سوپای ئینکیشاری ڕێکخراوێکی سەربازی بوو کە دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی: (ئۆرخانی کوڕی عوسمان ١٣٢٦-١٣٦١ز) دایناوە. سەرەتا لە چەندین بنەچە و ڕەگەزی جۆراوجۆر پێکهاتبوو کە لە بنەماڵە و کەسوکاریان دابڕکرابوون. سوپایەکی پیشەگەر و کاری تەنها ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەربازی بووە. لەم ڕێکخراوە سەربازییە لە سەرەتادا خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە دەوڵەتی عوسمانی کرد. پاشان وردە وردە گەندەڵیی تێدا پەیدا بوو تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە گرفتێکی گەورەی بۆ دەوڵەت پێکهێنا و چارەسەر کردنیشی گەلێ دژوار بوو، بەڵام سوڵتان مەحموودی دووهەم (١٨٠٨-١٨٣٩ز) بە پلانێك توانیی هەڵی بووەشێنێتەوە و "سیستەمی نوێی سەربازی"ی لە بری دانا، کە سیستەمێکە هەوڵی تازەگەریی دا لەناو سوپای عوسمانیدا. بڕوانە: (الدولة العثمانية من الميلاد إلى السقوط) د. عدنان العطار. ص: ٢٣-٢٤، ١٣٧-١٣٨، ط١. دار القلم دمشق. ٢٠٠٦م. هەروەها: (الدولة العثمانية، عوامل النهوض والسقوط) د. علـــي محمـــد الصلابي. ص: ٦٧-٧٠، ٣٧٠-٣٧٢، ط٥. دار المعرفة، بيروت، لبنان. ٢٠٠٨م. (وەرگێڕ)

چونکە سەرپێچی لە فەرمان تەنها یەك دانە تاوان نییە، بەڵکو دەستدرێژییە بۆ سەر مافی ملیۆنەها کەس.

دەزانن کە ئاڵای یەکتایی خوای گەورە لە دەستی ئازایەتیی ئێوەدایە و، هێزی ئەو دەستەش لە گوێڕایەڵی و پابەندبووندایە بە سیستەمی سەربازییەوە، چونکە هەزار کەسی گوێڕایەڵ و ڕێکخراو سەد هەزار کەسی وێڵ و بەرەڵا دەهێنێت.

ئاشکرایە کە سی ملیۆن عوسمانی لە ماوەی سەد ساڵدا نەیانتوانی ئەم دوو ئاڵوگۆڕ(کودەتا)ە خوێناوییە بەرپا بکەن. کەچی ئێوە بە گوێڕایەڵیتان ئەنجامتان دا.

زیاد لەوانەش، لەدەستدانی یەك ئەفسەری بەرۆش و شارەزا و ڕۆشنبیر، لەدەستدانی ورە و هێزی مەعنەویی خۆتان دەگەیەنێت. چونکە لە ڕۆژگاری ئێستادا پتر ئازایەتیی ئیمانی و عەقڵی و زانستی زاڵە و، هەندێ جار یەك دانە ڕۆشنبیری ناو ئەوان سەد کەسی تری جگە لەوان دەهێنێت..

بیانییەکان تێدەکۆشن بەم ئازایەتییەیان بەسەرتاندا زاڵ بن. واتە ئازایەتیی سروشتی بە تەنیا خۆی داد نادات.

به پوختی: من فەرمانەکانی پێغەمبەری مەزنتانﷺ پێ ڕادەگەیەنم، کە:

گوێڕایەڵیی کاربەدەستان فەرزە.

بژی سەربازەکان.. بژی مەشرووتیەتی ڕەوا)[1].

(بیستم بەشێك لە سەربازەکان پەیوەندییان بە هەندێ "کۆمەڵە"وە کردووە، یەکسەر ڕووداوە ترسناکەکەی "ئینکیشاری"م وەبیرهاتەوە. بۆیە گەلێ نیگەران و پەشێو بووم و، لە ڕۆژنامەیەکدا نووسیم:

بەرزترین و پیرۆزترین "کۆمەڵە" لەم کاتەی ئێستاماندا کۆمەڵەی سەربازانی ئیماندارە.

سەرجەمی ئەو کەسانەی ڕۆشتوونەتە ڕیزی سەربازییەوە، هەر لە سەربازێکی ئاساییەوە تا دەگاتە سەرکردە، هەموویان لەم کۆمەڵەیەدان. چونکە پیرۆزترین ئامانجی خاوێنترین کۆمەڵە لە سەرانسەری جیهاندا بریتییە لە یەکێتی و برایەتی و گوێڕایەڵی و

---

(١) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٦-٤٢٧.

خۆشەویستی و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام. ئەوەتا سەرجەمی سەربازانی ئیماندار بانگهێشت بۆ ئەم ئامانجە ڕادەگەیەنن.

بەڵام سەربازەکان خۆیان مەڵبەندن و، دەبێ سەرجەمی نەتەوە و هەموو کۆمەڵەکانیش پەیوەندی بە سەربازەکانەوە بکەن. چونکە هەموو کۆمەڵەکانی تر تەنها بۆ ئەوەن کە نەتەوە بکەن بە سەرباز لە ڕێبازی خۆشەویستی و برایەتیدا.

سەبارەت بە "یەکێتیی محەممەدی"یشەوە، ئەوا هەموو ئیمانداران دەگرێتەوە و، نە کۆمەڵەیە و نە حیزبە. چونکە مەڵبەندەکەی و ڕیزی پێشەوەی موجاهیدان و شەهیدان و زانایان و ڕابەرەکانن. هیچ ئیماندار و سەربازێکی گیانفیدا نییە -چ ئەفسەر بێت و چ سەرباز -لەم یەکێتییە بەدەر بێت.

کەواتە هیچ پێویستییەك نییە بۆ پەیوەندی کردن بە کۆمەڵەکانی ترەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خۆم لە کاروباری هەندێ لەو کۆمەڵە خێرخوازانە هەڵناقورتێنم کە مافی خۆیانە ناوی یەکێتیی محەممەدی بۆ خۆیان دابنێن)[1].

❑ بردنی بۆ دادگای عورفیی سەربازی بەهۆی ڕووداوی "٣١"ی مارتەوە

(کاتێ کە "سەربەستی" بوو بە هاوتای "شێتی"، ئیستیبدادی لاواز "خەستەخانەی شێتان"ی بۆ کردم بە قوتابخانە)[2]..

(لە دادگای عورفیی سەربازی و لە دەمی ڕووداوەکەی "٣١"ی مارتدا وتم:

من قوتابیی شەریعەتم. هەر لەبەر ئەوەش هەموو شتێك بە تەرازووی شەریعەت هەڵدەسەنگێنم.

تەنها ئیسلام ئایین و ڕێبازمە و، پێوەر و ڕوانینەکانم بۆ هەر شتێك بەپێی ڕوانینی ئیسلامە.

لەو کاتەدا کە من لە دەرگای ئەو جیهانی بەرزەخەدا ڕاوەستاوم کە ناوی "بەندیخانە"تان لێ ناوە و، لە وێستگای سێدارەدا چاوەڕوانی ئەو شەمەندەفەرەم کە

---

(١) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٢٣.

(٢) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٠٩.

دەمگوێزێتەوە بۆ ئەودنیا، ڕەخنە و ناڕەزایی خۆم لەو بارودۆخە غەددار و ستەمکارانەیە دەردەبڕم کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا پیادە دەکرێت.

ڕووی ئەم گوفتارەم تەنها لە ئێوە نییە، بەڵکو ئاراستەی سەرجەم ڕەگەزی ئادەمیزادی ئەم ڕۆژگارەی دەکەم.

ئەوەتا بەهۆی نهێنیی ئایەتی: ﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾ (الطارق:٩) هەموو ڕاستییەکان بێ پەردە لەناو گۆڕی دڵەوە هاتوونەتەدەر. دەبا ئەو کەسەی نامەحرەمە بۆیان نەڕوانێت.

من بەوپەڕی حەز و شەوقەوە ئامادەی سەفەرم بۆ ئەودنیا و لە سەرپێی کۆچ کردنم لەگەڵ ئەوانەی کە بە سێدارەکاندا هەڵواسراون[١].

گوندنشینێکی شەیدای شتانی نامۆ، گەر لایەنە سەیر و سەرسووڕهێن و خۆشی و جوانییەکانی ئەستەمبووڵ ببیستێت، دەبێ چەندە تامەزرۆی بینین و سەرلێدانی ئەستەمبووڵ بێت؟

منیش وەکو ئەو دەشتەکییە بووم؛ گەلێ تاسەمەندی کۆچ بووم بەرەو ئەودنیا، کە کۆگا و پیشانگای شتانی نامۆ و سەرسووڕهێنە. ئێستاش هەر وام.

کەواتە دوورخستنەوە و نەفی کردنم بۆ ئەوێ، سەبارەت بە من بە "سزا" دانانرێت. بەڵام گەر دەتوانن سزای "ویژدانی"م بدەن، چونکە جگە لەو شێوە سزایە هیچ شتێکی تر بۆ من سزا نییە، بەڵکو شان و شەرەف و بڵندییە.

ئەم حکومەتە چەتەیە لە ڕۆژگارانی "ئیستیبداد"دا دوژمنایەتیی "ژیری"ی دەکرد. کەچی وا ئێستا دوژمنایەتیی سەرانسەری "ژیان" دەکات..

جا ئەگەر حکومەت بەم شکڵ و شێوەیە بێت، ئەوا با بژی "شێتی".. بژی "مردن".. "دۆزەخ"یش هەر بژی بۆ ستەمکاران.

من بۆ خۆم لە زەمینەیەك دەگەڕام کە بیروبۆچوونەکانمی تێدا بخەمە ڕوو. وا ئەم دادگا عورفییە بوو بە باشترین شوێن کە لێیەوە هزر و بیرەکانم بڵاو بکەمەوە.

---

(١) چونکە لە دەمی ئەو بەرگرییەدا، تەرمی پازدە کەس لە پەنجەرەی زووری دادگاوە دەبینران کە بە سێدارەدا هەڵواسرابوون!

لە یەکەم ڕۆژەکانی لێکۆڵینەوەدا لێیان پرسیم، وەك لە کەسانی تریشیان پرسی: "تۆیش داوای شەریعەتت کردووە"؟

وتم:

ئەگەر هەزار "گیان"م هەبێت، ئامادەم هەموویان لە پێناوی یەك دانە ڕاستیی "شەریعەت"دا بەخت بکەم..

چونکە شەریعەت هۆکاری بەختەوەرییە و.. دادگەریی بێگەرد و خاوێنە و.. فەزیلەت و سەربەرزییە.. "شەریعەتی ڕاستەقینە" دەڵێم، نەك بە وێنەی داواکاریی هەڵگەڕاوەکان

وا دەست بە وتارەکەم دەکەم:

ئەی سەرکردەکان! ئەی ئەفسەرەکان!

پوختەی تاوانەکانم کە داخوازی بەند کردنم بوون ئەوەیە کە:

إذا محـــاسِـــنِيَ اللاّتِي أُدِلُّ بـــها  كانَتْ ذُنُوبِي، فَقُلْ لِي كيفَ أَعْتَذِرُ[1]؟

واتە: ئەگەر ئاکارە بەرز و جوانەکانم کە مایەی شانازیمن بە تاوان دابنرێن، دە پێم بڵێ ئیتر چۆن پۆزش بهێنمەوە؟

لە سەرەتاوە دەڵێم:

مرۆڤی مەرد دانابەزێتە ئاستی ئەنجامدانی تاوان. خۆ ئەگەر پێی تۆمەتبار بکرێت لە تۆڵە و سزا ناترسێت..

جا ئەگەر من بەناحەق لە سێدارە بدرێم، دەسکەوتم پاداشتی دوو شەهید دەبێت. چونکە شەهیدانی تر نیوەی پاداشتەکەیان بە ناوبانگی دنیایی دەگۆڕنەوە.. ئەگەر لە بەندیخانەشدا بمێنمەوە، ئەوا بێ گومان باشترین شوێنە لە سایەی ئەم حکوومەتە ستەمکارەی کە لە ئازادی و سەربەستیدا تەنها وشەکەی پێ براوە! کەواتە مرۆڤ بە ستەملێکراوی بمرێت باشترە لەوەی بە ستەمکاری بژی!

---

(١) ئەم بەیتە شیعرە هی وەلیدی کوڕی عوبەیدی ناسراو بە (بوحتوری)یە (٢٠٥-٢٨٤ك/٨٢١-٨٩٧ز) کە یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی سەردەمی عەبباسی. بڕوانە: ديوان البحتري: ١/٤٦٨. دار الجيل، بيروت. دون تاريخ. (وەرگێڕ)

هەروەها دەڵێم:

هەندێ کەس لەوانەی کە سیاسەتیان وەك ئامرازێك بە دەستی ئیلحادەوە بەکارهێناوە، خەڵکانی تر بە "کۆنەپەرستی" و "قۆزتنەوەی ئایین لە پێناوی سیاسەت"دا تۆمەتبار دەکەن، تاکو خراپکاری و تاوانەکانی خۆیان بپۆشن.

جاسووس و سیخورەکانی دەستەڵاتداران، گەلێ لەوانەی پێش خۆیان دڵڕەقترن، ئیتر چۆن متمانەیان پێ دەکرێت و پشتیان پێ دەبەسترێ و، "دادگەری" لەسەر قسە و گوفتاری ئەوان بنیات دەنرێت؟

جگە لەوەی کە مرۆڤ لە کەموکووڕی و ناتەواوی دەربازی نابێت، ئەوەتا لەو کاتەدا کە بە جەربەزەیی هەوڵی "دادگەری" دەدات، دەکەوێتە نێوان "ستەم"ەوە!

بەڵام کۆکردنەوەی چەندین کەموکووڕیی زۆر و زەبەندە کە لە چەند ماوەیەکی درێژخایەن و لە هەڵسوکەوتی چەندین کەسی زۆرەوە ڕوویان دابێت - کە بکرێ بەو چاکەکارییانەی کە ناوبەناو لە نێوانیاندا ڕوویان داوە، چاوپۆشی لە کەموکووڕییەکان بکرێت - و، گومان بردنی ئەوەی کە ئەو هەموو کەموکووڕییانە هی یەك کەس بن و لە یەك کاتیشدا ئەنجامی دابن، کارێ دەکات ئەو کەسە شایانی سزایەکی گەلێ سەخت بێت..

دیارە ئەوەش لەخۆیدا ستەمێکی یەکجار گەورەیە!

وا ئێستاش لە تاوانەکانم دەدوێم کە یازدە تاوان و نیون[1])[2].

ئەم بەرگرییە ئازا و ڕەنگینە لە کاتی خۆیدا دوو جار لە چاپ درایەوە.

لەو کاتەدا کە چاوەڕوانیی ئەوە دەکرا بڕیاری لە سێدارەدانی لە لایەنی ئەو دادگایەوە لەسەر دەربچێت، کەچی بڕیاری بێ تاوانی و ئازادکردنی بۆ "بەدیعوززەمان" دەرکرد، کە هەر ئەو دادگایە بوو گەلێ کەسی بە پەتی قەنارەدا هەڵواسی!

---

(١) هەریەك لەم تاوانانە پوختەی چل لاپەڕەی پەرێشانەە لە وەڵامی دادگای سەربازیدا و، وەڵامی چەند پرسیارێکی چاوەڕوانکراوە کە لە چەند شوێنێکی جیاوازدا هاتوونەتە زەینمەوە. (دانەر)

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٠٩-٤١٣. دەقی تەواوی ئەم بەرگرییە لە سەرچاوەی ناوبراودا هاتووە.

جا "بەدیعوززەمان" لە بریی ئەوەی سوپاسی دادگا بکات لەسەر ئەم بڕیارەی، کەچی هەر لە گەڕەکی "بایەزید"ەوە - کە دادگاکەی لێ بووە - هەتا گەڕەکی سوڵتان ئەحمەد بە ڕێ پێوان لەگەڵ جەماوەرێکی زۆردا و، هەمووشیان بە دەنگی بەرز لە پشت سەریەوە ئەم دروشمەیان دەوتەوە:

بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران.. بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران[1]!

❑ بەرگری کردنی لە بێ تاوانەکان، دوای ئازادبوونی لە دادگای سەربازی

(ئەم وتانەی خوارەم یەکەم جار لە دادگای سەربازیدا لەسەر زار هەڵقوڵاوە.. پاشان دوو لەسەر سێی وتارەکەم ئاراستەی دووهەم دادگای سەربازی کردووە و لە هەمان کاتیشدا وەڵامی چەند پرسیارێك بوون کە لە چەند کاتێکی جیاجیادا ئاراستەم کراون.

بەشی پرسیارەکانم لە دووهەم ڕۆژی ئازادبوونمدا جارێك نارد بۆ "خورشید پاشا"ی سەرۆکی یەکەم دادگای سەربازی و، چەند جارێکیش بە مەبەستی بەرگری کردن لە گیراوە بێ تاوانەکان ئەم پرسیارانەم ئاراستە کردووە. پارچەیەکیشیم لە چەند شوێنێکی جیاوازدا بە شێوەی وتوویژ دەربڕیوە)[2]:

[ئەمەش پرسیارەکانن کە بۆ داکۆکی کردنی لە بێ تاوانەکان ئاراستەی دادگای سەربازیی ئیتیحادییەکانی کردووە]:

(سزای ئەو کەسە چیيە کە لە ڕووی مرۆڤێك دەوەستێتەوە شێوەی ماری لەخۆ گرتووە و، بەرامبەر پیاوچاکێك پۆشاکی کەسێکی خراپکاری پۆشیوە و، دژی مەشرووتیەتێك بەرگی ئیستیبدادی لەبەردایە.. کە لە ڕاستیدا جگە لە مار و خراپکار و خۆسەپێن هیچی تر نین؟

ئایا خۆسەپێن (مستبد) یەك دانە کەس دەبێت، یان دەگونجێ کە چەند کەسێکی زۆر بن؟

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

(٢) داوەرییەکان، بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤١٠-٤١١.

ئەوەش هەیە کە مـن پێـم وایـە دەبێ هێز لـە یاسـادا بێـت، دەنـا ئیستیبدادە کە دابەش دەبێت و، لە ڕێی ڕێکخراوەکانەوە زیاتر توندوتۆڵی بەدەست دەهێنێت.

ئەم دوانە کامیان زیانی زیاترە:

لەسێدارەدانی بێ تاوانێك، یان لێخۆشبوون لە دە تاوانبار؟

ئایا گوشار خستنە سەر خاوەن ڕێباز و بیر و هزرەکان، ڕێگاکانی دووڕوویی زیاتر ناکات؟ لە کاتێکدا کە دەزانین ئەم گوشارە دەرەقەتیان نایەت؟

ئایـا بـە بـێ لابردنـی "تایبەتمەندی‌یـەکان بـۆ هـەندێ کـەس جگـە لـە هـەندێکی تـر" دەتوانرێت یەکێتیی نەتەوە بهێنرێتەدی، کە کانگای ژیانی کۆمەڵایەتیمانە؟

شێواندنی "یەکسانی" و تایبەت کردنی بە تەنها چەند کەسێکەوە و، جێبەجێ کردنی یاسا تەنـها سەبارەت بەوان، هەرچەند بە ڕواڵـەت "دادگـەری" دەگەیـەنێت، بەڵام لـە ڕوویەکی ترەوە نەبوونی "یەکسانی" ستەم و دووڕوویی بەرهەم دەهێنێت. وێڕای ئـەوەی کـە بێ تـاوانیی زۆربـەی بەندکراوان بە ئازاد کردنی لە سەدا هـەشـتایان دەرکـەوت و، ئاشکرا بوو کە هیچ تاوانێکیان نەبووە. جا ئەگەر لە گۆشـە نیگـای زۆرینەوە ئـەم حاڵـە فەرمانڕەوا بێت، ئایا ڕق و بیری تۆڵەسەندنەوەی لـێ ناکەوێتەوە؟

مـن لـێرەدا شتێکم نی‌یـە بـە دادگـای بڵێـم، بـەڵکو دەبێ هـەواڵگرەکان بـیری لـێ بکەنەوە!

گەر دەسـتەیەکی دیـاریکراو خـۆی بـە خـاوەن ئیمتیـاز دانـا بەسـەر خـەڵکانی تـردا و ئەوانی ناچار کرد لە شـێوەی نـەیاری مەشرووتیەتدا دەربکەون، لەبەر ڕەخنـەی زۆری ئەو دەستەیە لێیان و زامدارکردنی هەست و نەستیان.. گەر هەموو خەڵکەکە ڕەخنەیان لەو ئیستیبدادە سەرسەختەی ئەو دەستەیە گرت کە لە ژێر پـەردەی مەشرووتیەتدا خـۆی شاردووەتەوە، ئایا کێ بە گوناهبار دادەنرێت؟

ئەگەر باخەوانێك دەرگای باخەکەی بە کراوەیـی بـەجێ هێشـت، بـە شـێوەیەکی وا کە هەرکەسێ ویستی لـێ بێت بڕواتە ناوی، پاشان دەرکەوت کە دزی لـەناو باخـەکـەدا ڕووی داوە.. ئایا کێ بەرپرسە؟

ئەگەر سەربەستیی بیروبۆچوون و ئازادیی قسە بە خەڵکی درا، پاشان لێپرسینەوە لە کەسێك کرا لەسەر بیر و بۆچوون و گوفتارەکانی، ئایا دەرناکەوێت کە پلانێکی داڕێژراو بووە بۆ پاڵ پێوەنانی ئەو نەتەوە کلۆڵە بەرەو دۆزەخ؟ ئایا ئەوە بە خەیاڵدا نایەت کە ئەگەر ئەمەش نەبوایە هەر بەهانەیەك بۆ هەمان مەبەست دەدۆزرایەوە؟

دەبینین هەمووان پەیمان بە "مەشرووتیەت" دەدەن و سوێندی پێ دەخۆن، کەچی ڕەفتارەکانی خودی پەیماندەر دژی ناوەڕۆکی مەشرووتیەتە، یان لە کەسانی دژی مەشرووتیەت بێ دەنگە!

ئایا ئەو دیاردەیە پێویستی بە کەفارەتی سوێند نییە؟

ئایا ئیتر نەتەوە بە درۆزن دانانرێت؟ ئایا ئەو ڕای گشتییەی کە دەبێ لەو کاتانەدا خاوێن بێت، بە درۆزن و کەودەن و گەمژە لە قەڵەم نادرێت؟

بە پوختی:

ئەو شتەی کە بەسەر بارودۆخی ئێستادا زاڵە، ئیستیبداد و خۆسەپاندنێکی توندوتیژە، ئەوەش بە قۆزتنەوەی ئەو نەزانییەی کە بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە. وەك بڵێی "جاسوسی" و "خۆسەپاندن" گیانیان لەگەڵ یەکتردا گۆڕیوەتەوە)[1].

☐ پوختەیەکی ئەم ماوەیەی ژیانی

سەعیدی لاو بە سروشت بێزار دەبوو لە هەر شتێك سنوور بۆ جموجوولی دابنێت و شێوازی ژیانی پابەند بکات. بەڵکو حەزی دەکرد لە هەموو ڕەفتار و جموجوولێکی ژیانیدا بە سەربەستی هەڵسوکەوت بکات و، دوور بێت لە پاڵەپەستۆی فەرمان و کۆت و زنجیری یاساکان. بۆیە هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە کە:

"ئازادیی خۆم بە هیچ یاسایەکی هەرەمەکی سنووردار ناکەم"!

لە سەرجەم لاپەڕەکانی ژیانیدا ئەم حەز و مەیلەی بۆ "ئازادی" لێ بینراوە و، هیچ کات ملی بۆ یاساکانی گومڕایی سامناك و ئەو ئیلحادە کەچ نەکردووە کە لە ئەورووپاوە هاتوون و، جڵەوی کاری نەداوەتە دەستی ئەو ئیستیبدادەی کە بەرهەمی

(١) داوەرییەکان، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، ل: ٤٣٩-٤٤١.

فەلسەفەی سروشتی‌یە و، هەردەم تیکۆشاوە بۆ روونکردنەوەی ڕاستیی ئیسلام، کە سەربەستیی شەرعی و شارستانێتیی نموونەیی و ناوازەی لەخۆ گرتووە.

بە شێوەیەکی گشتی ژیانی "بەدیعوززەمان" لە ئەستەمبوڵ تا ڕادەیەك مۆرکێکی سیاسیی پێوە دیار بوو، چونکە بیرۆکەی خزمەتکردنی ئایینی لە ڕێی سیاسەتەوە هەڵگرتبوو، هەر تەنها خۆشەویستیی خزمەت بە ئایینیش ئەم ڕێگایەی پێ گرتبووەبەر. ئەوەبوو لەو پێناوەدا پشتی بانگەشەی "ئازادی"ی گرت و، بە توندی لە دژی کۆمەڵەی ئیتتیحاد و تەرەقی ڕاوەستا کاتێ کە هەندێ ستەمی ئەوانی بینی. تەنانەت دوودڵ نەبوو لەوەی کە ڕووبەڕوو پێی وتن:

"ئێوە دەستدرێژیتان کردە سەر ئایین و، خۆتان لە قەرەی غیرەتی خوای گەورە دا و، پشتتان لە شەریعەت هەڵکرد. دیارە ئاکامتان مەترسیدار دەبێت"!

لە دوای ڕاگەیاندنی دەستووریش، پشتی کۆمەڵەی "یەکێتیی محەممەدی"ی گرت کە لە ماوەیەکی کەمدا هێندە پەرەی سەند کە تەنها لە "ئەدەپازای" و "ئیزمیت"دا[1] و لە دوای بڵاوکردنەوەی وتارێکی "بەدیعوززەمان" پەنجا هەزار کەس پەیوەندییان بەو کۆمەڵەیەوە کرد.

هەر لەم ماوەیەدا وتاری یەك لە دوای یەکی لە ڕۆژنامە ئایینی‌یەکاندا بڵاودەکردەوە و گوتاری بۆ جەماوەر دەدا، تاکو ڕێ بگرێت لەوەی کە "سەربەستی" بە هەڵە لێکبدرێتەوە یان لە ڕێڕەوی خۆی لابدرێت، هەروەها خەڵکیش ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە ڕازی بوون بە "مەشرووتیەت" بەندە بەو مەرجەی کە پەیوەست بێت بە شەرعەوە. ئیتر چ زۆرینەی خەڵکی و چ زانایان و چ سیاسەتمەداران، سوودێکی یەکجار زۆریان لەو وتارانەی وەرگرت.

هەروەها بەردەوام مژدەی هەڵهاتنی "سپێدەی ڕاست"ی بەختەوەریی دنیایی ئاسیای بە خەڵکی دەدا، لە ڕێی بێدارکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی تیایاندا، بە مەرجی پابەندبوون بە فەرزەکانی شەرعەوە، تاکو جڵەوی ئەو بێداری‌یە لە دەستی میللەت نەترازێت.

---

(١) مەڵبەندی دوو پارێزگای تورکیان دەکەونە خۆرهەڵاتی ئەستەمبوڵ. (وەرگێڕ)

هـەروەك هەمیشـە وریـایی دەدا و دەیـوت: "ئەگـەر مەشـرووتیەتی مەشـرووع و سەربەستیی شـەرعی قبوولْ نەکـەین و بـە شێوەی پێویسـت جێبـەجێ نـەکرێن، ئەوا لـە دەستی دەدەین و، کارگێڕیەکی خۆسەپێن دەڕواتە جێی"[1].

## ساڵی ١٩١٠ز/١٣٢٨ك

❑ لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ "وان"

لە ئەستەمبوولْ نەمایەوە، بەڵکو لە ڕێی "باتووم"ەوە گەڕایەوە بۆ "وان". لـە ڕێدا، بـە شاری "تەفلیس"دا تێپەڕی و سەرکەوتە سەر گردی "شێخی سەنعان"[2].

❑ گفتوگۆی لەگەڵ پۆلیسێکی ڕووسدا

(دە ساڵ پێش ئێستا [ واتە ساڵی ١٩١٠ز ] ڕۆشتم بۆ "تـەفلیس" و سـەرکەوتمە سـەر گردی "شێخی صەنعان".

لەو کاتەدا کە بە تێڕامانـەوە سـەرنجی دەوروبـەری خـۆم دەدا، ڕووسـێك لێـم هاتـە پێش و، وتی: سەرنجی چی دەدەیت؟

وتم: نەخشەی قوتابخانەکەم دەکێشم!

وتی: بۆچی تۆ خەڵکی کوێیت؟

وتم: بەتلیس.

وتی: ئاخر خۆ ئێرە تەفلیسە!

وتم: بەتلیس و تەفلیس برای یەکترین.

وتی: مەبەستت چی‌یە؟

وتم: خەریکـە سـێ ڕووناکیی یـەك لـە دوای یـەك لـە ئاسـیا و سـەرجەمی جیـهانی ئیسلامیدا دەردەکەون.. لای ئێوەش سـێ تـاریکیی یـەك لەسـەر یـەك پـەیدا دەبن. دوای ئەوە، پەردەی ئەم ئیستیبدادە دێتەوە یەك و پارچە پارچـە دەبێـت. ئـەو کاتـە منیـش دێـم و قوتابخانەکەم لێرە بنیات دەنێم.

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

وتی: ئاواتێکی چەندە دوورە! من لە هیوا درێژیت سەرسام ماوم!

وتم: منیش لە ژێریی تۆ سەرم سوورماوە! ئایا پێت وایە ئەم وەرزی زستانە هەر دەمێنێتەوە؟ دڵنیابە کە هەموو زستانێك بەهارێکی لە دوایە و، هەموو شەوێکیش ڕۆژی لێ دەبێتەوە!

وتی: ئاخر موسڵمانان لەتوپەت بوون.

وتم: ڕۆشتوون بۆ بەدەستهێنانی زانست.. ئەوەتا "هیندی"ی کوڕی بە جەوهەر و لێهاتووی ئیسلام لە قوتابخانەی ئامادەیی ئینگلیزدا دەخوێنێت..

ئەوەش "میسری"ی کوڕە زیرەك و وریای ئیسلامە لە قوتابخانەی ئیداریی سیاسیی ئینگلیزدا درێژە بە خوێندنەکانی دەدات..

ئەوانەش قەفقاسی و تورکستانین، کە کوڕی ئازا و بەجەرگی ئیسلامن، لە قوتابخانەی سەربازیی ڕووسدا مەشق دەکەن... هتد.

جا ئەو ڕۆڵە بەوەفا و جوامێرانە، دوای وەرگرتنی بڕوانامەکانیان، هەریەکەیان جڵەوی یەکێك لە کیشوەرەکان دەگرنە دەست و، ئاڵای باوکی دادگەریان - کە ئیسلامی مەزنە - بەرز دەکەنەوە، تاکو بەسەر ئاسۆکانی سەرجەم ئاکارە بڵند و ڕەفتارە مەزنەکاندا بشەکێتەوە و، وێڕای هەموو گیروگرفتێکیش نهێنیی ئەو دانستە ئەزەلیی‌یەی خواوەند ئاشکرا بکەن کە لە چارەنووسی ئادەمیزاددا دەستنیشانی کردووە)[1].

☐ دانانی پەیامی ڕەچەتەی عەوام "مونازەرات"

کاتێ گەیشتەوە شاری "وان" دەستی کرد بە وتنەوەی وانە کۆمەڵایەتی و زانستی‌یەکانی و، بەناو هۆز و تیرەکاندا گەڕا و، لە نێوان چەند پرسیار و وەڵامێکدا و بە شێوازی گفتوگۆ ڕێنماییەکانی خۆی پێشکەش کردن، کە دوایی لە نامیلکەیەکدا بە ناوی "مونازەرات" بە زمانی تورکی بڵاوی کردەوە. هەروەك لە هەمان کاتدا و بە مەبەستی ناساندنی ڕووناکی‌یەکانی ئیسلام بە کەسانی سیاسی و کاربەدەستان، گفتوگۆی لەگەڵ دەگۆڕینەوە[2].

---

(١) داوەری‌یەکان، سنووحات، ل: ٧٦٥-٧٦٧.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

❏ هەندێ لە پێشەکیی ئەو پەیامە

(بزانن کە: کاتێ دووهەم سالّی "مەشرووتیەت" گەشتەکەم دەستی پێکرد و، لەو سەردەمەوە کە ئەستەمبولّ نوێنەرایەتیی دەکات بەرەو دوا گەڕامەوە و، بەرەو چەرخەکانی ناوەڕاست شۆڕ بوومەوە و، بەناو هۆزە کوردەکاندا گەڕام و، "هاوینە گەشتەکەم" لە باخی بەهارەوە بەرەو پایز دەستی پێکرد، ئنجا لەویشەوە کەوتمە ڕێ بۆ "گەشتی زستان" لە وڵاتە عەرەبی‌یەکاندا.. لەم کاتەدا، چیا و دەشتەکانم کردە قوتابخانەیەك وانەی "مەشرووتیەت"م تێدا پێ وتنەوە.

هەر ئەو کاتە لە دوودڵی و گومانەکانیانەوە بۆم دەرکەوت کە بە شێوەیەکی نامۆ لە "مەشرووتیەت" تێگەیشتوون، هەروەك زانیم زۆربەی گومانەکان و پرسیارەکانیان هی یەك دۆڵ و شیون. ئیتر بە مەبەستی دەستنیشان کردنی ئەو نەخۆشی‌یە، کلیلی گوفتارم دایە دەستی خۆیان و، وتم:

"پرسیار بکەن" تاکو وەڵامەکەم نەخۆشی‌یەکەتان چارەسەر بکات.

ئەوانیش ئەم شێوازەیان پەسەند کرد، چونکە سروشتیان وایە کە لە ڕێی وتوویێژ و گفتوگۆکردنەوە وانەکانیان وەردەگرن.

جا بەو نیازەی کە سوودەکەی گشتی بێت، پرسیارەکانی ئەوانم لەگەڵ وەڵامەکانی خۆمدا نووسی، تاکو پشتی ئەو وەڵامانە بگرن و، نووسراوەکەم لە بریی مـن بدوێت و، ڕووی گوفتاری لە کوردەکان و هاوشێوەیان بێت کە نەمبینیون، هەروەها بۆ ئەوەش کە بە زمانی پرسیارەکان مەبەستی ئەو کەسانە دەربڕێت کە زمانیان توانای دەربڕینی ناخی خۆیانی نی‌یە.

واتە ئەم کتێبە لە بری من وەڵام دەداتەوە و لە بریی ئەوان پرسیار دەکات. هەروەك یارمەتیی پزیشکانی سیاسەتیش دەدات بۆ دیاری کردنی نەخۆشی‌یەکە.

دەسا ئەی کەسانی بە پەرۆش و خاوەن غیرەت!

ئاگادارتان دەکەمەوە کە وەك بیر و هزر کوردەکان و هاوشێوەکانیان بوون و دەشبن بە "مەشرووتیەت خواز". بەڵام هەندێ لە کارمەندان بە "کرداریان" شوورا

بەرجەستە ناکەن. کە ئەمەش گرفتی لەوە زیاترە، لە کاتێکدا کە مامۆستای ئەو عەوامانەی ژێرییان لە چاویاندایە بریتییە لە "کردار")[1]!

[ کاتێ کە دوای ماوەیەکی درێژخایەن "مونازەرات"ی خوێندەوە، ئەمەی خوارەوەی نووسی: ]

(برا ئازیزەکانم!

کتێبێکی چاپکراوی سەعیدی کۆنم دەست کەوت کە ناوی "مونازەرات"ە و، بە وردبینی و تاسەمەندییەوە تێم ڕوانی. یەکسەر ئەم بڕگەیەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

یەکەم:

ئەم کتێبەی کە سالی ١٣٢٩ك لە چاپخانەی "أبو الضیاء" چاپ کراوە، بریتییە لەو دەرسەی کە لە سالی سێهەمی سەردەمی سەربەستیدا و بۆ ئەوەی هۆز و خێلەکان بە ڕاستی و دروستی لە شوورای شەرعی تێبگەن و وەری بگرن، سەعیدی کۆن بە عەشرەتەکانی "ئەرتووش" بە تایبەت "گەڤەدان" و "مامە خووران"ی وتووەتەوە. بەلام هەرچەند سی سال بە دوای ئەم نووسراوەمدا دەگەڕام بە داخەوە دەستم نەکەوت، تا لەم نزیکانەدا یەکێك نوسخەیەکی دەست کەوت و بۆی ناردم.

کتێبەکەم بە وردی و بە عەقلی سەعیدی کۆن و بە سنووحاتی سەعیدی نوێ خوێندەوە..

تێگەیشتم کە سەعیدی کۆن بە هەستێکی سەیر و سەرسووڕهێنەری پێش وەخت نزیکەی چل سال پێش ئێستا هەستی بەم ڕووداوە ماددی و مەعنەوییانە کردووە کە ئێستا ڕوو دەدەن. چونکە لە پشت پەردەی هۆز و عەشیرەتە کوردەکانەوە ئەو خیانەتکارانەی بینی کە ئەم ڕۆژگار و زەمانەیان کردبوو بە ڕووپۆشی خۆیان و، بریتین لەو مولحید و جاهیلە ڕاستەقینە و کۆنەپەرستانەی کە دەیانەوێت لە ژێر پەردەی نیشتمان پەروەریدا ئەم نەتەوەیە بەرەو داب و نەریتە پێشینەکانی پێش سەردەمی ئیسلام بوونیان بگێڕنەوە و، سەعیدی کۆنیش بە توند و تیژی لەگەلیان دواوە.

---

(١) داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٢٩١-٢٩٢.

دووهەم:

ئەو لاپەڕانەم لەم کتێبەدا خوێندەوە کە تیایاندا دەردەکەوێت وەلی‌یەکی گەورە لەناو گوێ بیستانی ئەو دەرسەمدا بووە، بە بێ ئەوەی من پێی بزانم. چونکە لەو مەقامەدا ڕەخنەیەکی توندی گرت و وتی:

- تۆ زیاد لە پێویست ڕۆ دەچیت و پێی لێ ڕادەکێشیت، چونکە "ئەندێشە" بە "حەقیقەت" پیشان دەدەیت و، لەو ڕووەوە کە پێت وایە ئێمە "نەزان" بین. سووکایەتیمان پێ دەکەیت. خۆ ئێمە لە چەرخی ئاخر زەماندایین و فەساد و خراپکاری پەرە دەسێنێت و لەمەولاش لە خراپەوە بەرەو خراپتر سەردەکێشێت.

وەڵامی ناو کتێبەکەش بەم جۆرە بوو کە:

بۆچی دەبێ دنیا بۆ هەموو کەسێك گۆڕەپانی پێشکەوتن بێت و، تەنها بۆ ئێمە مەیدانی دواکەوتن بێت؟!

جا ئەگەر وایە، ئەوا سوێند بێت لەگەڵ ئێوە نەدوێم و پشتتان لێ هەڵبکەم و، ڕووی گوفتارم بکەمە ئەوانەی کە لە ئایندەدا دێن، [ پێیان دەڵێم: ]

ئەی ئەو کەسەی وا لە پشت چەرخێکی بڵندی دوای سێ سەد ساڵەوە و بە ئەسپایی و بێ دەنگی گوێ لە وتەکانی "نوور" ڕادەگرێت و، بە تەماشا کردنێکی غەیبی و پەنهان بۆمان دەڕوانێت!

ئەی ئەوانەی ناوتان: "سەعید و حەمزە و عومەر و عوسمان و تاهیر و یووسف و ئەحمەد" و ئەم چەشنە ناوانەیە!

من لەگەڵ ئێوە دەدوێم.. سەرتان بەرز بکەنەوە و تەسدیقم بکەن و بڵێن:

"ڕاستت وت".

با ئەم تەسدیق کردنەش قەرز بێت لە ئەستۆتاندا!

با واز لەم هاوچەرخانەم بێنین کە گوێ بۆ وتەکانم ڕاناگرن. من لەگەڵ ئێوەمە و، هەر لە شیوە قووڵەکانی ڕابوردووەوە - کە ناوی مێژووی لێ نراوە - تا دەگاتە لوتکە بڵندەکانی ئایندەی ئێوە و، لە ڕێی شەپۆلەکانی "ئەثیرەوە" لەگەڵتان دەدوێم..

چی بکەم؟ ناچار بووم زوو بێم و بە دەستی خۆم نەبوو، ویستی قەدەر وا بوو کە لە زستانی ژیاندا بێمە ناو ئەم ژیانە. بەڵام خۆزگەم بە ئێوە، لە بەهارێکی خۆشی بەهەشت ئاسادا دێنە مەیدان و، ئەو تۆوانەی "نوور" کە ئێستا دەچێنرێن، لە زەویی ئێوەدا بە چەندین گوڵی گەش دەمیان دەپشکوێت.

ئێمە بەرامبەر بە خزمەتگوزارییەکانمان تەنها داوای ئەوەتان لێ دەکەین کە هەر کات هاتن و بە قەدپاڵی ڕابوردوودا گوزەرتان کرد، سەرێك لە گۆڕەکانمان بدەن و دیارییەکانی ئەو بەهارەتان لەسەر لووتکەی قەڵاکەدا بڕوێنن)[1].

## ساڵی ١٩١١ز/١٣٢٩ك

### ☐ بەرەو شام

[لە کۆتایی ساڵی ١٩١٠ز (١٣٢٩)دا ڕۆشت بۆ شام و، لەوێ لەسەر مینبەری مزگەوتی ئەمەوی وتارێکی ئاراستەی ئامادەبووان کرد کە دواتر لە نامیلکەیەکدا بە ناوی "وتاری شام" چاپ کرا].

### ☐ هەندێ لە پێشەکیی "وتاری شام"

(ئەم پەیامە عەرەبییە چل ساڵ پێش ئێستا بە دەرس لە مزگەوتی ئەمەویی دیمەشقدا و لەسەر جەختی زانایانی ئەوێ پێشکەش کراوە و، نزیکەی دە هەزار کەس گوێیان لێ ڕاگرت، کە بەلای کەمەوە سەد کەس لە گەورە زانایانی شامیان لە نێواندا بوو.

"سەعیدی کۆن" بە هەستی پێش ڕووداو هەستی بەو ڕاستییانە کردبوو کە بە دڵنیایی و یەقینێکی تەواوەتی وەك مژدەیەك لەو وتارەدا ڕایگەیاندن، چونکە پێی وابوو ئەو ڕاستییانە نزیکن بێنە دی. بەڵام هەردوو جەنگە گەورەکە و ئیستیبدادی ڕەهایش، کە چارەکە سەدەیەکی خایاند[2]، بوون بەهۆی ئەوەی چل پەنجا ساڵ هاتنەدیی ئەو ڕاستییانە دوا بکەوێت)[3].

---

(١) پاشبەندەکان، ل: ٥٤٦-٥٤٨؛ داوەرییەکان، مونازەرات، ل: ٣٤٩-٣٥٠.

(٢) واتە لە نەمانی خەلافەتی عوسمانییەوە لە ساڵی (١٩٢٤ز)دا، هەتا ساڵی (١٩٥٠ز).

(٣) داوەرییەکان، وتاری شام، ل: ٤٧٥.

ئەم "وتاری شام"ە کاتی خۆی دوو جار لە چاپ درایەوە.

لەم وتارەیدا دەردە ماددی و مەعنەوییەکانی نەتەوەی ئیسلامی دەستنیشان کردووە و، لەو هۆکارانە دواوە کە جیهانی ئیسلامیی دووچاری ڕووداوە لەناودەرەکان کردووە.

هەروەك ڕێگا چارەی ڕزگاربوونیشی لەو دەردانە لە وتارەکەیدا خستووەتە ڕوو. هەروەها مژدەی بە هەموو موسڵمانان و سەرجەمی مرۆڤایەتی داوە کە لە داهاتوودا ئایینی ئیسلام لە سەرانسەری زەویدا فەرمانڕەوا دەبێت، ڕوونیشی کردووەتەوە کە گەورەترین پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی - پێکەوە - ئیسلام دەیهێنێتەدی و، شارستانێتیی ئیسلامیش بە جوانترین شێوەی دەردەکەوێت و، گۆی زەوی لە چڵك و چەپەڵی‌یەکانی پاك دەبێتەوە.

هەموو ئەمانەشی هاودەم لەگەڵ چەندین بەڵگەی توندوتۆڵی عەقڵیدا دەخستە ڕوو[1].

❑ نموونەیەك لە وتارەکەی

(من وانەکانم لە قوتابخانەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئادەمیزاددا خوێندووە و، لەم کات و شوێنەدا فێری ئەوە بووم کە شەش نەخۆشی هەن ئێمەیان - لە ڕووی ماددی‌یەوە - لە دەرگای سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕاگرتووە، لە کاتێکدا کە بیانی‌یەکان - بە تایبەت ئەوروپاییەکان - بەرەو داهاتوو هەڵفڕیون.

ئەو نەخۆشی‌یانەش ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: ژیانی نائومێدی و بێ هیوایی، کە لەناو ئێمەدا هۆکاری سەرهەڵدانی بەدەست هێناوە.

دووهەم: مردنی "ڕاستی" لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیماندا.

سێهەم: حەز بە دوژمنایەتی.

چوارەم: نەزانینی ئەو پەیوەندی‌یە نوورانی‌یانەی کە ئیمانداران پێکەوە گرێ دەدەن.

---

(1) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

پێنجەم: بڵاوبوونەوە و تەشەنە کردنی خۆسەپاندن (ئیستیبداد) بە وێنەی تەنینەوەی پەتا و درمە جۆراوجۆرەکان.

شەشەم: پەستاندنی ورە و چالاکی لە بازنەی بەرژەوەندییە کەسییەکاندا.

وا بە مەبەستی چارەسەر کردنی ئەم "شەش نەخۆشی"یە کوشندەیە، بە "شەش وشە" ئەو ڕێگا چارانە دەخەمە ڕوو کە لە دەرمانخانەی قورئانی حەکیم - کە وەك کۆلێژێکی پزیشکی وایە لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا - وەرم گرتوون، چونکە ئەوانە بە بناغەی چارەسەر دەزانم.

وشەی یەکەم: "هیوا"!

واتە: پشت بەستنی توندوتۆڵ و تەواوەتی بە "میهرەبانیی خوای گەورە" و متمانە پێ بوونی.

بەڵێ، ئەی جەماوەری موسڵمان! لەسەر بناغەی وانەکانم کە لە ژیاندا فێریان بووم، خۆشحاڵم مژدەی ئەوەتان بدەمێ کە نزیکە نیشانەکانی سپێدەی بەیان لە ئاسۆدا دەربکەون و، خۆری بەختەوەریی ئەم دنیای جیهانی ئیسلامە، بە تایبەت قەڵەمڕەوی عوسمانی و پێشکەوتنی ئیسلام هەڵبێت، نەخوازەڵا عەرەبەکان کە بێداری و پێشکەوتنی جیهانی ئیسلامی بەندە بە ڕابوون و بێداریی ئەوان.

وا من بە کوێرایی چاوی "نائومێدی" و، بەوپەڕی هێز و توانای خۆم و، بە دڵنیاییەکی ئەوتۆ کە هەموو گێتی بیبیستێ، ڕایدەگەیەنم کە:

ئایندە تەنها هەر بۆ ئیسلامە و، جڵەوی فەرمانڕەواییش تەنها بە دەست ڕاستییەکانی قورئان و ئیمانەوە دەبێت. کەواتە با بەو قەدەرەی خوای گەورە و ئەو بەشەی کە بۆی دیاری کردووین ڕازی بین، چونکە ئێمە ئایندەیەکی گەش چاوەڕوانمانە و، بیانییەکانیش ڕابوردوویەکی ئاڵۆز و شێواویان تۆمار کردووە.

ئەمە دەعواکەمە و، گەلێ بەڵگەشم لەسەری هەیە. بەڵام - دوای ڕێ خۆش کردن بە چەند پێشەکییەك - تەنها بەڵگە و نیوێکیان لێ باس دەکەم)[1].

---

(١) داوەرییەکان، وتاری شام، ل: ٤٨٨-٤٨٩.

□ گەڕانەوەی بۆ ئەستەمبووڵ

[ پاشان لە ڕێی بەیرووت – ئیزمیرەوە گەڕایەوە بۆ ئەستەمبووڵ و، لەوێ بەردەوام بوو لەسەر دواکاریی دامەزراندنی قوتابخانە(زانکۆ)ی زەهراء ].

□ هاوڕێیەتی کردنی سوڵتان ڕەشاد لە گەشتەکەیدا

لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا بە نوێنەریی ویلایەتەکانی خۆرهەڵات (کوردستان) هاوڕێیەتیی سوڵتانی ڕەشادی کرد لە گەشتەکەیدا بۆ ڕۆمەلی[1].

ئەو دەمە بە سوڵتان و ئەو ئیتتیحادییانەشی وت کە لەگەڵ سوڵتاندا بوون:

"خۆرهەڵات" (کوردستان) لە هەموو شوێنێکی دیکە زیاتر پێویستی بەم چەشنە زانکۆیە هەیە[2]، چونکە شوێنێکی "ناوەند"ە سەبارەت بە جیهانی ئیسلامی. سوڵتانیش بۆ ئەو مەبەستە بەڵێنی باشی پێ دا.

پاشان هەر هێندەی جەنگ لەگەڵ بەلقاندا هەڵگیرسا و شوێنی ئەو زانکۆیە لە "قۆسوا"دا گیرا، بەدیعوززەمان داوای کرد ئەو بڕە پارەیەی کە بۆ ئەوێ تەرخان کرابوو، دابنرێت بۆ کردنەوەی زانکۆیەك لە خۆرهەڵات، ئەوەبوو ڕەزامەندی لەسەر داواکەی بەدەست هات[3].

(سوڵتان ڕەشاد نۆزدە هەزار لیرەی زێڕینی بۆ دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە بەخشی و، بناغەکانی ئەو قوتابخانەیە دامەزران و بەرز کرانەوە، بەڵام هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ڕێی لە تەواو کردنی ئەو پڕۆژەیە گرت)[4].

□ غیرەت و پەرۆشیی "ئایینی" یان هی "نەتەوەیی"؟

(لەناو شەمەندەفەرەکەماندا گفتوگۆیەك ڕووی دا لە نێوان من و دوو برادەر لەوانەی کە زانستیان لە قوتابخانە تازەکاندا خوێندبوو.. لێیان پرسیم:

---

(١) واتە ئەو بەشەی خۆرهەڵاتی ئەورووپا کە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بووە. گەشتەکەش ماوەی (٧-٢٦/٦/١٩١١ز)ی خایاندووە.

(٢) پێدەچێ مەبەست زانکۆیەکی دیاری کراو بێت کە ئەو دەمە لە نیازدا بووە لە بەشە ئەوروپییەکەی دەوڵەتی عوسمانیدا دامەزرێت. (وەرگێڕ)

(٣) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati

(٤) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٧١.

غیرەت و پەرۆشیی "ئایینی" و "نەتەوەیی" کامیان بەهێزتر و باشترە مرۆڤ شوێنی بکەوێت و پشتی پێ ببەستێ؟

هەر ئەو کاتە وەڵامم دانەوە کە:

لای ئێمەی موسڵمان "ئایین" و "نەتەوە" یەکیان گرتووە. خۆ ئەگەر جیاوازی‌یەکیش هەبێت، تەنها ڕواڵەتی و لاوەکی‌یە. تەنانەت ئایین لای ئێمە گیان و ژیانی نەتەوایەتیمانە.

بەڵام گەر بەو چاوە تەماشا بکرێن کە لە یەك جیا بن، ئەوا دەبینین حەماس و پەرۆشی ئایینی سەرجەمی کەسانی تایبەتمەند و خەڵکانی عەوامیش دەگرێتەوە، کەچی غیرەتی نەتەوەیی تایبەت دەبێت بە یەك لە سەدی خەڵکی لەوانەی کە بتوانن سوود و بەرژەوەندیی کەسیی خۆیان لە پێناوی نەتەوەدا بەخت بکەن!

کەواتە دەبێ لە مافە گشتی‌یەکاندا پەرۆشیی ئایینی بکرێت بە بناغە، ئنجا هی نەتەوەییەکەش خزمەتگوزاری گوێڕایەڵ و پشتگیرێکی توندوتۆڵی ئەو بێت.

ئێمەی خۆرهەڵاتی لە خۆرئاواییەکان ناچین، چونکە هەست و نەستی ئایینی بەسەر دڵماندا زاڵە. ئەوەتا قەدەری خوای گەورە بە ناردنی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لە خۆرهەڵاتدا ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە تەنها هەست و نەستی "ئایینی"یە بێداری بە خەڵکانی خۆرهەڵات دەبەخشێت و بەرەو پێشکەوتن دەیانبات. چەرخی بەختەوەری و سەدە نزیکەکانی دوای ئەوە، بەڵگەیەکی زۆر باشن لەسەر ئەمە.

دەسا ئەی هاوڕێیانم لەم قوتابخانە گەڕۆك(شەمەندەفەر)ەدا!

ئەی ئەوانەی پرسیار لەمەڕ جیاکاریی نێوان غیرەتی ئایینی و نەتەوەیی دەکەن!

ئەی ئەو قوتابییانەش کە لەناو قوتابخانەی شەمەندەفەری زەماندا لەگەڵ ئێمەدان و دەڕۆن بۆ داهاتوو!

ڕووی گوفتارم لە هەمووتانە و، دەڵێم:

پەرۆشیی ئایینی و نەتەوەیی ئیسلامی، بە تەواوی و بە جۆرێك کە نەتوانرێ لە یەك جیا بکرێنەوە، لە نەتەوەکانی تورك و عەرەبدا تێکەڵی یەکتری بوون.

جا ئەم پەرۆشی‌یە ئیسلامی‌یە ئاوێتەیە، بەهێزترین و توندوتۆڵترین پەتی نوورانی‌یە کە لە عەرشی هەرە مەزنەوە نازڵ بووە و، قایمترین دەستاوێزە کە هەرگیز ناپچڕێت و، ئەو قەڵا پۆڵایینەیە کە ناڕووخێنرێت)[1].

☐ لەبارەی کتێبی "تەعلیقات"ەوە کە لە زانستی "مەنتیق"دا داینراوە

[ مامۆستا عەبدولمەجیدی برای لەم بارەیەوە دەڵێت: ]

ئەم پەیامەی کە ناوی"تەعلیقات"ە، بریتی‌یە لەو پەراوێزانەی کە بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی لەسەر کتێبی "بورهان"ی گولەنبەوی نووسیویەتی و، "مەلا حەبیب"یش نووسیویەتەوە کە خۆشەویست ترین قوتابیی ئەو دەمەی مامۆستا و ئامادەی بەردەوامی وانەکانی ئەو بووە[2]. ئیتر ئەو ڕوونکردنەوانەی لە شێوەی پەراوێزدا تۆمار کردووە. ئەوەش لە سالی (١٣٢٩ك)دا بوو.

پاشان جەنگی جیهانیی یەکەم هەڵگیرسا و، بەدیعوززەمان و مەلا حەبیب وەکو ئامۆژگار بە هاورێیەتیی هێزەکەی "وان" ڕۆشتن بۆ بەرەی جەنگ لە "ئەرزرۆم" و، دوای ساڵێك پێکەوە گەڕانەوە. لەو دەمەدا وان لە لایەن ئەرمەنەکانەوە داگیر کرابوو. ئیتر پاشەکشێیان بەرەو قەزای "گەواش" کرد و، مەلا حەبیب لەوێ شەهید بوو.

دوای ئەوە، نامیلکە دەستنووسەکەی ئەوم بە درێژایی ساڵەکانی کۆچکردنم لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر و لە شارۆچکەیەکەوە بۆ یەکێکی دی لەگەڵ خۆمدا هەڵدەگرت، هەتا سالی (١٩٤٠ز) لە شاری "مەلاتییە" گیرسامەوە و، پاشان لەوێوە بەرەو شارۆچکەی "ئۆرگوب" و، لەوێ بە موفتی دامەزرام.

هەرچەند نامیلکەکە چەند پەڕەیەکی پچڕپچڕ و جیاجیا بوون، بەڵام من کۆم کردنەوە و بەرگم تێگرتن، بەو هیوایەی کە ڕۆژگارێك بێتە پێشەوە سەرلەنوێ

---

(١) داوەری‌یەکان، وتاری شام، ل: ٥٢٣-٥٢٤.

(٢) "مەلا حەبیب" یەکێکە لە قوتابی‌یە دڵسۆز و زیرەك و نزیکەکانی مامۆستا نوورسی لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا. بە هۆی خەتە جوانەکەیەوە نووسەرەوەی بەرهەمەکانی ئەو دەمەی مامۆستا نوورسی بووە، وەك لەو کتێبی (تەعلیقات)ەی کە لە دەقەکەدا باسی هاتووە، هەروەها تەفسیری عەرەبیی (إشارات الإعجاز) و کتێبێکی تری تەفسیریش بە زمانی کوردی کە لەو جەنگەدا تیاچووە. لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەشداریی جیهادی کردووە هەتا ئەو کاتەی شەهید بووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

زانست و ئایین زیندوو بکرێنەوە و، خەڵکانێك بێنە مەیدان کە ئەم چەشنە ناميلکانە بخوێنن. ئیتر ئەو کاتە ڕێزی شایانی لێ دەگیرێت و دەزانرێت کە چ هزرێکی قووڵ و چ زیرەکی‌یەکی تیژی تێدایە. بەڵام ئاواتێکی دوورە! نە ئەو ڕۆژگارە دێت و نە ئەو خوێنەرانەش پەیدا دەبن! والسلام.

عەبدولمەجید ١٩٥١ز[1]

## ساڵی ١٩١٣ز/١٣٣١ك

□ ڕووداوەکەی بەتلیس[2]

(ماوەیەکی کەم پێش جەنگی جیهانیی پێشوو، هەندێ کەسی ئاییندار و خاوەن تەقوا هاتن بۆ لام لە شاری وان و، وتیان:

"هەندێ لە سەرکردەکان چەند کارێکی دژ بە ئایین ئەنجام دەدەن. دەمانەوێ لێیان هەڵبگەڕێینەوە. تۆیش بەشداریمان بکە"!

پێم وتن:

"ئەو کارە بێ دینی و خراپکاری‌یانەی کە ئێوە باسی دەکەن، هی ئەو چەشنە سەرکردانەیە و، ناکرێ بەرپرسیاریتی‌یان بخرێتە ئەستۆی سوپا. چونکە ئەم سوپای عوسمانی‌یە لەوانەیە سەد هەزار ئەولیای خوای گەورەی تێدا بێت، بۆیە ناتوانم شمشێر لە ڕووی ئەم سوپایەدا هەڵبیرم و بەشداریتان بکەم".

دوای ئەمە، وازیان لە من هێنا. بەڵام خۆیان چەکیان هەڵگرت و، ئاکامەکەشی ڕووداوەکەی "بەتلیس" بوو، کە هیچ ئامانجێکی ئەوانی نەهێنایە دی..

پاش ماوەیەکی کەم جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا و، ئەو سوپایە لە ژێر ئاڵای ئاییندا بەشداریی لەو جەنگەدا کرد و ڕۆشتە ناو گەرمەی جیهادەوە و، سەد هەزاریان

---

(١) صيقل الإسلام، تعليقات، ص: ٢٤٢ .

(٢) (بەدلیس، بەتلیس، بیتلیس) هەموویان یەك ناون بۆ مەڵبەندی پارێزگاکەی نوورسی. ئەو ڕووداوەش بریتی‌یە لە هەڵسانەوەی هۆزە کوردەکانی دەوروبەری شاری "بەتلیس" بە سەرۆکایەتیی شێخ سەلیم لە دژی هەڵسوکەوتی ناموسڵمانانەی هەندێ لە ئەفسەرەکانی حوکمی "ئیتتیحاد و تەرەقی". لە مانگی حوزەیرانی (١٩١٣ز)دا ڕووی داوە و، بۆ ماوەی حەفتەیەك شارەکەیان لە ژێر دەستدا بووە. (وەرگێڕ)

لێ شەهید بوو، لەم ڕێیەشەوە ئەو شەهیدانە بۆ پلەی ئەولیاکان بەرز بوونەوەو، بە خوێنەکەیان ئیمزایان لەسەر بڕوانامەی "ویلایەت" کرد! ئەو ئاکامەش بوو بە بەڵگەیەك و پشتی ڕاستیی ڕەفتارەکەی منی گرت لەو کێشەیەدا)[1].

☐ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی ئەرمەن

(پەیوەندیی قوتابیانی "سەعیدی کۆن" بە مامۆستاکەیانەوە هێندە توندوتۆڵ بوو کە گەیشتبووە پلەی خۆ بەخت کردن و قوربانیدان. بۆیە "سەعیدی کۆن" دەیتوانی ڕووبەڕووی ئەو چالاکییە زۆرانە ببێتەوە کە چەکدارەکانی ئەرمەن و گیانفیدایانی "تاشناق" دەیانکردە سەر دەوروبەری "وان" و "بەتلیس". تەنانەت هەندێ جار تا ڕادەیەکیش لە سنووری خۆیاندا ڕایان دەگرتن.

خۆ کاتێ کە تفەنگی "ماوزەر"ی بۆ قوتابیانی پەیدا کرد، قوتابخانەکەی شێوەی سەربازگەی لەخۆ گرت، چونکە کتێب و تفەنگەکان لەو قوتابخانەیەدا شان بە شانی یەکتر بوون. هەر لەو دەمەدا سەرکردەیەکی سەربازی بە پلەی "فەریق" هات و ئەو دیمەنەی بینی، وتی: "ئەمە سەربازگەیە، نەك قوتابخانە"! ئنجا لە ترسی دووبارە بوونەوەی ڕووداوەکەی "بەتلیس" فەرمانی دا کە "تفەنگەکان کۆ بکەنەوە". بەم جۆرە، پازدە تفەنگیان لە ئێمە گرت.

دوای نزیکەی دوو مانگ، یەکەم جەنگی جیهانی هەڵگیرسا و، منیش تفەنگەکانی خۆمم لێ سەندنەوە.. بە هەر حاڵ.

جا بە بۆنەی ئەو چەشنە بارودۆخ و هەڵوێستەوە، لێیان پرسیم:

چەکدارەکانی ئەرمەن کە خۆبەختکاری ترسناکیان تێدایە، لێتان دەترسن، تەنانەت لەو کاتەشدا کە ئێوە لە خەڵك دوورکەوتنەوە و لەسەر چیای "ئەرەك"ی "وان"دا دەستان دایە گۆشەگیری، ئەو چەکدارانە هەر خۆیان لە ئێوە دەپاراست و لێتان دوور دەکەوتنەوە. ئایا ئێوە چ هێزێکتان هەیە کە ئەوانی وا لێ کردووە؟

منیش وەڵامم دەدانەوە کە:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٥-٥٥٦.

گیانفیدایانی ئەرمەن، لە پێناوی بەدەستهێنانی ژیانێکی فانیی دنیا و، بۆ هێنانەدیی بەرژەوەندییەکی کاتیی نەتەوەیەکی بچووك و، بۆ پارێزگاری لێ کردنی، ئەم چەشنە قارەمانێتییە ناوازەیە دەنوێنن..

بەڵام ئێمە کە ڕووبەڕووی ئەوانە دەبینەوە، ئەوا قوتابیانمان لەپێناوی بەدەستهێنانی ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی و، هێنانەدیی چەندین بەرژەوەندیدا بۆ نەتەوەی بەرز و مەزنی ئیسلام تێدەکۆشن و، دڵنیان کە ئەجەل یەکێکە و گۆڕانی بەسەردا نایەت.

جا بێ گومان ئەم قوتابیانە هەرگیز لەو گیانفیدا ئەرمەنانە دواناکەون، تەنانەت گەر پێویست بکات ئامادەن کە بە بێ هیچ دوودڵییەك و بەوپەڕی شانازییەوە ژیان و ئەجەلی خۆیان و تەمەنێکی چەند ساڵەی ڕواڵەتیی دنیا بەخت بکەن لە پێناوی بەدەستهێنانی ملوێنەها ساڵی ژیانێکی نەمر و، لەبەر پارێزگاری کردنی سەلامەتیی ملیارەها موسڵمانی خواناس)[1].

☐ خەونێکی ڕاست لەبارەی "ئیعجازی قورئان"ەوە

(پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی و لە دەمی هەڵگیرسانیشیدا، ئەم خەونە ڕاستەم دی:

خۆم لە ژێر چیای "ئەرارات"دا بینی.. کتوپڕ ئەو چیایە پارچە پارچە بوو و، بەردی هێندە گەورە گەورەی بەم لا و ئەو لای ڕووی زەویدا دەهاویشت کە هەریەکەیان ئەوەندەی چیایەك دەبوون..

کاتێ لەو بارە سامناکەدا بووم، دایکمم لە تەنیشتی خۆمەوە بینی - خوا لێی خۆش بێت - پێم وت:

"دایە گیان! ترست نەبێت، ئەمە فەرمانی خوای گەورەیە، خۆ ئاشکراشە کە خواوەند دانا و میهرەبانە".

کە من لەم حاڵەدا بووم، مرۆڤێکی مەزنی پیاوچاکم لێ پەیدا بوو، فەرمانی پێ دام و وتی: "ئیعجازی قورئان ڕوون بکەرەوە".

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٣٧-٧٣٨.

کاتێ لە خەو هەڵسام، تێگەیشتم کە تەقینەوەیەکی مەزن ڕوودەدات و، لە ئەنجامی ئەم تەقینەوەیەشدا ئەو شوورایانە دەڕووخێن کە دەوری قورئانی پیرۆزیان گرتووە، ئنجا قورئان هێرشی دەکرێتە سەر و خۆی بۆ خۆی بەرگری لە خۆی دەکات و، "ئیعجاز"ەکەشی قەڵای مەحکەم و پۆڵایینی دەبێت و، یەکێکی وەك منیش دەستنیشان دەکرێم تاکو لەم زەمانەدا یەکێك لە جۆرەکانی "ئیعجازی قورئان" ڕوون بکەمەوە، بە چەشنێ کە زۆر لە سەرووی توانای خۆمەوە بێت.

ئیتر تێگەیشتم کە من بۆ ئەم کارە دەستنیشان کراوم)[1].

☐ هەڕەشەی جەنگ

[ عەبدولمەجیدی برای دەگێڕێتەوە: ]

ڕۆژێکیان کە لە سەربانی قوتابخانەی خورخوڕ بووین و مامۆستا وانەی "تەفسیر"ی پێ دەوتینەوە و، یەکەم جەنگی جیهانیش نزیك بوو هەڵبگیرسێت، ئەو ئێوارەیە خۆر بە تەواوەتی گیرا. بەدیعوزەمان ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و، وتی: "بە داخەوە، لافاوێکی ڕامالەر بەڕێوەیە کە دێت هەمووومان ڕادەماڵێت". هەروەهاش بوو، دوای مانگێك جەنگ ڕاگەیەنرا و، لە ماوەیەکی کەمدا سەرانسەری وڵاتی گرتەوە[2].

[ هەروەها قوتابیانی تریشی دەڵێن ]:

چەندین جار لە کاتی دەرسەکانیدا هەواڵی سەرهەڵدانی بوومەلەرزەیەکی گەورەی بە واتای "جەنگی جیهانی" بە گوێدا دەداین. ئەوەبوو چۆن هەواڵی لەبارەوە دا، هەر بەو جۆرەش ڕووی دا.

(لە قوتابییانی دانەر: حەمزە. محەممەد شفیق. محەممەد میهری)[3].

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢١-٦٢٢.

(٢) (ب: ١/٢٢٧) ئەویش لە یاداشتەکانی عەبدولمەجید نوورسی، ل: ١٧.

(٣) پێشەکیی کتێبی: ئاماژەکانی ئیعجاز، پەراوێز.

## بەندی چوارەم

## لە ئەنجامدانی فەرزی جیهاددا

## ساڵی ١٩١٥ز/١٣٣٤ك

☐ پێکهێنانی هێزی خۆبەخشەران[١]

(لە یەکەم جەنگی جیهانیدا[٢] لەگەڵ شەهیدی خوالێخۆشبوو "مەلا حەبیب" لە بەرەی "پاسینلەر" پەلامار و هێرشمان بۆ سەر ڕووسەکان دەبرد و، تۆپخانەکەی ئەوانیش بەردەوام لە ماوەی هەموو یەك دوو خولەکێکدا سێ گوللە تۆپی تێ دەگرتین!

جارێکیان سێ دانە لەو گوللە تۆپانە بە بەرزایی دوو مەتر لە ئاستی سەرماندا تێپەڕین و، یەکێکیان لە شێوەکەی پشتمانەوە تەقیەوە و، سەربازەکانی ناو سەنگەرەکانیش کشانە دواوە. منیش - بۆ تاقیکردنەوە - بە مەلا حەبیبم وت:

- تۆ چی دەڵێیت مەلا حەبیب؟ من خۆم لە گوللە تۆپی ئەو کافرانە ناشارمەوە!

وتی:

- منیش وەك تۆ دەکەم و لێت دوا ناکەوم و جیا نابمەوە لێت!

لەم قسانەدا بووین کە گوللە تۆپی دووهەم لە نزیکمانەوە داکەوت.

---

(١) مامۆستا نوورسی ساڵی (١٩١٤ز) وەکو ئامۆژگار (واعیظ) ڕۆشتووەتە ناو سوپای عوسمانی و، ساڵی (١٩١٥ز)یش هێزەکانی خۆبەخشەران (پاریدەدەران)ی پێکهێنا و لە بەرەی قەفقاسدا بۆ خۆی سەرکردایەتیی دەکردن.

(٢) سوپای ڕووسیا لە بەرواری ٣١/١٠/١٩١٤زدا خۆرهەڵاتی تورکیا (بەشێکی کوردستان)ی داگیرکرد. پاشان لە بەرواری ١٥/١/١٩١٥زدا و، بە شەهید بوونی شەست هەزار سەرباز، لە شوێنە داگیرکراوەکان بەدەرنران. دوای ئەوە، جارێکی دیکە سوپای ڕووس لە بەرواری ١٣/١/١٩١٦زدا و بە هێزێکی سێ ئەوەندەی هێزی عوسمانی ناوچەکەی داگیرکردەوە و، لە ١٦/٢/١٩١٦زدا ڕۆشتە ناو شاری ئەرزرۆمەوە.

هاودەم لەگەڵ متمانەیەکی زۆردا بە پارێزگاریی خوای گەورە سەبارەت بە ئێمە، بە مەلا حەبیبم وت:

با بەرەو پێشەوە بڕۆین.. گوللە تۆپی کافران نامانکوژێت و.. هەرگیز ئێمەش دانابەزینە ئاستی هەڵهاتن و دواکەوتن!

هەمان شت لە جەنگەکەی "بەتلیس" و بەرەی پێشووی ئەو جەنگەشدا ڕووی دایەوە. چونکە سێ گوللەی ڕووسەکان بەر سێ شوێنی کوشندەی من کەوتن و یەکێکیشیان شەرواڵەکەی منی کون کرد و لە نێوان هەردوو پێمەوە دەرچوو.

لەو کات و بارودۆخە پڕ لە مەترسییەدا حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆم لە خۆمدا هەڵگرتبوو کە پێم عار بوو دابەزمە ناو سەنگەرەوە. تەنانەت "کەل عەلی"ی سەرکردە و "مەمدووح"ی پارێزگار لە پشتەوە هاواریان لێ بەرز بووەوە:

با بکشێتە دواوە.. یان خێرا بڕواتە ناو سەنگەرەکەوە!

جا هەرچەند ئەوان ئاوایان پێ دەوتم، من هەر دەموت:

گوللە تۆپی دوژمنان نامانکوژێت و، بایەخم نەدا بە حەزەر و خۆپاراستن و، هەوڵم بۆ پاراستنی ژیانە ڕەنگینەکەی ڕۆژگاری لاویم نەدا)[1].

دوای ئەوەی کە بەدیعوززەمان، وەك فەرماندەی هێزەکانی پاریدەدەران، بە جوانترین شێوە فەرزی جیهادی لەبەرەی قەفقاس جێبەجێ کرد و، ڕێز و پێزانینی سەرکردەی گشتی (ئەنوەر پاشا) و سەرکردەی تیپەکانی سوپای بەدەست هێنا، کشایەوە بەرەو شاری "وان" کە هێزەکانی ڕووس بەرەو ئەوێ دەڕۆشتن.

لە دەمی چۆڵکردنی شاری واندا لە دانیشتووانی لە لایەن حکومەتەوە، بە نیازی دەربازکردنیان لە هێرش و پەلاماری هێزەکانی ڕووس، بەدیعوززەمان و قوتابیانی بڕیاریان دا کە هەتا بەدەستهێنانی پلەی شەهیدی داکۆکی لە شارەکەیان بکەن و، لە قەڵایەکدا خۆیان قایم بکەن.

بەڵام بە کشانەوەی والی و قایمقام و خەڵك و سوپا بەرەو "بەتلیس"، فەوجێکی سوارەی قازاقی ڕووس هێرشیان بردە سەر "وەستان"، لەو دەمەدا مەلا سەعید و چەند

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٤٧٠-٤٧١.

کەسێکی کەمی قوتابیانی و نزیکەی چل کەس لەو سەربازانەی کە پاشەکشێیان نەکردبوو بەرەنگاریان بوونەوە، تەنانەت بوونە هۆی ئەوەی کە ماڵ و منالی دانیشتووان نەکەوێتە بەردەستی دوژمن، ئیتر سەرجەمی دانیشتووان توانییان لە دەمی کشانەوەیاندا ڕزگاریان ببێت و دوژمن زیانیان پێ نەگەیەنێت.

ئنجا بە مەبەستی ترس هاویشتنە دلی قازاقە هێرشبەرەکانەوە، خۆی و قوتابیانی وایان پیشان دا کە تەپۆلکەیەکیان بە دەستەوەیە بەسەر ئەواندا دەڕوانێت! بەمەش وای تێگەیاندن کە هێزێکی سەربازیی گەورە بە هانایانەوە هاتووە!

بەم کارەی سنوورێکی بۆ بەرەو پێش هاتنی "قازاق" دانا، هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوەی کە ڕووس شارۆچکەی "وەستان"یان بۆ نەگیرێت.

لە گەرمەی ئەو جەنگەدا، جار بە جار دەگەڕایەوە ناو سەنگەرەکەی و، تەفسیری "ئاماژەکانی ئیعجاز"ی دادەنا، کە بۆ "مەلا حەبیب"ی قوتابیی دەوت و ئەویش دەینووسییەوە. تەنانەت هەندێ جار لەسەر پشتی ئەسپەکەی، یاخود لە یەکەم هێلی بەرگریدا ئەم کارەی ئەنجام دەدا، هەتا بەشی هەرە زۆری ئەو تەفسیرە مەزنەی تەواو کرد[1].

□ لە پێشەکیی ئاماژەکانی ئیعجاز

(یەکەم سالی جەنگی جیهانیی یەکەم و، لە بەرەی جەنگدا و، بە بێ هیچ سەرچاوەیەك، تەفسیری "ئاماژەکانی ئیعجاز" دانراوە.

دیارە بارودۆخی دژواری جەنگ و، دەستکورتی و نەبوونی، کە لەگەڵ جەنگدا هاودەمن، داخوازی ئەوە بوون کە ئەم تەفسیرە – لەبەر چەند هۆکارێکی زۆر – لەوپەڕی کورتی و پوختیدا بنووسرێت.

ئەوەبوو تەفسیری سوورەتی "فاتیحە" و نیوەی یەکەمی تەفسیرەکە لەڕادەبەدەر بە کورت و پوختی نووسران:

یەکەم: لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕۆژگار و سەردەمە بواری ڕوونکردنەوەی نەدەدا، چونکە "سەعیدی کۆن" بە دەستەواژەی پوخت و کورت نیاز و مەبەستەکانی خۆی دەردەبڕی.

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

دووهەم: "سەعید" تەنها بایەخی بە پلەی تێگەیشتنی قوتابی‌یە هەرە زیرەکەکانی خۆی دەدا و، بیری لە تێگەیشتنی ئەوانی تر نەدەکردەوە.

سێهەم: لەبەر ئەوەی کە وردترین و بەرزترینی "ئیجاز"ە خاوەن ئیعجازەکانی هۆنینی قورئانی روون دەکردەوە، ئەوا دەستەواژەکان بەرز و پوخت هاتن بەدەستەوە!

لەگەڵ ئەوەشدا، وا ئێستا بە چاوی "سەعیدی نوێ" چاوم پێدا خشاندنەوە و، بۆم دەرکەوت کە ئەم تەفسیرە لە ڕاستیدا بە هۆی ئەو وردەکاریانەی تیایدا کراوە، بە یەکێك لە شاکارە ڕەنگینەکانی "سەعیدی کۆن" دادەنرێت، سەرباری هەڵە و گوناهەکانی.

جا لەبەر ئەوەی "سەعیدی کۆن" لە دەمی نووسینی ئەم تەفسیرەدا هەڵمەتی بۆ بەدەستهێنانی "پلەی شەهیدی" دەبرد، ئیتر هەرچی‌یەکی لێ دەردەکەوت بە نیەتێکی خاوێن دەینووسی و، یاساکانی ڕەوانبێژی و زانستەکانی زمانی عەرەبیی تێدا جێبەجێ دەکرد، ئەوا نەمتوانی ڕەخنە لە هیچ شوێنێکی بگرم، چونکە ئومێدم وایە کە بەدیهێنەری مەزن ئەم دانراوە بکاتە کەفارەتی گوناهەکانی و، خەڵکانێکی بەتوانا بنێرێت کە بە ڕاستی و دروستی لەم تەفسیرە تێبگەن.

خۆ ئەگەر ڕێگرەکانی جەنگی جیهانی نەبوونایە، ئەوا نیازمان وابوو کە ئەم بەرگە تایبەت بێت بە ڕوونکردنەوەی "ئیعجازی هۆنین" لە نێوان ڕووەکانی ئیعجازی قورئاندا و، هەریەك لە بەرگەکانی تریش تایبەت بێت بە یەکێك لە ڕووەکانی تری ئیعجاز. جا ئەگەر ئەو ڕاستییانەی تەفسیر، کە لە پەیامەکاندا پەرش و بڵاون، بخرێنە ناو بەرگەکانی ترەوە، ئەوا دەبێتە تەفسیرێکی ناوازە و هەمەلایەنەی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان.

بەشکو خوای گەورە دەستەیەکی ڕووناکبووی بەختەوەر بنێرێت کە ئەم بەرگە و هەر شەست و شەش پەیامەکەی "وتەکان" و "مەکتووبات" بگرە هەر سەد و سی بەشەکانی "پەیامەکانی نوور" بکاتە سەرچاوەیەك و، لە ڕووناکیی ئەو سەرچاوەیەدا تەفسیرێکی لەم جۆرە بنووسێت)[1].

---

(١) تەفسیری: ئاماژەکانی ئیعجاز، پێشەکی.

(ئنجا کاتێ کە من چاوەڕوان بووم و، ڕووم لەم ئامانجە کردبوو کە دەستەیەکی لەم شێوەیە سەرهەڵبدات - کە ئەمەش لەمێژ بوو ئامانجی ئەندێشەم بوو - کتوپڕ بە هەستێکی پێش ڕوودان نزیکبوونەوەی بوومەلەرزەیەکی مەزن بە دڵدا تێپەڕی.

ئیتر وێڕای کۆڵەواری و ناتەواویم و داخراویی گوفتارم، دەستم دایە تۆمارکردنی هەرچیم لێ هەڵدەکەوت لە ئاماژەکانی ئیعجازی قورئان سەبارەت بە "هۆنین"ی و، خستنە ڕووی هەندێ لە ڕاستییەکانی. لەو دەمەشدا سەردانی تەفسیرەکانم بۆ نەڕەخسا. جا ئەگەر لەگەڵیاندا یەکی گرتەوە ئەوا جێی دڵخۆشییە، دەنا ئۆباڵی لە ئەستۆی خۆمدایە.

ئەوەبوو ئەم گرفتە مەزنە ڕووی دا..

ئیتر لە دەمی ئەنجامدانی فەرزی جیهاد و هەر کاتێ لە هێڵی جەنگدا هەلم بۆ هەڵبکەوتایە، بە چەند دەستەواژەیەکی جۆراوجۆری حاڵەتە جیاجیاکان و، لەناو چیا و دۆڵەکاندا هەرچیم لێ دەردەکەوت، تۆمارم دەکرد. هەرچەندەش دەزانم پێویستیان بە پاکژکاری و چاکسازی هەیە، بەڵام دڵم بە گۆڕین و دەستکارییان ڕازی نابێت، چونکە لە حاڵێکی نیاز پاکیی وەهادا سەریان هەڵداوە کە ئێستا شکی نابەم.

وا دەیانخەمە بەرچاوی خەڵکانی خاوەن کەماڵ، نەك لەبەر ئەوەی تەفسیری قورئان بێت، بەڵکو - ئەگەر قبووڵی جەماوەری زانایانی بەدەست هێنا - ببێتە جۆرە سەرچاوەیەك بۆ هەندێ لە ڕووەکانی تەفسیر.

دیارە حەز و شەوقم منی بەرەو کارێك دایەبەر کە لە سەرووی وزە و توانای خۆمەوەیە. جا ئەگەر ئەوان بە جوان هەڵیانسەنگاند، ئەوا بۆ بەردەوام بوون لەسەری هانم دەدەن. یارمەتی وپشتیوانیش هەر لە لایەن خوای گەورەوەیە) [1].

(ئەم تەفسیرە، هێندە مایەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی "ئەنوەر پاشا"ی سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان بوو کە بەوپەڕی ڕێزەوە - کە ئەوەشی لەگەڵ کەسدا نەکردووە - ڕۆشت بۆ پێشوازی لێکردنی [2]. تەنانەت بڕیاری دا کاغەزی پێویست بۆ

---

(١) تەفسیری: ئاماژەکانی ئیعجاز، پێشەکی.

(٢) واتە پێشوازی لێکردنی مامۆستا نوورسی لە دەمی گەڕانەوەیدا لە دیلی.

چاپکردنی کتێبەکە ببەخشێت، تاکو پاداشتێکی لە شەرەف و شانازی و پاداشتی ئەو دیاری‌یەدا هەبێت، کە دیاریی جەنگە)[1].

هەروەك خەبات و تێکۆشانی دانەری ئەو کتێبە لە جەنگدا، بەوپەڕی باشی و ڕێزەوە باس کرا و نرخێنرا.

□ ڕزگارکردنی هەر شتێك لە تواناداا بوو

لە گەرمەی ئەو جەنگە خوێناویانەدا[2] نزیکەی بیست کەس لە قوتابی‌یە نەجیبەکانی شەهید بوون. بەڵام قوتابی‌یە نووسەرەوەکەی کە ناوی "مەلا حەبیب" بوو دوای ئەوەی لەگەڵ "خەلیل پاشا"دا ئەرکێکی سەربازیی لە بەرەی "وان"دا بە ئەنجام گەیاند، لە "وەستان" شەهید بوو.

گیانفیدایانی ئەرمەن لە چەند ناوچەیەکدا منالی موسڵمانانیان سەردەبڕی، موسڵمانەکانیش لە کاردانەوەی ئەواندا منالی ئەرمەنیان دەکوشتەوە!

بەڵام هەر هێندەی هەزاران منالی ئەرمەن لەو ناوچەیەدا کۆکرانەوە کە لە ژێر فەرمانی بەدیعوززەماندا بوو، یەکسەر فەرمانی بۆ سەربازەکان دەرکرد کە بە هیچ شێوەیەك کاریان بەسەر ئەو منالانەوە نەبێت.

پاشان بێ ئەوەی هیچ کردارێکی نابەجێیان بەرامبەر بکات، هەموویانی ئازاد کرد و، ناردنیەوە بۆ ناو خێزانەکانی خۆیان لە پشتی سەنگەرەکانی ڕووسەوە!

ئەم ڕەوشەی بەدیعوززەمان، وانە و پەندێکی گرنگ بوو ئاراستەی ئەرمەنەکانی کرد و، بوو بە هۆی ئەوەی ڕێز لەو ڕەوشت و ڕەفتارەی موسڵمانان بنێن.

دوای ئەم ڕووداوە، ئەرمەنەکان وازیان لە کوشتنی منالی موسڵمانان هێنا لەو گوندانەدا کە هێزەکانی ڕووس داگیریان دەکرد. چونکە وتیان: مەلا سەعید منالەکانی ئێمەی سەرنەبڕی، بەڵکو تەسلیمی کردینەوە. دەبێ ئێمەش ڕەوشمان بە هەمان شێوە بێت لەگەڵ منالانی موسڵماناندا.

ئیتر لەسەر ئەوە پەیمانیان بە یەکتر دا.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٧١.

(٢) واتە هی ئەو شەوەی کە لە لایەن ڕووسەکانەوە بەتلیس گیرا.

واتە بەدیعوززەمان بوو بە هۆی ڕزگاربوونی هەزاران منالی بێ گوناهی هەردوو لا.

دوای ماوەیەك ڕووسەكان دەستیان بەسەر ناوچەكانی "وان" و "مووش"دا گرت.

ئنجا لە دەمی هێرشیاندا بە سێ هێزی سوپاوە بۆ سەر بەدلیس، "مەمدووح بەگ"ی والیی شار و "كەل عەلی"ی سەركردە بە مامۆستا بەدیعوززەمانیان وت:

"ئێمە ناچارین بكشێینەوە، چونكە تەنها یەك تیپی سەربازی و نزیكەی دوو هەزار خۆبەخشمان هەیە كە لە ژێر فەرمانی تۆدان".

بەدیعوززەمان پێی وتن:

"بەو پێیە بێت، هەموو دانیشتووانی دەوروبەرمان و خەڵكی بەتلیسیش كە پەنایان بۆ ئێمە هێناوە، خۆیان و منالْ وسامانیان دەكەوێتە دەستی دوژمن! كەواتە ناچارین هەتا مردن بەرگری لە ناوچەكە بكەین"!

وتیان:

"سەربازەكان هەوڵی ئەوە دەدەن كە سێ دانە لە تۆپەكانمان بگوێزنەوە بۆ بەرەكەی تری جەنگ لە "مووش" دوای ئەوەی كەوتە دەستی دوژمن. جا ئەگەر دەتوانیت بەو هێزە خۆبەخشەی لە ژێر فەرمانتدایە ئەو تۆپانە ڕزگار بكەیت، ئەوا دەتوانین چەند ڕۆژێكی تر بەرگری بكەین هەتا خەڵكەكە ڕزگاریان دەبێت".

بەدیعوززەمان وتی:

"یان ئەوەیە دەمرم، یان ئەو تۆپانە دەهێنمەوە"!

ئیتر بە سەركردایەتیی سێ سەد كەسی خۆبەخشەوە بەرەو "نوورشین" بە شەو كەوتنەڕێ كە تۆپەكان بەرەو ئەوێ برابوون. هەواڵگرەكانیشی دەنگۆی ئەوەیان لە نێوان سەربازە قازاقەكانی ڕووسدا بڵاوكردەوە كە:

ئەو سەركردەیەی خۆبەخشەران كە بەرگریی لە بەتلیس كرد، بە سێ هەزار سەربازی خۆیەوە هاوكات لەگەڵ سەركردە مووسا بەگدا ئەویش بە هەزار كەس لە سەربازەكانیەوە بە ڕێوەن بۆ ڕزگار كردنی تۆپەكان.

هەر هێندەی ئەم هەواڵەی كە زیادەڕەویی تێدا كراوە لە ناویاندا بڵاو بووەوە، یەكسەر سەركردەی قازاقەكان لە هێرش كردن ڕاوەستا.

ئیتر بەدیعوززەمان هەموو سەربازە خۆبەخشەکانی خۆی بەسەر تۆپەکاندا دابەش کرد و بەرەو بەتلیس ڕایان کێشان، تەنانەت دوا دانەی ئەو تۆپانە بە تەنها خۆی و دوو خۆبەخشی هاوڕێی ڕزگاریان کردا

بەم جۆرە، سێ دانە تۆپی لە دەستی دوژمن ڕزگار کرد و ناردنی بۆ بەتلیس، ئیتر سەربازەکان و خۆبەخشەرانیش بەهۆی ئەم تۆپانەوە توانییان چەند ڕۆژێکی تر لە بەردەم دوژمندا خۆیان ڕابگرن، هەتا هەموو خەڵکەکە و ماڵ و منداڵیان ڕزگاریان بوو.

هەروەها دەگێڕنەوە کە خۆبەختکارانی ئەرمەن بەوە ناوبانگیان دەرکردبوو کە چەندەش ئازار بدرێن، تەنانەت گەر پشکۆی ئاگریان بەسەردا بکرێت و چاویشیان هەڵبکۆڵرێت هێشتا هەر نهێنیی خۆیان دەپارێزن و بۆ هیچ کەسێکی نادرکێنن! لەگەڵ ئەوەشدا ڕووسەکان دەیانووت:

"خۆبەخشەکانی بەدیعوززەمان لە ئەرمەن ئازاترن و، توانیویانە بەسەر قازاقدا سەربکەون"!

بەدیعوززەمان لە یەکەم هێڵی بەرگریی پێشەوەی جەنگ و بەناو ئاگربارانda، بە مەبەستی بەرزکردنەوەی وورەی سەربازەکان و بڵاوکردنەوەی ئازایەتی لە نێوان جەنگاوەراندا، بەسەریاندا دەگەڕا و، نەدەڕۆشتە ناو سەنگەرەکانەوە.

کاتێ کە لە هێڵی پێشەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی بە ڕاست و چەپدا دەجەنگا، ختوورەیەکی ئەوتۆی بە دڵدا هات کە چاڵی لەناو گیانیدا هەڵکەند. چونکە لە بەرخۆیەوە بە خۆی وت:

ئەگەر ئێستا، کە لە هێڵی ئاگردا پێش هەموویان کەوتوویت، لەم شوێنەدا شەهید ببیت، نەکەی شتێك لە خۆنواندن تێکەڵ بە کارەکەت بێت و، لەمەوە "ئیخلاس"ەکەت کەلێنی تێبکەوێت، کە یەکێکە لە بناغەکانی پلەی "شەهیدی"!

یەکسەر دوای ئەم ختوورەیە گەڕایەوە ناو سەنگەر بۆلای هاوڕێیانی!

دوای کشانەوە و ڕزگاربوونی "والی" و "کەل عەلی"ی سەرکردە و خەڵکەکە بە شەو لەگەڵ سەربازەکان و خۆبەخشەراندا، بەدیعوززەمان و چەند کەسێك لە خۆبەخشەران لەناو بەتلیسدا مانەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەوانەی کە نەیانتوانیبوو

ڕزگاریان ببێت. هەر هێندەی تاریکایی ڕەوی‌یەوە، خۆیـان لـە بـەردەم تیپێـك سـەربازی دوژمندا بینی‌یەوە! ئیتر زۆرێك لە هاوڕێیانی، کە یەکێك لەوانە "عوبەید"ی خوشکەزای بوو، شەهید بوون و، تەنها خۆی و چوار دانە لە قوتابیانی بە تێپەڕبوونیان بـە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەناو ڕیزەکانی دوژمندا، ڕزگاریان بوو.

بۆ دڵدانەوەی هاوڕێیانی، پێی وتن:

چەکەکانمان کاتێ بەکاردەهێنین کە ڕووبەڕووی ژمارەیەکی زۆری دوژمن ببینـەوە، کەواتە خۆمان هەرزان فرۆش ناکەین و ئەو فیشەکانەی پێمانە نایتەقێنین بەسەر یەك دوو کەسی دوژمندا!

❐ دیل بوونی

(لـەو جەنگـە جیهانی‌یەدا چـەند بـارێکی ترسـناك دەورەیـان دام، تەنانـەت یەکـەم ڕەشنووسی "ئاماژەکانی ئیعجاز" بە دەستی دوژمـن درا و لەتوپـەت بـوو، چونکـە چـوار گوللە تۆپم بە یەکجار ئاراستە کرا و، لە یەکێکیاندا برینـدار بـووم و، پێیەکیشـم شـکا. ئیتر سی و چوار سەعات لەناو قوڕاودا چاوەڕوانی مردنم دەکرد و، لە لایـەن دوژمنانـەوە گەمارۆ درابووم..

ئەو کاتانە، بە تاریکترین و نائومێدترین و ترسناکترینی کاتەکانی ژیانم دادەنرێن)[1]!

چاودێری‌یەکی ئاشکرای پـەروەردگار بـوو کـە سـەربازانی ڕووس وێـڕای پشـکنینی بـەردەوام و گـەڕان بـەدوایاندا نەیاندۆزینـەوە، هەرچـەند ئـەمان لـە شـوێنێکدا بـوون کـە ئەوانیان دەبینی!

بە قوتابی‌یە گیانفیداکانی خۆی وت:

هاوڕێیانم! بەم جۆرە لێرەدا مەمێننەوە، بڕۆن و من بەجێ بهێڵن، دەنا گـەردنتان ئـازاد ناکەم. هەوڵی ڕزگار کردنی خۆتان بدەن!

وەڵامیان دایەوە کە:

هەرگیزاو هەرگیز تۆ بەم حاڵەوە بەجێ ناهێڵین. با پێکـەوە لـە خزمـەتی تـۆدا شـەهید ببین.

---

(١) (ب:١/٣٠٥).

بەم جۆرە، لەو شوێنەدا مانەوە، هەتا ڕووسەکان دیلیان کردن[١].

پاشان بران بۆ وان، جەلفا، تەفلیس، کیلۆگریف، کۆستڕما.

نزیکەی دوو ساڵ و نیو لە دیلیدا مایەوە، هەتا توانیی هەڵبێت و، ساڵی (١٣٣٦ك) گەڕایەوە بۆ ئەستەمبووڵ[٢].

[عەبدولمەجیدی برای لە دەمی نووسینەوەی "ئاماژەکانی ئیعجاز"دا و ڕژانی مەرەکەب بەسەر نووسینەوەکەیدا، بەم جۆرەی خوارەوە مێژووی ئەو دیلبوونە تۆمار دەکات: ]

(ئەم نەخشە نامۆیە لەم باسە سەرسووڕهێنەرەدا و لە دەمی نووسینەوەی لە دیاربەکر لە ماڵی جەودەت بەگ، بەرواری نۆزدەی شوبات عەسری شەوی هەینی ڕووی دا کە هاوکات بوو لەگەڵ داگیرکرنی بەتلیس و دیل بووتی دانەر "بەدیعوززەمان" لەو شەوەدا[٣]..

وەك بڵێی دروستبوونی ئەم نەخشە لەسەر ئەم لاپەڕەیە لەو شەوەدا، ئاماژە بێت – خوای گەورە باشتر دەزانێت – بۆ ڕژانی خوێنی هاوڕێیانی دانەر و دیلبوونی خۆی ئەو شەوە لە بەتلیس)[٤].

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. قوتابیانی هاوڕێی دەگێڕنەوە کە: دوای ئەوەی قاچی مامۆستا شکا، هەڵمانگرت و بردمان بۆ ناو جۆگەلە ئاوێکی سەرگیراو، ئنجا چەند دانەیەکمان لە تفەنگەکان خستە ناو ئاوەکە و پێی مامۆستامان لەسەر تفەنگەکان ڕاکێشا، هەتا هەندێ حەوایەوە. پاشان پێی وتین: برایانم! تازە قەدەر بڕیاری دیلیی لەسەر داوم. بیر لە ڕزگارکردنی خۆتان بکەنەوە. هەر کە ئەوەی وت، هەموومان دەستمانکردە گریان و، وتمان: مامۆستا بۆ کوێ بڕۆین؟ چۆن تۆ بەم حاڵەوە بەجێ دەهێڵین؟ تۆ بڵێیت ئێمە شەرەف و غیرەتمان نەمابێت؟ دەبێ ژیان و مردنمان لە خزمەتی تۆدا بێت! ئیتر سێ و چوار سەعاتمان بەم جۆرە و لەو شوێنەدا بەسەربرد. سەرمای لەڕادەبەدەریش خەریك بوو لەناوی دەبردین، چونکە بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو، هەروەك ماوەی سێ ڕۆژیش بوو برسێتی پەکی خستبووین و، با شەونخوونی و ترسیش لەولاوە بووەستێ کە دەورەی دابووین. دواجار بڕیارمان دا یەکێکمان (کە عەبدولوەهاب بوو، چونکە شتێکی لە زمانی ڕووسی دەزانی) بڕوات ڕووسەکان لە شوێنەکەمان ئاگادار بکاتەوە.. ئیتر بەم جۆرە ڕووسەکان مامۆستایان بە دەستەبەرەیەك لەسەر شانیان هەڵگرت و ئێمەش لە دووریدا دەڕۆشتین. (ب ١/ ٣٢٠ لە یادداشتەکانی عەلی چاوشەوە، بە کورتی)

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٣) واتە هی ساڵی (١٣٣١) بە تەقویمی ڕۆمی، کە بە تەقویمی زایینی دەکاتە (١٩١٦/٣/٢ز).

(٤) ئاماژەکانی ئیعجاز، تێبینییەکەی عەبدولمەجیدی برای.

□ چەند یادەوەری‌یەکی ڕۆژگارانی دیلی

(ئەو کاتەی کە لە ڕووسیا دیل بووم لە شوێنێکی نزیکمانەوە خۆر تا یەك حەفتە ئاوا نەدەبوو، تەنانەت خەڵکی دەچوونە دەرەوە بۆ بینینی دیمەنی ناوازەی خۆرئاوابوون)[(١)]!

(لەگەڵ نەوەد ئەفسەر لە کۆسترمای ڕووسیا لە هۆڵێکی گەورەدا دیل بووین و، جار بە جارێك من دەرسم پێ دەوتن.

ڕۆژێکیان سەرکردە ڕووسەکە هات و هەڵوێستەکەی بینی، وتی:

"ئەم کابرا کوردەی کە سەرکردەی خۆبەخشەران بووە و زۆر کەسی لە سەربازەکانمان سەربڕیوە، ئێستا هاتووە لێرەدا وانەی سیاسی دەڵێتەوە؟! هەرگیز شتی وا نابێ ڕوو بدات".

ئیتر بە توندی ڕێی ئەو کارەی لێ دەگرم..

بەڵام هەر هەمان سەرکردەی ڕووس دوای دوو ڕۆژ هاتەوە و، وتی:

"وا دیارە وانەکانتان سیاسی نین، بەڵکو وانەی ئایینی و ڕەوشتین. کەواتە فەرموو لەسەر وتنەوەی وانەکانت بەردەوام بە".

بەم جۆرە بواری دەرس وتنەوەی داین)[(٢)].

(هەرچەند ڕووسەکان بە سیفەتی "سەرکردەی خۆبەخشەرانی کورد" بۆیان دەڕوانیم و، وەك ستەمکارێك سەیریان دەکردم کە گوایا دیلەکان و قازاقەکان سەردەبڕێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕێی دەرس وتنەوەیان لێ نەگرتم. بەڵکو دەرسم بە ئەفسەرە دیلەکانی هاوەڵم دەوتەوە کە ژمارەیان نەوەد کەس بوو، یەك جار نەبێ کە سەرکردەی ڕووسەکان هات و گوێی لە دەرسەکەم ڕاگرت و، لەبەر ئەوەی زمانی تورکیی نەدەزانی پێی وابوو کە دەرسێکی سیاسی‌یە، بۆیە ئەو جارە دەرس وتنەوەی لێ قەدەغە کردم..

بەڵام دوای ئەو یەك جارە، ڕوخسەتی دام لەسەر دەرسەکانم بەردەوام بم.

---

(١) وتەکان، وتەی بیست و چوارەم، ل: ٥٠٢-٥٠٣.

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٤٥.

پاشان ژوورێکمان لەناو سەربازگەکەدا - کە تیایدا دیل بووین - کردبوو بە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت و خۆیشم پێشنوێژیم بۆ دەکردن..

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کاتێك ئەو رووسانە دەستیان نەهێنایە رێمان و، تێکەڵاوی و هامشۆی یەکتریان لێ قەدەغە نەکردین و، رێی نامە هاتن و ناردنیان لێ نەبەستین)[1].

(لە جەنگی جیهانیدا لەگەڵ نەوەد کەس لە ئەفسەرەکانمان لەناو هۆڵێکی گەورە لە باکووری رووسیادا بەند کرابووین.

من لە رێی ئامۆژگاری کردنیانەوە هەرگیز بواری دەنگ بەرزکردنەوە و غەڵبەغەڵبم نەدەدا، چونکە لەرادەبەدەر رێزیان لێ دەگرتم.

رۆژێکیان کتوپڕ لە ئەنجامی ئەو دەمارگرژی و دڵتەنگی‌یەی بەسەر دەروونی ئەو خەڵکەدا زاڵ بووبوو، تووڕەبوونی هەندێکیان چەندین موناقەشەی توندوتیژی لە نێواندا دروست کردن.

منیش بە هەندێ لەو هاورێیانەم وت:

"برۆن بۆ لای ئەو قرەقڕ و غەڵبەغەڵبە و، پشتی ئەوەیان بگرن کە ناحەقە، نەك ئەوەی کە لەسەر حەقە"!

ئەوانیش بەگوێیان کردم و، بەم کارە، ئەو موناقەشە توندوتیژ و زیانبەخشە کۆتایی پێ هات!

پاشان لێیان پرسیم:

بۆ ئەم کارە ناڕەوایەت کرد؟

وتم: ئەو کەسەی لەسەر حەق بێت هەمیشە بەویژدانە؛ لە پێناوی حەوانەوە و بەرژەوەندیی مەزن و زۆری کەسانی تردا دەست لە مافی خۆی هەڵدەگرێت.

بەڵام بابای ناحەق زۆربەی جار لەخۆبایی و خۆپەرستە؛ دەست لە هیچ شتێك هەڵناگرێت و، قرەقڕەکەش هەر لە زیادبووندا دەبێت)[2]!

---

(١) مەکتووبات: پاشکۆی مەکتووبی شازدەهەم، ل: ١٢٦.

(٢) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٥٠٣.

❐ ڕەوشت و خوویەك ژیرییەكان سەرسام دەكات[1]

[ یەكێك لە شایەتحاڵەكان ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ]

كاتێك كە لە بەتلیس لـە جـەنگی یەكـەمی جیـهانیدا برینـدار بـووم و دیـل كـرام، لـە هـەمان ڕۆژدا بـەدیعوززەمانیش بـە دیـل گـیرا و، ناردیـان بـۆ گـەورەترین سـەربازگەی دیلەكان لە سیبیریا. منیش ڕەوانەی دوورگەی "نانكۆن"ی سەر بە "باكۆ" كرام.

ڕۆژێك كە "نیقۆلا نیقۆلا فیج" بە مەبەستی پشكنین سەردانی سەربازگەی ناوبراو دەكات، هەموو دیلەكان – بە مەبەستی ڕێز لێنان – لەبەری هەڵدەسنەوە. كاتێكیش بە بەردەم بەدیعوززەماندا تێدەپەڕێت، ئەو لە شوێنی خۆی ناجوولێت و بایەخی پێ نادات! ئەمەش سەرنجی سەركردە گشتییەكە ڕادەكێشێت!

بۆیە بە بیانوویەك دەگەڕێتە دواوە و جارێكی تر بە بەردەم بەدیعوززەماندا دەڕواتەوە، ئەویش بە هەمان شێوەی جاری پێشوو بایەخی پێ ناداتەوە!

لە جاری سێهەمدا كە بە هەمان شێوە بایەخی پێ نادات، لە بـەردەم بـەدیعوززەماندا ڕادەوەستێ و، بە هـۆی وەرگێڕێكـەوە ئـەم گفتوگۆیـەی خـوارەوە لـە نێوانیـاندا ڕوو دەدات:

دەڵێت: ئایا نەیناسیم؟

لە وەڵامدا دەڵێت:

بەڵێ ناسیومە.. ئەوە "نیقۆلا نیقۆلا فیج"ە، كە خاڵی قەیسـەر و سـەركردەی گشتیی بەرەی قەفقاسە!

ئەویش دەپرسێت:

كەواتە بۆچی بە نیازی سووكایەتی پێ كردن لەبەرم هەڵنەسا؟

وەڵامی دایەوە:

نـەخێر.. مـن سـووكایەتیم پـێ نـەكردووە. بـەڵكو كـارێكم ئـەنجام داوە كـە بیروباوەڕەكەم فەرمانی پێ داوم.

---

(١) ئەم وتارە لە گۆڤاری "أهـل السـنة"دا لـە ئەستەمبووڵ و لـە ١٥/١٠/١٩٤٨ز بە پێنووسی خاوەنە پارێزەرەكەی "عەبدوڕەحیم زابسوو" بڵاوكراوەتەوە.

وتی: بیروباوەڕەکەت چ فەرمانێکت پێ دەدات؟

وەڵامی دایەوە:

من زانایەکی موسڵمانم و لەناو دڵمدا ئیمانم هەڵگرتووە. جا ئەو کەسەی ئیمانی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتبێت باشترە لە کەسێك کە ئیمانی لە دڵیدا هەڵنەگرتبێت. خۆ ئەگەر وەك ڕێز لێنانێك لەبەری هەڵبسامایەتەوە ئەو کاتە ڕێزی کەمم بەرامبەر بە بیروباوەڕەکەم دەنواند. جا بۆ ئەوەی شتی وا ڕوو نەدات، لەبەری هەڵنەسام.

ئەویش وتی:

کەواتە بەوەی سیفەتی بێ ئیمانیی داوەتە پاڵ من، ئەوا سووکایەتیی بە خۆم و بە سوپاکەم و نەتەوەکەم و بە قەیسەر کردووە. کەواتە هەر ئێستا دەبێ دادگایەکی سەربازی بۆ لێپرسینەوە لەم کەسە پێك بهێنرێت.

لەسەر ئەم بڕیارە و بۆ جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانە، دادگایەکی سەربازی پێکهێنرا..

ئەفسەرە دیلەکانی تورکیا و ئەڵمانیا و نەمسا، بە جەخت لێ کردنەوە داوایان لە بەدیعوززەمان کرد کە داوای لێبووردن لەو سەرکردە ڕووسە بکات و، پێی بڵێت کە لێی خۆش ببێت!

بەڵام بەدیعوززەمان بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی دانەوە:

"من پڕ بە دڵ حەز لە سەفەر دەکەم بۆ ئەودنیا و ئامادە بوون لە بەردەم پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ. ئەوەندە هەیە من پێویستم بە پاسپۆرتی سەفەرە بۆ ئەودنیا. هەروەها ناتوانم کارێك بکەم کە پێچەوانەی ئیمانەکەم بێت".

لە ئاستی ئەم گوفتارەدا هەموو ئەفسەرەکانی هاوڕێی بێ دەنگی دایگرتن و، چاوەڕێی ئەنجامی دادگاییەکەیان دەکرد..

دادگاکەش کارەکانی بەدەرکردنی بڕیاری لە سێدارە دانی بەدیعوززەمان کۆتایی پێ هێنا، بەپێی ماددەی یاسایی سووکایەتی کردن بە قەیسەر و سوپای ڕووس!

پاشان دەستەیەکی سەربازی بە سەرۆکایەتیی ئەفسەرێکی ڕووس دێن بۆ بردنی بەدیعوززەمان بەرەو گۆڕەپانی لە سێدارەدان. بەدیعوززەمانیش بە ڕوویەکی گەش و خەندانەوە داوا لە ئەفسەرە ڕووسەکە دەکات کە:

"مۆڵەتی تەنها پازدە خولەکم بدەنێ بۆ ئەوەی دوا ئەرك و واجبی سەرشانی خۆم جێبەجێ بکەم".

ئیتر هەڵدەستێ و دەستنوێژ دەگرێت و دەیەوێ پێش لە سێدارە دانی نوێژ بکات.

لەو کاتەدا "نیقۆلا نیقۆلا فیج" ئامادە دەبێت و پێی دەڵێت:

"داوای لێبوردنت لێ دەکەم! پێشتر پێم وابوو کە ئەو کارەی بەرامبەر من نواندت بە نیازی سووکایەتی پێکردنی من بێت، بۆیە ئەو ڕەوشە یاساییانەم بەرامبەرتان ئەنجام دا. بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە ئەم هەڵوێستەتان لە ئیمانەکەتانەوە سەرچاوە دەگرێت و کارێك جێبەجێ دەکەن کە بیروباوەڕەکەتان فەرمانتان پێ دەدات. لەبەر ئەوە، فەرمانی دادگام سەبارەت بە ئێوە هەڵوەشاندەوە و، ئێوە لەبەر تەقوا و ئاییندارییتان شایانی هەموو ڕێز و سەرسوورمانێکن. داوای لێبوردن دەکەم کە بێزارم کردن و، چەند جارێکی تریش دووپاتی دەکەمەوە کە: داوای لێبوردن دەکەم".

ئەم عیززەتە ئایینی و خووڕەوشتە بەرزەی کە پێشەنگێکی جوان و نەخشینە بۆ موسڵمانان، یەکێك لە هاوڕێ ئەفسەرەکانی لە سەربازگەی دیلەکان کە لە پلەی نەقیبدا بووە و بە چاوی خۆی شایەتی ڕووداوەکە بووە، گێڕاویەتەوە.

منیش کە هەر ئەمەم بیست، چاوەکانم - بە بێ هیچ دەسەڵاتێکی خۆم - پڕ بوون لە فرمێسك[١]. عەبدوڕەحیم زابسوو)[٢].

## ☐ بێداربوونەوەیەکی ڕۆحی و یارمەتییەك لە قورئانەوە

(ئەو کاتەی لە یەکەم جەنگی جیهانیدا بە دیل گیرام، لە شارێکی دووری باکووری خۆرهەڵاتی ڕووسیا دەژیام کە ناوی "کۆستڕما" بوو.

---

(١) هەر چەند مامۆستامان خۆی فەرمانی پێ نەداوین کە ئەم بڕگەیەی لەو گۆڤارەدا نووسراوە بڵاوی بکەینەوە، بەڵام خرایە ئەم شوێنە، لەبەر ئەوەی گەلێ پەندی بەنرخی تێدایە و هەست و نەستی خوێنەر دەورووژێنێت و مایەی بایەخ پێدانە. (خەسرەو)

(٢) تیشکەکان، ل: ٧٤١-٧٤٣. شایانی باسە، بە درێژایی سی و دوو ساڵ و هەتا بڵاوبوونەوەی لە گۆڤاری ناوبراودا، مامۆستا نوورسی باسی ئەم ڕووداوەی نەکردووە. بەڵام کاتێ کە دوای بڵاوبوونەوەی پرسیاریان لێ کرد: ئایا ڕاستە؟ ئەگەر وایە بۆچی تا ئێستا باست نەکردووە؟ لە وەڵامدا وتوویەتی: بەڵێ ڕاستە، بەڵام بۆیە باسم نەکردووە چونکە تا ئێستا شایەتحاڵم نەبوو! بڕوانە: (الشهود الاواخر: ١/٦٨). (وەرگێڕ)

ئەو شارەش مزگەوتێکی بچووکی تەتارەکانی لێ بوو کە لەسەر کەناری ڕووباری "ڤۆلگا"ی بەناوبانگ بنیات نرابوو.

منيش لە نێوان ئەفسەرە ديلەکانی هاوەڵمدا دڵتەنگی دايگرتبووم و سەودای گۆشەگيری کەوتبووە سەرمەوە، بەڵام نەياندەهێشت بەبێ ڕوخسەت کەس بڕواتە دەرەوەی ئۆردوگای ديلەکان..

پاشان هەرچۆن بوو هێشتيان بە کەفالەتی تەتارەکان بڕۆمە دەرەوە و لە مزگەوتەکەدا بژيم.

ئيتر شەو بە تەنيايی لەوێ دەمامەوە و دەخەوتم. بەهاريش نزيك بووبووەوە و، شەوگاری ئەو ناوچە دوورەش گەلێ درێژ بوو.

لەو شەوە درێژ و تاريکانەدا کە بە پەژارەی ڕەشی غەريبی خۆيان داپۆشيبوو، زۆر جار هەتا ڕۆژم دەکردەوە خەو لە چاوەکانم دەزڕا!

خۆ لەو شەوانەشدا هيچ دەنگێك بەر گوێ نەدەکەوت جگە لە خوڕەی خەمناکی ڕووباری ڤۆلگا و، چرکەی ناسکی تکەی باران و، پەژارەی جودايی نەبێت کە لە هاژە و وژەی باوە دەهاتە گوێم!

هەموو ئەمانەش منيان لەو خەوە قورس و قووڵەی بێ ئاگايی - بۆ ماوەيەکی کاتی - بێدار کردەوە.

خۆ هەرچەند هێشتا خۆمم بە پير نەدەزانی، بەڵام هەر کەسێك جەنگی جيهانيی بينيايە دەبوو پير ببوايە! چونکە چەند ڕۆژێکی ئەوتۆ هاتن و ڕۆشتن کە منداڵيان تێدا پير دەبوو! وەك بڵێی يەکێك لە نهێنی‌يەکانی ئايەتی: ﴿يوماً يَجعلُ الوِلدانَ شيباً﴾ (المزمل:١٧) ڕۆشتبێتە ناويانەوە!

لەبەر ئەوە بوو کە هەرچەندە بە تەمەن نەگەيشتبوومە چل ساڵ، کەچی خۆمم وەك پيرێکی هەشتا ساڵی دەهاتە بەرچاو!

لەو شەوگارە تاريك و خەمناك و درێژانەدا و، لەو دەوروبەرە نوقم بووەی ناو پەژارەی غەريبی و، لە ناوەندی ئەو بارە ئازاربەخشەی خۆمدا، نائومێدی‌يەکی هێندە

قورس خۆی کوتایە سەر سنگم کە بە جارێ هەموو هیوا و ئومێدێکی بڕیم سـەبارەت بە ژیانم و گەڕانەوەم بۆ نیشتمانم!

خۆ هەرکاتێ کە ئاوڕم بە لای تەنیایی و بێ دەستەڵاتیی خۆمدا دەدایەوە، بـە تـەواوی هەموو ئومێدێکم دەبڕا و بێ هیوایی سەری تێ دەکردم..

بـەڵام یارمـەتیم لـە قورئـانی پـیرۆزەوە بـۆ هـات و، "زمـان"م دەسـتی کـرد بـە دووپاتکردنەوەی:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران:١٧٣).

"دڵ"یشم بە گریانەوە وتی:

غریبم بی کسم ضعیفم ناتوانم الأمان گویم

عفو جویم مدد خواهم ز در گاهت إلهی

بـەڵام "ڕۆح"م کـە خۆشەویستانی زووی شـارەکەمی کەوتـەوە یـاد و، مردنمـی لـەم غەریبییـەدا هاتـە پێش چـاو، شیعرەکانی "نیـازی"ی خوێنـدەوە کـە لـە دووی هـاوڕێ دەگەڕێت:

"بەڵای هەموو خەفەتێکی دنیادا گوزەرم کرد و..

دامە شەقەی باڵ بەرەو "نەبوون".

دەفڕیم بە تاسەوە و، لە هەموو ساتێکدا هاوارم دەکرد:

هاوڕێ.. هاوڕێ..."!

بە هەرحاڵ.. "لاوازی" و "دەستەوسانی"م لەو شەوە تاریك و خەمناك و درێژانەی کە تاریکیی جودایی و نامۆیی داپۆشیبوون، گەیشتنە ڕادەیـەك کـە لـە دەرگـای میـهرەبانیی خواوەند نزیکیان خستمەوە و، بوون بە مایەی گیرابوونی نزا و پاڕانـەوەکانم و تکاکـارم لە حوزووری خوای گەورەدا..

ئەوەش بە شێوەیەك بـوو کـە تـا ئێسـتاش سەرسامی ئـەوەم چـۆن توانیـم دوای چـەند ڕۆژێکی کەم ڕابکەم و، بە جۆرێکی چـاوەڕوان نـەکراو ماوەیـەکی هێنـدە دوور و درێـژ ببڕم کە مەگەر بە ساڵێکی تەواو دەنا بەو ماوە کەمە نابڕێت، بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆش لە زمانی ڕووسی بزانم!!

چونکە بە جۆرێکی زۆر سەیر و سەرسوورهێنەر لەو دیلی‌یە ڕزگارم بوو، ئەویش تەنها بە فەزڵی چاودێریی خوای گەورە بوو کە ناردی بە هانای "لاوازی" و "دەستەوسانی"مەوە. بەم جۆرە لە ڕێی "وارشۆ" و "ڤییەننا"وە گەیشتمەوە ئەستەمبووڵ.

گەشتی دوور و درێژی ئەم ڕاکردنەشم هێندە بە ئاسانی بە دەستەوە هات کە ئازاترین کەس لەوانەی زمانی ڕووسی دەزانن کاری وایان بۆ نەدەچووەسەر)[١].

## ساڵی ١٩١٨ز/١٣٣٦ك

□ گەڕانەوەی لە دیلی

(کە لە دیلی دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ[٢]، ئەو پێشوازی‌یە ڕەنگین و گەرمەی لێم کرا، چ لە لایەن خەلیفە و، چ لە لایەن شێخولئیسلام و، چ لە لایەن سەرکردەی گشتی و، چ لە لایەن قوتابیانی زانستە شەرعی‌یەکانەوە.. هەروەها ئەو ڕێزە گرنگەی لێم گیرا..

هەموو ئەمانە، لە ڕادەیەکدا بوون کە من شایستەی نەبووم)[٣].

□ دامەزراندنی بە ئەندام لە "دار الحكمة الإسلامية"دا

(حکوومەتی ئیتیحاد و تەرەقی بە کۆی دەنگ ئەویان لە هەموو کەسێك بەلاوە گونجاوتربوو کە بتوانێت "حیکمەتی ئیسلامی" بە شێوەیەکی کاریگەر بە فەیلەسووفانی ئەورووپا ڕابگەیەنێت)[٤].

[ خۆی دەگێڕێتەوە کە: ]

(بۆ خزمەتکردنی ئایین لە "دار الحكمة الإسلامية"دا، نزیکەی سێ ساڵ لە ئەستەمبووڵ مامەوە)[٥].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٦٩-٤٧٠.

(٢) لە ١٩/ڕەمەزان/١٣٣٦ك، بەرامبەر بە ١٩١٨/٧/٨ز.

(٣) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٦٣.

(٤) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٧١.

(٥) بریسکەکان، بریسکەی بیست وشەشەم، ل: ٤٩٣. دەزگای زانستیی "دار الحكمة الإسلامية" لە بەرواری ١٩١٨/٨/٢٥ز دامەزراوە و، هەتا ساڵی ١٩٢٢ز لە کارەکانیدا بەردەوام بووە.

[عەبدورەحمانی برازای بەم جۆرە باسی مامی دەکات لە دوای گەڕانەوەی لە دیلی:]

دوای ئەوەی مامم سالی ١٣٣٤ی ڕۆمی (١٩١٨ز) لە دیلی گەڕایەوە، بە بێ ڕەزامەندیی خۆی لە "دار الحکمة الاسلامیة" بە ئەندام دامەزرا[1]، بۆیە بەشداریی کۆبوونەوەکانی ئەوێی نەکرد، چونکە دوای ئەوەی گرفتە سەختەکانی دیلیی چەشتبوو، هەستی دەکرد کە پێویستییەکی زۆری بە پشوودان و حەوانەوە هەیە.

لەبەر ئەوە، چەندین جار داواکاریی بۆ ناردن کە دەست لەو ئەندامبوونەی دەکێشێتەوە، کەچی داواکەی وەرنەگیرا. بۆیە دواجار پەیوەندیی بە کارەکەیەوە کرد[2].

من ئەو دەمە چاودێریی حالی ئەوم دەکرد. دەمبینی ئەو مووچەیەی کە وەری دەگرت تەنها هێندەی لێ بەکاردەهێنا کە مایەی بژێوی بێت.

کاتێ کە لەم بارەیەوە پرسیاری لێ دەکرا، دەیوت: دەمەوێ وەکو زۆرینەی خەلکی بژیم، کە بە هێندەی ئەم بڕە پارەیە بە پێداویستییەکانی گوزەران و ژیانی خۆیاندا ڕادەگەن و، نامەوێ شوێنکەوتەی کەمینەیەکی هەلەخەرجی دەست بلاو بم.

ئنجا دوای ئەوەی کە بڕی دیاریکراوی بۆ خەرجی و مەسرەف دەخستە لاوە، پاشماوەکەی لای من دادەنا و، دەیوت: ئەمە بپارێزە. بەلام من پشتم بە شەفەقەت و میهرەبانییەکەی دەبەست و بێ ئەوەی پێی بزانێت خەرجم دەکرد!

کەچی ڕۆژێکیان پێی وتم: ئەو پارەیە بۆ ئێمە حەلال نییە، چونکە مالی نەتەوەیە. بۆچی خەرجت کرد؟ کەواتە وا لە ئێستاوە تۆم لە کاری خەرجی و مەسرەف لابرد و، لە بریی تۆ خۆم لەسەر ئەو کارە دادەنێم!

---

(١) لەسەر داوای "وەزارەتی جەنگ" لە ١٩١٨/٨/٢٦ز لەوێ بە ئەندام دامەزرا، واتە لە کۆتایی دووهەم مانگی گەڕانەوەی لە دیلی و بە مووچەیەکی مانگانە کە بڕەکەی پەنجا لیرەی زێڕ بوو. پاشتر لەسەر داوای "ئەنوەر پاشا"ی وەزیری جەنگ، شێخولئیسلام "مووسا کازم" داوای لە سولتان وەحیدەدین کرد کە پلەیەکی بەرزی زانستی بە بەدیعوززەمان ببەخشێت. سولتانیش لە بەرواری ١٩١٨/٩/٩زدا ڕەزامەندیی لەسەر داواکەی نواند.

(٢) ئەوەش لە مانگی حوزەیرانی ١٩١٩زدا بوو. واتە کۆی دەوامکردنی تەواوەتیی لەوێ دەکاتە دە مانگ چوار ڕۆژ کەم، چونکە لەو ماوەیەدا چەند جارێك مۆلەتی نەخۆشیی وەرگرتووە.

ڕۆژگار هات و ڕۆشت. ئەوەی بە دڵدا هات کە ئەو دوازدە پەیامەی داینابوون، لە چاپیان بدات[1]. ئیتر ئەو برە پارەیەی کە پاشەکەوتی کردبوو، لە چاپکردنی ئەو نامیلکانەدا خەرج کرد. ئنجا یەك دووانێکیان نەبێت ئەوانی تری بە خۆڕایی دابەش کردا

کە لێم پرسی بۆچی دانراوەکانی نافرۆشێت؟ وتی: لەم مووچەیەدا جگە لە ڕادەی پێویست، مافێکی تری منی تێدا نییە و، پاشماوەکەی هی نەتەوەیە. منیش لە لایەنی خۆمەوە بەم کارەم پارەکەم دایەوە بە خاوەنەکەی[2]!

---

(١) Tarihce-i Hayat. ilk hayati. ئەو پەیامانەش بریتین لە:

١. ئاماژەکانی ئیعجاز (١٩١٩ز) بە زمانی عەرەبی.
٢. خاڵێك لە نووری ناسینی خوای گەورە (١٩١٩ز) بە زمانی تورکی.
٣. سنووحات (١٩٢٠ز) بە زمانی تورکی.
٤. ناوکەکانی حەقیقەت/١ (١٩٢٠ز) بە زمانی تورکی.
٥. گزنگەکان (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.
٦. تیشکەکانی ناسینی پێغەمبەر ﷺ (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.
٧. قزل إیجاز (١٩٢١ز) بە زمانی عەرەبی.
٨. هێماکان (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.
٩. ئاماژەکان (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.
١٠. چەند بریسکانەوەیەك (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.
١١. شەش هەنگاوەکان (بە بێ مێژوو) بە زمانی عەرەبی و تورکی.
١٢. ناوکەکانی حەقیقەت/٢ (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی. (پاشکۆی مێژووی ژیانی مامۆستا، لە نووسینی عەبدوڕەحمان)

هەر لەم ماوەیەدا ئەم بەرهەمەشی چاپ کرد:

١. موحاکەمات (١٩٢١ز) بە زمانی تورکی.

لە پێش ئەوانەشدا، ئەم کتێبانەی تری چاپ کردبوو:

١. ڕەچەتەی عەوام و ڕەچەتەی زانایان (الصیقل الإسلامي) (١٩١٢ز) بە زمانی عەرەبی.
٢. وتاری شام (دەرمانی نائومێدی) (١٩١١ و ١٩١٢ز) بە زمانی عەرەبی.
٣. مونازەرات (١٩١٣ز) بە زمانی تورکی.
٤. دەستنیشانکردنی نەخۆشی (١٩١٢ز) بە زمانی تورکی.
٥. نوتق (١٩١٢ز) بە زمانی تورکی.
٦. دادگای عورفیی سەربازی (١٩١١ز) و (١٩١٢ز) بە زمانی تورکی.

(٢) Tarihce-i Hayat. ilk hayati.

(بەشێکی زۆری ئەو مووچەیەم خەرج کرد کە لە "دار الحکمـــــة الإسلامیة" وەرم دەگرت و، بەشێکی کەمیشیم لێ پاشەکەوت کرد بە نیازی بەجێهێنانی فەرزی حەج. هەر ئەو پارە کەمە، بەهۆی بەرەکەتی قەناعەت و دەست پێوەگرتنەوە، بەشی کردم و ئاوی ڕووم نەتکا. ئێستاش پاشماوەی بەپیتی ئەو پارەیە هەر ماوە)[١].

چونکە (نزیکەی دوو ساڵ نەبێت کە لە "دار الحکمة الإسلامیة"دا ئەندام بووم، دەنا هیچ مووچەیەکم وەرنەگرتووە، کە ئەویشم بۆ لە چاپدانی کتێبەکانم و پاشان دابەش کردنیان بەسەر خەڵکیدا - بە خۆڕایی - خەرج کردووە و، لەم ڕێیەوە داومەتەوە بە خۆیان)[٢].

---

(١) تیشکەکان، ل: ٦٤٨. لەو پاشماوەیە نەوەدلیرەی زێڕی لێ مابووەوە، مامۆستا نوورسی لە ساڵی (١٩٤٦ز)دا وەك بەشداریکردنی خۆی لە خەرجی و مەسرەفی کاغەز و چاپکردنی پەیامەکاندا بە ئامێری ڕۆنیۆ، ڕادەستی ئەو قوتابیانەی کرد کە پەیامەکانی نووریان بڵاو دەکردەوە. (ب: ١/١١٥)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٣٥؛ مەکتووبات، مەکتووبی شازدەهەم، ل: ١١٠.

عەبدوڕەحمانی برازای، لە نامەیەکدا کە بۆ "عەبدولمەجید"ی مامی نووسیوە، دەڵێ:

(من لە هەڵسوکەوتی "مامە سەعید"م سەرسام ماوم! هەموو ئاواتەکانی دنیای منی کوژاندەوە. چونکە حکومەت مووچەیەکی باشی دەداتێ و، منیش هەرچی لە خەرجی و مەسرەفی خۆمان زیاد بێت پاشەکەوتی دەکەم. چەند کتێبێکیشی داناوە. جارێکیان بانگی کردم و، وتی: برۆ خاوەنی فلان چاپخانەم بۆ بانگ بکە. منیش ڕۆشتم. کاتێ دانراوەکانی خۆی دا بە خاوەنی چاپخانەکە، وتی: عەبدوڕەحمان! چەندە پارەت پاشەکەوت کردووە بیدە بە بەڕێوەبەری بەڕێز. منیش داواکەیم جێبەجێ کرد. دوای ئەوەی کە بەڕێوەبەر ڕۆشت چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك، بەڵام دوایی دڵی خۆمم بەوە دایەوە کە: ئەم کتێبانە دەفرۆشرێن و پارەکەیان دێنەوە و، منیش جارێکی تر پاشەکەوتیان دەکەمەوە. کەچی دوای چەند ڕۆژێك منی ناردەوە بە دوای بەڕێوەبەردا و، ئەم جارە پێی وت: تکایە لەسەر کتێبەکانم بنووسە: "بە خۆڕایی بەسەر موسڵماناندا دابەش دەکرێت"!

دوای ڕۆشتنی بەڕێوەبەر، هەستم کرد ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەم لەرزەی پێ کەوت کە بەرامبەر مامی گەورەم هەستم پێ دەکرد. ئیتر خۆمم بۆ ڕانەگیرا و دامە پرمەی گریان و، وتم: مامە گیان! هەندێ پارەم پاشەکەوت دەکرد تاکو خانووەکەمانی پێ نۆژەن بکەمەوە کە جەنگ وێرانی کرد، کەچی وا ئێستا لەو ئاواتەی منت کوشت، ئایا کاری وا دروستە؟

مامم بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وتم: کوڕم عەبدوڕەحمان! حکومەت مووچەیەکی زۆری دەداینێ. لە مایەی بژێو زیاتر هی من نەبوو تا وەری بگرم. هەرچی لەوە زیاتر بێت دەبێ بدرێتەوە بە "بەیتولماڵ". بۆیە منیش دامەوە بە موسڵمانان. لەو باوەڕەشدا نیم کە تۆ لەمە تێبگەیت، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت خانوویەکت لە شوێنێکی ئەم نیشتمانەدا دەداتێ! (ش: ١/١٨٥-١٨٦) ئەویش لە: (گۆڤاری "أهل السنة"وە ٢/٤١ لە بەرواری ١/١١/١٩٤٨ز).

"دار الحكمة الإسلامية"ش دەزگايەكی سەر بە "مەشيەختی گشتيی دەوڵەتی عوسمانی بووە و، تەنها گەورە زانایانی بەڕێزی لەخۆ دەگرت، وەك: محەممەد عاكيف و، ئیسماعیل حەققی ئیزمیرلی و، حەمدی ئەلمالیلی و، هاوشێوەیان[1].

[ كاتێ كە لە دوای داگیر كردنی ئەستەمبووڵ ئەم پرسیارەی لێ كرا: ]

(بۆچی "دار الحكمة الإسلامية" نەیتوانی خزمەت بكات؟

وەڵامی دایەوە:

گەورەترین خزمەتی ئەوێ خزمەت نەكردنیەتی! مەزنترین جموجووڵیشی نەجووڵانەوەیەتی!

چونكە ئەو هێزەی كە لێرەدا زاڵە، سەركوتی هەر جموجووڵێك دەكات لە بەرژەوەندیی خۆی نەبێت.

ڕاپەڕیوە جووڵاوەكانم بینی كە لەناو مزگەوتە پیرۆزەكاندا ناچاركران دوعا بۆ كافران بكەن و، فەتوا بۆ كوشتنی خەباتگێڕانیش دەربكەن!

لەبەر ئەوە، نەیانتوانی لەم زریانەدا "دار الحكمة" بكەنە ئامرازێك بۆ ئەم فیتنەیە.

هێزی بیانی، كە گەورەترین ڕێگر بوو لەوە، بە هەموو توانایەكی خۆی پارێزگاری لە ڕەوشتە خراپەكان دەكرد و هانی بڵاوبوونەوەیانی دەدا.

هۆكاری دووهەم:

ئەندامانی "دار الحكمة" توانای توانەوەیان لەیەكتردا و تێكەڵ بوونیان بە یەكتری تێدا نییە، بەڵكو هەریەكەیان تایبەتمەندیی كەسیی خۆی هەیە و، گیانی "كۆمەڵ" لەواندا لەدایك نەبووە و، "من"ەكانیان زۆر بە هێزە و كوناودەر نەكراوە تاكو ببێتە "ئێمە"! بەڵێ، "من" نەبووە "ئێمە".

ئەوان بە دەستووری "هاوبەشێتی" دەستیان دایە كار و، دەستووری "هاوكاری" لە نێوانیاندا پشتگوێ خرا.

---

(١) Tarihce-i Hayat. ilk hayati. "ئیسماعیل حەققی"ی مێژوونووس دەگێڕێتەوە كە لە مامۆستاكەی خۆی (شێخولئیسلام مستەفا سەبری)ی پرسیوە: هۆی چی بوو بەدیعوززەمان لە "دار الحكمة الإسلامية"دا كرا بە ئەندام؟ وەڵامی داوەتەوە: لەبەر ئەوەی شارەزاییەكی زۆری لە زانستی فەرموودەدا هەیە. چەند كەسێكی تریش هەمان هۆكاریان باس كردووە. (Aydinlar Konşuyor)ی نەجمەدین شاهێنەر، ل: ٣٠٢

"هاوبەشێتی" لە کاروبارە ماددیەکاندا بەرهەمەکە دەکاتە شتێکی زۆر گەورە، بەڵام لە کاروبارە مەعنەوییەکاندا دەیانکات بە شتێکی ئاسایی، تەنانەت ناشیرین و بێ کەڵکیش.

کەچی دەستووری "هاوکاری" لە شتانی ماددیدا بە تەواوی پێچەوانەی ئەمەیە؛ سەبارەت بە "کۆمەڵ" دەبێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر بچووك، بەڵام سەبارەت بە تاکە کەس دەبێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر گەورە، خۆ لە شتانی مەعنەویدا بە ڕادەیەکی نائاسایی بەرهەمەکە بەرز دەکاتەوە.. هەروەها ڕەخنەگرتنەکانیشی یەکجار یەکلاکەرەوەن؛ هزری نەیار لەتوپەت دەکەن و دەیکوژێننەوە.

هەندێ کەس لە سۆراغکردنی "حەقتر"دا "حەق" ون دەکەن.

بە ڕای من زۆر جار "حەق" لە "حەقتر" حەقترە، چونکە لە "حەق"دا یەکگرتن هەیە و لە "حەقتر"دا جیاوازیی ڕاکان!

لە ماوەی گەڕاندا بە دوای "حەقتر" جۆرە چاوپۆشییەك ڕوو دەدات لە ناحەق)[١]!

چەند تەوژمێکی دوور لە گیانی ئیسلام، بە تایبەت بیانییەکانیان، هەوڵیان دەدا دەست لە کاروباری "دار الحكمة الإسلامية" وەربدەن. بەدیعوززەمانیش بە وێنەی چیا سەختەکان لە دژیان ڕادەوەستا و، بە بێ دوودڵی بەرپەرچی فەتوا هەڵەکانی ئەوانی دەدایەوە، چونکە هەمیشە مردنی لە پێش چاوی خۆی دانابوو[٢].

[لێرەدا ئەم وەڵامەی خوارەوەی دەهێنین سەبارەت بەو فەتوایەی کە لە مەشیەخەتی ئیسلامییەوە لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەنادۆڵ نووسیویەتی[٣] :]

(ئەوە "فەتوا"یەکی پەتی نییە هەتا عوزری بۆ بهێنرێتەوە، بەڵکو فەتوایەکە "قەزا"(بڕیار)ی لەخۆ گرتووە..

---

(١) داوەرییەکان، گزنگەکان، ل: ٨١٣-٨١٤.

(٢) Tarihce-i Hayat. ilk hayati. چونکە شێخولئیسلامی ئەو کاتە "عەبدوڵلا دوڕری زادە" لە بەرواری ١١/٤/١٩٢٠زدا نزیکی پێنج فەتوای لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخواز دەرکردبوو.

(٣) لەو دەمە دوو حکوومەت لە تورکیا هەبوو: حکوومەتی ئەستەمبووڵ، کە لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی ئینگلیزدا بوو. حکوومەتی ئەنادۆڵیش کە ئەنقەرەیان کردبووە پایتەخت و لە دژی داگیرکەران دەجەنگان. ئەو فەتوایەش بە گوشاری ئینگلیز لە دژی ئەمەیان دەرکرابوو.

چونکە جیاوازیی فەتوا لە قەزا لەوەدایە کە بابەتی فەتوا گشتی‌یە و، دەستنیشان نەکراوە و، مولزیمیش نی‌یە. بەڵام قەزا هەم دەستنیشان کراوە و هەم مولزیمیشە..

جا ئەم فەتوایەی کە پرسیاری لەبارەوە دەکەیت، هەروەك "دەستنیشان کراو"ە، ئەوەتا هەر کەسێك سەرنجی بدات لە مەبەستەکەی تێدەگات.. "مولزیم"یشە، چونکە هاندانی عەوامی موسڵمانان لە دژی ئەوان (ئەنادۆڵ) دواهەمین هۆکاری دەرکردنیەتی.

جا مادەم ئەم "فەتوا"یە "قەزا"ی لەخۆ گرتووە، ئەوا لە "قەزا"دا گوێ ڕاگرتن لە هەردوو ڕکەبەرەکە دەبێتە کارێکی پێویست..

لەبەر ئەوە، دەبوو قسەی ئەنادۆڵیش بە هەند وەربگیرایە. دوای ئەوە لە لایەن دەستەیەکی سیاسەتمەدار و زانایانەوە و، لە خاڵی بەرژەوەندیی ئیسلامدا داوەری لەو دەعوایەی کە لە دژیانە و لە دەرەنجامی مایەی دەعواکەشدا بکرایە، ئنجا دەتوانرا فەتواکە بدرێت.

خۆی لە خۆیدا هەندێ لە ڕاستی‌یەکان هەڵگەڕاونەتەوە و، دژەکان ناوەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا گۆڕیوەتەوە، ئەوەتا "ستەم" بە دادگەری و، "جیهاد" بە هەڵگەڕانەوە و، "دیلی" بە ئازادی ناودەبرێن)[1]!

[ بۆ چاکسازی لە بارودۆخی "دار الحکمة"دا پێشنیازی ئەمەی خوارەوەی کرد ]:

(بەکارهێنانی هەر شتێك لە غەیری جێگای خۆیدا، ئەنجامی لەکارخستن دەبێت و، ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرێت نایەتەدی!

بۆ نموونە:

"دار الحکمة الاسلامیة" کە بۆ ئامانجێکی مەزن دامەزرێنراوە، ئەگەر لەم بارەی ئێستای دەربچێت و، هاودەم لەگەڵ سەرۆك فەرمانگەکانی تری مەشیەخەت لە ڕاوێژکاریدا بەشدار بکرێت و، بە ئەندامێکی ئەو فەرمانگانە دابنرێت و، نزیکەی بیست زانای بەرز و بەڕێز و جێی بڕوای لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامی‌یەوە بۆ بهێنرێت، ئەو کاتە دەتوانرێت بناغەیەك بۆ ئەم مەسەلە گەورە و گرنگە پەیدا ببێت)[2].

---

(١) داوەری‌یەکان، گرنگەکان، ل: ٨٠٥-٨٠٦.

(٢) داوەری‌یەکان، سنووحات، ل: ٧٤٠-٧٤١.

## ساڵی ١٩١٩ز/١٣٣٧ك

□ پەژارەکانی سەبارەت بە گرفتەکانی نەتەوەی ئیسلام

[ کاتێ پرسیاری لەبارەی پەژارە و ئازارەکانیەوە لـێ دەکرا، بـەهۆی ئـەو گرفتانـەی کە بەسەر موسڵماناندا هاتن لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، دەیوت: ]

من دەتوانم ئازارە کەسی‌یەکانی خـۆم بخۆمـەوە و دان بـە خـۆدا بگـرم. بـەڵام ئـازاری نەتەوەی ئیسلام هێنـدە منی هـاڕیوە کـە وا هەسـت دەکـەم ئـەو چەپۆکانـەی لـە جیـهانی ئیسلامی وەشێنران لە پێشدا بە وێنەی خەنجەرێك بە دڵی مندا کـراون، لەبـەر ئەوەیـە کـە وا بە دڵشکاوی دەمبینن. بەڵام نوورێك دەبینم بەڕێوەیە کە - پشت بە خوا - دێت و ئەم ئازارانەمان لە بیر دەباتەوە[1].

□ گفتوگۆیەك لـە خەونێکدا

(مـانگی ئـەیلوولی سـاڵی ١٩١٩ز و، لـە ئـەنجامی نائومێدی‌یـەکی لـە ڕادەبـەدەر کـە ڕووداوەکانی ڕۆژگار دووچاریان کردبووم، لەناو پەرێشـانی و پەشـێوی‌یەکی سـەختدا دەتلامەوە..

ئەو دەمـە، لـەو تاریکی‌یـە ڕەش و چڕەدا بـە دوای ڕووناکی‌یـەکدا وێـڵ بـووم کـە لـە بێداریدا نەمدۆزی‌یەوە.. ئەو بێداری‌یەی کە لە ڕاستیدا خەونێکە مرۆڤ لـە نوسـتنێکدا دەیبینێت. بەڵکو لە خەونێکی ڕاستدا دەستم کەوت کە بێداریی ڕاستەقینەیە!

لێرەدا ئەو خاڵانە تۆمار دەکەم کـە بریتیـن لـەو گوفتارانـەی کاتـێ دواندیـانم بـە سـەر زمانمدا هاتن، بێ ئەوەی برۆمە ناو درێژە پێدانیانەوە. ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

شەوێکی هەینی لە ڕێی خەونەوە ڕۆشتمە ناو جیهانی میسالەوە.

لەوێ یەکێك هات و پێی وتم:

ئەنجومەنێکی خاوەن ڕێز و بەسام و شکۆ بانگت دەکەن، کـە بـۆ باسـی چارەنووسـی جیهانی ئیسلامی و حاڵی ئێستای گیراوە.

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

منیش ڕۆیشتم.. ئەنجومەنێکی وا نوورانیم بینی کە پێشینانی پیاوچاك و نوێنەرانی چەرخەکان، هەر چەرخەو نوێنەرێك، لەوێ ئامادە بوون.. لە ژیانمدا هاوشێوەیانم نەدیبوو.. بۆیە سام دایگرتم و، لە ئەدەب و شەرمدا لای دەرگاکەوە ڕاوەستام!

یەکێکیان ڕووی گوفتاری تێکردم و، وتی:

ئەی مرۆی چەرخی کارەسات و ئاشووب و تیاچوونەکان! ڕای خۆت سەبارەت بەم باسە دەربڕە. چونکە تۆ خاوەنی ڕای خۆتی تیایدا.

هەر بە ڕاوەستانەوە، وتم:

پرسیار بکەن با وەڵامتان بدەمەوە.

یەکێکیان وتی:

ڕات سەبارەت بە چارەنووسی ئەو شکستە چی‌یە کە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هات؟ .. چ ئاکامێکت چاوەڕان دەکرد بۆ ئەو دەوڵەتە گەر سەرکەوتنی بەدەست بهێنایە؟

وتم: گرفت و موسیبەتەکان سەرتاسەر خراپ نین، چونکە هەندێ جار بەختەوەری لە بەڵا و گرفتەکانەوە سەر هەڵدەدات، هەروەك هەندێ جاری تریش بەختەوەری ئاکامەکەی بەڵا و دەردیسەری دەبێت.

ئەم دەوڵەتەی کە پێشتر بۆ پارێزگاری لە جیهانی ئیسلامی - کە وەك یەك جەستە وایە - ئەرکی جیهادی وەك فەرزێکی کیفایەت لە بریی سەرجەمی موسڵمانان خستبووە ئەستۆی خۆی و، لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی "الله" و پاراستنی سەربەخۆیی جیهانی ئیسلامیدا خۆی لە هەڵوێستی قوربانی و خۆبەختکاریدا دانا و، ئاڵای خەلافەتی هەڵکرد..

ئەم دەوڵەت و نەتەوە موسڵمانە، بە پشتیوانیی خوای گەورە، بە سەربەستی و بەختەوەری‌یەکی ئەوتۆ پاداشت دەدرێتەوە کە سەرانسەری جیهانی ئیسلامی بگرێتەوە و، قەرەبووی گرفت و زیانەکانی پێشوویان بۆ بکاتەوە..

چونکە ئەم گرفتەی کە دووچاری بووین، زیندووبوونەوەی برایەتیی ئیسلامی و گەشەکردنیشی لە نێوان موسڵماناندا پێش خست، ئەو برایەتی‌یەی کە گیان و کاکڵەی

ژیانمانە! تەنانەت کاتێ کە ئێمە بە دەم ئازارەوە دەتلاینەوە جیهانی ئیسلامی بۆمان دەگریا. خۆ ئەگەر ئەوروپا پتر ئازاری بداینایە، ئەوا جیهانی ئیسلامی دەنگی هاوار و نالەی لێ بەرز دەبووەوە.

ئەگەر ئێمە بمرین، ئەوا بیست هاوولاتیی "قەلەمڕەوی عوسمانی" دەمرێت، بەلام سێ سەد موسلمان زیندوو دەبێتەوە.

ئێمە لە چەرخی کارە دەراساکاندا دەژیین، دوو سێ سال دوای مردنمان دەبینرێین کە زیندوو دەبینەوە..

ڕاستە بەم شکستەمان بەختەوەرییەکی فانیی ئێستامان لە دەست دا، بەلام دواتر بەختەوەرییەکی هەمیشەیی چاوەڕوانمان دەکات.

دیارە ئەو کەسەی کە حالێکی جوزئیی بگۆڕ و دیاری کراوی ئێستای دەگۆڕێتەوە بە داهاتوویەکی گەش و فراوانی ئاییندە، بێ گومان ئەو کەسە قازانجی کردووە، نەك زیان.

لەم کاتەدا دەنگێك لە ئەنجومەنەکە بەرز بووەوە، وتی:

ئەوەی دەیلێیت ڕوونی بکەرەوە.

وتم: جەنگی نێوان نەتەوە و دەولەتەکان جێی خۆی بۆ جەنگی نێوان چین و توێژەکانی مرۆڤ چۆل کردووە. ئادەمیزاد هەروەك مل بە دیلی نادات، بە ژیانی کرێگرتەییش ڕازی نابێت..

ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست بهێنایە، ئەوا بەرەو ڕەفتاری دوژمنانمان لەمەڕ داگیرکاری و خۆسەپاندن کێش دەبووین و خووی ئەوانمان دەگرت، لەوانەشە زیادەڕەویمان تێدا بکردایە. لە کاتێکدا کە ئەو تەوژمە داگیرکارییە خۆسەپێنە تەوژمێکی ستەمکارانەیە و، دژی سروشتی جیهانی ئیسلامی و، پێچەوانەی بەرژەوەندیی زۆرینەی ڕەهای ئیماندارانە. سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنیشی کورتە و ڕووبەڕووی لەت لەت بوون و نەمان دەبێتەوە..

جا ئەگەر ئێمە دەستمان لەو تەوژمە گیر بکردایە، ئەوا جیهانی ئیسلامیمان بەرەو شتێکی پێچەوانەی سروشتی خۆی دەدایە بەر.

ئەم شارستانێتی‌یە چەپەڵەی کە جگە لە خراپە شتی ترمان لێ نەدیوە و، لە دیدی شەریعەتەوە ناپەسەند و نەویستراوە و، خراپەکانی بەسەر چاکەکانیدا زاڵ بووە، بەرژەوەندیی ئادەمیزاد بڕیاری هەڵوەشانەوەی و، بێداربوونەوەی گرۆی مرۆڤیش فەرمانی قڕبوونی بۆ دەردەکات.

ئەگەر ئێمە سەربکەوتینایە، ئەوا لە ناوەرۆکدا پارێزگاریی ئەم شارستانێتی‌یە هەرزە و یاخی و ناپاك و دڕندەیەمان لە ئاسیادا دەگرتە ئەستۆ!

یەکێکی ناو ئەنجومەنەکە وتی:

بۆچی شەریعەت ئەم شارستانێتی‌یە[1] پەسەند ناکات و دەست بە ڕوویەوە دەنێت؟

وتم: چونکە لەسەر پێنج بناغەی سەلبی دامەزراوە:

خاڵی پشت پێ‌بەستنی بریتی‌یە لە: "هێز". دیارە "هێز"یش ماف خواردن و سنوورشکاندن و دەستدرێژیی لێ دەبێتەوە.

مەبەست و ئامانجیشی بریتی‌یە لە: "بەرژەوەندی". خۆ ئەمەش پاڵپاڵێن و دوژمنایەتیی لێ دەبێتەوە.

دەستووری ژیانیش بەلایەوە بریتی‌یە لە "مشتومڕ و ململانێ". خۆ ئەمەش هەردەم قڕە و بڕە و پاشقول لەیەکتر گرتنی لێ پەیدا دەبێت.

ئەو پەیوەندی‌یە بنەڕەتی‌یەش کە بۆ هاوئاهەنگیی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی دادەنێت بریتی‌یە لە "دەمارگیری و نەتەوایەتی‌یەکی سەلبی" کە لەسەر حسابی نەتەوەکانی تر گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت. خۆ ئەمەش وەك لە بەرچاودایە هەمیشە ئاژاوە و جەنگ و ناکۆکیی لێ دەبێتەوە.

---

(١) مەبەست ئەو چاکەکاری‌یانەی شارستانێتی‌یە کە پێشکەشی ئادەمیزادی کرد، نەك خراپکاری و گوناهەکانی کە گەوج و نەفامان بە دوایدا هەناسە بڕکێیانە و پێیان وایە ئەو خراپکاری‌یانە چاکە بن، هەتا دووچاری تیاچوونیان کردین! مرۆڤایەتی لە ئەنجامی زاڵبوونی تای خراپەکانی ئەم شارستانێتی‌یە بەسەر چاکەکانی و گوناهەکانی بەسەر لایەنە جوانەکانیدا دوو زللەی سامناکی لێ درا کە دوو جەنگی جیهانیی لەوتۆ بوون لەو شارستانێتی‌یە گوناهبارەیان تیابرد و خوێنێکیان ڕشاندەوە کە سەرانسەری گۆی زەویی چەپەڵ کرد. لە خوای گەورە داواکارین کە بەهێزی ئیسلام لە ئایندەدا چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی بەسەر خراپەکانیدا زاڵ ببن، تاکو گۆی زەوی لە چڵك و چەپەڵی‌یەکانی پاك بکاتەوە و، ئاسایشی گشتی بۆ سەرانسەری گرۆی مرۆڤ دەستەبەر بکات. (دانەر)

ئەو خزمەتەش کە پێشکەشی گرۆی ئادەمیزادی دەکات خزمەتێکی لەخشتەبەری سەرنج ڕاکێشە.. کە بریتی‌یە لە هاندانی حەز و ئارەزووی سوود و بەرژەوەندی و، ورووژاندنی دەروونی بەدخواز و، هێنانەدیی خواستەکانی و ئاسانکردنی بەدەستهێنانی داواکاری‌یەکانی..

خۆ ئەو حەز و ئارەزووانەش مرۆڤ لە پلەی مەلائیکەییەوە بەردەدەنە خوارەوە بۆ پلەی ئاژەڵێتیی سەگ ئاسا، بەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی سەروسیمای مرۆڤانەی ئادەمیزاد و بە چەشنێکی مەعنەوی مەسخی دەکات!

ئەوەتا گەر دیوی دەرەوەی زۆربەی ئەو مرۆڤە شارستانی‌یانە ئاوەژوو بکەیت و ناوەرۆکیان بخەیتە ڕوو، ئەوا ئەندێشەی مرۆڤ شێوەی گورگ و ورچ و مار و مەیموون و بەراز، لە ڕوخسار و سیمایاندا بەدی دەکات!

هەر لەم پێناوەشدا شارستانێتیی ئێستا لە سەدا هەشتای گرۆی ئادەمیزادی خستە باوەشی بەدبەختی و، لە سەدا دەیانی لەو بەدبەختی‌یە هێنایە دەر و خستنیە ناو بەختەوەری‌یەکی ساختە و ڕووکەش و، دەکەی تریش لەو نێوانەدا مانەوە..

لە کاتێکدا بەختەوەری ئەوەیە کە هەمووان، یاخود زۆرینەی خەڵکی بگرێتەوە. کەچی بەختەوەریی ئەم شارستانێتی‌یە بۆ کەمترینی بەشە کەمەکانی خەڵکی‌یە.

لەبەر ئەمەیە قورئانی پیرۆز بە شارستانێتی‌یەك ڕازی نابێت کە بەختەوەریی هەمووان، لانی کەم زۆرینەی زۆریان دەستەبەر نەکات.

پاشان بەهۆی خۆسەپاندنی هەوا و ئارەزووە لە بەند پچڕاوەکان، شتانی ناپێویست وەکو شتانی پێویست و ناچاری‌یان لێ هاتووە بۆ مرۆڤ.. چونکە لە کاتێکدا کە مرۆڤ لە قۆناغی ژیانی دەشتەکێتیدا پێویستی تەنها بە چوار شتی سەرەکی دەبوو، ئێستا لەم شارستانێتی‌یەدا پێویستیی بە سەد شت هەیە. بەم جۆرە، "شارستانێتیی ئێستا" مرۆڤی دووچاری هەژاری‌یەکی لەڕادەبەدەر کردووە.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە هەوڵ و کۆششی حەڵاڵ ناتوانێت ئەرك و خەرجیی ئەو پێداویستی‌یە هەمیشە زیادبووانە بگرێتە ئەستۆ، ئەوا مرۆڤ دەستی دایە کاری ساختە و فڕوفێڵ و خواردنی حەرام! بەم جۆرە بناغەکانی خووڕەوشت لێك هەڵوەشان.

لە کاتێکدا ئەم شارستانێتی‌یە سەروەت و دەوڵەمەندی و زرق و برق بە کۆمەڵ و ڕەگەزی مرۆڤ دەدات، کەچی تاکە کەس دەستکورت و هەژار و بەدڕەوشت دەکات!

ڕشانەوەی ئەم شارستانێتی‌یە دڕندەییەکی ئەوتۆی لە گەرووی خۆی هێنایەوە کە لە دڕندەیی سەدەکانی پێشین گەلێ زیاتر بوو.

بێزهاتنەوەی جیهانی ئیسلامی لە وەرگرتنی ئەم شارستانێتی‌یە و هەڵپە بۆ نەکردنی و دوودڵ بوونی لە وەرگرتنیدا، شایانی سەرنجدان و تێڕامانە.

چونکە ئەو "ڕێنماییە خوایی"یە کە شەریعەتە، تایبەتکاریی "سەربەخۆیی" و پێویست نەبوون بە شتی تر بە مرۆڤ دەبەخشێت و، هەرگیز ناگونجێ ئەم "شەریعەت"ە تێهەڵکێش و ئاوێتەی "دەهاء"ی فەلسەفەی[1] ڕۆمانی ببێت، یان هەڵی بلووشێت، یاخود شوێنی بکەوێت.

زیرەکیی "ڕۆمان" و "یۆنان"ی دێرین (واتە شارستانێتی‌یەکەیان) کە وەکو مناڵی دوانە لە یەك سەرچاوە و بناغەوە سەریان هەڵدابوو، وێڕای تێپەڕبوونی چەرخەکان و، گۆڕانی بارودۆخ و، تەقالا و کۆششی گەرموگوڕ بۆ تێکەڵ کردن و تواندنەوەیان لە یەکتریدا و، ئاوێتەکردنی هەردووکیان بە نەسرانییەت، کەچی بە چەشنی تێکەڵ نەبوونی ڕۆن و ئاو، هیچ کامیان ئاوێتەی ئەوی تر نەبوو، تەنانەت ئێستا گیانی هەر یەکەیان لە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر و جیاجیادا دەژی.

جا ئەگەر دوو برای دوانە و هاوڕێی یەکتر لە گەشەکردن و بەرەوپێشچووندا، لەگەڵ هەموو هەوڵ و هۆکارێکی ئاوێتەکردن، بە درێژایی‌ئەم ماوەیە و تا ئێستاش هەر پێکەوە نەگونجابن و تێکەڵی یەکتری نەبووبن، ئیتر چۆن نووری هیدایەتی قورئان - کە گیانی شەریعەتە - تێکەڵ بە تاریکی‌یەکانی شارستانێتی دەبێت کە بناغەکەی "دەهاء"ی ڕۆمایە؟ دیارە هەرگیز نە تێکەڵی یەکتری دەبن و نە پێکەوە هەرسیش دەکرێن.

---

(١) مەبەست بە وشەی "دەهاء": گشت ئەو چەمك(مفاهیم)ە ماددی‌یانەیە کە شارستانێتیی خۆرئاوا، یان بیری ماددی لە فەلسەفەی خۆرئاوادا لە ئامێزی گرتوون. ئەم وشەیەشمان وەك خۆی هێشتەوە، چونکە لەگەڵ وشەی "هودا" و "هیدایەت" جیناسێکی جوان پێکدەهێنن. (وەرگێڕ)

وتیان:

ئەی ئەو شارستانێتی‌یە کامەیە کە لە شەریعەتدایە؟

وتم:

ئەو شارستانێتی‌یەی کە شەریعەتی خاوێن لە خۆی گرتووە و فەرمانیشی بە ئێمە داوە شوێنی بکەوین، ئەوەیە کە بە ڕەوینەوەی ئەم شارستانێتی‌یەی ئێستا دەردەکەوێت و، لە بریی بناغە بێ کەڵك و کرمۆڵ و سەلبی‌یەکانی ئەو، چەندین بناغەی ئیجابی و بنیاتنەر دادەنێت:

بەڵێ، خاڵی پشت پێ‌بەستنی، لە بریی "هێز"، بریتی‌یە لە "حەق".. خۆ ئاشکرایە کە "حەق" هەمیشە دادگەری و هاوسەنگی دادەمەزرێنێت..

ئامانجیشی، لە بریی "بەرژەوەندی"، بریتی‌یە لە "فەزیلەت".. دیارە بەرهەمی "فەزیلەت"یش خۆشەویستی و تەبایی و لێك نزیکبوونەوەیە..

لایەنی یەکێتی و پەیوەندی دەرەکانی نێوان کۆمەڵانی مرۆڤ بە لایەوە بریتین لە پەیوەندیی "ئایین" و "هاونیشتمانی" و "پەیوەندی‌یەکانی کار و پیشە" لە بریی "ڕەگەزپەرستی".. خۆ ئەم چەشنە پەیوەندی‌یانە هەمیشە برایەتیی بێگەردی ڕاستەقینە و ئاشتی و ئاسایش و تەبایی و بەرگری لە وڵات لە دەمی دەستدرێژیی دوژمندا بەرهەم دەهێنێت..

دەستووریشی لە ژیاندا، لە بریی مشتومڕ و ململانێ، بریتی‌یە لە "هاوکاری" و "هاوئاهەنگی" و "یارمەتیدانی یەکتری".. دیارە "هاوکاری"یش یەکبوون و پشتگیری لە نێوان مرۆڤدا بەرهەم دەهێنێت..

ئنجا "هودا" لە بریی "هەوا" و ئارەزووەکان دادەنێت بۆ ئەوەی فەرمانڕەوای ئەو خزمەتگوزاری‌یانە بێت کە پێشکەش بە کۆمەڵ دەکرێن.. خۆ "هودا"یش ئاستی مرۆڤ بەرەو ئاکارە تەواوەکان بەرز دەکاتەوە.

ئنجا لەو کاتەدا کە سنوورێك بۆ هەوا و ئارەزووەکانی "دەروون" دادەنێت، دڵنیاییش بە "گیان" دەبەخشێت و بۆ بەرزی‌یەکان پەرۆش و تامەزرۆی دەکات.

واتە ئێمە بە شکست هێنانمان لە جەنگدا شوێن تەوژمی دووهەم کەوتین کە تەوژمی ستەم لێکراوان و جەماوەری خەڵکە. خۆ ئەگەر ستەم لێکراوانی غەیری موسڵمان لە

سەدا هەشتا پێك بهێنن، هی موسڵمانان لـە سەدا نەوەد، بەڵكو لـە سەدا نەوەد و پێنج پێكدەهێنن.

دوورەپەرێزیی جیهانی ئیسلامی لەم تەوژمی دووهەمە یان نەیاری کردنی بۆی کارێکی بێ پاڵپشتە و، سەرجەمی هەوڵ و تەقالاکانیشی بە زایە داوە. دەیتوانی لـە بریی توانەوە لە ژێر دەستەڵاتی زاڵبووی لایەنی سەرکەوتوودا ژیرانە هەڵسوکەوتی بکردایە و ئـەو تەوژمـەی لەگـەڵ تـەرز و شـێوەیەکی ئیسـلامدا بگونجاندایـە و بـەو جـۆرە بیخستایەتەکار..

چونکە دوژمنی دوژمن هاوڕێیە هەتا دوژمنی بێت، هەروەك هاوڕێی دوژمن دوژمنە هەتا هاوڕێی بێت.

ئامانجەکان و سوودەکانی ئەم دوو تەوژمە، دژی یەکترین. تەنانەت گەر یەکێکیان بڵێ: "بمرە" ئـەوی تریـان دەڵێت: "زیندوو بەرەوە". واتە سوودی یەکێکیـان داخـوازی زیان و شپرزەیی و نزمی و لاوازیی ئێمەیە.. هەروەك سوودی ئـەوی تریـان بێ گومـان هێز و یەکگرتنی ئێمە دەخوازێت.

جاران دوژمنایەتیی خۆرهەڵات ڕابوون و بێداریی ئیسلامیی دەخنکاند. وا ئێستا نەما، دەشبێ نەمێنێت. بەڵام دوژمنایەتیی خۆرئاوا دەبێ بمێنێت، چونکە هۆکارێکی گرنگە بۆ گەشە کردن و یەکێتیی برایەتیی ئیسلامی.

لەم کاتەدا نیشانەکانی پشتگیریی قسەکانم لە ئەنجومەنەکەوە بەرز بووە و.. وتیان: بەڵێ، ئومێدەوار بن. چونکە مەزنترین دەنگێك کە لـە ئالوگۆڕەکانی داهاتوودا دەزرنگێتەوە دەنگی زوڵاڵی ئیسلامە.

یەکێکی تریان پرسیی:

بەڵا و گرفتەکان سزای تاوان و پێشەکیی پاداشتن. ئایا ئێوە چ تاوانێکتان کرد کە قەدەری خوایی بڕیاری ئەم گرفتەی بۆ دەرکردن، چونکە هـۆی دابارینی موسیبەت و گرفتە گشتییەکان هەڵە و تـاوانی زۆرینـەی خەڵکییە؟ هەروەها پاداشتە پێشـەکی و خێراکەشتان چییە؟

وتم:

پێش هەموو شتێك پشتگوێ خستنی سێ پایەی ئیسلام بوو لە لایەن ئێمەوە: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات. چونکە:

بەدیهێنەرمان داوای لێ کردین کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا، تەنها یەك سەعات بۆ بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژ تەرخان بکەین. کەچی ئێمە سستیمان لەم ئەرکەدا نواند..

خوای گەورەش لە تۆڵەی ئەمەدا، بە مەشق و تەدریبێکی سەخت و بەردەوامی بیست و چوار سەعاتی و بۆ ماوەی پێنج ساڵی یەك لە دوای یەك سزای داین. واتە ناچاری بەجێهێنانی جۆرە نوێژێکی تایبەتیی کردین!

هەروەها ئەو بەدیهێنەرە مەزنە بەزەیی بە ئێمەدا هاتەوە و داوای لێ کردین کە تەنها یەك مانگ لە سەرانسەری ساڵدا بەڕۆژوو بین. کەچی ئێمە دەروونی خۆمان بەلاوە ئازیز بوو، ئەو فەرمانەی خوای گەورەمان جێبەجێ نەکرد..

خوای گەورەش لە سزای ئەم سەرپێچییەدا و بۆ کەفارەتی ئەو گوناهە، بە درێژایی پێنج ساڵ ناچاری ڕۆژوویەکی تایبەتیی کردین!

هەروەها داوای لێ کردین کە دە یەك، یان چل یەکی ئەو ماڵ و سامانەی خۆی، کە بە ئەمانەت لای ئێمە دایناوە، بە ناوی زەکاتەوە دەربکەین. کەچی ئێمە چرووکیمان نواند و، ستەممان لە خۆمان کرد..

لە سزای ئەمەشدا ناچاری کردین کە بەپێی یاسای "الجزاء من جنس العمل" زەکاتی کەڵەکەبووی ئەو ماوەیە بە یەك جار دەربکەین!

پاداشتی خێرا و زووبەزووی ئەم گرفتەش بریتی بوو لەوەی کە پێنج یەکی ئەم نەتەوە گوناهبارە – واتە چوار ملیۆن کەس– بۆ پایەی ویلایەت بەرز کرانەوە و، پلەی موجاهیدی و شەهیدییان پێ بەخشرا.

کەواتە ئەو موسیبەتە گشتییەی کە ئەنجامی هەڵەیەکی گشتی بوو گوناهەکانی ڕابوردووی سڕییەوە.

یەکێکیان وتی:

ئەگەر فەرماندە بە هەڵە فەرمانی دابێت ئەوا نەتەوەی دووچاری تیاچوون کردووە؟

وتم:

مرۆڤی تووش بوو بە گرفتێك ئومێدەواری پاداشتە. جا یان چاکەکارییەکانی ئەو فەرماندەیەی دەدرێتێ کە بە هەڵە فەرمانی بۆ دەرکردووە، دیارە ئەوەش شتێکی ئەوتۆ نییە.. یان گەنجینەی غەیب خۆی پاداشتی دەداتەوە..

پاداشتی ئەو مرۆڤەش لەو گەنجینەیەوە، لەم چەشنە کاروبارانەدا، جگە لە پلەی موجاهیدی و شەهیدی شتێکی تر نییە.

بینیم ئامادەبووانی ئەنجومەنە میسالییەکە ئەم وەڵامەیان پەسەند کردم.

دوای ئەمە.. لە تین و تاوی هەڵچوونی خۆم، لە خەونەکەم بێدار بوومەوە!

سەیرم کرد پەنجەکانی دەستم هەڵپێکاوە و ئارەقم لێ دەچۆڕێ!

ئەو شەوەم بەم جۆرە لێ گوزەرا)[1].

(لە خەونەکەدا هیچ شتێکی لە بارەی "حەج"ەوە باس نەکرد.

لە ڕاستیدا پشتگوێ خستنی حەج و بایەخ نەدان بەو حیکمەتانەی کە لە حەجدان، نەك تەنها مایەی دابارینی موسیبەتە، بەڵکو قەهر و تووڕەیی خوای بەهێز وخاوەن زەبریش دەبارێنێت. سزاکەشی کەفارەتی گوناهەکان نییە، بەڵکو زۆربوونیەتی!

بەڵێ، پشتگوێ خستنی سیاسەتی بەرزی ئیسلام لە حەجدا، کە یەکگرتنی بیر و هزرەکانی لە ڕێی یەکتر ناسینەوە و هاوبەشکردنی هەوڵ و تەقالاکانیشی لە ڕێی هاوکاریی یەکترەوە لەخۆ گرتووە، بوو بەهۆی ئامادەکردنی دۆخ و ناوەندێکی لەبار بۆ دوژمنان کە ملیۆنەها موسڵمان لە دژی ئیسلام بەکاربهێنن.

ئەوەتا ئەو هیندییە لە لای سەری باوکیەوە دەگری کە کوشتوویەتی؛ پێی وابووە دوژمنەکەیەتی..

ئەوە تەتار و قەفقاسن لای پێی تەرمێکەوە ڕاوەستاون کە لە کوشتنیدا یارمەتیی یەکتریان داوە.. دوای هەل لەدەستدان زانیویانە کە باوکیانە..

---

(١) داوەرییەکان، سنووحات، ل: ٧٤١-٧٥٠.

ئەوە عەرەبەکانیشن بە هەڵە برا قارەمانەکەی خۆیان کوشتووە، لە سەرسامیدا نازانن چۆن بۆی بگرین و بیلاوێننەوە..

ئەوە ئەفریقیایە بێ ئەوەی پێی بزانێت براکەی خۆی کوشتووە و، ئێستا هاوار و شینی بۆ دەکات..

ئەوەش جیهانی ئیسلامی‌یە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت یارمەتیی کوشتنی ڕۆڵەکەی خۆی داوە و، ئێستا بە وێنەی دایکێکی شێت و نەفام لە کولمی خۆی دەدات و قژی دەڕنێتەوە.

ملیۆنەها موسڵمانی جیهان لە ژێر ئاڵای دوژمندا - کە سەرتاپا شەڕ و خراپەی پەتی و بێ گومانە - بەرەو چەندین گەشتوگوزاری درێژخایەن دراونەتە بەر، لە بریی ئەوەی چاك بکەن بەلادا و بۆ حەج خۆیان بپێچنەوە، کە سەرانسەر خێر و چاکەی ڕوون و بێ گومانە.. دەسا پەند وەربگرن!

هەروەك پێوستی‌یە ناچاری‌یەکان شتانی حەرام بۆ مرۆڤ حەڵاڵ دەکەن، بە هەمان جۆر گیروگرفتەکانیشی بۆ ئاسان دەکەن.

مریشك کە بۆ ترسنۆکی بە نموونە دەهێنرێتەوە، بۆ پارێزگاری لە جووجەڵەکانی هێرش بۆ سەر گامێش دەبات.. ئازایەتیی لەڕادەبەدەر ئەمەیە..

ترسی بزن لە گورگ نموونەی پێ دەهێننەوە. کەچی ئەو ترسەی لە کاتی ناچاریدا هەڵدەگەڕێتەوە بۆ داکۆکی و بەرگری کردن، تەنانەت بەگژی گورگدا دەچێت.. دلێریی نائاسایی ئەمەیە..

بەڵێ، مەیلێك کە سروشتی بێت ناتوانرێ ڕێی لێ بگیرێت. ئەوەتا لەوێچێك ئاو گەر لەناو تۆپێکی ئاسندا دابنرێت، هێندەی ڕووبەڕووی سەرمای زستان دەکرێتەوە، ئەو ئاوەی کە دەیبەستێت ئاسنەکە لەت و پەت دەکات، لەبەر ئەو مەیلە سروشتی‌یەی کە تیایدایە بۆ کرانەوە و بڵاوبوونەوە.

جا ئازایەتیی مریشکی دڵسۆز بۆ جووجەڵەکانی و.. دلێریی ناچاریی بزنی دەروون بەرز، نموونەی وورووژاندنی سروشتین.

ئەم ورووژاندنە سروشتی‌یە ئەگەر ستەمی کافر یەخەی پێ بگرێت و شەڕی پێ بفرۆشێت، بە وێنەی ئاوی ناو تۆپە ئاسنەکە هەموو شتێك لە بەردەمی خۆیدا وردوخاش دەکات..

رووسە لادێ نشینەکان نموونەی لەبەرچاون لەسەر ئەمە.

وێڕای ئەمەش، ئەو مەردایەتی‌یە نائاساییەی کە ماهییەتی ئیمان لەخۆی گرتووە و ئەو ئازایەتی‌یەش کە لە عیززەتی ئیسلامیدا هەیە و تەحەددای سەرجەمی جیهان دەکات، لە رێی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی برایەتیی ئیسلامی‌یەوە، هەموو کاتێك دەتوانێت موعجیزات پێش چاو بخات.

رۆژێك دێت کە خۆری حەقیقەت هەڵبێت.. ئایا جیهان تا ئەبەد هەر لە تاریکیدا دەمێنێتەوە)[1]؟!

## ساڵی ١٩٢٠ز/١٣٣٨ك

☐ بڵاوکردنەوەی "شەش هەنگاوەکان" بۆ بەرەنگاری کردنی ئینگلیز

(کاتێ ئەو سەرکردە ئینگلیزەی کە ئەستەمبوولی داگیر کرد[2] دەستی دایە نانەوەی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان موسڵماناندا و، تەنانەت "شێخولئیسلام" و هەندێ زانای تری خەڵەتاند و وای لێ کردن کە هێرش بکەنە سەر یەکتری و، جیاوازیی نێوان کۆمەڵی "ئیتتیحادی‌یەکان" و کۆمەڵی "ئیئتیلاف"ی[3] فراوان کرد، تاکو کەش و بارودۆخ بۆ سەرکەوتنی یۆنانی‌یەکان ئامادە بکات و شکست بە بزووتنەوەی میللیی نیشتمانی بهێنێت.

لەو دەمەدا من نووسراوی "شەش هەنگاوەکان"م لە دژی ئینگلیز و یۆنانی‌یەکان دانا و، بەڕێز "ئەشرەف ئەدیب"یش[4] لە چاپی دا و بڵاوی کردەوە.

---

(١) داوەری‌یەکان، سنووحات، ل: ٧٥٧-٧٥٨.

(٢) لە بەرواری ١٨/٣/١٩٢٠زدا ئینگلیزەکان ئەستەمبوولیان داگیر کرد.

(٣) مەبەست کۆمەڵی ئیتتیحاد و تەرەقی‌یە، کە دوای شکستی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگدا، سەرکردەکانیان رایان کرد بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام کۆمەڵی ئیئتیلاف دەستەیەکی سیاسی بوون کەمێك دوای جەنگی یەکەمی جیهانی سەریان هەڵدا و رکەبەری ئیتتیحادی‌یەکان بوون.

(٤) یەکێکە لە تێکۆشەرانی ئەو دەمە. دوایی باسی پوختەیەك لە ژیانەکەی دێت. (وەرگێڕ)

ئەم کارەش یارمەتی‌یەکی باشی دا بۆ پووچەڵ کردنەوەی کاریگەریی ئەو پلانە دۆزەخی‌یانەی کە ئەو سەرکردەیە دایڕشتبوو)[1].

کاتێ سەرکردەی سوپای ئینگلیز هاتە ناو ئەستەمبوڵەوە، نامیلکەی "شەش هەنگاوەکان"ی درایە دەست، کە بە توندی هێرشیان دەکاتە سەر و، پەردە لە ڕووی درۆ و دەلەسەکانیان هەڵدەداتەوە و، ورەی موسڵمانان بەرز دەکاتەوە. هەروەها چالاکی‌یە سەرومڕەکانی "بەدیعوززەزمان"یان پێش چاو خست لە ڕووی ئابڕووبردنی سیاسەتی ئینگلیز و هاندانی خەڵکی لە دژیان..

ئەو سەرکردەیە بڕیاری لە سێدارەدانی "بەدیعوززەمان"ی دا. بەڵام کاتێ ئاگادار کرایەوە لەوەی کە ئەم بڕیارە پتر ڕق و قینی گەلیان لە دژ دەورووژێنێت و، هانیان دەدات کە بە هەر نرخێك بووە کرداری دوژمنانەی زیاتریان بەرامبەر ئەنجام بدەن، ئەوا لە بڕیاری لەسێدارەدانی پاشگەز بووەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا داگیرکەران بە مەبەستی گرتنی بە دوایدا دەگەڕان[2].

کاتێکیش سەرکردەکانی "بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی" لە ئەنقەرە کاریگەریی ئەم پەیامەیان لە ناوەندە گشتی و تایبەتەکاندا بیست و، جیهاد و کۆششی "بەدیعوززەزمان"یان لە دژی داگیرکەرانی ئەستەمبوڵ بەرگوێ کەوتەوە، بە مەبەستی ڕێزنان لە پاڵەوانێتی و خزمەتە مەزنەکانی لە پێناوی وڵات و گەلدا، دوو جار بانگهێشتیان کرد بۆ ئەنقەرە..

بەڵام مامۆستا لەو دەمەدا بەدەم داواکاری‌یەکیانەوە نەڕۆشت و، مانەوەی لە ئەستەمبوڵ بەلاوە باشتر بوو، وتی:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٥٩.

(٢) ئوتاییانی دەڵێن: نووسینی ئەم کتێبە بچووکە لەو ڕۆژگارە ترسناکەدا کە هێزەکانی دوژمنان لە هەر چوارلاوە "ئەنادۆڵ"یان داگیر کردبوو، ئاوێنەیەکی درەخشانە لە نێوان هەزاران چاکەی تابلێی گەورە و لە ناوەندی خزمەتە یەکجار بەرزەکانی مامۆستادا، کە بێ سڵەمینەوە و بە وێنەی قارەمانێك لە ڕێی زمانی چاپخانەکانەوە لە ڕووی داگیرکەراندا سەربەرزیی ئیسلام و غیرەتی ئیمانیی وەبیری خەڵکی هێناوەتەوە. کە ئەمەش لەو ڕۆژەدا وەك تف کردنێك وا بووە بە ڕووی ئەو داگیرکەرانەدا. بڕوانە: داوەری‌یەکان، پێشەکیی شەش هەنگاوەکان، ل: ٧٧٣.

"من دەمەوێ لە ترسناکترین شوێندا جیهاد بکەم، نەك لە پشتی سەنگەرەکانەوە. پێم وایە شوێنەکەی ئێرەم لە چاو ئەنادۆڵ گەلێ ترسناکترە"[1]!

## ساڵی ١٩٢١ز/١٣٣٩ك

□ وەڵامێك بۆ کەنیسەی ئەنگلیکی

(کاتێ ئینگلیزەکان - لە جەنگی جیهانیدا - تۆپەکانی دەربەندیان تێکشکاند و ئەستەمبووڵیان داگیر کرد، سەرگەورەی قەشەکانی کەنیسەی ئینگلیکی شەش پرسیاری ئاراستەی "مەشیەخەتی ئیسلامی" کرد[2]، کە ئەو دەمە لە "دار الحكمة الإسلامية"دا ئەندام بووم.

پێیان وتم:

وەڵامی پرسیارەکانیان بە شەش سەد وشە بدەرەوە، وەك خۆیان دەستنیشانیان کردووە.

وتم: وەڵامی ئەم پرسیارانە نە شەش سەد و نە شەش وشە و نە یەك وشەیە، بەڵکو تەنها یەك تفە کە بکرێتە ناوچاویان)[3]!

(ڕۆژێکیان قەشەیەکی قین لە دڵ و سیاسی و فێڵباز و دوژمنی سەرسەختی ئیسلام، پرسیاری لە بارەی چوار شتەوە کردبوو کە دەیویست بە شەش سەد وشە وەڵام بدرێتەوە! ئەم پرسیارانەشی بۆ مەبەستی وروژاندنی گومان و، بە دەرخستنی لووتبەرزی و گاڵتە پێ کردن و، دەربڕینی شادمانی بە شکستی موسڵمانان و، لە کاتێکی وا سەختدا ئاراستە کرد کە دەوڵەتەکەی دەستی لە گەرووی دەربەندەکانمان گیر کردبوو!

---

(١) Tarihce-i Hayat. ilk hayati.

(٢) ئەو نامەیە لە بەرواری ٢١/١٢/١٩١٨زدا بە ئیمزای "ئارسەر بۆت ۆد"ی سەرۆکی قەشەکان ئاراستەی مەشیەخەتی ئیسلامی کرابوو. شێخولئیسلام حەیدەری زادە ئیبراهیم ئەفەندیش ناردی بۆ "دار الحكمة الإسلامية". لەوێ جگە لە مامۆستا نوورسی، هەریەك لە ئیسماعیل حەققی ئیزمیرلیی موفەسسیر و، شێخ عەبدولعەزیز جاویش، وەڵامی تێروتەسەلی پرسیارەکانیان دابەوە.

(٣) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و نۆهەم، ل: ٧٠٧-٧٠٨.

جا دەبێ سەبارەت بە خۆشحاڵی‌یەکەی ئەو قین لە دڵە بە: "سەرت دای لە بەرد" وەڵام بدرێتەوە و، بەرامبەر بە فرۆفێڵەکانیشی دەبێ بە رقەوە پشتگوێ بخرێن، سەرەڕای وەڵامێکی دەمکوت کەریش کە لە بەرامبەر ئینکاری کردنەکەیەوە وەك چەکوش بدرێت بە تەوقی سەریدا!

بۆیە من ئەو دوژمنە سەرسەختە بە شایانی وەڵامدانەوە نازانم، بەڵکو وەڵامەکانمان بۆ ئەو کەسانەیە کە گوێ ڕادەگرن و عەودالی ڕاستین.

ئەمانەش وەڵامەکانن:

لە پرسیاری یەکەمدا وتبووی:

ئایینی محەمەد ﷺ چی‌یە؟

وتم:

قورئانی پیرۆزە.. کە بناغەی ئامانج و مەبەستەکانی: جێگیر کردنی شەش پایەکانی ئیمان و، قووڵ کردنەوەی پێنج پایەکانی ئیسلامە.

لە دووهەمدا وتبووی:

ئیسلام چیی پێشکەش بە "بیر" و "ژیان" کردووە؟

وتم:

"یەکبوون"ی بە بیر و، "ئیستیقامەت"یشی بە ژیان پێشکەش کردووە. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿قُل هُو اللهُ أحَد﴾ (الإخلاص: ١)..

﴿فاستَقِمْ كما أُمرت﴾ (هود: ١١٢).

لە سێ‌هەمدا وتبووی:

ئیسلام چۆن کێشە و ململانێکانی ئێستا چارەسەر دەکات؟

دەڵێم:

بە حەرام‌کردنی ڕیبا و فەرزکردنی زەکات. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿وَأَحلَّ اللهُ البيعَ وَ حرّم الرِّبا﴾ (البقرة: ٢٧٥)..

﴿يَمحَقُ اللهُ الرِّبا﴾ (البقرة: ٢٧٦)..

﴿وَأَقيمُوا الصّلاةَ وَآتوا الزّكاةَ﴾ (البقرة: ٤٣)..

لە چوارەمدا وتبووی:

ئیسلام چۆن دەڕوانێتە گیروگرفتەکانی گرۆی مرۆڤ؟

دەڵێم:

هەوڵ و کۆشش بناغەیە و، دەشبێ سامانی مرۆڤ لە دەستی ستەمکاراندا کۆ نەبێتەوە و لە گەنجینەکانیاندا کەڵەکە نەکرێت. شایەتیشم لەمەدا ئەم فەرموودانەی خوای گەورەیە:

﴿وأَن ليسَ لِلإنسان إلاّ ما سعى﴾ (النجم: ٣٩)..

﴿والذين يكنـــزونَ الذّهبَ والفضّة وَلا يُنفقُونَها في سَبيل اللهِ فبشّرهُم بعَذابٍ أليـم﴾ (التوبة: ٣٤)..)[1].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی سی و دووهەم، ل: ٨٣٨-٨٣٩؛ تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٢٤.

# بەندی یەکەم

## لەدایکبوونی سەعیدی نوێ

◆ تێبینی:

خوێنەری بەڕێز دەبینێت کە لە ڕیزبەندیی مێژووییدا گەڕاوینەتەوە بۆ ساڵی (١٩١٩ز) تاکو بە ئاسانی بتوانێت بەدواداچوون بۆ ئەو ماوەیەی ژیانی مامۆستا نوورسی بکات کە لە گەڕانەوەی لە دیلیەوە دەست پێدەکات و، قۆناغەکانی ژانی لەدایکبوون و سەرهەڵدانی "سەعیدی نوێ" دەنوێنێت و، ئەرکی بانگەوازی بۆ "ئیمان" و "قورئان" خستە ئەستۆی، لە دژوارترینی ئەو قۆناغانەدا کە نەتەوەی ئیسلام پیایدا دەڕۆشت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای مێژووی ژیانی، دەبینین قەدەری خوای گەورە "سەعید"ی هەر لە منالیەوە بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەمانەتە ئامادە کردووە. چونکە هەر لەو ساتە وەختانەوە بە خواردن و پارووی حەڵاڵ گۆش کراوە و پێگەیەنراوە و، هەڵکەوتوویی پێوە دیار بووە و، بەهرەی زیرەکیەکی تیژبین و هێزێکی سەرسووڕهێنی بیر و زەینی پێوە دەرکەوتووە. هاوکات لەگەڵ دەروون بەرزی و، شەرەفمەند بوونی بە مژدەی پێغەمبەر ﷺ و، بەهرەوەر بوونی بە هەڵگوزینی زانستە جۆراوجۆرەکان و، گرتنەبەری ڕێبازی زوهد و وەرع و، ڕوودانی ئالوگۆڕ لە هزری ئەودا لە دەمی بیستنی پلانێکی چەپەڵ لە دەوری قورئان و، لێبڕانی تەواوەتیی بۆ خزمەتی قورئانی پیرۆز..

ئنجا ئەو بارە دەروونی‌یە پەرێشانەی کە لە دەمی دیلیدا دووچاری بوو، هاوکات لەگەڵ بێداربوونەوەی ڕۆحیی، پاشتر گەڕانەوەی دوای دەربازبوون لە دیلی.. پاشان ئەو گۆڕانکاری‌یە مەزنەی کە بەهۆی هەڕەشەی پیری و، بیرکردنەوەی لە مردن و، یەکخستنی قیبلەی ڕووتێکردنی ڕووەو قورئانی پیرۆز ڕووی دا، دوای خوێندنەوەی کتێبی شێخی گەیلانی و ئیمامی ڕەببانی.. هەروەها سەرهەڵدانی سەرەتای ئاڵوگۆڕێکی یەکجار گەورە لە ژیانیدا بە ڕادەیەك کە ئارەزووی گۆشەگیری بوو بە خولیای، بۆیە لە خەڵك دوورکەوتەوە و لەسەر "گردی یووشەع" دەستی دایە ڕێبازی تێڕامان و بیرکردنەوە و، هەرچی تۆز و چڵك و چەپەڵیی فەلسەفە لە هزری نیشتبوو هەمووی داتەکاند و، سەرجەم موعاناتە دەروونی و ئاڵووگۆڕە ڕۆحی و ڕوونبوونەوە قەلبی‌یەکانی خۆی لە "مەسنەوی"یەکەیدا تۆمارکرد، هەتا بە تەواوەتی بوو بە "سەعیدێکی نوێ" لە ڕێگایەکی قورئانیدا، کە ڕێی کۆڵەواری و، هەژاری و، شەفەقەت و، بیرکردنەوەیە.

سەرباری ئەوەش، لە هیچ کاتێکی ئەم ماوەیەی ژیانیدا ئەرکی گەیاندنی بانگەوازی لەبیرنەچووە، ئەوەبوو لە ڕووی پیلانەکانی ئینگلیز ڕاوەستا و، لە ئەنقەرەش هەوڵی سەروەری دا کە ڕووکاری ئاڵوگۆڕە نوێ‌یەکە بەرەو بەرژەوەندیی ئیسلام ئاراستە بکات، بەڵام لەوێ نیشانەکانی "دەجاڵ" و "سوفیانی"ی لەو کەسەدا بینی کە دەسەڵاتی گرتبووە دەست. ئیتر دڵنیا بوو لەوەی کە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بارودۆخە تەنها بە "ئیعجازی قورئان" دەبێت.

بۆیە بە تەواوی لە کاروباری سیاسەت دوورکەوتەوە و، بەرەو "وان" گەڕایەوە، تاکو لەوێ خۆی بۆ هەڵگرتنی ئەمانەتە قورسەکە ئامادە بکات.

بەم جۆرە، دەبینین کە چاودێریی خوایی چۆن چۆنی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر ئەوی بردووە، تاکو "سەعیدی نوێ" بە تەواوەتی لێ ببڕێت بۆ ئەرکی "ڕزگارکردنی ئیمان".

## ساڵی ١٩١٩ز/١٣٣٦ك

❑ سەرهەڵدانەوەی ڕابوونە ڕۆحی یەکەی

(کاتێ کە لە دیلی گەڕامەوە، لەگەڵ "عەبدوڕەحمان"ی برازامدا لەناو خانوویەك لەسەر لوتکەی "چاملیجە"ی ئەستەمبووڵ نیشتەجێ بووبووم.

دەکرێت ئەو جۆرە ژیانە – لە لایەنی دنیاییەوە – بۆ ئێمەمانان لە چەند ڕوویەکەوە بە ژیانێکی میسالی دابنرێت. چونکە لە لایەکەوە لە دیلی ڕزگارم بووبوو. لە لایەکی تریشەوە دەرگاکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی "دار الحکمة الإسلامیة" بەپێی پیشە و ئەرکی زانستیی سەرشانم لە من کرابوونەوە. ئنجا ناوبانگیش بە ڕادەیەك دەورەی دابووم کە من شایستەی نەبووم. ئەمە جگە لەوەی کە من لە خۆشترین شوێنی ئەستەمبووڵ "(چاملیجە"دا دەژیام و، هەموو شتێکم بە گوێرەی دڵ بوو، چونکە خوالێخۆشبوو "عەبدوڕەحمان"ی برازامم لەگەڵدا بوو، کە جگە لەوەی لەوپەڕی وریایی و زیرەکیدا بوو، لە هەمان کاتدا قوتابی و خزمەتگوزار و نووسەر و مرۆڤێکی گیانفیدا بوو، بە ڕادەیەك کە من بە کوڕێکی مەعنەویی خۆمم دادەنا.

لەم کاتەدا کە خۆم بە بەختەوەرترین کەسی ئەم جیهانە دەزانی، سەیرێکی ئاوێنەم کرد. هەر هێندەی چەند تاڵێکی سپیم لە سەر و ڕیشمدا بەدی کرد، یەکسەر ئەو بێداربوونەوە ڕۆحی یەی سەردەمی دیلیم کە لە مزگەوتەکەی "کۆستڕما"دا هەستم پێ کرد، بە بینینی ئەم تاڵە مووە سپی یانە سەری هەڵدایەوە!

لەمەوە دەستم کرد بە سەرنجدان و بیرکردنەوە لەو شتانەی کە بە دڵ پەیوەستیان بووم و وامدەزانی مایەی بەختەوەریی ژیانی دنیان. بەڵام دوای سەرنجدانێکی ورد بۆم دەرکەوت کە هەموو یەکێکی ئەو حاڵەت و هۆکارانە، کەم نرخ و مرۆڤ خەڵەتێنەرن و شیاوی ئەوە نین کە دڵیان پێوە ببەسترێت.

سەرەڕای ئەمانەش، لەم کاتەدا پچڕانی پەیوەندیی هاوڕێیەتی، تەنانەت بێ وەفاییەکی چاوەڕوان نەکراوم لە هاوەڵێکی دڵسۆزم دی کە هەرگیز شتی وام بە دڵدا نەدەهات..

ئەمانە هەموویان بوون بە مایەی دوورکەوتنەوە و بێزاری و نەفرین کردنم لە ژیانی دنیا و، لە دڵی خۆمم پرسی:

"ئایا من خەڵەتاوم کە دەبینم زۆربەی خەڵکی بە چاوی غیبتە و حەسوودی‌یەوە سەیری ئەم ژیانەی ئێمە دەکەن، کە لە ڕاستیدا شایستەی شیوەن و گریانە؟! ئایا ئەو هەموو خەڵکە شێت بوون؟ یان من بەرەو شێتی دەڕۆم کە ئەو شەیدایانەی دنیا بە شێت دەزانم"؟!

بە هەرحاڵ.. ئەم بێداربوونەوەیەی کە بە هۆی بینینی پیری‌یەوە ڕووی دا، بە باشی و جوانی نەمانی شتانی "فانی"ی پیشان دام و تێیگەیاندم کە دەبێ هەر بڕۆن و چاوەڕێی مانەوە نەکەن!

کە ئاوڕم بە لای خۆمدا دایەوە، بینیم لەوپەڕی دەستەوسانیدام.

"گیان"یشم کە داخوازی مانەوە و نەمری‌یە و، دەستی لە داوێنی دنیا و ئەو شتانە گیر کردبوو کە ڕوو لە نەمانن، چونکە پێی وابوو نەمری و مانەوەیان تێدایە.. ئەم گیانە، کە دەوستەوسانیی منی بۆ دەرکەوت، بە دەم هاوارەوە وتی:

"مادەم جەستەم فانی بێت، دەبێ چ سوودێکم لەم شتە فانی‌یانە دەست بکەوێت؟.. کە خۆم بەم جۆرە دەستەوسان بم، دەبێ چاوەڕێی چی بم لە دەستەوسان و بێ دەسەڵاتان؟! کەواتە ئەم دەردە هیچ دەرمانێکی نی‌یە و چارەسەر ناکرێت، مەگەر تەنها لای ئەو خواوەندە باڵادەستەی کە هەر بووە و هەر دەبێ و دەمێنێتەوە".

بەم جۆرە کەوتمە گەڕان و بەدواداچوون..

یەکەم شت کە بۆ مەبەستی دۆزینەوەی هیوا و ئومێد پیایدا ڕۆشتمەوە، ئەو زانستانە بوون کە زووتر خوێندبوومن و دەستم کەوتبوون.

بەڵام بەداخەوە من تا ئەو کاتەش زانستە ئیسلامی‌یەکان و زانستە فەلسەفی‌یەکانم تێکەڵ کردبوون و پێکەوە لێم هەڵدەگۆزین.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە من لەڕادەبەدەر بەهەڵەدا چووبووم، وامدەزانی ئەم بابەتە فەلسەفی‌یانە سەرچاوەی کامڵ بوون و پێشکەوتن و تەوەرەی "ڕۆشنبیری"ن!

کەچی لە ڕاستیدا هەر ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانە بوون کە سەریان لـە ڕۆحـم شـێواند و لەکەی زۆریان لەسەر هەڵچنی و، هەر ئەوانیش بوون بە تەگەرە لـە ڕێـی بەرزبوونـەوەی مەعنەویمدا)[1].

### ☐ لابردنی لەمپەرەکان لەسەر ڕێی "دڵ"دا

(بێ گومان هەر بۆخۆم زیادبوونی "زانستی فەلسەفی"م لە زیادبوونی نەخۆشی‌یەکەدا بینـی، هـەروەك زیـادبوونی نەخۆشی‌یەکەشـم لـە زیـادبوونی "زانسـتی عـەقڵی"دا بینـی. چونکە نەخۆشی‌یە مەعنەوی‌یەکان مرۆڤ دەگەیەننە چـەند زانسـتێکی عـەقڵی، هـەروەك زانستە عەقڵی‌یەکانیش دەبنە هۆی پەیدابوونی چەندین "نەخۆشیی قەلبی")[2].

ئـەوەبوو (کاتـێ "سـەعیدی نـوێ" ڕێـی تێڕامـان و بیرکردنـەوەی گرتەبـەر، هونـەر و زانستە فەلسـەفی‌یەکانی ئـەوروپا کـە تـا ڕادەیـەك لـە بـیری "سـەعیدی کـۆن"دا جێگـیر ببووبوون، لەناو دڵی ئەودا چـەند نەخۆشـی‌یەکیان پێکـهێنا و، لـەو گەشـتەی کـە ئـەو بـە "دڵ" ئەنجامی دا چەندین گیروگرفتی زۆریان لـێ پەیدا بوو.

لەبەر ئـەوە، "سـەعیدی نـوێ" بـیری خـۆی - بـە یـەکجاری - لـە چڵـك و چەپـەڵیی فەلسەفەی بە ڕوو کەش ڕازاوە و شارستانێتیی ساختە و نەفام، داتەکاند)[3].

---

(١) بریسکەکان، ل: ٤٧٧-٤٧٨. پێویستە ئەوەش یادی خوێنەری بەڕێز بخەینەوە کـە: "ئەو فەلسـەفەیەی کە پەیامەکانی نوور هێرشی دەکەنە سەر و زللەی توند و بەهێزی تێ دەسرەوێنن، تەنها فەلسەفە زیانبەخشەکەیە و تێکڕای فەلسـەفە نی‌یە. چونکە بەشـی "حیکمـەت" لـە فەلسـەفەدا، کـە خزمـەتی ژیـانی کۆمەڵایـەتیی مـرۆڤ دەکـات و یارمـەتیی ئاکـار و ڕەوشتە بـەرزەکان دەدات و ڕێ بـۆ پێشـکەوتنی پیشەسـازی خـۆش دەکـات، پەیوەندیی باشی لەگەڵ قورئاندا هەیـە و سـازە لەگـەڵی، بـەڵکو خزمـەتکاری حیکمـەتی قورئـانی پیرۆزە و لـە دژی ڕاناوەستێت، تەنانەت هـەر ناشتوانێت لـە دژی ڕابووەستێت. لەبەر ئەوە، پەیامـەکانی نـوور بـەر لـەم بەشەی فەلسـەفە نـاگرن. بـەڵام بەشـی دووهـەمی فەلسـەفە، هـەروەك لـە لایەکـەوە بـووە بـەهۆی بەربوونـەوەی خەڵکی بۆ ناو گومڕایی و ئیلحـاد و لیتاوی بۆگـەنی فەلسـەفەی سروشـتی، لـە هـەمان کاتـدا و لـە لایـەکی تریشـەوە بە هەرزەیی و گـەمە و گاڵتەوە مرۆڤ بەرەو بێ ئاگایی و گومڕایی دەداتـە بـەر. ئنجا لەبەر ئەوەی بەو کـارە دەراسایانەی خـۆی کە وەکو سیحر وان، سنگ لـە ڕاسـتی‌یەکانی موعجـیزەی قورئـانی پـیرۆز دەردەپەڕێنێت، ئەوا پەیامەکانی نـوور لـە زۆربەی بەشـەکانیاندا و بـە دامـەزراندنی چەندین تـەرازووی ورد و دەستووری توندوتۆڵ و، لە ڕێی سازدانی چەندەها بەراوردی پشت بەستوو بە بەڵگەی بەهێز، ڕووبەڕووی ئەم بەشە گومڕایەی فەلسەفە دەبنەوە و زللەی توندوتیـژی تـێ دەسـرەوێنن، لـە کـاتێکدا کـە کاریـان بەسـەر بەشە ڕاست و سوودبەخشەکەی فەلسەفەوە نی‌یە". پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٠٨-٤٠٩.

(٢) مەسنەویی نووری، دڵۆپێك لە دەریای تەوحید، کۆتایی.

(٣) بریسکەکان، بریسکەی حەڤدەهەم، ل: ٢٢٨.

چونکە (سەعیدی کۆن و بیریارەکان لە هەندێکی دەستوورەکانی فەلسەفەی مرۆڤ "رازی"ن. واتە شتێکیان لێ پەسەند کردووە و، هەر بە چەکی ئەوان زۆرانیان لەگەڵدا دەگرن و، بەشێك لە دەستوورەکانی فەلسەفەیان بە وێنەی زانستە نوێیەکان وەرگرتووە و سەلماندوویانە. بۆیە ناتوانن - بەم شێوە کارکردنە - وێنەی راستەقینەی ئیسلام پێشکەش بکەن. چونکە دەچن درەختی ئیسلام بە لق و پەلی ئەو حیکمەت و فەلسەفەیە موتوربە دەکەن کە پێیان وایە خاوەنی رەگ و ریشەی قووڵ و بەربلاو بن. وەك بڵێی دەیانەوێت بەم کارەیان ئایینی ئیسلام بەهێز بکەن!

بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بە کەمی رێ دەکەوێت کە بەم چەشنە کارکردنە سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەست بهێنرێت و.. لەبەر ئەوەش کە هەندێك داشکانی تێدایە لە شان و شکۆی ئیسلام، ئەوا وازم لەو رێبازە هێنا و، بە راستی و کردار دەرمخست کە بناغەکانی ئیسلام هێندە ریشەدار و قووڵن و ئەوەندە بەناخدا رۆچوون کە هەرگیز بناغەکانی فەلسەفەیان پێ ناگات، تەنانەت لە بەرامبەریانەوە بێ بناغە و رووکەش دەردەکەون!

لە "وتەی سیهەم" و "مەکتووبی بیست و چوارەم" و "وتەی بیست و نۆهەم"دا ئەم راستییەم بە بەڵگەکانیەوە پێشچاو خستووە.

لە رێبازی پێشوودا وا گومان دەبرێت کە فەلسەفە شتێکی قووڵ بێت و ئەحکامەکانی ئیسلامیش رواڵەتی و رووکەش بن، بۆیە دەست لە پەل و لقەکانی فەلسەفە گیر دەکرێت بۆ مەبەستی پاراستنی ئیسلام!

بەڵام هەرگیز وانییە و ئەم بۆچوونە گەلێ لە واقیعەوە دوورە. دەستوورەکانی فەلسەفە لە کوێ دەتوانن بەو ئەحکامانە بگەنەوە)[1]!

□ سەرکەوتنی "دڵ"

(لەو کاتەدا کە من بەم حاڵەوە دەتلامەوە، میهرەبانی و کەرەمی خوای گەورەی بەتوانای باڵادەست، دانستە بەرز و پیرۆزەکەی قورئانی پیرۆزی نارد بە هانامەوە و،

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و نۆهەم، ل: ٧٤٩-٧٥٠.

لەکەی ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانەی داشۆرد و "گیان"ی منیان لەوانە پاك کردەوە، وەك لە زۆر پەیامدا باس کراوە.

چونکە ئەو تاریکی‌یە ڕۆحی‌یەی کە لە زانستە فەلسەفی‌یە تازەکانی لەمەڕ بوونەوەرەوە سەرچاوە دەگرن، نزیك بوو ڕۆحی منیش داپۆشن و ڕۆشناییەکەی لە ناوەندی بوونەوەراندا نغرۆ بکەن..

ئەوەبوو هەرکاتێ کە دەمڕوانی‌یە هەر لایەنێکی ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانە، تروسکاییەك ڕووناکیم تێدا نەدەبینین و تەنانەت تەنگە نەفەسیش دەبووم! هەتا ئەو دەمەی کە نوورە درەخشانە تەوحیدی‌یەکەی قورئانی پیرۆز هات و تەلقینی "لا إلـه إلا هو"ی دادام و، ئەو تاریکی‌یەی لەسەر ڕەواندمەوە و سنگم کرایەوە. ئنجا توانیم بەوپەڕی حەوانەوە و دڵنیایی هەناسەی ئاسوودەیی هەڵبکێشم.

بەڵام نەفس و شەیتان، بەهۆی ئەو دەرس و ئامۆژگاری‌یانەی کە لای گومڕایان و ئەهلی فەلسەفە خوێندبوویان، خۆیان بۆ ڕانەگیرا و پێکەوە هێرشیان کردە سەر "دڵ" و "ژیری"م. ئەوەبوو لەم هێرشەدا چەند گفتوگۆ و تووێژێك لە نێوان هەردوو لادا ڕووی دا، کە سوپاس بۆ خوا بە سەرکەوتنی "دڵ" و دام و دەستەکەی کۆتایی پێ هات)[1]!

☐ هەڕەشەی پیری و، یادکردنەوەی مردن

(کاتێ لە بەرەبەیانی پیریدا لە خەوی شەوگاری لاوی بێدار بوومەوە، سەرنجم لە خودی خۆم دا، بینیم وا بە خێرایی لە لوتکەی بەرزاییەکەوە بەرەو دەرگای گۆڕەکەم بەردەبمەوە، وەك "نیازیی میسری"[2] لە وەسفی ئەم چەشنە حاڵەتەدا دەڵێت:

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٧٩.

(٢) نیازیی میسری (١٦١٨-١٦٩٤ز) شاعیرێکی زاهیدە، لە گوندێکی سەر بە پارێزگەی "مەلاتییە" لە دایك بووە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە: "میسری". کە لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبووڵدا، هەر لەوێش تەریقەتی "خەڵوەتی"ی دامەزراندووە کە پێیشی دەوترێت: "تەریقەتی نیازی" و "تەریقەتی میسری". جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"، "عوائد الاحسان"، "هدایة الاخوان". (وەرگێڕ)

لە گەرمەی خەوی غەفڵەتی "گیان"م

ڕووخا بەرد بەردی کۆشکی "ژیان"م!

بەڵێ، ئەو جەستەیەی کە خانە و لانەی گیانمە، بە درێژایی ڕۆژگار یەك لە دوای یەکی بەردەکانی داکەوتن.. ئەو هیوا و ئاواتانەش کە بە توندی منیان بە دنیاوە بەستبوو، هەموویان پچڕان و لەت لەت بوون! لەمەوە هەستم بە نزیکبوونەوەی وادەی جودایی و لێکدابڕانم کرد لەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی کە لە ژمارە نایەن.

لەبەر ئەوە، کەوتمە گەڕان بە دوای تیماری ئەم برینە مەعنەوییە قووڵەی کە وا دیارە دەرمانی نییە. بەڵام هیچ چارەسەرێکم دەستگیر نەبوو. لە ناچاریدا منیش وەکو "نیازی" وتم:

"دانست" خوازیاری فەنای جەستەمە

"ئەبەد" ئاواتی دڵی خەستەمە

دەروونم کەیلی پەژارە و دەردە

لوقمان سەرسامە و تیمار ئەستەمە

لەم کاتەدا کە من بەم حاڵەوە دەتلامەوە، لە ناکاودا نووری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ﷺ کە ئەمیندار و نموونە و بانگەوازکار و زمانی میهرەبانیی خوای گەورەیە، هاودەم لەگەڵ شەفاعەت و ئەو دیارییەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە و بریتییە لە ڕێنمایی کردنی مرۆڤایەتی، بوون بە مەڵهەم و دەرمانێکی ساڕێژکاری دەردە بێ دەرمانەکەم و، ئەو نائومێدییە ڕەشەیان بۆ گۆڕیم بە ئومێدێکی ڕووناکی درەخشان)[1].

(کاتێ کە یەکەم هەنگاوم نایە ناو دەرگای پیرییەوە، تەندروستیی جەستەشم - کە درێژە بە خەوی "بێ ئاگایی" دەدات - تێکچوو بوو.

بەم جۆرە، "پیری" و "نەخۆشی" یەکیان گرت و پێکەوە هێرشیان کردە سەرم و، تا ئێستایش بە دوو قۆلی لێم ڕاست بوونەتەوە و زللەی یەك لە دوای یەك لە سەر و گوێلاکم دەسرەوێنن. تا بە تەواوی خەوی "بێ ئاگایی"یان لێ زڕاندم.

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٤٨-٤٤٩.

ئنجا هیچ شتێکی وەك ماڵ و منالیشم نەبوو تا بە دنیاوە بمبەستنەوە. لەبەر ئەوە، کە سەیری ئەنجامی سەرمایەی تەمەنی خۆمم کرد - کە بەهۆی بێ ئاگایی سەردەمی لاویم لە دەستم دەرچوو - بینیم هەر تەنها تاوان و گوناهباریە!

لەم کاتەدا منیش وەکو "نیازیی میسری" هاوارم لێ هەڵسا و، وتم:

بە دەستی خاڵی ڕێگام گرتەبەر
بە بێ ئاگایی و ڕەنجی بێ سەمەر
لە کاروان جێماو، نامۆ و ئاوارە
سەرمایەی ژینم ڕۆیشت بە هەدەر

* * *

تەنها لافاوی فرمێسکی چاوم
قرچەی سووتاویی تاسەی هەناوم
هاودەمی گەشتی تەنیایی من بوون
سەرباری "ژیری"ی سەر لێ شێواوم

لەو دەمەشدا لە نامۆییەکی سەختدا دەژیام. بۆیە هەستم بە پەژارە و نائومێدی دەکرد و، لە حەسرەت و پەشیمانیی ڕۆژانی ڕابوردووی تەمەنمدا بووم. لە تاوا بەدەم داد و هاوارەوە داوای یارمەتیم دەکرد و، لە دووی ئومێدێکدا دەگەڕام کە دڵم ڕووناك بکاتەوە..

لە ناکاودا قورئانی پیرۆزی ئیعجازبەخش ئاوڕی سۆزی لێ دامەوە و، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کردم و، دەرگایەکی گەورەی هیوا و ئومێدی بۆ خستمە سەرپشت و، نوورێکی هێندە ئومێدبەخش و درەخشانی پێ بەخشیم کە ئەگەر ئەو نائومێدییەم سەد ئەوەندەش زیاتر و گەورەتر بوایە، هەر هەمووی دەڕەواندەوە و دەوروبەری بۆ ڕووناك دەکردمەوە)[1].

(بەڵێ، من ئەو وتەیەم تێدا هاتووەتەدی کە وتراوە:

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٥٠-٤٥١.

وعيني قد نامَتْ بليلِ شبيبَتي ولَمْ تنتَبهْ إلاّ بِصُبحِ مَشيبِ[١]

چونکە ئێستا بۆم دەرکەوت کە بێدارترینی کاتەکانی لاویم، قوولترینی چینەکانی نووستنم بوون)[٢]!

(ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە چەند تاڵێکی سپی - کە نیشانەی پیرییە - تێکەڵی مووی سەرم بووبوون.

ڕووداوە سەختەکانی یەکەم جەنگی جیهانی و، ئاسەوارە قووڵەکانی دیل بوونم لە ڕووسیا بە سەر ژیانمەوە، خەوی بێ ئاگایی منیان قورستر کردبوو.

دوای ئەوەش کە لە دیلی دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ، ئەو پێشوازییە ڕەنگین و گەرمەی لێم کرا چ لە لایەن خەلیفە و چ لە لایەن "شێخولئیسلام" و چ لە لایەن سەرکردەی گشتی و چ لە لایەن قوتابیانی زانستە شەرعییەکانەوە، هەروەها ئەو ڕێزە گرنگەی لێم گیرا کە لە ڕادەیەکدا بوو من شایستەی نەبووم.. هەموو ئەمانە، هاودەم لەگەڵ مەستی و بێ ئاگایی لاویدا، بوون بەهۆی دروستبوونی بارێکی ڕۆحیی ئەوتۆ کە خەوی بێ ئاگایی منیان لە جاران قورستر کرد، بە ڕادەیەك کە دنیام بە هەمیشەیی دەهاتە بەرچاو! هەروەك "دەروون"یشم هێندە بە شێوەیەکی سەیر خۆی پابەندی دنیا کردبوو وەك بڵێی هەرگیز مردنی لە ڕێگادا نەبێت!

ئا لەم کاتە و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا سەرێکی مزگەوتی "بایەزید"م دا لە ئەستەمبووڵ، بەو نیازەی کە لەسەر زاری قورئان خوێنە دڵسۆزەکانی ئەوێ گوێ لە قورئانی پیرۆز ڕابگرم[٣]. ئەوەبوو لەسەر زمانی قورئان خوێنەکانەوە ئەو ڕاگەیاندنە

---

(١) واتە:

گەنج بووم چاوم نوست "لاوی"م بوو بە شەو سپێدەی "پیری" جا هەڵسا لە خەو

دوای گەڕانێکی زۆر بۆم ساغ نەبووەوە ئەم بەیتە شیعرە هی کێیە. (وەرگێڕ)

(٢) مەسنەویی نووری، تۆوێك لە بەروبوومەکانی بەهەشتی قورئان.

(٣) مامۆستا نوورسی چەند یادەوەرییەکی گرنگی لە مزگەوتی "بایەزید"دا هەیە کە شایانی یادخستنەوەن، لەبەر ئەوەش نەمانهێنان بۆ ئێرە تاکو باسەکە درێژە نەکێشێت. خوێنەری بەڕێز دەتوانێت لە شوێنی دیاریکراوی خۆیاندا بیانخوێنێتەوە و سوودیان لێ وەربگرێت. یەکێك لەوانە لە باسی ئیعجازی پیتی "ن"ی ﴿نَعْبُدُ﴾دایە، بڕوانە: "مەکتووبات، ل: ٦٦٣-٦٦٨"؛ یەکێکی تر لە دەمی چەسپاندنی ئەوەی کە قورئان گوفتاری خوای گەورەیە، "مەکتووبات، مەکتووبی بیست و شەشەم، ل: ٥١٧-٥٢٩".

توند و بەهێزەی قورئانی پیرۆزی ئیعجازبەخشم بیست کە بە گوفتارە بەرز و ئاسمانی یەکەی خۆی مردن و نەمانی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێکی لە ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ دا (آل عمران:١٨٥) بە ئاشکرا ڕاگەیاندووە!

ئەم ڕاگەیاندنە توند و بەهێزە، هێندە بە گەرموگوڕی ڕۆشتە ناو گوێمەوە کە هەموو چینە چڕ و ئەستوورەکانی خەوی بێ ئاگایی و مەستیی منی بڕیی و، جێی خۆی لە ناخی دڵمدا کردەوە!

دوای ئەوە لە مزگەوت دەرچووم.

پاش چەند ڕۆژێك هەستم کرد کە پاشماوەی ئاسەوارەکانی ئەو خەوی بێ ئاگاییەی کە لە مێژە جێی خۆی لە ناخی مندا کردبووەوە، وەك زریانێکی گەورە و سەخت لە سەرمدا دەجوولا و، خۆم وەك کەشتییەك دەبینی کە لە ناو شەپۆلی دەریادا قیبلەنماکەی لەکار کەوتبێت و بە ڕاست و چەپدا بخولێتەوە. دەروونم لەناو ئاگرێکی چەڕە دووکەلاویدا هەلدەقرچا. خۆ هەر کات لە ئاوێنەدا سەیری خۆمم دەکرد، مووە سپییەکان پێیان دەوتم: وریابە!!

بەڵێ، ئەم جارە بە پەیدابوون و بێدارکردنەوەکانی ئەو چەند تاڵە سپییە، هەموو شتێکم لە لا ڕوون بووەوە..

چونکە بینیم ئەو لاوییەی کە من زۆر جار پێی دەنازیم و شەیدای چێژەکانی بووبووم، ئێستا پێم دەڵێ: "خوا حافیز"! هەروەها ئەو ژیانەی کە پەیوەندیی خۆشەویستیم لەگەڵدا بەستبوو، وردە وردە بەرەو کزبوون و کوژانەوە دەڕۆشت.. ئەو دنیایەش کە دەستم لە داوێنی گیرکردبوو، تەنانەت زۆر بۆی پەرۆش بووم، بەڵکو شەیداشی بووبووم، بینیم پێم دەڵێت: "خوا حافیز، خوات لەگەڵ"!

بەمەش پێی ڕادەگەیاندم کە من لێرەدا میوانم و هێندەی نەماوە ئەم میوانخانەیە بەجێ بهێڵم. بەڵکو لەمەش زیاترم دی؛ چونکە بینیم دنیا خۆیشی خەریکی خۆپێچانەوەیە بۆ کۆچکردن و "خواحافیزی" وتن!

ئنجا یەکێ لە واتا "هەمەکی"یەکانی ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ لە ڕووی دڵمدا کرایەوە، کە بریتییە لەمەی خوارەوە:

"سەرجەمی مرۆڤایەتی بە گشتی وەك تاقە كەسێك وایە، دەبێ بمرێت تاكو سەرلەنوێ زیندوو بكرێتەوە.. گۆی زەویش كەسێكە دەبێ تامی مردن بچێژێت تاكو شێوەی مانەوە و هەمیشەیی لەخۆ بگرێت.. دنیاش بە هەمان جۆر كەسێكی ترە و دەبێ بمرێت، تاكو لە شێوەی دواڕۆژدا دروست بكرێتەوە".

ئنجا بیرم لەو بارە كردەوە كە ئەو كاتە منی تێدابووم.. بینیم:

ئەو لاوی‌یەی كە خولگەی هەموو تام و چێژێكە، بەرەو نەمان دەڕوات و شوێن بۆ ئەو پیری‌یە چۆڵ دەكات كە سەرچاوەی هەموو داخ و خەفەتێكە! ئەم ژیانە درەخشان و ڕووناكەش لە ڕۆشتندایە و، مردنی بە ڕواڵەت تاریك و لێڵ خۆی بۆ شوێنەكەی ئامادە دەكات! ئەم دنیا خۆشەویست و شیرینەش كە وا دەزانرێت هەمیشەییە و خۆشەویستی بێ ئاگایانە، بینیم زۆر بە پەلە بەرەو ئاوابوون دەڕوات!

منیش بۆ ئەوەی سەر بە ناو بێ ئاگاییدا بكەم و لە دەست ئەو بارە پەرێشانە خۆم بخەڵەتێنم، ئاوڕێكم بە لای ئەو پلە و پایە بەرزە كۆمەڵایەتی‌یەدا دایەوە كە پاش گەڕانەوەم لە دیلی لە ئەستەمبوڵ بەدەستم هێنا و دەروونم پێی خەڵەتا و، سەرتاپا دڵنەوایی و ڕێزلێنان و ڕووتێكردنی خەڵكی بوو بەرامبەرم و، زۆر لە توانا و وزەی خۆم زیاتر بوو..

بینیم هەموو ئەمانە تا دەرگای گۆڕەكەم لەگەڵمدا دێن كە لێی نزیك بوومەتەوە و، هەر هێندەی گەیشتمە ئەوێ سەرجەم ڕووناكی‌یەكانیان دەكوژێنەوە!

پاشان بۆم دەركەوت كە ڕیایەكی قەبە و خۆپەرستی‌یەكی سارد و سڕ و بێ ئاگاییەكی كاتی خۆیان لە پشتی پەردەی ڕازاوە و نەخشاوی "لەخۆ ڕازی بوون"ەوە مەڵاس داوە، كە نموونەی بەرز و ئاواتی گەورەی شەیدایانی ناوبانگە!

ئیتر تێگەیشتم كە ئەم شتانەی تا ئێستا منیان خەڵەتاند، لەمەودوا هیچ دڵنەوایی و ڕووناكی‌یەكم پێ نابەخشن!

جا بۆ ئەوەی ئەم جارەیان بە تەواوی لە خەوی بێ ئاگایی بێدار ببمەوە، دەستم كردەوە بە گوێ ڕاگرتن لەو قورئان خوێنە بەڕێزانەی ناو مزگەوتی "بایەزید" بۆ مەبەستی خوێندن و وەرگرتنی وانە ئاسمانی‌یەكەی قورئانی پیرۆز.

ئیتر لـەم ڕێیـەوە و لـە نـاوەندی فەرمانـە خـاوێن و پیرۆزە کـانی پـەروەردگاردا، مزگێنییەکانی ئەو ڕابەرە ئاسمانییەم بیست کە لە ئایەتی: ﴿وَبَشِّرِ الذينَ آمَنُـــوا...﴾دا (سورة البقرة:٢٥) ڕایگەیاندووە.

بەڵێ، کاریگەریی ئەو ڕێژنە و بەرەکەتەی لە قورئانی پیرۆزەوە دەستم کـەوت، هـانی دام کـە لـەناو ئـەو شـتانەی سەرسـامیان کردبـووم و خسـتبوومیانە نـائومێدی و دڵتەنگییەوە، بە شوێن ئومێد و ڕووناکیدا بگەڕێم.

هەزاران شوکر و ستایش بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم کـە یارمـەتیی دام بـۆ دۆزینـەوەی دەرمان لە هەمان نەخۆشیدا و، بینینی ڕووناکی لە هەمان تاریکیدا و، هەسـت کـردن بـە دڵنەوایی لە هەمان ئازار و سامناکیدا!

یەکەم جار سەیرێکی ئـەو "ڕوو"ەم کـرد کـە خـەڵکی دەترسێنێت و لـە پێش چـاوی هەمواندا سامناك دەردەکەوێت، کە بریتییە لە ڕووی "مردن"!

بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کـە ڕووی ڕاسـتەقینەی مـردن سـەبارەت بـە ئیماندارانەوە ڕوویەکی جوانی ڕووناکە، هەرچەند دیوی دەرەوەی بە پەردەیەکی ڕەشی تاریك و ناشیرین و ترسناك داپۆشراوە.

ئەم ڕاستییەمان بە جۆرێکی گومـانبڕ لـە زۆر پـەیامدا چەسپاندووە. بـە تایبـەت لـە "وتەی هەشتەم" و "مـەکتووبی بیستەم"دا ڕوونمـان کردووەتـەوە کـە "مـردن" لـەناودانی هـەتاهـەتایی و جودایـی هەمیشـەیی نییـە، بـەڵکو پێشـەکی و سـەرەتای ژیـانێکی هەمیشـەییە و.. مۆڵەت و حـەوانەوەیە و.. کـۆتـایی هێنـانە بـە ئـەرکی کارمـەندیی ئـەم ژیانە و.. شوێن گۆڕین و بە یەك شادبوونەوەیە لەگەڵ کاروانی ئەو خۆشەویستانەی کـە کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردووە.

بەم جۆرە و لە ڕوانگەی ئەم ڕاستییانەوە، ڕووی گـەش و ڕوونـاکی مـردنم دی. بێ گومـان نـەك بـە تـرس و لـەرزەوە، بـەڵکو - لـە ڕوویەکـەوە - بـە ڕوانینـی حـەز و تاسەمەندییەوە بۆم ڕوانی. کە ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی یەکێك لـە نهێنییـەکانی یـادی مردن(رابطة الموت)م بۆ دەربکـەوێت کـە ڕێڕەوانـی ڕێبازەکـانی "تەسـەووف" ئـەنجامی دەدەن.

پاشان سەرنجی "سەردەمی لاوی"م دا کە سەردەمێکە هەموو کەسێك شەیدایەتی و خەفەت بە نەمانی دەخوات و، وەکو لاویی من لە هەموو کەسێکی تریش بە بێ ئاگایی و گوناهباری دەچێتەسەر! بینیم لە پشت ئەو بەرگە رازاوە نەخشاوەی لاوییەوە روویەکی ناشیرین و تەنانەت سەرسوورهێن و مەستکەر هەیە کە بەو بەرگە داپۆشراوە.

خۆ ئەگەر من راستی و چییەتیی لاویم نەزانیبایە، ئەوا با تەمەنێکی سەد سالییشم ببوایە، هەتا دوا هەناسەی ژیانم دووچاری خەفەت و گریانی دەکردم، بۆ ئەو چەند سالەکەمەی کە بە مەستی و پێکەنینەوە دەچێتە سەر، بە وێنەی ئەو شاعیرەی کە بە خەفەت و ئازارێکی تاڵەوە بۆ لاویی خۆی گریاوە و، وتوویەتی:

خۆزگا گەنجییەکەم ئەگەڕا دواوە گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

بەڵێ، ئەو پیرانەی کە بە جوانی لە نهێنییەکانی تافی "لاوی" نەگەیشتوون، بە وێنەی ئەم شاعیرە، تەمەنی پیرییان بە خەفەت و گریانەوە دەبەنە سەر، بۆ لەدەستچوونی "سەردەمی لاوی"یان.

ئەگەر گەشە و لێهاتوویی هەرەتی "لاوی" لە باوەڕدارێکی هێمن و ژیر و دڵ بێدار و بە ویقاردا جێی خۆی بکاتەوە و، وزە و هێزی لاوی لە خواپەرستی و کردەوەی چاك و بازرگانیی دوارۆژدا بەسەر ببات، ئەوا دەبێت بە گەورەترین هێزی خێر و چاکە و، باشترین هۆی بازرگانی و، جوانترین و بەتامترین مایەی چاکەکاری.

بەڵێ، سەردەمی لاوی، سەردەمێکی گەلێ بەنرخە و نیعمەتێکی گەورەی خوایی و شادمانییەکی بەتام و خۆشە، بۆ کەسێك کە باش بەکاری بهێنێت و ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات.

بەڵام ئەگەر سەردەمی "لاوی" رێگای راستی تێدا نەگیرێتە بەر و، لەگەڵ داوێن پاکی و خواپەرستیدا هاودەم نەبێت، ئەوا گەلێ مەترسیی سەخت و لەناودەری لە رێگادایە. چونکە هاندان و هەڵەشەیی ئەم سەردەمەی تەمەن "بەختیاریی هەمیشەیی" و "ژیانی دوارۆژی" مرۆڤ لەناو دەبات، تەنانەت لەوانەیە ژیانی ئەم دنیاشی تێکبشکێنێت. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی لە سەردەمی پیریدا خەفەت و ئازارێکی

زۆر دەرخواردی ئەو کەسە بدات، تەنها لەبەر چەند ساڵێکی کەم کە بە کەیف و شادی‌یەوە لێی چووەتەسەر.

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی سەردەمی لاوی‌یان بە بێ زیان لێ ناچێتە سەر، ئەوا دەبێ ئێمەی پیر و بەساڵاچوو سوپاسێکی زۆری خوای خۆمان بکەین کە لە زیان و مەترسی‌یەکانی ئەو سەردەمە ڕزگاری کردووین.

لە لایەکی تریشەوە تام و لەزەتەکانی "لاوی" - وەك هەموو شتێکی تر - لە ئەنجامدا دەبڕێنەوە و کۆتاییان پێ دێت. جا ئەگەر ئەم سەردەمە بە پەرستش و کردەوەی چاك بەسەر ببرێت، ئەوا بەروبوومی نەبڕاوە و بەردەوام بە مرۆڤ دەبەخشێت و، دەبێت بەهۆی دەستخستنی لاویتی‌یەکی هەتاهەتایی لە ژیانێکی هەمیشەییدا.

پاشان سەیرێکی ئەم دنیایەم کرد کە زۆربەی خەڵکی شەیدا و گیرۆدەی بوون.

بەهۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بینیم "سێ" دنیای گشتی هەیە کە تێهەڵکێشی یەکتری بوون:

یەکەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ئاوێنەی ئەو ناوانەیە.

دووهەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ڕۆژی دوایی و کێڵگەی چاندنی تۆوی ئەو دنیایە.

سێ‌هەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ئەهلی دنیا و گومڕایان و، جێی گاڵتە و گەپ و ڕابواردنیانە.

هەروەها بۆم دەرکەوت کە هەرچی کەسە لە ناوەندی ئەم دنیایەدا، دنیایەکی تایبەتیی خۆی هەیە. واتە هێندەی ژمارەی مرۆڤ دنیای تێهەڵکێشی یەکتری هەیە!

بەڵام دنیای تایبەتیی هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ژیانە تایبەتی‌یەکەی ئەو کەسە ڕاگیر بووە و، هەر کات جەستەی ئەو کەسە ڕووخا و تێکشکا، ئەوا دنیاکەشی ڕووخاوە و قیامەتی بەرپا بووە!

جا لەبەر ئەوەی بێ ئاگایان بەم خێرایی و کتوپڕی‌یە هەست بە ڕووخانی دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆیان ناکەن کە ئاوا بە زوویی هەرەس دەهێنێت و کۆتایی پێ دێت، ئەوا شەیدای دەبن و پێیان وایە کە وەك دنیا دامەزراوە گشتی‌یەکەی دەوروبەریان وایە!

منیش کە بیرم کردەوە، لەبەر خۆمەوە وتم: بێ گومان منیش - وەکو خەڵکی - دنیایەکی تایبەتیی خۆم هەیە و، دنیاکەی منیش وەکو هی ئەوان بە خێرایی و لە پڕ دەڕووخێت. ئیتر دەبێ چ سوودێك لە دنیا تایبەتی یەکەی تەمەنە کورتەکەمدا ببێت؟!

بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کە ئەم دنیا تایبەتی یەی من و خەڵکی:

خانەیەکی کاتی یە بۆ بازرگانی و.. میوانخانەیەکە هەموو ڕۆژێك لە میوان پڕ دەبێت و پاشان خالی دەبێتەوە و.. بازاڕێکی سەر ڕێگایە بۆ ئەوانەی کە دێن و دەڕۆن و.. کتێبێکی کراوەی بەدیهێنەری وێنەکێشە کە دانستی خوای گەورە نووسین و کوژاندنەوەی بە ویستی خۆی تێدا دەکات و.. هەموو بەهارێکیشی نامەیەکی نەخشاوی ڕازاوەیە و.. هاوینەکانیشی چامەیەکی هۆنراوەی بەسۆز و ڕەنگینە و.. چەند ئاوێنەیەکی هەمیشە نوێ بووی ئەوتۆیە کە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی کردگاری شکۆمەندیان تێدا دەردەکەوێت و.. باخچە و کێڵگەی تێداچاندنی تۆوی ئەودنیایە و.. گوڵدانی میهرەبانیی خواوەندە و.. کارگەیەکی کاتی یە بۆ ئامادەکردنی ئەو تابلۆ پەروەردگاری یە هەمیشەییانەی کە لە جیهانی هەتاهەتایی و نەمریدا پیشان دەدرێن!

ئیتر منیش، کە ئەمەم بینی، لە لایەنی خۆمەوە شوکرانەی زۆرم پێشکەشی خواوەندی بەدیهێنەری بەخشندەم کرد بۆ ئەوەی کە دنیای لەسەر ئەم شێوەیە بەدی هێناوە!

بەڵام ئەو "خۆشەویستی"یەی کە بۆ ئەوە لە ناخی مرۆڤدا جێگیر کراوە تاکو بۆ دوو ڕووە جوانەکەی دنیا بەکاری بهێنێت، کە دەڕواننە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ڕۆژی دوایی، کەچی مرۆڤ نیشانەکەی نەپێکا و بە هەڵەدا چوو کاتێ کە ئەو خۆشەویستی یەی لە جێگای خۆیدا بەکار نەهێنا و بەرەو ڕووە ناشیرینە زیانبەخشەکەی سێهەمی دنیا وەری چەرخاند. بۆیە فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ تێدا هاتەدی کە دەفەرموێ: "حب الدنیا رأس کل خطیئة"[1][2].

---

(١) بڕوانە: (ضعیف الجامع الصغیر وزیادته: ٢٦٨١). (وەرگێڕ)

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٦٢-٤٦٨.

## ساڵی ١٩٢١ز/١٣٣٩ك

□ ڕێنمایی قورئانی پیرۆز

(دوای ئەوەی کە لە "دیلی" گەڕامەوە، بە درێژایی دوو ساڵ لە ژیانی ئەستەمبوڵم - سەر لە نوێ - بێ ئاگایی سەری تێ کردبوومەوە. چونکە باری ڕامیاریی ئەو کاتەی ئەوێ و تەوژمەکانی، زەین و بیری منیان شپرزە و پەرتەوازە کرد و سەرقاڵیان کردم بە خۆیانەوە و، نەیانهێشت ئاوڕێك بە لای خۆمدا بدەمەوە و بە قووڵی لە خۆم ورد ببمەوە.

ڕۆژێکیان لە شوێنێکی بەرزی گۆڕستانی "ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری"دا - خوای لێ ڕازیی بێت - کە بەسەر دۆڵێکی قووڵدا دەڕوانی، دانیشتبووم و سەرنجم لەو ئاسۆیانەی دەوروبەری ئەستەمبوڵ دەدا.

کتوپڕ دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆمم وا هاتە پێش‌چاو کە لە سەرەمەرگدا بێت! چونکە لە ئەندێشەمدا وام هەست دەکرد کە لە هەندێ لامەوە ڕۆحم دەکێشرێت! منیش لەبەر خۆمەوە وتم: ئایا بلێیت نووسراوی سەر ئەم کێلانە بۆ ئەم جۆرە ئەندێشانە هانیان دابێتم؟

ئەمەم وت و، ڕووی خۆمم لەو ئاسۆ دوورانە وەرچەرخاند و ڕوانیمە گۆڕستانەکە. لەم کاتەدا ئەم واتایە خرایە دڵمەوە کە:

"ئەم گۆڕستانەی چواردەورت سەد ئەستەمبوڵی تێدایە؛ چونکە سەد جار ئەستەمبوڵی تێدا ڕۆکراوە! دانستی خواوەندی بەتوانا و دانایش کە دانیشتووانی ئەستەمبوڵی لێرەدا خاڵی کردووەتەوە، هەرگیز تۆ لەوان جیا ناکاتەوە و دەبێ تۆش وەك ئەوان بڕۆیت و ئێرە بەجێ بهێڵیت"!

بەم خەیاڵە سامناکەوە گۆڕستانەکەم بەجێ هێشت و، ڕۆشتمە ناو ژوورێکی بچووك لە مزگەوتی "ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری"دا، کە پێشتر زۆر جار دەڕۆشتمە ناوی..

لەوێ بیرم لە خۆم کردەوە.. بۆم دەرکەوت کە من لە سێ لاوە میوانم. چونکە هەروەك لەم ژوورە بچکۆلەیەدا میوانم، بە هەمان جۆر لە ئەستەمبوڵیشدا، تەنانەت لە دنیاشدا میوانم و دەبێ بڕۆم و بەجێی بهێڵم! خۆ دیارە میوانیش دەبێ بیر لە ڕێگا و

سەفەری خۆی بکاتەوە و مشووری بۆ بخوات! بەڵێ هەروەك لەم ژوورە بچووکە دەڕۆمە دەرەوە و چۆڵی دەکەم، بە هەمان شێوە ڕۆژێکیش دێت کە لە ئەستەمبووڵ دەڕۆمە دەرەوە و بەجێی دەهێڵم، هەروەك دەبێ ڕۆژێك بێتە پێشەوە کە ئەم دنیایەش بەجێ بهێڵم!

خەفەت و ئازارێکی لێڵ و تەماوی لەم حاڵەدا خۆی هاویشتە سەر دڵ و بیر و ئەندێشەم! چونکە بێ گومان کە من کاتێك ئەستەمبووڵ بەجێ دەهێڵم تەنها لە ژمارەیەکی کەمی هاوڕێ و دۆست و خۆشەویستانم دانابڕێم، بەڵکو لە هەزاران دۆست و خۆشەویستی ئەستەمبووڵ دوور دەکەومەوە. تەنانەت کاتێ کە لەم دنیا جوانە دەردەچم، هەزاران بەڵکو سەدان هەزاریان لە دوای خۆم لێ بەجێ دەهێڵم!

بەم حاڵە و بەدەم خەفەتەوە جارێکی تر ڕۆشتمەوە بۆ هەمان شوێنی ناو گۆڕستانەکە. ئەم جارەیان دانیشتووانی ئەستەمبووڵم وەك چەندین تەرم هاتنە پێش چاو کە هەڵسابنە سەر پێ و بەڕێدا بڕۆن! بە وێنەی ئەو ئەکتەرانەی کە خۆیان مردوون، کەچی لە فیلمەکانی سینەمادا - چونکە بە نیازی وەرگرتنی پەند و عیبرەت جار بەجارێك دەڕۆشتمە سەیریان - دەردەکەون و دەجووڵێنەوە!

ئەندێشەم پێی وتم: مادەم هەندێك لەم تەرمانەی کە ئێستا لەم گۆڕستانەدا نوستوون، دەگونجێ وەك ئەکتەرەکانی سینەما دەربکەون و بجووڵێنەوە، کەواتە بیر لەو خەڵکانەش بکەرەوە کە دێنە ناو ئەم گۆڕستانە و هەر لە ئێستاوە وا دابنێ کە ڕۆشتوونەتە ناو گۆڕەکانیانەوە! کەواتە ئێستا هەموو ئەوانە تەرمن و دەجووڵێنەوە!

لەم کاتەدا کە من بەم خەفەت و بارە ئازاربەخشەوە دەتلامەوە، لە ناکاودا بەهۆی نووری قورئانی پیرۆز و، بە ڕابەریی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - نورێکی خۆش و بەتام و لەزەتم لە قورئانی پیرۆزەوە بە هاناوە هات کە ئەو حاڵەتە خەفەت بزوێنەی لەناو برد و، گەشاندمیەوە و، دڵی خۆش کردم. چونکە ئەو نوورەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە هات بە هانامەوە و لە ڕووی دڵمدا کرایەوە، ئەمانەی خوارەوەی یاد خستمەوە:

لە دەمی دیلیت لە کۆستڕما یەك دوو ئەفسەری دیلی هاوڕێت لەگەڵدا بوون و، بە دڵنیاییشەوە دەتزانی کە ڕۆژێك دێت هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئەستەمبووڵ.

خۆ ئەگەر ئەو کاتە یەکێکیان لێی بپرسیتایە:

" ئایا لێرە دەمێنیتەوە یان دەگەڕێیتەوە بۆ ئەستەمبووڵ"؟

بێ گومـان - ئەگـەر نـەختێك هـۆش و ژیریـت ببوایـە - بەوپـەڕی شـادمانی و خۆشحاڵییەوە ڕۆشتنەوەت بۆ ئەستەمبـووڵ هـەڵدەبژارد. چونکـە لـە نێوان هـەزار دۆست و خۆشەویست و هاوڕێدا نۆسەد و نـەوەد و نۆیـان لـەوێن، بـەڵام لـێرەدا مەگـەر یەك دوانێکیـانت لەگـەڵدا بن، کـە ئـەوانیش بـە دڵنیاییـەوە دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوێ. واتـە ڕۆشتنەوەت بۆ ئەستەمبووڵ هیچ نابێتە مایەی خەفەت و ئازار..

خۆ وا هاتیتەوە و، لە وڵاتی دوژمنان و شەوگارە دوور و درێژە ڕەش و تاریکەکانی و زستانە سارد و سـرەکەی ڕزگـارت بـوو و، گەیشـتیتەوە ئـەو ئەسـتەمبووڵە جـوان و خەملاوەی کە دەڵێی "بەهەشتی سـەر ڕووی زەوی"یە. ئایـا هێشتا بەمـە ڕازی نـابیت و شوکری خوای گەورەی لەسەر ناکەیت؟!

بە هەمان جۆر، لە سەدا نەوەد و نۆی خۆشەویستانی درێژایی تەمەنیشـت، هـەر لـە منالیتەوە تا ئێستا، کۆچیان بۆ ئەو گۆڕستانە کردووە کە بە ڕواڵەت ترسناك دیـارە. خۆ ئەگەر یەك دوانێکیان لە دنیادا مابن، ئەوانیش لـە ڕۆشتندان بـۆ ئـەوێ. کەواتـە مردنـت جودایی و لێکدابڕان نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا پێ شادبوون و بەیەك گەیشـتنەوەیە لەگـەڵ ئەو خۆشەویستانەتدا..

بەڵێ، "گیان"ی نەمری ئەوان هەندێکیان هێلانە ڕووخاوەکەی ژێر زەوییـان بـەجێ هێشتووە و لە گەشتی ناو ئەستێرەکاندان و، هەندێکی تریشیان لە ناو چینەکانی جیهانی بەرزەخدا دەژین.

بەم جۆرە ئەو نوورەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە هـات بـە هانامـەوە و لـە ڕووی دڵمـدا کرایەوە، ئەمانەی سەرەوەی یاد خستمەوە.

"قورئـان" و "ئیمـان" ئـەم ڕاسـتییەیان بـە جۆرێکـی هێنـدە بـەهێز و گومـانبڕ چەسپاندووە کـە ئەگـەر کەسێك "دڵ" و "گیـان"ی خـۆی لەدەسـت نـەدابێت، یـاخود نوقمی گومڕایـی نـەبووبێت، وەك بـە چـاو ببینێـت ئـاوا بـاوەڕ بـەم ڕاستییە دەهێنێـت و هەستی پێ دەکات..

چونکــە ئــەو خوایــەی کــە بــۆ ئاشــکرا کردنــی کــەرەم و میــهرەبانیی پەروەردگاریتی‌یەکەی، ئەم جیهانەی بە لوتف و سۆزی خۆی و نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی ڕازاندووەتەوە و، پارێزگاریی هەموو شتێکی بوونەوەر تەنانەت شتە بچووکە هەندەکی‌یەکانی وەك تۆوی ڕووەك و درەختەکانیش دەکات..

ئاشکرایە ئەم بەدیهێنەرە میهرەبان و بەخشندەیە، نایەوێت ئەو مرۆڤەی کە ڕێکوپێکترین و ڕێزلێگیراوترین و گرنگترین و خۆشەویستترینی بەدیهێنراوانیەتی، هەروا بە بێ دوارۆژ و بێ بەزەییانە لەناو ببات و بە لە ناوبردنی هەمیشەیی بیفەوتێنێت - وەك لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت - بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ هەروەك چۆن جووتیار تۆوی دەغڵ و دان لە زەویدا دەچێنێت تاکو لە شێوەی ژیانێکی تری وەك گوڵە گەنمدا دروست بکرێتەوە، خواوەندی میهرەبانیش کە مرۆڤ بۆ ماوەیەکی کەم دەخاتە ژێر خاکی دەروازەی چوونە ژوورەوەی جیهانی پڕ لە میهرەبانی و بەزەییەوە، بۆ ئەوەیە کە لە ژیانی دوارۆژدا ئەو مرۆڤە بەروبوومی خۆی ببەخشێت.

پاش ئەوەی کە ئەم ئاگاداری‌یەم لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگرت، لە ئەستەمبووڵ زیاتر دڵم بەو گۆڕستانە دەکرایەوە و، گۆشەگیری و تەنیاییشم لە تێکەڵاویی خەڵکی گەلێ پێ خۆشتر بوو!

هەر ئەمەش بوو کە هانی دام جێگایەك بۆ گۆشەگیری بدۆزمەوە لە "صاری یەر"دا کە بەرزاییەکە بەسەر دەربەندی "بسفۆر"دا دەڕوانێت. ئیتر بۆ خۆم لەوێ دادەنیشتم و، شێخی گەیلانی - خوای لێ ڕازی بێت - لە ڕێی کتێبی "فتوح الغیب"ەوە بوو بە مامۆستا و پزیشك و ڕابەرم و، "ئیمامی ڕەببانی"یش- خوای لێ ڕازی بێت - بەهۆی "مەکتوبات"ەکەیەوە بوو بە مامۆستایەکی دڵدەرەوەی بەسۆزم.

بەم جۆرە، منەتباری و ڕەزامەندی‌یەکی تەواوم بە پیری و دوورکەوتنەوەم لە ڕابواردن و چێژە شارستانێتی‌یەکان و خۆکشانەوەم لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەربڕی و، شوکرانەبژێری‌یەکی زۆرم لە دەرگانەی خوای گەورەدا پێشکەش کرد[1].

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٧٣-٤٧٦.

□ قەیرانێکی ڕۆحیی سەخت

(لـە سـاڵی "١٣٣٩ك"دا بـە قـەیرانێکی ڕۆحیـی سـەخت و دژواردا تێپـەڕیم و، نیگەرانی‌یەکی ترسناك و پشێوی‌یەکی فیکریی مەترسیدار هاتە ڕێم. لـەو کاتـەدا زۆر بـە توندی هانام بـۆ لای شـێخی گـەیلانی برد، ئەویش بـە هیممـەتی خۆی و کتێبـی "فتـوح الغیب"ەکەی فریام کەوت. بە ڕادەیەکی وا کە ئەو نیگەرانی و پشێوی‌یەم تێپەڕاند)[1].

□ یەکخستنی قیبلە لە "قورئان"دایە!

(سی ساڵ پێش ئێستا چەند زللەیەکی توند و بەهێز لـە سەر و گوێلاکـی "سـەعیدی کۆن"ی بێ ئاگا وەشێنران. ناچار بیری لە کێشەی "مردن ڕاست و ڕەوایـە" کـردەوە و، بینیی کە سەرتاپا لەناو قوڕ و لیتاودا نوقم بووە..

لە تاوا هاواری فریاگوزاریی لـێ هەڵسا و بە دوای ڕێگـای دەربـازبوون و کەسێکی فریاگوزاردا دەگەڕا کە دەستی بگرێت و لەو بارە پەرێشانە ڕزگـاری بکـات. ئنجا ئـەو ڕێگایانەش کە بۆ ئەم مەبەستە دۆزینیەوە لەناو خۆیاندا جیاجیا و جۆراوجۆر بوون!

بۆیە سەرسام ما و لە تاوا دەستی دایـە کتێبـی "فتـوح الغیـب"ی شـێخ عـەبدولقادری گـەیلانی – خـوای لـێ ڕازی بێـت – و بـە گەشبینی‌یەوە کردیـەوە. یەکسـەر ئـەم دەستەواژەیەی تێدا بەدی کرد کە دەفەرموێ:

"أنت في دار الحکمة فاطلبْ طبيباً يداوي قلبك"[2]!

ئەمـەم زۆر بـەلاوە سـەیر بـوو! چونکـە مـن ئـەو کاتـە لـە دەزگـای "دار الحکمـة الإسلامیة"دا ئەندام بـووم! وەك بڵێـی بـۆ ئـەوە هاتبمـە نـاو ئـەم دەزگایـەوە کـە زامـەکانی نەتەوەی ئیسـلام سـاڕێژ و چارەسـەر بکەم، کەچی خۆم لـە هـەموو کەسـێك نەخۆشتر بووم و زیاتر پێویستم بە دەرمان و چارەسەر هەبوو! خۆ دیارە دەبێ مرۆڤی نـەخۆش پێـش هەموو کەسێکی تر مشووری خۆی بخوات و چارەسەری خۆی بکات.

(١) بریسکەکان، بریسکەی هەشتەم.

(٢) دەقی ئەو دەستەواژەیە بەم جۆرەیە: "يا عباد الله! أنتم في دار الحکمة، لابد من الواسطة، اطلبـوا مـن معبودکم طبيباً يطب أمراض قلوبکم، مداوياً يداويکم". بڕوانە: "المجلس الثاني والستـون" ص٣٠٦ ط دار الکتاب العربي. لە کتێبی: (الفتح الرباني)ی شێخی گەیلانی کە لە چاپە پێشووەکاندا لەگەڵ کتێبی (فتـوح الغيب)دا پێکەوە و بەم ناوەی دووهەم چاپ دەکران.

بەڵێ، شێخ پێی وتم: تۆ نەخۆشیت.. پزیشکێك پەیدا بکە با چارەسەرت بکات!

وتم: ئەی شێخی بەڕێزم! تۆ ببە بە پزیشکم.

ئیتر دەستم دایە خوێندنەوەی ئەو کتێبە بە چەشنێك کە وا بزانم رووی گوفتاری راستەوخۆ ئاراستەی من دەکات.. لە ڕاستیدا شێوازی گوفتاری کتێبەکە زۆر توندوتیژ بوو، غروور و لەخۆبایی بوونی منی تێکدەشکاند و، گەلێ نەشتەرگەریی قووڵی لەناو دەروونمدا ئەنجام دا. بۆیە توانای بەردەوام بوونم تێدا نەما و بڕستم لێ بڕا. چونکە بەو چاوە دەمڕوانییە گوفتارەکانی کە ئاراستەی منیان دەکات..

بەڵێ، بەم چەشنە هەتا نزیکەی ناوەڕاستی ئەو کتێبەم خوێندەوە، بەڵام نەمتوانی چیی تر لەسەری بەردەوام بم و تەواوی بکەم. بۆیە کتێبەکەم خستەوە جێی خۆی.. کەچی پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك هەستم کرد ئازارەکانی ئەو نەشتەرگەری و زامانە کۆتاییان پێ هاتووە و، چەندین چێژ و لەزەتی سەیر و سەرسووڕهێنی ڕۆحییان لە شوێندا بەجێ ماوە! ئنجا گەڕامەوە سەری و، خوێندنەوەی کتێبەکەی مامۆستای یەکەمم تەواو کرد و، گەلێ سوودی مەزنم لێ دەست کەوت و، چەند کاتێکی دوور و درێژخایەنم لەگەڵدا بردە سەر کە تیایاندا گوێم لە ویرد و موناجاتە نەرم و خاوێنەکانی ئەو مامۆستایەم دەگرت.

پاشان کتێبی "مەکتووبات"م کەوتە دەست، کە هی "ئیمامی ئەحمەدی فارووقیی سەرهەندی"[1]ی نوێکاری هەزارەی دووهەمە.

بە نیازی خێر و گەشبینییەکی خاوێنەوە دەستم دایێ و کردمەوە.. یەکسەر شتێکی سەیرم تێدا بینی! چونکە لە دوو نامەی ئەو کتێبەدا وشەی "میرزا بەدیعوززەمان" بەکار هاتبوو! منیش وام هەست کرد کە لەگەڵ منی بێت و بە ناوی خۆمەوە بانگم بکات، چونکە باوکم ناوی "میرزا" بوو، هەردوو نامەکەش ئاراستەی "میرزا بەدیعوززەمان" ناوێك کرابوون!

---

(١) ئیمامی ڕەببانی: ئەحمەدی کوڕی عەبدولئەحەدی فارووقی (٩٧١-١٠٣٤ ك) خەڵکی هیندستانە. نوێکاری ئایین بووە لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی کۆچیدا. زانایەکی یەکجار بە توانا و خاوەنی دەروونێکی پاك و ئیخلاصێکی کەم وێنە و ڕۆحێکی پەروەردەکراو بووە لە بەندایەتیدا بۆ خوای گەورە. ڕووبەڕووی ئەو ئاشووبە ڕاوەستا کە لە هیندستان بۆ لەناوبردنی ئیسلام هەڵگیرسا و، توانیی دەوڵەت بگێڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام. چەند بەرهەمێکی بەجێ هێشتووە، بەناوبانگەکەیان "مەکتووبات"ە. (وەرگێڕ)

لەبەر خۆمەوە وتم: سبحان الله! ئەم نامەیە ڕاستەوخۆ لەگەڵ منیەتی!

چونکە سەعیدی کۆن بە نازناوی "بەدیعوززەمان" ناسرابوو. خۆ هەرچەندە جگە لە "هەمەدانی" - کە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە - کەسێکی ترم شك نەدەبرد بەم نازناوە بەناوبانگ بوو بێت، کەچی ئەم نامەیە ئەوەی دەگەیاند کە دەبێ کەسێکی تری غەیری "هەمەدانی" هاوسەردەمی ئیمامی ڕەببانیی سەرهەندی بوو بێت و، بەم نازناوە نامەکەی ئاراستە کرابێت. دەشبێت حاڵەتەکەی ئەو وەك هی من وا بوو بێت، چونکە دەرمانی دەردەکەی خۆمم لەو دوو نامەیەدا دەست کەوت!

ئیمامی ڕەببانی لەو دوو نامەیە و چەند نامەیەکی تردا ئامۆژگاریی ئەوەی دەکات کە: "قیبلەی ڕوو تێکردنت بکە بە یەك"[١]. واتە شوێن یەك پێشەوا و ڕابەر بکەوە و، بە غەیری ئەو ڕابەرەوە سەرقاڵ مەبە!

لە ڕاستیدا ئەم ئامۆژگارییە لەگەڵ ئامادەیی و باری ڕۆحیی ئەو کاتەمدا یەك نەدەکەوت. چونکە بیرم کردەوە لەوەی کە ئایا شوێن کامیان بکەوم؟ لە پشت سەری ئەمیانەوە بڕۆم یان ئەو؟

لە ڕاستیدا گەلێ سەرسام بووم و نەمدەزانی کامیان هەڵبژێرم. سەرسامییەکەشم زۆر خەست و چڕ بوو، چونکە هەریەکەیان تایبەتکاری و جازیبییەتی خۆی هەبوو. بۆیە نەمتوانی یەکێکیان هەڵبژێرم و دەست لەوی تریان هەڵبگرم!

کاتێ من لەم سەرسامی و حەپەسانە خەست و چڕەدا دەتلامەوە، ختوورەیەکی ڕەحمانیم بە دڵدا هات کە پێی وتم:

سەرەتای سەرجەمی ئەم ڕێگایانە و.. سەرچاوەی ئەم هەموو جۆگەلانە و.. خۆری درەخشانی گشت ئەم هەسارە گەڕۆکانە، تەنها هەر قورئانی پیرۆزە. کەواتە یەکخستنی ڕاستەقینەی "قیبلە" لە شوێنکەوتنی "قورئانی پیرۆز"دایە. چونکە قورئانی پیرۆز بەرزترین ڕابەر و خاوێنترین مامۆستایە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕووم کردە قورئان و، دەستم پێوە گرت و، یارمەتی و فریاگوزاریم تەنها لە قورئان وەرگرت.

---

(١) بڕوانە: "مكتوبات الإمام الرباني"، المكتوب الخامس والسبعون ١/٨٧، لە چاپە عەرەبییەکەی (دار الكتب العلمية، لبنان)؛ یان ١/٢٢١ لە چاپە فارسییە تازەکەی (انتشارات صديقي، زاهدان). (وەرگێڕ)

خۆ توانا و لێهاتنی پەرێشان و ناتەواوی من گەلێ لەوە دەستەوسان و کۆتاترە کە بتوانێت – وەك پێویست – لە ڕێژنەی بەخوڕەمی ئەو ڕابەرە حەقیقی‌یە بنۆشێت، کە وەك کانیاوێکی سەلسەبیل و ئاوی حەیات و ژیانبەخش وایە. بەڵام بە فەزڵی خودی ڕێژنەی قورئان دەتوانین ئەو ڕێژنە و سەلسەبیلە بۆ کەسانی "ئەهلی دڵ" و "خاوەنی حاڵ" و، هەریەکەیان بەپێی پلەی خۆی، ڕوون بکەینەوە.

کەواتە "وتەکان" و ئەو ڕووناکی‌یانەش کە لە قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون [ واتە پەیامەکانی نوور ] تەنها چەند مەسەلەیەکی "زانستی" و "عەقڵی" نین، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا بریتین لە چەند مەسەلەیەکی "قەلبی" و "ڕۆحی" و چەند حاڵەتێکی "ئیمانی". واتە وەك چەند زانستێکی بەرز و بەنرخی خوایی و پەروەردگاری وان)[1].

☐ هەنگاونان بەرەو "سەعیدی نوێ"

(لە ئەستەمبوڵ و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ڕووداوێکی میسالیم دی. ئەو کاتە من هێشتا "سەعیدی کۆن" و سەرقاڵی فەلسەفە بووم و، لەوەدا بووم بگۆڕێم بە "سەعیدی نوێ".

لەو کاتەدا سەرنجم لەو سێ ڕێبازەی کۆتایی سوورەتی "فاتیحە" دا کە بە: ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمِ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ ئاماژەیان بۆ کراوە..

لەم سەرنجدانەوە، ئەو ڕووداوە ئەندێشەییەم دی کە زۆر لە "خەون" دەچوو، کاتی خۆیشی لە کتێبی "چەند بریسکانەوەیەك"دا لە شێوەی گەشتێکی ئەندێشەییدا و بە پەخشانێکی لەشیعرچوو تۆمارم کرد. وا ئێستا کاتی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی هاتووە، چونکە تیشکی ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو ڕاستی‌یە ناوبراوە:

خۆمم لە ناوەڕاستی دەشتاییەکی گەلێ گەورە و فراواندا بینی‌یەوە و، هەوری تاریك و ڕەش ڕووی ئاسمانی داپۆشیبوو، هەموو شوێنێکی سەر زەوی تەنگەنەفەسیی تێدا زاڵ بوو، بە ئاسانی هەناسە نەدەدرا و وەخت بوو مرۆڤی تێدا بخنکێت. نە سروەیەك هەبوو، نە ڕووناکی‌یەك، نە ئاوێك.. وام گومان دەبرد کە سەرزەوی لە دڕندە و ئاژەڵی زیانبەخش پڕ بووە..

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٥٩٥-٥٩٨.

لەو کاتەدا ئەوەم بە دڵدا هات کە ڕووەکەی تری زەوی سروەیەکی فێنك و ئاوێکی سازگار و ڕووناکی‌یەکی گەلێ جوانی لێ‌یە. کەواتە چار نی‌یە دەبێت بڕۆم بۆ ئەو لایەی کە ئەمانەی تێدان.. پاشان خۆم وا بینی‌یەوە کە بە ویستی خۆم بۆ ئەوێ دەڕۆم..

ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتێکەوە لەناو زەویدا کە لە تونێلی ناو چیاکان دەچوو، ڕێم گرتەبەر و ڕۆشتم. دەمبینی پێش من کەسانی زۆری تر بەم ڕێگایەی ژێر زەویدا گوزەریان کردووە، بەڵام بێ ئەوەی ڕۆشتنەکەیان تەواو بکەن، لە پەلوپۆ کەوتوون و لە جێی خۆیاندا هەناسەیان سوار بووە و خنکاون، چونکە جێ پێ‌یانم دەبینی و جار بە جاریش دەنگی هەندێکیانم دەهاتە گوێ، بەڵام هێندەی نەدەخایاند ئەو دەنگەش دەبڕا و کپ دەبوو.

دەسا ئەی ئەو هاوڕێیەی کە ئەویش بە ئەندێشەی خۆی لەم گەشتە ئەندێشەییەدا بەشداریم دەکات!

ئەو زەوی‌یە: "سروشت" و "فەلسەفەی سروشتی‌یە"..

تونێلەکەش: ئەو ڕێبازەیە کە ڕێڕەوانی فەلسەفە بۆ مەبەستی گەیشتن بە "ڕاستی" بە بیری خۆیان بڕیویانە..

جێ پێ کانیش جێ پێی فەیلەسووفە بەناوبانگەکانی وەك: "ئەفلاتوون" و "ئەرستۆ"ن[(١)]..

ئەو دەنگانەش کە دەهاتنە گوێم: هی بلیمەت و مرۆڤە زیرەکەکانی چەشنی "ئیبن سینا" و "فارابی" بوون..

---

(١) ئەگەر دەڵێیت: جا تۆ چییت تاکو زۆران لەگەڵ ئەو مرۆڤە بەناوبانگانەدا بگریت؟ ئایا وەك مێشێکیش دەبیت تاکو لەگەڵ ئەو هەڵۆیانەدا بفڕیت؟

منیش دەڵێم: مادەم مامۆستایەکی ئەزەلیم هەیە کە قورئانی پیرۆزە، ئەوا لە ڕێی گەیشتندا بە "ڕاستی و زانست" بە ئەندازەی باڵە مێشێکیش خۆم بە ناچار نازانم بایەخ بەو هەڵۆیانە بدەم کە قوتابیی ئەو فەلسەفەیەن بە گومڕایی چەپەڵ بووە و، شوێنکەوتەی ئەو ژیری‌یەن کە دووچاری دەردی گومانە.. کەواتە هەرچەندە پلەم لەوانە نزمتر بێت، بەڵام مامۆستاکانی ئەوان بە چەندین پلەی لەژمارەبەدەر لە خوارووی مامۆستاکەی منەوەن. بە سایەی مامۆستاکەمەوە، ئەو ماددەیەی کە ئەوانی بە تەواوی لە خۆیدا نوقم کرد، نەیتوانی بنی پێیشم تەڕ بکات! بەڵێ، سەربازێك کە فەرمانی پادشایەکی مەزنی پێ بێت، دەتوانێت کاری وا ئەنجام بدات کە "موشیرێك" لای پادشایەکی بچووك هەرگیز نەتوانێت ئەنجامی بدات. (دانەر)

بەڵێ، هەندێ "وتـە" و "یاسـا"ی "ئیبن سینا"م لـە هـەندێ جێدا دەبیست، بـەڵام بـە تـەواوی ئـەو دەنگانـە دەپچـڕان و نـەدەمان و نـەیاندەتوانی پتر بـەرەو پێـش بـڕۆن، واتـە دەخنکان!

بە هەر حاڵ، وا من هەندێ لەو ڕاسـتییانەم بـۆ ڕوون کردیتـەوە کـە لـە ژێـر پـەردەی ئەندێشـە کەمدان، تـاکو هـەندێ تاسـەمەندیی چـاوەڕوانی کردنت لەسـەر شـان سـووك بکەم..

وا ئێستاش بۆ باسی گەشتە ئەندێشەییە کەم دەگەڕێمەوە:

کاتێ من لە ڕۆشتندا بەردەوام بووم، کتوپڕ دوو شتم هاتنە دەست:

یەکەمیان:

گڵۆپێکی کارەبایی بوو کە تاریکیی چڕ و ئەستووری ژێر زەویی دەڕەواندەوە.

دووهـەمیـان:

ئـامێرێکی مەزن بـوو، بـەردی گـەورە گـەورەی وەك چیاکـانی لەتوپـەت دەکـرد و ڕێی بۆ دەکردمەوە.

لـەو کاتـەدا ئـەوەم بـە گوێـدا درا کـە: ئـەم چـرا و ئـامێرەت لـە گەنجینـەی قورئـانی پیرۆزەوە پێ بەخشراوە.

بەم چەشنە، ماوەیەك ڕۆشتم تاکو گەیشتمە دیوەکەی تر. دەبینم لەوێ، لە ئاسمانێکی سافی بێ هـەوری سامـاڵ و جـواندا خـۆر هەڵهـاتووە و، ڕۆژیش بەهارێکی خۆشی سـەفا بەخشـە و، سـروەی هـەوایش وەك گیـانی بـە بـەردا کرابێـت هـەڵی دەکـرد و، ئـاوی سازگاریش لە کانیاوەکانـەوە بە خوڕ دەهاتە خوارێ..

بـە کورتـی: جیـهانێکم دی کـە بـە خۆشـی و شـادی و کامـەرانی خـەمڵابوو. منیـش سوپاس و شوکرانەی زۆرم پێشکەشی خوای گەورەی خۆم کرد.

پاشـان سـەیری خۆمـم کـرد.. بینیـم خـاوەنی خـۆم نیـم و، نـاتوانم بەسـەر دەروون و خودی خۆمدا زاڵ و سەرکەوتوو بم و، یەکێك هەیە تاقیم دەکاتەوە..

کتوپڕ جـارێکی تـر خـۆم لـەو دەشـتاییە بەرینـەدا بینییـەوە و، دیسـان هـەوری ڕەشـی تاریك ڕووی ئاسمانی داپۆشی و، دنیا تاریك داهات و، لـە تەنگـە نەفەسیدا وەخـت بـوو هەناسەم بۆ نەدرێت.

وام هەست دەکرد کەسێك هەیە بۆ ڕێیەکی ترم دەبات، چونکە بینیم ئەم جارەیان لەسەر ڕووی زەوی بۆ لاکەی تری دەڕۆم نەك لەناو تونێلەکەوە.

لەم ڕۆشتنەی ئەم جارەمدا شتی گەلێ سەیر و دیمەنی سامناکی زۆر ناوازەم دی کە هەرگیز باس ناکرێن.. دەمبینی دەریا ڕقی لێم هەڵساوە و زریان دەیترساندم و هەموو شتێك تەگەرەی دەهێنایە ڕێم، بەڵام ئەو تەگەرە و قورساییانەم بە سایەی ئەو هۆی گەشتەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە پێم بەخشرابوو، لەسەر ڕێ بۆ لا دەبرا و کارم بۆ ئاسان دەکرا..

بەردەوام هەنگاوم دەنا و، ڕێم دەبڕی و، تەرمی گەشتیارانم لەم لا و لەو لای ڕێگادا دەبینی کە یەك لە هەزاری گەشتیاران نەبێ کەسی تر ئەو گەشتەیان تەواو نەکردبوو!

هەرچۆن بوو لە تاریکیی ئەو هەورە چڕانەی کە وەخت بوو مرۆڤ بخنکێنن، ڕزگارم بوو و، گەیشتمە لاکەی تری زەوی و، ڕووبەڕووی خۆری ڕاستەقینە بوومەوە و، هەناسەیەکی فێنك و خۆشی ئاسوودەم هەڵکێشا و، دەستم بە گەشت و گەڕان کرد لەو جیهانەدا کە وەك بەهەشت وابوو.

ئیتر سوپاسی خوای گەورەم کرد و، وتم: "الحمد لله".

پاشان دەبینم نایەڵن لێرەشدا بمێنمەوە، چونکە یەکێك هەیە دەیەوێت ڕێیەکی ترم پیشان بدات. لەبەر ئەوە، یەکسەر بردمیەوە دۆخی یەکەم جار بۆ دەشتاییە بەرینەکەی یەکەم.

سەیرم کرد چەندین شتی چەشنی پلیکانەی کارەبایی لە بەرزایی ئاسمانەوە دادەبەزنە خوارەوە و هەریەکەیان شێوە و جۆریان لەوانی تر جیاوازە، هەندێکیان لە فڕۆکە دەچوون و هەندێکی تریان لە ئۆتۆمبیل و هەندێکی تریش وەك زەمبیلە شۆڕ کرابوونەوە. ئنجا هەر کەسێك بەپێی هێز و توانای خۆی بتوانێت دەست بە یەکێك لەوانەوە بگرێت ئەوا سەردەخرێت و لەوێ ڕزگاری دەبێت.

منیش سواری یەکێك لەو هۆکارانە بووم. دەبینم لە ماوەی یەك خولەکدا لە سەرووی هەور و لەسەر چەندین چیای سەوز و جوان و ڕەنگیندام، تەنانەت ئەو چیایانە ئەوەندە بەرزن کە هەورەکان ناگەنە نیوەیان و، لە هەموو جێگایەکەوە جوانترین ڕووناکی و ناسکترین سروە و سازگارترین ئاو دەبینران و هەستیان پێ دەکرا..

که به جوانی تەماشای هەموو لایەکم کرد، بینیم ئەو مەنزڵگا نوورانییانەی کە وەك پلیکانە وان، لە هەموو شوێنێکدا هەن. لە دوو گەشتەکەی ترم لە ڕووەکەی تری زەویدا شتی وەك ئەمانەم دەبینی، بەڵام هیچم لە بارەیانەوە نەدەزانی، وا ئێستا تێدەگەم کە ئەو مەنزڵگایانە هی درەوشانەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن. جا:

*ڕێی یەکەم:* هی گومڕایانە، کە بە: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ﴾ ئاماژەیان بۆ کراوە و، ڕێبازی ئەوانەیە کە بەرەو چەمکی "سروشت"ێیان خلیسکاوە و بیری سروشتییەکانیان هەڵگرتووە. دیارە ئێوەش هەستتان کرد و بۆتان دەرکەوت کە گەیشتن بە "ڕاستی" بەهۆی بڕینی ئەم ڕێگایەوە چەندە کارێکی دژوار و پڕ لە گیروگرفتە.

*ڕێی دووهەمیش:* کە بە: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾ ئاماژەی بۆ کراوە، ڕێبازی هۆپەرستان و ئەوانەیە کە "بەدیهێنان" دەگێڕنەوە بۆ هۆکارەکان و کاریگەرییان دەدەنێ و، دەیانەوێت وەك دانایانی فەلسەفەی گەڕۆکایەتی (الحكماء المشائيون) تەنها لە ڕێی "بیر" و "ژیری"یەوە بگەن بە ڕاستیی هەموو ڕاستییەکان و ناسینی خوای گەورە.

*بەڵام ڕێی سێهەم:* کە بە: ﴿أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ ئاماژەی بۆ کراوە، ڕێی ڕاست و نوورانیی شوێنکەوتوانی قورئانە و، کورتترین و بێ مەترسیترین و ئاسانترین ڕێیە و، لە بەردەم هەموو خەڵکیدا کراوەتەوە تاکو بیگرنە بەر و، ڕێگایەکی ئاسمانی و ڕەحمانی و نوورانییە)[1]!

□ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ چرای ڕێنماییە

(لەو ڕێ تاریکەی کە لە گەشتی ناو تاریکستاندا بڕیم، سوننەتە پیرۆزەکانم وەك ئەستێرە و چرا دەبینین. دەمبینی هەریەك لە سوننەتەکان و هەریەك لە بڕیار و فەرمانەکانی شەرع لە نێوان ڕێ تاریك و سەر لێ شێوێنە لەژمارەبەدەرەکاندا دەدرەوشێنەوە و، بە لادانیش لە سوننەت دەمبینی مرۆڤ دەبێت بە گاڵتەجاڕی شەیتان و، مەڵبەندی وەهم و، کۆگای تەنگانەکان و، هەڵگری چەندین باری قورسی چەشنی چیاکان، گەر شوێنی سوننەت بکەوتایە هەموو ئەمانەی لە کۆڵ دەبوونەوە.

(١) وتەکان، وتەی سیهەم، ل: ٨١٤-٨١٧.

سونەتەکانم وەك چەندین پەت دەبینی بە ئاسماندا شۆڕ بووبێتنەوە، هەر کەسێ دەست بە شتێکیەوە - با هەندەکیش بێت - بگرێت، خۆی سەردەخات و بەختەوەریش بەدەست دەهێنێت.

هەروەها بە چاوی خۆم بینیم کە ئەو کەسەی ڕەفتاری بە پێچەوانەی سونەتە و پشت بەو ژیرییە دەبەستێت کە لە نێوان خەڵکدا باوە، وەك ئەوەی بیەوێت لە ڕێی هۆکارەکانی زەوییەوە بە هۆکارەکانی ئاسمانەکان بگات، بە چەشنی فیرعەونی لێ دێت و عەقڵی دەدۆڕێنێت، لەوەدا کە وتی:

﴿یا هامانُ ابنِ لي صرحاً﴾ (غافر:٣٦)..)[1]!

(کاتێ ئەم "سەعید"ە هەزارەی دەرگانەی خوا تێدەکۆشا لە دۆخی "سەعیدی کۆن" دەربچێت، دڵ و ژیریم لە بەرامبەر زریانێکی مەعنەویی سامناك و لە ناوەندی ڕاستییەکاندا لەرزەیان پێ کەوت و تلۆر بوونەوە..

چونکە لەو کاتەدا وا هەستم دەکرد کە وەك بڵێی دڵ و ژیریم تاوێك لە ئاسمانەوە دەکەونە خوارەوە بەرەو زەوی و تاوێکی تریش لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە! بەهۆی ئەوەی کە لە لایەکەوە کەس ڕابەرم نەبوو، لە لایەکی تریشەوە دەروونی بەدخوازم لە خۆی بایی بووبوو..

جا لەو کاتەدا کە من لەم دابەزین و بەرزبوونەوەیەدا بووم، هەریەك لە سونەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ و، ڕەچاو کردنی ئاسایی‌ترین ڕەویەی ئەوم وەك قیبلەنمایەك بینی کە ڕووکاری کەشتییەکانی ناو دەریا دەستنیشان دەکات و، دەمبینی کە هەریەکەیان وەك چرایەك وایە چەندین ڕێی تاریك و زیانبەخشی لەژمارەبەدەر ڕووناك دەکاتەوە.

کاتێ لەو گەشتە ڕۆحییەمدا لە ژێر پاڵەپەستۆی چەندین گوشار و کۆڵی گەورە و قورسدا ماندوو دەبووم، هەتا شوێن ئەو مەسەلانەی سونەتی پیرۆز دەکەوتم کە پەیوەندییان بەو بارە ڕۆحییەمەوە هەبوو، هەستم بە لەش سووکی دەکرد. وەك ئەوەی سونەتی پیرۆز کۆڵە قورسەکانم بۆ هەڵبگرێت و، ئەرکەکانی سەرشانم لە کۆڵ بکاتەوە!

---

(١) مەسنەویی نووری، دڵۆپێك لە دەریای تەوحید، پاشکۆ.

ئیتر بەم چەشنە و بە خۆتەسلیم کردنی تەواوەتیم بۆ سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، لە پەژارەی وەسوەسە و دوو دڵیی وەك: "ئایا ئەم کارە بەرژەوەندیی تێدایە یان نا؟ کارێکی ڕەوایە یان نا؟" ڕزگارم دەبوو.

ئنجا هەرکات دەستم لە سوننەت هەڵدەگرت، یەکسەر شەپۆلی گیروگرفتەکان زیاد دەبوون و، ڕێگا نەزانراوەکانیش زیاتر سەخت و پڕ لە هەڵەت و تەماوی و، کۆڵەکانیش پتر قورس دەبوون..

لە کاتێکدا کە من لەوپەڕی کۆڵەواری و کورتبینیدا بووم و ڕێگاش تاریك داهاتبوو..

بەڵام هەر ئەوەندەی دەستم بە سوننەتەوە دەگرت و شوێنی دەکەوتمەوە، هەستم دەکرد کە یەکسەر ڕێگام لە بەردەمدا ڕووناك دەبووەوە و، ئارامی و ئاسایشی تێدا دەبینرا و کۆڵەکانیش سووك دەبوون و، کۆسپ و تەگەرەکانیش نەدەمان.

بەڵێ، لەو ماوەیەی ژیانمدا ئەو دیاردەیەم بەو جۆرە بینی، ئیتر بەو هەستکردن و بینینەی خۆم تەسدیقی بڕیار و فەرمایشتەکەی ئیمامی ڕەببانیم کرد[1]، لەوەدا کە دەفەرموێ:

"ئەو کاتانەی کە پلەکانی سەیر و سلووکی ڕووحیم دەبڕی، دەمبینی گەشاوەترین و بەرزترین و ناسکترین و هێمن و ئارامترینی چینەکانی ئەولیا، ئەوانەن کە شوێنکەوتنی سوننەتی پیرۆزیان کردووە بە بناغەی تەریقەتەکانیان. تەنانەت وەلیە عەوامەکانی ئەو چینە، گەلێ جوانتر و بەڕێزتر دەبینران لە چاو ئەولیایانی تایبەتیی چینەکانی تردا"[2].

(بەڵێ، ئیمامی ڕەببانیی نوێکاری هەزارەی دووهەم - خوا لێی ڕازی بێت - ڕاستی فەرمووە. چونکە ئەو کەسەی دەست بە سوننەتی پیرۆزەوە دەگرێت و دەیکات بە بناغەی کارەکانی، شایانی پلەی "مەحبووبییەت"ە[3] لە ژێر سایەی پێغەمبەری خۆشەویستی خوادا ﷺ)[4].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی یازدەهەم، ل: ١٠٢-١٠٣.

(٢) لە چەندین شوێنی مەکتووباتی ئیمامی ڕەببانیدا جەخت لە شوێنکەوتنی سوننەت کراوەتەوە. (وەرگێڕ)

(٣) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: ﴿قُلْ إِنْ كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ (آل عمران:٣١). (وەرگێڕ)

(٤) بریسکەکان، بریسکەی یازدەهەم، ل: ١٠٢.

❐ بە ڕێگایەکدا ڕۆشتم لە نێوان "دڵ" و "ژیری"دا کە پێشتر نەگیرابووەبەر!

(هەندێ جار "ژیری"م دەبێتە هاوڕێی "دڵ"م لە دەمی گەشتەکەیدا، ئیتر ئەوەی "دڵ" لەو گەشتەدا بە چێژ دەیبینێت دەیداتە دەستی "ژیری". ئەویش بە پێی نەریتی خۆی، لە شێوەی نموونەیەکدا پێش چاوی دەخات کە بەڵگە پشتی گرتبێت)[1].

[ لە پێشەکیی هەندێ لە دانراوەکانی ئەم ماوەیەی ژیانیدا، ئەمانەی خوارەوەی تۆمار کردووە ]:

(ئەم پەیامە چەند گفتوگۆیەکی کتوپڕین لەگەڵ دەروونی خۆم لە کاتێکی سەرسووڕهێنەردا و، وتەکانیش لە دەمی وتووێژێکی هێندە گەورەدا لەدایك بوون کە وەك زریانێکی ئەوتۆ بوون ڕووناکی و ئاگرەکان ململانێیان تێدا دەکرد و.. لە یەك ساتدا سەرم لە لوتکەی بەرزاییەکانەوە بەرەو خواری خوارەوە بەردەبووەوە و، لە خواری خوارەوەش بەرەو لوتکەی سەرەوە سەردەکەوت و بەرز دەبووەوە؛ چونکە ڕێگایەکم لە نێوان "ژیری" و "دڵ"دا گرتبووەبەر کە پێشتر نەگیرابووەبەر و، ژیریم لە حەپەساویی ئەو بەربوونەوە و بەرزبوونەوەیەدا گێژ و سەرسام مابوو!

بۆیە هەر هێندەی ڕێم لە نوورێك دەکەوت نیشانەیەکم لەسەر دادەنا تاکو بەهۆیەوە بیناسمەوە..

تەنانەت زۆر جار یەك وشەم وەك نیشانەیەك لەسەر نوورێك دادەنا کە ناتوانم گوزارشتی لێ بکەم، ئەمەش تەنها بۆ ئاگادار کردنەوە و یادخستنەوە، نەك بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر ئەو نوورە و ڕوونی بکاتەوە. بەڵکو زۆر جار تەنها یەك وشەم لەسەر یەك نووری گەورە داناوە.

پاشان بۆم دەرکەوت کە ئەو نوورانەی لەناو زەویی تاریك و نووتەکدا بە دەممەوە دێن و یارمەتیم دەدەن، تیشکەکانی خۆری قورئانی پیرۆزن وەکو چرا لێم دەرکەوتوون!

اللهم اجعل القرآن نوراً لعقولنا، وقلوبنا، وأرواحنا، ومرشداً لأنفسنا.. آمين)[2].

---

(١) مەسنەویی نووری، مەشخەڵێك لە ڕووناکییەکانی خۆری قورئان.

(٢) مەسنەویی نووری، پێشەکیی دانەر، بێدارکردنەوە.

(باسەکانی ئەو پەیامانە وەکـو چـەند پلیکانـە و هۆکـارێك دەبینـم بـۆ بەرزبوونـەوەی مرۆڤ بـەرەو ئـەو زەمبیلانـەی کـە لـە عەرشی خـوای میهرەبانـەوە شـۆڕبوونەتەوە، کـە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن. چونکە هیچ بابەتێکیان نی‌یە سەری بە پێی ئایەتێکی قورئانی پیرۆزەوە نەنووسابێت.

خـۆ هەرچـەندەش مەسـەلەکانی ئـەو پەیامانـەم یەکـەم جـار لـە ڕێـی چێـژ و حـەدس و شـهوودەوە بەدەسـت هێنـا، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی بـە هاوڕێیـەتیی "ژیـری"م و بـە چـاوی کـراوەوە ڕۆشتمە نـاو بیابـانی شێتی لـەو شتانەدا کـە خـاوەنی بینینـەکان چـاوی تێـدا دەنووقێنن، ئـەوا ژیریم بە پێی نەریتی خۆی بینینەکانی دڵمی لـە پێوەرەکـانی خـۆی دا و لەو ڕێیەوە هەڵی سەنگاندن و بە بەڵگەکانیشی هەڵی گرتن. ئیتر لەم ڕووەوە بابەتـەکانی ئەم پەیامانە وەکو ئەوەیان لـێ هات کە بە بەڵگە سەلمابن.

کەواتـە ئـەو کەسـەی لـە ڕووی هـزر و زانستەوە لـە ڕێ تـرازاوە، دەتوانـێ ئـەوەندە سوودیان لـێ بەدەست بهێنێت کە لە پێ خلیسکی هزرە فەلسەفی‌یەکان بیپارێزێت.

تەنانـەت دەکـرێ، بـە پوختـەکاری و ڕێکخسـتن و ڕوونکردنـەوە، بیروبـاوەڕێکی ئیمانی و زانستێکی نوێی "کەلام"یان لـێ دەربهێنرێت کـە لەوپـەڕی هـێز و توندوتۆڵیـدا بێت بۆ بەرپەرچدانەوەی گومڕایی هزرەکانی سەردەم.

بـەڵکو ئـەو کەسـەی کـە "ژیـری"ی ئاوێتـەی "دڵ"ی بـووە، یـان "دڵ"ی دوای ئـەو "ژیری"یەی کەوتووە کە لەناو ئاسۆکانی "زۆری"دا پەرتەوازەیە، دەتوانێـت ڕێگایـەکی پتەوی بێ وەیی چەشنی هێڵی شەمەندەفەریان لـێ هـەڵێنجێنێت کـە بـە ڕێنمـایی قورئـانی پـیرۆز بەسـەریدا تێپـەڕێت.. ئـەی چـۆن وا نی‌یـە، لـە کـاتێکدا کـە هـەر جوانی‌یـەك لـە پەیامەکانمدا هەبێت تەنها لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوەیە!

سوپاس تەنها بۆ خوایە.. چونکە هەر قورئان لەم ڕێیەدا مامۆستا و ڕابەرم بوو.

بـەڵێ، هەرکەسێك دەست بـە قورئانـەوە بگرێت، ئـەوا دەسـتی بـە دەسـتاوێزێکی نەپچڕاوی توندوتۆڵەوە گرتووە)[١].

(١) مەسنەویی نووری، بڵقێك لە دەریای قورئانی پیرۆز، پاشکۆ، ڕوونکردنەوەیەك.

(پێت وا نەبێت ئەوەی من دەینووسم شتێك بێت هزر و ژیرییەكان جوییبێتیانەوە..
نەخێر!

بەڵكو ڕێژنەیەكە لە ئەنجامی داوای یارمەتی لە قورئانی پیرۆز بەسەر گیانێكی زامدار و دڵێكی هەوكردووی بریندار‌دا ڕژاوە..

گومانی ئەوەش نەبەیت كە شتێكی كاتی بێت؛ دڵەكان بیچێژن و پاشان نەمێنن..
نەخێر!

بەڵكو چەند ڕووناكییەكن لە چەندین ڕاستیی دامەزراوی نەگۆڕەوە، لەسەر ژیرییەكی دەردەدار و دڵێكی بیمار و دەروونێكی نابینا ڕەنگیان داوەتەوە.

من خۆیشم نازانم كە چۆن "دڵ" و "ژیری"م ئاوێتەی یەكتری بوون و، لە ڕێگای شوێنكەوتووانی ژیری (لە زانایانی پێشین) و لە ڕێگای ئەهلی دڵیش (لە پیاوچاكان) ڕۆشتمەدەر..

خۆ ئەگەر لەگەڵ هەردووكیاندا یەكم گرتبێتەوە، ئەوا زۆر باشە و مایەی خۆشحاڵییە..

دەنا گەر لە هەر كامێكی ئەو دوو ڕێیە لامدابێت، ئەوا گوفتارەكەم بە ڕووی خۆمدا دەدرێتەوە.

ئەو مەسەلانەی كە لە شێوەی بەڵگەدا دێنە ڕێت "بەڵگە" نین هەتا بوترێ: "جێی قسەی تیایە"! بەڵكو چەند بنەمایەكی "حەدسی"ن كە بە نوورەكانی ئەو یەقینە گرێ دراون و پارێزراون كە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزە)[1].

(مرۆڤی بەختەوەری پشتگیراو لە لایەن خوای گەورەوە، دەگونجێ لە ڕووی ڕواڵەتەوە بگات بە ناوەرۆكی حەقیقەت، بە بێ ئەوەی بە نێو بەرزەخی تەریقەتدا تێپەڕ بێت!

من بۆ خۆم هەر لە قورئانی پیرۆزەوە ڕێیەكم دی بەرەو حەقیقەت، بە بێ گرتنەبەری تەریقەت "واتە ئەوەی كە مەشهوورە"..

---

(١) مەسنەویی نووری، پاشكۆی "حەباب"، ڕوونكردنەوە. هەروەها بڕوانە: دڵۆپێك لە دەریای تەوحید، كۆتایی.

هەروەها ڕێیەکم تێدا دۆزییەوە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو زانستانەی کە ئامانج و مەبەستن، بە بێ تێپەڕ بوون بەناو بەرزەخی زانستە ئالییەکاندا)[1]!

☐ قۆناغەکانی ڕۆشتن بەرەو "سەعیدی نوێ"

(لەبەر ئەوەی سەعیدی کۆن، پەنجا ساڵ پێش ئێستا، خۆی بە زانستە عەقلی و فەلسەفییەکانەوە گەلێ سەرقاڵ کردبوو، ئەوا بە دوای دەروازە و ڕێبازێکدا دەگەڕا کە لە ڕێیەوە بگات بە ڕاستیی هەموو ڕاستییەکان و، بڕواتە ڕیزی ئەوانەی کە تەریقەت و حەقیقەتیان پێکەوە کۆکردووەتەوە.

بۆ ئەم مەبەستەش تەنها بە جموجوڵی"دڵ" ڕازی نەدەبوو، وەك ئەوەی کە زۆربەی شوێنکەوتووانی تەریقەت پێی ڕازین. بەڵکو لە پێشدا هەوڵێکی زۆری دا بۆ ڕزگار کردنی "ژیری" و "بیر"ی خۆی لە هەندێکی ئەو نەخۆشییانەی کە لە خوێندنەوەی بەردەوامی کتێبی فەیلەسووفەکانەوە دووچاریان هاتبوو.

دوای ئەوەی لەم نەخۆشییانە ڕزگاری بوو، ویستی شوێن پێی هەندێ لەو گەورە مەردانەی ئەهلی حەقیقەت هەڵبگرێت کە بە "ژیری" و "دڵ" ڕووەو حەقیقەت هەنگاویان ناوە. سەیری کرد هەریەك لەو گەورە مەردانە تایبەتکاریی سەرنج ڕاکێشی خۆی هەیە، بۆیە لە هەڵبژاردنی هەندێکیان بەسەر هەندێکی دیکەیاندا سەرسام ما!

ئا لەم کاتەدا ئەوەی "مەکتووباتی ئیمامی ڕەببانی" بە دڵی سەعیدی کۆنی سەرتاپا برینداردا هات کە بە پەنهانی و لە پشتی پەردەوە فەرمانی: "قیبلەت یەك بخە"ی ئاراستە دەکرد. واتە مامۆستای ڕاستەقینە تەنها هەر قورئانە و، یەکخستنی "قیبلە"ش بەوە دەبێت کە مرۆڤ تەنها قورئان بە مامۆستای خۆی دابنێت.

ئیتر بە ڕێنمایی ئەو مامۆستا پاك و خاوێنە و، بە نامۆترین شێوە دەستی دایە سلووك و هەنگاونان بە "گیان" و "دڵ". دەروونی بەدخوازیش بەهۆی دوودڵی و گومانەکانیەوە ئەویان ناچاری موجاهەدەی مەعنەوی و زانستی کرد.

لە دەمی برینی ئەو ڕێگایە و، ماندووبوونی لە پووچەڵکردنەوە و بەدەرنانی گومانەکاندا، هەموو مەقامەکانی بڕی و هەموو ئەو شتانەشی بینی کە لەو مەقامانەدا

(١) مەسنەویی نووری، بۆنێك لە سروەی هیدایەتی قورئان (٣).

هەبوون، بەڵام نەك بە چاوی نووقاو، وەك ئەوەی کە ئەهلی "ئیستیغراق" دەیکەن، بەڵکو لەگەڵ کردنەوەی چاوەکانی "دڵ" و "گیان" و "ژیری"دا، وەك ئەوەی ئیمامی غەزالی و ئیمامی ڕەببانی و جەلالەددینی ڕۆمی ئەنجامیان دا. ئیتر بەناو مەقامەکاندا ڕۆشت و بەو چاوە کراوانە - بە بێ نووقاندن و تروکاندن - هەموو شتێکی ناو ئەو مەقامانەی بینی.

دەسا سوپاس بۆ خوای گەورە کە لە ڕێژنەی ڕێنمایی قورئانی پیرۆزەوە یارمەتیی دا تەریقەت لەگەڵ حەقیقەتدا کۆ بکاتەوە..

تەنانەت توانیی بە "پەیامەکانی نوور" کە سەعیدی نوێ دایناون، ئەو ڕاستییە ڕوون بکاتەوە کە دەڵێت:

وفي كلِ شَيْءٍ له آية تَدُل عَلَى أنَّهُ واحِدُ[1]

لە گەشت و گوزاری ناو ئەو مەقامانەدا بە "دڵ" لە ژێر چاودێریی ژیریدا و، بە "ژیری"ش لە ژێر پارێزگاریی دڵدا دەڕۆشت و هەنگاوی دەنا، بە وێنەی ئیمامی غەزالی و ئیمامی ڕەببانی و جەلالەددینی ڕۆمی..

لە پێشدا دەستی دایە سارێژکردنی زامەکانی دڵ و گیانی و، بە تەواوی خۆی لە وەسوەسە و گومانەکان ڕزگار کرد. بەم ڕزگاربوونەشی لێیان، "سەعیدی کۆن" گۆڕا بە "سەعیدی نوێ".

ئیتر بە زمانی عەرەبی و بە پوختەترین دەستەواژە، چەند نامیلکەیەکی لە حوکم و ناوەڕۆکی "مەسنەوی"دا نووسی، کە لە بنەڕەتدا بە زمانی فارسی نووسراوە.

ئنجا هەرکات دەرفەتی بۆ بڕەخسایە ئەو نامیلکە عەرەبییانەی یەك لە دوای یەك چاپ دەکرد، کە بریتین لە:

"قطرة، حَباب، حبة، زهرة، ذرة، شمة، شعلة و، چەند وانەیەکی تر"..

---

(١) ئەم بەیتە هی شاعیری سەردەمی عەباسی (أبو العتاهية)یە (١٣٠-٢١١ك/٧٤٧-٨٢٦ز). واتە:
هەموو شتێك بەڵگەی تیایە لەسەر ئەوەی خوا تەنیایە
بڕوانە: (ديوان أبي العتاهية) ص: ٧١، نشر: دار الجيل، بيروت، ٢٠٠٣م/ ١٤٢٤هـ. (وەرگێڕ)

لەگەڵ دوو نامیلکەدا بە زمانی تورکی کە بریتین لە:
"لمعات، نقطة"(١).

پاشان لە ماوەی نیو سەدەدا ئەو ڕێبازەی بە "پەیامەکانی نوور" ڕوون کردەوە، ئەو پەیامانەی کە تەنها بە جیهادی نەفس و شەیتانەوە نەوەستاون، بەڵکو جگە لەوەش وەکو کۆمەڵە پەیامێکی گشتی و فراوانی "مەسنەوی"یان لێ هات لەوەدا کە سەرگەردان و موحتاجان دەرباز دەکەن و، ئەوانەش ڕزگار دەکەن کە بە هۆی فەلسەفەوە بەرەو گومڕایی پێیان خلیسکاوە.

ئەو مونازەرەیەی کە لە نێوان هەردوو سەعیدی کۆن و نوێدا ڕووی دا، شەیتانی بەدەرنا و دەروونی بەدخوازیشی سەرکوت کرد، بە ڕادەیەك کە "پەیامەکانی نوور" بوون بە پزیشکێکی شارەزا و کارامەی زامداران لە قوتابیانی حەقیقەت و، لە هەمان کاتیشدا دەمکوتکەری مولحید و گومڕایان)(٢)!

☐ شتێکم نەنووسیوە کە نەمبینیبێت!

(قەدەری خوای گەورە منی بەرەو ڕێیەکی سەیر دایەبەر، کە پیایدا ڕۆشتم دووچاری گەلێ مەترسی و گرفت و دوژمنی زۆر و زەبەندە بووم..

لەبەر ئەوە، پەشۆکام و، لەتاوا بە کۆڵەواری‌یەوە هانام برد بۆ پەروەردگارم. یەکسەر چاودێریی ئەزەلیی ئەو دەستی گرتم و، قورئان هۆش و فامی کردمەوە و،

---

(١) لە دوا مانگەکانی ساڵی (١٩٢١ز)دا دەستی کرد بە دانانی ئەو پەیامانە و، لە مانگی چواری ساڵی (١٩٢٣ز)دا تەواوی کردن. ئەوانەشیان کە بە زمانی عەرەبی چاپ کران بریتین لە:

١. قطرة من بحر التوحيد، وذيل القطرة (ط ١٩٢٢).
٢. شمة من نسيم هداية القرآن، وذيل الشمة (ط ١٩٢٢).
٣. حبة من نواتات ثمرة من ثمرات جنان القرآن، وذيل الحبة (ط ١٩٢٢).
٤. زهرة من رياض القرآن الحكيم، وذيل الزهرة (ط ١٩٢٣).
٥. ذرة من شعاع هداية القرآن (ط ١٩٢٢) وذيل الذرة (ط ١٩٢٣).
٦. حباب من عمان القرآن، وذيل الحباب (ط ١٩٢٣)
٧. شعلة من أنوار شمس القرآن (ط ١٩٢٣).

ئەوانەش کە بە زمانی تورکی چاپ کران، بریتی بوون لە:

١. لمعات (ط ١٩٢١).
٢. نقطة من نور معرفة الله جل جلاله (ط ١٩٢١).

(٢) مەسنەویی نووری، پێشەکیی دانەر.

"میهرەبانی"ش هات بە هانامەوە و لەو مەترسی‌یانە ڕزگاری کردم. ئیتر - سوپاس بۆ خوای گەورە - لەو جەنگانەم لەگەڵ دەروون و شەیتاندا سەرکەوتنم بەدەست هێنا کە بووبوونە بریکارێکی خۆهەڵقورتێنی سەرجەم جۆرەکانی گومڕایان.

یەکەم جار لەبارەی ئەم وشە پیرۆزانەوە دەستەویەخەی یەکتر بووینەوە:

سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر..

ئەوەبوو لە ژێر هەموو یەکێکی ئەو قەڵایانەدا سی جەنگ ڕووی دا!

ئیتر هەموو ڕستەیەك، تەنانەت هەموو بەستێنێك لەم پەیامەدا، لەئەنجامێکی سەرکەوتنە لە جەنگێکدا کە هیچ تەماعێك، بگرە بچووکترین برووبیانووشی بۆ دوژمن تێدا نەمایەوە. کەواتە شتێکم نەنووسیوە کە نەمبینیبێت، تەنانەت گریمانی وەهمیی پێچەوانەکەی ئەوەشم لە لا نەماوە کە نووسیومە)[1]!

(دان بە ڕاستیدا دەنێم و، بەوپەڕی دەنگی بەرزم هاوار دەکەم کە: من دەستەوسانم.. کەمتوانام لە تێگەیاندندا. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دەربڕینی نیعمەتی خوای گەورە و ڕاسپاردنی ئەمانەت دەڵێم: دڵنیابن کە ناتانخەڵەتێنم، بەڵکو شتێك دەنووسم کە دەیبینم، یاخود بە "عین اليقين" یان "علم اليقين" لێی دڵنیام)[2].

## ساڵی ١٩٢٢ز/١٣٣٩ك

□ ئاڵوگۆڕێکی ڕۆحی و، بێزاری لە ژیانی کۆمەڵایەتی

(دوای ئەوەی کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە دیلیی ڕووسەکان دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ، نزیکەی سێ ساڵ بۆ خزمەتکردنی ئایین لە "دار الحكمة الإسلامية"دا مامەوە. بەڵام بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و هیممەتی شێخی گەیلانی و بێداربوونەوەم بە پیری، لە ژیانی شارستانیی ئەستەمبووڵ بێزار بووم و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتی‌یە ڕەنگینەم لێ بێزرا.

---

(١) مەسنەویی نووری، دڵۆپێك لە دەریای تەوحید، ڕوونکردنەوەیەك.

(٢) مەسنەویی نووری، بۆنێك لە سروەی هیدایەتی قورئان، ڕوونکردنەوەیەك.

ئنجا ئەو تاسەمەندی‌یەی پێـی دەوترێـت "دەردی غـەریبی" هـانی دام کـە بڕۆمـەوە بـۆ شارەکەم. چونکە دەموت: مادەم هەر دەمرم، دەبا لە شارەکەی خۆمدا بمرم)[1]!

(بـەڵێ، نـەفرەت‌کردنم لـەو ژیانـە ڕازاوە دنیاییـەی ئەستەمبوولـم - کـە لـە ڕواڵـەتدا لەزەت و خۆشحاڵی بوو - بەو جۆرە بوو کـە باسمـان کـرد و، لـە ئەنجامی ئـەو ڕوانـین و تێفکرینـەوە بـوو کـە لـە دوای بینینـی تاڵـە مـووە سپی‌یەکانی سـەر و ڕیشـم و، دوای بێ وەفایی هاوڕێ دڵسۆزەکەم، ڕووی دا.

ئیتر "دەروون"م لە بریی ئەو چێـژە مـاددی و دنیاییانـەی کـە پێشـتر پێیـان خەڵـەتابوو، بەدوای چێژە مەعنەوی‌یـەکاندا دەگـەڕا و، سـۆراخی ئومێـد و نوورێکـی بـۆ ئـەم پیری‌یـە دەکرد کە سـارد و سڕ و قەبە و قورس دەردەکەوێت لە بەرچاوی بێ ئاگایـاندا، تاکـو تین و گەرموگوڕیی پێ ببەخشێت!

جا هەزاران شوکر و سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کـردم ئـەو چێژە ڕاستەقینە هەمیشـەییانە لـە: (لا إلـه إلا هـو) و نـووری "تـەوحید"دا بدۆزمـەوە، لـە بریـی ئـەو چێـژە دنیاییە بێ ئاکامانەی کە هیچ ڕاستی و تامێکیان نی‌یە..

هەروەها سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕەزای پیریی لەلا شیرین کردم و، لە گـەرمایی و ڕووناکیی پیریدا حەواندمیەوە. بە پێچەوانەی پیریی گومڕایان کـە تـابلێی سـارد و سڕ و ڕەزاگرانە)[2]!

(لـە سـەرەتای پـیریمدا حـەزم لـە گۆشـەگیری و تـەنیایی دەکـرد لـە سـەر گـردی "یووشەع"، کـە بەسـەر گـەرووی "بسـفۆڕ"دا دەڕوانێـت و، "گیـان"یشـم بـە دوای ئاسوودەیی گۆشەگیری و تەنیاییدا عەوداڵ بوو..

ڕۆژێکیـان لەسـەر لوتکـەی ئـەو گـردە نـاوبراوە بـەرزەوە سـەیری ئاسـۆکانی دنیـام دەکـرد. لـە ناکـاودا هەڕەشـەی "پـیری" تابلۆیـەکی لـەو تـابلۆ ناسـك و خەمناکانـەی جودایی و نەمانی پیشـاندام.

کە سـەرنجی ئەو تابلۆیەم دا، بینیم هەر لە چڵەپۆپـەی لقـی چـڵ و پێنجـەمی درەختـی ساڵەکانی تەمەنمەوە هەتا قووڵترین ڕەگ و ڕیشەی چینەکانی ژێرەوەی ژیانم، هـەموویانم

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٩٣.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٨٥-٤٨٦.

بە تەرمی ئەو دۆست و خۆشەویستانەم دەهاتە پێش چاو کە لـە ژمـارە نایـەن و، ئەوانـەش کە لە ماوەی ژیانمدا پەیوەندیم لەگەڵیاندا بووە!

لە تاو حەسرەت و پەژارەی جودایی یاران و خۆشەویستاندا، ئەم ناڵەیـەی "فزوولیـی بەغدادی"م[1] لەبەر خۆمەوە وتەوە کە لە دەمی جودایی خۆشەویستانیدا وتویەتی:

لەگەڵ یادی وەسڵی تۆدا فرمێسکی گەش دەبارێنم

تا هەناسـەی ژینم مـابێت بـە یـادی تـۆ دەنـاڵێنـم!

لە ناوەندی ئەو هەموو خەفەت و حەسرەتە قووڵانەدا، بە دوای دەرووپـەکی ئومێـد و کلاورۆژنەیەکی رووناکیدا دەگەڕام کە دڵی خۆمی پێ بدەمەوە. لـەپڕ نـووری: "ئیمـان بە ڕۆژی دوایی" هات بە هانامەوە!

بەڵێ، ئـەم ئیمانـە نوورێکـی ئـەوتۆی پێ بەخشیم کـە هـەرگیز کوژانـەوەی نیـیە و، ئومێدێکیشی خەڵات کردم کە هەرگیز خامۆش نابێت)[2].

(کاتێ لە ئەستەمبووڵ لەسەر گردی "یووشەع"ی لێواری بسفۆڕدا بڕیـاری تـەرکی دنیام دا، چەند هـاوەڵێکی ئـازیز هـاتن بـۆ لام تـاکو لـەو بڕیـارەم پەشیمانم بکەنـەوە و بۆ حاڵەت و باری یەکەم جارم بمگێڕنەوە!

منیش پێم وتن:

لێم گەڕێن هەتا سبەینێ با ئیستیخارەیەکی پەروەردگارم بکەم!

بۆ بەیانی ئەم دوو تابلۆیەی خوارەوە بۆ دڵم هاتن، کە هەرچەند بە شێوە و ڕوخسـار لە شیعر دەچن، بەڵام شیعر نین.

هەر بەو شێوازەش هێشتمنەوە کە هاتنە دڵمەوە و، لەبەر ئەو خـاتیرە پیرۆزە قەڵەمم تێ نەبردن. پاشان لە کۆتایی وتەی بیست و سێ‌هەمدا دانران و، لەبەر گونجاویی ئەم پلـە و مەقامەش هێنرانە ئێرە.

---

(١) "فزوولیی بەغدادی" شاعیرێکی تورکە لـە سـەدەی شـازدەهەمی زاییـنیدا ژیـاوە و، نـاوی "محەممەد"ە، ئەم شاعیرە دەورێکی کاریگەری بووە لە ئەدەبی تورکیدا و، بە دامەزرێنەری ئەدەبی ئازەریی تورکی دادەنرێت. بە زمانەکانی: تورکی و فارسی و عـەرەبی شیعری وتـووە. چەند بەرهـەمێکی هەیـە یـەکێك لەوانـە: "لـەیلا و مەجنوون"ە، لە ساڵی ١٥٥٥زدا بە تاعوون کۆچی دوایی کردووە.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٥٣.

تابلۆی یەکەم: "کە وێنەی ڕاستیی دنیایە لە نیگای بینینی گومڕایانەوە":

بۆ لای دنیا بانگم مەکە! من خۆم هاتم و بێ کەڵکیی ئەوم دی..

چونکە لەبەر ئەوەی "بێ ئاگایی" تیایدا بوو بە پەردە و نووری "حەق"ی داپۆشی، ئەوا، سەرجەمی بوونەوەرانم بە "فانی" و "زیانبەخش" هاتە پێش چاو.

ئەگەر دەڵێیت: "بوون". دەڵێم: بەڵێ، ئەو بەرگەشم پۆشی، بەڵام گەلێ گیروگرفتی "نەبوون"م لەو پێناوەدا هاتەڕێ!

گەر دەڵێیت: "ژیان". دەڵێم: تامی ئەویشم نۆشی، بەڵام گیرۆدەی گەلێ سزا و ئازاری سەختی ژیان بووم.. چونکە لەم ژیانەدا:

"مانەوە"ی مرۆڤ بۆ ئەو بەڵایە..

"ژیری" سزایە و "تەمەن" هەوایە..

"کەماڵ" فەنایە و.. "کردار" ڕیایە!

تەنانەت نۆشی ئاواتەکانی

دەبن بە نێشی ئازارەکانی!

"بەیەك شادبوون"یش خودی نەمانە

ئەوەی کە دەردە تۆ پێت دەرمانە!

ڕووناکییەکانی ئەم جۆرە ژین و بیرکردنەوەیەش تاریکستانێکی ڕەش و چڕ بۆ مرۆڤ فەراهەم دەهێنن و، خۆشەویستانیش لەم ڕوانگەیەدا بە وێنەی "هەتیوان"ی بێ نەوا لە پێش چاودا دەنوێنن..

ئەو "دەنگانە"ش کە دێنە گوێی مرۆڤ تێکڕا هەواڵی دڵتەزێنی جودایی و لێکدابڕانیان پێیە و، "زیندووان"یش وەك مردووی بێ گیان دەردەکەون.

سەرتاپای "زانستەکان"ی ئەم جۆرە ژیان و دنیایە، وەهم و ئەندێشەی بێ بناغەن و.. هەزاران دەرد و زام و بیماریش لە توێی "دانستەکان"یدا حەشار دراون..

"تام و چێژەکان"یشی سەرتاپا دەرد و ئازارن و.. هەزاران جۆری "نەبوون"یش لە دووتوێی تەنها یەك "بوون"دا خۆیان مەڵاس داوە.

ئەگەر دەشڵێیت: ئەدی "خۆشەویست"؟! دەڵێم: بەڵێ، "خۆشەویست"یشم دۆزییەوە، بەڵام سەد ئاخ لە دەست جودایی، کە چەندە ئازاری سەخت دەرخواردی مرۆڤ دەدات!

تابلۆی دووهەم: "ئاماژە بۆ ڕاستیی دنیا دەکات بە لای ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەتەوە":
هەر ئەوەندەی پەردەی "بێ ئاگایی" لە بەرچاودا لاچوو، بە ئاشکرا نووری "حەق"م بینی و، دەرکەوت کە:
"بوون" بەڵگەی زاتی ئەوە و.. "ژیان"یش ئاوێنەیە کە "حەق"ی تێدا دەدرەوشێتەوە..
"ژیری"ش کلیلی گەنجینەکەیە و.. "نەمان"یش دەرگای "مانەوە"یە!
بریسکەی "کەماڵ" کوژایەوە.. بەڵام خۆری "جەماڵ" لەو ئاسۆیەوە هەڵهات!
ئیتر دوای ئەوە:
"نەمان" بوو بە خودی "بەیەك شادبوون" و.. "ئازار"یش تام و چێژی خۆش و بەلەزەتی بەرهەم هێنا.
بینیم کە "تەمەن" هەر خودی کردارەکانی مرۆڤە و، تا "ئەبەد"یش ئەو تەمەنە درێژخایەن و بەردەوامە..
"تاریکی"یش توێکڵی سەر ڕووی "ڕووناکی"یە و.. ژیانی ڕاستەقینەش لە "مردن"دایە!
"شتان"م بە هاودەم و دڵدەرەوە و هاوڕاز هاتنە پێش چاو.. "دەنگەکان"یشم بە زیکر و یادی خوای گەورە هاتنە بەر گوێ، چونکە سەرجەمی بوونەوەران سەرگەرمی زیکر و تەسبیحن.
بۆم دەرکەوت کە: "هەژاری" گەنجینەی "دەوڵەمەندی"یە و.. "هێز"یش لە دووتوێی "بێ دەستەڵاتی" و کۆڵەواریدایە!
گەر خوای گەورەت دۆزی‌یەوە، هەموو شتێك دەبێت بە هی تۆ. بەڵێ، گەر تۆ بەندەی خاوەنی ئەو موڵکانە بیت، ئەوا سەرجەمی موڵکەکانی ئەو دەبن بە موڵکی تۆ! دەنا گەر بەندەی دەروونی خۆت بیت و لە نەفست ڕازی بیت، ئەوا بێ گومان گرفتاری گەلێ بەڵای بێ ژمارە دەبیت و، سزای چەندین ئازاری بێ سنووریش دەچێژیت.
بەڵام گەر بەندەی ڕاستەقینەی خوای گەورە بیت و، بە ڕاستی ئیمانت پێ هێنا، ئەوا فەرموو خاوێنی و بێگەردی‌یەکی بێ سنوور ببینە و تامی بەختەوەری‌یەکی لەژمارەبەدەر بنۆشە و بەدەستی بهێنە)[1].

---

(١) وتەکان، مەقامی دووهەمی وتەی حەڤدەهەم، ل: ٣٠٤-٣٠٦.

(ئەی "نەفس"ە کەم!
تۆش وەك "دڵ"م.. بە ئەشکی گەش
هانا بۆ فریادڕەس بەرە.
بڵێ: من خۆم "فانی"م.. ئیتر "فانی"م ناوێ..
دەستەوسانم.. کۆڵەوارم..
شتی "دەستەوسان"م ناوێ!
"ڕۆح"ی خۆمم بە خواوەندی "ڕەحمان" سپارد..
هیچ کەسێکی دیکەم ناوێ!
بەڵکو تەنها ئەوم دەوێ..
"یار"ی باقیی فانی‌نەبووی تاکم دەوێ.
من گەردیلەم..
بەڵام خۆری ئاوانەبووی هەمیشە بێ باکم دەوێ.
خۆم لە خۆمدا: هیچی تەواو هیچم، کەچی:
سەرانسەری بوونەوەری پاکم دەوێ) [1].

□ ئەو ڕووداوەی کە "سەعیدی کۆن"ی گۆڕی بە "سەعیدی نوێ"

(گوێ لەم ڕووداوە ئەندێشەییە ڕابگرە، کە ڕاستیی ژیانی دنیا دەنوێنێت و، ڕووداوێکە "سەعیدی کۆن" چاوی پێ کەوت و گۆڕیی بە "سەعیدی نوێ". کە بەم جۆرەیە:

خۆمم وەك مرۆڤێك دی کە لەسەر سەفەر بووم و، بۆ شوێنێکی دوور ڕەوانە کرابووم و، ڕێگایەکی دووورودرێژم لەبەربوو. گەورەکەشم شەست لیرەی زێڕینی "هەر ڕۆژە و لیرەیەك" بۆ تەرخان کردبووم. تا ڕۆژێکیان ڕۆشتمە ئوتێلێکەوە کە مەلهای تێدا بوو، منیش "دە" لیرەم لەو کاتەدا پێ بوو، هەموویانم لە یەك شەودا لەسەر مێزی قومار و لە پێناوی ناوبانگ دەست کەوتندا دۆڕاند و، بە دەستی بەتاڵ مامەوە و هیچ کەسابەتێکم بە پارەکەمەوە نەکرد و، هیچیشم نەهێشتەوە تاکو پێداویستی‌یەکانی ئەو جێگایەمی پێ دابین بکەم کە بۆی دەڕۆم.

---

(١) وتەکان، مەقامی دووهەمی وتەی حەڤدەهەم، ل: ٣٠٨

بە کورتی: لەو چێژ و تامە نارەوایە جگە لە ئازار و، تاوانی زۆر و، زام و، داخ و، خەم و پەژارە هیچی ترم لێ پاشەکەوت نەکرد.

کاتێ من لەم نائومێدی و خەفەتباری و خەم خواردنەدا دەتلامەوە، پیاوێکم لێ پەیدا بوو، وتی: "هەموو سەرمایەکەت لە دەست دا و ئێستا شایانی سزایت. وا بە دەستی بەتاڵیش بەرەو ئەو شارەی نیازتە بۆی بڕۆیت ڕێ دەگریتەبەر. جا ئەگەر وریا و خاوەنی بینایی دڵ بیت، ئەوا دەرگای پەشیمان بوونەوە و تۆبەکردن هێشتا دانەخراوە، دەتوانیت بە نیوەی قازانجی ئەو پازدە لیرەیەی کە ماوتە کەسابەتی پێوە بکەیت و، هەندێ لە پێداویستییەکانی ئەوێت بکڕیت".

کە لەمەدا ڕاوێژم بە نەفسم کرد، دەبینم ڕازی نییە..

پیاوەکە وتی: "کەواتە سێیەکی". نەفسم بەمەش ڕازی نەبوو.

پیاوەکە وتی: "چواریەکی". دەبینم نەفسم نایەوێ لەو خووەی دووچاری بووە لابدات! پیاوەکە بە توورەییەوە پشتی تێ کردم و ڕۆشت.

پاشان کە تەماشام کرد، وەك بڵێی هەموو شتێك گۆڕا بێت و وەك خۆی نەمابێت، وا بوو لە بەرچاومدا! خۆمم لەناو شەمەندەفەرێکدا دی کە بەوپەڕی توندی و بە پەلە لە تونێلێکی ناو زەویدا دەڕۆشت، لە سەرسووڕماندا شپرزە بووبووم. بەڵام هیچ چارێکم نەبوو و نەمدەتوانی نە بە لای ڕاست نە بە لای چەپدا بڕۆم. سەیر لەوەدا بوو لەم دیو و ئەو دیوی شەمەندەفەرەکەدا چەندین جۆر گوڵی ڕەنگین و جوان و سەرنج ڕاکێش و بەروبووم و میوەی بەتام دیار بوون.

منیش وەکو مرۆڤە دەبەنگەکان دەستم بۆ بردن، تاکو هەندێ لەو گوڵانە بکەمەوە و لەو میوە بەتامانەش شتێکم دەست بکەوێت. بەڵام هیچم دەستنەکەوت، چونکە هەر ئەوەندەی دەستم پێیان گەیشت، دڕکەکانیان بە دەستمدا چەقین و دەستیان زامدار کردم و خوێنیان لێ هێنا، شەمەندەفەرەکەش لە ڕەوتی توندوتیژی خۆیدا هەر بەردەوام بوو! بەم جۆرە، بێ ئەوەی هیچ سوودێکم دەست بکەوێت خۆم تووشی ئازار کرد..

فەرمانبەرێکی شەمەندەفەرەکە پێی وتم: "پێنج قرووشم بدەرێ، تا ئەندازەیەکی باشت لەو گوڵ و بەروبوومانەی دەتەوێن بۆ بکەمەوە. خۆ تۆ بەم زامانەت چەندین ئەوەندەی ئەوەی بەو پێنج قرووشە دەستت دەکەون زیان دەکەیت، ئەمە سەرەڕای ئەو

سزایەی کە لەسەر ئەم کارەت دەیچێژیت، چونکە بێ ڕوخسەت وەرگرتن دەستت بۆ بردوون".

لەو کاتەدا سەری دنیام لێ هاتەوەیەك و بە تەواوی کەوتمە پەژارە و تەنگانەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی لای پێشەوەم کرد، تاکو بزانم کەی ئەم تونێلە کۆتایی پێ دێت؟ دەبینم کۆتایی ئەو تونێلە چەند کون و کەلەبەر و پەنجەرە و چالێکن و، هەریەك لە نەفەرەکانی ئەو شەمەندەفەرە فڕێ دەدرێنە ناو یەکێك لەو کون و چالانەوە! لە بەرامبەر خۆیشمەوە چالێکم دی لە هەردوو سەریەوە بەردی وەك "کێلی گۆڕ" دانرابوون. کە لە بەردەکانی وردبوومەوە، دەبینم بە پیتی گەورە ناوی "سەعید"یان لێ نووسرابوو!

لە ترس و بیم و سەرسووڕماندا بە دەنگی بەرز وتم: ئەی هاوار!!

کتوپڕ دەنگی ئەو پیاوەم هاتەوە گوێ کە لە دەرگای مەلهاکەدا ئامۆژگاریی زۆری کردم. گوێم لێ بوو پێی وتم:

"کوڕم! ژیریت هاتەوەبەر؟ لە مەستی بێدار بوویتەوە"؟

وتم: "بەڵێ، بەڵام دوای ئەوەی کە کار لە کار ترازا و، هیچ هێز و توانا و دەستەڵاتێکم لە دەستدا نەما".

وتی: "تۆبە بکە و پشت بەخوا ببەستە".

وتم: "وا کردم".

پاشان کە بێدار بوومەوە، "سەعیدی کۆن"م لێ ون بوو و، "سەعیدی نوێ"م لە خۆمدا بینی)[1]!

☐ ڕێبازی "بیرکردنەوە"

(بیست و سێ ساڵ پێش ئێستا کە "سەعیدی کۆن" گۆڕا بە "سەعیدی نوێ" و ڕێبازی "بیرکردنەوە"ی هەڵبژارد، بە دوای نهێنیی "تفکر ساعة خیر من عبادة سنة"دا گەڕا. ئەوەبوو هەموو یەك دوو ساڵێك ئەو نهێنییە شێوەکەی خۆی دەگۆڕی و، یان پەیامێکی عەرەبی یان پەیامێکی تورکیی بەرهەم دەهێنا. ئەم ڕاستییەش هەر لە پەیامی

(١) وتەکان، وتەی بیست و سێهەم، ل: ٤٧١-٤٧٣.

عەرەبیی "قطـرة"ەوە هەتا پەیامی "الآیــة الكــبرى"[١] لەسەر شێوە گۆڕینە جۆراوجۆرەکانی خۆی بەردەوام بوو، دوای ئەوە شێوە هەمیشەییەکەی لە "الحزب النوري"[٢]دا گرتە خۆ.

وا ماوەی بیست ساڵە هەر کاتێك دڵتەنگ دەبم و، بیر و دڵم ماندوو دەبن و، لە تاوا پەنا بۆ خوێندنەوەی ورد و لەسەرخۆ و تێرامانی بەشێکی "الحزب النوري" دەبەم، یەکسەر دڵتەنگی و بێزاری و ماندووبوونەکەم دەڕەوێنێتەوە. وا ئەمە هەزار جاریش دووپات بووەوە و، خوێندنەوەی شەش‌یەکی ئەو حیزبە لە پێش نوێژی بەیانیدا هیچ شوێنەوارێکی بێزاری و ماندووبوونی بەجێ نەهێشت کە دەبوو لە ئەنجامی خوێندنەوەی ماوەی پێنج شەش سەعاتی شەودا بەجێی بهێشتایە. بەڵێ، ئەم حاڵەتە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە)[٣].

☐ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی: دەستەوسانی و، هەژاری و، شەفەقەت و، بیرکردنەوە (لە نموونەیەکدا)

(... گریان ئێمە هەرسێکمان ئەو "گوڵ" و "دڵۆپ" و "نم"ەین، چونکە ئەو هەست و شعوورەی کە بە گریمان دامان نا تیایاندا بیێت، بەشی ئەم کارە ناکات. بۆیە وا ژێریی خۆیشمان دەنێرینە ناویانەوە. واتە دەبێ تێبگەین لەوەی کە هەروەك ئەو سیانە لە ڕێژنەی ڕووناکیی خۆرە ماددی‌یەکەیان بەهرەمەند دەبن، ئێمەش بە هەمان جۆر لە هی خۆرە مەعنەوی‌یەکەمان بەهرەمەند دەبین..

دەسا ئەی ئەو هاوڕێیەی کە دنیا لە بیر ناباتەوە و لە شتانی ماددیدا ڕۆدەچێت و نەفسیشی چڕ و ئەستوور بووە! تۆ ببە بە "گوڵ"ەکە، چونکە توانا و لێهاتنت وەك هی ئەو وایە، ئەوەتا ئەو گوڵە لە ئاوێتەبوونی ڕووناکیی خۆرەوە ڕەنگێك وەردەگرێت و وێنەی نموونەی خۆر لەو ڕەنگەدا ئاوێتە دەکات و لە شێوەیەکی جواندا خۆی پێ دەنەخشێنێت.

---

(١) تیشکی حەوتەمی کۆمەڵە پەیامی "تیشکەکان"ە. هەروەك بە سەربەخۆیی بە ناوی "بینینەکانی گەشتیارێك" بڵاومان کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) کۆمەڵە تێرامانێکی ئیمانیی مامۆستا نوورسی‌یە، بە زمانی عەرەبی لە شێوەی "موناجات"دا.

(٣) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٩٣.

ئنجا ئەم فەیلەسووفەش کە لە قوتابخانە نوێیەکاندا خوێندوویەتی و، باوەڕی بە کاریگەریی "هۆکارەکان" هەیە و، لە "سەعیدی کۆن" دەچێت، با ببێت بە "دڵۆپ"ە شەیداکەی ئەو مانگەی کە سێبەری "ڕووناکی"ی لە خۆر وەرگیراوی دەداتێ و، ڕووناکییەك بە چاوی ئەو دەبەخشێت کە پێی بیریسکێتەوە.. بەڵام ئەو دڵۆپە دەبێ بزانێت کە جگە لە "مانگ" چیی تر بەو ڕووناکییە نابینێت و ناتوانێت "خۆر"ی پێ ببینێت. مەگەر لە ڕێی ئیمانەکەیەوە – نەك بەو ڕووناکییە – بتوانێت خۆر ببینێت.

پاشان ئەم هەژارەش [ دانەر مەبەستی خۆیەتی ] کە باوەڕی وایە هەموو شتێك ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوەیە و "هۆکارەکان" بە پەردە دادەنێت، با "نم"ەکە بێت. ئەوەتا لە خۆیدا نمێکی هەژارە و شتێکی ئەوتۆی نییە وەك گوڵەکە پشتی پێ ببەستێت و پاڵی پێوە بدات و، ڕەنگێکیشی نییە کە بەهۆیەوە ببینرێت و، جگە لە خۆر هیچ شتێکی تر ناناسێت تا ڕووی تێ بکات، هێندە نەبێت کە سافی و خاوێنییەکی بێگەردی ئەوتۆ لە بیلبیلەی چاویدا شك دەبات کە وێنەی خۆری پێ هەڵبگرێت)[1].

[ دوای ڕوونکردنەوە، بەمەی خوارەوە کۆتایی بە باسەکە دەهێنێت ]:

(وا هاوەڵی سێهەمیشتان، کە وەك "نم" وایە، هەژارە.. بێ ڕەنگە.. هەر خێرا بەهۆی گەرمیی خۆرەوە دەبێت بە هەڵم و، واز لە خۆویستیی خۆی دەهێنێت و، سواری پشتی هەڵم دەبێت و، بە بۆشایی نێوان ئاسمان و زەویدا سەر دەکەوێت و، بە ئاگری عیشق ماددە چرەکەی ناوی گڕ دەگرێت و، لە ڕێی ڕووناکییەوە دەبێت بە "نوور" و، دەست بە یەکێك لەو تیشکانەوە دەگرێت کە لە درەوشانەوەکانی ئەو ڕووناکییەوە هاتوون و، بۆ خۆی لەم ڕێیەوە لێی نزیك دەبێتەوە!

دەسا ئەی وێنە و نموونەی "نم"ەکە! تۆ مادەم ڕاستەوخۆ ئەرکی ئاوێنە ڕادەپەڕێنیت بۆ "خۆر"، ئەوا لە هەر پلەیەکدا دەبیت ببە، چونکە دەتوانیت لەو پلەیەدا پەنجەرەیەکی ڕوون و خاوێنت دەست بکەوێت کە بە "عین الیقین" سەیری ڕووی خۆری لێوە بکەیت و، لە گێڕانەوەی ئاسەوارە سەرسووڕهێنەرەکاندا بۆ خۆر، گرفتاری هیچ چەشنە دژواری و گیروگرفتێك نەبیت. چونکە دەتوانیت – بێ هیچ چەشنە دوودڵییەك – وەسفە بەهەیبەت و سامەکانی خۆر بۆ خودی خۆر بگێڕیتەوە و، هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی گێڕانەوەی ئەو ئاسەوارە سەرسووڕهێنەرانەت بۆ دەستەڵاتدارییە

---

(١) وتەکان، وتەی بیست و چوارەم، ل: ٤٩٠-٤٩١.

ڕەهاکەی خۆر لێ بگرێت.. نە تەنگ و تاریی بەرزەخەکان، نە پابەندیی توانا و لێهاتنەکان.. نە بچووکیی ئاوێنەکان، هیچ کامیان گرفتاری سەرسامیت ناکەن و بەرەو شتێکی پێچەوانەی "حەقیقەت" ناتبەن، چونکە خۆت ساف و بێگەردیت و ڕاستەوخۆ سەیری خۆر دەکەیت.. هەر لەبەر ئەوەیە کە زانیت ئەوەی لە ئاوێنەکاندا دیارن خودی خۆر نین، بەڵکو جۆرە درەوشانەوە و ڕەنگدانەوەیەکی جۆراوجۆرن و، تەنها بەڵگە و ناونیشانی خۆرن و، ناتوانن سەرجەمی ئاسەوارە بەسام و شکۆدارەکانی خۆر دەربخەن)[1].

❑ نزیکترین ڕێ بۆ لای خوای گەورە

(چەندین ڕێی زۆر هەن کە مرۆڤ بە خوای گەورە دەگەیەنن، سەرچاوەی هەموو ئەو ڕێ ڕاستانەش "قورئانی پیرۆز"ە. بەڵام ئەوەندە هەیە هەندێ لەم ڕێیانە لەچاو ئەوانی تردا گشتی تر و سەلامەت تر و نزیکترە.

من، وێڕای تێگەیشتنی کۆتا و ناتەواوی خۆم، ڕێگایەکی تەخت و کورت و ئاسانم لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە دۆزیوەتەوە، کە بریتی‌یە لە ڕێی:

"کۆڵەواری، هەژاری، شەفەقەت، بیرکردنەوە".

بەڵێ، "کۆڵەواری" وەك عیشق وایە، ڕێیەکە مرۆڤ بە خوای گەورە دەگەیەنێت، بەڵکو ڕێگایەکە لە عیشق سەلامەتتر و نزیکترە، چونکە لە ڕێی "بەندایەتی"یەوە مرۆڤ دەگەیەنێتە "مەحبووبییەت".

"هەژاری"ش وەهایە، مرۆڤ بە ناوی پیرۆزی "الرحمن"ی خوای گەورە دەگەیەنێت.

"شەفەقەت"یش بە هەمان جۆر وەك عیشق وایە، مرۆڤ بە خوای گەورە دەگەیەنێت، بەڵکو لە عیشق تیژڕەوترە و مەوداکەشی لەو فراوانترە، چونکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ناوی پیرۆزی "الرحیم"ی خوای گەورە.

"بیرکردنەوە"ش وەك عیشق وایە، تەنانەت لەویش بەپێزترە و ڕووناکی‌یەکەشی درەوشاوەترە و ڕێیەکی گەلێ بەرینترە. چونکە ڕێبواری ئەو ڕێیە دەگەیەنێتە ناوی پیرۆزی "الحکیم"ی خوای گەورە.

---

(١) وتەکان، وتەی بیست و چوارەم، ل: ٤٩٣-٤٩٤.

ئەم ڕێیە جیایە لەوەی کە لە "دە" هەنگاو پێکهاتووە و ڕێبوارانی ڕێی "نهێنی" گرتوویانەتەبەر.. هەروەها جیایشە لەوەی کە لە ڕێی "ئاشکرا"دا دەیگرنەبەر و بریتییە لە "حەوت" هەنگاو، بەپێی ژمارەی حەوت دەروونەکان..

ئەم ڕێیە بریتییە لە تەنها "چوار" هەنگاو. ڕاستییەکی شەرعیشە زیاتر تا ئەوەی تەریقەتێکی سۆفی بێت.

با بە هەڵەدا نەچن، مەبەست لە: قسوور و کۆڵەواری و هەژاری ئەوەیە کە هەموو ئەمانە تەنها لە بەردەم خواوەندی مەزندا دەرببڕرێن، نەك لە بەردەم خەڵکیدا.

ویرد و زیکرەکانی ئەم ڕێیەش ئەمانەی خوارەوەن:

* شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ.

* لەنجامدانی فەرزەکان، بە تایبەتی بەجێهێنانی نوێژ بە ڕێکوپێکی و، خوێندنی زیکرەکانی دوایان.

* دەست هەڵگرتن لە گوناهە گەورەکان.

سەرچاوەکانی ئەم هەنگاوانەش لە قورئانی پیرۆزدا، ئەمانەن:

﴿فلا تُزكّوا أنفسَكُم﴾ (النجم:٣٢) ئاماژە بۆ هەنگاوی یەکەم دەکات..

﴿ولا تكُونوا كالّذين نسُوا الله فأنساهُمْ أنفُسَهم﴾ (الحشر:١٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی دووهەم دەکات..

﴿ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أصابَك من سَيِّئَةٍ فمن نفسِك﴾ (النساء:٧٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی سێهەم دەکات..

﴿كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَه﴾ (القصص:٨٨) ئاماژە بۆ هەنگاوی چوارەم دەکات.

ڕوونکردنەوەی ئەم چوار هەنگاوە - زۆر بە کورتی - بەم جۆرەیە:

*هەنگاوی یەکەم:* وەك ئایەتی ﴿فلا تُزكّوا أنفسَكُم﴾ ئاماژەی بۆ دەکات، بریتییە لەوەی "نەفس" بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت.

چونکە مرۆڤ، بەپێی سروشت و فیترەتی، ڕاستەوخۆ و لەپێشدا تەنها خۆی خۆش دەوێت و، لە پێناویدا هەموو شتێك بەخت دەکات و، بە چەشنێك بە شان و باڵای خۆیدا دەخوێنێت و مەدحێکی وای دەکات کە تەنها شایستەی خواوەند بێت و، هەردەم خۆی بە خاوێن لە قەڵەم دەدات. تەنانەت هیچ کەموکووڕییەکی بۆ ڕەوا

نابینێت و بەرگرییەكی توندی تا ڕادەی پەرستنی لێ دەكات. وەك بڵێی هەموو ئەو ئامێرانەی كە خوای گەورە بۆ ستایش و پاك ڕاگرتنی خواوەند لەو مرۆڤەدا دایناون، ئەو مرۆڤە دەچێ بۆ خۆی بەكاریان دەهێنێت!

بەم جۆرە ڕووبەڕووی ئەو وەسفە دەبێتەوە كە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە:

﴿مَنِ اتَّخذَ إلهَهُ هَواهُ﴾ (الفرقان:٤٣).

ئیتر دووچاری لەخۆ ڕازی بوون و لەخۆ بایی بوون دەبێت و، پێویست دەكات كە پاكژ بكرێت.. جا پاكژ كردنی دەروونی مرۆڤ لەم هەنگاوەدا بەوە دەبێت كە بە پاك نەزانرێت و بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت!

*هەنگاوی دووهەم:* ئەو دەرسەیە كە لەم ئایەتە پیرۆزە وەردەگیرێت:

﴿ولا تَكُونوا كالَّذين نسُوا الله فأنْساهُمْ أنفُسَهم﴾.

ئەویش بەم جۆرە:

مرۆڤ هەردەم خۆی لە بیر دەباتەوە، خۆ ئەگەر بیریش لە مردن بكاتەوە، ئەوا ڕووی ئەو مردنە بۆ غەیری خۆی وەردەچەرخێنێت و، گەر لەناوچوون و نەمانیش ببینێت، بۆ كەسانی تری دادەنێت، وەك بڵێی هەرگیز ئەو نەگرێتەوە و هیچ پەیوەندییەكی بە خۆیەوە نەبێت!

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە دەروونی بەدخوازی مرۆڤ لە كاتی بەش و پاداشت وەرگرتندا خۆی بیر دەكەوێتەوە و بە توندی دەستی پێوە دەگرێت. كەچی لە كاتی كار و فرمان و خزمەتگوزاریدا خۆی لەبیر دەباتەوە!

كەواتە پاكژ و خاوێن و پەروەردە كردنی، لەم هەنگاوەدا، ڕەفتار كردنە بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتە. واتە خۆ لەبیر نەچوونەوە لە دەمی لەبیرچوونەوەدا.

بە واتایەكی تر: خۆ لەبیر بردنەوە لە كاتی پاداشت وەرگرتن و، بیر لێكردنەوەشی لە دەمی خزمەتگوزاری و یادی مردندا!

*هەنگاوی سێهەم:* ئەوەیە كە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەكات كە دەفەرموێ:

﴿ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أصابَك من سَيِّئَةٍ فمن نفسك﴾.

چونكە هەردەم "نەفس" داخوازی ئەوەیە كە هەرچی خێر و چاكەیە بە هی خۆی دادەنێت، ئەم كارەش بەرەو شانازی و لەخۆڕازی بوونی دەبات.

کەواتە دەبێت، لەم هەنگاوەدا، لە ناتەواوی و کەموکووڕی و کۆڵەواری و هەژاری بەولاوە هیچی تر لە خۆیدا نەبینێت و، هەموو چاکە و لایەنە تەواوەکانی خۆیشی بە چاکەی خواوەندی مەزنیان دابنێت و بە بەخششی ئەویان بزانێت. ئیتر لە بریی شانازی و لەخۆ بایی بوون، شوکرانەبژێری دەنوێنێت و سوپاسی خواوەند دەکات.

کەواتە پاکژ کردنی "نەفس" لەم پلەیەدا لە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدایە کە دەفەرموێ: ﴿قد أفلحَ مَنْ زكّاها﴾ (الشمس:٩).

واتە بەوە دەبێت کە بزانێت تەواویی خۆی لە ناتەواوییدا و، توانای لە کۆڵەوارییدا و، دەوڵەمەندییەکەشی لە هەژارییدایە.

بەو واتایەی کە بزانێت تەواویی خۆی لەوەدایە کە تەواو نەبێت و، دەسەڵاتی لەوەدایە کە لە بەردەم خوای گەورەدا کۆڵەوار و بێ دەسەڵات بێت و، دەوڵەمەندیشی لەوەدایە کە هەژاری دەرگانەی ئەو بێت.

*هەنگاوی چوارەم:* ئەو وانەیە کە ئەم ئایەتە دەیڵێتەوە: ﴿كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَهُ﴾.

چونکە "نەفس" گومانی وایە کە خۆی لە خۆیدا سەربەست و سەربەخۆیە. لەبەر ئەوە لافی جۆرە پەروەردگارییەك لێ دەدات و، بەرامبەر پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی سەرپێچیی تێدایە. جا هەستکردن بەم ڕاستییەی خوارەوە مرۆڤ لەو بارە ڕزگار دەکات. ئەو ڕاستییەش بریتییە لەوەی کە:

هەموو شتێك لە خۆیدا و بە "واتا ئیسمییەکەی" لەناوچوو، ون بوو، تازە پەیدا بوو، نەبووە. بەڵام بە "واتا حەرفییەکەی" و لەو ڕووەوە کە بەپێی ئەرك و فرمانی سەرشانی دەوری ئاوێنەی دەرخەری ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری مەزن دەبینێت، ئەوا ئەو شتە: بینەر و بینراوە و، هەیە و بووە.

جا پاکژکردنی "دەروون" لەم هەنگاوەدا بەوە دەبێت کە بزانێت نەبوونی لە بوونیدایە و، بوونیشی لە نەبوونیدا!

واتە ئەگەر خۆی بینی و بوونی بە خۆی بەخشی، ئەوا لە تاریکستانی چەندین نەبوونی ئەوەندە زۆر و زەبەندەدا نوقم دەبێت کە بە ئەندازەی هەموو بوونەوەران دەبن.

بە واتایەکی تر دەڵێین: ئەگەر لە بەدیهێنەری ڕاستەقینەی خۆی - کە خوای گەورەیە - بێ ئاگا بێت و، بە بوونی خۆی بایی ببێت، ئەوا خۆی بە تەنیایی و خنکاوی دەبینێتەوە لە ناوەندی تاریکیی بێ کۆتایی جودایی و نەبووندا، بە چەشنی گوڵەستێرە کە تەنها بە ڕووناکی‌یە کزەکەی خۆی لە تاریکیی شەوی تاردا بجووڵێتەوە.

بەڵام کاتێ واز لە خۆویستی و لەخۆ بایی بوون دەهێنێت، بۆی دەردەکەوێت کە لە ڕاستیدا خۆی لە خۆیدا شتێك نی‌یە، بەڵکو ئاوێنەیەکی درەوشانەوەکانی بەدیهێنەری ڕاستەقینەیە. بەم پێ‌یە، لەم ڕێ‌یەوە "بوون"ێکی نەبڕاوە و بێ کۆتایی بەدەست دەهێنێت و، ئنجا "بوون"ی هەموو بوونەوەرانیش دەستکەوت و قازانجی دەبێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی خوا دەدۆزێتەوە، هەموو شتێکی دەست کەوتووە، چونکە هەموو بوونەوەران، تێکڕا، بریتین لە: درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندی مەزن!

*کۆتایی:*

ئەم ڕێگایەی کە پێکهاتووە لەم چوار هەنگاوە: "کۆڵەواری و، هەژاری و، شەفەقەت و، بیرکردنەوە" لە هەر بیست و شەش وتەکانی پێشووی کتێبی "وتەکان"دا، کە لە زانستی حەقیقەت و، ڕاستیی شەریعەت و، حیکمەتی قورئانی پیرۆز دەدوێن، ڕوون کراونەتەوە.

بەڵام لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی پوخت بۆ چەند خاڵێك دەکەین کە ئەمانەن:

ئەم ڕێگایە کورتترین و نزیکترین ڕێ‌یە لەچاو ئەوانی تردا، چونکە تەنها چوار هەنگاوە. ئنجا ئەگەر "کۆڵەواری" بەسەر نەفسدا زاڵ ببێت، ئەوا ڕاستەوخۆ تەسلیمی خواوەندی "بەتوانا"ی شکۆمەندی دەکات.

بەڵام گەر لە ڕێگەی عیشقدا - کە گەیەنەرترین ڕێ‌یە بۆ لای خوای گەورە - "عیشق" بەسەر نەفسدا زاڵ ببێت، ئەوا دەروونی مرۆڤ دەستەکانی لە داوێنی مەعشووقی مەجازی گیر دەکات و بەو جۆرە دەمێنێتەوە هەتا نەمانی ئەو مەعشووقەی دەبینێت، ئنجا دەگات بە خۆشویستراوی ڕاستەقینە!

پاشان ئەم ڕێگایە لە هەموو ئەوانی تر بێ وەی ترە، چونکە "نەفس" لەم ڕێگایەدا دووچاری "شەتەحات" نابێت و، لاف و گەزافی لە توانای خۆی بەرەوژوورتر لێ

نـادات، چونکـە مرۆڤ لـەم ڕێگایـەدا جگـە لـە کۆڵـەواری و هـەژاری و قسـوور و ناتەواوی، هیچی تر لە نەفسی خۆیدا شك نابات، تا لە سنووری خۆی لابدات!

ئەم ڕێیە جادەیەکی گەورە و شەقامێکی گشتییە، چونکە مرۆڤ لەم ڕێیەدا ناچار نابێت بوونەوەران بخاتە "بەندیخانە" یان "ئیعدامیان" بکات، بە وێنەی ڕێڕەوانی ڕێگەی "وحدة الوجود"، کە بۆ مەبەستی گەیشتن بە دڵنیایی و حوزووری قەلبی، بوونەوەرانیان لە وەهمی خۆیاندا بە "نەبوو" لە قەڵەم دا و، وتیان: "لا موجود الا هو"..

یان بە وێنەی ڕێڕەوانی ڕێی "وحدة الشهود" کە بۆ مەبەستی بەهرەوەر بوون و گەیشتنیان بەو دڵنیاییە، بوونەوەرانیان لە بەندیخانەی "بیرچوونەوە"دا بەند کرد و، وتیان: "لا مشهود الا هو"!

قورئانی پیرۆز – کە ئەم چوار ڕێیەی لێ وەرگیراوە – بە ئاشکرا لە ئیعدام کردنی بوونەوەران خۆش دەبێت و لە بەندیخانەش دەربازیان دەکات!

جا ئەم ڕێگایە – لەسەر ئەو ڕێبازەی قورئان – بەو چاوە دەڕوانێتە بوونەوەران کە:

ملکەچ و گوێڕایەڵی بەدیهێنەری شکۆمەندیانن و، لە ڕێی ئەودا خزمەت دەکەن و، دەرخەری درەوشـانەوەکانی نـاوە جوانـەکانن، دەڵێـی ئاوێنـەن ئـەو درەوشـانەوانە دەدەنەوە و دەریاندەخەن. واتـە ئـەم ڕێیـە بوونـەوەران بە واتـای "حـەرفی" دەبینێت و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و، دووریان دەخاتەوە لەوەی کە خـاوەنی واتـای "ئیسـمی" بن و، هەر بۆ خۆیان کەوتبنە خزمەت و گوێڕایەڵ بووبن.

بەم چەشنە، مرۆڤ لە بێ ئاگایی ڕزگـاری دەبێـت و، لەسـەر ڕێبازەکـەی قورئـانی پیرۆز بە "حوزووری بەردەوام و هەمیشەیی" دەگات و پێی بەهرەوەر دەبێت. ئەو کاتەش لە هەموو شتێکدا ڕێگایەك دەبینێت کە بە خوای گەورەی دەگەیەنێت.

*پوختەی ئەم قسانە:*

ئەم ڕێگایە بە "واتای ئیسمی" ناڕوانێتە بوونەوەران، واتە بەو ڕوانینە بۆیان نـاڕوانێت کە لە خۆیاندا و بۆ خۆیان کەوتبنە کار و گوێڕایەڵ بووبن. بەڵکو ئـەم بۆڕوانینـەیان لـێ دادەماڵێت و، ئـەرك و فەرمانبـەریی "ملکـەچ بوونیـان بـۆ خـوای گـەورە" دەخاتـە ئەستۆ[1].

---

(١) وتەکان، وتەی بیست و شەشەم، ل: ٧٠٠-٧٠٥.

## بەندی دووهەم

## لە ئەنقەرە

## ساڵی ۱۹۲۲ز/۱۳٤۰ك

❐ بانگهێشت بۆ ئەنقەرە

(کاتێ کە لە سەرەتای پیریمدا خەندەی خۆشحاڵیی "سەعیدی کۆن" نەما و جێی بۆ شین و گریانی "سەعیدی نوێ" چۆڵ کرد، دنیاخوازانی "ئەنقەرە" پێیان وابوو من وەك باری پێشووم ماومەتەوە و هەر "سەعیدی کۆن"ی جارانم، بۆیە بانگهێشتیان بۆ کردم کە بچم بۆ ئەوێ. منیش ڕۆشتم)[1].

چونکە (مستەفا کەمال دوو نامەی بە پەرلە نارد بۆ تەحسین بەگی هاوڕێم کە ئەو کاتە والی بوو لە شاری "وان". لەو دوو نامەیەدا بانگهێشتی دەکردم بۆ ئەنقەرە تاکو پاداشتم بداتەوە لەسەر بڵاوکردنەوەی نامیلکەی "شەش هەنگاوەکان". منیش ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە)[2].

(لە ساڵی "۱۳۳۸"دا[3] لە ئەنقەرە دڵخۆشی و شادمانیی ئیماندارانم بینی بە سەرکەوتنی سوپای ئیسلام بەسەر یۆنانییەکاندا. بەڵام لە هەمان کاتدا جموجوڵی سامناکی بێ بڕوایی و ئیلحادیشم بینی کە لە ڕێی بەکارهێنانی فرتوفێڵ و لەخشتەبردنی خەڵکییەوە خەریکی جێکردنەوەی چەمکەکانی خۆی بوو لەناو دڵ و دەروون و

---

(۱) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٥٨.

(۲) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٢.

(۳) بە مێژووی ڕۆمی، کە دەکاتە: (۱۹۲۲ز) و (۱۳٤۰ك). (وەرگێڕ)

بیروباوەڕی دامەزراوی ئیمانداراندا، بۆ ئەوەی لەخشتەیان ببات و بیروباوەڕیان ژەهراوی بکات.

منیش کە ئەمەم بینی و هەستم پێ کرد، لە ناخی دڵمەوە داخ و خەفەت دایگرتم و، لە دەست ئەو دێوە سامناکەی کە دەیەوێت پەلاماری پایە و بنچینەکانی ئیمان بدات، هاوار و هانام بردە لای خوای گەورەی بەدەستەڵات و پەنام بەم ئایەتە پیرۆزە برد و دەستم پێوە گرت[1].

ئەوەبوو نامیلکەیەکی بچووکم بە زمانی عەرەبی دانا و، لە چاپخانەی: "ڕۆژی نوێ Yeni Gun"ی ئەنقەرە لە چاپم دا و بڵاوم کردەوە، کە بەدیهییەتی "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەم تێدا چەسپاندبوو. بەهۆی ئەو بەڵگە بەهێز و پتەوانەی کە لە نووری قورئانی پیرۆز وەرم گرتبوون و، سەری هەژدیهای بێ بڕواییم پێ کوتابوونەوە و، لەو نامیلکەدا باسم کردبوون..

بەڵام جێدەست و شوێنەواری ئەو بەڵگە بەهێزانە لە بەرەنگاری کردنی بێ بڕوایی و ئیلحاددا دەرنەکەوت، چونکە ئەو نامیلکەیەی کە چاپم کردبوو تابلێی پوخت و کورت بوو، جگە لە کەمیی ئەوانەش کە بایەخیان بە زمانی عەرەبی دەدا. لەبەر ئەمانە، وەهم و خەیاڵەکانی ئەو ئیلحادە - بە داخەوە - پتر لە گەشە و بڵاوبوونەوەدا بوون)[2].

بەڵێ، ئەو ئامانجەی کە بەدیعوززەمان هەر لە منداڵییەوە هەوڵی بۆ دەدا و ئەو هیوایەش کە لە ڕێی ڕۆشتنیدا بۆ ئەنقەرە بووبووە خولیای، بریتی بوو لە بەرپابوونی ڕابوونێکی ئیسلامیی گشتی کە سەرجەمی جیهانی ئیسلامی بگرێتەوە.

ئەم ڕۆحە مەزنە، پتر لەو باس و مونازەرانەیدا ڕوون بووەوە کە پێش هاتنی بۆ ئەستەمبووڵ لەگەڵ سەدان زانای خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا ئەنجامی دا. هەروەها لە دەمی هاتنیشیدا بۆ ئەنقەرە، بە ڕادەیەك کە سیاسەتمەدارانی سەرسام کردبوو.

هیچ کاتێك ئەم بەرپرسییە مەزن و ئەرکە قورس و شەوقە بەردەوامەی لێ جیا نەبووەتەوە. ئومێدی وا بوو کە ڕاگەیاندنی ئازادی و مەشرووتیەت لە خزمەتی شەریعەتی خاوێندا بێت و، ببێتە مزگێنییەك بۆ بەختەوەریی ئەنادۆڵ و سەرجەمی

---

(١) واتە ئایەتی: ﴿قالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللهِ شَكٌّ فاطِرِ السَّموات والأَرضِ﴾ (ابراهيم: ١٠).

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و سێهەم، ل: ٣٥٠؛ سروشت هونەرە یان هونەرمەندە؟! ل: ٩-١٠.

جیهانی ئیسلامی. تەنانەت لـە ڕووناکیی ئـەو هیوایـەیدا و، بۆ هێنانـەدیی ئـەو ئاواتـەی، گەلێ گوتـاری ئاراستەی جەماوەر کرد و، چەندین وتاریشی لـە ڕۆژنامەکاندا بڵاو کردەوە. هەروەك ئـەم ئاواتـەی لـە چەند نووسراوێکیدا دەرکەوت کە لـەو قۆناغـەدا داینابوون. هەمیشە بە ڕاشکاوی ڕایدەگەیاند کە مـەزنترین دەنگێـك لـە داهـاتوودا بزرنگێتەوە دەنگی زوڵاڵی قورئانی پیرۆزە.

بەڵام ڕووخانی دەوڵەتی عوسمـانی، کە نزیکی هـەزار ساڵ لـە دوای عەباسییەکان خزمەتی ئیسلامی خستبووە ئەستۆی، زۆر بە توندی جیهانی ئیسلامیی لـەرزاند. ئیتر دوژمنانی سەرسەختی ئیسلام زاڵ بوون بەسەر مەڵبەندی خەلافەتدا و، دەستیان دایە ڕیشەکەن کردنی ئیسلام لە ناخی دڵـەکاندا.. کـەچی چاکـەی توانستی خوایی بەسـەر بەدیعوززەماندا درەوشایەوە، تاکو لەو بارودۆخە سەخت و تاریکەدا ئاڵاکە هەڵبگرێت.

بە هیـوای ئـەوەی شتێك لـە بەرژەوەندیی ئیسلام بەدەسـت بـهێنێت و، یارمـەتیی بەرپرسان بـدات ڕۆشـت بۆ ئەنقەرە. چونکە هـەروەك "جـەنگی ڕزگـاری" جـەنگێکی ئیمانی بـوو بۆ وەدەرنـانی دوژمنـان بۆ دەرەوەی وڵات بـە پشتیوانی خـوای گـەورە، بە هەمان جۆر ئومێـدی بـەوەش هـەبوو کە حکوومـەتی نـوێ ڕاستەوخۆ پشت بە قورئان ببەستێت بۆ بـەرەو پێش بردنـی کاروبـاری ئیسـلام لـە وڵاتـدا و، یـەکگرتنی "جیـهانی ئیسلامی"ش بکاتە پاڵپشتێك بۆ خـۆی و، بـە جوانـترین شێوەی ماددی و مەعنـەوی ئـەو شارستانێتییەی ئیسلام بخاتە ڕوو کە لە کاکڵە و ناوەرۆکی ئیسلامدا هەیە..

بەڵام کاتێ گەیشتە ئەنقەرە و، لە لایەن بەرپرسانەوە - پەرلـەمانتاران و وەزیرەکـان - هەروەها لـە لایـەن جەماوەرەوە پێشوازییەکی تۆکمـە و ڕەنگینـی لـێ کـرا، شتانێکی ئەوتۆی بینی کە چاوەڕوانی نەدەکرد، ئەوەبوو سەرنجی دا لـە پەرلـەماندا بایەخ بە ئایین نادرێت و گوێ نادەنە دروشمەکانی ئیسلام. لەبەر ئەوە، پێویستیی خواپەرستی بە تایبەت ئەنجامدانی "نوێژ"ی لە بەیاننامەیەکدا بۆ ڕوونکردنـەوە کە بەسـەر ئـەندامانی پەرلـەماندا دابەش کرا و، جەنەڕاڵ "کازم قەرەبەکر" بۆ "مستەفا کەمال"ی خوێندەوە[1].

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. مامۆستا نوورسی لـە ١٩٢٢/١١/٢٢زدا گەیشتە ئەنقـەرە. ئـەو بەیاننامەیەش لە ١٩٢٣/١/١٩زدا بەسەر ئەندامانی پەرلەماندا دابەش کرا.

یەکێك لە دەرەنجامە کاریگەرەکانی ئەم بەیاننامەیە، پابەند بوونی شەست پەرلەمانتار بوو لەسەر بەجێهێنانی نوێژەکانیان. تەنانەت ئەو ژوورەی کە پێشتر نوێژیان تێدا دەکرد، دوای ئەو بەیاننامەیە جێی نوێژخوێنانی تێدا نەدەبووەوە، بۆیە ژوورێکی فراوانتریان بۆ ئەنجامدانی نوێژەکانیان تەرخان کرد[1]!

[ ئەمەش دەقی بەیاننامەکەیە ]:

❑ (وتارێك بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی نەتەوە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إنَّ الصَّلوةَ كانَتْ على المؤمنينَ كتاباً مَوْقُوتاً﴾ (النساء: ١٠٣)

يا أيُّها المبعوثون! إنَّكُمْ لَـ﴿مَبْعُوثُونَ * لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (المطففين: ٤-٥)!

ئەی موجاهیدانی ئیسلام! ئەی ئەهلی حەل و عەقد!

تکام وایە گوێ بۆ مەسەلەیەك ڕابگرن کە ئەم هەژارە دەیەوێ بە چەند ئامۆژگاری‌یەك و، لە ناوەندی "دە" وشەدا ئاراستەی ئێوەی بەڕێزی بکات:

"یەکەم": ئەم نیعمەتە مەزنەی کە خوای گەورە بەم سەرکەوتنەتان پێی بەخشیون خوازیاری شوکرانەبژێری‌یە، تاکو لە بەردەوامی و زیادبووندا بێت. چونکە هەر نیعمەتێك گەر بە شوکرانەکردن پێشوازیی لێ نەکرێت، دەبڕێت و کۆتایی پێ دێت.

جا مادەم ئێوە - بە فەزڵی خوای گەورە - قورئانی پیرۆزتان لە هێرش و پەلاماری دوژمنان ڕزگار کرد، ئەوا دەبێ گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی ڕاشکاوی ئەو قورئانەش بن سەبارەت بە نوێژە فەرزەکانەوە، تاکو هەر بەم شێوە دەراسایە ڕێژنە و سایەی نوورەکانی قورئانتان لەسەر بەردەوام بێت.

"دووهەم": ئێوە سەرجەمی جیهانی ئیسلامیتان بەم سەرکەوتنەتان شادمان و دڵخۆش کرد و، ڕێز و خۆشەویستیی ئەوانتان بەدەست هێنا. بەڵام مانەوە و بەردەوامیی ئەم ڕێز و خۆشەویستی‌یەی ئەوان تەنها بەندە بە ملکەچی و پابەندیتان بە شەعائیری ئیسلامەوە. چونکە موسڵمانان تەنها لەبەر "ئیسلام" ئێوەیان خۆش دەوێت.

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

"سێهەم": ئێوە لەم جیهانەدا سەرکردەیی چەندین کەستان لە موجاهیدان و شەهیدان گرتە ئەستۆ کە لە حوکمی ئەولیا و پیاوچاکاندان. جا ئەو هەڵوێستەی کە لە شان و شکۆی کەسانی غیرەتمەندی وەك ئێوە چاوەڕوان دەکرێت، هەوڵدانی گەرموگوڕتانە بۆ فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز، تاکو لەودنیاشدا شەرەفی هاوڕێیەتیی ئەو شەهیدە نوورانییانە بەدەست بهێنن. دەنا لەوێ ناچاری ئەوە دەبن کە تکا و داوای یارمەتی لە ئاسایی‌ترین سەربازی ئێرەتان بکەن، لە کاتێکدا کە خۆتان لێرە لە پلەی سەرکردە و پێشەوادان.

خۆ ئاشکرایە ئەم دنیایە، بە هەموو ناوبانگ و شەرەفمەندی‌یەکیەوە، هێشتا هەر شایانی ئەوە نی‌یە کە بەڕێزانی وەك ئێوە پێی ڕازی بێت و، دوامەودای زانینتان بێت و، سەرجەمی ئاواتەکانیشتانی تێدا بێتەدی.

"چوارەم": هەرچەندە بەشێکی ئەم نەتەوەی ئیسلامە لە بەجێهێنانی نوێژەکانیاندا سستی و کەمتەرخەمی دەنوێنن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەیانەوێ سەرکردە و سەرۆکەکانیان پیاوچاك و خاوەن تەقوا بن، هەرچەند خۆیشیان لەڕێ لادەر یان خاوەنی ڕەفتاری خراپ بن!

تەنانەت یەکەم پرسیار کە خەڵکی کوردستان لە بارەی بەرپرسەکانیانەوە دەیکەن سەبارەت بە نوێژەوەیە. واتە ئەگەر ئەو بەرپرسانە نوێژخوێن بن، ئەوا بە باشیان دادەنێن و جێی بڕوا و متمانەیان دەبن، دەنا کارمەند و بەرپرس بەلایانەوە جێی دوودڵی و گومان دەبێت، هەرچەندە لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانیدا بەتوانا و لێهاتووش بێت!

کاتی خۆی هەندێ پشێوی لە نێوان عەشیرەتەکانی "بیت الشباب"دا سەری هەڵدا. منیش بە نیازی زانینی هۆکارەکانی ئەو ڕووداوە ڕۆشتم و پرسیارم لێ کردن..

وتیان: چۆن دەگونجێ گوێڕایەڵی بەرپرسێکی بێ ئایینی وەك قایمقام بین کە نوێژ ناکات و مەی دەخواتەوە؟! لە کاتێکدا ئەو کەسانەی کە ئەمەیان دەوت بۆ خۆیان نوێژنەکەر، تەنانەت چەتەش بوون!

"پێنجەم": سەرهەڵدانی زۆربەی پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - لە خۆرهەڵات و زۆربەی فەیلەسووفەکانیش لە خۆرئاوادا، هێمایە کە لەلایەن قەدەری

خواوەندەوە بۆ ئەوەی کە تەنها "دڵ" و "ئایین" - نەك "ژیری" و "فەلسەفە" - دەتوانن خۆرهەڵات ڕابپەڕێنن و باری لاری بۆ ڕاست بکەنەوە.

جا مادەم ئێوە خۆرهەڵاتتان لە خەو بێدار کردووەتەوە، ئەوا ڕێبازێکیشی بۆ دابین بکەن کە لەگەڵ سروشتیدا بگونجێت. دەنا هەموو هەوڵ و کۆششێکتان بە فیڕۆ دەڕوات، یان هیچ نەبێ هەوڵ و تەقالایەکی کاتی و ڕووکەش دەبێت.

"شەشەم": ئەورووپاییەکان کە دوژمنی ئێوە و ئایینی ئیسلامیشن - بە تایبەت ئینگلیزەکان - هەر لە مێژە هەتا ئێستاش هەلی کەمتەرخەمیی ئێوەیان لە ئایینداقۆستووەتەوە. تەنانەت دەتوانم بڵێم: ئەوانەی کە سوود لەم کەمتەرخەمی‌یەی ئێوە وەردەگرن، بە وێنەی دوژمنەکانتان (یۆنانی‌یەکان) زیان بە ئایینی ئیسلام دەگەیەنن.

کەواتە پێویستە ئێوە لەپێناوی بەرژەوەندیی ئیسلام و سەلامەتیی نەتەوەکەتاندا، واز لەم کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستنە بهێنن و، کردەوەی لە جێگادا دابنێن.

ئێوە هەر بۆخۆتان بینیتان کە چۆن سەرکردەکانی "ئیتتیحاد و تەرەقی" لەبەر بایەخ نەدانی هەندێکیان بە ئایین و شەعائیرەکانی، لە ناوخۆی وڵات و لە لایەن ئەم نەتەوەیەوە چ بێز و نەفرەتێکیان ئاراستە کرا، هەرچەندە خۆبەختکردن و هیممەت و ئازایەتیی زۆریشیان نواند و، تا ڕادەیەکیش بوون بە هۆی ئەم بێداری و ڕابوونە ئیسلامی‌یە. کەچی موسڵمانانی دەرەوەی وڵات لەبەر ئەوەی پشتگوێ خستن و کەمتەرخەمیی ئەوانیان لە کاروباری ئاییندا نەبینیبوو، ڕێزێکی زۆریان پێ بەخشیبوون!

"حەوتەم": هەرچەندە جیهانی کوفر لە مێژە توانیویەتی هێرش بۆسەر جیهانی ئیسلامی بهێنێت، کەچی بەگشت توانا و هۆکارێکی شارستانێتیی خۆی و بە هەموو فەلسەفە و زانست و موبەششیرەکانیەوە، نەیتوانیوە لە ڕووی ئایینەوە بەسەریدا سەربکەوێت. ئەوەبوو دەستە و تاقمە گومڕاکانی ناوخۆ هەمیشە هەر کەمایەتی و ژێردەستە بوون.

جا لە کاتێکدا کە ئایینی ئیسلام توانیویەتی بە "ئەهلی سوننەت و جەماعەت" پارێزگاریی توندوتۆڵی و دامەزراویی خۆی بکات، ئەوا تەوژمێکی بیدعەخوازی سەرهەڵداوی لایەنە چەپەڵەکەی شارستانێتیی ئەورووپا هەرگیز ناتوانێت ڕێگا بۆ

ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامی خۆش بکات. پێشتریش جموجوولی لەم جۆرە ڕووی نەداوە، گەر ڕوویشی دابێت ئەوا یەکسەری و خێرا دووچاری نەمان و ڕووبەڕووی تیاچوون و ئاوابوون بووەتەوە.

واتە جگە لە "ملکەچیی تەواوەتی" بۆ "یاسا و دەستوورەکانی ئیسلام" هەرگیز لە توانادا نییە ئالوگۆڕێکی جەوهەری و بنەڕەتی بەرپا بکرێت.

"هەشتەم": هەرگیز ناتوانرێت هاودەم لەگەڵ سستی و کەمتەرخەمی کردن لە کاروباری ئاییندا، کارێکی "ئیجابی و بنیاتنەر" ئەنجام بدرێت. چونکە وا نزیکە شارستانێتیی قورئان بێتەکایەوە و، هێندەشی نەماوە شارستانێتیی گومڕای ئەورووپا – کە ئۆباڵی لاوازبوونی ئایینی لە ئەستۆدایە – ڕووبەڕووی هەڵوەشانەوە و داڕمان ببێتەوە!

خۆ سەبارەت بە ئەنجامدانی "کاری سەلبی"ش ئەوا ئیسلام پێویستی پێی نییە، چونکە ئەو زام و دەردیسەری و گیروگرفتانەی سەروزیادن کە هاتنەڕێی!

"نۆهەم": ئەو کەسانەی کە ئێوەیان بە دڵ و زمان خۆش دەوێت و، بەهای خزمەت و سەرکەوتنتان لە جەنگەکانی "سەربەخۆیی"دا دەزانن، تەنها جەماوەری ئیماندارانن، بە تایبەت چینی "عەوام" کە موسڵمانانی ڕاستین و بە گەرمی ئێوەیان خۆش دەوێت و، بە ڕاستی شانازیتان پێوە دەکەن و، بە دڵسۆزی و ئیخلاسەوە پشتگیریتان بۆ دەنوێنن و، بە گەورەترینی ئەو هێز و توانایەش کە تیایاندا بێدار بووەتەوە یارمەتیتان دەدەن..

دەبێ ئێوەش لە لایەنی خۆتانەوە و بۆ مەبەستی شوێنکەوتنی فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز و بەرژەوەندیی ئایینی ئیسلام، پەیوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵدا گرێ بدەن و، پشتیان پێ ببەستن. دەنا پێشخستنی کەسانی خۆدامالیو لە ئیسلام و پەیوەندی بڕاو بەم نەتەوەیەوە (لە سەرسووڕماوان و چاولێکەرانی ئەورووپا) بەسەر گشتینەی موسڵماناندا، کارێکی تەواو دژ و پێچەوانەی بەرژەوەندیی ئیسلامە و، "جیهانی ئیسلامی"ش – لە ئەنجامی ئەم کارەدا – بۆ داوای یارمەتی و هاوکاری ڕوو لە جێگایەکی تر دەکات.

"دەهەم": ئەگەر ڕێگایەك "نۆ" گریمانی تیاچوون و تەنها "یەك" گریمانی ڕزگاربوونی تێدا بێت، ئەوا مەگەر شێتێکی هێندە نەفام کە بایەخ بە ژیانی خۆیشی نەدات، دەنا هیچ کەسێك نایگرێتەبەر!

خۆ ئاشكرایە ڕێی جێبەجێ كردنی فەرزە ئایینی‌یەكان ڕێژەی لـە سـەدا نـەوەد و نـۆی ڕزگـاربوونی تێدایە. لـە كـاتێكدا كـە لـە مـاوەی شـەو و ڕۆژێكدا تەنـها یـەك سـەعات سـەروزیادە بۆ ئەنجامدانی نوێژەكان، لە بەرامبەر گریمـانی یەك دانە زیانـەوە كـە لەوانەیـە - لە ڕووی بێ ئاگایی و تەمبەڵی‌یەوە - لەم ژیانەی دنیـا بكـەوێت. كـەچی وازهێنـان لـە فەرزەكان و پشتگوێ خستنیان، بە ڕێژەی لە سەدا نەوەد و نۆ، گریمانی زیانی تێدایـە. لـە بەرامبەر ڕێژەی یەك لە سەدی گریمانی ڕزگاربوون، لە ڕووی بێ ئاگایی و گومراییەوە.

ئایا دەبێ چ بروبیانوویـەك بـۆ وازهێنـان لـە فـەرزەكان بدۆزرێتـەوە، لـە كـاتێكدا كـە وازلێهێنانیان زیان لە دین و دنیای مرۆڤ دەدات؟ یان چۆن غیرەت و جوامێریی مـرۆڤ بواری ئەم كەمتەرخەمی‌یەی دەدات؟

هەڵسوكەوت و ڕەفتارەكـانی كـاروانی موجـاهیدی ئـەم ئەنجومەنـە باڵایـە گەلــێ گرنگە، چونكە لە دواییـدا دەبێ بـە پێشـەنگ و چـاوی لــێ دەكرێـت.. جـا یـان ئەوەیـە نەتەوە چاو لە هەڵەكانیان دەكات، یـان ڕەخنـەیان لــێ دەگرێـت، كـە هـەردوو كارەكـە زیان و مەترسـی‌یان لـە دووتوێدایـە. واتـە دەسـتگرتنی ئـەم كاروانـە بـە مافـەكانی خـوای گـەورەوە و ئـەنجامدانی فـەرزەكانی ئەسـتۆیان، ڕاپـەڕاندنی مـافی بـەندەكانیش لـەخۆ دەگرێت.

هەرگیز ناتوانرێت كارێكی جیددی لەگەڵ ئەو كەسانەدا ئەنجام بدرێت كە بـە چـەند وەهمێكـی بریقـەداری لەخشتەبەری "دەروون" و وەسوەسـەی "شـەیتان" ڕازی بـوون و پێـی خەڵـەتاون و، گوێـی خۆیشـیان لـە ئاسـتی ئـەو ڕاگەیاندنـە ڕوون و درەخشـانانەدا ئـاخنیوە كـە بـە تـەواتور و كۆدەنگیـی زانایـان چەسـپاون. بـەڵێ، بـەردی بناغـەی ئـەم ئاڵوگۆڕە مەزنە دەبێ توندوتۆڵ بێت.

هـێزی "كەسـایەتیی مەعنـەوی"ی ئـەم ئەنجومەنە باڵایـە واتـای "سـەڵتەنەت"ی لــەخۆ گرتـووە. جـا ئەگــەر - بــە وەكالــەت - واتــای "خەلافــەت"یـش لـەخۆ نـەگرێت و، شەعائیرەكانی ئیسلام جێبەجێ نەكات و، فەرمانیش نەدات بە خەڵكی بـۆ ئـەنجامدانیان، واتە گەر لە پێشكەش كردنی واتای خەلافەتدا نوشوستیی هێنا و پێداویستیی ئـایینیی ئـەم نەتەوەیـەی دەستەبەر و دابین نـەكرد، كـە نەتەوەیەكە هێشـتا فیـترەتی تێـك نـەچووە و

پێویستی بە ئایین زیاتر هەیە تا بە هۆکارەکانی ژیان و گوزەران و، هێشتا لە ژێر باڵەپەستۆی گەمە و گاڵتەی شارستانێتیی نوێدا پێداویستی‌یە ڕۆحی‌یەکانی خۆی فەرامۆش نەکردووە.. ئەوا خەڵکی ناچار دەبن کە واتای "خەلافەت" بەو شتە ببەخشن کە ئێوە تەنها وشە و ناوەکەیتان بۆ داناوە و، پشتگیری و هێز و پێزیش بە مانەوە و بەردەوامیی ئەو واتایە دەدەن. لە کاتێکدا کە ئەگەر ئەم جۆرە هێزە لە دەستی ئەم ئەنجومەنەدا نەبێت و لەم ڕێیەوە نەهاتبێتە کایەوە، دەبێت بەهۆی پەرت بوون و شپرزی!

خۆ دیارە سەرپێچی و گوێڕایەڵی نەکردن، کارێکی دژ و پێچەوانەی فەرمانی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێ:

﴿واعْتَصِموا بِحبلِ اللهِ جَميعاً ولا تَفرَّقُوا﴾ (آل عمران: ١٠٣).

ئەم چەرخەی ئێستا چەرخی "کۆمەڵ"ە. چونکە "کەسێتیی مەعنەوی" کە گیانی کۆمەڵە، لە "کەسێتیی تاك" دامەزراوترە و زیاتریش دەتوانێ فەرمانەکانی شەرع ڕایی بکات. کەسایەتیی "خەلیفە" تەنها بەهۆی پاڵدانەوەیەتی بەم گیانە مەعنەوی‌یەوە کە دەتوانێ ئەرکەکانی سەرشانی ڕابپەڕێنێت.

بەڵێ، "کەسایەتیی مەعنەوی" گیانی جەماوەر و گشتینەی خەڵکی دەنوێنێت. جا هەتا ئەو کەسێتی‌یە لە ڕاستە شەقام لانەدات، ئەوا لەچاو "کەسێتیی تاك"دا پتر گەشاوە و درەخشانتر دەبێت. دەنا گەر بێ کەڵك و ڕزیو بێت، ئەوا هەر بەو پێیە بێ کەڵکی و ڕزیوی‌یەکەشی بڵاودەبێتەوە و پەرە دەسێنێت. چونکە "خێر و شەڕ" لە تاکدا سنوورێکیان هەیە، بەڵام لە "کۆمەڵ"دا بێ سنوورن..

کەواتە وریابن! ئەو چاکەکاری‌یانەی کە لە بەرامبەر دەرەوەدا بەدەستتان هێناون، لەناوخۆدا نەیانگۆڕن بە خراپکاری!

خۆتان باش ئاگاداری ئەوەن کە دوژمنە هەمیشەیەکانتان هەوڵی تێکدانی شەعائیرەکانی ئیسلام دەدەن. کە ئەمەش کارێکە زیندووکردنەوە و پارێزگاری کردنی ئەم شەعائیرانەتان لەسەر پێویست دەکات. دەنا - بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن - یارمەتیی ئەو دوژمنانەتان دەدەن کە لە مەڵاسدان بۆتان و خۆیان ئامادە کردووە هێرشتان بکەنە سەر.

کەمتەرخەمی لە جێبەجێ کردنی شەعائیرەکانی ئاییندا ئەنجامەکەی لاوازیی نەتەوە دەبێت و، ئەم لاوازی‌یەش تەماعی دوژمنانتان لێ دەورووژێنێت و، گیانی ئازایەتی‌یان لە دژی ئێوە دەکات بەبەردا و، لە سنوورێکیشدا ڕایان ناگرێت.

حسبنا الله ونعم الوكيل.. نعم المولى ونعم المصير)[1].

□ لەگەڵ سەرۆك کۆماردا

[ وێڕای خوێندنەوەی بەیاننامەکە بۆ پەرلەمانتاران، بەڵام بوو بە هۆی دروستبوونی مشتومڕێك لەگەڵ "مستەفا کەمال"دا. چونکە ئەم کارەی "بەدیعوززەمان"ی بە دڵ نەبوو. بۆیە لە بەردەمی نزیکەی شەست پەرلەمانتاردا پێی وت ]:

"بێ گومان ئێمە پێویستمان بە مامۆستایەکی بەتوانای وەکو ئێوە هەیە. بۆ ئەوەش بانگهێشتمان کردیت بۆ ئێرە تاکو سوود لە ڕا و بۆچوونە ڕاست و دروستەکانت وەربگرین، ئێوەش بەدەم بانگهێشتەکەوە هاتن. کەچی یەکەم کارێك ئەنجامتان دا نووسینی چەند شتێکت بوو لەبارەی نوێژەوە، بەمەش تۆوی دووبەرەکیت لە نێوان ئێمەدا چاند"!

یەکسەر بە تووڕەیی وەڵامی توندوتۆڵی دایەوە و، پەنجەی بۆ ڕاکێشا و، وتی:

"پاشا.. پاشا.. لە ئیسلامدا گەورەترین حەقیقەتی دوای "ئیمان" بریتی‌یە لە "نوێژ". خۆ هەرکەسێك نوێژ نەکات خیانەتکارە. دیارە حوکمی خیانەتکاریش وەرناگیرێت و پشتگوێ دەخرێت"!

"پاشا" ناچار بوو کە تووڕەیی خۆی بخواتەوە و، هەوڵی ڕاگرتنی دڵی بدات)[2].

(مستەفا کەمال لەوێ ئەوەی بۆ پێشنیاز کردم کە بە "واعیزی گشتی" لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا بە مووچەیەکی سێ سەد لیرەیی لە جێگەی شێخی سەنووسی[3] دام بمەزرێنێت، چونکە شێخی ناوبراو زمانی کوردیی نەدەزانی، هەروەها لەگەڵ دامەزراندنم بە ئەندام لە ئەنجومەنی مەبعووسان(پەرلەمان)دا و، ئەندامێتیش لە

---

(١) مەسنەویی نووری، بلقێك لە دەریای قورئانی پیرۆز.

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل:٦٣٩؛٦٦٠.

(٣) شێخی سەنووسی واعیزێکی ئایینی بووە لە کوردستان و پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا و، لە دەمی داگیرکاریی ئینگلیزیشدا ڕۆڵێکی لە بەرچاوی بووە لە دەرکردنی فەتوای جیهاد لە دژی ئینگلیزەکان.

سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی، هاودەم لەگـەڵ مانـەوەی ئـەندامێتیم لـە "دار الحکمـة الإسـلامیة"دا. مەبەستیشـی ڕازی کردنـی مـن و، قەرەبوو کردنـەوەی کارمەندییەکـەی پێشووم بوو.

بەڵام کـە سـەرئەنجام دا بەشێك لـەو هەواڵانـەی لـە دەقـی ئەسـڵیی "تیشکی پێنجـەم"دا هەیە، بە پڕاوپڕی لە کەسێکدا دیتەدی کە لەوێ بینیم. ناچار بووم واز لەو کارمەندییـە گرنگانە بهێنم، چونکە بە قەناعەتی تەواو زانیم کە لەیەك تێگەیشتن لەگەڵ ئەو کەسەدا، یان مامەڵە لەگەڵ کردنی، یاخود ڕێ لێ گرتنی، کارێکی ئەستەم و مەحاڵە. ئیـتر دوای ئەوە، وازم لە کاروباری دنیا و سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایـەتی هێنـا و، هـەموو کاتـەکانم تەنها لە پێناوی خزمەتی ئیماندا تەرخان کرد)[1].

(چەند کارمەندێکی گەورە لێیان پرسیم:

"کاتێ کـە مستەفا کـەمال ویسـتی بـە "ئامۆژگـاری گشـتی" و بەرپرسـی هـەموو کوردستان و پارێزگاکانی خۆرهەڵات لە بریی شێخی سەنووسی و بە مووچەیەکی سێ سـەد لـیرەیی[2] دات.بمەزرێنێت، بۆچی پێـی ڕازی نـەبوویت؟ خـۆ ئەگـەر پێـی ڕازی ببوویتایـە دەبوویـت بـەهۆی ڕزگـارکردنی سـەدان هـەزار کـەس لەوانـەی کـە بـوون بـە قوربانیی شۆڕشەکە"[3]؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەیاندا وتم: "لە جیاتی ئەوەی بیست سیساڵی ژیانی دنیایی ئەو پیاوانە ڕزگار بکەم، پەیامەکانی نوور بوون بەهۆی ڕزگارکردنی ملیۆنەها سـاڵی ژیـانی ئەودنیای سەدان هەزار هاوولاتی. واتە کارێکیان ئەنجام دا کە ئەو زیانـەیان بـە هـەزاران ئەوەندەی خـۆی قـەرەبوو کـردەوە. خـۆ ئەگـەر مـن ئـەو کاتـە ئـەو داواکارییـەم قبـووڵ

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٢-٥٥٣.

(٢) ئەم مووچەیە لەو ڕۆژگارەدا یەکجار زۆر و هی وەزیرەکان بووە. (وەرگێڕ)

(٣) لـەو دەمـەدا بـاکووری کوردسـتان چـەند شۆڕشـێکی بـەخۆوە بینـی. گرنگترینیـان شۆڕشـەکەی شـێخ سەعیدی پیران بوو لە ١٩٢٥/٢/١٣زدا لە دژی سیاسەتی مستەفا کەمال کە "دژایەتیی ئیسـلام" و، سیاسـەتی "ڕەگەزپەرستی"ی پیادە دەکرد. بەڵام مستەفا کـەمال توانیـی بەسـەر ئەم شۆڕشـەدا زاڵ ببێـت و، لـە ئـەنجامدا شێخ سەعید خۆی و چـل و حـەوت کەسـی تر لـە هاوڕێیـانی لـە ١٩٢٥/٦/٣٠دا لـە سێدارە دران، جگـە لـە ماڵوێرانی و دەربەدەربوونی هەزاران کەس. (وەرگێڕ)

بکردایە، ئەوا "پەیامەکانی نوور" کە نهێنیی ئیخلاسیان لەخۆدا هەڵگرتووە و نابن بە شوێنکەوتە و هۆکار و ئامرازی هیچ شتێك، پەیدا نەدەبوون".

تەنانەت لە بەندیخانەدا بە هاورێ بەرێزەکانی خۆمم وت: ئەگەر پەیامەکانی نوور ئیمانی ئەو کاربەدەستانەی ئەنقەرە رزگار بکەن کە زللەی توندوتیژی پەیامەکان ئازاری دان و، بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکردم.. گەر ئەم پەیامانە ئەوان لە ئیعدامی هەمیشەیی دەرباز بکەن، ئەوا ئێوە بە شایەت بن کە من لە ناخی دڵمەوە لێیان خۆش دەبم)[١]!

لەبەر ئەوەی بەو فیتنەیە راگەیشت کە خەریك بوو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا پەرەی دەسەند، ئەوەی کە ماوەی هەزار و چوار سەد ساڵ بوو نەتەوەی ئیسلام پەنای بە خوا دەگرت لێی.. هەروەها لەبەر ئەوەی کە هەڵگیرسێنەرانی ئاگری ئەو فیتنەیەی بە چاوی خۆی بینی. ئەوا ڕۆژێك بۆ ماوەی دوو سەعات وتووێژی لەگەڵ مستەفا کەمالدا کرد و، تێی گەیاند کە لابردنی دروشمەکانی ئیسلام بە مەبەستی بەدەستهێنانی ناوبانگ لە لای دوژمنانی، خراپترین کاولکارییە لەم نەتەوەیەدا و تێکدانی گەل و وڵاتە. خۆ ئەگەر هەر ئاڵوگۆڕێك پێویست بێت با لە ڕوانگەی پشت بەستنەوە بێت بە قورئانی پیرۆز و کردنی بێت بە دەستووری ئەم دەوڵەتە نوێیە[٢].

☐ هەندێ وتەی لە دادگاکاندا لە بارەی مستەفا کەمالەوە

(هەرگیز ئێمە لەگەڵ سەرکردەیەکدا نیین کە بەپێی ئارەزووی خۆی فەرمانەکانی بە ناوی یاساوە دەرکرد بۆ گۆڕینی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا" بە بتخانە و، گۆڕینی بارەگای مەشیەخەتی ئیسلامی بۆ دواناوەندییەکی کچان.. ئێمە نە بە هزر و بیر و نە لە ڕووی بابەت و نە لە ڕووی هاندەر و نە لە ڕووی ئاکامەکانەوە لەگەڵ ئەودا نین و، خۆشمان بە ناچار نازانین کە شتی وا قبووڵ بکەین)[٣].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٥٩-٤٦٠.

(٢) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati. دەتوانرێ سەردانی ئەو نموونە جوانە بکرێت کە مامۆستا نوورسی بۆ مستەفا کەمالی هێناوەتەوە، لە کتێبی "مەکتووبات"دا، مەکتووبی بیست و نۆهەم، ل: ٧٠٠-٧٠٢.

(٣) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦١٥-٦١٦.

(کاتێ کە من بە چەند وشەیەکی توندوتیژ ڕەخنەی ڕاستەوخۆم ئاراستەی ئەو کەسە ناسراوە کرد کە سەرۆکایەتیی حکومەتی لە ئەنقەرە گرتە دەست، خۆی هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو بەرامبەرم، بەڵکو بێ دەنگیی هەڵبژارد. کەچی لە دوای مردنی، ڕاستیی فەرموودەیەکی پیرۆز - کە من پێش چل ساڵ نووسیبووم - هەڵەکەی ئەوی دەرخست..

جا ئەو ڕاستییە و، ئەو ڕەخنانەش کە سروشتی و پێویست بوون، ئێمە لە لایەنی خۆمانەوە بە نهێنی و تایبەت، نەك گشتی و ئاشکرا، هەڵمان گرتبوون. بەڵام داواکاری گشتی بە فێڵ شکاندیەوە بەسەر ئەو کەسەدا و، بەرپرسیارییەکەشی خستە ئەستۆی ئێمەوە!

ئیتر ئایا دادگەریی یاسا، کە ڕەمز و یادگاریی نەتەوەیە و یەکێکە لە درەوشانەوەکانی خوای گەورە، لە کوێ و.. خاتری کەسێکیش کە مرد و پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە نەما، لە کوێ)[1]؟

(لە کاتێکدا کە پێویست بوو حکومەت بیپاراستمایە و دەستی یارمەتی و هاوکاریی بۆ درێژ بکردمایە، چونکە ئەو کارە بەرژەوەندییەکی گەورەی بۆ نەتەوە و سوودێکی زۆری بۆ نیشتمان تێدایە، کەچی گوشار خستنە سەرم لە لایەن حکومەتەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی "دەستەی پەنهانی ئیلحاد" کە ماوەی چل ساڵە دژایەتیم دەکەن و، هەندێك لە پیری شیوعییەکانیش کە ئێستا ڕۆشتوونەتە ریزی ئەوان، توانیویانە چەند شوێنێکی گرنگی ناوەندە ڕەسمییەکان داگیر بکەن و، ئێستا لەوێوە سەرکردەیی ئەو هێرشە دەکەن لە دژم. ئیتر حکومەتیش یان بەمە نازانێت، یاخود پێی دەزانێت و بواری پێ داون)[2].

(ئایا چ گونا هـ و چ تاوانێك لەوەدا هەیە ڕەخنە لە پیاوێك بگریت و خۆشت نەوێ کە "مزگەوتی ئەیاصۆفیا"ی - کە مایەی شانازیی هەمیشەیی نەتەوەیەکی پاڵەوان و، گەوهەری درەخشانی خزمەت و تێکۆشانیەتی لە پێناوی قورئاندا و، دیارییەکی

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٦٧.

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٩٥.

بەنرخی شمشێری باپیرە قارەمانەکانیەتی - کرد بە خانەی بتان و، بارەگای مەشیەختەتی ئیسلامیی گۆڕی بە دواناوەندیی کچان)[1]؟

(دەمارگیری و هاوڕێیەتیی داواکاری گشتی - کە ئەم چەشنە مەقامەی هەیە - بۆ مستەفا کەمال بوو بەهۆی چەند پرسیار و پەلپ و بیانوویەکی نایاسایی و، هەڵە و، دوور لە پێویست. هەر ئەوەش ناچاری کردم ئەم ڕوونکردنەوانە پێشکەش بکەم کە لە دەرەوەی باسەکەدایە.

لێرەدا، وەك نموونەیەك لەسەر گوفتاری نایاسایی تێکەڵ بە میزاجی کەسیی ئەو، یەکێك لە قسەکانی خۆی دەهێنم:

پێی وتم: ئایا لە هەموو دڵی خۆتەوە لەو قسانەت پەشیمان نیت کە لە "تیشکی پێنجەم"دا هێناوتە؟ چونکە تۆ سووکایەتیت بەو کردووە کاتێ لەبارەیەوە وتووتە:

"هێندە ئارەق و شەرابی خواردووەتەوە کە وەکو کوندەی ئاوی لێ هاتووە"!

منیش لە وەڵامی دەمارگیرییە تەواو هەڵە و نەفرەت لێ کراوەکەیدا، کە هی هاوڕێیەتیی خۆیەتی بۆی، دەڵێم:

شەرەفی سەرکەوتنی سوپای پاڵەوان نابێت تەنیا بدرێتە پاڵ ئەو، بەڵکو تەنها بەشێکی دیاریکراوی لەو سەرکەوتنەدا هەیە، چونکە ستەمێکی ئاشکرا و دەرچوونە لە دادگەری کە دەستکەوت و ماڵ و سامان و ڕۆزیی سوپا بدرێت بە تەنیا یەك کەسی سەرکردە.

جا هەروەك ئەو داواکارە گشتییە دوور لە ویژدانە بەوە تۆمەتبارم دەکات کە ئەو کەسە خاوەن عەیب و عارەم خۆش ناوێت، بە ڕادەیەکی وا کە وەکو کەسێکی خیانەتکار بە نیشتمان دامدەنێت! منیش لە لایەنی خۆمەوە بەوە تۆمەتباری دەکەم کە سوپای خۆش ناوێت، چونکە کاتێ کە ئەو هەموو شەرەف و دەستکەوتە مەعنەوییانەی سوپا دەبەخشێت بە هاوڕێکەی، ئەوا بەم کارەی سوپا لە شەرەفمەندیی خۆی بێ بەش دەکات. کەچی حەقیقەت ئەوە پێویست دەکات کە سەرجەمی چاکەکاری و کارە ئیجابییەکان بەسەر کۆمەڵ و سوپادا دابەش بکرێت..

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٠٠.

بەڵام ناتەواوی و خراپکاری و کردارە سەلبی‌یەکان دەبێ ئاراستەی سەرکردە و کەسی جڵەو بە دەست بکرێت. چونکە "بوون"ی هەر شتێك بە هاتنەدیی سەرجەم پایە و هەل و مەرجەکانی ئەو شتە دێتە دی. سەرکردەش لێرەدا تەنها یەکێکە لەو هەل و مەرجانە. بەڵام بۆ نەهاتنەدی و تێکچوونی ئەو شتە، نەهاتنەدیی تەنها یەك دانە مەرج، یان تێکچوونی یەك دانە لە پایەکانی، سەروزیادە. بۆیە دەتوانرێت ئەو خراپکاری‌یە بدرێتە پاڵ نەخشەساز و سەرۆکی ئەو کارە، چونکە چاکەکاری و لایەنە باشەکان چەند شتێکی ئیجابی و خاوەن "بوون"ن، کەواتە ناکرێ تەنها لەو کەسانەدا جەم بکرێن کە لە سەرۆکایەتیی دەوڵەتدان. بەڵام ناتەواوی و خراپکاری‌یەکان بریتین لە کاولکاری و شتی "نەبوو"، بۆیە سەرکردەکان بەرپرسن لێیان!

مادەم حەق و ڕاستی ئەمەیە، ئەوا چۆن دەکرێ هۆزێك کە چەندین سەرکەوتنی بە دەست هێنابێت، بە سەرۆکەکەیان بوترێت: "دەستت خۆش ئەی حەسەن ئاغا"؟ بەڵام گەر ئەو هۆزە شکست بهێنێت، سووکایەتی ئاراستەی یەك بە یەکی ڕۆڵەکانی ئەو هۆزە بکرێت؟ دیارە ئەم چەشنە ڕەفتارە بە تەواوی پێچەوانەی حەق و دژی ڕاستی‌یە.

بە هەمان شێوە، ئەو داواکارە گشتی‌یەش کە منی تۆمەتبار کردووە، لە حەق و ڕاستی لایداوە، کەچی بە خەیاڵی خۆی بە ناوی دادگەری‌یەوە بڕیار دەدات)[1]!

(سەبارەت بە مەسەلەی ئەو زللەیەش کە لە لایەن پەیامەکانی نوورەوە ئاراستەی مستەفا کەمال کراوە، ئەوا شتێکی پەنهان نی‌یە و، شەش دادگا و سەرجەم لایەنە ڕەسمی‌یەکانی "ئەنقەرە" لێی ئاگادارن و، هیچ ئیعتیرازێکیان لێ نەگرتووە و، بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردین و، سەرجەم کتێبەکانیان داینەوە، کە لە نێوانیاندا "تیشکی پێنجەم"یشی تێدایە. پاشان کاتێ کە من خراپکاری‌یەکانی ئەو دەردەخەم، لە پێناوی پاراستنی ڕێز و حورمەتی سوپادایە. واتە خۆش نەویستنی تەنیا کەسێك لەبەر ستایش کردنی پڕ لە خۆشەویستیی سوپایە)[2].

(گریمان سەرکردەیەکی ترسناك و بلیمەت، بە زیرەکیی خۆی توانیی هەموو کردەوە باشەکانی سوپا بە هی خۆی لەقەڵەم بدات و، کردەوە خراپ و لایەنە

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٤-٥٥٥.
(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٩٧-٥٩٨.

سەلبیەکانی خۆیشی بداتە پاڵ سوپا، ئەوا بەم کارەی سەرجەمی کردەوە چاکەکانی - کە بە ژمارەی هەموو کەسانی سوپا دەبن - کەم کردووەتەوە بۆ کردەوەی چاکی یەك دانە کەس. هەروەها کاتێ کە خراپە و هەڵەکانی خۆیشی دایە پاڵ سوپا، ئەوا ژمارەی ئەو خراپانەی بە ئەندازەی ژمارەی کەسانی ناو سوپا پەرە پێداوە و زیادی کردووە. دیارە ئەمەش ستەمێکی ترسناکە و دژی ڕاستییە.

هەر لەبەر ئەوە، لە دادگاییەکی پێشوومدا کە داواکارە گشتییەکەی لەسەر ئەوە هێرشی کردە سەرم کە لە دەمی لێکدانەوەی فەرموودەیەکی پیرۆزدا پێش چل ساڵ زللەیەکی تەمێ کردنم ئاراستەی ئەو کەسە کردووە[1]، بەو داواکارە گشتییەم وت:

بەڵێ ڕاستە، من بە هێنانی چەند هەواڵێك کە فەرموودە پیرۆزەکان ڕایان گەیاندووە لە شان و شکۆی ئەو کەسە کەم دەکەمەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا شەرەفی سوپا لە هەڵە گەورەکان دەپارێزم. بەڵام تۆ دەچیت لە پێناوی یەك کەسی هاوەڵی خۆتدا شەرەفی ئەو سوپایە چەپەڵ دەکەیت کە هەڵگری ئاڵای قورئان و سەرکردەیەکی بە هەڵمەتی جیهانی ئیسلامی بووە و، چاکەکانی لە بناغەدا هەڵدەوەشێنیتەوە.

بەم قسەیەم، ئەو داواکارە سەری بۆ ویژدان نەوی کرد و، بە پشتیوانیی خوای گەورە لەو هەڵەیە ڕزگاری بوو)[2].

(هەرچەندە سەرۆکە گەورەکە، بە هاندەری وەهم و گومانەکان و ڕق و قینی خۆی، هەندێ کەس و کارمەندی وەزارەتی "داد"ی لە دژمان هان دا، بەڵام بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکانی نوور لە تۆمەتی دامەزراندنی هەر "کۆمەڵە" و "تەریقەت"ێکی سۆفی لە دادگاوە دەرچوو)[3].

[ هەروەها لە دادگادا وتوویەتی ]:

(پیاوێك کە بەوپەڕی توندوتیژی و بە بێ هیچ ترس و بیمێك لە بەردەم ئەو دادگا عورفییە سەربازییەدا کە بەهۆی ڕووداوی "٣١ی مارت"ەوە ساز کرا، بەرگرییەکی یەکجار کاریگەر و دلێرانەی کرد و، لە بەردەم ئەنجومەنی "مەبعووسان"یشدا بە هەمان

(١) مەبەست: مستەفا کەمالە. (وەرگێڕ)

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٨٩.

(٣) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٧٦.

شێوە، بێ ئەوەی گوێ بە تووڕەیی و هەڵچوونی مستەفا کەمال بدات.. چۆن ئەو کەسە بەوە تۆمەتبار دەکرێت کە گوایا بە نهێنی و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت ماوەی هەژدە ساڵی ڕەبەق پیلانی سیاسی دەگێڕێت؟ ئەو کەسەی تۆمەتی وای ئاراستە بکات بێ هیچ گومانێك کەسێکی قین لە دڵە)[1].

(مادەم خودی مستەفا کەمال و، دوو دادگا و، والیی سێ پارێزگا نەیانتوانی ئەم سەرسەختی و عینادی‌یەی بشکێنن، دەبێ ئێوە چی بن کە بتانەوێت ئەم هەوڵە بێ سوود و نەزۆکە بدەن! یان بۆچی هەوڵێکی ئاوا بێ ئەنجام دەدەن لە کاتێکدا کە هیچ خێرێکی نە بۆ نەتەوە و نە بۆ ئەم حکوومەتە تێدا نی‌یە)[2]؟

[لە نامەیەکیدا بۆ قوتابیانی نووسیویەتی]:

(بەپێی نهێنیی دەستووری: "الخير فيما اختاره الله" دواکەوتنی ئەم مەسەلەیەمان خێری تێدایە. چونکە خۆشویستنی ئەو پیاوە مردووە ترسناکە، لە هەموو قوتابخانەکان و فەرمانگەکانی حکوومەت و لە ناوەندە گشتی‌یەکانی گەلدا، هەردەم دەوترێتەوە و بە گوێی خەڵکیدا دەدرێت. ئەم حاڵەتە کاریگەری‌یەکی یەکجار دڵتەزێن و ئازاربەخشی لە جیهانی ئیسلامی و لە ئایندەشدا دەبێت)[3].

□ ڕەخنەگرتنی لە سەرۆك کۆمار[4]

(هۆکاری بنەڕەتیی هێرشی داخ لە دڵان لە دژی من ئەوەیە کە بە بیانووی خۆشەویستی و پشتگیری‌یان بۆ مستەفا کەمال دەمهاڕن و ئازارم دەدەن!

وا منیش بەو ڕقاوی و داخ لە دڵانە دەڵێم:

من لە بارەی کەسێکەوە کە مرد و کۆتایی پێ هات و پەیوەندیی بە حکوومەتەوە نەما، وتوومە: لە ئاخر زەماندا کەسێك پەیدا دەبێت زیان بە قورئانی پیرۆز دەگەیەنێت! ئەمەشم سێ ساڵ پێش پەیدا بوونی وت و، کاتی خۆی لە فەرموودەیەکی پیرۆزەوە وەرمگرتبوو. پاشان ڕۆژگار دەری خست کە ئەو کەسە "مستەفا کەمال"ە!!

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٨.

(٢) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٦٣.

(٣) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٥٢٢.

(٤) ئەمە پاشکۆی ئەو عەرزوحاڵەیە کە پێشکەشی سەرۆك کۆمار [جەلال بایار] کرا، ناچار بووم بینووسم. (دانەر)

جا ئەو ڕق لە دڵانەی کە لایەن و پشتی مستەفا کەمال دەگرن، وا ماوەی بیست ساڵە، بە چەند بڕوبیانوویەکی پڕوپووچ، ئەشکەنجە و ئازارم دەدەن، چونکە من ناچم کارێکی پێچەوانەی ڕاستی بکەم و هەموو سەربەرزی و شانازی و سەرکەوتنەکانی ئەو سوپایەی پێنج سەد ساڵە بە قارەمانێتی و خۆبەختکارییەوە لە پێناوی حەقدا تەحەددای جیهانی کردووە، بدەمە پاڵ مستەفا کەمال!

بەڵێ، وەك لە دادگادا چەسپاندم: هەموو شانازی و دەسکەوت و کردارە چاکە ماددی و مەعنەوییەکان دەبێ بدرێنە پاڵ کۆمەڵ و بەسەر ئەواندا دابەش بکرێن، بەڵام تاوان و گوناهەکان و هەڵسوکەوتە هەڵەکان دەبێ بدرێنە پاڵ سەرۆکەکەیان.

جا لەبەر ڕووناکیی ئەم دەستوورە ڕاستەقینەیەدا دەڵێم: ئەو شەرەف و شانازییانەی کە سوپا لە ڕێی سەرکەوتنەکانی خۆیەوە بەدەستی هێنان، بە تایبەت هی ئەفسەرە قارەمانەکان کە سەرکردایەتیی سوپایان لە ئەستۆدا بوو، نابێ بە هی مستەفا کەمال دابنرێن، بەڵکو تەنها هەڵە و ناتەواوی و گوناهەکانی دەدرێنە پاڵ!

جا ئەو کەسانەی کە بە خۆش نەویستنی مستەفا کەمال تۆمەتبارم دەکەن، لە ڕاستیدا سووکایەتی بە شان و شەرەف و کەرامەتی سوپا دەکەن. بۆیە من بە خیانەتکارانی نەتەوەیان دادەنێم و، بەو چاوە دەڕوانمە ئەو سەرسەختە لایەنگرانەی مستەفا کەمال و، ئامادەشم ئەم ڕاستییەیان پێ بسەلمێنم، وەك لە بەردەم دادگادا چەسپاندم:

"من ملیۆنەها سەرباز و ئەفسەری سوپای کۆڵنەدەری ئەم نەتەوە خاوێنەم خۆش دەوێت و، هەتا بتوانم بۆ پاراستنی عیززەت و کەرامەت و ڕێزیان تێدەکۆشم. کەچی ناحەزە ڕق لە دڵەکانم کە بەرامبەرم ڕاوەستاون، لە ناوەرۆکدا سووکایەتی بە شان و شکۆی ملیۆنەها کەسی ئەم سوپایە دەردەبڕن و، لە پێناوی خۆشویستنی تەنها یەك کەسدا دوژمنایەتییان دەکەن".

بەڵێ، بە چەند نیشانەیەکی زۆر بۆمان دەرکەوتووە کە: تەنها لەبەر ئەوەی "مستەفا کەمال"م خۆش ناوێت و نەیاری بووم، ئەو ڕق لە دڵانە هێرشم دەکەنە سەر و، هۆکارەکانی تر هەموویان بڕوبیانووی پڕوپووچ و دەست هەڵبەستن. بۆیە ناچار بووم کە بەو نەیارانەم بڵێم:

مستەفا کەمال خۆی بانگی کردم بۆ ئەنقەرە تاکو ڕێزم لێ بگرێت و بمکات بە واعیزی گشتیی هەموو کوردستان (پارێزگاکانی خۆرهەلات). منیش ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە، بەلام ئەم سێ ماددانەی خوارەوە هانیان دام واز لە خۆشویستنی بهێنم و، لە ئەنجامی ئەم وازهێنانەشدا بیست سالی ڕەبەقم بە ئازاری ژیانی گۆشەگیری و پڕ لە ئەشکەنجە و ئازار بردە سەر و، توخنی کاروبارە دنیاییەکانی ئەوان نەکەوتم:

*ماددەی یەکەم:*

بە کردار و ڕەفتارەکانی خۆی دەری خست کە "مستەفا کەمال" ئەو کەسەیە فەرموودەی پیرۆز ڕایگەیاندووە: لە ئاخر زەماندا کەسێك پەیدا دەبێت هەولی زیان گەیاندن بە داب و نەریتە ئیسلامی‌یەکان دەدات! من سی و شەش سال پێشتر ئەو فەرموودە پیرۆزەم لێکدابووەوە. پاشان بە تەواوی واتاکەی لەم کەسەدا هاتە دی! ئەمەشم لە ماددەی سێ‌هەمی بەرگری‌یەکانم لە بەردەم دادگادا، ڕوون کردووەتەوە.

*ماددەی دووهەم:*

"بوون" و "بینا" و "ژیان"ی هەرشتێك بەندە بە بوونی "هەموو" پایە و هەل و مەرجەکانی ئەو شتەوە. بەلام "نەبوون" و "ڕووخان" و "مردن"ەکەی بە تێکچوون یان نەهاتنەدیی تەنها "یەك" مەرج ڕوو دەدات. ئەمەش دەستوورێکی هێندە ڕاستەقینەیە کە لەسەر زمانی خەلکیدا ئەم قسەیە وەك پەندی لێ هاتووە و دەلێن:

"وێرانکاری لە ئاوەدانکردنەوە ئاسانترە"!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە بەهێز و توندوتۆلە:

هەرچی ناتەواوی و عەیبە و کاولکاریی ڕوالەتی و سامناك ڕوویان داوە، هەموویان هی هەلەکانی ئەو سەرکردەیەن! بەلام سەرکەوتنە درەخشانەکان هی قارەمانێتیی سوپان.

جا لە کاتێکدا کە دەبوو سەرجەمی خراپکاری‌یەکانی بدرێنە پال و، کردارە چاکەکانیش بە هی سوپا دابنرێن، کەچی ئەم پێویستی‌یە بە تەواوی پێچەوانە کراوەتەوە، ئەوەتا کردارە چاکەکانی کۆمەل دەدرێنە پال ئەو کەسەی کە خراوەتە پێشەوە و، خراپەکانی ئەویش دەدرێنە پال کۆمەل! دیارە ئەمەش ستەمێکی چەپەل و ئابڕووبەرە.

*ماددەی سێ هەم:*

گێڕانەوەی چاکەکاری‌یەکانی کۆمەڵ و سەرکەوتنەکانی سوپا بۆ سەرکردەی فەرماندە، هەروەها گێڕانەوەی گوناهەکانی ئەو فەرماندەیەش بۆ هەموو کۆمەڵ، ئەوە دەگەیەنێت کە سووکایەتی بە شان و شکۆی هەزاران کردەوەی چاك بکرێت و بهێنرێنە ئاستی یەك دانە کردەوەی چاك و، لە هەمان کاتدا یەك کرداری خراپیش بکرێت بە هەزاران هەڵە و کردەوەی خراپ..

چونکە هەروەك ئەگەر تیپێکی سوپا دوژمنێکی سەرسەخت بکوژن، ئەوا هەموو یەکێکی سەربازەکانی ئەو تیپە پلەی موجاهیدیان دەدرێتێ، بەڵام گەر ئەم پلەیە تەنها بە فەرماندەکەیان بدرێت، ئەوا هەزار پلەی موجاهید دادەبەزێنرێنە تەنها یەك دانە پلە..

هەروەها گەر لە ئەنجامی هەڵەیەکی فەرماندەی ئەو تیپەوە تاوانێکی قەتڵ ڕوو بدات و پاشان ئەم تاوانە بخرێتە ئەستۆی هەموو یەکێکی ئەو تیپەوە، ئەوا یەك دانە تاوانەکە زیاد دەکات و لە حوکمی هەزار تاواندا دەبێت. چونکە ئەو کاتە - بۆ نموونە - هەزار سەرباز لەو تاوانە بەرپرسن و شایانی سزا دەبن لەسەری!

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، ئەم مەسەلەیەش بە هەمان جۆرە. چونکە هەڵە گەورەکان زۆر ئاشکرا و لە بەرچاون. جا ئەگەر نەخرێنە ئەستۆی ئەو پیاوە مردووەی کە هەر خۆی ئەنجامی داون و، بدرێنە پاڵ ئەو سوپا مەزنە بەڕێزەی کە لە پێش چاوی هەموو جیهاندا جیهادی لە پێناوی هێنانەدیی حەقدا دەرخست و، بە خوێن و شمشێرەکانیشی شایەتیی سەربەرزی و بڵند ڕاگرتنی ئاڵای قورئانی لە ماوەی پێنج سەد بەڵکو هەزار ساڵدا سەلماند، ئەوا ئەو گوناهانە دەبن بە هەزاران گوناه و بە ئەندازەی ژمارەی ئەرکانەکانی ئەو سوپایە زیاد دەکەن و، بەمەش ڕابوردووی بەرز و مایەی شانازیی ئەو سوپایە بە شێوەیەکی سامناك چەپەڵ دەبێت و دەشێوێت و، مێژووەکەشی بە ڕادەیەك ڕەش دەبێت کە سوپای ئەم چەرخە بەرپرس و شەرمەزار دەکات لە بەردەم سوپا پاڵەوانەکانی چەرخەکانی پێشوودا..

هەروەها گەر سەرکەوتنە درەخشانەکانی سوپا و شانازی و دەسکەوتەکانی ئێستای بدرێنە پاڵ تەنها یەك دانە کەس، ئەوا دەبن بە شتێکی جوزئی و، ئەو کردەوە چاك و

جیهادانەش کە هێندەی ژمارەی ئەرکان و سەربازەکانی سوپا دەبن، دێنە خوار و دەچنە حوکمی چاکەی یەك دانە کەس. دیارە لەو کاتەشدا ئەو ڕووناکی‌یە درەخشانە دەکوژێتەوە و نابێت بە کەفارەتی تاوان و گوناهەکان.

لەبەر ئەم هۆکارانەیە کە وازم لە خۆشویستنی ئەو پیاوە هێنا و، خۆشویستنی ئەو سوپایەم دەسکەوت کە بە کردەوە و، بە جۆرێکی کاریگەر و، لە کاتێکی ناسکی سەختەتدا، لە ڕیزەکانیدا خزمەتم کردووە. هەروەك بە پەیامەکانی نووریش هەوڵی پارێزگاریی شەرەفی ئەو سوپایەم داوە کە هەزار جار لە هەر تاکە کەسێك بەرز و بڵندترە)[1]!

❑ حاڵەتی ڕۆحیی لە ئەنقەرە

(لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا ڕۆشتمە سەر لوتکەی قەڵاکەی ئەنقەرە، کە لە من گەلێ زیاتر دووچاری پیری و پرتووکان بووبوو!

لەوێ ئەو قەڵایەم وەك ڕووداوە مێژوویيە بە بەردبووەکان هاتە بەرچاو!

جا بەهۆی پیربوونی ساڵ لە وەرزی پایزدا و، پیریی خۆم و، پیریی قەڵاکە و، پیریی مرۆڤایەتی و، پیریی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و، مردنی خەلافەت و، پیربوونی دنیا بە گشتی، خەمێکی قووڵ، ناخی دەروونمی گرتەوە و تەزوویەکی بەتینیش بە جەستەمدا هات..

ئەو حاڵەتە، ناچاری کردم کە لەسەر لوتکەی ئەو قەڵایەوە چاو بەناو بەرزاییەکانی ئایندە و شیو و دۆڵەکانی ڕابوردوودا بگێڕم و، بە دوای نوور و ئومێد و شتێکی دڵخۆشکەردا بگەڕێم، تاکو شەوەزەنگی چڕ و تاریکی ئەو بارە ڕۆحی‌یەم بۆ ڕووناك بکاتەوە و، لە تاریکایی ئەو هەموو چەشنە پیری‌یە تێك ئاڵاوانەی دەورووبەرم، کە نوقمی بووە، دەری بهێنێت[2]!

بۆ مەبەستی چاوگێڕان بە دوای نوور و ئومێددا، ئاوڕێکم بە لای ڕاستدا - کە ڕابوردووە - دایەوە. ئەم لایەم لە دوورەوە لە شێوەی گۆڕستانی باوك و باپیرانم و

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/ ٤٥٦-٤٦٠.

(٢) ئەم حاڵەتە ڕۆحی‌یە لە شێوەی موناجاتدا، بە زمانی فارسی هاتە دڵمەوە و نووسیم، پاشان لە پەیامی (حەباب)دا لە ئەنقەرە چاپ کرا. (دانەر)

تێکرای مرۆڤایەتیدا هاتە پێش چاو. واتە لە بریی ئەوەی دڵم بداتەوە و نوورێکم پێ ببەخشێت، کەچی ئەوەندەی تر بێزاری کردم و دڵی داگرتم!

پاشان ئاوڕم بە لای چەپدا دایەوە - کە ئایندەیە - بەو نیازەی دەرمانێکم تێدا دەست بکەوێت. کەچی ئەم لایەم لە شێوەی گۆڕستانێکی گەورە و تاریکی خەم و هاوچەشنەکانم و نەوەکانی داهاتوودا بینی! بەم جۆرە، ئەم لایەش دەردەکەی گرانتر کردم!

دوای ئەوەی کە دڵم لە "ڕابوردوو" و "ئاینده" هەڵکەندرا، سەیرێکی کاتی "ئێستا"م کرد. یەکسەر لە بەرچاوی ڕوانینی مێژوویمدا ئەم کاتەم لە شێوەی تابووتی تەرمی جەستەی تێکشکاوم و، بە وێنەی سەربڕاوێك لە نێوان ژیان و مردندا، هاتە پێش چاو!

کە دەستم لەم لایەش داشۆرد، سەرم بەرز کردەوە و بۆ چڵەپۆپەی درەختی تەمەنی خۆمم ڕوانی. بینیم تەنها یەك دانە بەری گرتووە، ئەویش تەرمەکەی خۆمە و بۆم دەڕوانێت! لەتاوا سەرم داخست و ڕوانیمە ڕەگ و ڕیشەی درەختی تەمەنم. بینیم خاك و گڵی ژێر پێم، تێکڕا گڵی جەستە و ئێسکی پرتووکاوی منن کە تێکەڵی یەکتری بوون و خەڵکی بەسەریاندا دەڕۆن و پێی پێدا دەنێن!

بەم شێوەیە، ئەم دوو ڕوانینەش، لە بریی ئەوەی دەرمانم بدەنێ و زامەکەم سارێژ بکەن، کەچی دەردەکەیان پتر بۆ گران کردم و هیچ دەرمانێکم تیایاندا بەدی نەکرد!

لە ناچاریدا ئاوڕێکم بە لای "دوا"وە دایەوە. بینیم ئەم دنیا فانی‌یە بەرەو شیو و دۆڵی بێهوودەیی و ڕووەو تاریکستانی "نەبوون" تلۆر دەبێتەوە!

ئەم سەیر کردنە، ژەهری بەسەر زامەکەمدا کرد و، لە بریی ئەوەی سارێژ و تیماری بکات پتر کولاندیەوە و هێنایەوە سۆ.

کە لەم لایەش نائومێد بووم، سەیرێکی "بەردەم"ی خۆمم کرد و ڕوانیمە دوور. دەبینم وا گۆڕەکەم لەسەر چەقی ڕێگادایە و دەمی لێ کردوومەتەوە و، چاوەڕێم دەکات! لە پشتیەوە ئەو ڕێگا دوور و درێژە نەبڕاوەیەش دەردەکەوێت کە چین لە دوای چینی کاروانەکانی گرۆی مرۆڤی پێدا تێپەڕ دەبن!

منیش لە بەردەم ئەم هەموو گیروگرفتە سەخت و سەرسووڕهێنەرانەی کە لە هەر شەش لامەوە ڕووم تێدەکەن، بینیم هیچ پاڵپشتێکم نییە کە پشتی پێ ببەستم و، جگە لە بەشێکی بچووکی ئەو ویستە هەندەکی یە(الإرادة الجزئية) نەبێت کە پێم بەخشراوە، هیچ چەکێکی ترم بە دەستەوە نییە.

کەواتە لە بەردەم هەموو دوژمنانی زۆر و شتانی زیانبەخش و لە ژمارە نەهاتوودا تەنها ئەو چەکە مرۆڤانەیە نەبێت کە بریتییە لە (جوزئی ئیختیاری) هیچی تر شك نابەم.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم چەکەش لە خۆیدا کۆڵەوار و ناتەواوە و، ناتوانێت بڕواتە ناو کاتی "ڕابوردوو" تاکو خەم و خەفەتەکانی ئەویێم نەهێڵێت و، بیشچێتە ناو "ئاینده"وە تاکو هەر شتێکی سامناك لە ڕێگامدایە لەناویان ببات، ئەوا دڵنیا بووم لەوەی کە نە دەستەڵاتی چارەسەرکردنی سەرجەمی ئازارەکانی خۆمم هەیە و، نە دەشتوانم گشت هیوا و ئاواتەکانی ڕابوردووم و داهاتووم بهێنمەدی. بۆیە لە ناچاریدا دەست لەئەژنۆ دانیشتم و دۆش دامام!

لەم کاتەدا کە لە هەر شەش لامەوە چەندین جۆری بێزاری و سەرسامی و نائومێدی و تاریکی دەورەیان دابووم، "نوورەکانی ئیمان"م بینی کە لە ڕووی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیانەوە دەدرەوشانەوە!

ئەم نوورانە بە هانامەوە هاتن و، هەر شەش لاکانیان بە چەندین نووری درەخشان بۆ ڕووناك کردمەوە، بە چەشنێك کە ئەگەر ئەو بێزاری و تاریکییە زۆرانەی گەمارۆیان دابووم سەد جارەش بیوونایەتەوە، ئەو نوورانە سەروزیادی ڕووناککردنەوەی هەموویان دەبوون.

بەم جۆرە، ئەو نوورانەی ئیمان یەك بە یەکی ئەو زنجیرە سامناك و درێژانەیان گۆڕی بە دڵدانەوە و ئومێد و، سەرجەمی مەترسییەکانیشیان کرد بە هیوای گیان و، ئارامی و ئاسوودەیی لە دڵ و دەروونددا!

بەڵێ، "ئیمان" توانیی ئەو وێنە سامناکەی "ڕابوردوو" - کە گۆڕستانێکی گەورە بوو - بدڕێنێت و، بیگۆڕێت بە ئەنجومەنێکی نوورانی و کۆگای خۆشەویستان. ئەمەشی بە "عين اليقين" تەنانەت بە "حق اليقين" پیشان دام..

هەروەها ئەو "داهاتوو"ەی کە کاتێ بە چاوی بێ ئاگاییەوە سەیری دەکەین وەکو گۆڕێکی گەورە و فراوان دێتە پێش چاومان، "ئیمان" بە "علم اليقين" پیشانی دام کە لە ڕاستیدا ئەنجومەنی میوانداریی خوای گەورەی میهرەبانە، کە لە کۆشکەکانی بەختیاریی هەمیشەییدا بۆ میوانەکانی خۆی ئامادەی کردووە..

پاشان "ئیمان" ئەو دیمەنی تابووت و تەرمەی کاتی "ئێستا"ی تێکشکاند و، تێیگەیاندم کە کاتی ئێستام مەڵبەندێکی بازرگانییە بۆ دواڕۆژ و میوانخانەیەکی ڕازاوەی خواییە..

ئنجا ئەو تاقانە "بەر"ەی درەختی تەمەن، کە چاوی بێ ئاگایی لە شێوەی "تەرم"دا پیشانی دام، دەرکەوت بەو جۆرە نییە. چونکە "ئیمان" بە "علم اليقين" پیشانی دام کە ئەوە بریتییە لە دەربازبوونی "گیان"م - کە شیاوی ژیانی هەمیشەییە و دەستنیشان کراوی بەختیاریی هەتاهەتایە - لە هێلانە کۆنەکەی خۆی بەرەو ژیانی ناو ئاسۆی ئەستێرەکان و گەشتوگوزار لە ناویاندا..

پاشان ڕازە نهێنییەکانی "ئیمان" دەریانخست کە خاکی ئێسکی پرتووکاوم و خاکی سەرەتای دروستبوونم بەو شێوە کەم نرخە نییە کە پێی پێدا بنرێت، بەڵکو دەرگای میهرەبانیی خوای گەورە و پەردەی سەر ڕووی هۆڵەکانی بەهەشتە..

ئنجا کە یەکەم جار بە چاوی بێ ئاگایی دەمڕوانییە حاڵ و بارودۆخە داڕووخاوەکانی "دنیا" وا دەهاتنە پێش چاوم کە لە شیو و دۆڵی بێهوودەییەوە بکەونە ناو تاریکایی "نەبوون"ەوە. کەچی "ئیمان" پیشانی دام کە ئەم ئاڵوگۆڕانەی دنیا بریتین لە نامە و نووسراوە صەمەدانییەکانی خواوەند و، لاپەڕەکانی نەخشونیگاری ناوە جوانەکانی، کە ئەرکی سەرشانیان ئەنجام داوە و، واتاکانی خۆیان ڕاگەیاندووە و، بەرهەم و ئاکامی خۆیان لە بوونەوەردا بەجێ هێشتووە.

بەم جۆرە "ئیمان" هەتا پلەی "علم اليقين" بەها و چییەتی(ماهیـة)ی دنیای پێ ناساندم..

پاشان ئەو "گۆڕ"ەی کە لەوەو پێش وامدەزانی بۆم دەڕوانێت و، لەسەر چەقی ڕێگا لە مەڵاسدایە و چاوەڕوانم دەکات، "ئیمان" بەهۆی نووری "قورئانی پیرۆز"ەوە دەری

خست کە ئەو گۆڕە بیرێك نی‌یە دەمی لێ پان کردبێتمـەوە، بـەڵکو پیشـانی دام کـە ئـەو گۆڕە لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە دەرگای چوونەژوورەوە بۆ نـاو "جیـهانی ڕوونـاکی". ئـەو ڕێگا دوور و درێژەش بە تاریکایی و نەبوون کۆتایی پێ نایەت، بەڵکو ڕاستە شـەقامێکە بەرەو جیهانی "ڕووناکی" و "بوون" و "بەختیاریی هەمیشەیی".

بەم جۆرە.. ئەم حاڵەتانە بوون بـە دەرمـانی دەرد و مەلهەمی زامەکانم. ئەمانەشم بە شێوەیەکی هێندە ئاشکرا بەدی کرد کە گەیاندمیانە قەناعەتێکی تەواو بەو ئەنجامانە.

پاشان ئەم "جوزئی ئیختیاری"یە کەمەی کە تەنها دەستکەوتێکی تابلێیت هـەندەکیی هەیە، "ئیمـان" بەڵگەنامەیـەکی ئـەوتۆی پێ بەخشـی کـە بەهۆیـەوە پـاڵ بـە توانسـتێکی ڕەهاوە بداتەوە و، پەیوەندیی بە میهرەبانی‌یەکی فراوانیشەوە بکـات لـە دژی ئـەو هـەموو دوژمنـە لەژمارەبەدەر و تاریکی‌یـە زۆرانـەی کـە لـە هـەموو لایەکـەوە دەورەیـان داوە. تەنانەت هەر خودی "ئیمان" دەبێت بە بڕوانامەیەك بە دەست "جوزئی ئیختیاری"یەوە.

ئنجا هەرچەندەش ئـەم جوزئـە ئیختیاری‌یـە – کـە چـەکی مرۆڤـە – خـۆی لـە خۆیـدا کۆڵەوار و، کەم و، کۆتا و، ناتەواوە، بەڵام ئەگەر بە ناوی خواوەندی حەق و لە پێناوی خوا و لـە ڕێگـای ئـەودا بـەکارهێنرا، ئـەوا بـە نـاوی ئیمانـەوە بەهەشتێکی هەمیشـەیی و فراوان بە پانتایی پێنج سەد ساڵ ڕێ دەستی خاوەنەکەی دەخات..

ئیماندار لەمەدا وەك ئـەو سـەربازە وایـە کـە ئەگـەر هێزە هەندەکی‌یەکـەی خـۆی بە ناوی دەوڵەتەوە بەکار بهێنێت، دەتوانێت بە ئاسانی چـەند کـارێکی ئـەوتۆ ئـەنجام بـدات کە بە هەزاران جار لە هێزە تایبەتی‌یەکەی خۆی گەورەتر بێت.

ئنجا هەروەك "ئیمان" بەڵگەنامەیەك بـە دەستی "جوزئـی ئیختیـاری" دەسپێرێت، لـە هـەمان کـاتدا جڵـەوی جوزئـی ئیختیـاریش لـە دەست "جەستە" دەسێنێتەوە کـە هیـچ دەستەڵاتێکی بەسەر ئاینده و ڕابوردوودا نی‌یە و، دەیداتە دەست "دڵ" و "گیان"!

جا لەبەر ئەوەی بازنـەی "دڵ" و "گیـان" بـە وێنـەی جەسـتە پابەندی "کـاتی ئێسـتا" نی‌یە و، چەند ساڵێکی ئاینده و ڕابوردووش لـە سنووری بازنـەی ژیـانی دڵ و گیـاندان، ئەوا ئەم جوزئە ئیختیاری‌یە لە هەندەکی‌یەوە دەردەچێت و دەبێت بە هەمەکی!

ئیتر هەروەك بە "هێزی ئیمان" دەڕواتە ناو قووڵایـی شیو و دۆڵـەکانی "ڕابـوردوو" و تاریکیی خەم و خەفەتەکانی ئەوێ لـەناو دەبات، بە هـەمان جۆر و بـە "نـووری ئیمـان"

سەردەکەوێت و دەفڕێت تا دەگاتە لوتکەی بەرزاییەکانی "ئاینده"ش و هەموو مەترسی‌یەکانی تێدا لەناو دەبات)[1]!

□ پوختەی ئەم ماوەیەی ژیانی لە ئەنقەرە

سەرۆك کۆمار ویستی بەلای خۆیدا ڕایبکێشێت، تاکو سوود لە پێگەی ئەو وەربگرێت لە خۆرهەڵاتی وڵاتدا و، داوای لێ کرد ببێت بە ئەندامی پەرلەمان، هاوکات لەگەڵ مانەوەی ئەندامێتیی لە "دار الحكمة الاسلامية"دا، هەروەها مەنسەبی واعیزی گشتیی خۆرهەڵاتی وڵات بگرێتە ئەستۆ لە بریی "شێخی سەنووسی".. هەروەها تەرخانکردنی "ڤێلا"یەکی گەورەش بۆی.. جگە لە خستنەبەری تەماعەکانی تری هاوشێوەی ئەمانە..

بەڵام لەبەر ئەوەی بەدیعوززەمان لەوێ ئەو وەسفانەی بینی کە لە فەرموودەی پیرۆزدا لەبارەی کەسەکانی ئاخر زەمانەوە (دەجاڵ و سوفیانی) ڕیوایەت کراون و، کاتی خۆی لە ئەستەمبووڵ پێش "سەردەمی سەربەستی" تەئویلی کردبوون، دڵنیا بوو لەوەی کە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو جۆرە کەسانە تەنها بە نوورەکانی ئیعجازی قورئان دەکرێت، نەك بە ڕێبازی سیاسەت..

لەبەرئەوە، دەستی بە ڕووی سەرجەم پێشنیارەکانی مستەفا کەمالەوە نا و، ئەنقەرەی بەجێ هێشت، دوای ئەوەی کە تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە حکوومەتی نوێ بۆ ئەو پەرلەمانتارانە ڕوون کردەوە کە ئامادەی ماڵئاوایی و بەڕێکردنی بوون و، جەختیان لێ دەکرد کە لە ئەنقەرە بمێنێتەوە بۆ هاوکاریی حکوومەتی نوێ[2].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٥٩-٤٦٢.

(٢) .Tarihce-i Hayat, ilk Hayati لە ماوەی نێوان ٤/٣٠ -١٩٢٣/٥/١٣ ئەنقەرەی بە جێ هێشت. لەو کەسایەتی‌یانەی کە هاتبوون بۆ بەڕێکردن و خواحافیزیی "کازم قەرەبەکر" و "ڕەئووف ئوربای" و سەرکردەکانی هاوشێوەیان بوون کە زۆر جەختیان لێ کرد لە ئەنقەرە بمێنێتەوە و بەجێی نەهێڵێت. بەڵام قایل نەبوو لەوێ بمێنێتەوە. بۆیە بە شێوازێکی جوان دەستی بە ڕووی داواکاری‌یەکەیانەوە نا. (ب: ١/٥٠٥) لە دەفتەری تێبینی‌یەکانی "زوبەیر گوندوز ئالب"ەوە، ل: ٩١.

## بەندی سێهەم

## دوور کەوتنەوەیەکی ڕەنگین

## ساڵی ١٩٢٣ز/١٣٤٠ك

☐ بەرەو "وان"[1]

(ڕۆشتمەوە بۆ وان. لەوێ پێش هەموو شتێك ڕۆشتم بۆ سەردانی قوتابخانەکەم کە ناوی "خورخور" بوو..

بینیم لە دەمی داگیرکردنی ئەم شارەدا لە لایەن ڕووسەکانەوە، ئەرمەنەکان قوتابخانەکەم و خانووەکانی ئەم شارەیان سووتاندووە!

ئنجا سەرکەوتمە سەر قەڵا بەناوبانگەکەی "وان" کە تاشە بەردێکی زەبەلاحە و قوتابخانەکەم ڕاستەوخۆ لە تەنیشت و داوێنی ئەو قەڵایەدا بنیات نرابوو..

لەم کاتەدا تارمایی هاوەڵ و برایانی ڕاستەقینەم، لە قوتابیانی قوتابخانەکەم، بە پێش چاودا دەهات و دەچوو کە حەوت ساڵ بوو بەجێم هێشتبوون!

ئەوەبوو دوای ڕوودانی ئەو کارەساتە سەخت و ناهەموارە، هەندێ لەو هاوڕێ گیانفیدایانەم لە ڕاستیدا شەهید بووبوون و، هەندێکی تریشیان پلەی شەهیدی مەعنەوی‌یان بەدەست هێنابوو. کە ئەمەم دی، خۆم پێ ڕانەگیرا و بەکوڵ دامە گریان!

پاشان ڕۆشتمە سەر لوتکەی ئەو قەڵایە، کە بە ئەندازەی هەردوو منارەکە بەرز بوو و بەسەر قوتابخانەکەمدا دەیڕوانی. لەوێ دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە و تێڕامان..

---

(١) لە مانگی ٥/١٩٢٣زدا.

جا لەبەر ئەوەی من لەوێ تەنیا بووم و، هیچ شتێکیش نەبوو ڕێی یادکردنەوەی ئەو ڕۆژگارانەم لێ بگرێت و، لە خۆیشمدا ئەندێشەم بەهێزە.. ئەوا بە بیر و ئەندێشەم گەڕامەوە بۆ هەشت ساڵ پێشتر و، یادی ئەو کاتانەم کردەوە کە لەوێ بەسەرم بردبوون..

بینیم لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا گۆڕانێکی گەلێ گەورە بەسەر ئەم شارەدا هاتووە! تەنانەت هەر کە چاوم دەکردەوە هێندە گۆڕانکاریم بەدی دەکرد کە دەتوت چەرخێك بە خۆی و ڕووداوەکانیەوە بەسەر ئەم شارەدا تێپەڕیوە! چونکە سەنتەری ئەم شارە مەزنەی دەورانەوری قوتابخانەکەم - کە لە تەنیشتی ئەو قەڵایەدا بوو - سەرانسەری سووتێنرابوو، یان بە تەواوی کاول کرابوو!

ئنجا بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە سەیرێکی ئەم دیمەنەم کرد و خەفەتێکی گەلێ زۆرم پێ خوارد، چونکە جیاوازی‌یەکی یەکجار گەورەم لە نێوان ئێستا و ئەوسای ئەم شارەدا دەبینی! وەك بڵێی دوو سەد ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕ بووبێت!

زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەم خانووانەیان ئاوەدان کردبووەوە، دۆست و خۆشەویست و ئازیزانی من بوون. کەچی وا ئێستا هەندێکیان بە کۆچ کردنیان لەم شارە، تیاچوون و تاڵیی کۆچکردنیان چەشت، خوای گەورە بە سۆز و میهرەبانیی خۆی لە هەموویان خۆش ببێت. چونکە جگە لە گەڕەکی ئەرمەنەکان، سەرانسەری شار و سەرجەمی خانووی موسڵمانەکان کاول کرابوو!!

ئەوەندە لە ناخی دڵمەوە خەفەتم بەو دیمەنە خوارد کە ئەگەر هەزار چاوم ببوایە بە هەر هەموویان فرمێسکم هەڵدەڕشت!

پێشتر وام دەزانی بە گەڕانەوەم بۆ شارەکەم لە غەریبی ڕزگارم دەبێت. کەچی - بە داخەوە - دڵتەزێنترین جۆری غەریبیم لە شارەکەی خۆمدا بەدی کرد!

چونکە بە سەدان کەسم دەبینی لە قوتابی و خۆشەویستانی وێنەی "عەبدوڕەحمان"ی ناوبراو، لەوانەی کە پەیوەندی‌یەکی ڕۆحیی توندوتۆڵمان لە نێواندا بوو، دەمبینی هەموویان کەوتوونەتە ژێر خاك و داروپەردووی کەلاوەی ئەم شارە و، تەنها شوێنەواری خانووەکانیان نەبێ هیچی تریان بەرچاو ناکەوێت!

لە بەردەم ئەم تابلۆ خەمناکەدا، ناوەرۆکی ئەو وتەیەم لەبەرچاودا بەرجەستە بوو کە لە مێژە لە یادم ماوە و زووتر بە تەواوی لێی تێنەدەگەیشتم، کە دەڵێت:

لولا مفارقةُ الأحبابِ ما وَجَدَتْ    لـهـا المنـايا إلى أرواحِنا سُبُلاً[١]

واتە زۆربەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەفەوتێنن: جودایی خۆشەویستانە!

بەڵێ، هیچ شتێك بە وێنەی ئەم کارەساتەی باسم کرد، ئازاری نەداوم و نەیخستوومەتە گریان! خۆ ئەگەر یارمەتیم لە "قورئانی پیرۆز" و "ئیمان"ەوە بۆنەهاتایە، ئەوا ئەو خەم و پەژارانە سەروزیادی ئەوە بوون گیانم بکێشن!

بە چاوی خۆم تابلۆی خەمناکی ئەو جوداییەم دی کە هەر لە کۆنەوە شاعیران کاتێ مەنزڵگای دێرینی خۆشەویستانیان بەسەر دەکردەوە، دەیانبینی و فرمێسکیان بۆ هەڵدەڕشت.

ئیتر هاودەم لەگەڵ "چاو"مدا "دڵ" و "گیان"یشم بە وێنەی کەسێك پاش دووسەد ساڵ گەڕابێتەوە بۆ شوێنەواری مەنزڵگای خۆشەویستانی، بە کوڵ دەستیان دایە پرمەی گریان!

لەم کاتەدا بە وێنەی دیمەنەکانی فیلمی سینەما، یەك لە دوای یەکی لاپەڕە جوان و خۆشەکانی ژیانی ڕابوردووم بە پێش چاودا دەڕۆشت، هی ئەو ژیانە شادەی کە بۆ نزیکەی بیست ساڵ لەگەڵ قوتابییە بەرێزەکانمدا و هەر لەم جێگایەدا بردبوومە سەر، کە پێشتر شوێنێکی ئاوەدان و خۆش و پڕ لە شادمانی بوو، کەچی وا ئێستا جگە لە کەلاوە و شوێنەوار هیچی تری لێ بەدی ناکرێت!

کاتێکی زۆرم لە تێڕامان و سەرنجدانی ئەو تابلۆیانەی ژیانم بردە سەر. هەر لەو کاتەدا سەرم لە خەڵکی ئەم دنیایە سووڕ دەما کە چۆن خۆیان دەخەڵەتێنن و، بە چییەوە خۆیان دەستخەڕۆ کردووە، کەچی ئەمەش حاڵی دنیایە و، مرۆڤ تیایدا لە ڕێبوار و میوانێك زیاتر هیچی تر نییە!

هەروەك بە چاوی خۆم مەودای ڕاستیی ئەو وتەیەی ئەهلی حەقیقەتیشم بینی کە دەڵێن: "دنیا غەددارە.. فێڵبازە.. فانییە.. پێی مەخەڵەتێن"!

---

(١) شیعری موتەنەبییە. بڕوانە: (دیوان المتنبي) ص١٧ نشر دار الجيل – بيروت. (وەرگێڕ)

هەروەها بۆم دەرکەوت کە مرۆڤ چۆن پەیوەندیی لەگەڵ لەش و ماڵ و منداڵی خۆیدا هەیە، بە هەمان جۆر پەیوەندیی لەگەڵ شار و وڵات و تەنانەت دنیاکەشیدا هەیە.

لەم کاتەدا کە دەمویست بە چاوەکانم بۆ پیریی خۆم تێر بگریم، دەشمویست بە "دە" چاو نەك تەنها بۆ پیری بەڵکو بۆ مردنی قوتابخانەکەم بگریم، تەنانەت هەستم دەکرد کە پێویستم بە "سەد" چاو هەیە تاکو پێیان بگریم بۆ شارە جوانە لە مردوو چووەکەم!

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ:

هەموو سەر لە بەیانییەك فریشتەیەك بانگ لە خەڵکی دەکات و دەڵێت:

"لدوا للموت و ابنوا للخراب"(١)!

لەم کاتەدا ڕاستیی ئەم فەرموودەیەم نەك بە گوێ، بەڵکو بە چاو دەبیست!

جا هەروەك ئەو بارە ناهەمواره منی لەو کاتەدا خستە گریان، وا بیست ساڵە خەیاڵیشم هەر فرمێسك هەڵدەڕێژێت کە یادی ئەو کارەساتە دەکاتەوە!

بەڵێ، ڕووخانی خانووەکانی سەر لوتکەی ئەو قەڵایە کە هەزاران ساڵە ئاوەدانە و، پیربوونی شارەکەی ژێر قەڵاکە لە ماوەی هەشت ساڵدا کە دەڵێی هەشت سەد ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕ بووە و، مردنی قوتابخانەکەم - لە داوێنی قەڵاکەوە - کە جموجووڵ و ترپەی ژیانی لێ دەهات و کۆگای خۆشەویستان بوو..

هەموو ئەمانە، ئاماژە بۆ مردنی قوتابخانە ئایینییەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن و، مەزنیی مەعنەویی تەرمە گەورەکەیان پیشان دەدەن، تەنانەت ئەم قەڵایە - کە تەنها یەك تاشە بەردی گەورەیە - بووە بە کێلی گڵکۆی هەموویان! دەمبینی قوتابییانی پێش هەشت ساڵی ئەم قوتابخانەیەم - خوا لێیان خۆش بێت - لەناو گۆڕەکانیاندا هاودەم لەگەڵ مندا دەگرین! تەنانەت خانووە هەڵوەشاوەکانی شارەکە و دیوارە ڕووخاوەکان و بەردە پەرتەوازەکانیشم دەبینی هاوبەشی خەفەت و گریانم بوون!

بەڵێ، هەرشتێکم دەبینی وامدەزانی لەگەڵ مندا دەگری! ئیتر تێگەیشتم کە ناتوانم لەوە زیاتر ئەم غەریبییە لە شارەکەمدا هەڵبگرم! بۆیە هاتمە سەر ئەوەی کە یان بڕۆم بۆ

---

(١) رواه البيهقي في الشعب من حديث عن أبي هريرة والترمذي مرفوعاً، وأبو نعيم في الحلية عن أبي ذر مرفوعاً، وأحمد في الزهد عن عبدالواحد قال: قال عيسى عليه السلام، فذكره (الدرر المنتثرة) وانظر كشف الخفاء (٢٠٤١). (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە)

لای ئەو ئازیزانە لەناو گۆڕەکانیاندا.. یان بڕۆمە ئەشکەوتێکەوە، هەتا منیش لەوێ بۆ خۆم وەك ئەوان دەمرم! چونکە دەموت: "مردن" گەلێ باشترە لەم جوداییانەی کە لەم دنیایەدا دێنە ڕێی مرۆڤ و، لە ڕادەیەکدان ئارامیان لەسەر ناگیرێت و، ئازار و زامیشیان لە پلەیەکی وەهادایە کە بەرگری ناکرێن.

لە تاو ئەم پەژارانە، چاوم بە هەر شەش لای خۆمدا گێڕا، کەچی لە تاریکی زیاتر هیچی ترم تێدا بەدی نەکرد. ئەو پەژارە و ئێش و ئازارە قورسانە دووچاری "بێ ئاگایی"یان کردم و.. ئەو بێ ئاگاییەش دنیای سامناك و چۆڵ پیشان دام؛ دەتوت هەر ئێستا دنیام بەسەردا دەڕووخێت!

لەو کاتەدا "گیان"م لەتاو ئەم هەموو بەڵا و گرفتە زۆرانەی کە شێوەی دوژمنیان لەخۆ گرتبوو، بە دوای پشت و پەنایەکدا دەگەڕا تاکو پشتی پێ ببەستێ و، چاوی بۆ یارمەتیدەرێك دەگێڕا کە بتوانێت ئارەزووە لە ژمارە نەهاتووەکانی بۆ بهێنێتەدی کە هێندە زۆرن تا "ئەبەد" کۆتاییان نایەت..

لەو کاتەدا کە "گیان"م بە دوای ئەو "پشتیوان" و "یارمەتیدەر"ەدا دەگەڕا و، چاوەڕوانی دڵدانەوە و دەرورویەکی دەکرد کە لێی بکرێتەوە سەبارەت بەو خەم و خەفەتە زۆرانەی کە ئەنجامی کاولکاری و لێکدابڕان و جودایە بێ سنوورەکان بوون.. ئا لەو کاتەدا، ڕاستیی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز بە ڕوونی لە بەردەم دیدی ئەندێشەمدا دەرکەوت کە دەفەرموێ:

﴿سَبَّحَ لله مَا فِي السَّموات والأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ۞ لَـهُ مُلْـكُ السَّـموات والأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الحديد: ١-٢)..

ئیتر لەو ئەندێشە ئازاربەخشە و لە ئازارەکانی جودایی و لێکدابڕان ڕزگاری کردم و، چاوی سەر و بینایی دڵی کردمەوە.

دوای ئەوەی کە حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە هات بە هانامەوە، ئاوڕم لە درەختە بەردارەکان دایەوە، بینیم بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە بۆم دەڕوانن و، پێم دەڵێن:

تەنها سەیری ئەو شوێنەوارە ڕووخاوانە مەکە.. ئەی سەیرێکی ئێمەش ناکەیت و سەرنجمان نادەیت؟!

بەڵێ، ڕاستیی ئەم ئایەتە بە توندی ڕاپەکاندم و بێداری کردمەوە و، پێی وتم:

بۆچی هەتا ئەم ڕادەیە خەفەت بۆ لەدەستچوونی ئەو نامە ئاوەدانەی سەر لاپەڕەی "وان" دەخۆیت، کە مرۆڤ بە دەستی خۆی نووسیبووی و بنیاتی نابوو هەتا شێوەی شارێکی ئاوەدانی لەخۆ گرتبوو؟

بۆچی بەم ئەندازەیە خەم و پەژارەی نەمانی ئەم شارە دایگرتوویت کە لافاوی سامناکی داگیرکردنی ڕووس بردی و گشت خەت و شوێنەوارێکی کوژاندەوە؟

سەرت بۆ لای خواوەندی بەدیهێنەر هەڵبڕە کە پەروەردگار و خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە و جڵەوی هەموو شتێکی لە دەستدایە.. دڵنیابە نووسراوەکانی خواوەند لەسەر لاپەڕەی "وان"دا هەمیشە بە کەماڵی ورشەداری و ڕەنگینی هەر لە گەشەکردن و تازەبوونەوەدان.

ئەو ڕووداوانەش کە تۆ زووتر بینیت و شیوەن و گریانیش بەسەر چۆڵیی ئەو جێگایانە و کاول بوونیاندا، تەنها لە ئەنجامی بێ ئاگایی مرۆڤەوەیە لە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو جێگایانە و، هی ئەوەیە کە مرۆڤ - بە هەڵەی ئەندێشەی - خۆی بە خاوەنیان لە قەڵەم دەدات و، نازانێت کە ڕێبوار و میوانێك زیاتر شتێکی تر نییە!

لە ناوەندی ئەم حاڵەتە دڵ سووتێنەر و بۆچوونە هەڵەیەی مندا، دەرگایەکی گەورەم لێ خرایە سەرپشت، کە بەسەر ڕاستییەکی زۆر گرنگدا دەیڕوانی.. هەروەك ئاسن کە دەخرێتە ناو ئاگر و هەندێ نەرم دەبێت ئنجا شێوەیەکی تایبەتیی بۆ دیاری دەکرێت، "دەروون"یشم بە دیتنی ئەو حاڵەتە گەرم و سووتێنەر و، خەفەتە ئازار بەخشانە، نەرمیی بەدەست هێنا و ئامادەیی وەرگرتنی ئەو ڕاستییە گرنگەی پەیدا کرد و، قورئانی پیرۆز لە ناوەندی ڕاستیی ئەم ئایەتەوە بەرەکەتی ڕاستییەکانی ئیمانی بە ڕوونی پیشان دا. ئیتر دەروونم وەری گرتن و ملی بۆ کەچ کردن)[1].

☐ وازم لە "سیاسەت" هێنا

(ڕۆژێکیان پیاوێکم دی سەروسیمای لە هی زانایان دەچوو، ناوی زانایەکی بەڕێزی بە خراپی دەبرد، بە ڕادەیەك کە گەیاندییە ئەوەی بە "کافر" لە قەڵەمی بدات! ئەمەش هەر تەنها لەبەر ئەوەی کە لە چەند بابەتێکی سیاسیدا ڕا و بۆچوونیان جیاواز بوو. هەر

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٩٣-٤٩٨.

لە هەمان کاتدا مەدحی یەکێکی تری موونافیقی کرد کە لە بیروڕای سیاسیدا هاوبیر بوون!

منیش کە ئەمەم دی، تەزوویەکی توند بە جەستەمدا هات و، لە دەست ئەم بارودۆخەی کە سیاسەتی تێکەوتووە پەنام بە خوای گەورە برد و، وتم:

"أعوذ بالله من الشيطان والسياسة"!

ئیتر لەو ڕۆژەوە خۆم لە ژیانی سیاسی کێشاوەتەوە)[1].

(*پرسیار*: ئایا بۆچی تا ئەم ڕادەیە بایەخ بە هەواڵ و ڕەوتی سیاسەتی ئێستای جیهان نادەیت؟ ئایا ئەو ڕووداوانەت پێ خۆشە؟ یان دەترسیت و لە ترساندا بێ دەنگ دانیشتوویت؟!

*وەڵام*: تەنها "خزمەتکردنی قورئان"ە کە بە توندی ڕێی جیهانی سیاسەتم لێ دەگرێت، تەنانەت بیرکردنەوەی ئەو جیهانەشی بە تەواوی لە بیر بردوومەتەوە!

دەنا هەموو مێژووی ژیانم شایەتە و دەیچەسپێنێت کە هەرگیز "ترس" دەستی نەبەستووم و ڕێی بەردەوام بوونمی لە شتێکدا لێ نەگرتووم کە بە "حەق"م زانیبێت.

پاشان لە چی بترسم؟ خۆ من جگە لە "ئەجەل" هیچ پەیوەندییەکی ترم بە دنیاوە نییە! ئەوەتا خاوەنی ماڵ و مناڵ و سامان نیم تاکو بیرم بەلایانەوە بێت.. هەروەها بیریش لە شەرەفی ئەسڵ و فەسڵ و بنەماڵە و نەسەب ناکەمەوە.. ئنجا سەبارەت بە پلەو پایە و سومعەی کۆمەڵایەتیشم، کە لە ڕاستیدا بریتییە لە ڕیا و ناوبانگی درۆینە، ئەوا نەك هەر نامەوێت پارێزگاریی لێ بکەم، بەڵکو ڕەحمەت بۆ ئەو کەسەش دەنێرم کە یارمەتیم دەدات بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی!

کەواتە جگە لە "ئەجەل" هیچ شتێکی تر نەماوە کە مرۆڤ لێی بترسێت. خۆ ئەجەلیش تەنها بە دەستی خوای تاك و تەنیایە. کێ هەیە جورئەت و پرکێشی بکات - پێش کاتی خۆی - توخنی ئەجەلم بکەوێت؟!

واتە ئێمە هەر لە بناغەدا مردنێکی سەربەرزیمان لە ژیانی سەرشۆڕی و ڕسوایی گەلێ پێ باشترە!

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و دووهەم، ل: ٤٤٨.

زووتر شاعیرێك - بە وێنەی سەعیدی كۆن - وتوویەتی:

ونحن أناسٌ لا تَوَسُّـــــطَ بيْنَنا لنا الصَّدرُ دونَ العالمينَ أو القبرُ[1]

كەواتە هیچ كام لەو هۆكارانە نی‌یە، بەڵكو تەنها "خزمەتكردنی قورئانی پیرۆز"ە كە ڕێم نادات بیر لە ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی بكەمەوە.

وا بەم جۆرەی خوارەوە ئەمەتان بۆ ڕوون دەكەمەوە:

ژیانی مرۆڤایەتیی هەموو كات و سەردەمێك - لە ڕاستیدا - كاروانێكە دەڕوات و بە دنیادا گوزەر دەكات..

ئنجا بەهۆی "نووری قورئانی پیرۆز"ەوە بۆم دەركەوت كە ڕێی ئەم كاروانە، لەم زەمان و سەردەمەی خۆماندا، كاروانی مرۆڤایەتیی گەیاندە ناو قوڕ و لیتاوێكی بۆگەنی چەپەڵ. ئەوەتا ڕەوتی مرۆڤایەتی گرفتاری هەڵەنگووتن بووە و، هەر هێندەی هەڵدەستێتەوە سەر پێ یەكسەر دەكەوێتەوە ناو قوڕێكی چەپەڵ و لیتاوێكی بۆگەنی ترەوە.

بەڵام هەندێك لە خەڵكی ئەو كاروانە، بە ڕێ‌یەكی بێ وەیدا دەڕۆن..

بەشێكی تریان چەند هۆكارێكی جۆراوجۆریان دۆزیوەتەوە كە - بەپێی توانا - لەو قوڕ و لیتاوە دەربازیان بكات..

بەشێكی تریان - كە زۆربەی خەڵكی كاروانەكەن - لە نێوان تاریكاییەكی چڕ و نووتەكدا بەناو ئەو قوڕ و لیتاوەدا هەنگاو دەنێن!

ئنجا لە سەدا بیستی ئەم بەشەیان، بەهۆی وڕی و مەستی‌یانەوە، ئەو قوڕ و لیتە چەپەڵە بە میسك و عەنبەر دەزانن و دەموچاوی خۆیانی پێ دەهەنوون.. پاشان تاوێ هەڵدەستنەوە و تاوێكی تر دەكەونەوە ناوی.. هەر بەم چەشنە دەڕۆن تا لە ئەنجامدا تیایدا دەخنكێن!

(١) ئەم دێڕە شیعرە هی "ئەبوو فیراسی حەمدانی"یە كە لە نێوان ساڵەكانی: (٣٢٠-٣٥٧ك)دا ژیاوە. لە هەندێ سەرچاوەدا نووسراوە: (لا توسط عندنا). واتە: ئێمە بە پلەوپایە مامناوەندی‌یەكان قایل نابین. دەبێ یان لە پێشەنگی كاروانی هەموو خەڵكی جیهانەوە بین، یاخود دەبێ بە سەربەرزی‌یەوە بڕۆینە ناو گۆڕەكانمان! (وەرگێڕ)

کەچی لە سەدا هەشتاکەی تریان، بە خۆیان دەزانن کە کەوتوونەتە ناو چڵکاوەوە و هەست بە بۆگەنی و چەپەڵیشی دەکەن، بەڵام سەرسام و سەرگەردانن، ناتوانن ڕێی خاوێن و بێ وەی ببینن و بیدۆزنەوە.

تەنها دوو ڕێگا چارە بۆ ئەم دوو تاقمە هەیە:

یەکەمیان: بێدارکردنەوەی لە سەدا بیستەکەیانە بە "چەکوش"..

دووهەمیشیان: پیشاندانی ڕێی ڕزگاری و بێ وەییە بۆ سەرگەردانەکان. ئەمەش بەوە دەبێت کە "نوور" و ڕووناکی‌یەکیان پیشان بدرێت، واتە: ڕێنمایی بکرێن.

چار تەنها ئەمەیە..

بەڵام ئەوەی کە من دەیبینم شتێکی ترە.. دەبینم هەشتا کەس بە چەکوشەوە بەرەنگاری بیستەکە بوونەتەوە و بەرامبەریان ڕاوەستاون، کەچی هەشتا کەسە نائومێد و بەدبەختەکان هیچ کەس بە هانایانەوە ناڕوات و ڕێی ڕووناکیی ڕاستەقینەیان پیشان نادرێت! خۆ ئەگەر پیشانیشیان بدرێت، ئەوا لەبەر ئەوەی ڕێ پیشاندەران "نوور" و "کوتەك"یان پێکەوە بە دەستەوە گرتووە، ئەوا جێی متمانە و دڵنیایی ئەو سەرگەردانانە نین، چونکە بابای سەرگەردان بە دڵەتەپێ و نیگەرانی‌یەوە بە خۆی دەڵێت:

"تۆ بڵێیت ئەم مرۆڤە بیەوێت بەو "نوور"ەی کە پێیەتی بێ خەمم بکات و لە خۆی نزیکم بخاتەوە، ئەوجا چەکوشەکەی دەستیم تێ بسرەوێنێت"؟!

ئنجا کە جاربەجار - بە بۆنەی چەند هۆکارێکەوە - ئەو چەکوشە دەشکێت، ئەوا نوورەکەش دەڕوات و نامێنێت، یان هەر بە تەواوی دەکوژێتەوە!

بەم پێ‌یە:

مەبەست لەو لیتاوە: ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەمڕۆی مرۆڤە، کە ژیانێکی چڵکن و بەرەڵا و بێ ئاگا و چەپەڵ بووی دەستی گومڕاییە..

مەستەکانیش: ئەو یاخی بووانەن کە لەزەت لە گومڕایی دەچێژن..

سەرگەردانەکانیش: ئەو کەسانەن کە بێز لە گومڕایی دەکەنەوە، بەڵام تێوەی تلاون و گرفتار بوون و ناشتوانن لێی دەرباز ببن.. ئەوانەن کە دەیانەوێت ڕزگاریان ببێت، بەڵام ڕێی ڕزگاری نادۆزنەوە و سەریان لێ شێواوە..

ئەو چەکوشانەش: ڕێچکە و تەوژمە سیاسی‌یەکانن.. ئەو نوورانەش: ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆزن.

"نوور" وەکو "چەکوش" نی‌یە و بە یەك چاو تەماشا ناکرێن و، غەلبەی لە ئاستدا ناکرێت و، دوژمنایەتیی بەرامبەر نانوێنرێت و، کەس لێی هەڵنایەت، مەگەر شەیتانی نەفرەت لێ کراو.

لەبەر ئەوەیە کە پڕ بە دەم وتم: "أعوذ بالله من الشيطان والسياسة" تاکو پارێزگاریی نووری قورئانی پیرۆز بکەم. ئیتر لەو کاتەوە چەکوشی سیاسەتم فڕێ دا و، هەردوو دەستم بە توندی لە نووری قورئانی پیرۆز گیر کرد.

پاشان بینیم کە هەموو ڕێچکە و ڕێبازە سیاسی‌یەکان - چ لایەنگرانی نووری قورئان و چ نەیارەکانی - کەسانێکی زۆریان تێدایە کە عاشقی ئەو نوورەن.

لەبەر ئەم ڕاستی‌یە، ئەو دەرسە قورئانی‌یەی کە لە شوێنێکی خاوێن و دوور لە هەموو بیر و بۆچوونێکی سیاسی و لایەنگریی مەبەستدارەوە دەوترێتەوە و، لە پلەیەکی گەلێ لەوانە بەرز و بڵندترەوە ڕێنمایی خەڵکیی بۆ لا دەکرێت، دەبێ هیچ لایەنێك دوورەپەرێزیی لێ نەکات و، جێی گومانی هیچ چەشنە دەستە و تاقمێك نەبێت، هەرچی‌یەك و لە هەر جۆرێك بن. مەگەر ئەوانەی کە کوفر و ئیلحاد بە سیاسەت دەزانن و لایەنی دەگرن، خۆ ئەوانەش - لە ڕاستی و ناوەرۆکدا - شەیتانن لە شکڵی مرۆڤدا و، ئاژەڵن لە جەستەی ئادەمیدا خۆیان دەنوێنن.

سوپاس بۆ خوای گەورە، کە بەهۆی دوورەپەرێزی و دەستبەرداربوونم لە ڕێڕەوە سیاسی‌یەکان، نرخی ئەڵماس بەهای ڕاستی‌یەکانی قورئانم دانەشکاند و، بە تۆمەتی پڕ و پاگەندەی سیاسی نەم‌گەیاندنە ئاستی بێ نرخیی وردە شووشەکان! تەنانەت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو گەوهەرانەی نووری قورئان لە بەرچاوی هەموو دەستە و تیرە و تاقمێکدا نرخیان زیاتر دەبێت و پتر گەشەدار دەبن و دەبریسکێنەوە)[1].

(*پرسیار*: بۆچی "سەعیدی نوێ" زۆر بە توندی و تا ئەم ڕادەیە دوورەپەرێزی لە سیاسەت دەکات؟

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی سیازدەهەم، ل: ٧٨-٨١.

وەڵام: بۆ ئەوەی لە ئەنجامی خۆهەڵقورتاندنی لە ژیانێکی دنیایی گومان لێکراودا - کە یەك دوو ساڵ بڕ دەکات - ئەو هەوڵەی خۆی بەزایە نەدات کە بۆ بەدەستهێنانی ژیانێکی هەمیشەیی ملیارەها ساڵی دەیدات! پاشان لە پێناوی خزمەتکردنی ئیمان و قورئاندایە کە ئاوا بە توندوتیژی لە سیاسەت هەڵدێت، چونکە ئەم خزمەتە لە هەموو خزمەتێك مەزنتر و پێویستتر و خاوێنتر و حەقترە.. ئەوەتا سەعیدی نوێ دەڵێت:

من هەتا بێت زیاتر پیر دەبم و نایشزانم کە دوای ئەم تەمەنەی ئێستام چەندەی تر دەژیم.. کەواتە سەبارەت بە منەوە باشتر وایە هەوڵ بۆ ژیانێکی هەمیشەیی بدەم کە لە هەموو شتێکی تر پێویستترە.

جا لەبەر ئەوەی ئیمان هۆی بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایی و کلیلی بەختەوەریی هەمیشەییە، ئەوا پێویستە مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات. بەڵام خۆ من زانایەکی ئایینیم و بەپێی فەرمانی شەرع دەبێ سوود بە خەڵکی بگەیەنم، بۆیە دەمەوێ لەم بوارەشدا خزمەتیان بکەم، کەچی سوودەکانی ئەم خزمەتە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و دنیایی کە من دەستەڵاتم بەسەریدا ناشکێ، ئەمە چ جای ئەوەی کە زۆر دژوار و دەگمەنە لە ڕۆژگارێکی ئاوا سەخت و گێژەڵوو کاویدا مرۆڤ بتوانێت کردەوەیەکی ڕاست و دروست ئەنجام بدات. بۆیە وازم لەم لایەنەش هێنا و، خزمەتکردنی ئیمانم هەڵبژارد و پێم باشتر بوو، کە گرنگترین و پێویستترین و دروستترین خزمەتگوزارییە..

ئنجا دەرگای ئەم خزمەتەشم خستە سەرپشت تاکو ئەو ڕاستییانەی ئیمان کە دەستی خۆمم خستن و ئەو چارەسەر و دەرمانە مەعنەوییانەش کە لە خۆمدا تاقیم کردنەوە، بە دەستی کەسانی تریش بگات، بەشکو خوای گەورە ئەم خزمەتەمان لێ قبووڵ بفەرموێت و بیکات بە کەفارەتی گوناهەکانی پێشوومان.

خۆ جگە لە شەیتان هیچ کەسێك - نە ئیماندار و نە کافر، نە دۆست و نە مولحید - بۆی نییە ڕەخنە و پەلپ و بیانوو لەم خزمەتە بگرێت، چونکە هیچ شتێکی تر نییە بە وێنەی بێ ئیمانی بێت، لەوانەیە چێژ و لەزەتێکی شەیتانیی چەپەڵ لە ستەمکاری و فاسقی و گوناهی گەورەدا هەبێت، بەڵام هەرگیز هیچ چێژ و لەزەتێك لە بێ ئیمانیدا نییە! بەڵکو سەرتاپا ئازار و سزا و تاریکیی یەك لەناو یەکە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە: وازهێنان لە کار و کۆشش بۆ ژیانێکی هەمیشەیی و، دەست هەڵگرتن لە هەوڵ و تەقالا بۆ نووری موقەددەسی ئیمان و، ڕۆشتنە ناو یاریی پڕ لە مەترسی و ناپێویستی سیاسەتەوە لە تەمەنی پیریدا، کارێکی پێچەوانەی ژیری و حیکمەتە بۆ یەکێکی وەك من کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە کەسەوە نی‌یە و، بە تەنیایی دەژی و ناچارە بە دوای کەفارەتی گوناهەکانی پێشوویدا بگەڕێت. تەنانەت ڕەفتاری لەو جۆرە شێتی و گێلی‌یەکی ئەوتۆیە کە کەسانی گێژ و گەلحۆش لەمە تێدەگەن.

*خۆبەگەر دەشڵێیت*: خزمەتی ئیمان و قورئان چۆن ڕێی سیاسەتت لێ دەگرێت؟

*دەڵێم*: حەقیقەتەکانی ئیمان و قورئان، بە وێنەی گەوهەرەکانی ئەڵماس بەنرخ و گرانبەهان. جا ئەگەر من خۆم بە سیاسەتەوە خەریك بکردایە، کەسانی عەوام ئەم پرسیارەیان بە خەیاڵدا دەهات کە: ئایا ئەمە دەیەوێت بەرەو لایەنێکی سیاسی ڕامان بکێشێت؟ ئایا بڵێی ئەو شتەی کە بانگەشەی بۆ دەکات پڕوپاگەندەیەکی سیاسی نەبێت بۆ ڕاکێشانی خەڵکی و کۆکردنەوەی شوێنکەوتووان بۆ خۆی؟

واتە ئەو کاتە وەك شووشە وردەی بێ نرخ دەیانڕوانی‌یە گەوهەر و ئەڵماسە بەنرخەکان. دیارە ئەو کاتە منیش بەو تێکەڵ بوونەم لەگەڵ سیاسەتدا ستەمێکی گەلێ مەزنم لەو حەقیقەتە بەنرخانە و بەها و بایەخیان دەکرد.

دەسا ئەی ئەهلی دنیا! بۆچی وازم لێ ناهێنن و بە هەموو شێوەیەك تەنگم پێ هەڵدەچنن)[1]؟

(*وترا*: بۆچی لە مەیدانی "سیاسەت" کشاویتە دواوە و توخنی ناکەویت؟

*وەڵام*: سەعیدی کۆن نزیکەی "دە" ساڵ ڕۆشتە ناو سیاسەتەوە بەو نیازەی کە لەو ڕێیەوە خزمەتی زانست و ئایین بکات، بەڵام هەموو هەوڵەکانی با بردنی و بێ ئەنجام دەرچوون. چونکە بۆی دەرکەوت کە ڕێیەکی گێچەڵاوی و گومان لێکراوە. هەروەك سەبارەت بە منیشەوە خۆهەڵقورتاندنە لە شتانێکدا کە پەیوەندی‌یان پێمەوە نی‌یە، چونکە ڕێی ئەنجامدانی گرنگترین واجب و ئەرکی سەرشانم لێ دەگرێت. جگە لەوەی کە ڕێیەکی پڕ لە مەترسی‌یە و، زۆربەشی درۆ و دەلەسە و فێڵ و تەڵەکەیە و،

(١) مەکتووبات، مەکتووبی شازدەهەم، ل: ١٠٣-١٠٤.

لەوانەیە مرۆڤ - بێ ئەوەی بە خۆیشی بزانێت - ببێت بە ئامراز بە دەستی بیانی‌یەکانەوە!

هەروەها ئەو کەسەی کە دەڕواتە ناو سیاسەتەوە، یان لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدایە، یان نەیاریەتی..

جا ئەگەر من بەو سیفەتە بڕۆمە ناو ئەو بوارە کە لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدا بم، ئەوا ئەم کارە لە ڕاستیدا خۆهەڵقورتاندن و دەست تێوەردانە لە شتانێکدا کە پەیوەندی‌یان بە منەوە نی‌یە، چونکە نە کارمەندی دەوڵەتم و نە ئەندامیشم لە پەرلەمانەکەیدا. دیارە تێوەگلانم بە سیاسەتەوە لە کاتێکی وادا هیچ جێگایەك ناگرێت. هەروەك ئەوانیش پێویستیان بە من نی‌یە تاکو خۆمی تێدا هەڵبقورتێنم..

خۆ ئەگەر بیشڕۆمە ناو ئەو سیاسەتەی کە هی نەیارانی دەوڵەتە، ئەوا دەبێ یان لە ڕێی "هزر و بیر" یان لە ڕێی "هێز"ەوە بڕۆمە ناوی..

جا ئەگەر لە ڕێی "بیر"ەوە بڕۆم، ئەوا هیچ پێویستی‌یەك بە من لە گۆڕێدا نی‌یە، چونکە هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرایە و، خەڵکی هەموو شتێك دەزانن و ئاگادارن، کەواتە پێویست بە قسەی زیاد ناکات.

ئەگەر لە ڕێی "هێز"یشەوە خۆم بکەم بەناو سیاسەتدا، واتە لە ڕێی نانەوەی گێچەڵ و گیروگرفتەوە و، لە پێناوی چەند ئامانجێکی گومان لێکراودا بڕۆمە ئەو بوارە، ئەوا لەوانەیە بکەومە ناو هەزاران تاوان و گوناهەوە، چونکە ئەو کاتە گەلێ کەسی "بێ تاوان" بە تاوانی یەك کەس تێوە دەتلێن. منیش ویژدانم ڕێم پێ نادات کە لەبەر یەك دوو گریمان لە نێوان دە گریماندا، خۆم بخەمە ناو گوناهەوە و کەسانی بێ تاوانیشی پێوە بگلێنم.

لەبەر هەموو ئەمانە، "سەعیدی کۆن" هاودەم لەگەڵ وازهێنانی لە "جگەرە"، وازیشی لە "سیاسەت" و کۆڕە دنیاییەکانی و، تەنانەت لە خوێندنەوەی "ڕۆژنامە"ش هێنا)[1]!

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی شازدەهەم، ل: ١٠١-١٠٢.

# ساڵی ١٩٢٥ز/١٣٤٢ك

## ❑ گرتن و دوورخستنەوە

(لە کاتێکدا کە خەریکی وتنەوەی وانەی حەقیقەتەکانی قورئان بووم بە قوتابییەکانم لە شاری "وان"، لەم کاتەدا ڕووداوەکانی لەمەڕ "شێخ سەعیدی پیران"[1]

(١) بەڕێز مەلا حەمید، کە قوتابییەکی مامۆستا نوورسییە و، چ لەناو شاری "وان" و چ لە "چیای ئەرەك"دا لێی جیانەبووەتەوە، ئەم گفتوگۆ بەپێز و پڕ لە واتایەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە نێوان مامۆستا نوورسی و حسەین پاشادا ڕووی داوە، کە سەرۆکی عەشیرەتی "حەیدەران" بووە.
ئەم حسەین پاشایە، لە دەمی پێکهێنانی "هێزەکانی حەمیدییە"دا لە کوردستان، سوڵتان عەبدولحەمید بە پلەی "میرئالای" دایمەزراند. ئەویش چەندین سەرکەوتنی ڕەنگینی بەسەر هێزەکانی ڕووس و ئەرمەندا تۆمار کرد و زیانی گەورەشی پێ گەیاندن. لەبەر ئەوە حکومەتی ئیتیحاد و تەرەقی و سوڵتان ڕەشاد بۆ پلەی "ئەمیر لیوا" بەرزیان کردەوە. لە پێش جەنگی جیهانیدا یارمەتیی دامەزراندنی چەندین قوتابخانەی دا لە کوردستان. کەسێکە بە دادپەروەری و ڕێزگرتنی زانایان ناوبانگی دەرکردووە. پەیمانی برایەتیی قیامەتیانەی لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەستووە. وێڕای بەشداری نەکردنی لە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیراندا، کەچی لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا بۆ شاری "قەیسەری" دوورخرایەوە. بەڵام بەرگەی ژیانی دوورخراوەیی نەگرت و دوای دوو ساڵ هەڵهات بۆ سووریا و، ساڵێك لەوێ مایەوە. دوای ئەوە کەسێك بە ناوی "مەدەنی" هات بۆ لای و قەناعەتی پێ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ وڵات، گوایا حکومەت لێبوردنی گشتیی بۆ دوورخراوەکان دەرکردووە. لە ڕێی گەڕانەوەی و لە کاتی نوێژکردندا، کەسی ناوبراو دەرفەتی هێنا، حسەین پاشا و هەردوو کوڕەکەی کوشت. خوا لێیان خۆش بێت.
مەلا حەمید ئەم گفتوگۆیەمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ:
لە پەرستگایەکی ڕووخاوی چیای ئەرەکدا لە خزمەتی مامۆستا نوورسیدا بووین. ڕۆژێکیان حسەین پاشا و دوو کەس لە هاوڕێیانی هاتن بۆ سەردانی مامۆستا.
دوای ئەوەی ئەسپەکانیان بە درەختەکانی بەردەرگای پەرستگا ڕووخاوەکەوە بەستەوە، هاتنە ژوورەوە بۆ لای مامۆستا و، دەستیان ماچ کرد و، لە بەردەمیدا بەوپەڕی ڕێزەوە چۆکیان دادا.
حسەین پاشا کەسێکی باڵابەرز و بەسام بوو، نیشانە و مەدالیاکانی تایبەت بە پاشایەتیی ئەو ڕۆژگارەی بە سنگ و بەرۆکیدا هەڵواسیبوو.
کە دانیشت دەستەسرێکی دەرهێنا و لەسەر زەوی داینا، کە بە مەزەندە نیو کیلۆ ئاڵتوون دەبوو تیایدا.
مامۆستا لێی پرسی: ئەوە چییە؟
وتی: ڕۆحم بە قوربانت بێت، زەکاتەکەمە، لە سامانی تایبەتیی خۆمە بۆم هێناویت!
مامۆستا پێی وت: کەسێکت لە دەوروبەری خۆت، لە خزمانت، لە خەڵکی گوندەکەت دەست نەکەوت بیاندەیتێ، وا هێناوتە بۆ ئێرە؟
حسەین پاشا وتی: سەیدا! خزمەکانم و کەسانی دەوروبەرم هەموویان دەوڵەمەندن و، کەسی هەژاریان تێدا نییە. پێم وابوو ئێوە شایستەین.

بەرپرسانی دەوڵەتیان خستبووە نیگەرانی و مەترسییەوە. خۆ هەرچەندەش ئەو کاربەدەستانە لە هەموو کەسێك بەدگومان بوون، بەڵام هیچ خراپەیەکیان بەرامبەرم

---

مامۆستا وتی: گواستنەوەی زەکات دروست نییە. بۆچی هێناوتە بۆ ئێرە و بازت بەسەر چەندین گوند و ئاوەدانیدا داوە؟

حسەین پاشا وتی: سەیدا! تکایە لانی کەم چەند دانەیەکیان لێ هەڵبگرە بۆ قوتابیانی هاوڕێت.

مامۆستا وتی: نەخێر شتی وا ناکرێت.. پێویستم بە زەکات نییە.

بەم جۆرە، گێڕایە دواوە و لێی وەرنەگرت.

پاش کەمێك حسەین پاشا بە مامۆستای وت:

سەیدا! دەمەوێت لە شتێکی تایبەتیدا ڕاوێژت پێ بکەم، تکایە مۆڵەتی قوتابییەکانت بدە بڕۆنە دەرەوە، چونکە دەمەوێ بە تایبەتی لەگەڵت بدوێم.

مامۆستا وتی: ناگونجێ.. ئەمانە بەشێکن لە خۆم، لێم جیا نابنەوە. ڕوونی بکەرەوە چیت دەوێت؟

حسەین پاشا وتی: سەیدا! تکا دەکەم ڕێگامان بدەیت لەگەڵ شێخ سەعیددا بەشداریی شۆڕش بکەین، چونکە ئێمە ئامادەین.

مامۆستا وتی: بۆچی شۆڕش دەکەن؟ ئەگەر فلان و فیسار تاوانێکیان کردبێت، خەڵکی تر گوناهیان چییە؟ ئەو کارە خوێنی موسڵمانانی تێدا دەڕژێت.

حسەین پاشا وتی: ڕووسەکان ئێمەیان کوشت و لەناویان بردین و ماڵ و منالیان نەهێشتین، بەڵام شەرەفمان هەر پارێزراو بوو کەس بە خراپی توخنی نەکەوت. بەڵام ئێستا ئایین و شەرەفیشمان ڕووبەڕووی تیاچوون بووەتەوە. کەواتە ڕوخسەتمان بدە کە هەڵبگەڕێینەوە.. هەموو سەربازانی پیادە و سوارەشمان ئامادەن.

دوای ئەوە، حسەین پاشا باسەکەی خۆی و ڕووداوە دڵتەزێنەکانی ڕوون کردەوە، مامۆستاش سەری داخستبوو بیری دەکردەوە، پاشان سەری هەڵبڕی و بەوپەڕی نەرمونیانی پێی وت:

پاشا! وەرە با ڕاوێژ بە مەلای جزیری بکەین و، بە نیازی پرس و ڕا دیوانەکەی بکەینەوە. ئایا مەلای جزیری هەرچی بڵێت تۆ پێی ڕازی دەبیت؟

پاشا وتی: بەڵێ.

مامۆستا دیوانەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و کردیەوە.. ئەم بەیتەیان ڕووبەڕووی خۆیان بینی:

هن ژ نك دێرێ ڤەتێن ڤەستا کنشتێ هن دکن    نەی ژ ڤانم نەی ژ وانم من دەرێ خەممار بەس

[ بۆ پەرستن هاتوچۆی دێر یان کەنشت هەندێ دەکەن    من لە هیچیان نیم و بەسمە بەردەری بادەفرۆش ]

ئنجا مامۆستا وتی:

پاشا! خۆ بە چاوی خۆت بینیت! من ئێستا نە لە ئێوەم و نە لەوانیش.

حسەین پاشا وتی: سەیدا! غیرەتی منت خاو کردەوە و هیممەتیشت لاواز کردم. کاتێ دەڕۆمەوە بۆ ناو هۆزەکەم، پێم دەڵێن: پاشا ترساوە و لە هەڵگەڕانەوە پەشیمان بووەتەوە.

مامۆستا وتی:

بەڵێ، با پێت بڵێن: ترساوە.. بەڵام نەڵێن: خوێنی ڕشتووە!

کاتێ پاشا خواحافیزیی لە مامۆستا کرد، مامۆستا سێ جار لێی دووپات کردەوە:

پاشا خوێن مەڕێژە.. پاشا خوێن مەڕێژە.. پاشا خوێن مەڕێژە.

کە حسەین پاشا گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی، بڵاوەی بە هێزەکانی کرد. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لە ناوچەی "وان"دا هیچ ڕووداوێك ڕووی نەدا. (ب: ١/٥٥٧).

نەنواند و هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە نەبوو تاکو بیانووم پێ بگرن. هەر بەم جۆرەش ڕەفتاریان لەگەڵ کردم هەتا لە خزمەتکردنی قورئاندا بەردەوام بووم.

بەڵام کاتێ لە بەرخۆمەوە وتم: "من چیم لە خەڵکی داوە" و بیرم لە تەنها خۆم کردەوە و، لە مەیدانەکە کشامە دواوە و ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتەکانی چیای "ئەرەك" تاکو خۆم بۆ قیامەت دەرباز بکەم.. کاتێ ئەم هەنگاوەم نا، هاتن لەو ئەشکەوتانە[1] دەریانهێنام و گرتیانم و، لە پارێزگایەکی خۆرهەڵاتەوە "وان" بەرەو پارێزگایەکی خۆرئاوا "بوردوور" دووریان خستمەوە)[2]!

کاتێ لەو شوێنی گۆشەگیرییەی چیای ئەرەکدا ژیانی بەسەر دەبرد، شۆڕش لە کوردستان هەڵگیرسا و، شێخ سەعیدی سەرکردەش داوای لێ کرد کە پێگەی خۆی لای خەڵکی ناوچەکە بەکاربهێنێت بۆ پشتگیریی شۆڕشەکە. بەڵام ئەو نەیویست بەشداری بکات و، نامەیەکیشی بۆ نووسی کە تیایدا هاتبوو:

"ئەو شۆڕشەی ئێوە دەیکەن، هانی برا دەدات برای خۆی بکوژێت و، هیچ ئاکامێکیشی نابێت"[3].

[ وێڕای هەڵوێستی ڕوونی مامۆستا نوورسی بەرامبەر بەو شۆڕشە، کەچی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان و شێخان و قسەڕۆشتووانی کوردستاندا، تەنانەت ئەوانەش کە هیچ ڕۆڵ و دەستێکیان لەم بزووتنەوەیەدا نەبوو، حکومەت قۆڵبەستی کردن و دووری خستنەوە بۆ خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ ].

ئەوەبوو مەفرەزەیەکی سەربازی دای بەسەر ئەو ئەشکەوتەدا کە مامۆستا بەدیعوززەمان تیایدا لێبڕابوو بۆ خواپەرستی. سەرۆکی مەفرەزەکە ڕەفتارێکی وشك و زبری بەرامبەر بە مامۆستا نواند و، کاردانەوەی مامۆستاش توندوتیژ و ئازایانە بوو بەرامبەری، بۆیە کتوپڕ کەشەکە کارەباوی بوو. ئەوانیش خێرا مامۆستایان لەگەڵ خۆیان برد.

---

(١) لە ١٩٢٥/٢/١٠زدا مامۆستا لە سەر چیای ئەرەك هێنرایەوە خوارەوە. بەڵام ڕاگواستنی کاروانی دوورخراوەکان لە بەرواری ١٩٢٥/٢/٢٥زدا بوو.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی دەهەم، ل: ٨٣.

(٣) .Tarihce-i Hayat, ilk Hayati لەمە بەشێکە لەو نامەیە کە لە دۆسیەکانی دادگای سەربەخۆیی، لەناو "فایلی شێخ سەعید"دا پارێزراوە. (ب: ١/ ٥٣٢)

دوای ئەوەی ماوەیەك ڕۆشتن، هەندێ قوتابیی مامۆستا و خەڵکی ئەوێ لێیان نزیك بوونەوە و، بە زمانی ناوچەکە "کوردی" گفتوگۆیان لەگەڵ مامۆستادا کرد و لێی پاڕانەوە کە لەگەڵ جەندرمەکاندا نەڕوات و، ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە بیفڕێنن بۆ شوێنێکی تر، یان بۆ وڵاتێکی تری موسڵمان. بەڵام مامۆستا ئەو داوایەی ئەوانی وەرنەگرت و، پێی وتن کە بە ڕەزامەندیی خۆی لەگەڵ مەفرەزەکەدا دەڕوات و، سەربازەکانیش وەکو قوتابیی خۆی وان. بۆیە ئامۆژگاریی کردن کە بە بێ دەنگی بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان و نیگەران نەبن[1].

بەم جۆرە، نەیهێشت ڕووبەڕوو بوونەوە لە نێوان خەڵك و حکومەتدا ڕووبدات، کە بەهۆی ئەمەوە خوێنی تێدا بڕژێت[2].

---

(١) لە دەفتەری یادداشتنامەکانی زوبەیر گوندوزئالب. (ب: ٥٦٧/١)؛ (ش: ٢٧٣).

(٢) ڕاگواستنی دوورخراوەکان لە بەرواری ١٩٢٥/٢/٢٥زدا بوو. ئاراستەی ڕۆشتنیان بەم جۆرە بوو: کاروانەکە لە "وان"ەوە کەوتەڕێ بەرەو "ئەرجیش" لەوێشەوە بۆ "باتنووس" کە نزیکەی چوار ڕۆژ لەوێ وچانیان دا. ئنجا بەرەو "ئاگری" و ڕۆژێك تیایدا مانەوە، لەوێشەوە بۆ "ئەرزڕۆم" حەفتەیەکیش لەوێ بوون، پاشان بەرەو شاری "ترابزۆن" کەوتنەڕێ. لەوێش بیست ڕۆژیان بەسەربرد. لەوێشەوە بە پاپۆڕ ڕووەو ئەستەمبوڵ ڕۆشتن و، بەرواری ١٩٢٥/٤/١٥ز گەیشتنە ئەوێ و (٢٠-٢٥) ڕۆژ لەوێ مانەوە.

"مستەفا ئاگریلی" کە وەك سەربازێك بەشدار بووە لە پاسەوانیی کاروانی دوورخراوەکاندا، یادداشتەکانی خۆی سەبارەت بەم گەشتە دەگێڕێتەوە و، دەڵێ:

"کاتێ لە شاری وان لە خزمەتی سەربازیدا بووم، گەلێ جار ناوی مامۆستا بەدیعوززەمان و ناوبانگی ئەوم بەرگوێ دەکەوت، هەموو خەڵکی باسیان دەکرد، ئەوەش حەزێکی تێدا وروژاندم بۆ بینینی.

کاتێ کاروانەکە لە "وان" دەرچوو، وەرزی زستان بوو، بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو. ئەو کاروانە (٧٠-٨٠) گالیسکەی سەربەفری تێدا بوو کە ئەسپ و گا بەسەر بەفردا ڕایاندەکێشا. ئێوارە گەیشتینە گوندێك، هەموو خەڵکەکەی هاتن بۆ پێشوازیمان. سەرکردەی گەشتەکەش گرفتار بووبوو نەیدەزانی چۆن لەم گوندە کوردەدا لابدات و کاروانەکەش بپارێزێت کەسێکیان لێ هەڵنەیەت! لەبەر ئەوە نەدەگونجا دوورخراوەکان بەسەر خەڵکی گوندەکەدا دابەش بکات. لە دواییدا بڕیاری دا کە هەموویان لە شوێنێکدا کۆبکاتەوە، تاکو بە ئاسانی بتوانرێت بخرێنە ژێر چاودێری.. لەگەڵ مامۆستادا پێکەوە ڕۆشتین بۆ ژوورێکی بچووك کە تەنها جێی نوستنی دوو کەسی تێدا بوو. خەڵکی گوندەکەش لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داین و ڕێزێکی زۆریان لێ گرتین، وەك بڵێی چاوەڕێی ئاماژەیەکی "بەدیعوززەمان" بن! بەڵام ئەو ڕێی نەدەدا بەوەی کە شتێك ڕووبدات. ئێوارە خواردنی جۆراوجۆریان بۆ هێناین. مامۆستا وتی: نەخۆشم و، دەستی بۆ نەبرد. بەڵام خوڵکی منی کرد بۆ خواردنەکە. پاشان نوێژی خەوتنمان خوێند و نوێنێکیان بۆ مامۆستا ڕاخست و نوێنێکیش بۆ من لە نزیکی دەرگاکەوە.

❐ یادەوەریی‌یەکی ئەستەمبووڵ

(کاتێ بە دوورخراوەیی هاتم بۆ ئەستەمبووڵ و، پێشتریش پەیوەندیم بە "دار الحکمة الإسلامیة"وە هەبوو کە لەسەر دیوانی مەشیەخەتی ئیسلامی بوو، چونکە لە پێناوی خزمەتی قورئاندا کارم تێدا کردبوو..

پرسیم: دەنگوباسی "مەشیەخەتی ئیسلامی" چی‌یە؟

کەچی زۆر بە داخەوە وەڵامێکم بیست کە گیان و دڵ و بیری منی هێنایە لەرزە و خستمیە گریانێکی بەکوڵ. چونکە ئەو فەرمانگەیەی کە سەدان ساڵ بوو بە نووری شەریعەت ڕووناك بووبووەوە، نەمابوو.. شوێنەکەشی کرابوو بە ئامادەیی کچان و شوێنی یاری و گاڵتە و گەپ!

ئیتر حاڵەتێکی ڕۆحیی خەفەت بەخش دایگرتم، وەك بڵێی دنیام بەسەردا ڕووخابێت. بەڵام چارم چی‌یە؟ خۆ هیچ دەسەڵات و توانا و هێزێکم نی‌یە ئەم گرفتەی پێ لابدەم.

بۆیە بە نائومێدی و بە هەڵڕشتنی فرمێسك و ئاخ و داخەوە هانام بۆ دەرگانەی خوای گەورە برد، ئنجا ئاخ و حەسرەتی دڵ سووتاوەکانی وەك منیش چوونە پاڵی. ئێستا لەیادم نەماوە کە ئایا هیممەت و دوعاکانی شێخی گەیلانیشم خستە پاڵ دوعاکانمان یان

---

دوای کەمێك، بە دەنگی جووڵەیەك بەخەبەر هاتم. کە چاوم کردەوە بینیم مامۆستایە، چرایەکی فانۆسی زەیتیی بە دەستەوەیە، لە حەوشە پڕ لە بەفرەکە دەستنوێژی گرت و، پاشان هاتەوە ڕاوەستا بۆ نوێژ. ئەو شەوەی بە نوێژ و خواپەرستی بردەسەر.

کاتێ زانیی من بەخەبەرم، ئاوڕی لێ دامەوە و پێی وتم: "هێشتا کاتت بەدەستەوە ماوە بۆ خەوتن. ئێمە لەسەر مەزهەبی شافیعیین زوو هەڵدەستین، بەڵام ئێوە حەنەفی مەزهەبن دەتوانن دوای کەمێکی تر نوێژەکەتان بخوێنن".

لە ڕاستیدا ئەو زوو هەڵنەسابوو، بەڵکو هەر هیچ نەنوستبوو! منیش خەوم لێ نەکەوتەوە، بەڵکو هەڵسام دەستنوێژم گرت و نوێژی بەیانیم لەگەڵدا خوێند.

سۆپایەك لە ژوورەکەدا هەبوو. مامۆستا هەڵسا نەختێ ئاوی لەسەر گەرم کرد. زەمبیلەیەکی بچووکیشی پێ بوو، هێلکەیەکی لێ دەرهێنا و کوڵاندی. تا ئەو کاتە چەند سەعاتێکی زۆر دەبوو لە "وان" دەرچووبووین، ئەوە یەکەم جار بوو مامۆستا خواردن بخوات! پاشان تاقمی تراشی دەرهێنا و ڕیشی تاشی. من بە وردی سەرنجیم دەدا، دەمبینی بایەخێکی گەورە بە پاکوخاوێنی و ڕیش تاشین و خواپەرستی دەدات و، خۆراکی کەسی نەدەخوارد"! (ش: ١/١٣٦)

نا؟ بەڵام گومانم نی‌یە كە هیممەت و دوعاكانی ئەو ئیلهامبەخشی ئاخ و حەسرەتمان بوو.

ئیتر ئەو شەوە ئاگری لێ كەوتەوە و، بەشێكی ئەو تەلارەی سووتاند كە لە مێژە جێی بڵاوبوونەوەی ڕووناكی‌یەكان بوو، تاكو لە تاریكی بیپارێزێت[1]!

هەموو خەڵكەكە خەمیان بۆ ئاگركەوتنەوە لەو تەلارە دەخوارد، جگە لە من و لەو كەسانەی كە وەكو من دڵیان ئاگری تێبەربووبوو، سوپاسی خوامان دەكرد)[2]!

[ پاشان بە پاپۆڕێك لە ڕێی ئیزمیرەوە بەرەو ئەنتالیا ئەستەمبوڵی جێهێشت و، لەوێشەوە بردیان بۆ بوردوور ].

##ساڵی ١٩٢٦ز/١٣٤٣ك

❑ دوورخستنەوەی بۆ "بوردوور"

(كاربەدەستانی ئەم شارە زۆر بە توندی چاودێریی دوورخراوەكانیان دەكرد و، دەبوو هەموو ئێوارەیەك دوورخراوەكان لە لای پۆلیس خۆیان پیشان بدایە و، بەم كارەش ئامادەبوونی خۆیان دەربخستایە.

بەڵام من و قوتابی‌یە دڵسۆزەكانم، لەبەر خزمەتگوزاریی قورئان، لەم كارەدا لە خەڵكانی تر جیا كراینەوە..

بەم جۆرە هیچ كاتێ بۆ دەرخستنی ئامادەبوونم نەڕۆشتمە ئەوێ و كەسم لە كاربەدەستانی ئەوێ نەناسی.

تەنانەت كاتێ كە "فەوزی پاشا"[3] هات بۆ "بوردوور"، والیی شار سكاڵای ئەم كارەی ئێمەی لە لا كردبوو. ئەویش لە وەڵامدا وتبووی:

"ڕێزی بگرن و كارتان بەسەریەوە نەبێت"!

---

(١) لێكۆڵەری كارامە نەجمەدین شاهێنەر لە ڕۆژنامەكانی ئەو كاتەوە بۆی ساغ بووەتەوە كە ئاگرەكە شەوی هەینی ٢٩/٤/١٩٢٦ز كەتووەتەوە. (Nurs Yolu)

(٢) بریسكەكان، بریسكەی هەشتەم.

(٣) مەبەست (مارشاڵ فەوزی چاقماق)ە كە ئەو دەمە سەرۆك ئەركانی سوپای توركیا بووە.

لە ڕاستيدا تەنها كەرامەتی خزمەتكردنی قورئانی پيرۆز بوو ئەم گوفتارەی لە دەم دەركرد)[١].

(چەند كەسێك لەو سەرۆك هۆزانەی كە نۆ ساڵ پێش ئێستا[٢] لەگەڵ مندا بۆ شاری "بوردوور" ڕەهەندە كرابوون، گەلێ هەوڵيان دا و جەختيان لێ كردم كە زەكاتەكانيان لێ وەربگرم، تاكو لەبەر كەميی پارەكەم گرفتاری "نەبوونی" نەبم و زەليليم بەسەردا نەيەت.

منيش بەو سەرۆك هۆزە دەوڵەمەندانەم وت: "هەرچەند پارەكانم كەمن، بەڵام من دارای قەناعەت و دەست پێوەگرتنم و، لە ئێوە گەلێ دەوڵەمەندترم"!

بەم جۆرە، داخوازیيە دووپاتبووەكانيانم گێڕايە دواوە.

شايانی باسە كە هەندێك لەو كەسانەی ويستيان زەكاتيان لێ وەربگرم، لەبەر ئەوەی پابەندی "دەست پێوەگرتن" نەبوون، پاش دوو ساڵ "قەرزاری" يەخەی پێ گرتن!

بەڵام ئەو پارە كەمەی من – سوپاس بۆ خوا – بەهۆی بەرەكەتی دەست پێوەگرتنەوە تاكو حەوت ساڵی دوای ئەوەش بەشی كردم و، ئاوی ڕووم دانەتكايە خوار و، ناچاری ئەوەی نەكردم پێويستی و نەبوونيم لای خەڵكی بدركێنم و، دەستووری ژيانيشمی لێ نەشێواندم، كە بريتيیە لە "بێ نيازيم لە خەڵكی"[٣].

[ لەم شارەدا حەوت مانگ مايەوە و، پەيامی "يەكەم دەروازەی نوور"ی لەو ماوەيەدا دانا كە لە پێشەكیيەكەيدا دەڵێت ]:

ئەم پەيامە گفتوگۆيەكە لە نێوان سەعيدی كۆن و سەعيدی نوێدا، سيازدە وانەی لە ڕاستيیەكانی ئيمان لەخۆ گرتووە كە لە پلەی "شهود"دان و، دەروونی بەدخواز بێدەنگ دەكەن و، پتر لە "علم اليقين"ەوە نزيكن و، ڕاستەوخۆ لە قورئانی خاوەن "ئيعجازی بەيان"ەوە هەڵقوڵاون. لە هەموو يەكێكی ئەو وانانەدا گوفتارەكان ئاراستەی "سەعيدی نوێ" كراون..

---

(١) بريسكەكان، بريسكەی دەهەم، ل: ٨٣-٨٤.

(٢) واتە: ساڵی ١٩٢٦ز. (وەرگێڕ)

(٣) بريسكەكان، بريسكەی نۆزدەهەم، ل: ٢٨٤-٢٨٥.

❒ دوورخستنەوەی بۆ "ئیسپارتە"

مامۆستا دەڵێت: (کاتێ سستی ڕووی کردە کارەکانم لە خزمەتکردنی قورئاندا.. ئىا لەم کاتەدا و، بە پێچەوانەی ئەو مەبەستەی چاوەڕوانم دەکرد، سزایان دام! واتە لە بووردوورەوە بەرەو جێگایەکی تر دووریان خستمەوە، کە شاری "ئیسپارتە" بوو)[1].

(نۆ ساڵ پێش ئێستا هاتم بۆ شارێکی بەپیت و بەرەکەت و، وەرزیش زستان بوو، نەمتوانی سەرچاوەی سەروەت و لایەنەکانی بەروبوومی ئەو شارە ببینم. موفتیی شار - خوا لێی خۆش بێت - پێی وتم: "خەڵکی شارەکەمان دەستکورت و هەژارن". چەند جارێکیش قسەکەی دووپات کردەوە.

ئەم هەواڵە گەلێ کاری تێکردم و سۆزی بزواندم، تاکو نزیکەی شەش ساڵ خەم و ئازارم بۆ دەچەشتن و دوعای میهرەبانیم بۆ دەکردن.

کە پاش هەشت ساڵ لە وەرزی هاویندا سەرم لەو شارە دایەوە و سەیری باخ و بێستانەکانیم کرد، قسەکەی موفتیی خوا لێخۆشبووم هاتەوە یاد.

بە سەرسووڕمانەوە وتم:

سبحان الله! خۆ داهات و بەروبوومی باخ و بێستانەکانی ئەم شارە زۆر لە پێداویستییەکانی هەموو خەڵکی شار زیاترن، دەبوو دانیشتووانی ئێرە گەلێ دەوڵەمەند بوونایە!!

ماوەیەك لەم سەرسووڕمانەدا بووم. پاشان لە ڕێی "ڕاستی"یەکەوە، کە ڕواڵەت نەیتوانی بمخەڵەتێنێت و ئەو ڕاستییەم لێ بشارێتەوە، چونکە حەقیقەتێکە هەمیشە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان دەیکەم بە ڕابەر و ڕێنمای خۆم، تێگەیشتم کە لە ئەنجامی ئیسراف و دەست پێوەنەگرتنەوە بەرەکەت لەم شارە هەڵگیراوە!

بۆیە موفتی - خوا لێی خۆش بێت - وتی: "خەڵکی شارەکەمان دەستکورت و هەژارن". سەرباری ئەم هەموو سەرچاوە زۆرەی سەروەت و گەنجینەی داهاتیش کە لە شارەکەیاندا هەیە.

(١) بریسکەکان، بریسکەی دەهەم، ل: ٨٤.

بەڵێ، بە تاقیکردنەوە و لێکدانەوەی چەندین ڕووداوی لە ژمارەبەدەر چەسپاوە کە زەکات دان و بایەخدان بە هۆکارەکانی دەست پێوەگرتن، هۆی پیت و بەرەکەت و زیاد بوونی ڕۆزین. بەڵام ئیسراف و زەکات نەدان، بەرەکەت هەڵدەگرن)[1].

(لەوێ دەستم کردەوە بە کارکردن بۆ قورئانی پیرۆز. بەڵام پاش تێپەڕبوونی بیست ڕۆژ بەسەر ئەم خزمەتگوزارییەی قورئاندا، هەندێ لەو کەسانەی مەترسییان هەبوو، جار لە دوای جار دەهاتن ئاگاداریان دەکردمەوە و دەیانوت:

"لەوانەیە کاربەدەستانی شار ئەم کارەی تۆیان پێ باش نەبێت! کەواتە ئارام بگرە و پەلە مەکە".

لەمەوە بایەخدان بە تەنها خۆم و دواڕۆژی تایبەتیی خۆم بەسەرمدا زاڵ بووەوە، داوام لە برادەرانم کرد نەیەن بۆ لام! بەم جۆرە خۆم لە مەیدانی کار کشاندە دواوە.

ئنجا جارێکی تر دوور خرامەوە و، بۆ جێگایەکی تری سێهەم، کە "بارلا"یە، نەفی کرام)[2].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی نۆزدەهەم، ل: ٢٩٤-٢٩٥.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی دەهەم، ل: ٨٤.

# بەندی چوارەم

## لە تاراوگەی بارلا

### (یەکەم قوتابخانەی نوور)

### ١٩٢٧/٣/١ - ١٩٣٥/٤/٢٥ز

❐ ڕوخساری ئەم قۆناغە:

ئەم ماوەیە لێوانلێوە لەو ڕووداوە زریاناوییە گەورانەی کە سەرانسەری تورکیایان گرتەوە.

ئەوەبوو ئەو وڵاتە دەورانێکی یەکجار تاریکی بەخۆوە بینی لە ئیستیبدادی ڕەها و، ستەم و، دوژمنایەتیی دڕندانە و بێ پەردەی ئایین و، هەوڵی یەك لە دوای یەك بۆ کوژاندنەوەی نووری خوای گەورە و سڕینەوەی شەریعەتەکەی، هەموو ئەمانەش لە ژێر چەند ناوێکی ڕازاوەی چەشنی "بە شارستانی بوون"!

ئەم بارودۆخە تاریکە ماوەی چارەکە سەدەیەك - واتە هەتا ساڵی ١٩٥٠ز - بەردەوام بوو، چونکە دەسەڵات لەو ساڵانەدا تێدەکۆشا چەمکەکان ئاوەژوو بکات و، هەموو ئەو شتانە بگۆڕێت کە پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە هەبێت، چ لە ڕووی بیروباوەڕەوە، چ لە ڕووی کەلەپوورەوە، چ لە ڕووی داب و نەریتەوە، تەنانەت پۆشاك و، ڕەنووس و، پیتی نووسین و، جەژنەکان و، ڕۆژانی پشوو.. هتد!

ئەم مەبەستانەشی، بە دەرکردنی زنجیرە یاسایەك، بەسەر میللەتدا سەپاند.

❐ وا لە خوارەوە گرنگترینی ڕووداوەکان و ئاڵوگۆڕەکانی ماوەی نێوان (١٩٢٢-١٩٤٠ز) باس دەکەین:

سالّی ١٩٢٢ز

١٩٢٢/١١/١ هەڵوەشاندنەوەی پادشایەتیی عوسمانی.

سالّی ١٩٢٣ز

١٩٢٣/٨/٢٤ ئیمزاکردنی پەیمانی لۆزان.

١٩٢٣/١٠/٢٩ ڕاگەیاندنی ڕژێمی کۆماری و، هەڵبژاردنی مستەفا کەمال بە یەکەم سەرۆك کۆمار و، کردنی ئەنقەرە بە پایتەخت.

سالّی ١٩٢٤ز

١٩٢٤/٣/٣ هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و، وەدەرنانی یەك بە یەکی بنەماڵەی عوسمانی بۆ دەرەوەی وڵات!

١٩٢٤/٣/١٦ دەرچوونی یاسای "یەکخستنی وانە وتنەوەکان"ی ژمارە "٤٣٠" لە ٣/مارت/١٣٤٠ ڕۆمی.

بە پێی ئەم یاسایە، وتنەوەی وانەی ئایین هەڵوەشایەوە و، هەموو قوتابییەکان خرانە سەر وەزارەتی پەروەردە و، قوتابخانەکانی قورئانی پیرۆز و ئایین داخران.

١٩٢٤/٤/٢٤ هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی و، دادگا شەرعییەکان و، چاوخشاندنەوە بە دەستووری دەوڵەتدا.

سالّی ١٩٢٥ز

١٩٢٥/٢/١٣ سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران.

١٩٢٥/٢/٢١ ڕاگەیاندنی ئەحکامی عورفی لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا (کوردستان).

١٩٢٥/٣/٤ دەرچوونی یاسای سەپاندنی ڕێسا لە وڵاتدا.

٦-١٩٢٥/٣/٩ داخستنی دە ڕۆژنامە لە ئەستەمبوڵ.

١٩٢٥/٦/٢٩ لەسێدارەدانی شێخ سەعیدی پیران و چل و حەوت کەس لە هاوڕێیانی و، داخستنی هەموو تەکیە و خانەقاکان لە کوردستاندا.

١٩٢٥/٧/٢٥ هەڵوەشاندنەوەی تەقویمی بەکارهاتووی "ڕۆمی" و، بەکارهێنانی تەقویمی گریگۆریی ئەورووپی. هەروەها حساب کردنی کاتەکان بەپێی سەعاتی زەوالی بە یاسای ژمارە ٦٩٧،٦٩٨ و جێبەجێ کردنی لە بەرواری (١٩٢٦/١/١)ەوە.

١٩٢٥/٨/٢٤ دەرکەوتنی مستەفا کەمال بە شەپقەوە لە قەستەمۆنی.

١٩٢٥/٩/٢ داخستنی مەرقەد و زیارەتگاکان. هەروەها بڕیاری وەزاریی ژمارە (٢٤٩٣) سەبارەت بە جلوبەرگی ئایینی و ئەو جۆرە کڵاوەی کە دەبێ کارمەندان لەسەری بکەن!

١٩٢٥/٩/٤ بۆ یەکەم جار بەشداری کردنی چەند ئافرەتێکی موسڵمان لە ئاهەنگێکی سەما لە ناوچەی تەقسیم لە ئەستەمبووڵ.

١٩٢٥/١٢/٨ یاسای لەشولار (ژمارە ٦٧١، لە ١٣٤١/١١/٢٥ی ڕۆمی) و، لەسەرکردنی شەپقە و، خۆدەرخستنی ئافرەتان (سەپاندنی پۆشاکی ئەوروپی).

١٩٢٥/١٢/١٤ یاسای داخستنی سەرجەم تەکیە و خانەقاکانی وڵات (ژمارە ٦٧٧ لە ١٣٤١/١١/٣٠ ی ڕۆمی) و، ناچارکردنی کارمەندانی مزگەوت بۆ لەبەرکردنی پۆشاکی ئەوروپی و، کارمەندانی تر بە لەسەرکردنی شەپقە.

هەڵوەشاندنەوەی نازناوەکانی وەك شێخ، خەلیفە، مورید.

سالی ١٩٢٦ز

١٩٢٦/٢/١٧ هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕین بە پێی شەرعی ئیسلام و دانانی یاسای مارەبڕینی شارستانی (بە ژمارە ٧٤٣). بەپێی ئەم یاسایە فرەژنی قەدەغە کرا و، مارەیی کە پێویست بوو مێرد بیدات بە ژنەکەی هەڵوەشێنرایەوە و، پیاو ڕێی تەڵاقدانی ژنی خۆی لێ گیرا و، کچ ئازاد کرا لە هەڵبژاردنی مێرد لە هەر ئایینێك بێت و، یەکسانی خرایە نێوان نێر و مێ لە میراتدا و، سیستەمی میرات بردن بە خزمایەتی و خزمی عەصەبە هەڵوەشێنرایەوە.

١٩٢٦/٥/١٦ مردنی سوڵتان "محەممەد وەحیدەدین" لە شاری "سان ڕیمۆ"ی ئیتالیا.

١٩٢٦/١٠/٤ قبووڵ کردنی یاسای شارستانیی ئەوروپی، کە تەرجەمەی دەقاودەقی یاسای سویسری و ئیتالی‌یە و، دانانی بە یاسای سزای تورکی.. هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم یاسا شەرعی‌یەکان.

– دانانی پەیکەری مستەفا کەمال لە ناوچەی "سەرای بورنو" لە ئەستەمبووڵ، لە هەمان بەرواردا.

سالّی ١٩٢٧ز

١٩٢٧/٥/٢٠ لابردنی هەر تابلۆ و مۆرکێك کە پەیوەندیی بە دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە هەبێت لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا (بە یاسای ژمارە ١٠٥٧).

١٩٢٧/١١/٤ ئاهەنگ گێڕان بۆ لابردنی پەردە لەسەر پەیکەری "سەرکەوتن" لە ئەنقەرە.

سالّی ١٩٢٨ز

١٩٢٨/٢/٣ یەکەم وتاری هەینی بە زمانی تورکی.

١٩٢٨/٤/١٠ دەرهێنانی وشەی (الله) لەو سوێندەی کە پیاوانی دەوڵەت دەیخۆن. هەروەها لابردنی ڕستەی "ئیسلام ئایینی ڕەسمیی دەوڵەتە" و سەرجەم زاراوە و دەستەواژە ئایینی‌یەکان لە دەستووردا، بە پێشنیاری عیصمەت ئینۆنۆ و هاوڕێیانی، (بە یاسای ژمارە ١٢٢).

١٩٢٨/٥/٢٤ بەکارهێنانی ڕەنووسی ئەورووپی لەبری عەرەبی (بە یاسای ژمارە ١٢٨٨).

١٩٢٨/١١/١ کەمکردنەوەی ژمارەی کارمەندانی مزگەوتەکان لە (٢١٢٨) ەوە بۆ تەنها (١٨٨) دانە!

- بڕیاردان لەسەر بەکارهێنانی پیتە لاتینی‌یەکان لەبری پیتی بەکارهاتووی عەرەبی (بە یاسای ژمارە ١٣٥٣) بەپێی ئەم یاسایە چەندەها تۆن بەڵگەنامە و کتێبی بەهادار بە نزمترین نرخ فرۆشران و چەندین تۆنی تریشیان لێ ڕەوانە کرا بۆ کارگەی دروستکردنی کاغەز! لە هەمان بەرواردا.

- خەڵك ناچار کران کە لە ڕۆژنامەکان و تابلۆی کۆڵان و شەقام و سەر دووکانەکان بە پیتە تازەکان بنووسن، لە هەمان بەرواردا.

١٩٢٨/١٢/٣٠ داخستنی "نەوەد" مزگەوت لە ئەستەمبووڵ.

سالّی ١٩٢٩ز

١٩٢٩/٩/١ لابردنی وانەی عەرەبی و فارسی لە قوتابخانەکاندا و، قەدەغەکردنی خوێندنەوەی قورئان و کتێبە ئایینی‌یەکان و جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە بە توندوتیژی.

هەر لەم کاتەدا بەکارهێنانی نازناوە عوسمانییەکانی وەك پاشا و ئەفەندی و هاوشێوەیان قەدەغە کران.

سالّی ١٩٣٠ز

١٩٣٠/٣/٢٤ ماف درا بە ئافرەت لە هەڵبژاردنی شارەوانییەکاندا.

١٩٣٠/١٢/٢٣ ڕووداوی "مەنەمەن" و، چەند شۆڕشێك لە "ئاگری" لە سالّی ١٩٣٠ دا و، لە "مووش" و "شیوی زیلان" لە ١٩٣١ دا.

سالّی ١٩٣١ز

١٩٣١/٢/٣ لەسێدارەدانی "بیست و هەشت" کەس بەهۆی ڕووداوی "مەنەمەن"ەوە.

١٩٣١/٢/٢٦ قبووڵ کردنی پێوانەی مەتری و جێبەجێ کردنی لە ٤/١ ەوە.

سالّی ١٩٣٢ز

١٩٣٢/١/٢٢ خوێندنەوەی قورئانی تەرجەمەکراو بە تورکی.

١٩٣٢/٢/٦ وتاری هەینی بە تورکی لە مزگەوتی "سولەیمانییە"ی ئەستەمبووڵ.

١٩٣٢/٢/١٩ کردنەوەی مەڵبەندەکانی "خانەی گەل" لە نۆزدە پارێزگادا.

١٩٣٢/٦/٢٠ کردنەوەی بیست مەڵبەندی تر لە شوێنە جیاجیاکانی وڵاتدا.

١٩٣٢/٧/١٨ سەپاندنی بانگ و قامەت بە زمانی تورکی بە شێوەی ڕەسمی و قەدەغەکردنیان بە عەرەبی. هەروەها چاپکردنی موصحەف بە تورکی.

١٩٣٢/٨/١ بەشداری کردنی تورکیا لە پێشبڕکێکانی جوانیدا.

سالّی ١٩٣٣ز

١٩٣٣/٢/١ ڕوودانی شۆڕشێك لە "بوورسە" لە دژی بانگدان بە تورکی .

١٩٣٣/٢/٧ بانگدان بە تورکی لە هەموو مزگەوتەکاندا هاتە جێبەجێ کردن .

سالّی ١٩٣٤ز

١٩٣٤/١١/٥ بەخشینی مافی هەڵبژاردنە گشتییەکان بە ئافرەتان.

١٩٣٤/١١/ ٢٦ یاسای لابردنی نازناوەکان (بە یاسای ژمارە ٢٥٩٠).

١٩٣٤/١٢/٣ قەدەغەکردنی پۆشینی چەند پۆشاکێکی دیاری کراو بە یاسای (٢٥٩٦).

سالّی ١٩٣٥ز

١٩٣٥/١/٢ کردنی ڕۆژی یەك شەممە بە پشووی هەفتە لەبریی هەینی.

١٩٣٥/٢/١ گۆڕینــی مزگــەوتی "ئەیاسـۆفیا" بــە مۆزەخانــە دوای ماوەیــەك لــە داخستنی و، گۆڕینی مزگەوتی فاتیح بە جبەخانە.

هەروەك بڕیـار دەرچـوو بـە دانـانی کورسـی لـە نـاو مزگەوتـەکاندا و بـەکارهێنانی ئـامێری مۆسیقای (ئۆرگ) تیـایدا تـاکو قورئـان هاوکـات لەگـەڵ ژەندنـی مۆسـیقادا بخوێنرێت! بەڵام ئەو بڕیارە جێبەجێ نەکرا .

سالّی ١٩٣٨ز

ڕووداوی بەناوبانگی دەرسیم.

سالّی ١٩٤٠ز

١٩٤٠/٣/٧ وتنەوەی وانەی ئیلحاد بە ڕەسمی لە "پەیمانگاکانی گوندەکان"دا[١].

* * *

هە موو ئەم یاسـا و بڕیارانـە بـۆ ڕیشـەکەن کردنـی ئیسـلام و کوژاندنـەوەی پشـکۆی ئیمـان لـەناو دڵـی ئـەم نەتەوەیـەدا دانـران کـە بـە درێژایـی شـەش سـەدە ئـاڵای ئیسـلامی هەڵگرتبوو.. ئیتر بەو جۆرە:

وتنەوەی وانەی ئایین لە هەموو قوتابخانەکاندا قەدەغەکرا..

ژمارەکان (ڕەنووسەکان) و پیتەکانی نووسین کران بە پیتی لاتینی..

چەندین هەوڵ درا بۆ وەرگێڕانی قورئان و هـەوڵ درا بـۆ خوێندنـی تەرجەمەکـەی لـە نوێژدا..

هەروەك عەلمانییەتی دەوڵەت ڕاگەیەنرا و، ڕێ لە هەر چـالاکی و کاراییـەك گـیرا لـە بەرژەوەندیی ئیسلام، چونکە چاپکردنی کتێبی ئیسلامی قەدەغەکرا..

خەڵکی بە زۆرەملـێ ناچار کران پۆشاکیان بگـۆڕن بـە پۆشـاکی ئـەورووپی، ئـەوەبوو پیاوان بۆ لەسەرکردنی شەپقە و ژنانیش بۆ خۆدەرخستن زۆریان لـێ کرا..

---

(١) Muzaffer Gokman. Elli Yilin Tutanagi.

هەروەها چەندین دادگا پێکهێنرا کە لە پانتایی و درێژایی وڵاتدا ترس و دڵەڕاوکێی چاند و، سێدارەش بۆ چەندین زانای مەزن و هەموو ئەوانەش دانرا کە هەر گلەیی و ڕەخنەیەکی لە دەسەڵات بە دڵدا بێت[1].

بەم جۆرە، کەش و هەوایەکی ترس و تۆقاندن باڵی بەسەر هەموو لایەکی وڵاتدا کێشا، بە ڕادەیەك خەڵکە قورئانیان لە پێش چاوی کارمەندانی دەوڵەت دەشاردەوە.

ڕۆژنامەکانیش کەوتنە چالاکیی بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی و گاڵتەکردن بە ئایین..

ئیتر کتێبەکانی ئیلحاد بڵاوبونەوە و، لەجێی وشەکانی: "خوای پەروەردگار، بەدیهێنەر، ئیسلام "دا، وشەکانی: سروشت، پەرەسەندن، نەتەوایەتیی تورك.. هتد، دانران[2].

فێرکار و مامۆستایانیش لە قوتابخانەکاندا دەستیان دایە سڕینەوەی هەموو شوێنەوارێکی ئیمان لە دڵی منداڵاندا، چونکە فەلسەفەی ماددی و ئینکاری کردنی "بەدیهێنەر" و "پێغەمبەریتی" و "حەشر"یان بە گوێدا دەدان..

---

(١) چەندین زانای زۆر و ئەدیبی مەزن بەجێهێشتنی وڵاتیان هەڵبژارد بەسەر ئەوەدا کە بمێننەوە و شەپقە لەسەر بکەن. هەروەك چەندین شۆڕشی جۆراوجۆریش لە دژی دەسەڵات هەڵگیرسا لە چەند شوێنێکی جیاجیای وڵاتدا. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٥ز ئەم شۆڕشانە ڕوویان دا: لە سیواس ١٩٢٥/١١/١٤ و، لە ئەرزڕۆم ١٩٢٥/١١/٢٠ و، لە مەرعەش ١٩٢٥ /١١/٢٧ و، لە ڕیزە ١٩٢٥/١١/٢ و، هەموشیان بە هێز وزەبری دەسەڵات سەرکوت کران. (ب: ١/ ٥٢٦).
"قارا عەلی"ی جەللاد لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٣١/٣/٣ی ڕۆژنامەی "سۆن پۆستە"دا بە ڕاشکاوی ڕایگەیاند کە: " لە ماوەی ساڵانی ڕابوردوودا پێنج هەزار و دوو سەد و شازدە کەسم بە دەستی خۆم بە سێدارەدا هەڵواسیوە"! هەروەك ڕۆژنامەی "جومهورییەت" لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٣٠/٧/١٦دا بەم جۆرەی خوارەوە وەسفی ڕووداوەکانی کوردستان دەکات: "نزیکەی هەزار و پێنج سەد کەسی سەرلێشێواو پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکانی چیای ئەرارات. فڕۆکەکانمان بە چڕی بۆردومانیان کردن و، تەقینەوەکان بەردەوام بوون هەتا ئەو دەڤەرە لە یاخیبووان پاك کرایەوە، چونکە سەرجەمی ئەو گوندانە سووتێنران کە یاخیبووان پەنایان پێ بردبوو! "شیوی زیلان"یش پڕبووەوە لە لاشەی ئەوانەی کە لەناوبران و ژمارەیان هەزار و پێنج سەد کەس بوو. (Bediuzzaman Said Nursi, Yavuz Bahadiroglu: ٢٠٠).

(٢) هەندێ لەوانەی کە ئاڵای "نەتەوایەتیی تورك"یان هەڵگرتبوو ئەمانە بوون: تەکین ئالب (جوولەکە)، زیاء گۆك ئالب (قوتابیی زانای کۆمەڵناسی ئیسرائیلی دۆرکایم)، ئەحمەد ئاغاییف و یووسف ئاقجورە (کە دەزگای هەواڵگریی ڕووسیا ئامادەی کردبوون و لە دوای لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید ڕەوانەی تورکیا کران)!

هەروەها دەسەڵات بە خستنەگەڕی سەرجەم توانا و دەزگا و هێز و دادگاکانی ئەو دەمەی خۆی، هەوڵی پچڕاندنی هەموو پەیوەندی‌یەکی دا کە ئەم نەتەوەیە بە ئایینەکەیەوە پەیوەست بکات و، تێکۆشا بۆ دەرهێنانی قورئان لە دڵیاندا. بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە هەوڵی دا نوسخەکانی قورئان کۆبکاتەوە و لەناویان بەرێت.. بەڵام کاتێ زانییان ئەو کارە دژوارە، پلانیان بۆ ئەوە داڕشت کە نەوەی داهاتوو دوور لە ئیمان و ئیسلام پێبگات، ئیتر ئەو نەوەیە بۆ خۆی هەوڵی لەناوبردنی قورئان دەدات[1]!

یەکێك لە زنجیرە کارەکانی شەڕ فرۆشتن بە ئیسلام و ڕاوەدوونانی زانایانیدا، گرتنی مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی و بردنی بوو لە شوێنی خواپەرستی‌یەکەیەوە لە چیای "ئەرەك" و دوورخستەوەی بۆ "بارلا" کە شارۆچکەیەکی دوورە دەستە، بە نیازی ئەوەی کە ناوی بکوژێتەوە و کاریگەریی کەم ببێتەوە و لەبیر بچێتەوە و ئەم کانیاوە بەخورەمە وشك بکات.

بەڵام بە پێچەوانەی ئەو پلانە ترسناکەی کە بۆی داڕێژرابوو، مامۆستا نوورسی تەنانەت یەك خولەکی کاتەکانی خۆی بەفیڕۆ نەدا، بەڵکو خولەك بە خولەکی ژیانی خۆی لەپێناوی مەزنترین خزمەتی ناو ئەم دنیایەدا بەسەربرد کە خزمەتی ئیمان و قورئانە..

ئیتر لێبڕا بۆ سوودمەندبوون لە ڕێژنەی نوورەکانی قورئانی پیرۆز و دەستی پێوەگرت، هەتا خوای گەورە هێندە لە نووری ئایەتە حەکیمەکانی قورئانی بەسەردا ڕشت کە لافاوێکی زوڵاڵی لە پەیامەکان هەڵساند کە ناوی "پەیامەکانی نوور"ی لێ نان و بە پەنهانی و دوور لە بینینی چاوی دەسەڵات لە نێوان دۆستان و خۆشەویستانیدا بڵاوی کردنەوە، ئیتر بە ئیزنی خوای گەورە شیفای بەو سەرگەردانانە بەخشی کە موحتاجی ئیمان بوون.

---

(١) برای بەڕێزمان "ئەدیب ئیبراهیم دەبباغ" لە کتێبی "سعید النورسي رجل الایمان في محنة الکفر والطغیان"دا چەندە ڕاستی وتووە کە دەڵێ: " ئایا چ چارەنووسێك چاوەڕێی تورکیای دەکرد گەر خوای گەورە ئەم پیاوەی بۆ نەناردایە، لەو کاتەدا کە قولنگی ڕق و پاچی وێرانکاری کەوتبوونە کار بۆ لەرزەخستن بە ئیمان و داڕماندنی تەلارەکەی و سڕینەوەی ئاسەواری لە وڵاتدا؟ دیارە ئەو کاتە شەبەنگی "ئەندەلوس"مان بە لاوازی و گریانەوە دەهاتە پێش چاو، کە بە بێ گەڕانەوە، ئیسلام تیایدا دەکشایەوە.

بەم جۆرە، خوای گەورە ویستی وابوو کە لەو کاتە تاریك و نووتەکەدا "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" ئالاکە هەڵبگرێت. ئەویش بڕیاری دا کار بۆ "ڕزگارکردنی ئیمان" بکات. ڕزگارکردنی ئیمانی سەرانسەری گەلێك کە وەکو دیلی لێ هاتبوو، تەنانەت لە هەموو لایەکەوە تیری کوفری ئاراستە کرابوو، تاکو ئەو ئیمانەیان بپێکێت و بۆ هەتاهەتایی بیمرێنێت کە لە دڵیاندا ڕیشەی داکوتابوو.

ویستی خوای گەورە وابوو کە ئەم گوندە بچووکە "بارلا" ببێتە سەرچاوەی تیشکدانەوەیەکی ئەوتۆی ئیسلام کە دوایی سەرانسەری تورکیای گرتەوە و، تیشکەکانی گەیشتە هەموو گوند و ناوچە و شارێکی وڵات[1].

(لە ڕووی باسکردنی نیعمەتەوە دەڵێم:

سەد هەزار جار سوپاس بۆ خوای گەورە کە هەموو گوشار و خۆسەپاندنێکی ئەوان وەکو تەختەداری لێ دێت بۆ گڕپێوەنانی ئاگری هیممەت و غیرەت، تاکو نوورەکانی قورئان پتر ڕووناك و درەخشان بن!

جا ئەو ڕووناکییانەی قورئان، کە بە تەنگ پێ هەڵچنین لە لایەن ئەوانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا، گەرموگوڕیی غیرەت و هیممەتیان تێدا بووژایەوە و هێندە فراوانییان بەدەست هێنا کە سەرانسەری پارێزگا، تەنانەت زۆربەی شارەکانی تریشیان وەکو قوتابخانە لێ کرد و تەنها بە "بارلا"وە نەمانەوە!

پێیان وابوو کە منیان لە گوندێکدا بەند کردووە.. کەچی ئەو گوندە "بارلا"، بە کوێرایی چاوی زەندەقە و ئیلحاد و بە فەزڵی خوای گەورە و بە پێچەوانەی ئاواتی ئەوانەوە، بوو بە کورسیی دەرس و وانەی نوورەکانی قورئان. تەنانەت گەلێ شوێنی تر بە وێنەی "ئیسپارتە" ڕۆشتنە ڕیزی قوتابخانەکانەوە)[2].

□ لە "بارلا"

مامۆستا سەعیدی نوورسی لە ١٩٢٧/٣/١ز[3] گەیشتە "بارلا"ی سەر بە پارێزگای ئیسپارتە، لە خۆرئاوای ئەنادۆڵ.

---

(١) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati.

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦١٢.

(٣) ئەم بەروارە بە پێی لێکۆڵینەوەی توێژەر "نەجمەدین شاهینەر"ە. بەڵام سەرچاوەکانی تر دەڵێن مامۆستا لە ساڵی (١٩٢٦ز)دا گەیشتووەتە بارلا.

یەکەم شەو لە پاسگەی پۆلیس مایەوە[1]..

پاشان خانوویەکی بچووکی دوو ژووریی بۆ تایبەت کرا بەسەر مێرگ و باخەکانی بارلادا دەیڕوانی کە تا لێواری دەریاچەی سازگاری "ئەگریدیر" درێژ بوونەتەوە، درەختێکی پەڵکی بەرزیش لە بەردەم خانووەکەدا بوو.

دارتاشێك ژوورێکی بچووکی سەرنەگیراوی بە تەختە لە نێوان لقەکانی ئەو درەختەدا بۆ دروست کرد. مامۆستا زۆربەی کاتەکانی لە هەردوو وەرزی بەهار و هاویندا لەو ژوورە تەختەیەدا شەو تا بەیانی بە خواپەرستی و بیرکردنەوە لە دەستەڵاتی خوای گەورە بەسەر دەبرد. خەڵکی بارلا نەیاندەزانی مامۆستا کەی دەخەوێت و کەی هەڵدەستێ! لە ئارامیی شەودا هەر کەسێك لە نزیکی ئەو درەختەوە تێپەڕ دەبوو گوێی لە دەنگی نزا و پاڕانەوەکانی ئەو زانا شەونوێژخوێنە خواپەرستە دەبوو.

(١) "شەوکەت دەمیر ئای" ئەو سەربازەیە کە ئەرکی گواستنەوەی مامۆستا نوورسیی بۆ ناحیەی "بارلا" خرابووە ئەستۆ، یادداشتەکانی خۆی لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوە و، دەڵێ:
لە شاری "ئەگریدیر" بووم، کە سەرلەبەیانیی ڕۆژێك بانگیان کردم بۆ سەنتەری شارەوانی.. منیش ڕۆشتم. بینیم قایمقام و، فەرماندەی جەندرمە و، ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی و، مرۆڤێکی مێزەربەسەریشی لێیە کە لە ساڵەکانی چلی تەمەنیدایە و جوببەیەکی لەبەردایە و ڕوخسارێکی بەویقاری هەیە.
فەرماندەی جەندرمە ڕووی تێکردم و، وتی: کوڕم! گوێ بگرە. دەبێ ئەم مامۆستایەمان کە ناسراوە بە "بەدیعوززەمان" لەگەڵ خۆتدا ببەیت بۆ "بارلا". ئەم ئەرکەشت زۆر گرنگە. خۆ کاتێ کە لەوێ تەسلیمی فەرمانگەی پۆلیست کرد، با ئیمزا لەسەر ئەوراقە ڕەسمییەکان بکەن و، پاشان ئاگادارمان بکەرەوە.
وتم: بەڵێ باشە گەورەم. لەگەڵ مامۆستادا لەوێ دەرچووین و، لە ڕێگادا پێم وت: مامۆستا گیان! تۆ لە جێی باوکمدایت.. ئەمە ئەرکە پێم سپێرراوە، تکایە لێم زویر نەبیت.
پاشان باسی گەشتەکە دەکات کە بە بەلەم ڕۆشتوون. دەڵێ:
کەش و هەواکە سارد و وەرزیش زستان بوو، ئاوی دەریاچەکە لێرە و لەوێ بەستبووی. یەکێك لە سەوڵ لێدەرانی بەلەمەکە دارێکی درێژی بە دەستەوە بوو سەهۆڵی پێ دەشکاند و ڕێی ڕۆشتنی بۆ بەلەمەکە دەکردەوە. مامۆستا هەندێ مێوژ و شیرینیی بەسەردا دابەش کردین. من بە وردی سەرنجی مامۆستام دەدا، بینیم هەتا بڵێی لەسەرخۆیە و دەیڕوانییە دەریاچەکە و چیاکانی دەوروبەری.
لەبەر ئەوەی ڕۆژگار کورت بوو، کاتی نوێژی عەسر زوو هاتە پێشەوە. ویستی بە پێوە نوێژەکەی بکات، ئێمەش ئاراستەی کەشتییەکەمان بەرەو قیبلە ڕاگرت. کتوپڕ گوێم لە دەنگێکەوە بوو وتی: "الله أكبر"! لە هەموو ژیانمدا تەکبیرێکی ئاوا بە سام و خشووعم نەبیستبوو! وا هەستم دەکرد کە مووەکانی جەستەمان ڕاوەستاون. ڕەفتار و جموجوڵەکانی لە هی ئەو مامۆستایانەی تر نەدەچوو کە بینیبوومانن. زۆر هەوڵمان دەدا کە بەلەمەکە لەسەر ئاراستەی قیبلە نەجووڵێت. کاتێ نوێژەکەی خوێند، ئاوڕی لێ داینەوە و، وتی: "سوپاستان دەکەم براکانم! ماندووم کردن". مرۆڤێکی خاکی و ڕەوشت جوان بوو. (ذكريات عن سعيد النورسي) ص: ٣٠.

مامۆستا هەمیشە تەندروستیی ناڕێك بوو، خواردنی كەمی دەخوارد. تەنانەت دەتوانرێ بوترێ كە تەمەنی خۆی بە نیوە برسی و نیوە تێر لێ گوزەراوە، چونكە ڕۆژێكی ڕەبەقی بە قاپێكی بچووكی شۆربا و چەند لەتێك نان ڕایی دەكرد. خواردنەكەشی لەماڵێكی دراوسێیەوە بۆ دەهات كە هەمیشە بە جەختەوە پارەكەی دەدانێ، چونكە ئەو دروشمەی كە بە درێژایی تەمەنی لەم ڕووەوە جێبەجێی دەكرد بریتی بوو لەوەی هیچ شتێك بێ بەرامبەر لە كەس وەرنەگرێت. هەموو ژیانی خۆی بە دەست پێوەگرتن و، بەرەكەت و، ئەو پارەیەی كە زووتر پاشەكەوتی كردبوو، بەسەربرد.

دەسەڵات هەمیشە چاوی لەسەر دانابوو، چاودێریی هەموو وەستان و جموجووڵێكی ئەوی دەكرد. لەبەر ئەوە، خەڵكی بارلا خۆیان لێ دەپاراست و نزیكی نەدەبوونەوە و نەیاندەدواند. ئەویش زۆربەی كاتەكانی لەناو ماڵ بەسەر دەبرد، یان لە وەرزەكانی بەهار و هاویندا دەرۆشتە دەرەوە بۆ سەر چیای"چام" و[1]، لەناو درەخت و دەوەنەكانیدا لێ دەبڕا بۆ بیركردنەوە و خواپەرستی[2].

---

(١) ڕۆشتن بە پیادەیی لە بارلاوە بۆ سەر چیای چام چوار سەعات دەخایەنێت.

(٢) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati. ڕۆژێكی وەرزی هاوین مامۆستا نوورسی وەكو نەریتی خۆی لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە بەرەو چیاكە. كاتێ كە لە ماڵ دەرچوو، ئاسمان ساماڵ و دنیاش خۆرەتاو بوو. بەڵام هەر هێندەی گەیشتە سەر لوتكەی چیاكە، ئاسمان بوو بە هەور و، هەڕەشەی نزیكبوونەوەی با و بارانێكی قایمی پێ بوو. هەروەهاش بوو، هێندەی نەخایاند هەور گرماندی و ئاسمان چەخماخەی دا و باران بە خوڕ دایكرد. مامۆستاش لەسەر لوتكەی چیاكە بە تەنیا بوو، جگە لە درەختەكان كە سوودێكیان نەبوو بۆ پاراستنی لەو بارانە، پەناگەیەكی دیكەی شك نەدەبرد لە خوڕەمی بارانەكە بیپارێزێت. زۆری پێ نەچوو بارانەكە هێور بووەوە و، مامۆستاش بە هەڵی زانی، گەڕایەوە بۆ ناو ئاوایی. بەڵام هەر لە تەوقی سەرەوە هەتا پاژنەی پێی تەڕ بووبوو، لە ڕێگادا پێڵاوەكانیشی دڕا. كە هاتەوە پێڵاوەكانی بە دەستەوە گرتبوو، بە گۆرەوییە خوریییە سپییەكانیشی بە ناو قوڕاوەكەدا دەڕۆشت!
كاتێ گەیشتەوە "بارلا" كۆمەڵێ خەڵكی ئەوێ لە نزیكی كانیی ئاوەكە ڕاوەستابوون و پێكەوە گفتوگۆیان دەكرد. كتوپڕ ئەو دیمەنە كاریگەرەیان بینی.. دیمەنی ئەم زانا گەورە بەسام و هەیبەتەی كە لە وڵاتی خۆی دوور خراوەتەوە و.. بە تەنیایی دەژی و.. لە لایەن هەموو كەسێكەوە پەیوەندیی لەگەڵ دابڕاوە.. وا ئێستا پێڵاوە دڕاوەكانی بە دەستەوە گرتووە و، بە گۆرەوییەكانیەوە بەناو قوڕاوەكەدا هەنگاو دەنێت و، چمكی پۆشاكەكەی بەریشی قوڕاوی بووە!
لەم كاتەدا بێدەنگییەكی قورس باڵی بەسەر ئەو خەڵكەدا كێشا و، دوو دژە هەست و سۆزی جیاواز زۆربەیانی بەم لا و ئەولادا كێش كرد: سۆزی درێژكردنی دەستی یارمەتی و، هەستی ترسیش لە چاوی سیخوڕەكانی دەسەڵات كە چاودێریی هەموو جموجوڵێكی ئەویان دەكرد..

## لە یادداشتەکانی "بارلا"

### ❑ گوشاری یەك لە دوای یەك

(لە "بارلا"شدا هەر کات سستی ڕووی بکردایەتە کارکردنم بۆ قورئان و، بایەخم تەنها بە خودی خۆم بدایە و تەنها هەوڵم بۆ چارەسەرکردنی کاروباری قیامەتی خۆم بوایە، یەکێك لە هەژدیهاکانی ئەهلی دنیا بەسەرمدا زاڵ دەبوو، یان مونافیقێك ڕێی پێ دەگرتم و شەڕی پێ دەگێڕام!

جا برایانم! من ئامادەم هەشتا ڕووداوی وەك ئەم جۆرەتان بۆ بگێڕمەوە، کە تەنها لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی مانەوەمدا لە بارلا بەسەرم هاتوون)[1].

### ❑ چەند نموونەیەك لەو گوشارانە

(لەم ماوەیەی دواییدا لە لایەن ئەو مولحیدانەی کە لە پشت پەردەوە خۆیان مەڵاس داوە، گەلێ دەستدرێژیی نابەجێ کرایە سەر مافی ئیمانداره لاوازەکان، بە تایبەت ئەو دەستدرێژییە ئاشکرایەی کردیانە سەرم و، خۆیان کوتایە ناو مزگەوتە تایبەتییەکەمەوە کە بۆخۆم ئاوەدانم کردبووەوە و لەگەڵ چەند کەسێکی کەمی هاوەڵە ئازیزەکانمدا نوێژمان تێدا دەکرد و، بە نهێنی بانگ و قامەتمان تێدا ئەنجام دەدا..

پێمان وترا: بۆچی نوێژ بە زمانی عەرەبی دەکەن و بە نهێنیش بانگ دەدەن؟!

منیش ئارامم لە لا بڕا و نەمتوانی بێ دەنگ بیم..

وا ئێستا ڕووی گوفتارم ئاراستەی ئەو چەشنە کەسە دەنی و نزمانە ناکەم کە لە ویژدان بێ بەش کراون و شایانی ئەوە نین قسەیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو ڕووی

---

هێندەی نەبرد لە نێوان ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدا "سلێمان" ناوێك دەرپەڕی و، بەرەو ڕووی مامۆستا ڕۆشت و، پێڵاوەکانی لێ وەرگرت و لە حەوزی ئاوەکە بۆی شۆرد. ئنجا لەگەڵ مامۆستادا ڕۆشت هەتا گەیاندییەوە ماڵەوە و بردیەوە بۆ ناو ژوورەکەی خۆی.

ئەم "سلێمان کاروانچی"یە دوایی بوو بە یەکەم هاوڕێی مامۆستا و قوتابی لەسەر دەستیدا. هەروەك بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە بارلا خزمەتی مامۆستای کرد و، نموونەی ڕاستی و وەفا و ئیخلاس بوو! ساڵی (١٩٦٥ز) کۆچی دوایی کرد. خوا لێی خۆش بێت.. (ذکريات عن سعيد النورسي) ص: ٣٢.

(١) بریسکەکان، بریسکەی دەهەم، ل: ٨٤.

گوفتارم دەکەمە ئەو سەرۆکە فیرعەونئاسایانەی سەرکردایەتی، کە بە گوێرەی هەوا و ئارەزووی ستەم و لەسنوور دەرچوونیان یاری بە چارەنووسی نەتەوە دەکەن)[1].

(بەهۆی هاندان و هاوبەشی کردنی مامۆستا"معلم"یەکی بێ ویژدانەوە، بەرپرسەکە فەرمانی بۆ پۆلیسەکان دەرکردبوو کە: "بڕۆن ئەو میوانانە دەستگیر بکەن و بیانهێنن". ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئێمە لە مزگەوتدا سەرگەرمی زیکرەکانی دوای نوێژ بووین.

ئامانجی ئەوان لەم ڕەفتارەدا ئەوەبوو کە تووڕەم بکەن و، بە هەست و نەستەکانی "سەعیدی کۆن" بڕۆم بە گژیاندا و، لە بەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتە هەڕەمەکی و نایاساییەوە دەریان بکەم.

بەڵام ئەو بەدبەختە نەیدەزانی کە "سەعید" هەرگیز ناچێت بە دارعەسایەکی شکاوی ناو دەستی بەرگری لە خۆی بکات، لە کاتێکدا کە "شمشێرێکی ئەڵماس"ی دروستکراوی کارگەی قورئانی حەکیمی لە زماندایە، بەڵکو لە بریی دارعەساکەی دەستی، ئەو شمشێرە ئەڵماسە بەکار دەهێنێت!

لەگەڵ ئەوەشدا پۆلیسەکان بە سەلیقە و لەسەرخۆ بوون و، تا کۆتایی هاتنی نوێژ و تەواوبوونی زیکرەکانی چاوەڕوانییان کرد و ڕاوەستان، چونکە هیچ حکوومەت و دەوڵەتێك خۆی لە نوێژ و مزگەوتدا هەڵناقورتێنێت تا نوێژ و زیکرەکانی تەواو نەبن. کەچی بەرپرسەکە لەم ڕەفتار و چاوەڕوانییەی پیاوەکانیشی تووڕەیی سەری تێکرد و یەکسەر پاسەوانەکەی بە دوادا ناردن و وتی: "پۆلیسەکان گوێڕایەڵیم ناکەن"!

بەڵام خوای گەورە من بەم چەشنە مارانەوە سەرقاڵ ناکات. ئامۆژگاریشم بۆ برایانم ئەوەیە کە ئەوانیش پێیانەوە سەرقاڵ نەبن، مەگەر پێویستییەکی ناچارەکی یەخەیان پێ بگرێت. بەڵکو خۆتان بەرزتر ڕابگرن لەوەی کە تەنانەت قسەشیان لەگەڵدا بکەن و بیاندوێنن. چونکە وەك وتراوە: "جواب الأحمق السكوت"(واتە: وەڵامی مرۆڤی گەوج بێ دەنگییە)! بەڵام وریای ئەم خاڵەی خوارەوە بن:

هەروەك ئەگەر لە بەرامبەر ئاژەڵێکی دڕندەوە خۆت بە "لاواز" پیشان بدەیت، ئەم کارەت ئازایەتی و غیرەتی دەداتێ کە هێرشت بکاتە سەر، لاوازی نواندنیش، بە

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و نۆهەم، ل: ٧٢٧-٧٢٨.

مەرایی کردن، بۆ کەسێك کە سروشتی ئاژەڵی دڕندەی لە خۆدا هەڵگرتبێت، بە هەمان جۆرە و هانی دەدات بۆ دەستدرێژی کردن!

کەواتە دەبێ هاوڕێیانمان بە وریایی و حەزەرەوە ڕەفتار بکەن، نەبادا لایەنگرانی زەندەقە و ئیلحاد کەمتەرخەمی و بێ ئاگاییان بقۆزنەوە)[1].

❑ خوای گەورە ستەمە جۆراوجۆرەکانی ئەوانی
دەگۆڕی بە چەندین جۆری چاکەی خۆی

(سوپاسی لەژمارەبەدەر بۆ خــوا‌وەندی میهرەبانم، لەسەر ئەوەی کە ئەو هەموو سەختی و ستەمەی ئەهلی دنیا هێنایانە ڕێم، خوای گەورە هەموویانی بۆ گۆڕیم بە چەندان جۆر چاکە و میهرەبانی.

لەو کاتەدا کە من لەناو ئەشکەوتی چیایەکدا بە گۆشەگیری دەژیام و دەستم لە سیاسەت داتەکاند و دنیام پشتگوێ خست و سەرگەرمی کاروبارەکانی قیامەتم بووم، دنیاویستان لەوێ هێنایانمە دەرەوە و، بە ناڕەوایی بۆ ئێرە دووریان خستمەوە.

بەڵام بەدیهێنەری دانا و میهرەبانم ئەم تاراوگەیەی ئێرەی بۆ گۆڕیم بە میهرەبانی و خێر و خۆشی. چونکە ئەو گۆشەگیرییەی ناو چیاکەی ئەوێ، کە لەوانە بوو گرفتاری چەند هۆکارێکی ئەوتۆ ببێت کە ئارامی و ئاسایشی تێدا نەهێڵن و کەلێن لە ئیخلاسدا پەیدا بکەن.. خوای گەورە بۆی گۆڕیم بە گۆشەگیرییەك لەناو چیاکانی "بارلا"دا کە لە هەموو لایەکەوە هێمنی و ئاسایش و ئیخلاس دەورەیان داوە.

ئەو دەمەی کە لە ڕووسیا دیل بووم، بڕیارم دا و لە خوای گەورەش لاڵامەوە کە لە کۆتایی تەمەنمدا گۆشەگیریم لە ئەشکەوتێکدا بۆ بڕەخسێنێت. وا خوای گەورەی میهرەبان لە بریی ئەو ئەشکەوتە، "بارلا"ی بۆ ڕەخساندم و سوودەکانی ئەو ئەشکەوتەی کە من لە نیازمدا بوو لە بارلادا بۆی ئاسان کردم و، گیروگرفتەکانی ئەشکەوت نشینیی نەخستە ئەستۆی لاوازمەوە، جگە لە چەند تەنگوچەڵەمەیەك کە هێنرانە ڕێم بەهۆی ئەو گومانانەی لە دڵی چەند کەسێکی خەڵکی بارلادا بوون، ئەوانەی کە پێشتر هاوڕێم بوون و پاشان وەهم و گومان سواری سەریان بوو، کاتێ لایان وابوو لە بەرژەوەندی و

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٠٧-٦٠٨.

حەوانەوەی من هەوڵ دەدەن، بەڵام بەم وەهم و گومانەیان منیان گرفتاری دڵتەنگی و خزمەتی قورئانیشیان دووچاری زیان کرد.

ئنجا هەرچەند ئەهلی دنیا "بەڵگەنامە"ی گەڕانەوەیان بە هەموو "دوور خراوەکان" دا و، لە گشت تاوانبارانیش خۆش بوون و لە بەندیخانەکان بەریان دان.. کەچی بە ناڕەوا و ستەم بەڵگەنامەیان بە من نەدا و لێیان قەدەغە کردم. بەڵام پەروەردگاری میهرەبانم ویستی وابوو کە لەم نامۆیی و ئاوارەییەدا بمهێڵێتەوە، تاکو پتر لە خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزدا بمخاتە کار و ئەم نوورانەی قورئان زیاتر بنووسم کە ناوم لێ ناون "وتەکان". بەم جۆرە منی لەم نامۆییە دوور لە جەنجاڵی و غەڵبە غەڵبەدا هێشتەوە و، ئەم هێشتنەوەیەشی بۆ کردم بە میهرەبانی‌یەکی مەزن و فراوان.

هەروەها ئەهلی دنیا بواری مانەوەی ناو شارۆچکە و شارە مەزنەکانیان بە گشت سەرۆك هۆز و قسە ڕۆشتووە دوورخراوەکان دا، لەوانەی کە دەتوانن دەست لە کاروباری دنیایی ئەماندا وەربدەن، هەروەك ڕێی خزم و کەسانیشیان دان کە بڕۆن بۆ لایان و سەریان لێ بدەن، کەچی بە ناڕەوایی و ستەمکاری ژیانی گۆشەگیری‌یان تەنها بەسەر مندا سەپاند و ڕەوانەی گوندێکی بچووکیان کردم و، ڕێیان بە خزم و کەس و خەڵکی شارەکەشم نەدا - یەك دوانێکیان نەبێت - سەرم لێ بدەن.

ڕەفتاری دنیاویستان لەگەڵ مندا بەم جۆرە بوو.. بەڵام بەدیهێنەری میهرەبانم ئەم گۆشەگیری‌یە سەپاوەی بۆ گۆڕیم بە میهر و بەزەیی و سۆزێکی فراوان. چونکە بوو بەهۆی ساف بوون و خاوێن کردنەوەی زەینم لە شتانی بێ نرخ و ئاراستە کردنی بەرەو بەهرە وەرگرتن لە قورئانی پیرۆز بە جۆرێکی خاوێن و بێگەرد و، دوور لە هەموو ئامانج و مەبەستێکی تر.

پاشان لە سەرەتای هاتنمدا بۆ ئێرە و، لە ماوەی دوو ساڵی ڕەبەقدا، تەنها دوو نامەی ئاساییم نووسیبوو، کەچی ئەهلی دنیا ئەمەیان بە شتێکی زۆر و کارێکی گەورە لەسەر تۆمار کردم! تەنانەت لە ماوەی دە ڕۆژ یان بیست ڕۆژ یاخود مانگێکدا یەك دوو میوان دێنە لام، ئەهلی دنیا بەمە دڵگران دەبن و، پێیان ناخۆشە کەسێك بێت بە میوانم! لە کاتێکدا کە مەبەست لەو سەردانە تەنها دەستکەوتنی پاداشتی دوارۆژە..

کەواتە ئەوان لەمەدا ستەمیان لێ کردم.. بەڵام پەروەردگاری میهرەبان و بەدیهێنەری دانام ئەو ستەمەی ئەوانی بۆ گۆڕیم بە میهرەبانی، چونکە لەم سێ مانگە پیرۆزەدا، کە مرۆڤ داهاتی نەوەد ساڵی ژیانی مەعنەویی تیایاندا دەست دەکەوێت[1]، ئەوان منیان خستە گۆشەگیرییەکی پەسەند و بەکەڵکەوە.

کەواتە: "الحمد لله علی کل حال")[2].

### ❑ "ئیمان" هات بە هانامەوە

(ئەو دەمەی لە شوێنی دوورخرانەوەم - کە دیلییەکی ئازاربەخش بوو - بە تەنیایی لەسەر لوتکەی چیای "چام" دەژیام، کە بەسەر سەوزەڵانیی "بارلا"دا دەڕوانێت.. لەو تەنیایی و گۆشەگیرییەدا بە شوێن نوورێکدا دەگەڕام کە دڵم ڕووناك بکاتەوە.

شەوێکیان لەو ژووورە بچکۆلە سەرنەگیراوە دانیشتبووم کە لەسەر درەختێکی سنەوبەری سەر لوتکەی ئەو چیایە "بە تەختە" دروست کرابوو..

کتوپڕ پیرییەکەم چەندین جۆری غەریبیی خستە پێش چاوی هەست و شعوورم، وەك ئەوەی کە لە مەکتووبی شەشەمدا بە ڕوونی باس کراوە. چونکە لە هێمنی و کپیی ئەو شەوەدا جگە لە زایەڵەی خەمناکی خشەی گەڵای دارەکان هیچ دەنگێکی تری تێدا نەدەبیسترا. هەستم کرد ئەو زایەڵەیە سەرجەمی هەست و نەستەکانم و ناخی پیری و غەریبیمی پێکا و، بە گوێی دڵمدا چرپاندی و وتی:

"هەروەك ڕۆژی ڕووناك بوو بەم گۆڕە تاریکە و دنیا کفنی ڕەشی پۆشی، ڕۆژگاری تەمەنیشت - بە هەمان جۆر - شەوی بەسەردا دێت و، ڕۆژگاری دنیاش دەگۆڕێت بە شەوگاری بەرزەخ و، ڕۆژی هاوینی ژیانیش دەبێت بە شەوی زستانی مردن"!

دەروونیشم بە خەفەتەوە لە وەڵامدا وتی:

"ڕاستە، من لێرەدا نامۆ و دوور لە شار و نیشتمانی خۆمم. بەڵام جودایی خۆشەویستانی درێژایی تەمەنم کە لە پەنجا ساڵ تێپەڕ بووە و لە فرمێسك ڕشتن بە دوایاندا هیچی تر شك نابەم، نامۆییەکی گەلێ دژوارترە لە نامۆیی نیشتمان. تەنانەت

---

(١) مەبەست مانگە پیرۆزەکانی: "ڕەجەب، شەعبان، ڕەمەزان"ە. (وەرگێڕ)

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی سیازدەهەم، ل: ٧٤-٧٦.

ئەم شەو من هەست بە غەریبی‌یەك دەكەم كە ئازارەكـەی گەلـێ زیـاترە لـەچاو غـەریبیی سەر لوتكەی ئەم چیایە كە ئەویش پۆشـاكی نـامۆیی وخەفـەتی پۆشیوە! چونكـە "پـیری" هەڕەشـەی نزیكبوونـەوەی كـاتی جودایی تـەواوەتی و كۆچـی دواییـم لـەم دنیایـە لـێ دەكات".

لەتاوا، هەر لە ناوەندی ئەم نامۆییەی كە خەفەت گەمارۆی داوە و ئەم خەفەتـەش كـە ئاوێتەی ئازارە، بە دوای ترووسكاییەكی نوور و دەرگایەكی هیوا و ئومێددا دەگەڕام..

لە ناكاودا "ئیمان بە خوا" هات بە فریامەوە و دەستی گرتم و، لە پاش هەستكردن بەو غەریبی‌یە، ئاسـوودەیی و دڵنەواییـەكی گـەورەی ئەوتۆی پێ بەخشـیم كـە ئەگـەر ئـەو ئازار و نامۆییەم چەندان جار لەوەش زیـاتر بوایـە، هـەر دەیڕەواندنـەوە و ئاسـوودەیی پـێ دەبەخشیم.

بـەڵێ خوشـك و برایـانی پیرم! مـادەم بەدیهێنـەرێكی میهرەبانمـان هەیـە، ئـەوا ئێمـە غەریب و نامۆ نین.. مادەم خوای گەورە هەیە، ئەوا ئێمە هەموو شتێكمان هەیە.. مـادەم خوا و فریشتەكانی هەن، ئەوا ئەم دنیایە چۆڵ نی‌یە و، ئەم بیابان و هەردانەش كە بە چۆڵ دێنە بەرچاومان، لە ڕاستیدا پڕن لە مەلائیكەت و بەندە بەڕێزەكانی خوای گەورە.

بەڵێ، نووری ئیمان بەو خوایە و، ڕوانینە دنیا لەبەر خوای گەورە و لە ڕوانگەی ئەو ئیمانەوە، هەرچی درەخت و دار و بـەرد هەیـە، هـاودەم لەگـەڵ بـەندە خـاوەن هەسـت و شعوورەكانی، هەموویان دەكات بە خەمڕەوێن و هـاوەڵ و ئاشـنامان. چونكـە دەگونجـێ ئەو بوونەوەرانە بە زمانی حاڵیان لەگەڵماندا بدوێن و، دڵمـان بدەنـەوە و، بێ تاقـەتیمان دەربكەن)[1].

□ چەند جۆرێكی غەریبی

(دوو سـێ مانگە بە تەنیایی ماومەتەوە. مەگەر نزیكەی بیست ڕۆژ جارێك میوانێك بێت و سەرم لـێ بدات، دەنا زۆربەی كاتەكانی تر بە تەنیا كەسی دەمێنمەوە. وا نزیكەی بیست ڕۆژە هیـچ كەسێكم لـە خـەڵكی چیاكـە لـە دەوروبـەردا نـەماوە و هـەموویان بڵاوەیان لـێ كردووە.

(١) بریسكەكان، بریسكەی بیست و شەشەم، ل: ٤٥٦-٤٥٧.

لەم چەشنە چیا چۆڵانەدا کە غەریبیم بە یاددا دەهێنن، کاتێ کە شەو پەردەی خۆیم بەسەردا دەدات و جگە لە خشەی خەم بزوێنی گەڵای دارەکان هیچ دەنگ و زایەڵەیەکی تری تێدا نابیسترێت، خۆم لە نێوان پێنج جۆری غەریبیدا دەبینمەوە:

یەکەمیان: لەبەر ئەوەی هەندێ بەساڵا چووم و پیری جێ دەستی خۆی تێدا دەرخستووم، ئەوا هەستم بە غەریبی و دووریی خۆم کرد لەو کەسوکار و هاوڕێ و خۆشەویستانەم کە بەجێیان هێشتووم و بۆ جیهانی بەرزەخ گواستوویانەتەوە..

هەر لەم غەریبی‌یەوە بازنەی غەریبی‌یەکی ترم لێ خرایە سەرپشت، کە بریتی بوو لەوەی هەستم بە غەریبی‌یەکی ئاوێتەی ئازاری جودایی کرد، چونکە بینیم زۆربەی ئەو بوونەوەرانەی کە پەیوەندیم پێیانەوە هەیە، بە وێنەی بەهاری ڕابوردوو، ڕۆشتوون و بەجێیان هێشتووم!

ئنجا لە ناوەندی ئەم غەریبی‌یەوە بازنەی غەریبی‌یەکی تر کرایەوە، کە غەریبیمە لە نیشتمان و کەسوکار، چونکە هەستم بە غەریبی‌یەکی ئاوێزانی ئازاری جودایی کرد کاتێ بینیم بە تەنیایی و دوور لە نیشتمان و کەسوکارم دەژیم.

هەر لە ناوەندی ئەم غەریبی‌یەوە، بارودۆخی شەوی تار و چیا بەرجەستەکانی بەردەمم غەریبی‌یەکی ئەوتۆیان بەسەردا دادامەوە کە خەم و خەفەتێکی ئاوێتەی سۆز و بەزەیی لەگەڵ خۆدا هێنابوو.. کە ئەمەش کارێکی کرد هەست بکەم مەیدانی غەریبی‌یەکی تر لە بەردەم ڕۆحمدا کراوەتەوە، کە وەختە ئەم میوانخانە فانی‌یە جێ بهێڵێت و ڕووەو ئەبەد و هەتاهەتایی بکەوێتە ڕێ. لەمەوە هەستم کرد کە غەریبی‌یەکی نائاسایی منی لە ئامێز گرتووە. بۆیە کەوتمە بیرکردنەوە و، یەکسەر لەبەر خۆمەوە وتم: "سبحان الله". ئنجا بیرم کردەوە لەوەی کە ئایا چۆن مرۆڤ بتوانێت ڕووبەڕووی ئەم هەموو تاریکی‌یە زۆر و یەك لەسەر یەك و غەریبی‌یە جۆراوجۆرانە ببێتەوە کە بەم چەشنە ئاوێتەی یەکتری بوون؟

"دڵ"م هاواری لێ هەڵسا و وتی:

ئەی پەروەردگارم! من غەریب و تەنها و لاواز و بێ توانا و نەخۆش و دەستەوسان و پیر و بێ ئیختیارم!

ئەی خوای گەورەم! هانام بۆ هێناویت! دەسا فریام بکەوە.. داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم.. لە دەرگانەی تۆدا دەستەوسان و بێ دەستەڵات کەوتووم، هێز و توانات لێ دەخوازم!

یەکسەر "نووری ئیمان" و "ڕێژنەی قورئان" و "لوتف و سۆزی پەروەردگار" هاتن بە هانامەوە و، هێندە هێز و پێزیان پێ دام کە هەر پێنج جۆرە غەریبییە تاریکەکانی دەوروبەریان بۆ ڕەواندمەوە و گۆڕییان بە پێنج بازنەی نوورانیی شاد و دڵنەوایی‌بەخش. ئیتر "زمان"م دەستی کرد بە دووپات کردنەوەی ئایەتی:

﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾ (آل عمران:١٧٣).

"دڵ"یشم ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە کە دەفەرموێ:

﴿فان تولّوا فقل حَسبيَ الله لاّ إلــه الا هــو عليــه توكلــتُ وهــو ربُّ العــرشِ العظيم﴾(التوبة:١٢٩).

پاشان "ژیری"م ڕووی گوفتاری ئاراستەی "دەروون"ی نیگەران و دەم بە هاوار و شڵەژاوم کرد و، وتی:

ئەی بێچارە! واز لە سکاڵا و هاوار بهێنە و پشت بە خوای گەورەی خۆت ببەستە..

چونکە سکاڵا - خۆی لە خۆیدا - بەڵایەکی ئاوێتەی بەڵایە و گوناهێکە لە دووتوێی گوناهباریدا.

گەر بە بۆنەی ئەم بەڵایەتەوە "بەڵابەخش" بناسیت و بیدۆزیتەوە، ئەوا بەڵاکەت لە ڕاستیدا دەبێت بە بەخششێکی مەزن و سەفایەکی یەکجار زۆر.

کەواتە واز لە سکاڵا بهێنە و، قازانجی شوکرانەبژێری دەستی خۆت بخە، چونکە زەردەخەنەی گوڵ لە شەوقی ڕووی "بولبولی عاشقیەتی"!

ئەوەتا دنیاکەت - بە بێ خواناسی - سەرانسەر ئازارە و هەردەم ڕوو لە نەمانە.

کەواتە وەرە لەم بەڵایەدا پشت بە خوا ببەستە..

بۆچی بەم جۆرە لە دەست بەڵایەکی بچووك وا هاوار دەکەیت، کە لە هەمان کاتدا پڕ بە دنیا کۆڵی بەڵات لەسەر شانە؟!

زەردەخەنەی "تەوەککول" لە ڕووی بەڵادا بنوێنە، با ئەویش بە پێکەنین بەرەو ڕووت بێتەوە..

چونکە هەتا ئەو لە پێکەنیندا بێت، ئەوا هێدی هێدی بچووك دەبێتەوە، تا بە تەواوی نامێنێت)[١].

☐ کۆچی دوایی عەبدوڕەحمان و دڵدانەوەیەك لە قورئانەوە

(لەو کاتەدا کە بە تەنیایی لە "بارلا"ی سەر بە پارێزگای "ئیسپارتە" دەژیام و، بە دەست ئەو دیلییە ئازاربەخشەوە دەتلامەوە کە پێی دەوترێت: "دوورخراوەیی" و، تێکەڵیی خەڵکی و تەنانەت نامە گۆڕینەوەشم لەگەڵ هەر کەسێکدا لێ قەدەغە کرابوو، سەرەڕای نەخۆشی و پیری و غەریبیی خۆیشم..

لەم کاتەدا کە من گرفتاری ئەم حاڵە بووم و خەم و خەفەتی تاڵم لە دەست دەچەشت، نوورێکی دڵدەرەوە و درەخشانم لە سەرنج و نهێنییە وردەکانی قورئانی پیرۆزەوە لێ دەرکەوت، کە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی پێی دەبەخشیم و ڕێی پێ ڕووناك دەکردەوە بۆم.

منیش تێدەکۆشام کە بە هۆی ئەو نوورەوە ئەشکەنجە و بارودۆخە ئازاربەخشەکەم لە بیری خۆم بەرمەوە، بە ڕادەیەك کە توانیم لەو ڕێیەوە شار و خزمان و خۆشەویستانم لە بیر بچێتەوە، تەنها یەکێك لەو خۆشەویستانە نەبێت کە - بە داخەوە - هەرگیز لە یادم نەچوو، ئەویش "عەبدوڕەحمان"ی برازام بوو.. کە لە ڕاستیدا کوڕی مەعنەوی و هاوڕێی ئازا و قوتابیی دڵسۆزم بوو، نزیکەی حەوت ساڵیش دەبوو لێك دابڕابووین. نەشمدەزانی لە کوێیە تا بە هەر جۆرێك بووە نامەی بۆ بنێرم و قسەی لەگەڵدا بکەم و، پێکەوە هاوبەشی خەمی یەکتر بین. هەروەك ئەویش جێگای منی نەدەزانی هەتا بێت بۆ لام تاکو بۆ دڵدانەوە و خزمەتکردنم لێ بیرێت..

بەڵێ، لەم پیرییەمدا گەلێ پێویستم بە یەکێکی تێکۆشەر و ڕاست و ڕاستگۆی وەك "عەبدوڕەحمان" هەبوو!

ڕۆژێکیان لە ناکاودا نامەیەکیان دایە دەستم.. هەر کە هەڵم پچڕی سەیر دەکەم ئەم نامەیە کەسێتیی "عەبدوڕەحمان"ی بە تەواوی پێوە دیارە.

لە ڕاستیدا ئەم نامەیە زۆر گریاندمی و تا ئێستاش هەر دەمگریێنێت!

(١) مەکتووبات، مەکتووبی شەشەم، ل: ٣٦-٣٨.

چونکە "عەبدورەحمان" لەم نامەیەدا دەری بڕیبوو کە بە تەواوی دەستی لە چێژە دنیاییەکان و لە هەموو خۆشی و لەزەتێکی هەڵگرتووە و، نووسیبووی کە ئەوپەڕی ئاواتی ئەوەیە بگاتە لای من و لە پیریمدا چاودێریم بکات وەك ئەوەی کە من لە کاتی منالیی ئەودا چاودێریم دەکرد. تاکو بە قەڵەمە کارامەکەی لە کارمەندی و ئەرکی ڕاستەقینەی ئەم دنیایەمدا یارمەتیم بدات، کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی ڕاز و نهێنییەکانی قورئانی پیرۆز. جگە لەمەش داوای "سی" پەیامی کردبوو کە بۆی بنێرم، تاکو بە خۆی و یارمەتیدەرانیەوە لە هەریەکەیان "سی" دانە بنووسنەوە!

ئەم نامەیە بە هیوایەکی توندوتۆڵ منی بە دنیاوە بەستەوە و، لەبەر خۆمەوە دەموت:

"وا من قوتابیی دڵسۆز و ئازا و زیرەك و بەوەفای خۆم دۆزییەوە، ئەو کەسەی کە پەیوەندیی نێوانمان لە پەیوەندیی نێوان باوك و کوڕ گەلێ بەهێزتر بوو. وا دۆزیمەوە و، ئاشکراشە کە دێت بۆ لام بۆ چاودێری کردنم".

ئەم هیوایە هەرچی ئازاری دیلی و تەنیا باڵی و غەریبی و پیری بوون، هەموویانی لە بیر بردمەوە!

ئەم نامەیە ئیمانێکی گەلێ درەخشان و بەهێزی پێوە دیاربوو. وەك بڵێی کاتێ "عەبدورەحمان" نووسیویەتی چاوەڕێی ئەجەلی خۆی کردووە! چونکە لەو ماوەیەدا نوسخەیەکی لە "وتەی دەهەم - پەیامی حەشر" دەست کەوتبوو کە سەبارەت بە "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" دەدوێت و چاپم کردبوو. جا ئەو پەیامە بە وێنەی مەڵهەمێك هەموو زام و برینە مەعنەوییەکانی ماوەی حەوت ساڵی ڕابوردووی ئەوی تیمار و سارێژ کردبوو.

لە پاش نزیکەی دوو مانگ کە من لەم هیوایەدا دەژیام و، چاوەڕێی گەیشتنی "عەبدورەحمان" بووم، تاکو پێکەوە ژیانێکی پڕ لە بەختیاری لە دنیادا بەرینە سەر، کەچی لە ناکاودا دەنگوباسی مردنی هات!!

ئەم دەنگ و باسە وەها ڕایتەکاندم کە تا ئێستا و بە درێژایی ئەم پێنج ساڵەی مردنیشی، هێشتا کاریگەری و خەفەتی هەر لە دڵمدا ماوە و، ئازار و پەژارەیەکی هێندە زۆری بۆ بەجێ هێشتم کە لەو دیلی و تەنیاباڵی و غەریبی و پیری و نەخۆشییەی تیایاندا دەتلامەوە، گەلێ زۆرتر و زیاتر بوو!

پێشتر دەموت: "نیوەی دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆم بە مردنی دایکم لەدەستم چوو". کەچی وا ئێستا نیوەکەی تریشی بە مردنی "عەبدوڕەحمان" تەواو بوو، کەواتە ئیتر من هیچ پەیوەندی‌یەکم بە دنیاوە نەماوە!

بەڵێ، ئەگەر "عەبدوڕەحمان" لە ژیاندا بمایە، لە دنیادا دەبوو بە جەمسەرێك بۆ کارمەندی‌یەکەی سەر بە دوارۆژم و، دوای خۆیشم دەبوو بە باشترین جێگەدارم و، لە ماوەی دنیاشدا هاوڕێ‌یەکی بە وەفا دەبوو بۆم و، دڵم پێی دەکرایەوە و، دەبوو بە ئەمینداریکی دڵسۆز و قوتابی‌یەکی زیرەکی "پەیامەکانی نوور".

بەڵێ، کۆچی دوایی "عەبدوڕەحمان" سەبارەت بە کەسێکی وەك من – وەك مرۆڤێك – لە دەستچوونێکی ئازاربەخش و دڵ سووتێنەرە!

خۆ هەرچەندە هەوڵێکی سەرومڕم دەدا بۆ ئارامگرتن و خۆڕاگری، کەچی ڕووبەڕووی زریانێکی هێندە بەتین وتەوژم بووبوومەوە کە هەموو سووچ و قوژبنێکی گیانمی گرتبووەوە. خۆ ئەگەر ئەو دڵدانەوانە نەبوونایە کە هەندێ جار لە نهێنی‌یەکانی قورئانی پیرۆزەوە دەهاتنە فریام، ئەوا کەسێکی وەك من هەرگیز بەرگەی ئەو گەردەلوولەی نەدەگرت و، ئارامی لا هەڵدەگیرا و، بە تەواوی ئۆقرەی لەبەر دەبڕا!

هەر بەم خەفەت و ئازارانەوە، هەندێ جار دەڕۆشتم بۆ ناو هەرد و شاخە چۆڵەکانی "بارلا" و لەوێ بە گۆشەگیری و تەنیایی دادەنیشتم و، بە وێنەی فیلمی سینەما تابلۆ جوانەکان و دیمەنە نیانەکانی ئەو ژیانی بەختەوەری‌یەم بە پێش چاودا دەهات و دەڕۆشت کە لەگەڵ قوتابی‌یەکانمدا – لە کەسانی وەك عەبدوڕەحمان – بردبوومەسەر. جا هەرکات ئەو تابلۆیانە لە بەردەم ئەندێشەمدا تێدەپەڕین، هەست ناسکیی پیری و غەریبیم ئەوەندەی تر لە هێزی بەرگریی منی کەم دەکردەوە و، پتر وورەی دەڕووخاندم و، زیاتر هەستی دەبزواندم!

بەڵام لە ناکاودا یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئایەتی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ إِلاّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (القصص: ٨٨) هێندە بە ئاشکرا و ڕوونی لە ڕووی دڵمدا دەرکەوت کە هانی دام دوو جار "یا باقي أنت الباقي" لەبەر خۆمەوە دووپات بکەمەوە و، بەمەش دڵم بە تەواوی کرایەوە.

بەڵێ، بەهۆی نهێنی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە و، لە نێوان ئەو هەرد و شیوە چۆڵەدا و، لەگەڵ ئەو دەروونە پڕ ئازارەدا، خۆمم لە لای سەرووی سێ تەرمی گەورەدا بینییەوە، وەك لە پەیامی "پلیکانەی سونەت"دا ئاماژەم بۆ کردووە:

یەکەم: خۆمم وەك کێلی گۆڕێك هاتە پێش چاو، کە پەنجا و پێنج سەعیدی مردووی ماوەی ژیانی منی تێدا ئەسپەردەی خاك کرابوون، بە درێژایی تەمەنم کە خۆی دابوو لە پەنجا و پێنج ساڵ!

دووهەم: خۆمم بە وێنەی زیندەوەرێکی بچووکی وەك "مێروولەیەك" دەبینی کە بەسەر رووی ئەم چەرخەدا دەڕۆشت، کە لە جێی کێلی گلکۆی تەرمە گەورەکەی گرۆی مرۆڤە، هەر لە ئادەم پێغەمبەرەوە - دروودی لەسەر بێت - تا دەگاتە ئێستا.

سێهەم: بەهۆی نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە مردنی ئەم دنیا گەورەیەم لە پێش چاودا بەرجەستە بوو، وەك ئەوەی کە هەموو ساڵێك - بە وێنەی مردنی مرۆڤ - چەندین دنیای گەڕۆك دەمرێت و بە تازەبوونەوەی ساڵ، ساڵی پێشوو کۆچ دەکات.

کاتێ کە من لەم حاڵەدا بووم، واتا ئاماژەییەکەی ئایەتی: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (التوبة:١٢٩) هات بە فریامەوە و، نوورێکی نەکوژاوەی هێنا بە هانامەوە و، ئەو خەم و پەژارە زۆرەی کە لە مردنی "عەبدورەحمان"ەوە تووشم بوو، هەمووی ڕەواندەوە و، دڵنەوایی ڕاستەقینەی پێ بەخشیم.

بەڵێ، ئەم ئایەتە پیرۆزە پێی سەلماندم کە مادەم خوا هەیە، ئیتر ئەو خوایە جێی هەموو شتێکمان بۆ دەگرێتەوە و، بوونی ئەو سەرزیادی بوونی هەموو شتێکی ترە. چونکە دەرکەوتنی چاودێری و عینایەتێکی ئەو جێی هەموو جیهان دەگرێتەوە و، تاقە تیشکێکی نووری ئەویش ژیانێکی وا بەو سێ تەرمە دەبەخشێت کە دەری دەخات ئەوانە تەرم نین، بەڵکو بریتین لەوانەی کە ئەرکی فەرمانبەرییان لەم سەرزەوییەدا کۆتایی پێ هێناوە و بۆ جیهانێکی تر کۆچیان کردووە.

لەبەر ئەوەی ئەم نهێنی و حیکمەتەمان لە "بریسکەی سێهەم"دا ڕوون کردووەتەوە، بە پێویستی نازانم لێرەدا زیاتر ڕوون بکرێتەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە:

ئەو شتەی بوو بەهۆی ڕەوینەوەی سەرجەمی داخ و خەفەتە زۆرەکانم تەنها دووپات کردنەوەی دوو جارەی "یا باقي أنت الباقي" بوو، کە واتای ئایەتی پیرۆزی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَهُ﴾ لێك دەداتەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە، دەڵێم:

کاتێ کە بۆ یەکەم جار "یا باقي أنت الباقي"م وت، هەستم کرد بە وێنەی نەشتەرگەری لە دەروونمدا تیماری ئەو برینە مەعنەوی‌یە زۆرانە دەکرێت کە بەهۆی تەواو بوونی دنیا و کۆچ کردنی خۆشەویستانی وەك "عەبدوڕەحمان"ەوە لە دڵمدا پەیدا بووبوون..

بەڵام بۆ جاری دووهەم ڕستەی: "یا باقي أنت الباقي" بوو بە مەڵهەمێك و گشت ئەو برینانەی بۆ ساڕێژ کردم. ئەویش بە تێڕامان لەم واتایەی خوارەوە:

"کێ دەڕوات با بڕوات! خۆ تۆ هەر دەمێنیتەوە! تاقە درەوشانەوەیەکی میهرەبانیی تۆ سەروزیادە بۆ هەموو شتێکی فانی و بڕاوە. هەروەها مادەم تۆ هەیت، ئیتر ئەو کەسەی کە بەهۆی باوەڕهێنانی پێت و گوێڕایەڵیی بۆ ئایینەکەت - کە ئیسلامە - پەیوەندیی بە تۆوە هەیە، لە هیچ شتێکی کەم نی‌یە و هەموو شتێکی هەیە. نەمان و ڕۆیشتن و مردن و نەبوونیش، هەموویان پەردەی تازەکردنەوە و هۆکاری گەشت و گوزارن بەناو چەندین جێ و شوێنی جیاجیادا"!

ئیتر بەم بیرکردنەوەیە، ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یە خەفەت بەخش و سامناك و تاریك و سووتێنەرانەم نەمان و، خۆشحاڵی‌یەکی ڕووناك و بەلەزەت و خەمڕەوێن جێی گرتنەوە. ئنجا دڵ و زمانم، تەنانەت هەموو خانە و گەردیلەیەکی جەستەشم - بە زمانی حاڵ - دەستیان کرد بە وتنی: "الحمد لله" و سوپاسکردنی خوای گەورە)[1].

□ هەندێ نموونەی تێڕامانی لە نیشانەکانی گەردوون

(کاتێ کە لە دەمی دوورخراوەییم لە "بارلا"دا، لەسەر لوتکەی چیایەکەوە سەیری درەختی کاژ و قەتران و عەرعەرم دەکرد، کە هەموو لایەکی ئەو دەوروبەرەیان داپۆشیبوو، سەرنجی بارودۆخ و ناوازەیی شێوە و دیمەنیانم دەدا.. کتوپڕ سروەیەکی

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٤٨٦-٤٩٠.

لەسەرخۆ و نیان لەراندنیەوە و ئەو دۆخە کپ و ئارام و بەسام و شکۆیەی ئەوانی گۆڕی و خستنیە کۆڕێکی زیکر و تەسبیح و تەهلیل و، حاڵ و جەزبەی شەوق و شادییەوە. بینیم سەرتاپای ئەو دیمەنە قەشەنگ و ڕەنگینەی کە ئاوێزانی شادمانی بووە، دەرسی پەند و ئامۆژگاریی لێ دەچۆڕێت و دانایی بە گوێی مرۆڤدا دەچرپێنێت. یەکسەر لەو دیمەنەوە، ئەم بڕگە کوردییەی خوارەوەی شێخ ئەحمەدی جزیریم[1] هاتەوە یاد کە دەڵێت:

هەرکەس بتەماشاگەهی حوسنا تە ژ هەر جا تەشبیهی نیگاران ب جەمالا تە دنازن[2]

واتە هەموان، لە هەموو لایەکەوە، بە پەلە بۆ بینینی جوانیی تۆ هاتوون و، شانازی بەو جوانییەی تۆوە دەکەن!

جا بۆ دەربڕینی واتاکانی ئەو ئامۆژگاری و پەندانەی کە لەو دیمەنەوە هەستم پێ کرد، "دڵ"م بەم شێوەیەی خوارەوە دایە پڕمەی گریان:

ئەی پەروەردگارم! هەموو زیندەوەرێك لە گشت شوێنێکدا، پێکەوە، بۆ جوانیی تۆ دەڕوانن و، سەرنجی تێڕامان ئاراستەی دیمەنە ناوازەکانی گۆی زەوی دەکەن، کە پیشانگای سنعەتی نایابی تۆیە.

هەموو یەکێك لەو زیندەوەرانە، بە وێنەی دەلاڵ و بانگەوازکار، لە هەموو جێگایەکدا.. لە زەوی.. لە ئاسمانە بڵندەکاندا، دەنگیان لێ هەڵبڕیوە و لە بارەی جوانیی تۆوە دەدوێن و، بینەران و سەرنجدەرانی پێ ئاشنا دەکەن.

ئەم درەختانەش، کە هەندێکن لەو دەلاڵ و بانگەوازکارانە، لە خۆشی و مەستیی جوانیی نەخش و نیگارەکانت بەسەر ڕوخساری بوونەوەرەوە، کەوتوونەتە لەنجەولار و، جەزبەی شادمانییان لێ هاتووە و..

---

(١) شێخ ئەحمەدی جزیری بە "مەلای جزیری" بەناوبانگە و خەڵکی جزیرەی بۆتانە. مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی هێشتا بە تەواوی بۆیان ساغ نەبووەتەوە کە ئایا لە سەدەی شەشەم یان نۆهەمی کۆچیدا ژیاوە؟ دیوانەکەی گەلێ جار چاپ کراوە. پوختەترینیان تا ئێستا ئەو چاپەیە کە مامۆستا هەژاری موکریانی - خوا لێی خۆش بێت - بە لێکدانەوەی تێر و تەسەلی خۆیەوە چاپی کردووە، چەند پێشەکی و سەرەتایەکی بەسوودیشی بۆ نووسیوە. بڕوانە: (دیوانی عارفی ڕەببانی شێخ ئەحمەدی جزیری مەشهوور بە مەلای جزیری) شەرح و لێکدانەوەی هەژار چ/ سرووش - تاران ١٣٦١ هەتاوی. (وەرگێڕ)

(٢) دیوانی جزیری (لێکدانەوەی هەژار)، ل ٣٧٦. (وەرگێڕ)

لە ئەنجامی بینینی کەماڵی سنعەتی تۆوە، چەندین ئاوازی زیکر و زایەڵەی نەرمونیان دەردەبڕن و بە گوێی ئێمەیدا دەدەن.. دەڵێی دەنگخۆشیی زایەڵەی ئاوازەکانیان، پتر مەستی کردوون و بە لەنجەولاری نازەوە هەموویانی هێناوەتە سەما. هەر بۆیە، بۆ سەما و لەنجەولاری ئاوا، ڕاپەڕیون و ئارەزووی مەستی و جەزبەش کەمەندکێشی کردوون.

هەموو زیندەوەرێك ئیلهامی نوێژ و تەسبیحاتی تایبەتیی خۆی لە ئاسەوارەکانی ئەم میهرەبانی‌یە تایبەتەوە وەردەگرێت.

پاش خوێندن و وەرگرتنی ئەو وانە ڕەوانە، یەك بە یەکی ئەو درەختانە لەسەر تاشە بەردێکی ڕەق ڕادەوەستێت و دەستەکانی ڕووەو عەرشی مەزن ڕادەگرێت..

نابینیت هەموویان پۆشاکی بەندایەتی‌یان پۆشیوە و، لە بەردەم دەرگانەی خوای مەزندا دەستەکانیان بە لالانەوەی گەرمی بە کوڵ هەڵبڕیوە، دەڵێی "شابازی قەلەندەر"ن؟![1]

پەلە ناسکەکانیشیان بە وێنەی پەلکە جوان و دلڕفێنەکانی "شاناز"[2] دەلەرێنەوە و، چەندەها تاسەی ناسك و چێژی بەرز و بلند لە بینەراندا دەورووژێنن؟!

ئەم جوانی‌یە دەڵێی بەجارێ سەرجەمی چینەکانی عیشق دەخرۆشێنێت.. تەنانەت پەنجە ناسك و نیانەکانیشی بەسەر قووڵترینی ژێ هەستیارەکانی مرۆڤدا دەهێنێت!

ئەم بارودۆخە سەرنج بزوێنەی درەختەکان، واتای وەك ئەمەی خوارەوە بە بیری مرۆڤدا دەهێنێت:

دیمەنی ئاوا، پەژارەیەکی خەمناك دەخاتەوە یاد و.. گریانێکی تالیش لە قووڵایی ناخی مرۆڤدا هەڵدەقوڵێنێت. ئەو ناخەی کە بە ئازاری نەمانی خۆشەویستە مەجازی‌یەکان، هەردەم دێنەوە سۆ و پتر دەکولێنەوە.

ئەو دیمەنە، ئاوازی جودایی و ئازاری بەسوێ بە گوێی عاشقاندا دەدات، ئەوانەی کە بە وێنەی لێکدابڕانی سوڵتان مەحموود لە "ئەیاز"ی خۆشەویستی، لە دڵخوازەکانیان دابڕاون!

---

(١) خزمەتگوزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە و، هەر لەسەر دەستی ئەویشدا پێگەیشتووە و بە پلەکانی ویلایەتدا سەرکەوتووە. (دانەر)

(٢) کیژێك بووە کە بە جوانیی خۆی و فز و پەرچەمی بەناوبانگ بووە. (دانەر)

ئەم درەختانە، بە ئاوازە خەمناك و ناسکەکانیان، دەڵێی زایەڵەی "نەمری" بە گوێی ئەو مردووانەدا دەدەن کە لە گفتوگۆ و لێدوانی دنیا بڕاون.

"گیان"یش لەم دیمەنانەوە تێگەیشت کە سەرجەمی شتان، بە تەسبیح و تەهلیل و زیکرەوە، ڕوویان لە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری مەزن کردووە. کەواتە ئەو دەنگانەی لێیان دەبیستڕێت دەنگ و زایەڵەی لاڵانەوەکانیانە.

"دڵ"یش، لە ناوەندی هۆنینەوە بەرز و بڵندەکەی ئەم ئیعجازە ناوازەیەدا، نهێنیی "تەوحید" لەسەر ڕوخساری ئەو درەختانەدا دەخوێنێتەوە، کە دەڵێی هەریەکەیان ئایەتێکی بەرجەستەی قورئانی پیرۆزن..

واتە: هێندە ڕێسای دەراسا و.. سنعەتی ناوازە و.. ئیعجازی حیکمەت لە بەدیهێنانی هەریەکەیاندا دەبینیت کە ئەگەر سەرجەم هۆکارەکانی گەردوون کۆ بینەوە و خاوەن ویست و ئیختیار و تواناش بن، ئنجا ناتوانن لاساییان بکەنەوە و هاوویْنەیان بەدی بهێنن!

"دەروون"یش کە هەموو جارێك ئەم بارودۆخە لە درەختەکاندا دەبینێت، "بوونەوەر" وا دێتە پێش چاوی کە لە بەردەم تەوژمی گێژاوی بەخوڕەمی زەمان و جوداییدا تەپاوتلی پێ کەوتبێت!

بۆیە، لەتاوا، کەوتە گەڕان و پشکنین و.. خولیای دۆزینەوەی چێژێکی نەبڕاوەی هەمیشەیی کەوتە سەر، تا لە ئەنجامدا ئەم واتایەی پێ ڕاگەیەنرا کە:

"بە وازهێنانت لە دنیاپەرستی، مانەوەت دەستگیر دەبێت"!

"عەقڵ"یش ڕێکوپێکیی بەدیهاتن و.. نەخش و نیگاری حیکمەت و.. گەنجینەکانی چەندەها نهێنیی مەزنی لە توێی:

ئەم دەنگە ناسك و ئارامانەی درەختەکان و سەرجەمی زیندەوەران و.. ئاورنگی ڕووەکە وردیلەکان و..شنەی سروەی هەوا فێنکەکاندا.. بەدی کرد!

لەوەش تێگەیشت کە هەرچی شت هەیە، بە چەندین لایەن و ڕوو، تەسبیحاتی خۆی بۆ بەدیهێنەری مەزنی ڕادەگەیەنێت!

سەبارەت بە "ئارەزووی دەروون"یش، ئەوا چێژێکی هێندە ناسك لە خشەی گەڵاکان و هەڵکردنی سروە نیانەکانەوە هەست پێ دەکات کە سەرتاپای چێژە مەجازییەکانی لە بیر دەباتەوە، تەنانەت هێندە تام و چێژ لەو دیمەنە وەردەگرێت کە پڕ بە

دڵ حەز دەکات دەست لەو تام و چێژە مەجازی‌یانە هەڵبگرێت - کە گەوهەری ژیانی ئەون - و لە پێناوی ئەو چێژە حەقیقی‌یانەدا بمرێت و بتوێتەوە!

"ئەندێشە"ی مرۆڤیش، ئەم دیمەنەی وا دێتە بەرچاو کە وەك بڵێی مەلائیکەتانی سەرپەرشتیکاری ئەم درەختانە، ڕۆشتبنە ناو قەد و ڕەگەکانیان و پۆشاکی لق و پەلە قامیشی‌یە جۆراوجۆرەکانی ئەوانیان پۆشیبێت! دەڵێی پادشای ئەزەل لەگەڵ ئاوازی سەدان شمشاڵ و لە ناوەندی نمایشێکی بەسام و شکۆدا جەستەی ئەم درەختانەی بە بەری ئەوان پۆشیوە! تاکو درەختەکان بە هەست و شعوورێکی تەواو - نەك لە شێوەی چەند جەستەیەکی ڕەقی بێ گیان و بێ هەستدا - شوکرانە و منەتباریی خۆیان پێشکەشی خوای میهرەبان بکەن!

ئەو شمشاڵانە، چەند ئاوازێکی هێندە ناسك و بێگەرد و کاریگەر دەردەکەن دەڵێی سیمفۆنیایەکی ئاسمانین و لە مۆسیقایەکی بڵند و بەرزەوە دەرچوون! ئەوەتا بیری مرۆڤ هەتا گوێیان لێ ڕابگرێت هەرگیز سکاڵای جوداییان لێ نابیستێت، وەك ئەو ناڵەی جوداییەی کە سەرجەمی عاشقان، لە پێشەنگیانەوە "مەولانای ڕۆمی" لێیان دەبیستن[1]..

بەڵکو چەندەها جۆری شوکر و ستایشی نیعمەت بەخشی میهرەبانیان لێ دەبیستێت کە پێشکەشی خواوەندی "حي" و "قیّوم"ی دەکەن!

لە کاتێکدا کە درەختەکان بوون بە جەستەی فریشتەی سەرپەرشتیکاریان، گەڵاکانیشیان وەك "زمان"یان لێ هات و، تەنها بە هەڵکردنی سروەیەکی ناسك، بە هەزاران زمان، زیکری: "هو.. هو"یان دووپات دەکردەوە و.. بە "ژیان"ەکەشیان سڵاوی خۆیان بۆ بەدیهێنەری "حي" و "قیّوم" ڕاگەیاند.

چونکە سەرانسەری بوونەوەران لە ناوەندی ئەڵقەیەکی مەزنی زیکردا کار دەکەن و پێکەوە و بە یەك دەنگ دەڵێن: "لا إله إلا هو".

هەریەکەشیان، بە زمانی توانست و لێهاتنی سروشتیی خۆی، لە دەرگانەی گەنجینەی میهرەبانیی خوای گەورەدا، دەستەکانی هەڵبڕیوە و، بە دووپات کردنەوەی

---

(١) ئاماژەیە بۆ یەکەم بەیتی "مەسنەویی مەعنەوی"ی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، کە دەڵێت:
بشنو از نی چون حکایت می کند     از جداییها شکایت می کند. (وەرگێر)

"یا حق" داوای مافی ژیان دەکات و.. بە زمانی: "بەدەستهێنانی ئەو ژیانەش" هەموویان زیکری ناوی: "یا حيّ" بە بەردەوامی دەڵێنەوە)[1]!

❑ نامەیەك کە ئەستێرەکان دەدوێنێت!

(جارێکیان لەسەر لوتکەیەك لە لوتکەکانی چیای "چام"ەوە لە ئارامیی شەودا سەیری ڕووی گەشی ئاسمانم دەکرد. کتوپڕ ئەم بڕگانەی خوارەوە بۆ دڵم هاتن. وەك بڵێی ئەندێشەم گوێی لەو گوفتارانە بووبێت کە ئەستێرەکان بە زمانی حاڵ دەریاندەبڕی! ئنجا لەبەر نەشارەزاییم لە ڕێساکانی شیعر نووسیندا، ئەو واتایانەم چۆن بە دڵدا هات هەروەهاش نووسیمنەوە:

گوێ بۆ وتاری بەتام و شیرینی ئەستێرەکان ڕابگرە..

با بزانیت کە مۆری حیکمەتی نەخشاوی سەر ڕوخساری "بوون" چیی بڕیار داوە!

دەبینیت هەموویان پێکەوە لەسەر زمانی "حەق" دەدوێن و، بە یەك دەنگ دەڵێن:

ئێمە بەڵگەی ڕوونی درەخشانین لەسەر سام و هەیبەتی خواوەندی بەتوانای شکۆمەند.

ئێمە شایەتی ڕاستین لەسەر "بوون" و "تەنیایی" و "توانست"ی بەدیهێنەری مەزن.

بە چەشنی مەلائیکەت، تەماشای ئەو موعجیزاتە خنجیلە و ناسکۆلانە دەکەین کە ڕووی زەوییان ئارایشت داوە.

ئێمە هەزاران چاوی بینەرین کە لە ئاسمانەوە بەسەر ڕووی زەویدا دەڕوانین و، سەیری بەهەشت دەکەین[2].

---

(١) وتەکان، مەقامی دووهەمی وتەی حەڤدەهەم، ل: ٣٠٩-٣١٣.

(٢) واتە: ڕووی زەوی شەتڵگا و کێڵگەی بەهەشتە، موعجیزاتی بێ سنووری توانستی خوای گەورەی تێدا پێش چاو دەخرێت. جا هەروەك مەلائیکەتانی ناو جیهانی ئاسمانەکان تەماشای گۆی زەوی دەکەن و ئەو موعجیزاتانەی تێدا دەبینن، ئەو ئەستێرانەش، کە وەك چاوی ئاسمانەکان وان، بە هەمان جۆرن، چونکە بە چەشنی مەلائیکەتان تەماشای بەدیهاتووە ناسکۆلەکانی گۆی زەوی دەکەن و، لە هەمان کاتدا بۆ جیهانی بەهەشتیش دەڕوانن و، کارە دەراسا و کاتییەکانی ئێرە لە شێوە باقی و هەمیشەییەکانی ئەوێدا دەبینن. واتە ئەو ئەستێرانە لەو کاتەدا کە تەماشای گۆی زەوی دەکەن، بە ڕوانینێکی تر، ئاوڕیش لە بەهەشت دەدەنەوە، واتە چاویان لە هەردوو جیهانەکەیە. (دانەر)

هەزاران بەری ڕەنگینی درەختی بەدیهاتووانین، کە دەستی دانستی خواوەندی شکۆمەند و خاوەنی جوانی بە ئاسمان و لق و پەلەکانی ڕێی کاکێشاندا هەڵی واسیوین.

ئێمە بریتیین لە چەند مزگەوت و خانە و لانەیەکی گەڕۆك و بڵند و، چەند گڵۆپێکی ڕووناکیبەخش و، چەندەها کەشتی و فڕۆکەی گەورە بۆ ئاسمان نشینان.

ئێمە موعجیزەی توانستی بەتوانایەکی خاوەن کەماڵ و.. کاری دەراسای سنعەتی دانایەکی شکۆمەندین..

دانایی نایاب و.. بەدیهاتووانی گەورە و گرنگ و.. چەندەها جیهانی ڕووناکیمان لە ئامێز گرتووە!

بەم جۆرە دەرکەوت کە ئێمە بە هەزار و یەك زمان، هەزار و یەك بەڵگە بەرچاو دەخەین و، دەیاندەین بە گوێی کەسانێکدا کە مرۆڤی ڕاستەقینەن.

دەك چاوی بابای مولحید کوێر بێت، کە ڕووی ڕووناکی ئێمە نابینێت و، گوفتارە ڕوون و ڕەوانەکانمان نابیستێت!

ئێمە چەند بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەواین کە "حەق" لەسەر زارمان دەردەچێت.

سکە و مۆری هەموومان هەر یەکێکە و.. تێکڕا تەسبیحات گوزار و بەندەی پەروەردگارمانین و لە ژێر فەرمانی ئەوداین.

ئێمە بەدەم جەزبەی خۆشەویستیی خوای گەورەوە، یادی ئەو دەکەین و، هاوبەشی ئەڵقەی زیکری ڕێی کاکێشانین)[1]!

□ "درەختی پەڵك" وەك نموونەیەك

(مادەم بوونەوەران لە حوکمی درەختدان، ئەوا دەگونجێ بۆ مەبەستی دەرخستنی ڕاستییەکانی بوونەوەران، "درەخت" بە نموونە بهێنینەوە.

وا درەختی ئەم پەڵکە زەبەلاحەی بەردەم ژوورەکەمان، بە سیفەتی ئەوەی نموونەیەکی پوخت و بچووکی بوونەوەرانە، بە نموونە دەهێنینەوە و، بە هۆیەوە درەوشانەوەی "تەنیایی" خوای گەورە لە بوونەوەردا، بەم جۆرەی خوارەوە، ڕوون دەکەینەوە:

(١) وتەکان، مەقامی دووهەمی وتەی حەڤدەهەم، ل: ٣١٤-٣١٥.

ئەم درەختە – بە لای کەمەوە – دە هەزار بەر و، هەموو یەکێکیش لەو بەرانە – بە لای کەمەوە – سەدان تۆوی باڵداری هەیە. واتە هەموو یەکێك لەو دە هەزار بەر و ملیۆن تۆوە لە یەك کاتدا کاری بەدیهێنان و وردەکاریان تێدا ئەنجام دەدرێت. لە کاتێکدا کە "هەوێنی ژیان" لەناو تۆوە ئەسڵییەکەی ئەم درەختە و لە رەگ و قەدەکانیدایە و، شتێکی دەستنیشان کراوە و، لە درەوشانەوەی ویستی خواوەیە و، ناوکێکە لە "ئەمر"ی پەروەردگار. هەر بەم درەوشانەوە جوزئییەش مەرکەزییەتی یاساکانی دروستبوونی درەخت پێکدێت، کە لە سەرەتای هەموو پەل و لەناو گشت "بەر" و تەنیشتی هەموو "تۆو"ێکدان، بە چەشنێ کە ئەم یاسایانە هیچ بەشێکی درەختەکە بە ناتەواوی ناهێڵێتەوە و هیچ شتێك ڕێیان لێ ناگرێت.

پاشان ئەم تەنها درەوشانەوەیەی "ویست"ی خوایی و "ئەمر"ی پەروەردگاری، بە وێنەی ڕووناکی و گەرمی و هەوا، بڵاو نابێتەوە. چونکە لەو ماوە دوورانەی نێوان ئەو شوێنانەی بۆیان دەڕوات و ئەو بەدیهاتووە جۆراوجۆرانەی بەدییان دەهێنێت، هیچ ئاسەوارێك بەجێ ناهێڵێت، تەنانەت هەر ئاسەواریشی دەرناکەوێت. چونکە ئەگەر ئەو درەوشانەوەیە بە بڵاوبوونەوە بوایە، شوێنەوارەکەی دەردەکەوت. بەڵکو بێ بڵاوبوونەوە و لەت بوون، لە تەنیشتی هەموو بەشێکی ئەو بەدیهاتووە، ئامادەیە و، ئەم کارە هەمەکییانەش دژ و پێچەوانەی "زاتییەت" و "تەنیایی"ی ئەو نین..

لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بوترێت:

ئەو درەوشانەوەیەی ویستی خوای گەورە و، ئەو یاسا ئەمرییە و، ئەو هەوێنی ژیانە، لە تەنیشتی هەموو جوزئێکی بەدیهاتووەکەدا ئامادەیە و هەرگیز بە جێگایەکەوە نەبەستراوە)[1].

## سەرهەڵدانی پەیامەکانی نوور

☐ بەهرەمەندبوون بە هەردوو ناوی جوانی: "الرحیم" و "الحکیم"

(من ئێستا لەسەر چڵەپۆپەی درەختێکی گەورە و بەرزی سنەوبەردام کە بەسەر یەکێك لە لوتکە بڵندەکانی چیای "چام"ەوەیە..

---

(١) وتەکان، هەڵوێستی دووهەمی وتەی سی و دووهەم، ل: ٩١٤.

لە ڕاستيدا من لە مرۆڤ بێزار بووم و، پتر دڵم بە ئاژەڵ و گيانلەبەران دەكرێتەوە!

خۆ هەر كات حەزم لێ بێت لەگەڵ خەڵكی دابنيشم و گفتوگۆيان ئاراستە بكەم، ئەوا بە ئەندێشە وا دادەنێم كە ئێوەم لێ نزيكن و لەگەڵتان دەدوێم، تا بەم شێوەيە دڵنەوايی بە خۆم ببەخشم!

گەر هيچ ڕێگرێك نەيەتە پێش، نيازم وايە يەك دوو مانگ لێرەدا بە تەنيايی بمێنمەوە.

جا هەركات هاتم بۆ "بارلا" ئەوا بەپێی خواست و ئارەزووی خۆتان بە دوای هۆكارێكی چاوپێكەوتن و گفتوگۆدا دەگەڕێين.

بە ڕاستی من لە ئێوە زياتر تاسەمەند و موشتاقی بارلام!

وا ئێستاش ئەو واتايانەتان بۆ دەنووسم كە لە سەر ئەم درەختی سنەوبەرە بە دڵدا هاتن:

يەكەميان: خاتيرەيەكی تا ڕادەيەك تايبەتی‌يە، چونكە يەكێكە لە نهێنی‌يەكانم، بەڵام ئێوە كەسانێك نين كە نهێنيتان لێ بشارڕێتەوە. ئەويش بريتی‌يە لەوەی كە:

هەروەك بەشێكی ئەهلی حەقيقەت نوورەكانی ناوی جوانی "الودود"ی خوای گەورەيان دەست كەوتووە و، لە پەنجەرەكانی بوونەوەران و لە ڕێی درەوشانەوەكان و پلەی هەرە بەرزی ئەو ناوەوە، ڕوانيويانەتە خواوەندی "واجب الوجود"..

ئەم برايەشتان كە هەر هيچ نی‌يە و لەگەڵ هيچ شتێكدا ناونابرێت (مەبەستی خۆيەتی) لەو كاتەدا كە تەنها خزمەتی قورئانی پيرۆز دەكات و خەريكی بانگی خەڵكی‌يە بۆ ئەو گەنجينە بێ كۆتاييانەی قورئان، وەسفێكی پێ بەخشراوە كە بەهۆيەوە لە نوورەكانی ناوی جوانی "الرحيم" و "الحكيم"ی خوای گەورە بەهرەمەند دەبێت!

جا سەرجەمی "وتەكان" چەند درەوشانەوەيەكی ئەو بەهرەمەندی‌يەن!

لە خوای گەورە ئومێدەوارين كە "وتەكان" بەهرەمەندی ناوەرۆكی ئەم ئايەتە پيرۆزە بكات كە دەفەرموێ:

﴿ومَن يؤتَ الحِكمةَ فقد أُوتِيَ خيراً كثيراً﴾ (البقرة:٢٦٩)..)[1].

---

(١) مەكتووبات، مەكتووبی چوارەم، ل: ٢٨-٢٩.

□ دانانی پەیامی حەشر[١]

ڕۆژێکیان لەو کاتەدا کە مامۆستا نوورسی لەسەر لێواری ئارام و قەشەنگی دەریاچەی "ئەگریدیر" هاتوچۆی دەکرد و سەرنجی لە ئاوە شینەکەی و قەدپاڵی سەوزی چیاکانی دەوروبەری دەدا و، بیری لە مەسەلەی زیندوبوونەوەی دوای مردن و ڕۆژی قیامەت دەکردەوە، کە ئەو دەمە لە لایەن فەرمانگە ئیلحادیەکانەوە بە خورافەت و ئەفسانەیەکی ئەوتۆ وێنا دەکرا کە هیچ پاڵپشتێکی لە بەڵگەی عەقڵی و زانستی نەبێت..

لەو کاتەدا، بەدەم هاتوچۆکردنەوە لە لێواری دەریاکە و، لە هەڵچوون وقوڵپدانێکی گەورەی ڕۆحیدا، نزیکەی چل جار ئایەتی پیرۆزی: ﴿فانظُرْ إلى آثارِ رَحْـمَتِ اللهِ كيفَ يُحيي الأرضَ بعد موتِها إنَّ ذلك لمحيِ الموتى وهو على كلِّ شيءٍ قدير﴾ی (الروم: ٥٠) لە شادمانیەکی قووڵی ڕۆحیدا دووپات کردەوە. کە ئەوەش دەروونی ئەوی لە واتاکانی ئەم ئایەتە لێوانلێو کرد، ئنجا ئەو واتایانەی بەسەر یەکێك لە هاوڕێیانیدا خوێندەوە هەتا بینووسێتەوە. بەم جۆرە "پەیامی حەشر" هاتە کایەوە، کە یەکەم پەیامی نوورە[٢].

(هەموو یەکێك لەو ڕاستیانەی وتەی دەهەم "پەیامی حەشر" لە یەك کاتدا سێ شت دەچەسپێنێت: بوونی خواوەندی "واجب الوجود" و.. ناوەکانی و.. سیفەتەکانی. ئنجا مەسەلەی حەشر لەسەر ئەو شتە بنەڕەتیانە بنیات دەنێت و دەیچەسپێنێت. ئیتر هەموو کەسێك، هەر لە سەرسەختترین مونکیرەوە تا دامەزراوترین ئیماندار، دەتوانێت بەشی خۆی لە هەموو یەکێکی ئەو ڕاستیانە وەربگرێت.

چونکە ئەو ڕاستیانە سەرنجەکان بۆ لای بوونەوەران و ئاسەوارەکان ڕادەکێشن و دەڵێن: چەند کارێکی ڕێکوپێك لەم بوونەوەرانەدا بەدی دەکرێت.. کاری ڕێکوپێکیش هەرگیز بێ بکەر نابێت، کەواتە بکەرێکیان هەیە. مادەم ئەم بکەرەش کارەکانی بە ڕێکوپێکی و ڕێسا ئەنجام دەدات، ئەوا دەبێ "دانا" و "دادگەر" بێت. خۆ مادەم دانایە

---

(١) دانراوەکانی تری لە "بارلا":
١. وتەکان (هەمووی)
٢. مەکتووبات (هەمووی)
٣. بریسکەکان (زۆربەی) دوایی لە ئیسپارتە لە ماوەی هەشت مانگدا تەواوی کرد.

(٢) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati.

ئەوا کاری بێهوودە و هەڕەمەکی ناکات. ئنجا مادەم کارەکانی بە دادگەری جێبەجێ دەکات ئەوا مافەکان بە زایە نادات.. کەواتە دەبێ مەحشەر و دادگایەکی یەکجار گەورە بەرپا ببێت..

ڕاستی‌یەکانی وتەی دەهەم بەم چەشنە دەڕۆن و، پۆشاکی ئەم شێوە زنجیرەییە دەپۆشن و، هەرسێ دەعواکە بە یەکەوە دەچەسپێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی بە پوختی هێنراون، ئەوا ڕوانینی سەرپێیی و ساکارانە ناتوانێت لە یەکیان جیا بکاتەوە.

دەبێ بیشزانین کە هەریەك لەو ڕاستی‌یانە لە چەند پەیامێکی تر و لە وتەکاندا بە ڕوونکردنەوەیەکی تێر و تەسەل درێژەیان پێ دراوە)[1].

(ئەم پەیامە بەڵایەکی گەورەی گێڕایە دواوە. چونکە بەهۆی ئەو ئاژاوەگێڕی و پشێوی‌یەی کە هزرە زاڵەکان نایانەوە و، بەهۆی لەرزە پێ خستنەکانی جەنگی جیهانی‌یەوە، ئەو مونافیقانەی کە ئینکاریی "حەشر" دەکەن هەلیان بۆ ڕەخسا کە بیرە ژەهراوی‌یەکانی خۆیان لە زۆر شوێندا بڵاو بکەنەوە. جا کاتێ "وتەی دەهەم - پەیامی حەشر" دەرکەوت، هەزار نوسخەی لێ چاپ کراو، لە شوێنە جیاجیاکاندا بڵاوکرایەوە و، هەرکەسێ دەستی کەوت بە حەز و پەرۆشی‌یەوە خوێندی‌یەوە. ئیتر بە پشتیوانیی خوای گەورە، پشتی کوفری شکاند و زمانی ئەوانەشی لاڵ کرد)[2]!

لەگەڵ ئەوەشدا (ئەم پەیامە - وتەی دەهەم - هێشتا پلە و پایەی شایانی خۆی نەدراوەتێ. من هەر خۆم نزیکەی پەنجا جار خوێندوومەتەوە و، لە هەموو خوێندنەوەیەکدا تامێکی نوێم چەشتووە و، هەستم کردووە کە پێویستم بە خوێندنەوەیەکی نوێی تر هەیە! کەچی هەندێ کەس پەیی بەم گرنگی‌یە نەبردووە و بە چاوی پەیامە زانستی‌یەکانی تر دەڕوانێتە ئەم چەشنە پەیامانە و، تەنها یەك جار دەیخوێنێتەوە و جارێکی تر بەسەری ناکاتەوە.

لە ڕاستیدا ئەم پەیامە یەکێکە لەو زانستە ئیمانی‌یانەی کە پێویستیی مرۆڤ پێیان وەك خواردنی نان وایە، پێویستی‌یەکی ڕۆژانەیە و هەمیشە نوێ و دووپات دەبێتەوە)[3].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٩٧-٩٨.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی هەشتەم.

(٣) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ١٠٤.

☐ ناوی "پەیامەکانی نوور"

(قەدەری خوای گەورە بە "نەفی کردن" لـەم شارەوە بۆ ئەوشـار دەیگواستمەوە. ئـا لەم کاتەدا چەندەها وتەی مەزن کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵابوون، لە نـاخی دڵـمەوە سـەریان هـەڵدا و، منیـش بۆ ئەو کەسـانەی کە لـە نزیکمـدا بـوون، دەموتــن و ئەوانیش بۆیان دەنووسیمەوە و، بوون بەو نامیلکانەی کە ناوی "پەیامەکانی نوور"م لــێ نان.

ئەم ناوەش لە قووڵایی دڵمەوە هەڵقوڵاوە، چونکە ئـەو پەیامانـە بـە ڕاسـتی لـە نـووری قورئانی پیرۆزەوە درەوشاونەتەوە. لە قەناعەت ودڵنیاییەکی تەواویشدام کە ئەم پەیامانـە زادەی "بیر"ی من نین، بـەڵکو ئیلـهامێکی خوایـین لـە نـووری قورئـانی پیرۆزەوە بەسـەر دڵمدا ڕژاون..

لەبـەر ئـەوە، پیرۆزبـاییم ئاراستەی هـەموو ئـەو کەسـانە کــرد کــە پەیامــەکانیان بـۆ دەنووسیمەوە، چونکە من دڵنیام کە جگە لەم ڕێیە هیچ ڕێگایەکی تر لە ئارادا نی‌یــە بـۆ پاراستنی ئیمانی موسڵمانان و، پێم وایە کە هەرگیز نابێ ئەو ڕێژنانەی قورئانی پـیرۆز لـە هیـچ کەسێك قەدەغــە بکرێــن و بشــاررێنەوە. پاشــان دەســتانی خــاوێن و دڵســۆز بـۆ نووسینەوەیان و بڵاوکردنەوەیان کەوتنە کار..

ئیتر منیش دڵنیا بووم کە ئەم لـێبڕانەی ئەوان ڕامکردنێکی پـەروەردگار و هـاندانێکی خواییە تاکو ئیمانی کەسانی تر بپارێزرێن و، هیچ کەسێك نەتوانێت ڕێ لەم ڕامکردن و هاندانە خواییە بگرێت. لەمەشەوە هەستم کرد بە فەرمانی ئایینەکەم گەلـێ پێویستە هانی گشت ئەو کەسانە بدرێت کە لەم ڕێیەدا کار دەکەن)[1].

("پەیامەکان" کە بریتین لە سی و سێ "وتە" و سی و سێ "مـەکتووب" و سی و یـەك "بریسکە" و سیازدە "تیشك"، لەبەر ئەوە ناونراون بە "پەیامەکانی نوور" چونکـە وشـەی "نـوور" لـە هـەموو شـوێنێکدا و بـە درێژایـی ژیـانم ڕووبـەڕووم بووەتـەوە، کـە ئەمانـە هەندێکیانن:

گوندەکەم ناوی "نوورس"ە..

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٠٥-٧٠٦.

دایکی خوالێخۆشبووم ناوی "نووریە"یە..
مامۆستاکەم لە تەریقەتی نەقشبەندیدا ناوی "سەیید نوور محەممەد"ە..
یەکێك لە مامۆستاکانم لە تەریقەتی قادریدا ناوی "نورەدین"ە..
یەکێك لە مامۆستاکانم لە قورئاندا ناوی "نووری"یە..
زۆربەی ئەو قوتابیانەی لەگەڵمدا دەمێننەوە ناوی "نور"یان پێوەیە..
زۆربەی ئەو شتەی کتێبەکانم ڕوون و ڕووناك دەکاتەوە، نموونەهێنانەوە نوورانییەکانن..
ئەو یەکەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە "ژیری" و "دڵ"م ڕووناك دەکاتەوە و "بیر"یشم بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات، بریتییە لە ئایەتی:
﴿الله نورُ السَّمَوات وَالأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكوةٍ﴾ (النور:٣٥)..
زۆربەی جار گیروگرفتەکانم لە بارەی حەقیقەتە خواییەکانەوە، ناوی جوانی "النور"ی خوای گەورە بۆم شی دەکاتەوە..
ئنجا لەبەر ئەوەی زۆر موشتاقی قورئانم و خزمەتەکەشم تەنها بۆ قورئانە، ئەوا پێشەوای تایبەتیم حەزرەتی "عثمان ذوالنورین"ە، خوای لێ ڕازی بێت)[1]!

☐ چاودێریی خوایی و کەرامەتی قورئان

(ئەی برایانی ئاخیرەتم و دوو قوتابییە جیددییەکانم؛ بەڕێزان: "خەسرەو"[2] و "ڕەئفەت"[3]!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٩٤-٩٥.
(٢) خەسرەو سالی (١٨٩٩) لە ئیسپارتە لەدایك بووە و سالی (١٩٧٧ز)یش لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە. لە پێشەنگی ئەو کەسانەوە بووە کە لە ناخۆشترین و سەختترین بارودۆخدا سەدان پەیامیان نووسیوەتەوە و بڵاویان کردووەتەوە. زۆربەی ژیانی خۆی لەگەڵ مامۆستاکەیدا لە بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" و "ئافیوون"دا بەسەر بردووە و، بە فەرمان و ڕێنمایی مامۆستا نوورسیش موصحەفێکی بۆ دەرخستنی ئیعجازی لەمەڕ تەوافوقی جوانی "لەفظی جەلالە"ی ناو یەك بە یەکی لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز، نووسیوەتەوە. خوای گەورە لێی خۆش بێت.
(٣) ڕەئفەت باروودچی (١٨٨٦-١٩٧٥ز) عەمیدێکی خانەنشینە و لە بارلادا پەیوەندیی بە مامۆستا نوورسییەوە هەبووە و، لە بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر سالی ١٩٣٥" و "دەنیزلی ١٩٤٣" و "ئافیوون ١٩٤٨" لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەند کراوە. لە وانەوتنەوە و فێرکاریی قورئانی پیرۆزدا گەلێ شارەزا بووە. پاشان لە مزگەوتێکی ئەستەمبوڵدا و هەتا کاتی لە دنیا دەرچوونی پێشنوێژ بووە. خوای گەورە لێی خۆش بێت.

ئێمە هەستمان بە سێ کەرامەتی قورئانی دەکرد لە کۆمەڵە پەیامی "وتەکان"دا، کە لە ڕێژنەی نوورەکانی قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە..

کەچی ئێوە، بە هیممەت و شەوق و تێکۆشانی خۆتان، کەرامەتێکی تری چوارەمتان خستە سەر ئەو سیانە. سێ کەرامەتە زانراوەکە بریتین لەمانەی خوارەوە:

*یەکەم:* ئاسانی و خێرایی نائاساییی لە دانانیاندا. تەنانەت "مەکتووبی نۆزدەهەم" کە لە پێنج بەش پێکهاتووە، لە نزیکەی سێ ڕۆژدا و هەر ڕۆژەش لە نزیکەی چوار سەعاتدا، واتە بە کۆی دوازدە سەعات و لە نێوان چیا و دۆڵ و باخەکاندا و بێ ئەوەی هیچ کتێبێکی سەرچاوەیمان لەبەر دەستدا بێت، دانراوە!

"وتەی سیهەم"یش لە دەمی نەخۆشی و لە ماوەی پێنج شەش سەعاتدا دانراوە.

"وتەی بیست و هەشتەم"یش، کە باسی بەهەشت دەکات، بە یەك دوو سەعات و لە ناو باخەکەی "سولەیمان" لە لێواری شیوەکەدا دانراوە. تەنانەت من و تۆفیق و سولەیمان سەرمان لەم خێرایییە سوور دەما!

جا هەروەك ئەم کەرامەتە قورئانییە لە دانانیدا هەیە، بە هەمان جۆر:

*دووهەم:* لە نووسینەوەشیدا ئاسانییەکی نائاسایی و شەوقێکی گەرموگوڕ هەست پێ دەکرێت، بێ ئەوەی نووسەرەوەکەی گرفتاری بێزاری ببێت. لە کاتێکدا کە گەلێ هۆکار لەم ڕۆژگارەدا هەن گیان و ژیرییەکان دووچاری بێزاری دەکەن. کەچی هەر ئەوەندەی وتەیەك لە "وتەکان" دادەنرێت، یەکسەر لە گەلێ شوێنی زۆردا لەبەری دەنووسرێتەوە و، ئەم کارەش بەسەر گەلێ ئەرکی گرنگدا پێش دەخرێت.

*سێهەم کەرامەتی قورئانی بریتییە لەوەی کە:* خوێندنەوەشیان مرۆڤ بێزار ناکات، بە تایبەت گەر خوێنەر هەست بکات پێویستی پێیانە. تەنانەت هەتا زیاتر بخوێنرێنەوە، پتر چێژ و شەوقی خوێنەریش زیاد دەبێت و لێیان بێزار نابێت.

جا ئێوەش - ئەی هەردوو براکەم! - کەرامەتێکی قورئانیی چوارەمتان چەسپاند..

ئەوەتا کاك خەسرەوی برامان - کە خۆی بە تەمبەڵ ناو دەبات - لەو کاتەوە کە پێنج ساڵ لەمەوبەر ناوی وتەکانی بیست لە نووسینەوە سارد بووەتەوە، کەچی وا لەماوەی یەك مانگدا بە نووسینێکی ڕێك و جوان چوارده کتێبی نووسییەوە، بە تایبەت

"مەکتووبی سی و سێهەم" کە پەیامی پەنجەرەکانە و ڕێزی شایانی لێ نراوە، چونکە بە جوانترین شێوە نووسراوەتەوە.

جا ئەم کارە کەرامەتێکی بێ گومانی نهێنییەکانی قورئانە.

بەڵێ، ئەم پەیامە لە بواری ناسینی خوای گەورە و ئیمان هێناندا بە خواوەند گەلێ بەهێز و درەخشانە، بەڵام پەنجەرەکانی سەرەتای پەیامەکە گەلێ کورت و پوختن، هەرچەندە وردە وردە ڕوون دەبنەوە و پتر درەخشان دەبن. چونکە پێشەکییەکانی زۆربەی "وتەکان" - بە پێچەوانەی کتێبەکانی تر - بە پوختی و کورتی دەست پێ دەکەن، بەڵام وردە وردە ڕوون دەبنەوە)[1].

❒ نوورەکان مولکی قورئانن

(ئەم قسەیەی کە سەبارەت بە "وتەکان"ەوە دەیکەم، لە ڕووی تەوازوعەوە نییە، بەڵکو ڕوونکردنەوەی حەقیقەتە:

ئەو ڕاستی و تایبەتکارییانەی لە "وتەکان"دان، هەرگیزاو هەرگیز زادەی بیری من نین، بەڵکو تەنها هی قورئانی پیرۆزن. چونکە ئەو وتانە چەند نمێکن لە ئاوی زوڵاڵی قورئان، بە ڕادەیەك کە وتەی دەهەم "پەیامی حەشر" لە ڕاستیدا چەند دڵۆپێکی نمنم داتکاوی سەدان ئایەتی قورئانی پیرۆزە. هەروەها پەیامەکانی تریش.

جا مادەم خۆم دەزانم پەیامەکانی نوور ئەمانەن کە باسم کردن و، دەشزانم من ئەم ژیانە بەجێ دەهێڵم و کۆچی ماڵئاوایی لێ دەکەم، ئەوا نابێ شوێنەوارێك بە منی فانییەوە ببەسترێت کە دوای نەمانی من ئەو هەر دەمێنێت و لەناوناچێت..

هەروەها مادەم گومڕایان و ستەمکاران گەر بیانەوێت بەها و نرخی کتێبێك بشکێنن کە بە کەڵکی ئەوان نەیەت، دەچن لە ڕێزی دانەرەکەی دادەگرن، ئەوا دەبێ ئەم پەیامانەی کە پەیوەندییان بە ئەستێرەکانی ئاسمانی قورئانی پیرۆزەوەیە، بە پاڵپشتێکی شڕی وەك منەوە نەبەسترێنەوە کە شایانی هەڵە و کەوتنم و، دەگونجێ لە هەموو لایەکەوە بە زۆری ڕەخنەم ئاراستە بکرێت و بیانووم پێ بگیرێت.

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٠٤-٦٠٥.

هەروەها مادەم خەڵكی وا ڕاهاتوون كە لـە هەڵسوكەوتی دانەری كتێبدا بـە شوێن لایەنـە تایبەتـەكانی كتێبەكـەدا دەگـەڕێن، چونكـە لایـان وایـە ئـەو دانـەرە سـەرچاوە و تەوەرەی خێری ئەو كتێبەیە، ئەوا ئەوپەڕی ستەم كردنە لـە ڕاستی و پێشێل كردنیـەتی، گەر وا دابنرێت ئەو ڕاستی‌یە بەرز و گەوهـەرە گرانبـەها و بەنرخانە تفـاقی موفلیسێكی وەكو من بن، كە ناتوانم یەك لە هەزاری ئەو تایبەتكاری‌یانەیان دەربخەم.

لەبەر هەموو ئەمانـە، دەڵێـم: پەیامـەكان هـی مـن نـین و لـە بـیری منـەوە دەرنـەچوون، بەڵكو موڵكی قورئانن. هەر لەبەر ئەوەشە كە ناچارم جوانی‌یەكانیان باس بكەم، چونكە ئەم پەیامانە چەند نمێكیان لە تایبەتكاری‌یەكانی قورئانی پیرۆز دەست كەوتووە.

بەڵێ، ئەو تایبەتكاری‌یانەی لە هێشـووی بەلـەزەتی ترێدا هـەن، وا مەزانـە هـی قـەد و پـەل و لقـی ئـەو مێوەیـە كـە ئـەو هێشـووەی گرتـووە. منـیش وەكـو ئـەو قـەد و لقانـە وام سەبارەت بەو ترێ بەلەزەتانە)[1]!

(ئەگەر من دەنگم بە هـەموو جێگایـەكی جیـهان بگەیشـتایە، ئـەوا بـە هـەرچی هـێز و توانام هەیە دەموت:

"وتەكان" تێكڕا حەقیقەتن و تابلێی جـوان و ڕەنگینـن. بـەڵام لـە منـەوە سـەرچاوەیان نـەگرتووە، بـەڵكو چـەند تیشـكێكن لـە ڕاستی‌یەكانی قورئـانی پیرۆزەوە پـەیدا بـوون و درەوشـاونەتەوە. كەواتـە جوانیـی ڕاستی‌یەكانی قورئـان لــە لایـەن منـەوە نی‌یـە و مـن نەمڕازاندووەتـەوە، تەنانـەت هـەر نـەمتوانیوە جوانی‌یەكـەی دەربخـەم، بـەڵكو ڕاسـتی‌یە جوانەكانی قورئانی پیرۆز، وشە و تەعبیرەكانی منیان ڕازاندووەتەوە)[2].

□ سەلماندنی ڕاستی‌یەكانی ئیمان

(چەسپاندنی سـەرجەم "ڕاسـتی‌یە گرنگـەكانی ئیمـان و قورئـان" بـە چەشـنێكی درەخشان تەنانەت بۆ سەرسـەختترین كەسـی ملنـەدەر و سـەركەش لـە لایـەن بەشـەكانی پەیامەكانی نوورەوە، لـە ڕاستیدا ئاماژەیـەكی غـەیبیی یـەكجار بەهێز و چاودێری‌یـەكی مەزنی خوای گەورەیە.

---

(١) مەكتووبات، مەكتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٢-٦٢٣.

(٢) مەكتووبات، مەكتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٤.

چونکە پەیامەکانی نوور چەندین ڕاستیی ئەوتۆی ئیمان و قورئانیان ڕوون کردووەتەوە و چەسپاندووە کە تەنانەت کەسانی یەکجار زیرەکی وەك "ئیبن سینا"ش دانیان بە دەستەوسانیی خۆیاندا ناوە لە تێگەیشتنیدا.

ئەوەتا لە مەسەلەی حەشردا وتوویەتی[1]:

"مومکین نی‌یە بە عەقڵ و ژیری ڕێی چەسپاندنی حەشر بگیرێتە بەر".

کەچی "وتەی دەهەم" تەنانەت منداڵ و عەوامەکانیش فێری چەندین حەقیقەتی ئەوتۆ دەکات کە ئەو فەیلەسووفە نەیتوانیوە بە زیرەکیی خۆی پێیان بگات و پەی ببات پێیان.

هەروەها ئەو مەسەلانەی "قەدەر و جوزئی ئیختیاری" کە زانای مەزن "سەعدی تەفتازانی"[2] لە بەشی دوازدە پێشەکی‌یەکەی کتێبی "التلویح"دا بە پەنجا لاپەڕە ئنجا توانیویەتی شیتەڵی بکاتەوە و تەنها بۆ زانا تایبەتمەندەکانیشی ڕوون کردووەتەوە، کەچی هەر ئەم مەسەلانە بەوپەڕی تێروتەسەلی لە دوو لاپەڕەی باسی دووهەمی وتەی بیست و شەشەمدا بە چەشنێکی ئەوتۆ ڕوون کراونەتەوە کە لە ئاستی تێگەیشتنی سەرجەمی خەڵکیدا بێت.

جا ئەگەر ئەم کارە ئاسەوارێکی "چاودێریی خواوەند" نەبێت، دەبێ چی بێت؟

---

(١) (ئیبن سینا) ناوی: ئەبوو عەلی حسەینی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سینایە، لە نێوان ساڵەکانی: (٣٧٠-٤٢٨ك/ ٩٨١-١٠٣٨ز)دا ژیاوە. خەڵکی گوندێکی سەر بە "بوخارا"یە و، ماوەیەك لە "هەمەدان" وەزیر بووە. فەیلەسووفێکی ناودارە و، خاوەنی گەلێ کتێبە لە زانستی پزیشکی و مەنتیق و فەلسەفەی سروشتیدا. بەناوبانگترینی کتێبەکانی ناوی "قانوون"ە کە بۆ ماوەی شەش سەدەی ڕەبەق لە زانستی پزیشکیدا کاری پێ کراوە و ئەورووپاییەکانیش وەریانگێڕاوەتە سەر زمانەکانی خۆیان و لە زانکۆکانیاندا خوێندوویانە. ئەو وتەیش کە دانەر ئاماژەی پێ دا، پوختەی وتەیەکی ئیبن سینایە لەم سەرچاوەیەدا:
(ابن سینا - کتاب الإشارات والتنبیهات، فصل المعاد من قسم الإلهیات، المقالة التاسعة). (وەرگێڕ)

(٢) ناوی "مەسعوودی کوڕی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا"یە. ساڵی ٧١٢ك (یان٧٢٧) لە تەفتازانی سەر بە خوراسان لە دایك بووە و، لە سەمەرقەندیش ساڵی ٧٩٣ك کۆچی دوایی کردووە. لە زانستەکانی زمانی عەرەبی و مەنتیق و کەلام و بەلاغەدا پێشەوای زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە. دوای ئاوابوونی خۆری زانستە ئیسلامی‌یەکان لە ئەنجامی هێرش و پەلامارەکانی مەغۆلدا ئەم زانایە هەوڵی دا ئەو زانستانە زیندوو بکاتەوە و گەلێ کتێبی سەرچاوەیی گرنگیشی بۆ ئەم مەبەستە دانا. تەنانەت بە سنووری نێوان زانایانی پێشین و دوایین دادەنرێت. ئەمەش ناوی هەندێکە لە کتێبەکانی: تهذیب المنطق، شرح المقاصد، شرح العقائد النسفیة، المطول، مختصر المعاني، التلویح في کشف حقائق التنقیح). تا ئێستاش هەندێ لەم کتێبانە لە قوتابخانەکانی کوردستان و زانکۆکانی چەشنی زانکۆی ئەزهەردا بە دەرس دەخوێنرێن.

هەروەها "نهێنیی بەدیهێنانی جیهان" کە پێی دەوترێت "مەتەڵی بوونەوەران" و ژیریی کەسانی ژیر و هۆشمەندی گرفتاری سەرسامی کردووە و هیچ فەلسەفەیەك نەیتوانیوە شیی بکاتەوە، ئیعجازی مەعنەویی قورئانی مەزن (واتە پەیامەکانی نوور) لە "مەکتووبی بیست و چوارەم" و سەربجە ڕەمزییەکەی کۆتایی "وتەی بیست و نۆهەم" و شەش دانست و حیکمەتەکەی ئاڵوگۆڕ و جموجوولی گەردیلەکان لە "وتەی سیهەم"دا، نهێنییەکانی ئەو مەتەڵەی ئاشکرا کردووە و گرێ کوێرەکانیشی کردووەتەوە.

بەڵێ، ئەم پەیامانە مەتەڵە داخراوەکەی گەردوونیان شی کردووەتەوە و، پەردەیان لەسەر نهێنییەکانی ئەو گرێ کوێرە پەنهانەی بەدیهێنان و ئەنجامی گەردوون هەڵداوەتەوە و، حیکمەت و ئاڵوگۆڕەکانی گەردیلەکانیان ڕوون کردووەتەوە. سەرجەمی ئەم پەیامانەش لە بەردەستی خەڵکیدان، هەرکەسێك بیەوێت، دەتوانێت بیانخوێنێتەوە و لەم دەرەنجامە دڵنیا ببێت.

هەروەها ڕاستییە گەورە و مەزنەکانی چەشنی: "تاکی" و "تەنیایی"ی "پەروەردگاریتیی بێ هاوبەش" و.. ڕاستییەکانی "نزیکیی خوای گەورە" - تەنانەت لە خۆشمان نزیکتر - لێمانەوە و "دووریی ڕەهای ئێمە" لە خوای گەورەوە.. بەوپەڕی تەواوەتی لە لایەن وتەی "شازدەهەم" و وتەی "سی و دووهەم"ەوە ڕوون کراونەتەوە.

هەروەها ڕاستییەکانی: "توانستی هەمەلایەنگری خواوەند" کە دەورانەوری هەموو شتێکی داوە و.. "یەکسانیی گەردیلەکان و هەسارە گەڕۆکەکان" لە بەردەم ئەو توانستەدا و.. "ئاسانیی زیندووکردنەوەی سەرجەمی گیانلەبەران" لە حەشری مەزندا بە ئەندازەی ئاسانیی زیندووکردنەوەی یەك دانەیان لە لایەن ئەو توانستەوە و.. "خۆ هەڵنەقورتاندنی شیرك و هاوبەشایەتی" بە هیچ جۆرێك لە بەدیهێنانی گەردووندا و، چەسپاندنی ئەم ڕاستییەش بە چەشنێکی ئەوتۆ کە دەری بخات خۆهەڵقورتاندنی شیرك تا پلەی ئیمتیناع و مەحاڵی، لە عەقڵ و ژیرییەوە دوورە..

هەموو ئەم ڕاستییانە، لە دەمی لێکدانەوەی "وهو علی كلّ شيءٍ قدير"ی "مەکتووبی بیستەم" و پاشکۆکەیدا - کە سێ نموونەی لەخۆ گرتووە - ڕوون کراونەتەوە و ئەو نهێنییە مەزنەی "تەوحید" شیتەڵ کراوەتەوە.

ئەمە سەرباری ئەوەی کە "ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان" هێندە فراوانن کە زیرەکترین مرۆڤ نەتوانێت دەوراندەوریان بدات!

جا ئایا دەرکەوتنی وردەکارییەکانی زۆربەی ڕەهای ئەو ڕاستییانە، بەوپەڕی خێرایی و لە کاتی تەنگانە و گیروگرفتدا، بۆ کەسێکی وەك منی زەین شێواوی پەرێشان حاڵی ئەوتۆ کە هیچ سەرچاوەیەکی کتێبی لە لا نییە.. ئایا - ئەم کارە - یەکێك نییە لە ئاسەوارەکانی "ئیعجازی مەعنەویی قورئان" و، دەرکەوتن و درەوشانەوەیەکی "چاودێریی پەروەردگار" و، ئاماژەیەکی بەهێزی غەیبی)[1]؟

❐ ئاسانکاریی نائاسایی

(خوای گەورە، بە نیعمەت و بەخششی خۆی، دانانی شەست پەیامی بەم چەشنە نیعمەت و چاکەکارییە پێ بەخشیم. چونکە کەسێکی وەك من کە بە کەمی بیر دەکاتەوە و، تەنها شوێن سنووحاتی دڵ[2] دەکەوێت و، بوارێکی فراوانی بۆ باس و لێکۆڵینەوە لەبەر دەستدا نییە، کەچی پەیامی وای لەسەر دەستدا دادەنرێت کە کۆمەڵێك زانا و بلیمەتی بەتوانا بە هەوڵ و تێکۆشانیش نەتوانن دایبنێن..

جا دانانی ئەم پەیامانە بەو شێوەیەی کە باس کرا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پەیامەکان ئاسەواری "چاودێری"یەکی ڕاستەوخۆی پەروەردگارن..

چونکە لە ڕێی "هێنانەوەی نموونەی زۆر"ەوە سەرجەم ڕاستییە ورد و قووڵەکانی ئەم پەیامانە دەخرێنە ئاستی وانە و تێگەیشتنی تەنانەت مرۆڤە عەوامەکانیشەوە. لە کاتێکدا کە گەلێ زانای بەڕێز سەبارەت بە زۆربەی ئەو ڕاستییانەوە وتوویانە:

"ئەمانە بە دەرس ناوترێنەوە و تێگەیاندنیان لە تواناد نییە".

لە ئەنجامی ئەم بۆچوونەشیاندا ئەو ڕاستییانەیان هەروەك بە کەسانی عەوام نەوتەوە، تایبەتمەندانیشیان لێ بێ بەش کردن.

جا ئەم ئاسانکردنە دەراسایەی دانانی ئەو پەیامانە و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانیان، بەوەی کە دوورترین "ڕاستی" هێندە لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخەنەوە کە دەڵێی لە

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٩-٦٣١.

(٢) مەبەست لە: "سنووحات" ئەو واتا ئیمانییە بەرزانەیە کە لە ئاسۆی دڵ هەڵدێن. (وەرگێڕ)

بەردەستدایە، هەروەها وتنەوەی ئەم ڕاستی‌یانە و تێگەیاندنی سادەترین و نەخوێندەوارترین کەس لێیان، هەرگیز لە توانای کەسێکی وەك مندا نی‌یە کە:

دەستێکی کورتی لە زمانی تورکیدا هەیە و، گوفتارەکانیشی داخراون و، خەڵکی لە زۆربەیان تێناگەن، تەنانەت کاتێ کە لە ڕاستی‌یە ئاشکراکانیش دەدوێت دەیانکات بە گرێ‌کوێرە و، هەر لە کۆنیشەوە بەم سیفەتانە ناسراوە و ئاسەوارە دێرینەکانیشی ئەم ناوبانگە خراپەی دەسەلمێنن!

جا دەرکەوتنی ئەم ئاسانی و ڕوونکردنەوە ئاشکرایانە لەسەر دەستی کەسێکی ئاوادا، بێ هیچ گومانێك، یەکێکە لە ئاسەوارەکانی "چاودێریی خوای گەورە" و، هەرگیز ناکرێت هی کارامەیی و لێهاتنی ئەو کەسە بێت، بەڵکو یەکێکە لە درەوشانەوەکانی "ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆز" و، وێنە دانەوەیەکی "نموونە هێنانەوەکانی" ئەو قورئانەیە)[1].

(هاوەڵە نزیکەکانم ئەمانە دەزانن، بە تایبەت هاوەڵی بەردەوامم کاك سلێمان لە زۆربەیان ئاگادارە.

ئیتر بەم جۆرە ئێمە بەهرەمەندی کارئاسانی‌یەکی خاوەن کەرامەتی خوایی بووین کە هەرگیز بە دڵ و ئەندێشەماندا نەهاتووە، چ لە بڵاوکردنەوەی "وتەکان" و پەیامەکانی تردا و، چ لە ڕاستکردنەوەیان و دانانیان لە شوێنی خۆیاندا و، چ لە ڕەشنووس و پاکنووسیاندا. ئیتر دوای ئەمانە هیچ گومانێکمان لەوەدا نەما کە هەموو یەکێك لەو چاودێری‌یە خواییانە کەرامەتێکی قورئانی پیرۆزن.

سەدان نموونەمان لەسەر ئەمە بەدەستەوەیە.

پاشان هەست دەکەین کە ئێمە بە "شەفەقەت" و "میهرەبانی" پەروەردە دەکرێین و، گوزەرانمان بە "چاودێری" دەبرێت بەڕێوە، بە چەشنێك خاوەنی ئەو چاودێری‌یەی کە ئێمەی لەم خزمەتەدا خستووەتە کار، بچووکترین ئارەزووەکانی دڵمان بۆ دەهێنێتەدی و بێ ئەوەی لە نیاز و حسابیشماندا بوو بێت پێمانی دەبەخشێت..

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣١-٦٣٢.

جا ئەم حاڵەتە ئاماژەیەکی غەیبیی لەوپەڕی بەهێزیدایە بۆ ئەوەی کە:

ئێمە لەم خزمەتە قورئانیـیەدا دەدرێینە بەر و، دەخرێینە کار و، ڕەزامەندیی خوای گەورەش دەورەی داوین و، لە ژێر سایەی میهرەبانیی پەروەردگاردایین.

الحمد لله هذا من فضل ربي)[1].

□ ڕەخنە لـێ نەگرتنی

(هەرچەند بە شێوەیەکی گشتی و زۆر بە فراوانی "پەیامەکانی نوور" بڵاوبوونەتـەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك لەو چین و دەستە و کۆمەڵانەی کـە خـەڵکیان لـێ پێکهاتووە، هەر لە مەزنترین زاناوە تا دەگاتە بچووکترین کەس لە عامەی خەڵکی.. هەر لە گەورەترین وەلی و پیاوچاك و خواناسـەوە تـا دەگاتـە نزمـترین فەیلەسووفی مولحیدی سەرسەخت.. هیـچ کـام لەمانـە، تـا ئێستا ڕەخنـەیان لـێ نـەگرتوون، هەرچـەندەش ئـەم پەیامانەیان لە بەردەستدایە و دەیـانبینن و دەیانخوێننـەوە و، هـەر دەسـتە و کۆمـەڵێکیش بـە پێـی پلـەی خۆیـان سـوودیان لـێ وەرگرتـووە و، هـەندێکیش دووچـاری زلـلـەکانی ئـەم پەیامانـە بـوون! هـەموو ئەمانـە، تەنـها شـوێنەواری چاودێری‌یـەکی پـەروەردگارین و کەرامەتی قورئانی پیرۆزن)[2].

□ خێرایی لەڕادەبەدەر لە دانانیاندا

(ئەو کەسانەی کـە زۆر لێمـەوە نزیکـن، دەزانـن مـن - لـەوەوپێش - هـەرکاتێ بـە دەسـت شتێکەوە بێزار ببوومایە نەمدەتوانی ئاشـکراترین حەقیقـەت ڕوون بکەمـەوە، تەنانەت وام لـێ دەهات کە نەیشیزانم! بە تایبـەت گـەر نەخۆشـی و تەنگانـەم لەسـەر کـۆ ببوونایەتـەوە، ئـەوا لـەو چەشـنە کاتانـەدا دەسـتم لـە کتێـب دانـان و دەرس وتنـەوە هەڵدەگرت.. کـەچی وتە گـرنگەکان و پەیـامەکانی تریش لە چەنـد کـاتێکی ئەوتۆدا دانراون کە تەنگانە و نەخۆشی‌یەکانم لەچاو کاتەکانی تردا گەلـێ توندوتیژتر بوون و بـە خێرایی و لە کەمترین وەختدا دانراون.

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٥-٦٣٦.

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٢.

جا ئەگەر ئەم دیاردەیە ڕێزلێنانێکی پەروەردگاری و کەرامەتێکی ڕاستەوخۆی قورئان نەبێت، دەبێ چیی تر بێت؟

پاشان هەر کتێبێك ئەم چەشنە ڕاستی‌یە خوایی و ئیمانی‌یانەیان باس کردبێت، هەندێ لە بابەت و مەسەلەکانیان زیانی لە چەندین کەسدا بەجێ هێشتووە.

هەر لەبەر ئەوەش بووە کە هەموو مەسەلەکانی ئەو چەشنە کتێبانە بۆ سەرجەمی خەڵکی بڵاو نەدەکرانەوە.

بەڵام ئەم پەیامانە هیچ زیانێکیان بە کەس نەگەیاندووە و، هیچ کاریگەری‌یەکی سەلبی‌یان بۆیان نەبووە و، زەینی کەسیشیان نەڕووشاندووە، هەرچەندە لەم ڕووەوە پرسیارم لە گەلێ کەس کردووە. بە ڕادەیەك کە بە دڵنیاییەوە بۆمان ڕوون بووەتەوە کە ئەم دیاردەیە "ئاماژەیەکی غەیبی" و "چاودێری"یەکی ڕاستەوخۆی پەروەردگاری‌یە)[1].

❑ پێویستیی ڕۆح

(پاشان زۆربەی هەرە زۆری پەیام و دانراوەکان لە ئەنجامی پێویستی‌یەکی کتوپڕی "ڕۆح"م و، بێ ئەوەی هۆیەکی دەرەکی لە گۆڕێدا بووبێت، وەك نیعمەتێك پێم بەخشراون. کە ئەمەم بۆ هەندێ لە هاوڕێیانم باس کرد، وتیان:

"ئەم پەیامانە دەرمانی زامەکانی ئەم چەرخەن".

پاش بڵاوکردنەوەشیان، لە ڕێی زۆربەی برایانمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم پەیامانە پێویستی‌یەکانی ئەم چەرخە ناهێڵن و هەموویان ئەنجام دەدەن و زامەکانی ساڕێژ دەکەن.

جا ئەم هەموو حاڵەتانەی لە سەرەوە باس کران، کە هەر هەموویان لە هەست و نەست و ویستی خۆم و ڕەوتی ژیانم بەدەرن و.. تێکڕای لێگەڕان و پشکنینە زانستی‌یەکانیشم، کە ئەویش - بە بێ ویستی خۆم - بە پێچەوانەی داب و ڕەویەی زانایان بوون.. هەموو ئەمانە، هیچ گومانێکیان لەوەدا بۆ نەهێشتم کە ئەو پەیامانە:

چاودێریی خوای گەورە و، ڕێزنانی ڕوون و ئاشکرای پەروەردگارن، تاکو بگەیەننە ئەم ئەنجامە بەرز و پیرۆزە)[2].

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٣-٦٣٤.

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٤-٦٣٥.

### ❐ کاریگەریی بەهێزی پەیامەکان

(برام! تۆ دەپرسیت: بۆچی لە "وتەکان"دا – کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون – هەست بە کاریگەرییەکی نائاسایی و لەعادەت بەدەری ئەوتۆ دەکەین کە مەگەر بە دەگمەن دەنا لە نووسینی خواناسان و تەفسیرنووساندا هەستی پێ ناکەین، چونکە ئەو کاریگەرییەی کە یەك دێڕی "وتەکان" دەیکات، بەرامبەر کاریگەریی یەك لاپەڕەی کتێبێکی ترە و.. ئەو هێزەش کە لە لاپەڕەیەکیدا هەستی پێ دەکرێت مەگەر لە کتێبێکی تەواوی تردا ئنجا دەست بکەوێت؟

وەڵامی ئەمە، کە وەڵامێکی جوانە، ئەمەی خوارەوەیە:

مادەم فەزڵی ئەم شتە بۆ ئیعجازی قورئان دەگەڕێتەوە نەك بۆ من، ئەوا بە بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێم:

بەڵێ، زۆربەی جار وایە. چونکە "وتەکان":

(تَصَوُّر) نییە بەڵکو (تَصديق)ە[1].. (ئیسلام) نییە بەڵکو (ئیمان)ە[2].. (معرفة) نییە بەڵکو (شهادة) و (شهود)ە[3].. (تقليد) نییە بەڵکو (تحقيق)ە[4].. (إلتزام) نییە بەڵکو (إذعان)ە[5].. (تصوف) نییە بەڵکو (حقيقة)ە.. (إدعاء) نییە بەڵکو (بەڵگە)یە لە دووتوێی (دەعوا)دا.

حیکمەتی ئەم نهێنییەش لەوەدایە کە:

بناغە و بنچینەکانی ئیمان لە سەردەمەکانی پێشوودا تاباڵیی دامەزراو بووە و لە لایەن ئیمانداارانەوە گوێڕایەڵییەکی تەواویان بۆ کراوە، بە ڕادەیەك کە ئەگەر عارفان و

---

(١) تصوّر: بریتییە لە پێزانینی شتێك، ئیتر بێ ئەوەی بە "نەفی" یان "ئیثبات" حوکمی بەسەردا بدرێت. بەڵام "تصديق": بریتییە لەوەی کە بە ویستی خۆت ڕاستی(صدق) نیسبەت بدەی بۆ لای قسەکەر.

(٢) ئیسلام و ئیمان: لێرەدا مەبەست ئەو جیاوازییەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە: ﴿قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا ولكن قولوا أسلمنا﴾ (الحجرات:١٤).

(٣) معرفة: واتە پێزانینی شتێك بەو جۆرەی کە هەیە. "شهادة": گێڕانەوەی شتێك یان ڕووداوێك پاش دیتن بە چاو. "شهود": لێرەدا مەبەست بینینی خوای گەورەیە بە چاوی دڵ لە حەقیقەتدا.

(٤) تقليد: چاولێکەری. "تحقيق": گەیشتن بە ئەنجام پاش لێکۆڵینەوە.

(٥) إذعان: جەزم کردنی عەزمە پاش دوودڵی.

تێبینی: بۆ واتای ئەم زاراوانە سوود لە کتێبی "التعريفات"ی "جورجاني" وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

شـــارەزایان لــە مەســـەلە فەرعی‌یــەکاندا بەڵگەشـیان نەهێنابایەتـــەوە، هـــەر تەنـــها ڕوونکردنەوەکانیان سەروزیاد بوون بۆ دروستکردنی قەناعەتی هاوچەرخانی خۆیان.

بەڵام لە کاتی ئێستاماندا، لەبەر ئەوەی گومڕایی زانستی (واتە ئەو گومڕاییەی کە بە ناوی زانستەوە خەڵکی لە ڕێ دەترازێنێت) پەلی بۆ بناغەکانی ئیمانیش هاویشتووە، ئەوا خوای گەورە و میهرەبان کـە دەرمـانی هـەموو دەردێـك دەبەخشـێت، بـە دانـایی و میهرەبانیی خۆی پرشنگێکی لە "ضرب الأمثال"(واتە نموونە هێنانەوە) پێ بەخشیوم، کـە ڕوونترین و درەخشانترینی موعجیزاتی قورئانە..

ئەمەش تەنها بەزەیی خواوەندی میهرەبانە کـە نـاردی بـە هانـای لاوازی و ناچـاری و هەژاریمەوە لە نووسینەکانمدا کە تایبەتن بە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز.

کەواتە تەنها سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو خواوەندە میهرەبانەیە کە:

بە دووربینی (ضرب الأمثال) دوورتریـن حەقیقـەت لـە پێش چـاودا یەکجــار نزیـك خرایەوە و..

بەهۆی یەکێتیی بابەتیش لە (ضرب الأمثال)دا زۆربەی مەســـەلە پـەرش و بڵاوەکـان کۆکرانەوە و..

بە پلیکانـــەی (ضرب الأمثال)دا زۆر بە ئاسـانی سـەرکەوتن بۆ بەرزترین حەقیقەت بەدەست هات و..

لە دەروازەی (ضرب الأمثال)ەوە دڵنیایی ئیمانیش لە بەرامبەر حەقیقەتە شاراوەکانی غەیب و بناغەکانی ئیسلامەوە بە ئەندازەیەك هاتەدی کە دەتوانم بڵێم زۆر لە "شـهود"ەوە نزیکە.

ئیـــتر هـــەروەك لـــەم ڕێیـــەوە "ژیـــری" و "ئەندێشـــە" و "وەهـــم" و "دەروون" و ئارەزووەکانی سەریان نەوی کرد، بە هـەمان جۆر "شـەیتان"یش چـەکی دانـا و توانـای بەرگریی نەما!

بە پوختی: هەرچی لە بارەی کاریگەری لە نووسینەکانمدا دەردەکەوێت، هیچی هی من نی‌یە و لە بیری منەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە بریسکانەوەکانی ئەو (ضرب الأمثال)ەیە کە بە ئاسمانی قورئـانی پیرۆزەوە دەدرەوشـێتەوە و، بەشـی مـن لـەم کـارەدا

تەنها ئەوەیە کـە لەوپەڕی پێویستی و بێ دەستەڵاتیدا هانا دەبەمە بەر خواوەنـد و لێی دەپاڕێمەوە.

کەواتە دەردەکە لە منەوەیە و دەرمانەکەشی لە قورئانی پیرۆزەوە)[1].

□ ئایا ئەرکی سەرشانم کۆتایی پێ هاتووە؟

(برایانم!

هەرچەندە تاریکی‌یەکانی ئەم جۆرە غەریبی‌یانە بە نـووری ئیمـان ڕەوینـەوە و لـە دەوروبەرمدا نەمان، بەڵام هەر هەندێ جێ پەنجەی فەرمانەکانی خۆیـان لـە مندا بـەجێ هێشت و، ئەم بیرەیان بە خەیاڵدا هێنام:

مادەم خۆم غەریبم و، لە غەریبیدا دەژیم و، بەرەو غەریبیش دەڕۆم، ئایا بڵێـی ئەمـە وا بگەیـەنێت کـە ئـەرکی سەرشـانم لـەم میوانخانەیەدا کۆتـایی پـێ هـاتبێت تـاکو ئێـوە و "وتەکان" بکەم بە وەکیل و لە بریـی خـۆم داتـانبنێم و، بـە تـەواوی پەیوەندی‌یـەکانم بـەم دنیایەوە بپچڕم و دەستی لـێ دابشۆم؟

جا لەبەر ئەوەی ئەم بـیرەم بـەم شێوەیە بـە دڵـدا هـات، ئـەوا ئـەم چەشنە پرسـیارانەی خوارەوەم ئاراستە دەکردن کە:

ئایا "وتەکان" سەروزیادن؟ ئایا ناتەواوی‌یان تێدایە؟

مەبەستیشم لەم پرسیارانە ئەوە بوو کە ئایا ئـەرکی سەرشـانم تـەواو بـووە؟ تـا دنیـا لـە بیری خۆم بەرمەوە و، بە دڵنیاییەوە خۆم بهاومە ناو باوەشـی غەریبی‌یـەکی گـەرموگوڕ و نوورانی و بەلەزەت و ڕاستەقینەوە)[2]؟

[ "خلووصی"[3]، کە یەکەم قوتابی‌یەتی، بەمەی خوارەوە وەڵامی دەداتەوە ]:

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٣٦-٦٣٨.

(٢) مەکتووبات، مەکتووبی شەشەم، ل: ٤١.

(٣) "خلووصی یەحیا گیل" یەکێکە لە قوتابیانی دێرینی مامۆستا نوورسی لە "بارلا" کە ئەو دەمە ئەفسەر بووە لە پلەی نەقیبدا. هەر پرسیارێکی ببوایە سەبارەت بابەتە ئیمانی‌یەکان دەینـارد بـۆ مامۆستا نوورسـی، ئـەویش وەڵامی بۆ دەنووسی‌یەوە. پاشان بە ڕێنمایی مامۆستـا ئـەم وەڵامانـە کۆکرانـەوە و نـاونران: "مـەکتووبات". لـە ساڵی (١٩٨٦ز) و لە تەمەنی نەوەد و یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. خوا لێی خۆش بێت.

□ ئەركی سەرشانی بانگەوازكار كۆتایی بێ نایەت

(مامۆستای بەڕێزم! لە دواهەمین دوو نامەتاندا گەلێ سوورن لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارێك كە پێشتر فەرمووبووتان..

جا بۆ ئەوەی وەڵامەكەم لەگەڵ حەق و ڕاستیدا یەكاویەك دەربچێت، دەڵێم:

بێ گومان "وتە" پیرۆزەكان، كە بریسكانەوەی نووری قورئانی پیرۆزن، هەرچەند بەهۆی شێوازە بەرز و بڵندەكەیانەوە لە هەندێ شوێندا پێویستیان بە ڕوونكردنەوە و لێكدانەوە هەیە، بەڵام – بە گشتی – هیچ كەموكوڕی‌یەكیان تێدا نی‌یە و، گشت توێژ و چینێكی خەڵكی دەتوانن بەشی خۆیان لێی بەهرەوەر بن و سوودی لێ وەربگرن.

بەڵگەش لەسەر ڕاستیی ئەم بۆچوون و قەناعەتەمان ئەوەیە كە تا ئێستا هیچ كەسێك ڕەخنەی لێ نەگرتوون، بەڵكو گشت مەشرەب و ڕێبازەكان ڕەزامەندی‌یان لە ئاستدا دەربڕیوە و، مولحیدانیش لە بەرامبەریانەوە كەڕ و لاڵ ماونەتەوە.

وا لە خوارەوەدا بەپێی بیر و بۆچوونی خۆم ئەو بەڵگانە دەنووسم كە دەیسەلمێنن ئەركی سەرشانی بەڕێزتان تەواو نەبووە:

*یەكەم:* ئەو كارەی خراوەتە ئەستۆی زانایانەوە بریتی‌یە لە ئاشكرا كردنی "حەق" و بێ دەنگ نەبوون لە ناحەقی لە دەمی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی بیدعەتەكاندا. هەروەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هەڕەشەی سزای خوای گەورە كراوە لەو كەسەی كە لە ئاستی ئاشكرا كردنی "حەق"دا بێ دەنگ دەبێت.

*دووهەم:* ئێمە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرمان ﷺ خراوەتە ئەستۆ. جا ئەنجامدانی ئەم ئەركە گرنگە، پێویستی‌یەكە هەتا كۆتایی تەمەن بەردەوامە.

*سێهەم:* ڕاپەڕاندنی ئەم خزمەتە بە ڕا و بۆچوونی جەنابتانەوە نەبەستراوە، بەڵكو ئەم خزمەتە ئەركێكە ئێوەی تێدا خراونەتە كار و هەرگیز دەستی ئێوەی تێدا نی‌یە. بۆیە من لە قەناعەتێكی وەها تەواودام كە ئەگەر ئەركی سەرشانی مامۆستای بەڕێزم تەواو ببێت، خوای گەورە ئیلهامی دڵی دەكات كە تەواو بووە.

*چوارەم:* ئاراستە نەكردنی ڕەخنە تا ئێستا لە "وتەكان" ئەوە ناگەیەنێت كە ئەم بارە تا دوایی هەر وا دەمێنێتەوە. نەخێر..

ئێوە – ئەی مامۆستای بەڕێزم! – هەتا لە ژیاندا مابن ئەرکی وەڵامدانەوەی ئەو هێرشانەتان لە ئەستۆدایە کە لەوانەیە بکرێنە سەر "وتەکان".

پێنجەم: پێم وایە ئێوە وەڵامی ئەو پرسیارانە پشتگوێ ناخەن کە سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی "وتەکان" لە لایەن ئەو کەسانەی پەیوەندییان پێیانەوە هەیە، ئاراستەت دەکرێن. خۆ ئەگەر هیچ هۆکارێکی تری جگە لەمە لە گۆڕێدا نەبێ، ئەوا هەر ئەم هۆکارە سەروزیادە بۆ ئەوەی کە نەتوانن دنیا فەرامۆش بکەن، هەرچەندەش خۆتان واتان پێ باش بێت.

شەشەم: ئەو کەسانەی لەبەر خوای گەورە تۆیان خۆش دەوێت، گەلێ پرسیارت لە بارەی هەندێ لایەنی نووسینە بەنرخەکانت و ڕوونکردنەوە بەرزەکانی کۆرە زانستییەکانت ئاراستە دەکەن، خۆ هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەش لە "وتەکان"دا بڵاو نەکراونەتەوە. ئەمەش بەڵگەیەکی بێ گومانە دەری دەخات کە ئەرکی سەرشانتان هێشتا تەواو نەبووە و خزمەتگوزاریی ئیمانیش کۆتایی پێ نەهاتووە)[1].

## ڕێی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور

❐ نووسینەوەی دەستی:

دانان و بڵاوکردنەوەی "پەیامەکانی نوور" کارێکی نایاب و دەگمەنە لە مێژووی هاوچەرخی بانگەوازی ئیسلامدا، چونکە مامۆستا سەعیدی نوورسی لەبەر ئەوەی لە ڕووی توانای نووسینەوە نیمچە نەخوێندەوار بووە (واتە خەتی ناخۆش بووە) ئەوا زۆربەی پەیامەکانی بە دەستی خۆی نەدەنووسی، بەڵکو دانانی بەشی زۆری ئەو پەیامانە لە حاڵەتێکی هەڵچوون و قوڵپدانی ڕۆح و ویژداندا بووە کە بۆ قوتابیانی خۆی دەوت و ئەوانیش یەکسەری دەیاننووسییەوە. دوای ئەوە لە نێوان قوتابیاندا نوسخەی یەکەم دەستاودەستی دەکرد و بە نووسینی دەستی لەبەریان دەگرتەوە، پاشان هەموو ئەو نوسخانە دەهێنرانەوە بۆ لای مامۆستا، تاکو پێداچوونەوە و وردبینی بۆ یەك بە یەکیان بکات و، هەر هەڵەیەك لە نووسینەوەیدا ڕووی دابێت ڕاستی بکاتەوە..

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٢٣-٢٥.

هەروەها جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ سەرچاوەیەکی تری لە کاتی دانانی پەیامەکاندا لـە بەردەستدا نـەبووە. ئـەو بیرە نـاوازە و توانـا سەرسووڕهێنەرەی کـە بـۆ لەبـەر کردن هەیبوو، یارمەتیی باشی دەدا بۆ ئەو چەشنە دانانەی پەیامەکان.

مـاوەی بیسـت سـاڵ پەیامەکانی نـوور بـەم ڕێگایـە بڵاودەبوونـەوە. دوای ئـەوە و بـۆ یەکـەم جـار بـە ئـامێری "ڕۆنیـۆ" چـاپ دەکـران. هـەتا سـاڵی (١٩٥٦ز)یش چـاپی ئـەم پەیامانە لە چاپخانەی ئاساییدا مەیسەر نەبوو. جگە لە "پەیامی حەشر" کە بـە پەنـهانی لـە ڕێی یەکێك لە قوتابیانی نوورەوە لە ئەستەمبووڵ هەندێکی لـێ چاپ کرا[١].

ئەو دەمە پیتەکانی نووسین گۆڕابوون بە پیتی لاتینی، چونکە چاپ و بڵاوکردنەوە بە پیتەکانی پێشوو قەدەغە کرابوو، هەروەك چاپخانـەکانی پیتـی عـەرەبی داخـرابوون. ئیـتر ئەم ڕێیە – واتە نووسینەوەی پەیامەکان بە دەست و بە پەنهانی – تاقانە ڕێـی گونجـاو بـوو کـە دانراوەکـانی مرۆڤێکـی دوورخـراوەی پێ بڵاوبکرێتـەوە، ئـەو مرۆڤـەی کـە لـە ژێـر چاودێریی دەوڵەتدا بووە و، هەموو ڕێیەکی نووسین و بڵاوکردنەوەشی لـێ داخـرابوو، بە تایبەت کە بە سووربوونی لەسەر نووسینی پەیامەکان بە پیتە عەرەبییـەکان دەیویسـت ئەو پیتانە لە تیاچوون و لەبیرچوونەوە بپارێزێت[٢].

---

(١) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati. عـەبدوڵڵا چـاوش (١٨٩٥-١٩٦٠ز) کـە یەکێکـە لـە پێشەنگەکانی ئەم خزمەتە قورئانییە، دەڵێ: دوای خۆرئاوابوون، گوندی "ئیسلام کۆی"م بـەجێ دەهێشت و لە هەگبەکەمدا ئەو پەیامانەم هەڵدەگرت کە "حافز عەلی" نووسیبوونیەوە و، بە درێژایی شەو بە پێ بەناو چیا و شیوەکاندا دەڕۆیشتم هەتا دەمەوبەیان دەگەیشتمە بارلا و دەمبینی مامۆستا چاوەڕوانمە و، بـە خۆشـحاڵییەکی زۆرەوە پێشوازیی لـێ دەکردم. پێکەوە نوێژی بەیانیمان دەخوێند و پاشان من دەنوستم. بە هەمان شێوە ڕۆژی دوای ئـەوە دەستنووسـەکانم لـە مامۆستا وەردەگرت و شـەو "بارلا"م بـەجێ دەهێشـت تـاکو بگـەمـە "ئیسـلام کۆی"، ئیتر لەوێ دەستنووسەکانم بە دەستی "حافز عەلی" دەسپارد. لە "ذكريات عن سعيد النورســي"یەوە، ص ٣٣.

(٢) هەر "عەبدوڵڵا چاوش" دەگێڕێتەوە کە:
ڕۆژێکیـان هـاتم بۆ لای مامۆستا، دەبینـم حـافز عـەلی و چـەند قوتابییـەکی تـری مامۆسـتای لێیـە. مامۆسـتا جوزئەکانی قورئـانی پیرۆزی بەسـەردا دابـەش کـردن تـاکو بینووسنەوە، ڕێنمـایی چۆنێتیی نووسینەوەکەشی کردن. جا لەبەر لەوەی من نەخوێندەوارم و نازانم بنووسم و بخوێنمەوە، ئەوا ڕۆشـتم "چا"م بۆ ئامـادە کـردن، تاکو بەشداری پاداشتیان ببم. بەڵام هەر هێندەی من "چا"کەم هێنا تاکو بۆیان دابنێم، خێرا مامۆسـتا هەڵسـایە سەرپێ لێی وەرگرتم و خۆی بۆی دانان، منیش شەرمەزاربووم! چونکە چۆن دەبێ مامۆسـتا "چـا" بـۆ قوتـابیی خۆی دابنێت؟! بەڵام من لە بەردەم جەختی زۆری مامۆستادا بێدەنگ بووم.. پاشـان فـەرمووی: نووسینەوەی

خۆ کاتێ کە بازنەی قوتابیان فراوان دەبوو، پەیامەکانیش دەگەیشتنە گوند و ناوچەکانی نزیکی "بارلا"، ئیتر بە پەنهانی دەستاودەست دەکران و وانەیان لەسەر دەخوێنرا، ئنجا ئەوانیش دەیانگەیاندنە شارە دوورەکان. چونکە لەو بارودۆخە سووتێنەر و تاریکەدا، ئەو پەیامانە وردە وردە چەندین دڵی نوێ و گیانی تینووی هیدایەت و ڕووناکی‌یان بەلای خۆیاندا کێش کرد.

لە پێشدا دەیان، پاشان سەدان، ئنجا هەزاران قوتابیی نوور لە ژن و پیاو چەندین سەعات بە ڕۆژ و بە شەو لێدەبڕان بۆ لەبەرنووسینەوەی پەیامەکان. بە ڕادەیەك کە هەندێکیان حەوت ساڵ لە ماڵی خۆی نەهاتە دەرەوە و خۆی بۆ ئەم ئەرکە گرنگە تەرخان کردبوو! تەنانەت گوندی "ساو"ی نزیکی "ئیسپارتە" هەزار کەسی نووسەرەوەی پەیامەکانی تێدا بوو[١]!

❑ ئافرەتان لە ڕێی نووردا

ئافرەتانیش بەشداریی کارا و گەرموگوڕیان لەم هەڵمەتەدا کرد. ئەو کیژانەی کە دەیانزانی بنووسن، بە نووسینەوە بەشدارییان دەکرد. ئەوانەش کە نەیاندەزانی، بە لاسایی کردنەوەی نووسینەوەکانی ئەوانی تر دەیاننووسی‌یەوە، واتە بە شێوەی نەخش کردن و وێنە کێشان دەچوون لەبەر نووسینەکانی ئەوانیان دەگرتەوە!

هەندێ لە ئافرەتان هاتنە خزمەتی مامۆستا نوورسی و پێیان وت:

ئەی مامۆستای بەڕێزمان! ئێمە بڕیارمان داوە کاری ڕۆژانەی مێردەکانمان بگرینە ئەستۆ، تاکو ئەوان بە تەواوی لێ ببڕێن بۆ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور و، ئێمەش پاداشتی ئەو خزمەتانەمان دەست بکەوێت[٢]!

"کاتێ لە سەرەتای دانانی پەیامەکانی نووردا لە بارلا بووم، خوشکی بەڕێز "زەهرا خانم" - خوا لێی خۆش بێت - کە خێزانی یەکەم نووسەرەوەی پەیامەکانی نوور "حافز

---

لێوە بۆ چەند جوزئێکی قورئانی پیرۆز و هەوڵ و کۆششتان لەپێناوی قورئاندا، لای خوای گەورە قبووڵ دەبێت و، مەلائیکەتە بەڕێزەکانیش لەم دۆخەدا وێنەتان دەگرن. لەبەر ئەوەی منیش خزمەتکارێکی قورئانم، پێویستە خزمەتتان بکەم. ئیتر لەو کاتە کە ئەوان سەرگەرمی نووسینەوە بوون، بە دەستی خۆی چاکەی بۆ دانان. لە "ذكريات عن سعيد النورسي"یەوە، ص ٣٣.

(١) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati.

(٢) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati.

تۆفیق"(١) بوو، لەبریی مێردەکەی کۆڵەداری دەهێنا و کارەکانی مێردەکەی جێبەجێ دەکرد، تاکو ئەو خەریکی نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی پەیامەکان بێت. ئێمەش وەکو وەفادارییەك بۆ ئەو کردارە جوانە، ناوی ئەو خوشکە دەخەینە نێو دوعاکانمان بۆ قوتابیانی تایبەتمەندی نوور کە کۆچیان کردووە و، لەسەر ئەم دوعایەش هەر بەردەوام دەبین"(٢).

□ ئەوانەی پێشەنگ بوون لە کاروانی نووردا

(ئەی برایانی ئازیز و بەوەفا و پیرۆزم و.. ئەی هاورێیانی بەهێز و دڵسۆزم لە خزمەتکردن بە ئیمان و قورئان!

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە کە ئاواتەکەی منی لە "پەیامی پیران" و ئیدیعاکەمی لە "پەیامی بەرگرییەکان"دا بە ئێوە هێنایە دی.

بەڵێ، بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکان لە ئەزەلەوە تا ئەبەد سوپاس بۆ خوای گەورە کە "سی" کەسی، بەڵکو "سەد و سی" کەسی، تەنانەت "هەزار و سەد و سی" هاووێنەی "عەبدورەحمان"ی لە ئێوە بە پەیامەکانی نوور بەخشی، کە هەریەکەیان لە بەرامبەر هەزار کەسەوەیە!

هەرچەندە بۆ ئەو برایانەم دەڕوانم کە بەردەوام بۆ خزمەت لەگەڵمدان و لە خەیاڵم دەرناچن، دەیانبینم وەکو ئێوە بەوپەڕی چوست و چالاکییەوە بۆ کاری پەیامەکانی نوور تێدەکۆشن و دەیانگرنە ئەستۆ و، پارێزگارییان لێ دەکەن و، یەك لە دوای یەك بە یەکتریی دەسپێرن و، بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن و، ڕێزی شایان لە هەموو شتێك دەگرن.. کە لە شوێنی خۆمەوە دەبینم بەو جۆرە ئیخلاسیان لە هی من زیاترە و لە منیش زیاتر گەرموگوڕ و چوست و چالاکترن لە خزمەت بە ئیمان و قورئاندا.. ئەوا بە شادمانی و خۆشحاڵییەکی تەواوەتی و کەماڵی دڵنیاییەوە چاوەڕوانی ئەجەل و مردن و گۆڕەکەی خۆم دەکەم.

---

(١) لە نێوان ساڵەکانی (١٨٨٧ – ١٩٦٥)زدا ژیاوە و لە قوتابیانی پێشینی پەیامەکانی نوورە. بۆیە پێی وتراوە (حافز) چونکە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە و، پێشی وتراوە (شامی) چونکە ماوەیەکی زۆر لە شامدا لەگەڵ باوکی ماوەتەوە. مرۆڤێکی زانا و خاوەن تەقوا و صەلاحەت بووە. لە "بارلا" و بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" هاودەمی مامۆستا نوورسی بووە. خوا لێی خۆش بێت.

(٢) Tarihce-i Hayat, Barla Hayati.

برایانم! من لە ڕێی نامەکانتانەوە و لە ناوەندی خزمەتە بەنرخەکانتانەوە - کە هەرگیز لە یادم دەرناچن - هەرچی ڕۆژە چەندین جار دەتانبینم و، بەم کارانەشتان شەوق و تاسەمەندیم تێر دەبێت و دڵنیایی بەدەست دەهێنم. ئێوەش بە هەمان جۆر دەتوانن لە ڕێی پەیامەکانەوە گفتوگۆ و دانیشتن لەگەڵ ئەم برا لاوازەتاندا ساز بکەن..

چونکە کات و شوێن ڕێ لە گفتوگۆی نێوان ئەهلی حەقیقەت ناگرن، تەنانەت گەر یەکێکیان لە خۆرهەڵات و ئەوی تریان لە خۆرئاوا و، یەکێکیان لە دنیا و ئەوی تریشیان لە بەرزەخدا بێت. چونکە پەیوەندیی ئیمانی و قورئانیی نێوانیان وەك ڕادیۆیەکی مەعنەوی وایە، دەتوانن لەو ڕێیەوە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا بکەن)[1].

(خوای گەورە لە گەنجینەی نیعمەتەکانی خۆیەوە چەند برایەکی بەهێز و گەرموگوڕ و دڵسۆز و بەغیرەت و خۆبەختکاری پێ بەخشیوم، کە قەڵەمەکانیان وەکو شمشێری ئەڵماس وایە و، هانی داون یارمەتیی کەسێکی نیمچە نەخوێندەواری لە خەڵك دابڕاوی وەك من بدەن، کە بە باشی ناتوانێت بنووسێت و لە وڵاتی غەریبیدا تێکەڵاویی خەڵکی لێ قەدەغە کراوە و، ئەو کۆڵە قورسەی خزمەتی قورئانی خستە سەر ئەستۆی بەهێزی ئەوان کە ئەستۆی لاوازی من توانای هەڵگرتنی نەبوو..

بەم پێیە، خوای گەورە کۆڵە قورسەکەی لەسەر شان سووك کردم.

جا ئەو کۆمەڵە پیرۆزە، لە شەوق و هەوڵ و تەقالای کارکردن و غیرەت و گەرموگوڕیی خزمەت کردندا لەیەك دەچن. چونکە بڵاوکردنەوەی نهێنییەکانی قورئان و نوورەکانی ئیمان و گەیاندنیان بە هەموو شوێنێك لە لایەنی ئەو برایانەوە، هەروەها ڕاپەڕاندنی چوست و چالاکانەی کارەکانیان بە شەوقێکی بەردەوام و هیممەتێکی بەرزەوە لەم ڕۆژگارە سەختەدا کە پیتەکانی نووسین گۆڕاون و، چاپخانە دەست ناکەوێت و، خەڵکییش پێویستیان بە نوورەکانی ئیمانە، سەرەڕای ئەو کۆسپ و تەگەرە زۆرانەش کە ڕێی کارکردن دەگرن و مرۆڤ سست و سارد دەکەنەوە و شەوقی لاواز دەکەن..

ئەم خزمەتەی ئەوان لەم بارودۆخەدا، کەرامەتێکی ئاشکرای قورئان و چاودێرییەکی دیار و لەبەرچاوی خوایی نەبێت، هەرگیز هیچی تر نییە.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٣١-١٣٢.

بەڵێ، هەروەك "ویلایەت" کەرامەتی هەیە، بە هەمان جۆر "نیازی خاوێن" و "ئیخلاس"یش کەرامەتیان هەیە. بە تایبەت پەیوەندیی توندوتۆڵ و پشتگیریی پتەوی نێوان برایان لە ناوەندی بازنەی برایەتی‌یەکی خاوێن و بێگەرددا بۆ خوای گەورە، گەلێ کەرامەتی زۆری دەبێت. تەنانەت "کەسی مەعنەوی"ی ئەم چەشنە کۆمەڵە دەگونجێ لە حوکمی "وەلی‌یەکی کامڵ"دا بێت و لە چاودێری‌یەکانی خواوەند بەهرەمەند بێت)[1].

☐ بە چ هەست و سۆزێك ئەم خزمەتانە ئەنجام دەدرێن؟

(وا دەستووریێکتان لە بارەی "برایەتی"یەوە بۆ روون دەکەمەوە، کە دەبێ بە گەرمی و لێبڕانەوە ڕەفتاری پێ بکەن..

ژیان ئەنجامی "یەکبون" و "یەکێتی"یە. جا ئەگەر ئەو یەکێتی‌یەی کە لە ئاستی تێکەڵی و ئاوێتەبووندایە لەدەست بچێت، ئەوا ژیانی مەعنەوییش دەڕوات و نامێنێت.

ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ (الأنفال:٤٦) ئاماژە بەوە دەدات کە: هەرکات پشتگیری و هاوپەیوەندیی نێوان برایان تێکچوو، ئەوا "کۆمەڵ"یش چێژی خۆی لەدەست دەدات.

ئێوە دەزانن کە هەرکات سێ دانە ئەلف بە جیا جیا بنووسرێن نرخیان هەر سێ دانە دەبێت، بەڵام گەر بە پشتگیریی ژمارەیی کۆ بینەوە ئەوا نرخیان دەگاتە سەد و یازدە. بە هەمان جۆر گەر چەند کەسێکی وەك ئێوە لە خزمەتگوزارانی حەقدا هەریەکەیان بە جیا جیا کارەکانی ئەنجام بدات و بایەخ بە دابەشکردنی کار لە نێوان خۆیاندا نەدەن، ئەوا هێز و توانایان هەر تەنها هی سێ چوار کەس دەبێت، بەڵام گەر بە برایەتیی ڕاستەقینە و پشتگیریی یەکتری تێبکۆشن و هەریەکەیان شانازی بە فەزڵی ئەوانی ترەوە بکات تا بەهۆی نهێنیی "توانەوە لە برایەتیدا"(الفناء في الأخوة) وایان لێ بێت کە هەر یەکەیان بریتی بێت لەوی تریان.. ئەوا نرخی ئەو چوار کەسە وەك هی چوار سەد کەسی لێ دێت!

برام! ئێوە وەك دینەمۆکانی کارەبایەك وان کە ڕووناکی نەك تەنها بە "ئیسپارتە" بەڵکو بە وڵاتێکی گەورە بدات.

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست و هەشتەم، ل: ٦٢٨-٦٢٩.

خۆ چەرخەکانی مەکینەش ناچارن هاوکار و تەواوکەری یەکتر بن. چونکە هەریەك لەو چەرخانە نەك هەر دژایەتی و بێزاری‌یان بەرامبەر بەوانی تر تێدا نی‌یە، بەڵکو حەوانەوەشیان لەو هێزە گەورەیەوە بەدەست دەهێنن کە هی چەرخەکانی ترن، چونکە ئەرکی سەرشانی لەسەر سووك دەکەن.

ئەو کەسانەی ئەرکی خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئان لەسەر شانیان هەڵدەگرن، کە وەکو گەنجینەیەکی گەورە و بەرزی حەق و ڕاستی وایە، هەرکات چەند شان و بازوویەکی بەهێز و هاوکار بچێتە ڕیزیانەوە و گەنجینە مەزنەکەیان لەگەڵدا هەڵبگرێت، دەبێت بە مایەی شانازی‌یان، هەروەك سوپاسی پەروەردگاریشی لەسەر دەکەن.

کەواتە وریابن! هەرگیز دەرگای ڕەخنە لە نێوانتاندا نەخەنە سەر پشت. ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی ڕیزەکەتاندا شایانی ڕەخنەن، گەلێ زۆرن. جا هەروەك من شانازی بە تایبەتکاری‌یەکانی ئێوەوە دەکەم و، حەوانەوە و دڵنەواییم لەو تایبەتکاری‌یانەی ئێوەدا بەدەست دەهێنم کە خۆم لێیان بێ بەشم و بە هی خۆمیان دادەنێم، دەبێ ئێوەش بە هەمان جۆر بڕواننە تایبەتکاری‌یەکانی برایانتان و هەریەکەتان چاکەی ئەوانی تر بڵاو بکاتەوە.

بە شایانی دەزانم ئێوەش لەو هەستە برایانە بێگەردەی برای بەڕێزمان "حافز عەلی"[1] ئاگادار بکەمەوە کە بەرامبەر ئەو برایەمان دەری بڕی لە نووسینەوەی دەستیی پەیامەکاندا دەبووە ڕکەبەری.. وا لە خوارەوە دەیگێڕمەوە بۆتان:

"حافز عەلی" هات بۆ لام و، پێم وت:

خەتی "فلانە برا" لە خەتی تۆ خۆشترە و کار و چالاکیشی لە هی تۆ زیاترە!

بینیم "حافز عەلی" لە ناخی دڵەوە – بە ئیخلاس و بێگەردی – شانازی بە سەرکەوتنی ئەو برایەوە دەکات بەسەریدا، تەنانەت لەزەتیشی لەم هەواڵە چەشت و دڵی پێی کرایەوە، چونکە ئەو برایە توانیویەتی خۆشەویستی و مەدح و سەنای مامۆستاکەی بەدەست بهێنێت!

---

(١) "حافز عەلی" لە پێشەنگی قوتابی‌یە دێرینەکانی مامۆستا نوورسی‌یە و، بەهۆی ئەو خەت خۆشی و هیممەت بەرزی‌یەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو لە نووسینەوەی پەیامەکاندا گەلێ چوست و چالاك بووە. ساڵی ١٩٤٤ لە بەندیخانەی دەنیزلی لە تەمەنی ٤٦ ساڵیدا ژەهری دەرخوارد دراوە و شەهید کراوە. خوای گەورە نوقمی میهرەبانیی فراوانی خۆی بکات. ئامین.

کە بە وردی سەرنجی "دڵ"ی حافز عەلیم دا و بۆم ڕوانی، زانیم ئەم گوفتارەی هەرگیز دەستکرد و مەرایی نییە، بەڵکو تێگەیشتم کە هەستێکی بێگەرد و خاوێنە!

منیش پڕ بە دڵ گەلێ شوکرانەی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەوەی کە لەناو برایانماندا کەسێکی وا هەیە ئەم هەست و سۆزە بەرزەی تێدا بێت. پشت بە خوا ئەم هەستە گەلێ خزمەت ئەنجام دەدات. سوپاس بۆ خوای گەورە وردە وردە ئەم هەست و سۆزە برایانەیە لەناو ڕیزی برایانی ئەم ناوچەیەماندا بڵاو بووەتەوە)[1].

☐ پەیوەندیی قوتابی بە مامۆستاکەیەوە

(ڕا و بۆچوونی خۆمتان بە جۆرێك کە سوودی بۆ ئێوە تێدا بێت، سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوان "مامۆستا" و "قوتابیان" و "هاوڕێیانی دەرس" بۆ باس دەکەم:

برایانم!

ئێوە لە ڕوویەکەوە و بە ڕادەیەك کە لە سەرووی سنوور و توانای خۆمەوە بێت قوتابیی منن و.. لە لایەکی تریشەوە هاوڕێمن لە دەرسدا.. هەروەك لە لایەکی ترەوە یاریدەدەر و هاوڕێیانی شوورا و پرس و ڕای منن.

برا ئازیزەکانم!

مامۆستاکەتان لە هەڵە پارێزراو(معصوم) نییە. بەڵکو هەڵە لەوەدایە کە لەو باوەڕەدا بن تووشی هەڵە نابێت..

بەڵام هەرگیز سێوێکی گەنیو زیان لە باخەکەی نادات و، دراوێکی ساختە و قەڵبیش لەناو گەنجینەیەکدا نرخی گەنجینەکە ناشکێنێت.

جا لەبەر ئەوەی "خراپە" بە یەك دانە و، "چاکە"ش بە دە هێندەی خۆی دادەنرێت، ئەوا ویژدان داخوازی ئەوەیە کە:

سافی و خاوێنیی دڵەکان هەرگیز بەرامبەر کردەوە چاکەکان لێڵ نەکرێت و ڕەخنەیان لێ نەگیرێت، گەر گوناهێك یان هەڵەیەك لە خاوەنی ئەو کردەوە چاکانەوە بینرا.

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٧٦-٧٨.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلانەی کە تایبەتن بە "ڕاستی‌یەکانەوە" هەروەها "مەسەلە گشتی‌یەکان" و "درێژە پێدانیان" بە شێوەیەکی گشتی، لە بابەتی "سانیحاتی ئیلهامی"ن، ئەوا بە چەند مەسەلەیەکی یەقینی دادەنرێن و هیچ ڕەخنەیەکیان ئاراستە ناکرێت.

سەبارەت بە ڕا وەرگرتن و پرس و ڕاشم پێتان لە بارەی ئەو مەسەلانە، ئەوا لە ڕووی جۆری وەرگرتنی ئەو مەسەلانەیە لە لایەنتانەوە، نەك لەو ڕووەوە کە ئایا حەق و حەقیقەتن یان نا؟ چونکە هەرگیز من دوودڵ نیم لەوەدا کە "حەقیقەت"ن!

ئنجا لەبەر ئەوەی خۆم بە باشی ناتوانم بنووسم و، نووسەرەوەشم بە هەمیشە و بەردەوامی لە لای خۆم بۆ نارەخسێت، ئەوا گوزارشت و دەربڕینەکان بە پوختی و لە شێوەی تێبینیدا دەمێننەوە و لێ تێگەیشتنیان قورس دەبێت.

ئەی برایان و هاوڕێیانی دەرسم!

ئەوە بزانن کە من گەلێ دڵخۆش دەبم گەر هەر هەڵەیەکتان لێ بینیم بە ڕاشکاوی ئاگادارم بکەنەوە. تەنانەت گەر بە توند و تیژی‌یەوە ئەو هەڵەیەشم پێ بڵێن، دەڵێم: خواتان لێ ڕازی بێت. چونکە نابێ لە ئاستی "حەق"دا بایەخ بە هیچ شتێکی تر بدرێت.

من بۆ قبووڵ کردنی هەر ڕاستی‌یەك ئامادەم کە "حەق" بە پێویستی دابنێت. خۆ ئەگەر ئەو ڕاستی‌یە نەزانم و شارەزای نەبم هەر کە پێم وترا - با پێچەوانەی دەروونی بەدخوازیشم بێت - بە بێ موناقەشە، لەسەر چاو و سەرمی دادەنێم.

باش بزانن ئەم کارکردنەمان بۆ "ئیمان"، بە تایبەت لەم کاتەدا، گەلێ مەزن و گرنگە. بۆیە نابێت ئێوە ئەم کۆڵە قورسە بخەنە ئەستۆی کەسێکی لاوازی وەك من کە بیری دووچاری شپرزی و پەرتەوازەیی بووە. بەڵکو دەبێت بە پێی توانا ئێوەش یارمەتیی بدەن)[1].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٨٠-٨٢.

# بەندی پێنجەم

## لە بەندیخانەی ئەسکی شەهر

### (یەکەم قوتابخانەی یووسفی)

### ١٩٣٥/٤/٢٥ - ١٩٣٦/٣/٢٧ز

ئەو دوژمنانەی ئیسلام کە چاوەڕێی هەموو هەلێکن بیقۆزنەوە لە دژی هەر ڕابوون و جوولەیەك پشتی "ئیمان" بگرێت و خزمەت بە "قورئان" بکات، کاتێ هەستیان کرد "پەیامەکانی نوور" بڵاودەبنەوە و ئیمانیش لەناو دڵی خەڵکدا بە توندوتۆڵی دادەمەزرێت، ئەوا فێڵێکیان بۆ دەستگیر کردنی مامۆستا نوورسی و قوتابیانی نوور ساز کرد و، بە پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنی و، کارئەنجامدان لە دژی ڕژێمی فەرمانڕەوا و هەڵتەکاندنی بناغەکانی ئەو ڕژێمە، تۆمەتبار کران.. هەروەها تۆمەتەکانی تری هاوشێوەی ئەمانە.

لە ئەنجامی ئەمە و لە بەرواری ١٩٣٥/٤/٢٥زدا، مامۆستا نوورسی و قوتابیانی کەلەپچە کرایە دەستیان و، بە مەبەستی دادگایی کردنیان بران بۆ بەندیخانەی شاری "ئەسکی شەهر".

بەڕێز "ڕووحی"ی سەرۆکی مەفرەزەکە، بەزەیی بە مامۆستادا هاتەوە و، فەرمانی دا کەلەپچەکانی بکرێنەوە. تەنانەت دوای ئەوەی کە لە ڕاستییەکان تێگەیشت، بوو بە هاوڕێی مامۆستا نوورسی و قوتابیانی نوور.

ڕۆژی ١٩٣٥/٤/٢٧ز خودی وەزیری ناوخۆ و، سەرۆکی جەندرمەکان، لەگەڵ چەند مەفرەزەیەکی سەربازیی چەکداردا، هاتن بۆ شاری ئیسپارتە و، هێزێکی

سەربازیی پیادەیان لەسەر ڕێی "ئیسپارتە - ئافیون" دانا و، سەرجەمی پارێزگاکە و دەوروبەریشیان خستە ژێر کۆنترۆڵی سەربازییەوە!

لە لایەکی دیکەوە سەرۆکی ئەو کاتەی حکوومەت "عیصمەت ئینۆنۆ" سەردانێکی ناوچەکانی خۆرهەڵات(کوردستان)ی کرد، لەبەر ئەوەی کە بەهۆی گرتنی مامۆستا نوورسییەوە مەترسیی بەرپابوونی شۆڕشێکیان تێدا دەکرد. چونکە ئەو دوژمنانەی ئایین کە لە پشتی پەردەوە خۆیان شاردبووەوە، بە نیازی نانەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لە دڵی خەڵکدا، ئەوەیان بڵاوکردەوە کە بەدیعوززەمان و قوتابیانی لە سێدارە دەدرێن..

لە کاتێکدا کە بەدیعوززەمان بە درێژایی ژیانی ڕەفتارێکی پێچەوانەی ڕێسا و ئاسایشی ئەنجام نەداوە، بەڵکو هەمیشە کاری ئیجابی و بنیاتنەری کردووە بە ڕێبازی ژیانی و، وتوویەتی:

"نابێت لەبەر هەڵە و تاوانی چەند کەسێکی کەم، زیان بە سەدان کەس بگەیەنرێت".

لەبەر ئەوە و، سەرەڕای ئەو هەموو ستەمەی کە داباریە سەر خۆی و قوتابیانی، تەنها یەك ڕووداوی تێکدانی ڕێسا و ئاسایش ڕووی نەداوە. بگرە هەمیشە هانی قوتابیانی خۆی داوە بۆ خۆڕاگری و، دامەزراوی و، بەردەوامیی لەسەر کارکرن بۆ ئیمان و، دوورەپەرێزی لە کاری تێکدەرانە. چونکە ئەو چەشنە کردارە تێکدەرانەیە جگە لە بێ دینەکان کەسی تر سوودی لێ نابینن.

ئیتر بەو جۆرە، مامۆستا نوورسی و سەد و بیست کەس لە قوتابیانی بران بۆ بەندیخانەی ئەسکی شەهر و، خرانە زیندانی تاکەکەسی و دابڕانی تەواوەتی لە خەڵك. ئنجا ئەشکەنجەدانی ترسناك و تۆقێنەر داباری بە سەریاندا..

کەچی وێڕای ئەو بارودۆخە سەخت و دژوارە، مامۆستا نوورسی لەسەر کاری ئامۆژگاری و ڕێنمایی هەر بەردەوام بوو. لە ئەنجامی ئەوەشدا گەلێ کەس لە بەندکراوانی ناو بەندیخانەکە گۆڕانیان بەسەردا هات و، بوون بە کەسانی باشی دیندار و خاوەن تەقوا.

سەرەڕای کۆکردنەوەی پەیامەکانی نوور لەناو ماڵی قوتابیانی نوور و، لێکۆڵینەوەی ورد، کەچی "دادگا" ماددەیەکی لەو پەیامانەدا نەدۆزییەوە کە بیکاتە مایەی تۆمەتبارکردن. لەگەڵ ئەوەشدا، دادگا تەنها لەسەر خواست و قەناعەتی کەسیی

"خودی دادوەر" بڕیاری یازدە مانگ بەندکردنی بۆ مامۆستا نوورسـی و شەش مـانگیش بۆ پازدە قوتابیی نوور دەرکرد و، سەد و پێنج قوتابی‌یەکەی تر ئازاد کران[١].. لـە کاتێکدا گەر تۆمەتەکان ڕاست بوونایە، ئەوا سزاکەیان بڕیاری لەسێدارەدان، یان لانی کەم بەندکردن دەبوو لەگەڵ کاری قورسدا!

لەبەر ئەوە، مامۆستا نوورسی ڕەخنەی لە بڕیـاری ستەمکارانە و هەڕەمەکیی دادگـا گرت و، ڕوونـی کردەوە کـە ئـەم سـزایە هـی کەسێکە هێسـترێکی دزی بێـت، یـان کیژۆڵەیەکی فڕاندبێت. بۆیە داوای لـە دادگـا کـرد کـە یـان بڕیـاری بێ تـاوانی، یـان لەسێدارەدان، یاخود سەد ساڵ بەندکردنی بۆ دەربکات[٢]!

## بەرگریی مامۆستا نوورسی
## لە دادگای ئەسکی شەهردا[٣]

□ وەڵامم لە دادگادا:

شتێکی بەڵگەنەویستە کەسێك کە ماوەی سیازدە ساڵ لە ژیان دابڕابێـت، چاودێری کردنی ئوسووڵ و ڕێوڕەسمی یاساکان نازانێت و لە توانایدا نابێت..

لەبەر ئـەوە، تکـام وایـە لـە بری پرسیار و وەڵامـە ڕەسمی‌یـەکان، گـوێ بیسـتی ئـەم ئیفادەیەم بـبن. چونکـە مـن سێ جـار لـە "ئیسپارتە" بـە شێوەیەکی ڕەسمی ڕووبـەڕووی پرسیار و وەڵام بوومەتەوە.

ئەم ئیفادە تازە و درێژەم تووشی سەرسامیتان ناکات، بـەڵکو ڕێـی لێکۆڵینـەوەکانتان سەبارەت بە من بۆ ئاسان دەکات و، دەیکاتـە ڕوونکردنەوەیـەکی ڕاسـت و دروسـت و، لە سەرێشەی لێکۆڵینەوە و گەڕانی ناو ئەو سی کتێبە ڕزگارتان دەکات کە ئێسـتا لـەبـەر دەستی ئێوەدایە.

---

(١) بڕیاری "داگای گەورەی سزا"ی ئەسکی شەهر ژمـارە (١٢١)ە لـە بەرواری ١٩/٨/١٩٣٥ز. تەسدیقی "یەکەم دادگای تەمییز"یش ژمارە (٢١١١)ە لە بەرواری ١٢/١٠/١٩٣٥ز. (ب: ٢/٨٣٢)

(٢) Tarihce-i Hayat, Eskisehir Hayati.

(٣) ئەم بەرگری‌یە لەم سەرچاوەیە وەگیراوە: Tarihce-i Hayat, Eskisehir Hayati

هەر ئەم حەقیقەتـەی کـە ئێستا خراوەتە پێش چاوی دەستەی دادوەرانی دادگا و، وەزیری نـاوخۆ و، سـەرۆکایەتیی ئەنجومەنی پەرلـەمان، لـە هـەمان کـاتدا داواکـاری و ئەرزوحاڵێکیشە پەیوەندیی بە ژیانی هەمیشەیی کەسانێکی زۆرەوە هەیە.

ئەی دەستەی بەڕێزی دادگا!

بە چەند ماددەیەك منیان تۆمەتبار کردووە و دەست بەسەر کراوم:

ماددەی یەکەم:

هـەواڵی ئـەوە دراوە کـە لـە نیازدایـە لـە ڕێی بەکارهێنانی ئاینـەوە و، بـە مەبەسـتی گێڕانەوەی شەریعەت (کۆنەپەرستی!) ئاسایشی گشتی تێك بدرێت.

*وەڵام:*

یەکەم: "گریمان" شتێکە و، "ڕوودان"یش شتێکی ترە..

ئەوەتا هەموو یەکێك لە مرۆڤەکان گریمانی ئەوەی هەیە چەندین کەس بکوژێت.. جا ئایـا کەسێك دادگـایی دەکرێت بە تۆمـەتی ئـەوەی کـە "گریمـان"ی ئـەنجامدانی کـاری کوشتنی لـێ بکرێت؟!

هەروەها گریمانی ئەوە هەیە کە یەك چیلکـە شـقارتە مـاڵێکی تـەواوەتی بسـووتێنێت، جا ئایا لەسەر بناغەی ئەم "گریمان"ە شقارتەکان لەناو دەبرێن؟!

دووهەم: هەزار جـار حاشـا، خـوا نـەکات شتی وا ڕوو بـدات. چونکـە ئـەو زانسـتە ئیمانی‌یانـەی کـە ئێمـە سـەرقاڵین پێیانـەوە، ڕێ بـەوە نـادەن بۆ هیــچ شـتێکی جگـە لـە ڕەزامەندیی خوای گەورە بقۆزرێنەوە..

بەڵێ، ئەو ئیمانەی کە کلیلی نوورانی و خـاوێنی ژیـانی هەمیشـەیی و خـۆری ژیـانی ئەودنیایە، هەرگیز نابێتە ئامرازێك بە دەستی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسیی ئـەم دنیـاوە، وەکو ئەوەی کە خۆر نابێتە شوێن پێ هەڵگری مانگ.

بەڵێ، لەم گەردوونەدا هیچ بابەتێك نی‌یە لە بابەتی "نهێنیی ئیمان" گرنگتر بێت، کـە گەورەترین بابەتی گەردوون و مەزنترین نهێنی‌یە لە بەدیهێنانی جیهاندا، تا ئـەم مەسـەلەی "نهێنیی ئیمـان"ە لە پێناویدا بکرێتە ئامرازێك. حاشا هەرگیز شتی وا لە ئارادا نی‌یە!

ئەی دەستەی دادوەران!

باوەڕم پێ بکەن کاتێك کە دەڵێم:

"ئەگەر ئەم بەندکردنە ئازاربەخشەم تەنها پەیوەندیی بە خۆم و ژیانی دنیامەوە ببوایە، ئەوا درێژەم بە بێدەنگی دەدا، وەك ئەوەی کە دە ساڵە بێدەنگم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بەندکردنەم پەیوەندیی بە بەختەوەریی هەتاهەتایی گەلێ کەس و، بە پەیامەکانی نووریشەوە هەیە، کە مەتەڵی مەزنی بوونەوەران شی دەکەنەوە، ئەوا گەر جەستەم سەد سەری پێوە بێت و هەموو ڕۆژێك سەرێکم لێ جیا بکرێتەوە، هێشتا هەر واز لەم نهێنییە مەزنە ناهێنم! خۆ ئەگەر لە دەست ئێوە ڕزگارم ببێت، ئەوا لە چنگی ئەجەل ناتوانم دەرباز ببم".

من مرۆڤێکی بەتەمەن و لەسەر لێواری گۆڕم.

سەیری مەسەلەی "نهێنیی ئیمان" بکەن کە پەیوەستە بەو "ئەجەل" و "گۆڕە"ی هیچ کەسێك لە دەستیان دەربازی نابێت و، یەکێکە لە نێوان سەدان مەسەلەی ئەوتۆ کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو مەتەڵەی "پەیامەکانی نوور" شی‌یان دەکاتەوە، ئەو پەیامانەی کە بە وێنەی بینینی چاو ئەو ڕوونکردنەوە مەزنەی قورئانی حەکیم تەفسیر دەکات، کە لە خۆیدا نهێنی‌یەکانی گەردوونی خستووەتە ڕوو.

جێی سەرسووڕمانی منە! کەسێك باوەڕی بە ئەجەل و مردن هەبێت، ئایا بابەتە سیاسی‌یە مەزنەکانی دنیا لە پێش چاویدا لە ئەجەل و مردن گەورەتر دەردەکەون، هەتا بیانکات بە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی؟! لە کاتێکدا ئەو ئەجەلەی کە هەموو ساتێك گەردنەکان دەقرتێنێت، کاتەکەی نادیار و نەزانراوە؟!

خۆ "ئەجەل" یان ئیعدامی هەمیشەیی، یاخود پشوودان و بلیتی گەشت و گوزارە بۆ جیهانێکی جوانتر.. ئەو "گۆڕ"ەش کە هەرگیز داناخرێت، یان دەرگای چاڵێکە بۆ نەمان و تاریکایی هەمیشەیی، یاخود دەرگایەکی لەسەرپشتە بۆ دنیایەکی ڕووناکتر و هەتاهەتایی کە مانەوە لەوێ لەم دنیایە باشتر و خۆشترە.

پەیامەکانی نوور بەهۆی بەرەکەتی قورئان و بە پلەیەکی بێگومانی وەك ئەنجامی "دوو کەڕەتی دوو دەکاتە چوار" بە ئاشکرا ئەوە پێش چاو دەخەن کە چارەسەرێکی بێ گومان و دڵنیایی بەخش هەیە بۆ گۆڕینی ئەجەل لە "ئیعدامی هەمیشەیی"یەوە بۆ "بلیتی

ڕوخسەتنامە" و، گۆڕینی گۆڕیش لە "چاڵێکی بێ کۆتایی نەبوون"ەوە بۆ "دەرگایەکی بەهەشتەکان"..

باش بزانن کە ئەگەر دەسەڵاتی هەموو دنیام بدرێتێ، بێ هیچ دوودڵی‌یەك، لە پێناوی ئەم چارەسەرەدا بەختی دەکەم.

بەڵێ، ئەمە ئەو کارەیە کە هەموو مرۆڤێکی خاوەنی ژیری ئەنجامی دەدات.

بەڕێزان! چ ویژدانێك ڕێ بەوە دەدات کە بەو چاوە سەیری ئەو پەیامانەی نوور بکرێت، کە سەدان بابەتی ئیمانیی وەکو ئەمە ڕوون دەکەنەوە، بە چەند کتێبێکی ئامانجداری ئەوتۆ دابنرێن کە بۆ تەوژمە سیاسی‌یەکان بقۆزرێنەوە، وەك بڵێی چەند بڵاوکراوەیەکی خراپ و زیانبەخش بن؟ کە حاشا و سەد جار حاشا "پەیامەکانی نوور" دوورن لەو تێڕوانینە!

یان ئایا چ ژیری‌یەك بەوە ڕازی دەبێت و، چ یاسایەکیش ئەو بۆچوونە دەخوازێت؟

ئایا نەوەی نوێی ئایندە و خەڵکانی دواڕۆژ کە داهاتووی ڕاستەقینەیە.. هەروەها دادوەری شکۆمەندی دواڕۆژ.. هەمان ئەم پرسیارە لەو کەسانە ناکات کە بوونەتە هۆکاری ئەم ڕووداوە؟

بەڵێ، دەبێت کاربەدەستانی ئەم نەتەوەیەی کە بە سروشت ئایندارە لەم نیشتمانە پیرۆزەدا، لایەنی ئایین بگرن و لە ڕووی ئەرکی دەسەڵاتەوە هانی دینداری بدەن. خۆ ئەگەر ئەوان بە ناوی کۆماریێتیی عەلمانی و بنەماکانیەوە پارێزگاریی بێ لایەنی بکەن بەرامبەر بێ ئایینەکان و خراپەیان بەرامبەر نەنوێنن، ئەوا زۆر بەڵگەنەویستە کە نابێ بەهانە و بیانوو بدۆزنەوە بۆ ئەوەی خراپە بەرامبەر ئاینداران بکەن.

سێ‌هەم: وەك ڕێزنانێك بۆ خەباتم لە دژی ئینگلیز لەو نووسراوەمدا کە ناوی "شەش هەنگاوەکان"ە، سەرۆکەکانی ئەنقەرە پێش دوازدە ساڵ بانگهێشتیان کردم بۆ ئەوێ، منیش ڕۆشتم.. بەڵام هەست و نەستەکانی پیریم لەگەڵ ڕەفتار و بارودۆخی ئەواندا نەگونجا.

پێیان وتم: "کارمان لەگەڵدا بکە".

وتم: "سەعیدی نوێ دەیەوێت کار بۆ دواڕۆژ بکات و هاوکاریی ئێوە ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاری بەسەرتانەوە نی‌یە".

بەڵێ، من بەدواداچوونم بۆ کارەکانی ئەوان نەکرد، چ جای ئەوەی هاوبەشیی ئەوانە بکەم کە شوێن کارەکانی ئەوان دەکەون، یان مەیلم بە لایاندا هەبێت. تەنانەت خەمیشم بۆ خواردن، چونکە ئەو کردارە - بە داخەوە - بوو بە هۆی ئەوەی کە وریایی و زیرەکی‌یەکی سەرسوورهێنی سەربازی، کە دەکرا لە بەرژەوەندیی داب و نەریتەکانی نەتەوەی ئیسلامدا بەکار بهێنرایە، کەچی تا ڕادەیەك لە پێچەوانەی ئەم نەریتانەدا خرایەکار.

بەڵێ، لە سەرۆکەکانی ئەنقەرەدا، بە تایبەت لە خودی سەرۆك کۆماردا، زیرەکی‌یەکی سەرسەخت و گەورەم هەست پێ کرد. بۆیە وتم: نابێت ئەم زیرەکی‌یە لە دژی داب و نەریتەکان و لە ورووژاندنی گومان لەو داب و نەریتانەدا بخرێتەکار.

لەبەر ئەوە، هەوڵم دا بەپێی توانای خۆم لە دنیای ئەوان بکشێمەوە و، لە ڕاستیدا خۆم ئالوودەی ئەو دنیایە نەکرد. ئیتر وا ماوەی سیازدە ساڵە لە سیاسەت کشاومەتە دواوە و، بیست جەژنم بە گشتی - یەك دوو جەژن نەبێت - لەم غەریبی‌یەدا بە تاکەکەسی و بەندکراو لە ژوورەکەمدا بردەسەر، تاکو هیچ کەسێك گومانی ئەوەی بۆ دروست نەبێت کە من خەریکی سیاسەت بم.

ئەو بەڵگانەش کە نیشانەن لەسەر بەدوادانەچوونم بۆ کارەکانی حکوومەت و، حەز نەکردنم لە دەست تێوەردانیان، ئەمانەی خوارەوەیە:

بەڵگەی یەکەم: هاوڕێیانم لە گوندی "بارلا" کە ماوەی نۆ ساڵ تیایدا بووم، لە "ئیسپارتە"ش کە بۆ ماوەی نۆ مانگ تیایدا مامەوە، دەزانن کە سیازدە ساڵە ڕۆژنامەکانم نەخوێندووەتەوە کە زمانحاڵی سیاسەتن. تەنها ئەوە نەبێ کە لە دەمی دەستبەسەرکردنم لە ئیسپارتە و بە بێ حەز و ئارەزووی خۆم، ئەویش بۆ تەنها یەك جار، بڕگەی ڕۆژنامەنووسێکم بەرگوێ کەوت کە بە کارێکی دوور لە ویژدان و بە شێوەیەك کوفر دەربڕێت، هێرشی کردبووە سەر قوتابیانی پەیامەکانی نوور.

بەڵگەی دووهەم: لەو کاتەوە کە لە پارێزگای ئیسپارتەم و بە درێژایی سیازدە ساڵ، لە ناوەندی ئاڵوگۆڕە جیهانی‌یە زۆرەکاندا، هیچ نیشانەیەك لە ئێمەوە دەرنەکەوتووە کە بایەخمان بە سیاسەت دابێت.

بەڵگەی سێهەم: بریتی‌یە لە دان پێدانانی پارێزگا و فەرمانگەی پۆلیس بە نەبوونی هیچ شتێك لە کتێبەکانمدا کە بەدواداچوونی تێدا بێت بۆ سیاسەتی حکوومەت. دوای ئەوەی هەڵمەتیان بردووە بۆ شوێنی مانەوەم و، بە شێوەیەکی کتوپڕی و چاوەڕوان نەکراو پشکنینی ورد ئەنجام دراوە و، کتێبەکانم و زۆربەی ئەوراقە تایبەتی‌یەکانی منیان برد کە ماوەی دە ساڵە کۆبوونەتەوە.

ئایا جێی سەرسوورمان نی‌یە کە تایبەتی ترینی ئەوراقەکانی پیاوێکی وەك من کە نەك دە ساڵ، بەڵکو تەنها دە مانگ، بێ هیچ هۆیەك و بە ستەمێکی بێ بەزەییانە، دووچاری دوورخستنەوە و نامۆکردن و چاودێری و گوشاری ئازاربەخش بوو بێت، لانی کەم دە ماددەیان تێدا نەبێت کە خۆڵ بەسەروچاوی ستەمکاراندا بکات؟

*ئەگەر بوترێت*: بیست نامەی تۆمان دۆزی‌یەوە.

*دەڵێم*: ئایا دە نامە، یان بیست، یاخود سەد نامەش بە زۆر دەزانن کە لە ماوەی دە ساڵدا بۆ هاوڕێیان نووسرابێت؟ خۆ مادەم نامەگۆڕینەوە یاسایی بێت و، ئەو نامانەش بەدواداچوون بۆ دنیای ئێوە نەکات، ئەوا هیچ تاوانێك پێکناهێنێت، تەنانەت گەر هەزار نامەش بن.

بەڵگەی چوارەم: ئێوە دەبینن کە کتێبە دەست بەسەرداگیراوەکانم هەموویان پشتیان لە سیاسەت وەرچەرخاندووە و، بە هەموو هێزێکیان روویان لە ئیمان و قورئان و دوارۆژ کردووە. دووسێ پەیام نەبێت کە "سەعیدی کۆن" وازی لە بێدەنگی هێناوە و، لە بەرامبەر ئازاردانی چەند کەسێك لە کارمەندە ناپاکەکانەوە توورە بووە. ئیتر رەخنەی لەو کارمەندانە گرتووە کە کارمەندی‌یەکەیان بە خراپی بەکار دەهێنن، نەك لە حکوومەت. بۆیە لەو یەك دوو پەیامەدا سکاڵای لەو ستەمە دەربڕیوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەیامانەم بە "پەیامی تایبەتی" داناوە و، رو خسەتی بڵاوکردنەوەیانم نەداوە و، لە چەند کەسێکی هاوڕێیانم زیاتر تێپەڕیان نەکردووە.

حکوومەت بایەخ بە "کردار" دەدات و چاودێریی "رواڵەت" دەکات. هەرگیز مافی ئەوەی نی‌یە بڕوانێتە ناو "دڵ"ی خەڵك و کارە پەنهان و تایبەتەکان.

لەبەر ئەوە، هەموو مرۆڤێك دەتوانێت لەناو توێی دڵی خۆی و لەناو ماڵەکەیدا هەر کردارێك ئەنجام بدات و، دەتوانێت زەمی کاربەدەستان بکات و لێیان رازی نەبێت.

*بۆنموونە*: حەوت ساڵ پێش ئێستا و پێش دروستکردنی بانگی نوێ (واتە بە تورکـی) نامەیەکم لە بەرامبەر کۆمـەڵێك کارمـەندەوە نووسـی کـە خۆیـان لـەبارەی مێزەرەکـەی سەرم و خواپەرستیی تایبەتیی منەوە هەڵدەقورتاند، کـە بـەپێی مەزهـەبی شـافیعی‌یە. پاش ماوەیەك بانگ بە زمانی تورکی هاتە کایەوە. لەبـەر خۆمـەوە وتم: "ئـەو پەیامـە پـەیامێکی تایبەتی‌یە". ئیتر رێم لە بڵاوبوونەوەی گرت.

*نموونەیەکی تر*: کاتێك ئەنـدامی "دار الحكمة الاسلامية" بـووم، وەڵامێکـم لـەسـەر رەخنەیەك نووسی کە لە ئەوروپاوە دژی ئایەتی "پۆشتەیی" دەرکرابوو. هەر ئەو وەڵامـەم کە پێی دەوترێت "پـەیامی پۆشتەیی" پێش سـاڵێك نووسـی‌یەوە و لـە بەرهەمـە کۆنـەکانم دەرمـهێنا و، وەك بابـەتێك لـە بابەتـەکانی بریسـکەی حەڤدەهـەم دانـرا، پاشـان نـاوی بریسکەی بیست وچوارەمی لـێ نرا.

ئنجا ئەو "پەیامی پۆشتەیی"یەشم بە هەمان جۆر شاردەوە، تاکو خۆی لە قەرەی یاسـا تازەکان نەدات کە دواتر دەرچـوون. بـەڵام خۆیشـم نـازانم کـە چـۆن هەڵەیـەك رووی داوە و بۆ شوێنێك رەوانە کراوە.

هەر ئەم پەیامە بۆ خۆی وەڵامێکی زانستی و دەمکوتکەری رەخنەیەکی شارسـتانێتیی نوێ‌یە لـە ئایـەتێکی قورئـانی پیرۆز. خۆ ئـەم ئـازادیی زانسـتی‌یە نـابێت لـە سـەردەمی کۆماریدا کۆت و زنجیر بکرێت!

بەڵگەی پێنجەم: بریتی‌یە لەوەی کە ماوەی نۆ ساڵە بـە ویسـتی خـۆم گۆشـەگیریم لـە گوندێکـدا و خۆدامـاڵینم لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی هـەڵبژاردووە و، مـاوەی دە ساڵیشـە بـە هیـچ جۆرێـك سـەردانی فەرمانگـە رەسمی‌یـەکانم نـەکردووە و، ئەشـکەنجەی جۆراوجـۆرم چـەندین جـار وەك ئـەم جـارە هـەڵگرتووە، تـاکو خـۆم لـە کاروبـارە سیاسی‌یەکانی دنیاوە نەگلێنم. خۆ ئەگەر سەردانی ئـەو فەرمانگـە رەسمی‌یانـەم بکردایـە، وەك ئەوەی کەسانی تر کردیان، ئەوا لە بریی "بارلا" لە "ئەستەمبوڵ" دادەنیشتم.

لەوانەیە هۆکاری بە غەدر راگرتنی ئەم جارەم ئەوە بێت کە والیـی ئیسپارتە و چـەند کارمەندێکی حکومەت گومانیان سەبارەت بە من لای وەزارەتی ناوخۆ ورووژاندبێت، لـە داخـی ئـەوەی کـە بـە سـەرلێنەدانیان لووتبـەرزیی ئـەوانم شـکاندووە! ئیـتر لـە رق و دەستەوسانیی خۆیاندا دەنکە گەنمێکیان هێندەی گومەزێك بە گەورە پیشان داوە!

بە پوختی: هەموو ئەو هاورێیانەم کە لـە نزیکـەوە دەمناسـن، دەزانـن کـە تێکـەڵبوونی سیاسەت، یان خۆ پێدا هەڵواسـینی، تەنانـەت بیرلێکردنەوەشـی، دژی ئامـانجی بنـەڕەتیی من و، بارودۆخی دەروونیـم و، خزمەتە بێگەردە ئیمانیی‌یەکەمە.

من "نوور"م پێ بەخشراوە، نەك "گورز"ی سیاسەت.

یەکێك لـە حیکمـەتەکانی ئـەم حاڵەتـەم ئەوەیـە کـە لـەو بـاوەڕەدام خـوای گـەورە نەفرەت و بێزێکی سەبارەت بە سیاسەت لە دڵی مندا داناوە، تاکو زۆرێك لەو کەسانەی کە دێنـە نـاو ڕێبـازی ئـەم خزمەتـە و، ئەوانـەش کـە بـە تـەواوی تامـەزرۆی ڕاستیی‌یەکانی ئیمانن، بە دوودڵی یاخود بە چاوێکی کەم نەڕواننە ئەم ڕاستیی‌یانە و، بۆ ئـەوەش بـێ بـەش نەبن لێیان.

ماددەی دووهەم کە تۆمەتبارکردنی منی لەسەر بنیات نراوە:

ئـەو ئیمزایانەیـە کـە لـە کۆتـایی پـەیامی "موعجیزاتی ئەحمـەدی" و پـەیامی "مانـەوەی گیـان و حەشـری مـەزن"ەوە دەبینرێن.. وەك ئـەوەی پێیـان وابێـت کـە ئەوانـە ئیمـزای ئەندامانی "کۆمەڵە"یەك، یاخود هی دەروێشانی "تەریقەت"ێك بێت!

وەڵام:

من بەوپەڕی توانا و هێزی خۆمەوە دڵنیاتان دەکەمەوە کە خاوەنی ئەو ئیمزایانـە هیـچ گوناهێکیان لەم کارەدا نیی‌یە، ئەگەر هەشبێت ئەوا گوناهی منە.

ئایا کەسێك بۆ "یادگاری" ئیمزایەك بکات سەبارەت بەوەی کەرامەتێکی پێ جـوان بووبێت کە بە چاوی خۆی لە باسی "موعجیزاتی ئەحمـەدی"دا بینیبێتـی و، ئـەو تەوافوقـە سەرسووڕهێنەشی زانیبێت کە لە پیتەکانی "ئەلف"ی وتەی "بیسـت و نۆهـەم"دان، وەك ئیمزایەکی غەیبی لەسەر حـەقبوونی ئـەو وتەیـە.. یـان مرۆڤێـك سـەردانی کـردبێ، کـە بـە دەگمەن دەتوانێت سەردانم بکات..

ئایا ئەو کارە هیچ گوناهێك پێکدەهێنێت؟

ئایا ئەو ئیمزایانەی کە لە دەفتەری یادگاریی میوانخانەکاندان، یان ئەو ناوانەی کە لە دەفتەری بەقاڵەکاندا دەنووسرێن، بە هی "کۆمەڵـە"یـەك نـاودەبرێن؟ ئایـا هیـچ کەسێکی ژیر لەو باوەڕەدا دەبێت خاوەنی ئـەم ئیمزایانـەی کـە ئیمزاکانیـان وەك تابلۆیـەك مـاوەی

سێ چوار ساڵ لە ژوورەکەم لە گوندی بارلادا هەڵواسرابوون و، دەگونجا بکەوێتە دەستی هەر کەسێك بیەوێت، بە ئەندامانی کۆمەڵەیەکی نهێنی دابنرێن؟

زۆربەی خاوەن ئیمزاکان میوانەکانمن کە سەردانیان کردووم. ئەوانیش کەسی وایان لە برایانی ئاخیرەتم تێدایە کە هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەتەوە نییە.

کەواتە بەم ئەندازە زۆرە ئازاری ئێمەی خاوەن ئیمزاکان مەدەن، چونکە یەکێك لەو برایانەمان کە لەوپەڕی پاکی و ڕاستڕەویدا بوو، کە موقەددەمی خانەنشین خوالێخۆشبوو کاك "عاصم"ە، لە فەرمانگەی لێپرسینەوەی ئیسپارتە کاتێ لێپرسینەوەی لێ کرا، زانیی ئەگەر ڕاستی بڵێت زیانێك بە مامۆستاکەی دەگات و، گەر درۆش بکات ئەوا کۆڵێکی قورس دەکەوێتە سەر شەرەفی ماوەی دووردرێژی سەربازیی خۆی، کە بە پاکی و ڕاستڕەوی بەسەری بردووە..

بۆیە لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە:

"ئەی پەروەردگارم! گیانم بکێشە".

خوای گەورەش دوعاکەی قبووڵ کرد و، هەر لەو سەعاتەدا گیانی کێشا و، بەو مردنەشی بوو بە شەهیدی ڕاستڕەوی و، قوربانیی ئەو هەڵە چەپەڵەی کەسێك کە گومانی هەڵەی بردووە بە هاوکارییەك کە لەسەر خێرە و، تەسدیقێك کە هیچ یاسایەکی دنیا بە گوناهی دانانێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی تەنها یەك وانەی لە پەیامەکانی نوور وەرگرتبێت، وەکو ئاسانیی خواردنەوەی ئاو، شەربەتی "ئەجەل"یش نۆش دەکات، کە بە پسووڵەی ڕوخسەتنامەی دادەنێت!

خۆ ئەگەر من بیرم لە ئازارچەشتنی ئەو برایانەم نەکردایەتەوە کە دوای من لە دنیادا دەمێننەوە، ئەوا منیش وەکو کاك عاصمی برای بەغیرەتم دەپاڕامەوە:

"ئەی پەروەردگار! گیانم بکێشە"!

ماددەی سێهەم کە هۆی تۆمەتبارکردنە:

ئەوەیە کە پەیامەکانی نوور لە داهاتوودا دەبنە بەربەستێك لە بەردەم بنەمای ئازادیی حکوومەت، هەروەك ئاسایشی گشتی تێکدەدەن، بەهۆی ئەوەی کە بە بێ هیچ ڕوخسەتێکی حکوومەت بڵاو دەبنەوە و، هەست و نەستی ئیمانی بەهێز دەکەن.

وەڵام:

یەکەم: پەیامەکانی نوور "نوور"ن. هیچ زیانێکیش لە نوورەوە سەرهەڵنادات. ئەم پەیامانە ماوەی سیازدە ساڵە گورزی سیاسەتیان بەلا ناوە و ڕاستییە خاوێنەکان دادەمەزرێنن، کە بناغەی هەردوو ژیانی دنیا و قیامەتی ئەم گەل و نیشتمانەن.

هەموو ئەو کەسانە دەگرم بە شایەت کە بەشەکانی ئەم پەیامانەیان خوێندووەتەوە، لەسەر سوودی بێ زیانی پەیامەکان بۆ لەسەدا نەوەد و نۆی ئەم میللەتە پیرۆزە. دەبا کەسێك بێت لافی ئەوە لێ بدات کە زیانێکی لەو پەیامانەدا بینیوە.

دووهەم: من خاوەنی چاپخانە نیم و، نووسەرەوەی زۆریشم لەلا نییە و، بە زەحمەتیش یەك کەسی نووسەرەوەم دەست دەکەوێت کە پەیامەکانم بۆ بنووسێتەوە. خۆیشم خەتم خۆش نییە و نیوە نەخوێندەوارم، بەو خەتە ناخۆش و ناتەواوەی خۆم ناتوانم لاپەڕەیەك زیاتر بە یەك سەعات بنووسم.

چەند کەسێکی بەڕێزی وەك خوالێخۆشبوو "کاك عاصم" بە خەتە جوانەکەیان یاداشتە یەکجار خەمناکەکانی منیان لە غەریبیمدا وەك یادگارییەك بۆ نووسیمەوە. پاشان کەسانی تر کە دەرمانی شیفابەخشیان بۆ دەردەکانی خۆیان لەو یاداشتانەدا بینی، داوایان کرد ئەو نوورە ئیمانییانە بخوێننەوە. ئیتر کە خوێندیانەوە بەوپەڕی دڵنیایی بینییان دەرمانێکی شیفابەخشن بۆ ژیانی هەمیشەییان. بۆیە نوسخەیان لەبەر گرتەوە بۆ خۆیان.

جا ئایا هیچ یاسایەك هەیە ڕێ لەمە بگرێت؟

پەیامی "پێڕست" کە کەوتە بەردەستی ئێوە و خرایە ژێر چاوی پشکنین، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەریەك لە بەشەکانی پەیامەکانی نوور تەفسیری ڕاستییەکی ئایەتێکی قورئان دەکات. بە تایبەت ئەو ئایەتانەی کە پەیوەندییان بە پایەکانی ئیمانەوە هەیە. ئەوەتا هێندە بە ڕوونی ئەو ئایەتانە تەفسیر دەکەن کە پلانی هێرش لەسەر قورئان تێکدەدات و بناغەکانی هەڵدەوەشێنێت، کە ماوەی هەزار ساڵە فەیلەسووفەکانی خۆرئاوا ئامادەیان کردووە.

ئومێدی یازدەهەمی "پەیامی پیران" کە ئێستا لە بەردەستی خۆتاندایە، تەنها یەك بەڵگەی لەخۆ گرتووە لە نێوان هەزاران بەڵگەی "ئیمان" و "تەوحید"دا.

فەرموون وەك نموونەیەك بیخوێننەوە و بە وردی سەیری بکەن، ئەو کاتە تێدەگەن کـە داواکەم ڕاستە یان هەڵەیە.

هەروەها وەك نموونەیەك بۆ ڕادەی سوودی ئەم پەیامانە بۆ گەل و نیشـتمان، پێـم وایـە هەرکەسێك بە چاوی ویژدانـەوە سـەیری پـەیامی "ئیقتیسـاد" بکـات، کـە لـە بەشـەکانی پەیامەکانی نوورە.. هەروەها ئەو پەیامەی کە بیست و پێنج دەرمانی بۆ "بیمـاران" لـەخۆ گرتووە، لەوانەی کە لە سەرچاوەی ئیمانـەوە هـەڵقوڵاون.. هـەروەها ئـەو پەیامـەش کـە بیست و شەش ئومێد و دڵدانەوەی لە سەرچاوەی ئیمانەوە بـۆ "پیران" لـەخۆ گرتـووە.. بێ هیچ گومانێك گەنجینـەی سـامانێکی ئەوپـەڕی بـەنرخ و، دەرمـانێکی شیفابەخش و، ڕووناکی‌یەکی بەسوودی بۆ دەستەی هەژاران و بیماران و پیران تێدا دەبینێت کە پـڕ لـە نیوەی ئەم گەلە پیرۆزە پێکدەهێنن.

پاشان بۆ یارمەتیدانتان لە ئەرکی لێکۆڵینەوەدا، دەڵێم:

پـەیامی "پێڕسـت" پێڕستێکە بـۆ بەشێك لـەو پەیامانـەی کـە تەمـەنیان بیسـت سـاڵە. بناغەی هەندێك لەو پەیامانەش لە سەردەمی "دار الحکمـــة الاســـلامیة"وە دەسـت پـێ دەکات. هەروەها ئەو ژمارانەش کە لە "پێڕست"دا دەیانبینن بـە پێـی ڕیزبـەندیی دانانیـان نی‌یە، بۆ نموونە وتەی "بیست و دووهەم" لە پێش "وتەی یەکەم" و، "مەکتووبی بیسـت و دووهەم"یش لە پێش "مەکتووبی یەکەم" دانراون. نموونەی زۆری تری وەك ئەمانە هەن.

سـێهەم: بەشـەکانی پەیامەکانی نـوور کـە جگـە لـە چـەند زانستێکی ئیمـانی هیـچ شتێکی تر نـین، بناغـەی ڕێسـا و ئاسـایش دادەمـەزرێنن. چونکـە ئـەو ئیمانـەی کـە سەرچاوەی هـەموو ڕەوشتە بـەرز و جوانەکانـە، هـەرگیز ئاسـایش تێـك نـادات، بـەڵکو دەیهێنێتەدی و دابینی دەکات. ئەوەی کە ئاسـایش تێکـدەدات تەنـها کەسـی بـێ ئیمانـە، بەهۆی ڕەوشت و خوی خراپیەوە.

ئەوەش بزانن کە پێش نزیکەی سی ساڵ وەزیری موستەعمەراتی بەریتانی وتی:

"ئێمـە نـاتوانین بـە ڕاسـتی حوکمـی موسـڵمانەکان بکـەین هـەتا ئـەم قورئانـەیان لـە بەردەستدا بێت.. دەبێت هەوڵی لابردن و نەهێشتنی بدەین".

قسەی ئەم کافرە سەرسەختە، ماوەی سی ساڵە سەرنجی منی بەلای فەیلەسـووفەکانی ئەورووپادا وەرچەرخاندووە.

ئەوەتا لە دوای جیهادی دەروونی خۆم، جیهادم ئاراستەی ئەوان کردووە و، ئاوڕ نادەمەوە بۆ ئەو شتانەی کە لە ناوخۆدان. چونکە پێم وایە ناتەواوی و قسووری ناوخۆ ئەنجامی لە ڕێ لادان و فەساد بڵاوکردنەوەی ئەورووپایە.

لەبەر ئەوە، لە فەیلەسووفەکانی ئەورووپا تووڕە دەبم و، زللەی تەمێ کردنیان تێدەسرەوێنم.

سوپاس بۆ خوا! پەیامەکانی نوور ئاواتەکانی ئەو کافرە سەرسەختانەی تەفروتوونا کرد، وەك ئەوەی فەیلەسووفە ماددی‌یە سروشتی‌یەکانیشی بە تەواوی دەمکوت و بێدەنگ کرد.

لە هەموو دنیادا حکوومەتێك نی‌یە - لەسەر هەر شکڵ و شێوەیەك بێت - ڕێ لە داهاتێکی پیرۆزی نیشتمانەکەی و، پەیامێکی مەزنی ورە و هێزی مەعنەویی نیشتمان بە وێنەی "پەیامەکانی نوور" بگرێت و، بڵاوکەرەوەی چەشنی ئەم پەیامانە بە تاوانبار دابنێت.

ئەو ئازادی‌یەی کە ڕاهیبەکانی ئەورووپا تیایدا دەژین، پیشانمان دەدات کە هیچ یاسایەك نی‌یە بەدواداچوون بۆ ئەو کەسانە بکات وازیان لە دنیا هێناوە و، بە هەموو هێزێکی خۆیان کار بۆ دواڕۆژ و ئیمان دەکەن.

*بە پوختی:*

بە دڵنیاییەوە دەڵێم: لە دنیادا هیچ یاسایەك ڕێگر نی‌یە، یاخود ناتوانێت ڕێگر بێت لە نووسینی چەند سەرنجێك کە تایبەت بن بەو ئیمانەی کلیلی بەختەوەریی هەمیشەییە، لە لایەن مرۆڤێکی پیرەوە کە ماوەی دە ساڵ بڕیاری دوورخستنەوەی لە غەریبیدا لەسەر درابێت و، ڕێی تێکەڵاوی و نامەگۆڕینەوەشی لەگەڵ خەڵکیدا لێ گیرابێت.

نەگرتنی ڕەخنە لە لایەن هیچ زانایەکەوە لەم نووسین و تێبینی‌یانە، دەیسەلمێنێت کە جگە لە "حەق و ڕاستی" شتێکی تر نی‌یە.

**ماددەی چوارەم بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکاری تۆمەتبارکردن و دەستبەسەرکردنم:**

ئەوەیە کە چەند هەواڵێك دراوە سەبارەت بەوەی من وانەی "تەریقەت" دەڵێمەوە، لە کاتێکدا کە دەوڵەت قەدەغەی کردووە.

وەڵام:

یەکەم: کتێبەکانم کە لە بەردەستتاندایە، هەموویان شایەتی دەدەن کە من سەرقاڵی "ڕاستییەکانی ئیمان"م. چەندین جاریش لە پەیامەکانمدا نووسیومە کە:

"ئەم زەمانە هی تەریقەت نییە، بەڵکو ڕۆژگاری ڕزگارکردنی ئیمانە. زۆر کەس هەن بە بێ تەریقەت دەڕۆنە بەهەشتەوە، بەڵام هیچ کەسێك بە بێ ئیمان ناڕواتە ناوی. کەواتە پێویستە کار بۆ ئیمان بکرێت".

دووهەم: ماوەی دە ساڵە من لە پارێزگای ئیسپارتەدام.. با کەسێك بێت بیسەلمێنێت کە فێری وانەیەکم کردووە لە تەریقەتدا!

بەڵێ، لەو ڕووەوە کە من زانام، چەند وانەیەکم لە زانستەکانی ئیمان و ڕاستییە بڵندەکان بە چەند کەسێکی تایبەتمەند لە برایانی ئاخیرەتم وتووەتەوە. خۆ ئەمەش فێرکردنی "تەریقەت" نییە، بەڵکو وانە وتنەوەی "حەقیقەت"ە.

پاشان شتێکی تر هەیە ئاگادارتان دەکەمەوە لێی:

من شافیعی مەزهەبم و، تەسبیحاتی دوای نوێژ لەم مەزهەبەدا کەمێك جیاوازە لە تەسبیحات کردنی حەنەفی مەزهەبەکان. هەروەها لە کاتی تەنیاییمدا بۆ گوناهە زۆرەکانم داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم و، خەریکی خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەبم و، بە زیکرەکانی وەك ئەمانەوە سەرقاڵ دەبم. لەم کاتانەدا لە دوای نوێژی مەغریبەوە هەتا نوێژی عیشا و، پێش نوێژی بەیانیش، پێشوازی لە هیچ کەسێك ناکەم.

پێم وایە هیچ یاسایەك نییە لەم دنیایەدا ڕێ لەم حاڵە بگرێت.

بەهۆی ئەم مەسەلەی "تەریقەت"ەوە، کارمەندی حکوومەت و دادگا لێم دەپرسن: "بە چی دەژییت"؟

وەڵام: ئەو هاوەڵانەم کە پەیوەندییان پێمەوە هەیە، هەروەها بە بینینی پێش چاوی خەڵکی "بارلا"ش کە نۆ ساڵە تیایدام، دەزانن کە من زۆربەی ڕۆژەکانم هەر ڕۆژەی بە چل "پارە" یان لەوەش کەمتر دەژیم. ئەوەش بە بەرەکەتی دەست پێوەگرتنی لە ڕادە بەدەر و، بەهۆی گەنجینەی قەناعەتی تەواوەتییەوە. تەنانەت لە ماوەی حەوت ساڵدا بۆ پێداویستییەکانی وەك پۆشاك و پێڵاو تەنها حەوت لیرەی وەرەقی سەرروزیادم بووە!

پاشان هەموو ئەو هاوڕێیانەم کە خزمەتم دەکەن و، بە شایەتیی مێژووی ژیانم کە لە بەردەستی ئێوەدایە، لە هەموو تەمەنمدا دەستم بۆ وەرگرتنی دیاری و خێری کەس ڕانەکێشاوە و، بە وەرنەگرتنی دیارییەکانیان هەست و سۆزی ڕاستترین هاوڕێی خۆمم زامدار کردووە. خۆ ئەگەر ناچار بوو بێتم دیارییەك وەربگرم، بەو مەرجە وەرم گرتووە کە لە بەرامبەریەوە بایی ئەوەی خۆی شت بدەمەوە بەو کەسە.

زۆربەی مووچەکانم کە لە "دار الحكمة الاسلامية" وەرم دەگرت، لە چاپی ئەو کتێبانەمدا خەرجم کردن کە ئەو کاتە دامنابوون. بەشێکی کەمیشم بە نیازی "حەج" پاشەکەوت کردبوو..

جا ئەو پارە کەمانە، بەهۆی پیت و بەرەکەتی دەست پێوەگرتن و قەناعەتەوە، ماوەی دە ساڵ بەشیان کردم و ئاوی ڕوومی پاراست. ئێستاش پاشماوەیەکی ئەو سامانە پیرۆزەم لەلا ماوە.

ئەی دەستەی دادوەران!

نابێت لە بیستنی ئەم ئیفادە دوور و درێژەم بێزار ببن، چونکە نزیکەی سی کتێب خراونەتە ناو ئەوراقی یاداشتنامەی گرتنمان. جا ئەم ئیفادە دوور و درێژە، لەچاو ئەوراقی تۆمەتبارکردنمدا، هەر زۆر بە کورت و کەم دادەنرێت.

من بەهۆی دابڕانم بۆ ماوەی سیازدە ساڵ لە سیاسەتی دنیا، شارەزای یاساکان نیم. مێژووی ژیانیشم شایەتە لەسەر ئەوەی کە لە دەمی بەرگری کردنمدا، خۆم لە فێڵ و هەڵخەڵەتاندنی بەرامبەر بەرز ڕاگرتووە. کەواتە ڕاستیی حاڵ چۆنە، هەر بەو جۆرەش ڕوونم کردووەتەوە.

ئیتر خۆتان و ویژدانتان!

دەشزانن چۆن یاسا جێبەجێ دەکرێت بە بێ غەدر و ناحەقی.. فەرموون بەو پێیە بڕیاری خۆتان لەبارەی منەوە بدەن.

ئەوەش بزانن کە هەندێ کارمەندی ناشی بە چاویلکەی گەورەکەرەوە سەبارەت بە من ڕوانیویانە و، دەنکە دانەوێڵەیەکیان بە قەدەر گومەزێك لێ کردووە لە ناوەندی چەند گەمەیەکدا، بە مەبەستی ئامادەکردنی زەمینەی گونجاو بۆ جێبەجێ کردنی یاسا تازەکانی ئازادی.. ئەوەش بەهۆی ناشایستەییان، یان وەهم و گومانیان، یان بە وێنەی

پێش چاوخستنی بیانووی گورگ بۆ بەرخ، یاخود لە پێناوی بەدەستهێنانی پلەوپایە، یان مەرایی خۆبردنەپێشەوە لە لای حکوومەت..

ئیتر بەو پێیە ئەوەندە زیانیان بە ئێمە گەیاند کە دەگاتە بایی هەزاران لیرە. ئومێدمان وایە بە ئێوە کە بە توانا و لێهاتوویی خۆتان بزانن ئەو شتەی کە ئەو کارمەندانە پێیان وابووە گومەزێکە، بە چاوی خۆتان ببینن کە هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەکە. واتە دووربینە گەورەکەرەوەکان هەڵبگێڕنەوە و بە دیوەکەی تری بڕوانن.

پاشان تکایەکم هەیە:

نرخی ئەو کتێبانەم کە دەستیان بە سەردا گیراوە، لە لای من لە هەزار لیرە زیاترە. تکایە بیانگێڕنەوە بۆم.

بەڕێوەبەری کتێبخانەی ئەنقەرە، بە ڕێز و سوپاسەوە لە ڕۆژنامەکاندا ڕایگەیاند کە پێش دوازدە ساڵ بەشێکی ئەو کتێبانەی لە کتێبخانەکەیدا وەرگرتووە.

دەمەوێت بە ڕەزامەندیی ئەم دەستەیەی ئێوە کە ئێستا بڕیار لە ژیانی من دەدات، وێنەیەکی ئەم ئیفادەیەم بدەن بە داواکاری گشتی، تاکو داوا لەسەر ئەو کەسانە تۆمار بکات کە بوون بە هۆی ئەوەی ئازار و زیانم پێ بگات. هەروەها وێنەیەك بۆ وەزارەتی ناوخۆ و، وێنەیەکیش بۆ ئەنجومەنی پەرلەمان.

## بۆ پێش چاوی لێکۆڵەری بەڕێز و دەستەی دادوەر

سێ ماددە دەخەمە سەر ئیفادەکەی پێشووم:

ماددەی یەکەم:

ئەو شتەی کە زۆر دەمانخاتە سەرسامی و سەرسووڕمانەوە و، وامان لێ دەکات هەست بە بوونی فێڵێك بکەین لە بابەتی بەدەستهێنانی هۆکارێکی تاوانبار کردن لە نەبوونی هیچ تاوانێکەوە، ئەو پرسیارەیانە کە بە جەختەوە دەیکەن و، ئاماژە دەکات بۆ بوونی کۆمەڵە و ڕێکخستنێك کە گوایا لە ڕاستیدا هەبێت، ئەوەیە دەڵێن:

سامانتان لە کوێ بوو بۆ دامەزراندنی ئەم ڕێکخستنە؟

وەڵام:

یەکەم: من لەو پرسیارکەرانە دەپرسم:

ئایا بەڵگەنامەیەك، یاخود نیشانەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵەیەکی سیاسیمان دامەزراندبێت؟

ئایا بەڵگەیەکیان بە دەستەوەیە لەسەر ئەوەی کە ڕێکخستنێکمان بە پارە و سامان پێکهێنابێت، تاکو ئەوان هەتا ئەم ڕادەیە سوور بن لەسەر ئەم پرسیارە؟

من ماوەی دە ساڵە لە پارێزگای ئیسپارتە لە ژێر چاودێری‌یەکی توندوتیژدام. تەنها منیش نیم کە ڕقی لە درۆ هەڵبەستنی ئەوانە بێت کە پیاوێك تۆمەتبار دەکەن لە ماوەی دە ڕۆژدا مەگەر کەسێك یان چەند کەسێکی خزمەتگوزار یان یەك دوو میوان دەبینێت و، بە تەنیایی و بێزاری لە دنیا دەژی و، بە یەکجاری سیاسەتی لە پێش چاودا بێزراوە و، بە چاوی خۆیشی ئەو زیان و نەزۆکی‌یە دووپات بووە دەبینێت کە کۆمەڵە سیاسی‌یە نەیارە بەهێزەکان بەدەستیان هێنا لە ئەنجامی کار و کاردانەوەکان.

ئنجا ئەو کەسە، لە گرنگترین هەلی گونجاودا، لەناو گەلی خۆی و هەزاران خۆشەویستیدا دەستی بە ڕووی کۆمەڵەکان و جموجوولە سیاسی‌یەکانەوە نا و، بەشداریی لەگەڵدا نەکردن و، وەك کەسێك لە شەیتان هەڵبێت ئاوا پشتی لە سیاسەت هەڵکرد، چونکە پێی وایە "ئیمانی تەحقیقی" خزمەتێکی هێندە خاوێنە کە نابێت بە هیچ شتێك بڕووشێنرێت و، لاوازکردنی ئەو خزمەتەش بە ئامانجی سیاسی بە تاوان دادەنێت و، ماوەی دە ساڵیشە "أعوذ بالله من الشيطان و السياسة"ی کردووە بە دەستووری خۆی و، پێی وایە فێڵ لەوەدایە کە واز لە فێڵ بهێنرێت و، کەسێکی هێندە تووڕە تەبیعەتە کە بێ حساب کردن بۆ هیچ شتێك نهێنی‌یەکانی خۆی دەدرکێنێت..

درۆ ئەوەیە کە پێی وابێت "ئەم کەسە" توانیبێتی ماوەی دە ساڵ ئەم چەشنە کۆمەڵەیە لە کارمەندانی هەستیار و وردەکاری پارێزگای ئیسپارتە بشارێتەوە!

خۆ هەر کەسێك بەم پیاوە بڵێت: "کۆمەڵەیەکی وەك ئەمەت هەیە و چەرخی فێڵێکی سیاسی هەڵدەسووڕێنیت"، تەنها بە ڕق و تووڕەیی نەبێت بە هیچ شتێکی تر بەرەو ڕووی نابێتەوە. تەنانەت هەموو خەڵکی پارێزگای ئیسپارتە و هەموو ئەوانەش کە دەمناسن،

هاوبەشیم دەکەن لەم ڕق و تووڕەییەدا. لەوانەیە هەموو کەسێکی خاوەن ژیری و ویژدانیش. بۆیە تێکڕا دەڵێن: "ئێوە بە درۆ و ناحەقی تۆمەتباری دەکەن".

دووهەم: کێشەکەمان کێشەی "ئیمان"ە و، پەیوەندیی برایەتیی ئیمانیمان لەگەڵ لە سەدا نەوەد و نۆی خەڵکی ئەم وڵاتە و پارێزگای ئیسپارتەدا هەیە. کەچی "کۆمەڵە" بریتی‌یە لە یەکگرتنی کەمایەتی لە نێوان زۆرینەدا. کەواتە هەرگیز لە کۆمەڵەیەکدا نەوەد و نۆ کەس لە بەرامبەر یەك کەسەوە ڕێکخستن پێکناهێنن. خۆ ئەگەر کەسێك ئەو بۆچوونە بڵاو بکاتەوە، ئەوا بە نیازی سووکایەتی کردن بڵاوی دەکاتەوە بەم گەلە پیرۆزە ئایینداره و، کاری کەسێکە لە ئایین و ویژدان بێ بەش بێت و، لەو گومانە هەڵەیەدا بێت - کە حاشا وا نی‌یە - هەموان وەك خۆی بێ ئایین بن!

سێ‌هەم: پیاوێکی وەك من کە بە گەرموگوڕی گەلی تورکی خۆش ویستبێت و، لەو ڕووەوە کە ئەو گەلە ستایشی قورئانی بەدەست هێناوە، بە زۆری ڕێزی لێ نابێت و، بە هەموو هێزێکی پشتی ئەم نەتەوەیەی گرتبێت، لەبەر ئەوەی ئاڵای قورئانی هەڵگرتووە.. بە کرداریش هێندەی هەزار "نەتەوە پەرست"ی تورك و بە شایەتیی هەزار کەسی تورك خزمەتی بە گەلی تورك کردبێت و، ئەم نامۆییەی هەڵبژاردبێت و، فەزلی سی چل لاوی باشی تورکی دابێت بەسەر سی هەزار کەسی نوێژنەکەر لە خەڵکی شارەکەی خۆیدا.. هەروەها بەو کەرامەت و ڕێزەی کە هی زانایانە پارێزگاریی لە بەرزیی زانست کردبێت و، بە ڕووناکترین شێوە وانەی ڕاستی‌یەکانی ئیمانی وتبێتەوە..

ئایا کەسێکی وا.. ئێوە بە زۆری دەزانن، یان پێتان وایە زیانێك لەوەدا هەبێت کە چەند برایەکی قیامەتی و قوتابیی هەبێت کە لە ماوەی نەك دە ساڵ بەڵکو بیست ساڵ و سی ساڵدا و، ژمارەیان نەك بیست و سی، بەڵکو گەر سەد دانە و هەزار دانەش بێت، کە بەوپەڕی دڵسۆزی و ئیخلاس و تەنها لە ڕێی ئیمان و حەقیقەت و ئاخیرەتدا پەیوەندییان لەگەڵدا کردبێت..

ئایا خەڵکانی بە ویژدان بە کارێکی ڕەوای دەزانن کە ئەوانە بە چاوی سووك یان بە کۆمەڵەیەکی سیاسی سەیر بکرێن؟

چوارەم: کەسانی بەویژدان دەزانن قسەی ئەوانە چەندە دوورە لە ویژدانەوە کە دەڵێن:

"ئەو پارە و سامانەت لە کوێ بوو کە پێی بژیت و کۆمەڵەیەکی پێ دابمەزرێنیت"؟ ئەمەش سەبارەت بە پیاوێك دەڵێن کە لە ماوەی دە ساڵدا تەنها بە سەد لیرەی وەرەقی ژیانی بەڕێ کردبێت و، هەندێ جاریش تەنها چل پارە خەرجیی ڕۆژانەی بێت و، ماوەی حەوت ساڵیش عەبایەکی پۆشی بێت کە حەفتا پینەی پێوە بێت!

ماددەی دووهەم:

منیان بە زەبر و زۆر لە "بارلا"وە کێش کرد بۆ "ئیسپارتە" بە سازدانی هاوشێوەیەکی ساختەی ڕووداوی "مەنمەن". هەروەها تۆقاندنی گەل و خەڵەتاندنی حکوومەت بە فێڵی ئاسانکاریی جێبەجێ کردنی یاساکانی ئازادی، بەو گومانە فێڵ ئامێزەی کە گوایا ئەم کارەیان یارمەتی دەدات بۆ جێبەجێ کردنی یاساکانی ئازادیی حکوومەت!

بەڵام سەرنجیان دا من کەسێك نیم کە بکرێم بە ئامرازێك و بەکار بهێنرێم بۆ ئەم چەشنە ئاشووبانە و، زانییان مەیلم بە لای هیچ هەوڵێکی نەزۆکدا نییە کە زیان بە نیشتمان و نەتەوە و ئایین بگەیەنێت.. کاتێك لەمە تێگەیشتن، نەخشەکەیان گۆڕی و، سوودیان لە ناوبانگە درۆینەکەم وەرگرت کە پێم خۆش نییە و بە لامەوە باش نییە. ئیتر هاوشێوەیەکی وەهمیی ڕووداوە ناحەقەکەیان بە بەر پۆشیم کە ناسراوە بە ڕووداوی "مەنمەن" لە ڕێی چەند پیلانێکەوە کە هەرگیز بە خەیاڵماندا نایەت.

ئیتر بەم جۆرە گەلێ زیانی گەورەیان بە نەتەوە و، حکوومەت و، چەندین کەسی بێ تاوانی دەستگیرکراوی ئەم گەلە، گەیاند.

دوای ئەوەی کە درۆکەیان ئاشکرا بوو، ئێستا هەوڵی دروست کردنی چەند بروبیانوویەك دەدەن، بە وێنەی هەڵبەستنی بەهانە و بیانووی گورگ بۆ ڕاوکردنی بەرخەکان، بە نیازی خەڵەتاندنی کارمەندانی داد.

من لە لایەنی خۆمەوە ئەوە دەخەمەوە یادی کارمەندانی داد کە پێویستە لە ڕووی مافە شارستانییەکانمەوە زۆر وریا و بێدار بن.

ئەوانەی کە بەهانە و بیانوو هەڵدەبەستن، دەبێت هەر ئەوان تۆمەتبار بکرێن. چونکە بە سازدانی ڕووداوێکی بچووك لە ڕێی وورووژاندنی لاوازە بێ تاوان و خۆش باوەڕەکانەوە و، لە ژێر دەمامکی ئیدیعای بوونی کۆمەڵەیەکی وەهمی و، بە بوختان و

درۆ، خۆیان لە هەندێك پایەکانی حکومەت دەبەنە پێشەوە. ئنجا بە وێنەی شەیتان حکومەت هەڵدەخەڵەتێنن و، دەنکە دانەوێڵەیەك هێندەی گومەزێك پیشان دەدەن و، دەبنە هۆی هاڕین و پێشێل کردنی گەلێ کەسی بێ تاوان و، زیانێکی زۆر بە وڵات دەگەیەنن و، کۆڵی تاوانی خۆیان دەخەنە ئەستۆی کەسانی تر.

کێشەکەی ئێمە بە تەواوی لەم جۆرەیە.

**ماددەی سێهەم:**

بێ گومان دادگاکان زۆر زیاتر لە هەموو فەرمانگەکانی دەوڵەت ئەرکی پاراستنی ئازادیی خۆی بەوپەڕی توانا لە ئەستۆدایە و، دەبێت هەتا دەتوانێت ئازاد بێت لە کاریگەرییە دەرەکییەکان و، بێ لایەنیی خۆی ڕابگرێت و، تا لە توانایدایە دوور لە هەست و نەست و ئارەزووەکانەوە بڕوانێت.

جا بە پشت بەستن بە ئازادیی تەواوەتیی دادگاکان، بە مافی خۆمی دەزانم کە بەم شێوە ئازادانە بەرگری لە مافەکانی ئازادیی خۆم بکەم.

بەڵێ، هەموو دادگاکان کۆمەڵێك کێشەیان تێدا هەیە سەبارەت بە ماڵ و سامان و گیانەکان. خۆ ئەگەر لەبەر هۆیەك دادوەرێك تووڕە ببێت و قاتڵێك بکوژێت، ئەوا دادوەرەکەش بە قاتڵ دادەنرێت. کەواتە ئەگەر کارمەندانی داد بە شێوەیەکی تەواوەتی خۆیان لە هەست و ئارەزووەکان و کاریگەرییە دەرەکییەکان ڕزگار نەکەن، ئەوا گریمانی ئەوە دەبێت کە لە ناوەندی دادپەروەرییەکی ڕواڵەتیدا بکەونە ناو گەلێ تاوانی گەورەوە!

پاشان تەنانەت تاوانباران و نەیاران و ئەوانەش کە هیچ پشت و پەنایەکیان نییە، خاوەنی مافی خۆیانن. جا بۆ بەدەستهێنانی ئەم مافەی خۆیان بە دوای سەرچاوەیەکی تەواو بێ لایەندا دەگەڕێن.

ئەو شتەی کە گەوهەری "دادپەروەری" هەڵدەگێڕێتەوە بۆ "ستەم" و، لە ڕووی دادگەرییەوە "لایەنگری" دەگەیەنێت، ئەو دەستەواژەیە کە هەموو جارێك بەکاری دەهێنن بۆ من و پێم دەڵێن: "سەعیدی کوردی"! لە کاتێکدا کە من ناوم "سەعیدی نوورسی"یە. کەچی لێرە و لە ئیسپارتە لە لێکۆڵینەوەکاندا من بە "کورد" ناو دەبەن!

بەمەش دژە هەستێك لە برایانی قیامەتیمدا بەرامبەر بە من دەورووژێنن کە پەیوەندیی بە غیرەتی نەتەوەییەوە هەیە! جگە لەوەی کە ئەمە کاری دادگا و گەوهەری دادگەرییەکەی بە تەواوی لە ڕەوتی خۆی دەترازێنێت.

بەڵێ، وێڕای بوونی هەزاران ڕووداوی مێژوویی کە دەیسەلمێنێت یەکەم مەرجی دادپەروەری: ڕوانینی دادوەر و دادگایە بەوپەڕی بێ لایەنی و بێ نیازی لە هیچ نیشانەیەك کە لایەنگری بگەیەنێت، وەك دانیشتنی سەروەرمان عەلی کوڕی ئەبوو تالیب - خوا ی لێ ڕازی بێت - لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا شانبەشانی جوولەکەیەك لە دادگادا. هەروەها ئامادە بوونی زۆر لە پادشایان لە دادگاکاندا لەگەڵ عەوامی خەڵکیدا.

دەمەوێت بە هەموو ئەوانە بڵێم کە دەیانەوێت "دادگەری" بە هەڵەدا بەن و، سێبەری "دووری لە شارستانێتی" بخەنە سەر من، دەڵێم:

بەڕێزان! من پێش هەموو شتێك موسڵمانم و، لە کوردستان لە دایك بووم. بەڵام خزمەتی تورکم کردووە و، نەوەد و نۆی خزمەتە سوودبەخشەکانم بۆ تورك بووە و، زۆربەی تەمەنیشم لە ناو تورکدا بەسەر بردووە و، دڵسۆزترین و ڕاستترین برایانم لەناو تورکدا سەریان هەڵداوە و، دەتوانم هەزار لاوی تورکی ڕاستەقینە و بە غیرەت بکەم بە شایەت لەسەر ئەوەی کە لە هەزار کەسی ئەوانە زیاتر خزمەتم بە نەتەوەی تورك کردووە کە خۆیان وا پیشان دەدەن نەتەوەکەی خۆیان خۆش دەوێت و، بە نازناوی "کوردی" ناوزەدم دەکەن! چونکە خۆشویستنی تورك و پشتگیرییان، زیاتر لە پشتگیریم بۆ نەتەوەکانی تر، یەکێکە لە خواستەکانی خزمەتە خاوێنەکەم کە خزمەتی قورئانە، چونکە ئەوان لە هەموو پاڵەوانەکانی سوپای ئیسلام ئازاترن.

هەروەها ئەو سی چل کتێبەم دەگرم بە شایەت کە لای دەستەی دادگا پارێزراون، بە تایبەت پەیامەکانی "ئیقتیساد و پیران و بیماران" کە هێندەی هەزار بانگەشەچی بۆ نەتەوەی تورك، خزمەتی چوار لە پێنجی گەلی تورك دەکەن، لە موسیبەتداران و، هەژاران و، بیماران و، پیران و، خواپەرستان و، کەسانی خاوەن تەقوا، کە هیچ کام لەو کتێبانە لە بەردەستی کورددا نین، بەڵکو لە بەردەستی لاوەکانی تورکدان.

دوای ڕوخسەت وەرگرتن لە دەستەی دادگا، بەو ستەمکارە مولحیدانەی کە ئێمەیان دووچاری ئەم بەڵایە کرد و، هەندێك پایەی دەولەتیان خەڵەتاند و، لە ژێر پەردەی نەتەوایەتیدا پیلانەکانیان دارشت، دەڵێم:

بەڕێزان! ئایا ئەوە بە کاری "نەتەوایەتی" دادەنرێت کە زیاد لە چل کەسی هەرە باشی لاوی تورك و بە ویقارترین پیرەکانیان، وەکو کەسێك تاوانێکی گەورەی کردبێت، بخرێنە ئەم گرفتەوە بە هۆی ماددەیەکەوە کە سەبارەت بە من نەسەلماوە، گەر بیشسەلمێت بە تاوان دانانرێت، گەر تاوانیش بێت، بە تەنها من بەرپرسم لێی؟

بەڵێ، لە نێوان ئەوانەی کە بە بێ هیچ هۆکارێك، دووچاری ئەم ئازاری بەندکردنە بوون، چەند بەڕێزێك هەن کە مایەی شانازیی لاوانی تورکن.

ئایا ئەو کارە بە "نەتەوایەتی" دادەنرێت کە ئەو جۆرە لاوانە لە نێوان خێزان و منالیاندا بە وێنەی تاوانبار دەربهێنرێن و بخرێنە ناو ئەم گرفتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی کە من لە دوورەوە هەستم بە نرخ و بەهای یەکێکیان کردووە و، تەنها و تەنها سلاوێکم لێ کردووە، یاخود نامەیەکی ئیمانیم بۆ ناردووە؟

من کە لە پێش چاوی ئێوەدا لە نەتەوەیەکی تری ناشارستانیم و، لە غەیری نەتەوەی ئێوەم، یەك دانە لاوی مەردی بەندکراو و پیری بەڕێز لەوانە ناگۆڕمەوە بە سەد کەسی (بێ دینی) نەتەوەکەم.

هەروەها ئەو بەندکراوانە کەسی وەهایان تێدایە کە تەنها لەبەر "ئەو" ماوەی پێنج ساڵە وازم لە دوعاکردن هێناوە لەو ستەمکارانەی کە ماوەی دە ساڵە ستەمم لێ دەکەن! هەروەها کەسی وەهایان تێدایە کە بەوپەڕی ڕێز و سەرسوورمانەوە خاوێنترین نموونەی ڕەوشتی بەرزم بە بەرجەستەیی تێدا بینیون لەو تورکە نەجیبزادانە. هەر بەهۆی ئەوانەوە لە نهێنیی سەرکەوتنی نەتەوەی تورك تێگەیشتم و، ویژدانی خۆم دەکەم بە شایەت و گەلێ نیشانەش پێش چاو دەخەم کە ئەگەر بە ژمارەی ئەو بەندکراوە بێ تاوانانە گیانم هەبوایە، یان بمتوانیایە ئەو دەردیسەری و ئازارانەی هاتە ڕێی هەموویان، من بە تەنها خۆم هەڵم بگرتایە، ئەوا سوێند بێت بەوپەڕی شانازییەوە ڕازی دەبووم کە برۆمە شوێنی ئەوان!

ئەم هەستەشم بەرامبەریان، لە نرخ و بەهای خودی ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، نەك لەبەر سوودێکی کەسی بۆ خۆم. چونکە هی وایان لە نێواندایە کە تازەکی ناسیومە و، هەندێکیشیان سوودی لە من وەرگرتووە و منیش لە ڕێی ئەوەوە زیانم پێ گەیشتووە، بەڵام گەر هەزاران زیانم لەوانەوە پێ بگات هەر بەهایان لە پێش چاومدا کەم نابێتەوە.

دەسا ئەی ئەو ستەمکارە مولحیدانەی کە لافی نەتەوەگەریی تورك لێ دەدەن!

ئایا شکاندن و زەلیل کردنی ئەو بەڕێزانە - کە مایەی شانازیی تورکن - بە لاوازترین بروبیانوو، بە "نەتەوایەتی" دادەنرێت، لەبەر کوردێکی وەك من، وەکو ئێوە دەڵێن؟

ئایا ئەمە "نیشتمان پەروەری"یە؟

دەسا وەڵامم بدەنەوە!

ئەو وەڵامە بە ویژدانی ستەمکارانەتان دەسپێرم.

دادگای دادگەر دوای ئەوەی کە زانیی ئەوانە بێ تاوانن، زۆربەیانی ئازاد کرد. خۆ ئەگەر تاوانێك لە ئارادا هەبێت تەنها هی منە. ئەوانیش لەبەر ڕەوشتی جوان و بەرزیان و، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورە و، بە نیازێکی پاك و بێگەرد، کارە وردەکانی منی پیری غەریب و بە تەمەنیان ئەنجام داوە، وەکو داگیرساندنی ئاگردان و، هێنانی ئاو و، لێنانی خواردن و، پاکنووس کردنی پەیامێکی تایبەت بە خۆم. هەروەها بۆ خاتر گرتنی من و بۆ یادخستنەوە لە کۆتایی دوو پەیامی مندا، کە وەك دەفتەری یادگاری وان، ئیمزایان کردووە.

ئایا لە هەموو دنیادا یاسایەك، یان دەستوورێك، یان بەرژەوەندییەك هەیە ئەو مرۆڤانە بەم بیانووە لاوازانە تاوانبار بکات؟!

## دووهەم پاشماوەی بەرگرییەکەم

ئەی دەستەی دادوەران!

لەوانەیە لەم ڕوونکردنەوانەی خوارەوەمدا هەندێ شت ببینن کە گرنگییەکیان تێدا نەبێت بۆ ئەرکی سەر شانتان. بەڵام ئەم بابەتانە پەیوەندییان بە سەرانسەری وڵات،

بەڵکو بە هەموو دنیاوە هەیە. کەواتـە تەنـها ئێـوە گـوێ بیسـت نـین، بـەڵکو ئـەوانیش لـە حوکم و واتادا گوێ بیست دەبن.

پاشان بە هۆی ئەوەی مافێکی گرنگی خۆمانیان لـێ زەوت کردووین، ئـەوا نـاڕێکی لە ڕوونکردنەوەکانمدا دەبینن. چونکە خەتی خۆم جوان نی‌یە و، گەلـێ تکاشم کرد کـە نووسەرێکم بدەنێ لە بری من لەم کێشەیەدا بەرگری‌یەکەم بـۆ بنووسێتەوە کـە کێشـەی ژیان و مردنە، بەڵام هەروەك نووسـەرێکیان بـۆ نـەناردم، تەنانـەت بـە ستەمێکی یـەکجار مەزن نزیکی دوو مانگ ڕێی قسەکردنیشیان لـێ گرتم. بۆیـە نـەمتوانی بـە خەتـە ناتـەواوە یەکجار شێواوەکەم نووسینێکی ڕێکوپێك بنووسم.

*دواهەمین ڕوونکردنەوەکانم ئەمەی خوارەوەیە:*

با گریمانی مەحاڵی وەك ئەو هەواڵە گریمان بکەین کە خراپکاران گەیاندوویانە و، وا دابنێین کە پەیامەکانی نوور:

"لەگـەڵ هـەندێ سیاسـەتی حکوومـەت و، هـەندێ یاسـایدا یـەك ناگرێتـەوە، یـان پێچەوانەیانە و، چەند قەناعەتێکی سیاسـی و بـیروبۆچوونی جیـاوازە و، پەیامـەکانیش بـە گشتی باس لە ئیمان ناکەن، بەڵکو لە سیاسەت دەدوێن"..

گەر بە فـەرزی مـەحاڵ درۆیـەکی زەقـی وەك ئەمـە قبـووڵ بکرێـت، ئـەوا لـە وەڵامـدا دەڵێم:

مـادەم فراوانـترین حاڵەتـەکانی ئـازادی بریتی‌یـە لـە "کۆمـاری" و، حکوومـەتیش بـە زۆرترینی شێوە ئازادی‌یەکانی کۆماری ڕازی بووە کە بیکات بە سیستەمی خـۆی، ئـەوا شتێکی بەڵگەنەویسـتە کـە قەناعەتـە زانسـتی‌یەکان و بیروبۆچوونـە ڕاسـت و دروسـت و بێگومانـەکان، کـە قـابیلی ڕەتدانـەوە نـین، نابـێ هـەرگیز ئـازادیی کۆمـاری - بـە ئیستیبدادەوە - خۆی بەسەر ئەو ئازادی‌یە زانستی‌یەدا بسەپێنێت، بـە مـەرجێك ئاسـایش تێك نەدات. هەروەك نابینرێت ئەو ئازادی‌یە بە تاوان دابنرێت.

بەڵێ، ئایا لە هەموو دنیادا حکوومەتێك هەیە کە هەموو کەسێکی گەلەکـەی لەسـەر یەك قەناعەتی سیاسی یەکیان گرتبێت و کۆ بووبێتنەوە؟

گریمان من قەناعەتە سیاسی‌یەکانم بە پەنهانی بۆ خۆم نووسی، پاشـان پیشـانی هـەندێ هاوڕێی تایبەتیی خۆم دا. من نەمبیستووە یاسای وا هەبێت کە ئەو کارە بە تاوان دابنێت.

لە ڕاستیدا پەیامەکانی نوور لە بارەی "نووری ئیمان"ەوە دەدوێن و، نەکەوتوونەتە ناو تاریکایی سیاسەتەوە و، دانابەزنە ئەو ئاستە.

گەر کەسێکی بێ ئایین و نەزان بە حەقیقەتی کۆماریی عەلمانی، بلێت:

پەیامەکانت تەوژمێکی بەهێزی ئایینی دەخاتەکار. بەمەش دەبیتە نەیاری بنەماکانی کۆماریی بێ ئایین؟

*لە وەڵامدا دەڵێم:*

ئێمە دەزانین کۆماریی عەلمانی‌یەتی حکوومەت بریتی‌یە لە جیاکردنەوەی ئایین لە دنیا. هەرگیز هیچ کەسێك ئەوە قبوول ناکات کە عەلمانی‌یەت بریتی بێت لە ڕەتکردنەوەی ئایین و خۆدامالین لێی بە تەواوەتی، مەگەر کەسێکی نەزانی بێ ئایین کە لەوپەڕی نەفامیدا بێت.

بەڵێ، لە هەموو جیهاندا گەلێك نی‌یە بە بێ ئایین بژی. تورکەکانیش وەك گەلێکی نایاب، لە هەموو چەرخێکدا و لە هەر هەرێمێکی زەویدا هەبن، موسڵمانن. کەچی هەموو توخمەکانی تری ئیسلام کۆمەڵێکیان تێدایە کە موسڵمان نەبن، هەرچەندەش کەم بن.

کەواتە ئەو درۆزنە بێ ئایینانەی دەچن نەتەوەیەکی پیرۆزی خاوەن ئایین، کە بە ڕاستی و ڕاستگۆیی دەستی بە ئایینەوە گرتووە و، شانازی‌یە نەتەوەییەکانی لە ڕووی زەویدا بە ملیۆنەها سەرچاوەی ئایینی جێگیر کردووە و، وەکو گەلێکیش بە شمشێرەکانی ئەو سەرچاوانەی نووسیوە و، ماوەی هەزار ساڵە سوپای ئازای ئەم ئایینەیە.. گەر ئەو درۆزنە بێ ئایینانە ئەم نەتەوەیە بەوە تاوانبار بکەن کە دەست لە ئایین هەڵدەگرێت و دەبێتە نەتەوەیەکی بێ ئایین، ئەوا بەم بۆچوونەیان تاوانێك ئەنجام دەدەن کە شایستەی سزای بنکی ئاگری دۆزەخیان بکات.

لە ڕاستیدا پەیامەکانی نوور باس لە ئایین ناکەن لە بازنە فراوانەکەیدا کە دەوراندەوری یاساکانی ژیانی کۆمەڵایەتیشی داوە، بەڵکو ئامانج و بابەتی بنەڕەتی‌یان باسکردنی پایە مەزنەکانی "ئیمان"ە، کە کاکڵەی تایبەتیی ئایینە و بەرزترینی بەشەکانیەتی.

پاشان زۆربەی ئەوانەی کە لە پەیامەکاندا ڕوویان تێ دەکەم، دەروونی خۆمە، دوای ئەو فەیلەسووفەکانی ئەورووپایە!

پێم وایە هەر تەنها شەیتانەکانن کە گومانی زیان لەم چەشنە بابەتە خاوێنانە دەکەن، بە مەرجی ئەوەی ئەم بابەتانە ڕاست بن. بەڵام سێ چوار پەیام ڕوویان لە چەند کەسێکی کارمەند بوو بە شێوەی سکاڵای ڕەخنە ئامێز.

ئەم پەیامانەش لە پێناوی زۆراندا لەگەڵ حکوومەت و بە مەبەستی ڕەخنە لێ گرتنی نەبوون، بەڵکو لە دژی چەند کارمەندێك بوون کە ستەمیان لێ کردم و، کارمەندی‌یەکەیان سەبارەت بە من بە خراپی بەکارهێنا. تەنانەت بۆ ئەوەی نەبێتە سەرچاوەیەك بۆ تێگەیشتنی هەڵە، دواتر ڕێم لە بڵاوبوونەوەی ئەو پەیامانە گرت، لەو ڕووەوە کە تایبەتن بە خۆمەوە.

زۆربەی پەیامەکانی تر ماوەی چوار پێنج ساڵ دەبێت نووسراون و، هەندێکیشیان لە پێش هەشت یان دە ساڵ، هەندێکی تریشیان سیازدە ساڵ پێش ئێستا دانراون. تەنها "پەیامی ئیقتیساد و پیران و بیماران" نەبێت کە ساڵی ڕابوردوو دامناون.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەرکەسێك خاوەنی گەردیلەیەك ویژدان بێت و بێ لایەنانە لە پەیامەکان بکۆڵێتەوە، دڵنیا دەبێت و ئەوەش پشتڕاست دەکاتەوە کە پەیامەکان دژی یاساکانی حکوومەت نین و، ئاسایش تێك نادەن و، گەل بە هەڵەدا نابەن. بەڵکو پێویستە لە لایەن حکوومەتەوە هاندان و ڕێزلێنان بەدەست بهێنن.

خۆ ئەگەر گریمانی ئەوەش بکەین لە چەند خاڵێکی زۆریاندا پێچەوانەی تێڕوانینی حکوومەت بن، ئەوا بە پێی ئەو یاسای لێبوردنەی کە ئەم دواییە بڵاو کرایەوە و، لەو چەشنە تاوانانە خۆش دەبێت کە هی پێش (١٩٣٣/٧/٢٨)ن، ئەوا دەڵێم هیچ ڕێ و شوێنێکی یاسایی نەماوە بۆ بە دواداچوونی ئەم پەیامانە. لەبەر ئەوە، داوای هەڵگرتنی خێرای ستەم دەکەم لەسەرمان و گێڕانەوەی پەیامەکانیش بۆمان.

ئەگەر کەسێکی مەست و بێ ویژدان کە پێی وایە مرۆڤایەتی لە خراپترین و نزمترینی پلەکانی ئاژەڵیدایە و، لەو گومانەدایە کە دنیا هەمیشەییە و، لەو خەیاڵەدا دەژی کە مرۆڤ دەمێنێت و نامرێت، گەر کەسێکی ئاوا بڵێت:

"هەموو پەیامەکانتان چەند وانەیەکی ئیمانیی یەکجار بەهێز پێشکەش دەکەن و، سەرنجی خەڵك لە دنیاوە ڕووەو ئاخیرەت وەردەچەرخێنن. بەڵام ئێمە دەگونجێت بە هەموو هێز و بایەخ و ژیریمان لەم سەردەمەدا بژین و، ڕوومان لە ژیانی دنیا بێت، چونکە بەردەوامیی ژیان و خۆپاراستن لە دوژمنان لەم سەردەمەدا کارێکی دژوارە".

وەڵام:

وانەکانی ئیمانی تەحقیقی هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە ڕوانینەکان ئاراستەی ئاخیرەت دەکەن، ئەوەش فێری خەڵکی دەکەن کە دنیا کێڵگە و بازاڕ و کارگەیەکە بۆ ئاخیرەت، هەروەها هانیان دەدەن کە هەوڵی بێ وچان بۆ ژیانی دنیا بدەن. پاشان ئەو وانە ئیمانی‌یانە هێزێك دەبەخشن بەو وورە مەعنەوی‌یەی کە لە نەبوونی ئیماندا تووشی دارمان بووە. ئەو کەسە نائومێدانەش کە دووچاری بێ کاری و بایەخ نەدانن، بەرەو شەوق و هیممەت دەدەنە بەر و، هانیان دەدەن بۆ کار و کۆشش.

جا ئەوانەی کە دەیانەوێت لەم دنیایەدا بژین، ئایا بە بوونی پاسایەك ڕازی دەبن ڕێ لە وانەکانی ئەو ئیمانە تەحقیقی‌یە بگرێت کە لەزەتی ژیانی دنیا و، شەوق بۆ کار و کۆشش و، وورە و هێزی مەعنەوی لە خۆدەگرێت بۆ خۆڕاگرتن بەرامبەر گرفتە زۆرەکانی دنیا؟ ئایا دەگونجێت پاسایەکی وەکو ئەمە هەبێت؟

خۆ ئەگەر کەسێك کە غیرەت و پەرۆشیی ڕواڵەتی دەنوێنێت و، بێ ئاگایە لە بناغە ڕاستەقینەکانی بەڕێوەبردنی گەل و ئاسایشی وڵات، بڵێت:

"ئێمە بەو گریمانە چاو دێریت لەسەر دادەنێین کە لەوانەیە بە "هێزی پەیامەکان" ئاژاوە ڕوو بدات، لەو ڕووەوە کە ئەگەر کەسێك بیەوێت ئاسایش تێك بدات و کارگێڕی بشێوێنێت، کارەکەی بداتە پاڵ پەیامەکانت، یاخود تۆ حەزەر پشتگوێ بخەیت و ڕەخنە لەم کارگێڕی‌یەی ئێستا بگریت".

وەڵام:

کەسێك وانەی پەیامەکانی نووری خوێندبێت، خۆی ناخاتە ناو ئاشووبێك کە خوێنی گەلێ کەسی بێ تاوان بەهەدەر بدات و مافەکانیان پێشێل بکات. هەروەها بە هیچ شێوەیەك توخنی ئەو فیتنە و گێژاوانە ناکەوێت کە چەندین جار شکست و زیانی

دووپات بووەتەوە. دە دانە ئاشووبی ئەم دە ساڵەی کە ڕابورد، یەك لە دەی قوتابیانی پەیامەکانی نوور، تەنانەت یەك دانە کەسیشیان، بەشدارییان تێدا نەکردووە. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پەیامەکان دژی ئەو ڕەفتارانە و، مایەی هێنانەدیی ڕێسا و ئاسایشن!

ئایا ئەم دووانە لە ڕووی کارگێڕی و پاراستنی ئاسایشەوە کامیان ئاسانترن:

هەزار پیاوی ئیماندار، یاخود دە پیاوی بێ ئایین کە هیچ بەربەستێك ڕێ و سنووری هەڵسوکەوتی بۆ دیاری نەکات؟

بەڵێ، "ئیمان" بە پیت و بەرەکەتی خەسڵەتە جوانەکانی، هەستی میهرەبانی و مەیلی خۆپاراستن بە مرۆڤ دەبەخشێت.

سەبارەت بە گریمانی پشتگوێ خستنیشم بۆ حەزەر کردن، ئەوا خەڵکی پارێزگای ئیسپارتە دەزانن کە من لەم سیازدە ساڵەی دواییدا بەوپەڕی وزە و توانای خۆمەوە هەوڵ دەدەم سەرنجی حکومەت ڕانەکێشم و، توخنی نەکەوم و، خۆم لە کاروباریدا هەڵنەقورتێنم و، ژیانێکی هەرە سادەم هەڵبژاردووە لە چۆڵایی و گۆشەگیری لە خەڵکی و، دەردیسەری و، دوورەپەرێزی لە سیاسەت.

دەسا ئەی ئەو بێ ویژدانانەی کە منیان بەرەو ئەم بەڵایە دایەبەر!

پێدەچێت کە ئێوە ڕق و داخی ئەوەتان لە من هەڵگرتبێت کە لە دژی ئاسایشی گشتی نەجووڵاوم و، بە هاندەری دژایەتیتان بۆ ئەم بێدەنگییەم، منتان دەست بەسەر کردووە!

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە ئامانجیان تێکدانی ئاسایش و ئارامی و شڵەژاندنی کارگێڕییە، حکومەتیان سەبارەت بە من خەڵەتاند و، دام و دەزگای دادیان بە بێ جێ سەرقاڵ کرد و، بەندیان کردم. دەبێت دەستەی دادوەر، لە سەرووی هەموویانەوە داواکاری گشتی، نەك لەبەر ئێمە، بەڵکو بە ناوی وڵاتەوە داوایان لەسەر تۆمار بکات.

*ئەگەر بوترێت:*

تۆ کارمەندی دەوڵەت نیت و، دەبێ ڕێز لە گەڵ بگریت و، بە وێنەی کارمەندێك وانەی ئایینی نەڵێیتەوە. فەرمانگەیەکی ڕەسمی هەیە کە چەند وانەیەکی ئایینی دەڵێتەوە، پێویستە ڕەزامەندیی ئەوان بەدەست بهێنیت.

وەڵام:

یەکەم: من نە چاپخانەم هەیە و نە چەند نووسەرێکیش کە ئەرکی بڵاوکردنەوە بگرنە ئەستۆ. بەڵکو کارەکانمان تـایبەتن بـە خۆمانـەوە و، لـە نـاوەندی یاسـای ئـازادیی بیر و باوەڕ و ئازادیی کارە تایبەتەکاندان، بە تایبەت ئەگەر ئەو کارانە ئیمانی و ویژدانی بن.

دووهەم: دامـەزرانـدنم بە کارمەندییەك لـە "دار الحکمة الإسلامیة"دا بە کۆدەنگیی حکوومەتی ئیتتیحاد و تەرەقی بە مەبەستی چەسپاندنی ڕاستییەکانی ئیسلام لـە بەرامبـەر ئەورووپا و، وانە وتنەوە بە گەل.. هەروەها دامەزراندنم لە لایەن سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی لە پارێزگای "وان"دا بە ئامۆژگار لەوێ.. هەروەها دەستاودەست پێکردنی زیاد لە سەد پەیامی مـن لـە بەردەستی زانایاندا تـا ئێستا و ئاراستە نـەکردنی ڕەخنـە لێیـان.. دەیسەلمێنێت کە من مافی وانەوتنەوەم بە گەل هەیە.

سێهەم: ئەگەر دەرگای گۆڕ دابخرێت و مرۆڤ بە هەمیشەیی بـژی و نـەمرێت، ئـەوا ئەو کاتە کارمەندییەکان لە کـاری سـەربازی و کـارگێڕی و ڕەسمیـدا دەمایـەوە. بـەڵام مادەم ڕۆژانە بە لای کەمەوە سـی هـەزار شـایەت بـە تابووتـەکانیان ئیمـزا لـەسـەر بابـەتی "الموت حق" دەکەن، ئەوا دەبێ گەلـێ کارمەندیی ئیمانی هەبێت کە زۆر گرنگتر بن لـەو کارمەندییانەی کە هی دنیان!

جا "پەیامەکانی نوور" بە فەرمانی قورئان ئەم کارمەندییانە ڕادەپەڕێنن.

خۆ مادەم ئەو قورئانەی کە فەرماندە و سەرکردەی پەیامەکانی نوورە، حوکمـی سـێ سەد و پەنجا ملیۆن کەس دەکات و، فەرمانەکانیان پێ ڕادەگەیەنێت و، ڕۆژی پێنج جـار بە لایەنی کەمەوە چوار لەسەر پێنجی ئەو کەسانە بەرەو پاڕانەوە و پـەنابردن هـان دەدات لـە دەرگانـەی میـهرەبانیی خواییـدا و، فەرمانـە ئاسمـانی و خاوێنەکانیشـی بـە لالانــەوە و خشووعەوە لە مزگەوتەکان و سـەرجەم نوێژ و جەماعەتـەکاندا لـەسـەر زاری ئـەوان پـێ دەخوێنێتەوە.. ئەوا دەبێت پەیامەکانی نوور کـە تەفسیری ڕاستەقینەی ئـەو قورئانەیـە و، ڕووناکییەکە لە خۆرەکەی و، کارمەندێکە لە کارمەندەکانی، دەبێ ئـەم کارمەندییـە ئیمانییە، بە ئیزنی خوا، جێبەجێ بکات، بێ ئەوەی ئەرکەکەی دووچـاری گـیروگرفت ببێت.

کەواتە لە ڕاستیدا ئەهلی دنیا و سیاسەت پێویستیان بە زۆرانگرتن لەگەڵ ئەم پەیامانەدا نییە، بەڵکو گەلێ پێویستیان بەوە هەیە کە سوودی لێ وەربگرن.

بەڵێ، زۆر بەشی پەیامەکانی نوور هەیە، وەك "وتەی بیست و نۆهەم" کە مەتەڵی داخراوی بوونەوەران ئاشکرا دەکات و، نهێنییەکانی: لە کوێوە و بەرەو کوێ دەڕۆین؟ دەکاتەوە و.. "وتەی سیهەم" کە نهێنیی داخراوی ئاڵوگۆڕی گەردیلەکان ئاشکرا دەکات و.. "مەکتووبی بیست و چوارەم" کە ئەو مەتەڵە سەرسووڕهێنەی بەدیهێنەرێتیی گشتی و، ئەو کارابیە بەردەوامە شی دەکاتەوە کە لە نەمانی بوونەوەراندا هەیە و.. "مەکتووبی بیستەم" کە قووڵترین و گرنگترین نهێنیی تەوحید ئاشکرا دەکات و ئاسانیی زیندووبوونەوەی مرۆڤ هێندەی ئاسانیی زیندووکردنەوەی مێشێك بە بەڵگە دەسەلمێنێت و.. "بریسکەی بیست و سێهەم"یش کە ناوی "پەیامی سروشت"ە و بناغەی بیرۆکەی کافرانەی سروشت پەرستان هەڵدەتەکێنێت..

ئەم پەیامانە، هەرکەسێك بە وردی بیانخوێنێتەوە، باوەڕ بەوە دەهێنێت و تەسدیقی ئەوە دەکات کە ئەگەر هەر زانایەك، یان هەر ئەدیبێك، یان هەر مامۆستایەکی زانکۆ تەنها یەکێك لەو نهێنییانە شی بکاتەوە، لە هەر حکوومەتێکدا بێت، بە پاداشت و خەلات ڕێزی لێ دەنرێت!

نابێت گومانی ئەوە ببرێت کە ڕوونکردنەوەکانم درێژەپێدانێکە لە دەرەوەی بابەت، چونکە زیاد لە سەد پەیامی نوور لە نێو ئەوراقی لێکۆڵینەوەی کێشەکەمدان و، دەستەی دادوەریش ئەرکی لێ وردبوونەوەی ئەو پەیامانەی خراوەتە ئەستۆ. منیش لە لایەنی خۆمەوە لە ڕووی پەیوەندیی ئەم کێشەیەوە بە قورئان و، بە جیهانی ئیسلامی و، بە داهاتووەوە، دەبێت وەڵام و ڕوونکردنەوە پێشکەش بکەم.

هەروەها پێویست دەکات هەر گریمانێك، تەنانەت گەر لە دووریشەوە پەیوەندیی بەم کێشەیەمانەوە هەبێت، ڕوون بکرێتەوە. چونکە ڕوونکردنەوەی تەواوەتیی هەر مەسەلەیەك بەوە دەبێت کە سەرجەم گریمانە دوور و نزیکەکان بخرێنە ڕوو، بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەگەر چەند کەسێکی بەدبەخت لەوانەی کە کوفر و بێ دینییان کردووە بە ڕێبازی خۆیان و، لە ژێر پەردەی ئامانجێکی سیاسیدا خۆیان لەناو چەند پایەیەکی حکوومەتدا

جێگیر کردووە و لەو ڕێیەوە حکوومەتیان بە هەڵەدا بردووە، یان ڕۆشتوونەتە ناو کارمەندیی دەوڵەتەوە و ویستوویانە بە فرۆفێڵ پەیامەکانی نوور بسڕنەوە و، بە هەڕەشە لێ کردنیش بێدەنگم بکەن، گەر ئەوانە بڵێن:

"سەردەمی دەمارگیری بۆ شتی پێشوو بەسەرچووە و، دەبێت ڕابوردوو لەبیر ببرێتەوە و، بە هەموو هێزێکمان ڕوو لە داهاتوو بکەین و، حەزمان لەم وانە ئایینی و ئیمانی‌یە بەهێزەت نی‌یە لە شێوە کۆنەپەرستی‌یەکەیدا"..

*لە وەڵامدا دەڵێم:*

یەکەم: ئەو شتەی گومان دەبرێت ڕابوردوو بێت، لە ڕاستیدا بووەتە داهاتوو. تەنانەت داهاتووی ڕاستەقینەیە. ئێمەش بەرەو ئەو داهاتووە دەڕۆین!

دووهەم: پەیامەکانی نوور پەیوەستن بە قورئانی پیرۆزەوە، لەو ڕووەوە کە تەفسیرێکی قورئانن. قورئانیش ڕاستی‌یەکی کێشکەری وەك ئەو کێشە گشتی‌یە وایە کە زەویی بە عەرشەوە پەیوەست کردووە.

ئەو کەسانەش کە دەسەڵاتی ئاسیا دەگرنە دەست، توانای زۆرانیان لەگەڵ تەفسیرێکی قورئانیی وەك پەیامەکانی نووردا نی‌یە، بەڵکو لەگەڵیدا ڕێك دەکەون و، سوودی لێ وەردەگرن و، دەیپارێزن.

سەبارەت بە بێدەنگ بوونیشم، ئەوا دەڵێم:

سەری گەلێ کەسی سەربەرز لە پێناوی دۆزینەوەیەکی ئاسایی، یان شوێنکەوتنی هزرێکی سیاسیی بێ نرخ، یان لە پێناوی ڕێزێکی دنیاییدا بەخت کراوە. کەواتە لە پێناوی سەروەتێك کە بەهەشتی مەزنی پێ دەکڕێت و ئیکسیری ژیانێك کە ژیانی هەمیشەیی دەستی مرۆڤ دەخات و، چەندین دۆزینەوە کە سەرجەم فەیلەسووفەکان سەرسام دەکات، ئەوا گەر بە ژمارەی گەردیلەکانی جەستەم سەرم هەبووایە و لەو پێناوەدا پێویست بووایە بیانکەمە قوربانی، بێ هیچ دوودڵی‌یەك هەموویانم بەخت دەکرد!

پاشان بێدەنگ کردنم بە هەڕەشە و لەناوبردن، ئەوا کارێك دەکات لە بریی یەك زمان، هەزار زمان بکەوێتە گۆ!

ئومێدم بە خوای گەورەی بەخشندە و میهرەبان هەیە کە ئەو کاتە، لە بریی یەك دانە زمانی بێدەنگم، هەزاران زمان بە پەیامەکانی نوور بخاتە گوفتار، کە لە بیست ساڵی رابوردوودا لە ناو گیانەکاندا نیشتەجێ بوون.

## بابەتێکی بێ نرخ، بەڵام وەکو تاوانێکی گەورە پرسیارم لە بارەیەوە لێ کراوە

*دەڵێن:*

تۆ شەپقە لەسەر ناکەیت و، لە دادگا و فەرمانگە رەسمی‌یەکانی هاوشێوەیدا مێزەرەکەی سەرت لانابەیت. بەو واتایەی کە تۆ یاساکان رەت دەکەیتەوە، لە کاتێکدا رەتکردنەوەی یاساکان دەبێتە هۆی سەپاندنی سزایەکی سەخت!

*وەڵام:*

رەتکردنەوەی یاساکان شتێکە و، کار پێ نەکردنیشیان شتێکی تری تەواو جیاوازە لەو. گەر سزای یەکەمیان ئیعدام بێت، ئەوا هی ئەوی تر رۆژێك بەندکردن، یان غەرامەیەکی نەختینەیە بە بری تەنها یەك لیرە، یاخود ئاگادارکردنەوە و سەرزەنشتێکە.

جا من کار بەو یاسایانە ناکەم و نەخراونەتە ئەستۆم، چونکە بە گۆشەگیری دەژیم. ئەم یاسایانەش ئەو کەسانە ناگرنەوە کە گۆشەگیر و دابڕاون لە خەڵکی.

بێدارکردنەوەیەك:

وێڕای ئەوەی کە دادگاکانی ئیسپارتە و ئەسکی شەهر و، وەزارەتی ناوخۆ دەستیان بەسەر ئەو کتێب و نامە تایبەتی‌یانەی مندا گرتووە کە ماوەی دە ساڵە کەڵەکە بوون، کەچی هێشتا بە دوای هەمان تۆمەتدا دەگەڕێن کە رێکخستنێکی نهێنی هەبێت! بەڵام سەرباری لێ وردبوونەوە سەختەکەشیان دانیان بەوەدا نا کە هیچ شتێکی لەو جۆرەیان تێدا نەدۆزیوەتەوە.

منیش دەڵێم: بەرێزان!

ئێوە بە بێ جێ خۆتان ماندوو دەکەن!

ئەگەر ئەو شتەی بە دوایدا دەگەڕێن ببوایە، ئەوا لەم ماوە درێژەدا کە نەتانتوانیوە بیدۆزنەوە، ئەوە دەگەیەنێت هێزێکی شکست نەخواردوو، هەروەها زیرەکی یەکی نەبەزیو لە پشتی ئەم کارەوە هەیە! کەواتە هیچ چارێکتان لە بەردەستدا نی یە جگە لە ڕێککەوتن لەگەڵیدا..

دەنا ئایا ئەوەتان سەروزیاد نی یە کە زیانتان بە کەسانێکی زۆری بێ تاوان گەیاندووە بە شێوەیەك کە غیرەتی خوا بجوولێنێت و، ببێتە هۆی دابارینی موسیبەتەکانی چەشنی گرانی و وشکەساڵی و تاعوونەکان؟ لە کاتێکدا کەسێکی بە میزاج تووڕەی وەکو مـن، کە بێ هیچ حساب کردنێك، شاراوەترینی نهێنی یەکانی خۆی بۆ کەسانی نەناسراو دەدرکێنێت و، لە بەردەم دادگای عورفیی سەربازیدا وەك قارەمانەکان بەرگریی لە خۆی کرد و، لە دەمی پیریدا ناچارە بە پێی ڕێبازەکەی دوورەپەرێزی و خۆپارێزی لە ڕووداوە ئەنجام نادیارەکان بکات..

دەڵێم: تاوانبارکردنی ئەم پیاوە بە دامەزراندنی ڕێکخستنێکی نهێنیی وەها کە هەرگیز لە تواناد نی یە ئاشکرا بکرێت، ساویلکەییەکی لەوپەڕی گەمژەییدایە، یاخود بێ گومان فێڵێکە نەخشەی بۆ دارێژراوە.

❑ من داوای مافێکی خۆم لە دەستەی دادوەر دەکەم:

ئەو کتێبانەم کە دەستیان بەسەردا گیراوە، نرخیان لە لای من زیاد لە هەزار لیرەیە، چونکە بەشێکیان دوازدە ساڵ پێش ئێستا کتێبخانەی ئەنقەرە بە سوپاس و شانازیەوە قبوولی کرد. بە تایبەت هەندێکیان سەرتاپا ئیمانی و قیامەتین، وەك "مەکتووبی نۆزدەهەم" و "وتەی بیست و نۆهەم" کە گرنگی یەکی زۆریان لە لای من هەیە، چونکە دەرەنجامی ژیانم و هەموو سەروەتێکی مەعنەویی منن، لەبەر ئەوەی بەشێك لە دە بەشی ئیعجازی قورئان بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕوون دەکەنەوە. جگە لەوەی کە من ئەو دوو کتێبەم بە تایبەتی بە شێوەی زەڕکفت بۆ خۆم داوە بە نووسینەوە. وێڕای نوسخەیەکی "پەیامی پیران"یش لە نێوان سێ چوار نوسخەیدا.

جا لەبەر ئەوەی هیچ کام لەم پەیامانە شتێکیان تێدا نی یە کە تایبەت بێت بە دنیا، ئەوا بە هەموو قەوارەی خۆم داوای گێڕانەوەی ئەم پەیامانە و پەیامە عەرەبی یەکانیشم دەکەم

کە تایبەتن بە یادگاری‌یەکانی پیریم. چونکە ئەو کتێبانە هاودەم و خەمڕەوێن و هاوڕێمن، تەنانەت گەر لە بەندیخانە و گۆڕیشدا بم. چ جای لەم دنیایەدا کە بە پێنج جۆری غەریبی کۆڵی ئەستۆی منی قورس کردووە.

بێ بەش کردنم لەو کتێبانە، بەرەو غەریبی‌یەك دەمبات کە لە توانادا نی‌یە ئارامی لەسەر بگیرێت.

دەسا خۆتان لەو ئاخ و حەسرەتانە بپارێزن کە لە ئەنجامی ئەم گوشارە قورس و ئازاربەخشانەوە دەردەچن!

□ داوای مافێکی گرنگ لە سەرۆکی دادگا و ئەندامانی دەکەم..

کە بریتی‌یە لەوەی:

تەنها من بابەتی باس نیم لەم کێشەیەدا، کە دوای ئاگاداربوونتان لە ڕاستی‌یەکان، بە بڕیاری بێ تاوانیم کۆتایی پێ بێت. چونکە کەسی مەعنەویی زانایان و خەڵکانی خاوەن تەقوا، سێبەری تۆمەتبارکردنیان لە پێش چاوی گەلدا خراوەتە سەر و، حکوومەتیش بە چاوی گومان و نادڵنیاییەوە بۆیان دەڕوانێت. کە ئەمەش زانایان و کەسانی خاوەن تەقوای ناچار کردووە فێری ئەوە بن کە چۆن خۆیان لە هەوڵی زیانبەخش و تێکدەر بپارێزن.

بۆیە داواکارم بەرگری‌یەکەم، کە دوابەشیم نووسیوە، بە پیتە تازەکان و بە چاپکراوی بڵاوبکرێتەوە، تاکو زانایان و کەسانی خاوەن تەقوا بە فێڵ و پیلانەکان نەخەڵەتێن و، توخنی هیچ هەوڵێك نەکەون زیان و مەترسیی تێدا بێت و، بۆ ئەوەش ئەو کەسایەتی‌یە مەعنەوی‌یە لە پێش چاوی گەلدا لە تۆمەت ڕزگاری ببێت و، حکوومەتیش لە زانایان و تەقواکاران دڵنیا ببێتەوە و، تێگەیشتنی هەڵە لە بارەیانەوە نەنوێنێت. ئیتر - جارێکی تر - هاوشێوەی ئەم ڕووداوانە دووپات نەبێتەوە، کە زیان بە حکوومەت و گەل و نیشتمان دەگەیەنێت.

□ بەسەرهاتێك کە لە لائیحەی ئیعتیرازەکەمدا هاتووە:

ئەم بەسەرهاتەم لە لائیحەی ئیعتیرازەکەدا خستووەتە ڕوو، کە حاڵی غەریبی و بێ پشتیوانیم و، بایەخ نەدانی کەس بە هەواڵ پرسینم پیشان دەدات. تەنانەت بۆ ماوەی چوار مانگ بە تەنها یەك دانە نامەش، سەبارەت بە کەسێك کە لە خەڵکی دابڕاوە و

ڕۆیشتووەتە ناو کێشەیەکی چارەنووس سازەوە لە نێوان ژیان و مردندا. جگە لەوەی کە بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ڕق لە دڵانە خەڵکی لێ دوور دەخرێتەوە.

بەسەرهاتەکەش ئەوەیە کە: پادشایەك لە ڕابوردوودا دووچاری نەخۆشییەك بوو، کە جگە لە خوێنی منالێك بە هیچ دەرمانێکی تر چارەسەر نەدەبوو. باوکێکیش منالەکەی بەرامبەر بە نرخێك دا بە پادشا لەسەر فەتوای دادوەر. بەڵام منالەکە لە بریی گریان و داوای فریاکەوتن، دەستی کرد بە پێکەنین!

پێی وترا: ئایا بۆچی داوای فریاگوزاری ناکەیت و سکاڵا دەرنابڕیت؟ بەڵکو پێدەکەنیت؟

وەڵامی دانەوە:

مرۆڤ ئەگەر دووچاری گرفتێك ببێت یەکەمجار هانا بۆ باوکی، پاشان بۆ دادوەر، ئنجا بۆ پادشا دەبات. بەڵام من باوکم دەمفرۆشێت تاکو سەربېڕرێم و، دادوەریش بڕیاری کوشتنم دەدات و، پادشاش چاوەڕێی خوێنەکەمە! کەواتە ئەم حاڵەتە سەیر و نامۆ و ناشیرین و نەفرەت لێکراوە، کە هاووێنەی نەبینراوە، تەنها شایستەی پێکەنینە!

دەسا ئەی " شوکری قایا "ی بەڕێز[1]! ئێمەش وەکو ئەو منالەمان لێ هاتووە..

---

(١) بەڵگە لەسەر ئەوەی کە "شوکری قایا" بە گومانە لاوازەکان خەڵەتاوە و، ڕقی شارراوەی ئەو دەردەخات، ئەوەیە کە هەر بۆ خۆی لە ئەنقەرە لەگەڵ سەد کەسی جەندرمە و پازدە پۆلیسدا هاتووە و، ئامادە بووە بۆ ئەوەی کەسێکی نامۆی وەك من لەگەڵ چەند برایەکی هەژاری تردا ببرێم بۆ دادگا! وەك بڵێی ئەو هێزە جەندرمە و سوپایەی کە لە ئیسپارتەدا هەیە بەشی ئەم کارە ناکات! کە ئەمەش کەش و هەوایەکی تۆقاندن و دڵەڕاوکێی لە لای خەڵك دروست کرد.

لە ڕاستیدا ئەم ئەرکە تەنها یەك پۆلیس دەتوانێت ڕاییبەڕێنێت، کەچی بەم کارەی دوو سێ هەزار لیرەی گەلی بەفیڕۆ دا، چونکە بۆ گواستنەوەی ئەو بێ تاوانانەی کە دوایی ئازادکران لە ئیسپارتەوە بۆ ئەسکی شەهر پێنج سەد لیرەی خەرج کرد، جگە لەوەی کە ئەو بێ تاوانانەی دووچاری هەزاران زیان کرد، وێڕای لەرزەخستن بە پلەوپایەی کۆمەڵایەتییان لە پێش چاوی خەڵکدا.

ئەم بارودۆخانە ڕادەی ئەو زیانانە دەردەخەن کە ئەو گەیاندی بە کارگێڕیی ناوخۆ و، ئاسایشی وڵات و، هەوڵ و کۆششی گەلی داماو. چونکە لەو کاتەدا کە ناوخۆ پێویستی بە ڕێسا و ئاسایش و ئارامی هەیە، ئەوا دروستکردنی کێشەیەکی مەزن لە هیچ و خۆڕایی و، بوون بەهۆی کەوتنەوەی چەندین زیانی گەورە و، نیشاندانی دەنکە دانەوێڵەیەك لە شێوەی سەد گومەزدا و، ڕایی کردنی چەندین کاری نایاسایی بە ناوی یاساوە، وامان لێ دەکات کە ئیدیعای ئەوە بکەین "خود"ی شوکری قایا تاوانێکی یاسایی گەورەی ئەنجام داوە، بۆیە سکاڵای لەسەر دەکەین لە لای "وەزیری ناوخۆ" شوکری قایا! (دانەر)

چونکە لەو کاتەدا کە پێویست دەکات ئەم بارودۆخەمان وەك سکاڵایەك بخەینە بەردەم والیی شار کە نوێنەری حکوومەتە و، پاشان بۆ دادگا و، ئنجا بۆ وەزارەتی ناوخۆ، تاکو ئەو ستەمەیان بۆ روون بکەینەوە کە دووچاری بووین و، ئەوانیش لە دەستی ستەمکاران دەربازمان بکەن.. کەچی دەبینین وەزیری ناوخۆ، کە کۆتا سەرچاوەیە گوێمان لێ رابگرێت، دووچاری نەخۆشیی غرور بووە و داوای خوێنمان دەکات و، بە چەند بروبیانوویەکی لاواز و بێ نرخ دەیەوێت لەناومان بەرێت و، بە هەڵەیەکی گەورەدا دەڕوات کە ڕەنگی حەقیقەت بەو وەهم و گومانانە دەبەخشێت کە هیچ بناغەیەکیان نییە.

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە سکاڵای "کەس"ی شوکری قایا لای "وەزیری ناوخۆ" شوکری قایا دەکەین!

جا ئەگەر ئەم دادگایە بە ڕاستی دەیەوێت پارێزگاری لە ئازادیی تەواوەتی بکات و، مل بۆ هیچ چەشنە گوشارێك دانانەوێنێت و، بەپێی ئەو هەستە دادگەرییە بڕیار دەدات کە لە ویژدانی دەستەی دادوەردایە، ئەوا ئێمە یەکەم کەس دەبووین داوامان لەسەر کەسی شوکری قایا تۆمار دەکرد، گەر بمانزانیایە گوێمان لێ دەگرن! چونکە ماوەی ساڵێکە جاسووسەکان ڕاپۆرتی ڕۆژانە لەسەر ئێمە بۆ لای ئەو بەرز دەکەنەوە لەسەر داوای ڕۆژانە، یان لانی کەم هەفتانەی ئەو. بەمەش سەرنجی جاسووسەکانی پیاوانی ئاسایشی بەلای ئێمەدا ڕاکێشاوە و، بە وێنەی قوربانی ئامادەی کردین بۆ سەربڕین!

لەو کاتەدا کە نابێت دەستەی دادگا بیر لە هیچ شتێکی جگە لە "دادگەری" بکاتەوە، کە لە ڕاستیشدا بە توندی دەستیان پێوە گرتووە، کەچی توانای گوشاری بەڕێز شوکری قایایان نییە و، ئازادمان ناکەن و، دەستی دەستیمان پێ دەکەن.

سەبارەت بە والی و پیاوانی ئاسایشی حکوومەتی ناوچەیی پارێزگای ئیسپارتەش، ئەوا لە هەموو کەس زیاتر ئەرکی ویژدانییان بوو کە گیراوە بێ تاوانەکانی ئیسپارتە بپارێزن و، هەوڵی ئەوەیان بدایە بە زوویی ئازاد بکرانایە. کەچی ئەوان بە پێچەوانەی ئەمەوە هەوڵی لەناوبردنیان بە برسێتی دەدەن، بە تایبەت هەژارە موحتاجەکانیان، ئەوەبوو بە چەند بیانوویەکی بێ نرخ و ناهەق جیرەی دەستنیشان کراوی ئەوانیان بڕی..

ئەم حاڵەتەی کە ئەوپەڕی پلەکانی گریان دەورووژێنێت، ئێمە لە بریی سکاڵا، بە پێکەنین ڕووبەڕووی دەبینەوە، بە وێنەی پێکەنینی ئەو مناڵە و.. کێشەکەمان بە خوای گەورەی بەتوانا دەسپێرین و پشتی پێ دەبەستین.

□ پێشەکی‌یەك کە بەم دواییە کرا بە پاشکۆی دوابەرگری

لە سێهەم ڕۆژی ئەو "تا" یەکجار سەختەی کە لە ئەنجامی ژەهر پێدانم لێم هات و، ماوەی سێ ڕۆژ ڕێی خواردنی لێ گرتم، مەگەر پەرداخێك ماست یان پەرداخێك شیر.. لەو سێهەم ڕۆژەدا، کتوپڕ ختوورەیەکم بە دڵدا هات. ئیتر ئەو ختوورەیەم وەك پێشەکی‌یەك بۆ بەرگری‌یەکەم لە دادگا، نووسی. جا ئەگەر توندوتیژی، یان ناتەواوی‌یەکی تێدا هەبێت، ئەوا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشی‌یەکەم.

بەوپەڕی توانام هەوڵم داوە "ڕاستی" وەکو خۆی بە دروستی و ڕێکوپێکی دەربخەم و بەم ئەندازەیە ڕوونی بکەمەوە. چونکە من هاوکات لەگەڵ ئەو ماندووبوونەی کە مێشکم دووچاری بووە و، ئەو سەختی و تەنگانەیەی پێوەی دەتلێینەوە و، ئەو بارودۆخە بێزاری بەخشانەش کە تیایدا دەژیین، ناچارم بەرگری لە سەد کەس بکەم.

مەبەستیشم لەم شێوازەم لە سەرجەم لاپەڕەکانی بەرگری‌یەکەمدا، کە شێوەی زۆرانبازیی لەخۆگرتووە لەگەڵ ڕێکخراوێکی نهێنی و ترسناکدا، ئەمەی خوارەوەیە:

حکوومەتی کۆماری کە "جیاکردنەوەی ئایینی لە دەوڵەت" قبووڵ کردووە، نابێت خۆی لە قەرەی ئایینداران بدات بەهۆی ئایینەکەیانەوە، هەروەك خۆی لە قەرەی موڵحیدان نادات، لەبەر ئیلحادەکەیان.

هەروەها دەمەوێت ئەم حکوومەتە کۆماری‌یە، کە دەبێت بێ لایەن و سەربەست بێت، جیا بکەمەوە لەو ڕێکخراوە نهێنی و ترسناکانەی کە لایەنی ئیلحاد دەگرن و، پیلان ساز دەکەن و، کارمەندانی حکوومەت دەخافڵێنن. دەمەوێت حکوومەت تابلێی لەم ڕێکخراوانەوە بەدووربێت.

لە ڕاستیدا من تەنها لە دژی ئەو پیلانگێڕانە خەبات دەکەم کە هەندێکیان دزەیان بۆ ناو کارمەندی‌یەکانی دەوڵەت کردووە. چونکە ئەوانە بە گەرموگوڕی بەدواداچوون بۆ ئاییندارن دەکەن و، دوو تۆمەتی ئامادەیان پێیە دەیانلکێنن بەو ئاییندارانەوە کە ڕقیان لێیانە و، بەو دوو تۆمەتەش هەوڵی خەڵەتاندنی حکوومەت دەدەن:

*یەکەمیان* : "کۆنەپەرستی" بە واتای مەیل نەدان بەلای ئیلحادی ئەواندا.

*ئەوی تریان* : "قۆستنەوەی ئایین وەك ئامرازێك بۆ سیاسەت" بە واتای ئەوەی کە شوێنکەوتووانی ئەم حکومەتە ئیسلامی‌یە سیاسەتەکەیان ئیلحادە[1]. نەخێر.. نەخێر.

بەڵێ، بێ هیچ گومانێك حکومەتی کۆماری بەرەو بە بیروبۆچوونەکانی ئەو رێکخراوە نهێنی‌یە خراپکارە نادات و لایەنیان ناگرێت، کە چەند بیروبۆچوونێکن زیان بە گەل و نیشتمان دەگەیەنن. بەڵکو "یاسای کۆماری" قەدەغەکردنیان دەخوازێت. لەبەر ئەوەی لایەنگرتنی ئەو چەشنە خراپکارانە هەرگیز جێبەجێکردنی بناغە راستەقینەکانی "کۆماری" ناهێنێتەدی، چونکە لە دژی ئەو بناغانەن.

کەواتە دەبێت حکوومەت حەکەمێکی عادل بێت لە نێوان ئێمە و ئەو خراپکارانەدا، ئیتر هەر لایەنێکمان ستەمکار و دەست درێژیکار بوو، با بە دادگەری بڕیاری لەسەر بدات!

بەڵێ، نکوولی لەوە ناکرێت کە هەر لە سەرەتای بەدیهاتنی مرۆڤەوە کوفر و ئیمان لە ململانێدان و، هەتا رۆژی قیامەتیش هەر بەو جۆرە دەمێننەوە. خۆ هەرکەسێك لە ناوەرۆکی کێشەکەمان تێبگات، ئەوا دەزانێت کە ئەو هێرشەی کراوەتە سەرمان تەنها و تەنها دەستدرێژی‌یەکی ئاشکرا و راستەوخۆیە لە لایەن کوفرەوە بۆ سەر دینداران.

سەرهەڵدانی زۆرینەی دانا و فەیلەسووفەکان لە خۆرئاوا و ئەورووپادا.. هاتنی زۆربەی پێغەمبەرانیش لە خۆرهەڵات و ئاسیادا، هێمایەکە لە لایەن قەدەری خوای گەورەوە بۆ ئەوەی کە تەنها "ئایین" بەسەر ئاسیادا زاڵە. بێ گومان ئەم حکومەتە کۆماری‌یەی کە لە بەشی پێشەوەی ئاسیادایە، سوود لەم لایەنە سروشتی‌یەی ئاسیا وەردەگرێت و، بناغەی بێ لایەنی‌یەکەی بە جۆرێك دادەرێژێت کە پتر لایەنی دینداری بگرێت تا ئەوەی مەیلی بەلای کوفردا بچێت.

---

(١) واتە ئەوان دەڵێن: سیاسەتی حکوومەت - لە روانگەی ئەوانەوە - بریتی‌یە لە ئیلحاد. کە حاشا وا نی‌یە. ئنجا ئەم خزمەتەی ئێمەش، کە بۆ هێنانەدیی ئیمانە بەو پەیامانەی نوور کە لە دەقەکانی قورئانی حەکیمەوە داچۆڕاون، گوایا سیاسەتێکە لە دژی ئەو سیاسەتەی حکوومەت! ئیتر بەم کارە بوختانێکی گەورە هەڵدەبەستن. (دانەر)

ماددەی دووهەم:

لەوانەیـە مەسـەلەیەك بخرێتـە ڕوو کـە بوونـی چـەند بابەتێکـە لـە چـەند بەشـێکی پەیامەکانی نووردا پێچەوانەی یاسا بن..

ئەم ڕووەی کێشەکە تایبەتە بە دادگاوە. بەڵام خـودی پەیامـەکان زیـاد لـە سـەد "دۆزینـەوە"ی مەعنـەوی‌یان لـەخۆگرتووە، دەبێـت مـافی "دۆزەرەوە" و بەزایەنـەدانی تەنـانەت مـافی یـەك دۆزینـەوەیان بپـارێزرێت. چونکـە ئـەم دۆزینەوانـە لـە لای حەقیقەتخوازان و زانایان و ئـەدیبان گرنگیی خۆیـان هەیە و، ناگونجێت هیـچ کەسێك دۆزینەوەی دۆزەرەوە بکات بە هی خـۆی. خۆ ئەگەر کەسێك ئەو دۆزینەوەیە بە هی خۆی ناوزەد بکات، ئەوا دەبێت دۆزەرەوە داوای لەسەر تۆمار بکات. ئەمەش یاسایەکە لە هەموو دەوڵەتەکاندا کاری پێ دەکرێت.

ئەو پەیامانەی نوور کە پێم خۆشە، دوای بەدەستهێنانی ڕەزامـەندیی حکوومـەت، لـە داهـاتوودا بڵاویـان بکەمــەوە، نزیکـەی سـی سـاڵە هـەوڵم بـۆ دانانیـان و تـەقالام بـۆ دۆزینـەوەیان داوە. کەواتـە ئـەو پەیامانـە ئەنجامی مـاوەی پـەنجا سـاڵی کۆششـی مـن و بەروبوومی لـێ وردبوونـەوە و پشـکنین و تێڕامـانی خۆمـن لـە چـەندین سـەرچاوەی جۆراوجۆردا و، سـەد دۆزینـەوەی مەعنـەوی ئاشکرا دەکـەن کـە هـەزاران حەقیقـەتیان لەخۆ گرتووە. هەموو ئەمانەش لە چەند بەشێکدا کە لە سەد پەیام زیاترن.

لەبەر ئەوە، پێش چاو خستنی تەنها پازدە خاڵی ئەو پەیامانە کە لەگەڵ هەندێ یاسادا یەك ناگرنەوە، لە شێوەی تۆمـەتبارکردندا، ڕێ بـۆ ئـەوە ساز دەکـات کـە خـەڵکانی تر بیـاندزن و بە هـی خـۆیانی دابنێـن. چونکــە ئـەو کـارە دەبێتـە هــۆی زایـەبوونی ئـەم حەقیقەتانە و لەناوچوونی مافەکانی منیش کە پەیوەندی‌یان بەو حەقیقەتانەوە هەیە.

تا لێرەوە من پێش هەموو شتێك، بە ناوی حەقیقـەت و مافەکانـەوە، داوای پاراستنی مافی خـۆم دەکـەم و، ئومێدم وایـە کـە ئەم داوایەم یەکەم ڕووی ئـەم کێشـەیە بێـت کـە دادگای دادوەرتان بۆی بڕوانێت.

ئەو ڕاستی‌یانەی کە ئەو پەیامانەم لـەخۆیان گرتـوون، کـە لـە ئـەنجامی ئـەو گومانـەی ئامرازی تاوانێك بن دەستیان بەسەردا گیراوە، پێویستە لە بەردەستمدا بن. چونکە ئەوانە

سەرچاوەی ئیسپاتن بۆ من لە بەرامبەر زانایان و ئەهلی فەلسەفە و لێکۆڵەرانی توێژینەوە ئاکادیمیەکانەوە. بۆیە داوا دەکەم ئەو پەیامانەم بۆ بگێڕنەوە بۆ سەلماندنی ئەو دۆزینەوە و مونازەرە زانستیيانەی کە تیایاندایە. تەنانەت گەر بڕیاریشم لەسەر دەربکەن، ئەوا ئەو پەیامانە هیچ بڕیارێکیان لەسەر نی‌یە و، دەبێت هاوڕێم بن لە بەندیخانەدا.

بێ گومان دادگای دادپەروەر خۆی لەوە بەرزتر ڕادەگرێت کە گوێ بۆ قسەی خەڵکانی قین لە دڵ بگرێت، کە کارێکە ڕێز و شەرەف و دادپەروەریی دادگا دەڕووشێنێت و، پشت بە خوا پیلانە نەزۆکەکانی ئەوان پووچەڵ دەکاتەوە.

من لێرەدا تەنها بە ناوی خۆمەوە قسە ناکەم، بەڵکو بە ناوی ئەو ڕاستی‌یە بەرزەوە دەدوێم کە گەلێ "ڕاستی" پەیوەستن پێ‌یەوە و پەیوەندی‌یان بە مافەکانی گەلێ کەسی بێ تاوانەوە هەیە و، پشت بەوە دەبەستن کە دادگا پلەیەکی بەرزتر شك نابات لە وەرگرتنی مافەکان و هێنانەدیی دادپەروەری. تەنانەت ڕزگارکردنی دادپەروەری و، دووربوون لە هیچ کاریگەرێکی دەرەکی، خواستی ئەو" دادپەروەری"یەیە کە جێبەجێی دەکات. بۆیە پێویستە پەلە بکرێت لە بەرپەرچدانەوەی ئەو گومانە ناڕەوایانە، ئەوەش بە ڕاگەیاندنی ئازادیی پەیامەکانی نوور.

ماددەی سێ‌هەم:

لەو گوناهە وەهمی‌یەوە کە دەخرێتە پاڵمان ئەوە دەخوێنرێتەوە کە مەحکووم بوونم بە دوای خۆیدا بهێنێت! چونکە مەبەست لەو گوناهە وەهمی‌یە ئەوەیە کە ڕواڵەت و گشتی بوونی ماددەی "١٦٣"ی یاسای سزا و دەستەواژە گشتی‌یەکەی بمانگرێتەوە، بە بێ ئەوەی بەستێنە پارێز(القیود الاحترازیة)ەکانی ڕەچاو بکرێت.. هەرچەند ئەو بەرگری‌یانەم کە لە فایلە ڕەسمی‌یەکانی بەردەستاندا تۆمار کراون، چەندین وەڵامی ڕاستەقینە و گومان بڕیان لەخۆ گرتووە بۆ ئەو گوناهەی کە خراوەتە پاڵ من. ئەوەتا دەبینن بەهۆی دە، یان پازدە خاڵەوە ڕەخنە لە پەیامەکانی نوور دەگیرێت و سزا دەدرێت، لە بریی ئەوەی کە خەڵات بکرایە و، ڕێزی شایانی لێ بگیرایە، چونکە سەد دۆزینەوەی مەعنەوی و سەدان ڕاستیی گرنگیان لە زیاتر لە سەد بەشیدا لەخۆ گرتووە.

ئایا مافی خۆم نی‌یە کە داوای ئەم مافەم و مافی ئازادیی پەیامەکان بکەم؟ بەڵکو ئەمە کارێکی پێویستە.

ماددەی چوارەم:

بێ گومان ئەوانەی کە تا ئێستا هێرشم دەکەنە سەر و حکوومەت لە دژمان دەوروژێنن، کەسانێکی ڕق لە دڵن و، ئامانجی تایبەت بە خۆیان هەیە، چونکە هیچ دەرگایەکیان نەهێشتەوە کە لێی نەدەن بۆ دووچارکردنمان..

ئەوەبوو لە پێشدا ئێمەیان بەوە تۆمەتبار کرد کە خاوەن تەریقەتێکی سۆفیین. کەچی شتێکیان دەست نەکەوت تۆمەتەکەیان بسەلمێنن.. پاشان تۆمەتی "دامەزراندنی کۆمەڵە".. ئنجا تۆمەتی "نەیاری کردن بۆ یاساکانی کودەتای نوێ و.. پێکهێنانی کۆمەڵە نهێنییە نەیارەکانی دەوڵەت و.. پەخش کردنی چەند بڵاوکراوەیەك بە بێ ئیزنی حکوومەت".. هەروەها تۆمەتە زۆرەکانی تری هاوچەشنی ئەمانەیان دایە پاڵمان. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکیان نەدۆزییەوە کە بیکەن بە بەڵگەی تاوانبارکردنمان.

وا ئێستا لە کۆتاییدا دەیانەوێت ماددەیەکی یاساییمان بەسەردا بسەپێنن، بێ ئەوەی "بەستێنە پارێز"ەکانی بە هەند وەربگرن. بەڵکو دەچن سوود لە گشتی بوونی ڕواڵەتی ئەو ماددەیە وەردەگرن، بە شێوەیەك کە هیچ مرۆڤێکی ژیر قبووڵی ناکات و، هیچ کەسێکی خاوەن ویژدانیش ئەو مافەیان ناداتێ.

بەڵێ، کەسێك نییە لە سەرانسەری دنیادا کە هێندەی گەردیلەیەك ژیری و ویژدانی هەبێت، ئەو ماددەیەی پێ قبووڵ بێت کە باسی دەکەن و، بێ هیچ گومانێك دەڵێت: "ئەوە بوختانێکی سەرتاسەرییە". کە بریتییە لەوەی وتوویانە:

"سەعیدی کوردی ئایین لە پێناوی سیاسەتدا بەکاردەهێنێت".

چونکە ئەو بەڵگانەی کە ئەم گومانە پووچەڵ دەکەنەوە دەگەنە بیست بەڵگە و، نزیکەی دە بەڵگەشیان لە فایلە ڕەسمییەکانی بەرگرییەکانمدا تۆمار کراون.

وا تەنها یەك دانە لەو بەڵگانە بە شایەتیی سەدان شایەت باس دەکەم:

لە بەرچاوی خەڵکی گوندی بارلا، کە نۆ ساڵ تیایدا مامەوە و، بە شایەتیی هاوڕێیانم لە ئیسپارتە کە نۆ مانگ لەوێدا نیشتەجێ بووم، هەروەها ئەو هاوڕێیانەشم دەگرم بە شایەت کە لە نزیکەوە دەمناسن، لەسەر ئەوەی کە:

مـن مـاوەی سـیازدە سـاڵە هیـچ ڕۆژنامەیـەکم - کـە زمانحـاڵی سیاسـەتە - نەخوێندووەتەوە و، گوێـم لـە خوێندنـەوەی نـەگرتووە و، داواشـم نـەکردووە. تەنانـەت نەمویسـتووە ئـەو ڕۆژنامانـەش ببینـم کـە لـەو ڕووداوانـە دواون گومـان دەبرێـت پەیوەندی‌یـەکیان بـە کەسی منەوە هـەبێت و، سـەرنجی خـەڵکی ڕادەکێشـن. هـەروەك نەمخوێندوونەتەوە، داوای ئەوەشم نەکردووە کەسێك بۆم بخوێنێتەوە.

ئایا ئیتر کە سەبارەت بە سەعید دەوترێت: "ئایین دەکات بە ئامرازێك بۆ سیاسەت"!

کـە ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت ئـەو ئایینـە ڕاسـت و ڕەوایـەی بـاوەڕی پـێ هێنـاوە و ڕاستی‌یەکی بەرز و خاوێنە و ئیمانی ڕاستەقینەیە، دەیکاتە ئـامرازێك بـۆ سیاسـەت، واتـە دەیکاتە ئـامێرێك بـۆ ئامـانجێکی نزمـی نـەزۆك کـە مـافی زۆر کەسـی تێـدا دەفـەوتێت، بـۆ مەبەستێك کە گوناهێکی گەورەی ئاوێتە دەبێت!!

ئنجـا بـەچی ئـەم کـارە دەکـات؟ بـەو پەیامانـەی نـوور کـە دوای ئـەو وردەکاری‌یـە قووڵانـەی حکوومـەت تیایـاندا ئەنجامی دان، دەرکـەوت ئـەو پەیامانـە ڕوویـان تەنـها لـە ئاخیرەت و ئیمان و حەقیقەتە، پازدە ماددەیان نەبێت!!

ئایـا ئـەو کەسـەی گوفتـاری وای لـە زار دەردەچێـت، تێناگـات کـە ئـەم قسـەیەی دوورترین شتە لە ژیری و ویژدانەوە؟!

بێ گومان دادگای دادپەروەر دەست بە ڕووی ئەم چەشـنە گومانـە نـاڕەوا و تۆمـەت هەڵبەستنە ستەمکارانەیەوە دەنێت و، سەبارەت بە ئێمەش حەق و ڕاستی دەهێنێتەدی.

هەرچەند نەزانینی یاساکان لە لایەن زۆرینەی خەڵکەوە نابێتە بیانوو، بـەڵام کەسێك لە گوندێکی دوورە دەست و لە ژێر چاودێریدا و لە شـارێکی تـری جگـە لـە شـارەکەی خـۆیـدا و، دوورە پـەرێز لـە دنیـا و، بـە زۆرەملـێ و دوورخـراوەیـی لـەوێ نیشـتەجێ کرابێت و، بەردەوام بێزار بکرێت.. نەزانینی یاساکان لە لایەن ئەو کەسەوە، بێ گومان لای خەڵکانی بەویژدان وەك بەهانەیەك وەردەگیرێت.

جا ئەو کەسە منـم.. چونکـە زانیـاریم لـەبارەی هیـچ ماددەیـەکی یاسـاوە نـەبووە کـە ئەوانە بە گومانێکی هەڵە منی پێ تاوانبـار دەکـەن. تەنانـەت نـەمدەتوانی بـەم پیتـە نوێیانـە ئیمزای خۆیشم بکەم و، هەندێ جاریش لە مـاوەی دە ڕۆژدا کـەس نـابینم جگـە لـەوەی

کە لە کاروباری تایبەتیمدا یارمەتیم دەدات. چونکە هەموان لەوە هەڵدێن کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکەن. زیاد لەوەش توانام نی‌یە پارێزەرێك بکەمە بریکارم کە بەرگریم لێ بکات. لە لایەنی خۆیشمەوە دەستووری: "فێڵ لە وازهێناندایە لە فێڵ"م کردووە بە دەستووری درێژایی ژیانم..

لەبەر ئەوە، هەر بەردەوامم لە وتنی قسەی ڕاست و دروست و ڕاستی، لە سەرجەم داوەری‌یەکاندا.

جا لەسەر بناغەی ئەوانەی باس کران، دادپەروەری وا دەخوازێت کە بە چاوی لێبوردن و چاوپۆشی‌یەوە سەیری ئەو دەستەواژانەم بکرێت کە لەگەڵ یاساکانی ئێستا و ڕێ و شوێنی ڕەسمیدا ناگونجێت، چ لە بەرگری‌یەکانمدا، چ لە چەند پەیامێکی نووردا.

ئەو خاڵانەی کە بە پوختی لە بەرگری‌یەکانمدا هاتوون، لەو نامەی بەرپەرچدانەوەی لائیحەی ئیددیعایەدا ڕوون کراونەتەوە، هەروەها ئەو مادده کورت و پوختانەش کە لە بەرپەرچدانەوەکەدا هەن، لە بەرگری‌یەکانمدا ڕوون کراونەتەوە. کەواتە هەریەکەیان ئەوی تر تەواو دەکات.

ئەو واتایەی کە هاودەم لەگەڵ "بەستێنە پارێز"ەکاندا ماددەی "١٦٣" لەخۆی گرتووە، مەبەستی دانەری یاساکە ئەوەیە کە:

"ئایین هاندەری تێکدانی ئاسایش نەبێت".

جا لەبەر ئەوەی هیچ ئاماژە و نیشانەیەك نی‌یە کە هێما بێت بۆ تێکدانی ئاسایش نە لە خۆم و نە لە پەیامەکانمدا، ئەوا ئەم ماددەیە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە کێشەکەمانەوە نی‌یە و، هیچ ڕوویەکیش نی‌یە کە سزادانمان بخوازێت. ئەمەشمان بە جۆرێکی بێ گومان سەلماندووە، وەك لە فایلە ڕەسمی‌یەکاندا هەیە..

لەبەر ئەوە، شایانی شکۆی دادگا نی‌یە کە بە کاریگەریی ئەو گومانانەی لە سەرەتادا باس کران، ئەم مادده یاساییە پێش چاو بخات و، بە پێی ئەو ماددەیە سزامان بدات.

لەبەر ئەوە، داوای بڕیاری بێ تاوانیم دەکەم و، لە دوا وشەمدا دەڵێم:

﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران: ١٧٣).

﴿حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (التوبة: ١٢٩).

## ئیعتیرازێك لەسەر داواكاری گشتی

ئەی دەستەی دادوەر و ئەی داواكاری گشتی!

هەموو یەكێك لەو ماددانەی كە لە لائیحەی داواكردنی گشتیدا هاتووە سەبارەت بە هۆی تاوانبار كردنم، هەموویان لەو بەرگرییانەمدا وەڵام دراونەتەوە كە لە فایلە رەسمییەكانی فەرمانگەی لێكۆڵینەوەدا تۆمار كراون. ئنجا "دوا بەرگریم" كە سی و پێنج لاپەڕەیە، لە بریی ئیعتیرازێك پێشكەش دەكەم. بەڵام بە مەبەستی ئەوەی كە سەرنجی "دادپەروەری" و "ویژدان" بۆ خاڵێكی گرنگ رابكێشم، دەڵێم:

چ ویژدانێك بەوە قایل دەبێت كە من بە هەوڵی تێكدانی رێسا و ئاسایش تۆمەتبار بكات، وێڕای ئەوەی كە ماوەی دە ساڵ هیچ نیشانەیەك لە منەوە دەرنەچووە سەبارەت بە تێكدانی رێسا و ئاسایش، لە كاتێكدا كە من كەسێكی ستەم لێ كراوم و، لە پارێزگای ئیسپارتە لە ژێر گوشارەكاندام؟

خۆ ئەگەر رووی جێبەجێ كردنی ماددەی یاسایی "١٦٣" دەرهەق بە ئێمە لێكبدرێتەوە، ئەوا دەبێت لە پێشدا سەرۆكایەتیی كاروباری ئایینی و، سەرجەم پێشنوێژ و وتاربێژ و ئامۆژگارەكانیش بگرێتەوە، لەبەر ئەوەی هەموومان لەگەڵیاندا بەشدارین لە رێنمایی و ئاراستەكردنی خەڵكیدا بۆ ژیانی ئایینی. چونكە ئەگەر یاساكە بەم چەمكە هەڵە ئاشكرایە لێك بدرێتەوە، واتە بەوەی كە رێنمایی ئایینی "ئاسایش و رێسای ناوخۆ تێكدەدات" ئەوا دەكرێت هەموو ئەوانەش بگرێتەوە!

بەڵێ، من لە ڕوویەكەوە لەوان زیاترم، ئەویش ڕوونكردنەوەی ڕاستییەكانی ئیمانە بە شێوەیەكی هێندە ڕوون كە هیچ گومانێك نەهێڵێتەوە.

خۆ ئەگەر ئەو گریمانە مەحاڵە دابنرێت و بە گشتی رەخنە لە ئایینداران بگیرێت، ئەوا ئەم حاڵەتە خۆی بۆ خۆی دەبێتە هۆی رزگاربوونمان لە رەخنە!

بێ گومان شایانی روانینی دادپەروەرانە نییە كە بیست كەسی بێ تاوان بخرێنە بەندیخانە و دووچاری بارێكی سەخت و دژوار بكرێن، دوور لە كەسوكار و هەوڵ و كۆشش و كەسابەتیان، بە هۆی منەوە و، لەسەر بناغەی ماددەیەك كە دوای ئەم هەموو

لێکۆڵینەوەیە و تا ئەم ڕادەیەش، هیچ شتێکی لەسەر من نەسەلمابێت.. تەنانەت ئەگەر لە ڕاستیشدا بسەلمێت، ئەوا لە پێش چاوی دادگەریی ڕاستەقینەدا هیچ تاوانێك پێکناهێنێت.. خۆ ئەگەر تاوانێکیش بێت، ئەوا تەنها من لێی بەرپرسم.

بەڵێ، تەنها بەهۆی کەمترین پەیوەندیەوە لەگەڵ مندا گەلێ کەسی بێ تاوان بە "گرتن و دەست بەسەر کردن" زیانی یەکجار زۆریان پێ گەیشتووە.

لە لائیحەی ئیددیعادا سەبارەت بە دوورخستنەوەی من بە جۆرێك باس کراوە کە ئەوە بگەیەنێت بەشداریم لە ڕووداوەکانی خۆرهەڵات (شێخ سەعید)دا کردبێت.

لە وەڵامدا دەڵێم:

تەنها لە ڕووی حەزەرکردن و ئیحتیاتەوە من دوور خراومەتەوە. ڕوونکردنەوەی زیاتر سەبارەت بەم بابەتە لەو تۆمارەمدا هەیە کە لای حکوومەتە. چونکە من ئەو کاتە - وەکو ئێستا - لە خەڵکی گۆشەگیربووم. ئەوەبوو خۆم و کەسێك کە خزمەتی دەکردم بە تەنیا لە ئەشکەوتی چیایەکدا دەژیام. کەچی هاتن منیان دەستگیر کرد و، بۆ ماوەی دەساڵ نیشتەجێی زۆرەملێیان بەسەردا سەپاندم، نۆ ساڵی لە گوندێکدا و یەك ساڵیش لە ئیسپارتە. لە کۆتاییدا دووچاری ئەم گرفتەیان کردم.

☐ سێهەم لائیحەی ئیددیعاء:

ئەم بڕگەیەی خوارەوە لە لائیحەکەدا هاتووە:

(کاتێك لە بارلا بوو، پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی دوور و نزیکدا بەست و، یارمەتیی ماددی و مەعنەویی لەوانەوە بۆ خۆی دەستەبەر کرد و، چالاکیەکانی بە دانانی چەند نامیلکەیەك دەست پێ کرد کە ناوی "پەیامەکانی نوور"ی لێ ناون و، بەشێکی ئەو پەیامانەشی یەك لە دوای یەك بەوان نووسیوەتەوە و، چەند نوسخەیەکی زۆری لەبەرگرتوونەتەوە و، بە شێوەیەکی پەنهان و بە ڕێنمایی پیاوەکانی و بە چەندین هۆکاری جۆراوجۆر بڵاوی کردنەوە، بە تایبەت لە ئەنتالیا و ئەیدن و میلاس و ئەگریدر و دینار و وان و ناوچەکانی هاوچەشنیاندا. هەندێ لەو پەیامانەش کە کاریگەرییان لەسەر ئاسایشی ناوخۆ دەبێت ئەوەی لەسەر داناون کە: چەند نامەیەکی نهێنی و تایبەتن، یان شێوە تایبەتن. بەمەش ئەو ئامانجەی خۆی دەرخست کە لەم پەیامانەدا هەیەتی..).

ئەم وەڵامە ڕوون و گومان بڕەی خوارەوە لەگەڵ "دوابەرگریم" پێشکەش دەکەم کە لە فایلە ڕەسمی‌یەکاندا تۆمار کراوە و، سی و پێنج لاپەڕە دەبێت لە شێوەی نامەیەکی ئیعتیرازدا.. دەڵێم:

سەد هەزار جار حاشا.. هەرگیزاو هەرگیز من زانستی ئیمانم نەکردووە و نایشیکەم بە ئامرازێك بۆ هیچ شتێکی تری جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە. مافی هیچ کەسێکیش نی‌یە بیکات.

لە ماوەی بیست ساڵدا سەد و بیست و پێنج پەیامم لە ژێر ناوی "پەیامەکانی نوور"دا داناوە و، ئەوانەشیان لەسەریان نووسراوە "پەیامی تایبەتی و نهێنی" تەنها سێ دانەیە. بۆ ئەوەش ئەو پەیامانەمان کرد بە پەیامی "تایبەتی" تاکو نەبێتە مایەی ڕیا و لەخۆبایی بوون.

وا ئێستا ناچارم پەردەی نهێنیتی لەسەر ئەو پەیامانە لابدەم و، بڵێم:

یەکێك لەو سێ پەیامە نهێنی و تایبەتە بریتی‌یە لە "کەرامەتی غەوسی" دووهەمیشیان "کەرامەتی عەلەوی" سێ‌هەمیشیان چەند پەیامێکن تایبەتن بە ئیخلاسەوە.

ئەو دوو پەیامەیان کە تایبەتن بە کەرامەتەوە، بریتین لە ئاماژەکانی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و شێخی گەیلانی - قدس سره - بۆ ڕێزلێنان و نرخاندنی خزمەتەکانم بۆ قورئان، بە شێوەیەك کە سەد جار لە سەرووی سنووری خۆمەوەیە. ئەو پەیامەش کە تایبەتە بە نهێنیی ئیخلاسەوە، بە ئیزنی خوای گەورە مرۆڤ لە ڕیا و خۆپەرستی و لەخۆبایی بوون ڕزگار دەکات و، تایبەتە بە برایانی تایبەتمەوە.

ئیتر ئایا ئەم پەیامانە چ پەیوەندی‌یەکیان بە ئاسایشی ناوخۆوە هەیە؟ هەتا بکرێنە مایەی تۆمەتبار کردنم؟

بەشی دووهەمی پەیامە تایبەتەکان چەند پەیامێکن کە نۆ ساڵ پێش ئێستا، کاتێك ئەندامی "دار الحكمة الاسلامية" بووم، لە بەرپەرچی ڕەخنەکانی ئەوروپا و، هێرشە بێ پەردە کافرانەکەی "عەبدوڵا جەودەت"دا نووسیومن و، دوو نامەشیان لە شێوەی سکاڵادا نووسیومن لەو دەستدرێژی‌یە ستەمکارانە ئابڕووبەرەی کە لە لایەن هەندێ کارمەندەوە کرایە سەرم و، هەردوو نامەکەش لە بەرگری‌یەکەمدا باس کراون.

ئنجا دوای ماوەیەك لە دانانی ئەم چوار پەیامە، ڕێم لە بڵاوکردنەوەیان گرت، تاکو بە هیچ شێوەیەك خۆیان لە قەرەی یاساکانی ئازادی و کاروباری حکومەت نەدەن و،

وتم: ئەمانە چەند پەیامێکی تایبەتن. ئیتر تەنها لـە نێوان یەك دوو برای یەکجار تایبەتمدا مانەوە. بەڵگەشم بۆ ئەمە، نەبوونی هیچ کام لەو پەیامانەیە لە هیچ شوێنێکدا، سەرباری پشکنینی زۆری ئێوە. بەڵام "پێڕست"ی هەموو پەیامەکانتان کەوتە دەست و، لەم ڕێیەوە ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵانە بوو بە کارێکی پێویست. وەڵامی هەمووشیانم دایەوە و لە فایلە ڕەسمی‌یەکانی ئێوەدا تۆمار کراون.

لە لائیحەی ئیددیعاکەدا ناوی چەند ناوچەیەك هاتووە و، باس لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور دەکات لەو ناوچانە لە ڕێی پیاوەکانمەوە!

*لە وەڵامدا دەڵێم:* من بە نامۆیی و بێ پشت و پەنا لە گوندێکی دووردا دەژیم و، ناتوانم بە باشی بنووسم. ئنجا لەبەر ئەوەش کە لە ژێر چاودێریی بەردەوامدام، ئەوا خەڵکی دەوروبەر خۆیان لە یارمەتیدانم دەپارێزن..

ئیتر بزانن ئەو قسەیە چەندە دژی ڕاستی‌یە کە بە بێ بنەما هەڵی دەڕێژن و دەڵێن: "هەوڵی بڵاوکردنەوە و گشتاندنی پەیامەکان دەدات" تەنها لەبەر ئەوەی کە هەندێ تیڕوانینی ئیمانیم وەك یادگارێکی جوان بۆ چەند کەسێکی یەکجار کەمی خۆشەویستانم ناردووە کە ژمارەیان لە پێنج کەس زیاتر نی‌یە؟

خۆتان هەڵوێستەکە هەڵبسەنگێنن!

ئیتر چۆن دەبێت بە ناردنی یەك دوو نامەی ئیمانی، کە بۆ برادەرێك نێردرابێت لە "وان" بووترێت: "بڵاوکردنەوە"؟ لەکاتێکدا کە من ماوەی پازدە ساڵ لەوێ وانەم وتووەتەوە و، زۆر لە سنووری خۆیشم زیاتر ڕێز و ڕووتێکردنی خەڵکی ئەوێم بەدەست هێنا.

بێ گومان من توانای " بڵاوکردنەوە"م نی‌یە، چونکە نە خاوەنی چاپخانەم و، نە چەند نووسەرەوەیەکم لەلایە و، نە خۆیشم دەتوانم بە باشی بنووسم. بەڵام "پەیامەکانی نوور" تایبەتکاریەکی کێش کردنیان هەیە کە بە خۆیان بڵاودەبنەوە! هێندە نەبێت کە پێش بڕیاردان لەسەر پیتە نوێیەکان "وتەی دەهەم"مان چاپ کرد کە تایبەتە بە حەشرەوە و، بەرپرسانی حکوومەت و پەرلەمانتاران و والی‌یەکان نوسخەیان لێ دەست کەوت و، کەسیشیان ئیعتیرازی لێ نەگرت و، هەشت سەد نوسخەشی لێ بڵاوکرایەوە.

ئیتر بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم وتەیەوە هەندێ کەس چەند پەیامێکی هاوشێوەی ئەویان لە پەیامە ئیمانی‌یە قیامەتی‌یە بێگەردەکان دەست کەوت.

بێ گومان من بەم بڵاوبوونەوەیەی کە لە خۆیەوە و بە بێ ویستی ئێمە بووە، دڵخۆش بووم و، ئەم ڕێز و دڵخۆشی‌یەم لە شێوەی هانداندا لە هەندێ نامەدا نووسی.

لە ئەنجامی ئەو پشکنینە وردەی کە سێ مانگ پێش ئێستا کرا، لای تەنها پازدە بیست کەسی ئەم وڵاتە فراوانە کتێبەکانی منیان دۆزی‌یەوە..

جا ئایا دۆزینەوەی ئەو پەیامانە لای هاوڕێیانی کەسێك بە "بڵاوکراوە" دادەنرێت کە سی ساڵی تەمەنی لە نووسیندا بەسەر بردووە؟

یان ئایا چۆن دەبێت بوترێت: ئامانجێکی لە پشت ئەم بڵاوکراوانەوە هەیە؟

بەڕێزان!

ئەگەر "دنیا" یاخود "سیاسەت"م مەبەست بووایە، ئەوا پەیوەندیم بە سەد هەزار کەسەوە دەردەکەوت، نەك پازدە و بیست کەس!!

بە هەرحاڵ.. لەو بەرگری‌یەم کە لە بەردەستتاندایە، ڕوونکردنەوەی زۆرتر هەیە سەبارەت بەم خاڵە.

* * *

لە لائیحەی ئیددیعاکەدا ئیعتیرازێك لەسەر "ڕاستی"یەك هاتووە کە ئەو ڕاستی‌یە خۆی لە خۆیدا وەڵامێکی زانستی‌یە لەوپەڕی ڕوونیدا بۆ ڕەخنەیەك کە شارستانێتیی نوێ لەبارەی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەوە گرتوویەتی:

﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء: ١١).

﴿فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء: ١١).

لە کاتێکدا ئەو ڕاستی‌یە لە هەموو تەفسیرەکاندا هاتووە.

هەروەها لە لائیحەی ئیددیعاکەدا ڕەخنە لەم دەستەواژەیە گیراوە کە لە پێرستەکەوە هێناویانە:

"وەرگێڕان جێگەی وشەکانی قورئان و ئەو زیکرانە ناگرێتەوە کە ڕیوایەت کراون".

ئەم مەسەلەیە پێش هەشت ساڵ ڕووی داوە و، ڕاستی‌یەکی زانستیی ئەوتۆیە کە ئیعتیراز قبووڵ ناکات.

بەڵام حکوومەت لە دوای ماوەیەکی درێژ و بەپێی خواستەکانی کاتی ئێستا، بە وەرگێڕانیان قایل بووە. ئیتر چۆن ئەو ڕاستی‌یە زانستی‌یە لە دژی من بەکاردەهێنرێت؟

نامەی سکاڵاکەش بریتی‌یە لە چوار خاڵ و، نەمداوە بە هیچ کەسێك. هەر لەبەر ئەوەش نەدۆزراوەتەوە و، باس لەو دەستدرێژی‌یە ستەمکار و وەحشیگەرانەیە دەکات کە لە لایەن بەڕێوەبەری ناحیە و چەند کەسێك لە هاوڕێیانی کردیانە سەر مزگەوتەکەم و، هەڵسوکەوتی نابەجێی قایمقام و کارمەندەکانیشی کە لەگەڵیدا بوون.

لە لائیحەی ئیددیعادا باس لەو تەوافوقە جوانە کراوە کە لە ژمارەی دێرەکانی "پەیامی حەشر"دا هەیە و هاوڕێکە لەگەڵ مێژووی دانانی و، مێژووی ڕاگەیاندنی کۆماریی بێ ئایینی عەلمانیدا کە ئایین لە دنیا جیا دەکاتەوە و، ئەوەش نیشانەیەکە لەسەر ئینکاری کردنی حەشر..

کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت گریمان هەیە گومڕایان و مولحیدان بە ئاشکرا ئینکاری کردنیان بۆ حەشر دەربڕن و، سوود لە بێ لایەنیی حکوومەتی کۆماری وەربگرن کە بەدواداچوون نە بۆ ئایین و نە بۆ ئیلحاد ناکات و، بە بێ لایەنی دەمێنێتەوە..

خۆ ئەمە هیچ ڕەخنەیەکی تێدا نی‌یە لە حکوومەت، بەڵکو ئاماژەیە بۆ بێ لایەنیی ئەو.

بەڵێ، هەر هەشت سەد نوسخەکەی "وتەی دەهەم" زمانی گومڕایانی لاڵ کرد و، نەیانتوانی ڕقی خۆیان دەربخەن، چونکە ئەو پەیامە ئینکاری کردنی ئەوانی بۆ حەشر لەناو دڵی خۆیاندا شاردەوە و، هەلی ئەوەی نەدان دەری ببڕن، ئەوەبوو بە بەڵگە گومان بڕ و بەهێزەکانی دەمی ئەوانی بەست.

بەڵێ، وتەی دەهەم کە باس لە پایەیەکی مەزنی ئیمان دەکات، کە حەشر و زیندووبوونەوەیە، وەکو شوورایەکی پۆڵایینی لێ هاتووە لە دەوری ئیمان و، گومڕایانی بێدەنگ کرد. بێ گومان حکوومەتی کۆماری ئەو پەیامەی پێ خۆش بوو، هەروەك لێیشی ڕازی بوو، بە ڕادەیەك کە لەناو بەرپرسە گەورەکاندا بەوپەڕی ئازادی دەستاودەستی پێ دەکرا.

ئەی دەستەی دادوەر! ئەگەر ئامانجی پەیامەکانی نوور "دنیا" بێت، یاخود بۆ "ئامانجێکی دنیایی" بن، ئەوا لە سەد و بیست پەیامدا دەیان هەزار شوێنی ڕەخنەگرتن دەبوو کە سەرنجەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن..

جا ئایا دروستە باخێکی بەپیت دابخرێت و خاوەنەکەشی بـە تاوانبـار دابنرێت، تەنـها لەبەر ئەوەی کە پازدە میوەی تاڵی، سەبارەت بە ئێوە، تێدا بێت لـە نێـوان سـەد و بیسـت هەزار میوەی شیرین و بەتامدا؟

وەڵامی ئەمە بە ویژدانی دادپەروەرانەتان دەسپێرم.

لـە دوابـەرگریمدا ڕوونم کـردەوە کـە: من مـاوەی سی سـاڵە و تـا ئێسـتاش وەڵامـی ڕەخنەکانی فەیلەسووفانی ئەورووپا و ئەو مولحیدانەش دەدەمەوە کە لەناوخۆی وڵاتـدا بـۆ حسابی ئەوان کار دەکەن و، پیلان و فێڵی چەپەڵ دادەڕێـژن. هەرکەسێك بـە وردی لـە پەیامەکانم بکۆڵێتەوە، تێدەگات کە دوای خۆم گوفتارم ئاراستەی ئەوان کردووە.

ئێستاش لێتان دەپرسم: ئایا بە چ شێوەیەك ئەو زلـلـە زانستییانە لـە دژی حکوومـەت دادەنرێن کە دەیانسرەوێنمە فەیلەسووفەکانی ئەورووپا و دەموچـاوی هـەر مولحیدێـك کـە بۆ حسابی بیانییەکان کار بکات؟

ئێمە لەمە تێناگەین! چونکە تەنانەت هیچ گریمانێکیش بۆ ئەوە دانانێین کـە ئـەم کـارە دژی حکوومەت بێت! بەڵکو پێمان وایە حکوومەتی کۆماری، کە بانگەشە بـۆ ئـازادی دەکات، بە ناوی خۆی و بە ناوی یاساوە پێخۆشحاڵیی خۆی بەم زللە زانستییە حەق و ڕەوایانە دەردەبڕێت و، هـەرگیز بـە چـەند ماددەیـەکیان دانـانێت کـە مایـەی بەرپرسـی و تۆمەتبارکردن بن.

پۆزش:

ئەم ئیعتیرازەم دوای سێ ڕۆژ لە بەدەست گەیشتنی لائیحـەی ئیددیعـادا نووسـراوە. ڕۆژی یەکـەم لائیحەکـە درەنـگ گەیشـت و تـا ئێـوارە خوێنرایـەوە. ڕۆژی دووهـەمیش بەشی هەرە زۆری تەرجەمە کرا. کەواتە ئـەم ئیعتیرازە درێـژەم بـە پەلـە نووسرا، چونکـە تەنها ماوەی شەش سەعاتم بۆ نووسینەوەی بە دەستەوە هەبوو.

جا لەبـەر ئـەوەی ڕێـی تێکـەڵ بوونیـان لـە خـەڵك لـێ گرتـووم، ئـەوا یاسـا و ڕێ و ڕەسمەکانی ئێستا شارەزا نیم، وەك لە بەرگرییەکەمدا هاتووە.

لەبەر ئەوە، ئەم ئیعتیرازەی کە لە ماوەی چوار پێنج سـەعاتدا نووسیومە، بێ گومـان ناڕێك و شێواو دەبێت. تکام وایە بە چاوی لێبوردنەوە بۆی بڕوانن.

# دوا بەرگری کە پێشکەش بە "دادوەری سزا" کراوە

باسمه سبحانه

"بەرگری"یەکە لە بەرامبەر ئەو تۆمەتانەی کە تایبەتن بــە منــەوە و، لە دوازدە لاپەڕەدا نووسراون، لە نێــوان بڕیــاری تۆمــەتبارکردندا کــە شەست لاپەڕەیە.

وەڵامە گومان بڕەکان بۆ ئەو ماددانەی کە لــە بڕیـاری تۆمـەتبار کردنەکـەدا هـاتووە، لەو بەرگرییەمدا هەیە کە لە فایلە ڕەسمییەکانی خۆتـاندا تۆمـار کـراوە. دیـارترینی ئـەم بەرگرییەش دواهەمینیانە کــە بیسـت و نۆ لاپەڕەیـە، لەگـەڵ نامـە نـۆزدە لاپەڕەییەکـەی ئیعتیرازەکەدا سەبارەت بەم بڕیارە ناڕەوا و تۆمەتە وەهمییانە.

ئەم دوو بەرگرییە، بە شێوەیەکی گومان بڕ، هەموو ئەو خاڵانە پووچەڵ دەکەنـەوە و بەرپـەرچیان دەدەنـەوە کــە لــە بڕیارەکــانی دادوەرانــی لێکۆڵینــەوەدا کراونەتــە مایــەی تاوانبارکردن و بناغەی تۆمەتەکان. هەروەك ڕوونی دەکەنەوە کــە ئــەو بڕیارانــەی ئــەوان بەتاڵە و هیچ بناغەیەکی نییە.

وا لێرەدا و لە پێنج ستووندا ڕوونی دەکەمەوە ئەو کەسانە لە کوێوە خەڵەتێنراون کــە تۆمەتبارمان دەکــەن و، ئــەو گوناهــە ناڕەوایــەیان لــە دژی ئێمــە لــە کوێ وەرگرتــووە و، پاڵپشتی ئەم بڕیارەیان چییە؟!

ستوونی یەکەم:

وەڵامە بۆ ئەو تۆمەتە ناڕەوا بێ بناغەیەی کە پێی وایە مـن و پەیامـەکانی نـوور نـەیاری دەسـتوورەکانی حکوومــەتین و، دژی سیســتەمەکەی وەســتاوین و، ئاسایشــی نــاوخۆ تێکدەدەین. بەڵگەشیان ئەو پازدە بڕگەیە کە لــە چــەند شــوێنێکی بەشــەکانی پەیامــەکانی نووردا هاتووە، کە سەد و بیست بەشن.

دەڵێم: حکوومەت تەنها بەهۆی ناچاری و پاڵەپەستۆی ئــەم ڕۆژگــارەی ئێسـتاوە بــە هەندێ لەو یاسا مەدەنییانە قایل بووە کە موڵکی هاوبەشی ئەورووپان.

لەبەر ئەوە، سەبارەت بە بەرگرییەکانم لە پێناو هێنانەدیی مافی "ڕاستییەکانی ئیمان"دا لە بەرامبەر بەشە ناتەواوەکەی ئەو شارستانێتییەوە، نەك بەشە سوودبەخشەکەی، چۆن دەوترێت ئەو بەرگرییانە نەیاری دەستوورەکانی حکوومەت و دژی ڕێسای ئەون، یاخود بزووتنەوەیەکن لە دژی ئالوگۆڕەکانی حکوومەت؟

ئایا حکوومەت دادەبەزێتە ئەو ئاستەی کە خۆی بکاتە پارێزەری بەرگری لە بەشە کورت و ناتەواوەکەی شارستانێتیی ئەورووپا! ئایا ئامانجی دێرینەی حکوومەت بریتییە لە یاساکانی ئەو بەشە ناتەواوەی مەدەنیەت کە پێچەوانەی ئیسلامە؟

ئایا ئیتر دۆخی "نەیاری" بۆ حکوومەت لە کوێ و؟ بەرگریش بە شێوەیەکی زانستی لە ڕاستییەکانی قورئان، لە بەرامبەر یاسا ناتەواوەکانی شارستانێتی، لە کوێ؟

ئایا ئەو کارە ڕقێکی دیار و گومانێکی ناڕەوای ئاشکرا نییە کە بەوە تۆمەتبار بکرێم پێم بوترێت: نیازی "نەیاری"ی هەیە بۆ یاساکانی کودەتا و، دژایەتیش بۆ دەستوورەکانی حکوومەت و ڕژێم دەکات، لەو ڕاستییە بەرز و خاوێنانەدا کە سی ساڵ پێش ئێستا سەبارەت بە ئایەتە پیرۆزەکانی:

﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء: ١١).

﴿فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء: ١١).

﴿يا أَيُّها النَّبِيُّ قُلْ لأَزْواجِكَ..﴾ (الأحزاب: ٥٩).

﴿فَانْكِحُوا ما طابَ لَكُمْ﴾ (النساء: ٣)..

نووسیومە لە بەرامبەر ئیعتیراز و دەستدرێژیی فەیلەسووفەکانی ئەورووپا؟

ئەو ئایەتانەی کە هەزار و سێ سەد ساڵە تەفسیرنووسان لە ملیۆنەها تەفسیریاندا لێکدانەوەیان بۆ کردووە و، کتێبخانەکان ئێستاش پڕن لەو تەفسیرانە؟

خۆ ئەگەر بابەتەکە پەیوەندیی بەم دادگایەوە نەبوایە، ئەوا هەر بە شایانی بەرگری و وەڵامم نەدەزانی!

من سەرم لەمە سووڕماوە! ئایا چۆن بەرگرییە زانستییەکانم بەو شێوەیە وەردەگیرێت کە دژی حکوومەت بێت، لە کاتێکدا کە بەرامبەر بە مولحیدان و ئەو خراپکارانەیە نیازیان گەیاندنی زیانە بەم گەل و نیشتمانە و، بۆ حسابی ڕێکخراوە

مولحیدەکانی ئەورووپا کار دەکەن و، بەهۆی "کۆمەڵ"ەکانی ڕۆم و ئەرمەنەوە تۆوی ئیلحاد و دووبەرەکی و خراپکاری دەچێنن و بڵاوی دەکەنەوە؟!

ئایا چۆن بەرگرییە زانستییەکان "بە هێما" واتای خۆ لەقەرەدانی حکوومەتیان لەخۆ گرتووە؟ چ ویژدانێك ڕازی دەبێت بەوەی کە "ئیلحاد" کارێ بکات حکوومەت بکاتە موڵکی خۆی و، پاشان هەرکەسێك لە دژی "ئیلحاد" بووەستێت بە نەیاری حکوومەت تۆمەتباری بکات؟

چ ویژدانێك ڕازی دەبێت و قبوولی ئەوە دەکات کە بەرگرییە زانستییەکانم، کە ماوەی بیست ساڵە بەسەر مولحیدان و خراپکاراندا زاڵە، وا دابنرێن کە "قۆستنەوەی ئایینە بۆ سیاسەت" و، هاندانی خەڵکە بۆ ڕەخنەگرتن لە حکوومەت؟

ئایا چۆن ئیلحاد دەکرێتە خاوەنی هەندێ لە دەستوورەکانی حکوومەت، لە کاتێکدا کە بناغە توندوتۆڵەکانی حکوومەتی کۆماری دژی ئەو چەشنە مولحیدانەیە؟

بەڵێ، من نەك تەنها بۆ ئەم دادگایە، بەڵکو بۆ سەرانسەری دنیای ڕادەگەیەنم کە هەر لە دێر زەمانەوە و تا ئێستاش بەرگریم لە ڕاستییە خاوێنەکانی "ئیمان" کردووە لە بەرامبەر فەیلەسووفەکانی ئەورووپاوە، بە تایبەت مولحیدانی ئەوان، بە تایبەتتر ئەوانەی کە سیاسەت دەکەنە ئامرازێك بۆ ئیلحاد و، لە ناوەرۆکدا ڕێسا و ئاسایش تێکدەدەن.

من دەزانم کە حکوومەتی کۆماری حکوومەتێکی ئیسلامییە و، بواری تەوژمە ئیلحادییەکان نادات کە زیان بە گەل و نیشتمان دەگەیەنن و، لە ناوەندی پاڵەپەستۆ و کارە ناچارییەکانی سەردەمی ئێستادا بە هەندێ یاسای شارستانی قایل بووە.

من ئەم گوفتارەم ئاراستەی دادوەرانی لێکۆڵینەوە ناکەم کە ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدەن، بەڵکو ئاراستەی ئەو مولحیدە ستەمکارانەی دەکەم کە لە بڕیاری تاوانبارکردنماندا پشت بە قسەکانیان بەستراوە و، دەڵێم:

من ئێوە تۆمەتبار دەکەم بە قۆستنەوەی سیاسەت لە پێناوی "ئیلحاد"دا، لە بەرامبەر ئەوەی کە ئێوە بەوە تۆمەتبارم دەکەن ئایینم بۆ "سیاسەت" بەکارهێنابێت، چونکە بە سەد بەڵگەی گومان بڕ سەلماندم کە ئەو تۆمەتەی ئێوە ئاراستەی منی دەکەن بوختانێکی ئابڕووبەر و ناڕەوایە و، هیچ بناغەیەکی ڕاستیی نییە.

لە دێر زەماندا پادشایەکی فێڵباز، بە ناوی دادپەروەری‌یەوە، گەلێ ستەمی ئەنجام دەدا! ڕۆژێکیان زانایەکی بەڕێز پێی وت:

"تۆ ئەی دەسەڵاتدار! بە ناوی دادپەروەری‌یەوە ستەم لە گەلەکەت دەکەیت. چونکە تێڕوانینی فێڵبازانە و ڕەخنە ئامێزت خراپکاری‌یە پەرش و بڵاوەکانی کاتە جیاجیاکان کۆدەکاتەوە و، پێی وایە هی یەك کات بن. ئیتر خاوەنەکەیان دووچاری سزایەکی ئازاربەخش دەکەیت..

پاشان بەم تێڕوانینە ڕەخنە ئامێزە فێڵباز و خەڵەتێنەرەت، خراپکاری‌یە جیاوازەکانی خەڵکانی جیا جیا بە یەك جار کۆدەکەیتەوە، ئیتر مەترسیت لە هەموو تاکێکی ئەو خەڵکە لە لا دروست دەبێت و، نەفرەت لە هەموویان دەکەیت و، مستەکۆڵێکی ستەمکارانەیان تێ دەسرەوێنیت.

بێ گومان هەر خۆت لە تفی ماوەی ساڵێکی خۆتدا نوقم دەبیت گەر هەموویان لە یەك ڕۆژدا ڕۆ بکەیت! هەروەها ئەو دەرمان و چارەسەرە تاڵەی کە لە چەند کاتێکی جیاجیادا بەکاریان دەهێنیت، گەر چەند کەسێك لە یەك ڕۆژدا بەکاری بهێنن لەوانەیە ببێتە هۆی مردنیان.. هەر بەم جۆرە هتد..

جا لەو کاتەدا کە دەبوو کردارە خراپەکان بەو کردەوە باشانە داپۆشرانایە کە جار بە جار دەبنە ناوبڕی خراپکاری‌یەکان. کەچی تۆ بیر لەو کردەوە جوان و چاکانەی گەلەکەت ناکەیتەوە کە خراپکاری‌یەکانیان دەسڕێتەوە، بەڵکو بە تێڕوانینە فێڵباز و خەڵەتێنەرەکەت سەرجەم خراپکاری‌یەکان کۆدەکەیتەوە و، سزایەکی ئازاربەخشیان لەسەر دەدەیت"!

ئیتر ئەو پادشایە گوێ بیستی زانا مەزنەکە دەبێت و، لە ستەم کردن ڕزگاری دەبێت.

دەستێکی پەنهان هەیە کە دەیەوێت بڕیاری تاوانبار کردنم بدرێت..

هەست دەکەم کە ئەو دەستە پەنهانە هەموو هۆکارێك بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی کە هەرچەشنە بڕوبیانوویەکی دەست بکەوێت منی پێ تاوانبار بکات، وەك کەسێك کە ئاو لە هەزار شیو کۆبکاتەوە! تەنانەت ئەو کارە لە "داوای گورگ لەسەر مەڕ" سەیر و نامۆترە!

بۆ نموونە ماوەی سێ مانگە ئەم وشەیە دووپات دەکەنەوە کە:
"سەعیدی کوردی ئایین بۆ سیاسەت بەکاردەهێنێت".
منیش سوێند بە هەموو پیرۆزی‌یەکان دەخۆم کە ئەگەر هەزار سیاسەتم ببوایە، ئەوا هەموویانم دەکرد بە قوربانی ڕاستی‌یەکانی ئیمان. ئیتر چۆن ڕاستی‌یەکانی ئیمان دەکەمە ئامرازێك بۆ سیاسەتی دنیا؟
وێڕای ئەوەی کە لە سەد شوێندا ئەم تۆمەتەم پووچەڵ کردەوە، کەچی ئەوان هەمان هات و هاوار دووپات دەکەنەوە. بەو واتایەی کە ئەوان دەیانەوێت بە هەر شێوەیەك بووە تۆمەتبارم بکەن!
منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەو ستەمکار و مولحیدانەی لە دژمان تێدەکۆشن، تۆمەتبار دەکەم بەوەی کە سیاسەت بۆ "ئیلحاد" بەکاردەهێنن، ئەوەتا دەیانەوێت ئەم واتا و ناوەرۆکە، کە مایەی تۆمەتباربوونیانە، بەوە ڕووپۆش بکەن کە تۆمەتبارم بکەن بەوەی: سەعید ئایین بۆ سیاسەت بەکاردەهێنێت.
مادەم ئەمە وایە و، ئەوان دەیانەوێت بە هەر شێوەیەك بووە بڕیارم لەسەر دەربچێت، ئەوا بە سەرجەمی خەڵکی دنیا دەڵێم:
خۆم بەرز ڕادەگرم و دانابەزمە خوارەوە، لەبەر یەك دوو ساڵی ئەم تەمەنی پیری‌یە!
ستوونی پێنجەم[1]: بریتی یە لە چوار خاڵ:
خاڵی یەکەم: ئەوەیە کە لە"بڕیار"ەکەدا وشەکان لە شوێنی خۆیان دەترازێنرێن! چونکە پلاریان لێ دەردەهێنرێت! لە کاتێکدا کە وشەکە ئەوەی مەبەست نی‌یە. هەروەك ئامانجی پەیامەکانی نووریش تەواو جیاوازە لەوەی کە باسی دەکەن. چونکە ئەو پلارانەی کە هاوکات نی‌یە لەگەڵ نیازی وشەکانیدا، تەنانەت وتە ڕاشکاوەکانیش، دەبێت بە چاوی لێبوردن و چاوپۆشی‌یەوە تەماشا بکرێن.
ئەم نموونەیەی خوارەوە پێوەرێکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە:
من ئامانجێکی دیاری کراو دەست نیشان دەکەم و بە ڕاکردن بەرەو ئەو ئامانجە دەڕۆم، کەچی بە بێ ویستی خۆم لە ڕێدا بەر پیاوێکی گەورە کەوتم و پیاوەکەش کەوتە سەر زەوی. منیش پۆزشم بۆ هێنایەوە و، وتم:

(١) دانەر تەنها ستوونی یەکەم و پێنجەمی لەم ژیاننامەیەدا داناوە. (وەرگێڕ)

"گەورەم! داوای لێبوردن دەکەم.. چونکە بێ هیچ مەبەستێك و بە ڕێی خۆمدا دەڕۆشتم کە بەر تۆ کەوتم". بێ گومان ئەو پیاوە لێم خۆش دەبێت و، دڵگران نابێت..

بەڵام ئەگەر بە نیازی بێزارکردنی، پەنجەیەکم بخەمە گوێی ئەو کەسە، ئەوا بێ گومان لێم تووڕە دەبێت، چونکە ئەم ڕەفتارەم بە سووکایەتی‌یەکی ئەنقەست دادەنێت.

جا ئێمە لە ئەنجامی ڕۆیشتنماندا بەرەو ئامانجەکانمان، نامانەوێت بەرتان بکەوین. بەڵام گەر چەند وشەیەکی بەهێزی پەیامەکانی نوور لە دەمی بزووتنەوە زانستی‌یە فکری‌یەکانی ئەو پەیامانەدا بەر ئێوە بکەوێت، ئەوا دەبێت جێی لێ بوردن و چاوپۆشی بێت، چونکە ئامانجی پەیامەکانی نوور ئیمان و ئاخیرەتە.

□ دووچاری ستەمێکی بێ وێنە بووم

کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

سەرباری ئەوەی کە لە دوابەرگریدا باسم کردووە و، لە هەر سێ ئیعتیرازەکەشمدا بە چەندین بەڵگەی گومان بڕ و لە بیست ڕووەوە ڕوونم کردووەتەوە کە ماددەی "١٦٣" هەرگیز پەیوەندیی بە منەوە نی‌یە..

هەروەها ئەوەش کە لەو پەیامانەمدا، کە ژمارەیان سەد و بیست پەیامە و لە ماوەی بیست ساڵدا دانراون، کەمتر لە بیست وشەی ئەوتۆ نەبێت کە بە دڵیان نی‌یە، هیچی تریان تێدا نەدۆزی‌یەوە..

هەروەها ئەوەش کە لەو بەرگری‌یە زانستی‌یانەمدا ڕوونم کردووەتەوە کە لە چەند کاتێکی جیاجیادا لە بەرامبەر فەیلەسووفە کافرەکانی ئەورووپا و قوتابی‌یە مولحیدەکانیان، کە چەند پەیامێکی بەسوود و بەنرخی قیامەتین و، بەهۆی ئەندام بوونم لە "دار الحكمة الاسلامية"دا نووسیمن، دە پازدە وشەیان لە نێوان سەدان هەزار وشەدا، لەگەڵ هەندێ ماددەی ئەو یاسا شارستانی‌یەدا یەك ناگرنەوە کە دوای چەند کاتێکی درێژ خایەن و بە پاڵەپەستۆی ڕۆژگار قبووڵ کراون..

سەرباری هەموو ئەمانە.. داوای مەحکووم کردنم دەکرێت و، ئەو پەیامانەی نووریش دەستیان بەسەردا دەگیرێت کە لە بەردەستدان و ژمارەیان سەد و بیست پەیامە و، چەندین دۆزینەوەی مەعنەویی گرنگ لەخۆ دەگرن. وێڕای ئەوەش کە هەموو

داوا و بەرگرییە زانستی و مەنتیقی و یاساییەکانم لە بەردەم دادگادا، بە شێوەیەکی نایاسایی و بێ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکان، ڕەت دەکرێنەوە.

ماددەی یاسایی "١٦٣" کە دەقێکی یاسایە سەبارەت بەو کەسانەی هەست و سۆزی ئایینی بەکاردەهێنن بۆ تێکدانی ئاسایش، پێویستە ڕاڤەی تایبەت بەخۆی هەبێت، چونکە یەکجار فراوان و گشتییە و، چەندین بەستێنە پارێزی هەیە. دەنا ئەم ماددەیە و ئەم واتا فراوانە، هەروەك من بە تاوانبار دادەنێت، هەموو ئاییندارێکیش تاوانبار دەکات، لە پێشەکیی هەموویانەوە سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی و سەرجەم پێشنوێژ و وتاربێژ و ئامۆژگاران.

خۆ ئەگەر واتا گشتییەکەی ئەم ماددەیە من بگرێتەوە، سەرباری ئەو هەموو بەرگرییە ڕاستەقینە و گومان بڕانەی کە لە سەد لاپەڕە زیاتردا پێشکەشم کردن، ئەوا بە هەمان جۆر هەموو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە ئامۆژگاری و ڕێنمایی خەڵك دەکەن بۆ ڕێی خێر و چاکە. تەنانەت گشت مرۆڤێك دەخاتە ژێر بڕیاری خۆی.

دەبێت واتای ئەم ماددە یاساییە بەم جۆرەی خوارەوە بێت:

(مەبەست لەم یاسایە بەربەست دانانە لە بەردەم ئەوانەی کە لە ژێر پەردەی دەمارگیریدا شوێن سیاسەتێکی نەیاری حکوومەت دەکەون و، تەگەرە لە بەردەم پێشکەوتنی شارستانیدا دروست دەکەن).

خۆ بە چەندین بەڵگەی گومان بڕی زۆر سەلماندمان کە ئەم ماددەیە، بەم واتایە، هەرگیز پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.

بەڵێ، نابێت ئەم ماددە یاساییە بەم واتا بێ "ڕاڤە" و بێ "سنوور" و بێ "بەستێنە پارێز"ە بێت، چونکە ئەو کاتە دەبێتە پاساوێکی لەبار بۆ هەر داخ لە دڵێك کە هەرکەسێکی مەبەست بێت تۆمەتباری بکات!

من ماوەی دە ساڵە لە ژێر چاودێریی بەردەوامدا دەژیم و، لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردووشدا سەد و بیست پەیامم داناوە. دوای چەندین لێکۆڵینەوەی قووڵ، هیچ نیشانەیەکیان نەدۆزییەوە، نە لە من و نە لە پەیامەکاندا، کە ئاسایش تێکبدات.

جگە لەوەش، من بە بیست ڕوو سەلماندم و، هەموو ئەو کەسانەش دەگرم بە شایەت کە لە نزیکەوە دەمناسن، لەسەر ئەوەی کە هەروەك چۆن پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتان،

بە هەمان جۆر پەناشم بە خوا گرتووە لە سیاسەت و، خۆم لە کاروباری دنیا هەڵنەقورتاندووە و، کارکردنم بۆ "ئیمان" بە مەزنترین ئامانجی ژیانی خۆم داناوە..

وێڕای هەموو ئەمانە، کەچی دەبینین ئەوە بڵاودەکەنەوە کە:

"سەعید ئایین بۆ سیاسەت بەکاردەهێنێت و هەوڵی تێکدانی ئاسایش دەدات".

بەمەش تێدەکۆشن کە ماددەی "١٦٣" بمگرێتەوە، تاکو بەو ماددەیە تاوانبارم بکەن.

ئەم ڕووداوەی لەمەڕ "داد" تا ئێستا هاوشێوەی نەبینراوە!

لەو باوەڕەدام کەرامەت و شەرەفی دادگاکان و دادپەروەریی هەموو دنیا لەکەدار دەکات!

پیشاندانی ملکەچ بوونی تەواوەتیی کاربەدەستە مەزنەکان و سەرکردە بەهێزەکان، لە چەندین دادگای بچووکدا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە دادگاکان ڕێز و شەرەفمەندیی خۆیان هەیە و هیچ شتێك نایڕووشێنێت..

لەبەر ئەوە، بەوپەڕی ئازادی و بە پشت بەستنم بەم شەرەفە بەرزەی دادگا، بەرگری لە مافەکانم دەکەم و، دەڵێم:

ئایا سەد و پازدە کتێبی بێ تاوان و سوودبەخش حوکمی دەست بەسەردا گرتنی ئەوانەیان دەدرێت کە دەستاودەستیان پێ دەکرێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە دوو دانە پەیام لەوانە پازدە وشەیان لەخۆ گرتووە کە گومان لای تێڕوانینی کاتی ئێستا بەجێ بهێڵێت، لە کاتێکدا ڕێ بە بڵاوکردنەوەی هەر وتارێك دەدرێت، دوای ئەوەی "چاودێری" چەند وشەیەکی لێ لا دەبات کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت زیان بەخش بن؟

بیست کتێبی ئەم پەیامانە لە چەند کاتێکی جیاجیادا دانراون و، بەشێکی گرنگیشیان کتێبخانەی ئەنقەرە بە شانازییەوە وەری گرت و خستیە ناو کتێبەکانی.

بێ گومان ئەم کارە شەرەفی دادپەروەری لە سەرانسەری زەویدا زامدار دەکات.

گومان لەوەشدا نییە کە "دادگای تەمییز" ئەم شەرەف و کەرامەتەی دادگا دەپارێزێت.

لە نێوان ئەو دە پازدە مەسەلەیەدا، بە تایبەتی دوو مەسەلەی گرنگ ڕەخنەیان ئاراستە کراوە و، بوون بەهۆی ڕەخنە گرتن لە کتێبەکانی تر..

ئەو دوو مەسەلە گرنگەش ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەن:

﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء: ١١).
﴿فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء: ١١).

جا ئەم دوو مەسەلەیە لە پێشەنگی ئەو مەسەلانەوەن کە من و کتێبەکانی پێ تاوانبار دەکرێین.

نزیکی چل ساڵە چەندین پەیامم بە زمانی عەرەبی و تورکی نووسیوە، هەندێکیان چاپ کراون و هەندێکی دیکەشیان چاپ نەکراون، تیایاندا ئیعجازی قورئانم بە بناغە داناوە. ئیتر ئەو خاڵانەم پشتگوێ خستووە کە شارستانێتی تیایاندا پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە و، ئیعجازی قورئانی پیرۆزم بە دەستەوسانیی شارستانێتی دەنی (ئاست نزم) - وەك ناوم لێ ناوە - سەلماندووە، ئەو شارستانێتی‌یەی کە پڕە لە خراپە و زیان، نەك شارستانێتیی سوودبەخش.

پێش ماوەیەك ئەو ماددانەی یاسای شارستانێتیم خستە بەر تیرۆوانین کە تایبەتن بە میرات و، پێچەوانەی ئەم دوو ئایەتە ناوبراوەن، هێندە بەڵگەی گومان بڕیشم پێش چاو خست کە سەرسەخت ترین فەیلەسووفیان بێدەنگ بکات..

ئەم مەسەلەیەشم لە بەرامبەر شارستانێتی و فەیلەسووفەکانەوە نووسیوە و، پێش ئەوەی حکوومەتی کۆماری بە پاڵەپەستۆی ناچار کردنی ڕۆژگار بەشێکی ماددەکانی یاسای شارستانی قبووڵ بکات، بەرگریم لەو نووسینەی خۆم کرد و ڕوونم کردەوە کە قورئانی پیرۆز بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە ئەو مافانەی ئافرەتی پاراستووە کە لە سەدەکانی یەکەم و ناوەڕاستدا پێشێل کرابوون.

وا ئێستا ڕوونکردنەوەکانم لەو دوو مەسەلەیەدا بە شێوەیەك پێش چاو دەخرێن کە پێچەوانەی یاسای حکوومەتی کۆماری بن و، بە ماددەی "١٦٣" ی یاسا تاوانبارم دەکەن.

منیش لە لایەنی خۆمەوە بە دادگای باڵا و دام و دەزگای دادپەروەری دەڵێم:

بە پشت بەستن بە بڕیار و یەکگرتنی قسەی سێ سەد و پەنجا هەزار تەفسیر بۆ ئەو دەستوورە خواییەی کە ڕاست و حەقیقەتە و، سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە هەموو سەردەمێك و لە کێشەکانیاندا بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان، لە ماوەی هەزار و سێ

سەد و پەنجا سالدا بۆ فەرمانەکانی گەڕاونەتەوە.. هەروەها بۆ ڕێزگرتن لە هەموو باپیرانمان.. پێش پازدە بیست سال، هەندێکیشیان پێش نۆ سال لە دوو کتێبمدا ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەم بە مەبەستی دەرخستنی ئیعجازی قورئانی پیرۆز بۆ مولحیدانی ئەورووپا باس کردووە.

ئێستاش بەهۆی یەك دوو مەسەلەی وەك ئەمە، بڕیاری بەندکردنێکم لەسەر دەدرێت کە ژیان لە هەل و مەرجی وەهادا، هاوکات لەگەڵ تێکچوونی تەندروستیمدا، ناگونجێت بەردەوام بێت. وەك بلێی بڕیاری لەسێدارەدانم بۆ دەربکرێت بە وێنەی ئەوەی کە بڕیار لەسەر سەد و پازدە پەیامم درا.

ئەم بڕیارە ستەمکارانەیە دەبێت "دادپەروەری" ڕەتی بکاتەوە و هەڵی بووەشێنێتەوە، گەر لەسەر زەویدا "دادپەروەری" هەبێت!

زۆربەی ئەو شتەی کە سەرسامان دەکات و دەمانخاتە نائومێدییەوە ئەوەیە کە ئێمە چەندەشمان لەسەر بکەوێت هەر لە "ڕاستی" زیاتر شتی تر نالێین. چونکە لە ڕێبازماندا بە هیچ شێوەیەك ڕێ بە "درۆ" نەدراوە، تەنانەت گەر لە بەرژەوەندیی خۆیشمان بێت..

لەبەر ئەوە، سەبارەت بەو بڕیارەی کە لەسەر من دراوە، بەپێی چەند گومان و هەواڵێکی دوور لە ڕاستی لە ئیسپارتە و، پیشاندانی دەنکە گەنمێك بە وێنەی گومەزێك، دەڵێم:

من لە سەد و بیست لاپەڕەدا بەرگریم لە خۆم کردووە کە بەڵگە گومان بڕ و مەنتیقی و بەهێزەکانم تێدا هێناوەتەوە و، سەلماندوومە کە هەرگیز خۆم لە قەرەی ئەم یاسایە نەداوە. بەڵام بڕیارەکە بە بێ سەیرکردنی بەرگری و بەڵگەکانم دراوە و، لە هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکرادا مێژووی دانان و مێژووی نووسینەوە، تەنانەت مێژووی نامە ناردنم بۆ کەسێك تێکەڵی یەکتر کراون و، ئەو کارانەی کە لە ماوەی بیست سالدا ئەنجام دراون، بەو جۆرە سەیر کراون کە وەك ئەوەی لە ماوەی یەك سالدا کرابن!

هەمان شت لە بڕیاری دادوەرانی لێکۆڵینەوە و لائیحەی ئیددیعای گشتی و دوابڕیاری دادگاشدا دووپات بووەتەوە کە بڕیاری لەسەر دەرکردین، بێ ئەوەی بەرگرییە ڕاستەکانمان بەهەند وەربگیرێت.

من بە شەوقەوە چاوەڕێی لابردنی خێرای ئەم ستەم و ناحەقی‌یە دەکەم کە تەزوو بە جەستەی شوێنکەوتووانی ڕاستی و حەقیقەتدا دەهێنێت و، چاوەڕێی بڕیاری بێ تاوانیی "پەیامەکانی نوور"م لەم دادگایەی کە بالاترین پایەی دادە.

خۆ ئەگەر دادگا، کە بڵندترین پایەی دادپەروەری‌یە، بە فەرزی مەحاڵ، گوێ لەم بانگەوازە حەق و بەهێزە نەگرێت، ئەوا لە توندوتیژیی نائومێدیی خۆمدا دەڵێم:

ئەی ئەو ستەمکارە مولحیدانەی کە ئەم ڕووداوەتان هەڵبەست و، بەرەو ئەم بەڵایە پاڵتان پێوە نام!

مادەم بڕیارتان داوە بە هەر شێوەیەك بێت لەسێدارەم بدەن، بۆچی پیلانەکەتان بە دەستی دام و دەزگای "داد" گێڕا کە مافی ستەم لێکراوانی لاواز دەپارێزێت و، فێڵی چەپەڵتان سازدا و، چەندین پیلانی نزمی وەهاتان هەڵبەست کە شەرەف و کەرامەتی دام و دەزگای "داد" زامدار دەکات؟

دەبوو بە شێوەیەکی مەردانە ڕووبەڕووم ببوونایەتەوە و، پێتان بوتمایە:

"بوونی تۆمان لەم دنیایەدا ناوێت"!

ئەو مەسەلەیەی کە نزیکی چوار مانگە دادوەرانی لێکۆڵینەوەیان سەرقاڵ کردووە، هاوکات لەگەڵ لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەد و حەڤدە کەسدا، "دادگای گەورەی سزا" تەنها لە ماوەی ڕۆژ و نیوێکدا و، بەوپەڕی سەرزارەکی و ڕووکەش سەیری کرد و، چاوی لە ناتەواوی و هەڵەکان نوقاند.. بە تایبەت لەوەی کە من ئیددیعام کرد کە لە دەمی ڕووبەڕوو بوونەوەم لەگەڵ دەستەیەکی ئەکادیمیدا سەبارەت بە دۆزینەوە مەعنەوی‌یەکانی "پەیامەکانی نوور" و بەرگری‌یە زانستی‌یە زامدار نەکراوەکانم، بۆ هەموو ئەوانەی دەسەلمێنم و ڕوونی دەکەمەوە..

کەچی ئەوان لە بڕیارەکەدا پەلەیان کرد و، بە تێڕوانینێکی سەرپێیی و ڕواڵەتی بڕیاریان دا. کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەبەستیان حەق و دادگەری نی‌یە.

ئیتر بەم بڕیارە یەکجار هەڵە و دوور لە ڕاستی‌یە لە ڕووی یاساوە، بڕیاریان دەر کرد. کە ئەمەش پێویست بە هەڵوەشانەوە و لێ وردبوونەوە دەکات.

ئــەنجام: لــە دەرەنجــامی لـــێ وردبونـــەوە لـــە ئـــەوراقی ئامـــادەبووانی دادگـــا و خوێندنەوەیان، بە تایبەت پەیامە دەست بەسەردا گیراوەکانم، چاپ کـراو بـن یـان چـاپ نەکراو، دەرکەوت کە سەرجەم ئیعتیـرازە زانسـتی و یاسـایی و مەنتیقیـیەکانم، بـە هـەند وەرنەگیراون و، تەنها بـە خوێندنەوەیـەکی کەسـی و هەڕەمـەکی چ لـە لایـەن دادوەرانـی لێکۆڵینەوە و چ لە لایەن دادگا، ڕاستەوخۆ ڕەت کراونەتەوە، بە بێ بـاس کردنـی ئـەو هۆکارانەی کە بڕیارەکەیان پێویست کردووە و، بە بێ هیچ بەڵگە و یاسایەك..

ئەو پەیامانەشم کە ماوەی سی ساڵە لـە بەرامبـەر فەیلەسـووفەکانی ئەورووپا و بەشـی هـەرزەی شارسـتانێتی، بـەرگرییان لـە مافـە ئیسـلامییە تورکییـەکان کـردووە و، ئـەو پەیامانـەش کـە مەتـەڵ و نهێنییـەکانی بوونـەوەرانیان دەرخسـتووە و، دۆزینـەوە مەعنەوییەکانیان لەخۆ گرتووە.. هەموو ئەو پەیامانە، دەستیان بەسـەردا گـیراوە. جگـە لـەوەی کـە سـزایەکی جەستەییش دراوم، وێڕای تێکچوونـی تەندروسـتیم کـە توانـای هەڵگرتنی ئەو سزایەی نییە.

ئنجا چ ئـەو هۆکارانـەی کـە لـە سـەرەوە باسـم کـردن و، چ لــەو ئیعتیرازانـەدا کـە پێشکەشی داواکاری گشتیم کردن و، چ لە دواهەمین ئیعتیـرازم کـە بـە نووسـین لـە دوا دانیشــتنی دادگــادا پێشکەشـــم کـــرد و پێنـــج ســـتوونی لـــەخۆ گرتـــووە و، چ لـــە دوابەرگریشمدا کە ئەم مەسەلەیەی بە درێژەپێدانێکی زانستی و یاسایی لەخۆ گرتـووە.. هـەموو ئـەو ناتەواییـە یاسـاییانەم ڕوون کردووەتـەوە کـە لـە دەمـی لێکۆڵینـەوە و لـێ وردبوونەوەدا پێش چاو دەکەون..

هەموو ئەمانە، بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ڕاشکاو، دەری دەخەن کە من لەم بڕیارەدا غەدرم لـێ کراوە.

بۆیە لە دەستەی ئێوە چـاوەڕوانم کـە بـە هەڵوەشـاندنەوەی ئـەم بڕیـارە "دادپەروەری" ئاشکرا بکەن.

منیش لە لایەن خۆمەوە پشت بە خوای گەورە دەبەستم و پەنای بۆ دەبەم و، دەڵێم:

﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللهِ إِنَّ اللهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (غافر: ٤٤).

* * *

ئـەو حـەوت لاپەڕەیـەی نێـوان سـەد و ئـەوەندە لاپـەڕەی کـۆی بەرگرییـەکانم، هەرچەندەش لـە دادگـادا چەند جارێك خوێنرایەوە و لـە تۆماری دادگاکـاندا تۆمـار کران، کـەچی ئـەم لائیحـەی ڕاستکردنەوەیەی خـوارەوە نەخوێنرایـەوە و لـە فایلـە رەسمیـیەکاندا تۆمـار نـەکرا، چونکـە هێشـتا ئەوراقـەکانمان لـە "دادگـای تـەمییز"ەوە نەهاتبوو. بێگومان لە کاتێکی نزیکدا لە تۆمارەکاندا دەنووسرێت.

## سکالآنامەیەك

## کە پێشکەشی ئەنجومەنی وەزیران کرا

ئەی ئەهلی حەل و عەقد!

من گرفتـاری ستەمێکی ئـەوتۆ کـراوم کە دەگمەنە لـە هـەموو دنیـادا هاوشـێوەی هـەبێت. جـا لەبەر ئـەوەی بێ دەنـگ بوون لـە "ستەم" بـە سـووکایەتی و ڕێـز نـەگرتن دادەنرێت بەرامبەر بە "حەق" ئەوا ناچار بووم کە ڕاستییەکی گەلێ گرنـگ بدرکێنم. بۆیە دەڵێم:

یان لە سێدارەم بدەن و ئەو تاوانەشم ڕوون بکەنەوە کـە شایانی بڕیـاری سـەد و یـەك ساڵ زیندانی بێت لە چوارچێوەی یاسادا.. یان بە بەڵگە بیچەسپێنن کـە مـن کابرایـەکی شێتم و ژیریم لە دەست داوە.. یاخود سەربەستیی تەواوەتی بـە خۆمـان و پەیامـەکانمان و هاوڕێیانمان بدەن و، لێپرسینەوە لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە بوون بەهۆی ئازاردانمان.

بەڵێ، دەبێ هەموو حکوومەتێك سەبارەت بە هەر شتێك یەك یاسا و یەك بنچینەی بـۆ ئەو یاسایە هەبێت و، سزاکانیش لەسەر بناغەی ئەو یاسایە دەردەکرێن.

جا ئەگەر یاساکانی حکوومەتی کۆماری شتێکی ئەوتۆی تێدا نـەبێت کـە داخـوازی سزادانی مـن و هاوڕێیـانم بێـت، ئـەوا کـارێکی پێویستە کـە دڵمـان ڕابگـرن و دڵنـەوایی پێویسـت و ڕێز و خەڵاتـی شـایانمان پێشـکەش بکـەن، هاوکـات لەگـەڵ بەخشـینی ئازادی و سەربەستیی تەواوەتیدا پێمان..

چونکە ئەگەر خزمەتە قورئانییەکانم بـە دوژمنایـەتی دابنرێت بەرامبـەر حکوومـەت، ئەوا دەبێ بڕیاری سەد و یەك ساڵ بەند کردن یان بڕیاری لە سێدارەدانم بـۆ دەربکـەن و، سزای سەختیش بۆ هـەموو ئـەو کەسانە دەربکرێت کە بە شێوەیەکی گەرموگوڕ لـەم

خزمەتەدا پەیوەندییان پێوە کردووم، نەك ئەوەی بچن بڕیاری یەك ساڵ بەندکردن لەسەر من و شەش مانگیش لەسەر هاوڕێکانم دەربکەن.

جا ئەگەر خزمەتەکانمان لە دژی حکوومەت نەبن، ئەوا دەبێ حکوومەت لە بریی سزا و زیندان و ئازار و تۆمەتبارکردن، بە ڕێزلێنان و خەڵاتەوە پێشوازیمان لێ بکات. چونکە سەد و بیست پەیام زمانێکی ڕەوان و پاراون کە ئەم خزمەتە پێش چاو دەخەن و، توانییان تەحەددای فەیلەسووفەکانی ئەورووپا بکەن و، بناغە فیکرییەکانی ئەوان لە بناغەوە هەڵبتەکێنن.

بێ گومان ئەم خزمەتە کارا و کاریگەرە، یان ئاکامێکی ترسناکی لێ دەبێتەوە، یان بەروبوومێکی زانستیی یەکجار بەرز و سوودبەخش پێشکەش دەکات. کەواتە نابێ بڕیاری تەنها یەك ساڵ بەندکردنم بۆ دەربکرێت، وەك ئەوەی ئێمە خەریکی یاریی منداڵان بین و عەوامی خەڵکی لەخشتە بەرین و خەریکی شاردنەوەی پیلانی دوژمنان بین لە دژمان. چونکە کەسانی وەك من یان دەبێ بەوپەڕی فەخر و شانازی و سەری بەرزەوە بە داری سێدارەکانیاندا سەربکەون، یان دەبێ لە پلەوپایەی شایانی خۆیاندا ئازاد و سەربەست بن.

بەڵێ، ئەگەر دزێکی کارامە و لێزان هەبێت و بتوانێت بایی هەزار لیرە "ئەڵماس" بدزێت. کەچی هەر ئەو دزە بەتوانایە بچێت چەند پارچە شووشەیەکی بێ بایەخی چەند قورشی بدزێت و، حوکمی دزینی ئەڵماسە بەنرخەکانیشی لەسەر دەربکرێت..

ئایا هیچ دزێکی ئاسایی خاوەن هەست و ژیری شتی وا دەکات؟ چونکە بێ گومان ئەو دزە کەسێکی لێزان و زیرەکە و، هەرگیز خۆی دووچاری کاری لەو جۆرە ناکات کە ئەوپەڕی نەفامی و گەلحۆیی پێوە دیارە!

بەڕێزان!

گریمان بەپێی وەهم و گومانی ئێوە من وەکو ئەو دزە وابم.. ئایا بۆچی ناوچەیەکی پڕ لە کوێرەوەریی سەر بە شاری "ئیسپارتە" هەڵدەبژێرم کە نۆ ساڵ تیایدا بەگۆشەگیری مامەوە؟ خۆ لە بریی ئەوەی بیروبۆچوونی چەند کەسێکی دڵسۆزی کەمی ئەوێ (کە چەند حوکمێکی سووکەڵەیان لەسەر دەرکرا) بەرەو دژایەتیی حکوومەت بزوێنم و

خۆم و پەیامەکانی نووریش - کە ئامانجی ژیانمن - گرفتاری مەترسی بکەم، بۆ من وا باشتر بوو کە وەك جارانم لە شوێنێکی گەورەی وەك "ئەنقەرە" یان "ئەستەمبووڵ"دا بوومایە و، هەزاران کەسم بەرەو ئەو ئامانجەی مەبەستمە ئاراستە بکردایە. ئەو کاتەش دەمتوانی بەو شان و شکۆ و عیززەتەی کە شایانی ڕێبازی خۆمە بەشداری لە کاروباری دنیادا بکەم، لە بریی ئەوەی خۆم بخەمە بەر ئەم چەشنە سزا سووك و بێ نرخانە.

جا بۆ ئەوەی ڕادەی هەڵەی ئەو کەسانە ڕوون بکەمەوە کە دەیانەوێ بەرەو پلەیەکی نزمی بێ نرخ و بێ سوود پاڵم پێوە بنێن، ئەوا بە ناچاری هەندێ خۆویستی و ڕیاکاریی پێشووی خۆمیان یاد دەخەمەوە، نەك بە مەبەستی فەخر و شانازی.. دەڵێم:

ئەو کەسانەی کە بۆیان ڕەخساوە ئەو بەرگرییەم ببینن کە بە ناونیشانی "بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت" چاپکراوە، شایەتی دەدەن کە توانیویەتی بە ئاراستە کردنی تەنها یەك وتار لە ڕووداوەکانی "٣١"ی مارتدا هەشت تیپی سەربازی بگێڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی و.. هەروەك ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە نووسییان، لە دەمی جەنگی سەربەخۆییدا توانیی بە یەك دانە وتار بە ناوی "شەش هەنگاوەکان" ڕای زانایانی ئەستەمبووڵ بگۆڕێت لە دژی ئینگلیز، کە ئەوەش کاریگەرییەکی گەورە و ئیجابیی هەبوو لە بزووتنەوەی میللیدا و.. هەزاران کەس لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا گوێیان لە وتارەکەی ڕاگرت و.. لە "ئەنجومەنی نوێنەران"یشدا لە ئەنقەرە بە چەپڵەڕێزانی گەرمەوە پێشوازیی لێ کرا و.. سەدو شەست و سێ ئەندام پەرلەمان ڕەزامەندییان لەسەر تەرخان کردنی "سەد و پەنجا هەزار لیرە" نواند بۆ بنیاتنانی زانکۆکەی و.. کاتێکیش ئەندامانی پەرلەمانی بۆ نوێژ کردن بانگهێشت کرد، لە دیوانی سەرۆکایەتیدا ڕووبەڕووی تووڕەیی سەرۆك کۆمار بووەوە و، بە بێ هیچ ترس و بیمێك بەرپەرچی قسەکانی دایەوە و.. ئەو دەمەش کە لە "دار الحكمة الإسلامية"دا ئەندام بوو حکوومەتی ئیتتیحاد و تەرەقی بە یەکدەنگی ئەویان لە هەموو کەسێك بەلاوە گونجاوتربوو کە بتوانێت "حیکمەتی ئیسلامی" بە شێوەیەکی کاریگەر بە فەیلەسووفانی ئەورووپا ڕابگەیەنێت.. سەبارەت بە کتێبەکەشی "ئاماژەکانی ئیعجاز" کە لە بەرەکانی جەنگدا دایناوە و ئێستا دەستی بەسەردا گیراوە، هێندە مایەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی "ئەنوەر

پاشا"ی سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکان بوو کە بەوپەڕی ڕێزەوە - کە ئەوەشی لەگەڵ کەسدا نەکردووە - ڕۆشت بۆ پێشوازی لێکردنی و، تەنانەت بڕیاری دا کاغەزی پێویست بۆ چاپکردنی کتێبەکە ببەخشێت، تاکو پاداشتێکی لە شەرەف و شانازی و پاداشتی ئەو دیارییەدا هەبێت..

پیاوی ئاوا.. هەرگیز ناتوانێت لەو مامەڵەیە بێ دەنگ بێت کە بەم چەشنە لەگەڵی دەکرێت. وەك بڵێی چەند تاوانێکی بێ نرخی وەك دزینی هێسترێك، یان ڕفاندنی کیژۆڵەیەك، یاخود بڕینی گیرفانێکی ئەنجام دابێت..

چونکە ئەگەر لەو ڕەفتارەتان بێ دەنگ ببێت، ئەوا وەك پەڵەیەکی نەنگی وایە بە خۆیەوە و بە عیززەتی خاوێنی زانستی و خزمەتگوزارییەکانی و هەزاران هاوڕێی بەنرخیەوە. چونکە کاتێ ئێوە بە زیندانیی ماوەی ساڵێك فەرمانی لەسەر دەردەکەن، وەك ئەوە وایە کە مامەڵەی دزی مەڕ یان بەرخێکتان لەگەڵدا کردبێت.

ئەوەتا دوای ئەوەی کە بێ هیچ هۆیەك ماوەی دە ساڵی پڕ لە گوشار و ئازاری دەست بەسەری و چاودێریی بەسەر برد و، دوای ئەم هەموو ئازاردانە درێژخایەنە، دەچن بۆ ماوەی یەك ساڵ زیندانی دەکەن و یەك ساڵی تریش دەیخەنە ژێر چاودێری و دەست بەسەرییەوە. جا لەبریی ئەوەی بیخەنە ژێر زەبر و زەنگ و خۆسەپاندنی پۆلیسێکی ئاسایی یان پۆلیسێکی نهێنیی ئاساییەوە - لە کاتێکدا کە ئەو کەسێکە تەنانەت خۆسەپاندنی سوڵتانیشی پێ قبووڵ نەکرا - بۆ ئەو باشتر وایە کە لە سێدارە بدرێت.

خۆ ئەگەر کەسێکی وەك ئەم مرۆڤە بیەوێت و حەز بکات دەست لە کاروباری دنیا وەربدات و، کارمەندی و ئەرکی خاوێن و پیرۆزی بواری ئەوەی پێ بدەن، ئەوا دەیتوانی پێشەوایەتیی ڕووداوێك بکات کە بە دەیان جار لە ڕووداوی "مەنمەن" و "شۆڕشەکەی شێخ سەعید" گەورەتر بوایە. واتە دەیتوانی دەنگێکی گەورەی چەشنی زرمەی تۆپ بە گوێی ئێوەدا بدات، نەك دەنگێکی وەك ویزەی باڵی مێش!

بەڵێ، من ئەوە دەخەمە پێش چاوی حکوومەتی کۆماری کە هەرچی بەلا و گیروگرفتێك دووچاری دەبم هەر هەمووی ئەنجامی پیلان و پڕوپاگەندەی ڕێکخراوێکی بەلشەفیی نهێنییە، ئەوەتا کەش و هەوایەکیان بۆ پڕوپاگەندەی گشتی و هەمەلایەنەی

ئەوتۆ ساز کردووە کە تا ئێستا شتی وا نەبینراوە و، ترس و تۆقاندنێکی زۆریشیان بڵاوکردووەتەوە. بەڵگەشمان ئەوەیە کە وا ماوەی شەش مانگە هیچ کام لە هاورێکانم کە ژمارەیان دەگاتە سەد هەزار کەس نەیتوانیوە یەك نامەم بۆ بنێرێت، تەنانەت سڵاوێکیشم پێ بگەیەنێت.

جا ئەو پیلانگێڕانەی کە لە هەوڵی خەڵەتاندنی حکوومەت و لەخشتەبردنیدان، بە ڕاپۆرتە نهێنی‌یەکانیان توانیویانە هەر لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتەوە هەتا دەگاتە پارێزگاکانی خۆرئاوای وڵات پشکنین و لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە ساز بکەن.

ئەو نەخشەیەی کە پیلانگێڕان دایانڕشتبوو بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕێکخرابوو کە بڵێی ڕووداوێکی یەکجار گەورە لە ئارادایە و، من و هەزاران کەسی تری وەك من لەسەر ئەو ڕووداوە سزای سەخت دەدرێین. کەچی بە سزایەکی هێندە بێ نرخ کۆتایی پێ هات کە دەگونجێ لەسەر هەر کەسێکی ئاسایی دەربکرێت لەسەر دزینی شتێکی بێ نرخ و بەها. ئەوەبوو سزای ساڵێك بەندکردنیان بۆ پازدە کەسی بێ تاوانی نێوان سەد و پازدە کەس دەرکرد!

ئایا هیچ کەسێکی ژیر و هۆشمەند هەیە کە شمشێرێکی تیژی بە دەستەوە بێت و، بە سووکی لە کلکی شێرێکی گەورەی بژەنێت و بەو جۆرە لە دژی خۆی بیورووژێنێت؟

چونکە ئەگەر مەبەستی خۆپاراستن یان لەگەڵ جەنگانی ئەو شێرە بێت، ئەوا شمشێرە تیژەکەی لە شوێنێکی تری جەستەی ئەو شێرەدا بەکار دەهێنا!

دیارە دەرکردنی سزایەکی سووکەڵەی ئاوا لە دژم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێتان وایە من وەکو ئەو کەسە وام!

جا ئەگەر کەسێك بم بە وێنەی ئەو ڕەفتارە دوور لە هەست و ژیری‌یە هەڵسوکەوت بکەم، ئیتر بۆچی سەرانسەری ئەم وڵاتەتان لە ترس و دڵەڕاوکێ پڕ کردووە؟

یان چ پێویستی‌یەك بەم هەموو پڕوپاگەندانە هەیە کە بۆ هەژاندنی ڕای گشتی لە دژی من بڵاوی دەکەنەوە؟

دەبوو بە وێنەی شێتێکی ئاسایی مامەڵەتان لەگەڵدا بکردمایە و بتانناردمایە بۆ نەخۆشخانەی شێتان!

خۆ ئەگەر پێتان وایە من کەسێکی گرنگی مەترسیدارم و، لە ئاستی گرتنەبەری ئەو ڕێ وشوێن و خۆئامادەکاری‌یە گرنگانەدام کە لە دژی من دەیگرنەبەر، ئەوا هەر گیز مەنتیق و ژیری ڕێ بەوە نادەن کە بڕۆم لەکلکی ئەو شێرە یان ئەو دڕندەیە بژەنم و لە دژی خۆم بیورووژێنم، بەڵکو دەبێ بەپێی توانا خۆمی لێ بپارێزم.

هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینن ماوەی دە ساڵە بە حەز و ویستی خۆم ژیانی گۆشەگیریم هەڵبژارد و، هێندە گوشار و ئازارم قبووڵ کرد کە هیچ مرۆڤێك لە توانایدا نی‌یە و، لە هیچ کاروبارێکی حکوومەتدا خۆم هەڵنەقورتاندووە و تەنانەت هەر حەزیشم لە کاری لەو جۆرە نەکردووە، چونکە ئەرکی خاوێنی سەرشانم ڕێی کاری وام پێ نادات.

ئەی ئەهلی حەل و عەقد!

ئایا دەگونجێ کەسێك کە بیست و پێنج ساڵ پێش ئێستا - بە شایەتیی ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە - توانیی بە نووسینی تەنها یەك "وتار" بیری سی هەزار کەس و، سەرنجی گرنگی پێدانی سوپای بزووتنەوە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و، بە شەش وشە وەڵامی پرسیارە کانی سەرگەورەی قەشەکانی ئینگلتەرای دایەوە کە دەیویست بە شەش سەد وشە وەڵام بدرێنەوە و، لە سەرەتای سەردەمی سەربەستیدا وەك هەر سیاسەتمەدارێکی شارەزا و لێزان وتاری ئاراستەی جەماوەر دەکرد..

ئایا دەگونجێ لە سەد و بیست پەیامی کەسێکی ئاوادا لە پازدە وشە زیاتری تێدا نەبێت کە پەیوەندی‌یان بە سیاسەت و کاروباری سەر بە دنیاوە هەبێت؟ ئایا هیچ ژیری‌یەك قەناعەت بەوە دەکات کە پیاوی ئاوا ڕێی سیاسەتی گرتووەتەبەر و چەند ئامانجێکی دنیایی هەیە؟ چونکە ئەگەر بایەخی بە سیاسەت بدایە و خۆی لە کاروباری حکوومەتدا هەڵبقورتاندایە ئەوا لە سەد شوێنی تەنها یەك کتێبیدا چ بە ڕاشکاوی و چ بە هێما ئەو بایەخدانەی دەردەکەوت.

خۆ ئەگەر ئامانجی ئەو ئاراستەکردنی ڕەخنەی سیاسی بوایە، ئایا نەیدەتوانی جگە لە باسی پۆشتەیی و بابەتی میرات - کە لەو بابەت و دەستوورانەن هەر لە مێژەوە هەن - شتی تری بۆ ئاراستەکردنی ڕەخنەکانی بدۆزیایەتەوە؟

هەر کەسێك هەڵگری بیرێکی سیاسیی دیاری کراو بێت، دەتوانێت سەدان هەزار بابەتی ڕەخنە لێگرتن بدۆزێتەوە لەم ڕژێمە کۆماری‌یەدا کە ئاڵوگۆڕێکی گەورەی بەرپا کرد، نەك تەنها یەك بابەت و دوو بابەت! چونکە ئایا دەگونجێ ئەو گۆڕانکاری‌یەی حکوومەت ئەنجامی دا بترنجێنرێتە دوو مەسەلە و بابەتی بچووکەوە؟ خۆ بێ ئەوەی نیازی ئاراستە کردنی هیچ ڕەخنەیەکم بووبێت، ئەوان دوو سێ وشەیان لە یەك دوو کتێبی پێشووی مندا دەرهێناوە و ئیدیعای ئەوەیان کردووە کە گوایا من هێرش دەکەمە سەر سیستەمی حکوومەت و کوودەتاکەی.

ئێستا من لە ئێوە دەپرسم: ئایا لێدوانی من لە بابەتێکی زانستیی ئەوتۆ کە شایانی هیچ سزایەکی تەنانەت یەکجار بچووکیش نی‌یە، ئەوە دەهێنێت کە سەرانسەری وڵات سەرقاڵ بکرێت و ترس و بیم لە هەموو لایەکدا بڵاو بکرێتەوە؟

دەرکردنی سزایەکی سووکەڵە و بێ نرخ لەسەر من و چەند کەسێکی کەمی هاوڕێیانم و.. بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی توندوتیژ و چڕوپڕ لە دژمان لە هەموو لایەکی وڵاتدا و.. نانەوەی کەش و هەوای ترس و تۆقاندن لەناو خەڵکیدا بە نیازی دوور خستەوەیان لێمان و بێزاندمان لە بەرچاویاندا و.. هێنانی هێزێکی گەورە لە لایەن "شوکری قایا"وە بۆ شاری "ئیسپارتە" بۆ ئەنجامدانی کارێك کە تەنانەت یەك دانە سەرباز دەتوانێت ئەنجامی بدات، کە دەستگیرکردن و بەند کردنی منە و.. سەردانی "عیصمەت ئینۆنۆ"ی سەرۆك وەزیران بۆ پارێزگاکانی خۆرهەڵات بە هەمان بۆنەوە و.. ڕێ نەدان بە قسەکردنی من بۆ ماوەی دوو مانگ و.. بوار نەدان بە هیچ کەسێك کە هەواڵم بپرسێت و سڵاوێکم لێ بکات، لە کاتێکدا کە من لەم غەریبی‌یەمدا کەسێکی تەنها و بێ هاودەمم..

هەموو ئەمانە.. ئاماژە بۆ باروودۆخێکی هێندە نامۆ و نابەجێ دەکەن کە هیچ داناییەکی تێدا نی‌یە، هەروەك شایانی شان و شکۆی هیچ حکوومەتێك نی‌یە لە دنیادا، چ جای حکوومەتی کۆماری کە دەبوو چاودێریی یاسای بکردایە و ڕێزی لێ بگرتایە، لە کاتێکدا کە وشەی "حکوومەت" ئەوە دەگەیەنێت بە حیکمەت و دانایی مامەڵە لەگەڵ کارەکاندا بکرێت!

من دەمەوێ لە چوارچێوەی یاسادا پارێزگاری لە مافەکانم بکرێت. هەرکەسێکیش پێچەوانەی یاسا ڕەفتار دەنوێنێت و هەر بە ناوی یاساوە یاسا پێشێل دەکات، من بە تاوانبار ناوزەدی دەکەم.

بێ گومان یاساکانی حکوومەتی کۆماری دەست بە ڕووی کردارەکانی ئەو تاوانبارانەوە دەنێت و، هیوادارم مافە زەوتکراوەکانم پێ بدرێتەوە.

سەعیدی نوورسی[1]

* * *

❐ لەناو بەندیخانەوە

داواکاری گشتی لە "دادگای گەورەی سزا" ی ئەسکی شەهر سالّی (١٩٣٥ز)، دەگێڕێتەوە کە:

ڕۆژێکیان بەدیعوززەمان لە بازاڕدا دەبینێت، ئیتر سەرسام دەبێت و، یەکسەر بە هەڕەشەوە پەیوەندی بە بەڕێوەبەری بەندیخانەکەوە دەکات و، پێی دەڵێت:

"چۆن بوارتان داوە بە بەدیعوززەمان بڕوات بۆ بازاڕ؟ من بە چاوی خۆم لە بازاڕ بینیم"؟!

بەڕێوەبەریش وەڵامی دەداتەوە:

"بوورن گەورەم! بەدیعوززەمان لەناو بەندیخانەیە و، دەتوانن تەشریف بهێنن لە زیندانی تاکە کەسیدا ببینن"!

کاتێ داواکاری گشتی دێت، پێکەوە دەڕۆن بۆ شوێنی زیندانی کردنی و، دەبینن مامۆستا لەوێیە!

هەواڵی ئەم ڕووداوە لەناو فەرمانگەکانی "داد"دا بڵاودەبێتەوە و، دادوەرەکان لە نێوان خۆیاندا دەماودەمی پێدەکەن، هەرچەندەش بە "ژیری"ی خۆیان باوەڕ بە شتی وا ناکەن!

هەروەها بەڕێوەبەری ئەو کاتەی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" ڕووداوێکی دیکەی هاوشێوەی ئەمە دەگێڕێتەوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٩٩-٦٧٥.

گوێی لە دەنگی بەدیعوززەمان دەبێت کە داوا دەکات لە بەندیخانە بڕواتـە دەرەوە بۆ نوێژی هەینی لە مزگەوتی "ئاق جامیع". لە کاتی نوێـژدا سـەردانی ژووری زیندانەکەی دەکات، دەبینێت لەوێ نییە و، پاسەوانەکانیش لـە شوێنی خۆیـاندان و قفڵـەکانیش بـە دەرگاکانەوەیە! بەڕێوەبەر خێرا دەڕوات بـۆ مزگـەوتی نـاوبراو، لـەوێ مامۆستا لـە لای ڕاستی ڕیزی پێشەوەدا دەبینێت. دوای تـەواوبوونی نوێـژ بـە دوایـدا دەگـەڕێت، بـەڵام نایدۆزێتەوە. خێرا دەگەڕێتەوە بۆ بەندیخانەکـە، دەبینێـت مامۆستا دەڵێـت: "الله أکبر" و دەچێتە سوژدەوە!

ئەو کاتەش کە مامۆستا لە بەندیخانـەی "دەنیزلی" بـوو، چـەند ڕووداوێکـی تـری لـێ دەگێڕنەوە کە گەلـێ جار لە نوێژی جەماعەتی بەیانیاندا بینراوە!

هەموو ئـەم هەواڵانـەش لـە زاری چـەند کەسـێکی بەرپرسـەوە بیسـتراوە کـە دوژمنـی مامۆستا بوون، نەك لە دۆستانی[1].

بەڵێ (موجـاهیدان لـە چـەند شـوێنێکی بـەرەی جـەنگدا زانایـەکی مـەزن و بـەڕێزیان بینیبـوو کـە بەشـداری لـە جیـهاددا دەکـات.. دوایـی کـە ئـەم بینینـەیان بـۆ خـۆی بـاس کردبوو، وتبووی: هەندێ ئەولیا لە شێوەی مندا دەرکەوتوون و لە شوێنی مـن و لـەبریی مـن چـەند کارێکیـان ئـەنجام داوە، تـاکو پاداشـتم بـۆ پاشـەکەوت بکـەن و لـەو لاشـەوە ئیمانداران سوود لە وانەکانم وەربگرن.

بە هەمان شێوەی ئەمە، منیان لە مزگەوتەکانی شاری "دەنیزلی"دا بینیبوو لـەو کاتـەدا کە من لە بەندیخانەکەی ئەوێ بووم. تەنانەت ئەمـەیان گـەیاندبووە لایەنـە بەرپرسـەکان و بەڕێوەبـەری بەندیخانـە و پاسـەوانەکان. هەندێکیشیان بـە نیگەرانییـەوە وتبـووی: کـێ دەرگای بەندیخانەی بۆ دەکاتەوە؟ ئێستا وا هەمان شت لێرەشدا ڕوو دەداتەوە.

بەڵام لە بریی ئـەوەی ڕووداوێکـی جوزئی بدەنـە پـاڵ مـن، پـەیامی "مۆری تەسـدیقی غـەیبی" چـەندین کـاری لـە ئاسایی بـەدەر بـۆ پەیامـەکانی نـوور دەچەسـپێنێت و ڕوونـی دەکاتەوە و، سەد جار بەڵکو هەزار جار لەو ڕووداوە زیاتر متمانە و بـاوەڕی ئیمـانداران بە پەیامەکانی نـوور بەدەسـت دەهێنێـت، جگـە لـەوەش کـە قارەمانـەکانی نـوور لـە ڕێـی

(١) Tarihce-i Hayat, Eskisehir Hayati.

حاڵەتە دەراسا و نووسینە ڕەنگینەکانیانەوە، وەرگیراویی پەیامەکانی نوور دەسەلمێنن و پشت ڕاستی دەکەنەوە)[١].

## چەند نامەیەك لەناو بەندیخانەوە

☐ زلـلەیەکی میهرەبانی

(برایانم! وا سێ ڕۆژ دەبێت بە قەناعەتێکی تەواو هەستم کردووە ئەمەی کە گرفتاری بووین - بە داخەوە - زلـلەیەکی میهرەبانییە! تەنانەت ئەم ئایەتەی خوارەوە کە گەلێ ئاماژەی تێدایە، من وای لێ تێگەیشتم یەکێك لە ئاماژەکانی ڕووی لە ئێمە بێت! ئەم ئایەتە پیرۆزە کە ڕووی لەوانەیە سەرپێچی لە فەرمانی خوا دەکەن دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ... أَخَذْنَاهُمْ﴾[٢].

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٨٩.

لێرەدا یادگارێکی بەڕێز "کەمال تان ئەر" دەهێنین. ئەوەتا دەڵێت:

قوتابیی دوا ساڵی "کۆلیجی مافەکان" بووم، دەبوو سەردانی دادگا و بەندیخانەکانمان بکردایە. ڕۆژێکیان ڕۆشتم بۆ بەندیخانەی ئەسکی شەهر بۆ سەردانی مامۆستا. کاتێ ڕۆشتمە ژوورەوە، بینیم لەسەر بەرماڵەکەی دانیشتووە و سەرقاڵی خوێندنی ویردەکانی دوای نوێژە. دەستیم ماچ کرد و پێم وت: مامۆستام! دەڵێن گەلێ کەرامەتی غەیبی لەسەر دەستی ئێوە ڕوو دەدات، بەڵام من هیچ حاڵەتێکی نائاساییم لێ نەبینیون. دەمەوێت پیشانمی بدەن، بۆ نموونە: با ئەم تەسبیحەی دەستت بڕوات بەڕێوە! مامۆستا بزەیەکی کرد و، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستی خۆی ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە، وتی: "پیاوێك منداڵێکی تاقانەی هەبوو زۆر خۆشی دەویست. ڕۆژێکیان بۆ دەربڕینی خۆشەویستیی زۆری بۆی، بردی بۆ دوکانی گەوهەرفرۆشێك تاکو هەندێ دیاریی بەنرخی لە ئەڵماس و گەوهەرەکان بۆ بکڕێت بە پێی حەزی کوڕە خۆشەویستەکەی. دوکاندارەکەش بنمیچی دوکانەکەی بە چەند میزەڵدانێکی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندبووەوە تاکو سەرنجی کڕیارانی پێ ڕابکێشێت. کاتێ منداڵەکە ڕۆشتە ئەو دوکانەی کە بە میزەڵدان ڕازاوەتەوە، ڕەنگەکانی سەرنجی ئەویان ڕاکێشا و، بە گریانەوە وتی: بابە! میزەڵدانم بۆ بکڕە.. میزەڵدانم دەوێت! باوکی پێی وت: کوڕی خۆشەویستم! گەوهەر و ئەڵماسی بەنرخ و گرانبەهات بۆ دەکڕم. کەچی منداڵەکەی بە جەختەوە داوای میزەڵدانی دەکرد"! دوای ئەوەی مامۆستا ئەم نموونەیەی هێنایەوە، وتی: "برام! من تەنها دەڵاڵ و خزمەتگوزارێکم لە دوکانی گەوهەرەکانی قورئانی پیرۆزدا و، فرۆشیاری میزەڵدانی ڕەنگاوڕەنگ نیم، جگە لە ئەڵماسی هەمیشەیی قورئانی پیرۆز شتێکی تر لە دوکانەکەمدا نییە. جا برام! من سەرقاڵی ڕاگەیاندنی نوورەکانی قورئانم". ئیتر لە مەبەستی مامۆستا تێگەیشتم و، هەستم بە هەڵەی خۆم کرد. (ذکریات عن سعید النورسي، ص: ٣٧)

(٢) دەقی تەواوی ئایەتەکە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ﴾ (الأنعام:٤٤).

واتە: ئەو کەسانەی ئامۆژگاری کران، دوای ئەوەی کە ئامۆژگاریيان نەگرتە گوێ، بە گیروگرفت و بەلا و موسیبەت دووچارمان کردن.

بەڵێ، لەم دواییەدا پەیامێکمان پێ نووسرا کە تایبەتە بە نهێنیی ئیخلاسەوە. هەر بە ڕاستیش پەیامێکی بەرز و دەستوورێکی برایانە و نوورانیيە. بە ڕادەیەك کە ئەو گیروگرفت و ڕووداوانەی بە دە هەزار کەس نەبێت ناتوانرێ بەرگری بکرێت، کەچی بەهۆی نهێنیی ئیخلاسەوە تەنها دە کەس دەتوانن بەرەنگاریان ببنەوە و خۆیانی لە بەردەمدا ڕابگرن!

بەڵام وا بە داخەوە دەڵێم: کە ئێمە و لە پێشدا خۆم، نەمانتوانی بەپێی داخوازی ئەو بێدارکردنەوە مەعنەوییە ڕەفتار بکەین. بۆیە واتای "ئاماژەیی"ی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئێمەی گرتەوە و، هەندێکمان گیرۆدەی زللەی تەمێکردن و میهرەبانی بووین، سەبارەت بە هەندێکی تریشمان زللەی تەمێ کردن نەبوو، بەڵکو بوو بە مایەی دڵدانەوە و دڵنەوایی، تاکو پاداشتیان دەست بکەوێت.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی ماوەی سێ مانگە تێکەڵ بوونم لەگەڵ خەڵکیدا لێ قەدەغە کراوە، ئەوا هەتا سێ ڕۆژ پێش ئێستاش نەمتوانیوە ئاگام لە هەواڵی برایانم بێت. ئەوەبوو بێ ئەوەی شتی وام هەرگیز بە خەیاڵدا هاتبێت، هەندێ لەوانەی کە بە دڵسۆزترین و خاوێنترینی برایانی خۆمم دادەنا، چەند کارێکی پێچەوانەی نهێنیی ئیخلاسیان لێ دەرکەوت. ئیتر لەمەوە تێگەیشتم کە یەکێك لە واتا ئاماژەییەکانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ... أَخَذْنَاهُمْ﴾ لە دوورەوە ڕووی لە ئێمەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزەی کە سەبارەت بە گومڕایان نازڵ بووە، مایەی ئازارێکی سەختە بۆ ئەوان. بەڵام بۆ ئێمە زللەیەکی تەمێ کردن و میهرەبانییە، تاکو دەروونەکانی پێ پەروەردە و گوناهەکانیشی پێ پاکژ بکرێن و، پلە و پایەکانیشی پێ بەرز ببنەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئێمە ڕێزی شایانمان لەو نیعمەتە خواییە بەنرخە نەنا کە پێی بەخشیوین، ئەوەیە قەناعەتمان بەم خزمەتە قودسییەی "پەیامەکانی نوور" نەکرد کە خاوێنترین جیهادی مەعنەوییە و، لە ڕێژنەی میراتگریی نەبەوییەوە "ویلایەتی کوبرا"ی بەدەست هێناوە و، خولگەی نهێنیی ئەو مەشرەبەیە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر بوون.

لە ئەنجامی ئاگادارکرنەوەی بەردەوام و توندوتیژمەوە بۆ برایان، توانرا ڕێی حەزکردنیان لە تەریقەتە سۆفی‌یەکان لێ بگیرێت، کە لەم ڕۆژگارەدا سوودی کەمیان بۆ ئێمە تێدایە و، دەگونجێت زیان بەم بارودۆخەی ئێستامان بگەیەنێت. دەنا ئەو حەز و ئارەزووە، یەکێتیی ئێمەی تێکدەدا و بیرەکانی ئێمەی پەرتەوازە دەکرد، کە ئەم کارەش نرخی پشتگیری و هاوپەیوەندیی برایانی لە هەزار و سەد و یازدەوە - کە لە یەکگرتنی چوار دانە "یەك"ەوە پەیدا بوون - دادەبەزاندە نرخی تەنها چوار دانە و، دەبوو بە مایەی لە یەك دوورکەوتنەوەی دڵان. کە ئەوەش بەرامبەر بەم ڕووداوە قورسە، هێزی ئێمەی تەفروتوونا دەکرد و هیچ ئاسەوارێکی نەدەهێشتەوە.

شێخ سەعدیی شیرازی[1] خاوەنی کتێبی "گولستان" دەگێڕێتەوە کە:

لە گۆشەی خانەقایەکدا پیاوێکی خاوەن تەقوام لە ئەهلی دڵ بینی کە سەرقاڵی سەیروسلووك بوو، کەچی دوای چەند ڕۆژێك لە قوتابخانە و لە نێوان قوتابیانی زانستە شەرعی‌یەکاندا بینیمەوە! لێم پرسی: بۆچی وازت لەو خانەقایە هێنا کە سەرتاپا نوور و ڕووناکی‌یە و، هاتوویت بۆ ئەم قوتابخانەیە؟

وتی: "ئەم خاوەن نەجابەت و هیممەتە بەرزانە، هاودەم لەگەڵ ڕزگار کردنی خۆیاندا بۆ ڕزگار کردنی کەسانی تریش تێدەکۆشن، بەڵام ئەوانەی ئەوێ تەنها بۆ ڕزگار کردنی خۆیان هەوڵ دەدەن، ئەگەر سەرکەوتن لەم کارەیاندا بەدەست بهێنن!

کەواتە نەجابەت و هیممەت بەرزی و چاکە لای ئەمانە، بۆیە هاتم بۆ ئێرە"!

بەم جۆرە شێخی سەعدی پوختەی ئەم ڕووداوەی لە کتێبی "گولستان"دا تۆمار کردووە[2].

---

(١) شێخ موصلیحەدین سەعدیی شیرازی: یەکێکە لە شاعیرە مەزنەکان. لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی لە "شیراز" لە دایك بووە. لە قوتابخانەی"نیزامیە"ی بەغدا خوێندوویە. لە شیراز لە ساڵی (٦٩١ك) یان (٦٩٤ك) کۆچی دوایی کردووە. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی "گولستان" و "بوستان"ن. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی دانەر باسی کرد، واتای ئەم بەیتانەی شێخی سەعدی‌یە:

صاحبدلی بمدرسه آمد ز خانقاه — بشکست عهد صحبت اهل طریق را

گفتم میان عالم و عابد چه فرق بود — تا اختیار کردی از آن این فریق را

گفت آن گلیم خود بدر میبرد زموج — وین جهد میکند که بگیرد غریق را

بروانە: کلیات سعدی - گلستان، چاپ تهران - ١٣٦٩ ش. به اهتمام محمد علی فروغی (وەرگێڕ)

جا ئەگەر مەسەلە سادە و ئاساییەکانی صەرف و نەحوو کە قوتابیان پێیانەوە خەریکن وەك: "نَصَرَ، نَصْراً، نَصَرُوا" لەو ویردانە لە پێشتر بن کە لە تەکیە و خانەقاکاندا دەخوێنرێن، دەبێ پلەوپایەی "پەیامەکانی نوور" چۆن بێت کە ئەو حەقیقەتە ئیمانییە خاوێنانەی: "آمنت بالله وملائكته وكتبه ورسله وباليوم الآخر"یان لەخۆ گرتووە؟!

لە کاتێکدا کە "پەیامەکانی نوور" بە ڕوونترین شێوە و بەوپەڕی بێ گومانی و چەسپاندن، ئەو حەقیقەتانە تەنانەت بۆ سەرسەختترین زەندیق و کەللەڕەقترین فەیلەسووفی ملنەدەر دەچەسپێنن و، بە بەڵگە دەیانبەستنەوە و ڕێنماییان دەکەن.. لە کاتێکدا کە ئەمە حاڵی پەیامەکانە، دەبێ ئەو کەسە چەندە لە هەڵەدا بێت کە واز لەم ڕێگایە دەهێنێت، یان پەکی دەخات، یان قەناعەتی پێ ناکات و، بێ ڕوخسەت و مۆڵەت خواستن لە پەیامەکان و، بۆ مەبەستی شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووی خۆی، دەچێتە ناو تەکیە و خانەقا داخراوەکانەوە!

لە هەمان کاتدا ئەم کارە ڕادەی شایستەییشمان بۆ ئەم زلـلەی تەمێ و میهرەبانییە دەردەخات)[1].

☐ شتێکی ئەوتۆمان لەدەست نەچووە

(برا ئازیز و بەوەفاکانم!

کاتی خۆی لە شارێکدا شێخێکی مەزن گەلێ موریدی لە دەور کۆبووبوونەوە. پیاوانی دەوڵەتیش لەو شارەدا کەوتنە مەترسییەوە لەو موریدانە و، دەترسان دەست لە کاروباری سیاسەت وەربدەن. لەبەر ئەوە، ویستیان ئەو کۆمەڵەی دەوروبەری شێخ تەفروتوونا و پەرتەوازە بکەن.

کە شێخ بەمەی زانی، پێی وتن: "من تەنها مورید و نیوێکم هەیە؛ ئەگەر حەزیش دەکەن تاقییان دەکەینەوە"!

شێخ لە دەرەوەی شار خێوەتێکی هەڵدا و، هەزاران کەسی لە موریدەکانی خۆی بۆ ئەوێ بانگ کرد، پاشان پێی وتن:

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و هەشتەم، ل: ٥٥٨-٥٦٠.

"وا ئێستا تاقیتان دەکەمەوە؛ جا هەر کەسێك بـە ڕاستی موریـدی مـن بێـت، دەچێتـە بەهەشتەوە".

ئنجا یەکە یەکە بانگی دەکردن بۆ ناو خێوەتەکە، لە هەمان کاتیشدا و بـە چەشـنێکی پەنهان بەرخێکی سـەربڕیبوو، موریدەکـانی دەرەوەی خێوەتەکـە وا تێگەیشـتن کـە شـێخ یەکێك لە موریـدە تایبەتمـەندەکانی خۆی سـەربڕیوە و بۆ بەهەشـتی نـاردووە! ئیـتر هـەر هەموویان کشانە دواوە و بە گوێی شێخیان نەکرد، تەنانـەت ئینکـاریی ئـەو هەڵوێستەی شێخیشیان دەربڕی. تەنها یەك "پیاو" نەبێت وتی: "من دەڕۆم؛ با سەرم بە قوربـانی شـێخ بێت"! ئەمەی وت و، خۆی بە ناو خێوەتەکەدا کرد. پاش ئەو ژنێکیش هەمان هەڵوێستی نواند. هەموو ئەوانی تر بڵاوەیان لـێ کرد!

ئنجا شێخ بە پیاوانی دەوڵەتی وت:

"ئەوەتا بە چاوی خۆتان بینیتان کە من تەنها مورید و نیوێکم هەیە"!

بەڵام ئێمە هەزار و یـەك شـوکر و ستایش پێشکەشی خـوای گـەورە دەکـەین کـە لـە تاقیکردنەوە و موحاکەمەکانی "ئەسـکی شـەهر"دا، بە پێچەوانـەی ئـەو شـێخەوە، تەنـها قوتابی و نیوێکمان لە دەست دەرچوو، لە بریی ئەو قوتـابی و نیـوە لەدەسـت چـووەش دە هەزار کەس هاتن و بوون بە قوتـابیی نـوور! ئەمـەش بـە فـەزڵی خـوای گـەورە و ئـەنجامی هەوڵ و کۆششی پاڵەوانانی "ئیسپارتە" و دەوروبەری.

لــە خــوای گــەورە داواکــارین کــە بــەهۆی هیممــەتی پاڵــەوانانی خۆرهــەڵات و خۆرئـاوای وڵات، لـەم تاقیکردنەوەیـەدا کەسـانی زۆر بەزایـە نـەچن، بـەڵکو لـە بریـی یەکێکی لەدەستچوو دە کەس بێنە مەیدانەوە)[1]!

□ ورياکردنەوەیەك لە دووتوێی چیرۆکێکی بچووکدا

(پیرەژنێك هەشت کوڕی هەبوو. جارێکیان سەروکولێرەی بە هـەر یەکەیان دا، بـێ ئەوەی هیچ بۆ خۆی بهێڵێتەوە. پاشـان پێـی وتـن: یـەکی لـەتێك کولـێرە بەشـی دایکتـان بدەن! بەم جۆرە، خۆی چوار کولێرە و ئەوانیش یەکی لەتێکیان بەرکەوت!

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٥٠٠-٥٠١.

برايانم! من لە خۆمدا هەست بە نیوەی ئازاری یەك بە یەكی ئێوە دەكەم، لە كاتێكدا كە ئێوە دەگەنە چل كەس!

ئەوەش بزانن كە من گوێ بە ئازارە كەسی و تایبەتی‌یەكانی خۆم نادەم. بەڵام رۆژێكیان ناچار بووم كە بڵێم: "ئایا ئەمە تۆڵەی خۆمە وا سزا دەدرێم لەسەری"؟

ئنجا كەوتمە پشكنین و گەڕان بە دوای ئەو حاڵەتانەی پێشوودا و، بینیم كە من هیچ دەستێكم لە جووڵاندن و ورووژاندنی ئەم موسیبەتەدا نەبووە، بەڵكو ئەوپەڕی دوورەپەرێزیم لێ كردووە.

بەو واتایەی كە ئەم موسیبەتە قەزایەكی خواوەندە بەسەرماندا باریوە و، ماوەی ساڵێكە لە لایەن خراپكارانەوە لە دژی ئێمە ساز كراوە و، لە توانامانددا نەبووە خۆمانی لێ بپارێزین. بۆیە هەرچی‌یەكمان بكردایە، نەماندەتوانی خۆمان بپارێزین لەوەی كە خستیانە ئەستۆمانەوە.

كەواتە سوپاس و پێزانین بۆ خوای گەورە كە توندوتیژیی موسیبەتەكەی لە "سەد"ەوە هێنایە خوارەوە بۆ سەر "یەك".

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە، ئێوە منەتم بەسەردا مەكەن و مەڵێن: ئێمە بەهۆی تۆوە بەم گیروگرفتە سزا دراین. نەخێر وا مەڵێن، بەڵكو لێم ببوورن و دوعای خێرم بۆ بكەن..

ئنجا ڕەخنەش لە یەكتر مەگرن و، بە یەكتری مەڵێن: گەر ئەو كارەت نەكردایە فلانە شت ڕووی نەدەدا. چونكە بۆ نموونە دان پێدانانی برایەكمان لەسەر خۆی، لە بریی چەند كەسێك لەوانەی ئیمزایان لەسەر پەیامەكان كردبوو، زۆر كەسی ڕزگار كرد و، لە شان و شكۆی ئەو فرووفێڵ و پیلانە زۆرانەشی هێنایە خوار كە ئەو كەسانەی ئەم كێشەیە گەورە دەكەن لە مێشكی خۆیاندا نەخشەیان بۆ كێشابوو.

جا ئەم كارە هیچ زیانێكی تێدا نی‌یە. بەڵكو سوودێكی گەورەی گشتیی تێدایە، چونكە بوو بەهۆی ڕزگار كردنی زۆر كەسی بێ تاوان.

دەسا برایانم! لە یەك بێزار مەبن و بە یەكتر مەڵێن: ئەم برایەم ویژدانی نەبوو بەرامبەرم.. یان: مافی پێشێل كردم..

ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە لەم ژیانە و لەم کۆبوونەوەیەماندا. خۆ ئەگەر هاوڕێکەت بایی درەمێك زیانی پێگەیاندبیت، تۆ بەم بێزاربوون و دوورکەوتنەوەیەت لێی بایی چل درەم، تەنانەت گریمانی ئەوە هەیە بایی چل لیرە زیان بە پەیامەکانی نوور بگەیەنیت.

بەڵام – سوپاس بۆ خوا – بەرگرییە ڕاست و دروست و بەهێزەکانمان کارێکی کرد برایانمان بۆ لێپرسینەوەی دووبارە بانگ نەکەنەوە، ئیتر بەم جۆرە دەرگا لەسەر خراپە داخرا. دەنا ئەو زویرییەی کەوتبووە ناو برایانمان زیانێکی گەورەی پێ دەگەیاندین، بە وێنەی ئەوەی کە پووشێك بکەوێتە چاوی مرۆڤەوە یان پزیسکێکی ئاگر فڕێ بدرێتە ناو بارووت)[1]!

□ ﴿وَلا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلاَّ بِأَهْلِهِ﴾ (فاطر: ٤٣)

دەستی نزای برا بێ تاوانەکانمان، کە بۆ خوای بەتوانای باڵادەست بەرز کرانەوە، وەکو ئەوە وابوو کە گوللە تۆپەکان ئامادە بکەن، چونکە ئاراستەی ئەوانە کران کە دەیانویست فێڵمان لێ بکەن! ئەوەبوو بەسەر خۆیاندا تەقییەوە و، ئێمەش هیچ ئازارێکمان پێ نەگەیشت، مەگەر چەند سووکەڵە زامێکی کەم، ئەوەش پاداشتمان دەست دەخات.

کەواتە دەبێ ئێمە دڵخۆش بین و شوکری خوا بکەین، چونکە ماوەی ساڵێك بوو ئەو تۆپە لە لایەن ئەوانەوە ئامادە دەکرا بۆ ئێمە. واتە ڕزگاربوونمان لێی بە فەزڵی خوای گەورە کارێکی دەراسا بوو.

جا لەبەر ئەوەی خراپکاران پلانێکی وایان دارشتبوو کۆتایی بە ژیانمان بهێنن، ئەوا پاشماوەی ژیانمان موڵکی ئێمە نییە! بەو واتایەی کە دەبێ لە مەولا ژیانمان بۆ حەق و ڕاستی تەرخان بکەین، نەك بۆ خۆمان. هەروەها بەردەوام تێبکۆشین لە هەموو شتێکدا ڕووی "میهرەبانی" و ئاسەوارەکەی و خودی خۆی ببینین، تاکو هەمیشە لە بری سکاڵاکردن هەر شوکرانەبژێر بین[2].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و هەشتەم، ل: ٥٦٢-٥٦٣.

(٢) Tarihce-i Hayat, Eskisehir Hayati.

❐ وازنەهێنان لە "پەیامەکان"

(برایانم! گەلێ بەرگریی ئەوتۆم لە قوتابیانی نوور کرد کە شایانی ئەوان بێت. پشت بە خوا لە دادگاشدا بەوپەڕی توانامەوە دەنگی لێ هەڵدەبڕم و، هەمان بەرگرییان لێ دەکەم و، دەنگی پەیامەکانی نوور و پلە و پایەی قوتابیانی بە گوێی سەرانسەری دنیادا دەدەم!

بەڵام دەبێ ئاگاتان لەمەی خوارەوە بێت:

مەرجی پارێزگاری کردنی نرخ و بەهای بەرگرییەکەم، بریتییە لەوەی کە: لە ئەنجامی تەنگانەی ئەم ڕووداوە و هاوچەشنیەوە واز لە پەیامەکانی نوور نەهێنرێت و، برا لە مامۆستاکەی بێزار نەبێت و، بەهۆی تەنگانە و بێزاربوونەوە دوورەپەرێزی لە براکانی نەکات و، بە دوای عەیب و عار و ناتەواویی یەکتردا نەگەڕێن.

ئێوە لە یادتانە کە لە "پەیامی قەدەر"دا چەسپاندمان ئەو ستەمەی دێتە ڕێی مرۆڤ دوو حوکم و دوو ڕووی تێدایە:

ڕووی یەکەم: هی مرۆڤە..

ئەوی تریان: هی قەدەری خوایە.

واتە: لە تەنها یەك ڕووداودا مرۆڤ ستەم دەکات، لە کاتێکدا "قەدەری دادگەر"ی خواوەند لە هەمان ڕووداودا بە دادگەری ڕەفتار دەکات!

جا دەبێ ئێمە لەم کێشەیەماندا زیاتر بیر لە دادگەریی قەدەر و حیکمەتی خواوەند بکەینەوە، تا بیرکردنەوەمان لە ستەمی مرۆڤ.

بەڵێ، قەدەر بانگهێشتی قوتابیانی نووری بۆ ئەم کۆڕ و ئەنجومەنە کردووە و، حیکمەتی "سەرکەوتنی جیهادی مەعنەوی" بەرەو ئەم قوتابخانە یووسفییە ئەوانی دایەبەر کە لە ڕاستیدا مرۆڤ دڵتەنگ و بێزار دەکات و، بەو پێیە ستەمی مرۆڤ بوو بەهۆی ئەو کارەی قەدەر.

لەبەر ئەوە، هەرگیز کەستان بە کەسی ترتان نەڵێت:

"گەر ئاوات نەکردایە من نەدەگیرام"!)[1].

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و هەشتەم، ل: ٥٥٧.

❑ دیمەنەکانی تابلۆیەکی مەعنەوی

(لە یەکێك لە ڕۆژەکانی "جەژنی کۆماری"دا لە بەردەم پەنجەرەی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" کە بەسەر قوتابخانەیەکی ئامادەیی کچاندا دەڕوانێت، دانیشتبووم..

لەو کاتەدا قوتابی‌یە تازە پێگەیشتووەکانی ئەو قوتابخانەیە، بەوپەڕی خۆشی و شادی‌یەوە، سەما و یاری‌یان دەکرد..

یەکسەر لەسەر شاشەیەکی مەعنەوی، حاڵی پاش پەنجا ساڵی ئەو قوتابیانەم هاتە بەرچاو!

بینیم لە شەست قوتابیدا پەنجایان لەناو گۆڕەکانیاندا دەبن بە خاك و سزا دەدرێن. دە دانەکەی تریشیان بوون بە چەند پیرەژنێکی ناشیرینی حەفتا هەشتا ساڵە و ئەو جوانی‌یەی دەموچاویان نەماوە و ئاڵۆزاوە و بە تەواوی چرچ بووە و، بەدەست ئەو کەسانەوە خەم و ئازار دەچێژن کە کاتی خۆی چاوەڕوانیی سەرسوورمان و خۆشەویستی‌یان لێ دەکردن، بەڵام وا ئێستا بە چاوێکی سووك و بێزەوە سەیریان دەکەن و، ئەمانیش لە ناچاریدا خەفەت بۆ لەدەستچوونی ڕۆژانی جوانی و لاوی‌یان دەخۆن، چونکە پاك و خاوێنیی خۆیان تێدا نەپاراست!

بەڵێ، بەوپەڕی دڵنیایی و بێ گومانی ئەمەم بینی. ئیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا و، بۆ حاڵی ئەوان دەستم بە گریانێکی هێندە گەرم و بەکوڵ کرد کە سەرنجی هەندێ لە هاوەڵەکانی بەندیخانەمی ڕاکێشا و، بە پەلە هاتن و، هەواڵیان لێ پرسیم.

منیش پێم وتن:

"ئێستا وازم لێ بهێنن و لێم دوور بکەونەوە"..)[١].

(کاتێ لە پەنجەرەی بەندیخانەوە و لە چاویلکەی "بیرکردنەوەم لە دوارۆژ و نیگەرانیم بۆ ئاییندە" سەیری پێکەنینە گریانهێنەکانی مرۆڤم دەکرد لە فیستیڤاڵی ڕەنگینی شەودا، یەکسەر لە بەردەم بینینی ئەندێشەمدا ئەم بارودۆخەی خوارەوەم لێ دەرکەوت:

وەك ئەوەی لەسەر شاشەی سینەمادا بارودۆخەکانی ژیانی ئەو کەسانە دەبینرێت کە ئێستا لەناو گۆڕەکانیاندا ڕاکشاون..

---

(١) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٣٢٧-٣٢٨.

بە هەمان شێوە، منيش تەرمی بزۆك و جووڵاوی ئەو خاوەن گۆڕانەم لـە پێش چـاوی خۆمدا بينی كە لە ئايندەيـەكی نزيكـدا دەمـرن و دەڕۆنـە نـاو گۆڕەكانيـان! بۆيـە ئـازار و هەستی بێزاری سەريان تێكـردم و، بۆ حـاڵی ئەوانـەی كـە ئێستا لـە پێكـەنيندان، دامـە پرمەی گريان!

پاشان سەردانی ژيريی خۆمم كرد و لە "حەقيقەت"م پرسی: ئەم ئەندێشەيە چیيە؟!

"حەقيقەت" وەڵامی دامەوە كە:

پێنـج كـەس لـەو پـەنجا كەسە بەدبەختانەی كـە ئێستا وا پێدەكـەنن و لـە خۆشـی و شادمانيدان، دوای پەنجا ساڵی تر دەبينيـت پير و پەككەوتـەن و، پشتيان چەميوەتـەوە و، تەمەنيشيان خۆی لە حەفتا ساڵ داوە!

چل و پێنج دانەكەی تريشيان لەناو گۆڕەكانياندا لەشيان شی دەبێتـەوە و دەبنـەوە بە گڵ!

كەواتە ئەو ڕوخسارە جوان و پێكەنينە شادمانانە، دوايی هەڵدەگەڕێنەوە و پێچەوانـە دەبنەوە! خۆ بەپێی دەستووری "كل آتٍ قريب" بينينی ئەو شتانەی كە لەمەولا دێن، وەك ئەوەی ئێستا هاتبن و ڕوويان دابێت، كارێكی حەقە و ڕاستيی لەخۆ گرتووە. كەواتە ئەو شتانەی بينيتن، هەموويان ڕاستين و هيچيان ئەندێشە نين.

جا مادەم ئـەو پێكەنينە غەفڵـەت ئامێزانـەی دنيـا، تێكـڕا كـاتی و لـەناوچوون و، ئـەم چەشنە حاڵەتە ئازاربەخش و گريان هێنەرانەيان لە خۆدا شاردووەتەوە، ئەوا دەبـێ تەنـها يـەك شـت هـەبێت "دڵ"ی مرۆڤـی بەدبـەختی عاشـقی "هەميشـەيی" خـۆش بكـات و، شادمانی بـە "گيـان"ی شـەيدا و تامـەزرۆی "مانەوە" و "نـەمری"ی ئـەو ببەخشـێت، كـە ئەويش بريتیيە لە گەمە و گاڵتەوگەپی خاوێن و چـەند دڵخۆشـی و شـادمانیيەك كـە لـە چوارچێوەی شەرعدان و بەهۆی پاداشتەكەشيانەوە "مانەوە" بەدەسـت دەهێنـن، هـاودەم لەگەڵ شوكرانەبژێرییەكدا كە بـە دڵنيـايی و دڵ بێـداری و دوور لـە بـێ ئاگـايی ئـەنجام بدرێت.

جا بۆ ئەوەی ڕۆژانی جەژن "بێ ئاگايی" لەناو دەروونەكاندا پەرە نەسێنێت و پاشـان مـرۆڤ لـە بازنـەی شـەرع دەرنـەكات، فـەرمووده پيرۆزەكـان گەلـێ هـاندانی زۆر و

بەهێزیان تێدایە لەسەر شوکرانە و یادی خوای گەورە لەو ڕۆژانەدا. چونکە بەم کارە نیعمەتەکانی "خۆشی" و "شادمانی" دەبن بە شوکرانەبژێرییەکی ئەوتۆ کە نیعمەت زیاد و بەردەوام بکات، چونکە "شوکر" نیعمەت زیاد دەکات و، بێ ئاگاییش نایهێڵێت و لایدەبات)[1].

☐ نووسینی "تیشکی یەکەم"[2]

(لە بەندیخانەکەی ئەسکی شەهر و لە کاتێکی ترسناکدا کە ئێمە زۆر پێویستمان بە دڵدانەوەیەکی قودسی بوو، ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە لە خۆمم پرسی:

تۆ چەند شایەتێکی نێوان قسە و گوفتارەکانی ئەولیا پێشینەکان لەسەر "ئەحەققییەت" و "قبووڵ بوون"ی پەیامەکانی نوور دەهێنیتەوە. کەچی بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا رَطْبٍ وَلا يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ (الأنعام:٥٩) خاوەنی گوفتار لەم مەسەلەیەدا قورئانی پیرۆزە..

جا ئایا قورئانی پیرۆز لە پەیامەکانی نوور ڕازییە؟ ئایا چۆن دەڕوانێتە ئەم پەیامانە؟

ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە سەیرە بوومەوە و، پەنام بۆ قورئانی پیرۆز برد و، داوای یارمەتیم لێ کرد. یەکسەر لە ماوەی یەك کاتژمێردا هەستم کرد کە:

"پەیامەکانی نوور" تاکێکە لە ناوەندی ئەو واتا ئاماژەییە هەمەکییەی کە ئەویش یەکێك لە چینەکانی ئەو لق و پەلانە دەنوێنێت کە لە واتای ڕاشکاوی سی و سێ ئایەتی پیرۆزی قورئاندا هەن.

هەروەك نیشانەیەکی بەهێزیشم دەست کەوت لەسەر ئەوەی کە پەیامەکانی نوور ئەو واتایە دەیانگرێتەوە و تایبەتە بەوانەوە. چونکە بەشێکی ئەم نیشانەیەم تا ڕادەیەك بە

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و هەشتەم، ل: ٥٧٩-٥٨٠.

(٢) بەرهەمەکانی تری لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" ئەمانەن:

١. بریسکەی بیست و حەوتەم (بەرگرییەکانی لە بەردەم دادگای ئەسکی شەهردا).
٢. بریسکەی بیست و هەشتەم (چەند نامەیەکی دڵدانەوە بۆ برایانی لەناو بەندیخانەدا).
٣. بریسکەی بیست و نۆهەم (پەیامی: بیرکردنەوەی ئیمانیی بەرز و خواناسینی تەوحیدیی بڵند).
٤. بریسکەی سیهەم (لێکدانەوەی ئیسمی ئەعزەمی: الفرد، الحي، القيوم، الحكم، العدل، القدوس).
٥. تیشکی دووهەم (لەبارەی تەوحید و، واتاکانی: قل هو الله أحد).

ڕوونی و بەشەکەی تریشیم بە کورتی و پوختی بینی. ئیتر هیچ شوبهە و گومان و دوودڵی و وەسوەسەیەکم لەو قەناعەتەمدا نەما. بۆیە ئەو قەناعەتە بێ گومانەی خۆمم نووسی و، دام بە برا تایبەتمەندەکانم، بەو مەرجەی بە نهێنی هەڵی بگرێت. ئەمەش بە نیازی پارێزگاری کردنی "ئیمان"ی ئیمانداران بە پەیامەکانی نوور.

ئێمە لەو پەیامەدا نەمان وتووە: واتای ڕاشکاوی ئایەتە پیرۆزەکە ئەمەیە، هەتا زانایان بڵێن: "فیه نظر"! هەروەها نەشمان وتووە: هەمەکی بوونی واتا ئاماژەییەکە بریتییە لەمە. بەڵکو دەڵێین:

لە ژێر واتای ڕاشکاوی ئایەتە پیرۆزەکەدا چەند چینێکی جیاجیای "واتا" هەیە. یەکێك لەم چینانە واتای هێما و ئاماژەییە. ئنجا ئەم واتا ئاماژەییەش خۆی لە خۆیدا هەمەکی(كلي)یە و، لە هەموو چەرخێکدا چەند واتایەکی هەندەکی(جزئي)ی هەیە..

جا پەیامەکانی نوور لەم چەرخەدا یەکێکە لە دانە دانە و تاك تاکە جوزئییەکانی هەمەکێتیی چینی ئەو واتا ئاماژەییە.

ئنجا هەر لە کۆنەوە دەستووری "حسابی ئەبجەدی و جەفر" لە نێوان زانایاندا بۆ دۆزینەوەی نیشانە و بەڵگەکان کاری پێ کراوە. جا ئەم جۆرە حساب و لێکدانەوەیە هەرگیز ئایەتە پیرۆزەکە و واتا ڕاشکاوەکەی زامدار ناکات. بەڵکو هەندێ جار هۆیەك دەبێت بۆ دەرخستنی ئیعجازی قورئان و مەزنیی ڕەوانبێژییەکەی.

کەواتە لە ڕووی ڕاستییەوە هیچ ڕەخنەیەك لەسەر ئەم ئاماژە غەیبییانە لە گۆڕێدا نییە. چونکە ئەو کەسەی کە نەتوانێت ئینکاریی ئەو وردەکاری و لێ دەرهێنانە لەژمارەبەدەرانەی ئەهلی حەقیقەت بکات، کە لە ئاماژە نەبڕاوە و بێ سنوورەکانی قورئان دەریان هێناون، دەبێ ئینکاریی ئەمەش نەکات، بەڵکو هەر ناشتوانێت بیکات)[1].

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٥١-٢٥٢.

## بەندی شەشەم

# لە تاراوگەی قەستەمۆنی

## (دووهەم قوتابخانەی نوور)

## ١٩٣٦ - ١٩٤٣ز

### ☐ قوتابخانەیەکی تری نوور

(پاش ئەوەی کە ساڵێکی تەواوی مەحکومیم لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"دا بردە سەر، بەو پیری‌یە دووریان خستمەوە بۆ "قەستەمۆنی"[1] و، نزیکەی سێ مانگ لە پۆلیسخانەکەی ئەوێدا بەند بووم.

شتێکی ئاشکرایە کە چەندە ئازار تووشی کەسێکی وەك من دەبێت لەم جۆرە جێگایانەدا، لە کاتێکدا کە بە گۆشەگیری لە خەڵکی دەژی و، ناتوانێت تەنانەت لەگەڵ هاوڕێ وەفادارەکانیشیدا بمێنێتەوە و، بەرگە ئیسلامی‌یەکانی بگۆڕێت بە بەرگە ئەوروپاییەکان[2].

ئا لەم کاتەدا کە نائومێدی دەورەی دابووم، چاودێریی خوای گەورە هات بە فریای پیریمەوە. چونکە پۆلیس و بەرپرسەکانی ئەو پۆلیسخانەیە، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ بوون بە هاوڕێ و برادەری بەوەفای من کە هەرکات بمویستایە دەیانهێنامە دەرەوە بۆ گەشتی

---

(١) "قەستەمۆنی" شارێکە دەکەوێتە باکووری تورکیا. ساڵی ١٩٣٦ز مامۆستا نوورسی بۆ ئەوێ دوورخراوەتەوە و، هەشت ساڵ لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا بووە. تا لە ساڵی ١٩٤٣زدا براوە بۆ "دادگای گەورەی سزا" لە شاری "دەنیزلی". (وەرگێڕ)

(٢) چونکە دوای دەرچوونی "یاسای بەرگ و پۆشاك" خەڵکی بە زۆرەملێ ناچار کران شەپقە و پۆشاکی ئەوروپایی لەبەر بکەن!

دەورووبەری شار و، بە وێنەی هەر خزمەتگوزارێکی تایبەتی خزمەتیان دەکردم. ئەمە جگە لەوەش کە زۆریان لێ نەکردم بۆ لەسەر کردنی "شەپقە"!

پاشان ڕۆشتمە ناو قوتابخانە نووری‌یەکەی[1] بەرامبەر ئەو پۆلیسخانەی "قەستەمۆنی" و، لەوێ دەستم کردەوە بە نووسینی پەیامەکان. "فەیزی و ئەمین و حیلمی و صادق و نەزیف و صەلاحەدین" و هاووێنەیان لە پاڵەوانانی نوور[2] لە پێناوی

(١) خانوویەکی بچووکی دوو نهۆمی بووە. یەکەمیان عەمباری سووتەمەنی و، دووهەمیش لە دوو ژوور پێکهاتووە. مامۆستا نوورسی لە دووهەمیاندا بووە و، هەر بۆ خۆیشی کرێکەی داوە. شوێنەکەی ڕاستەوخۆ لە بەرامبەر پۆلیسخانەوە بووە. مامۆستایان لەوێ نیشتەجێ کردووە، تاکو بەردەوام لە ژێر چاودێریدا بێت!

(٢) ئەو قوتابیانە، دوای دوو ساڵ لە دوورخستنەوەی مامۆستا نوورسی بۆ قەستەمۆنی، واتە لە ساڵی (١٩٣٨ز)دا بە مامۆستا نوورسی ئاشنا بوون و کاریان لە پێناوی پەیامەکانی نووردا دەست پێکرد، جگە لە "ئەمین چایەر" کە لە پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکانی کوردەو، یەکێکە لەوانەی کە لە کوردستانەوە دوورخرابوونەوە بۆ قەستەمۆنی. لەوێ گۆشەیەکی بچووکی بۆ خۆی دانابوو چای تێدا دەفرۆشت و بەم بۆنەیەوە بە "ئەمین چایچی" ناوبانگی دەرکردبوو. ئیخلاسەکەی ڕێنمایی کرد کە ئاشنایەتی لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا پەیدا بکات و لەو ڕێیەوە بوو بە تەوەرەی بڵاوکردنەوەی پەیامەکان. زۆربەی کاتەکان لە قەستەمۆنی لە خزمەتی مامۆستا نوورسیدا بووە و، پاشان لە بەندیخانەی "دەنیزلی"ش لەگەڵ ئەودا بەندکراوە. ساڵی (١٩٦٧ز) لە شاری "وان"ی زێدی خۆی کۆچی دوایی کرد. خوا لێی خۆش بێت.

ئاشنابوونی بە مامۆستا نوورسی بەم شێوەیە بوو کە خۆی دەیگێڕێتەوە:

ڕۆژێکیان پیاوێکم بینی کە زانست و ویقار لە ڕوخساریدا بەدی دەکرا. منیش ڕۆشتم بۆ لای و، دوای سڵاو لێ کردنی لێم پرسی: خەڵکی کوێیت؟

وەڵامی دامەوە: لێم نزیك مەبەرەوە، لە ژێر چاودێریی پیاوانی پۆلیسدام، دەترسم ئازارت پێ بگەیەنن!

ئەو ڕاستی و دڵسۆزی‌یەی کە لەم چاوپێکەوتنەدا هەستم پێ کرد، بەس بوو بۆ ئەوەی کە بە لای خۆیدا کێشم بکات و، هەموو شوێنێکی ناوشاری بە شوێندا بگەڕێم، هەتا دوایی لە پۆلیسخانەکەی ناو بازاردا دۆزیمەوە و، زانیم هەندێ جار سەردەکەوێت بۆ سەر قەڵای قەستەمۆنی و یەکێکیش لە پیاوانی پۆلیس شوێنی دەکەوێت.

ڕۆژێکیان پۆلیسێك هات بۆ لام و بانگی کردم بۆ سەر ئەو قەڵایە کە مامۆستای لێ بوو، کاتێك بە یەك گەیشتین، مامۆستا بە پۆلیسەکەی وت: "براکەم! ئەم پیاوە لە ئاشناکانمە. بریا بوارت پێ بدایایە کەمێك پێکەوە بدوێین". پۆلیسەکە دوور کەوتەوە و، مامۆستاش باروودۆخی سەختی خۆی و تێکچوونی تەندروستیی لە ئەنجامی ئەو ژەهرەی بۆی کرابووە خواردنەوە، بۆ باس کردم.

پاشان وتی: پێویستم بە هەندێ شەکر و پێداویستیی لەو جۆرە دەبێت و، ناشیەڵن هیچ کەسێك ببینێت. جا من دەمەوێت بە مفەوەزەکە بڵێم: نوێنەکەم دەفرۆشم، تاکو ئەم فرۆشتنە ببێتە هۆکارێکی پەیوەندی لە نێوان من و تۆدا، هەتا ئەم گرفتە چارەسەر دەبێت.

دوای ئەوە دەستی برد سێ لیرەی زێڕی لە گیرفانی دەرهێنا و، وتی: ئەم لیرە زێڕانە پاشماوەی ڕۆژەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمە، چەندین ساڵە پارێزگاریم لێ کردوون، تۆ لای خۆت هەڵیان بگرە و بە پێی پێداویستی‌یەکانم خەرجیان بکە بۆم.

لەبەرگرتنەوە و بلاوکردنەوەی پەیامەکاندا بەوپەڕی لێبڕانەوە دەستیان کرد بە دەوام کردن لەو قوتابخانەیەدا و، بەو لێدوان و باسە بەنرخە زانستییانەی ئەوێ لێهاتوویی و چالاکییەکی ئەوتۆیان نواند کە لەچاو ئەوەی کاتی لاویم لەگەڵ قوتابییەکانی پێشوومدا گەلێ زیاتر بوو)[1].

☐ زانستەکان بەدیهێنەرمان پێ دەناسێنن

(کۆمەڵێك لە قوتابیانی قۆناغی ئامادەیی لە شاری "قەستەمۆنی"[2] هاتن بۆلام و پێیان وتم:

---

پێم وت: باری گوزەرانم باشە و، پێویستم بە پارەکانت نییە.
وەلامی دامەوە: من هیچ شتێك بێ بەرامبەر لە کەس قبووڵ ناکەم. ئیتر لیرەکانم لێ وەرگرت و، یەکێکیانم لە بازاڕدا گۆڕییەوە بەم پارانەی ئێستا.
ڕۆژی دوای ئەوە مفەوەزەکە بانگی کردم و، وتی: ئەم مامۆستایە دەیەوێت نوێنەکەی بفرۆشێت، ئایا لێی دەکڕیت؟
وتم: بەڵێ.
پاشان وتی: چۆن ئەم پیاوە دەناسیت و لە کوێ؟
وتم: یەکێکە لە کەسە ناسراوەکانی پێشینم و یەکترمان زۆر دیوە.
ئنجا دوای ئەوەی ئامادەبوونی خۆم بۆ کڕینی نوێنەکە دەربڕی، بردمی بۆ پۆلیسخانە تاکو مامۆستا ببینم کە لە نهۆمی دووهەم بوو. لەوێ نوێنەکەم بینی و نرخەکەیم بە (بیست و پێنج) لیرە خەملاند. ئنجا بە کرێ دامەوە بە مامۆستا، بە مەرجێ ڕۆژانە پارەی تێداخەوتنیم بداتێ! ئیتر بە بیانووی وەرگرتنی کرێی نوێنەکە، هەموو ڕۆژێك دەڕۆشتم بۆ پۆلیسخانە بۆ لای مامۆستا و، لەگەڵ خۆشمدا پێداویستییەکانیم بۆ دەبرد! (ذکریات عن سعید النوورسی ص٤٦)

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٣-٥٢٤.

(٢) لەو سالە تاریکانەدا چەمکی "خوا" و "بەدیهێنەر" لە زەینی خەڵکدا دەسڕرانەوە و، پاچی وێرانکاری و ڕووخاندنیش تەلاری "ئیمان بە خوا"ی لە دڵی نەوەی نوێدا دەڕماند و، سەرسامیی لە دەروونەکانیشدا دەورووژاند.
"عەبدوڵلا یەگن" باسی ئەو سەرسامییەی خۆی دەکات کاتێ کە لە قوتابخانەی ناوەندیدا خوێندوویەتی و، مامۆستاکانی لە قوتابخانە هیچ شتێکیان لەبارەی "خوا"وە بۆ باس نەدەکردن، بۆیە خۆی و هاوڕێیەکی کە ناوی "ڕەفعەت" بووە دەڕۆشتن بۆ سەردانی بەدیعوززەمان. ئەوەتا دەڵێ:
من و ڕەفعەتی هاوڕێم بەردەوام سەردانی مامۆستامان دەکرد، ئەویش لەبارەی "گرنگیی ئیمان" و "یەکتایی خوای گەورە" و سەبارەت بەوەش کە مرۆڤ بۆ ئەوە بەدی نەهاتووە کە بێ هیچ یاسا و دەستوورێك بژی، قسەی بۆ دەکردین. ئێمەش دوای هەموو سەردانێك هەستمان دەکرد سەرلەنوێ لەدایك بووینەتەوە و، هەموو جارێ ناخمان پڕدەبوو لە بەختەوەریی مەعنەوی و خۆشی و شادمانی. (ش: ٣٣١)

"خوای بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە، چونکە مامۆستاکانمان باسی خوامان بۆ ناکەن"!
پێم وتن:

هەریەك لەو زانستانەی دەیانخوێنن، هەمیشە باسی خوا دەکات و بە زمانی تایبەتیی خۆی خواوەندی بەخشندەمان پێ دەناسێنێت. کەواتە ئێوەش لە بریی مامۆستاکان، گوێ بۆ زانستەکان ڕابگرن!

بۆ نموونە: هەروەك هەر شووشە دەرمان و پێکهاتەیەکی کیمیایی ناو دەرمانخانەیەکی گەورە، کە بە چەندین تەرازووی سەرنەکەر و ئەندازەی ورد ئاوێتەی یەکتر کرابێتن، دەیچەسپێنێت کە دەرمانگەرێکی دانا و کیمیاگەرێکی زانا ئەم کارانەی ئەنجام داوە..

دەرمانخانەی گۆی زەویش، کە چوار سەد هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەری زیاتر تێدایە، بە هەمان جۆرە. چونکە لە ڕاستیدا هەریەك لەو ڕووەك و زیندەوەرانە وەکو شووشەیەکی پڕ لە پێکهاتەی ورد و، ئاوێتەکراوێکی زیندەکاری سەرسووڕهێنەر وایە.

جا ئەم دەرمانخانە گەورەیە، خواوەندی دانا و شکۆمەند پیشانی هەموو کەسێك، تەنانەت نابیناکانیش، دەدات و، بە ئەندازەی پلەی کەماڵ و ڕێکوپێکی و گەورەییەکەی، بەدیهێنەری بەخشندە بە غەیری خۆی دەناسێنێت، بە چەشنی دەرمانخانەکەی بازاڕ، کە کیمیاگەر و دروستکەری خۆی ناساند. ئەمەش بەپێی زانستی "پزیشکی" کە خۆتان دەیخوێنن.

[ پاشان گەلێ نموونەی تر دەهێنێتەوە، ئنجا دەڵێ ]:

نموونەیەکی تر: ئەگەر کتێبێك هەبێت لە هەموو دێڕێکیدا کتێبێك بە خەتێکی ورد و، لە هەموو وشەیەکیدا سوورەتێکی قورئانی تێدا نووسرابێت و، هەریەك لەو مەسەلە و بابەتانەش کە لێیان دەدوێت ورد و پڕ واتا بن و پشتی یەکتری بگرن..

گەر کتێبێکی وا ببێت، ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەو کتێبە کارامەیی لەڕادەبەدەری نووسەرەکەی و توانستی تەواوی دانەرەکەی دەردەخات.

واتە ئەو چەشنە کتێبە وەکو ڕووناکیی خۆر نووسەرەکەی بە خەڵکی دەناسێنێت و، کەماڵی توانستی ئەو دەردەخات و، بە چەشنێکی وا ڕێز و تەقدیری سەیرکەرانی ڕادەکێشێت کە یەکسەر لەبەر خۆیانەوە بڵێن: "تبارك الله، سبحان الله، ما شاء الله".

کتێبی مەزن و گەورەی ئەم "گەردوون"ەش وەهایە، کە تەنها لە یەك لاپەڕەیدا - کـە گۆی زەوی‌یە - و لە یەك مەلزەمەیدا - کە وەرزی بەهارە - سێ سەد هەزار کتێبی جیـا جیا، کە ڕووەك و زیندەوەرانن، دەنووسرێن و، هەریەکەیان وەك کتێبێك وان. هەموو ئـەمـانەش پێکەوە و بە بێ تێکەڵبوون و هەڵە و لەبیرچوونەوە و بەوپەڕی ڕێکوپێکی‌یـەوە، دەنووسرێن. تەنانەت لە تەنها وشەیەکیدا "وەك درەخت" پارچە شـیعرێکی تـەواوەتی و، لە یەك دانە نوختەیدا "وەك تۆو" پێڕستی کتێبێکی تەواو دەنووسرێت!

جا هەروەك ئەمە شتێکە لە بەرچاوماندایە و بێ هیچ گومانێك پیشانمان دەدات کە لە پشتی ئەم نووسینانەوە قەڵەمێکی کارامە هەیە دەیاننووسـێت.. ئەوا دەتوانـن بـۆ خۆتـان ئەوە لێك بدەنەوە کە ئایا مەودای بەڵگـەی کتێبی گـەورە و مـەزنی "گـەردوون" کـە لـە هەموو وشەیەکیدا چەندین واتا و دانایی تێدایە و.. مەودای بەڵگەی ئـەم قورئانـە گـەورە بەرجەستەیە - کە جیهانە - بزانن چەندەیە و چۆن دەبێـت بـە بەڵگـە لەسـەر خـواوەنـدی نووسەری خۆی، هەروەك ئەو کتێبـەی لـە نموونەکەدا بـاس کـرا، بـوو بـە بەڵگـە لەسـەر نووسەرەکەی!

ئەمەش بەپێی خواستی "زانستی حیکمەتی شتان" و "هونەری خوێندنـەوە و نووسـین" کە دەیانخوێنن و، بە تەرازوویەکی گەورەتر و ڕوانینێکی فراوانتر بۆ ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون، دەردەکەوێت.

تەنانـەت ئـەو کاتـە تێدەگـەن کـە چـۆن ئـەم کتێبـە گەورەیـەی گـەردوون بـە "الله أکبر"کـردن خـوای بەدیهێنـەری خـۆی دەناسـێنێت و، بـە "سـبحان الله" تەقدیسـی ئـەو خوایـەمان فێر دەکـات و، بـە سوپاسـگوزاریی "الحمـد لله"ش ئـەو خواوەندەمـان لـە لا خۆشەویست دەکات!

بەم جۆرە و بـەپێی ئەوانـەی باسمان کـردن، هەریەکە لـەو زانستە لـە ژمـارە بەدەر و زۆرانە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری شکۆمەندی بوونەوەر و، خـوای گـەورەمان بـە نـاوە جوانـەکانی و کـەماڵات و سـیفەتە بـەرزەکانی پـێ دەناسـێنێت. ئەمـەش بـەهۆی ئـەو تەرازووە فراوان و، ئاوێنە تایبەتی و، چاوە تیژ و بینەر و، ڕوانینە پڕ لە پەندانەی کە لەناو هەریەك لەو زانستانەدا هەن.

بەو قوتابی‌یە لاوانەم وت:

حیکمەتی دووپات بوونەوەکانی قورئانی پیرۆز، وەك: ﴿خلقَ السمواتِ والأرضَ﴾ و ﴿ربُّ السمواتِ والأرض﴾ لە پێناوی ڕێنمایی کردنی خەڵکیدایە بۆ ئەو ڕاستی‌یەی کە باسمان کرد. هەروەها بۆ ئەوەیە کە ئەم بەڵگە بەهێز و ڕووناکەی "تەوحید"مان فێر بکات و بەدیهێنەری مەزنمان پێ بناسێنێت.

ئەوانیش وتیان:

سوپاسی بێ سنوور پێشکەشی پەروەردگاری بەدیهێنەرمان بێت، لەسەر ئەم وانەیەی کە لە ڕاستیدا حەقیقەتێکی گەلێ بەرزە، خوات لێ ڕازی بێت و پاداشتی چاکەت بداتەوە)[1].

❐ "پۆستەچی‌یانی نوور"

بەدیعوززەمان هەشت ساڵ لە "قەستەمۆنی" مایەوە..

لەو ماوەیەدا بە چەندین هۆکاری جۆراوجۆر و بازدان بەسەر ئەو چاوانەدا کە چاودێریی جموجووڵیان دەکرد، پەیامەکانی لەگەڵ قوتابی‌یەکانیدا دەگۆڕی‌یەوە، چونکە ئەم کارە بە نهێنی ئەنجام دەدرا.

ئنجا بە نووسینەوەی "دەستی" لەبەریان دەگیرایەوە و، پاشان بەسەر گوند و ناوچە و شارە نزیکەکاندا دابەش دەکران. بەم کارەش "پۆستەچی‌یانی نوور" پێکهاتن، کە ئەرکی سەرشانیان بریتی بوو لە گواستنەوەی پەیامەکان گوند بە گوند و شار بە شار.

هەروەك کاری لەبەرنووسینەوەی پەیامەکانیش ڕێکوپێك کرا و بەهێز بوو. هەندێ قوتابیی نوور هەبوون کە هەر تەنها خۆیان زیاد لە هەزار دانەیان لە پەیامەکان نووسی‌یەوە!

ئیتر بەم ڕێگایە شەش سەد هەزار نوسخە بە نووسینەوەی دەستی لەبەر پەیامەکان گیرانەوە و، وردە وردە لە سەرانسەری تورکیادا بڵاوبوونەوە و، بەسەر سوپای تاریکیدا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و، ڕایان گەیاند کە هەرگیزاو هەرگیز لە توانادا نی‌یە نووری ئیسلام بکوژێنرێتەوە!

---

(١) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٣٣٩-٣٤٤.

ئەو نامە و پەیامانەی کە خوێنەران بۆ چەند وردە لایەنێکی "فیقهی بانگەواز" ئاراستە دەکەن و، چەند بابەتێکی وردی "ئیمان" لەخۆ دەگرن، هەموویان لە ژێر ناونیشانی "پاشبەندی قەستەمۆنی"دا کۆکرانەوە[1].

## چەند نموونەیەك لە نامەکانی بۆ قوتابیانی

☐ هەندێ ئەنجامی دنیایی لە کاری خزمەتی پەیامەکانی نووردا

(برا ئازیز و ڕاستەکانم!

پیرۆزبایی جەژنتان لێ دەکەم و.. خزمەتە مەزنەکانتانم لەبەرچاوە. لە خوا دەپاڕێمەوە کە سەرتان بخات تیایدا. هەروەك سوپاسی بێ کۆتایی بۆ بەدیهێنەری میهرەبانم لەسەر ئەوەی کە برایانی دامەزراوی خۆبەختکاری وەك ئێوەی کردووە بە خاوەن و بڵاوکەرەوەی "پەیامەکانی نوور". هەر کاتێك ئێوە دێنەوە یادم، "گیان"م خۆشحاڵ و "دڵ"یشم شادمان دەبێت و، خەم بۆ لەدنیا دەرچوونم ناخۆم، بەڵکو وەك هاوڕێیەك دەڕوانمە "مردن". چونکە بە مانەوەی ئێوە ژیانی من بەردەوام دەبێت. لەبەر ئەوە، بە بێ هیچ نیگەرانی‌یەك، چاوەڕێی ئەجەلی خۆم دەکەم!

دەسا خوای گەورە بۆ هەتاهەتایی لێتان ڕازی بێت. ئامین. ئامین.

هەروەك زۆربەی قوتابی‌یە کارگوزارەکانی "پەیامەکانی نوور" هەست بە جۆرە کەرامەت و ئیکرامێکی خوایی دەکەن، ئەم برا کۆڵەوارەشتان لەبەر ئەوەی زۆر پێویستی بەو کەرامەت و ئیکرامانەیە، هەست بە زۆربەی جۆرەکانیان دەکات.

قوتابیانی نووری ئەم ناوچانە بە سوێندخواردنەوە دەڵێن:

هەرکات بە خزمەتگوزاریی نوورەوە سەرقاڵ ببین، ڕۆزیمان فراوان و دڵمان گوشاد دەبێت و، خۆشی و شادمانی هەموو گیانمان دەگرێتەوە. منیش بە تەواوەتی لە خۆمدا هەست بەمە دەکەم، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە دەروونی بەدخواز و شەیتانەکەشم بە سەرسامی‌یەوە لە بەردەم ئەم ڕاستی‌یە بەڵگەنەویستەدا بێ دەنگ دەبن)[2]!

(١) Tarihce-i Hayat, Kastamonu Hayati. ژمارەی ئەو نامەی دڵنەوایی و ڕێنماییانەی کە مامۆستا نوورسی لە "قەستەمۆنی"یەوە ناردنی بۆ قوتابیانی لە "ئیسپارتە" و شارەکانی تر "دوو سەد و حەفتا و پێنج" نامەیە، کە هەندێکیان تایبەتین بۆ چەند کەسێکی دیاریکراو، هەندێکی دیکەشیان گشتین. (ب: ٢/٨٤٤)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٥٠-١٥١.

❑ گرنگترین ئەرکی قوتابیی پەیامەکان

(گرنگترین ئەرکی سەرشانی ئەو کەسەی پەیوەندیی بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە بریتی‌یە لە نووسینەوەیان و، هاندان و بانگهێشتی خەڵکیش بۆ ئەم نووسینەوەیە و، پشت گرتنی بڵاوبوونەوەیان. چونکە ئەو کەسەی کە دەیان‌نووسێتەوە، یان داوا لە یەکێکی تر دەکات بیاننووسێتەوە و دەیانگەیەنێتە دەستی، ناونیشانی "قوتابیی پەیامەکانی نوور" بەدەست دەهێنێت و، لەم ڕێیەوە بەشێك لە دەستکەوتە مەعنەوی‌یەکانم و ئەو دوعا و لالانەوە باشانەمی دەست دەکەوێت کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا سەد جار، بەڵکو زیاتریش پێشکەشی خوای گەورەیان دەکەم. جگە لەمەش بەشێکی لە دەستکەوتە مەعنەوی‌یەکانی هەزاران برای دڵسۆزم و دوعا خاوێنەکانیان بەدەست دەهێنێت.

سەرباری ئەمانەش، ئەو کەسە، بە نووسینەوەی پەیامەکان، لە چوار ڕووەوە چوار جۆری عیبادەتی گیرای دەست دەکەوێت. چونکە ئیمانەکەی خۆی بەهێز دەکات و.. تێدەکۆشێت ئیمانی کەسانی تریش لە تیاچوون بپارێزێت و.. ئەو بیرکردنەوە ئیمانی‌یەی دەستگیر دەبێت کە هەندێ جار سەعاتێکی وەك ساڵێکی عیبادەت وایە – وەك لە فەرموودەدا هاتووە – و خەڵکی تریش بۆ ئەم بیر و تێڕامانە هان دەدات و.. بە یارمەتیدانی مامۆستاکەی هاوبەشی کردارە چاکەکانی ئەو مامۆستایەی دەبێت کە خەتی ناخۆشە و گیرۆدەی بارودۆخە سەخت و دژوارەکان بووە.

بەڵێ، دەتوانێت ئەم چەشنە سوودە مەزنانە بەدەست بهێنێت)[1].

❑ هاوڕێیەتیی پاڵەوانان

(برام "فەیزی"!

ئەگەر دەتەوێت لە پاڵەوانەکانی پارێزگای "ئیسپارتە" بچیت، ئەوا دەبێت لە هەموو شتێکدا وەك ئەوان وابیت..

لە بەندیخانەدا شێخێکی مەزن و ڕابەرێکی گەورە و کەسێتی‌یەکی خاوەن جازیبیەمان لە ئەولیایانی تەریقەتی نەقشبەندی – خوا لێی خۆش بێت – لەگەڵدا بوو.

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٥٣-١٥٤.

ئەم شێخە بۆ ماوەی چوار مانگ لەگەڵ نزیکەی شەست قوتابیی نووردا دانیشت و تێکەڵیان بوو، هەروەك گەلێ قسە و وتوویژی لێزانانەی بۆ کردن تاکو هانیان بدات بڕۆنە ناو تەریقەتەوە. بەڵام تەنها یەکێکیان نەبێت - ئەویش بە شێوەیەکی کاتی - نەیتوانی کەسیان ڕابکێشێتە لای خۆی!

ئەوان هەرچەند دەیانزانی ئەو کەسە وەلی و پیاوچاکە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پێویستییەکیان پێی نەبوو، چونکە ئەو خزمەتگوزارییە ئیمانییەی کە پەیامەکانی نوور پێشکەشی کردبوون و ئاسوودەییان تێدا بە دەست هێنابوو، سەروزیادیان بوو. ئەو پاڵەوانانە بە دڵی بێدار و بەسیرەتی بینەری خۆیان لەم ڕاستییەی خوارەوە تێگەیشتبوون:

خزمەتگوزاریی پەیامەکانی نوور بریتییە لە "ڕزگار کردنی ئیمان". بەڵام تەریقەت و مەشیەخەت "پلەکانی ویلایەت" دەستی مرۆڤ دەخەن..

ئاشکرایە کە ڕزگار کردنی ئیمانی کەسێك گەلێ گرنگتر و پاداشتەکەشی یەکجار زۆرترە لە بەرز کردنەوەی دە ئیماندار بۆ پلەی "ویلایەت". چونکە ئیمان بەختەوەریی هەمیشەیی دەستی مرۆڤ دەخات و موڵکێکی لە زەوی فراوانتری بۆ بەدەست دەهێنێت، بەڵام ویلایەت بەهەشتی ئیماندار فراوانتر و گەشاوەتر دەکات. جا هەروەك بەخشینی پلەی "پادشایی" بە مرۆڤێکی ئاسایی گەورەترە لە بەرز کردنەوەی دە سەرباز بۆ پلەی "فەرماندە"، پاداشتی ڕزگار کردنی ئیمانی مرۆڤێکیش بە هەمان جۆرە؛ گەلێ مەزنترە لەوەی دە کەس بگەیەنرێنە پلەی ئەولیا و پیاوچاکان.

"دڵ"ی برایانی "ئیسپارتە"ت بە گشتی ئەم نهێنییەیان بینیبوو، هەرچەندەش "ژیری"ی هەندێکیان نەیدیبوو..

لەبەر ئەوە، هاوڕێیەتیی کەسێکی لاوازی گوناهباری وەك منیان گەلێ پێ باشتر بوو لە هاوڕێیەتیی چەندەها ئەولیای گەورە گەورە، تەنانەت لە هاوڕێیەتیی موجتەهیدانیش، گەر لەم سەردەمەدا هەبن.

جا لەم ڕوانگەیەوە و لەسەر بناغەی ئەم ڕاستییە:

ئەگەر قوتبێك لە ئەولیاکان، یان شێخێکی گەورەی وەکو "گەیلانی" بێت بۆ ئەم شارە و پێت بڵێ: "لە ماوەی دە ڕۆژدا دەتگەیەنمە پلەی ویلایەت".. تۆیش شوێنی

بکەویت و واز لە "پەیامەکانی نوور" بهێنیت، ئەوا ناتوانی ببیت بە هاوەڵی پاڵەوانەکانی "ئیسپارتە"!)[1].

❑ داوی ئاییندااران

(ئەم چەرخە سەیرەی کە قورساییەکی زۆری خستووەتە ئەستۆی مرۆڤ بەوەی کە داخوازییەکانی ژیانی لەسەر زیاد کردووە و سەرچاوەکەشی لێ هێناوەتەوە یەك و.. لە ڕێی چاولێکەریی یەکترەوە شتانی ناپێویستی هێناوەتە ئاستی شتی پێویست و.. ئەم خەڵکەی وا ڕاهێناوە بە توندی دەست بەو خووانەوە بگرن کە لەواندا ڕەگی داکوتاوە، بە ڕادەیەك کە ژیان و گوزەرانی دنیای کردووە بەوپەڕی ئامانج و مەبەست و، ئاواتی هەرە بەرزی مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا..

ئەم چەرخە سەیرە.. بەم چەشنە کارانەی کە باس کران، پەردەی بەسەر ڕووی ژیانی ئایینی و قیامەتی و هەمیشەییدا هێناوە، هیچ نەبێ ئاستی ئەو ژیانەی هێناوەتە پلەی دووهەم یان سێهەم لە بەرچاوی مرۆڤدا. لەبەر ئەوە و لە سزای ئەم هەڵەیەدا، زللەیەکی ئەوەندە توندوتیژی لە مرۆڤ وەشاند کە دنیاکەی بۆ گۆڕی بە دۆزەخێکی ئەوتۆ هەرگیز ئارامی لەسەر نەگیرێت!

ئاییندارەکانیش - بە هەمان جۆر - دووچاری هەمان دەرد و داو دەبن و، هەیانە هەر بە خۆیشی نازانێت کە بووە بە تەڵەوە!

بۆ نموونە: چەند کەسێکم دی ئارەزوومەندی ئایین بوون و حەزیان دەکرد فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن، تاکو لە کاروبار و ژیانی دنیایاندا سەرکەوتوو بن!! تەنانەت هی وایان تێدا بوو کە لەبەر کەشف و کەرامەت تەریقەتی سۆفیی دەویست! واتە ئارەزووی دواڕۆژی دەکرد بە پلیکانە بۆ دەستخستنی کاروبار و شمەکی دنیایی!

ئەو کەسە بە خۆی نازانێت کە سوودە دنیاییەکانی سەر بە ڕاستییەکانی ئایین - ئەو ڕاستییانەی کە بناغەی بەختەوەریی ئەودنیان - بۆ ئەوەن کە شەوق و زەوق و ئارەزوومەندی بە مرۆڤ ببەخشن و، ئەودنیای لەچاو ئەم دنیا لە لا خۆشەویست بکەن. دەنا ئەگەر ئەو سوودانە بگەنە پلەی "هۆی سەرەکی" بۆ ئەنجامدانی کرداری خێر، ئەوا

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٨٠-١٨١.

ئەو کردارە بەتاڵ دەکاتەوە، هیچ نەبێت ئیخلاسەکەی تێك دەشکێنێت و پاداشتەکەی لەدەست دەدات.

باشترین شتێك کە بە تاقیکردنەوە سەلمابێت و مرۆڤ لە ستەمی ئەم چەرخە نەخۆشە غەددار و شووم و تاریکە ڕزگار بکات، ئەو ڕووناکی‌یەیە کە لە "پەیامەکانی نوور"ەوە دەدرەوشێنەوە، بەو تەرازووکاری‌یە ورد و بەراوردە ڕاستانەی کە تیایاندایە. چل هەزار کەس شایەتی لەسەر ڕاستیی ئەمە دەدەن.

واتە ئەوانەی نزیکی بازنەی "پەیامەکانی نوور"ن، گەر نەڕۆنە ناویەوە، ئەگەرێکی بەهێز هەیە کە تیابچن)[1]!

❐ ڕاستی‌یەکانی ئیمان یەکەم ئامانجن

(لە کاتێکدا کە دەبوو لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا "ڕاستی‌یەکانی ئیمان" یەکەمین و لە پێشترین ئامانج بوونایە و، شتانی تریش لە پلەی دووهەم و سێ‌هەم و چوارەمدا دابنرانایە.. لەو کاتەدا کە دەبوو خزمەت کردنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان بە "پەیامەکانی نوور" گرنگترین کار و ئەرك و جێی بایەخ و حەز و ئامانجی سەربەخۆ بووایە..

کەچی حاڵەتەکانی جیهانی ئێستا، بە تایبەت ژیانی دنیا و، لەویشدا بە تایبەت ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و، بە تایبەت‌تر دەنگوباسی جەنگی جیهانی، کە درەوشانەوەیەکی غەزەبی خوایە و، وەك سزایەك بۆ گومڕایی و هەرزەیی شارستانێتی ئێستا ناردوویەتی و، خەڵکی بە لای خۆیدا کێش دەکات و، ڕەگ و دەمارەکان بە ڕادەیەك دەورووژێنێت کە دەڕواتە ناو ناخی دڵەوە و، لە بریی ڕاستی‌یە بەرزە سوودبەخشەکانی ئیمان، حەز و ئارەزووە بێ کەڵك و زیانبەخشەکانی تێدا جێ دەکاتەوە..

لەم چەرخە شوومەدا کە هەتا ئێستا خەڵکی بەم شتانەوە دەخافڵێنێت و، بە بیرەکانی خۆی تا ئێستاش تەلقیحیان دەکات، بە ڕادەیەك کە زانایانی دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نوور، تەنانەت هەندێ کەس لە ئەولیاکانیش بەهۆی پەیوەندی بوونیان بەو ژیانە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یەوە، لافاوی ئەو تەوژمانە ڕایماڵیون و حوکمی

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٠٠-٢٠١.

ڕاستی‌یەکانی ئیمانیان هێناوەتە پلەی دووهەم و سێهەم و، ئەو مونافیقانەیان خۆش دەوێت کە لەگەڵیاندا هەڵگری هەمان بیر و بۆچوونن و، دوژمنایەتیی ئەو کەسانە دەکەن کە لە ئەهلی حەقیقەت و تەنانەت ئەهلی ویلایەتیشن و ڕایان لەگەڵ ئەماندا جیاوازە، بەڵکو ڕەخنەشیان لێ دەگرن.. ئەمەش لە ڕادەیەکدایە کە هەست و شعوورە ئاینی‌یەکانیان کردووە بە شوێنکەوتەی ئەو تەوژمە سیاسی‌یانە..

لەم چەرخەدا و لە بەرامبەر ئەم تیاچوونە سەیر و سەرسوورهێنانەی کە ئەم سەردەم و ڕۆژگارە لەگەڵ خۆیدا هێناونی.. خزمەتی پەیامەکانی نوور و سەرقاڵ بوونم پێیانەوە، بە ڕادەیەك ئەو تەوژمە سیاسی‌یانەی ئێستای لە پێش چاو خستووم کە لە ماوەی ئەم چوار مانگەدا بایەخم بە دەنگوباسی ئەم جەنگە نەداوە و، هیچ هەواڵێکیشم لە بارەیەوە نەپرسیوە!

پاشان قوتابی‌یە تایبەتمەندەکانی پەیامەکانی نوور لەو کاتەدا کە سەرگەرمی بلاوکردنەوەی ڕاستی‌یە بەنرخەکانی ئیمانن، نابێ بە سەیرکردنی یاریی شەترەنجی ستەمکاران لە ئەرکی موقەددەسی خۆیان سست ببنەوە و، خاوێنیی زەین و بیری خۆیانی پێ لێڵ بکەن. چونکە خوای گەورە نوور و ئەرکی نوورانیی بە ئێمە بەخشیوە و، چەند گەمە و گاڵتەیەکی تاریك و زاڵمانەشی بەوان داوە.

جا لە کاتێکدا کە ئەوان بێز لە ئێمە دەکەنەوە و، دەستی یارمەتیمان بۆ ڕاناکێشن و، حەزیان لە ڕووناکی‌یە بەرزەکانی لای ئێمە نی‌یە، کارێکی گەلێ هەڵەیە کە ئێمە لەسەر حسابی ئەرکە خاوێن و ڕووناکەکەی سەرشانمان دابەزینە ئاستی سەیرکردنی یاری‌یە تاریکەکانی ئەوان. کەواتە چێژە مەعنەوی‌یەکان و نوورەکانی ئیمان لەناو بازنەکەماندا سەروزیادی ئێمەیە)[1].

- ❐ ڕاستکردنەوەی شەفەقەتێکی زیاد لە پێویست

(لەبەر ئەوەی شەفەقەتی مرۆڤ یەکێکە لە درەوشانەوەکانی میهرەبانیی پەروەردگار، ئەوا نابێت مرۆڤ پلەی میهرەبانیی خواوەند بشکێنێت و، بیەوێت لە میهرەبانیی پێغەمبەری "رحمة للعالمين ﷺ" زیاتر هەنگاو بنێت! چونکە گەر لەم هەست و

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٠٤-٢٠٦.

سۆزەدا زیادەڕەوی بکات، ئەوا هەرگیز بە شەفەقەت دانانرێت، بەڵکو نەخۆشی‌یەکە "گیان" و "دڵ" دووچاری دەبن و، سەری لە گومڕایی و ئیلحادەوە دەردەچێت!

بۆ نموونە:

تەئویل کردنی سزای کافر و مونافیقان لە دۆزەخدا و، ئەنجامەکانی جیهاد و، ڕووداوەکانی هاوچەشنیان، کە بەهۆی تەسکیی شەفەقەتی مرۆڤ و جێ نەبوونەوەی ئەم شتانە تیایدا، تەئویل دەکرێن.. لە ڕاستیدا ئینکاری کردن و بەدرۆخستنەوەیە بۆ بەشێکی زۆری دەقەکانی قورئانی پیرۆز و ئایینە ئاسمانی‌یەکان. هەروەك لە هەمان کاتدا ستەم و بێ سۆزی‌یەکی لەوپەڕی نارەواییدایە. چونکە پاراستن و بەزەیی هاتنەوە بەو ئاژەڵە دڕندانەی کە گیانەوەرە بەری و داماوەکان لەت و پەت دەکەن، ستەمێکی گەورەیە لە مافی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانانە، هەروەك خۆی لە خۆیدا کارێکی دڕندانەی ئەنجامی بێ ویژدانی‌یە.

کەواتە پشتگیری و بەزەیی هاتنەوە بەو ستەمکارانەی کە ژیانی هەتاهەتایی هەزاران موسڵمان لەناو دەدەن و، بە هاندانی خەڵکییش بۆ گوناه و تاوان، سەدان ئیماندار بەرەو بەدئەنجامی و عاقیبەت شەڕی دەبەن.. هەروەها دوعای سۆز و بەزەیی کردن بۆ ئەو کافر و مونافیقانە تاکو لە سزای سەخت ڕزگاریان ببێت.. بێ گومان ئەم ڕەفتارە، ستەمێکی گەورە و غەدرێکی نابەجێ‌یە بەرامبەر بەو ئیماندارە ستەم لێکراوانە!

"پەیامەکانی نوور" بە چەشنێکی بێ گومان چەسپاندوویانە کە:

"کوفر و گومڕایی" سووکایەتی کردنێکی گەورە و ستەمێکی لەڕادەبەدەرە لە بوونەوەران و، هۆکارێکە بۆ هەڵگرتنی میهرەبانی و دابارینی بەڵا و موسیبەتەکان. تەنانەت هەندێ ڕیوایەت هەن لەسەر ئەوەی کە ماسی‌یەکانی بنکی دەریاش لەتاو ستەمی خراپکاران کە حەوانەوەیان لێ زڕاندوون، سکاڵا بۆ لای خوا دەبەن!

لەبەر ئەوە، سۆز و بەزەیی نواندن بۆ "کافر" کە لە دۆزەخدا چەندین جۆر ئازار و ئەشکەنجە دەدرێت، بەزەیی نەهاتنەوە دەگەیەنێت بەو بێ تاوانە لەژمارەبەدەرانەی کە شایانتری میهر و سۆز و بەزەیین! تەنانەت ئەو کەسەی کە بەزەیی بە کافرەکەدا دێتەوە، بەزەیی بەواندا نایەتەوە و ستەمێکی ئاشکرایان لێ دەکات!

جگە لەمە، شتێکی تریش هەیە.. کە بریتی‌یە لەوەی:

گاتێ بەلاّدێت بۆ کەسانی شایان، بەری و بێ تاوانە کانیشی پێوە گیرۆدە دەبن. لەو کاتانەشدا ناگونجێ جیا بکرێنەوە و بێ سۆزی لەگەڵ ئەواندا نەکرێت. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا میهرەبانی‌یەکی پەنهان بە تایبەت بۆ ئەو بێ تاوانە ستەم لێکراوانە هەیە کە لە ئەنجامی ئەو بەلاّیەی بۆ تاوانکاران نازڵ بووە ئەوانیش زیانیان لێ کەوتووە.

لە یەکەم جەنگی جیهانیدا ماوەیەك خەم و ئازاری زۆرم بۆ ئەو ستەم و کوشتارانە دەخوارد کە دوژمنان دەیانهێنا بەسەر موسڵمانانەدا، بە تایبەت مناڵ و خێزانەکانیاندا و، لەبەر ئەو سۆز و شەفەقەتە لەڕادەبەدەر و بەزەییە زیادەش کە لە سروشتی مندا هەیە گەلێ زیاتر لە توانای خۆم ئازارم دەچەشت و خەمم بۆ دەخواردن.

هەر ئەو کاتە ئەم واتایەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

ئەو کوژراوە بەری و بێ تاوانانە "شەهید"ن و، دەچنە پلەی ئەولیا و پیاوچاکانەوە. هەروەك ژیانە فانی‌یەکەیان بۆ دەگۆڕرێت بە ژیانێکی باقی و، ماڵ و سامانە تیاچووەکانیشیان حوکمی "صەدەقە"یان دەبێت و، دەبن بە چەند ماڵ و سامانێکی نەبڕاوە و هەمیشەیی. تەنانەت گەر ئەو ستەم لێکراوانە کافریش بن، ئەوا لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە سەبارەت بەوان و لە بەرامبەر ئەو گیروگرفتانەی کە لە دنیادا دووچاری بوون، گەلێ پاداشت دەدرێنەوە، بە ڕادەیەك کە ئەگەر پەردەی غەیب لا بدرێت، ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو "میهرەبانی"یەی دەستیان دەکەوێت لە ڕادەیەکدایە کە شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە دەربڕن.

ئیتر کە ئەمەم زانی، قەناعەتێکی تەواوم پێ کرد و، بە فەزڵی خوا لەو ئازارە توندوتیژە دەرباز بووم کە ئەنجامی شەفەقەتی لە ڕادەبەدەرم بوو)[1].

☐ چارەنووسی کافرانی بێ تاوان لە بەلاّ و کارەساتەکاندا

(ئەو کارەسات و برسێتی و قات و قڕی‌یەی کە لەم زستانە سەختەدا و لە ئەنجامی ئەم بەلاّ بەشەری‌یەوە "جەنگی دووهەمی جیهانی" کەنەفتان و هەژارانی بێ نەوای پێوە گیرۆدە بوون، کاریگەری‌یەکی توندوتیژی لە هەست و نەستەکانمدا بەجێ هێشت کە

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ١٦٦-١٦٨.

زیاد لە پێویست پەرۆشی و سۆز و بەزەییان لەخۆ گرتووە. بەڵام کتوپڕ بۆ ئەمەی خوارەوە بێدار کرامەوە:

ئەم گیرو گرفتانە و کارەساتەکانی هاوچەشنیان، جۆرە بەزەیی و پاداشتێکیان تەنانەت بۆ کافرانیش تێدایە، بە ڕادەیەك کە ئەو موسیبەتە لەسەر شانیان سووك دەکات و، سەبارەت بەوان ئاسان دەبێت.

ئەم بێدارکردنەوەیە بوو بە مەڵهەمێکی شیفابەخش بۆ ئازاری بەزەییەکانم سەبارەت بە منداڵان و خێزانەکانی ئەوروپا و ڕووسیا، هەرچەندەش چەند مانگێکە هیچ شتێکم سەبارەت بە دنیا و هەواڵی جەنگ لە کەس وەرنەگرتووە.

بەڵێ، ئەوانەی کارەساتی مەزنی ئەم تاوانەی ستەمکارانیان بەسەردا شکایەوە، گەر منداڵ بن هەتا تەمەنی پازدەساڵی، ئەوا لە حوکمی "شەهید"دان، سەر بە هەر ئایینێك بن. دیارە ئەو پاداشتە مەزنەی کە چاوەڕێیانە و بۆیان دانراوە، سەختیی موسیبەتەکەیان لە سەرشان سووك دەکات.

سەبارەت بەوانەش کە لە تەمەنی پازدە ساڵی بەرەو ژوورن، گەر بێ تاوان و بەری و ستەم لێکراو بن، پاداشتێکی هێندە گەورەیان هەیە کە لەوانەیە لە دۆزەخ ڕزگاریان بکات. چونکە ئایین – بە تایبەت ئیسلام – لە ئاخر زەماندا بە پەردەی گوێ پێ نەدان دادەپۆشرێت و، ئایینی ڕاستەقینەی حەزرەتی عیساش – دروودی خوای لەسەر بێت – لە ئاخر زەماندا شان بە شانی ئیسلام فەرمانڕەوا دەبێت.

کەوا تە دەتوانرێت بە بێ هیچ گومانێك بوترێت: ئەو نەصرانییە ستەم لێکراوانەی کە بۆ لای حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – نیسبەت دەدرێن و لە تاریکستانێکی وەك هی تاریکیی قۆناغی "فەترەت"دا دەژین، هەرچی کارەسات و تیاچوونێکی ئاوایان تووش دەبێت – سەبارەت بەوان – وەك جۆرە شەهیدییەك دەبێت. بە تایبەت کەسانی پیر و گرفتار و هەژار و کەنەفتانی بێچارە و داماو، کە لە ژێر زوڵم و زۆری ستەمکارە خۆسەپێنەکاندا گیرۆدەی کارەساتەکان دەبن.

لە لایەن حەقیقەتەوە پێم ڕاگەیەنرا کە:

ئەو کارەساتانە سەبارەت بەوان دەبێت بەهۆی سڕینەوەی ئەو گوناهانەی کە لە ئەنجامی هەرزەیی مەدەنییەت و پێنەزانی و ناشکوریی نیعمەتەکان و گومڕایی و

كافربوونی فەلسەفەوە دووچاری بوون. كەواتە ئەو كارەساتانە سەد ئەوەندەی ژيان بۆ ئەوان قازانجترە.

لەمەشەوە دڵدانەوەم لە بەرامبەر ئەو ئازارە سەختەوە دەست كەوت كە لە بەزەيی و سۆزی زياد لە پێويست و لەڕادە بەدەرمەوە سەرچاوەی گرتبوو. بۆيە شوكر و سوپاسی نەبڕاوەم پێشكەشی خوای گەورە كرد.

خۆ ئەو ستەمكارە نزم و بێ نرخانەی شەيتانەكانی "جيننی" و "ئينس"يش كە بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی سوودە كەسی‌يەكانی خۆيان ئاگری ئەو ئاشووب و كارەساتانە دادەگيرسێنن، ئەوانە بە تەواوی شايانی ئەو ئازارە ئابڕووبەرەن. كەواتە كارەساتەكان سەبارەت بەوان دادگەری‌يەكی ڕوون و بێ گومانی پەروەردگارە.

بەڵام ئەگەر گيرۆدەبووان بەو كارەساتانە لەو جۆرە كەسانە بن كە بە خێرايی بۆ فرياگوزاريی ستەم لێكراوان ڕادەپەڕن و لە پێناوی هێنانەديی حەوانەوەی گرۆی مرۆڤ و پاراستنی بناغەكانی ئايين و موقەددەساتی ئاسمانی و مافەكانی مرۆڤايەتيدا تێدەكۆشن، ئەوا ئەنجامی مەعنەوی و قيامەتيی ئەو خۆبەخت كردنەيان هێندە گەورەيە كە ئەو كارەساتانە سەبارەت بەوان مايەی شەرەف و شانازی دەبێت، تەنانەت لە بەرچاوياندا خۆشەويستی دەكات)[1].

☐ خزمەتەكەمان بۆ ڕزگاركردنی ڕێسا و ئاسايش تێدەكۆشێت

(كارمەندێكی بەرپرس كە پەيوەنديی بە ئێمە و بە سياسەتەوە هەيە و، گەڵێ سەرقاڵی چاودێری كردنی ئێمەيە، هات بۆ لام و منيش پێم وت:

ماوەی هەژدە ساڵە سەردانی ئێوەم نەكردووە و تەنانەت يەك دانە ڕۆژنامەشم نەخوێندووەتەوە. ئنجا وا هەشت مانگە تەنها بۆ يەك جاريش لە بارەی ڕووداوەكانی جيهانەوە هيچ شتێكم لە كەس نەپرسيوە و، گوێم لە ڕاديۆش نەگرتووە كە سێ ساڵە لێرەوە دەبيسترێت و بەرگوێ دەكەوێت. هەموو ئەمانەش، لەبەر ئەوەيە كە هيچ زيانێكی مەعنەوی لە خزمەتە بەرزەكەمان نەكەوێت.

هۆكاری ئەمەش بريتی‌يە لەوەی كە:

---

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٠١-٢٠٣.

خزمەتی ئیمان و حەقیقەتەکانی لە هەموو شتێکی ناو گەردوون گەورەترن و، نابن بە ئامراز بۆ هیچ شتێك..

لەبەر ئەوە، خزمەتی قورئانی پیرۆز بە هیچ جۆرێك ڕێمان پێ نادات خۆمان لە قەرەی سیاسەت بدەین. چونکە:

بێ ئاگایان و گومڕایانی ئەم ڕۆژگارە، کە لە پێناوی بەدەستهێنانی شمەکی قەڵبی دنیادا ئایینەکەیان دەفرۆشن و، ئەڵماسی بەنرخ و بەهادار بە پارچە شووشەی شکاو دەگۆڕنەوە، هەوڵ دەدەن ئەو خزمەتە ئیمانی‌یە بەوە تۆمەتبار بکەن کە ئامرازێکە بە دەست چەند تەوژمێکی بەهێزی دەرەوەی وڵاتەوە. تاکو لە شان و شکۆی بەرزی ئەو خزمەتە دابگرن.

جا ئێوەی ئەهلی سیاسەت و حکوومەت هەرگیز لەسەر بناغەی دوودڵی و گومان خۆتان بە ئێمەوە سەرقاڵ مەکەن، بەڵکو دەبێ کۆسپەکانمان لە ڕێدا نەهێڵن و ڕێگامان لە بەردەمدا بۆ ئاسان بکەن. چونکە خزمەتگوزاری‌یەکەی ئێمە ئاسایش و ڕێز و میهرەبانی دادەمەزرێنێت و، بۆ ڕزگاری و پشتگیریی ڕێسا و ئاسایش و دەرباز کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بەربادی و تۆقاندن و تیرۆر، تێدەکۆشێت. کەواتە ئەم خزمەتەی ئێمە پایەکانی کارمەندی‌یە ڕاستەقینەکەی ئێوە جێگیر و بەهێز دەکات و پشتی دەگرێت)[1].

❐ سەردەمی کەسی مەعنەوی

(ئەم سەردەمە سەبارەت بە شوێنکەوتووانی ڕێگای ڕاستی، سەردەمی کۆمەڵە و، هەرگیز هی کەسێتیی تاك و دەرخستنی خۆویستی و لەخۆبایی‌بوون نی‌یە. چونکە تەنها ئەو کەسێتی‌یە مەعنەوی‌یەی کۆمەڵە کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێت و، بەرامبەر گەردەلوول و زریانەکان ڕادەوەستێت.

کەواتە بۆ ئەوەی حەوزێکی مەزن دروست بکرێت، دەبێت "تاك" کەسێتی و خۆویستی و لەخۆبایی‌بوونی خۆی، کە وەك شەختە سەهۆڵێکی ڕەق و تەق وایە، بهاوێتە ناو ئەو حەوزەوە و لەوێدا بیتوێنێتەوە. دەنا بە دڵنیایی ئەو شەختە سەهۆڵە

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٢٠-٢٢١.

دەتوێتەوە و بەفیڕۆ دەڕوات و، لـە هـەمان کاتیشـدا دەرفـەت و سـوود وەرگرتنیشـی لـەو حەوزە لەکیس دەچێت!

گەلێ جێی سەرسووڕمان و مایـەی خەفەتـە کـە شـوێنکەوتووانی حـەق و ڕاستی بـە هـۆی جیـاوازیی نێوانیـان ئـەو هـێزە هـەرە مەزنـە لـە کیسـی خۆیـان دەدەن کـە لـە یەکگرتندایە. کەچی گومڕایان و دووڕووان لە نێوان خۆیـاندا لەسەر ئـەو هێزە گرنگە یەکدەگرن، هەرچەندەش ئەم کارە پێچەوانەی مەشرەبی ئەوانە. ئیتر لەم ڕێیـەوە بەسـەر ڕێژەی لە سەدا نەوەدی ئەهلی حەقیقەتدا سەردەکەون. لە کاتێکدا کە خۆیـان لـە سـەدا دە زیاتر نابن)[1]!

❑ تەقوا و کردەوەی چاك

(لـەم ڕۆژانـەدا بیرم لـە بناغـەکانی "تـەقوا" و "کـردەوەی چـاك" کـردەوە، کـە لـە ڕوانگەی قورئانەوە دوای "ئیمان" بە دوو بناغەی یەکجار مەزن دادەنرێن.

"تەقوا" بریتی‌یە لە وازهێنان لە حەرام و دوورەپەرێزی لە گوناهـ و تاوان.

"کـردەوەی چـاك"یش بریتی‌یـە لـە جێبەجێ کردنی ئـەو شتانەی لـە لایـەنی خـوای گەورەوە فەرمان دراوە بەجێ بهێنرێن، بە مەبەستی دەستکەوتنی خێر و پاداشتی باش.

جـا لـەم سـەردەمەدا کـە بـە بۆنـەی وروژاندنـی حـەز و خواسـتەکانی دەروونـی بەدخواز و پـەت پچڕاندنـی ئارەزووەکانـەوە، کاولکـاریی "ڕەوشـتی و گیـانی" پـەرەیان سـەندووە، "تـەقوا" دەبێـت بـە بناغەیەکی گـەلـێ مـەزن، تەنانـەت بـە بـەردی هـەموو بناغەیەك و، لە هەموو شتێك باشتر و مـەزنتر دادەنرێت. چونکـە "تـەقوا" - لـە خۆیـدا - دوورخستنەوەی خراپکاری‌یە و وازهێنانـە لـە تاوانـە گـەورەکان. ئـەو دەستوورەش کـە دەڵێت: "دوور خسـتنەوەی خراپکـاری لـە نزیـك خسـتنەوەی شـتی سـوودمەند باشـترە" دەستوورێکە لە هەموو کاتێکدا ڕەفتاری پێ دەکرێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا ئەو تەوژمە وێرانکارانە لە پەرەسەندندان کـە "گیـان" و "ڕەوشتی مرۆڤ" تێکدەشکێنن، ئـەوا "تـەقوا" بـووە بـە بناغەیـەکی گەلـێ مـەزن و بەربەستێکی یەکجار گەورە بۆ بەرهەڵستی کردن لەم کاولکاری‌یە سامناکە.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٢٦-٢٢٧.

جا ئەو کەسەی کە فەرزەکانی بەجێ دەهێنێت و ناڕوات بە لای تاوانی گەورەدا، بە ئیزنی خوا، ڕزگاری دەبێت. چونکە بەجێهێنانی کردەوەیەکی خاوێن و بێگەرد، لە ناوەندی ئەم هەموو تاوانە گەورانەی دەوروبەردا، یەکجار دەگمەنە.

"کردەوەی چاك" با کەمیش بێت، لە نێوان ئەم مەرجە گران و بارودۆخە سەختەدا بە زۆر دادەنرێت.

ئنجا هەر لەناو "تەقوا"دا "کردەوەی چاك"یش هەیە! چونکە وازهێنان لە حەرام واجبە، پاداشتی بەجێهێنانی واجبیش گەلێ لە هی سوننەتەکان زیاترە.

جا دوورەپەرێزی لە تەنها یەك دانە گوناه، لەگەڵ بەجێهێنانی کردەوەیەکی کەم، ئا لەم چەشنە کاتانەدا کە تاوان و گوناهـ لە هەموو لایەکەوە هێرش بۆ مرۆڤ دەهێنن، وەك وازهێنان وایە لە سەدان گوناه (کە لەو تەنها گوناهەوە پەیدا دەبوون گەر بکرایە) و، وەك جێبەجێ کردنی سەدان واجب وایە.

ئەم خاڵە شایانی بایەخ پێدانە و بە "نییەتی خاوێن و، تەقوا و، مەبەستی هەڵهاتن لە گوناهباری" نەبێت، بەدەست نایەت..

مرۆڤ لەم ڕووەوە دەتوانێت پاداشتی چەندین کردەوەی چاکی دەست بکەوێت کە تیایاندا ماندوو نەبووە.

گرنگترین ئەرکێ لەم کاتەدا دەکەوێتە ئەستۆی قوتابیانی نوور و خزمەتگوزارانی قورئانەوە، ئەوەیە کە:

"تەقوا" بکەن بە بناغەی هەموو کردارەکانیان و، لە بەردەم تەوژم و لێشاوی کاولکاریی سامناك و هێرشبەر و، لە بەرامبەر ئەو گوناهـ و تاوانانەی ئابلوقەیان داون، بەپێی "تەقوا" هەنگاو بنێن، چونکە مرۆڤ لە هەموو خولەکێکی ئەم چەشنە ژیانە کۆمەڵایەتی‌یانەی ئێستادا ڕووبەڕووی سەدان گوناهـ دەبێتەوە.

خۆ بێ هیچ گومانێك تەنها تەقوایە لە ڕێی مرۆڤدا کە هێندە پاداشتی بۆ دەستەبەر بکات وەك ئەوەی سەدان کردەوەی چاکی بەجێ هێنابێت، چونکە بە بۆنەی "تەقوا"وە لەو سەدان حەرام و گوناهانە دوورەپەرێزی دەکات.

شتێکی ئاشکرایە کە بیست کەس ناتوانن لە بیست ڕۆژدا کۆشکێك بنیات بنێن، کەچی یەك کەس دەتوانێت لە یەك ڕۆژدا بیڕووخێنێت!

لەبەر ئەوە، دەبێت لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە سەرگەرمی کاولکاری‌یە "ڕەوشتی و گیانی"یەکانە، بیست کەس هەبن ئەو لایەنانە بنیات بنێن و ئاوەدانیان بکەنەوە.. کەچی ئێمە پێچەوانەی ئەمە دەبینین؛ ئەوەتا هەزاران کاولکار تەنها یەك بنیاتنەر و ئاوەدانکەریان لە بەرامبەرەوەیە، ئەویش "پەیامەکانی نوور"ە.

کەواتە بەرگری کردنی خزمەتگوزارانی قورئان، بە تەنها خۆیان، لە بەرامبەر ئەو کاولکاری‌یە سامناکانەوە، لە ڕاستیدا، کارێکی نائاساییە.

خۆ ئەگەر ئەو دوو هێزە بەرامبەرە لە یەك ئاستدا بوونایە، ئەوا شتی لەعادەت بەدەری زیاتر و فتووحاتی گەلێ مەزنتر لە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی "گیانی و ڕەوشتی"دا دەبینی.

با تەنها یەك نموونە لەسەر ئەمە بهێنینەوە:

گەورەترین بەردی بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە "بچووك ڕێزی گەورە بگرێت و، گەورەش بەزەیی بە بچووکدا بێتەوە". کەچی دەبینین ئەم بناغەیە لە زۆر لاوە درز و کەلێنی تێ کەوتووە.

تەنانەت ئێستا لە ئەنجامی تێکچوونی ئەم بناغەیە، چەندەها هەواڵی یەکجار دڵتەزێن و ڕووداوی تەواو ناهەموار بەرامبەر باوکان و دایکان، دەبیستین!

بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە، پەیامە قورئانی‌یەکان بڕۆنە هەر جێگایەك، بەرەنگاری کاولکاری دەبنەوە و نایەڵن ئەم بناغە کۆمەڵایەتی‌یە بڕووخێت، بەڵکو هەوڵی چاككردنەوەشی دەدەن.

هەروەك بە ڕووخانی بەربەستەکەی "زولقەرنەین" یەئجووج و مەئجووج دەست دەدەنە خراپکاری لە ڕووی زەویدا، بە هەمان جۆر لە ئەنجامی جێ لەق بوونی بەربەستی مەزنی قورئانیشدا کە شەریعەتی خاوێن و بێگەردی حەزرەتی محەممەدە ﷺ خراپکاریی گەلێ زیاتر لەوەی یەئجووج و مەئجووج لە وشکایی و دەریاکانی سەر ڕووی زەویدا بڵاو بووەتەوە، کە بە تاریکایی تۆقاندن و ئاژاوە چواردەوری جیهانی داگرتووە و،

چەندەها ستەم و ئیلحادی لەرادەبەدەریش سەرانسەری ژیان و رەوشتی مرۆڤیان داپۆشیوە.

کەواتە جیهادی مەعنەویی قوتابیانی نوور کە بەرەنگاریی لافاوی ئەم تەوژمە رامالەر و سەختەی پێ دەکەن، بە ئیزنی خوا، بە جیهادێکی ئەوتۆ بۆیان دەنووسرێت کە پاداشتی گەورە و زۆریان دەست بخات، چونکە تروسکاییەك لە جیهادی هاوەڵە بەرێزەکان، کە لەسەر کردەوەی کەم پاداشتی زۆریان دەدرێتەوە، تێکەڵی جیهادی ئەمان بووە.

دەسا برا ئازیزەکانم!

گەورەترین هێزی ئێمە، لەم کاتە پڕ لە تەنگانە و لە بەردەم ئەم رووداوە مەزنانەدا، دوای هێزی "ئیخلاس"، بریتییە لە هێزی "بەشداری کردن لەو کردارانەدا کە بە نیازی پاداشتی دوارۆژ ئەنجام دەدرێن"!

چونکە بەم بەشدارییە هەموو یەکێکی ئێوە چەندین کردەوەی چاك لە دەفتەری چاکەکارییەکانی برایانیدا دەنووسێت، هەروەك بە زمانیشی هێز و یارمەتی و پشتگیری بۆ قەڵا و سەنگەر و سپێرەکانی "تەقوا" دەنێرێت، بە تایبەت ئەم برا هەژارەی خۆتان کە لە هەموو لایەکەوە هێرشی سەخت و نائامانی لەسەرە، چونکە لەم سێ مانگە پیرۆز و رۆژە بەبەرەکەتانەدا زۆر پێویستی بە یارمەتیی ئێوەیە.

ئەمەش لە ئێوە بە دوور نازانم. چونکە شایانی ئەم هەوڵەن و، پاڵەوانی وەفادارن و، بەزەییتان بە حاڵی ئەم برایەتاندا دێتەوە.

وا من بە هەموو جەستە و زمانم و لە قووڵایی و ناخی دڵمەوە داوای ئەم یارمەتیدانە مەعنەوییەتان لێ دەکەم و، لە لایەنی خۆیشمەوە لە دوعا و چاکەکارییە مەعنەوییەکانمدا قوتابیان هاوبەش دەکەم، تەنانەت هەندێ جار لە ماوەی یەك رۆژدا سەد جار زیاتر بە ناوی "قوتابیانی نوور" ناوتان دەهێنم و دوعاتان بۆ دەکەم، بە مەرجی دەستبەردار نەبوون لە "ئیمان" و "وەفا" کە دەستووری بەشدارییە لە کردەوەکانی سەر بە دوارۆژدا)[1].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٣٤-٢٣٨.

❑ بۆچی تەنها بە پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵ دەبین؟

(دەڵێن: "سەعید" هیچ کتێبێکی تر لای خۆی گل ناداتەوە! واتە ئەو کتێبانەی بە دڵ نی‌یە و، تەنانەت حەزیش لە کتێبەکانی ئیمامی غەزالی[1] ناکات و کتێبەکانی ئەو لای خۆی دانانێت!

بەم قسە سەیر و سەرسوورهێنەر و نابەجێیانە، زەینی خەڵکی لێڵ دەکەن. دەبێ بیشزانین کە هەر تەنها زەندیق و مولحیدەکانن بەرەو بەم چەشنە پڕوپاگەندانە دەدەن، بەڵام هەندێ زانای ساویلکە و ئەهلی تەسەووف دەکەن بە داردەست و هۆی بڵاوکردنەوەیان.

ئێمەش لە بەرامبەر ئەمەوە دەڵێین:

حاشا.. سەد جار حاشا.. ئەرکی سەرشانی پەیامەکانی نوور و قوتابیانی بریتی‌یە لە پارێزگاری کردنی ڕێبازی مامۆستاکەیان کە "حوجەتولئیسلام ئیمامی غەزالی"یە و، بەرگری لێکردن و دەرباز کردنیەتی لە هێرشی گومڕایان، تا ئەو ئەندازەیەی کە لە توانایاندایە. ئنجا ئیمامی غەزالی تاقانە مامۆستامە کە بە ئیمامی عەلی‌یەوە - خوا لێی ڕازی بێت - پەیوەستم دەکات.

ئەوەندە هەیە کە هێرشی زەندیقەکانی سەردەمی ئەوان هێندە سامناك نەبوو کە لەرزە بە پایەکانی ئیسلام بخات، بۆیە ئەو چەکانەی کە زانا لێکۆڵەرە مەزنەکان و موجتەهیدە گەورەکان بەپێی چەرخەکانیان لە مونازەرە و توێژە زانستی و ئایینی‌یەکانیاندا بەکاریان دەهێنا، هەروەك بە خێرایی لەم سەردەمەدا بەدەست ناهێنرێن، لە هەمان کاتیشدا دوژمنانی سەرسەختی ئەم ڕۆژگارە بە تەواوی سەرکوت ناکەن..

---

(١) ناوی ئەبوو حامید محەممەدی کوڕی محەممەدی غەزالی‌یە (٤٥٠ - ٥٠٥ك). یەکێکە لە مەردانی بەناوبانگی ئیسلام و گەورە زانایانی فیقهی شافیعی و زانستی کەلام. بە فەیلەسووف و زاهید و چاکسازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و خاوەن پەیامێکی ڕۆحی دادەنرێت کە جێدەستی لە ژیانی ئیسلامیدا هەر لە سەردەمەکەی خۆیەوە هەتا ئێستا نمایانە. لە شاری "تووس"ی سەر بە خۆراسان لە دایك بووە. پاش تەواو کردنی خوێندن لە قوتابخانەی نیزامی‌یەی بەغدا (کە گەورەترین زانکۆی ئەو سەردەمە بووە) وانەی وتووەتەوە. لە کتێبی (المنقذ من الضلال)دا گەشتی فیکری و ڕۆحیی خۆی تۆمار کردووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وەك: "إحياء علوم الدين"، "تهافت الفلاسفة"، "معيار العلم"، "الأربعين في أصول الدين". بۆ زیادە شارەزابوون لە ژیان و ڕۆڵی گرنگی ئەم کەسایەتی‌یە ناوازەیە، بەرگی یەکەمی کتێبی (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)ی خوالێخۆشبوو (سەیید ئەبولحەسەنی نەدەوی) و، (هكذا ظهر جيل صلاح الدين)ی (د. ماجد الگيلاني) (بە تایبەتی: الفصل العاشر) بخوێنەرەوە. (وەرگێڕ)

بەڵام پەیامەکانی نوور، بە ئیلهام وەرگرتنیان لە "قورئانی پیرۆز"ەوە، چەند چەکێکی نوێیان دۆزیوەتەوە کە دەتوانرێت بە خێرایی بەدەست بهێنرێن و، لە هەمان کاتیشدا هێندە بەهێز و کاریگەرن کە دوژمن تەفروتوونا دەکەن. بۆیە سەر لە کارگەی چەکەکانی ئەو مەردە هەڵکەوتووە بەرز و پیرۆزانە نادرێت. چونکە قورئانی پیرۆز کە سەرچاوە و کانی و مەرجەع و مامۆستای ئەو زانا بەرزانەیە، بووە بە مامۆستایەکی تەواوەتیش بۆ پەیامەکانی نوور.

جگە لەمانەش.. ئێمە هێندە کاتمان بە دەستەوە نییە و خۆیشمان لاوازین و، بواری ئەوەمان بۆ نارەخسێت کە سوود لەو بەرهەمە نوورانییانە وەربگرین. ئنجا سەدان هێندەی کەسانی وەك قوتابیانی پەیامەکانی نوور خەڵکانی تر هەن کە بەو کتێبانەوە سەرقاڵن و، ئێمە ئەو ئەرکەمان بۆ ئەوان بەجێ هێشتووە.

دەنا ئێمە هەرگیزاو هەرگیز بەو شێوازە ناڕوانینە ئەو کتێبانە. بەڵکو بە ئەندازەی خۆشویستنی گیانی خۆمان، بەرهەمە خاوێن و پیرۆزەکانی مامۆستا پایەدارەکانمان خۆش دەوێت.

بەڵام هەریەك لە ئێمە یەك مێشك و یەك دەست و یەك زمانمان هەیە و، هەزاران دەستدرێژی کەریشمان لە بەرامبەرەوەیە و، کاتێکی یەکجار کەم و تەسکیشمان لە بەردەستدایە. خۆ مادەم دواهەمین چەکی ئۆتۆماتیکیمان لە بەردەم خۆماندا دۆزیوەتەوە - کە بەڵگەکانی پەیامەکانی نوورە - ئەوا ناچار بووین کە ئەو چەکە سەروزیادمان بێت و دەستی لێ گیر بکەین)[1].

☐ بناغەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەخنەگراندا

(لەبەر ئەوەی ئەولیا پیاوچاکەکان ناتوانن ئاگاداری غەیب بن، گەر خوا بە ئیلهام ئاگاداریان نەکات، چونکە جگە لە خوای گەورە کەس ئاگادار و شارەزای غەیب نییە.. لەبەر ئەوە، مەزنترین وەلی و پیاوچاك ناتوانێت حەقیقەتی حاڵی وەلییەکی تر بزانێت، لەوانەشە لەبەر ئەم نەزانینەی دوژمنایەتیی بکات..

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٦٩-٢٧١.

ئەوەی لە نێوان هەندێ هاوەڵانی عەشەرەی موبەشەرەدا - خوايان لێ ڕازی بێت - ڕووی دا، ڕوونترين بەڵگەيە لەسەر ئەم دەرەنجامەی کە ئەگەر وەلی‌يەك ڕەخنەی لە وەلی‌يەکی تر گرت، ئەم کارە هيچيان لە پلەوپايەی ويلايەت داناگرێتە خوارەوە. مەگەر کارێك ڕووبدات بە تەواوی پێچەوانەی ڕواڵەتی شەرع بێت.

جا مادەم وايە، ئەوا:

١ - لەبەر ڕەفتار کردن بە ئايەتی پيرۆزی:

﴿والكاظمينَ الْغَيْظَ والعافينَ عنِ النّاس﴾ (آل عمران:١٣٤).

٢- بۆ مەبەستی پارێزگاری کردنی ئيمانی ئيمانداران نەبادا کەلێنی تێ بکەوێت، ئەمەش بەوەی کە ئەو گومانە باشەی بە شێخ و گەورەکانيان هەيانە، هەر بمێنێت.

٣- بەپێی ئەوەی کە پێويستە قوتابيانی بێگەرد و ئەرکانی نوور لە "توندوتيژيی زيانبەخشی تووڕەبوون" بپارێزرێن - با لەسەر حەقيش بن - بەرامبەر بەو ڕەخنە ناڕەوايانەی کە ئاراستەيان دەکرێن.

٤- بۆ مەبەستی دوورەپەرێزی لەوەی کە ئەهلی ئيلحاد لەوانەيە سوود و دەرفەت لە ناکۆکيی نێوان دوو دەستەی ئەهلی ئيمان وەربگرن، کە دەگونجێ هەر بە چەکی دەستی يەکێکيان ئەوی تر زامدار بکەن و ڕەخنە لە يەکتر بگرن و، هەرکەسەيان بە بەڵگەکانی خۆی بريقەی ئەوی تر بشارێتەوە و، ئەمەش ببێت بە مايەی تياچوونی هەردووکيان لە ئەنجامدا!

بەپێی ئەم بناغانەی پێشوو، دەبێت قوتابيانی نوور:

بە توندوتيژی ڕووبەڕووی ڕەخنەگران نەبنەوە و، ڕەفتاری "وەك يەك"يان لەگەڵدا نەنوێنن. بەڵکو دەبێت تەنها بەرگری لە خۆيان بکەن، لەگەڵ دەرخستنی گيانی ئاشتەوايی و وەڵامدانەوەی ئەو خاڵانەی کە مايەی ڕەخنە بوون.

چونکە لەم چەرخەی خۆماندا "خۆويستيی مرۆڤ" بە چەشنێك بەرجەستە بووە و ملی دەرکێشاوە کە هيچ مرۆڤێك ئامادە نی‌يە خۆويستيی خۆی - کە وەك شەختە سەهۆڵێك وايە و بە ئەندازەی خۆيەتی - بتوێنێتەوە و نايەوێت بيگۆڕێت، بەڵکو هەميشە بەهانە و پاساو بۆ خۆی دەهێنێتەوە. لەمەشەوە ناکۆکی لە نێواندا دروست دەبێت و،

ناحەقڕەوان و گومڕایانیش، لەسەر حسابی حەقڕەوان و ئیمانداران، بۆ خۆیان کەڵك و سوود وەردەگرن.

ڕووداوی ئیعتیرازەکەی ئەستەمبووڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:

هەندێ لەو زانایانەی لە مەشرەبەکانی خۆیان ڕازین و، خۆپەرستانی ناو سۆفییەکان و، هەندێ لە مورشیدان و ئەهلی حەق لەوانەی کە هێشتا نەفسی ئەممارەی خۆیان نەکوشتووە و، لە داوی حەز لە پلەوپایە ڕزگاریان نەبووە، بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن و برەودان بە مەشرەب و ڕێبازەکانیان و، بەدەستهێنانی ڕووتێکردنی شوێنکەوتووانیان، لەوانەیە ڕەخنە لە "پەیامەکانی نوور" بگرن، تەنانەت گرێمانێکی زۆر بەهێزیش هەیە کە بە توندی ڕووبەڕووی پەیامەکان ببنەوە.

جا لە کاتی ڕوودانی ئەم چەشنە گریمانانەدا، دەبێ زۆر لەسەرخۆ و ئارام و خۆڕاگر بن و، بەسەر دەروونتاندا زاڵ بن و، دان بە خۆتاندا بگرن و، خۆتان دووچاری دوژمنایەتی نەکەن و، لە شان و شکۆی سەرۆکەکانی دەستە و تاقمانی ڕەخنەگران نەشکێنن.

خۆ ئەگەر بە فەرزی مەحاڵ لە لایەن قوتبی ئەعزەم و لە مەککەی پیرۆزیشەوە ڕەخنەیەك لە پەیامەکانی نوور بگیرێت، ئەوا قوتابیانی پەیامەکانی نوور خۆیان ڕادەگرن و لەرزەیان پێ ناکەوێت. بەڵکو ڕەخنەکەی ئەو قوتبە ئەعزەمە وەك ئاوڕ لێدانەوەیەکی ڕێز و سڵاو لێکردن وەردەگرن و، هەوڵ دەدەن ڕووتێکردنی ئەو بەدەست بهێنن و، دەستەکانی ماچ بکەن و، مایەی ڕەخنەکەش بۆ ئەو مامۆستا مەزنەیان ڕوون بکەنەوە)[1].

❑ ڕۆزیی زانستخواز

(دوای نزیکەی هەزار تاقیکردنەوە قەناعەتی تەواوم بۆ دروست بوو کە:

هەر ڕۆژێك کار بۆ خزمەتی پەیامەکانی نوور ئەنجام بدەم، بە ئەندازەی پلەی ئەو خزمەتە، دڵ کراوەیی و خۆشحاڵی و پیت و بەرەکەت، لە دڵ و جەستە و مێشك و گوزەرانمدا، دەبینم.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٧٩-٢٨١.

تا ئێستا تێبینیی هەمان حاڵەتم لە برا زۆرەکانی ئێرە و ئەوێشدا کردووە و، زۆرێك لەوان دان بەمەدا دەنێن و دەڵێن:

"ئێمەش لە خۆماندا ئەم هەستە شك دەبەین".

تەنانەت من لەو باوەڕەدام کە - وەك ساڵی پار بۆم نووسین - نهێنی ژیانی کەفاف و مایەی بژێوم لەو بەرەکەتەوەیە.

ڕیوایەتێك لە ئیمامی شافیعی‌یەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: "من زامنی ڕۆزیی قوتابیی ڕاست و دڵسۆزی زانستم، چونکە فراوانی و پیت و بەرەکەت لە ڕۆزی‌یەکەیاندا هەیە".

مادەم ڕاستی ئەمەیە و، قوتابیانی پەیامەکانی نووریش لەم ڕۆژگارەدا شایستەیی تەواوەتی‌یان بۆ ناوی "قوتابیی زانست" پێوە دەرکەوتووە، ئەوا نابێت لە بەرامبەر ئەم قاتی و برسێتی‌یە بڵاوەدا واز لە خزمەتی پەیامەکانی نوور بهێنرێت)[1].

□ حیکمەتی خوێندنەوەی پەیامەکان

(دوو سێ ڕۆژ پێش ئێستا گوێم لە وتەی بیست و دووهەم گرت لە دەمی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیدا. بینیم کە زیکرێکی هەمەکی و، بیرێکی فراوان و، تەهلیلێکی زۆر و، وانەیەکی ئیمانیی بەهێز و، دڵ ئامادەییەکی بێ غەفڵەت و، دانستێکی بەرز و، پەرستشێکی فیکریی بڵند و، نوورەکانی هاوچەشنی ئەمانەی تێدایە. هەروەك لە حیکمەتی ئەوەش تێگەیشتم کە بۆچی بەشێکی قوتابیان بە نیازی پەرستش پەیامەکان دەنووسنەوە، یان دەیانخوێننەوە، یان گوێیان لێ ڕادەگرن.

ئیتر منیش پشتی ئەو کارەیانم گرت و، دوعای پیت و بەرەکەت و سەرکەوتنم لەو ئەرکەیاندا بۆ کردن)[2].

□ بوار بە ڕەخنە مەدەن

(برا ئازیز و بەوەفاکانم! وریا بن.. وریا بن! لە نێوان خۆتاندا بوار بە ڕەخنە مەدەن، تاگو گومڕایان جیاوازیی مەشرەب و دەماری لاواز و پێداویستی‌یەکانی ژیان و

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٨٣.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٣٠٨-٣٠٩.

گوزەرانتان نەقۆزنەوە. هەوڵ بدەن بە دامەزراندنی "شوورای شەرعی" لە نێوان خۆتاندا کارێك بکەن کە ڕا و بۆچوونەکانتان جیاواز نەبێت. هەمیشە دەستوورەکانی "پەیامی ئیخلاس" لە پێش چاوی خۆتان دابنێن. دەنا ئیختیلافێکی کەم لەم کاتەدا دەتوانێت زیانێکی زۆر بە پەیامەکانی نوور بگەیەنێت)[1].

## دانانی پەیامی "الآیة الکبری" (بینینەکانی گەشتیارێك)[2]

☐ نموونەیەك لەم پەیامە

(لە نێوان هەزاران نموونەی ئەو کارە پەروەردگارییانەدا، دەمانەوێت لێرەدا سێ نموونە بخەینە ڕوو[3]، لەوانەی کە سێ ئایەتی تەنیشتی یەکتری سوورەتی "النحل"

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٩٩.

(٢) کە تیشکی حەوتەمە. دانراوەکانی تری لە قەستەمۆنی، ئەمانەن:

١ - تیشکی سێهەم (پەیامی موناجات).

٢ - تیشکی چوارەم (پەیامی حەسبی).

٣ - تیشکی پێنجەم (پەیامی نیشانەکانی قیامەت و سیفەتەکانی دەجاڵ و سوفیانی "ڕێکخستنەوەی ئەم پەیامە"، چونکە پێشتر بناغەکانی دانرابوون).

٤ - تیشکی شەشەم (لەسەر واتاکانی تەحیات و سڵاوات).

٥ - تیشکی هەشتەم (کەرامەتی عەلەوی).

٦ - تیشکی نۆهەم (سەلماندنی حەشر).

٧، ٨، ٩ - پاکنووسکردنی تیشکی یەکەم و دووهەم، ڕێکخستنی پەیامی "الحزب الاکبر النوري". کە لە بریسکەی بیست و نۆهەمەوە وەرگیراوە.

(٣) لێرەدا ئەم چەند برگەیەی پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین عەبدولحەمید دەهێنین کە لە پێشەکیی ئەم پەیامەدا نوسیویە:

"نوورسی" بە هێمنی و ژیرانە دێتە پێش و، دەستی مرۆڤی عەودالی ڕاستی دەگرێت و، گەشتێکی گەردوونیی قەشەنگی فراوان و مەزنی لەگەڵ خۆیدا پێ دەکات، تاکو دەرگا داخراوەکانی "ژیری" و "دڵ"ی لەوی پێ بکاتەوە و، ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی "تابلۆی بوونەوەر" و جوانییە سەرنج ڕاکێش و دیمەنە ناوازەکانی رایبگرێت!

ئەم گەشتەی لە باسکردنی کارە سەرنج بزوێنەکانی ئاسۆ بەرزەکانەوە دەست پێدەکات و، بەردەوام دەبێت تا دەگاتە لایەنە سەرسووڕهێنەرەکانی بوونەوەرانی ناو جیهانە نزمەکان و، لە یەك بە یەکیاندا ڕۆدەچێت.

ئنجا لەبارەی هاوسەنگی و ڕێکی و تابلۆ هونەرییەکانی گەردوونەوە بە چەشنێك دەدوێت کە سەرنجی "ژیران" کەمەندکێش دەکات و، بە پەنجەی ناسك و نیان لە ژێی هەستیاری "دڵان" دەدات و، "بێ ئاگایان"

ئاماژەیان بۆ کردوون. جا هەرچەند هەموو یەکێك لەو کارانە چەندەها سەرنجی وردی لەژمارەبەدەریان تێدایە، بەڵام ئێمە تەنها سیانیان لێ باس دەکەین:

*ئایەتی یەکەم:*

﴿وأَوْحى رَبُّكَ إِلى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذي مِنَ الجِبالِ بيوتاً﴾ (النحل:٦٨).

بەڵێ، هەنگ، چ بە سروشت و چ بە کارەکانی، موعجیزەی توانستی پەروەردگارە. موعجیزەیەکی هێندە مەزنە کە سوورەتێکی گەورەی قورئانی پیرۆزی پێ ناونراوە..

چونکە تۆمارکردنی هەموو بەرنامەکانی ئەرکە گرنگەکەی سەرشانی لە "سەر"ێکی بچووکی مەکینەیەکی گچکەی بەرهەمهێنانی هەنگویندا.. پاشان دانان و کوڵاندنی خۆشترین و بەتامترین خواردەمەنی لەناو گەدە بچووکەکەیدا.. ئنجا هەڵبژاردنی جێی شیاو بۆ دانانی ژەهرێکی کوشندە و لەناوبەری ئەندامی "زیندوو" لە چزووەکەیدا، بێ ئەوەی هیچ کارێك بکاتە سەر ئەندامەکانی تری جەستەی ئەو هەنگە..

هەموو ئەمانە، گەر بەوپەڕی وردی و، زانایی و، دانایی و، ویست و، هاوسەنگی و، ڕێکوپێکی نەبێت، هەرگیز ناگونجێ ئەنجام بدرێن.

---

بەهۆش دەهێنێت و، بینایی دەروونیی "سەرسامان" ڕووناك دەکاتەوە و، دەستی "نەزانان"یش دەگرێت و تێکڕا بەرەو جیهانێکیان دەبات کە سەرتاپا "ڕاستیی زانستی"یە..

هەموو ئەمانەش لە ناوەندی هۆکارێتیی مەحکەم و، ئامانجداریی قووڵ و، لە چوارچێوەی نەخشەی گەردوونیی هەمەلایەنگردا کە بە تەواوی و گومانبڕی بوونی بەدیهێنەری مەزن دەچەسپێنێت.

ئەگەر دەپرسیت: هۆی سەرکەوتنی "نوورسی" چی بووە لە ژیاندنەوەی "ناوەرۆکەکانی ئیمان" لە دڵ و دەروونی سەدان هەزار کەسی تایبەتمەند و گشتیی نەوەکانی سەردەمی خۆی و نەوەکانی دوای خۆیدا؟

دەڵێین: نهێنیی ئەو سەرکەوتنەی، لە ئیمانە قووڵ و، سۆز و پەرۆشییە بێ وێنە و، شێوازە پەروەردگارییە قورئانییەکەیدایە، کە لە ڕێڕەوی کۆنی "زانستی کەلام" لایدا و ڕاستەوخۆ ڕووی گوفتاری ئاراستەی "ژیری" فیتری و "دڵ"ی ساغی پێکەوە هەڵشێلراوی ناو سروشتی مرۆڤ کرد و، دەستی لەو شێوازەی زانایانی پێشینی کەلام داشۆرد کە تەنها شایانی چەرخەکانی خۆیان بوون. واتە نوورسی "زانستی تەوحید"ی لە دۆخی "لەکارکەوتوویی ئەرکی سەرشانی" ڕزگار کرد و، گۆڕیی بە تەوژم و تەزوویەکی کۆمەڵایەتیی بەخوڕەم لە باوەڕ و ڕەفتاری ئیمانداراندا..

"نوورسی" تەمەنی خۆی لەوەدا بردەسەر کە دەیویست لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە مامۆستایەتیی "قورئانی پیرۆز" لەناو هەموو گەردووندا، بۆ خەڵکی بسەلمێنێت. بۆ ئەوەی مرۆڤی موسڵمان باوەڕ و متمانەی بە خۆی پەیدا بکاتەوە و، چیی تر لە خشتە نەبرێ. ئنجا ئەرك و ڕۆڵی شارستانێتیی خۆی لەم جیهانەدا بگرێتەوە ئەستۆ و، بە هێز و تینی بیروباوەڕە پەروەردگارییەکانی، سەرجەمی مرۆڤایەتی لە چنگی ئیلحاد و لێکهەڵوەشان و لەڕێ ترازان، ڕزگار بکات.

لەبەر ئەوە، شتانی بێ هەست و بێ ڕێسا و دوور لە وردەکاری و تەرازووی وەك "سروشت"ی کەڕوکاس و "ڕێکەوت"ی کتوکوێر، هەرگیزاو هەرگیز، ناتوانن خۆیان لەم چەشنە کارە ناوازانەدا هەڵبقورتێنن!

بەم جۆرە، لەم سنعەتە خواییەدا سێ موعجیزەمان بەرچاو دەکەوێت و، هەمان کاری "پەروەردگاری"ش لە گشت هەنگە لەژمارەبەدەرەکانی سەر ڕووی زەویدا بە چاوی خۆمان دەبینین.

جا دەرکەوتنی ئەم کارە پەروەردگارییەی گشت هەنگێکی سەر ڕووی زەوی، بە هەمان دانایی و وردی و تەرازووکاری و، لە هەمان کاتدا و، بە هەمان شێوە.. بەڵگەیەکی ڕوونە کە بە ئاشکرا "یەکتایی" خوای گەورە دەچەسپێنێت.

*ئایەتی دووهەم:*

﴿وإِنَّ لكُمْ في الأنعامِ لَعِبْرَةً نُسْقيكُمْ مِمّا في بطُونه مِنْ بيْنِ فَرْثٍ ودمٍ لبَناً خالِصاً سائغاً لِلشّارِبين﴾ (النحل:٦٦).

ئەم فەرمانە خواییە، سەرتاپا، دەرس و پەندی لێ دەچۆڕێت!

بەڵێ، ئەو شیرە سپی و بێگەرد و خاوێن و ساف و بژێو و بەلەزەتەی کە خوای گەورە دەرخواردی ئێمەی دەدات و، لە کارگەکانی شیرەوە[ گوانی دایکان ] بە تایبەت مانگا و حوشتر و بزن و مەڕدا، بە سەخاوەتمەندی، لە ناوەندی "سیخوڕ" و "خوێن"دا و، بێ تێکەڵی و لیڵ بوون، هەڵدەقوڵێت..

هەروەها ڕواندنی ئەو میهر و شەفەقەتەی کە لە شیر شیرینتر و بەتامتر و بەنرخترە، لە سنگی ئەو دایکانەدا، کە هەندێ جار دەیانگەیەنێتە ڕادەی خۆنەویستی و فیداکاری..

هەموو ئەمانە، بێ هیچ گومانێك، پێویستیان بە پلەیەکی ئەوتۆی میهرەبانی و، دانایی و، زانین و، توانست و، ئیختیار دەبێت کە هەرگیز بە "ڕێکەوت"ە هەڕەمەکی و "توخم"ە سەرگەردان و "هێز"ە کوێرەکان ناکرێت ئەنجام بدرێت!

لەبەر ئەوە، ئەم هەڵسوکەوتەی کە لەم سنعەتە پەروەردگارییەدایە و، هەمە لایەنگریی ئەم کارە خواییە و، دەرکەوتنی بە هەمان دانایی و وردەکاری و ئیعجاز و، بە یەك شێوە و لە یەك کاتدا، لە "دڵ" و "مەمك"ی هەزاران جۆری دایکانی سەر ڕووی

زەویدا.. بە ڕوونی "یەکبوون"ی خوای گەورە دەچەسپێنێت و بەڵگەیە لەسەر "یەکتایی" ئەو.

*ئایەتی سێهەم:*

﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ والأَعْنابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (النحل:٦٧).

ئەم ئایەتە پیرۆزە سەرنج و ڕوانینی مرۆڤ بۆ لای دارخورما و مێو ڕادەکێشێت و، بێداریان دەکاتەوە کە:

ئەم دوو "بەر"ە نیشانەیەکی مەزنیان تێدایە بۆ خاوەن ژیری و دڵان و بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر تەوحید.

بەڵێ، ئەم دوو بەرە هەروەك "خۆراك"ن، لە هەمان کاتیشدا "بەر" و "میوە" و سەرچاوەی گەلێ خواردەمەنیی بەتامولەزەتن، هەرچەندەش درەختی هەردووکیان لە گلێکی بێ گیان و زەویەکی وشکدا گەشە دەکەن..

کەواتە هەریەك لەم دوانە، موعجیزەیەکی توانستی خوایی و کارێکی دەراسای پەروەردگارین و، کارگەیەکی شەکر و شیرینی و، شەربەتی هەنگوین ئاسا و، چەند سنعەتێکن کە بە تەرازووی وردی سەرنەکەر و، ڕێکوپێکیی تەواوەتی و، کارامەیی دانایانە دروست کراون. بە ڕادەیەك کە هەرکەسێك خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك "ژیری" و "بینایی دەروون" بێت، بە پێویستی دەزانێت کە بڵێت:

"ئەو کەسەی ئەم شتانەی بەم شێوەیە دروست کردووە، هەر ئەویشە کە گشت بوونەوەرانی بەدیهێناوە"!

چونکە ئەوەتا – بۆ نموونە – بە چاوی خۆمان دەبینین نزیکەی بیست هێشووی ترێ لەو پەلە بچووکە لاوازەوە شۆڕبوونەتەوە.. هەریەك لەو هێشووانەش نزیکەی سەد دەنکە ترێی ناسکی شیرینی وەك هەنگوینیان گرتووە.. هەریەك لەو دەنکانەش بەرگێکی تەنك و ناسك و ڕەنگاوڕەنگ و جوانیان تێوە پێچراوە.. لە ناوەڕاستی هەریەکەشیاندا چەند تۆوێکی ڕەقوتەق هەن کە بەرنامە و مێژووی ژیانی ئەو درەختەیان تێدایە!

بەڵێ، بەدیهێنانی هەموو ئەمانە و غەیری ئەمانەش لەم ترێیە و هاووێنەی لە ژمارە بەدەری لەسەر ڕووی تێکڕای زەویدا، بە هەمان وردی و دانایی و، دروستکردنی ئەم سنعەتە موعجیزە و دەراسایە بەم ژمارە یەکجار زۆرە - لە یەك کاتدا و بە هەمان شێوە - بە ڕوونی ئەوە دەچەسپێنێت کە:

"جگە لە بەدیهێنەری مەزنی بوونەوەران، کەسی تر ناتوانێت ئەم کارە ڕاپەڕێنێت کە داخوازی توانست و دانستێکی ڕەها و نەبڕاوەیە".

بەڵێ، نە "هێز"ە کوێرەکان و نە "سروشت"ی کەڕولاڵ و نە "هۆکار"ە پەرتەوازە و سەرگەردانەکان، هیچیان - هەرگیزاو هەرگیز - ناتوانن دەست بۆ ئەم کارە درێژ بکەن و خۆیان لەو تەرازووە وردە سەرنەکەرەدا هەڵبقورتێنن کە بەوپەڕی کارامەیی و ڕێکی و دانایی لەو سنعەتەدا خراوەتەکار. نەخێر، بەڵکو هەموو ئەم چەشنە هۆکارانە بە فەرمانێکی "پەروەردگاری" لەو کارە پەروەردگارییانەدا ملکەچ دەکرێن و ژێربار دەخرێن.

کەواتە "هۆکارەکان" چەند شتێکی کارتێکراون و، تەنها لەم ڕووەوە بۆیان دەڕوانرێت و قبووڵ دەکرێن. دەنا جگە لە چەند "پەردە"یەکی کار پێ سپێرراوی بەردەستی خوای گەورە هیچی تر نین.

جا هەروەك ئەم سێ ئایەتە ئاماژە بۆ سێ ڕاستی دەکەن و، هەریەکەیان سێ سەرنجیان تێدایە کە بەڵگەن لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە.. چەندەها کاری تری لە سنووربەدەری پەروەردگاری و، چەندین درەوشانەوەی لەژمارەبەدەریش هەن کە هەر هەموویان پێکەوە بەڵگەن لەسەر خواوەندی "تاك" و "تەنیا" و، شایەتییەکی ڕاست و ڕوون لەسەر "زات"ی تاك و تەنیای بەخشندەی شکۆمەند دەدەن)[1].

□ بڕگەیەك لە پەیامی "موناجات"

(ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان!

ئەی خوای پێشینان و دواییینان!

(١) تیشکەکان، تیشکی حەوتەم، ل: ٢٦٥-٢٦٨.

ئەی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان!

من بەهۆی فێرکاریی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و لە ڕێی وانە و دەرسەکانی قورئانی حەکیمەوە، تێگەیشتم و ئیمانم هێنا بەوەی کە:

لە پێشەکیی هەموانەوە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کە پاڵی بە سەدان موعجیزاتی ڕوونی خۆیەوە داوە و، قورئانی پیرۆزیش کە ئایەتە ڕاستەوخۆ و گومان نەهێڵەکانی پشتی دەگرن و، سەرجەمی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - کە خاوەنی گیانی ڕووناکن و، گشت ئەولیاکان کە جەمسەری دڵە ڕۆشناکانن و، هەموو ئەصفیا و صیددیقانیش کە خاوەنی ژیریی‌یە ڕووناکەکانن..

هەر هەموویان، مژدەی بەختەوەریی هەمیشەیی بە گرۆی جینی و ئادەمیزاد دەدەن و، هەڕەشە و مەترسیی ئاگری دۆزەخیش پێش چاوی گومڕایان دەخەن.

بەڵێ، هەموو ئەوانە باوەڕیان بەم هەواڵە هەیە و شایەتیی لەسەر دەدەن و، لەمەشدا پشت بەو بەڵێن و هەڕەشانە دەبەستن کە چەندین جار لە کتێب و صوحوفە ئاسمانی‌یە خاوێنەکانتدا باست کردوون و، پاڵیان بە سیفات و کاروبارە قودسی‌یەکانیشتەوە داوە، وەك توانست و، میهرەبانی و، چاودێری و، دانست و، شکۆمەندی و، جوانی..

هەروەك لەم هەواڵەیاندا پشتیان بە عیززەتی شکۆمەندی و دەستەڵاتی پەروەردگاریتیی تۆ بەستووە و، لە ڕێی کەشف و بینینی خۆیان و ئەو عەقیدە دامەزراوەشیانەوە کە لە پلەی "علم الیقین"دایە، ئەم مژدەیە ڕادەگەیەنن.

دەسا ئەی خواوەندی بەتوانای دانا!

ئەی بەخشندەی میهرەبان!

ئەی خاوەن بەڵێنی ڕاست!

ئەی قەهھاری شکۆمەند!

ئەی خاوەن عیززەت و مەزنی و گەورەیی!

تۆ زۆر خاوێن و پاك و پیرۆزیت و گەلێ لەوە بەرزتریت کە ئەم ژمارە زۆرەی دۆستە ڕاستگۆکانت و گشت بەڵێنە زۆر و زەبەندەکانت و سەرجەم سیفەتە مەزن و کاروبارە خاوێن و پیرۆزەکانی خۆت بە درۆ بخەیتەوە و، پەردە بەسەر خواستی دەستەڵاتداریی پەروەردگاریتی‌یەکەتدا بگێڕیت و، دوعا و نزا بێ سنوورەکانی بەندە

باش و وەرگیراوەکانی خۆت گیرا نەکەیت کە خۆشت دەوێن و، ئەوانیش لە ڕێی ئیمان و تەسدیق و گوێڕایەڵی‌یەوە خۆیان لە لا خۆشەویست کردوویت..

تۆ ئەی پەروەردگارم!

خاوێن و پیرۆزیت و بە جۆرێکی ڕەها بەرزیت لەوەی کە کافر و گومڕایان لە ئینکاری کردنی حەشردا تەسدیق بکەیت، لە کاتێکدا کە ئەوان دەستدرێژی بۆ سەر مەزنیی تۆ دەکەن و، بەهۆی کافری و سەرپێچی و بەدرۆخستنەوەی تۆوە لە بەڵێنەکەتدا سنووری عیززەتی شکۆمەندی و، مەزنیی سام و شکۆی خوایەتی و، میهرەبانیی پەروەردگارێتی‌یەکەت، دەشکێنن.

من تەقدیسی بێ سنوور و نەبڕاوەی "دادگەری" و "جوانی" و "میهرەبانی"یەکەت لەم ستەم و ناشیرینی‌یە نەبڕاوەیە ڕادەگەیەنم و، بە ئەندازەی گەردیلەکانی وجوودم ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە کە دەفەرموێ:

﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيراً﴾ (الإسراء:٤٣).

تەنانەت پێغەمبەرە ڕاستگۆکانت - درووودیان لەسەر بێت - کە بانگەوازکاری ڕاستەقینەی پەروەردگارێتی‌یەکەتن، بە "حق الیقین" و "عین الیقین" و "علم الیقین" گەنجینەکانی بەخشش و میهرەبانی‌یەکانت لە دوارۆژی هەمیشەییدا و.. دەرکەوتنی تەواوەتی و دەراسای درەوشانەوەی ناوە جوانەکانت لە خانەی بەختەوەریدا، دەبینن و ئاماژەی بۆ دەکەن و بە مژدەش بە ئێمەی ڕادەگەیەنن. هەروەك بەندە ئیماندارەکانیشت ڕێنمایی دەکەن بۆ ئەوەی کە مەزنترین تیشکی ناوی جوانی "الحق" - کە سەرچاوە و خۆر و پارێزەری هەموو حەقیقەتەکانە - بریتی‌یە لە "حەقیقەتی حەشر"ی مەزن!)[1].

## بردنی مامۆستا نوورسی بۆ "ئیسپارتە" پاشان بۆ "دەنیزلی"

(هەندێ لە پەیامە تایبەتی‌یەکان و کۆمەڵە گرنگەکانیم، بە تایبەت ئەو پەیامەی کە لە بارەی دەجاڵی موسڵمانان"سوفیانی"ەوە دەدوێن، لەگەڵ هەندێ لەو پەیامانەی کە

(١) تیشکەکان، تیشکی سێهەم، ل: ٨٣-٨٨.

کەرامەتەکانی "پەیامەکانی نوور" باس دەکەن، لە ژێر لیژنەیەك دار و خەڵووزدا شاردبوووەوە، بەو ئومێدەی کە پاش مردنم یاخود پاش ئەوەی سەرۆکەکان گوێ بۆ دەنگی ڕاستی ڕادەگرن و هۆش و مێشکیان لە "ڕاستی" تێدەگات، بڵاو بکرێنەوە. لەم کارەی خۆشم بێ خەم و دڵنیا بووم.

بەڵام هەر کە فەرمانبەرانی پشکنین و یاریدەدەری "داواکاری گشتی" بۆ دۆزینەوەی پەیامەکانی نوور خۆیان کرد بەناو ماڵدا و ئەو پەیامە شارراوانەیان لە ژێر دار و خەڵووزەکاندا دەرهێنا، بەرەو بەندیخانەی "ئیسپارتە"یان بردم، هەرچەندەش بەدەست تێکچوونی باری تەندروستیمەوە دەتلامەوە[1].

لەم کاتەدا کە من لەڕادەبەدەر خەفەت و ئازارم دەچەشت و، بیرم لەو زیانانە دەکردەوە کە هاتوونەتە ڕێی "پەیامەکانی نوور"، ئا لەم کاتەدا چاودێریی پەروەردگار - جارێکی تر - هاتەوە بە هانامانەوە. چونکە ئەو بەرپرسانەی کە لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بەو پەیامە شارراوە بەنرخانە بوو، بە گرنگییەکی زۆرەوە دەستیان بە خوێندنەوە و توێژینەوەی ئەو پەیامانە کرد و، بەمەش ئەو دام و دەزگا ڕەسمییانە وەك قوتابخانەکانی نووریان لێ هات و، ڕوانینی ڕەخنە و توانجی جارانیان لە پەیامەکانی نوور گۆڕا و، لە بریی ئەوە بە چاوی ڕێز و سەرسووڕمانەوە بۆیان دەڕوانی!

تەنانەت بێ ئەوەی بە خۆشمان بزانین زۆربەی کاربەدەستانی "دەنیزلی" و کەسانی تریش پەیامی "الآیة الکبری"یان خوێندبووەوە کە زۆر بە نهێنی چاپ کرابوو!

بە خوێندنەوەی ئەو پەیامەش ئیمانیان پەرەی سەند و، ئێمەش بەم دەرەنجامە گەشاینەوە و ئەشکەنجە و ئازارەکانمان لە بیر چووەوە)[2].

---

(١) سێ جار پۆلیس داویانە بەسەر ماڵەکەی مامۆستا نوورسیدا لە قەستەمۆنی. یەکەمیان لە: ١٩٤٣/٨/٣١ز لەو کاتەدا کە لەبەر ئازاری ئەو ژەهرەی دەرخواردی درا دووچاری "تا"یەکی سەخت بووبوو! دووهەمیان لە ٩/١٨/ هەمان ساڵدا، بەڵام بە هەمان جۆر شتێکی ئەوتۆیان نەدۆزییەوە، چەند پەیامێك نەبێت کە لە بارەی ئیمان و ڕەوشت و قیامەتەوە دەدوان. سێ‌هەمیان دوو ڕۆژ دوای ئەوەی پێشوو بوو. لەم جارەیاندا مامۆستا و سەد و بیست و شەش قوتابیی نوور، کە لە شوێنە جیاجیاکانی وڵات کۆکرابوونەوە، لە ژێر چاودێریی پۆلیسدا بران بۆ "ئەنقەرە" بە بیانووی دۆزینەوەی "تیشکی پێنجەم" کە لە بارەی دەجاڵ و سوفیانی دەدوێت.

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٤-٥٢٥.

"تیشکی پێنجەم" بووە هۆی دادگایی کردن

(دۆزینەوەی پەیامێك لە شوێنێکی دووردا کە ئەسـڵەکەی بیسـت و پێنج سـاڵ پێش ئێستا نووسراوە "واتە تیشکی پێنجەم" و، لە مـاوەی هەشـت سـاڵدا تەنـها یـەك دوو جـار بەردەستی خۆم کەوتووەتەوە و یەکسەریش ون کراوە..

دۆزینـەوەی ئـەم پەیامـــە، نیمچـــە زانایـــانی خستووەتە دۆخـی ڕکەبـەر و، وەهـم و گومانیان لە بارەی ئەم پەیامەوە لە ڕیزەکانی فەرمانگەکانی "داد"دا بڵاو کردووەتەوە.

هـەر لە هەمـان کاتدا هەواڵی چاپ بوونی پەیـامی "الآیة الکبری"ش بـە پیتـە نوێکـان بە بێ ڕەزامەندیی خۆم و گەیشتنی چەند نووسخەیەك لێـی بـۆ ئێرە، لـە بریـی چـاپکردنی پەیامی "کلیلی ئیمان"[1] کە حەزم لە چاپکردنی بوو، ئەم هەواڵە بـە پێچەوانـە شـکایەوە بەسەر فەرمانگەکانی حکوومەتدا و، هەریەك لەم دوو مەسەلەیەیان لـە لا بـوو بـەوی تـر. وەك بڵێی پەیامی "تیشکی پێنجەم" بە پێچەوانەی یاسا مەدەنییەکان چاپ کرابێت!

ئەمەش کارێکی کرد کەسانی خاوەن "ئامانجی کەسی" بە کارەساتێکی گـەورەی لـە قەڵەم بدەن و، دەنکە گەنمێك بە سەد هێندەی گومەزێك پیشان بـدەن، هـەتا بـە ناحـەق و ستەم ئێمەیان ترنجاندە ئەم شوێنی ئیعتیکاف و گۆشەگیرییەوە.

قەدەری خواوەندیش بۆیە ئێمەی گەیاندە ئێرە تاکو چەند سوودێك بەدەست بـهێنین، چونکە ئەم شوێنە پاداشتی گەورەی گەلـێ زیاتری لە هی زاهیدە گۆشەگیرەکان دەست خستین کە لە خەڵوەتگا ئیختیارییەکانی خۆیاندا بەدەسـتی دەهێنـن. هـەروەها قـەدەری خوایی بۆیە جارێکی تر بانگهێشتی کردین بۆ "قوتابخانـەی یووسـفی" تـاکو بـە تـەواوەتی وانەی ئیخلاسمان فێر بکـات و پەیوەندییە لارەکانمـان بـەم دنیـا بـێ نرخـەوە پـێ ڕاسـت بکاتەوە.

ئێمە لە بەرامبەر وەهم و گومانەکانی ئەهلی دنیاوە دەڵێین:

"تیشکی حەوتەم" هەر لە سەرەتاوە تـا کۆتـایی لـە بـارەی ئیمانـەوە دەدوێـت و، ئێـوە سەرتان لـێ شێواوە و خەڵەتاون.

---

(١) نامیلکەیەکە چەند هەڵبژاردەیەکی پەیامەکانی لەخۆ گرتووە. (وەرگێڕ)

"تیشکی پێنجەم" بە تەواوەتی لەو جیاوازە و پەیامێکی تایبەتی و لەڕادەبەدەر نهێنییە، بە جۆرێك كە سەرباری پشكنینی وردیش كەچی لای ئێمە نەیاندۆزییەوە. ئەسڵی ئەم پەیامەش بیست ساڵ پێش ئێستا نووسراوە. ئێمە ڕازی نین كە بە تەنها خۆی چاپ بكرێت تەنانەت هەر ڕازیش نین كە لەم كاتەی ئێستادا پیشانی هیچ كەسێك بدرێت، چونكە پەیامێكە هەواڵی چەند ڕووداوێكی ئاینده ڕادەگەیەنێت و، واقیعیش لەوێ تەسدیقی كرد و، تەحەددای هیچ كەسێكیش ناكات)[1].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٧٠–٤٧١. بەدیعوززەمان لە ڕۆژێکی یەکجار گەرمی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بە ئوتومبێلێکی گواستنەوەی گشتی بەرەو ئەنقەرە بەڕێ کرا. بەو حالەشەوە لە ڕێگادا ئەرکی ڕاگەیاندن و ڕێنمایی لەبیر نەچوو، بۆیە ئاوڕی لە پاسەوانەکەی دایەوە و پێی وت: ئایا دەگونجێت داوا لە شۆفێری بەڕێز بکەیت کە ئوتومبێلەکە ڕابگرێت؟ خۆ ئاین هیچ زۆرەملێیەکی تێدا نییە. ئەوەندە هەیە دەمەوێت هەندێ ئامۆژگاری پێشکەش بە نەفەرەکان بکەم.

شۆفێرەکە ئوتومبێلەکەی ڕاگرت و، بەدیعوززەمان ڕووی کردە نەفەرەکان و، پێی وتن:

گریمانی زۆر هەیە کە ئەمشەو "شەوی قەدر" بێت. پاداشتی خوێندنی قورئانی پیرۆز لە ڕۆژە ئاساییەکاندا "دە" چاکەیە بۆ هەر پیتێکی قورئان و، لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا دەبێتە "هەزار" چاکە، بەڵام لە شەوی قەدردا "سی هەزار" چاکەیە. ئایا گەر داوا لە کەسێکی ئێوە بکرێت لە بەرامبەر کارێکەوە پێنج لیرەی زێڕ وەربگرن، ئایا پێتان خۆشە لەوەتان دەست بکەوێت؟

نەفەرەکان وتیان: بەڵێ، پێمان خۆشە.

ئەویش فەرمووی: دەبا هەموو موسڵمانێك لە ئێوە هەر ئێستا سێ جار سوورەتی فاتیحە و یەك جار سوورەتی ئیخلاس و یەك جاریش "ئایەتەلکورسی" بخوێنێت، چونکە پاشەکەوت دەبێت بۆ ژیانی هەمیشەییتان.

لە ڕێگا و لە دەمی بەربانگدا ئوتومبێلەکە ڕاوەستا و، مامۆستا بەدیعوززەمان لەگەڵ نەفەرەکاندا بەربانگی کردەوە و، پێکەوە نوێژی شێوانیان خوێند.

لە ئەنقەرە "نەوزاد تان دۆغان"ی والیی ئەوێ ناردی بە دوایدا و، مشتومڕێکی توند لەسەر پۆشاکەکانی لە نێوانیاندا ڕووی دا، چونکە والی دەیویست بە زۆر پۆشاکەکانی پێ بگۆڕێت، مامۆستا بەدیعوززەمانیش بەرپەرچی دایەوە کە کەسێکی گۆشەگیرە و یاسای جلوبەرگ نایگرێتەوە. ئنجا ئاماژەی بۆ گەردنی کرد و، وتی: ئەم مێزەرەش لانابرێت مەگەر لەگەڵ ئەم گەردنەمدا!

درەوشانەوەیەکی قەدەر هەیە جێی تێڕامانە و بریتییە لەوەی کە لەم والییە توندوتیژەی چەند وشەیەکی نابەجێی سووکایەتی ئامێزی بەرامبەر مامۆستا بەکارهێنا، لە ڕۆژی (١٩٤٦/٧/٩ز)دا بە کرداری "خۆکوژی" فیشەکێکی بە سەری خۆیەوە نا و خۆی کوشت! (ش٠ ٣٤). مامۆستاش بۆ خۆی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و، دەڵێت: بەڕێز نەوزادی والیی ئەنقەرە ویستی خۆی لە قەرەی پۆشاکەکانم بدات، بەڵام لە هەوڵەکەیدا سەرنەکەوت و، بە کرداری خۆکوژی سزاکەی بەدەستی خۆی وەرگرت. (ب:٢/ ٩٨٥، ئەویش لە دەستنووسی دۆسیەی دەنیزلییەوە)

# بەندی حەوتەم

## لە بەندیخانەی دەنیزلی

### (دووهەم قوتابخانەی یوسفی)

### ١٩٤٣/٩/٢٠-١٩٤٤/٦/١٥ز

❐ تۆمەتەکان هەمان تۆمەتن!

(پاشان دوژمنە پەنهانەکانمان دەستیان کرد بە هاندانی هەندێ بەرپرس لە دژمان و، هاندانی هەندێ لەوانەش کە بەخۆیان دەنازین و لە خۆیان بایی بووبوون لە زانایان و شێخانی تەریقەت. بەم کارەشیان بوون بەهۆی کۆبوونەوەمان لە بەندیخانەکەی "دەنیزلی" لەگەڵ چەند قوتابییەکی تردا کە لە چەندین پارێزگای ترەوە هاتبوون)[1].

ئەو تۆمەتەش کە ئاراستەیان کرا، بە وێنەی ئەوانەی پێشوو، بریتی بوو لە:

"پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنی و، هاندانی گەل لە دژی حکومەتی عەلمانی و، هەوڵدان بۆ هەڵگێڕانەوەی سیستەمی دەسەڵات، پاشان ناونانی مستەفا کەمال بە دەجاڵ و سوفیانی"[2]!

(پاشان بردینیان بۆ بەندیخانەی "دەنیزلی" و لە هۆڵێکی گەورەدا بەندیان کردم کە تابڵێی بۆگەن و شێدار و سارد و سڕ بوو! لەوێشدا ئازار و خەم و خەفەتێکی زۆر لە چەند لایەکەوە ڕووی تێکردم، لەبەر گرتنی برادەرە بێ تاوانەکانمان بەهۆی منەوە و،

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٤. ژمارەی ئەو قوتابیانەی نوور کە لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا تۆمەتبار کران سەد و بیست وشەش کەس بوو کە هەموویان پێکەوە بران بۆ ئەنقەرە، پاشان بۆ دادگای گەورەی سزا لە دەنیزلی، ئنجا بۆ بەندیخانەکەی ئەوێ لە بەرواری ١٩٤٣/١٠/٢٥ز. (ب: ١٠٠٠/٢)

(٢) Tarihce-i Hayat, Denizli Hayati.

پەك كەوتنی بڵاوبوونەوەی "پەیامەكانی نوور" و، دەستبەسەرداگرتنیان و، گیرۆدە بوونم بە پیری و نەخۆشی‌یەوە. هەموو ئەمانەش دووچاری بێزاری‌یان كردم و، بە خەفەتەوە دەتلامەوە..

هەر بەو جۆرە مامەوە، هەتا چاودێریی پەروەردگار فریام كەوتەوە و، ئەو بەندیخانە سامناكەی بۆ گۆڕیم بە قوتابخانەیەكی نوور و، دەركەوت كە بە ڕاستی "بەندیخانە" قوتابخانەی یووسفی‌یە! ئەوەبوو پەیامەكانی نوور كەوتنەوە بڵاوبوونەوە و، پاڵەوانانی قوتابخانەی "زەهراء"یش بە قەڵەمە ئەڵماسی و كارامەكانیان دەستیان دایە نووسینەوە و لەبەر گرتنەوەی پەیامەكان..

تەنانەت پاڵەوانەكەی نوور[1] لە ماوەی چوار مانگدا و لەو بارودۆخە ناهەموارەی دەوروبەرماندا زیاتر لە بیست نوسخەی لە پەیامەكانی "بەری درەختی ئیمان" و "بەرگری" نووسی‌یەوە. ئەم نووسینەوەیەش بوو بەهۆی چەندین فتووحات چ لە ناوەوەی بەندیخانە و چ لە دەرەوەیدا، كە ئەمەش زیان و بێزاری‌یەكانی ئەو گیروگرفتەی بۆ گۆڕیین بە سوود و دڵخۆشی و، سەر لە نوێ نهێنی‌یەكی ترمان بۆ دەركەوت لە نهێنی‌یەكانی ئایەتی: ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦)!

پاشان لەسەر بناغەی ئەو ڕاپۆرتە هەڵە و ساكارەی كە لە لایەن كارشناسە سەرەتاییەكانەوە پێشكەش كرا بوو، بڵاوكراوەیەكی توندوتیژ لە دژی ئێمە بڵاو كرایەوە و، وەزیری پەروەردەش لە لایەكی ترەوە هێرشێكی توندی كردە سەرمان. تا وای لێ هات هەندێك داوای لە سێدارەدانی ئێمەی دەكرد، تەنانەت هەوڵ و تەقالاشیان بۆ ئەو مەبەستە خستەكار!

ئا لەم كاتە دژوارەدا كە ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان دەكرد كارشناسەكانی ئەنقەرەش ڕەخنەی گەزندەمان ئاراستە بكەن، كەچی چاودێریی خوای گەورە فریامان كەوتەوە و ڕاپۆرتەكەیان - بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئێمە - سەرتاپا ڕێزگرتن بوو لە پەیامەكانی نوور و، نووسیبوویان كە: لە پێنج سندووقی پڕ لەو پەیامانەدا تەنها نزیكەی "دە" هەڵە زیاتر هیچی تریان تێدا نەدۆزیوەتەوە!

---

(١) مەبەست لەو پاڵەوانە شەهید "حافز عەلی"یە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

ئێمەش لە بەردەم دادگادا ڕوونمان کردەوە کە ئەو شتانەی ئەوان بە هەڵەیان لە قەڵەم داوە، هیچیان هەڵە نین، بەڵکو سەرتاپا ڕاستین! ئنجا بەمەشەوە ڕانەوەستاین، بەڵکو لە بەردەم دادگادا ڕوونمان کردەوە و بۆمان چەسپاندن کە ڕاپۆرتە پێنج پەڕەییەکەی ئەوان نزیکەی "دە" هەڵەی تێدایە)[1]!

پێم وتن: ئەو خەبیرانەی کە هیچ شارەزاییەکیان نییە، شایانی ئەوە نین کە لە "پەیامەکانی نوور" وردبینەوە[2]! لەبەر ئەوە، داواکارم لیژنەیەکی باڵا لە ئەنقەرە لە زانایان پێکبهێنرێت. خۆ ئەگەر پێویستیشی کرد با چەندین پسپۆڕ و زانا لە ئەورووپاوە بهێنرێن بۆ وردبوونەوە لەم پەیامانە، گەر ئەو کاتە شتێکیان تێدا بینی سزام لەسەر پێویست بکات، من بەو سزایە ڕازی دەبم.

حکومەتیش لیژنەیەکی تری لە زانایان و شارەزایان پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە لە "سەرجەمی پەیامەکانی نوور". دەرەنجامی کارەکەیان ئەو ڕاپۆرتە بوو کە هیچ شتێکیان تێدا نەبینیوەتەوە ببێتە مایەی تۆمەتبار کردن[3].

(لەو کاتەدا کە چاوەڕوان بووین لە هەرحەوت دەزگا ڕەسمییەکانەوە کە پەیامەکانی "بەری درەختی ئیمان" و "بەرگری"یان بۆ ڕەوانە کرابوو، هەروەها لە وەزارەتی دادیشەوە کە سەرجەمی پەیامەکانیان بۆ نێررابوو - بە تایبەتی ئەو پەیامەی کورتەکی جەرگبڕ دەسرەوێنێتە گیانی گومڕایان - چاوەڕوان بووین لە لایەن ئەوانەوە هەڕەشە و گوڕەشەیەکی زۆر و فەرمانی قورسمان لەسەر دەربچێت، کەچی ڕاپۆرتە نەوازشدەرەکانیان گەیشتە دەستمان کە لەوپەڕی نەرمیدا بوون و لەو نامەیە دەچوون کە سەرۆك وەزیران بۆی ناردین. وەك بڵێیت ئارەزوومەندی ئاشتی و ڕێکەوتن بن لەگەڵماندا!

ئەمانە هەموویان زۆر بە ڕێکوپێکی دەیچەسپێنن کە:

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٥-٥٢٦.

(٢) "نوورەدین تۆپچو" کە مامۆستای فەلسەفە بووە لە زانکۆی ئەستەمبوڵ، دەڵێت: دادگای گەورەی سزا لە شاری دەنیزلی پەیامەکانی مامۆستا نوورسیی بە لیژنەیەکی کارشناس سپارد کە مامۆستای قۆناغی دواناوەندی بوون، یەکێکیان وانەی ئەدەبی تورکی و ئەوی دیکەیان وانەی مێژووی دەوتەوە و، هەردوو کیشیان مولحید بوون و هیچ ئاینێکیان نەبوو. N. Sahhincr. Nurs yolu: ١٢٣

(٣) Tarihce-i Hayat, Denizli Hayati.

بە فەزڵ و کەرامەتی چاودێریی خوای گەورە، ڕاستییەکانی پەیامەکانی نوور بەسەر ئەوانەدا سەرکەوت. بە ڕادەیەك کە وای لێ کردن پەیامەکان بخوێننەوە و ڕێنماییان لێ وەربگرن و، ئەو ڕاستییانە دام و دەزگا گەورە و ڕەسمییەکانیشی وەك قوتابخانەکانی نوور لێ کرد و، کەسانێکی زۆری دوودڵ و سەر لێ شێواویشیان ڕزگار کرد و ئیمانی بەهێز کردن. ئەمەش خۆشی و شادییەکی ئەوتۆی پێ بەخشیین کە بە چەندین جار لەو بێزاری و دڵتەنگییە زیاتر بوو کە هاتە ڕێمان)[1].

❑ دانانی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"[2]

(لە ماوەی دوو هەفتەدا پەیامی "بەری درەختی ئیمان"مان بۆ بەندکراوەکان دانا، کە پەیامێکە پوختەی ئامانج و بناغەکانی پەیامەکانی نوور دەخاتە ڕوو، هەروەك بەرگری لە "پەیامەکانی نوور"یش دەکات)[3].

(کاتێ کە بەروبوومە فیردەوسی و یووسفییەکانی قارەمانانم پاکژ و بژار دەکرد، پەیامی "بەری درەختی ئیمان" لە ناویاندا سەرنجی ڕاکێشام. چونکە لەو کاتەدا گرنگییەکەیم لێ دەرکەوت. ئیتر بە دەنگی بەرز وتم:

"گیروگرفت و ماندووبوونەکانی بەندیخانە گەر سەد هێندەش زیاد ببن، هەر ئەم پەیامە لەوان زیاتر کاری خۆی ئەنجام داوە. چونکە ئەم پەیامە بوو بە هۆی ئەوەی کە لە ناوەندە گشتییەکاندا بیخوێننەوە، تەنانەت سەرسەختەکانیش بەرەو ئیمان بداتە بەر.

دەسا ئەی ئەو بەدبەختانەی کە هەمیشە گوشار دەخەنە سەرم!

هەرچیتان لەدەست دێت و چ ڕەفتارێکتان لێ دەوەشێتەوە دریغیی لێ مەکەن، چونکە هەر هەوڵێك بدەن هێشتا هیچ نرخێکی نییە و، هەرچی گرفتێکیش بێتە ڕێمان

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٦-٥٢٧.

(٢) کە تیشکی یازدەهەمە. دانراوەکانی تری لە بەندیخانەی دەنیزلی، ئەمانەن:

١ - تیشکی دوازدەهەم (هەندێ لە بەرگرییەکانیەتی لە دادگای دەنیزلیدا).

٢ - تیشکی سیازدەهەم (چەند نامەیەکی دڵدانەوەن بۆ قوتابیانی نوور لە بەندیخانەدا).

٣ - چەند نامەیەکی ڕێنمایی بۆ قوتابیانی کە ژمارەیان سەد و بیست نامەیە. (ب: ٢/١١١٤)

(٣) تیشکەکان، دوازدەهەم، ل: ٤٤٣. لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی مەسەلەی هەشتەمی پەیامی "بەری درەختی ئیمان" ساڵی ١٩٤٣ز دانراوە. بەڵام مەسەلەی نۆهەمی لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤زدا. (ب: ٢/١٠٢٣)

بە شتێکی سووك و ئاسانی دەزانین، تەنانـەت بـە چـاودێری و میهرەبانی‌یـەکی بێگـەردی خوای گەورەی دادەنێین".

ئەمەم وت و، دڵنەوایی تەواوم تێدا بەدەست هێنا)[1].

(من پێم وایە کە ئەو نامیلکە بچووکەی بەندیخانەی دەنیزلی بەرهەمی هێنا، دواهەمین بەرگریی ڕاستەقینەمان دەبێت. چونکە ئەو نەخشـە و پلانـەی کـە پێشـتر بـۆ لـەناوبردنمان ئامادە کراوە و، لە چەند وەهم و گومانێکەوە پەیدا بووە کە ماوەی ساڵێکە لە دژی ئێمە وورووژاندوویانـە، لــە ڕووبـەرێکی فراوانـدا نەخشـەی بـۆ کێشـراوە و، بریتی‌یـە لـەم تۆمەتانەی خوارەوە:

کارکردن لە پێناوی تەریقەتێکی سـۆفیدا.. ئەوانـە ڕێکخراوێکـی نـهێنین.. ئـامرازی دەستی چەند تەوژمێکی دەرەکین.. وورووژاندن و بـەکارهێنانی هەسـت و نەسـتی ئـایینی لە پێناوی سیاسەتدا.. هـەوڵدان بـۆ ڕووخـاندنی ڕژێمـی کۆمـاری و دەسـت وەردان لـە کاروباری دەوڵەت و تێکدانی ئاسایشی وڵات و.. بیانووەکـانی تـری هاوچەشنیان کـە هیچ بناغەیەکی ڕاستی‌یان نی‌یە، بۆیە هێرشیان کردە سەرمان.

کەواتە شوکر و سوپاس و پێزانینی نەبڕاوە و بێ کۆتـایی بـۆ خـوای گـەورە، چونکـە هەموو فڕوفێڵ و پیلانەکانیان پووچەڵ بوونەوە و، لەم مەیدانە فراوانە و لە نێـوان سـەدان قوتابیی نوور و سەدان پـەیام و کتێبـدا و بـە درێژایی مـاوەی هـەژدە سـاڵ هیـچ شـتێکیان نەدۆزی‌یەوە جگە لە چەند باس و بابەتێك لە بارەی ڕاستیی ئیمان و قورئان و، هاتنەدیی قیامەت و، هەوڵدان بۆ دەستخستنی بەختەوەریی هەمیشەیی. لەبەر ئەوە، ئێستا بـە دوای چەند بڕوبیانوویەکی یەکجار بێ نرخدا دەگەڕێن کە پلانەکانی خۆیانی پێ بشارنەوە.

بـەڵام گرێمـانی ئـەوە هەیـە ڕێکخراوێکـی ئیلحـادیی ترسـناك و پەنـهان، کـە ئێسـتا ڕاستەوخۆ لـە پێنـاوی کوفری موتڵـەقدا کـار دەکـات، هـەندێ لـە خـاوەن پایـەکانی حکوومـەت بخـافڵێنێت و لـە خشتەیان ببات و لـە دژمـان بیـان وورووژێنێـت و لـەوێوە هێرشمان بکرێتە سەر. جا لە بەرامبەر ئـەم گرێمانـەوە پەیامی "بـەری درەختـی ئیمـان" کـە وەکـو خـۆر ڕووناکـە و، شـوبهە و گومانـەکان لـەناو دەبـات و، بـە وێنـەی چیـا

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٢٩٩.

گەردن کەشەکان چەسپاوە، بەهێزترین بەرگریمان دەبێت لـە بەرامبەریانەوە و، پشت بە خوا بێدەنگیان دەکات.

پێم وایە ئەم پەیامەمان لەم پێناوەدا پێ نووسراوە)[1].

(هـەر ئـەوەندەی قوتابیـانی نـوور و پـەیامی "بـەری درەختـی ئیمـان" - کـە بـۆ بەندکراوان نووسراوە - ڕۆشتنە ئەو بەندیخانەیە، زیاتر لـە دووسـەد بـەندکراو تۆبـەیان کرد و ڕێی ئـایین و چاکـە و گوێڕایەڵیی خوا و ئەنجامدانی فـەرزەکانیان گرتەبەر، کـە ئەمەش لە ماوەی سێ مانگ یان شتێك زیاتردا ڕووی دا. تەنانەت یـەکێك لەوانـە کـە لـە سێ کەس زیاتری کوشتبوو، وای لـێ هات دەستی لە کوشتنی ئەسپێ دەگێڕایەوە! واتـە نەك هەر تەنها بوو بـە ئـەندامێکی بێ زیـان، بـەڵکو بـوو بـە ئـەندامێکی سوودبەخشـی بـە بەزەیی لە وڵاتدا!

فەرمانبەرە بەرپرسەکان بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئەم ڕووداوانەیان دەکرد!

تەنانەت پێش ئەوەی بڕیاری دادگا دەربچێت، هەندێ کەس لە لاوان وتبوویان:

"ئەگەر قوتابیانی نوور لـە بەندیخانـەدا بمێننـەوە، ئێمـەش کـارێك دەکـەین کـە حوکـم بدرێین و لەگـەڵیاندا بـە بـەندکراوی بمێنینـەوە و، ببین بـە قوتـابیی ئـەوان و، سـوود لـە ئامۆژگارییان وەربگرین، تاکو ئێمەش وەك ئەوانمان لـێ بێت"!

گومـانی تێـدا نییـە کـە ئەوانـەی تۆمـەتی شـێواندنی ئاسایشـی گشـتی دەدەنـە پـاڵ قوتابیانی نوور، کە ئەم هەموو ڕەوشتە بەرزانەیان هەیە، گەلـێ بە هەڵەدا چـوون. یـان بـە چەشنێکی دڵتەزێن فریـو دراون و لـە خشتە بـراون. یـا خـود بـۆ مەبەسـتی تۆقـاندن و ئاژاوەنانەوە کاربەدەستانی حکوومەت دەخەڵەتێنن، بە خۆیان بزانن یان نەزانن. بۆیـە لـە پێنـاوی ئـەوەدا هـەوڵ دەدەن کـە لـەناومان بـەرن، یـان گرفتـاری ئەشـکەنجە و ئازارمـان بکەن.

ئێمەش بەوانـە دەڵێین: "مـادەم مـردن نـاکوژرێ و، دەرگـای گۆڕیـش دانـاخرێت و، کاروانەکانی مرۆڤایەتیش لەم میوانخانەیـەی دنیـادا زۆر بـە پەلـە و یـەك لـە دوای یـەك لـە ئاسۆی خاکدا ئاوا دەبن، ئەوا دەبێ بەم زووانە هەردوو لامان لە یەك دابڕێین. بەڵام ئێوە

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٤-٤٨٥.

تۆڵەی ئەم ستەم کردنەتان بە جۆرێکی سامناك دەبینـن و، ئـەو "مـردن"ەی کـە بـۆ ئـەهلی ئیمـان بریتی‌یـە لـە پشـوودان و حەوانـەوەی دوای دەردیسـەریی ژیـان، ئێـوە لـە شـێوەی ئیعدامێکی هەمیشەییدا دەیچێژن، چونکـە ئەو تـام و چێژە فانی‌یانـەی کـە دەسـتتان لـە داوێنـی گـیر کـردووە و بەهۆیانـەوە پێتـان وایە لـە دنیـادا دەمێننـەوە، سـەبارەت بـە ئێـوە هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێت بە ئازارێکی قورسی هەمیشەیی"!

"حەقیقەتی ئایینی ئیسلام" کـە ئـەم نەتـەوە ئایینداره لـە مێژه دەستی کـەوتووە و، بـە خوێن و شمشێری سەدان ملیۆن پاڵـەوان و شـەهیدی تێکۆشـەری ئـەم نەتەوەیـە – کـە لـە پلـەی ئـەولیادان – پارێزراوە، ئێستا – بـە داخـەوە – مونافیقـان کـە دوژمنانی پەنـهانی ئێمەن، ناوی "تەریقەت"[1]ی لـێ دەنێن و، "تەریقەت"یش بـە خـودی خـۆری حەقیقـەتی ئیسـلام دەردەخەن، کە لە ڕاستیدا "تەریقەت" تاقە تیشـکێکی ئەو خۆره درەخشـانەیە – کـە ئیسـلامە – نـەك خـودی "خـۆر" خـۆی. ئەمـەش بـۆ ئـەوەی هـەندێ لـە کارمـەندە سـاویلکـەکانی پێ هـەڵبنێن لە دژمـان و.. قوتابیـانی نووریـش، کـە بـەوپەڕی هـەوڵ و تەقـالا و چالاکی‌یـەوە بـۆ دەرخستن و پیشـاندانی ڕاستی‌یەکانی "ئیمـان" و "قورئـان" تێدەکۆشـن، بـە نـاوی "ئـەهلی تەریقـەت" یـان "کۆمەڵەیـەکی سیاسـی" ناودەبـەن، مەبەستیشیان لەمەدا ناشیرین کردنی ئێمە و هەڵنانی کاربەدەستانە لە دژمان!

بەڵام ئێمە بەوان و بە ئەڵقە لە گوێیانی ئـەوانیش، هـەمان قسـە دەڵێـین کـە لـە بـەردەم دادگا دادگەرەکەی "دەنیزلی"دا وتمان:

"ئەو حەقیقەتـە خاوێنـەی ئیسـلام کـە سـەدان سـەر بوونەتـە گیـانفیدا و سـەرگەردی باڵای، ئێمەش بە هەمان جۆر سەرمان دەکەینە قوربانی و لە پێناویدا بەختی دەکەین. خـۆ ئەگەر هەموو دنیا لەسەر سەرمان بکەن بە ئاگر، ئەوا ئەو سەرانەی کە بوونەتـە قوربـانیی ئـەو حەقیقەتـەی قورئـان، هـەرگیز نـەوی نـاکرێن و جڵـەوی خۆیـان نادەنـە دەسـت زەندیقەکان و، لەو ئەرکە خاوێن و پیرۆزەی خۆیان – پشت بە خوا – لانادەن"!

بەم جۆرە، ساڵێك لـە سـاڵەکانی ئـەم تەمـەنی پیری‌یـەم، کـە بـە ڕووداوەکـانی خـۆی نائومێدی و کارەسات و ئەرکە قورسەکانی بـۆ پێکـهێنام و، دڵدانـەوەکانی سـەرچاوەی

(١) لەبەر ئەوەی تەریقەت لەو ڕۆژگارانەدا قەدەغە بووە، ویستوویانە بەوە تاوانباریان بکەن! (وەرگێڕ)

"ئیمـان" و "قـورئـان"یش هـاتن بە هانایەوە و فریای کەوتن.. سـالێکی ئـەم پیریـەم – لەگەڵ ئەو هەموو مەینـەتی و دەردیسـەرییەدا – بـە "دە" سـاڵی شـادی و خۆشـحاڵیی ژیانی لاویم ناگۆڕمەوە. بە تایبەت کە یەك سەعاتی تۆبەکاری بەجێهێنەری فەرزەکان لـە بەندیخانـەدا لـە حوکمـی دە سـەعاتی عیبادەتدایـە و، هـەر ڕۆژێکـی نەخۆشـی سـتەم لێکراویش پاداشتی دە ڕۆژی هەمیشەیی دەست خاوەنەکەی دەخات!!

ژیانێك کە بەم شێوەیە بێت، دەبێ چـەندە مایـەی شـوکر و ستایش بێـت بەرامبـەر بـە خـوای گـەورە! بـە تایبـەتی بۆ یـەکێکی وەك مـن کـە لـە لێـواری گـۆڕدا ڕاوەسـتاوە و چاوەڕوانی نۆرەی خۆی دەکات!

بەڵێ، ئەمە ئەو "وانە"یە بوو کە لەو ئاگادارکردنەوە مەعنەوییەوە وەرم گـرت و لێـی تێگەیشـتم. ئیـتر پڕ بـە دڵ وتم: "سوپاسـی نەبڕاوە و بێ کۆتـایی بۆ خـوای گـەورە" و، دڵخۆش بووم بە پیری و، بە زینداني کردنیشم ڕازی بووم!

چونکە "تەمەن" ڕاوەستانی نییە و هەمیشـە لـە ڕۆشتندایە، جـا ئەگـەر بـە خۆشـی و چێـژ و لەزەتـەوە بڕواتـە سـەر، ئـەوا خەفـەت و دلتەنگییـەکی زۆر بـۆ مـرۆڤ بـەجێ دەهێڵێت، لەبەر ئـەوەی لەدەسـت چوونـی خۆشـی لـە ڕاستیدا ئـازارە. خـۆ ئەگـەر ئـەو تەمەنە شوکرانەبژێریی خوای تێدا نەبێت و بە بێ ئاگایی لـە مرۆڤ بەسـەر بچێـت، ئەوا تەمەنەکـەی دەڕوات، بـەڵام دەسـتمایەیەك لـە گوناهکـاری کـۆ دەکاتـەوە و بـەجێی دەهێڵێت..

خۆ ئەگەر بە ئازار و بەندی لە مرۆڤ بڕواتـە سـەر، ئەوا لەبـەر ئـەوەی نـەمانی ئـازار خۆی لە خۆیدا خۆشی و لەزەتێکی مەعنەوییە و، ئەم چەشنە تەمەنانـەش بـە جۆرێك لـە جۆرەکانی پەرستش دادەنرێن، ئەوا لە ڕوویەکەوە ئەو تەمەنە بە "باقی" دادەنرێـت و هـەر دەمێنێتەوە و، خاوەنەکەشی بەروبووم و تەمەنێکی بێگەرد و هەمیشەیی دەستگیر دەبێت. لە لایەکی تریشەوە ئەم جۆرە تەمەنانە کەفارەتێکن؛ ئەو هەڵە و گوناهانە دەشۆرنەوە کە بوون بەهۆی بەندبوونمان!

جا لەبەر ئەمە و لەم ڕوانگەیەوە، پێویستە ئەو بەندکراوانەی کـە فـەرزەکانیان بـەجێ دەهێنن، هەمیشە ئارام بگرن و لە شوکرانەی خوادا بن)[1].

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٠-٥٢٣.

☐ نامەیەك بۆ حافز عەلی

(برای ئازیزم حافز عەلی! بایەخ بە نەخۆشی‌یەکەت مەدە..

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە شیفات پێ ببەخشێت. ئامین.

تۆ گەلێ قازانجت دەست کەوتووە. چونکە هەموو سەعاتێکی پەرستشی ناو بەندیخانە وەکو پەرستشی دوازدە سەعات وایە.

ئەگەر پێویستت بە دەرمانە، من هەندێکم لایە با بۆتی بنێرم؟ ئەوەش هەیە کە سووکەڵە پەتایەك بڵاو بووەتەوە.

من هەر ڕۆژێك کە بڕۆم بۆ دادگا بێ هیچ گومانێك لەو ڕۆژەدا نەخۆش دەکەوم. لەوە دەچێ تۆ لەمەدا بوو بیت بە یارمەتیدەرم و هەندێك لە نەخۆشی‌یەکەی منت هەڵگرتبێت، بە وێنەی ئەو قارەمانێتی‌یە دەراسایەی کە جاران ڕووی دەدا و، هەندێ جار یەکێك لە جیاتی براکەی نەخۆش دەکەوت، یاخود لە بریی ئەو دەمرد!)[1].

☐ شەهیدبوونی حافز عەلی

(پاشان دوژمنە پەنهانە خۆشارەوەکان ژەهریان بۆ کردینە ناو خواردنەوە و، دوای ئەم کارەساتە پاڵەوانەکەی نوور "حافز عەلیی شەهید" لە بریی من برا بۆ نەخۆشخانە و، هەر لە بریی منیش کۆچی بۆ جیهانی بەرزەخ کرد و، گریان و خەم و پەژارەیەکی زۆری بۆ بەجێ هێشتین.

جارێکیان پێش ئەم ڕووداوە، لەسەر چیای "قەستەمۆنی"یەوە چەند جارێك بە دەنگێکی بەرز وتم:

"برایانم! گۆشت دەرخواردی ئەسپ و گیایش دەرخواردی شێر مەدەن"!

واتە هەموو پەیامێك بە هەرەمەکی بە هیچ کەسێك مەدەن، نەوەك دووچاری گیروگرفتمان بکەن.

وەك بڵێی ئەم کاك "حافز عەلی"ەش - کە حەوت ڕۆژە ڕێ لێمانەوە دوور بوو - بە ئامێری تەلەفۆنی مەعنەویی خۆی ئەم قسەیەمی بیستبێت، نامەیەکی بۆ ناردم کە تیایدا نووسیبووی:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٥٠٩.

"بەڵێ مامۆستام! یەکێك لە کەرامەتەکانی "پەیامەکانی نوور" و لە کارە تایبەتی‌یەکانی ئەوەیە کە: گۆشت دەرخواردی ئەسپ و گیایش دەرخواردی شێر نادات، بەڵکو گیا بە ئەسپ و گۆشتیش بە شێر دەدات"!

بەم جۆرە پەیامی "ئیخلاس" درا بەو شێر و کەڵە زانایە و، دوای چەند ڕۆژێك ئەو نامە ناوبراوەمان بەدەست گەیشت! کە لێکمان دایەوە و ڕۆژەکانمان ژمارد بۆمان دەرکەوت ئەو ڕستەیەی لە هەمان کاتدا نووسیوە کە من لەسەر چیاکەی قەستەمۆنی‌یەوە دووپاتم دەکردەوە!!

جا مردنی پاڵەوانێکی مەعنەویی ئاوا لە پاڵەوانەکانی نوور، لەو کاتەدا کە مونافیقەکان بۆ تاوانبارکردنمان و سزا سەپاندن بەسەرماندا تێدەکۆشان، سەرەڕای نیگەرانیی بەردەوامی خۆیشم بەرامبەر بەوەی کە بە فەرمانێکی ڕەسمی بەرام بۆ نەخۆشخانە لەبەر ئەو نەخۆشی‌یەی کە لە ژەهرپێدانمەوە سەری تێ کردبووم..

ئا لەم کاتەدا کە ئەم هەموو بێزاری و دڵتەنگی‌یە دەورەی دابووین، چاودێریی خوای گەورە هات و یارمەتیی داین. چونکە نزا و پاڕانەوەی بێگەردی برا بەڕێزەکانم مەترسیی ژەهرەکەی لابرد. سەبارەت بەو پاڵەوانە شەهیدەش، ئەوا گەلێ نیشانەی زۆر بەهێز هەن لەسەر ئەوەی کە لە گۆڕەکەشیدا هەر خەریکی پەیامەکانی نوورە و وەڵامی پرسیارەکانی مەلائیکەتی پێ دەداتەوە!

پشت بە خوا پاڵەوانەکەی دەنیزلی "حەسەن فەیزی" - خوا لێی خۆش بێت - هەروەها هاوڕێ بەوەفاکانی، جێگای ئەو شەهیدە دەگرنەوە و لە بریی ئەو بە نهێنی خزمەتگوزاری نوور ڕادەپەڕێنن.

ئنجا لەبەر بڵاوبوونەوەی بەر فراوانی پەیامەکانی نوور لەناو بەندیخانەکەدا و، پێشوازی کردنی بەندکراوان و بەدەمەوەچوونی خێرایان بۆ ئەو پەیامانە، دوژمنەکانمان ترسیان لێ نیشت و لایەنی ئەو ڕا و بۆچوونەیان دەگرت کە لە بەندیخانە دەرباز بکرێین و بەر بدرێین، تاکو دەنگمان بەو بەندکراوانە نەگات! چونکە قوتابیانی نوور ئەو خەڵوەتگە پڕ لە بێزاری‌یەی بەندیخانەیان وەك ئەشکەوتی لاوە ئیماندارەکانی "أصحاب الكهف" و بە وێنەی خەڵوەتگای زاهیدە گۆشەگیرەکان لێ کردبوو! ئەوەبوو بەوپەڕی

دامەزراوی و لەسەرخۆییەوە کەوتبوونە تێکۆشان بۆ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور و بڵاوکردنەوەیان لە نێوان بەندکراواندا!

هەموو ئەمانە دەیچەسپێنن کە چاودێریی خوای باڵادەست یارمەتیی داوین و فریامان کەوتووە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم واتایەم بە دڵدا هات:

مادەم ئیمامی ئەعزەم "ئەبوو حەنیفە" و پێشەوا و موجتەهیدەکانی هاووێنەی، بە زیندانی و بەند کردن ئازار دران و، لەگەڵ ئەوەشدا ئارامیان گرت و لەرزەیان پێ نەکەوت..

مادەم ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و تێکۆشەرە گەورەکانی تر لە پێناوی تاقە مەسەلەیەکی قورئاندا ئازار دران، کەچی هەمووشیان لە بەردەم ئەو مەینەتی و ئازارانەدا خۆیان ڕاگرت و، لەسەر لوتکەی ئارامگرتندا ڕاوەستابوون و، کەسیان سکاڵا و بێزاریان پیشان نەدا و، هیچ کامیشیان لە وتەی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە..

مادەم چەندین زانا و پێشەوای مەزنی تریش لە بەردەم ئەو گیروگرفت و ئازارانەی هاتە ڕێیان نەلەرزین و دانیان بە خۆدا گرت و، هەمیشە لە شوکرانەی خوادا بوون، لە کاتێکدا کە ئەو بەڵا و ئازارانەی داباری بەسەر ئەواندا زۆر سەختتر بوو لەوەی ئێوە..

مادەم وایە، ئەوا ئێوە قەرزی شوکرانەی زۆرتان لە ئەستۆدایە، لە بەرامبەر ئەو ئازارە کەمەی کە لەسەر چەندین حەقیقەتی زۆری قورئانی پیرۆز تووشتان دەبێت، هاودەم لەگەڵ ئەو پاداشتە زۆرەی کە لەم ڕێیەوە دەستتان دەکەوێت)[1].

☐ پرسە و دڵدانەوەیەکی جوان لە گونجاوترین کاتدا

برایانی ئازیز و بەوەفام!

سەبارەت بە هەموو موسیبەتێك دەڵێین: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ (البقرة:١٥٦).

پرسە و سەرەخۆشی لە خۆم و ئێوە و پەیامەکانی نوور دەکەم. بەڵام پیرۆزبایی بۆ گیانی خوالێخۆش بوو "حافز عەلی" و گۆڕستانی "دەنیزلی" دەنێرم. چونکە ئەم برا پێشڕەوەمان کە بە "علم اليقين" لە ڕاستییەکانی پەیامی "بەری درەختی ئیمان"

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥٢٧-٥٢٩.

گەیشتبوو، جەستەکەی لەناو گۆڕدا جێ هێشتووە و بە وێنەی مەلائیکەت بەرەو ئەستێرەکان و جیهانی گیانەکان بەرزبووەتەوە، تاکو بگاتە پلەی "عین الیقین" و "حق الیقین". هەروەك کۆتایی بەو ئەرکەی سەرشانی هات کە بە ڕاست و دروستی ئەنجامی داوە و، ئێستا بۆ خۆی لە حەوانەوەدایە.

لە خوای بەخشندەی میهرەبان داواکارین کە بە ژمارەی هەموو پیتە نووسراوە و خوێنراوەکانی پەیامەکانی نوور کرداری چاك لە تۆماری کردەوەکانیدا بنووسێت. ئامین..

هەروەها بەو ژمارەیە ڕێژنەی میهرەبانیی خۆی بەسەردا ببارێنێت. ئامین..

قورئانی پیرۆز و پەیامەکانی نووریشی بۆ بکات بە دڵنەواز و ئارامی بەخش لە گۆڕەکەیدا. ئامین..

بە چاکە و بەخششی خۆیشی "دە" دانە کارگوزار لە بریی ئەو خوالێخۆشبووە بە کارگەی "نوور" ببەخشێت. ئامین.. ئامین.. ئامین.

ئێوەش - برایانم! - وەك من لە دوعاکانتاندا ناوی بهێنن و لە بریی زمانی خۆی هەزار زمان بە دوعا بخەنە کار و لە میهرەبانیی خوا داوا بکەن کە لە بریی ئەو یەك دانە ژیان و یەك دانە زمانەی لە دەستی دا، هەزار ژیان و زمانی دەست بخات.

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

سوپاس و شوکری نەبڕاوە و بێ کۆتایی پێشکەش بە خوای گەورە دەکەین لەسەر ئەوەی کە شەرەفی پلەی بەرزی قوتابیی زانستەکان و کردارە مەزنەکانی ئەوانی، بەهۆی ئێوەوە، لەم ڕۆژگارە سەیر و شوێنە نامۆیەدا پێ بەخشیوین.

بە چەندین ڕووداوی زۆر لە بینینەکانی ئەو پیاوچاکانەی گۆڕستانیان بۆ کەشف دەبێت، ئەوە چەسپاوە کە:

هەر قوتابییەکی زانستخوازی ڕاستەقینە و چوست و چالاك لە خوێندنی زانستدا، گەر لە دەمی خوێندنەکەیدا کۆچی دوایی بکات، خۆی - بە وێنەی شەهیدان - بە زیندوو دەزانێت و خەریکی وانەکانی دەبێت!

تەنانەت یەکێك لە کەسانی بەناوبانگی ئەو چینەی ئەولیا کە گۆڕیان لێ دەردەکەوێت، سەرنجی وەڵامەکانی قوتابییەکی دابوو بۆ پرسیارەکانی نەکیر و

مونکەری ناو گۆڕ، کە لە دەمی خوێندنی زانستی نەحو و سەرفدا کۆچی دوایی کردبوو. بینیبووی لە وەڵامی ئەو پرسیارەی مەلائیکەدا کە دەپرسێ: "مَـــنْ ربُّــكَ"؟ دەڵێت: "مَنْ" موبتەدایە و "ربُّكَ"ەش خەبەرەکەیەتی! ئەمەش بەپێی زانستی نەحوو..

پێی وابووە هێشتا هەر لە قوتابخانەدایە و وانەکانی دەخوێنێت.

لەسەر بناغەی ئەم ڕووداوە:

من لەو باوەڕەدام کە خوالێخۆشبوو "حافز عەلی" ئێستا بە پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵە، وەك لە ژیاندا هەمیشە سەرقاڵ بوو پێیانەوە و، لە شێوەی قوتابی‌یەکی زانستخوازدا بەرز و بڵندترین زانست دەخوێنێت و، بە ڕاستی پلەی شەهیدانی بەدەست هێناوە و، جۆری ژیانی ئەوان بەسەر دەبات.

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە، هەردەم لە نزا و پاڕانەوەکانمدا دوعای بۆ دەکەم. هەروەك دوعا بۆ دوو هاوڕێنەکەی ئەویش "محەممەد زوهدی" و "حافز محەممەد" دەکەم و، دەڵێم:

ئەی پەروەردگارا ئەوانە تا ڕۆژی قیامەت بخەرە کار تاکو بە کەماڵی دڵخۆشی و شادمانی‌یەوە سەرقاڵی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و نهێنی‌یەکانی قورئان بن لە ناوەندی پەیامەکانی نووردا. ئامین. إن شاء الله)[1].

## گوڵبژێرێك لە بەرگریی مامۆستا نوورسی
## لە دادگای "دەنیزلی"دا

(سەرۆکی بەڕێزا

لە بڕیاری دادگادا سێ بناغە دەستنیشان کراوە:

ماددەی یەکەم: "کۆمەڵە".

من هەموو قوتابیانی نووری ئێرە و، گشت ئەو کەسانەی منیان دیوە و قسەیان لەگەڵدا کردووم و، سەرجەمی ئەوانەش کە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە یان نووسیویاننەتەوە، دەگرم بەشایەت و، خۆشتان دەتوانن لێیان بپرسن تاکو دڵنیا ببن

---
(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٥٠٩-٥١١.

لەوەی کە من بە هیچ کەسێکم نەوتووە: ئێمە "کۆمەڵەیەکی سیاسی" یان "تەریقەتێکی نەقشبەندی" پێکدەهێنین. بەڵکو هەمیشە وتوومە:

"ئێمە هەوڵ دەدەین ئیمانەکەمان ڕزگار بکەین".

هەرگیز قسەیەکمان لە نێواندا نەبووە کە هی دەرەوەی سەرجەمی ئەهلی ئیمان و دەرەوەی ئەو کۆمەڵە ئیسلامی‌یە خاوێنە بێت کە ژمارەیان لە سێ سەد ملیۆن[1] موسڵمان زیاترە و، هیچ جێیەکمان لە دەرەوەی ئەو ناوی "حزب الله"یەدا بۆ خۆمان دانەناوە کە ناوێکە قورئانی پیرۆز لە هەموو موسڵمانانی ناوە و سەرجەمی ئیماندارانی لە ژێر سایەی ئیماندا کۆکردووەتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئێمە هەموو هەوڵێکمان لە خزمەتی قورئاندا چڕ کردووە، ئەوا بێ گومان ئێمە لە "دەستەی قورئان" و "حزب الله"ین.

ئەگەر بڕیاری تۆمەتبارکردنمان ئاماژە بۆ ئەمە دەکات، ئەوا ئێمە بە هەموو هێزێکی گیان و هەناومان و بەوپەڕی سەربەرزی و شانازی‌یەوە دان بەمەدا دەنێین.

بەڵام گەر ئاماژە بۆ هەر واتایەکی تر بکات، ئەوا ئێمە هیچ شتێك لەو واتایانەی تر نازانین.

**ماددەی دووهەم:**

بڕیاری تۆمەتبارکردنەکە پشت بە ڕاپۆرت و شایەتیی "پۆلیسی قەستەمۆنی" دەبەستێت و دان بەوەدا دەنێت کە "پەیامی حیجاب" و "پەیامی شەش هێرشەکان و پاشکۆکەی" لەناو چەند سندووقێکی داخراوی بزمارڕێژکراودا دۆزراونەتەوە، کە لە ژێر چەند لیژنەدار و کۆمەڵە خەڵووزێکدا هەڵگیرابوون. واتە هەرگیز بۆ "بڵاوکردنەوە" ئامادە نەکرابوون.

ئنجا ئەو پەیامە ناوبراوانە لە ژێر ڕەخنە و لێ وردبوونەوەی دادگای "ئەسکی شەهر" دەرچوون و، ئەنجامەکەشیان دەرکردنی سزایەکی سووك بوو لەسەر من. بەڵام داواکاری گشتی کە هەندێ ڕستەی ئەم پەیامانەی بە دەستەوە گرتووە و هەندێ واتای نادروستی بۆ لێکداونەتەوە، دەیەوێت نۆ ساڵ بەرەو دواوە بمانباتەوە و،

(١) ئەمە نزیکەی ژمارەی موسڵمانانی جیهان بووە لەو کاتەدا. (وەرگێڕ)

بەرپرسیارێتی‌یەکی نوێ بخاتە ئەستۆمانەوە لەسەر تۆمەتێك کە پێشتر سزا دراوین لەسەری.

ماددەی سێ‌هەم:

لە چەند شوێنێکی بڕیاری تۆمەتنامەکەدا چەند دەستەواژەیەکی وەك: "دەگونجێ ئاسایشی وڵات تێك بدات" بەکار هێنراوە. واتە "گریمانەکان" لە جێی "ڕووداوە چەسپاوەکان"دا دانراون!

منیش دەڵێم:

دەگونجێ هەموو کەسێك تاوانی "کوشتن" ئەنجام بدات، بەڵام ئایا دەکرێت هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ئەو گریمانە تاوانبار بکرێت؟!)[1].

(بەڕێزان!

دووپاتی دەکەمەوە بۆتان کە ئەو کەسانەی لێرەدان، یان هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە "پەیامەکانی نوور"ەوە نی‌یە، یاخود تەنها پەیوەندی‌یەکی سادە و ساکاریان لەگەڵ پەیامەکاندا هەیە. لە کاتێکدا کە من گەلێ برای ڕاستەقینەم هەیە، بە هەموو واتایەکی "برایەتی" کە بتوانن تەسەووری بکەن. هەروەها چەندین هاوڕێشم لەسەر ڕێ و ڕێبازی حەقیقەتدا هەیە لەوانەی کە گەیشتوونەتە حەقیقەت.

بەڕێزان!

ئێمە یەقینی نەبزواوی تەواوەتیمان بەوە هەیە کە "مردن"مان - بەهۆی نەهێنیی قورئانی پیرۆزەوە - هەرگیز ئیعدامی هەتاهەتایی نی‌یە، بەڵکو ڕوخسەتنامەی حەوانەوەیە..

کەچی دڵنیاین لەوەی کە "مردن" سەبارەت بە نەیارەکانمان و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی گومڕایین، مردنێکی بێ گومان و ئیعدامێکی هەمیشەییە، گەر هیچ باوەڕێکیان بە قیامەت نەبێت. یان مردن سەبارەت بەوان بەندیخانەیەکی تاکەکەسی و هەتاهەتایی و تاریکە، گەر باوەڕیان بە دواڕۆژی قیامەت بێت، بەڵام نوقمی ژیانی هەرزەیی و گومڕایی بووبن.

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٤٨-٤٤٩.

وا من لێتان دەپرسم کە:

ئایا هیچ کێشەیەك لەم دنیایەدا هەیە لە کێشەی مردن گەورەتر بێت؟.. ئایا هیچ مەسەلەیەك لەناو گرۆی مرۆڤدا هەیە کە لەمە گرنگتر بێت؟

ئیتر ئایا چۆن دەگونجێت ئەم مەسەلە و کێشە گەورەیە لە پێناوی شتی تردا بەکار بهێنرێت، مادەم هیچ شتێکی تر نەبێت کە لەم مەسەلە و کێشەیە گەورە و گرنگتر بێت؟

ئیتر بۆچی ئێوە بەم جۆرە خۆتان بە ئێمەوە سەرقاڵ کردووە؟!

ئێمە قورسترینی سزاکانتان وەك ڕوخسەتنامە و پسوولەیەکی سەفەر دەبینین بەرەو جیهانی ڕووناکی، بۆیە بە دامەزراوی‌یەکی تەواوەتی‌یەوە چاوەڕوانی دەرچوونی ئەو ڕوخسەتنامەیە دەکەین..

بەڵام لە هەمان کاتدا بە دڵنیاییەوە دەزانین کە ئەو کەسانەی لە دژمان ڕاوەستاون و بڕیارەکانیان لەسەر ئێمە دەردەکەن، بەم نزیکانە یان بە ئیعدامی هەتاهەتایی، یاخود بە زیندانیی تاکەکەسی، ڕووبەڕووی سزا و تۆڵەی ترسناکی خۆیان دەبنەوە.

ئێمە هێندە لەم ئاکامە دڵنیاین کە هەروەك بە چاوی خۆمان ئێوە لەم کۆڕ و ئەنجومەنەدا دەبینین، دەڵێی ئەوانیش بە هەمان جۆر لەناو سزاکانیاندا دەبینین!

بەڵێ، بەم جۆرە دەیانبینین و، لە ڕووی مرۆڤایەتی‌یەوە گەلێ بەزەییمان بە حاڵیاندا دێتەوە.

بە تەواوی ئامادەشم کە ئەم ڕاستی‌یە گرنگە بچەسپێنم و بەڵگەی لەسەر بهێنمەوە و گەورەترین کەسی سەرسەخت و ملنەدەریش لەمەدا بەستمەوە. هەروەك ئامادەیی تەواوەتیشم بۆ قبووڵ کردنی هەر سزایەك دەردەبڕم کە ئەگەر ڕوونتر لە خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ئەم ڕاستی‌یە لە بەردەم گەورەترینی زانا و فەیلەسووفەکانتاندا نەچەسپێنم، چ جای لە بەردەم پسپۆڕانی ئەم لیژنەیەدا، کە لە زانین و پسپۆڕی بێ بەشن و، دڵیان لە ڕق و کینە پڕ بووە و، هیچ ئاگایەکیان لە مەعنەوییات نی‌یە و بایەخی پێ نادەن!

وەك نموونەیەك لەسەر ئەمە، لە ماوەی دوو هەفتەدا پەیامی "بەری درەختی ئیمان"مان بۆ بەندکراوەکان دانا، کە پەیامێکە پوختەی ئامانج و بناغەکانی پەیامەکانی نوور دەخاتە ڕوو، هەروەك بەرگری لە "پەیامەکانی نوور"یش دەکات..

وا ئەم پەیامەتان پێش چاو دەخەم و، بۆ مەبەستی ئەوەش کە بخرێتە بەردەست دەزگا رەسمی‌یەکانی ئەنقەرە، ئەوا بە نهێنی ئەرك و ماندووبوونێکی قورس هەڵدەگرین لە پێناوی نووسینەوەیدا بە پیتە نوێکان[1] و، ئێستا ئێوەش بۆ خوێندنەوەی ئەم پەیامە بانگهێشت دەکەم. جا ئەگەر دوای خوێندنەوەی، دڵەکانتان - نەك دەروونەکانتان - تەسدیقیان نەکردم، ئەوا بە هەموو جۆرێکی ئەشکەنجە و سووکایەتیی ناو ئەم زیندانە تاکەکەسی‌یەم رازیم کە ئێستا تیایدام و، دەمم بە دەربڕینی هیچ سکاڵایەك ناکەمەوە!

*بەکورتی:*

ئێوە تەنها دوو ڕێگاتان لە بەردەمدایە:

یان سەربەستیی تەواوەتی بە پەیامەکانی نوور بدەن.. یان - گەر دەتوانن - بەسەر ڕاستی‌یەکانی ناو ئەو پەیامانەدا زاڵ بین و لەناویان بەرن!

من تا ئێستا نە بیرم لە ئێوە دەکردەوە و نە لە دنیاکەشتان. تەنانەت نیازم نەبوو لە ئایندەشدا بیرتان لێ بکەمەوە. بەڵام خۆتان ناچاری ئەمەتان کردم و، لەوانەشە ئەمە بۆ بێدارکردنەوەی ئێوە پێویست بووبێت و، قەدەری خواوەندیش بۆ ئەم مەبەستە ئێمەی هێنابێتە ئێرە.

بەڵام ڕابەری ئێمە تەنها ئەو دەستوورەیە کە دەڵێت:

"من آمن بالْقَدَر أمِنَ من الْكَدر"[2].

لەبەر ئەوە، بڕیارمان داوە بەوپەڕی ئارامی‌یەوە هەموو جۆرە گوشار و تەنگ پێ هەڵچنینێك هەڵبگرین کە بیهێننە ڕێمان)[3].

(بەڵێ، ئێمە کۆمەڵەیەکین کە لە هەموو چەرخێکدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن ئەندامی هەیە و، هەر هەموو شیان هەموو ڕۆژێك پێنج جار بە ئەنجامدانی نوێژەکانیان ئەوپەڕی ڕێز و پەیوەندیی ڕاست و دروستی خۆیان بە بنەماکانی ئەو کۆمەڵە خاوێنەوە دووپات دەکەنەوە و، چ لە ڕێی دوعای پاشملەیانەوە بۆ یەکتری و چ بە دەستکەوتە مەعنەوی‌یە

(١) واتە بە پیتی لاتینی. (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: القضاعي، مسند الشهاب: ١/١٨٧؛ الديلمي، المسند: ١/١١٣؛ المنـــاوي، فيـــض القديـــر: ٣/١٨٧.

(٣) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٤٢-٤٤٤.

زۆر و زەبەندەكانيانەوە، بەپێی دەستووری خوايی: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: ١٠) پێشبڕكێی درێژكردنی دەستی يارمەتی بۆ يەكتری دەكەن.

كەواتە ئێمە - بەم جۆرە - ئەندامی ئەو كۆمەڵە خاوێن و مەزنەين. كارمەندیی ئەستۆشمان لە چوارچێوەی ئەم كۆمەڵەيەدا بريتی‌يە لە ڕاگەياندنی ڕاستی‌يەكانی ئيمان و قورئانی پيرۆز بە جوانترين و خاوێنترين شێوە، بە عەودالانی حەق و ئيمان، تاكو خۆمان و ئەوانيش لە ئيعدامی هەميشەيی و بەرزەخی بەنديخانەی تاكەكەسی و هەتاهەتايی ڕزگار بكەين.

بەڵام كۆمەڵە دنياييەكان، كە لەسەر بناغەی فرتوفێڵە سياسی‌يەكان دامەزراون، نە لە نزيك نە لە دوورەوە ئێمە هيچ پەيوەندی‌يەكمان پێيانەوە نی‌يە، تەنانەت هەر دانابەزينە ئاستيشيان)[1].

(ئەگەر هەر چەشنە حەزێكمان لە كاروباری دنيا ببوايە، ئەوا ئەو دەنگەی كە لێمانەوە دەبيسترا وەك هی ويزەی مێش نەدەبوو، بەڵكو كارەكەمان بە وێنەی زرمەی تۆپ دەنگی دەدايەوە!

بەڵێ، پياوێك كە بەوپەڕی توندوتيژی و بە بێ هيچ ترس و بيمێك لە بەردەم ئەو دادگا عورفی‌يە سەربازی‌يەدا كە بەهۆی ڕووداوی "٣١"ی مارتەوە سازكرا، بەرگری‌يەكی يەكجار كاريگەر و دلێرانەی كرد و، لە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەرانيشدا بە هەمان شێوە بێت، بێ ئەوەی گوێ بە تووڕەيی و هەڵچوونی مستەفا كەمال بدات..

چۆن ئەو كەسە بەوە تۆمەتبار دەكرێت كە گوايا بە نهێنی و بێ ئەوەی كەس پێی بزانێت ماوەی هەژدە ساڵی ڕەبەق پيلانی سياسی دەگێڕێت؟

ئەو كەسەی تۆمەتی وای ئاراستە بكات بێ هيچ گومانێك كەسێكی قين لە دڵە)[2].

(كەس مافی ئەوەی نی‌يە كە بە بيانووی قسوور و ناتەواوی لە مندا يان لە هەندێ لە براكانمدا هێرش بكاتە سەر پەيامەكانی نوور، چونكە "پەيامەكانی نوور" ڕاستەوخۆ پەيوەستن بە قورئانی پيرۆزەوە، قورئانيش پەيوەستە بە عەرشی مەزنی خوای گەورەوە. كەواتە كێ هەيە بتوانێت دەست بۆ ئەوێ درێژ بكات و ئەو پەتە قايمانە خاو بكاتەوە!

---

(١) تيشكەكان، تيشكی سيازدەهەم، ل: ٤٨٩-٤٩٠.

(٢) تيشكەكان، تيشكی چواردەهەم، ل: ٥٥٧-٥٥٨.

پاشـان هـەرگیزاو هـەرگیز نـاکرێ پەیامـەکانی نـوور بـەرپرس بکرێـن لـە نـەنگی و ناتەواوی‌یـەکانی ئێمـە، چونکـە بەرەکـەتی مـاددی و مەعنـەویی ئـەم پەیامانـە و خزمەتـە مـەزنـەکانیان بە ئـامـاژەی سـی و سـێ ئایـەتی قورئـانی پیرۆز و سـێ کەرامـەتی ئیمـامی عەلی - خوای لـێ ڕازی بێت - و هەوالەکانی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّه - هاتووەتە دی. دەنـا ئەم وڵاتە ڕووبەڕووی چەندین زیـانی مـاددی و مەعنـەویی ئـەوتۆ دەبێتـەوە کـە چارەسەر و قەرەبوو نەکرێتەوە.

بە پشتیوانیی خوای گەورە، سەرجەم فرتوفێڵ و پیلانـە شـەیتانی‌یەکان و هێرشـەکانی مولحیدانـی دوژمنی پەیامـەکانی نـوور شکسـت دەهێنێـت و پووچـەڵ دەبێتـەوە، چونکـە قوتابیـانی نـوور وەکـو کەسـانی تـر نـین. بـە پشـتیوانی و چـاودێریی خـواوەنـد نـاتوانرێت پەرتەوازە بکرێن و ناچار بکرێن واز لە بانگەوازەکەیان بهێنن، یان بە سەریاندا زاڵ بین.

قوتابیانی نوور کە لە هەموو شوێنێکدا هەن و، ڕێـز و خۆشەویستیی جـەماوەری ئـەم نەتەوەیەیان بەدەست هێناوە - کە ئەمەش بە شتێکی زیندوو دادەنرێت لـەم نەتەوەیـەدا - ئـەو قوتابیانـەی نـوور، جگـە لـەوەی کـە قورئـان ڕێـی بـەرگریی مـاددی‌یـان پـێ نـادات، خۆیشیان هـەرگیز بەشـداری لـە ڕووداوێکـی جوزئیـی وەك ڕووداوەکـانی لەمـەڕ شێخ سەعیدی پیران و ڕووداوی "مەنەمەن"دا[1] ناکەن..

چونکە ئەگەر خوا نەخواستە ستەمێکی توندوتیژی لـە ڕادەبەدەریان لـێ بکرێـت و هێرش بکرێتە سەر پەیامـەکانی نـوور ئـەوا ئـەو مونـافیق و مولحیدانـەی کـە حکوومـەتیان خەڵەتاند، بێ هیچ گومانێك پەشیمان دەبنەوە.

*بەکورتی:*

مادەم ئێمە کارمان بەسەر دنیای ئەهلی دنیـاوە نی‌یـە، دەبێ ئـەوانیش حـەقیان بەسـەر قیامەتمان و خزمەتی ئیمانیمانەوە نەبێت)[2].

---

(١) پێدەچێ کە ڕووداوێکی دروستکراو بووبێت لـە لایـەن حکوومـەتی مستەفا کەمالـەوە. گوایـا لـە مزگەوتێکی ناحیەی "مەنەمەن" بە سەرکردایەتیی کەسێکی شێت خەڵکەکە لە حکوومەت هەڵگەڕاونەتەوە! ئەمە کرا بە بیانوویەك بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دڕندانە دەست لە خەڵکی شارەکە بووەشێنن و هەست و نەستی ئیسلامیی موسڵمانانیش زامدار بکەن.

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٥٩-٥٦٠.

(پاشان دوای ئەوەی کە ساڵێك سزام چەشت لەسەر "پەيامی حيجاب" کە لە ژێر چەندين ليژنەدار و کەرەسەی سووتەمەنيدا دۆزیيانەوە و، ئەم ساڵ نووسراوەتەوە و بڵاوکراوەتەوە، دەيانەوێ جارێکی تر تاوانبارمان بکەنەوە لەسەری.

ئنجا کاتێ کە من بە چەند وشەيەکی توندوتيژ ڕەخنەی ڕاستەوخۆم ئاراستەی ئەو کەسە ناسراوە کرد کە سەرۆکايەتيی حکوومەتی لە ئەنقەرە گرتە دەست، خۆی هيچ کاردانەوەيەکی نەبوو بەرامبەرم، بەڵکو بێدەنگيی هەڵبژارد. کەچی لە دوای مردنی، ڕاستيی فەرموودەيەکی پيرۆز - کە من پێش چل ساڵ نووسيبووم - هەڵەکەی ئەوی دەرخست..

جا ئەو ڕاستیيە و، ئەو ڕەخنانەش کە سروشتی و پێويست بوون، ئێمە لە لايەنی خۆمانەوە بە نهێنی و تايبەت، نەك گشتی و ئاشکرا، هەڵمان گرتبوون. بەڵام داواکاری گشتی بە فێڵ شکاندیەوە بەسەر ئەو کەسەدا و بەرپرسیاریيەکەشی خستە ئەستۆی ئێمەوە.

ئيتر ئايا دادگەريی ياسا، کە ڕەمز و يادگاريی نەتەوەيە و يەکێکە لە درەوشانەوەکانی خوای گەورە، لە کوێ و.. خاتری کەسێکيش کە مرد و پەيوەنديی بە دەوڵەتەوە نەما، لە کوێ؟

پاشان ئازاديی ويژدان و بيروباوەڕ کە حکوومەت کردوويەتی بە بناغەی کارەکانی، ئێمە پاڵمان پێوە داوە و پشتمان پێ بەستووە و، هەر بەو ماددەيەش داکۆکيمان لە مافەکانمان کردووە، کەچی دادگا کردوويەتی بە مايەی بەرپرسياريی ئێمە، وەك بڵێی ئێمە دژی ئازاديی ويژدان و بيروباوەڕ بين.

لە پەيامێکی تردا ڕەخنەم لە لايەنە خراپ و ناتەواوەکانی شارستانێتيی ئێستا گرت، کەچی فايلی لێکۆڵينەوەکە شتێکی وای داوەتە پاڵم کە هەرگيز بە ئەندێشەمدا نەهاتووە و، منی وەکو کەسێك پيشان داوە کە بەکارهێنانی ڕاديۆ[1] و سواربوونی

(١) بە مەبەستی پێشکەش کردنی شوکرانەبژێری بۆ خوای گەورە لەسەر نيعمەتی ڕاديۆ، کە نيعمەتێکی گەورەی خواييە، وتم: "ئەو شوکرانەيە بە خوێندنی قورئانی پيرۆز دەبێ لە ڕاديۆدا، تاکو ئەو دەنگە زوڵاڵە بدات بە گوێی هەموو جيهاندا، بەمەش هەوا دەبێت بە خوێنەری قورئانی پيرۆز". (دانەر)

شەمەندەفەر و فڕۆکە ڕەت بکاتەوە و، دەیەوێ بەرپرسم بکات لەوەی کە دژی پێشکەوتنی شارستانێتیی سەردەم بم!

لە هەموو ئەوانە نامۆتر ئەوەیە: نیعمەتە مەزنەکانی فڕۆکە و شەمەندەفەر و ڕادیۆ، کە دەبوو شوکری خوای گەورەیان لەسەر پێشکەش بکرایە، کەچی مرۆڤەکان لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەوە شوکری خوایان نەکرد و، لە ئەنجامی ئەمەدا بۆمبای فڕۆکەکانیان بەسەردا باری!

ڕادیۆش نیعمەتێکی هێندە مەزنی خوای گەورەیە کە دەبێ شوکری ئەو نیعمەتە بەکارهێنانی بێت وەك ئامێرێکی قورئان خوێنی ئەوتۆ قورئان بە گوێی گرۆی ئادەمیزاددا بدات..

لە "وتەی بیستەم"دا وتم:

قورئانی پیرۆز هەواڵی لەبارەی کارە دەراساکانی شارستانێتیی نوێ داوە و، لەوێ لە دەمی باسکردنی ئاماژەیەکی قورئانی پیرۆزدا ڕوونمان کردەوە کە کافرەکان لە ڕێی "شەمەندەفەر"ەوە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا زاڵ دەبن.

جا لەو کاتەدا کە من موسڵمانان بۆ بەدەستهێنانی ئەم چەشنە داهاتووە نوێیانە هان دەدەم، کەچی داواکاری گشتیی چەند دادگایەکی پێشوو کردوونی بە مایەی تاوانبارکردنمان، وەك بڵێی من لە دژی ئەم داهێنانە نوێیانە بم.

ئنجا کەسێك وتی: پەیامەکانی نوور لە نووری قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە، واتە ئیلهامیان لەو وەرگرتووە و میراتگرێکە ئەرکی ڕیسالەت و شەریعەت ئەنجام دەدات. کەچی داواکاری گشتی واتایەکی تەواو هەڵەی لەو قسەیە دایەوە و شتێکی وت کە هەرگیز پەیوەندیی پێوە نییە، گوایا پەیامەکانی نوور "پێغەمبەرن"! ئەمەشیان کرد بە مایەی تاوانبار کردنمان!

لە بیست شوێنی بەرگرییەکەمان و بە چەندین بەڵگەی گومان بڕ چەسپاندمان کە ئێمە قورئان و پەیامەکانی نوور ناکەین بە ئامراز و هۆکار تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی سەرانسەری دنیاش. بەڵکو یەك دانە ڕاستیی ئەوان ناگۆڕینەوە بە هەموو دەستەڵاتی دنیا بە گشتی. لە ڕاستیشدا هەر وەهاین. هەزاران نیشانە لەسەر ئەم دەعوایەمان هەیە.

جا مادەم وایە، ئەوا بە هەموو توانایەکمان دەڵێین:

﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾![1].

(بەڕێزان! لە ئەنجامی چەند بەڵگە و نیشانەیەکی زۆرەوە قەناعەتی تەواوم بۆ دروست بووە کە هۆی ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەرمان ئەو بۆچوونە هەڵەیە نی‌یە کە گوایا ئێمە "هەست و نەستی ئایینی لە پێناوی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆدا بەکار دەهێنین"..

نەخێر، ئەو هێرشەی کە لە ژێر ئەو پەردە ساختە و ڕووکەشەدا دەکرێتە سەرمان تەنها لە پێناوی کوفر و ئیلحاددایە و، مەبەست لەناوبردنی ئیمانەکەمان و کۆتایی هێنانە بە هەوڵ و تەقالاکانمان و ڕێ گرتنە لە خزمەتەکانمان لە پێناوی ئەم ئیمانە و ڕاگیرکردنی ئاسایش و هێمنیی وڵاتدا. ئێمە گەلێ بەڵگەی زۆرمان لەسەر ئەمە بەدەستەوەیە. با تەنها یەك دانە لەو بەڵگانەتان پێش چاو بخەین:

بیست هەزار کەس لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا بیست هەزار نوسخەی پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە و بەو پەیامانە ڕازی بوون و قبووڵیان کردوون، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها یەك دانە ڕووداوی تێکدانی ئاسایش لە لایەن قوتابیانی نوورەوە لەم ماوە درێژخایەنەدا ڕووی نەداوە و، دەزگا ڕەسمی‌یەکان هیچ ڕووداوێکی لەم جۆرەیان لەسەر تۆمار نەکردوون، هەروەك دادگای پێشین و ئەم دادگایەی ئێستاش نەیانتوانی هیچ ڕووداوێکی لەم جۆرە بدۆزنەوە. لە کاتێکدا کە دەبوو ئەنجامی ئەم پروپاگەندە بەهێز و بەربڵاوە، نەك لە بیست ساڵدا، بەڵکو لە ماوەی بیست ڕۆژدا و لە شێوەی چەند ڕووداوێکدا دەربکەوتایە!

کەواتە یاسای ژمارە "١٦٣"[2] تەنها پەردەیەکی ساختە و درۆینەیە لە ڕووی سەربەستیی ویژدان و ئازادیی بیروباوەڕدا بەرز دەکرێتەوە و، یاسایەکی پلاستیکیی وایە

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٦٧-٥٦٩.

(٢) دەقی ئەم یاسایە بە ڕاشکاوی سزا لەسەر ئەو کەسە دادەنێت کە هەوڵ بدات دەوڵەتێکی ئایینی لە تورکیادا دابمەزرێنێت، یان هەست و نەستی ئایینی لەم پێناوەدا بەکار بهێنێت. هەر ئەم یاسایەشە کە تا ئێستا سەرجەمی حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا بۆ لێدانی کار و چالاکی‌یە ئیسلامی‌یەکان پشتی پێ دەبەستن. (وەرگێڕ)

کە هەموو ئاییندارێك و گشت ئامۆژگاران و بانگەوازکاران بگرێتەوە و، مولحیدانیش تەنها ئەوەندەیان دەوێت کە هەندێ بەرپرسی حکوومەت بخەڵەتێنن و، بۆ لێدانمان و شکست پێ هێنانمان بەکاریان بهێنن.

مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا بە هەموو هێزێکمانەوە دەنگی لێ هەڵدەبڕین و دەڵێین:

ئەی ئەو بەدبەختانەی کە بەربوونەتەوە بۆ ناو چاڵی قووڵی کوفری موتلەق! ئەی ئەوانەی کە ئایینەکەتان بە دنیاتان فرۆشتووە!

چیتان لەدەست دێت درێغی مەکەن! یاخوا ئاکامی دنیاکەتان هەر ناکامی بێت، هەروەك دەشبێت. بەڵام ئێمە ئامادەین سەری خۆمان لە پێناوی ئەو ڕاستی‌یە خاوێنەدا بەخت بکەین کە سەدان ملیۆن پاڵەوان سەری خۆیان لە پێناودا بەخت کردووە. بۆیە ئێمە ئامادەی پێشوازی لێکردنی هەموو جۆرە سزایەکتانین، تەنانەت ئامادەین بۆ بڕیاری لەسێدارەدانیش کە لە دژمان دەری بکەن.

حاڵی دەرەوەی بەندیخانەمان - لەم بارودۆخانەدا - سەد جار خراپترە لە حاڵمان لەناو بەندیخانەکاندا. ئیتر دوای ئەم ئیستیبدادە ڕەهایەی کە ئاراستەی ئێمە کراوە، هیچ جۆرە سەربەستی و ئازادی‌یەکمان بۆ نەماوەتەوە؛ نە ئازادیی زانستی، نە ئازادیی ویژدان، نە ئازادیی ئایین. واتە جگە لە "مردن" یان "چوونە بەندیخانە" هیچ ڕێگایەکی تر لە بەردەم ئەهلی شەهامەت و غیرەت و ئایین و پشتگیرانی ئازادی و خۆشەویستانیدا، نەماوەتەوە.

سەبارەت بە خۆیشمانەوە هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێت کە هانا تەنها بۆ پەروەردگار ببەین و پشتی پێ ببەستین و، بڵێین:

﴿إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾![1].

❑ (بۆ بەڕێز عەلی ڕەزا، سەرۆکی دادگا!

بۆ ئەوەی بتوانم داکۆکی لە مافەکانی خۆم بکەم، ئەوا تکا و داواکاری‌یەکی گەرمتان پێش چاو دەخەم:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٤٤-٤٤٦.

من پیتە نوێکان شارەزا نیم و لە پیتە کۆنەکانیشدا دەستخەتم باش نی‌یە، پاشان چاوپێکەوتنی کەسانی تریشیان لێ قەدەغە کردووم. واتە وەك ئەوە وام کە لە دابڕانێکی تەواوەتی یان زیندانی تاکەکەسیدا بم، بە ڕادەیەك کە کاتێ تۆمەتنامەی داواکاری گشتی‌یان دایە دەستم یەکسەر دوای چارەکە سەعاتێك لێیان سەندمەوە!

هەروەك لە رووی دارایی‌یەوە ناتوانم پارێزەرێك بگرم بۆ بەرگری کردن لە خۆم، دوای ماندووبوونێکی زۆریش ئنجا توانیم بەرگری‌یەکەی خۆمتان پێشکەش بکەم و، بە شێوەیەکی نهێنیش توانیم نوسخەیەکی ئەم بەرگری‌یەم دەست بکەوێتەوە کە بە پیتە نوێکان نووسراونەتەوە.

ئنجا پەیامی "بەری درەختی ئیمان"یشم، کە وەك بەرگری‌یەك وایە لە پەیامەکانی نوور و پوختەی رێبازی ئەو پەیامانە دەردەخات، نووسی‌یەوە تاکو پێشکەشی "داواکاری گشتی"ی بکەم و، یەك دوو نوسخەشی بۆ لایەنە رەسمی‌یەکانی ئەنقەرە بنێرم. بەڵام پەیامەکەیان لێ سەندم و نەیاندامەوە.

لە کاتێکدا کە لایەنە دادوەرەکانی "دادگای ئەسکی شەهر" ئامێرێکی چاپی دەستی‌یان بۆ ناردمە ناو بەندیخانە و، توانیمان لەو رێیەوە چەند نوسخەیەکی بەرگری‌یەکەم بە پیتە نوێکان بنووسینەوە، هەروەك دادگا خۆیشی ئەو بەرگری‌یەی نووسی‌یەوە)[1].

(ئەو پەنجانەی کە لە پشتی پەردەوە لەگەڵ پەیامەکانی نووردا دەجەنگن، چەند پەنجەیەکی بیانی و دەرەکین و، دەیانەوێت ئەو خۆشەویستی و برایەتی‌یە تێکبشکێنن کە لە دڵی جیهانی ئیسلامیدا هەیە بەرامبەر بەم نەتەوە و نیشتمانە، کە هەر تەنها ئەم خۆشەویستی و برایەتی‌یەشە بە گەورەترین هێزی ئەم نەتەوەیە دادەنرێت.

جا بۆ مەبەستی تێکشکاندنی ئەم برایەتی و خۆشەویستی‌یە و، گۆڕینی بە رق و نەفرەت، ئەوا چەند پەنجەیەك هەن کە لە پشتی پەردەوە هەوڵ دەدەن سیاسەت بقۆزنەوە و بیکەن بە ئامێر و هۆکارێك بۆ برەودان بە ئیلحاد و کوفری موتڵەق. بەمەش فێڵ لە حکومەت دەکەن و لە خشتەی دەبەن. هەر ئەو پەنجانەش بوون کە دووجار

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٤٦-٤٤٧.

سەریان لە دامەزراوەی "داد" شێواند و وتیان: قوتابیانی نوور ئایین لە پێناوی سیاسەتدا بەکار دەهێنن و، گریمانیش هەیە ئاسایشی وڵات لەمەوە زیانی پێ بگات)[1].

❐ (بەڕێز سەرۆکی دادگا!

هاودەم لەگەڵ ئەم نامەیەدا وێنەیەکی ئەو بەرگرییەم دەنێرم کە وەك عەرزو حاڵێك خستمە بەردەست سەرۆك کۆمار و لایەنە ڕەسمییەکانی ئەنقەرە، لەگەڵ ئەو وەڵامنامەیەدا کە سەرۆکایەتیی وەزارەت ناردیانەوە و مەودای قبووڵ کردن و بایەخدانیان بە عەرز و حاڵەکەم دەردەخات.

جا لەم بەرگرییەمدا ئەو وەڵامە بەهێزانەم نووسیوەتەوە کە بەرپەرچی بەیانە پڕ لە وەهم و تۆمەتە بێ بناغەکانی "داواکاری گشتی"م پێ داونەتەوە. هەروەك لە بەیانەکەی ئەم ئیددیعایەدا چەند گوفتارێك هەن کە لەسەر بناغەی مەزبەتە ڕووکەش و قین لەدڵانەکەی "پۆلیس" بنیات نراون و، پێچەوانەی ڕاپۆرتی خەبیرەکانن و، پێشتر ڕەخنەکانی خۆمم لەسەر پێشکەش کردوون، کە دەتوانرێت پوختەکەیان بەم جۆرەی خوارەوە بخرێتە ڕوو:

وەك زووتر بۆم باس کردن، کاتێ دادگای ئەسکی شەهر ویستی بەپێی ماددەی ژمارە "١٦٣" تاوانبارم بکات، پێم وتن:

"١٦٣ پەرلەمانتاری حکوومەتی کۆماری کە ژمارەیان دووسەد کەس بوو - واتە بە ژمارەی ماددەی ١٦٣ - ڕەزامەندییان بۆ تەرخان کردنی سەد و پەنجا هەزار لیرە نواند، بۆ مەبەستی دامەزراندنی زانکۆکەی شاری وان. جا ئەم ڕەزامەندییەی ئەوان و ئەو بایەخەش کە حکوومەتی کۆماری بەرامبەر بە من دەری بڕی، ئەو تۆمەتە دەسڕێتەوە کە بە پێی ماددەی ١٦٣ ئاراستەم کراوە"!

کاتێ ئەمەم بە دادگا وت، لیژنەی ئیستیشاریی ئەو دادگایە قسەکەی منیان گۆڕی، گوایا ١٦٣ پەرلەمانتار لێکۆڵینەوەیەکیان لەبارەی سەعیدەوە ئەنجام داوە و داوایان کردووە دادگایی بکرێت!

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٤٧.

بەم جۆرە و بە پشت بەستن بەم چەشنە تۆمەتە نارەوایانەی ئەو لیژنە ئیستیشاریەیە، داواکاری گشتی دەیەوێت بەرپرسیاریی ئەم تۆمەتانەمان بخاتە ئەستۆ، لە کاتێکدا ئەو دەستە و لیژنە تایبەتمەندەی کە لە ئاستێکی بەرزی زانستیدان و بە بڕیاری ئەنجومەنی پەرلەمان پێکهێنراوە و لێ وردبوونەوەی پەیامەکانی نووریان پێ سپێرراوە، بە یەکدەنگی ئەمەی خوارەوەیان دەربڕیوە کە:

"هەرچی سەعید و قوتابیانی نوور نووسیویانە هیچ بەڵگە و نیشانەیەکی ڕاشکاویان تێدا نییە سەبارەت بەوەی کە ئایین و موقەددەسات وەك ئامراز و ئامێرێك بۆ تێکدانی ئاسایشی دەوڵەت، یان هاندانی خەڵکی بۆ ئەم کارە بەکار بهێنرێن.

هەروەها هیچ نیشانەیەکیشیان تێدا نییە لەسەر هەوڵدان بۆ دامەزراندنی "کۆمەڵە"یەك، یان لەسەر بوونی هیچ نیاز و ئامانجێکی خراپ.

هەروەها لە نامە گۆڕینەوەکانی قوتابیانی نووردا هیچ نیازێکی خراپمان نەدی لە دژی حکوومەت، یاخود هیچ مەبەست و ئامانجێك بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەیەك، یان تەریقەتێکی سۆفی.

هەروەك بۆمان دەرکەوت کە ئەوان لە جموجوڵیاندا لەم چەشنە ڕوانینگە و بۆچوونەوە ناجووڵێنەوە".

هەر ئەم لیژنە و دەستە تایبەتمەندە، بە کۆی دەنگ، ئەمەی خوارەوەشیان ڕاگەیاند کە:

"لە سەدا نەوەدی پەیامەکانی نوور هێندەی سەرە پەنجەیەکیش لە بناغە و بنەماکانی ئایین و زانست و حەقیقەت لایان نەداوە و، بە ئیخلاس و بێگەردی و دوور لە هیچ ئامانجێك نووسراون.

زۆر ئاشکرایە کە ئەم پەیامانە نایانەوێت "ئایین" بۆ هیچ ئامانجێك بەکار بهێنن، یان "کۆمەڵە"یەك دروست بکەن، یاخود هەوڵی تێکدانی ئاسایشی دەوڵەت بدەن.

هەروەك نامەکانی نێوان قوتابیانی نوور و هی نێوان ئەوان و سەعیدی نوورسیش هەمان مۆرك و نیشانەیان پێوەیە و، جگە لە چەند نامەیەکی نهێنی - کە ژمارەیان لە دە نامەیەك تێپەڕ ناکات - لە بابەتی زانستی نادوێن و سکاڵا و ئازاریان لەخۆ گرتووە. ئیتر

هـەموو "پەیامـەکانی نـوور" یـان بـۆ تەفسیری ئایـەتێك، یـاخود ڕوونکردنــەوەی واتــای فەرموودەیەکی پیرۆز نووسراون.

هەروەك زۆربەی پەیامـەکانی نـوور ڕوونکردنەوەی ڕاستیيەکانی ئـایین و ئیمانیـان لـەخۆ گرتـووە و، لـە بـارەی عـەقیدەی بـاوەڕ بـە خــوا و پێغەمبــەران و ڕۆژی دواییــەوە دەدوێن.

پاشان بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیيانە بـە شـێوەیەکـی جـوانتر و باشـتر ڕوون بینـەوە، ئـەوا پـەیامەکانی نوور شـێوازی هێنانەوەی نموونە و چیرۆکیان گرتووەتەبەر.

ئنجا ڕای زانستیی خۆیان و ڕێنمـایی و ئامۆژگاریيە ڕەوشتیيەکانیان لـە نـاوەندی چەند ڕەفتـارێکی جـوان و چـەندین ئـەزموونی ژیـان و چـیرۆکی پڕ لـە پـەندا پێشـکەش کردووە و، هەرگیز ئەم پەیامانە شتێکی وەهایان تێدا نیيە کـە بگونجێ خـۆی لـە قـەرەی حکوومەت یان لایەنە ڕەسمیيەکان بدات".

لەبەر ئەوە، ئێمە لە ڕاستیدا زۆر دڵگرانین بەوەی کە داواکاری گشتی ڕاپۆرتـی ئـەم دەستە و لیژنە زانستیيە تایبەتمەند و بەرزە دەخاتە لاوە و، پشت بە ڕاپۆرتە کۆنە ناتـەواوە شپرز و شێواوەکە دەبەستێت و، پاشان تۆمەتە نامۆکانیان لەسەر بنیات دەنێت. بۆیە زۆر بە لامانەوە سروشتیيە کە ئەو کارە بە شایستەی شان و شـکۆی دادگـەریی ئـەم دادگایـە نەزانین کە متمانەمان بە دادگەری و ویژدانی هەیە.

داواکاری گشتی بە مەبەستی ئەوەی دەرفەتێك بدۆزێتـەوە بۆ تانـە و تەشـەرگرتن لـە وانە کۆمەڵایەتیيەکانی پەیامەکانی نوور، وتوویەتی:

"ویژدان لـە شوێنی ئاییندایە و، ئایین پەیوەندیی بە حوکم و یاساوە نیيە، چونکـە لـەو کاتانـەی پێشوودا کـە ئـایین پـەیوەندیی بـە حوکـم و یاسـاوە بـوو، فـەوزای کۆمەڵایـەتی سەری هەڵدا".

منیش دەڵێم:

ئایین تەنها بریتــی نیيـە لـە "ئیمـان". بـەڵکو "کـردەوەی چـاك"یش بەشـی دووهـەمی ئایینە. چونکە ئایا ترسان لـە بەندیخانـە و پۆلیسـی حکوومـەت دەسـتی تاوانبارەکـان لـەو تاوانانـەی چەشـنی کوشـتن و زینـا و دزی و قومـار دەگێڕێتـەوە کـە ژیــانی کۆمەڵایـەتی

ژاراوی دەکەن؟ ئایا هەر تەنها ئەم ترسە وایان لێ دەکات کە لەو تاوانانە دوور بکەونەوە.

خۆ ئەگەر وابێت ئەوا دەبێ پۆلیسێکی چاودێر بۆ هەموو کەسێك تەرخان بکەین تاکو دەروونە بێ ئاگا و خراپکارەکان لەم چەشنە کارە چەپەڵانە دوورەپەرێزی بکەن!

جا پەیامەکانی نوور لە ڕووی "کردەوەی چاك" و "ئیمان"ەوە چاودێرێکی مەعنەوی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دادەنێن. دیارە هەرکات مرۆڤ بیری لە بەندیخانەی دۆزەخ و خەشم و قینی خوای گەورە کردەوە، ئەوا دەتوانێت بە ئاسانی خۆی لە گوناهـ و کردەوەی خراپ بپارێزێت.

دوا وشەم:

﴿حَسْبُنَا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾!)[1].

* * *

(بەڕێزان!

بەڕێز سەرۆکی دادگا!

تکام وایە بێدار بینەوە و بە باشی تێبگەن لەوەی کە دەرکردنی هەر بڕیارێك بە سزادانی قوتابیانی نوور، تەنها خزمەتێکی ڕاستەوخۆیە بۆ کوفر و ئیلحاد و، تاوانبارکردنی ئەو ڕاستییانەی قورئان و ئیمانە کە هەموو ساڵێك بە درێژایی ماوەی هەزار و سێ سەد ساڵ سێ سەد ملیۆن موسڵمان لەبەر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانیاندا هەنگاویان ناوە.

واتە هەر بڕیارێك کە لەم ڕووەوە دەری بکەن بریتی دەبێت لە هەوڵێك بۆ داخستنی ئەو ڕاستە شەقامەی کە نزیکەی سێ سەد ملیار موسڵمان[2] دەگەیەنێتە ڕاستی و بەختەوەریی هەردوو دنیا..

کە ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی ڕەخنە و نەفرەتی هەموو ئەو ژمارە زۆرە ئاراستەی دەرکەرانی ئەو چەشنە بڕیارە بکرێت. چونکە دوا ڕێڕەوانی ئەم ڕاستە شەقامە هەمیشە

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٥٠-٤٥٤.

(٢) مەبەستی ژمارەی موسڵمانانە بە درێژایی سەردەمەکان.

دوعا بۆ پێشینەکانیان دەکەن و، بە دوعا و کردەوەی چاك یارمەتیی ئەوانەی پێش خۆیان دەدەن[1]. پاشان ئەو کەسانەی کە لە هەڵوێستی دوژمنایەتیدان بەرامبەر بە ئیمان، لە دواییدا دەبن بەهۆی ورووژاندن و نانەوەی کێشەیەکی گەلێ گەورە لەم نیشتمانەدا!!

جا ئەگەر لە ڕۆژی قیامەت و دادگای گەورەی ئەوێدا سێ سەد ملیار کەس لە دژتان ڕاوەستان و لێیان پرسین:

"بۆچی بوارتان بە نووسراوی ئیلحادی و ئەو جۆرە کتێبانە دا کە بە ڕاشکاوی هێرش دەکەنە سەر ئایینی ئیسلام، وەك کتێبی "مێژووی ئیسلام"ی دکتۆر دوزی[2] و، کتێبخانەکانتان لێ پڕ کردن و، بەوپەڕی ئازادی ڕێتان بە خوێندنەوەیان دا و، بواریشتان بۆ قوتابیانی ڕەخساند کە بەپێی یاساکانتان چەندین کۆمەڵە پێك بهێنن و، هەرگیز دەستتان نەهێنایە ڕێی ئیلحاد و شیوعی و فەوزا و ڕێکخراوە گێرەشێوێنە دێرینەکان و توورانیزمی ڕەگەزپەرستی، لە کاتێکدا کە نەیاری سیاسەتەکانتان بوون..

کەچی دەستتان هێنایە ڕێی کەسانێك کە هەر هیچ پەیوەندییەکیان بە سیاسەتەوە نەبووە و، تاقانە خەم و پەژارە و خەفەتیان گرتنەبەری ڕێی ڕاست و دروستی ئیمان و قورئانی پیرۆز بوو، لەوانەی کە پەیامەکانی نووریان دەخوێندەوە، کە چەند پەیامێکن لە حەق و ڕاستی دەدوێن، چونکە تەفسیری ڕاستیی قورئانی پیرۆزن.. ئەو پەیامانەشیان بۆیە دەخوێندەوە تاکو خۆیان و هاوولاتییان لە ئیعدامی هەتاهەتایی و زیندانی تەنیایی و تاکەکەسی ڕزگار بکەن و، لە هەمان کاتیشدا هیچ پەیوەندییەکیان بە هیچ

---

(١) چونکە فەزڵی خوای گەورە داخوازی ئەوە بووە کە بەهۆی پێشینانەوە وەچەکانی دوای خۆیان بە نیعمەتی ئیمان بەهرەمەند بن. بۆیە هەر کردەوەیەکی چاك کە لە لایەن پاشینانەوە ئەنجام بدرێت وێنەیەکیشی لە تۆماری کردەوە چاکەکانی پێشیناندا دەنووسرێت. هەر بۆیە قورئانی پیرۆز ڕێنماییمان دەکات کە هەردەم بڵێین: ﴿رَبَّنا اغْفِرْ لَنا وَلِإِخْوانِنا الَّذينَ سَبَقُونا بالإِيمانِ﴾ (الحشر: ١٠). (وەرگێڕ)

(٢) دکتۆر دوزی (١٨٢٠ - ١٨٨٣ز) ناوی: "ڕینهارد پیتەر ئان دوزی"یە و خۆرهەڵاتناسێکی پرۆتستانت مەزهەبی هۆڵەندیی بە ڕەچەڵەك فەرەنسییە و، لە شاری "لیدن" لە دایك بووە و مردووە. نزیکەی سی ساڵ لە زانکۆکانی ئەو شارەدا وانەی وتووەتەوە. ئەندامی چەند کۆڕێکی زانیاری بووە. لە پێشدا بایەخی بە زمانەکانی ئەورووپا دەدا و پاشان بە زمانی عەرەبی. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: "فەرهەنگی دوزی" لە دوو بەرگدا و، "مێژووی ئیسلام" لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ساڵی ١٨٦٣ز. ئەم کتێبە بە زمانی هۆڵەندی دانراوە و پاشان کراوە بە تورکی. بڕوانە: (الأعلام ٣/٣٨).

کۆمەڵەیەکی سیاسی‌یەوە نەبوو، بەڵام ئێوە بەو بیانووە دەستتان هێنایە ڕێیان کە پێتان وابوو هاوڕێ‌یەتی و برایەتیی نێوانیان لە پێناوی خوادا - کە دڵی ئەوانی پێکەوە گرێ دابوو - ئەنجامی پەیوەندی‌یان بێت بە کۆمەڵەیەکی تایبەتی‌یەوە و، لەسەر بناغەی ئەو گومانە تاوانبارتان کردن و بە یاسایەکی سەیر بڕیارتان لەسەر دەرکردن"؟!

گەر لە بەردەم ئەو دادگایەدا ئەم پرسیارەیان لێ کردن، ئێوە بە چی وەڵامیان دەدەنەوە؟ خۆ ئێمەش هەر هەمان پرسیارتان لێ دەکەین؟

ئەوانەی کە ئێوەیان لەخشتەبرد و، سەریان لە لایەنەکانی داد شێواند و، حکوومەتیشیان بە شتێکەوە سەرقاڵ کرد کە زیانی نەتەوە و نیشتمانی تێدایە، ئەو موڵحید و زەندیق و مونافیقانەن کە نەیاری ئێمەن.. هەر ئەوانەشن کە ئێوەیان خەڵەتاند و حکوومەتیشیان سەرقاڵ کرد کاتێ کە ناوی "کۆماری"یان لە ئیستیبدادی موتڵەق نا و، ناوی "ڕێسا"یان بۆ پاشگەزبوونەوەی ڕەها دانا و، ناوی "شارستانێتی"یان بۆ هەرزەیی تەواوەتی بەکارهێنا و، ناوی "یاسا"شیان بۆ ئەو کاروبارە کافرانە و هەڕەمەکی و خۆسەپێنانە دانا کە بە دەستی خۆیان دایان ناون. بەم کارەشیان ئازاری ئێمەیان دا و، تەنگیان پێ هەڵچنین و، لە پێناوی خزمەتکردندا بە بیانی‌یەکان مشتەکۆڵی توندیان ئاراستەی حوکمی ئیسلام و حوکمی نەتەوە کرد)[1].

(بەڕێزان!

لەبەر ئەوەی ناتوانم هیچ شتێك لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئێستاوە بزانم و، لەبەر ئەو ئاراستەیەش کە داواکاری گشتی پیایدا دەڕوات و، سووربوونتان لەسەر دەرکردنی بڕیارێك لەسەرم بە بیانووی تاوانبارکردن بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەك، لە کاتێکدا کە من وەڵامی ئەم تۆمەتەم دایەوە و بە چەند بەڵگەیەکی گومانبڕ پووچەڵم کردەوە و، ئەو لیژنە ئیستیشاری‌یەش کە لە ئەنقەرە لە زانایان و پسپۆڕان پێکهاتبوو بە هەمان جۆر و بە یەکدەنگی پووچەڵیان کردەوە.. ئەوا من سەرم لەم سووربوونەی ئێوە لەسەر دەرکردنی ئەو چەشنە بڕیارە سووڕماوە و لە بەرامبەر ئەمەشەوە ئەم واتایەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٥٤-٤٥٦.

مادەم هاوڕێیەتی و حەز و مەیلی کۆبوونەوەی برایانە و کۆمەڵەی قیامەتی‌یانە، یەکێکن لە بناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێداویستی‌یەکی سروشتیی مرۆڤن و، لە هەموو پەیوەندی‌یەکانی تریش گرنگترن، هەر لە ژیانی خێزان و خێڵ و عەشرەتەوە تا دەگاتە ژیانی نەتەوە و ژیانی ئیسلامی و ژیانی گرۆی مرۆڤ..

هەروەك خاڵێکی پاڵ پێوەدان و دڵدانەوەشە بۆ هەموو مرۆڤێك لە بەرامبەر ئەو سەختی و گیروگرفتانەی کە لەم گەردوونەدا دێنە ڕێی و بە تەنها خۆی ناتوانێت ڕووبەڕوویان ڕابووەستێت..

هەروەها بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو ئەو تەگەرە و بەربەستە ماددی و مەعنەوی‌یانەدا کە ڕێی ئەنجامدانی ئەرك و واجبە مرۆیی و ئیسلامی‌یەکانی لێ دەگرن..

لە کاتێکدا کە ئەو هاوڕێیەتی و برایەتی‌یەی قوتابیانی نوور لەسەری کۆدەبنەوە هیچ لایەنێکی سیاسی تێدا نی‌یە، بەڵکو برایەتی‌یەکی ڕاست و بێگەردە و هۆکارێکە بۆ دەستخستنی خێری دنیا و بەختەوەریی قیامەت. چونکە ئەوان لە وانەکانی ئیمان و قورئاندا لە ژێر سایەی هاوڕێیەتی‌یەکی خاوێن و بێگەردی ڕێگای حەقدا کۆدەبنەوە و، لە دژی هەموو ئەو شتانەی زیان بە نەتەوە و نیشتمان دەگەیەنن، پشتی یەکتر دەگرن..

لەبەر ئەوەی کە ئەوان لەم جۆرە بە یەك گەیشتنە ئیمانی‌یانەدا کۆ دەبنەوە، دەبوو گەلێ مایەی ڕێز و تەقدیر بوونایە..

بەڵام ئەو کەسەی کە واتای "کۆمەڵەی سیاسی" لەم کۆبوونەوانە دەداتەوە، یان ئەوەیە بە جۆرێکی گەورە و فراوان خەڵەتاوە.. یاخود ئاژاوەچی‌یەکی غەددارە و بە جۆرێکی وەحشیگەرانە دژایەتیی مرۆڤایەتی دەکات و، دوژمنایەتی‌یەکی نەمروودانەش بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام دەنوێنێت و، بە چەپەڵترین شێوازەکانی ئاژاوەچێتی دژایەتیی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکات! واتە بە وێنەی مورتەد و دوژمنە سەرسەختەکان لەگەڵ نیشتمان و نەتەوە و دەستەڵاتی ئیسلامی و موقەددەساتی ئایینیدا، دەجەنگێت..

یان زەندیقێکی سەرسەختە و بۆ حساب و بەرژەوەندیی بیانی‌یەکان کار دەکات و، دەیەوێت بۆریی خوێنبەری ژیانی ئەم نەتەوەیە بقرتێنێت و بیشێوێنێت و، لەم پێناوەدا

حکوومەت دەخەڵەتێنێت و لایەنەکانی دادگەری بە هەڵەدا دەبات، تاکو بتوانن ئەو چەکە مەعنەوییانەی کە ئێمە تا ئێستا لە دژی فیرعەونەکان و ئاژاوەچییەکان بەکارمان هێناون، لە دژی نیشتمانەکەمان بەکاریان بهێنن، یان بتوانن ئەو چەکانە تێکبشکێنن)[1]!

(بەڕێزان!

ڕێکخراوێکی پەنهان هەیە کە نزیکەی چل ساڵە لە پێناوی بیانییەکاندا و بە ناوی کوفر و ئیلحادەوە بۆ تێکدانی ئەم نەتەوەیە کار دەکات و، لە ڕێی هێرش کردنەوە بە هەموو هۆکار و شێوازێك بۆ سەر ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان، دەیەوێت ئەم نیشتمانە پارچە پارچە بکات.

جا ئەم دەستە تێکدەرە نهێنییە، چەند شکڵ و شێوەیەکی جیاجیا دەگرنە خۆیان)[2].

## چەند نموونەیەك لە نامەکانی بەندیخانەی "دەنیزلی"

☐ سوودەکانی هاتنمان بۆ بەندیخانە

(برا ئازیز و بەوەفاکانم!

بە هەموو هێز و توانایەکمەوە پیرۆزبایی شەوی پیرۆزی "قەدر"ی ڕابوردوو، هەروەها "جەژن"ی پیرۆزی داهاتووتان لێ دەکەم و، ئێوە بە میهرەبانی و یەکتایی خوای بەخشندەی میهرەبان دەسپێرم.

خۆ هەرچەندە پێم وایە کە ئێوە پێویستتان بە دڵدانەوە نییە، چونکە ناوەرۆکی: "مَن آمَنَ بالقَدَر أمِنَ مِنَ الْكَدَر" سەرووزیادتانە، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

بە بینینی یەقینی و بێ گومان ئەو دڵدانەوە تەواوەتییەم بینی کە واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیبەخشێت:

﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ (الطور:٤٨).

---

(١) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٥٧-٤٥٨.

(٢) تیشکەکان، تیشکی دوازدەهەم، ل: ٤٥٨-٤٥٩.

چونکە لەو کاتەدا کە بیرم لە بەسەربردنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەکردەوە بە حەوانەوە و دڵنیایی و لە بیربردنەوەی خەم و خەفەتی دنیا، کەچی تووشی ئەم ڕووداوە ترسناك و سەختە بووین کە لە خەیاڵماندا نەبوو. جا بە ئاشکرا دەبینم ئەم ڕووداوە سەرتاپا چاودێرییەکی خواییە بۆ من و بۆ پەیامەکانی نوور و بۆ ئێوە و بۆ مانگی ڕەمەزانەکەمان و بۆ برایانیشمان.

سەبارەت بە سوودە زۆرەکانیەوە کە تایبەتن بە خۆمەوە، وا تەنها چەند دانەیەکیان لێ باس دەکەین:

*یەکەمیان*: هانی دام لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا بە گەرموگوڕییەکی توندوتۆڵ و پەنابردنێکی بەهێز و لالانەوەیەکی ناسك و بەکوڵەوە لە هەوڵی بەردەوامدا بم و، خۆم بەسەر نەخۆشیدا زاڵ بکەم.

*دووهەمیان*: ئەمسالیش گەلێ حەزم لە بینین و نزیکیی یەك بە یەکتان بوو. بۆیە لە بەرامبەر چاوپێکەوتنی یەك کەسی ئێوە و هاتندا بۆ "ئیسپارتە" بەم گیروگرفت و ئازارانە ڕازی بووم.

*سێهەمیان*: سەرجەمی حاڵەتە ئازاربەخشەکان، چ لە قەستەمۆنی و چ لە ڕێگادا و چ لێرەدا و بە شێوەیەکی نائاسایی و چاوەڕوان نەکراو - بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووی من - کتوپڕ ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهات، بە ڕادەیەك کە دەستێکی چاودێریی پەروەردگار لە پشتی ڕووداوەکانەوە دەبینرێت. ئەمەش وامان لێ دەکات کە بڵێین: "الخير فيما اختاره الله".

ئنجا "پەیامەکانی نوور" - کە من هەمیشە بیرم بە لایانەوەیە - تەنانەت ئەو کەسانەشیان ناچاری خوێندنەوەیان کردووە کە نوقمی "بێ ئاگایی" بوون، لەوانەی کە چەندین کارمەندیی دنیایی بەرزیان لە ئەستۆدایە. ئەم پەیامانەش بەم کارەیان چەند گۆڕەپانێکی نوێی کارکردنیان لە چەندەها بواری تردا کردووەتەوە.

سەرباری ئازارەکانی خۆم، ئازار و پەژارەکانی هەموو یەکێکی ئێوەش کە لەسەر من کۆبوونەتەوە و، هەست و سۆزی زۆری من دەوروژێنێت بۆ ئێوە و، ڕووداوی ئەم موسیبەتەش لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا کە هەموو سەعاتێکی لە حوکمی سەد سەعات

پەرستشدایە.. ئەمانە هەموویان، کارێك دەکەن کە هەموو سەعاتێکی ئەو سەد سەعاتە پاداشتە وەك دە سەعاتی پەرستش وابێت و، بیانگەیەنێتە ئاستی پاداشتی هەزار سەعاتی پەرستش و بەندایەتی.

پاشان کەسانی دڵسۆز و خاوەن ئیخلاسی وەك ئێوە کە پەیامەکانی نووریان خوێندووەتەوە و بە ڕاستی لێیان تێگەیشتوون و، هەستیان بەوە کردووە کە دنیا فانی و ڕێبوارە و، تەنها شوێنێکی کاتی‌یە بۆ بازرگانیی دواڕۆژ و، هەرچی‌یەکیان هەیە لە پێناوی ئیمانەکەیان و دواڕۆژی خۆیاندا بەختیان کردووە و، لەو باوەڕەدان کە ئەو گیرو گرفتە کاتی و فانی‌یەی لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا دووچاری بوون، چەندین چێژ و لەزەت و سوودی بەردەوام و هەمیشەیی هەیە..

کەسانی وەك ئێوە، کە بەم جۆرە بیر دەکەنەوە و، سوودی ئاوا هەمیشەییان دەستگیر بووە، لە بریی گریانی سۆز و بەزەیی و ئازارچەشتن بۆ حاڵتان، شایانی ئەوەن پیرۆزباییتان پێشکەش بکرێت و ڕێزی شایان لە خۆڕاگریتان بگیرێت. بۆیە لە لایەن خۆمەوە وتم:

"الحمد لله على كل حال سوى الكفر والضلال".

لەگەڵ ئەم سوودانەی کە تایبەتن بە خۆمەوە، چەندین سوودی تریش هەن کە تایبەتن بە ئێوە و، برایانمان و، پەیامەکانی نوور و، ئەم مانگی ڕەمەزانە پیرۆزەمان. بە ڕادەیەك کە ئەگەر پەردەیان لەسەر لا بدرێت و بیانبینن ئەوا هانتان دەدەن کە بڵێن:

"شوکر و سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگار! چونکە بە ڕاستی ئەم قەزا و قەدەرەی هاتە ڕێمان، چاودێری‌یەکی خوای گەورەیە کە بۆ ئێمەی خستووەتە کار".

من لەمە دڵنیام و قەناعەتی تەواوم پێیەتی.

برایانم! هەرگیز گلەیی لەو کەسانە مەکەن کە هۆکاری ئەم ڕووداوە بوون. چونکە لە مێژە ئەم پیلانە فراوان و ترسناکە ساز کراوە، بەڵام تا ڕادەیەك بە سووکەڵە و ئاسانی هاتە ڕێمان. پشت بە خوا بە خێرایی دەڕوات و کۆتایی پێ دێت. کەواتە ئێوەش دڵگران مەبن، بەڵکو بە ڕێنمایی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەنگاو بنێن کە دەفەرموێت:

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦).[1].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٦٦-٤٦٨.

❏ کەمترین ماندووبوون لە پێناوی مەزنترین ئامانجدا

(لەگەڵ ئەوەدا کە جارێکی تر پیرۆزبایی جەژنتان ئاراستە دەکەم، دەشڵێم: خەفەتی ئەوە مەخۆن کە ئێمە بە ڕواڵەت چاومان بە یەکتر ناکەوێت، چونکە ئێمە لە ڕاستیدا هەمیشە بە یەکەوەین و، پشت بە خوا ئەم هاودەمی و بە یەکەوە بوونەشمان لە ڕێی هەتاهەتاییدا بەردەوام دەبێت.

من لەو قەناعەتەدام کە ئەو پاداشتە هەمیشەییانەی بە کارەکانتان لە پێناوی ئیماندا بەدەستی دەهێنن و، سەرجەمی ئەو تایبەتکاریی‌یە گیانی و شادمانیی‌یەی ناو دڵیشتان، گشت خەم و دڵتەنگیی‌یەکتان دەسڕێتەوە کە ئێستا بە شێوەیەکی کاتی دێنە ڕێتان.

بەڵێ، تا ئێستا جگە لە "قوتابیانی نوور" بۆ کەسی تر نەڕەخساوە کە لە پێناوی گەورەترین کاری پیرۆز و خاوێندا دووچاری کەمترین گیروگرفت و دەردیسەری بووبن.

بەڵێ، بەهەشت گرانە؛ بە هەرزان و ئاسانی دەست ناکەوێت. هەروەك ڕزگارکردنی ئیمانیش لە چنگی ئەو کوفرە موتڵەقەی کە هەردوو ژیانەکە پێکەوە لەناو دەبات، لەم کاتەدا لەڕادەبەدەر گرنگە.

تەنانەت گەر هەندێ گیروگرفتیش ڕوو بدات، دەبێ بە شەوق و شوکرانەبژێری و ئارامگرتنەوە ڕووبەڕووی ببینەوە. چونکە مادەم بەدیهێنەرەکەمان کە بۆ ئەم خزمەتە دەمانداتەبەر و تیایدا دەمانخاتە کار، میهرەبان و دانایە، ئەوا دەبێ بە خۆشحاڵی و ڕەزامەندیی‌یەوە پێشوازیی هەموو گیروگرفتێك بکەین کە بێتە ڕێمان و، پەنا بۆ میهرەبانیی‌یەکەی ئەو بەدیهێنەرە ببەین و، لە دانستەکەشی دڵنیا بین)[1].

❏ هۆکارەکانی دوژمنان بۆ پەرتەوازەکردنی برایان

(برا ئازیز و بەوەفاکانم!

خۆڕاگری و توندوتۆڵیی ئێوە، پشت بە خوا، هەموو فێڵ و پیلانێکی ماسۆنی و دووڕووەکان پووچەڵ دەکاتەوە و، هیچ ئەنجامێك بەدەست ناهێنن.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٧١.

بەڵێ برایانم! هیچ پێویست بە شاردنەوە و قسەی پەنامەکی ناکات. ئەو زەندیقانە، قوتابیان و پەیامەکانی نووریان وەك تەریقەتە سۆفی‌یەکان بە تایبەت تەریقەتی نەقشبەندی لێکدایەوە، ئەوەبوو بە خودی ئەو پلانانەی کە بە هۆیانەوە بەسەر شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفی‌یەکاندا زاڵ بوون، هێرشیان کردە سەر ئێمەش، بەو هیوایەی لە یەکمان داببڕن و لە شان و شکۆمان کەم بکەنەوە.

ئەوەبوو ئەم هۆکارانەی خوارەوەیان لە دژمان بەکار هێنا:

یەکەم: هۆکارەکانی ترساندن و، دوورخستنەوەی خەڵکی لێمان و، پێش چاو خستنی چەند کارێك کە بە خراپی لەو ڕێبازەدا بەکار هێنراوە.

دووهەم: جاڕدان و بڵاوکردنەوەی ناتەواوی و کەموکووڕی‌یەکانی ئەرکان و پەیوەندیدارانی ئەو ڕێبازە.

سێ‌هەم: ئەو هۆکارانەی کە لە دژی تەریقەتی نەقشبەندی و تەریقەتەکانی تر بەکاریان هێنا بریتین لە:

بڵاوکردنەوەی فەساد بەهۆی فەلسەفەی ماددی و.. پەرەدان بە هەرزەیی شارستانێتی‌یە لەخشتەبەرەکەی ئەو فەلسەفەیە و.. ئاسانکردنی دەستخستنی لەزەتە بەنجکەرە ژەهراوی‌یەکەی بۆ مەبەستی تێکشکاندنی پشتگیری و پەیوەندی‌یەکانی برایەتیی نێوانیان و.. شکاندن و داگرتنی شان و شکۆی مامۆستا و ڕابەرەکەیان بە سووکایەتی پێکردنی و.. شکاندنی بایەخ و گرنگیی ڕێبازەکەیان بە هێنانەوەی دەستوورەکانی زانست و فەلسەفە..

خۆ هەر خودی ئەم هۆکار و چەکانەن کە لە هێرش‌کردنیشیاندا بۆ سەر ئێمە بەکاریان دەهێنن!

بەڵام ئەوان خەڵەتاون و بە هەڵەدا چوون!

چونکە بناغەی ڕێبازی "پەیامەکانی نوور" بریتی‌یە لە:

"ئیخلاسی تەواوەتی" و.. وازهێنان لە "خۆپەرستی" و.. هەستکردن بە میهرەبانیی خواوەند لە سەختی و گەرماوگەرمی ئەنجامدانی کارەکاندا و.. گەڕان بە دوای چێژ و لەزەتە باقی‌یەکان لە ناوەندی ئازارە سەرپێیی و کاتی‌یەکاندا و.. دەرخستنی ئازارە

سەختەکان لە ناوەندی خودی لەزەتەکانی هەرزەییدا و.. ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە مایەی لەزەتی بێگەرد و نەبڕاوەی ئەم دنیایەش هەر "ئیمان"ە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم پەیامانە خەڵکی‌یان فێری ڕاستی‌یەکان کردووە و ئەو مەسەلانەیان تێگەیاندوون کە هیچ فەلسەفەیەك ناتوانێت بگاتە ئاستیان.

لەبەر ئەوە، هەموو ئاوات و پلانەکانیان، پشت بە خوا، پووچەڵ دەبێتەوە و، ڕووبەڕووی ئەم ڕاستی‌یە دەبنەوە کە: ڕێبازی پەیامەکانی نوور لەگەڵ تەریقەتە سۆفی‌یەکاندا قیاس ناکرێت. ئەو کاتەش لە هەوڵەکەیاندا ڕەنجەڕۆ دەبن)[1].

❑ لە لایەن نەوەی نوێ و ئەهلی حەقیقەتەوە پێشوازی دەکرێن

(ئەوانەی لەم دوو قوتابخانە یوسفی‌یە کۆن و نوێ‌یەدا تاقیکردنەوەی سەختیان بڕی و، لەرزەیان پێ نەکەوت و، وازیان لە وانەکانی ئیمان نەهێنا و، لە هیچ بارودۆخێکدا دەستیان لە سیفەتی قوتابی هەڵنەگرت و، ئەو هەموو هێرشە زۆر و زەبەندانەش کرایە سەریان ورەی ئەوانی نەڕووخاند..

ئەوانە، مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یەکان ڕێزیان لێ دەنێن و سڵاویان لێ دەکەن و بە پێشوازی‌یانەوە دەڕۆن، هەروەك لە لایەن حەقخوازان و بەرەی داهاتوویشەوە بە هەمان جۆر ڕێزیان لێ دەگیرێت. من زۆر قەناعەتم بەمە هەیە.

بەڵام گەلێ دڵگرانی ئەوەم کە بیمار و هەژارتان لە نێواندایە، جا با هەموو یەکێك لە ئێوە بۆ ئەوانە ببن بە پێشەنگی ئارامگر و ڕەوشت جوان و، لە ڕووی نەرمونیانی و پشتگیریی یەکتریشەوە ببن بە برای بەشەفقەتیان و، زیرەکانە لەگەڵیاندا بدوێن و، لە کاتی دەرسە ئیمانی‌یەکاندا وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە و، بەرامبەر بەوان وەك ئاوێنەیەکی بێگەرد وابن بۆ دانەوەی ڕەوشتە بەرز و جوانەکان..

جا کە ئەم کارانەتان ئەنجام دا، ئەوا دەبینن هەرچی ئێش و ئازاری گوشارەکانی بەندی هەن، تێکڕا پشتیان هەڵکردووە و پەستی و بێزاریتان هیچ نەماوە.

بەڵێ، من وا تەسەوور دەکەم و دڵی خۆمی پێ دەدەمەوە، ئەی ئەو برایانەی کە لە گیانی خۆم خۆشترم دەوێن!

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٧٧-٤٧٨.

ڕۆژێـك جـوبـبەکـەی "مـەولانـا خـالـيـد"تان[1] - قُدِّسَ سِرُّه - بـۆ دەنـێرم کـە تەمـەنی سەد و بيست سـاڵە. جـا هـەروەك ئـەو جوبـبەکـەی خـۆی لـەبـەر کـردم، منـيش لـە لايـەن خۆمەوە هەرکات بتانەوێت دەينێرم بۆتـان تـاکو هەريەکـەتان بـە نـاوی خۆيـەوە لـەبـەری بکات)[2].

❑ حيکمەتی قەدەری خوا لـە بەندکردنماندا

(برا ئـازيز و بـەوەفاکانم! حيکمـەتێکی دادگـەريی قـەدەری خـوا، کـە ئێمـەی بـەرەو قوتابخانەی يووسفيی دەنيزلی داوەتەبەر، بريتیيـە لـە پێويستيی بـەندکراوان و خـەڵکان و لەوانەشە بەرپرسەکان و کارمەندانی فەرمانگەی دادگـەری لـەم شـارەدا، بـە قوتابيـان و پەيامەکانی نوور زياتر لە هەموو شوێنێکی تر!

جا لەسەر بناغـەی ئـەم ڕاستیيە، ئێمـە بـە ئـەرکێکی ئيمـانی و قيامـەتی ڕۆشتينە نـاو تاقيکردنەوەيەکی گەلـێ قورسەوە. چونکە پێشتر لە بيست سی کەسدا مەگـەر يـەك دوو بەندکراو مافی تەواويان بە نوێژەکانيان بدايە و ڕوکنەکانی نوێژيان بە تـەواوی جێبـەجێ بکردايە..

بەڵام هەر هێندەی چل پەنجا کەس لە قوتابيانی نوور، کە هەر هـەموويان نوێژەکانيـان بـە تـەواوی ئـەدا دەکـەن، ڕۆشتنە نـاو بەنديخانەکـەوە، ئـەوا زمـانی حـاڵی نوێژەکانيـان وانەيەکی ڕەوان و ڕێنماييەکی کردەوەيی بوو بۆ بەندکراوان. کە ئەمەش دەبێت بـەهۆی

---

(١) (مەولانا خاليد): ناوی خاليد کوڕی ئەحمەدی کوڕی حسەينە و، لە تيرەی جافی ميکايلیيە و، لـە سـالی ١١٩٣ك لە شارۆچکەی قەرەداخی سەر بە پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان لـە دايك بووە و، لـە سالی ١٢٤٢ك لە شام بە نەخۆشيی تاعوون کۆچی دوايـی کـردووە. لـە زانسـت و تـەقوادا يەکـەمی چـەرخ و ڕۆژگـاری خـۆی بـووە و، تەريقـەتی نەقشبەنديشـی لـە شـێخ عـەبدوڵلای ديهلـەوی وەرگرتـووە. مـەولانا نوێکار(مجدد)ی سـەردەمی خـۆی بـووە و، فەڕ و بەرەکـەتی بانگەوازەکەی نەك تەنـها وڵاتی خۆمـان بـەڵکو هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـتی گرتبـووەوە. چـەندين زانـای گـەورە لـە خزمـەتيدا بڕوانامەی زانستیيان وەرگرتـووە و چەندەها ئـەوليـاش لەسـەر دەسـتيدا پێگەيشـتوون. ئـەم جوبـبەيـەش کـە لـێرەدا نـاوی هـاتووە لـە قوتابیيەکی مەولاناوە بە ميراتی بۆ "ئاسيا خـانم" ماوەتـەوە کـە ئـەويش لـە ڕێـی يـەکێك لـە قوتابيـانی نوورەوە ناردوويەتی بۆ مامۆستا نوورسی و، مامۆستاش تا کۆتايی تەمەنی خۆی پارێزگاريی لـێ کردووە. تا ئێستاش لە لايەن قوتابيانی مامۆستا نوورسیيەوە لە باکووری کوردستان پارێزراوە. (وەرگێڕ)

(٢) تيشکەکان، تيشکی سيازدەهەم، ل: ٤٨٠-٤٨١.

لابردنی ئەم بێزاری و تەنگانەیە لەسەر دڵیان، بەڵکو لەوانەیە خۆشەویستیشی بکات لە لایان.

جا هەروەك قوتابیانی نوور بە کردەوە و حاڵەتەکانی خۆیان خەڵکی بۆ لای ئەم ڕاستییە ڕێنمایی دەکەن، بە هەمان جۆر لە میهرەبانیی خواوەندیش ئومێدەوارین کە بەهۆی ئەو ئیمانە تەحقیقییەی لە دڵیاندایە بیانکات بە قەڵایەکی مەحکەم و قایمی ئەوتۆ کە ئەهلی ئیمان لە تیری شوبهە و گومانەکانی گومڕایان بپارێزن.

هیچ زیانێك لەوەدا نییە کە ئەهلی دنیا ڕێی تێکەڵاوی و گفتوگۆمان لەگەڵ خەڵکیدا پێ نادەن، چونکە زمانی حاڵ گەلێ ڕەوانتر و کاریگەرترە لە زمانی گوفتار.

جا مادەم ڕۆشتن بۆ ناو بەندیخانە لە پێناوی پەروەردەکردندایە، ئەوا گەر ئەوان بە ڕاستی نەتەوەیان خۆش دەوێت با ڕێ بە خەڵکانی بەندکراوی ناو بەندیخانەکە بدەن کە تێکەڵی و گفتوگۆ لەگەڵ قوتابیانی نووردا بکەن، تاکو لە ماوەی یەك مانگ بەڵکو یەك ڕۆژدا ئەو پەروەردە پێویستەیان دەست بکەوێت کە چاوەڕوان دەکرا بە ساڵێك زیاتر بەدەستی بهێنن. هەروەها تاکو ئەو بەندکراوانە ببن بە چەند کەسێکی سوودبەخش بۆ وڵات و هاوولاتییان و، دواڕۆژ و ئەودنیای خۆیشیان ڕزگار بکەن.

گەر پەیامی "ڕابەری لاوان"مان لە لا بوایە گەلێ سوودی دەگەیاند. لە خوا داواکارین هێنانی ئەو پەیامە بۆ ئێرە ئاسان بکات)[1].

☐ ئەگەر پەردەش لابدرێت!

(برا ئازیز و صیددیقەکانم!

ئەمڕۆ ئەو گفتوگۆیەم بیرکەوتەوە کە لە بارەیەوە ئاگادارن و، سەبارەت بە شێخی زیائەددین لە نێوان من و کاکە مەلا عەبدوڵلامدا ڕووی دا. پاشان بیرم لە ئێوە کردەوە و لە دڵی خۆمدا وتم:

لەم زەمانەدا کە بە دەگمەن یەکێك ببێت خۆی ڕابگرێت، کەسانی ئاوا هەبن تا ئەم پلە و ڕادەیە خۆیان ڕابگرن.. ئەو خاوەن تەقوا و دڵسۆز و موسڵمانە لێبڕاوانەی کە لە

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨١-٤٨٢.

گێژاوی ئەم بارودۆخە سووتێنەر و پڕ ئێش و ئازارانەدا لەرزەیان پێ نەکەوێت.. کەسانی ئاوا، گەر پەردەی غەیب لە سەریان هەڵبماڵرێت و هەریەکەیان لە پلەی ئەولیا پیاوچاکەکاندا، تەنانەت لە پلەی "قوتبییەت"یشدا دەربکەون، لە بەرچاوم ناگۆڕرێن و مەگەر کەمێك دەنا ئەو بایەخەی ئێستا پێیان دەدەم و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵیاندا هەمە نایگۆڕم. بە هەمان جۆریش گەر لە شێوەی کەسانی عەوامی ئاساییدا دەربکەون، هەر ئەو نرخ و پلە بەرزەی ئێستا پێمداون، کەمی ناکەمەوە.

وام بڕیار داوە. چونکە خزمەتگوزاریی ئیمان لەم چەشنە بارودۆخە سەخت و هەل و مەرجە قورسانەدا، لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە.

پلەوپایە کەسییەکان و ئەو تایبەتکارییانەی گومان باشی بە مرۆڤ دەبەخشن، لەم چەشنە بارودۆخە شڵەژاوەدا جێیان پێ لەق دەبێت و لەتوپەت دەبن، پاشان گومان باشییەکە و ئنجا خۆشەویستییەکەش لە شوێنی خۆیاندا کەم دەبنەوە. زیاد لەمانەش، ئەو خاوەن پلە و فەزڵ و چاکەیە خۆی بە ناچار دەزانێ تەکەللوف لە خۆی بکات و ویقاری خۆکرد بە زۆر لە بەرچاوی ئەواندا بنوێنێت.

کەواتە شوکرانەبژێریی بێ کۆتایی و نەبڕاوەمان بۆ خوای گەورە، کە ئێمە پێویستمان بەو چەشنە تەکەللوفە خۆکرد و دەست هەڵبەست و سارد و سڕانە نییە!)[1].

☐ ڕووناکییەکان لەمەولا دەدرەوشێنەوە

(برایانم!

هەرچەند ئەم بارودۆخەی بەندیخانە جۆرە مەترسییەکی لە لای لایەنگرانی حکوومەت و هەندێ کارمەندەوە بەرامبەر پەیامەکانی نوور پەیدا کردووە، بەڵام بایەخ و شەوقێکی بەرامبەر بەم پەیامانە لە لای هەموو نەیارەکان و ئاییندارا ن و کارمەندە پەیوەندیدارەکان وروژاندووە.

برایانم! خەم مەخۆن.. ئەو ڕووناکییانە لەمەولا پتر دەدرەوشێنەوە)[2].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٢-٤٨٣.

(٢) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٤.

□ شان بە شان هاوکاریی یەکتر بکەن

برا ئازیزەکانم!

ئەمڕۆ کە هەینی‌یە کاتێ ویردێکی گەورەم دەخوێند، ئێوەم بە دڵدا هات کە بە زمانی حاڵ دەتانوت: چی بکەین تاکو لەم بەڵایە ڕزگارمان بێت؟ یەکسەر ئەمەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

شان بە شان هاوکاریی یەکتر بکەن و دەست لەناو دەست پشتگیریی توندوتۆڵی خۆتان بپارێزن، چونکە دوورەپەرێزیی هەندێك لە هەندێکی تر و، خۆپارێزیی لە من و لە پەیامەکان و، ڕەتکردنەوەی نوورەکان و، مەرایی کردن بۆ ئەو هێزە پەنهانانەی کە دەیانەوێت گیانمان بکێشن، جگە لە زیان هیچ ئەنجامێکی تری نابێت.

برایانم! من دڵنیاتان دەکەمەوە کە ئەگەر بزانم "خۆبەری کردنتان لە من" دەربازتان دەکات لە بەڵا و گرفتەکان، بوارم پێ دەدان کە سووکایەتیم پێ بکەن و بە غەیبەتەوە ناوم بهێنن و، چاوپۆشیم لێ دەکردن. بەڵام ئەو هێزە پەنهانەی کە دەیەوێت بمانهارێت باش دەتانناسێت و، بەم چەشنە ڕەفتارانەی ئێوە ناخەڵەتێت، بگرە هەتا لاوازیتان و پاشەکشێتان لە مەیدانەکە ببینێت، پتر ئازا دەبێت لە هارینتاندا. پاشان ڕێبازی ئێمە هاوڕێیەتی و برایەتی‌یە و، ڕێی خۆویستی و خۆپەسەندی و حەسوودیی تێدا نی‌یە. کەواتە دەبێت بڕواننە تایبەتمەندی‌یەکانی پەیامەکانی نوور، نەك ناتەواوی و کەموکووڕی‌یە زۆرەکانی کەسێکی لاوازی وەکو من[1].

□ هاونشینیی برایان

(بەیەك گەیشتنی برادەران و دانیشتن لەگەڵ برایاندا سەرچاوەیەکی فراوان و بەپیتی دڵنەواییە بۆ مرۆڤ بەرامبەر بەو دەردیسەری‌یانەی دووچاریان دەبێت لە ئەنجامی خێراییی ئاڵوگۆڕ و، لەناوچوون و خراپیی دنیا و، بەسەرچوونی خۆشی و تام و لەزەتە کاتی و بێ سوودەکانی و، زللەکانی جودایی و لێکدابڕان کە لە مرۆڤیان دەسرەوێنێت.

بەڵێ، لەوانەیە یەکێك ماوەی بیست ڕۆژ ڕێ ببڕێت و، سەد لیرە خەرج بکات لە پێناوی دیدارێکی چەند سەعاتەی برایەکی.

(١) Tarihce-i Hayat, Denizli Hayati.

جا ئەو گیروگرفتانەی دووچاریان بووین و زایەبوونی سامانەکانمان لەم سەردەمەدا کە برادەری ڕاستەقینەی بە دەگمەن تێدا دەست دەکەوێت، بایەخێکی ئەوتۆیان نییە لەچاو ئەوەی کە بە یەك جار چل یان پەنجا برادەری ڕاست و برای دڵسۆز و موخلیس بۆ ماوەی دوو مانگ یەکتر ببینن و لە پێناوی خوای گەورەدا پێکەوە دابنیشن و گفتوگۆ بکەن و دڵی یەکتری بدەنەوە.

من خۆم بەم هەموو گیروگرفتانە ڕازی دەبووم، بە ئومێدی ئەوەی تەنها یەك کەس لەو برایانەم ببینم کە دە ساڵ دەبوو نەم بینیبوون.

بزانن کە "سکاڵاکردن" ڕەخنەگرتنە لە قەدەر و، "شوکرانە"ش ڕازی بوونە پێی!)[1].

❑ دووچەندانە بوونی پاداشت

(برا بەوەفا و ڕاست و ئازیزەکانم!

مادەم بە نیازی دەستکەوتنی پاداشتی دوارۆژ و ئەنجامدانی جۆرە پەرستنێکی تایبەتی، پەیوەندیتان بە پەیامەکانی نوورەوە کردووە -کە پەیامی دوارۆژ و ئیمانن- ئەوا بێ هیچ گومانێك هەموو یەکێك لە سەعاتەکانی تەمەنتان لەم بار و دۆخ و هەل و مەرجە سەخت و قورسانەی ئێستادا لە حوکمی بیست سەعات خواپەرستیدایە و، بیست سەعاتی کارگوزاریی خزمەتی ئیمان و قورئانیش، لەبەر ئەوەی بە جیهادێکی مەعنەوی دادەنرێت، بایەخ و گرنگیی سەد سەعاتی هەیە و، سەد سەعاتیش کە لە چاوپێکەوتن و بە یەك گەیشتنی چەندین موجاهیدی ڕاستەقینە و چەند برایەکی باشدا بەسەر ببرێت، کە هەریەکەیان بەرامبەر سەد کەسن و.. بەستنی پەیوەندیی برایانە لەگەڵیاندا و.. یارمەتیدانیان بە هێزی مەعنەوی و.. یارمەتی لێ وەرگرتنیان و.. دڵدانەوەی ئەوان و دڵی خۆدانەوەش پێیان و.. بەردەوامیی دامەزراویی تەواوەتی و پەیوەندیی ڕاستەقینە لەگەڵیاندا بۆ مەبەستی خزمەتگوزاریی ئیمان و.. سوود وەرگرتن و بەهرەوەر بوون لە ڕەفتار و ڕەوشتە بەرزەکانیان و.. بەدەستهێنانی شایستەیی قوتابی بوون لە قوتابخانەی زەهرائدا، کە ئەویش بەوە دەبێ مرۆڤ بێتە ناو ئەم کۆڕی ئیمتیحانە لەم قوتابخانە

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٦.

یووسفی‌یەدا و.. وەرگرتنی ئەو ڕۆزی‌یەش کە قەدەر بۆ هەر یەکەیانی نووسیوە، بە نیازی پاداشت وەرگرتن..

هەموو ئەمانەی باس کران، داخوازی ئەوەن پڕ بە دڵ شوکرانەبژێری خوای گەورە بن کە ئێوەی گەیاندووەتە ئێرە و، پێویستە هاودەم لەگەڵ بیرکردنەوە لەو سوودانەی باس کران، لە بەرامبەر هەموو گیروگرفت و تەنگانەکانەوە بەئارام و خۆڕاگر بن)[1].

☐ بەردەوام دوعای زۆر بکەن

(برا ئازیز و ڕاست و بەوەفا و دامەزراوەکانم!

وا حاڵەتێکی خۆمتان بۆ ڕوون دەکەمەوە، نەك بۆ ئەوەی خەمم بۆ بخۆن، یان هەوڵی ئەنجامدانی حەزەر و پێداویستیی ماددی بدەن، بەڵکو بۆ ئەوەی سوود لە زیادبوونی دوعاکانتان وەربگرم بەپێی دەستووری "یەکخستنی هەوڵ و کۆششە مەعنەوی‌یەکان".. هەروەها بۆ پەرەپێدانی خۆڕاگری و حەزەر کردن و سەبر و ئارامگرتن و پاراستنی پەیوەندی‌یە توندوتۆڵەکەی نێوانتان.

ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی لێرەدا بە ماوەی یەك ڕۆژ گیرۆدەی دەبم بە یەك مانگی ڕەبەق لە بەندیخانەی ئەسکی شەهردا دووچاری نەدەبووم. چونکە ماسۆنی‌یە سامناکەکان کەسێکی ماسۆنیی ستەمکاریان بە سەرمدا زاڵ کردووە، تاکو تووڕەیی و توندوتیژیی لەڕادەبەدەرم لە بەرامبەر ئەشکەنجە و ئازارەکانیانەوە هانم بدات بڵێم: "ئیتر ئەم سزایە تا ئەم ڕادەیە بەسە". ئەم قسەیەشم بکەن بە هۆکارێك و بیقۆزنەوە بۆ دەستدرێژیی ستەمکارانە و، درۆ و دەلەسەکانیانی لە ژێردا بشارنەوە.

من بە شوکرانەبژێری‌یەوە ئارام دەگرم و ئەم ئارامگرتنەشم بە ئاسەوارێکی دەراسای چاکەکاریی خوای گەورە دادەنێم و، بڕیارم داوە کە لەسەر ئەم شوکرانە و ئارامگرتنە هەر بەردەوام بم.

مادەم ملمان بۆ قەدەری خوای گەورە کەچ کردووە و، ئەم تەنگانانەش کە هەستیان پێ دەکەین هۆن بۆ دەستکەوتنی پاداشتی زۆر و گەورەتر، بەپێی ناوەرۆکی دەستووری: "خير الامور أحمزها" واتە: " باشترین کار بەهێزترینیانە ".

لەبەر ئەوە و لەم ڕووەوە، ئەو تەنگانانە بە نیعمەتێکی مەعنەویی دادەنێین.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٦-٤٨٧.

پاشان زۆربەی جار بەڵا و موسیبەتەکانی دنیای فانی، بە خێر و خۆشی کۆتاییـان پـێ دێت. ئێمەش بەوپەڕی دڵنیاییەوە قەناعەتمان هەیە کە ژیانی خۆمان بۆ ڕاستی‌یەکی مەزنی لە ڕۆژ ڕووناکتر و، لە بەهەشت جوانتر و، بـەتامیش چەشـنی "بەختـەوەریی هەمیشـەیی" بەخت کردووە..

لەبەر ئەوە، نابـێ – هـەرگیزاو هـەرگیز – سـکاڵامان لـە زار دەربچێـت، بەڵکو ئـەم حاڵەتە سەختانە هانمان دەدەن کە بڵێین:

ئێمـە لـە جیـهادێکی مەعنـەویداین کـە مایـەی شـانازیمانە و.. شـوکرانەبژێری پەروەردگاری بەڕێزمانین کە بە فەزڵی خۆی ئەو نیعمەتەی پێ بەخشیوین)[1].

□ خۆپارێزی

(برایانی ڕاستگۆ و ئازیزم!

من زۆر بەختەوەرم و، شوکر و سوپاسی خوا دەکەم کە لە نزیکـی ئێـوە و لـەناو یـەك تەلاری بەندیخانەدام، هەرچەندەش ڕووبەڕوو ناتانبینم.

هەندێ جار، بە بێ هیچ ویست و ئیختیارێکی خۆم، ئەوەم بە بیردا دێـت کـە چـەند حەزەر و خۆپاراستنێکی پێویست ڕەچاو بکەین.

بۆ نموونـە: ماسۆنی‌یەکان بـەندکراوێکی جاسـووس و درۆزنیـان نـاردووە بـۆ نـاو زیندانەکەی تەنیشتمان!

جا لـەبەر ئەوەی ڕووخاندن و کاولکاری گەلـێ ئاسـانە، بە تایبـەت لـەو جـۆرە لاوە هەڵەشـە و سـەرەڕۆیانەدا، ئەوا لە ڕێی ئەو ئازارە سـەختەوە کە ئـەو نـاوبراوە دەیهێنێتـە ڕێـم و خراپکـاریی لـە نێـوان لاوەکـاندا بـڵاو دەکاتـەوە، تێگەیشـتم کـە زەندیقـەکان لـە بەرامبـەر ئـەو ڕێنمـایی و چاکسـازی‌یەی ئێـوە ئـەنجامی دەدەن، هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی فەساد و ڕووخاندنی ڕەوشت و ڕەفتارە جوانەکان دەدەن.

دەسا برایانم! لە بەرامبەر ئەم بارودۆخەوە، حەزەر و خۆپاراستنی لەڕادەبەدەر تـابڵێی پێویستە و، دەبێ تا لە توانادایە هەستی بێزاری بەرامبەر بەندکراوانی پێشوو دەرنـەبڕن و، بوار بەوە نەدەن کە لە ئێوە بێزار بن. هەروەها نەیـەڵن دووبـەرەکی و جیاوازیتـان بخرێتـە نێوانەوە، هاودەم لەگەڵ ئارامگرتن و زاڵبوون بەسەر خۆدا.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٨٨.

هەروەها پێویستە برایانمان بە دەرخستنی قوربانی و فیداکاری و وازهێنان لە خۆپەرستی و نواندنی خۆنەویستی، تا دەتوانن پاریزگاریی هێزی برایەتی و پشتگیریی یەکتر بکەن.

سەرقاڵ بوون بە کاروباری دنیا ئازارم دەدات. لەبەر ئەوە، پشت بە وریایی و زیرەکیتان دەبەستم، چونکە من ئەگەر ناچار نەبم ناتوانم ڕوو لەو کاروبارانە بکەم)[1].

❑ لە بەردەم گرفتەکاندا خۆڕاگر دەبین

(برایانم!

ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەك، کە ئەم بەیانی‌یە بە دڵمدا هاتووە، بۆ ڕوودانی هەموو گریمانێك زۆر زۆر پێویستە..

وا ماوەی بیست ساڵە نەفس و شەیتانەکەم گەلێ جار ئەو ڕاستی‌یانە دەپشکنن کە ئێمە لە قورئانی پیرۆزەوە دەرمانهێناون و، بە وێنەی خۆر و ڕۆژی ڕووناك هیچ دوودڵی و گومانێك هەڵناگرن. ئەو دووانە دەڵێن:

"ڕای فەیلەسووفە زەندیقەکان بەرامبەر بەمە چی‌یە و پاڵپشتیان دەبێت چی بێت"؟!

جا دوای ئەوەی کە نەفس و شەیتانەکەم هیچ کەلێن و ناتەواوی‌یەکیان لەو ڕاستی‌یانەدا نەدۆزی‌یەوە، بێ دەنگ بوون.

لەو باوەڕەشدام کە ئەو ڕاستی‌یەی نەفس و شەیتانی یەکجار هەستیاری منیان بێدەنگ کرد، کە پێکەوە کار دەکەن، دەتوانێت سەرسەخت‌ترین کەسی ملنەدەریش ناچاری بێ دەنگ بوون بکات.

مادەم ئێمە لە پێناوی حەقیقەتێکدا تێدەکۆشین کە یەکێکە لە ڕاستی‌یە گرنگەکان و لە هەموو‌شیان چەسپاوترە و زیاتر ڕەگی داکوتاوە و، بە هیچ نرخێکی ماددی - هەرچی‌یەك بێت - هەڵناسەنگێنرێت و، خود و گیان و هاوڕێ و خۆشەویست، تەنانەت هەموو دنیاش، لە پێناوی هاتنەدیی ئەو ڕاستی‌یەدا شایانی بەخت کردنن..

ئەوا دەبێ بەوپەڕی خۆڕاگری و ئارامەوە لە بەرامبەر هەموو بەڵا و مەینەتی‌یەك بێتە ڕێمان، خۆمان ڕابگرین و بە سنگی فراوانەوە بەرەنگاری هەموو گوشارێکی دوژمنان

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٩٣.

بینەوە. چونکە لەوانەیە و زۆریش نزیکە هەندێ لەو شێخ و زانایانەی کە بە ڕواڵەت تەقوایان هەیە، بۆ خۆیان خەڵەتابن، یاخود بە هاندانی کەسانی تر خەڵەتێنرابن و، لە دژمان بخرێنە کار ..

جا لە هەڵویستێکی ئاوادا، دەبێ پارێزگاریی خزمەتگوزاری و پشتگیری‌یەکانی نێوانمان بکەین و، کاتەکانمان لە وتوویژ و موناقەشەی بێ سوود و بەتاڵدا بەفیڕۆ نەدەین)[1].

❑ دوایادگاریی دەنیزلی

هەرچەند بڕیاری بێ تاوانیی مامۆستا وقوتابیانی و، گێڕانەوەی کتێبە دەست بەسەرداگیراوەکان بۆ خاوەنەکانیان، لە لایەن دادگای دەنیزلی‌یەوە دەرچوو[2]، کەچی مامۆستا نوورسی ڕێی نەدرا سەفەر بکات، هەتا فەرمان لە ئەنقەرەوە دەگات! ئیتر لەم ماوەیەدا و بۆ نزیکی دوو مانگ لە ئوتێل "شەهر"ی دەنیزلی مایەوە. بەڵام برایانی لە قوتابیانی نوور هەریەکەیان ڕۆشتەوە بۆ شارەکەی خۆی[3].

(ڕۆژێکیان، دوای بەربوونمان لە بەندیخانەی "دەنیزلی" لە نهۆمی سەرەوەی ئوتێلی "شەهر"دا دانیشتبووم و سەرنجی ئەو دار چنارە زۆرانەم دەدا کە لەناو باخچە و بێستانە دڵڕفێنەکانی دەوروبەرمدا بوون. بینیم ئەو درەختانە بەو جموجووڵ و لەنجە و لارەی کە لە بنکەوە هەتا لق و پەلەکانیان دەیاننواند، دڵخۆش دیارن و هەر کە بە ئاستەم سروەیەکیان بەردەکەوێت، یەکسەر گەڵاکانیان دەلەرێنەوە. بەم جۆرە ئەو درەختانەم لە جوانترین و شیرینترین شێوەدا هاتە پێش چاو، وەك ئەوەی لە ئەڵقەی زیکر و تەهلیلەدا خەریکی تەسبیحاتی خواوەند بن.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی سیازدەهەم، ل: ٤٩٣-٤٩٤.

(٢) دادگا بە کۆی دەنگ بە بڕیاری ژمارە (١٣٦/١٩٩) لە بەرواری (١٩٤٤/٦/١٥ز) بڕیاری بێ تاوانیی بۆ مامۆستا و قوتابیانی دەرکرد، لەگەڵ گێڕانەوەی سەرجەم کتێبە دەست بەسەردا گیراوەکان. بەڵام بڕیاری پشت ڕاستکردنەوەی دادگای تەمییز بۆ بڕیارەکەی دادگای دەنیزلی سەبارەت بە بێ تاوانی‌یان بە ژمارە (٣٠٠٠٥/٢١٩٣) لە بەرواری (١٩٤٤/١٢/٣٠ز) و لە ژێر ژمارەی (٢٠١٩)دا بوو. ئیتر بەپێی ئەم بڕیارە، مەسەلەی پەیامەکانی نوور بوو بە کێشەیەکی بڕیار لەسەر دراو.

(٣) Tarihce-i Hayat, Denizli Hayati.

ئەم جموجوولە ناسکانە، دەستکاریی ژێیەکانی دڵیان کردم، لەو کاتەدا کە دڵم لە پەژارەی جودایی خۆشەویستانمدا بوو، هەروەك خۆیشم لە خەمی ئەوەدا بووم کە بە تەنها مابوومەوە. کتوپڕ لەم کاتەدا دوو وەرزەکەی پایز و زستانم بە دڵدا هات و بێ ئاگایی سەری تێکردم، چونکە لەو دوو وەرزەدا گەڵاکان هەڵدەوەرێن و جوانییان نامێنێت. لەمەوە خەم و خەفەتی زۆرم خوارد بۆ ئەو دار چنارە جوانانە و هەموو زیندەوەران، کە ئێستا ئەو زەوق و خۆشی و شادییەیان تێدا دەردەکەوێت پاشان لەو دوو وەرزەدا ئاوایان بەسەر دێت!

بەڵێ، گەلێ خەفەت و ئازارم چەشت و، هێندە پەژارەی ئەوتۆشم لەسەر کۆبوونەوە، کە لە نەمان و جودابییەوە پەیدا بوون و ئەم پەردە ڕازێنراوە جوانەی بوونەوەریان پڕکردووە، کە بە جارێ هەردوو چاوم نوقمی فرمێسك بوون.

لەم کاتەدا کە من لەم بارە پەرێشان و خەم و پەژارەیەدا بووم، لە پڕ نووری حەقیقەتی محەممەدی ﷺ هەروەك بە هانای هەموو ئیماندارێکەوە دێت، بە هانای منیشەوە هات و، یەکسەر ئەو خەم و خەفەتە لە سنوور بەدەرانەی نەهێشت و هەموویانی گۆڕی بە چەندین شادمانی و دڵخۆشیی لەڕادەبەدەر، ئیتر وام لێ هات کە بە هەمیشە و بەردەوامی لە ڕەزامەندی و سوپاسگوزاریی ئەو حەقیقەتی محەممەدییەدا بم، کە تەنها یەك بەش لە بەشە زۆرەکانی لێشاوی نوورە لە سنوور و ڕادەبەدەرەکەی، منی ڕزگار کرد و لە هەموو سووچێکی دەروون و ناخی ویژدانمدا دڵنەوایی بڵاوکردەوە)[١].

وێڕای بڕیاری بێ تاوانی و پشت ڕاستکردنەوەی ئەو بڕیارەش لە لایەن دادگای تەمییزەوە، کەچی لە ئەنقەرەوە فەرمان هات بە دوورخستنەوەی بۆ قەزای "ئەمیرداغ"! ئەویش مانگی هەشتی ساڵی (١٩٤٤ز) ڕۆیشت بۆ ئەوێ و، ماوەی دوو هەفتە لە ئوتێلێکدا مایەوە، هەتا ژوورێکیان بۆ گرت بە کرێ کە خۆی کرێکەی دەدا[٢].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٤٢١.

(٢) Tarihce-i Hayat, Denizli Hayati.

## بەندی هەشتەم

## لە تاراوگەی ئەمیرداغ

### (سێ‌هەم قوتابخانەی نوور)

### ١٩٤٤/٨/١-١٩٤٨/١/٢٣ز

☐ دوورخستنەوەیەکی تر!

(ئەو کاتەی کە لە ژوورێکی شارۆچکەی "ئەمیرداغ"[1]دا لـە نیشتەجێی زۆرەملێدا دەژیـام، چاودێرەکـانی لایـەنی دەسـتەڵاتدار گوشـاریان لەسـەر دانـابووم و، هـەموو هەڵسوکەوتێکم هـەنگاو بـە هـەنگاو لەسـەر تۆمـار دەکـرا. ئەمـەش گەلـێ ئـازاری دەرخوارد دەدام، بە ڕادەیـەك کـە ژیـانیشـم لـە پێش چـاو کـەوت و، پێـم نـاخـۆش بـوو کە لـە بەندیخانە دەرچووبووم و، پڕ بـەدڵ حـەزم دەکـرد بگێڕنـەوە بـۆ بەندیخانەکـەی "دەنیزلی" یاخود بمرم و بڕۆمە ناو گۆڕەکەمەوە، چونکە بەندیخانە و گۆڕ لەچاو ژیـانێکی وادا گەلـێ باشترن)[2].

[ تەنانەت بۆ بەرپرسانی ئەنقەرەی نووسی ]:

(ئەگەر "حاکم" و "موددەعی" هەر یەك کەس بن، دەبێ سکاڵا بۆ لای کێ بـبرێت؟! زۆر لە مێژە سەرم لەم کێشەیە سووڕماوە!

بەڵێ، حالی ئێستام کە لـە بەندیخانە بەردراوم و چاودێریم لەسـەر دانـراوە، زۆر بەلامەوە دژوارترە لەو ڕۆژگارانەی کە لە بەندیخانەدا بووم! چونکە تەنها یەك ڕۆژی ئـەم جۆرە ژیانە لە مانگێکی تەواوەتیی ئەو زیندانە تاکەکەسی‌یە زیاتر ئازارم دەدات..

---

(١) ئەمیرداغ شارۆچکەیەکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەنادۆڵەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥١٢.

ئەوەتا سەرباری پیری و لاوازیم، لەم زستانە سەختەدا هەموو شتێکم لێ قەدەغە کراوە و، مەگەر منالێك، یان کەسێکی نەخۆش دەنا چاوم بە هیچ کەسێك ناکەوێت. جگە لەوەی کە وا ماوەی بیست ساڵیشە بە بەندی و زیندانی تاکەکەسی دووچار و گیرۆدە کراوم.

گوشار و چاودێری دانانی زیاتر لەسەرم و، دابڕ کردنم لە خەڵکی زیاد لەم ڕادەیە، غیرەتی خوای گەورە دەورووژێنێت و، ئەنجامەکەشی ترسناك دەبێت!

من دەڵێم:

گرنگترین ئەرکی ئەم حکومەتە - بە کاربەدەستانی داد و بەرپرسانی ئاسایشیەوە - کە ڕەفتارێکی مرۆڤانە و بەویژدانم لەگەڵ دەنوێنن، بریتی‌یە لەوەی بە تەواوی پارێزگاریم لێ بکات. چونکە حکوومەت و سێ "دادگای عەدلی" دوای لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەیان بۆ ماوەی نۆ مانگ لەسەر ئەو کتێب و نامانەم کە لە ماوەی بیست ساڵدا نووسیومن و دامناون، بڕیاری بێ تاوانی و ئازادی‌یان بۆ دەرکردین..

بەڵام ئەو ڕێکخراوە نهێنی‌یەی کە بە دزی و پەنامەکی هەوڵ و تەقالا بۆ خزمەتی بیانی‌یەکان دەدات، دوودڵی و گومانی خستووەتە دڵی هەندێ لە کارمەندان و، دەنگەکێکی لە بەرچاویاندا هێندەی گومەزێك بە گەورە پیشان داوە، بۆ ئەوەی ئازادبوونەکەمان لێ تێك بدەن..

ئامانجیشیان لەمەدا ئەوەیە کە ئارامم لێ ببڕێت و بڵێم: "بەسە.. بەسە"!

هۆکاری ڕق و تووڕەیی ئێستایان لە من، بێ دەنگیم و خۆهەڵنەقورتاندنمە لە کاروباری دنیا! وەك بڵێی دەیانەوێت خۆم لەو کاروبارانەدا هەڵبقورتێنم، تاکو ئامانجەکەیان بۆ بێتەدی!

وا هەندێ لەو فێڵانەی ئەوانتان بۆ ڕوون دەکەمەوە کە بە مەبەستی ورووژاندنی شك و گومان لە دڵی هەندێ کارمەندی حکومەتدا بەکاری دەهێنن. چونکە پێیان دەڵێن:

"سەعید لە ناوەندە گشتی‌یەکاندا قسەی دەڕوات و، کتێبەکانیشی زۆرن و، کاریگەریی لەڕادەبەدەریان لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا هەیە. ئەوەتا هەرکەسێك لێی نزیك دەبێتەوە، دەبێت بە هاوڕێی. کەواتە دەبێ ئەم توانا و دەستەڵاتەی بشکێنین و، لەم

پێناوەدا لە هەموو شتێك دایبڕین و، سووکایەتیی پێ بکەین و، بایەخی پێ نەدەین و، خەڵکیی لێ دوور بخەینەوە و، خۆشەویستانیشی بترسێنین"!

بەم جۆرە، حکوومەت لەمەدا سەرسام ماوە و، لە تاوا زیاتر گوشار دەخاتە سەرم!

منیش دەڵێم:

ئەی ئەو برایانەی کە ئەم وڵات و نەتەوەیەتان خۆش دەوێت!

بەڵێ ڕاستە، قسە ڕۆیشتن و کاریگەرییەك لە ئارادا هەیە، وەك ئەوەی کە مونافیقان لێی دەدوێن. بەڵام دڵنیا بن کە هی من نییە، بەڵکو هی پەیامەکانی نوورە! چونکە پەیامەکانی نوور ڕووناکییەکن هەرگیز ناکوژێنەوە و، هەر شتێك توخنیان کەوتبێت و هەرکاتێك دەست درێژییان کرابێتە سەر هێزی پەیامەکانی پتر پێ زیاد بووە! هەروەك جگە لە بەرژەوەندییەکانی وڵات و نەتەوە بۆ هیچ شتێکی تر بەکار نەهێنراون و بەکاریش ناهێنرێن.

وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی دە ساڵی ڕەبەقی دوو دادگای عەدلی لەسەر ئەو پەیامانەی کە لە ماوەی بیست ساڵدا نووسیومن، نەیتوانی هیچ بیانوویەکی ڕاستەقینە بۆ تاوانبار کردنمان بە دەستەوە بدات. ئەمەش بەڵگەیەکی بێ خەوش و شایەتێکی ڕاستە لەسەر دەعواکەمان.

بەڵێ، ئەو کتێبانە کاریگەرییەکی لەڕادەبەدەریان هەیە، بەڵام بۆ بەرژەوەندی و سوودی وڵات و نەتەوە. ئەمەش لەوەدا دەبینرێت کە ڕێنمایی سەد هەزار کەسیان بۆ ئیمانی تەحقیقی کردووە، بێ ئەوەی هیچ خراپەیەکیان بەرامبەر بە هیچ کەسێك لێ وەشابێتەوە. کەواتە کاریگەریی ئەم پەیامانە لە هەوڵ و تەقالایاندایە بۆ هێنانەدیی بەختەوەریی دنیا و ژیانی هەتاهەتایی ئەودنیای ئەم خەڵکە.

سەدان بەندکراوی حوکم لەسەردراو لە بەندیخانەی "دەنیزلی"دا - کە هەندێکیان بڕیاری سزای سەختیان لەسەر دەرچووبوو - دوای ئەوەی کە هەر تەنها پەیامی "بەری درەختی ئیمان"یان خوێندەوە، بوون بە ئاییندار و خاوەن ڕەوشتی بەرز. تەنانەت ئەوانەش کە قاتڵ بوون و سێ کەسیان کوشتبوو، دوای خوێندنەوەی ئەو پەیامە، دەستیان لە کوشتنی مێشوولەی ناو جێگەکەی خۆیان دەگێڕایەوە!

ئەم دیاردەیەش بەڕێوەبەری بەندیخانەی ناچار کرد دان بەوەدا بنێت کە بەندیخانەکە وەکو قوتابخانەیەکی پەروەردەیی لێ هاتووە!! هەموو ئەمانەش بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر ڕاستیی داواکەمان.

بەڵێ، دوای ڕوون بوونەوەی هەموو ئەمانە، ئیتر داماڵین و بێ بەش کردنم لە هەموو مافە مرۆییەکانم، لە ڕاستیدا ستەم و سزایەکی دووچەندانەیە و، لە هەمان کاتدا غەدر و خیانەتێکیشە لەم نەتەوەیەی کە هەرچەند نزیکەی چل ساڵ لە ناویاندا مامەوە بەڵام کەسیان هیچ زیانێکیان لە منەوە تووش نەبوو. چونکە بەڵگەی گومانبڕ لەسەر ئەوەی کە ئەم نەتەوە ئایینداراە پێویستی بە هێزێکی مەعنەوی و دڵدانەوەیەکی مەزن هەیە، ئەوەیە کە ئاوڕ لەو پڕوپاگەندە چەپەڵ و ڕقاوی‌یانە نادەنەوە کە لە دژی من دەخرێنە ناوەندەکانەوە. بەڵکو ئەم نەتەوەیە لە هەموو شوێنێکدا بە حەز و تاسە و شەوقەوە ڕوو دەکەنە پەیامەکانی نوور، تەنانەت هێندە ڕێزم لێ دەگرن کە لە شایستەیی خۆم سەد جار زیاترە و خۆم بە شایانی ئەو ڕێزەیان نازانم)[1].

لەگەڵ ئەوەشدا، خوای گەورە لە ئەمیرداغ بنەماڵەی "چاڵشقان"ی ئامادە کردبوو کە بە پیر و لاویانەوە هەموو هەوڵێکی خۆیان خستە کار بۆ دەستەبەرکردنی حەوانەوەی مامۆستایەکی گەورە و زانایەکی بەڕێز، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەنجامی ئەم کارە هەرچی‌یەك بێت، چونکە لە لایەن دەوڵەتەوە پاسەوانیان دانابوو کە لە دەرگای ماڵەکەی دوور نەدەکەوتەوە[2]!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٢٥-٣٢٨. هەرچەند مامۆستا نوورسی نزیکەی بیست ساڵی ڕابوردوو، بە درێژایی ماوەی بەندی و دوورخستنەوەی، سەردانی لایەنە ڕەسمی‌یەکانی نەکردووە و بانگیش نەکراوە بۆ بارەگای والی، یەکجار نەبێت لە قەستەمۆنی، کەچی لەم ماوەیەی ژیانیدا لە ئەمیرداغ، واتە لە ماوەی سێ ساڵ و نیودا لە لایەن دامودەزگا ڕەسمی‌یەکانەوە پازدە جار بانگ کرا! وەك فەرمانگەی ئاسایش، یان پاسگای پۆلیس، یان فەرمانگەی داد.

هەر لە هەمان کاتدا چەندین عەرزوحاڵی پێشکەش بە لایەنە بەرپرسەکان کرد سەبارەت بەو ستەمەی کە لێی کراوە، وەك ئەوەی لە سەرەوە هێنرا. هەروەها چەند عەرزوحاڵێکی ئاراستە کرد بۆ هەریەك لە وەزیری ناوخۆ و، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی و، بەڕێوەبەری ئاسایشی ئافیون و، سەرۆکی ئەنجومەنی نەتەوە و، بەرپرسانی ئەنقەرە و، سەرۆك کۆمار و، داواکاری گشتی و، دادوەری لێکۆڵینەوەی ئەمیرداغ. هەموو ئەمانەش بەڵگەن لەسەر مەودای ئەو ستەمە لەڕادەبەدەرەی کە بە دەستیەوە دەیناڵاند. (ب: ١٢٠٦/٢)

Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati. (٢)

❑ ڕێگری کردن لە ڕۆشتن بۆ مزگەوت

(لە کاتە چۆڵەکاندا جار بە جار دەچووم بۆ مزگەوت و، قوتابیانیش - بە بێ ئاگاداریی خۆم - ژوورێکی بچووکیان لە تەختە لە شوێنی قورئان خوێنەکاندا بۆ دروست کردبووم، تاکو لە سەرما بمپارێزێت، بڕیاریشم دابوو کە ئیتر نەڕۆم بۆ مزگەوت. بەڵام ئەفسەرە ناسراوەکەی ئاسایش ئەو ژوورە بچووکە تەختەیەی لابرد و، بە ڕەسمی پێیان ڕاگەیاندم کە سەردانی مزگەوت نەکەم!

ئنجا بەوەشەوە نەوەستان.. بەڵکو هەرا و هوریایەکیان لەناو خەڵکیدا نایەوە و، ڕووداوەکەیان بە شتێکی گەورە خستە پێش چاوی خەڵك و دەنکە گەنمێکیان لێ کردن بە گومەزێکی گەورە)[1].

❑ ژەهر دەرخواردکردنی

بە فەرمانی دەسەڵاتداران، یەکێك لە پاسەوانەکان شەو بە پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستادا سەرکەوت و ژەهری بۆ کردە ناو خواردنەکەی! ئیتر بۆ بەیانی و هەتا ماوەی یەك هەفتەش مامۆستا لەتاو توندوتیژیی کاریگەریی ژەهرەکە، بە دەست ئازارەوە دەتلایەوە و، مەگەر بە کەمی، دەنا لەو ماوەیەدا خواردن و خواردنەوەی نەچەشت. ئیتر خوای گەورە لە مردنێکی بێ گومان دەربازی کرد.

مامۆستا لەم ماوەیەدا بەردەوام ویرد و زیکرەکانی دەخوێند، بە تایبەت "الجوشن الكبير" و "الأوراد القدسية"ی شاهی نەقشبەند.

لەو ماوەیەدا سێ جار ژەهر دەرخواردی مامۆستا درا و، ئەوەی دواییان زۆر بەهێز بوو، بە ڕادەیەك کە لەناو جێگاکەیدا لە نوێژە فەرزەکان زیاتر نەیتوانی بخوێنێت.

دووان لەو قوتابیانەی کە لای دەمانەوە و شەویان لە لا ڕۆژ دەکردەوە، دەگێڕنەوە کە:

ڕۆژێکیان دەمەو بەیانی مامۆستا بە چاوی نووقاو لەناو جێگاکەی ڕاست بووەوە و، دەستەکانی بۆ لاڵانەوە لە دەرگای خواوەندی بەخشندە بەرز کردەوە و بە دەنگێکی

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٣٩٨/١.

یەکجار کز دوعای بۆ سەرکەوتنی بانگەوازی نوور و سەلامەتیی قوتابیانی کرد. پاشان هەر لەناو جێگاکەی کەوت بە لادا و لە هۆشی خۆی چوو[1]!

مامۆستا گەلێ پێویستی بە هەوای سازگار هەبوو، بۆیە هەندێ جار بۆ گەڕان و هەواگۆڕین دەڕۆشتە دەوروبەری شار. لە هەمان کاتیشدا "چاودێری"ی دەوڵەت هەمیشە بە دوایەوە بوو. تەنانەت جارێکیان لە پشتەوە فیشەکێکی پێوە نرا، بەڵام بەری نەکەوت. هەموو ئەو کردارانەیان لە دژی ئەنجام دەدا، تاکو بێزاری بکەن و ڕزگاریان بێت لێی.

یەکێك لەو گوشارانە، خۆهەڵقورتاندن بووە لە پۆشاکەکانی بەری و زۆر لێکردن بووە بۆ لەسەرکردنی شەپقە!

تەنانەت دوو جار بۆ ئەم مەبەستە ڕاپێچی لای دادگا و داواکاری گشتی کراوە. بەڵام مامۆستا بە هیچ جۆرێ ئەوەی قبووڵ نەکرد و، گەڕایەوە بۆ گۆشەگیری لەناو ژوورەکەی خۆیدا[2].

[لەبارەی ئەم ماوەیەی ژیانی خۆیەوە دەڵێ:]

(لەم کاتەدا چاودێریی خوای گەورە هات بە فریامەوە، چونکە ئامێرێکی ڕۆنیۆی - کە تازە پەیدا بووە - بە قوتابیانی قوتابخانەی (زەهراء) بەخشی کە خاوەنی قەڵەمی ئەڵماسیی وەك ڕۆنیۆن! ئیتر بەم ئامێرە و بە یەك دانە پێنووس پێنج سەد نوسخە لە پەیامەکانی نوور دەردەچوون!

---

(١) Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati. ڕووداوەکانی ژەهرپێدانی مامۆستا لە سەرەتاوە هەتا ئێستا بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

١ - لە ئەنقەرە، لە ئەنجومەنی نوێنەران، لە ڕێی دەرزی لێدانەوە، ساڵەکانی (١٩٢٢-١٩٢٣ز).

٢ - لە بەندیخانەی ئەسکی شەهر، ساڵی (١٩٣٥ز).

٣،٤،٥- لە قەستەمۆنی، لە نێوان ساڵەکانی (١٩٣٦-١٩٤٣ز).

٦،٧،٨ - لە بەندیخانەی دەنیزلی، لە ساڵەکانی (١٩٤٣-١٩٤٤ز) کە لە سێهەمیاندا "حافز عەلی" شەهید بوو.

٩،١٠،١١ - لە ئەمیرداغ، لە ساڵەکانی (١٩٤٥-١٩٤٦ز) کە لە سێهەمیاندا "حەسەن فەیزی" شەهید بوو. (ب: ٢/١١١٩).

(٢) Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati.

ئەم "فتووحات"ەی پەیامەکانی نوور بوون بەهۆی ئەوەی کە ئەو ژیانە پڕ لە بێزاری و دڵتەنگی‌یەم لەلا خۆشەویست و شیرین بێت و، هانی دام کە هەزاران شوکر و ستایش پێشکەشی خوای گەورە بکەم)[1].

☐ خزمەتی ئیمان وا دەخوازێ[2]

برای سدديقی ئازیز و هاوڕێی مەردم لەم دنیایەدا!

یەکەم: گەلێ سوپاستان دەکەم لەسەر ئەوەی کە پێش هەموو هاوڕێیانم و گشت خەڵکی ئەرزڕۆم کەوتنەوە لەو پەیوەندی‌یە پڕ لە شەفقەتە بێگەردەتان و، لەسەر درێژکردنی دەستی یارمەتیتان بۆم، لەم ژیانەدا کە بە ئازار و ستەم لێم گوزەرا..

هەتا کۆتایی تەمەنم ئەم چاکەیەی ئێوەم لەیاد ناچێت. هەزار هەزار ماشەڵڵا و بارەکەڵڵاتان لێ بێت.

دووهەم: وا هەندێ حاڵەتی تایبەت بە خۆم و ئازاردانم لە لایەن ستەمکارانەوە باس دەکەم بۆت، بە پێچەوانەی ئەو ڕێبازەی خۆم کە لە پەیامەکانی نوورەوە فێری بووم و لە دەرەوەی ئەو دەستوورەی ژیانیشم کە بریتی‌یە لەوەی ماوەی دە ساڵە ناڕوانمە ڕووداوە بێ نرخ و کاتی و گوزەراوەکانی دنیا. ئەوەش تەنها لەبەر خاتری تۆ و، لەبەر دڵنیاکردنەوەت و، ئەو بایەخدانەت باس دەکەم کە لە نامەکەتدا لێی دواویت.

سی ساڵ پێش ئێستا کاتێ لە "دار الحكمة الإسلامية"دا ئەندام بووم، یەکێك لە ئەندامەکانی ئەوێ، کە متمانەم پێ دەکرد و بەڕێز "سەعدەدین پاشا" بوو، وتی:

ڕێکخراوێکی بێ بڕوایان، کە لە چەندین لایەنی بیانی‌یەوە پشتگیری دەکرێت، کتێبێکی تۆیان خوێندووەتەوە و، وتوویانە:

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥١٢-٥١٣. یەکەم جار لە ساڵی (١٩٤٦ز)دا ئامێری چاپی "ڕۆنیۆ" گەیشتە تورکیا. یەکسەر قوتابیانی نوور ئەو ئامێرەیان کڕی. ئنجا هەردوو شاری "ئیسپارتە" و "ئەینەبۆلو" کەوتنە چالاکیی بڵاوکردنەوەی پەیامەکان بەو ئامێرە و، لەو ڕێیەوە پەیامەکانیان لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا گەیاندە زۆربەی شار و گوندەکانی تورکیا. سەبارەت بە بڵاوبوونەوەشیان لە دەرەوەی تورکیا ئەوا لە دوای بڕیاردان بوو بە سەفەری حەج لە ساڵی (١٩٤٧ز)دا.

(٢) نامەیەکی مامۆستا نوورسی‌یە بۆ یەکێك لە دۆستانی، باسی ئەو ستەمانەی تێدا دەکات کە دوژمنانی لە دژی بەکاریان هێناوە و، ئەو ئەرکەش بۆ قوتابیانی ڕوون دەکاتەوە کە پێویست بووە لەو ڕۆژگارە تاریکانەدا لە پێناوی خزمەتی ئیمان و قورئاندا جێبەجێی بکەن.

"هەتا ئەم پیاوە زیندوو بێت ئێمە ناتوانین بیروڕاکانی خۆمان بڵاوبکەینەوە".

لەبەر ئەوە، بڕیاریان داوە کۆتایی بە ژیانت بهێنن. وا هاتووم ئاگادارت بکەمەوە، چونکە زۆر ئازیزیت بەلامەوە.

پێم وت: "توكلتُ على الله".. ئەجەل یەکێکە و ناگۆڕێت.

جا ئەم "ڕێکخراو"ە، بەردەوام پەرەی سەند و، لە ماوەی سی چل ساڵدا هەموو جۆرەکانی فێڵ و ساختەکاریی بەرامبەرم بەکارهێنا و، دوو جار بوو بەهۆی ئەوەی کە بڕۆمە بەندیخانەوە و یازدە جاریش ژەهرم دەرخوارد بدرێت. دوا پلانیشیان بەکارهێنانی دەسەڵاتی حکوومەت بوو تاکو گوشاری زیاترم بخرێتە سەر، ئەوەش بەوەی کە هانی وەزیری پێشووی ناوخۆ و پارێزگاری پێشووی ئافیوون و قایمقامی پێشووی ئەمیرداغیان دا کە بەرەیەکی یەکگرتوو لە دژی من پێکبهێنن..

تەنانەت دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ڕق لە دڵانە لە دژی مرۆڤێکی پیر و لاواز و گۆشەگیر و هەژار و غەریبی وەکو من کە پێویستم بە کەسێکە یارمەتیم بدات و خزمەتم بکات. ئیتر لەبەر ئەو پڕوپاگەندە بەهێزەی ئەوان ترسی خەڵك لە من گەیشتە دوا سنوورەکانی، بە ڕادەیەکی وا کە تەنها یەك کارمەندیش ناوێرێ سڵاوێکم لێ بکات، نەوەکو هەواڵی ئەو سڵاوە بگاتەوە بەوان و بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر! لەبەر ئەوە، جگە لە جاسووسە هەواڵدەرەکان کەسی تر بەلای مندا گوزەری نەکرد. تەنانەت دراوسێکانیش سڵاویان لێ دابڕیم!

کەچی وێڕای ئەوە، خوای گەورەی پارێزەر و زانا، چاودێریی فراوانی خۆی هێنا بە هانامەوە و، ئارامی و خۆڕاگرییەکی جوان و سەرسووڕهێنی پێ بەخشیم و، سەرباری ئەو هەموو گوشارە سەختانەش، ناچاری ئەوەی نەکردم کە بە هیچ جۆرێ بکەومە پاڕانەوە لێیان.

سێهەم: دوو دادگا، دوای لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوەی درێژخایەنی ماوەی دوو ساڵ، هیچ بڕوبیانوویەکی یاساییان دەست نەکەوت کە ئێمەی پێ تاوانبار بکەن. بۆیە بڕیاری بێ تاوانییان بۆ دەرکردین. بەڵام ئەو "ڕێکخراوەی بێ باوەڕان" چەند کارمەندێکی دووڕووی خەڵەتاند و، پێکەوە پلانێکی ڕەسمییان لە ناوەندی حکوومەتدا

ساز کرد و، بە تەواوەتی لە هەموو قوتابیان و دۆستانم دایان بڕیم و، دووریـان خستمەوە بۆ شوێنێکی دوورە دەست کە "ئەمیرداغ"ە و، بە یەکجاری لەگەڵ ژیـان و تەندروستیی مندا ناسازە.

ئێستا بە دڵنیاییەوە بۆم دەرکەوتووە کە دوو ئامانجیان لەم ڕەفتارەیاندا هەیە:

یەکەمیان: هەڵبەستنی ڕووداوێك لـە ڕێی وروژاندنم و تووڕەکردنمـەوە، چونکـە دەزانن کە من هیچ سووکایەتی‌یەك قبووڵ ناکەم. ئەو کاتەش بیانوویەکیان دەست دەکەوێت بۆ کۆتایی هێنان بە ژیانم!

بەڵام لەبەر ئەوەی لـەم تەقالایەدا هیچ شتێکیان دەستگیر نەبوو. تێکۆشـان بـەهۆی ژەهرپێدانمەوە کۆتایی بە ژیانم بهێنن! کەچی چاودێریی گشتیی خوای گەورە و، دوعای قوتابیانی نوور و، ئارامی و خۆڕاگریم، هەموویان پێکەوە بوونە دەرمانێکی شیفابەخشی ئەو ژەهرە و، پلانەکەی ئەوانیش پووچەڵ بووەوە.

لـە هـەموو مێژوودا و لـە هیـچ حکوومـەتێکدا، سەرپێچی لـە یاسـا و، بـە کارهێنانی هەموو جۆرەکانی ئازاردان و ستەم بە ناوی یاسا و حکوومەتەوە، هەرگیز ڕووی نـەداوە بە وێنەی ئەوەی کە بەرامبەر من کراوە! چونکە چاودێری دانان لەسەرم بە ڕادەیـەکی وا بـەردەوام بـوو کـە دەمارەکـانم هـەتا ڕادەی تووڕەبوون بورووژێنێـت، هاوکـات لەگـەڵ بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لە دڵی خەڵکیدا.

کتوپڕ ختوورەیەکم بە دڵدا هات کە:

پێویستە بەزەییت بـەو ستەمکارانەدا بێتـەوە، نـەك لێیـان تـووڕە ببیـت! چونکـە دوای ماوەیەکی کەم هەموو یەکێکی ئـەوان لـە بەرامبـەر ئـەم سـزا کاتی‌یـەی کـە دەرخـواردی تۆی دەدەن، هـەزاران سـزای توندوتیژتـر دەچێژن. کەواتـە هـەزار و یـەك جـار زیـاتر بـە سزای دۆزەخێکی ماددی و مەعنەوی تۆڵەی تۆیان لـێ دەکرێتـەوە. هەندێکیشـیان تـا لـە دنیادایە بە سزایەکی ویژدانی‌یەوە دەتلێتەوە هەتا ئەو سـزایە کۆتـایی بـە ژیـانی دەهێنێـت. سەرباری ترس و دڵەڕاوکێیان لەو ئیعدامە هەمیشەییەی کە چاوەڕێیانە.

منیش لە لایـەنی خۆمـەوە تووڕەییـم نایـە لاوە و، بـەزەییم بـە حاڵیـاندا هاتـەوە و، وتم: خوایە گیان! حاڵی ئەوانە باش بکە!

من سوپاسی پەروەردگاری شکۆمەندم دەکەم و، لە نێوان گوشارە ترسناکەکانی ئەواندا هەست بە شادمانی‌یەکی گشتگیر دەکەم لە دڵی خۆمدا. چونکە سەرقاڵ بوونیان بە منەوە لە بریی "پەیامەکانی نوور" و قوتابیانی ئەو پەیامانە و، سزادانی تەنیا من، کارێکە سوودی بۆ سەلامەتیی قوتابیانی نوور هەیە، جگە لە بەدەستهێنانی پاداشت بۆم.

چوارەم: ئەوەش کە لە نامەکەتدا باست کردووە سەبارەت بە سەردانت بۆ لای حکوومەتی ئێستا لەبارەی ئەوەی کە ئەگەر پێویست بکات بڕۆم بۆ شام یان حیجاز بۆ دەستەبەرکردنی حەوانەوەم، دەڵێم:

یەکەم: ئەگەر لە مەککەی پیرۆزیشدا بم پێویستە و دەبێت بێم بۆ ئێرە، لەبەر رزگار کردنی ئیمان و خزمەتکردنی قورئان. چونکە ئێرە زۆر پێویستی بەم کارە هەیە. جا ئەگەر هەزار و یەك گیانیشم ببێت و، دووچاری هەزار و یەك نەخۆشی ببم و، هەزاران جۆری ئازار و دەردیسەریم بێتەڕێ، ئەوا بڕیاری خۆم و بڕیاری هەمووشمان مانەوەمانە لێرە بۆ خزمەتکردنی ئیمانی ئەم نەتەوەیە و، هەوڵدان بۆ ئەوەی بەختەوەریی هەمیشەییان دەست بخرێت.

ئەمە ئەو دەرسەیە کە لە قورئانی پیرۆزەوە فێری بووین.

دووهەم: برای بەڕێزم! لە بارەی ئەو سووکایەتی پێکردنەی کە لە بریی رێز و ئیحتیرام دەهێنرێتە رێم، لە نامەکەتدا دەڵێیت:

"ئەگەر لە میسر یان لە ئەمریکا بوویتایە، بە شانازی و رێزەوە لە مێژوودا ناوت دەهێنرا"!

برای ئازیز و تێگەیشتووم!

ئێمە بە پێی داخوازی رێبازەکەمان، تا دەتوانین لە دەست رێز و ئیحتیرام و باوەڕباشیی خەڵك و ئیعجابیان پێمان، هەڵدێین! چونکە راکردن بە دوای ناوبانگدا، کە ریایەکی سەیرە و.. چوونە ناو مێژوو بە شانازی‌یەوە، کە لە خۆڕازی بوونێکی فیتنە ئەنگێزە و.. حەز لە خۆدەرخستن و بەدەستهێنانی ئیعجابی خەڵك.. هەموو ئەمانە، دژ و پێچەوانەی "ئیخلاس"ن کە یەکێکە لە بناغە و رێبازەکانی پەیامەکانی نوور.

کەواتە ئێمە "سەبارەت بە خۆمان" لەم شتانە ڕادەچڵەکێین و، بە ترسەوە لە دەستیان هەڵدێین، چ جای ئەوەی حەزیان لێ بکەین.

بەڵام "سەبارەت بە پەیامەکانی نوور" کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون و، بریسکانەوەی ئیعجازی مەعنەوی و، تەفسیر و دەرخەری ڕاستی و نهێنی‌یەکانی ئەو قورئانەن..

سەبارەت بەم پەیامانە، ئێمە لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدەوار و تکاکارین کە ڕەواج و برەویان پێ بدات و، بە خەڵکیی بسەلمێنێت کە پێویستیان پێیانە و، بەها و نرخی هەرەبەرزی ئەم پەیامانە لای هەمووان ئاشکرا بکات و، سەرنجی ڕێز و قەدرزانی‌یان بۆ لا ڕابکێشێت و، کەرامەتە مەعنەوی و یەکجار ڕوونەکانیان و سەرکەوتنیان بەسەر هەموو جۆرەکانی کوفر و ئیلحاددا - بە هۆی ئیمانەوە - بۆ هەموو کەسێ دەربخات.

ئێمە دەمانەوێت ئەم شتانە ڕابگەیەنین و، خەڵکیان لێ تێبگەیەنین و، ئەو تایبەتکاری‌یانە ئاشکرا بکەین.. بەڵێ، ئومێدەواری هاتنەدیی هەموو ئەمانەین لە میهرەبانیی خوای گەورە)[1].

☐ پەیامێك لەبارەی حیکمەتی دووپاتبوونەوەکانی قورئانی پیرۆز[2]

(دوازدە ساڵ پێش ئێستا بەرگوێم کەوت کە: زەندیقێکی سەرسەخت دەروونی خراپ و مەبەستی پیسی خۆی ئاشکرا کردووە بەوەی کە قورئانی پیرۆزی وەرگێڕاوە. بەم هەوڵدانی وەرگێڕانەی قورئانیش پلانێکی ترسناکی بۆ ڕێزنەهێشتنی قورئان ساز کردووە و، وتوویەتی: با قورئان وەربگێڕرێت تاکو نرخەکەی دەربکەوێت. بە خەیاڵی

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤١٢-٤١٤.

(٢) کە مەسەلەی دەهەمی "بەری درەختی ئیمان"ە. دانراوەکانی تری لە شارۆچکەی ئەمیرداغ، لەم ماوەیەدا کە سێ ساڵ و نیوی خایاند، بریتین لە:

١ - مەسەلەی یازدەهەمی "بەری درەختی ئیمان". لەبارەی بەروبوومەکانی ئیمان بە مەلائیکەت. ساڵی ١٩٤٥ز.

٢ - ئومێدی چواردەهەمی "پەیامی پیران" کە تێڕامانەکانیەتی لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿حَسْـبُنَا اللهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيلُ﴾.

٣ - ئومێدی شازدەهەمی "پەیامی پیران" سەبارەت بە دوورخستنەوەی بۆ قەستەمۆنی و ڕووداوەکانی دوای ئەوە.

٤ - نزیکەی دوو سەد و پەنجا نامەی ڕێنمایی بۆ قوتابیانی.

خۆی گوایا: با خەڵکی دوورپات بوونەوە ناپێویستەکانی ببینن و، لە بریی خۆی وەرگێڕراوەکەی بخوێننەوە... هتد لەم بیروڕا ژەهراوییانە.

بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە "پەیامەکانی نوور" بەهۆی بەڵگە بەهێزە دەمکوت کەرەکانیان و بڵاوبوونەوەیان بە جۆرێکی فراوان لە هەموو شوێنێکدا، ئەو بیر و پلانەی ئەویان لەباربرد و پەکی خست و، بە چەشنێکی گومانبڕ چەسپاندوویانە کە:

هەرگیز لە توانادا نییە بە جۆرێکی ڕاستەقینە قورئانی پیرۆز وەربگێڕرێت و، هەر زمانێکی تری جگە لە زمانی عەرەبیی فوصحا هەرگیز ناتوانێت تایبەتکاری و سەرنجە ورد و ناسکە ڕەوانبێژییەکانی قورئان بپارێزێت و، ئەو وەرگێڕراوە سادە و جوزئییانەی کە مرۆڤ دەیانکەن، بە هیچ حاڵێك جێی تەعبیرە پڕ و تۆکمە و ئیعجازبەخشەکانی قورئان ناگرنەوە، کە لە هەر پیتێکیدا لە "دە"وە تا "هەزار" چاکەی تێدایە.

لەبەر ئەوە، هەرگیز مومکین نییە لە بریی خۆی وەرگێڕراوەکەی بخوێنرێتەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەمە، ئەو مونافیقانەی کە قوتابێتیی ئەو زەندیقەیان کردبوو، لە پێناوی شەیتاندا چەند هەوڵێکی هەڵەشانەیان دا، تاکو بە دەم وپلی خۆیان نووری قورئانی پیرۆز بکوژێننەوە..

جا لەبەر ئەوەی من کەس نابینم و تێکەڵی خەڵکی ناکەم، ئەوا ڕاستیی ئەو شتانەی لە بارودۆخی دەرەوەدان نازانم و لە بارەیانەوە ئاگادار نیم. بەڵام زیاتر وا گومان دەبەم کە ئەمەی ئێستا باسم کرد، بوو بەهۆی نووسینی مەسەلەی دەهەم، هەرچەندەش لە هەموو لایەکەوە تەنگانە دەورەی دابووم)[1].

وێڕای هەموو سەختی و گیروگرفتەکان، کەچی ئەوانەی کە مامۆستایان خۆش دەویست دادەبارین بۆ سەرلێدانی، بەڵام لەبەر توندوتیژیی چاودێری لەسەری، کەسانێکی کەم لەوانەی کە بۆ سەرلێدانی دەڕۆشتن بە ئامانجەکەیان دەگەیشتن..

مامۆستاش بە پێی ئاستی هزر و ڕۆشنبیریی ئەوان قسەی بۆ دەکردن و دەیدواندن، چونکە لە توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵ پێکهاتبوون.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٤٢٠.

گوفتارەکانی بۆیان بە پوختی دەربارەی گرنگیی "ئیمان" بوو لە کاتی ئێستادا و، سەبارەت بەوەش کە ئامانجی بنەڕەتیی "پەیامەکانی نوور" بەهێزکردنی ئیمان و بەربەست دانانە لە بەردەم "بێ باوەڕی"دا کە هەڕەشە لە نەتەوە و نیشتمان دەکات.

هەروەها گرنگترین کێشەی ئەم سەردەمە ڕزگارکردنی ئیمان و توندوتۆڵ کردنیەتی لە ڕێی دەستگرتنەوە بە قورئانی پیرۆز.

هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پەیامەکانی نوور هەموو تیڕوانینێکی خۆیان ئاراستەی ئەم ئامانجە دەکەن.

هەر لەبەر ئەوەشە کە دوژمنە بێ باوەڕەکان پێکەوە لە دژی ڕادەوەستن و هەڵمەتی بۆ دەبەن و، بوختان و درۆ و دەلەسەی ستەمکارانەی بۆ هەڵدەبەستن و، پڕوپاگەندەی قین لە دڵانەش لە دژی بڵاودەکەنەوە..

کەواتە جگە لە کاری ئیجابیی بنیاتنەر ڕێگا چارەیەکی تر نییە. چونکە تەنها "نوور"مان بە دەستەوەیە، نەك گورز و کوتەکی سیاسەت. تەنانەت گەر سەد دەستیشمان هەبێت هەر بەشی "نوور" دەکات و لێی زیاد نییە. هەروەها ڕێبازمان "ئیخلاس" و تەنها هەوڵی بەدەستهێنانی "ڕەزامەندیی خوای گەورە"یە. هەر ئەوەش سەرچاوەی هێزی پەیامەکانی نوورە. چونکە هەتا بە ئیخلاسەوە کاری ئیجابیی بنیاتنەر ئەنجام بدەین، چاودێریی خوای گەورەش خزمەتەکەمان دەپارێزێت[1].

## چەند نموونەیەك لەو نامانەی کە بۆ ڕێنمایی قوتابیانی لە "ئەمیرداغ"ەوە ئاراستەی کردوون

❑ ئایین ناکەین بە هۆکار بۆ دەستکەوتەکانی دنیا

(برا صددیق و ئازیزەکانم!

*پرسیار:*

بۆچی پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا نابەستیت، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەی کە بایەخ بە سیاسەت دەدەن، بەڵکو تا دەتوانیت دەست بە

(١) Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati.

ڕووی ئەمەوە دەنێیت و، نایەڵێت قوتابیانی نووریش بە هیچ جۆرێك توخنی ئەو لایەنانە بکەون! خۆ ئەگەر پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستیت، هەزاران کەس بە کۆمەڵ و تاك تاك دێنە ناو بازنەی "پەیامەکانی نوور" و، بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاستییە پرشنگدارەکانی ئەم پەیامانە تێدەکۆشن. سەرەڕای ئەوەش، تا ئەم ڕادەیە دووچاری گیروگرفت و تەنگ پێ هەڵچنینی ناڕەوا نابیت؟

*وەڵام:*

گرنگترین هۆی دوورەپەرێزی و بایەخ نەدانمان بەو لایەنانە "ئیخلاس"ە، کە بناغەی ڕێبازمانە. واتە ئیخلاس ڕێی ئەوەمان لێ دەگرێت. چونکە مرۆڤ لەم سەردەمی بێ ئاگاییەدا، بە تایبەت ئەو کەسەی هەڵگری چەند بیروڕایەکی ئەوتۆی سەر بە لایەنێکی دیاریکراوە، هەوڵ دەدات هەموو شتێك بکات بە داردەستی ئەو بیرەی خۆی، تەنانەت ئایین و کردارەکانیشی کە بۆ دواڕۆژ دەیانکات، هەموویان دەکات بە پلیکانە و "هۆ" بۆ ئەو ڕێبازە دنیاییە!

بەڵام ڕاستییەکانی ئیمان و خزمەتگوزاریی خاوێنی "نوور" هەرگیز خۆیان نادەن بەدەستەوە تا بکرێن بە "هۆکار" بۆ هیچ شتێك لە هەموو گەردووندا و، ناگونجێت جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکی تریان بێت.

لە ڕاستیدا پارێزگاری کردنی نهێنیی "ئیخلاس" لە ناوەندی ململانێ و کێشمەکێشی نێوان لایەنەکانی ئێستادا کارێکی گەلێ دژوارە. هەروەها ئەوەش کارێکی یەکجار سەخت و ئەستەمە کە ئایین نەکرێت بە "هۆکار" بۆ دەستخستنی دەستکەوتەکانی دنیا!

لەبەر ئەوە، باشترین چارەسەر بریتییە لە پشت بەستن بە چاودێریی خوای گەورە و، سپاردنی ئەم کارە بە تەوفیقدانی پەروەردگاری عالەمیان، لە بریی پاڵدانەوە بە هێزی دەستە و لایەنەکانی ئێستای دنیا.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەم دوورەپەرێزییەمان: "شەفەقەت"ە، کە یەکێکە لە چوار بناغەکانی پەیامەکانی نوور و، بریتییە لەوەی خۆمان لە ستەم و زیانی کەسانی ترەوە نەگلێنین و بە ڕەفتاری لەو جۆرە لەکەدار نەبین. چونکە مادەم مرۆڤ گەلێ

ستەمکار و نەزانە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم:٣٤) ئەوا دەبینین لەم سەردەمەدا بێ هیچ بەزەییەك و بە ستەمێکی یەکجار ڕەق و توندوتیژ بەرپەرچی هەڵسوکەوتی بەرامبەرەکەی دەداتەوە و، بە پێچەوانەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام:١٦٤) کە دەستووری ویستی خوای گەورەیە، ڕەفتار دەکات..

چونکە زۆربەی جار سۆز و لایەنگیریی بۆ لایەنێك بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئەو کاتەش تەنها بە دوژمنایەتی کردنی تاوانبارەکەوە ڕاناوەستێ، تەنانەت بە تێوەتلانی هەموو خزم و کەسوکاریشی ڕازی نابێت، بەڵکو دەیەوێت هەر کەسێ کە پەیوەندییەکی دوور یان نزیکی بە تاوانبارەکەوە بێت، هەموویان سزا بدات، بە ڕادەیەك ئەگەر دەستەڵات و فەرمانیشی بەدەست بێت ئەوا لەبەر تاوانی یەك دانە کەس گوندێکی تەواو بە "بۆمبا" وێران دەکات! لە کاتێکدا ویژدان داخوازی ئەوەیە کە لەبەر سەد تاوانباریش - نەك یەکێك - نابێت یەك کەسی بێ تاوان لەناو ببرێت و بەهۆی ئەوانەوە ستەمی لێ بکرێت..

ئەم بارودۆخەی ئێستا پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە؛ سەد کەسی بێ تاوان تووشی چەندین بەڵا و زیان دەکات، بەهۆی چەند کەسێکی کەمی تاوانبارەوە!

بۆ نموونە: لەناوبردنی دایك و باوکی بەتەمەن و، دەربەدەرکردنی منداڵانی ورد و، زەلیل و هەژارکردنی هەموویان بە بیانووی لایەنگیریی لایەنێك، تەنها لەبەر ئەوەی خزمێکیان هەڵەیەکی لێ ڕوودابێت.. ئەم کارە، بە تەواوی دژی بناغەی "شەفەقەت"ە بەرامبەر بەدیهێنراوانی خوای گەورە.

کەواتە بە لایەنگیریی ئەم پێڕ و دەستە و لایەنانەی کە ئێستا هەن، موسڵمانە بێ تاوانەکان لە ستەم ڕزگاریان نابێت، بەڵکو بەم لایەنگرتنە ستەم - بە جۆرێکی گشتی - بڵاو دەبێتەوە، بە تایبەت لە ڕێی ئەو هۆیانەی کە هاندەری شڵەژان و بەرپابوونی شۆڕشەکانن)[1].

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٤٣-٣٤٦.

□ پەیامەکان موڵکی قورئانن

(هەروەها ئەمەش بە ئاشکرا و ڕاشکاوی و بێ گومانی ڕادەگەیەنم کە:

پەیامەکانی نوور موڵکی قورئانی پیرۆزن، من جورئەتم لە کوێ بوو لافی خاوەندارێتیان لێ بدەم!

لەبەر ئەوە، هەرگیز هەڵە و ناتەواوی‌یەکانم نابن بە هی ئەو پەیامانە، چونکە من جگە لە خزمەتگوزارێکی گوناهباری ئەو نوورە و، بانگەوازکار و دەڵاڵی ئەو گەوهەر و ئەڵماسانە، هیچی تر نیم. کەواتە حاڵەتە پەشێواوەکانی من هەرگیز کار ناکەنە سەر ئەو پەیامانە، تەنانەت هەر نزیکیشیان نابنەوە.

لە ڕاستیدا ئەو وانەیەی کە لە پەیامەکانی نوورەوە فێری بووین بریتی‌یە لە:

دەستگرتن بە ئیخلاسەوە و، وازهێنان لە خۆویستی و، زانینی ئەوەی کە "نەفس" تەقسیربارە و، خۆپاراستنی زۆریش لەوەی کە لە خۆمان ڕازی بین..

ئێمە هەرگیز خۆمان دەرناخەین، بەڵکو کەسێتیی مەعنەویی "پەیامەکانی نوور" دەردەخەین و ڕوونی دەکەینەوە.

ئێمە سوپاسی هەر کەسێك دەکەین کە ناتەواوی‌یەکانی خۆمان پیشان دەدات، بە مەرجێك ناتەواویی ڕاستەقینە بێت و، پێی دەڵێین: خوای گەورە لێت ڕازی بێت. چونکە هەروەك سوپاسگوزاری ئەو کەسە دەبین کە دووپشکێکمان پێوە دەبینێت و فریای دەدات پێش ئەوەی پێمانەوە بدات، بە پیشاندانی ناتەواوی و کەموکوڕی‌یەکانیشمان، بە هەمان جۆر، ڕازی دەبین و، سوپاسی ئەو کەسە دەکەین کە ئاگادارمان بکاتەوە لێیان، بە مەرجێ ئامانجی کەسی و سەرسەختیی تێکەڵ نەبێت و، نەکرێت بە هۆکارێك بۆ یارمەتیدانی گومڕایان و ئەهلی بیدعەت)[1].

□ خواستەکانی خزمەت بە ئیمان

(ئەی برایانی ئازیز و بەوەفا و خۆڕاگر و گیانفیدا و دامەزراوم!

دەزانن کە خەبیرەکانی ئەنقەرە نەیانتوانی ئینکاریی کەرامەتەکانی پەیامەکانی نوور بکەن. بەڵام – بە هەڵە – ڕەخنەیان لەوە گرتبوو کە گوایا من بەشم لەو کەرامەتانەدا

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٥٤.

بیێت و، وتبوویان: "دەبێ ئەم جۆرە شتانە لە کتێبدا بڵاو نەکرێتەوە، چونکە کەرامەت نابێت ئاشکرا بکرێت"!

منیش لە بەرگرییەکانمدا و لە بەرامبەر ئەم ڕەخنە سەرپێییەوە، وەڵامم دانەوە و، وتم:

ئەو کەرامەتانە هی من نین و من مافی ئەوەم نییە کە خۆم بە خاوەنیان دابنێم. بەڵکو کەرامەتی ئەو پەیامانەی نوورن کە چەند بریسکە و نمێکی موعجیزەی مەعنەویی قورئان و تەفسیری ڕاستەقینەی ئەو قورئانە پیرۆزەن کە شێوەی کەرامەتیان لەخۆ گرتووە، تاکو ورەی قوتابیانی نوور بەرز بیێتەوە و، لە جۆری ئیکرام و ڕێزلێنانە خواییەکانن کە دەرخستنیان بە شوکرانەبژێری دادەنرێت و، کارێکی ڕاست و دروستە.

وا ئێستا لەسەر بناغەی هۆیەکی گرنگ، وەڵامەکە تا ڕادەیەك ڕوون دەکەمەوە. لەبەر ئەوەی ئەم پرسیارەی خوارەوە سەری هەڵدا:

بۆچی ئەو ئیکرام و ڕێزلێنانە خواییە دەردەخەم و، لەبەرچی ئەم هەموو قسە و گوفتارەیان لە بارەوە دەکەم، تەنانەت زۆربەی نامەکانیش ڕوویان لەو ئیکرامانەیە؟

وەڵام:

ئەو خزمەتگوزارییەی ئیمان کە لەم کاتەدا "پەیامەکانی نوور" ئەنجامی دەدەن و لە لایەن هەزاران کاولکارەوە بەرهەڵست دەکرێن، پێویستی بە سەدان هەزار ئاوەدانکار و بنیاتنەر هەیە کە بە مەبەستی پشتگیری لە ڕیزی ئەم پەیامانەدا بن و.. دەبێت - بە لای کەمەوە - سەدان کەس یارمەتیدەر و نووسەرەوەم لەگەڵدا بێت و.. لە نەتەوە و کاربەدەستانیش داخوازی ئەوەیە کە بە ڕێزلێنانەوە دەستی یارمەتیی بۆ درێژبکەن و، بۆ خزمەتی ئیمان هانمان بدەن و، گرنگیی پێ بدەن و، پەیوەندیی توندوتۆڵ لەگەڵ ئەم خزمەتەدا دامەزرێنن، نەك دوورەپەرێز بن و لە مەیدان دوور بکەونەوە. بەڵکو دەبێ ئیمانداران ئەم پەیامانەیان لە سەرقاڵی و سوودەکانی ژیانی دنیا گەلێ پێ باشتر بێت، چونکە خزمەتگوزاریی ئیمان ڕاستەوخۆ ڕووی لە ژیانی دواڕۆژە..

جا لە کاتێکدا کە دەبوو کارەکان بەم جۆرە بڕۆشتنایە، کەچی بە پێچەوانەوەیە!

با خۆم بە نموونە بهێنمەوە:

قەدەغە کردنم لە هەموو شتێك و، نەهێشتنی پەیوەندی لەگەڵمدا و، بڕینی ڕێگەی هەموو یارمەتی‌یەك لێم، سەرباری کز کردنی ورەی هاوڕێیانم لە ڕێی هەڵبەستنی پڕوپاگەندەی چەپەڵ بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە و، بەکارهێنانی هەموو ئەو هۆکارانەی لە دەستەڵاتیاندایە بۆ دوورخستنەوەی خەڵك لە من و لە "پەیامەکانی نوور"..

دەڵێم: دانانی ئەرکێ کە هەزاران کەس لە ژێریدا دەناڵێنن، لەسەر شانی کەسێکی ئاوا دەستەوسانی لاوازی نەخۆش و پیر و ئاوارەی وەك منی دوور لە خزم و کەسوکار، لەم بارودۆخانە و لە ناوەندی ئەم هەل و مەرجانەی خرانە ڕوو، سەرباری دوور خستنەوەی خەڵکی لێم وەك بڵێی دووچاری نەخۆشی‌یەکی گوازراوە بوویێتم، بۆ ئەوەی ناچار بم لێیان دوور بکەومەوە و تێکەڵیان نەبم..

زیاد لەمانەش؛ بڵاوکردنەوەی سام و دوودڵی و گومان خستنە ناو دڵی خەڵك لە بارەی خزمەتکردنی ئیمانەوە، بۆ ئەوەی ورە و هێزی مەعنەوی‌یان کەم بکەنەوە..

لە بەرامبەر گشت ئەم ڕێگرانەی باس کران، کە هەر هەموویان لە دەرەوەی ویستی ئێمەدان.. بەرامبەر بەمانە، پێویستە چەندین هێزی مەعنەوی لە دەوری "پەیامەکانی نوور" کۆبکرێنەوە. ئەمەش بەوە دەبێت کە هەموو ئەو ڕێزنانە خواییانە باس بکرێن کە مایەی هێز و پێزی مەعنەویی قوتابیانی نوورن.. پاشان بەوە دەبێت هێزی پەیامەکانی نووریش بخرێتە ڕوو کە وەك سوپایەکی مەزنی ئەوتۆیە هیچ پێویستی‌یەکی بە یارمەتیی هیچ کەسێك لە مرۆڤەکان نی‌یە، تەنانەت هەر تەنیا ئەو پەیامانەن کە لە دوژمن ڕاپەڕیون و بەرەنگاریان بوونەتەوە.

بەڵێ، لەبەر ئەم حیکمەتە ناوبراوانەیە، کە ئەو ڕێزلێنانە خواییانە و هاوچەشنیان نووسران.

دەنا ئێمە پڕوپاگەندە بۆ خۆمان ناکەین و، بە دوای ڕێز و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکدا ناگەڕێین و، هانیان نادەین مەدح و ستایشمان بکەن، بۆ ئەوەی ئیخلاسەکەمان بپارێزین کە بناغەیەکی گرنگە لە بناغەکانی پەیامەکانی نوور)[1].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٥٥-٣٥٧.

□ ڕزگارکردنی ئیمان مەزنترین چاکەیە لەم سەردەمەدا

(باشترین کردەوەی چاك و مەزنترین فەرمانبەری بەلامەوە - لەم سەردەمەدا - ڕزگارکردنی ئیمانە و هەوڵدانە بۆ بەهێز کردنی ئیمانی کەسانی تر.

کەواتە - براکەم! - وریابە! نزیکی خۆویستی و لەخۆبایی بوون مەبەرەوە و، توخنی هیچ شتێك مەکەوە کە لەمانە نزیکت بخاتەوە..

بەڵکو دەبێت "ئەهلی حەقیقەتی ئەم سەردەمە" بە تەواوی خۆیان لە بەشی دەروونی خۆیان دابماڵن و، واز لە خۆویستی و لەخۆبایی بوون بهێنن، بەڵکو ئەمە لە هەموو شتێك پێویستترە جێبەجێی بکەن. چونکە مەزنترین مەترسی کە لەم سەردەمەدا ڕوو دەکاتە مرۆڤ لە ڕێی خۆویستی و لەخۆ ڕازی بوونەوە دێن.

کەواتە با هەموو یەکێك لە ئەهلی حەقیقەت هەمیشە بۆ ناتەواوی و کەموکوڕی‌یەکانی خۆی بڕوانێت و، بە تەواوی خۆنەویستی بنوێنێت.

پارێزگاریی ئیمانەکەتان و بەندایەتیتان بۆ خوای گەورە، بە پاڵەوانیتی‌یەکی بێ وێنە لەم بارودۆخە دژوارەدا، پلەیەکی گەلێ بەرزە.

بەڵێ، پەیامەکانی نوور لە بەرامبەر هەموو هێرشە دڕندانەکانی ئەم چەرخەوە هەرگیز شکستیان نەهێناوە، بەڵکو سەرسەختترین ملنەدەر و کەسانی نەیاریان بە ڕەسمی ناچار کرد کە بە بڵاوبوونەوەیان ڕازی ببن.

تەنانەت وا ماوەی دوو ساڵە و، دوای وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر پەیامەکان، بەرپرسە گەورەکان و خاوەن پلە و پایە بەرزەکانی وەزارەتی داد ڕێیان بە سەربەستیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور دا و، پەیامە گشتی و نامە تایبەتی‌یەکانیان بە خاوەنەکانیان دایەوە.

یەکێك لەو شتانەی کە دەیچەسپێنن پەیامەکانی نوور موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن لەم چەرخەدا، شکست نەهێنانی ڕێبازی پەیامەکانی نوورە، وەك ئەو شکستەی کە بەسەر ڕێباز و تەریقەتە سۆفی‌یەکاندا هات، بەڵکو سەرکەوتنیەتی بەسەر نەیارانیدا و هێنانی زۆر کەسی ملنەدەر و سەرسەختە لە لایەن ئەو پەیامانەوە بۆ ناو بازنەی ئیسلام، کە ئەمەش گەلێ ڕووداوی زۆر شایەتن لەسەری.

ڕووداوەکان قەناعەتیان پێ داین کە خزمەتکردنی ئایین - بە زۆری لەم وڵاتەدا - لە دەرەوەی بازنەی پەیامەکانی نووردا هەرگیز خزمەتێکی کامڵ دەرناچێت، چونکە هەوڵێکی تایبەتی و جوزئی و تاکەکەسی.. یان کارێکی شکست پێهاتووی پشتی پەردە دەبێت.. یان لە ناوەندی چەند تەحریف و تەئویلێکی نابەجێدا چاوپۆشی و نەرمونیانی لە بەرامبەر بیدعەتەکانەوە دەنوێنێت!

برام! مادەم تۆ هیممەتێکی بەرز و ئیمانێکی بەهێزی دامەزراوت هەیە، ئەوا ببە بە قوتابیی پەیامەکانی نوور و، بە ئیخلاس و دامەزراوی و تەوازوعی تەواوەتییەوە دەستیان لێ گیر بکە، تاکو ببیت بە هاوبەشی دەسکەوتە قیامەتییەکانی هەزاران بەڵکو سەدان هەزار قوتابیی نوور، بە پێی دەستووری هاوبەشیی مەعنەوی و قیامەتییانەی کردارەکان. بەم کارەشت خێر و چاکەکانت لە کردەوەی چاکی "جوزئی" و "تاکەکەسی"یەوە دەگۆڕێت بە خێر و چاکەی "هەمەکی" و "بەکۆمەڵ" و، قازانجی بازرگانییەکی سوودبەخشت لەو دنیادا دەست دەخات)[١].

☐ وانەی حەقیقەتم لای کێ خوێندووە؟

(گومان باشیی زیاد لە پێویستتان بەرامبەر بە من هێندە زۆر و لە سەرووی سنووری خۆمەوەیە کە ناتوانم قبووڵی بکەم، مەگەر بە ناوی کەسی مەعنەویی پەیامەکانی نوورەوە بێت. دەنا هەرگیز لە توانا و سنووری مندا نییە کە تایبەتکارییەکانی ئەو پلە بەرزانە دەربخەم!

پاشان ڕێبازی پەیامەکانی نوور ڕێبازی تەریقەتی سۆفی نییە، بەڵکو هی حەقیقەتە و، لە نووری ڕێبازی هاوەڵە بەڕێزەکانەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - وەرگیراوە!

ئەم ڕۆژگار و زەمانە هی تەریقەتی سۆفی نییە، بەڵکو زەمانی ڕزگار کردنی ئیمانە.

سوپاس بۆ خوا پەیامەکانی نوور تاکو ئێستا و لە دژوارترین بارودۆخدا ئەم ئەرکەی سەرشانی خۆیان ڕاپەڕاندووە.

بازنەی پەیامەکانی نوور لەم ڕۆژگارەدا بریتییە لە بازنەی قوتابیانی ئیمامی عەلی و حەزرەتی حەسەن و حسەین و شێخی گەیلانی، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. چونکە

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٦٨-٣٦٩.

لەسەر شێوازی وەیسی قەرەنی[1]، وانەی حەقیقەتم ڕاستەوخۆ لای ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و بەهۆی شێخی گەیلانی و ئیمام زەینولعابیدین و حەزرەتی حەسەن و حسەینەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - خوێندووە! لەبەر ئەوە، بازنەی کار و خزمەتەکانی ئێمە بازنەکەی ئەوانە.

پاشان من دان بەوەدا دەنێم کە بە هیچ جۆرێك شایانی ئەو پلە بەرزە نیم تا ئەو بەرهەمە بەنرخە لای خوا وەرگیراوە بە هی خۆم دابنێم. بەڵام بەدیهێنانی درەختێکی گەورە و بەرز لە تۆوێکی یەکجار بچووك کارێکە لە توانستی خوای گەورە بەدەر نییە و، بەپێی یاسای کارای خواوەند لە گەردووندا هەمیشە ڕایی دەکرێت و، بەڵگەی مەزنیی ئەو یاسایەی خوایە.

وا من سوێندتان بۆ دەخۆم و دڵنیاتان دەکەم کە مەبەستم لە ستایشی پەیامەکانی نوور پشتگیریی ڕاستییەکانی قورئان و چەسپاندن و بڵاوکردنەوەی پایەکانی ئیمانە.

سوپاسی بێ پایان پێشکەش بە پەروەردگاری میهرەبانم کە ڕاینەهێناوم لە خۆم ڕازی بم، هەروەك عەیب و ناتەواوییەکانی خۆمی بە ڕادەیەك پیشان داوم کە هەرگیز حەزم لەوە نییە خۆم پێش چاوی خەڵکی بخەم.

بەڵێ، کەسێك لەسەر لێواری گۆڕ بێت، ئاوڕ لەو دنیا فانییە ناداتەوە کە لە پشتی خۆیەوە بەجێی هێشتووە. خۆ ئەگەر بۆی بڕوانێت و ئاوڕی لێ بداتەوە ئەوا کارێکی نەفامانەی ئەنجام داوە و زیانێکی گەورەشی لە خۆی داوە.

دەسا خوایە گیان!

لەم چەشنە زیانانەمان پارێزە. ئامین.

دوعا و سڵاومان بە یەك بە یەکی هەموو برایان بگەیەنن و، تکای دوعای خێریان لێ دەکەین)[2].

---

(١) یەکێکە لە گەورە مەردانی تابیعین و خەڵکی یەمەنە. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ژیاوە و موسڵمان بووە، بەڵام لەبەر خزمەتکردنی دایکە پیرەکەی نەیتوانیوە لە مەدینە سەردانی بکات و بە خزمەتی بگات. لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا - خوا لێی ڕازی بێت - هاتووە بۆ مەدینە و پاشان لە کووفە نیشتەجێ بووە. لە جەنگی "صیففین" لەگەڵ حەزرەتی عەلیدا بووە - خوا لێی ڕازی بێت - لەوەش دەچێ کە هەر لەو جەنگە و لە ساڵی "٣٧"ی کۆچیدا شەهید بووبێت. خوا لێی ڕازی بێت. بڕوانە: "أسد الغابة ١/١٧٩ حلية الأولياء ٢/٧٩ الأعلام ٢/٣٢". (وەرگێڕ)

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٧١-٣٧٣.

❒ "ڕاستیی هەمیشەیی" لەسەر شانی کەسانی "فانی" بنیات نانرێت!

(یەکەم: "ڕاستیی نەمر و هەمیشەیی" هەرگیز لەسەر شانی کەسانی لەناوچووی "فانی" بنیات نانرێت، دەنا ستەمێکی زۆر سەرهەڵدەدات. چونکە ئەو ئەرکە گرنگەی کە لە هەموو لایەکەوە سیفەتی بەردەوامی و کەماڵی تێدا بێت، نابێ ببەسترێت بە کەسانێکەوە کە دووچاری نەمان و گرفتاری سووکایەتی دەبن. خۆ ئەگەر ببەسترێت پێیانەوە ئەوا خودی ئەو ئەرکە گرنگە تووشی زیانێکی زۆر دەبێت.

دووهەم: پەیامەکانی نوور زادەی بیری دانەر نین، یاخود بە ڕێژنەی قورئانی پیرۆز لە زمانی پێداویستییە ڕۆحییەکانی دانەرەکەیان هەڵقوڵابێتن. واتە چەند ڕێژنە و بەرەکەتێکی ئەوتۆ نین کە تەنها ڕوویان لە موحتاجی و توانا و لێهاتنەکانی خودی دانەر بێت. بەڵکو لە داواکاریی گوێ بیستان و، هاوڕێ بەڕێز و بێگەرد و ڕاست و توندوتۆڵەکانی دانەرەوە لە دەرسی قورئاندا، سەرچاوەیان گرتووە، کە بە "ڕۆح" داواکاری ئەو ڕێژنە و بەرەکەتانە بوون و پڕ بە دڵ سەلماندوویانە و قبووڵ و جێبەجێیان کردووە. کەواتە چەند ڕێژنەیەکن کە زۆر لە سەرووی توانا و لێهاتنەکانی دانەریانەوەن.

جا هەروەك ئەو هاوڕێ و گوێ بیستانە بوون بەهۆی سەرهەڵدانی پەیامەکانی نوور، هەر ئەوانیشن کە قوتابیان و حەقیقەتی کەسی مەعنەویی پەیامەکانی نوور پێکدەهێنن. بەڵام دانەر تەنها بەشێکی لەو ڕاستییەدا هەیە کە لەوانەیە بریتی بێت لە شەرەفی ڕچەشکاندن و پێشکەوتن، گەر بە بێ ئیخلاسی پووچەڵی نەکاتەوە!

سێیەم: ئەم زەمانە ڕۆژگار و زەمانی کۆمەڵە. چونکە ئەگەر زیرەکی و بلیمەتیی یەك بە یەکی تاکەکەسەکان بگاتە ڕادەی "کاری نائاسایی"ش هێشتا هەر لەوانەیە لە بەرامبەر زیرەکیی کەسی مەعنەویی کۆمەڵەوە شکست بخوات..

بۆیە وەك ئەو برا بەڕێزەی کە نووسیویەتی، منیش دەڵێم:

ئەرکێکی ئیمانیی گرنگ و مەزنی ئەوتۆ کە لە ڕوویەکەوە جیهانی ئیسلام ڕووناك بکاتەوە و لە ڕووناکییەکانی زیرەکییەکی قودسییەوە سەری هەڵدابێت، هەرگیز ناخرێتە ئەستۆی یەك کەسی لاوازی بە ڕواڵەت شکست پێهاتوو، کە چەندین دوژمنی لە ژمارەبەدەر و ڕقەبەری سەرسەخت لە مەلاسدان بۆی و، دەیانەوێت بە سووکایەتی

پێکردنی لە شان و شکۆی دابشکێنن. خۆ ئەگەر ئەو ئەرکە مەزنە بخرێتە ئەستۆی ئەو کەسە لاوازەوە و، ئەویش لە ژێر لێدانی توندوتیژی ئەو هەوڵەی دوژمنانیدا لەرزەی پێ بکەوێت، ئەوا کۆڵی سەرشانی لێ دەکەوێتە خوارەوە و ورد و پەراش دەبێت)[1].

❐ ئیمانداران پێویستیان بە ڕاستی‌یەکی خاوێنە

(برا ئازیز و صددیق و دامەزراو و دڵسۆز و بێگەردەکانم!

*پرسیار*: ئەوانەی پەیوەندی‌یان پێمانەوە هەیە، پرسیارێکی گرنگی ماددی و مەعنەویم لێ دەکەن و، هەمان پرسیار بە دەروونی خۆیشمدا دێت، کە ئەمەیە:

بۆچی ڕەفتارێك دەنوێنیت کە تا ئێستا هیچ کەسێك لەو جۆرە ڕەفتارەی لێ نەبینراوە؟ بۆ ئاوڕێك بە لای ئەو هێزانەدا نادەیتەوە کە گەلێ گرنگن و دەتوانن لە کاروبارەکانتدا یارمەتیت بدەن؟ بۆچی لەم بابەتەدا هەڵوێستت پێچەوانەی خەڵکی‌یە؟ ئەوەتا بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنیت کە هیچ پێویستی‌یەکت بەوانە نی‌یە؟

پاشان بۆچی بە توندی دەست بە ڕووی هەموو پلە و پایەیەکی بەرزەوە دەنێیت کە قوتابی‌یە تایبەتی‌یەکانی نوور - بە یەکدەنگی - تۆ بە شایانیان دەزانن، ئەوەتا بە هەموو توانایەکتەوە لەو پلەوپایانە دوور دەکەویتەوە، لە کاتێکدا کە خەڵکی ئاواتیان بۆ دەخوازن و بە دوایاندا دەگەڕێن! ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانن چەندین سوود و خزمەتی زۆر بە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور بگەیەنن و، ڕێ بۆ فتووحاتی ئەم پەیامانە ئاسان بکەن؟

*وەڵام*: ئەهلی ئیمان، لەم کاتەی ئێستادا، تابڵێی پێویستیان بە ڕاستی‌یەکی گەلێ خاوێن و بێگەردە کە هەرگیز نەگونجێت ببێت بەهۆی دەستخستنی هیچ دەسکەوتێك و، شوێنکەوتەی هیچ شتێك نەبێت و، پلیکانە نەبێت بۆ ئامانجێکی تر و، هیچ مەبەستێك نەتوانێت چڵکن و چەپەڵی بکات و، فەلسەفە و گومانەکانیش نەتوانن خۆیانی لە قەرە بدەن و زەفەری پێ ببەن..

ئیمانداران پێویستیان بە ڕاستی‌یەکی ئاوا خاوێن و بێگەردە کە بەرەو ڕاستی‌یەکانی ئیمان ڕێنماییان بکات. تاکو لەم سەردەمەی ئێستادا، کە هێرشی گومڕایی تێدا سەخت

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٧٤-٣٧٥.

بووە و گومـان و دوودڵیی هـەزار سـاڵی ڕەبەقی تێدا کۆبووەتـەوە، ئیمـانی ئیمـانداران بپارێزێت.

جا لە ڕوانگەی ئەم خاڵەوە کە باس کرا، بازنەی خزمەتی پەیامەکانی نوور ئاوڕ لـەو کەسانە ناداتەوە کە دەستی یارمـەتیی بۆ درێژ دەکـەن، چ لـە نـاوەوەی وڵاتـدا بـن چ لـە دەرەوەی! هەروەها گوێ بەو هێزە بایەخدارەشیان نادات کـە هەیانـە، تەنانـەت هـەر بـە شوێنیشیاندا ناگـەڕێت، تـاکو لـە بـەرچاوی موسـڵماناندا نـەبێت بـە هۆکـارێك بـۆ دەستخسـتنی ئامانجـە دنیاییـەکان. چونکـە ئـەم پەیامـانە هـۆی ژیـانێکی نـەبڕاوەی هەمیشەیین و، جگە لەمە هیچ مەبەستێکی تریان نی‌یە.

مادەم ئەمە وایە، ئەوا پەیامەکانی نوور، بە بۆنەی لێکۆڵینـەوە لەعادەت‌بەدەر و هـێزە ناوازە و بێ وێنەکانیانەوە، دەتوانن ئەو هەموو گومان و دوودڵی‌یانە لا ببەن کە هێرش بـۆ سەر ئیمان دەهێنن و، بە یەکجاری ڕایان بماڵن.

*پرسیار*: پلەوپایە نوورانی‌یەکانی دواڕۆژ چەند پلەیەکی مەعنەوین و لە لای تێکڕای ئەهلی حەقیقەت بە ڕەوا دادەنرێن، تەنانەت هەموویان ئارەزوومەندی ئەو پلەوپایانەن کە هیچ زیانێکیان نی‌یە. بـرا دڵسۆزەکانیشـمان، لەبـەر بـاوەڕی باشیان بەرامبـەرت، پێیـان ڕەوا بینیویت. کەواتە ئەگەر پێیان ڕازی بیت ئەوا نە زیان لە ئیخلاسنت دەکـەوێت و نـە ئەو برایانەشت پێ‌یان ناخۆش دەبێت، چونکە بەڵگـەی زۆریـان لایـە کـە تـۆ شـایانی ئـەو پلەوپایانـەیت! کـەچی لەگـەڵ ئەمەشـدا تـۆ پێیـان ڕازی نـابیت و، بـە تووڕەیـی و توندوتیژی‌یەك دەست بە ڕووی ئـەو پلـە وپایانـەوە دەنێیـت کـە هـەرگیز بـە تـەوازوع دانـانرێت. زیـاد لەمانـەش، دەچیـت هەستی ئـەو برایانـەت زامـدار دەکـەیت کـە ئـەو مەقامانەت پێ ڕەوا دەبینن..

جـا ئایـا بۆچـی تـا ئـەم ڕادەیـە و بـەم شـێوە توندوتیـژە دووریـەرێزی لـەو پلەوپایانـە دەنوێنیت؟

*وەڵام*: هـەروەك مـەردێکی بـەغیرەت لـە پێنـاوی ڕزگـار کردنـی ژیـانی هاوڕێکـانیدا خۆی بەخت دەکات. بە هەمان جۆر، لەبـەر پاراستنی ژیـانی هەمیشـەیی ئیمـانداران لـە بەرامبـەر هێرشـی چـەندین دوژمنـی ترسـناکەوە، گـەر پێویسـت بێـت (کـە ئێسـتا ئـەو پێویستی‌یە هەیە) نەك تەنها ئەو پلەوپایانەی کە شـایانیان نیـم، بـەڵکو چـەندین پلەوپایـەی

ڕاستەقینەی ژیانی هەمیشەییش لەو پێناوەدا بەخت دەکەم. ئەمە لە پەیامەکانی نوورەوە فێر بووم کە بریتی‌یە لە "شەفەقەت" بەرامبەر بە خەڵکی!

بەڵێ، دەبێت لە هەموو کاتێکدا ئەمە وا بێت. بە تایبەت لەم سەردەمەدا و، بە تایبەت‌تریش لە دەمی پەرەسەندنی ئەو بێ ئاگاییەدا کە "گومڕایی" لە ناوەندی زاڵ بوونی تەوژمە سیاسی و بیروڕا فەلسەفی‌یەکاندا، بۆ خەڵکی فەراهەمی هێناوە..

لە چەرخێکی وەك ئەم چەرخەی ئێمەدا کە لەخۆبایی بوون و لەخۆڕازی بوونی تێدا ڕرووژاوە، پلەوپایە بەرزەکان دەیانەوێت هەموو شتێك بکەن بە ئامرازێکی گوێڕایەڵی بەردەستی خۆیان و، هەرچی شت هەیە لە پێناوی ئامانج و مەبەستەکانیاندا بەکاربهێنن. تەنانەت موقەددەساتیشیان دەکەن بە هۆکاری گەیشتنیان بەو پلەوپایانەی دنیا!

خۆ ئەگەر پلەوپایەی مەعنەوی لە ئارادا هەبێت، ئەوا پتر دەرفەتی لێ وەردەگیرێت و، زیاتر لە هەموو شتێك دەتوانرێت بکرێت بە هۆیەکی کاریگەر بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان!

لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ئەو پلەوپایە مەعنەوی‌یەی ببێت، هەمیشە بە تۆمەتبار تەماشا دەکرێت و، خەڵکی دەڵێن:

ئەمە بۆ ئەوەی لە بەرچاوی خەڵکیدا پارێزگاریی خۆی بکات و، وا پیشان بدات کە شایانی ئەو پلەوپایانەیە، دەچێت چەندین خزمەتی پیرۆز و خاوێن و ڕاستیی بەرز ئەنجام دەدات، بەڵام دەیانکات بە چەند هۆکار و پلیکانەیەك تاکو بە ئامانجەکانی خۆی بگات!

بەم چەشنە، دەردەکەوێت کە ئەگەر پلەوپایە مەعنەوی‌یەکان تەنها یەك پاداشتیان بۆ مرۆڤ و پلەکەی تێدا بێت، هەزار و یەك زیانیان تێدایە بۆ خەڵك و بۆ خودی ڕاستی‌یەکانیش، بەهۆی ئەو بێ ڕەواجی‌یەی کە لە گومان و دوودڵی‌یەکانەوە پەیدا دەبن و دێنەڕێی ئەو ڕاستی‌یانە!

*پوختەی ئەم قسانە:*

"ڕاستیی ئیخلاس" نایەڵێت توخنی هەر شتێك بکەوم کە لەوانە بێت بقۆزرێتەوە بۆ دەستخستنی ناوبانگ و گەیشتن بە پلەوپایە ماددی و مەعنەوی‌یەکان.

بەڵێ، هەرچەند ئەمە زیانێکی زۆر بە خزمەتگوزاریی نوور دەگەیەنێت! بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە ڕێنمایی بێگەرد و ڕاستەقینەی "دە کەس"دا پلەی خزمەتگوزاریی هەبێت و،

ڕاستیی‌یەکانی ئیمانیان تێبگەیەنێت کە لە سەرووی هەموو شتێکەوەن، ئەوەم گەلـێ پێ باشترە لەوەی کە مرۆڤ لـە پلـەی "قوتبێکـی مـەزن"دا بێـت و ڕێنمـایی "هـەزار کـەس" بکات. چونکە "چۆنێتی" لە "چەندایەتی" باشترە و، ئەو دە کەسـەش حەقیقەتـەکانیان لـە هەموو شتێك بەلاوە بەرز و باشتر دەبێت و، هەمیشە خۆڕاگر دەبن و، دەگونجێت دڵانـی ئەوان – کە لە حوکمی "تۆو"دان – درەختێکی مەزنی زەبەلاحی لـێ سەوز ببێت..

بەڵام هەزار کەسەکە لەوانەیە لەتاو ئەو هێرش و گومـانانەی کـە لـە لایـەنی ئـەهلی دنیا و فەلسەفەوە ڕوو بە ڕوویان دەبنەوە، دەوری ئەو قوتبە مەزنە چۆڵ بکەن و، بـەم لا و ئەو لادا پەرتەوازە ببن. چونکە لایان وایە ئەو قوتبە لە گۆشـە نیگـای خۆی و پلەوپایـە و هەستە تایبەتەکانیەوە دەدوێت!

لەبەر ئەوە، خزمەتکاریم پێ باشترە لەوەی کە خاوەنی پلەوپایە بم!

تەنانەت من گەلـێ دڵگران بووم و لە خـوای گـەورە پاڕامـەوە کـە ئـەم جارەیـان ئـەو مرۆڤە دووچاری هیچ شتێك نەکات کە بۆ ئەنجامدانی پیلانی دوژمنانم و، بێ هیـچ ڕێ و شوێنێکی یاسایی و، بە پێنج شێوە و، لە ڕۆژانی جەژندا سـووکایەتی پێ کـردم. چونکـە باسەکە لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە و، ترسام گەر خوای گـەورە دووچـاری گرفتێکـی بکات، خەڵکی پلەوپایەم بۆ دابنێن و، بڵێن: ئەمـەی دووچـاری ئـەو کەسـە بـوو ئـەنجامی کەرامەتێکی لەعادەتبەدەرە. لەبەر ئەوە، وتم:

"ئەی پەروەردگارم! ئیسـلاحی حـاڵی بکـە، یـان تۆڵەیـەکی وای لـێ بسـێنەرەوە کـە شایانی بێت، بێ ئـەوەی ئـەو تۆڵەسـەندنەوەیە بـە شـێوەیەك بێـت کەرامـەتێکی مەعنـەوی بگەیەنێت"!)[1].

☐ یاد و پەندێك

(ئا لـەم کاتەدا کە گیروگرفت و تەنگانە دەورەی داویـن، "دەروون"ی شـڵەژاوی بێ ئارامم بێزاری کـردم.. بـەڵام ئـەم بڕگـەیەی خـوارەوە دەمکـوت و بـێ دەنگـی کـرد و، خستیە دۆخی شوکرانەبژێری‌یەوە.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٧٥-٣٧٩.

وا ئەم بڕگەیە، کـە لـە پشتی سـەرمەوە دانراوە، لەگەڵ ئـەم نامەیـەدا دەنێرم بۆتـان، بەڵکو سوودی بۆ ئێوەش تێدا ببێت:

١ – نەفسەکەم! لەو چێژانەی کە بە دوایاندا دەگەڕایت، تۆ بەشی خۆتت بە زیادەوە وەرگرتووە لـە چـاو ئـەوەی کـە لـە سـەدا نـەوەدی خـەڵك وەریـان گـرت. کەواتـە هیـچ بەشێکی تۆیان تێدا نەماوە.

٢ – لە کاتێکدا "چێژەکان" هەموویان کاتی و لەناوچوون، کەچی تۆ دەتەوێت هەر بمێننـەوە و لـەناو نـەچن! لەبـەر ئەوەشـە کـە لـە ئـەنجامی پێکـەنینێکدا یـەك خولـەکی خایاندبێت، دە سەعاتی ڕەبەق فرمێسك دەڕێژیت!

٣ – ئەو ستەم و بەڵا و گرفتانەی هاتنە ڕێت و بەسـەرتا دابـارین، دادگـەریی قـەدەری خوایان تێدایە. ئەوان لەسـەر تـاوانێك ستەمت لـێ دەکـەن کـە ئەنجامت نـەداوە، بـەڵام قەدەری خوا لەسەر "هەڵە و گوناهە نادیارەکانت" بە دەستی بەڵا و موسیبەتەکان تەمێت دەکات و، لەم ڕێیەوە ئەو گرفتەت بۆ دەکات بە کەفارەتی هەڵەکانت.

٤ – ئەی نەفسـە بێ ئارامەکـەم! بـەهۆی سـەدان تاقیکردنـەوەی ژیـانی خـۆت، دڵنیـا بوویت لـەوەی کـە هـەموو بـەڵا و گرفتـە ڕواڵەتییـەکان و ئەنجامـەکانیان، لـە پاشـاندا سـەریان لـە چـەندین بـەروبوومی تـابڵێی بـەتام و لـەزەتی چـاودێریی خواوەنـدەوە دەردەچێت. چونکە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وعسى أنْ تكرهُوا شـيئاً وَهُـوَ خـيرٌ لكـم﴾ (البقرة:٢١٦) وانەی ڕاستییەك دەڵێتەوە کە لەوپەڕی بێ گومانی و دڵنیاییدایە. کەواتـە بـا هەمیشـە ئـەم وانەیەی قورئانی پیرۆزت لە یاد بێت. ئەوەش بزانە کە ئەو یاسـا خواییـەی گەردوون بەڕێوە دەبات – کە یاسـایەکی فراوان و مەزنی قەدەری خواوەندە – هـەرگیز لەبەر خاتری تۆ ناگۆڕێت!

٥ – دەسـتووری: "مَنْ آمَنَ بالْقَدَرِ أَمِنَ مِنَ الْكَدَرِ" بکـە بە ڕابـەری خـۆت و.. وەك منداڵی نەفام بە دوای تام و چێژی بێ نرخی کاتیدا هەڵپە مەکە و.. هەمیشە بیر بکـەرەوە لەوەی کە چێژە لەناوچووەکان چـەندین خـەم و پەژارە و ئـازاری مەعنـەویت بـۆ بـەجێ دەهێڵـن، بـەڵام ئـازار و دەردیسـەرییەکان چـەندین تـام و چێـژی مەعنـەوی و پاداشـتی دواڕۆژت بۆ هەڵدەگرن.

جا ئەگەر وریا بیت و گێل نەبیت، ئەوا تا دەتوانیت تەنها لەبەر "شوکرانە بژێریی خواوەند" تام و چێژە کاتی‌یەکانت بوێت، چونکە تەنها لەبەر شوکرانە بژێریی خوای گەورەیە کە چێژ و تامە کاتی‌یەکانی دنیا بە مرۆڤ بەخشراون)[١].

☐ گومانی باش بە خۆم نابەم

(برا بەوەفا و ڕاستەکانم!

*دەوترێت*: بۆچی بە پلەوپایە و چەند تایبەتکاری‌یەك بۆ خۆت ڕازی نابیت، لە کاتێکدا قوتابیانی نوور لەڕادەبەدەر باوەڕی باش و قەناعەتی تەواویان بەرامبەرت هەیە. خۆ گەر بەو پلەوپایانە ڕازی بییت، ئەوا ئاشکرایە کە شەوق و لێبڕانی ئەوان بۆ کارکردن لە خزمەتی ئیماندا زیاد دەبێت، کەچی ئەو پلەوپایە تایبەتانە لە خۆت دوور دەخەیتەوە و، بە "پەیامەکانی نوور"یان دەبەخشیت و، خۆت بە خزمەتگوزارێکی خاوەن قسوور و ناتەواوی پیشان دەدەیت؟

*وەڵام*: هەزاران شوکر و ستایشی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە. "پەیامەکانی نوور" ئەوەندە پاڵپشتی بەهێزی نەبزواوی زۆر و بەڵگەی گومانبڕی ئاشکرا و ڕوونیان هەیە کە هەرگیز ناکوژێنەوە، بە چەشنێك هیچ پێویستی‌یەکیان بەو قابیلییەت و تایبەتکاری‌یانە نی‌یە کە وا گومان دەبرێت لە مندا هەبن..

"پەیامەکانی نوور" وەك کتێب و بەرهەمەکانی تر نین تا گرنگی‌یان بە لێهاتنی دانەرەکەیانەوە بەسترابێت و، باشی و هێز و پێزیان هی ئەو بێت. نەخێر..

وا بیست ساڵە ئەم پەیامانە پشتیان بە بەڵگە بەهێزەکانی خۆیان بەستووە کە بە ڕادەیەکن دوژمنە ماددی و مەعنەوی‌یەکانیان ناچاری تەسلیم بوون کردووە. ئەمەش لە بەرچاوی هەمواندا ڕوون و ئاشکرایە. جا ئەگەر کەسێتیی من خولگە و پاڵپشتی گرنگی ئەو پەیامانە بوایە، ئەوا دوژمنە مولحید و ناحەزە ستەمکارەکانم، لە ڕێی دەست وەشاندنەوە لە منی خاوەن قسووری گوناهبار دەیانتوانی زەبرێکی توند ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" بکەن. بەڵام بەهۆی هەڵەشەیی و گێلیی خۆیان، دەچن هەرچی فرتوفێڵ و هۆکار و پیلانیان هەیە بۆ نرخ نەهێشتن و شکاندنی کەسێتیی من دایدەڕێژن.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤١٤-٤١٥.

جا لەو کاتەدا کە ئەوان تێدەکۆشن کەس رووم تێ نەکات و لێم نزیك نەبێتەوە، توانای ئەوەیان نی‌یە رێ لە "فتووحاتی ئیمانیی پەیامەکانی نوور" بگرن و، لە رێز و نرخ و بایەخیان دابشکێنن. تەنانەت ناشتوانن خزمەتگوزارە نوێکانی لەم خزمەتە ئیمانی‌یە دوور بخەنەوە، هەرچەندە بێگەردیی دڵ و زەینی هەندێ لەوانیان لێڵ کردبوو.

جا لەبەر ئەم راستی‌یە و، لەبەر پەرەسەندن و زاڵ بوونی "خۆویستی" بە چەشنێکی فراوان لەم سەردەمەدا، هەرگیزاو هەرگیز بەو گومان باشی‌یە لەرادەبەدەرەی کە خەڵك بەرامبەر من هەیانە و لە سەرووی توانا و وزەی خۆمەوەیە، رازی نابم و دەست بە روویەوە دەنێم. چونکە من وەکو براکانم وام، گومانی باش بە خۆم نابەم..

سەرەرای ئەوەی کە ئەو پلەوپایانەی دوارۆژ براکانم بەم هەژارەیان رەوا بینیوە، ئەگەر پلەی راستەقینەی تایبنی بێت و، منیش - خوا نەخواستە - ئەگەر پێی رازی بم، ئەوا بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئەو پلەوپایەیە! خۆ ئەگەر بیشزانم پلەوپایەی وام نی‌یە، ئەوا دەبێ - بە پێی ئەو دەستوورەی کە لە "مەکتووبی دووهەم"دا خراوەتە روو - بەخشش و دیاریی ئەوان وەرنەگرم. ئەمە سەرەرای ئەوەی کە هەرکەسێك خۆی بە خاوەن پلە بزانێت لەوانەیە خۆویستی تێکەڵی کارەکەی ببێت)[1].

☐ هەموو کەلەبەرێکی نەفسم گرتووە

(برا بەوەفا و راستەکانم!

لەو کاتەدا کە ئازاری نەخۆشی بە تەواوی لەسەرم قورس بووبوو، چەند پزیشکێك لە "ئەرکانی قوتابیانی نوور" هاتن بۆ لام، بەڵام سەبارەت بە نەخۆشی‌یە سەختەکەمەوە هیچم لای ئەو قوتابی‌یە راست و دڵسۆزانە نەدرکاند و چارەسەرم لێ وەرنەگرتن، تەنانەت لە بارەی ئەو نەخۆشی‌یانەی گرفتاریان بووم هەر هیچ پرس و رایەکم پێ نەکردن، هەرچەندەش لەو کاتەدا ئازارەکانی ئەو نەخۆشی‌یانە دەیانگوشیم و تابڵێی پێویستم بەوان هەبوو! کە بینی‌یان بە هیچ جۆرێك لە بارەی نەخۆشی‌یەکەمەوە نادوێم، دڵگرانی و ماتەمینی دایگرتن.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٤٠-٤٤٢.

لەبەر ئەوە، ناچار بووم ڕاستییەکیان بۆ ڕوون بکەمەوە کە حیکمەتێکی تێدایە، وا دەینێرم بۆتان بەڵکو سوودی بۆ ئێوەش تێدا بێت:

پێم وتن: دوژمنە پەنهانەکانم و دەروونی بەدخوازم پێکەوە و بە فیتی شەیتان، بە دوای سروشت و دەمارێکی لاواز دەگەڕێن لە مندا، تاکو بیگرن و لەو ڕێیەوە زیان بە خزمەتگوزاریی بێگەردانەی ئیمانم بگەیەنن و، کۆسپ بخەنە ڕێی بڵاوبوونەوەی ڕووناکییەکان.

بەڵێ ڕاستە، لاوازترین لایەن لە مرۆڤدا و، پڕ لە مەترسیترین ڕێگری کار "نەخۆشی"یە! چونکە ئەگەر "نەخۆش" بایەخی زۆر بە نەخۆشییەکەی بدات، هەستەکانی لەشی زیاتر لەسەری توند دەبن و پتر بە سەریدا زاڵ دەبن، هەتا وای لێ دێت دەڵێت: "ئەمە پێویستی و ناچارییە"! ئیتر بەم پێیە "ڕۆح" و "دڵ"ی لە قسە دەخات و، پزیشکەکەی بە وێنەی فەرمانڕەوایەکی خۆسەپێنەر هێندە زاڵ دەکات کە ناچاری گوێڕایەڵیی ئامۆژگارییەکانی ببێت و، ئەو چارەسەرانەش بەجێ بهێنێت کە دایاندەنێت بۆی. ئەمەش شتێکە زیان بە خزمەتگوزاریی ئیمان دەگەیەنێت، کە داخوازی قوربانی و خۆبەختکاری و ئیخلاسی تەواوەتییە.

دوژمنە پەنهانەکانم ویستیان سوود لەم لایەنە لاوازەم ببینن و، ئێستاش هەر هەوڵ دەدەن.. جگە لەوەش دەیانەوێت دەرفەت لە سروشتی ترس و تەماع و ناوبانگ وەربگرن. بەڵام لەم لایەنانەوە هیچ ئامانجێکیان بەدەست نەهێنا و، بۆیان سەلما کە ئێمە گوێ بە هیچ شتێك، تەنانەت بە ئیعدامیش، نادەین.

پاشان ڕەوشتێکی لاواز و دەمارێکی بێ هێزی مرۆڤ بایەخدانە بە تەماع و خەم و خەفەتی گوزەران. لەم ڕووەشەوە گەلێ هەوڵیان دا سوودێك وەربگرن. بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە لەو لایەنە لاوازەشەوە هیچ دەسکەوتێکیان نەبوو. تاکو گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە شمەك و کەرەسەکانی دنیا، لەوانەی کە خۆیان موقەددەساتیان لە پێناودا بەخت دەکەن، لای ئێمە ئەوەندە بێ نرخن کە بەهای هیچ شتێکیان نییە. ئەمەشیان بە چەندین ڕووداوی زۆر و زەبەندە بۆ سەلما. بە ڕادەیەك کە لە ماوەی ئەم دە ساڵەی ڕابوردوودا، سەد جار زیاتر بە شێوەیەکی ڕەسمی لە بەڕێوەبەرایەتییە ناوخۆییەکانیان پرسیبوو: "بە چی دەژی"؟

گەڕان بە دوای دەرکردنی ناوبانگدا و، چاوگێڕان بۆ پلەوپایە، دەمار و لایەنێکی لاوازە لە مرۆڤدا. کاربەدەستان فەرمانیان دابوو دەرفەت لەو دەمارە لاوازەم وەربگیرێت. لەبەر ئەوە، هەموو جۆرێکی زامدار کردنی هەست و، سووکایەتی و، ئەشکەنجە و ئازاریان هێنایە ڕێم!

بەلام - بە فەزڵی خوای گەورە - هیچ شتێکیان بەدەست نەهێنا و، بە تەواوی تێگەیشتن کە ئەو ناوبانگە دنیاییەی ئەوان تا ڕادەی پەرستن شەیدا و عەودالی بوون، ئێمە بە ڕیا و لەخۆڕازی بوونێکی ئەوتۆی دەزانین کە زیانی بۆ مرۆڤ تێدایە و، حەز کردنیش لە پلە و پایە و ناوبانگی دنیا - کە ئەوان بایەخی پێ دەدەن - لای ئێمە فلسێکی قەلب ناهێنێت، تەنانەت ئێمە لەم ڕووەوە ئەوان بە گێل و شێت دادەنێین!

پاشان ئەو لایەنەی کە لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە بە لایەن و دەمارێکی لاواز لە ئێمەدا دادەنرێت، هەرچەند لە ڕاستیدا بە لای هەموو خەڵکییەوە باش و ڕەوایە، بەڵکو لە هەناسەبڕکێ و هەڵپەدان بۆ دەستکەوتنی، کە بریتییە لەوەی مرۆڤ پلەیەکی مەعنەویی بەرزی هەبێت و بە مەقامەکانی "ویلایەت"دا سەربکەوێت..

ئەم لایەنە، هەرچەندە هیچ زیانێکی تێدا نییە و جگە لە قازانج هیچی تری لێ ناوەشێتەوە، بەلام لەم زەمانەی ئێمەدا کە خۆویستی و خۆپەرستی دەستەڵاتی خۆی تێدا سەپاندووە و ڕووی لە بەرژەوەندییە کەسییەکانە، بە ڕادەیەك کە هەموو هەست و نەستێکی مرۆڤ لەو بۆتەیەدا قاڵ بووە کە بیر تەنها لە ڕزگاربوونی خۆی بکاتەوە..

خزمەت کردنی ئیمان ئا لەم زەمانەدا، کە خزمەتێکە پاڵی بە نهێنیی ئیخلاسەوە داوە و، نایەوێت لە لایەن هیچ کەسێکەوە بۆ هیچ ئامانج و مەبەستێك بەکار بهێنرێت.. ئەم خزمەتە، داخوازی ئەوەیە کە مرۆڤ بە دوای پلەوپایەی مەعنەویی کەسیدا نەگەڕێت، بەڵکو هەڵسوکەوتیشی هەرگیز ئەوە نەگەیەنێت کە بە دوایاندا عەودالە و حەزی لێیانە، تەنانەت دەبێت هەر بیریشیان لێ نەکرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو نهێنییەی لە ئیخلاسی ڕاستەقینەدا هەیە، تێك نەچێت و کەلێنی تێ نەکەوێت.

ئەوانەی تێدەکۆشان دەرفەت لەم لایەنە لاوازەم ببینن، ئا لێرەوە بۆیان دەرکەوت کە من لە دەرەوەی خزمەتگوزاریی نووردا بە دوای ئەو کەشف و کەرامەت و پلە و پایە و تایبەتکارییە ڕۆحییانەشدا ناگەڕێم کە هەموو مرۆڤێك بە دوایاندا دەگەڕێت.

سڵاومان بە هەموو یەکێکی برایانمان بگەیەنن و، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە بە میهرەبانیی فراوانی خۆی ئەم "شەوی قەدر"ەی کە لە ڕێماندایە بخاتە بریی هەشتا ساڵ تەمەنی خواپەرستی بۆ یەك بە یەکی قوتابیانی نوور و، حەقیقەتی ئەو شەوەش دەکەین بە تکاکارمان لەو نزا و پاڕانەوەیەماندا)[1].

## چەند نامەیەك بۆ بەرپرسان

❑ گفتوگۆیەك لەگەڵ وەزیری داد و دادوەرەکان

(بەڕێزان!

بۆچی بەبێ هیچ پێویستی و هۆیەك خۆتان بە ئێمە و پەیامەکانی نوورەوە سەرقاڵ دەکەن؟

وا من بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەمەی خوارەوەتان پێ ڕادەگەیەنم:

نە من و نە پەیامەکانی نوور هیچ کاممان ململانێتان لەگەڵدا ناکەین، بەڵکو هەر بیریشتان لێ ناکەینەوە. تەنانەت ئەمە بە کارێکی بەدەر لە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دادەنێین. چونکە پەیامەکانی نوور و قوتابییە ڕاستەقینەکانی، خزمەتێکی مەزن پێشکەش بە نەوەی داهاتوو دەکەن کە لە دوای پەنجا ساڵ دێن! هەروەها بۆ پاراستنی ئەوان لە گێروگرفتێکی گەورە و، دەرباز کردنی وڵات و نەتەوەش لە مەترسییەکی سامناك هەوڵ دەدەن..

کەواتە ئەو کەسەی ئێستا خۆی بە ئێمەوە سەرقاڵ دەکات، ئەو کاتە لەناو گۆڕەکەیدا ڕزیوە و جەستەی بووەتەوە بە خاك! تەنانەت گەر وا دابنرێت ئەم کارەی ئێمە - کە بۆ هێنانەدیی بەختەوەری و ئارامییە - زۆران و ململانێ بێت لەگەڵ ئێوەدا، ئەوا نابێ ئەو کەسانە بگرێتەوە کە ئەو کاتە گڵی ناو گۆڕ دەبن!

ئەو بایەخ پێنەدانە کەمەی کە ئەندامانی ئیتیحاد و تەرەقی لە بەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایین و ڕەوشتە نەتەوەییەکانەوە نواندیان، دوای نزیکەی سی ساڵ بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ئەم بارودۆخانەی ئێستای لەمەڕ ئایین و ڕەوشت و شەرەف و

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٤٤-٤٤٦.

داوێنپاکی. بێ گومان ئەنجامی ئەم بارودۆخانەی ئێستاش دوای پەنجا ساڵ بەسەر نەوەی داهاتووی ئەم نەتەوە قارەمانە ئاییندارە بە شەرەف و غیرەتەوە دەردەکەون!

خۆ ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە ئایینی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی‌یـە هـەرگیز لای ئێـوە شارراوە نی‌یە کە دوای پەنجا ساڵ لەناو ئەم نەتەوەیەدا سەرهەڵدەدەن! چونکە بەشێك لە نەوەی داهاتوو بە چەند پەڵەیەکی ترسناك ڕابوردووی زێڕینی هەزار سـاڵەی ئـەم نەتـەوە گیانفیـدایە چــەپەڵ دەکـات و، لەوانەشــە هـەر بـە تـەواوی - دوای پـەنجا سـاڵ - ئـەو ڕابوردووە بسڕێتەوە!

لەبەر ئـەوە، باشـترین خزمـەت بـەم نەتــەوە و نیشـتمانە پاراسـتنی بەشـێکی نـەوەی داهاتووە لەو نوشوستی‌یە ترسناك و چاوەڕوان کراوە، ئەویش لـە ڕێـی ئـەو ڕاستی‌یانەی کە پەیامەکانی نوور ڕوونیان کردوونەتەوە. کەواتە ئێمە ڕووی گوفتارمان لە مرۆڤی ئەم زەمان و ڕۆژگارە نی‌یە، بەڵکو لە مرۆڤی ئەو ڕۆژگارەیە!

بەڵێ بەڕێزان! هەرچەند "پەیامەکانی نوور" تەنها دەڕواننە ئەودنیا و، ئاوڕ لە شتی تـر نادەنەوە و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گـەورە و ڕزگـار کردنـی ئیمـان هیـچ ئامانجێکی تریـان نی‌یـە و، قوتابیانیشــی تەنـها بـۆ پاراسـتنی خۆیـان و هاوولاتی‌یـان لــە ئیعدامــی هەمیشــەیی و بەندیخانــەی تاکەکەسـیی هەتاهـەتایی تێدەکۆشـن.. لــە هــەمان کاتـــدا خزمەتەکەیان هێندە مەزنە کە سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دنیایە و، وڵات و نەتەوەش لە ئاژاوەکان و، نەوەی داهاتووش لە کەڵبە و چڕنووکی گومڕایی ڕەها ڕزگار دەکـەن. چونکە موسڵمان لە کەسی تر نـاچێت! ئـەوەتا گـەر ئـایین لـە ئەسـتۆی خـۆی داماڵێـت، جگە لە گومڕاییەکی ڕەها هیچی تر لە بەردەم خۆیـدا نابینێتـەوە و، دەبێـت بـە کەسـێکی تۆقێنـەری ئـاژاوەچی و، هـەرگیز بە ڕێسـا و بـەڕێوەبردن بـەرەو گوێڕایـەڵی و ملکـەچی نادرێتەبەر!

بەڵێ، لــە کـاتێکدا کـە دەبینین لـە سـەدا پەنجای ئەوانـەی لەسـەر پـەروەردەی کـۆن پێگەیشتبوون، بایەخ بە نەریتە میللی و ئیسلامی‌یەکان نـادەن.. بە دڵنیاییـەوە پەنجا سـاڵ دوای ئێستا لە سەدا نەوەدیان، بە هاندەری دەروونی بەدخوازی خۆیـان، ئـەم نیشـتمان و نەتەوەیە بەرەو بەربادی و ئاژاوەیەکی هەمەلایەنە دەدەنە بەر.

بێ گومان هەر تەنها بیرکردنەوەم لەم بەلاّ و گیروگرفتە مەزنە و، دۆزینەوەی هۆکارەکانی بەرەودوابردن و چارەسەرکردنیان، بیست ساڵ پێش ئێستا دەستی منیان بە تەواوی لە سیاسەت داتەکاند و، هانیان دام خۆم بە خەڵکی ئەم کات و ڕۆژگارەوە سەرقاڵ نەکەم! هەروەك لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە پەیامەکانی نوور و قوتابیانیشی پەیوەندییان بە کێشە و ململانێکانی ئەم ڕۆژگارەوە پچڕی و، ململانێیان لەگەڵدا ناکەن و پێیانەوە سەرقاڵ نابن.

مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا یەکەم ئەرکی سەرشانی "دام و دەزگای داد" تاوانبار کردنی من و قوتابیانی نوور نییە، بەڵکو پاراستنی پەیامەکانی نوور و قوتابیانیەتی لە هەموو دەستدرێژییەك. لەبەر ئەوەی پەیام و قوتابیانی نوور پارێزگاریی گەورەترین مافی وڵات و نەتەوەیان لە ئەستۆ گرتووە.

لە ڕاستیدا هەر تەنها دوژمنە ڕاستەقینەکانی ئەم وڵات و نەتەوەیەن کە هێرش بۆ سەر پەیامەکانی نوور دەبەن و، دوای ئەوەی کە دام و دەزگای داد دەخەڵەتێنن، هانیشیان دەدەن تاکو ناشیرینترین ستەم و تاوانیان پێ ئەنجام بدەن)[1].

☐ نامەیەك بۆ سکرتێری پارتی گەلی کۆماری

(بۆ بەڕێز حیلمی ئۆران!

وەزیری پێشووی ناوخۆ و سکرتێری ئێستای پارتی گەلی کۆماری[2].

یەکەم:

لە ماوەی بیست ساڵدا و لەو کاتەدا کە ئێوە وەزیری ناوخۆ بوون، تەنها یەك عەرزوحاڵم بۆ نووسین. بەڵام بۆ ئەوەی لەو دەستوورەی ژیانم لانەدەم کە ڕەفتاری پێ

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٣٣٠-٣٣٢.

(٢) پارتی گەلی کۆماری: لە ساڵی ١٩٢٣زدا مستەفا کەمال دایمەزراندووە و، پاش ئەو "عیصمەت ئینۆنۆ" سەرکردایەتیی لە ئەستۆ گرتووە و، وەك تاکە حیزب و بێ نەیار بە زەبر و زەنگەوە هەتا ساڵی ١٩٥٠ز حوکمی وڵاتی کردووە. بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی ئەم ساڵەدا تەنها شەست و نۆ کورسیی لە کۆی چوارسەد و هەشتا و حەوت کورسیی پەرلەماندا بەدەست هێنا. یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئەم پارتە بریتییە لە عەلمانییەت بە واتای دوژمنایەتی کردنی ئایین، هەروەها بانگەشە بۆ نەتەوەگەریی تورك. لە ماوەی حوکمڕانیی ئەم حیزبەدا ستەمی نەتەوەیی لە کورد گەیشتە لوتکە و، ڕاگوێزانی لە خاکی خۆی دەستی پێکرد و، "پەیمانگای گوندەکان"یشی دامەزراند بۆ پێگەیاندنی مامۆستایانێك کە وانەی ئیلحاد بڵێنەوە!

دەکەم، عەرز و حاڵەکەم بۆ نەناردن. ئەگەر پێتان باشە ئێستا بۆتان دەخوێنمەوە و، بە سیفەتی ئەوەی کە وەزیرێکی پێشووی ناوخۆ و، سکرتێری گشتیی ئێستای پارتن، لەگەڵتان دەدوێم.

تکایە یەك دوو سەعات بواری قسەم پێ بدەن، چونکە کەسێك کە ماوەی بیست ساڵ لەگەڵ حکوومەتدا نەدوابێت، گەر دە سەعاتیش و تەنها یەك جار لەگەڵ یەکێك لە پایەکانی حکوومەتدا و، بە سیفەتی نوێنەرایەتیی حکوومەت بدوێت، هێشتا هەر کەمە.

دووهەم:

لەبەر ئەوەی بەڕێزتان سکرتێری ئێستای پارتن، خۆم بە ناچار دەزانم کە ئەم ڕاستییەی خوارەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە:

ئەم پارتەی کە سکرتارێتیی بە ئێوە سپێرراوە، لە بەردەم گەلدا ئەرکێکی گرنگی لە ئەستۆدایە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

ئەم نەتەوەی تورکە و برایانی ئایینیی هاوڕێشی، ماوەی هەزار ساڵە ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرتووە و، بە پاڵەوانێتیی خۆیان سەرجەمی نەتەوەی ئیسلامیان منەتبار و سوپاسگوزاری خۆیان کردووە و، یەکێتیی ئیسلامییان پاراستووە و، بە قورئانی پیرۆز و ڕاستییەکانی ئیمان گرۆی مرۆڤیان لە کوفری ڕەها و گومڕایی ترسێنەر و سامناك ڕزگار کردووە..

جا ئەگەر ئێستا ئەم نەتەوانە - بە وێنەی مێژووی پێشوویان - بە لێبرانێکی قارەمانانە ئەرکی پاراستن و بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان نەخەنە ئەستۆی خۆیان و، ئێوەی غیرەتمەندیش ڕاستەوخۆ کەسانی ئەم نەتەوەیە بۆ ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان هان نەدەن، لە بریی هەڵەی سەردەمی پێشوو کە بانگەشەی بۆ شارستانێتیی خۆرئاوا تێدا دەکرا و، گیانی ئایینیش بەرەو لاوازی دەبرا، ئەوا من مەترسی و هەڕەشەی بێ گومانی دواڕۆژێکی سامناکتان پێش چاو دەخەم و، ئەمەش بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ ڕوون دەکەمەوە. چونکە ئەو کاتە:

جیهانی ئیسلامی، لە بریی خۆشویستنی ئەم نەتەوەیە، نەفرەتی لێ دەکات، تەنانەت دەبێت بە دوژمنی برای پاڵەوانی نەتەوەی تورکی و، ئێوەش لە بەردەم ئەو ئاژاوە و

تۆقاندنەی کە لە ژێر پەردەی ئەو کوفرە ڕەهایەدا خۆی مەڵاس داوە کە بۆ لەناوبردنی جیهانی ئیسلامی تێدەکۆشێت، شکست دەهێنن و دەبن بەهۆی لەت لەت بوون و شپرزیی نەتەوەی تورك کە قەڵای جیهانی ئیسلامی‌یە و، سوپا پاڵەوانەکەشی. هەروەك ڕێگا بۆ خۆسەپاندنی دێوی دڕندەی شیووعیەتیش بەسەر ئەم وڵاتەدا خۆش دەکەن.

بەڵێ، مەگەر تەنها بە هێزی قورئانی پیرۆز، دەنا ئەم نەتەوە قارەمانە هەرگیز ناتوانێت لە بەردەم لافاوەکانی ئەو دوو تەوژمە سامناکەی دەرەوەدا خۆی ڕابگرێت.

کەواتە ئەم لافاوە ڕامالەرەی کوفر و.. ئیستیبدادی ڕەها و.. برەودان بە هەرزەیی و.. موباح کردنی ماڵ و سامانی خەڵك، تەنها ئەو نەتەوەیە دەتوانێت بەربەستی بکات کە گیانی لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا هێندە تەبا و تێکەڵ و هەڵشێلراو بێت کە بووبێت بە بەشێك لە قەوارەکەی و، نەتەوەیەك بێت لەبەر ڕێزنان لە مێژووی ڕابوردووی خۆی، شانازی بە ئیسلامەوە بکات.

بە پشتیوانیی خوا ئەهلی غیرەت و مەردایەتیی ئەم نەتەوەیە، لە ڕێی بڵاوکردنەوەی گیانی ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە – کە بە ناو دەمارەکانی ئەم نەتەوەیەدا ڕۆچووە – ئەو تەوژمانە لە شوێنی خۆیان ڕادەگرن و، لە بریی برەودان بە پەروەردەی شارستانێتیی خۆرئاوا، قورئان دەکەن بە دەستووری ژیانی خۆیان.

تەوژمی دووهەم بریتی‌یە لەوەی کە "دوژمن" ئەو شوێنانەی لە جیهانی ئیسلامیدا داگیری کردوون، بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت و، بە پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵ دەیانبەستێت بە خۆیەوە. تاکو دوای ئەوەی کە ناو و ناتۆرەی بێ دینی و ئیلحادی خستە شوێن ئەم وڵاتە، بتوانێت باوەڕ و متمانەی جیهانی ئیسلامی بەم وڵاتە و بە پلە و پایە مەرکەزی‌یەکەی لە جیهانی ئیسلامدا لەق بکات. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی پچڕانی پەیوەندیی مەعنەویی نێوان ئەم وڵاتە و جیهانی ئیسلامی. ئنجا ئەو گیانی برایەتی‌یەش کە جیهانی ئیسلامی بەرامبەر بەم نەتەوەیە هەڵی گرتووە دەگۆڕێت بە دوژمنایەتی..

ئەمە و پیلانە ترسناکەکانی تری هاوچەشنی، کە تا ئێستا هەندێ سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناوە..

بەڵام گەر ئەم تەوژمە ژیر بێت و پیلانە ترسناکەکەی بگۆڕێت و، وەك نەرمونیانی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا دەنوێنێت، لێرەش لە ناوخۆدا ڕەفتار و مامەڵەی لەگەڵ ئایینی

ئیسلامدا جوان بێت، ئەوا دەسکەوتێکی زۆر بەدەست دەهێنێ و، پارێزگاری لە دەسکەوتەکانی پێشووی دەکات و، ئەم نەتەوە و وڵاتەش لە کارەساتێکی ڕووخێنەر ڕزگاریان دەبێت.

جا ئەگەر ئێوە، کە پلەی سکرتاریێتیی ئەهلی غیرەت و نەتەوایەتیتان گرتووەتە ئەستۆ، هەوڵی پاراستنی ئەو بناغە و بنەمایانە بدەن کە موقەددەساتی ئایینی ئەم نەتەوەیە تێکدەشکێنن و، برەو بە شارستانێتیی خۆرئاوا دەدەن و، لایەنە چاکەکانی کاتی ئێستا و چاکەکاریەکانی ئەم کودەتایە بە هی چەند کەسێکی کەم دابنێن کە بە ناوی کودەتاکەوە هەڵساون و، لە هەمان کاتدا ناتەواوی و کەموکوڕیە ترسناك و تاوانە گەورەکانیش بخەنە ئەستۆی ئەم نەتەوەیەوە.. ئەوا کردارە خراپەکانی چەند کەسێکی کەم دەخەنە ئەستۆی هەموان و دەیانگەیەننە ملیۆنەها کردەوەی خراپ!

دیارە ئەو کاتەش ڕەفتارێکی دژ و پێچەوانەی ئاواتەکانی ئەم نەتەوە ئاییندار و قارەمانە ئەنجام دەدەن و، بێ وەفایی بۆ سوپای ئیسلام دەنوێنن و، بە ڕووکارێکی تری غەیری ئاراستگەی سەرجەمی نەتەوەدا دەڕۆن و، پشت لە ملیۆنان پاڵەوانی مەردی ئەم نەتەوەیە هەڵدەکەن کە شەرەفی شەهیدیان بەدەست هێناوە و، ئازاری ڕۆحە خاوێنەکانیان دەدەن و لە شان و شەرەفیان دادەشکێنن.

هەروەها گەر ئەو چاکەکاریانەی کە بە هیممەتی نەتەوە و هێزی سوپا بەدەست هێنراون، بدرێنە پاڵ ئەو چەند کەسە کەمە کودەتاچیەی، ئەوا ملیۆنان کردەوەی چاك دەتربجێننە چەند چاکەیەکی کەمەوە، کە بەوەش دەپووکێنەوە و، لە ئەنجامدا نامێنن و، ناشبن بە کەفارەتی هەڵە گەورەکانی ڕابوردوو.

سێهەم:

بێ گومان ئێوە لە چەند لایەنێکی ناوخۆ و دەرەوە ناحەز و نەیاری زۆرتان هەیە. خۆ هەرچەند ئێستا بەهۆی بایەخ نەدانم بە دەنگوباسی دنیا و سیاسەت لەو کاروبارانە بێ ئاگام، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمساڵ زۆر تەنگیان پێ هەڵچنیم، ناچاربووم کە بۆ هۆکاری ئەم سەخڵەت کردنە بگەڕێم و، لەمەوە زانیم کە نەیاری و موعارەزەیەك پەیدا بووە.

جا ئەگەر ئەم موعارەزەیە پێشەوایەکی شایستە و لێهاتووی بۆ برەخسێت و، بە ناوی ڕاستییەکانی ئیمانەوە بڕواتە مەیدانەوە، ئەوا یەکسەری بەسەرتاندا سەردەکەوێت! چونکە وا ماوەی هەزار ساڵە لە سەدا نەوەدی ئەم نەتەوەیە بە گیان و دڵ پابەندی داب و نەریتەکانی ئیسلامن و، گەر بە ڕواڵەتیش ملکەچی بۆ شتێکی پێچەوانەی ئەم سروشتەی خۆیان پیشان بدەن، ئەوا هەرگیز بە دڵ پابەندی نابن!!

پاشان "موسڵمان" جیاوازە لە کەسانی نەتەوەکانی تر؛ چونکە ئەگەر موسڵمانێك واز لە ئایینەکەی بهێنێت ئەوا هیچ شتێك لە سنووری خۆی ڕاناگرێت و، تۆقێنەرێکی ئاژاوەچیی لێ دەردەچێت. تەنانەت بە هیچ هۆکارێکی پەروەردە و بەڕێوەبردن بەڕێوە نابرێت، مەگەر ئیستیبدادی ڕەها و بەرتیلی گشتیی بۆ بەکار بهێنرێت. گەلێ بەڵگە و نموونەی زۆر هەن کە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن! لێرەدا بە کورتی لێیان دوام، ڕوونکردنەوەیان بە وریایی و زیرەکیی خۆتان دەسپێرم.

نابێت ئێوە لە دەوڵەتە ئەسکەندناڤیەکان دوا بکەون کە لەم چەرخەدا هەستیان بە پێویستییەکی زۆر بۆ قورئانی پیرۆز کردووە، بەڵکو دەبێ ئێوە پێشەنگی ئەوانیش و دەوڵەتەکانی تری هاوچەشنیان بن.

خۆ ئەگەر گوناهـ و تاوانەکانی ئەم کودەتایە کە تا ئێستا ئەنجام دراون بخەنە ئەستۆی چەند کەسێکی کەمەوە و، ئنجا بۆ چاککردنەوەی ئەو کاولکارییانە هەوڵ بدەن کە بەهۆی بارودۆخی جەنگی جیهانی و چەند ئاڵوگۆڕێکی ترەوە پەیدا بوون، بە تایبەت ئەوانەی کە سەبارەت بە داب و نەریتە ئایینییەکان ئەنجام دراون، ئەوا لە ئایندەدا ئەم هەوڵەتان بە شەرەفمەندییەکی گەورە بۆ دادەنرێت و، کارەکەشتان دەبێت بە کەفارەتی گوناهە گەورەکانتان. ئنجا لەبەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی نەتەوە و نیشتمانی دەکەن شایانی ئەوە دەبن کە سیفەتی "غیرەتمەندان" و "جوامێرانی نەتەوە"تان پێ بدرێت.

چوارەم:

مادەم "مردن" لەناو نابرێت و "دەرگای گۆڕ"یش داناخرێت و.. ئێوەش وەك هەر مرۆڤێکی تر دەبێ بە گورجی بەرەو گۆڕەکانتان بڕۆن.. ئنجا ئەو مردنەش کە دەبێت

هەموو کەسێك بیچێژێت، بۆ گومڕایان "ئیعدامێکی هەتاهەتایی"یە و، سەد هەزار بانگەشەی نیشتمان پەروەری و خۆشویستنی دنیا و دەسکەوتە سیاسیی‌یەکان، هەرگیز ناتوانن ئەو ئیعدامە هەمیشەییە بگۆڕن، مەگەر قورئانی پیرۆز کە بۆ "ئەهلی ئیمان" دەیکات بە پسوولەی پشوودان و حەوانەوە. وەك ئەو پەیامانەی نوور چەسپاندوویانە کە لەبەردەستاندایە و، هیچ فەیلەسووف و مولحیدێك نەیتوانیوە ڕەخنەیان لێ بگرێت، بەڵکو هەرکەسێك لەو فەیلەسووفانە بە وردی و سەرنجەوە ئەو پەیامانەی خوێندبێتەوە پەیامەکان هێناویانەتە ناو بازنەی ئیمانەوە..

تەنانەت لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا چ فەیلەسووفەکان و چ زانا خەبیرەکان و تەنانەت هەر چوار دادگاکانتان، جگە لە سەلماندن و سەرسووڕمان و ڕێزلێنان، شتێکی تریان بەرامبەر ئەو پەیامانە دەرنەبڕیوە و، هیچ ڕەخنەیەکیان لەو بەڵگە بەهێزانەی ڕاستیی‌یەکانی ئیمان نەگرتووە، چ جای ئەوەی زیانێکیان بۆ نەتەوە و نیشتمان تێدا بێت. بەڵکو ئەو پەیامانە وەکو بەربەستێکی قورئانیی چەشنی بەربەستەکەی "زولقەرنەین"وان لە بەردەم تەوژمە سامناکە هێرشبەرەکاندا. سەد هەزار شایەتیشم لەم نەتەوەی تورکە، بە تایبەت لە گەنجە ڕۆشنبیرەکانی، لەسەر ئەم ڕاستیی‌یە بەدەستەوەیە..

لەبەر هەموو ئەم هۆکارانەی کە خرانە ڕوو، ئەرکی بنەڕەتیی سەرشانتان بریتیی‌یە لەوەی کە بەوپەڕی گرنگی و بایەخ پێدانەوە بڵاوکردنەوە و پشتگیریی ئەم بیر و بۆچوونانەم بگرنە ئەستۆی خۆتان.

خۆ ئێوە هەمیشە گوێ بیستی زۆر کەسی سیاسی و دنیایی دەبن. دەبا ئەم جارە - با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت - گوێ لە کەسێکی لاوازی دەستەوسانی وەك من ڕابگرن، کە لەسەر لێواری گۆڕەکەیدا بۆ حاڵی هاوولاتیانی دەگری و، لە پێناوی دواڕۆژیشدا لەگەڵتان دەدوێت)[1].

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ١/٤٣٤-٤٤٠.

## بەندی نۆهەم

## لە بەندیخانەی ئافیوون

### (سێهەم قوتابخانەی یووسفی)

### ١٩٤٨/١/٢٨-١٩٤٩/٩/٢٠ز

❑ وروو ژاندنەوەی سەرلەنوێی تۆمەتەکان

(دوژمنە نهێنییەکانی پەیامەکانی نوور ئەم فتووحاتەی نووریان بینی، ئارامیان لا هەڵگیرا و کاربەدەستانیان لە دژمان وروو ژاند و، جارێکی تر ژیان لە پێش چاومان تاڵ بووەوە. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند چاودێری خوای گەورە جارێکی تر دەرکەوتەوە، چونکە ئەو پەیامانەی کە گیرابوون دەبوو کاربەدەستان - کە لە هەموو کەس زیاتر موحتاجی پەیامەکانی نوور بوون - بە حوکمی کارمەندی و ئەرکی سەرشانیان بیانخوێندایەتەوە! ئیتر ئەو پەیامانە - بە فەزڵی خوای گەورە - توانییان دڵی ئەوان نەرم بکەن و، خوێندنەوەی ئەو پەیامانە بە ڕادەیەك کاری تێکردن کە بوون بە پشتگیری پەیامەکانی نوور! بەمەش سنووری قوتابخانەکانی نوور پتر فراوانیی بەدەست هێنا و لە بریی ڕەخنەگرتن، ڕێز و سەرسووڕمانی خۆیان لە بەرامبەرەوە دەربڕی!

ئەم بەرهەمەش سوودێکی گەلێ زۆری پێگەیاندین و هەموو ئازار و دڵتەنگییەکی لەناوبردین، تەنانەت ئەم بەرهەمە بە سەدان جاریش لە زیانە ماددییەکانمان گەورەتر بوو.

بەڵام دوای ئەوەی ماوەیەکی کەم بەسەر ئەمەشدا تێپەڕی، مونافیقەکان - کە دوژمنە پەنهانەکانن - سەرنجی حکوومەتیان بۆ لای کەسی خۆم ڕاکێشا و، ژیانی سیاسیی ڕابوردوومیان خستەوە یاد و سام و مەترسییەکی زۆریان سەبارەت بە من

بڵاوکردەوە، بە تایبەتی لە ناوەندی فەرمانگەکانی "دادگەری و پەروەردە و ئاسایش و وەزارەتی ناوخۆ"دا.

ئنجا ئەو بەربەرەکانێ و ڕقەبەرایەتییەی کە لە نێوان پارتە سیاسییەکاندا ڕوو دەدات و بۆ ڕەخنە لە یەك گرتن دەیهێننە کایەوە، هەروەها ئەو هەرا و هوریایەی کە ئیرهابی و ئاشووبگێڕان - کە ڕووکاری شیووعییەکانن - بەرپایان کردبوو.. هەموو ئەمانە، ئەوەندەی تر گومان و مەترسیی لایەنە ڕەسمییەکانی فراوانتر کردبوو، تا وای لێ هات حکوومەت هەڵمەتێکی توندوتیژی کردە سەرمان، بە بەندکردن و زەوت کردنی ئەوەی دەستگیریان بوو لە پەیامەکانی نوورا بەم شێوەیە کار و چالاکیی قوتابیانی نوور ڕاوەستا.

ئنجا سەرەڕای ئەو پڕوپاگەندە ژاراوییانەش کە هەندێ لە فەرمانبەر و کاربەدەستان لە دژی من و بۆ زامدارکردنی کەسایەتیم بڵاویان دەکردەوە - کە لە ڕادەیەکدا بوو هیچ کەسێك باوەڕی پێ نەدەکردن - هیچیان سەری نەگرت و نەیانتوانی بە کەسی بسەلمێنن، کەچی سەرەڕای ئەمەش، بە چەند بڕوبیانوویەکی کەم نرخ لە هۆڵێکی گەورەدا و بە تەنیا کەسی لەو ڕۆژە سارد و سڕانەی کە دەتوت زەمهەریرە، دوو ڕۆژ بەندیان کردم. لە کاتێکدا کە من لە ماڵەوە زۆر خۆمم لە سەرما دەپاراست و لەبەر لاوازی و نەخۆشیم هەمیشە مەقەڵی و سۆپام دادەگیرساند)[١].

سەرلەنوێ جارێکی تر هەمان قەوان لێدرایەوە و، ئەو پڕوپاگەندەیە لە وڵاتدا بڵاوکرایەوە کە "نوورسی" کۆمەڵەیەکی نهێنی پێکدەهێنێت و، گەل لە دژی حکوومەت هان دەدات و، بۆ ڕووخاندنی سیستەمی دەوڵەت تێدەکۆشێت و، ناوی "دەجاڵی موسڵمانان" لە مستەفا کەمال دەنێت و.. پڕوپاگەندە و تۆمەتەکانی تری هاوشێوەی ئەمانە. ئیتر مامۆستا نوورسی و پەنجا قوتابیی نوور پێکەوە بران بۆ "دادگای گەورەی سزا" لە شاری "ئافیوون" و، هەموویان لە بەرواری ١٩٤٨/١/٢٣زدا لە بەندیخانەی ئەوێ ڕاگیر کران.

دوای لێکۆڵینەوەی توندوتیژی ڕەسمی، هیچ ماددەیەکیان دەست نەکەوت کە تاوانباریان بکات، بەڵام دادگا بە قەناعەتی ویژدانیی دادوەر - بە بێ پشت بەستن بە

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥١٣-٥١٤.

بەڵگە - بڕیاری زیندانی کردنی بیست مانگی بۆ مامۆستا نوورسی و، هەشت مانگ بۆ زانایەکی بەڕێز و[1]، شەش مانگیشی بۆ بیست و دوو کەس لە قوتابیانی نوور دەرکرد، ئەوانی تریش ئازاد کران[2].

مامۆستا نوورسی و قوتابیانی، سەبارەت بەو مامەڵە هەڕەمەکی‌یە، ئیعتیرازیان ئاراستەی دادگای تەمییز کرد. ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

"مادەم بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بە بڕیاری دادگای دەنیزلی بێ تاوان دەرچووە لەو تۆمەتە، ئەوا ئەو داوایەی کە لە لایەن دادگای تەمییزەوە پشتڕاست کراوەتەوە جارێکی تر لە دادگادا وەرناگیرێتەوە، تەنانەت گەر بڕیارەکەی دادگای دەنیزلی هەڵەش بووبێت".

ئیتر بەم جارێکی تر سەر لەنوێ دادگایی دەستی پێ کردەوە و، تۆمەتبارە بێ تاوانەکان بانگ کرانەوە بۆ لێپرسینەوە. قوتابیانی نووریش داوایان لە دادگا کرد کە بڕیاری "دادگای تەمییز" جێبەجێ بکات، بەڵام دادگا کارەکانی دوادەخست.. تا لە ئەنجامدا بەڵێنی دا بڕیارەکەی دادگای تەمییز جێبەجێ بکات، بەڵام بیانووی هێنایەوە کە خەریکی تەواوکردنی هەندێ کاری ڕەسمی‌یە کە لە پێشدا ناتەواو بووە. کەچی ئەو کارە ناتەواوانە کۆتاییان پێ نەهات هەتا مامۆستا نوورسی و قوتابیانی ئەو ماوەی مەحکوومییەتەیان بردەسەر، سەرباری بڕیارەکانی بێ تاوانی‌یان[3]!

لەم کاتەدا "پارتی دیموکراتی" دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست و[4]، لێبوردنی گشتیی ڕاگەیاند و، کێشەکەش داخرا، چونکە یاسای لێبوردنە گشتی‌یەکە دەیگرتەوە. کەچی دەستەی دادگا "پەیامەکانی نوور"ی بێ تاوان دەرنەکرد، بەڵکو لەسەر بڕیاری دەست بەسەردا گرتنی پەیامەکان بەردەوام بوو، تەنانەت دوو جار بڕیاری دەست بەسەردا گرتنی پەیامەکانی دا، بەڵام دادگای تەمییز هەردوو بڕیارەکەی پێکەوە هەڵوەشاندەوە.

پاشان دادگای ئافیوون ناچار بوو دان بە بێ تاوانیی پەیامەکانی نووردا بنێت و دەستی بەسەردا نەگرێت، کەچی ئەم جارەیان دادگای تەمییز بڕیارەکەی دادگای

(١) مەبەست بەڕێز "ئەحمەد فەیزی قول"ە. (ب: ١٢٧٠)
(٢) لە (١٩٤٨/١٢/٦ز)دا.
(٣) لە (١٩٤٩/٩/٢٠ز)دا ئازاد کران.
(٤) لە بەرواری (١٩٥٠/٥/٢٢ز)دا.

ئافیوونی هەڵوەشاندەوە، لەبەر هەبوونی ناتەواوی‌یەك لـە بنەما ڕەسمی‌یـەكاندا و، داوای كـرد سـەرۆكایەتیی كاروبـاری ئـایینی لـە پەیامـەكانی نـوور ورد ببێتـەوە، ئـەو سەرۆكایەتی‌یەش ڕاپۆرتێكی ئیجابیی لەمەڕ پەیامەكان پێشكەش كرد. ئیتر نووسـراوی ڕەسمی لەو بارەیەوە هەتاساڵی (١٩٥٦ز) بەردەوام بوو.

لە ئەنجامدا دادگای ئافیوون بە كۆی دەنگ و بە پشت بەسـتن بـە ڕاپۆرتـی نـاوبراوی كارشناسەكانی سەرۆكایەتیی كاروبـاری ئـایینی، بڕیـاری بـێ تـاوانیی "پەیامـەكانی نوور"ی دەركرد و، ئەم بڕیارەش بوو بە كۆتـا بڕیـار سـەبارەت بـە پەیامـەكان. دوای ئـەم بڕیارە چاپكردنی "پەیامەكانی نوور" لە هەموو شوێنێكدا ڕێی پێ درا.

مامۆستا نوورسی لە بەندیخانەی ئافیوون هێنـدە دەردیسـەریی چەشـت كـە زۆر زیـاتر بوو لەوەی كە لە بەندیخانەی دەنیزلی چەشـتی، تەنـانەت ئـازاری یـەك ڕۆژی بەندیخانەی ئافیوون لـە ئازاری یەك مانگی بەندیخانەی دەنـیزلی زیـاتر بـوو. چونكـە هێنـدە بـە ئـازاری "ژەهرپێدان"ەوە[1] تلایەوە كە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە خۆراك دابڕا و، بە تەنها خـۆی لە هۆڵێكی گەورەدا بوو، لە كەش و هەوایەكی تابلێی ساردو سڕدا دەژیا و، بواری هیچ كەسێكیان نەدا خزمەتی ئەوی پیری بە تەمـەن بكـات، چونكـە چاوەڕێی ئەجـەلی ئـەویان دەكرد لـەسەر ئەو شێوەیە[2]!

(لـەم كاتەدا كە سەرما تووشی تایەكی قورسی كردبـووم و بـاری دەروونیشـم تـابلێی پەرێشان بوو، چاودێریی خوای گەورە هات بە هانامـەوە و ئـەم ڕاستی‌یەی خـوارەوە لـە ڕووی دڵمدا كرایەوە و، پێی وتم:

"تۆ خۆت بەندیخانەت ناو ناوە قوتابخانەی یووسفی. بەندیخانەی "دەنیزلی"یش چـەندە دڵتەنگی و ئازاری دەرخوارد دان، چەندین هێنـدەی ئـەوە سـوود و دڵخۆشـی و قـازانجی مەعنەویی پێ بەخشین. یەكێك لەو سوودە زۆرانە ئەوەبوو كە هاوەڵـەكانی بەندیخانـەتان سوودێكی زۆریان لـە پەیامەكانی نوورەوە دەسـت كـەوت.. یـەكێكی تـر لـەو سـوودانە ئەوە بوو كە لە ناوەندە بەرزەكانی كاربەدەستاندا دەسـت بـە خوێندنـەوەی ئـەو پەیامانـە

(١) كرداری ژەهرپێدانی لە بەندیخانەی دەنیزلی سێ جار ڕوویداوە. ژەهر دەرخواردانی مامۆستا بەم سیانەوە دەكاتە چواردە جار!

(٢) Tarihce-i Hayat, Afyon Hayati.

کرا، بە ئەندازەیەك کە بەرهەمەکانی ئەو بەندیخانەیە خستنیە شوکرانە و ستایشێکی بەردەوامەوە و، هەموو سەعاتێکی تەنگی و ئازاری ئەو بەندیخانەیەی بۆ کردن بە "دە" سەعاتی پەرستش. بەمەش ئەو سەعاتە براوە و فانییانەی بۆ گۆڕین بە دەیان سەعاتی نەبڕاوە و هەمیشەیی.

ئێستاش ئەم سێهەمین قوتابخانە یووسفییە، پشت بە خوا، ئەوەندە گەرموگوڕیت پێ دەبەخشێت کە ئەم سەرما و سۆڵەیە نەهێڵێت و، هێندە خۆشیت دەداتێ کە دڵتەنگیت لەناوبەرێت. ئەمەش بە سوودوەرگرتنی هاوڕێ موسیبەتدارەکانی بەندیخانەتان لە پەیامەکانی نوور و بەخشینی دڵنەوایی پێیان..

خۆ ئەوانەش کە تووڕەیی و ڕقی تۆیان وروژاندووە، ئەگەر خەڵەتاو یاخود فریودراو بن، ئەوا شایانی ئەوە نین ڕقیان لێ هەڵبگریت، چونکە بە بێ هەستی خۆیان و بە نەزانی ستەمیان لێ کردوویت. بەڵام ئەگەر کەسانێك بە هەست و شعوور و زانینی خۆیان و، لەبەر ڕقێکی ڕەگداکوتاوی ناو دڵیان و، بۆ مەبەستی ڕازی کردنی گومڕایان ئازاریان دابیت، ئەوا بەم نزیکانە بەو مردنەی کە خۆیان بە "ئیعدامی ئەبەدی"ی دەزانن سزا دەدرێن و جێگای تەنگ و تاری ناو گۆڕیش - کە زیندانی تاکە کەسییە - چاوەڕێیان دەکات.

تۆش لەلای خۆتەوە و لە ئەنجامی ئەو ستەمەی ئەواندا پاداشتێکی زۆرت دەست دەکەوێت و، ئەو کات و سەعاتە فانییانەشت بۆ دەکرێن بە دەیان سەعاتی هەمیشەیی و، چەندین تام و لەزەتی خۆشی ڕۆحی و مەعنەویشت دەستگیر دەبێت. جگە لەوەی کە ئەرکە زانستی و ئایینییەکانی سەرشانی خۆت بەجێ دەهێنیت".

بەم جۆرە، ئەم واتایە بۆ ڕۆحم هات و لە ڕووی دڵمدا کرایەوە. ئیتر منیش پڕ بەدڵ وتم: "الحمد لله" و، بە حوکمی مرۆڤایەتیم بەزەییم بەو ستەمکارانەدا هاتەوە و، لە خوای گەورە پاڕامەوە کە ئیسلاحی حاڵیان بکات!

پاشان لە ئیفادەکەمدا بۆ وەزیری ناوخۆ ڕوونم کردەوە و بە "دە" دانە بەڵگە چەسپاندم کە ئەم ڕووداوە تازەیە پێچەوانەی یاسایە، تەنانەت چەسپاندیشم کە ئەو ستەمکارانە خۆیان بە ناوی یاساوە سەرپێچییان لە یاسا کردووە و سنووری یاسایان شکاندووە! چونکە بە دوای بەڵگەی کەم نرخ و دۆزینەوەی بیانووی دەست

هەڵبەست و پڕوپووچـدا دەگەڕان، بە ڕادەیەك كە هەموو كەسێكی ئاگاداری ئەم ڕووداوە گاڵتەی پێ دەكردن و، كەسانی حەقویست و بەویژدانیش دەستیان بە گریان كردا بەم كردەوانەشیان بۆ هەموو خاوەن ویژدانێكیان دەرخست كە هەرگیز ناتوانن بە ناوی یاساوە هیچ بیانوویەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی دەستدرێژی بۆ سەر پەیامەكانی نوور و قوتابیانی بكەن. بەڵام ئەوان بەو جۆرە پێیان ترازا و، بەرە و نزمترین پلەی شێتی و گەلحۆیی نزم بوونەوە!

نموونەی ئەمە: ئەو سیخوڕانە، پاش ئەوەی بۆ ماوەی مانگێك چاودێریان لەسەر دانایین، هیچیان دەست نەكەوت كە پێی تاوانبار ببین، ناچار ئەم ڕاپۆرتە درۆینەیەی خوارەوەیان هەڵبەست كە گوایا:

"خزمەتكارەكەی سەعید لە دوكانێك عارەقی بۆ كڕیوە"!

بەڵام كەسیان دەست نەكەوت ئەم ڕاپۆرتەیان بۆ ئیمزا بكات جگە لە غەریبێكی مەست و سەرخۆش، ئەویش كە دوای هەرەشە و گوڕەشەیەكی زۆر پێیان وت: "ئەم ڕاپۆرتە ئیمزا بكە"، لە وەڵامدا وتی:

"ئەستەغفیروڵلا! كێ دەتوانێت درۆی وا سەیر بكات"!

بۆیە ناچار بوون بە دەستی خۆیان ڕاپۆرتەكەیان بدڕێنن!

نموونەیەكی تر: لەبەر ئەوەی باری تەندروستیم تێكچووبوو، پێویستییەكی زۆرم بە هەڵمژینی هەوای ساف و پاكی سروشتی بوو. لەبەر ئەمە، پیاوێك كە نەمدەناسی و تا ئێستاش هەر نایناسمەوە كێ بوو، عارەبانەیەكی بە ئەسپەكەیەوە پێ دام كە پێی بگەڕێم و گەشتی دەرەوەی شاری پێ بكەم، منیش یەك دوو سەعاتێك دەرۆشتمە دەرەوە بۆ گەڕان بە سواری ئەو عارەبانەیە و، لە كرێی ئەمەشدا بەڵێنم بە خاوەنەكەی دابوو كە بایی پەنجا لیرە كتێبی بدەمێ، تاكو لەو پرۆگرامەی كە بۆ ژیانی خۆمم دانابوو لانەدەم و[1] لە ژێر منەتی كەسدا نەمێنمەوە.

جا ئایا ئەم كارە هیچ شتێكی وەهای تێدایە كە زیانێكی لێ بووەشێتەوە؟!

كەچی فەرمانگەكانی پۆلیس و داد و ئاسایش و تەنانەت پارێزگاریش لە پەنجا جار زیاتر پرسیبوویان: ئەم ئەسپ و عارەبانەیە هی كێن؟

---

(١) واتە وەرنەگرتنی هیچ شتێك لە هیچ كەسێك بە بێ بەرامبەر. (وەرگێر)

وەك بڵێی ڕووداوێکی سیاسیی سامناك بۆ شێواندنی ئاسایش ڕووی دابێت! هەتا لە ناچاریدا کەسێکی خۆبەخش ڕاپەڕی و، وتی: ئەسپەکە هی منە و، یەکێکی تریش وتی: عارەبانەکە هی منە. تاکو کۆتایی بەم پرسیارە کەم نرخانە بێت. بەڵام ئەوانیشیان گرت و لەگەڵ مندا خستیاننە بەندیخانەوە!

بەم چەشنە ڕووداوانە و هاوویْنەیان بووین بە تەماشاکەری گاڵتەی منالان و، بە گریانەوە دەستمان کرد بە پێکەنین و بە خەم و پەژارەوە گاڵتەمان پێ دەکردن! هەروەك بۆمان ڕوون بووەوە کە هەر کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر پەیامەکان و قوتابیانی نوور بەو جۆرە دەبێت بە مایەی گاڵتە و پێکەنینی خەڵك!

با دەمەتەقێیەکی سەیرتان بۆ بگێڕمەوە کە یەکێکی ترە لەو نموونانە:

پێش ئەوەی وەرەقەی تۆمەتبار کردنم بخوێنمەوە و بزانم تیایدا نووسراوە کە گوایا من ئاژاوەم ناوەتەوە و ئاسایشم تێکداوە، بە داواکاری گشتیم وت: "دوێنێ غەیبەتم کردی، چونکە بەو پۆلیسەم وت کە لە بریی بەڕێوەبەری ئاسایش ئیفادەی لێ وەرگرتم:

"خوا لەناوم بەرێ - سێ جار ئەمەشم دووپات کردەوە - کە ئەگەر لە هەزار بەڕێوەبەری ئاسایش و هەزار داواکاری گشتی زیاتر خزمەتی ئاسایشی گشتیم نەکردبێت"!

پاشان لەو کاتەدا کە من زۆر پێویستیم بە حەوانەوە و دوورەپەرێزی لە خەم و خەفەتی دنیا و خۆپاراستن بوو لە سەرما، کەچی ئەوان لەم کاتەدا گرفتاری دوورخستەوە و بەندییان کردم و، بە ڕادەیەکی وا تەنگیان پێ هەڵچنیم کە زۆر لە وزە و توانای خۆم بەدەر بێت و، بە شێوەیەك کە مرۆڤ هەست بکات ئەم کارە لە ڕقێکی شارراوە و تایبەتییەوە هەڵقوڵاوە!

جا هەموو ئەم ڕووداوانە، ڕقێکی زۆریان لە دەروونی مندا دژی ئەوان دروست کرد. بەڵام چاودێریی خوای گەورە جارێکی تر هاتەوە بە هانامەوە و، دڵی منی لەم واتایە ئاگادار کردەوە:

"قەدەری خوا - کە سەرتاپا دادگەریی ڕووت و بێ گومانە - بەشێکی یەکجار گەورەی لەم ستەمەدا هەیە کە ئەوانە لێیان کردوویت و، ڕۆزییەکەی بەندیخانەت

بانگی کردوویت بۆ ئێرە! کەواتە دەبێ لە بەرامبەر ئەم بەشەوە ڕازی بیت و گەردنت بۆ قەدەری خوای گەورە نەوی بکەیت..

ئنجا دانایی و میهرەبانیی پەروەردگاریش بەشی زۆریان تێدا هەیە، وەك: کردنەوەی ڕێی نوور و هیدایەت و ئومێد بەخشین بە دڵ و دەروونی هاوەڵەکانی ناو بەندیخانەتان، کە پاداشتێکی زۆری بۆ ئێوە تێدایە. لەبەر ئەوە، دەبێ لە بەرامبەر ئەم بەشەوە، هاودەم لەگەڵ ئارامگرتندا، هەزاران شوکر و ستایش پێشکەشی خوای گەورە بکەن.

پاشان "نەفس"یش بەشی خۆی هەیە! چونکە کەموکوڕی و کەمتەرخەمیی زۆری نواندووە. جا دەبێ لە بەرامبەر ئەم بەشەی "نەفس"ەوە، تۆبە و داوای لێبوردن بکەن و، بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و، سەرزەنشتی ئەو نەفسانە بکەن و، پێیان ڕابگەیەنن کە شیاوی ئەم زللەیەن..

ئنجا هەندێکیش لەو کارمەند و فەرمانبەرە دەبەنگ و ساویلکە و ترسنۆکانەی کە بە فڕوفێڵی دوژمنە پەنهانەکان فریو دراون، بەشی خۆیانیان هەیە! چونکە پەیامەکانی نوور بە تەواوی حەقی تۆی لەوانە سەندەوە و زللە مەعنەوی‌یەکانی خۆی تێ سرەواندن، خۆ ئەوانیش ئەوەندەیان بەسە!!

بەشی دواهەمینیش هی ئەو کاربەدەست و فەرمانبەرانەیە کە هۆکاری ڕاستەقینە بوون لەم کارەساتانەدا. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانە بە دڵنیایی - بیانەوێت یان نەیانەوێت - سوودی ئیمانی لەو پەیامانە وەردەگرن کە دەیانخوێننەوە - با بۆ مەبەستی توانج و ڕەخنەگرتنیش بێت - ئەوا لێبوردن لەوانە بە پێی یاسای: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ (آل عمران: ١٣٤) بە جوامێری و نەجابەت لە قەڵەم دەدرێت"!

پاش ئەوەی ئەم ئاگاداری‌یەم وەرگرت، کە سەرتاپا حەق و ڕەوایە، بڕیارم دا هەر لە شوکرانەی خوادا بم و لەم قوتابخانە یووسفی‌یە نوێ‌یەدا دان بە خۆدا بگرم. تەنانەت لەبەر تەمێ کردنی دەروونم بڕیارم دا یارمەتیی ئەوانەش بدەم کە دژایەتیم دەکەن!

پاشان گەر سەرنجی یەکێکی وەك من بدەین، کە تەمەنی لە حەفتا و پێنجدایە و لە نێوان حەفتا خۆشەویستدا تەنها پێنج دانەیان ماوە و، حەفتا هەزار نوسخەی پەیامەکانی نووریش کاروباری "نوور"ی‌یانەی خۆیان بەوپەڕی سەربەستی ڕادەپەڕێنن و، ئەوەندە

میراتگر و برای هەیە کە لە بریی یەك دانە زمان بە هەزاران زمان فەرمانبەریی ئیمان جێبەجێ دەکەن.. "گۆڕ" بۆ یەکێکی ئاوای وەك من سەد جار لەم بەندیخانەیە باشترە..

ئنجا ئەم "بەندیخانە"یەش پتر حەوێنەر و دەیان جاریش سوود بەخشترە لەو ئازادیی‌یە پابەند و دەست بەسەری‌یەی دەرەوە و، لە ژیانی ژێر چاودێری و خۆسەپاندنی خەڵك، چونکە لە بەندیخانەدا - بە هەر جۆرێك بووە - مرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ سەدان بەندکراوی تردا فەرمان سەپاندنی هەندێ کاربەدەستی وەك بەڕێوەبەر و سەرۆکی پاسەوانەکان قبووڵ بکات و ئارامی لەسەر بگرێت، چونکە پیشە و کارمەندیی ئەوان لەوەدایە ئەو کارانە ئەنجام بدەن، ئنجا لە لایەن هاوڕێ زۆرەکانی بەندیخانەشەوە دڵدانەوە و دڵنەواییت پێشکەش دەکرێت..

بەڵام لە دەرەوەی بەندیخانەدا دەبێ مرۆڤ بە تەنها خۆی لە بەرامبەر سەدان کاربەدەست و فەرمانبەرەوە دان بە خۆدا بگرێت کە هەموویان دەست دەخەنە ناو کاروباری مرۆڤ و خۆیانی بەسەردا دەسەپێنن!

پاشان سۆز و بەزەیی موسڵمانێتی و سروشتی مرۆڤانەش، بەرامبەر بە پیران - بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە لەم چەشنە حاڵەدان - دەکەوێتە جۆش، ئەمەش ئازار و گیروگرفتی بەندیخانەیان بۆ دەگۆڕێت بە بەزەیی و میهرەبانی..

لەبەر هەموو ئەمانە، پڕ بەدڵ بە بەند کردنم و مانەوەم لە بەندیخانەدا ڕازی بووم!

کاتێ کە هێنایانم بۆ ئەم دادگای سێ‌هەمە، لەبەر پیری و نەخۆشی و لاوازیی لە ڕادەبەدەرم، هەستم بە ماندووبوونێکی زۆر کرد و، نەمتوانی بە پێوە ڕابوەستم و چاوەڕوانی بکەم. بۆیە ناچار بووم لە دەرەوەی دەرگای دادگا لەسەر کورسی‌یەك دابنیشم. هێندەی نەخایاند حاکمەکە هات و بە تووڕەیی و سووکایەتی پێکردنەوە وتی:

"بۆچی ئەم کابرایە بە پێوە چاوەڕوانی ناکات"؟!

منیش لەبەر نەمانی سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە پیران، گەلێ تووڕە و دڵگران بووم. بەڵام کە سەرم هەڵبڕی ئەو کۆمەڵە زۆرەم لە موسڵمانان بەدی کرد کە لە دەورمان کۆبووبوونەوە و، بە چاو و دڵێکی پڕ لە سۆزی بەزەیی و میهرەبانی و برایەتی‌یەوە بۆ ئێمەیان دەڕوانی و، کەسیش نەیتوانی دەریان بکات و دووریان بخاتەوە. کە ئەمەم بەدی کرد، یەکسەر ئەم دوو "ڕاستی"یە هاتنە ناو دڵمەوە:

*یەکەمیان:*

دوژمنە پەنهانەکانی من و پەیامەکانی نوور چەند کارمەندێکی گێل و گەلحۆیان هـان دا کە ئەم هەڵسوکەوتە نزم و سووکانەم لەگەڵدا بکەن، گوایا دەیانـەوێت بـەم چەشنە ڕەفتارانە کەسایەتیم لە پێش چاوی خـەڵکدا بشکێنن و، ڕێـز و ڕووتێکردنـی خـەڵکیش بەرامبەر بە من – کە حەزم لێی نییە و بە دوایدا ناگەڕێم – بگێڕنە دواوە. پێیان وایە بـەم جۆرە هەڵسوکەوتانە دەتوانن بەربەست و دیوارێکی قـایم لـە بـەردەم لافاوی فتووحـاتی پەیامەکانی نووردا دروست بکەن!

جا لە بەرامبەر ئـەو سووکایەتی کردنـەی تاقـە کەسێکەوە، ئەم پشتگیرییە خوایيـە سەرنجی منی بـۆ لای ئـەو سـەد کەسـە وەرچـەرخاند کـە لـە دەورمـان کۆبووبوونـەوە و، ڕێزی خزمەتگوزارییەکانی قوتابیان و پەیامەکانی نووریان دەردەبڕی و، پێی وتم:

"بۆ ئەو کەسانە بڕوانە کە بۆ لای ئێوە هـاتوون و، بـە دڵێکـی پـڕ لـە ڕێـز و خـەفـەت و پەیوەندیی توندوتۆڵەوە ڕێزتان لـێ دەگرن"!

تەنانەت لە ڕۆژی دووهـەمدا کـە مـن وەڵامـی پرسیارەکانی "داوەری لێکۆڵینەوە"م دەدایـەوە، هـەزار کـەس لـە گۆڕەپـانی بەرامبـەر پەنجـەرەکانی بارەگـای دادگـادا کۆبووبوونەوە و، زمانی حاڵیان لە شێوەی ڕوخساریاندا بە جوانی دیار بوو کە دەیوت:

"ئەوانە سەختەت مەکەن"!

ئەوەندەش پەیوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵماندا نواند کە پۆلیس نەیتوانی پەرتەوازەیان بکات و دووریان بخاتەوە!

لەم کاتەدا ئەم واتایە هاتە دڵمەوە کە:

"ئـەو خەڵکـە لـەم کاتـە دژوارەدا بـە دوای دڵدانەوەیـەکی تـەواوەتی و نوورێکـدا دەگەڕێن کە کوژانەوەی نەبێت. تەنانەت بە سروشتیان بـە شـوێن ئیمـانێکی دامـەزراوی قـایم و مزگێنییـەکی ڕاستی بەختەوەریی هەمیشـەییدا عـەودالن. بیستوشیانە کـە ئـەو شتانەی ئەوان بە دوایدا دەگەڕێن، لە پەیامەکانی نووردا دەست دەکەون..

لەبەر ئەوەیـە کـە ئـەو هـەموو ڕێـزە زۆرە بەرامبـەر کەسـی مـن دەردەبـڕن کـە لـە ڕادەیەکدایە گەلـێ زیاترە لە سنووری توانای من و لەو ڕوانگەوەیە کە من خزمـەتکاری ئیمانم. خوا بکات خزمەتێکم بۆ ئیمان ئەنجام دابێت".

*ڕاستیی دووهەم*: ئەم واتایە هاتە دڵمەوە:

لە بەرامبەر سووکایەتی پێ کردنمان بە بیانووی ئەوەی کە گوایا ئاسایشی گشتیمان شێواندبێت و، لە بەرامبەر دوورخستنەوەی خەڵکەوە لێمان بەو هەڵسوکەوتە نزمانەی کە چەند کەسێکی کەمی فریودراو ئەنجامی دەدەن..

لە بەرامبەر هەموو ئەمانەوە.. لە لایەن ئەهلی حەقیقەت و نەوەی داهاتوو ڕێزێکی گەرموگوڕ و شایستەمان لێ دەگیرێت!

بەڵێ، لەو کاتەدا کە لە ژێر پەردەی شیووعیّتیدا و بۆ مەبەستی شێواندنی ئاسایشی گشتیی وڵات، بەوپەڕی چوست و چالاکی ئاژاوە و کاری تۆقاندن و ترس و لەرز بڵاو دەکرێتەوە، ئا لەم کاتەدا، قوتابیانی پەیامەکانی نوور بە هێزی دامەزراوی ئیمانی تەحقیقی لە هەموو گۆشەیەکی وڵاتدا ڕووبەڕووی ئەو ئاژاوانە دەبنەوە و، لە شوێنی خۆیاندا ڕایاندەوەستێنن و، شان و شەوکەتیان دەشکێنن و، تێدەکۆشن کە ئاسایش و یاسا لە جێی مەترسی و ئاژاوەدا جێگیر بکەن.

بۆ ڕاستیی ئەم قسەیەش، لە ماوەی بیستساڵی ڕابوردوودا و لە ڕووی شێواندنی ئاسایشەوە، هیچ ڕووداوێك لەسەر قوتابیانی نوور تۆمار نەکراوە، سەرەڕای زۆری و بڵاوبوونەوەشیان لە هەموو جێگا و گۆشەیەکی وڵاتدا..

ئەوەتا لە "دە" پارێزگا و نزیکەی "چوار" دادگای پەیوەندیدار تا ئێستا هیچ ئەفسەر و بەرپرسێك تاقە ڕووداوێکیان لەسەر تۆمار نەکردوون، تەنانەت چەند ئەفسەرێکی بەویژدانی سێ پارێزگا وتیان:

"لە ڕاستیدا هەریەك لە قوتابیانی نوور ئەفسەرێکی مەعنەویی ئاسایشە لە وڵاتدا. ئەوانە لە پاراستنی ئاسایش و یاسادا یارمەتیمان دەدەن، چونکە پەیامەکانی نوور بە هەرکەسێك بدەن و ئەویش بە خوێندنەوەیان ئیمانی تەحقیقی بەدەست بهێنێت، ئەوا بەم کارە چاودێر و پاسەوانێك لە هۆش و بیری ئەو کەسەدا دادەنێن و، بەمەش تێدەکۆشن ئاسایشی گشتیی وڵات بپارێزن"[1]!

---

(١) بریسکەکان، بریسکەی بیست و شەشەم، ل: ٥١٤-٥٢٠.

## گولبژێرێك لە بەرگریی مامۆستا نوورسی
## لە بەردەم دادگای "ئافیوون"دا

❑ (بەرپەرچدانەوەی لائیحەی ئیددیعاء

دوای بێ دەنگی‌یەك كە هەژدە ساڵی خایاند، وا بۆ مەبەستی بەرپەرچدانەوەی لائیحەی ئیددیعاء ناچار بووم كە ئەم داوایەم پێشكەش بكەم، هەرچەندەش پێشكەشی دادگا و وێنەیەكیشیم پێشكەشی بەرپرسە بەرزەكانی ئەنقەرە كردووە.

ئەمەی خوارەوە پوختەی كورتە بەرگری‌یەكە، كە خۆی لە خۆیدا عەینی حەقیقەتە و، بەو داواكارە گشتی و ئەفسەرە پۆلیسانەم وتووە كە سێ جار لە "قەستەمۆنی" هاتن بۆ پشكنینی ماڵەكەم. هەروەك بە بەڕێوەبەری پۆلیس و هەندێ لە پۆلیسەكان – لە جاری سێ‌هەمدا – و بە دادگای "دەنیزلی" و "ئافیوون"یشم وتووە.

جا ئێوەش بزانن كە بە هەموو ئەوانەم وتووە:

ماوەی بیست ساڵە من بە گۆشەگیری دەژیم، بۆ نموونە بە درێژایی هەشت ساڵی ڕەبەق لە شاری "قەستەمۆنی" بەرامبەر پاسگای پۆلیس مامەوە و، لە شوێنەكانی تریش بە هەمان شێوە. لە درێژایی ئەم ماوەیەدا لە ژێر چاودێریی بەردەوامدا بووم.

هەروەك چەندین جار ماڵیان پشكنیوم، سەرباری هەموو ئەمانەش هیچ نیشانەیەكیان دەست نەكەوت كە ئاماژە بۆ ئەوە بكات پەیوەندیمان بە دنیا و سیاسەتەوە هەبێت.

خۆ ئەگەر هەر چەشنە پەیوەندی‌یەكی لەو جۆرەم ببوایە ئەوا پۆلیس و دادگا دەیانزانی، یان زانیویانە و گوێیان پێ نەداوە، واتە لەم حاڵەدا ئەوان لەچاو من زیاتر بەرپرسیارن!

جا مادەم ئەم كێشەیە بەم جۆرەیە، ئەوا بۆچی تا ئەم ڕادەیە و بێ هیچ پێویستی‌یەك و بە چەشنێ زیان لە وڵات و هاووڵاتی‌یان بدات، دەستدرێژی دەكەنە سەرم؟ لە كاتێكدا كە هیچ شوێنێك لە دنیادا نی‌یە كاری بەسەر كەسانی گۆشەگیر و سەرقاڵبوو بە دواڕۆژی خۆیانەوە بێت!

ئێمەی قوتابیانی نوور بڕیارمان داوە کە هەرگیز پەیامەکانی نوور نەکەین بە ئامراز بۆ هیچ تەوژمێکی ڕامیاری، تەنانەت بۆ سەرانسەری دنیاش بە گشتی. جگە لەوەی کە قورئانی پیرۆزیش بە توندی ڕێی سەرقاڵ بوونمان بە سیاسەت لێ دەگرێت.

بەڵێ، ئەرکی بنەڕەتیی سەرشانی پەیامەکانی نوور خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز و، وەستانی مەردانە و بەجەرگانەیە لە ڕووی کوفری ڕەهادا، کە ژیانی هەتاهەتایی مرۆڤ لەناو دەبات و، خودی ژیانی دنیاش دەکات بە ژەهرێکی تاڵ و دۆزەخێکی لە توانای مرۆڤ بەدەر.

ڕێبازیشی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەی سەرشانی دەرخستنی ڕاستییە خاوێنەکانی ئیمانە، کە ئەو بەڵگە گومان بڕ و بەهێزانە پشتیان دەگرێت سەرسەخت ترین فەیلەسووف و مولحید ناچاری تەسلیم بوون دەکەن بە ئیمان. هەر بۆیە ئێمە مافی ئەوەمان نییە پەیامەکانی نوور بکەین بە ئامراز و داردەستمان بۆ هیچ شتێك، لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: تاکو ڕاستییەکانی قورئان، کە نرخیان لە هی ئەڵماس زیاترە، لە پێش چاوی بێ ئاگایاندا دانەبەزێنرێنە ئاستی وردە شووشە شکاوەکان. چونکە ئەگەر بێت و ئەو ڕاستییانە بکرێن بە ئامراز و داردەست بۆ هەر شتێك، ئەوا گومڕایان پێیان وا دەبێت کە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییانە پڕوپاگەندەی سیاسین و خزمەتی چەند ئامانجێکی دیاریکراو دەکەن. هەروەها لەبەر ئەوەی سووکایەتی نەکەین بەو واتا بەنرخانەی قورئانی پیرۆز.

دووهەم: ڕێبازی پەیامەکانی نوور کە بریتییە لە شەفەقەت و دادگەری و حەق و ڕاستی، بە توندی ڕێی ئەوەمان لێ دەگرێت کە خۆمان لە کاروباری سیاسی و دەستەڵاتی فەرمانڕەوادا هەڵبقورتێنین. چونکە ئەگەر هەندێ کەسیان تێدا بێت کە گرفتاری ئیلحاد بووبێتن و لەو ڕێیەوە شایانی سزا بن، ئەوا لە پشتی هەر یەکێکیانەوە کۆمەڵێك منداڵ و نەخۆش و پیری بێ تاوان هەیە و، گەر هەر کارەسات و گیروگرفتێك بێتە ڕێی هەر کام لەوانەی کە شایانی سزان، ئەوا ئەو بێ تاوانانەش، بەبێ هیچ گوناهێك، بەو ئاگرەی ئەوان دەسووتێن!

هەروەها لەبەر ئەوەی هاتنەدیی ئەو ئامانج و مەبەستەش جێی گومانە، ئەوا بـە توندی ڕێی ئەوەمان نەدراوە کە دەست بخەینـە نـاو کاروبـاری ئیداری‌یـەوە و، لـە ڕێـی هۆکـارە سیاسی‌یەکانەوە ئاسایش و ڕێسای وڵات تێك بدەین.

سێ‌هەم: لـە کـات و سـاتێکی سـەیری وەك ئـەم زەمەنـەی ئێمـەدا، دەبێ پێنج بنـەما جێبەجێ بکرێن، تـاکو بتوانرێت وڵات و ژیـانی کۆمەڵایـەتیی ڕۆڵـەکانی لـە بـەربادی و دابەش بوون بپارێزرێت. ئەو پێنج بنەمایەش ئەمانەن:

١ – ڕێزگۆڕینەوەی چوونیەك.

٢ – شەفەقەت و میهرەبانی.

٣ – دوور کەوتنەوە لە حەرام.

٤ – پارێزگاری کردنی ئاسایش.

٥ – دەست نان بە ڕووی فەوزا و هـات و هەرانانـەوە و، لـە هـەمان کـاتدا ملنـان بـۆ گوێڕایەڵی کردن.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ڕێبازی پەیامەکانی نوور، هـەر لـە سـەرەتاوە تـا ئێسـتا، لـە ژیانی کـۆمەڵایەتیدا ئـەم پێنج بنـەمایە دادەمـەزرێنێت و، کاریان پـێ دەکـات و، ڕێـزیـان بۆ دادەنێت، بەم کارەشی پارێزگاریی بەردی بناغـەی ئاسایشی وڵات دەکـات، ئەوەیـە کە پەیامەکانی نوور توانیویانە لە ماوەی بیست ساڵدا زیاد لە سەد هەزار کەس بکەن بـە ئەندامی سوودبەخش بە وڵات و هاووڵاتییان، بێ ئـەوەی هیـچ ئـازار و زیـانێك لـە ڕێـی ئەوانـەوە بـە هیـچ کەسـێك گەیشـتبێت. لەوانەیـە هـەردوو پارێزگـای "ئیسـپارتە" و "قەستەمۆنی" باشترین بەڵگە و شایەت بن لەسەر ڕاستیی ئەم قسەیەمان.

جا ئەگەر ڕاستی ئەمە بێت، ئەوا بێ گومان زۆربەی ئـەو کەسـانەی کـە دەسـتدرێژی بۆ سـەر بەشـەکانی پەیامـەکانی نـوور دەکـەن، خیانـەت و ناپاکی بەرامبـەر نیشـتمان و نەتەوە و دەستەڵات سالاریی ئیسلام دەردەبڕن و، بە خۆیان بزانن یـان نـەزانن لـە پێنـاوی نانەوەی ئاژاوە و توندڕەویدا کار دەکەن.

ئەو سەد وسی بەشەی پەیامەکانی نوور کە سەد و سـی چاکـە و سـوودیان پێشکەش بەم وڵاتە کردووە، هەرگیز ئەو زیانە وەهمی‌یانە ناتوانن لـەناویان بـەرن کـە بـێ ئاگایـانی کـورت بین و کەسـانی گومـان بزوێن بـە خـەیاڵیاندا دێـت، گوایـا لـە دوو سێ پـەیامدا

ناتەواوی هەبێت. چونکە ئەو کەسەی کە دەیەوێ بەم شوبهە و گومانانە لە شان و شکۆی ئەو پەیامانە کەم بکاتەوە، ستەمکارێکی ئاشکرایە.

سەبارەت بە ناتەواوی و گوناهەکانی کەسی بێ بایەخی خۆیشم، ئەوا ناچارم و بە بێ ئەوەی حەزیشی پێ بکەم و پێم خۆش بێت، کە بڵێم:

کەسێك کە بە درێژایی بیست و دوو ساڵ ژیانێکی نامۆیی وەك ژیانی ناو بەندیخانەی تاکە کەسی بە تەنیایی و گۆشەگیری بەسەر بردبێت و، لە شێوەی ژیانی خەڵکەوە دوور بێت و..

لە درێژایی ئەم ماوەیەدا بە ویستی سەربەستانەی خۆی، نە لە بازاڕەکان و نە لە مزگەوتە گەورەکاندا، تێکەڵی کۆمەڵگا نەبووبێت و..

دژوارترینی جۆرەکانی ئازار و گوشاری هێنرابێتە ڕێ و..

بە پێچەوانەی هەموو دوورخراوەکان، تەنانەت بۆ یەك جاریش سەردانی دام و دەزگاکانی حکوومەتی نەکردبێت و..

یەك دانە ڕۆژنامەی نەخوێندبێتەوە و گوێی لە خوێندنەوەشی نەگرتبێت، تەنانەت بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر بایەخیشی پێ نەدابێت.

باشترین شایەت لەسەر ئەمە هاوڕێ و خۆشەویستە نزیکەکانی ماوەی دوو ساڵی "قەستەمۆنی" و حەوت ساڵی شوێنانی تری ئەون..

تەنانەت ئاگای لە ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی نەبووبێت، بەڵکو نەیشیزانیبێت چ لایەنێك لەو جەنگەدا سەرکەوتووە و چ لایەنێکیش شکستی هێناوە و، بایەخی بە هەواڵی سوڵح و ڕێکەوتن نەدابێت و، هەر نەیزانیبێت لایەنەکانی جەنگ کێن و، هیچ حەزێکی بۆ زانینی ئەو لایەنانە تێدا نەبووبێت و هیچ پرسیارێکیشی لەبارەوە نەکردبن و، لە ماوەی سێ ساڵدا سێ جار نەبێت گوێی لە ڕادیۆ نەگرتبێت کە لە نزیکیەوە هەبوو..

ئەو کەسەی لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە ڕووبەڕووی کوفری ڕەها بووەتەوە، کە کوفرێکە ژیانی هەمیشەیی مرۆڤ لەناو دەبات و ئازارەکانی ژیانی ئەم دنیاش پتر پەرە پێ دەسێنێت و دەیکات بە ئازارێکی چەند جارە. شایەتیشی لەسەر ئەمە سەد هەزار کەسن لەوانەی کە بەهۆی ئەو پەیامانەی نوورەوە، کە لە ڕێژنەی نووری قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئیمانی خۆیان دەرباز کردووە. ئەو پەیامانەی کە مردن سەبارەت

بە سەد هەزار کەسەوە لە بریی ئیعدامی هەتاهەتایی دەکات بە نامەی لـەکار حەوانـەوە و پشوودان..

جا کەسێکی ئـاوا، ئایا چ یاسـایەك هەیـە بـوار بەوە بـدات کـە دەستدرێژی بکرێتـە سەری و، لە ژیان نائومێد بکرێت و، بخرێتە گریان و خەفەت خـواردن، کـە ئـەم کـارەش سەد هەزار کەس لە برایانی دەخاتە گریانەوە؟

تەنانەت دەبێت چ بەرژەوەندییەك لەم کارەدا هەبێت؟

ئایا لە ژێر ناوی دادگەریدا غەدرێکی بێ وێنە ئەنجام نادەن بەم کارەیان؟

ئایا هەر بە ناوی یاساوە دەرچوون نابێت لە یاسا؟

خۆ ئەگـەر ئێـوەش، بە وێنـەی هـەندێ لـەو کارمەندانـەی کـە لـەم پشـکنینانەدا کـار دەکەن، بڕوبیانووتان ئەوە بێت کە:

خۆت و هەندێ لە پەیامەکانت پێچەوانەی ڕژێم و بنەماکانی ئێمەن..

*ئەوا لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:*

یەکـەم: ڕژێـم و بنـەما دروستکراوەکانی ئێـوە هـەرگیز مـافی خۆهـەڵقورتاندنی لـە شوێنی مانەوەی کەسانی گۆشەنشین و کەنارگیردا نییە.

دووهەم: بەرپەرچدانەوەی هەر شتێك جیایە لە وەرنەگرتنی ئەو شتە لە دڵەوە و، کار پێ نەکردنیشی شتێکی تری تەواو جیاوازە. خۆ کاربەدەستانیش تەنها سەیری ئەوەی ناو دەست دەکەن، نەك ئـەوەی لـەناو دڵدایـە. ئنجـا لـە هـەموو شـوێن و وڵاتێکـدا کەسـانی نـەیاری توندوتیـژی حکوومـەت هـەن کـە دەسـت ناخەنـە نـاو کاروبـاری ئاسـایش و بەڕێوەبردنەوە. تەنانەت لە سەردەمی حەزرەتی عومەریشـدا - خـوای لـێ ڕازی بێـت - هیچ کارێکیان بەسەر گاورەکانەوە نەبوو، هەرچـەندەش ئینکـاریی ئیسـلام و یاسـاکانی شەریعەتیان دەکرد.

جا لەسەر ئەم بناغەیە و، بە پشت بەستن بە بنەمای ئازادیی بیر و بۆچوون و شتانی ناو دڵ و دەروونـەکان، گـەر هـەندێ کـەس لـە قوتابیـانی نـوور ڕژێـم و بنـەماکانی ئێوەیـان نەوێت و ڕەخنـەی زانستییانە و بنیاتنـەریان لـێ بگـرن، یـان چـەند کـردەوە و هـەڵس و کـەوتێکیان لـێ ببینـرێت کـە لەگـەڵ ئەو بنەمایانـەدا یـەك نەگرێتـەوە، تەنانـەت کــە لــە دڵیشـەوە ڕقیـان لـە کاربەدەسـتان بێـت، هێشـتا هـەر یاسـا مـافی ئـەوەی نییـە کـە

لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، بە یەك مـەرج، ئـەویش خۆهەڵنەقورتاندنـە لـە کاروبـاری بەڕێوەبردن و، تێکنەدانی ڕێسا و ئاسایشە.

سەبارەت بە پەیامەکانیشەوە، ئەوا ناوی ئەوەمان لێناون کە نهێنی و تایبـەتین و، ڕێـی بڵاوبوونەوەیانمان نەداوە. تەنانەت لە "قەستەمۆنی"دا و لە ماوەی هەشت ساڵدا یەك دوو جـار نوسـخەیەکیان لـەو پەیامـە بۆ هێنـام کـە بـوو بـەهۆی ئـەم ڕووداوە و، لــە هــەمان ڕۆژیشــدا شــاردمانەوە و ونمـان کـرد. کـەچی وا ئێسـتا ئێـوە بـە زۆرەملـێ ئاشـکرای دەکەن و دەری دەخەن. هەر لە ڕاستیشدا بەم کارەی ئێوە ئاشکرا بوو!

شتێکی ڕوونە کە ئەگەر هەر ناتەواوی‌یەك لە هەر پەیامێکدا ببێت کە مایەی تاوانبـار بوون بێت، ئەوا تەنها هەر ئەو وشانە لا دەبرێن و، ڕێ بەوانی تر دەدرێـت. خۆ لـە دوای لـێ وردبوونەوەیەکی چوار مانگی لە سەد پەیامی نـووردا لـە دادگـای "ئەسکی شـەهر" تەنها پازدە وشەیان دۆزی‌یەوە کە مایەی ڕەخنە بێت و، لە چـوار سـەد لاپـەڕەی کۆمەڵـە پەیامی "زولفەقار"دا[1] تەنها دوو لاپەڕەیان تێدا بینی کە لەگەڵ یاسای شارسـتانیدا یـەك نەگرێتەوە، ئەویش تەفسیری ئەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئانن کە تایبەتن بە میرات و پۆشتەیی ئافرەتەوە و سی ساڵ پێش ئێستا نووسراوە..

هەموو ئەمانـە دەیچەسپێنن کـە ئامـانجی پەیامـەکانی نـوور دنیـا نی‌یـە. بـەڵکو هـەموو خەڵکی پێویستیان بەم پەیامانەیە. کەواتە نابێ ئەو کۆمەڵە پەیامەی "زولفەقار" لەبەر ئـەو دوو لاپەڕەیە دەستی بەسـەردا بگـیرێت. بـا ئـەو دوو لاپەڕەیـەی لـێ لا ببرێت و کۆمەڵـە پەیامەکەمان بدەنەوە.. بەڵێ، مافی خۆمانە داوای ئەوە بکەین کە‌بماندەنەوە.

بەڵام ئەگەر پێتان وابێت کە ئیلحـاد یەکێکـە لـە داخوازی‌یـەکانی سیاسـەت و، لـەو گومانە هەڵەیەدا بن کە هەندێ کەس پێوەی گیرۆدە بووە، گوایا دەڵێن: تۆ بەم پەیامانەی بڵاویان دەکەیتەوە شارستانێتی‌یەتەکەمان لـێ دەشێوێنیت و ڕێـی ئـەوەمان لـێ دەگریـت کە تامی لەزەت و جوانی‌یەکانی ژیانی دنیا بچێژین..

ئـەوا منیش دەڵێـم: هیـچ گـەلێك نی‌یـە کـە بتوانێـت بـە بـێ ئـایین بـژی. ئەمـەش دەستوورێکی گشتی‌یە و لە سەرانسەری دنیادا دانی پێدا نراوە. بە تایبـەت گـەر کوفـری ڕەها لە کایەدا ببێت کە هەر لە دنیادا سزایەکی گەلـێ سەخت و دژوارتر لە هی دۆزەخ

(١) هەرسێ پەیامی موعجیزاتی قورئانی و موعجیزاتی ئەحمەدی و حەشر لەخۆ دەگرێت.

بۆ خاوەنەکەی فەراهەم دێنێ. وەك لە پەیامی "ڕابەری لاوان"دا بە چەندین بەڵگەی بەهێزی ئەوتۆ چەسپاوە کە وتوویژ و چەند و چۆن هەڵناگرێ. ئەو پەیامەش بە ڕەسمی چاپکراوە.

چونکە ئەگەر - خوا نەخواستە - موسڵمان لە ئایینەکەی خۆی وەربگەڕێ، ئەوا یەکسەر دەکەوێتە ناو کوفری موتلەقەوە و، هەرگیز لە ناوەندی ئەو کوفرە گومان لێکراوەدا نامێنێتەوە کە تا ڕادەیەك مۆڵەتی ژیان بە خاوەنەکەی دەدات، بەڵکو هێشتا وەك مولحیدانی بیانیشی لێ نایەت، تەنانەت لە ڕووی چەشتنی تام و چێژەکانی دنیاوە کە خۆی تەسەووریان دەکات دادەبەزێتە ئاستێکی ئەوەندە نزمەوە کە سەد هێندەی پلەی ئاژەڵ نزمتر بێت، چونکە ئاژەڵ هەست بە واتای ڕابوردوو و داهاتوو ناکات، بەڵام مردنی بوونەوەرانی پێشین و دواین و جودایی و لێکدابڕانی هەمیشەییان، گەلێ ئازاری یەك لە دوای یەك دەرخواردی ئەو مرۆڤە دەدات کە دووچاری گومڕایی بووە.

بەڵام هەر ئەوەندەی ئیمان هات و تێکەڵی پەڕەکانی دڵی مرۆڤ بوو، ئەوا یەکسەر سەرجەمی ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەی کە لە ژمارە نایەن زیندوو دەبنەوە و بە زمانی حاڵ دەڵێن: "ئێمە نەمردووین.. لەناو نەچووین"! ئیتر بەم جۆرە، ئەو بارە دەروونی‌یە دۆزەخ ئاسایەی پێشوو دەگۆڕێت بە چەندین تام و چێژی خۆش و باخ و گوڵزاری دڵگیر.

جا مادەم "ڕاستی" ئەمەیە.. ئەوا من ئەمەی خوارەوەتان یاد دەخەمەوە:

مەڕۆنە مەیدانی زۆران لەگەڵ "پەیامەکانی نوور"دا کە پاڵیان بە قورئانی پیرۆزەوە داوە، چونکە ئەو پەیامانە هەرگیز شکست ناهێنن. دەنا گەر کەسێك هەوڵی کوژاندنەوەی ئەو ڕووناکی‌یانە بدات، ئەوا کاروباری ئەم وڵاتە جێی داخ و پەژارە دەبێت و[1] پەیامەکان لێرە دەڕۆن بۆ شوێنێکی تر و ئەوێش ڕووناك دەکەنەوە.

دەسا باش بزانن کە:

ئەگەر بە ئەندازەی ئەو موانەی بە سەرمەوەیە "سەر"م هەبێت و هەموو ڕۆژێکیش یەکێکیان لە جەستەم بکرێتەوە، ئەوا ئەم سەرەی کە بۆ ڕاستی‌یەکانی قورئان بەختم

---

(١) ئەو بوومەلەرزە توندوتیژانەی لە کاتی شەڕفرۆشتن بە پەیامەکانی نوور ڕوویان دا لەوانەیە ڕاستیی ئەو بڕیارە بچەسپێنێت کە: کاروباری ئەم وڵاتە جێی داخ و پەژارە دەبێت. (دانەر)

کردووە، هەرگیز لە بەردەم ئیلحاد و کوفری موتڵەقدا داینانەوێنم و، هەرگیزاو هەرگیز واز لەم خزمەتە نوورانی‌یە ناهێنم، تەنانەت هەر ناشتوانم وازی لێ بهێنم.

بێ گومان نابێ سەیری ناتەواوی‌یەکانی ئیفادەی کەسێك بکرێت کە ماوەی بیست ساڵە لە گۆشەگیریدا دەژی و پێی ناوترێ لە مەبەست لایداوە. چونکە مادەم دادگای "ئەسکی شەهر" ماوەی چوار مانگی ڕەبەق لە پشکنین و لێ وردبوونەوە لە سەد پەیامی پەنهان و ئاشکرادا، یەك دوو مادده نەبێت لە یەك دوو پەیامدا، هیچ شتێکی نەدۆزی‌یەوە کە مایەی تاوانبارکردن بێت، کە ئەو دوو ماددەیەش سزایەکی سووکەڵە دەسەپێنن، تەنانەت ئەو دادگایە تەنها بڕیاری بەند کردنی ماوەی شەش مانگی بەسەر پازدە کەسدا دەرکرد لە نێوان سەد و بیست کەسدا و، ئێمەش ئەو ماوەی سزایەمان لە بەندیخانەدا بەسەر برد..

هەروەها مادەم سەرجەم بەشەکانی پەیامەکانی نوور پێش چەند ساڵێك کەوتنە بەردەستی بەرپرسان، ئنجا لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەو پەیامانەدا کە چەند مانگێکی خایاند هەموویان درانەوە بە خاوەنەکانیان..

هەروەها مادەم ماوەی هەشت ساڵ لە شاری "قەستەمۆنی"دا و سەرباری پشکنینی وردیش هیچ نیشانەیەکی وا دەرنەکەوت کە پەیوەندیی بە کاری دادگەری و ئاسایشەوە ببێت..

هەروەها مادەم چەند ساڵێك پێش ئێستا بۆ دواهەمین دەستەی کارشناسان لە "قەستەمۆنی" ڕوون بووەوە کە هەندێ لەو پەیامانە لە ژێر لیژنەدارێکدا دۆزراونەتەوە، ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە بڵاو نەکراونەتەوە، بەڵکو ون کراون..

هەروەها مادەم بەڕێوەبەری پۆلیس و بەرپرسی "داد" لە "قەستەمۆنی" بە جەخت کردنەوە بەڵێنیان پێ دام کە کتێبە شارراوەکانم بدەنەوە، بەڵام ڕۆژی دوای ئەوە و پێش ئەوەی وەریان بگرمەوە و تەنها بە گەیشتنی فەرمانی گرتن، گیرام و بەند کرام..

هەروەها مادەم هەردوو دادگای "دەنیزلی" و "ئەنقەرە" بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکردین و سەرجەم پەیامە گیراوەکانیان داینەوە..

جا لەسەر بناغەی ئەم شەش ڕاستی‌یانە، بە پێی خواست و پێویستیی سەرشانی دادگا و داواکاری گشتیی "دەنیزلی"، ئەرکی سەرشانی دادگا و داواکاری گشتیی

"ئافیوون"یشە کە سەرجەم مافە گرنگەکانم ڕەچاو بکەن. من ئومێدم وایە و چاوەڕوانم لەو داواکارە گشتی‌یەی کە بەرگری لە مافە گشتی‌یەکان دەکات، بەرگری لە مافە کەسی‌یەکانی منیش بکات کە بە بۆنەی پەیامەکانی نوورەوە ئەو مافانەم بوون بە مافی گشتی.

"سەعیدی نوێ" کە بیست و دوو ساڵە لە مەیدانی ژیانی کۆمەڵایەتی کشاوەتە دواوە و، هیچ شتێك لەبارەی یاساکانی ئێستا و شێوازەکانی نوێی بەرگری نازانێت و.. پێشتریش سەد لاپەڕە بەرگریی پڕ لە بەڵگەی بەهێزی پووچەڵ نەکراوی پێشکەش بە دادگاکانی "ئەسکی شەهر و دەنیزلی" کرد و.. تا ئەو کاتە و دواتریش لە "قەستەمۆنی" و "ئەمیرداغ"دا و لە ئەنجامی قسوورەکانی خۆیەوە ژیانی بە گیرۆدەیی بەسەر برد، چونکە لە ژێر چاودێریی بەردەوام و بە وێنەی زیندانی تاکە کەسی ئەو ماوەیەی ژیانی بردە سەر..

ئەم "سەعیدە نوێ"یەی کە ئەمە حاڵیەتی، بێ دەنگی هەڵدەبژێرێت و، بواری قسە کردن بۆ "سەعیدی کۆن" بەجێ دەهێڵێت.

"سەعیدی کۆن" دەڵێت:

"سەعیدی نوێ" پشتی لە دنیا هەڵکردووە و، لەگەڵ ئەهلی دنیا نادوێ و، ئەگەر ناچار نەکرێت هیچ پێویستی‌یەکیش نابینێت بۆ بەرگری لەخۆ کردن..

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کێشەیە پەیوەندیی بە گەلێ کەسی بێ تاوانەوە هەیە لە جووتیاران و کاسبکاران، کە بەهۆی پەیوەندی‌یەکی لاوازیان پێمانەوە بەند دەکرێن و، کار و پیشەیان نوشوستی دەهێنێت و، لەم وەرزی کارکردنەدا ناتوانن پێداویستیی خێزان و منداڵیان جێبەجێ بکەن و.. ئەم دیاردەیەش لە ناخەوە منی خستە گریانەوە..

بۆیە سوێند بە خوای گەورە دەخۆم کە ئەگەر لە توانامدا ببوایە سەرجەم دەردیسەری‌یەکانی هەموو ئەوانەم دەخستە ئەستۆی خۆمەوە، چونکە ئەگەر هەر تاوان و گوناهێك ببێت ئەوا تەنها هی منە و، ئەوانە هەموویان بێ تاوانن)[1].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٥٣٤-٥٤٢.

□ چەند خالێکی تر

(چەند خالێکی تر هەن کە دەمەوێ بیانخەمە پێش چاوی بەڕێوەبەرایەتیی شاری "ئافیوون" و دادگا و پۆلیسی ئەم شارە:

*یەکەم:*

پەیدا بوونی زۆربەی پێغەمبەران - درووودی خوایان لەسەر بێت - لە خۆرهەلآت و ئاسیا.. سەرهەلدانی زۆرینەی فەیلەسووفەکانیش لە خۆرئاوا و ئەوروپادا، ئاماژەیەکی ئەزەلیی قەدەری خوای گەورەیە بۆ ئەوەی کە لە ئاسیادا "ئایین" زاڵ و فەرمانڕەوایە و لەوێ فەلسەفە لە پلەی دووهەمدا دێت..

جا لەسەر بناغەی ئەم هێمایەی قەدەری خوای گەورە:

ئەگەر کاربەدەست لە ئاسیادا بۆ خۆی ئاییندار نەبێت، دەبێ لانی کەم کاری بەسەر کارگوزارانی ئایینەوە نەبێت، بەڵکو پێویستە پشتیان بگرێت و، هانیان بدات لە کارەکانیاندا بەردەوام بن.

*دووهەم:*

قورئانی پیرۆز وەك بیر و ژیریی زەوی وایە. خۆ ئەگەر خوا نەخواستە قورئان لەم زەوییە بڕواتەدەر، ئەوا زەوی شێت دەبێت و، دوور نییە ئەو کاتە سەری خۆی -کە ژیریی تێدا نەماوە- بکێشێت بە یەکێك لە هەسارەکاندا و، ئەم کارەساتەش ببێت بە هۆی بەرپابوونی قیامەت.

بەلێ، قورئان دەستاوێزێکی قایمە و، ئەو پەتە توندوتۆڵەیە کە عەرش و فەرش بە یەکەوە گرێ دەدات و، زیاتر لە "هێزی کێش" زەوی ڕاگیر دەکات! پەیامەکانی نووریش تەفسیری ڕاستەقینە و بەهێزی ئەم قورئانە گەورەیەن.

خۆ ئەم پەیامانەی کە وا ماوەی بیست ساڵە کاریگەریی خۆیان لەم نیشتمانە و لەم سەردەمەدا پێش چاو خستووە، بە نیعمەتێکی گەورەی خواوەند و موعجیزەیەکی خامۆش نەبووی قورئانی پیرۆز دادەنرێن. کەواتە نەك هەر نابێ حکوومەت دەستدرێژییان بکاتە سەر و قوتابیانی بترسێنێت بە مەبەستی دوور خستنەوەیان لەو پەیامانە، بەڵکو دەبێ پارێزگاری لەم پەیامانە بکات و خەڵکی بۆ خوێندنەوەیان هان بدات.

*سێیەم:*

لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئیمانداران ئایندە کردەوە چاکەکانیان بە دیاری بۆ ئیماندارانی پێشینی خۆیان دەنێرن و، دوعای لێخۆشبوونیان لە حوزووری خوای گەورەدا بۆ دەکەن.. لەسەر ئەم بناغەیە، لە دادگای "دەنیزلی" پێم وتن:

ئەگەر لە دادگای هەرە گەورەی قیامەتدا ملیارەها کەسی ئەهلی ئیمان پرسیاریان لەوانە کرد کە لە دنیادا گوشاریان دەخستە سەر قوتابیانی نوور و بڕیاری بەندکردنیان بۆ دەردەکردن، ئەو قوتابیانەی کە لە پێناوی دەرخستنی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزدا تێدەکۆشن، ئەگەر پرسیاریان لێ کردن و وتیان:

ئێوە لە دنیادا بەوپەڕی سنگ فراوانی و بە ناوی یاسای ئازادییەوە بوارتان بە کتێب و بڵاوکراوەی شیووعی و مولحیدان دەدا و چاوپۆشیتان لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانە دەکرد کە نانەوەی پشێوی و ئاڵۆزییان لە ئامێز گرتبوو، تەنانەت هەر هیچ ئاستەنگ و لەمپەرێکتان لەبەردەم کارەکانی ئەواندا دانەنا، کەچی لە ڕێی بەندکردن و چەندین هۆکاری تری گوشار و تەنگ پێ هەڵچنینەوە دەتانویست پەیامەکانی نوور و قوتابیانی لەناوبەرن، لە کاتێکدا کە ئەوان لە پێناوی ڕزگار کردنی نیشتمان و نەتەوە لە ئیلحاد و فەساد و، هاوولاتیانیش لە ئیعدامی هەمیشەیی تێدەکۆشان..

ئەگەر لەوێ ئەم پرسیارەیان ئاراستە کردن، چ وەڵامێکیان دەدەنەوە؟ خۆ ئێمەش لێرە هەر هەمان پرسیارتان لێ دەکەین؟

لەو دادگایەدا ئەمەم پێ وتن. ئیتر ئەو زاتە بەڕێزانەی کە خاوەنی ویژدان و دادگەری بوون، بڕیاری بێ تاوانیی ئێمەیان دەرکرد و، دادگەریی دام و دەزگای "داد"یان پێش چاو خست.

*چوارەم:*

من لە لایەنی خۆمەوە چاوەڕوانیی ئەوەم دەکرد کە "ئەنقەرە" یان "ئافیوون" بۆ بەردەم لیژنەیەکی ڕاوێژکار بانگم بکات و، پرسیار و وەڵام لە نێوانماندا بگۆڕینەوە سەبارەت بەو بابەتە گەورە و گرنگانەی کە پەیامەکانی نوور خستوویانەتە ئەستۆی خۆیانەوە..

بەڵێ، پەیامەکانی نوور بەهێزترین هۆکار و کاریگەرترین دەرمان و چارەسەرە لەم وڵاتەدا بۆ گێڕانەوەی برایەتیی ئیسلامیی پێشوو و خۆشەویستیی ڕابوردوو، هاودەم لەگەڵ گومان باشی و هاوکاری لە نێوان سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵماندا و، بۆ دۆزینەوەی ڕێگاکانی ئەم هاوکارییەش. وا لە خوارەوەدا نیشانەیەکی ڕوونی ئەمە پێش چاو دەخەم:

ئەمساڵ زانایەکی گەورە لە "مەککەی پیرۆز" چەند بەشێکی گەورەی لە پەیامەکانی نوور وەرگێڕا بۆ زمانی هیندی و عەرەبی و، ئەم وەرگێڕانانەشی نارد بۆ هیندستان و حیجاز و، وتی:

"پەیامەکانی نوور بۆ هێنانەدیی یەکێتی و برایەتیی ئیسلامیمان تێدەکۆشن، کە بەهێزترین پشتگیری ئێمەیە. بەمەش بۆمان دەردەخات کە خەڵکی تورکیا لە بوارەکانی دین و ئیماندا هەمیشە لە پێشەنگی شوێنانی ترەوەن".

هەروەها چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد ئەو مەسەلە و بابەتە گرنگانە بورووژێنرایە کە بە وێنەی چیا گەردن کەشەکان مەزن و گەورەن، وەك:

"ئایا ڕادەی خزمەتی پەیامەکانی نوور و قوتابیانی چەندەیە لە دژی ئەو شیووعییەتەی کە لە نیشتمانی ئێمەدا بووە بە بزووتنەوەیەکی ئاژاوەچی؟ چۆن دەتوانرێت ئەم نیشتمانە پیرۆزە لەم لافاوە ڕامالەر و ترسناکە بپارێزرێت"؟

لەو کاتەدا کە من چاوەڕوانی ئەمانەم دەکرد، کەچی دەبینم ڕووبەڕووی چەند کێشەیەکی هێندە بێ نرخ دەکرێمەوە کە کێشی باڵە مێشێکیان نییە و، ئەوەندە هەندەکین کە هیچ بەرپرسیارییەك هەڵناگرن و، ڕق وقین و بوختان و قسەی دەمهەڵبەستی کەسانێکن کە شتی بچووکی وەك دەنکە گەنمێك هێندەی گومەزێك گەورە دەکەن..

بەم جۆرە و لەم چەشنە هەل و مەرج و بارودۆخە دژوارەدا، هێندە ئازارم چەشت کە پێشتر و تا ئێستاش ئازاری تری هاوچەشنی ئەوەم نەچەشتووە. هەر هەمان ئەو پرسیارانەشمان لە هەمان ئەو مەسەلانەدا ئاراستە کراوەتەوە کە سێ دادگای پێشوو ئاراستەی کردین و، بێ تاوانیی ئێمەیان لەبارەیانەوە ڕاگەیاند، جگە لە یەك دوو مەسەلەی کەسی و بێ نرخ نەبێ کە هیچ واتایەکیان تێدا نییە.

*پێنجەم:*

ئاستەنگ دانان لە بەردەم پەیامەکانی نووردا و زۆران گرتن لە گەڵیاندا، لە توانای کەسدا نی‌یە! چونکە ئەم پەیامانە شکست ناهێنن و بە هیچ کەسێك نابەزێن. ئەوەتا وا ماوەی بیست ساڵە سەرسەخت ترین فەیلەسووف دەمکوت و بێ دەنگ دەکەن و، بە وێنەی خۆری ئاسمانیش لە ڕۆژی ڕووناکدا ڕاستی‌یەکانی ئیمان ئاشکرا دەکەن.

کەواتە دەبێ ئەوانەی حوکمی ئەم نیشتمانەیان لە دەستدایە سوود لە هێزی ئەم پەیامانە وەربگرن.

*شەشەم:*

سووك سەیر کردنی من لە ڕێی دەرخستنی هەڵەکانی "کەسێتیی" بێ بایەخی خۆمەوە و، شکاندنم لە پێش چاوی خەڵکدا بە سووکایەتی پێ کردنم، هیچ زیانێك بە "پەیامەکانی نوور" ناگەیەنێت، بەڵکو لە ڕوویەکەوە پتر یارمەتیی ئەو پەیامانە دەدات!

چونکە ئەگەر زمانی فانیی من بێ دەنگ بکرێت، ئەوا هەرگیز زمانەکانی سەدان هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور لە گوفتار و ڕاگەیاندن ناکەون. هەروەك هەزاران قوتابیی وەفاداری ئەم پەیامانەش، کە توانای گوفتار و ڕوونیی بەڵگە هێنانەوەیان پێ بەخشراوە، بە پشتیوانیی خوای گەورە هەتا ڕۆژی قیامەت ئەم فەرمانبەری‌یە پاك و پیرۆزە گشتی‌یە، بە بەردەوامی بەڕێوە دەبەن، وەك تا ئێستا بەڕێوەیان بردووە و ئەنجامیان داوە.

*حەوتەم:*

وەك لە دادگاکانی پێشوودا، کە بەڵگەکانی خۆمان تێدا خستووەتە ڕوو، باسمان لەوە کردووە دوژمنە نهێنی و نەیارە ڕەسمی و نارەسمی‌یەکانمان کە حکوومەتیان خەڵەتاندووە و، بە هەڵەیاندا بردووە و، گومان و مەترسیی هەندێ لە پایەکانی حکوومەتیان قۆزتووەتەوە و، دامودەزگای "داد"یان لە دژمان ئاراستە کردووە..

ئەوانە: یان بە شێوەیەکی یەکجار خراپ خەڵەتاون، یان خەڵەتێنراون، یان لە بەرژەوەندیی ئەو ئاژاوەچی‌یانە کار دەکەن کە بە شێوەیەکی غەددارانە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی حوکم تێدەکۆشن، یان لە کەسانی دوژمنی ئیسلامن، یاخود لەو هەڵگەڕاوانەن کە دوژمنایەتیی ڕاستی‌یەکانی قورئان دەکەن، یان لە زەندیق و مولحیدانن.. چونکە

ئەوانە لە دەمی دژایەتی کردنی ئێمەدا هیچ سڵێکیان لەوە نەکردەوە کە ناوی "ڕێسا" لـە هەڵگەڕانـەوەی تـەواوەتی بنێـن و، سـیفەتی "مـەدەنییەت" بـۆ هـەرزەیی و بـەرەڵایی ترسناکی ڕەوشتی دابنێن و، ئـەو ڕێسـا کوفـری و بـەرەڵا و خۆسـەپێنەش کـە پابـەندی هەوا و ئارەزووەکانە بە "یاسا" ناوزەد بکەن..

بەم جۆرە، توانییان گوشـارێکی تونـد بخەنـە سـەرمان و، حکوومـەتیان خـافڵاند و لـە خشتەیان برد و، بێ هیچ پێویستییەك دام و دەزگـای "داد"یـان بـەو ڕووکـارەدا ئاراستە کرد کە بە ئێمەوە سەرقاڵ بێت.

بۆیە ئێمەش لە لایەنی خۆمانـەوە هـەموو ئەوانە بـە قـەهر و غـەزەبی خـوای قەهـاری شـکۆمەند دەسـپێرین و، هـانا بـۆ قـەڵای ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيلُ﴾ دەبـەین، تـاکـو لە شەڕ و زیانی ئەوانە بمانپارێزێت)[1].

## پاشماوەی ئەو ئیعتیرازەی کە پێشکەش بە دادگای "ئافیوون" کرا

☐ (ڕووی گوفتـارم لـەم ئیعتیرازەدا لـە دادگـای "ئـافیوون" و داواکـارە گشتییەکەی نییـە، بەڵکو لـەو کارمەندانەیـە کـە لـێرە و لـە فەرمانگـەی لێکۆڵینـەوەکاندان، لەوانـەی کـە گومـان و مەبەسـتی کەسـییان لـەخۆدا هەڵگرتووە و، سەنگەر لە دژمان دەگرن و، پشت بـە چەند لێکۆڵینەوەیـەکی ناتەواو یان بە چـەند هـەواڵێکی هەڵبەسـتراو دەبەسـتن کـە هـەندێ داواکـاری گشتی و هـەواڵدەران و پشـکنەرانی شـوێنانی تـر کردبوویـان بـە بڕوبیـانووی دەستیان.

یەکەم: بڕینی ناوی کۆمەڵە – کە هەر بـە خـەیاڵدا نایـەت و هیـچ بناغەیـەکی نییـە – بەسـەر قوتابییـە بێ تاوانـەکانی پەیامـەکانی نـووردا، کـە هیـچ پەیوەندییـەکیان بـە سیاسەتەوە نییە.. پاشان لەقەڵەمدانی ئەو داماوانەی کـە ڕۆشتوونەتە نـاو ئـەو بازنەیـە و جگە لە ئیمان و ئاخیرەت هیچ ئامانجێکی تریان نییە، بە ئەندامانی کارا و بڵاوکەرەوەی ئەو کۆمەڵەیە.. هـەروەها تاوانبـار کردنـی ئـەو کەسـانەی کـە پەیامـەکانی نووریـان خوێندووەتـەوە، یـان ئـەو پەیامانـەیان بـە کەسـێك داوە بیانخوێنێتـەوە، یـاخود

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم ل: ٥٨٤-٥٨٨.

نووسیویانەتەوە، ئنجا بردنیـان بەرەو دادگـا لەسەر ئەوە.. هەموو ئەم چەشنە کارانە، دوور کەوتنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لە دادگەری.

بەڵگەی بێ گومانیش لەسەر ئەم قسەیەمان ئەوەیە کە:

خوێنەرانی کتێبە زیانبەخشە ژەهراویەکانی وەك کتێبەکەی دکتۆر دووزی و هاوچەشنی لەو کتێبانەی کە هێرش دەکەنە سەر قورئانی پیرۆز، لە ژێر ناوی دەستووری ئازادیی فیکر و ئازادیی زانستیدا، چاوپۆشییان لێ دەکرێت و بە تاوانبار دانانرێن. کەچی خوێندنەوە و نووسینەوەی ئەو پەیامانەی نوور بە تاوان دادەنرێت کە لە ڕاستیەکانی قورئان و ئیمان دەدوێن و، وانەی ئەو ڕاستیانە بەو کەسانە دەڵێنەوە کە پێویستیان پێیانە و، تاسەمەندی زانینیانن و، وەك خۆری درەخشان بۆیان ڕوون دەکەنەوە!

ئەوان لەسەر چەند ڕستەیەك تاوانبارمان دەکەن کە لە هەندێ پەیامی پەنامەکیدا هاتوون لەو پەیامانەی کە لەبەر ئەوەی بە هەڵە لێك نەدرێنەوە بە پەنهانی هەڵمان گرتبوون، پێش ئەوەی دادگاکان ئاشکرایان بکەن. لە کاتێکدا کە ئەو پەیامانە - یەکێکیان نەبێت - هەموویان دادگای "ئەسکی شەهر" لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر کردن و هەنگاوی پێویستی لەبارەیانەوە نا و، یەك دوو مەسەلەی "پەیامی حیجاب" نەبێت ڕەخنەی لە هیچیان نەگرت، کە وەڵامی ئەو خاڵانەشم لە عەرزوحاڵەکەم و لە ئیعتیرازەکەمدا بە بەڵگەی گومان بڕ دایەوە و، وتمان:

"ئەوەی لە دەستماندایە نوورە و، گورز و کوتەکی سیاسەت نیە"..

ئەمەشمان لە بیست ڕووەوە لە دادگای "ئەسکی شەهر"دا ڕوون کردەوە.

ئنجا دادگای "دەنیزلی"ش وردبوونەوەی لە سەرجەمی پەیامەکان - بە بێ جیاکردنەوەی هیچیان - ئەنجام دا و ڕەخنەی لە هیچ کامیان نەگرت. بەڵام ئەو داواکارە بێ ویژدانانە حوکمی ئەو دوو سێ ڕستە ڕەخنە لێ گیراوەیان بەسەر هەموو پەیامەکاندا شکاندەوە و، تەنانەت دەستیان بەسەر کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار"یشدا گرت کە چوار سەد لاپەڕەیە، تەنها لەبەر چەند لاپەڕەیەکی ئەو کتێبە! خوێنەران و نووسەرەوانی ئەو پەیامانەیان بە تاوانبار لە قەڵەم دا و، منیشیان بەوە تۆمەتبار کرد کە تەحەددا و دژایەتیی حکوومەت دەکەم.

من لە لایەنی خۆمەوە هەموو هاوڕێ نزیکەکانم و ئەوانەش کە سەردانم دەکەن دەگرم بە شایەت و، سوێندیش بە خوای گەورە دەخۆم کە:

لە نێوان سەرانی حکوومەت و، وەزیر و، سەرکردە و، کارمەند و، پەرلەمانتارانیدا جگە لە دوو سەرۆك کۆمار و ئەندام پەرلەمانێك و پارێزگاری قەستەمۆنی کەسی تریان لێ ناناسم و، بە دوای ناسینیشیاندا ناگەڕێم، مەگەر یەك دوو کەس نەبێت کە پێش ساڵێك پەیوەندی‌یان لەگەڵدا بەستم و، لە ڕێیانەوە پێنج شەش کەسم لە سەرانی حکوومەت ناسی.

جا ئایا دەگونجێ کەسێك کە ململانێ لەگەڵ حکوومەتدا بکات، نەزانێ لەگەڵ کێدا دەیکات؟ یان حەز بە ناسینیان نەکات و، بایەخ بەوانەی بەرامبەری نەدات کە ئایا دۆستن یان دوژمن؟

لەم حاڵەتانەوە دەزانرێت کە ئەوانە بروبیانووی بێ بناغە لە دژمان هەڵدەبەستن.

جا مادەم وایە، ئەوا من بەو بێ ویژدانانە - نەك بەم دادگایە - دەڵێم:

هیچ بایەخێك بەو سزایە نادەم - چەندەش توندوتیژ بێت - کە نیازتانە بە سەرمدا بیسەپێنن! چونکە ئێستا من لەسەر دەرگای گۆڕەکەم و لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدام. ئایا چ بەختەوەری‌یەك لەوە گەورەترە کە یەك دووساڵی تەمەنێکی ستەم لێکراوی و بێ تاوانی بگۆڕمەوە بە پلەی شەهیدی؟

پاشان لەوپەڕی دڵنیاییدام و هیچ گومانێکم لەوەدا نی‌یە کە "مردن" سەبارەت بە ئێمە پشوودان و، پسووڵەی ڕوخسەت وەرگرتنە بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو جیهانی دڵنیایی و بەختەوەری. هەزاران بەڵگەشمان لە پەیامەکانی نووردا لەسەر ئەم ڕاستی‌یە بە دەستەوەیە. تەنانەت گەر مردن بۆ ئێمە ئیعدامێکی ڕواڵەتی بێت، ئەوا گیروگرفتی ئەو یەك سەعاتەی کۆتایی تەمەن سەبارەت بە ئێمە دەبێت بە کامەرانی و، کلیلی دەرگای میهرەبانی و، هەلێکی گەورە بۆ گواستنەوەمان بەرەو جیهانی مانەوە و هەمیشەیی.

بەڵام ئێوە، ئەی دوژمنە خۆحەشاردەرە پەنهانەکان و، ئەی ئەوانەی کە لە پێناوی ڕازی کردنی ئیلحاددا دام و دەزگای "داد" لە خشتە دەبەن و، دەبن بە هۆی هەڵبەستنی وەهم و گومانی درۆینە لە زەینی کاربەدەستانی دەوڵەتدا، بۆ ئەوەی بە ناحەق و خۆڕایی بە ئێمەوە سەرقاڵیان بکەن!

باش بزانن و با لەرز بە جەستەتاندا بێت کە ئێوە بڕیاری ئیعدامی هەمیشەیی و زیندانی تاکەکەسیی بەردەوام لەسەر خۆتان دەردەکەن و، تۆڵەی ئێمە بە چەندین قات لە ئێوە دەسێنرێتەوە. ئەوەتا ئێمە ئەم ڕاستییە دەبینین و بەزەییمان بە حاڵتاندا دێتەوە!

بێ گومان ڕاستیی ئەو مردنەی کە سەد جار ئەم شارە لە دانیشتووانی خاڵی دەکاتەوە و بەرەو گۆڕستانەکان بەڕێیان دەکات، دەبێ خواست و ئامانجێکی لە خواست و ئامانجی ژیان و گوزەران گەلێ بەرزتری بێت و، هەوڵی خۆ ڕزگار کردنیش لە چنگی ئەو ئیعدامە هەمیشەییە لە پێشەکیی سەرجەمی کێشەکانی مرۆڤایەتییەوە بێت، تەنانەت لە هەموو خواستەکانی مرۆڤایەتی گرنگتر و پێویست تر بێت.

جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئایا کارێکی نامۆ و مایەی سەرسوورمان نییە کە خەڵکانێك هەبن قوتابیانی نوور تاوانبار بکەن، ئەو قوتابیانەی کە ڕێیان بەو نهێنییە بردووە و، ئەو ڕاستییەیان دۆزیوەتەوە.. یان تۆمەتی نارەوا ئاراستەی پەیامەکانی نوور بکەن، کە ئەو ڕاستییەیان بە هەزاران بەڵگەی خۆیان چەسپاندووە؟

خۆ هەر کەسێك هێندەی تۆزقاڵێك خاوەنی ژیری بێت - تەنانەت ئەگەر شێتیش بێت - دەزانێت کە ئەو خەڵکانەی کاری وا ئەنجام دەدەن خۆیان لە بەردەم ڕاستی و دادگەریدا دەخەنە هەڵوێستی تۆمەتبارییەوە!

سێ مادده هەیە کە گومانی بوونی "کۆمەڵە" بە خەیاڵدا دەهێنێت و ئەو ستەمکارانە دەخەڵەتێنێت، کە شتێکە هەرگیز ئێمە پەیوەندیمان پێوەی نییە.

یەکەمیان:

ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی کە قوتابیانی پێشووم بە یەکەوە گرێ دەدات، گومانی بوونی "کۆمەڵە"ی لە لا دروست کردووە.

دووهەم:

هەندێ لە قوتابیانی نوور بە شێوازی کاری بە کۆمەڵ ئیش دەکەن، وەك ئەوەی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی هەموو شوێنێك ئەنجامی دەدەن و، یاساکانی کۆماریش بواری پێ داوە و کاری بەسەریەوە نییە. لەبەر ئەوە، هەندێ کەس پێی وا بووە کە قوتابیانی

نوور "کۆمەڵە"یەك بن، کەچی کۆمەڵە نین. نیازی ئەو چەند کەسە کەمەش هەرگیز پێکهێنانی کۆمەڵە و شتانی هاوچەشنی نییە، بەڵکو تەنها پەیوەندییەکی بێگەرد و برایەتییەکی قیامەتییانەی خاوێنە.

سێهەم:

ئەو ستەمکارانە خۆیان دەناسن کە چۆن نوقمی دنیاپەرستی بوون و بە تەواوی لە ڕێ ترازاون، هەندێ یاسای حکوومەتیشیان دیوەتەوە کە لەگەڵ ئەواندا گونجاوە. بۆیە ئەو قسەیە دەڵێن کە بە زەینیاندا دێت:

سەعید و هاوەڵانی نەیاری ئێمە و ئەو یاسایانەی حکوومەتن کە لەگەڵ هەوا و ئارەزووی ئێمەدا یەك دەگرنەوە. کەواتە ئەوانە کۆمەڵەیەکی سیاسین.

منیش دەڵێم:

ئەی بەدبەختینە!

ئەگەر دنیا هەمیشەیی بوایە و، مرۆڤیش بە هەتاهەتایی تیایدا بمابایەتەوە و، کار و ئەرکەکانی ئەم دنیایەش تەنها بترنجایەتە سیاسەتەوە، ئەوا ئەو کاتە بوختانەکەتان جێیەکی دەگرت..

بەڵام باش بزانن کە ئەگەر من لە دەرگای سیاسەتەوە کارم بکردایە، ئەوا نەك تەنها دە ڕستە، بەڵکو هەزار و یەك ڕستەتان دەبینی کە بە شێوازی تەحەددای سیاسی دادەڕێژران!

گریمان بە فەرزی مەحاڵ - وەك ئێوە دەڵێن - ئێمە بە هەموو توانایەکمان بۆ چەند ئامانجێکی دنیایی و بەدەستهێنانی تام و چێژە کەم نرخەکانی و لە پێناوی دەستکەوتنی ئامانجی سیاسیدا کار دەکەین، کە ئەوەش گریمانێکە تەنانەت شەیتانیش نەیتوانیوە بە هیچ کەسێکی بسەلمێنێت.. بەڵام خۆ مادەم هەموو بەسەرهاتەکانی ماوەی بیست ساڵمان شتێك پێش چاو ناخات کە مایەی لێپرسینەوە و بەدواداگەڕانمان بێت، چونکە حکوومەت سەیری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مرۆڤ دەکات، نەك ئەو شتەی کە لە دڵیدایە. جگە لەوەی کە لە هەموو حکوومەتێکدا و بە شێوەیەکی بەهێز نەیاری حکوومەت هەیە..

ئەوا بێ هيچ گومانێك ئێوە نـاتوانن لـە ڕێی ياسـاكانی دادگەری‌يـەوە ئێمـە تۆمـەتبار بكەن.

دوا وتەم: ﴿حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هو عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وهوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظيم﴾!)[1].

## پاشكۆی پاشماوەی ئەو ئيعتيرازەی كە پێشكەشی داواكاری گشتيی دادگای "ئافيوون" كرا

❑ *(يەكەم:*

بۆ دادگای ڕوون دەكەمەوە كە:

ئەم داوا نوێ‌يەش لەسەر بناغەی چەند داوايەكی كۆنی دادگاكانی "ئەسكی شەهر" و "دەنيزلی" و، ڕاپۆرتێك كە چەند خەبيرێكی ڕوالـەت بـين دوای لێكۆڵينـەوەی سـەرپێيی پێشكەشيان كردبوو، بنيات نراوە.

لە دادگاكەی ئێوەدا وتم: ئەگەر سەد دانە هەڵەم لەم داوا نوێ‌يـەدا نەچەسپاند، ئـەوا ڕازيم سزای سەد ساڵ بەندیم لەسەر دەربكرێت. وا ئێستا مـن ئامـادەيی خـۆم دەردەبڕم كە ئەو هەڵانە بچەسپێنم. گەر حەز دەكەن ئەم خشتەيەتان پێشكەش دەكـەم كـە زيـاد لـە سەد هەڵەی دەست نيشان كردووە.

*دووەهەم:*

كاتێ لە دادگای "دەنيزلی"يـەوە دۆسـيە و نووسـراوەكانی ئێمـە ڕەوانـەی "ئەنقـەرە" كران و، لە نيگەرانی و چاوەڕوانيی بڕيارێكدا بووين لە دژمان دەربكرێت، ئەو بڕگەيەم بۆ برايـانم نووسـی كـە لـە كۆتـايی هـەندێ لـە بەرگری‌يـەكانمدا هەيـە و، بريتی‌يـە لەمـەی خوارەوە:

ئەگـەر كارمـەندانی "داد" كـە بـە نيـازی ڕەخنـە و هەڵسەنگاندن پەيامـەكانی نـوور دەخوێننەوە، توانی‌يان ئيمانی خۆيان بـەهێز بكـەن و بيپـارێزن، پاشان بڕيـاری ئيعداميـان لەسەر دەركردم، ئەوا ئێوە شايەت بن كە مـن دەسـت لـە هـەموو مـافێكی خـۆم بەرامبـەر بەوان هەڵدەگرم. چونكە ئێمە خزمـەتگوزاری ئيمـانين و، ئـەركی سـەرەكيی سەرشـانی

(١) تيشكەكان، تيشكی چواردەهەم، ل: ٥٧٠-٥٧٤.

پەیامەکانی نووریش بریتی‌یە لە بەهێزکردن و ڕزگارکردنی ئیمانی خەڵك. کەواتـە ئێمـە خۆمان بە ناچار دەزانین کە خزمەتە ئیمانی‌یەکان پێشکەش بکـەین، بە بێ جیـاوازی لـە نێوان دۆست و دوژمن، یان لایەنگرتنی هیچ لایەنێکی دیاری کراو.

بەم جۆرە.. ئەی ئەندامە بەڕێزەکانی دادگا! بە پشت بەستن بـەم ڕاستی‌یە و لـە ژێـر تیشکی ڕووناکی‌یەکەیدا:

پەیامەکانی نوور بەهۆی ڕاستی‌یە خاوێن و بەڵگە درەخشانەکانیانەوە، توانی‌یان دڵی زۆر کەس لە ئەندامانی دادگا بەلای خۆیاندا و هاوسۆزی‌یان لەگەڵیاندا ڕابکێشن. ئیـتر بـە لامـەوە گرنـگ نی‌یـە کـە چیتـان دەوێ بیکـەن بەرامبـەرم و، چ بڕیـارێك لەبارەمـەوە دەربکەن.

کەواتە چی دەکەن بیکەن. من لێتـان خـۆش دەبم.. هـەرگیز بـەگژتاندا نایـەم و لێتـان توورە نابم.

هەر ئەمەش تاکە هۆکـاری ئەوەیە کە هـەموو جۆرەکـانی ئـازار و ستەم و، دووبـارە کردنەوەی چەندین جارەی سووکایەتیم قبووڵ کردووە کە دەمارەکانیـان دەورووژانـدم لەوانەی کە پێشتر لە هەموو ژیانمدا شتی وام نەهاتووەتە ڕێ. تەنانـەت دوعـای شـەڕم لـە هیچ کەسێك نەکردووە.

هەروەها کۆمەڵە پەیامەکانی نوور کە لە بەردەستتاندایە، داکۆکی و بەرگریی ڕەخنە هەڵنـەگری منـە و، باشـترین بەڵگەیـە لەسـەر پووچـەڵیی ئـەو داوایانـەی لـە دژمـان ورووژێنراون.

ئەوەی کە مایەی سەرسووڕمان و جێی سەرسامی‌یە ئەوەیە کە:

لەو کاتەدا چەندین زانای گـەورەی میسـر و شـام و حەڵـەب و مەدینـەی منەووەرە و مەککـەی پـیرۆز و، چـەند زانایـەکی سـەرۆکایەتیی کاروبـاری ئـایینی لـە چـەند کۆمەڵەیەکی پەیامـەکانی نووریـان بـە وردی کۆڵیوەتـەوە و هیـچ ڕەخنەیـەکیان ئاراستە نەکردووە، بەڵکو ڕێز و ستایشی شایستەیان بەرامبەری دەربڕیوە..

هەروەها لەو کاتەدا کە ئەو پەیامانە، سەرباری بـارودۆخی دژواری دەوروبـەر، سـەد هەزار کەسی ئەهلی حەقیقەتیان وا لـێ کردووە تەسدیقیان بکەن..

لەو کاتەدا کە پەیامەکان بەم جۆرە ڕێزیان لێ دەگیرێت و ستایش دەکرێن، کەچی ئەو زیرەکە(!)ی کە چەند داوایەکی لاوازی لە دژمان کۆ کردووەتەوە[1]، هەڵەیەکی هێندە ئابڕووبەری لە زار دەردەچێت کە ساکاریی خۆی و سەرزارەکیی تێڕوانینەکانی بۆ شتان دەردەخات، ئەوەتا وتی: "قورئانی پیرۆز سەد و چل سوورەتە"!

جا ئەو شتەی کە مایەی سەرسووڕمان و جێی سەرسامییە ئەوەیە کە ئەم کەسەیە دێت پەیامەکانی نوور هەڵدەسەنگێنێت و دەڵێت:

"پەیامەکانی نوور هەرچەندە هەوڵی تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز و تەئویلی فەرموودە پیرۆزەکان دەدەن، بەڵام لە ڕووی پێشکەش کردنی زانیارییەوە بە خوێنەرانیان هیچ نرخ و بەهایەکی زانستیی بەرزیان لەخۆ نەگرتووە"!

جا ئایا لەم ڕەخنەیەوە دەرناکەوێت کە هەتا بڵێیت لە یاسا و ڕاستی و حەق و دادگەرییەوە دوورە!

هەروەها سکاڵای ئەوەشتان لەلا دەکەم کە:

ئێوە دوو سەعاتی تەواو قسەکانی داواکاری گشتیتان بەگوێدا دایەن کە دڵی هەموومانی زامدار کرد، لەبەر هەڵەکانی کە لە سەد دانە تێدەپەڕن و لە چل لاپەڕەدا تۆمارمان کردوون. بەڵام من هەرچەندە جەختم لێ کردن کەچی بواری دوو خولەک کاتتان پێ نەدام کە بە لاپەڕە و نیوێك وەڵامی بدەمەوە. بۆیە بە ناوی دادگەرییەوە داواتان لێ دەکەم کە بە تەواوی ئیعتیرازەکەم بخوێننەوە.

*سێهەم:*

هەموو حکوومەتێك کەسانی نەیاری هەیە.. یاسایش بوار نادات دەستدرێژی بکرێتە سەریان، مادەم کاریان بەسەر تێکدانی ڕێسا و سیستەمی وڵاتەوە نەبێت.

جا ئایا دەگونجێ من و کەسانی هاوشێوەی من لەوانەی کە پشتمان لە دنیا هەڵکردووە و بەرەو گۆڕەکانمان هەنگاو دەنێین، واز لە هەوڵ و تێکۆشانمان بهێنین بۆ ژیانی نەبڕاوەی هەتاهەتایی بەپێی ئەو ڕێبازەی کە باپیرە بەڕێزەکانمان لە درێژایی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵ پیایدا ڕۆشتوون و، بە ڕێنمایی قورئانە مەزنەکەمان و، لە ڕۆشنایی

---

(١) مەبەست داواکاری گشتییە.

ئەو دەستوورانەی کە لە هەموو چەرخێکدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن ئیماندار تەقدیسی دەکەن.. ئایا دەگونجێت کە ئێمە واز لەمە بهێنین و، بە ژیانێکی کورت و فانیی دنیاوە سەرقاڵ ببین و، بۆ چەند یاسا و دەستوورێکی نارەوشتیی شارستانێتیی هەرزە، تەنانەت چەند یاسایەکی وەحشیگەری و ستەمکارانەی وەك هی "بەلشەفی‌یەکان" ملکەچ بکەین و، لە ژێر گوشار و فرۆفێڵی دوژمنانماندا لایەنی یاسای لەم جۆرە بگرین؟

خۆ لە سەرانسەری دنیادا هیچ یاسایەك و هیچ مرۆڤێك نی‌یە کە هێندەی گەردیلەیەك ویژدانی هەبێت خەڵکانی تر ناچار بکەن واز لەوە بهێنن بۆ ئەمە.

بەڵام بەو نەیارانە دەڵێین:

ئێمە کارمان بەسەرتانەوە نەبووە، دەسا ئێوەش کارتان بەسەرمانەوە نەبێت.

بەم جۆرە و لەسەر بناغەی ئەم ڕاستی‌یە:

هەرگیز ئێمە لەگەڵ سەرکردەیەکدا نیین کە بە پێی ئارەزووی خۆی فەرمانەکانی بە ناوی یاساوە دەرکرد بۆ گۆڕینی مزگەوتی "ئەیاسۆفیا" بە بتخانە و گۆڕینی بارەگای مەشیەخەتی ئیسلامی بۆ دواناوەندی‌یەکی کچان.. ئێمە نە بە هزر و بیر، نە لە ڕووی بابەت و، نە لە ڕووی هاندەر و، نە لە ڕووی ئاکامەکانەوە لەگەڵ ئەودا نین و، خۆشمان بە ناچار نازانین کە شتی وا قبووڵ بکەین.

لە ڕاستیدا وێڕای بەسەربردنی ژیانی دیلی و ئاوارەیی لە ماوەی ئەم بیست ساڵەدا، کە چەندین جۆری ئازار و دژوارترین شێوازی ستەم و خۆسەپاندنم هاتووەتە ڕێ و، وێڕای ئەوەی کە سەدان هەزار برای نووری و بەوەفام هەیە، کەچی خۆمان لە کاروباری سیاسیدا هەڵنەقورتاندووە، تەنانەت یەك ڕووداویش تۆمار نەکراوە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کارمان بەسەر ئاسایشەوە بووبێت یان ڕێسامان تێکدابێت.

ئەو سووکایەتی پێکردنە یەك لە دوای یەك و مامەڵە سەرتاپا ستەمەی کە ڕووبەڕووم دەکرێتەوە و لەم دواڕۆژانەی ژیانمدا دێنەڕێم و، ژیانی نامۆیی و ئاوارەیی کە بەسەری دەبەم و پێشتر هاوشێوەیم نەبینیوە، وایان لێ کردووم لە ژیان بێزار بم..

من لە "ئازادیی دەست بەسراو" بێزار بووم، کە ئازادی‌یەکە خۆسەپاندن و ستەم سنووری بۆ دادەنێت! بۆیە داواکاری‌یەکم خستووەتە بەردەستتان نەك بۆ ئەوەی – وەك شتێکی ئاساییە لەم جۆرە حاڵەتانەدا – ئازادم بکەن، بەڵکو بۆ ئەوەی قورسترین و

سەخت ترین سزام لەسەر دەربکەن.. بەڵێ، قورسترین و سەخت ترین سزا، نەك سووكەڵەترین و ئاسانترین!

چونكە هیچ ڕێگایەك بۆ ڕزگاربوون لەم چەشنە مامەڵە ناحەزە سەیروسەمەرەیە لە بەردەم مرۆڤدا نییە جگە لەم دوو ڕێگایە: بەندیخانە یان گۆڕ. خۆ ڕێگای گۆڕم لە بەردەمدا داخراوە و ناتوانم بە دەستی بهێنم، چونكە لە ڕووی شەرعەوە خۆكوژی حەرامە و، ئەجەلیش پەنهانە و، مرۆڤ نازانێت كەی كۆتایی بە تەمەنی دێت، چ جای ئەوەی دەستی پێی بگات.

بۆیە بە مانەوەم لەم بەندیخانەیەدا ڕازی بووم كە شەش مانگە بە تەنیایی تیایدا بەند كراوم. بەڵام ئەم سكاڵایەم لە كاتی ئێستادا ڕاگرت، لەبەر داوا و ئارەزووی برا بێ تاوانەكانم.

*چوارەم:*

من لە ماوەی ئەم سی ساڵەی دوایی ژیانمدا كە ناوی "سەعیدی نوێ"م لێ ناوە، هەتا توانیومە تێكۆشاوم دەروونی بەدخوازم لەغاو بكەم و، لە چاوگێڕانی بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و شانازی بەخۆوە كردن و لەخۆڕازی بوون بیپارێزم، تەنانەت سەد جار زیاتر هەستی قوتابیانی نوورم زامدار كردووە لەوانەی كە لەڕادەبەدەر گومانی باشیان پێم هەیە..

ئەو شتانەی كە لە پەیامەكانی نووردا نووسیومن و ئەو ڕاستییانەش كە لەو پەیامانەدان و پەیوەندییان بە خۆمەوە هەیە و.. ئەو خاوەن ویژدانانەش كە بە لێبڕانەوە هامشۆم دەكەن و.. هەموو برادەران بە گشتی، شایەتی لەسەر ئەمە دەدەن. چونكە من خاوەنی كاڵا و تفاقی "نوور" نیم، بەڵكو تەنها دەڵاڵێكی لاواز و سادەی دووكان و پیشانگای گەوهەری قورئانی پیرۆزم.

هەروەها برا نزیكەكانم، بەو نیشانە زۆرانەی كە دیویانە، لەوەدا تەسدیقم دەكەن كە بڕیارم داوە نەك تەنها قوربانی بە پلەوپایە درۆینە و قەڵبەكانی دنیا بدەم و، هەموویان بەخت بكەم، بەڵكو ئەگەر - وا دابنێین - چەندین پلەی مەزنی مەعنەوییشم بدرێتێ، ئەوا هەر هەموویان بۆ خزمەتگوزاریم لە ڕێی ئیمان و قورئاندا بەخت دەكەم، نەبادا

بەشی نەفسی خۆم ئاوێتەی ئیخلاسم ببێت لەو خزمەتگوزاری‌یەدا. لـە ڕاستیدا ئەمەشـم ئەنجام داوە.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دادگای بەڕێزتان هەست و سۆزی ڕێزی هەندێ لە برایانم کە لە ئاستی مندا دەریان بڕیوە لە بەرامبەر سوودوەرگرتنیان لـە پەیامـەکانی نـوور، وەك سوپاسێکی مەعنەوی و زیاد لە ڕێزی کوڕ بۆ باوکی خۆی، کـە مـن دەستم بـە ڕوویـەوە ناوە و قبوولـم نـەکردووە، دادگـای بـەڕێزتان ئـەو ڕێـزەی ئـەوانی کـردووە بـە مایـەی لێپرسینەوەمان، وەك بڵێی بابەتێکی سیاسی بێت و، هەندێك لەو برایانەتان هان داوە کـە نکووڵی لەو ڕێزلێنانە بکەن!

بە سەرسامی‌یەوە دەپرسم کە:

ئایا چ تاوان و گوناهێك لە مەدح و سەنایەکدا هەیە کە لەسەر زمانی کەسێکی تـردا هاتووە و، ئەم هەژارەش پێی ڕازی نەبووە و خۆی بە شایانی نازانێت؟

پێنجەم:

مـن بـە ڕاشـکاویی تـەواوەتی بـە ئێـوەی ڕادەگەیـەنم کـە هـەوڵی چەسپاندنی تۆمـەتی "پەیوەندی کردن بە دەستە و کۆمەڵەکان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری نـاوخۆدا" بـە قوتابیـانی نـوورەوە کـە بـە هـیچ جۆرێـك پـەیوەندی‌یان بـە حیزبایـەتی و دەستە و تەوژمـە سیاسی‌یە جۆراوجۆرەکانەوە نی‌یە، تەنها پیلانی ئەو ڕێکخراوە نهێنی‌یەی پشتی پەردەیـە کـە چـل سـاڵە هـەوڵی ڕووخـاندنی ئیسـلام و سـڕینەوەی ئیمـان دەدات، مەبەستیشـی خزمەتی جۆرە بەلشەفی‌یەکە.

هەر ئەو ڕێکخراوەشە پەرە بە گیانی توندڕەوی و ئاژاوە نانەوە دەدات لـەم وڵاتـەدا، چ بە خۆی بزانێت یان نەزانێت و، دژە هەڵوێستی لـێ گرتووین.

بـەڵام خـۆ سـێ دادگـای جیاجیـا قسـەیان لەسـەر بـێ تـاوانیی پەیامـەکانی نـوور و قوتابیانی یەکی گرت، تەنها یەك دادگا نەبێت، کە دادگای "ئەسکی شەهر"ە و، بڕیاری ساڵێك لەسەر من و شەش مانگی لەسەر پازدە کـەس لـە برایـانم لـە کـۆی سەد و بیست کەسدا دەرکرد. لەوانەیە ئەو شتەی وای لە دادگای "ئەسکی شـەهر" کردبێـت کـە ئـەو بڕیـارە دەربکـات، بوونـی بڕگەیە کـە لـە مێـژە نووسـیومە و، لـە نـاوەندی پـەیامێکی بچووکدایە و، پەیوەندیی بە کێشەی "پۆشتەیی"یەوە هەیە. دەقی ئەو بڕگەیەش ئەمەیە:

"بیستمان کە ژنی پیاوێکی پلەوپایە بەرزی دنیایی، شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی بە دەرەوە بووە و، بۆیاخچی‌یەکی پێلاویش بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕۆشنا و لە ناوجەرگەی ئەنقەرەی پایتەختدا پەلاماری داوە! جا ئایا ئەم ڕووداوە "نارەوایە" زللەیەکی توندوتیژ نی‌یە لەسەر ڕووی دوژمنانی داوێن پاکی و پۆشتەیی، لەوانەی کە هیچ ئاگایەکیان لە واتا و ناوەرۆکی شەرم و حەیا نی‌یە"؟!

کەواتە هەڵبەستنی بڕوبیانووی لاواز و تۆمەتی نارەوا ئێستا لە دژی قوتابیانی پەیامەکانی نوور، وەك ئەوە وایە بڕیار لە دژی ئەوسێ دادگایە بدرێت و، تۆمەتیان ئاراستە بکرێت و بە نەنگی و خیانەت لەکەدار بکرێن.

شەشەم:

زۆرانگرتن لەگەڵ پەیامەکانی نووردا لە توانای کەسدا نی‌یە؛ چونکە وتەی ئەو زانایانەی ئیسلام کە پەیامەکانی نووریان دیوە، لەسەر ئەوە یەکی گرتووە کە:

ئەم پەیامانە تەفسیرێکی ڕاستی قورئانی پیرۆزن.

واتە چەندەها بەڵگەی بەهێز و توندوتۆڵیان لەخۆ گرتووە بۆ ڕاستی‌یە درەخشانەکانی و، موعجیزەیەکی مەعنەوی‌یە لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز لەم چەرخەدا و، بەربەستێکی پۆلایینە لە بەردەم ئەو مەترسی‌یانەی لە مەلاسدان بۆ ئەم وڵات و نەتەوەیە لە باکوورەوە.

کەواتە لە ڕووی مافە گشتی‌یەکانەوە "پێویستی" داخوازی ئەوەیە کە دادگای بەڕێزتان هانی خەڵکی بدات بۆ پێشوازی کردن لەم پەیامانە، نەك ئەوەی قوتابیانی بترسێنرێن و لە پەیامەکان دوور بخرێنەوە.

ئەوەی ئێمە لێی دەزانین ئەمەیە و، هەر تەنها چاوەڕوانی ئەمەشتان لێ دەکەین.

ئاشکرایە کە گوێ نەدان بە کتێبی مولحیدان و هەندێ لە سیاسەتمەدارە بێ بڕواکان و، گۆڤار و ڕۆژنامەکانیان، لە ژێر پەردەی ئازادیی زانستیدا، کە زیانی لە ڕادەبەدەریان بۆ نەتەوە و وڵات و ئاسایشی گشتی ڕوون و ئاشکرایە، ئەم دیاردەیە بۆ ئەم پرسیارە هانمان دەدات کە:

ئایا چ ڕوویەکی قەدەغەکراو لەوەدا هەیە لاوێکی بێ تاوان، کە پێویستی بـە یارمـەتی هەیە بڕواتە ڕیزی قوتابیانی نوورەوە، بە نیـازی ئـەوەی ئیمانەکـەی ڕزگـار بکـات و، لـە مەترسیی بەربوونەوەی بەرەو کەندەڵانی ڕەوشتە چەپەڵەکان دەرباز ببێت؟

ئایا کارێکی پێویست و ئەوپەڕی دانایی و دادگەری نییە کە وەزارەتی پەروەردە ئەم کارە لە ئامێز بگرێت و، پشتیوانیی لێ بکات و ڕێزی شایانی بۆ دابنێت، لە بریی ئەوەی هەوڵی نەهێشتنی ئەم کارە و ڕاوەدوونانی ئێمە بدات، بە بێ هیچ هۆیەکی پێویست؟

*دوا وتـەم*: لـە خـوای گـەورە داواکـارین کـە یارمـەتیی دادوەرەکـان بـدات بـۆ پیـادە کردنی حەق و جێبەجێ کردنی دادگەری.. ئامین.

﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾ ، ﴿نعم المولى ونعم النصير﴾.

الحمد لله رب العالمين.)[1].

❑ دوا وتەم

حەز دەکەم ئەمەی خوارەوە بۆ دەستەی دادگا ڕوون بکەمەوە:

لە ڕێی لائیحەی ئیتیهامەکـە و داناغـەوە بـۆ چـەندین جـاری درێژخایـەن لـە زیندانـی تاکە کەسیدا، هەستم کرد کە لەم کێشـەیەدا خـودی خۆمیـان مەبەستە. چونکـە تێبینیـی ئەوەیان کردووە کە بەرژەوەندییەك لـە شکاندنی شـان و شـکۆی مـن و زامدارکردنـی کەسایەتیم بەدەست دەهێنن و، گومانی ئـەوە کـراوە کـە مـن کەسـێکی زیانبـەخش بم بـە کـارگێڕیی وڵات و ئاسـایش و نیشـتمان و ، لـە ژێـر پـەردەی ئـایین و لـە پێنـاوی جـۆرە سیاسەتێکدا هەوڵی بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی دنیایی بدەم.

لە بەرپەرچی ئەمەدا، بەوپەڕی بێ گومانی بۆتان ڕوون دەکەمەوە کە:

لە پێناوی ئەم وەهم و گومانانە و لـەبەر هەوڵی شـەڕ فرۆشـتن بـە کەسی مـن، دەستی ئازاردان بۆ پەیامەکانی نوور و قوتابیی بەڕێزەکانیان درێژ نەکـەن، چونکـە هـەر ئـەوان ڕۆڵەی فیداکارن لە پێناوی ئەم نیشتمان و نەتەوەیەدا. دەنا زیانێکی گـەورە بـەم نەتـەوە و نیشتمانە دەگات و لەوانەیە ببێت بەهۆی مەترسی لەسەر نەتەوە و نیشتمان.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦١٣-٦١٩.

دەمەوێ بە دڵنیاییەوە جەخت لەوەش بکەمەوە کە:

لە ڕووناکیی ئەم ڕێبازەی ئێستامدا بڕیارم داوە هەر ئازار و سووکایەتی و ئەشکەنجە و سزایەك قبووڵ بکەم کە ئاراستەی کەسی من بکرێت، بە مەرجێك کە بە هۆی منەوە زیان بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور نەگات. چونکە ئەمە پاداشتی دواڕۆژی بۆ من تێدایە و، هۆیەکیشە بۆ ڕزگاربوونم لە شەڕ و خراپەکانی دەروونی بەدخوازم. بۆیە لە لایەکەوە دەگریم و لە لایەکی تریشەوە دڵخۆشم.

خۆ ئەگەر ئەو بێ تاوانە هەژارانە لەسەر ئەم مەسەلەیە لەگەڵ مندا نەخرانایەتە بەندیخانەوە، ئەوا شێوەی ئاخاوتنم لە بەرگرییەکەمدا زۆر توندوتیژ دەبوو. ئێوەش بۆ خۆتان بینیتان کە ئەو کەسەی لائیحەی ئیتیهامەکەی نووسیوە چۆن هەوڵی پەیدا کردنی بڕوبیانووی لاواز و بەهانەی نارەوای داوە و، هەرچی کتێبم داناوە و ئەو نامە نهێنی و تایبەتییانەش کە لە درێژایی بیست تاکو سی ساڵی ژیانمدا نووسیومن پێشکەشی دادگای کردوون وەك ئەوەی هەر هەموویانم ئەمساڵ نووسیبێت! ئنجا واتای هەڵەی لە هەندێکیان داوەتەوە، وەك بڵێی تا ئێستا نەبینرابن و، نەڕۆشتبنە هیچ دادگایەك و، هیچ یاسایەکی لێبوردن نەیگرتبنەوە و، بەسەرچوونی کاتیش کۆنی نەکردبن..

هەموو ئەمانە، لە پێناوی ئەوەی زەفەرم پێ ببەن و لە بەها و شان و نرخم دابگرن..

خۆ هەرچەندە زیاتر لە سەد جار وتوومە: من دان بە کەمی و بچووکیی نرخ و بەهای خۆمدا دەنێم و، وێڕای ئەوەش کە نەیارەکانم هەموو ڕێگا و هۆکارێك بەکاردەهێنن کە مستەکۆڵم تێ بسرەوێنن و سووکایەتیم پێ بکەن، بەڵام خۆشەویستیی خەڵکی بەرامبەرم، کە لە ڕادەیەکدایە سیاسەتمەدارانی نیگەران کردووە، هی ئەوەیە کە لەم زەمان و ڕۆژگارەدا "بەهێزکردنی ئیمان" پێویستییەکی گرنگ و تەواوەتیی بە کەسانێك هەیە کە - لە بابەتی ئاییندا - "ڕاستی" نەکەنە قوربانی لە پێناوی هیچ شتێکدا و، کەسیان ئایین نەکات بە هۆکار و ئامراز بۆ هیچ ئامانج و مەبەستێك و، هیچ بەشێك لەو خزمەتەدا بۆ خۆی دانەنێت، تاکو بتوانرێت سوود لە ڕێنماییەکانی وەربگیرێت لە وانەکانی ئیماندا و قەناعەتی تەواوەتی بۆ بەرامبەرەکەی بێتەدی.

بەڵێ، لە هیچ بارودۆخێکدا بە وێنەی ئەم چەرخەی ئێمە پێویستیی زۆر نەهاتووەتە ئاراوە بۆ خزمەتی ڕاستییەکانی ئیمان. چونکە مەترسییەکان بە توندوتیژی و دڕندەییەکی لە ڕادەبەدەر لەدەرەوە ئاراستەمان کراوە.

خۆ هەرچەندە من دان بەوەدا دەنێم و ڕایدەگەیەنم کە:

نەهێشتنی ئەم پێویستییە و پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە، تەنیا بە کەسی دەستەوسانی من نایەتەدی.. کەچی هەندێ کەس لەو گومانەدان کە هەندێ لەو ئەرکە لەسەر دەستی من دێتەدی، نەك لەبەر تایبەتکارییەك کە لە مندا هەبێت، بەڵکو لەبەر پێویستیی زۆر و لەڕادەبەدەر بۆ کەسێك کە ئەم ئەرکە ڕابپەڕێنێت و، سەرهەڵنەدانی ئاشکرای کەسێك کە ئەو بەرپرسییە مەزنەی گرتبێتە ئەستۆ.

لە مێژە بە سەرسووڕمان و سەرسامییەوە بیرم لەم مەسەلەیە کردووەتەوە. چونکە وێڕای هەڵە و نەنگییە سەرسووڕهێنەکانی کەسیی خۆم و ناشایستەییم لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئەنجامدانی ئەم چەشنە کارە مەزنە، ئێستا لە حیکمەتی ئاوڕدانەوەی گشتینەی خەڵك لە من و، دەربڕینی هەستی جۆرە ڕێزنانێك بەرامبەرم تێدەگەم..

ئەو حیکمەتەش ئەمەیە:

ئەو ڕاستییانەی کە پەیامەکانی نوور لەخۆیان گرتوون و ئەو کەسایەتییە مەعنەوییەش کە قەوارەی قوتابیانی ئەم پەیامانە دەینوێنێت، ڕووی ئەو پێویستییە ناوبراوەیان ئاراستەی خۆیان کردووە، نەخوازەڵا لە بارودۆخێکی وەك ئەم بارودۆخ و دەوروبەرەی ئێستاماندا. خۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە بەشی من لەم خزمەتەدا لەوانەیە تەنانەت یەك لە هەزاریش نەبێت، بەڵام هەندێ کەس باوەڕیان وایە کە ئەو ڕاستییە دەراسایە لە مندا بەرجەستە بووبێت و، نوێنەری ئەو کەسێتییە ئەمین و دڵسۆزە بم. بۆیە ئەو جۆرە ئاوڕلێدانەوەیەم بۆ دەردەبڕن.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە ئاوڕلێدانەوەیە چەندە زیانی بۆ من تێدایە، بە هەمان ئەندازە لەسەر دەروونیشم قورس و گرانە، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بە ناحەقی و لەبەر پاراستنی ڕاستییە نوورانییەکان و کەسێتییە مەعنەوییەکەی، بێ دەنگیم لە ئاستی ئەو زیانە مەعنەوییانەدا هەڵبژارد.

لەوانەیە هۆی ئەو چەشنە ئاوڕلێدانەوەیەی خەڵك، ئاماژەیەکی ئاییندەیی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّه - و هەندێ ئەولیای تر بێت کە بە ئیلهامێکی خوایی ئاماژەیان بۆ ڕاستیی پەیامەکانی نوور و کەسێتیی مەعنەویی قوتابیانی ئەو پەیامانە کردووە. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە پەیامەکانی نوور ئاوێنەیەکی پیشاندەری موعجیزەی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن لەم چەرخەی ئێستادا.

دوور نی‌یە ئەو هەندە خەڵکە، کەسی لاوازی منیان لەمەدا ڕەچاو کردبێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە خزمەتگوزاری ئەو ڕاستی‌یە دەراسایەم. منیش لەوەدا هەڵەم کرد کە ئاوڕلێدانەوەی جوزئیی ئەوانم بەرامبەر کەسی خۆم تەئویل نەکرد و نەمگێڕایەوە بۆ پەیامەکانی نوور. هۆی ئەوەش لاوازیی خۆم و زۆریی ئەو هۆکارانەیە کە یارمەتیدەرانم بەرەو ترسان ببەن..

قبووڵ کردنیشم بۆ ئەو بەشەی کە تایبەتە بە کەسی خۆمەوە، تەنها بۆ دانانی نیشانەی پشت پێ بەستن و، مۆرکی باوەڕ کردنە بە گوفتارەکانم، دەنا هیچ شتێکی تر نی‌یە.

من بەمەی خوارەوە وریاتان دەکەمەوە:

هەرگیز پێویست بە لەناوبردنی کەسی لاوازی من ناکات کە بەسەر لێواری گۆڕەکەمدا شۆڕ بوومەتەوە و، پێویستیش بەم چەشنە گرنگی دانە بە بوونی من ناکات.

ئەوەش زۆر پێویستە کە بزانن زۆرانگرتن لەگەڵ پەیامەکانی نووردا هەوڵێکی سەرنەگرتووە. چونکە هەرگیز ئێوە ناتوانن زۆرانی لەگەڵدا بگرن، بگرە هەر هەوڵی ئەوەش مەدەن و هەرگیز بەسەر پەیامەکانی نووردا سەرناکەون. خۆ ئەگەر هەوڵی زۆرانتان دا لەگەڵ ئەو پەیامانەدا، ئەوا جگە لە گەیاندنی زیانێکی مەزن بە نەتەوە و نیشتمان هیچی تر درووێنە ناکەن.

بەڵام هەرگیز ناتوانن - هەرچەندەش هەوڵ و تەقالای زۆر بدەن - قوتابیانی ئەو پەیامانە پەرتەوازە بکەن و یەکێتیی نێوانیان هەڵبووەشێننەوە. چونکە ناچار کردنی ڕۆڵە و نەوەکانی باپیرانی قارەمانمان کە زیاد لە پەنجا ملیۆن شەهیدیان لە پێناوی پارێزگاری کردنی قورئان و ڕاستی‌یە بەنرخەکانیدا پێشکەش کردووە، ناچار کردنیان

بۆ لەبیربردنەوە و بێ ئەمەكی بەرامبەر ڕابووردووی پرشنگداریان، یاخود بتانەوێ پەردەیەك لە نێوان ئەوان و پاڵەوانێتی‌یە ئایینی‌یەکانیان دابنێن کە مایەی سەرنج و جێی ڕێز و سەرسوورمانی جیهانی ئیسلامی‌یە، ئەو هەوڵە هەرگیز کارێکی ئاسان نی‌یە. خۆ ئەگەر ئەوان لە مەیدان بکشێنە دواوە، ئەوا قوتابیانی بەوەفای پەیامەکانی نوور دەستبەرداری ئەو پەیامانە نابن کە ئاوێنەیەکی دەرخەری ئەو ڕاستی‌یەن و، ڕازی نابن کە - بەو دەستبەرداری‌یە - زیان بە نیشتمان و نەتەوە و ئاسایش بگات.

دوا وتەم:

﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظيم﴾!)[1].

## بۆ سەرۆکایەتیی دادگای تەمییز

☐ (لەو دانیشتنەی دادگای تەمییزدا کە بۆ مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارە ستەمکارانەکەی دادگای "ئافیوون " سەبارەت بە ئێمە، پەنامان بۆ برد، هیچ بوارێکی قسە کردنیان پێ نەدام، بەڵکو تۆمەتێکی تری سێهەمیان بەسەردا خوێندمەوە کە بە زبری و توندوتیژی داڕێژرابوو، تەنانەت نەیانهێشت هیچ کەسێك لە نووسینەوەدا یارمەتیم بدات. ئنجا وێڕای ناخۆشیی خەتەکەم، لەو کاتەدا نەخۆشیش بووم. جا ئەم سکاڵایەی کە بەدەم نەخۆشی‌یەوە نووسیومە وەك لائیحەیەکی تەمییز پێشکەشی مەقامی بەڕێزتانی دەکەم کە تا ئێستا دوو جار بە تەواوی ویژدانی لەگەڵدا بەکارهێناوم.

ئەمە عەرزوحاڵێکە پێشکەشی دادگای هەرە مەزنی حەشری دەکەم و بۆ مەقامی خوای گەورەی بەرز دەکەمەوە، با "دادگای تەمییز"ی ئێستا و نەوەکانی داهاتووش بیبیستن و، بەرگوێی مامۆستایانی زانکۆ و قوتابی‌یە ڕۆشنبیرەکانیشی بکەوێت.

وا لە نێوان سەدان بەڵا و گیروگرفتدا، کە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا ڕووبەڕووی بوومەتەوە، تەنها "دە" دانەیان هەڵدەبژێرم. بۆ ئەوەی وەك سکاڵایەك بیانخەمە پێش چاوی دادگەریی مەقامی خوای گەورەی شکۆمەند و دادوەری ڕەها.

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٢٠-٦٢٣.

*یەکەم:*

هەرچەندە من لە خۆمدا کەسێکی خاوەن کەموکووڕی و ناتەواویم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ژیانی خۆم بۆ بەختەوەریی ئەم نەتەوەیە و ڕزگارکردنی ئیمانەکەی تەرخان کردووە و، بە هەموو توانایەکم هەوڵم داوە کار بۆ پەیامەکانی نوور بکەم، تاکو خۆم بکەم بە قوربانیی ڕاستییەك کە هەزاران کەس خۆیان لە ڕێیدا بەخت کردووە، کە ڕاستیی قورئانی پیرۆزە. هەر لەم ڕێیەشدا و بە پشتگیری و فەزڵی خوای گەورە توانیومە هەموو جۆرێکی ئازاردان و ئەشکەنجە هەڵبگرم و، بە هیچ جۆرێك پاشەکشێم نەکردووە و بەرەو دواوە نەگەڕاومەتەوە.

وا تەنها یەك نموونە دەهێنمەوە بۆ ئەو ڕەفتاری غەدر و ستەمکارییەی کە لە بەندیخانەی "ئافیوون" و دادگاکەیدا ڕووبەڕووی بوومەوە:

هەرچەند ئەوان سێ جار لائیحەی تاوانبارکردنەکەیان - کە پڕیان کردبوو لە تۆمەتی ناڕەوا و دەمهەڵبەست - دا بە گوێی من و قوتابیانی بێ تاوانی نووردا، کە چاوەڕوانیی دڵدانەوەیان دەکرد لە دادگەریی دادگا و، هەموو جارێکیش خوێندنەوەی لائیحەکە بەلای کەمەوە دوو سەعاتی دەخایاند، کەچی تەنها بواری یەك دوو خولەکی قسەکردنیان پێ دام، لە کاتێکدا کە تکام لێ کردن ماوەی دە خولەك یان چارەکە سەعاتێکم بدەنێ بۆ بەرگری کردن لە مافەکانمان.

وێڕای ئەوەی کە ماوەی بیست مانگ لە زیندانێکی تاکە کەسیدا بە دابڕاوی لە خەڵك مامەوە، ئەوان ڕێیان نەدا کەس سەردانم بکات، دوو سێ هاوڕێ نەبێت، ئەویش تەنها بۆ ماوەی سێ چوار سەعات! ئەم سەردانەش یارمەتییەکی جوزئیی دام بۆ نووسینەوەی بەرگرییەکەم. دوایی ڕێیان لەوانیش گرت و مامەڵەیەکی توندیان لەگەڵدا نواندن و سزایشیان دان! هەروەك ناچاریان کردین گوێ لە خوێندنەوەی لائیحەی تۆمەتبارکردنەکەی داواکاری گشتی بگرین کە پازدە لاپەڕە دەبێت و پڕی کردووە لە درۆودەلەسەی ڕق لە دڵانە و قسەی دەمهەڵبەست و تێگەیشتنی هەڵە و خراپ. تەنانەت من هەشتا و یەك دانە هەڵەم لەو لائیحەیەدا دەستنیشان کرد. بواری قسە و بەرپەرچدانەوەشیان پێ نەداین، خۆ ئەگەر ڕێی قسەیان بدامایە، پێم دەوتن:

ئێوە ئینکاریی ئایینی خۆتان و سووکایەتیش بە باپیرانتان دەکەن، لەو ڕووەوە کە پێتان وایە لەسەر گومڕایی بوون. هەروەك نکوڵی لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ دەکەن و یاساکانی قورئانی پیرۆزتان پێ قبوڵ نییە. کەچی لە هەمان کاتدا و لە ژێر دروشمی ئازادیی بیر و سەربەستی ویژداندا دەست ناهێننە ڕێی مەجووس و جوولەکە و گاوران و مونافیقانی مورتەددی ئاژاوەچی لە پشتگیرانی بەلشەفییەکان.

حکوومەتی بەریتانیا، کە هەموومان ڕادەی دەمارگیریی بۆ نەسرانیەت و مەودای لووت بەرزیی دەزانین، هەموو کاتێك ڕێ بە ملیۆنەها موسڵمانی ژێر دەستەڵاتی خۆی دەدات کە قورئان بخوێننەوە و وانەی لێ وەربگرن، ئەو وانانەی کە بەرپەرچی سەرجەمی بیروباوەڕە ناڕەوا و دەستوورە کافرەکانی ئینگلیز دەدەنەوە..

پاشان نەیارەکانی هەموو حکوومەتێك دەتوانن بە ئاشکرا ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان دەربڕن و بڵاویشیان بکەنەوە، بێ ئەوەی دادگاکانی ئەو حکوومەتانە کاریان بەسەریانەوە ببێت..

کەچی سەبارەت بە من، وردەکارییان لەسەر چل ساڵی ژیانم و سەد و سی دانە لە کتێبەکانم و سەرجەم نامەکانم، تەنانەت نهێنییەکانیشیان، لە دادگای "ئیسپارتە" و دادگای "دەنیزلی" و دادگای جەزای "ئەنقەرە" و لە سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینیشدا بە ئەنجام گەیاند. هەروەك دادگای تەمییزیش دوو جار، لەوانەیە سێ جاریش، ئەو لێکۆڵینەوە و وردەکارییە ناوبراوەی کرد و، نوسخە تایبەتی و نا تایبەتییەکانی پەیامەکانی نووریان نزیکەی سێ ساڵ لە لا مایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شتێکیان تێدا نەدۆزییەوە کە مایەی هیچ سزایەکی تەنانەت بچووکیش بێت.

جا من دەپرسم:

ئایا ئەو گوناهە چییە کە ئێمە کردوومانە هەتا سزایەکی ئاوا سەختمان بدەن و لە زیندانی تاکە کەسیدا بەندمان بکەن، لە کاتێکدا کە من بەم ڕادەیە لاوازم و لەم بارودۆخە دژوارەی ژێر دەستی زۆرداری و ستەمدام؟ ئایا چ یاسایەك یان چ بەرژەوەندی و ویژدانێك بەمە ڕازی دەبێت؟ لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور، کە ئێستا سەرجەمەکەیتان بە تەواوی لە بەردەستدایە، بووە بە ڕابەرێکی بەهێز و ڕاستی زیاتر لە

دووسەد هەزار قوتابیی نووری ڕاستەقینە کە ئامادەن بۆ قوربانی و خۆ بەخت کردن و، بەمەش خزمەتێکم پێشکەش بە ئاسایش و ئارامیی وڵات کردووە. پاشان ئەو بەرگرییەی پێشکەشم کرد و چوارسەد لاپەڕە دەبێت، بە جۆرێکی بێ گومان بێ تاوانیی ئێمەی سەلماند. بۆیە هەر ئەم پرسیارانەتان - بە بێ گومانی - لە بەردەم دادگای هەرە گەورەی ڕۆژی حەشردا لێ دەکرێت.

*دووهەم:*

ئەو تەفسیرەم کە بۆ چەند ئایەتێکی ڕاشکاوی قورئانی پیرۆز نووسیومە سەبارەت بە "پۆشتەیی" و "میرات" و "یادی خوا" و "فرەژنی" و، بەرپەرچدانەوەم بۆ ئەو ڕەخنە و بەهانە و بیانووانەی کە لە لایەن شارستانێتیی نوێی خۆرئاواوە لە دژیان وروژێنراوە.. ئەمانەیان بە هەندێ لەو تۆمەتانە داناوە کە ئاراستەیان کردووم.

وا لێرەشدا هەمان برگە دووپات دەکەمەوە کە پێش پازدە ساڵ لە دادگای "ئەسکی شەهر" و پاشان لە دادگای تەمیزی "ئەنقەرە"دا وتوومە و، هەر ئەم برگەیە سکاڵای منە لە دادگای حەشری هەرە مەزندا و، وریاکردنەوەشە بۆ کۆمەڵانی ڕۆشنبیری ئایندە و، لەگەڵ پەیامی "الحجة الزهراء"دا دەبێت بە لائیحەیەکی تەمییز.

هەروەك هەمان برگە بۆ ئەو داواکارە گشتییە دووپات دەکەمەوە کە هەلی قسەکردنی بۆ نەڕەخساندم و، هەشتا دانە هەڵەشم لەو لائیحەی ئیتیهامەیدا چەسپاند کە پڕی کردبوو لە قسەی هەڵە و لەخشتەبردن. جارێکی تر دەیخەمەوە پێش چاوی ئەو دادگایەی کە بڕیاری دوو ساڵی زیندانی تاکە کەسیی سەخت و دوو ساڵیش نەفی و دەست بەسەریی لەسەر دەرکردم:

"منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی داد دەڵێم:

تاوانبارکردنی کەسێك کە بەرزترین و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەکات، ئەو دەستوورەی کە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێکدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتییاندا پرس و ڕایان پێیەتی و ڕەفتاری پێ دەکەن.. ئەو کەسەی کە لە تەفسیرەکەیدا پشت بەو شتانە دەبەستێت کە سێ سەد و پەنجا هەزار تەفسیرنووس تیایاندا

یەکیان گرتووە و سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە کەوتووە کە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە.. تاوانبارکردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێکی ستەمکارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەویدا هەبێت - ڕەفزی دەکات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە".

هەروەها با گوێ کەڕەکانی سەردەمی ئێستاشمان ئەمە ببیستن!

ئایا تاوانبارکردنی کەسێکی ئاوا کە وازی لە سیاسەت و ژیانی کۆمەڵایەتی هێناوە و، لە ڕووی فیکری و زانستییەوە باوەڕی بە هەندێ لەو یاسا بیانییانە نییە کە بە هۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە لەم وڵاتەدا قبووڵ کران، ئایا ئیدانە کردنی کەسێکی ئاوا لەبەر ئەوەی تەفسیری ئەو ئایەتانەی کردووە، بە ئینکاریی ئەوان بۆ ئیسلام و بە خیانەت کردن دانانرێت بەرامبەر ملیارەها کەس لە باپیرانی ئایینداری قارەمانمان و، ئاراستە کردنی تۆمەت نییە بەرامبەر بە ملیۆنەها تەفسیری قورئانی پیرۆز؟

*سێهەم:*

یەکێك لەو هۆکارانەی کردوویانە بە بیانووی ئەوەی حوکم بدرێم ئەوەیە کە وتوویانە: ئارامی و ئاسایش تێك دەدات. هۆی ئەمەش لێکدانەوەی هەڵەیانە بۆ هەندێ ڕستەی چەند نامەیەکی کەسی و چەند نامەیەکی تایبەت کە لە پەنجا ڕستە تێناپەڕن، لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور زیاتر لە سەد هەزار وشە و ڕستەیان لەخۆ گرتووە و، ئەوان تەنها بۆ گریمانێکی لاواز و یەکجار دووریان ڕوانیوە کە ڕێژەکەی یەك لە سەد تەنانەت یەك لە هەزاریش دەرناچێت و، ئەم گریمانە دوورەیان وەك ئەوەی ڕووی دابێت لێك دایەوە و لەسەر ئەو بناغەیە دەیانەوێت سزامان بدەن.

من لە لایەنی خۆمەوە هەموو ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ئەم سی چل ساڵەی دوایی ژیانمن و، هەزاران قوتابیی نووری خاوێنیش دەگرم بە شایەت و، دەڵێم:

کاتێ ئەو سەرکردە ئینگلیزەی کە ئەستەمبووڵی داگیر کرد، دەستی دایە نانەوەی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان موسڵماناندا، تەنانەت "شێخولئیسلام" و هەندێ زانای تری خەڵەتاند و وای لێ کردن کە هێرش بکەنە سەر یەکتری و، جیاوازیی نێوان کۆمەڵی

"ئیتیحادی‌یەکان" و کۆمەڵی "ئیئتیلاف"ی فراوان کرد تاکو کەش و باروودۆخ بۆ سەرکەوتنی یۆنانی‌یەکان ئامادە بکات و شکست بە بزووتنەوەی میللیی نیشتمانی بهێنێت، لەو دەمەدا من کتێبی "شەش هەنگاوەکان"م لە دژی ئینگلیز و یۆنانی‌یەکان دانا و، بەڕێز "ئەشرەف ئەدیب"یش لە چاپی دا و بڵاوی کردەوە. کە ئەمەش یارمەتی‌یەکی باشی دا بۆ پووچەڵ کردنەوەی کاریگەریی ئەو پلانە دۆزەخی‌یانەی کە ئەو سەرکردەیە دایڕشتبوو..

جا ئەو کەسەی کە بایەخی بە هەڕەشەی ئیعدامی ئەو سەرکردە ئینگلیزە نەدا و، ڕای نەکرد بۆ ئەنقەرە.. لە کاتێکدا کە حکوومەتی ئەنقەرە بانگهێشتیان کردبوو بۆ ڕێزنان لە خەباتەکەی..

لە ڕووسیاشدا گوێی نەدا بە بڕیاری لەسێدارەدان کە سەرکردە ڕووسەکە بۆی دەرکرد..

لە ڕووداوەکەی "٣١ ی مارت"یشدا توانیی بە ئاراستە کردنی تەنها یەك وتار هەشت تیپی یاخی و هەڵچووی سوپا هێور بکاتەوە و بیانهێنێتەوە ژێر فەرمان و گوێڕایەڵیی سەرکردەکانیان..

کاتێکیش ژەنراڵەکانی دادگای عورفیی سەربازی پێیان وت:

"تۆیش کۆنەپەرستیت، چونکە داوای حوکمی شەریعەت دەکەیت"..

ئەو تەنانەت کەمترین بایەخیشی بۆ هەڕەشەکانیان دانەنا و، وەڵامی دانەوە کە:

"ئەگەر مەشرووتییەت لای ئێوە بریتی بێت لە خۆسەپاندن و دیکتاتۆرێتیی دەستەیەکی دیاری کراو، ئەوا با هەموو گرۆی جیننی و ئادەمیزاد بزانن کە من کۆنەپەرستم و، ئامادەم گیانی خۆم لە پێناوی تەنها یەك دانە مەسەلەی شەریعەتدا بەخت بکەم". کە بەم وەڵامەش هەموو ئەفسەرەکان حەپەسان و واقیان وڕ ما.

خۆ لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی دەرکردنی بڕیاری ئیعدام بوو لە لایەن ئەوانەوە، کەچی بڕیاری بێ تاوانی و بەردانیان بۆ دەرکرد. ئەویش لەسەر ئەم بڕیارە هیچ سوپاسێکی نەکردن، بەڵکو بەدەم دەرچوونیەوە لە دادگادا دەنگی لێ هەڵبڕی و وتی:

"با بژی دۆزەخ بۆ ستەمکاران"..

کاتێ لە دیوانی سەرۆکایەتیشدا لە ئەنقەرە – وەك لە بڕیاری دادگای ئافیووندا تۆمار کراوە – مستەفا کەمال بە تووڕەییەوە پێی وت:

"بۆیە بانگهێشتمان کردیت بۆ ئێرە هەتا سوود لە ڕا و بۆچوونە ڕاست و دروستەکانت وەربگرین، کەچی چەند شتێکت لەبارەی نوێژەوە نووسی و تۆوی دووبەرەکیت لە نێواندا چاندین". یەکسەر لە بەردەم نزیکەی پەنجا پەرلەمانتاردا وەڵامی دایەوە کە:

"گەورەترین مەسەلەی دوای مەسەلەی ئیمان بریتی‌یە لە نوێژ. خۆ هەرکەسێك نوێژ نەکات خائینە و، دیارە حوکمی خائینیش وەرناگیرێت و پشتگوێ دەخرێت"..

لە بەردەم ئەم وەڵامەدا، ئەو سەرکردەیە ناچار بوو کە تووڕەیی خۆی بخواتەوە و، هەندێ دڵنەوایی پێشکەش بکات..

پاشان پیاوانی ئاسایشی دەوڵەت لە شەش پارێزگادا هیچ ڕووداوێکیان لەسەر قوتابیانی نوور تۆمار نەکردووە کە ئاسایش تێك بدات، هەرچەندەش ژمارەیان سەدان هەزار دەبێت، جگە لە ڕووداوێکی بچووك کە پەیوەندیی بە داکۆکی کردنی شەرعیی قوتابی‌یەکی بچووکی نوورەوە هەیە و، هیچ کەسێك نەیبیستووە کە قوتابی‌یەکی نوور لەسەر هیچ تاوانێك چووبێتە بەندیخانەوە. خۆ ئەگەر بە ناڕەواش بەند کرابێت، ئەوا بووە بە هۆی چاك کردنی ڕەوشتی بەندکراوانی تر.

ئنجا هەرچەند سەدان هەزار نوسخەی پەیامەکانی نوور لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا بڵاو بوونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێك زیانێکی لێ نەبینیون، بگرە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا جگە لە سوود هیچ شتێکی تریان لێ نەدیوە. سێ دادگای سێ حکوومەتیش بڕیاری بێ تاوانی‌یان دەرکرد و، سەدان هەزار قوتابیش بە گوفتار و کردار پشتگیری و شایەتی لەسەر نرخ و بەهای پەیامەکانی نوور ڕادەگەیەنن.

پاشان ئایا کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز و هەژار و بەساڵاچوو کە خۆی لەسەر لێواری گۆڕدا دەبینێت و، بە هەموو هێز و قەناعەتێکی وازی لە شتانی فانی هێناوە و، بایەخ بە هیچ پلە و پایەیەکی دنیایی نادات، بەڵکو سەرقاڵی شتانێکە قسوور و ناتەواوی‌یەکانی پێشووی پاك بکەنەوە و سوود بە ژیانی‌ئەودنیای بگەیەنن و، لەبەر

شەفەقەتی زۆر و حەزی لە پاراستنی بێ تاوان و پیران لە هەر زیانێك بێتە ڕێیان، تەنانەت دوعای لەو ستەمکارانەش نەکردووە کە بە ناڕەوا ئازاری دەدەن..

ئایا دروستە کەسێکی ئاوا تاوانبار بکرێت و لە بارەیەوە بوترێت: ئەم پیرە گۆشەگیرە هەوڵی تێکدانی ئاسایش و ئارامی دەدات و، ئامانجیشی پیلانگێڕانی دنیاییە و پەیوەندی و نامەکانیشی هەر لەبەر ئەو مەبەستەن، کەواتە کەسێکی تاوانبارە؟!

بێ گومان ئەو کەسانەی گوفتاری وای دەرحەق دەڵێن و لە سایەی بارودۆخی دژواردا بڕیار لە دژی دەردەکەن، خۆیان بە یەکجارەکی تاوانبارن و، سبەینێ لە دادگای هەرەمەزنی ڕۆژی حەشردا دەبێ نرخ و بەهای ئەو تاوانەیان بدەن.

کەسێکی وەك ئەم پیاوەی کە بە تەنها یەك وتار هەشت تیپی سوپای هێور کردەوە و، قەناعەتی پێ کردن کە ملکەچی یاسا و ڕێسای سەربازی ببنەوە.. پێش چل ساڵیش توانیی بە نووسینی تەنها یەك وتار هەزاران کەس بە لای خۆیدا ڕابکێشێت و بیانکات بە لایەنگر و پشتگیری خۆی و، لە بەردەم سێ سەرکردەی زۆرداری بەزەبروزەنگدا - کە پێشتر باسکران - سەری نەوی نەکرد و لێیان نەترسا و مەرایی بۆ نەنواندن و، لەبەردەم دادگاکانیشدا وتی:

با چاك بزانن کە ئەگەر بە ئەندازەی مووی جەستەم سەرم ببێت و هەموو ڕۆژێك سەرێك لە جەستەم بکرێتەوە، ئەوا ئەم سەرەی کە بۆ ڕاستییەکانی قورئان تەرخانم کردووە، هەرگیز لە بەردەم ئیلحاد و کوفری ڕەهادا نەویی ناکەم و، هەرگیزاو هەرگیز خیانەت لە نیشتمان و نەتەوە و ئیسلام ناکەم..

کەسێکی ئاوا کە لە "ئەمیرداغ" لەگەڵ چەند کەسێکی کەمی هاوڕێی قیامەتی و سێ کەسی تر نەبێ لەوانەی کاروباری خزمەتی بۆ بەڕێوە دەبەن، پەیوەندیی لەگەڵ کەسی تردا نییە، ئایا دروستە دوای ڕوون بوونەوەی هەموو ئەوانەی باس کران، بەکەسێکی ئاوا بوترێت:

ئەم سەعیدە لە "ئەمیرداغ" بە نهێنی بۆ تێکدانی ئاسایش هەوڵ دەدات، ئەوەتا بیری هەندێ کەسی ئەم گەلەی لەوێ ژەهراوی کردووە و، بیست کەسی ئەویش مەدحیان کردووە و نامەی تایبەتییان بۆ ناردووە، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە نهێنی کار لە دژی سیستەمی شۆڕشگێڕانەی حکوومەت دەکات؟

ئنجا هەر لەسەر بناغەی ئەم تۆمەتەش سیاسەتی دوژمنایەتی‌یان لەگەڵدا بەکار هێناوە و، ماوەی دوو ساڵ بڕیاری بەندکردنی سەخت و دژواری لەسەر دەرکرا و، خرایە زیندانی تاکە کەسی و دابڕانی تەواوەتی‌یەوە و، لە دادگاشدا بواری قسە و بەرگری لەخۆ کردنیان پێ نەدا.

بۆیە لەبەر هەموو ئەمانە، سەرجەمی ئەو کەسانەی کە ئازاریان دام و بەم ڕادەیە لە دادگەری لایان دا، بە ویژدانی ئێوە دەسپێرم.

جا ئایا کەسێکی وا کە لە شایستەیی خۆی زیاتر خەڵکی ڕوویان تێکردووە و، هەزاران کەسی بە یەك وتار هێنایەوە ژێر گوێڕایەڵی و، بە نووسینی تەنها یەك وتار وای لە هەزاران کەس کرد کە بڕۆنە ناو کۆمەڵەی "ئیتیحادی محەممەدی" و، پەنجا هەزار کەس - بەوپەڕی ڕێزەوە - لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا گوێیان لە وتارەکەی ڕاگرت..

ئایا هەرگیز ژیری ئەوەی پێ قبووڵە کەسێکی ئاوا بۆ ماوەی سێ ساڵ لە "ئەمیرداغ" کاری نهێنی بکات، کەچی بتوانێت قەناعەت تەنها بە چەند کەسێکی کەم بهێنێت؟ ئنجا دەست لە کاروباری ئاخیرەتی خۆی هەڵبگرێت و نوقمی پیلانی سیاسی ببێت و، گۆڕە نزیکەکەی خۆی لە بری ڕووناکی لە تاریکی پڕ بکات؟

ئایا شتی وا هەرگیز دەگونجێ؟ خۆ تەنانەت خودی شەیتانیش ناتوانێت ئەم قەناعەتە بە هیچ کەسێك ببەخشێت!

*چوارەم:*

شەپقە لەسەر نەکردنی منیان وەك هۆکارێکی گرنگ بۆ تاوانبار کردنم پێش چاو خست و، بواریشیان نەدام هیچ قسەیەك بکەم، کە نیازم بوو پێیان بڵێم:

سێ مانگ لە پۆلیسخانەی "قەستەمۆنی" بە گیراوی مامەوە و، هیچ کەسێکیش پێی نەوتم: "دەبێ شەپقە لەسەر بکەیت".

لە سێ دادگاشدا کە دادگاییان کردووم، شەپقەم لەسەر نەکردووە و، لە دەمی دانیشتنەکانی دادگاکاندا سەرم دەرنەخستووە و، کەس لەم ڕووەوە دەستی نەهێناوەتە ڕێم.. ڕاستە، هەندێ لەو ستەمکارانەی کە هیچ بەشێکیان لە ئایین نەبوو ئەم بابەتەیان کرد بە بیانووی دەستیان و، بە شێوەیەکی نارەسمی ماوەی بیست و سێ ساڵ شەڕیان پێ فرۆشتم و گوشاریان خستە سەرم وئازاریان دام.

ئنجا منداڵان و ژنان و زۆربەی خەڵکانی لادێ نشین و کارمەندانی دەوڵەت لە فەرمانگە ڕەسمی‌یەکاندا و ئەوانەش کڵاو لەسەر دەکەن، ناچار نین شەپقە لەسەر بکەن، چونکە هیچ سوود و بەرژەوەندی‌یەکی ماددی لەوەدا نی‌یە..

کەواتە کەسێکی گۆشەگیری وەك من، ماوەی بیست ساڵ بەهۆی لەسەر نەکردنی شەپقەوە دووچاری گەلێ تۆمەتی ناڕەوا بووە. لە کاتێکدا کە هەموو موجتەهیدان و شەیخولئیسلامەکان ڕێیان بە لەسەر کردنی شەپقە نەداوە، کەچی وا ئێستا سەر لەنوێ بە ناحەقی ئازارم دەدەنەوە. خۆ بە ناوی سەربەستی و ئازادی‌یەوە کەس حەقی بەسەر ئەوانەوە نی‌یە کە بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕەمەزان ئارەق دەخۆنەوە و نوێژ ناکەن..

کەواتە ئەو کەسانەی کە بەم سەرسەختی و بەم چەشنە توندوتیژی‌یە چەندین جار لەبەر جلوبەرگەکانم تاوانبارم دەکەن، بێ گومان دوایی لێپرسینەوەیان لێ دەکرێت، کاتێ زیندانی تاکەکەسی و هەتاهەتایی گۆڕ دەبینن و، ئەو کاتەش کە ئامادەی بەردەم دادگای هەرەمەزن دەبن.

پێنجەم:

ئەو پەیامانەی نوور کە لە لایەن سەد هەزار کەسی ئەهلی ئیمانەوە "وەرگیراوی"یان بەدەست هێناوە و، ماوەی بیست ساڵی ڕەبەق چەندین سوودی زۆر و بێ زیانیان بە نەتەوە و نیشتمان گەیاندووە، ئێستا بێ نرخترین بروبیانوو دەکرێت بە هۆی دەست بەسەردا گرتنی.

بۆ نموونە: دەستیان بەسەر کۆمەڵە پەیامی "زولفەقار - موعجیزاتی ئەحمەدی"دا گرت کە ئیمانی سەد هەزار کەسیان ڕزگار کردووە، تەنها لەبەر ئەوەی تەفسیرێکی ڕاست و دروست بۆ دوو ئایەتی پیرۆز تەنها لە دوو لاپەڕەیدا کراوە لە نێوان کۆی لاپەڕەکانیدا کە دەگەنە چوارسەد لاپەڕە. لە کاتێکدا کە ئەم کۆمەڵە پەیامە وەختی بەسەردا تێپەڕیوە و لەم ماوەیەشدا چەندین یاسای لێبوردن دەرچوون.

جا ئایا دەست بەسەرداگرتنی ئەو کۆمەڵە پەیامە بەنرخە، تەنها لەبەر تەنها دوو لاپەڕەی، کارێکی ڕاست و دروستە؟ وا ئێستاش چەند پەیامێکی تری بەنرخ لەبەر یەك دوو وشەی نێوان هەزاران وشە کە واتای هەڵەیان لێ دەدەنەوە، دەستیان بەسەردا

دەگیرێت. هەر کەسێك ئەم سێ‌هەم لائیحەیەی داواکاری گشتی و ئەو بریارەی بیستبێت کە بڵاومان کردەوە، دڵنیا دەبێت لەم قسانەی کە دەیکەین.

بەڵام ئێمە سەبارەت بە هەر موسیبەتێك بێتە ڕێمان، دەڵێین:

﴿إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيْهِ راجِعُونَ﴾ و ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾!

*شەشەم:*

ئەو کەسانەی کە وەرگێری هەزاری پەیامەکانی نوور[1] لەسەر ئەوە تاوانبار دەکەن کە هەندێ قوتابیی نوور زیادەڕەوی‌یان لە مەدح و سەنایدا کردووە و، گومانی باشی زیاد لە پێویستیان بەرامبەری دەربریوە لەو نامانەدا کە بۆ هاندان و پیرۆزبایی و سوپاسگوزاری بۆیان نووسیوە، دوای ئەوەی سوودێکی یەکجار گەورەیان لە بەڵگە ئیمانی‌یە بەهێزەکان وەرگرت و، هەتا پلەی "علم اليقين" زانستەکانی ئیمانیان بەدەست هێنا.. ئەوانەی لەسەر ئەمە تاوانبارمان دەکەن، پێیان دەڵێین:

من کەسێکی لاواز و، دەستەوسان و، نەفی‌کراو و، نیمچە نەخوێندەوارم. لەو کاتانەشدا کە بە پڕوپاگەندەکانیان خەڵکیان لە دژم دەورووژاند و دەیانترساندن لێم، هەر دەرمانێکی قورئان و ڕاستی‌یە بەرزەکانی ئیمانم بۆ دەردەکانی خۆم بەدەست دەهێنا، یەکسەر ئەو ڕاستی‌یە بەنرخانەم دەنووسی، چونکە لەو باوەڕەدا بووم کە چارەسەرێکی شیفابەخشن بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوە و نیشتمان.

جا لەبەر ئەوەی خەتی خۆم یەکجار ناخۆشە، هەمیشە پێویستم بە چەند کەسێکی یارمەتیدەر بووە. چاودێریی خوای گەورەش چەندین یارمەتیدەری تایبەت و ڕاست و دامەزراوی پێ بەخشیم.

شتێکی ئاساییە کە بە تەواوەتی دەست بە ڕووی خۆش باوەڕی و گومان باشی و مەدح و سەنای بێگەردیانەوە نەنێم و لەسەر ئەوە سەرزەنشتیان نەکەم، تاکو هەست و نەستیان زامدار نەبێت. چونکە هەڵسوکەوتی لەو جۆرە، پێچەوانە و دژی ئەو ڕووناکی‌یانەیە کە لە گەنجینەی قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون، تەنانەت سووکایەتیشە بەو ڕووناکی‌یانە.

---

(١) دانەر مەبەستی خۆیەتی. (وەرگێر)

جا لەبەر ئەوەی کە ئەو یارمەتیدەرە خاوەن قەڵەمە ئەڵماسی و دڵە ئازایانەم لێ دوور نەکەونەوە، هەمیشە هەر مەدح و سەنایەکیان کردووم، من ئاراستەی پەیامەکانی نوورم کردوون، کە لە ڕاستیدا ئەو پەیامانە خاوەن مافن لەم ستایشەدا، چونکە دەرخەر و پیشاندەری موعجیزەی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن. هەروەها ئەو مەدح و سەنا و ستایشانەی ئەوانم بۆ کەسێتیی مەعنەویی قوتابیانی نوور گێڕاوەتەوە. خۆ کاتێ کە پێم دەوتن: "ئێوە سەد هێندەی بەشەکەی خۆم زیاترم دەدەنێ" هەست و سۆزی ئەوانم بەم قسەیە تا ڕادەیەك ئازار دەدا..

جا ئایا هیچ ماددەیەکی یاسایی هەیە کەسێك تۆمەتبار و سەرزەنشت بکات لەسەر ئەوەی کەسانی تر مەدح و ستایشیان کردبێت، هەرچەندەش خۆی ئەو ستایشەی پێ ناخۆش بێت؟ ئایا ماددەی یاسایی لەم چەشنە هەیە هەتا بکرێت بە پاساوی کارمەندێکی ڕەسمی کە بە ناوی یاساوە تاوانبارم بکات؟

دەبێ ئەوەش بزانین کە لە لاپەڕە "٥٤"ی بڕیاری لائیحەی تاوانبارکردن کە لە دژمان بڵاو کراوەتەوە، ئەم قسەیەی من هێنراوە کە وتوومە:

"ئەو کەسە مەزنەی کە لە ئاخر زەماندا دێت لە وەچەی ئالی بەیت دەبێت. ئێمەی قوتابیانی نووریش تەنها لە ڕووی مەعنەوییەوە دەکرێ لە ئالی بەیت دابنرێین. پاشان ڕێبازی پەیامەکانی نوور هەرگیز جێی "خۆویستی" یاخود بەگەورە گرتنی کەسێك یان حەزکردن لە پلەوپایەی دنیایی یان چاوگێڕان بۆ مەنسەب و ناوبانگی تێدا نییە. تەنانەت من خۆم بە ناچار دەزانم کە ئەگەر پلەوپایەی قیامەتیشم بدرێتێ، وازیان لێ بهێنم، تاکو ئەو ئیخلاسە نەشێوێنم کە لە ڕێبازی نووردا هەیە".

هەروەك لە لاپەڕە "٢٢" و لاپەڕە "٢٣"ی بڕیاری لائیحەکەدا ئەم دەستەواژانەی من هاتووە:

"مرۆڤ لە بەردەم خوای گەورەدا تەقسیرەکانی خۆی بزانێت و، پەی بە هەژاری و دەستەوسانیی خۆی لە بەردەم خوای گەورەدا ببات و، بە زەلیلی و شکستەیی و نەوازشەوە پەنای بۆ ببات. جا من - بەم کەسایەتی‌یە - خۆم لە هەموو کەسێك بە دەستەوسان تر و بەدبەخت تر و هەژارتر و تەقسیربارتر دەبینم لە بەردەم خوای گەورەدا.

خۆ ئەگەر سەرانسەری دنیا کۆ ببنەوە و لەسەر مەدح و ستایشم یەکبگرن، هێشتا هەر ناتوانن قەناعەتم پێ بکەن کە من مرۆڤێکی باش و سالح بم..

لەمە زیاتر لە خراپکاری‌یەکان و لایەنە چەوتەکانی کەسایەتیی سێ‌هەمم نادرکێنم، تاکو بە تەواوی لە خۆم دوورتان نەخەمەوە! کەواتە تەنها چاکە و بەخششی خوای گەورەیە کە کەسایەتی‌یە یەکجار نزمەکەم - کە وەك سەربازێك وایە - لە خزمەتی نهێنی‌یەکانی قورئاندا گوێڕایەڵ و ملکەچ دەکات، کە لە حوکمی بەرزترینی پلەوپایەکانی موشیرێتیدایە.

کەواتە "نەفس" لە هەموان نزمترە و، کارمەندی‌یەکەش لە هەموو شتێك بەرز و بڵندترە.

دەسا سەدان هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە".

لەگەڵ ئەوەشدا کە لائیحەکە ئەو دەستەواژانەی سەرەوەی لە قسەکانمان هێناوە و لە دەقەکەیدا دایناون، کەچی ئەوانەی دەیانەوێ تەنها لەبەر ئەوەی چەند کەسێك مەدحیان کردووم و، بە وێنەی ڕابەرێکی گەورە و مەهدی‌یەك هیدایەتم داون - بەو واتایەی کە لە پەیامەکانی نووردا هاتووە - بە تاوانبارم دابنێن. بێ گومان ئەو کەسانە خۆیان شایانی سزادانن لەسەر تاوانە گەورەکانیان.

*حەوتەم:*

دادگای "دەنیزلی" و دادگای تاوانە گەورەکان لە "ئەنقەرە" و دادگاکانی تەمییز بە یەکدەنگی بڕیاری بێ تاوانیی ئێمە و هەموو پەیامەکانی نووریان دەرکرد، ئەوەبوو هەموو ئەو پەیامانە و نامەکانیشیان داینەوە.

خۆ هەرچەندە ئەوان وتیان:

"هێشتا ئەگەر گریمانی بوونی هەڵەش هەبێت لە بڕیارەکەی دادگای دەنیزلیدا کە بۆ بێ تاوانیی ئێوە دەری کرد، بەڵام مادەم دادگای تەمییز بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردوون، ئەوا ئەو بڕیارە قەتعی‌یەتی وەرگرتووە و، نابێ جارێکی تر ببرێنەوە بۆ دادگا"..

هەروەها لەگەڵ ئەوەدا کە سێ ساڵم بە گۆشەگیری لە "ئەمیرداغ"دا بردە سەر و، پەیوەندیم تەنها لەگەڵ چەند کەسێکی کەمدا هەبوو لەوانەی کە بە نۆرە کاروباری خزمەتم بۆ ڕادەپەڕێنن، ئەوانەش وەك یارمەتیدەری بەرگدروو کاریان دەکرد. ئنجا قسەشم لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، مەگەر چەند کەسێکی دیندار و، لە چەند حاڵەتێکی ناچاریدا و، بۆ ماوەی تەنها چەند خولەکێك و، جگە لە ناردنی تەنها یەك نامە لە ماوەی حەفتەیەکدا لە پێناوی هاندانی قوتابیانی نووردا لەسەر خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور..

تەنانەت لە ماوەی سێ ساڵی دووردرێژدا سێ نامە زیاترم بۆ برا موفتییەکەم نەناردووە. بەڵکو وازم لە نووسین و کتێب دانانیش هێناوە کە سی ساڵە پێوەی سەرقاڵم، جگە لە دانانی دوو سەرنجی ورد لە بیست لاپەڕەدا سەبارەت بە "حیکمەتی دووپاتبوونەوە لە قورئان"دا و "هەندێ مەسەلە سەبارەت بە مەلائیکەت"ەوە و، لەو دوانە زیاتر شتی ترم نەنووسیوە، بەڵام ڕەزامەندیم لەسەر ئەوە نواند کە ئەو پەیامانەی دادگاکان بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردن لە شێوەی بەرگی گەورەدا کۆبکرێنەوە..

دوای ئەوەش کە دادگا ئەو پێنج سەد نوسخەیەی پەیامی "الآیـة الکبری"ی داینەوە کە بە پیتە کۆنەکان چاپ کرابوون، ڕەزامەندیم بۆ برایانم نواند کە بەهۆی ئامێری "ڕۆنیۆ"وە لەبەری بگرنەوە، چونکە دەمزانی یاسا بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕێ لەوە ناگرێت، تاکو جیهانی ئیسلامی سوودی لێ وەربگرێت و.. هەر تەنها سەرقاڵی هەڵەگیریی ئەو پەیامانە بووم و، خۆم لە قەرەی سیاسەت نەداوە. تەنانەت مانەوەم لە غەریبیی ئازاربەخشدا لە گەڕانەوە پێ باشتر بووە. ئەوەبوو بە وێنەی هەموو نەفی کراوەکانی تر نەڕۆشتمەوە بۆ شارەکەی خۆم، هەرچەندەش ڕوخسەتی ڕەسمی دەرچوو بوو کە بگەڕێمەوە. بەڵام نەڕۆشتمەوە، تاکو بە دنیا و سیاسەتەوە سەرقاڵ نەبم..

کەواتە ئاراستەکردنی ئەم سێهەم تۆمەتە کە کۆمەڵێك شتی درۆ و ناحەقی تێدایە و، لێکدانەوەی هەڵەی لەخۆ گرتووە و، هەوڵدانی تاوانبارکردنی ئەم پیاوە، دوو واتای سەرسامکەریان لەخۆ گرتووە کە ئێستا نایانڵێم.

ئەم ماوەیەی دوایی کە دەگاتە بیست مانگ ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێت.

بەڵام من هەر هێندە دەڵێم: ئەوان گۆڕ و دۆزەخیان سەروزیادە و، کێشەکەی خۆم بە دادگای هەرەمەزنی ڕۆژی قیامەت دەسپێرم.

*هەشتەم:*

پەیامی "تیشکی پێنجەم" دوو ساڵ لە دادگای "دەنیزلی" و دادگای "ئەنقەرە"دا مایەوە، دوای ئەوە دایانەوە بە خۆمان. منیش دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی ئەو پەیامە، بوارم دا لەگەڵ بەرگرییەکەم لەو دادگایەدا - کە لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دایە - بڵاو بکرێتەوە. ڕاستە من یەکەم جار وەك پەیامێکی تایبەت هەڵم گرتبوو کە پێش چاوی خەڵکیم نەدەخست، بەڵام مادەم دادگا ئاشکرای کرد و پەردەی لەسەر لادا، ئنجا دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکەش دایانەوە بە خۆمان، ئەوا وتم: هیچ زیانێك لە بڵاوکردنەوەیدا نییە، بۆیە ڕوخسەتم دا بڵاوی بکەنەوە.

ئەسڵی ئەو پەیامەش نزیکەی چل ساڵ پێش ئێستا لەبارەی هەندێ فەرموودەی موتەشابیهەوە نووسراوە کە لە مێژە لەناو خەڵکیدا بڵاو بوونەتەوە. خۆ هەرچەندە هەندێ لە زانایان بەشێکی ئەو فەرموودانەیان بە "زەعیف" لەقەڵەم داوە، بەڵام من لەبەر ڕزگار کردنی ئیمانداران لە شوبهە و گومانەکان نووسیومە، چونکە واتای ڕواڵەتیی ئەو فەرموودانە، دەبوو بە هۆی ئاراستەکردنی ڕەخنەی زۆر لێیان.

کەچی هەندێ لەو تەئویلە نائاساییانە لە پێش چاودا دەرکەوتن و بەرجەستە بوون! بۆیە ناچار بووین بیشارینەوە و وەك پەیامێکی پەنهان هەڵی بگرین، تاکو واتای هەڵەی لێ وەرنەگیرێ.

ئنجا دوای ئەوەی چەندین دادگا بە وردی لەو پەیامەیان کۆڵییەوە و ئاشکرایان کرد، دایانەوە بە خۆمان. کەچی جارێکی تر دادگا هەمان پەیامی کردووەتەوە بە هۆکاری تاوانبار کردنمان!

بۆیە ڕادەی دووریی ئەم کارە لە دادگەری و حەق و ئینسافەوە بە ویژدانی ئەو کەسانە دەسپێرین کە دەیانەوێ لەسەر قەناعەتێکی ناو ناخی دڵمان تاوانبارمان بکەن.

هەروەك ئەم سکاڵایەمان پێشکەش بە دادگای هەرە مەزنی خوایی دەکەین و، دەڵێین:

﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكيل﴾.

*نۆهەم:*

ئەمەش خالێکی گەلێ گرنگە، بەلاّم باسی ناکەین، تاکو ئەو کەسانە تووڕە نەکەین کە بڕیاریان لەسەر دەرکردین، لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نووریان خوێندەوە.

*دەهەم:*

ئەمەش خالێکی تری بەهێز و گرنگە، بەلاّم ئێستا باسی ئەمیش ناکەین، تاکو باسکردنی نەبێت بە مایەی زویری و بێزاری)[1].

## چەند نامەیەك لە بەندیخانەی ئافیوونەوە

□ حیکمەتی قەدەر

(برایانی ئازیز و بەوەفام!

سەرەخۆشیتان ئاراستە ناکەم، بەڵکو پیرۆزباییتان لێ دەکەم. چونکە:

مادەم قەدەری خوای گەورە لەبەر خواستی حیکمەتێکی خۆی ئێمەی بەرەو ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە سێ‌هەمە دایەبەر و، بەشێکی ڕۆزی‌یەکانمان لێرە دەرخوارد دەدات و، ڕۆزی‌یەکانمان ئێمەی بۆ ئێرە بانگ کردووە..

مادەم ئەزموونە بێ‌گومانەکانمان - تا ئێستا - تێی گەیاندووین کە چاودێریی خوای گەورە نەرمونیانە لەگەڵماندا و، بەهرەمەندی نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کردووین:

﴿وَعَسَى أنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وهُوَ خَيرٌ لَكُم﴾ (البقرة:٢١٦)..

مادەم برا تازەکانمان لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا لە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بەو دڵدانەوەیە هەیە کە پەیامەکانی نوور دەیبەخشن.

مادەم ئەو کەسانەی کە لە فەرمانگەکانی "داد"دا کار دەکەن زیاتر لە کارمەندەکانی تر پێویستیان بەو دەستووورە بەرزانە هەیە کە پەیامەکانی نوور لە خۆیان گرتوون..

مادەم بەشەکانی پەیامەکانی نوور لە دەرەوەی بەندیخانە و بە ڕادەیەکی یەکجار زۆر و لە بریی ئێوە ئەرکەکانی سەرشانیان ئەنجام دەدەن و فتووحاتیان ڕاناوەستێت..

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٥٥-٦٦٨.

مـادەم هـەموو سـەعاتێکی فـانیی ژیـانی نـاو ئـەم بەندیخانەیـە وەك چـەندین سـەعاتی پەرستشی باقی و هەمیشەیی وایە..

ئەوا بەپێی ئەم خاڵانە.. پێویستە خۆمان بە کاڵای ئارامی و دامەزراوی برازێنینەوە و، بە دڵخۆشی‌یەوە سوپاسی بەدیهێنەرمان بکەین بەرامبەر بەم ڕووداوە)[1].

☐ گرفتەکان دابەزینە سووکەڵەترین پلەیان

(برایانی ئازیز و بەوەفام!

*یەکەم:*

ئێوە – ئەی برایانی بەڕێزم!– هەرگیز بەو سووکایەتی و ئازاردانە خەم مەخۆن کە بـە تایبەتی ئاراستەی کەسی منی دەکەن. چونکە ناتوانن هیـچ ناتەواوی‌یـەك لـە پەیامـەکانی نـووردا بدۆزنـەوە، بۆیـە زیـاتر خۆیـان بـە کەسـی ئاسـایی و تەقسـیرباری منـەوە سـەرقاڵ دەکەن.

من بۆ خـۆم لەم بارە ڕازیم. تەنانـەت ئەگەر لە پێناوی سەلامەتیی پەیامەکانی نـوور و دەرکەوتنی نرخ و بەهایاندا هەزاران سـووکایەتی و ئـازار و بـەڵا و گـیروگرفتی کەسـیم تووش ببێـت، بەوپـەڕی شـانازی‌یەوە شـوکری خـوای گـەورەی لەسـەر دەکـەم. ئەمـەش بەپێی خواستی ئەو وانەیەی کە لە پەیامەکانی نوورەوە فێری بووم.

*دووهەم:*

ئەم دەستدرێژی‌یە بێ پەردە و فراوان و هێرشە سەختە ستەمکارانەیە، ئێستا لە ڕێـژەی "بیسـت"ەوە بـۆ ئاسـتی "یـەك" دابـەزیوە و سـووك و تـەنك بووەتـەوە. چونکـە لـە بریـی هەزاران کەسی قوتابیانی تایبەتمەندی پەیامەکانی نوور تەنها چەند کەسێکی کەمیان کـۆ کردووەتەوە و، لەبریی سەدان هەزار کەسی پەیوەندیدار و بایەخدەر بە پەیامەکانی نـوور چـەند برایـەکی نوێـیان جـەم کـردووە. واتـە بـە چاودێریی خـوای گـەورە موسـیبەتەکە دابەزیوەتە سووکەڵەترین حاڵەتەکانی)[2].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٨٣.

(٢) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٨٦.

□ كاركردن بۆ پەيامەكانی نوور چيمان پێ دەبەخشێت؟

(برايانی ئازيز و بەوەفام!

پەيامەكانی نوور لە بريی من ڕووبەڕووتانە و لە بەرامبەرتانەوەيە، ئەوەتا زۆر بە باشی ڕێنمايی و فێركردنی برا تازە و تاسەمەندەكانی وانەی نوور دەگرنە ئەستۆ.

ئـەزموون و تاقيكردنـەوەكان چەسپاندوويانە كـە سـەرقاڵ بـوون بـە پەيامـەكانی نوورەوە، ئيتر چ خوێندنـەوەيان بێـت چ ئـەوە بێـت بدرێـن بـە كەسی تـر بيانخوێنێتـەوە چ نووسينەوەيان بێـت، شـادمانی بـە دڵ و حەوانـەوە بـە گيـان و بەرەكـەت بـە ڕۆزی و تەندروستی بە جەستە، دەبەخشێت.

خوای گەورە ئێستا يەكێك لە قارەمانـانی نـووری وەك نيعمـەتێك پـێ بەخشـيون كـە "خەسرەو"ە و، پشت بەخوا قوتابخانەی يووسفيش شوێنێكی پيرۆزی لەمەڕ لێكۆڵينـەی سەر بە قوتابخانەی "زەهراء" دەبێت.

من تـا ئێستا "خەسرەو"م دەشـاردەوە و دەرم نەدەخست بۆ ئـەهلی دنيـا، بـەڵام ئـەو كۆمەڵە پەيامانەی كە بڵاو بوونەوە هێندە بە ئاشكرايی دەريـان خسـت كـە بـە جوانـی لـە بەرچاوی ئەهلی دنيادا ديارە و، هيچ شتێك بـۆ شـاردنەوە لـە ئـارادا نـەماوە. شتێكم لـە خزمەتەكانی ئەو بۆ هەندێ لە برايانی تايبەتمەند باس كرد.

خۆ ئەگـەر پێويسـت بكـات مـن و ئـەو "ڕاسـتی" ڕوون دەكەينـەوە و هيـچ شـتێك ناشارينەوە)[1].

□ گفتوگۆ لەگەڵ خزمەتكاری قورئاندا

(ئەی برايانی ئازيز و بەوەفام و ئەی هاوڕێيانی بەنديخانەم!

*يەكەم*: نيگەرانی ئەوە مەبن كە يەكتر نابينين، چونكە ئێمە لە ڕاستيدا و بـە جۆرێكـی مەعنـەوی هـەموو كـات ڕووبـەڕووی يـەكين و ڕوومـان لـە يـەكترە و، هـەر پـەيامێكتان دەست بكەوێت بيخوێننەوە يان گوێـی لـێ بگـرن ئـەوا نـەك بـە سيفەتی كەسی ئاسـايی خۆم، بەڵكو بە سيفەتی ئەوەی كە خزمەتگوزارێكی قورئانی مـەزن و پيرۆزم و، لـە ڕێـی ئەو پەيامـەوە، دەمبينن و گفتـوگۆم لەگـەڵدا دەكەن.

(١) تيشكەكان، تيشكی چواردەهەم، ل: ٦٩٠-٦٩١.

بزانن کە منیش لە ڕێی دوعا و پاڕانەوەکانمەوە و، بەهۆی نووسینەکان و پەیوەندییەکانتانەوە، هەردەم بە ئەندێشە دەتانبینم و ڕووم لێتانە. جا مادەم هەموومان پێکەوەین و لە یەك بازنەدا کار دەکەین، ئەوا وەك ئەوە وایە کە یەکتر ببینین.

دووەم: ئەو قوتابیانەی پەیامەکانی نوور کە تازەکی هاتوونەتە ناو ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە نوێیەوە، پێیان دەڵێین:

بە چەندین بەڵگەی بەهێز و چەندین ئاماژەی قورئانی پیرۆز کە خەبیرەکانی لە شوێنی خۆیاندا ڕاگرت و ناچاری تەسلیم بوونی کردن، ئەوە چەسپاوە کە:

قوتابی‌یە ڕاستەکانی پەیامەکانی نوور ژیانیان بە عاقیبەت خێری کۆتایی پێ دێت و بە ئیمانەوە دەڕۆنە ناو گۆڕەکانیان.. هەروەك بە هۆی ڕێژنەی نوورەکانی بەشداری کردن لە کاروبارە نوورییەکاندا هەر قوتابی‌یەك - هەر کەسەو بە پێی پلەی خۆی - هاوبەشی دەستکەوتە مەعنەوی‌یەکان و دوعاکانی هاوڕێیانی دەبێت، وەك ئەوەی کە بە هەزار زمان داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات و پەرستشەکانی ئەنجام بدات.

جا ئەم دوو سوود و دوو ئەنجامە گرنگەی کە لەم ڕۆژگار و سەردەمە سەیرەدا پەیامەکان بە قوتابیانی دەبەخشن، هەموو گیروگرفت و ئاستەنگێك لەسەر ڕێ لادەبەن.

بەم جۆرە، دەبینین کە پەیامەکانی نوور بە نرخێکی هەرزان ئەم دوو قازانجە گەورەیە دەستی قوتابیانی خۆیان دەخەن)[١].

□ قسەیەك مەکەن هەست زامدار بکات

(برایانی ئازیز و بەوەفام!

هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ پەنجەرەی ژوورەکەی منیان داخست و بزمار ڕێژیان کرد، ئەوەیە کە لە بەندکراوان دام ببڕن و ڕێ بگرن لەوەی کە لە نێوان خۆماندا سڵاو لە یەکتری بکەین. بەڵام ئەوان بیانوویەکی تری ڕواڵەتی‌یان پێش چاو خست.

ئێوە هەرگیز نیگەران مەبن. بەڵکو وازهێنانی ئەوان لە گوشار خستنە سەر پەیامەکانی نوور و قوتابیانی و، خۆ سەرقاڵ کردنیان بە کەسی منی بێ بایەخ و، سووکایەتی پێ کردنم و، ئازار دانی دڵ و جەستەم بە جۆرێکی ڕاستەقینە و، خۆنەدانیان

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٩٤-٦٩٥.

لە قەرەی پەیامەکانی نوور، من دەخاتە ڕازی بوونەوە لەم دۆخە. تەنانەت بە ئارامگرتنەوە شوکری خوای گەورە دەکەم و، بە هیچ جۆرێك نیگەران و پەشێو نابم. دەسا ئێوەش خەم مەخۆن.

قەناعەتم وایە کە سەرنج ڕاکێشانی کارمەندانی بەندیخانە لە لایەن دوژمنە پەنهانەکانمانەوە بۆ لای کەسی من، چاودێریی خوای گەورەی لە پشتە و خێری بۆ سەلامەتی و بەرژەوەندیی پەیامەکان و قوتابیانی نوور تێدایە.

کەواتە دەبێ هەندێ لە برایانمان تووڕەیی دەرنەبڕن و، گوفتاری وەهایان لە زار دەرنەچێت کە بەر هەستی ئەوان بکەوێت و، لە هەموو وەستان و جموجوولێکیاندا و بێ ئەوەی پەشێوی و نیگەرانی دەربڕن حەزەری خۆیان بکەن و، دەرگای باس لەسەر ئەم کێشەیە لە لای کەس نەکەنەوە، چونکە هەندێ جاسووس هەن کە قسەی برایانی ساویلکەی ئێمە، لەوانەی کە هێشتا فێری حەزەر نەبوون، دەستکاری دەکەن و واتای پێچەوانەی لێ دەدەنەوە و، شتانی بچووك بە گەورە پیشان دەدەن و، دەیگەیەنن بە کەسانی بەرپرس.

ئەم دۆخەی ئێستامان سەرتاپا جیددییە و هیچ گاڵتەیەکی تێدا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز مەشڵەژێن و، بزانن کە ئێمە لە ژێر سەرپەرشتیی چاودێریی خوای گەورەداین و، بڕیارمان داوە بە ئارامێکی ڕەنگین تەنانەت بە شوکرانە بژێریی یەکجار گەورەوە ڕووبەڕووی هەموو تەنگانە و گیروگرفتەکان ببینەوە. کەواتە ئێمە شوکری خوای گەورەمان خراوەتە ئەستۆ، چونکە کێشی درەمێك ماندوو بوون و سەختیی ئەم بارودۆخە بە ئەندازەی یەك باتمان پاداشت و میهرەبانیمان بۆ بەجێ دەهێڵێت)[1].

☐ کاروبارەکانی خۆم بە ئێوە دەسپێرم

(برایانی ئازیز و بەوەفام!

هەموو کاروبارێکی بەرگری کردنم بە قوتابیانی ئەرکانی نوور سپاردووە لەوانەی کە هاتوون یان دێن بۆ ئێرە. ئەمەش لەبەر دوو هۆ و لەسەر بناغەی ئاگادارکردنەوەیەکی

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٩٨-٦٩٩.

مەعنەوی کە لە دڵەوە ناچار بووم بۆ ئەمە. بە تایبەت ئەم کارە بە هەریـەك لـە "خەسرەو، رەئفەت، تاهیری، فەیزی، صەبری" دەسپێرم.

*هۆکاری یەکەم:* لـە فەرمانگـەی لێکۆڵینەوەکانەوە و لـە ڕێی چـەند نیشـانەیەکی زۆرەوە بە دڵنیـایی بـۆم دەرکـەوتووە کـە دەیانـەوێ بـە هـەموو هێزێکیانـەوە لـە دژی مـن کێشـە دروسـت بکـەن و، خۆیـان لـەوە ببوێـرن کـە مـن بـە هـزر و بـیر بـە سـەریاندا سەرکەوتووم. بۆ ئەمەش ئاگادارکردنـەوەی ڕەسمی‌یـان هەیـە. وەك بڵێـی هـەر ئـەوەندەی بکەومە قسە و گوفتار ئەوا توانستێکی زانستی و لێـهاتنێکی سیاسـیی ئـەوتۆ دەنوێنـم کـە دادگاکان بە بەڵگە بەستمەوە و سیاسی‌یەکانیش دەمکوت بکەم!

هـەر لەبـەر ئەوەشـە کـە بـە چـەند بیانوویـەکی لاواز و نابـەجێ ڕێـی قسـە کـردنم لـێ دەگرن. تەنانەت کاتێ لە دەمی لێکۆڵینەوەکەدا و لە وەڵامی پرسیارێکدا وتم: "نایەتـەوە یادم"، دادوەرەکە سەری سووڕما و وتی:

"چۆن کەسێکی وەك تۆ کە خاوەنی زیرەکی و زانسـتێکی سـەرووی ئاسـتی ئاسـایی بێت، شتی لەبیر دەچێتەوە"؟!

بـەڵێ، ئـەوان لـەو بـاوەڕەدان کـە پایەبـەرزیی پەیامـەکانی نـوور و لێکۆڵینـەوە وردە زانسـتی‌یەکانیان زادەی بـیر و هــزری منــن و، لــێرەوە سەرســامی و سەرســووڕمان دەیانگرێت و، ئیتر نایانەوێت قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکەم. وەك بڵێی هـەر کەسێك بمبینێت و قسەم لەگەڵدا بکات یەکسەر ببێت بە قوتابی‌یەکی بەغیرەتی پەیامەکانی نوور! بۆیـە ڕێـی چاوپێکـەوتن و قسـەکردنم لەگـەڵ هــەموو کەسـێك لــێ دەگـرن. تەنانـەت سەرۆکی کاروباری ئایینی وتبووی:

"هەر کەسێك ببینێت یەکسەر بەلایدا کێش دەبێت، بە ڕاستی هێزێکی زۆری کێـش کردنی هەیە"!

بەو واتایەی بەرژەوەندیمان داخوازی ئەوەیە کە ئێستا کاروبارەکان بـە ئێـوە بسـپێرم. بەرگری‌یە کۆن و نوێکانم، کە لای خۆتان هەیە، لە بریـی مـن هاوبەشـی ڕاوێـژ و پـرس و ڕای نێوانتان دەکات و، سەروزیادی ئەم کارەیە)[1].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٩٩-٧٠٠.

☐ دووچەندانە بوونی پاداشت

(برا ئازيز و ڕاستەكانم!

ئەمڕۆ بەهۆی بێداركردنەوەيەكی مەعنەوی كە ڕووی لە دڵم كرد، خەم و نيگەرانی بۆ ئێوە دايگرتم. چونكە خەمم بۆ حاڵی ئەو برايانەم خوارد كە لە ئەنجامی نيگەرانیيان بۆ ژيان و گوزەران حەزيان لەوەيە هەر ئێستا لە بەنديخانە بڕۆنە دەرەوە. هەر لەو خولەكەدا كە بيرم لەمە كردەوە، ئەنديشەيەكی بەپيت هاودەم لەگەڵ ڕاستی و مژدەيەكدا هاتە دڵمەوە، كە ئەمەی خوارەوەيە:

دوای پێنج ڕۆژی تر ئەو سێ مانگە پيرۆزە دێنە پێشەوە كە گەلێ خێر و پاداشتی گەورە لەگەڵ خۆياندا دەهێنن و، پاداشتی خواپەرستیيەكان لەو مانگانەدا وەك ئەوە وايە كە چەند قات زياد بكات، ئەوەتا ئەگەر پاداشتی كردەوە چاكەكان لە كاتەكانی تردا يەك بۆ دە بێت، لە مانگی ڕەجەبدا يەك بۆ سەد زياترە و، لە مانگی شەعباندا لە يەك بۆ سێ سەد تێپەڕ دەبێت و، لە مانگی پيرۆزی ڕەمەزانيشدا بەرەو يەك بۆ هەزار بەرز دەبێتەوە. خۆ لە شەوانی هەينيی ئەم مانگەدا يەك بۆ هەزاران و شەوی قەدريش يەك بۆ سی هەزار دەبێت.

بەڵێ، ئەم سێ مانگە بازاڕێكی بەپيت و بەرزی بازرگانيی دوارۆژە، بە ڕادەيەك كە ئەم هەموو سوود و قازانجە زۆرە قيامەتیيانە دەستی مرۆڤ دەخەن و، پيشانگايەكی مەزن و ناياب‌ی ئەهلی حەقيقەت و خواپەرستیيە و، لە ماوەی سێ مانگدا تەمەنێكی هەشتا ساڵی بۆ ئيمانداران لەخۆ دەگرن.

كەواتە بەسەربردنی ئەم سێ مانگە لە قوتابخانەی يووسفيدا، كە لە خۆيدا يەك بۆ دە قازانج دەستی مرۆڤ دەخات، بێ گومان قازانجێكی گەورە و دەستكەوتێكی مەزنە. گيروگرفتەكانيش هەرچەندە بن، هەر بۆ ئێمە سەرتاپا ميهرەبانیيە.

جا هەروەك ئەمە لە ڕووی خواپەرستیيەوە ئاوايە، لە ڕووی خزمەتكردنی نوور و كاركردنيش بۆ بڵاوكردنەوەی پەيامەكانی نوور وەهايە. چونكە پاداشتی خزمەتەكان، گەر لە ڕووی چەندايەتيشەوە نەبێت، لە ڕووی چۆنێتیيەتیيەوە يەك بۆ پێنج بەرز دەبنەوە، چونكە ئەوانەی دێنە ناو ئەم ميوانخانە(بەنديخانە)يە و دەڕۆنە دەرەوە دەبن بەهۆی

بڵاوبوونەوەی وانەکانی نوور و، لەوانەیە ئیخلاسی یەك دانە کەس لەوان هێندەی بیست کەس سوودی لەم ڕووەوە بیێت، چونکە ئەگەر هەر گیروگرفت و گوشارێك لەم بەندکردنەدا هەبێت ئەوا هیچ گرنگی‌یەکی نی‌یە لـە بەرامبەر بڵاوبوونەوەی نهێنیی ئیخلاس - کە لە پەیامەکانی نووردایە - لـە نێوان ڕیزی بەندکراواندا، کە لـە هەموو کەسێك زیاتر پێویستیان بەو دڵنەوایی و دڵدانەوەیە هەیـە کە پەیامەکانی نوور پەخشی دەکەن، بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە پاڵەوانێتیی سیاسی لە دەمارەکانیاندا هاتوچۆ دەکات.

سەبارەت بـە خەم و خەفەتی گوزەرانیش، ئەوا ئاشکرایە کە ئەم مانگانە بازاڕی دواڕۆژن و، هەندێکتان لەبریی چەند قوتابی‌یەکی زۆر هاتووەتە ناو ئەم بەندیخانەیەوە، تەنانەت هەندێك لە بریـی هەزار کەس هاتووە، ئەوا بێ گومان یارمەتی و پشتگیرتان دەبێت بۆ کاروبارەکانی دەرەوەی بەندیخانەتان.

ئەو بیرەم بەم جۆرە هاتە دڵەوە و، زۆریش پێی دڵخۆش بووم و، زانیم کە مانەوەمان لێرە هەتا جەژن نیعمەتێکی مەزنی خوای گەورەیە)[1].

❑ سەبارەت بە بیرۆکەی "مەهدییەت"

(گەلێ نیشانەی زۆر هەن کە بەهۆیانەوە دەزانم دوژمنە پەنهانەکانمان هەوڵی دەستدرێژی بۆ سەر پەیامەکانی نوور و کەمکردنەوەی شان و شکۆ و گرنگی‌یان دەدەن. ئەوەتا - لە ڕووی سیاسی‌یەوە - وەهم و گومانی بوونی بیرۆکەی "مەهدییەت" بڵاو دەکەنەوە و، ئیدیعای ئەوە دەکەن کە گوایا "پەیامەکانی نوور" هۆکاری ئەم بیرەن و، بە وردی دەگەڕێن تاکو بەڵگە و پاڵپشتێك بۆ ئەو وەهمە ناڕەوایە بدۆزنەوە. لەوانەیە ئەو ئازارانەی کە دەهێنرێنە ڕێم لەو وەهم و گومانەوە سەرچاوەیان گرتبێت.

منیش بەو ستەمکارانەی کە لە پشتی پەردەوە خۆیان شاردووەتەوە و، بەو کەسانەش کە گوێیان لێ دەگرن و دوژمنایەتیمان دەکەن، دەڵێم:

نەخێر.. نەخێر.. من هەرگیز لافی شتی وام لێ نەداوە و، سنووری خۆمم نەشکاندووە و، ڕاستی‌یەکانی ئیمانم نەکردووە بەهۆکارێك بۆ مەبەستەکانی کەسی خۆم

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٠٢-٧٠٣.

یان ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگ و پایەبەرزی. ئەم سی ساڵەی دوایی تەمەنم - بە تایبەتی - کە گەیشتووەتە حەفتا و پێنج ساڵ و.. پەیامەکانی نووریش لە گەڵیاندا، کە دەگەنە سەد و سی پەیام و.. هەزاران کەس لەوانەی کە بە ڕاستی هاوڕێیەتیان کردووم، شایەتن لەسەر ئەمە.

بەڵێ، قوتابیانی نوور ئەمە دەزانن و.. ئەو بەڵگانەش کە لە دادگادا هێنامانەوە دەریانخست کە من هەرگیز لە پێناوی پلە و پایەی کەسیی خۆم و تەنانەت بەدەستهێنانی ناوبانگ و پلەی مەعنەوی و قیامەتیشدا هەوڵ نادەم. بەڵکو بە هەموو توانایەکم بۆ بەدەستهێنانی خزمەتێکی ئیمانی بۆ ئیمانداران تێکۆشاوم.

لەوانەیە نەك بۆ بەختکردنی پلە و پایە فانییەکانی دنیا، بەڵکو گەر پێویست بکات ئامادە بم پلە و پایە قیامەتی و هەمیشەییەکانی ژیانی ئەودنیاشم لەو پێناوەدا بەخت بکەم، لە کاتێکدا کە هەموو کەسێك هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم پلانە دەدات. هاوڕێ نزیکەکانم دەزانن کە ئەگەر پێویست بکات ڕازیم واز لە بەهەشت بهێنم و بڕۆمە ناو دۆزەخەوە تەنها بۆ ئەوەی ببم بە هۆی ڕزگار کردنی چەند هەزارێکی ئەهلی ئیمان[1]. ئەمەم لە دادگاکاندا باس کردووە و لە چەند ڕوویەکەوە بەڵگەشم لەسەر هێناوەتەوە..

بەڵام ئەوان بەم تۆمەتە دەیانەوێ "بێ ئیخلاسی" بدەنە پاڵ خزمەتە ئیمانی و نوورییەکانم و، مەبەستیشیان کەمکردنەوەی نرخ و بەهای "پەیامەکانی نوور"ە لە بەرچاوی خەڵکیدا و بێ بەش کردنی نەتەوەیە لە ڕاستییەکانی ئەو پەیامانە.

ئایا ئەو بەدبەختانە پێیان وایە ژیانی دنیا هەمیشەییە؟ یان لەو وەهم و گومانەدان کە خەڵکانی تریش وەك ئەوان ئیمان و ئایین بۆ بەرژەوەندییەکانی دنیا دەفرۆشنەوە؟

ئەو وەهمەیان هانیان دەدات هێرش بۆسەر کەسێك ببەن کە تەحەددای هەموو گومڕایانی دنیای کردووە و.. لە پێناوی خزمەتی ئیماندا ژیانی دنیای خۆی بەخشیوە و،

---

(١) برای بەڕێز "محەممەد فرنجی" بۆی گێڕاموە کە:
زۆر جار سەردانی مامۆستام دەکرد. چەند جارێك دەیوت: "ڕازیم بڕۆمە دۆزەخ لە پێناوی ڕزگارکردنی ئیمانی کەسێکدا". لە دوا سەردانمدا بۆ لای ئەمەی دووبارە کردەوە. منیش شتێکم لە دڵدا دروست بوو کە ئایا چۆن دەبێ ئەو مرۆڤەی هۆی هیدایەتدانی گەلێ کەس بووە، بڕواتە دۆزەخەوە؟ کتوپڕ لە جێگاکەی ڕاست بووەوە و ئاماژەی بۆ کردم و، وتی: "هەمیشەیی نییە، هەمیشەیی نییە. بەڵکو وەکو ئەوە وایە کەسێك لەسەر گوناهێکی دەڕواتە دۆزەخەوە، بەڵام دوایی دەچێتە بەهەشت".

ئامادەیە لەو پێناوەدا - گەر پێویست بکات - ژیانی ئەودنیاشی بەخت بکات و.. هەرگیز یەك ڕاستیی ئیمان بە هەموو موڵکی دنیا ناگۆڕێتەوە. وەك لە دادگاکاندا بە ڕاشکاوی ئەمەی ڕوون کردەوە..

هەروەها ئەو وەهم و گومانەیان هانیان دەدات هێرش بەرنە سەر کەسێك کە بەهۆی نهێنیی ئیخلاسەوە و بەوپەڕی هێز و توانای خۆی لە دەست سیاسەت و پلە و پایە دنیاییەکانی و هەر شتێك چ لە دوور و چ لە نزیکەوە بۆنی سیاسەتی لێ بێت هەڵهاتووە و.. ماوەی بیست ساڵ ئازارێکی بێ وێنەی چەشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێی ڕێبازی ئیمانیی خۆی، دانەبەزیوەتە ئاستی کاری سیاسی..

پاشان ئەو کەسە - لە ڕووی نەفسەوە - خۆی زۆر لە خوار قوتابیەکانیەوە دەبینێت، بۆیە هەمیشە چاوەڕوانی دوعای لێخۆشبوون و نزای خێریان لێ دەکات.

جا هەرچەندە خۆی بە لاواز و بێ بایەخ دادەنێت، بەڵام هەندێ لە برا دڵسۆزەکانی لە نامە تایبەتی‌یەکانیاندا هەندێ چاکەکاریی پەیامەکانی نووریان داوەتە پاڵ ئەو، لەو ڕووەوە کە ڕوونکەرەوەی ئەو ڕێژنە ئیمانی‌یە بەهێزانەیە کە لە پەیامەکانی نوورەوە بەدەستیان هێناوە و، لەمەشدا هیچ واتایەکی سیاسی‌یان بە دڵدا نەهاتووە، بەڵکو هەر تەنها وەك دابێکی ئاسایی قسە و گوفتار..

ئەوەتا هەندێ جار مرۆڤ لەگەڵ کەسێکی ئاساییدا دەدوێت و، پێی دەڵێت: "تۆ هۆی ئەو نیعمەتەیت کە خوا پێی بەخشیوم.. تۆ گەورەی منیت".

واتە لە ڕووی گومان باشی‌یەوە پلەیەکی دەدەنێ کە ئەو شایانی نی‌یە و، هەزار جار لە پلە و بەهای خۆی زیاترە. خۆ هەروەك هەموان دەزانن هەر لە دێر زەمانەوە داب و عادەتێك لە نێوان مامۆستا و قوتابیانیدا هەیە و کەس ڕەخنەی لێ نەگرتووە، کە زیادەڕەویی قوتابیانە لە مەدح و سەنای مامۆستاکەیاندا، وەك سوپاس و پێزانینێك و، پیاهەڵدان و مەدحی زیاد لە پێویستە لە کۆتایی کتێبە باشەکاندا..

جا ئایا ئەمە لە هیچ ڕوویەکەوە بە تاوان دادەنرێت؟

ڕاستە، زیادەڕەوی - لە ڕوویەکیەوە - پێچەوانە و دژی ڕاستی‌یە. بەڵام یەکێکی وەك من کە بێ کەس و تەنیایە و، بە دەست غەریبی‌یەوە دەناڵێنێت و، گەلێ دوژمنی هەیە و، هۆکاری زۆریش هەن بۆ ئەوەی یاریدەدەرانی لێی دوور بکەونەوە..

ئایا ئەو بێ ویژدانانـە بـە لایانـەوە زۆرە کـە ورەی ئـەو یارمەتیـدەرە کـەمـانە لـە دژی نـەیارە زۆرەکـان بـەرز بکـەمـەوە و، نـەهێڵم دوور بکەونـەوە و، لـە پەرۆشـی و خوێـن گەرمی‌یان دانەشکێنم کە لە زیادەڕەویی مەدح و سەنایاندا دەردەکەوێت و، ئەو مەدح و سەنایە ئاراستەی پەیامەکان بکەم و بە تەواوی دەست بە ڕوویانەوە نەنێم؟

بەم جۆرە، ڕادەی دوورکەوتنـەوەی هـەندێ کارمـەندی ڕەسمی لـە حـەق و یاسـا و ویژدانەوە دەردەکـەوێت، کاتـێ کـە هـەوڵی ئـەوە دەدەن دەستدرێژی بکەنـە سـەر ئـەو خزمەتـە ئیمانی‌یـەی کەسـێك ئـەنجامی دەدات کـە بـە سـاڵا چـووە و لەسـەر لێـواری گۆڕەکەیدایە. وەك ئەوەی پێیان وابێت ئەم خزمەتە بۆ ئامانجێکی دنیایی بەکارهێنرابێت.

دوا وتەمان بەرامبەر هەموو موسیبەتێك:

﴿إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾!)[1].

☐ خوێندنەوەی پەیامەکان بێزاری نابەخشێ

(کاتێ کە لەم ڕۆژانەدا پەژارە دایگرتبـووم، لەبەر ئـەوەی زەینـم دووچاری هـەندێ سەرقاڵیی بەرگری کردن بوو لە بەردەم دادگاکاندا، ئەمەی خـوارەوەم - لـەم کاتـەدا - بە دڵدا هات:

"ئەو سەرقاڵ بوونەش هەر خەریك بوونە بە زانستەوە، چونکـە خزمەتێکە لـە پێنـاوی بڵاوبوونـەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمـان و، هێنانـەدیی سەربەستی‌یان و، ئاشـکرا کردنیـان. کەواتە لەم ڕووەوە ئەو بەرگری‌یانەش بە جۆرێکی پەرستش دادەنرێن".

خۆیشم هەر کاتێ دڵتەنگی لـە خۆمـدا شـك ببـەم، بەوپـەڕی لـەزەت لـێ چەشتنەوە دەست دەدەمە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور، هەرچەندە سەد جاریش خوێندوومنەتەوە، بە ڕادەیەك کە بۆم دەرکەوت "بەرگری‌یەکانیش" وەك پەیامە زانستی‌یەکانی نوور وان.

یەکێك لە برایانم پێی وتم:

"هەمیشـە هەسـت بـە شـەوق و پێویستی دەکـەم بـۆ خوێندنـەوەی چـەندین جـارەی "پەیامی حەشر" هەرچەندەش سی جار خوێندوومەتەوە"!

لەم وتەیەی ئەم برایەوە بۆم دەرکەوت کە:

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٦٠٢-٦٠٦.

پەیامـەکانی نـوور تەفسـیری بـەنرخ و ڕەسـەن و، ئاوێنـەی تیشـك دەرەوەی ڕاستییەکانی قورئانن و، لەو ڕووەوە تایبەتکارییەکی بەرزی قورئانی پیرۆزیان تێدایە، ئەویش بێزارنەبوونە لە خوێندنەوەیان)[1].

□ دڵدانەوەی یەکتر

(برا ڕاست و ئازیزەکانم!

کاریگەرترین چارەسەر لەم دنیایەدا، بە تایبەت لـەم سـەردەمەدا و، بە تایبەتیش بۆ ئەوانـەی تووشـی گـیرو گرفت هـاتوون و، بـۆ قوتابیـانی نووریـش کـە دووچـاری بێزارییەکی سەخت و نائومێدییەکی ڕەش و تاریك بوون، ئەوەیە کە:

دڵنەوایی یەکتر بکەن و، هەریەکەیان خۆشی بخاتە دڵـی ئـەوی تـر و، یارمـەتیی ورە و هێزی مەعنـەویی یـەکتر بـدەن و، زامـی تەنگانـە و خـەم و پەژارە و بێزاریی یـەکتر تیمـار بکەن و، بە چەشنی برای فیداکاری ڕاستەقینە دڵی پڕ لە خەم و خەفـەتی یـەکتر بدەنـەوە. چونکە ئەو برایەتییە ڕاستەقینە و قیامەتییانەی نێوانتان بەوە ڕازی نـابێت کـە ڕقتـان لـە یەکتر بێت و هەرکەسە لایەنی خۆی بگرێت.

من بە تەواوی پشتم بە ئێوە بەستووە و، ئاگاداری ئەو عەزمەی منیشن کە بڕیارم داوە نەك هەر تەنها حەوانەوە و ڕێـز و شـەرەفی خـۆم، بـەڵکو ئامـادەم بەوپـەڕی دڵشـادییەوە گیانیشم لـە پێنـاوی ئێـوەدا بـەخت بکـەم، تەنانـەت ئەمەشـم بـە کـردەوە لـێ دەبینـن. بـە چەشـنێ کـە سـوێندتان بـۆ دەخـۆم وا هەشـت ڕۆژە لـە دڵـەوە ئـازار دەچێـژم چونکـە ڕووداوێکی بێ بایەخ بوو بەهۆی ئەوەی دوان لە "ئەرکانی نوور" نازی ڕواڵـەتی بەسـەر یەکتردا بکەن و، لە بریی دڵنەوایی یەکتری یەکێکیان خەفەتی بە دڵی ئەوی تردا کرد. لە ئەنجامی ئەمەشەوە "گیان" و "دڵ" و "ژیری"م پێکەوە دەستیان بە گریان کرد و هاواریـان لـێ هەڵسا و، وتیان:

"ئەی هاوار! ئەی هاوار! ئەی خوای لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتر! بمانپارێزە و لە شـەیتانەکانی جیننـی و ئینـس پـەنامان بـدە و، دڵـی برایـانم بـە وەفـای تـەواوەتی و خۆشەویستیی بێگەرد و برایەتیی ڕاستەقینە و شەفەقەتی تەواو، پڕ بکە".

دەسا ئەی ئەو برایانەم کە لە توندوتۆڵی و دامەزراویدا وەکو ئاسن وان!

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی قەستەمۆنی، ل: ٣١٨-٣١٩.

لە ئەركی سەرشانمدا یارمەتیم بدەن. چونكـە كێشـەكەمان گەلـێ هەستیار و وردە. من هەموو ئەركێكی خۆمم بە دەستی كەسێتیی مەعنەویی ئێوە سپاردووە، چونكە گەلـێ متمانـەم پێتانـە و لێتـان دڵنیـام. كەواتـە ئێـوەش هـەتا دەتوانـن یارمـەتیم بـدەن. چونكـە هەرچەند ڕووداوەكە بچووك و بێ بایەخە، بەڵام دەبـێ بزانـن كـە یـەك دانـە "مـوو" گـەر بكەوێتـە چاومـان ئازارمـان دەدات و، گـەر بیشـكەوێتە نـاو كاتژمێرەكانمـان ئـەوا دەیانوەستێنێت)[1]!

❑ وریابن! لەرزە بە خۆشەویستیی نێواتان مەخەن

(برا بەوەفا و دڵسۆزەكانم!

تـا ڕادەی واجـب بـوون و بـە گوێـرەی توانـا و بەوپـەڕی هێزمانـەوە، پێویسـتە دەستوورەكانی بریسكەی "ئیخـلاس" و نـهێنیی ئیخلاسی ڕاستەقینە لـە نێـوان خۆمانـدا بەرامبەر یەكتری بەكاربهێنین. چونكە هەواڵێكی یەقینیم پێ گەیشـتووە كـە مـاوەی سـێ مانگە سێ دانە كەسیان داناوە بۆ ئەوەی ساردوسڕی بخەنە نـاو برایانمانـەوە لـێرە. بۆ ئـەم مەبەستەش دەرفەت وەردەگرن لەوەی كە بـەهێزان سـارد بكەنـەوە و، وەهـم و گومـان و ترسیش بخەنە دڵی ئەوانەی كە نەرمونیان و كەم سەبر و ئارامن، تا لە ئەنجامدا وایـان لـێ بكەن واز لە خزمەتگوزاریی نوور بهێنن!

كەواتە وریابن!! وریابن!!

نەكـەن ئـەو خۆشەویستییە قـووڵ و ڕاستەی نێـوان دڵانتـان لـەرزەی پـێ بكـەوێت. چونكـە تەنـها لەرەیـەكی كـەمی بە ئـەندازەی گەردیلەیـەك لـە برایـەتی و خۆشەویسـتیی نێوانماندا، زیانێكی یەكجار مەزنی هەیە. ئێمە – گەر پێویست بكات – بەوپەڕی ئاسانی گیانی خۆمان لە پێنـاوی برایـەتیی نێوانمـاندا بـەخت دەكـەین. خزمـەتی ئیمـان و قورئـان داخوازی ئەمەیە.

كەواتە با لە ئەنجامی بێزاری و دەمارگرژیی ئەم تەنگانە سەختەوە، یان هـەر هۆیـەكی تـر، هیـچ كامتـان لـەوی تـر زویـر نـەبێت، بـەڵكو هەریـەك لـە ئێـوە هـەوڵ بـدات خۆشەویستییەكەی و دڵسۆزی و ئیخلاسی بەرامبەر براكەی زیاد بكات. دەنا زیـانێكی

(١) تیشكەكان، تیشكی چواردەهەم، ل: ٧٠٨-٧٠٩.

گەلێ مەزن دەکەین، چونکە ئەو کاتە دەنکە گەنمێکی بچووك بە ئەندازەی گومەزێکی مەزنی لێ دێ و چار ناکرێت.

لێرەدا بە کورتی لەم باسە دواین. درێژە پێدانەکەی بە فیراسەتی خۆتان دەسپێرم)[1].

☐ باشترین شوێن بۆ کۆبوونەوەمان

(ئەی برایانی ئازیز و دۆست و دامەزراوم لە خزمەتی قورئاندا!

ئەی ئەوانەی کە لە کاتی تەنگانەدا لێمان هەڵنایەن!

لە ئەنجامی تەنگانەیەکی ماددی و مەعنەویدا و، بەهۆی بیرکردنەوەم لە ئێوە، گەلێ خەمم خوارد. بەڵام کتوپڕ ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە:

ئەگەر دە هێندەی ئەم دەردیسەری و گیروگرفتانەشتان بە جۆرێکی تر بهاتایەتە ڕێ و خۆتان لە بەردەمیدا ڕابگرتایە، هێشتا هەر بە کەم دادەنرا لە بەرامبەر چاو پێکەوتن و بینینی برایەکمان لە نزیکەوە.

بەڵێ، وەك ئەوەی کە ئەهلی حەقیقەت ساڵی یەك دوو جار کۆ دەبوونەوە، زۆر پێویستە هەموو چەند ساڵ جارێك قوتابیانی نووریش بە یەکەوە کۆببنەوە و، درێژە بە گفتوگۆکانیان بدەن، بە پێی مەشرەبی پەیامەکانی نوور کە ئاوێتەی تەقوا و وەرزشی ڕۆحی‌یە و، لەسەر ڕێبازی تایبەتیی پەیامەکان کە بریتی‌یە لە وتنەوەی وانەکانی بە هەموو کەسێك، بە تایبەت بەوانەی موحتاجی ئەو وانە و ڕێنماییانەن، تەنانەت بە نەیارەکانیشی و، بۆ ئەوەش کەسێتیی مەعنەویی ئەو پەیامانە لەو بازنەیەدا بخرێتە گوفتار.

خۆ ئەم قوتابخانە یووسفی‌یە باشترین و گونجاوترین جێ‌یە بۆ هێنانەدیی ئەم ئامانجانە، بە ڕادەیەك کە هەموو گیروگرفتێکی لە ڕێدا - با هەزار دانەش بێت - ئاسایی و ئاسان دەبێتەوە.

دوورەپەرێزیی برا لاوازەکانمان و، خۆ کشانەوەیان لە مەیدانی کار کردن بۆ پەیامەکانی نوور لەتاو بێزاری‌یان لە بەندیخانەکانی پێشوودا، زیانێکی گەورە بوو لێیان کەوت. لە کاتێکدا کە هیچ زیانێك بە پەیامەکان و قوتابیانی نوور نەگەیشت، بەڵکو لە بریی ئەوان، کەسانی زۆر لەوان دامەزراوتر و دڵسۆزتر هاتنە بازنەی قوتابیانی نوورەوە.

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧١٢-٧١٣.

لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەکانی دنیا چەند ڕێبوارێکن کە بە خێرایی دێن و دەڕۆن و، ئنجا پاداشت و بەروبوومەکانیان دەدەنە دەستمان، ئەوا دەبێ لە چاودێریی خوای گەورە دڵنیا بین و، لەناوەندی خۆڕاگری و ئارامدا شوکر و سوپاس پێشکەشی پەروەردگارمان بکەین)[1].

☐ هەموو شتێکم لە پێناوی نووردا بەخت دەکەم

(برایانی ئازیز و هاوڕێم!

پڕ بە دڵ و گیانی خۆمان پیرۆزبایی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزتان لێ دەکەین و لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە شەوی "قەدر"تان لە هەزار مانگ زیاتر بۆ بکات بە خێر و چاکە.. ئامین..

هەروەها لێتان قبووڵ بکات و بۆتان بخاتە بریی هەشتا ساڵی تەمەن کە بە خواپەرستی بەسەرچووبێت.. ئامین.

من بەوپەڕی سوپاس و شادمانییەوە و، بە هەموو گیان و جەستە و تەنانەت بە دەروونی بەدخوازیشمەوە و، لە پێناوی پاراستنی سەلامەتیی پەیامەکانی نوور و سەلامەتیی ئێوەدا، بەو هەموو گیروگرفتانە ڕازیم کە دەهێنرێنە ڕێم. چونکە هەروەك بەهەشت هەرزان نییە، دۆزەخیش زیاد لە پێویست نییە.

مادەم دنیا و گرفتەکانیشی ڕێبوارێکن بە خێرایی دەڕۆن و نامێنن، ئەوا ئەو ستەمانەی کە دوژمنە پەنهانەکانمان دەیهێننە ڕێمان، ئێمە حەقی خۆمانیان لە دادگای هەرە گەورەی ئەودنیا و بەشێکیشی لەم دنیادا بە چەندین قات، بەڵکو بە سەد هێندەی ئەوە، لێ دەکەینەوە.

کەواتە ئێمە لە بریی ئەوەی ڕق و قینیان لێ هەڵبگرین، خەمیان بۆ دەخۆین.

جا مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا دەبێ پشت بە خوای گەورە ببەستین و، بێ ئەوەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ کارمان تێ بکات ملکەچی کارەکانی قەدەر و چاودێریی خوای گەورە بین کە دەمانپارێزێت..

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧١٦-٧١٧.

هاودەم لەگەڵ حەزەر کردن و ئارامگرتن و سوپاسگوزاریی خوای گەورەدا و، توندوتۆڵ کردنی پەیوەندیی خۆشەویستی و هاودەمیی پیرۆز لەگەڵ برایانمان لەم ڕۆژە بەپیت و بەرەکەتانەی ئەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا.

هەروەها بەسەربردنی ئەو کاتانە لە کەش و هەوایەکی برایەتیی بێگەرد و، دڵدانەوەی جوانی یەکتری و، پەیوەندیی تۆکمە و توندوتۆڵ و، خۆ خەریك کردن بە خوێندنی ویردەکانەوە لەم مانگەدا کە پاداشتەکان یەك بۆ هەزار بەرز دەبنەوە و، هەوڵی گوێ نەدان بەم گوشارە جوزئی و کاتی‌یانە و، خۆ سەرقاڵ کردن بە وانە زانستی‌یەکانمانەوە. خۆ ئەمەش بەختێکی گەورەیە خوا بەوکەسانەی دەبەخشێت کە خۆی ویستی لەسەری بێت.

ئنجا دەبێ ئەوەش بزانین کە وانە تەواو کاریگەرەکانی نوور لەم تاقیکردنەوە سەختەدا و، ناچارکردنی تەنانەت نەیارەکانیشیان بۆ خوێندنەوەیان، لە ڕاستیدا چەند فتووحاتێکی نوورن کە بایەخ و گرنگیی خۆیان هەیە.

*پەراوێزێك:* ئینکاری کردنی هەندێ لە برایانمان کە یەکێك بێت لە قوتابیانی نوور، بێ ئەوەی هیچ پێویستی‌یەك بەوە هەبێت، بە تایبەت (...) و، شاردنەوەی خزمەتە نووری‌یە مەزنەکانی پێشووی، بێ پێویست بوون بە شتی وا.. هەرچەند کارێکی خراپە، بەڵام خزمەتەکانی پێشوویان وامان لێ دەکات کە چاویان لێ بپۆشین و لێیان بێزار نەبین)[1].

☐ تەفسیر دوو جۆرە

(برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

یەکەم:

ئەگەر سەفەرکردن بە ئازادی ڕێی پێ بدرایە، لەوانەیە هەندێ کەس لە ئێمە ئەمساڵ بڕۆشتایە بۆ ئەنجامدانی فەرزی حەج[2]. لە خوای گەورە داواکارین کە ئەو نیەتەمان لێ قبووڵ بفەرموێت وەك ئەوەی کە هەر لە ڕاستیدا ڕۆشتبین بۆ حەج و، پاداشتێکی مەزنی

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٢٣-٧٢٥.

(٢) ساڵی (١٩٤٧ز) بۆ یەکەم جار لە تورکیا ڕێ درا بە سەرفەرکردن بۆ حەج.

وەك پاداشتی حەجیش بە خزمەتە ئیمانی‌یـە نووری‌یەکـەمان ببەخشێت، لـەم کاتـەدا کـە ئێمە بەم بارودۆخە سەخت و پڕ لە دەردیسەری‌یەوە دەتلێینەوە.

دووهەم:

"پەیامەکانی نوور" تەفسیرێکی بەنرخ و ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن. ئـەم وتەیـەشمان چەندین جار دووپات کردووەتەوە. وا ئێستا ئـەوەم بـە دڵـدا هـات کـە ڕاستی‌یەك ڕوون بکەمەوە، چونکە واتا ڕاستەقینەکەی ئەو قسەیە ڕوون نی‌یە.

تەفسیر دوو جۆرە:

**یەکەم:** تەفسیرە ئاساییەکان. کە واتای دەستەواژە و ڕستە و وشەکانی قورئانی پیرۆز لێك دەدەنەوە و دەیانچەسپێنن.

*بەشی دووهەمی تەفسیر:* ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆزە بە پاڵپشتی بەڵگەی ڕوون و توندوتۆڵ. جـا ئـەم بەشـەی تەفسـیر گرنگی‌یـەکی یـەکجار گەورەی هەیە.

بـەڵام جۆرە تەفسـیرە زانراوەکـەی تـر هـەندێ جـار بـە پوختـی ئـەم جـۆرە تەفسـیرەی دووهەم لەخۆ دەگرێت. کەچی "پەیامەکانی نـوور" ڕاستەوخۆ ئـەم بەشـەی کـردووە بـە بناغەی خۆی. کەواتە ئـەم پەیامانـە تەفسـیرێکی مەعنـەویی ئـەوتۆی قورئـانی پـیرۆزن کـە سەرسەخت ترین فەیلەسووف دەمکوت و بێ دەنگ دەکەن)[1].

☐ پەیوەستی نێوانتان بێ وێنەیە

(برایانی هاوڕێ و ئازیزم!

لـە سـەرچاوەیەکی یـەکجار گرنگـەوە ئـەم پرسـیارەی خوارەوەیـان لـێ کـردم، کـە ناوەرۆکێکی گرنگی لەخۆ گرتووە..

*لێیان پرسیم:*

سـەرباری ئـەوەی کـە ئێـوە "کۆمەڵـە" نـین، بـە شـایەتیی سـێ دادگـا کـە لـەم ڕووەوە بڕیاری بـێ تـاوانیی ئێـوەی دەرکـردووە. ئنجـا دوای ئـەوەی کـە شـەش پارێزگـا ئـەرکی چاودێری و سیخوڕی‌یان بە سەرتانەوە بۆ ماوەی بیست ساڵ پێ سپێررابوو، لە ئاکامدا

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٢٩-٧٣٠.

بۆیان دەرکەوت کە ئێوە هیچ پەیوەندییەکتان بەو تۆمەتەوە نییە و هەر لە بناغەدا هەڵبەستراوە..

وێڕای هەموو ئەمانە، کەچی ئەو پەیوەندییەی کە قوتابیانی نوور بە یەکەوە دەبەستێت هێندە توندوتۆڵە کە لە هیچ دەستە و کۆمەڵەیەکدا هاوشێوەی نییە..

خۆزگا تیشکی ڕوونکردنەوەتان دەخستە سەر ئەم بابەتە و ئەم کێشەیەتان شی دەکردەوە؟

*منیش وەڵامم دانەوە و وتم:*

بەڵێ، قوتابیانی نوور نە "کۆمەڵە"ن و نە هیچ شتێکی تر لەو شێوەیەدا و، هەرگیز ناشبن. بە تایبەت کە ئەوان لەوە بەرزتر بیر دەکەنەوە پەیوەندی بەو جۆرە کۆمەڵانەوە بکەن کە لەبەر ئامانجە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان پێکدێن و مەبەستیشیان بەدەستهێنانی چەند بەرژەوەندییەکی سیاسی یاخود دنیاییە، ئیتر چ ئیجابی بێت و چ سەلبی..

بەڵام ڕۆڵە و نەوەکانی پاڵەوانانی پێشووی ئەم نیشتمانە، کە ئەو گیانفیدایانەی ئیسلام بوون بەوپەڕی خۆشحاڵی و ڕازی بوونەوە ملیۆنەها گیانیان لە پێناوی بەدەستهێنانی پلەی شەهیدیدا بەخت کرد، بێگومان ئەمانە بەشێکیان لەو گیانی خۆبەختکارییەی باپیرانیان بە میرات بۆ ماوەتەوە، بەو ڕادەیەی کە ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵ و نائاساییەیان دەربڕی کە هانی ئەم برا کۆڵەوارەیان بدات لە بەردەم دادگای "دەنیزلی"دا بڵێت:

"ئەو ڕاستییەی کە ملیۆنەها قارەمان سەری خۆیان لەپێناودا دانا، ئێمەش سەری خۆمانی لەپێناودا بەخت دەکەین"..

ئەم ڕستەیەشی بە ناوی هەموویانەوە وت و، دادگای بێ دەنگ کرد و خستنیە دۆخی سەرسامی و ڕێزگرتن و حەپەسانەوە!

بەو واتایەی کە چەندین گیانفیدای ڕاستەقینە و خاوێن و دڵسۆز بۆ خوای گەورە لە نێوان قوتابیانی نووردا هەیە کە تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورە و بەدەستهێنانی ژیانی دواڕۆژیان مەبەستە. بۆیە ماسۆنییەکان و شیووعییەکان و گومڕایان و خراپکاران و "تاشناق" و ڕێکخراوە ترسناکەکانی تری هاوشێوەیان، هیچ ڕێگایەکیان نەدۆزییەوە کە بەهۆیەوە بەسەر ئەو قوتابیانەی نووردا سەربکەون. ئیتر لە ناچاریدا و، لە ڕێی چەند

یاسـایەکی پلاسـتیکیەوە و، بە نیـازی شـکاندنی شـان و شـکۆی ئـەو قوتابیانـە، حکوومەت و فەرمانگەکانی دادیان لەخشتە برد.

بەڵام ئەوانە سەریان لـە بەرد داوە و، هـەموو هەوڵێکیشیان پووچەڵ دەبێتـەوە و، بە پشتیوانیی خوای گەورە هیـچ زیـانێك بـە قوتابیـانی نـوور ناگەیەنن. بـەڵکو کارەکـەیان دەبێت بەهۆی زیادبوونی ژمارەی پاڵەوانە گیانفیداکانی نوور و ئیمان)[1].

☐ تاقیکردنەوە و بژار پێویستە

(برا ئازیز و بەشەفەقەت و وەفادارەکانم!

وا دوو ڕۆژە هەڵامەت گەلـێ کاری کردووەتە سەر دەمارەکانم و سەرم.

لەم چەشنە حاڵەتانەدا وا هەست دەکەم کە پێویستم بە هاودەمی و دڵنەوایی برادەران هەیە. بـەڵام لـەم حاڵـەی ئێستامدا بێزاریی تـەنیایی و دابڕکردنم لـە هـەموو شتێك، بـە چەشنێکی سەیر، بە جارێ دڵتەنگی کردووم کە سکاڵایەکم بەم شێوەیە بە دڵدا هات:

ئەم ئازاردانە لە پێناوی چـی؟ چ سـوودێکی تێدایـە بـۆ ئـەو خزمەتـەی کـە لـە پێنـاوی ئیمان و قورئاندا ئەنجامی دەدەین؟

کتوپڕ ئەم سەرلەبەیانیەیە ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

گەلـێ پێویست بـوو ئێـوە بڕۆنـە نـاو ئـەم تاقیکردنەوە سـەختەوە و، چـەندین جـار لـە سەنگی مەحەك بدرێن، تاکو زێڕ بناسـرێت و لـە مـس جیـا بکرێتـەوە.. پێویسـت بـوو لـە هەموو لایەن و ڕوویەکەوە بە چەندین تاقیکردنەوەی ستەمکارانەدا تێپەڕ بـبن، بـۆ ئـەوەی بزانـن کـە تـا چ ڕادەیـەك دەروونـی بـەدخوازتان بـەش و فڕوفێڵـی خـۆی مـاوە.. پاشـان پێویست بوو لە سێ پاڵێوگەدا پاڵفتە بکرێن..

هەموو ئەمانە چەند کارێکی پێویست بوون لە پێناوی خزمەتگوزاریەکەتاندا، کە خزمەتێکی بێگەرد و خاوێنە و تەنها لەبەر حەق و ڕاستی ئەنجامی دەدەن!

لەبـەر ئـەوە، قـەدەری خـوای گـەورە و چـاودێریی پـەروەردگار بواریـان دا ئـەو پاڵفتەکاریە بهێنرێتـە ڕێتـان. چونکـە ڕاگـەیاندنی ئـەم خزمەتـە بـەرزە لـەم کـۆڕی تاقیکردنەوەیـەدا و، بەرامبـەر بـە چـەندین نـەیاری سەرسـەخت و سـتەمکاری وا کـە

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٣٥-٧٣٦.

لاوازترین بیانوو دەدۆزنەوە، کارێکی کرد خەڵکی تێبگـەن کـە ئـەم خزمەتگوزاری‌یـەی قورئان ڕاستەوخۆ لـە سـەرچاوەی حـەق و ڕاستی‌یەوە هــەڵقوڵاوە و، هیــچ فڕوفێــڵ و خۆویستی و لـەخۆبایی بـوون و هیـچ بەرژەوەندی‌یـەکی کەسـی و ســوودێکی دنیـایی، تەنانـەت قیامـەتیش، تێکـەڵی نی‌یـە. چونکـە ئەگـەر ئـەم تاقیکردنەوەیـە نەبوایـە، عـەوامی ئیمانداران متمانەیان بەم خزمەتە نەدەکرد و، زمانی حاڵیان دەیوت:

"لەوانەیە بەم قسانەیان بمانخەڵەتێنن"!

تایبەتمەندانیشیان دەیانوت:

"ئەمانـە بۆیـە وا دەکــەن تــاکو چــەند پلەوپایەیـەکی دیـاری کـراو و ڕازی بوونـی خەڵکی‌یان دەست بکەوێت، وەك ئەوەی کە هەندێ لە خاوەن پلەوپایـە مەعنەوی‌یـەکان دەیکەن"!

دیارە ئەو کاتەش ئەوان متمانەیان بە خزمەتگوزاری‌یەکەمان نەدەما.

بەڵام دوای تاقیکردنەوە، سەرسەخت ترین و بەدگومان ترین کەسیش ناچار بـوو مـل بۆ ئەو ڕاستی‌یە کەچ بکات.

کەواتە ئەگەر یەك تەنگانە و دەردیسەریتان تووش بووبێـت، ئـەوا - پشـت بـە خـوا - هەزار قازانجتان لەو تاقیکردنەوەیەدا دەست کەوتووە)[1].

❑ دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینە

(دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینە کە هەموو گیروگرفتێکم لادەبات مایەی بێزاریم بێت:

یەکەم: گۆڕانی سەختی و گیروگرفتەکان بۆ سۆز و میهرەبانی و دڵخۆشی.

دووهـەم: بەدەستهێنانی ئـەو شـادمانی‌یەی کـە لـە ڕەزامـەندی و تەسـلیم بوونـەوە بـۆ قەدەری خوای گەورە، سەرچاوە دەگرێت.

سێهەم: ئەو دڵخۆشی‌یەی کە هی سەرپەرشتیی چاودێریی تایبـەتیی خـوای گەورەیـە بۆ قوتابیانی نوور.

چوارەم: چێژ و لەزەتی نەمانی ئەو گیروگرفتەی کە شتێکی کاتی و ڕێبوارە.

پێنجەم: بەدەستهێنانی پاداشتە مەزنەکان.

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٣٨-٧٣٩.

شەشەم: خۆ هەڵنەقورتاندن لە ویستی خوای گەورەدا.

حەوتەم: ڕوودانی سووکەڵە و تەنکترین زام و کەمترین گیروگرفت، لە دەمی توندترین و دڕندەترین هێرشدا بۆ سەرمان.

هەشتەم: بچووك بوونەوەی گیروگرفتەکان بە چەندین پلەی زۆر سەبارەت بە گیرۆدەبووانی ترەوە.

نۆهەم: دڵخۆشیی کاریگەریی ئەو ڕاگەیاندنە بەرزانەی هەواڵی تەواوبوونی ئەم تاقیکردنەوە سەختە دەگەیەنن کە لە خزمەتی نوور و ئیماندا هاتە ڕێمان.

ئەم نۆ دانە دڵخۆشی‌یانە، چارەسەرێکی مەعنەوی و مەڵهەمێکی هێندە ناسك و نیانن بۆ هێور کردنەوەی ئازارە توندەکانمان کە لە باسکردن نایەن)[1].

☐ قەدەر چیمان پێ دەڵێت؟

(برایانی ئازیز و هاوڕێم!

یەکەم: باشترین شوێن بۆ ئێمە بەندیخانەیە، لە سەردەمی حوکمڕانیی وەزارەتێکی خۆسەپێندا کە ڕێ لە حەج دەگرێت و سووکایەتی بە ئاوی زەمزەم و قەدەغەی دەکات و.. بوار دەدات توندوتیژترین ستەم بەرامبەرمان بکرێت و.. گوێ نادات بە دەست بەسەرداگرتنی کۆمەڵە پەیامی "ذوالفقار" و "سراج النور" و.. پلەی ئەو کارمەندانەش بەرز دەکاتەوە کە بە ئەنقەست و بە بێ هیچ پاڵپشتێکی یاسایی ئازارمان دەدەن و، گوێ لە دەنگ و گریانی ئێمەی ستەم لێکراو ناگرن کە بە زمانی حاڵ لە خانە و لانەکانمانەوە بەرز دەبنەوە..

بەڵێ، باشترین جێ بۆ ئێمە لە سەردەمی حوکمی ئەم وەزارەتەدا بەندیخانەیە، مەگەر بگوێزرێینەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر. دیارە ئەو کاتە بە تەواوی ڕزگارمان دەبێت و بێوەی دەردەچین.

دووهەم: هەروەك ئەوان دوورترین کەسیان لە ئێمەوە ناچار کرد کە تایبەتی‌ترین و پەنهانترینی پەیامەکان بخوێننەوە، وا دیارە بە هەمان شێوە و بە جەخت لەسەر کردنەوە

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٤٨-٧٤٩.

هانی ئێمەش دەدەن کە "کۆمەڵە"یەك پێکبهێنین! چونکە برایەتیی ئیسلامی، کە لەناو کۆمەڵی ئەهلی ئیماندا پەرەی سەندووە، لای قوتابیانی نووریش بە شێوەیەکی بێگەرد و پاك و بەو خۆبەختکردنە ڕاست و فیداکاریـیە تەواوەتییـە پـەرەی سـەندووە کـە لـە باپیرانی پێشوویان و لـەو ملیۆنـەها پاڵەوانـەوە بـە میرات بۆیـان ماوەتـەوە کـە بەوپەڕی شـەوق و حەزەوە گیانی خۆیان لە پێناوی حەقیقەتدا بەخت کردووە..

جا ئەو قوتابیانەی نوور بە پەیوەستێکی هێندە توندوتۆڵ پەیوەندییان بەو ڕاستییەوە کردووە کە تا ئێستا پێویست بەوە ناکات ڕێکخراوەکان پێکبهێنرێن، چ سیاسی بن چ ڕەسمی، چ ئاشکرا بن و چ پەنهان.

کەواتە لەم سەردەمەدا بە ڕادەیەکی ئەوتۆ پێویستی بەم "برایەتییە ئیسلامی"یە هەیە کە قەدەری خوای گەورە ئەوانەمان بەسەردا زاڵ دەکات.

دەبینی ئەوان ستەممان لێ دەکەن کە گوایا ئێمە کۆمەڵەیەکی وەهمیمان پێکهێناوە..

بەڵام قەدەری خوای گەورە پێمان دەڵێت:

بۆچی بە ئیخلاسێکی تـەواوەتی و پشتگیرییەکی توندوتـۆڵ حیزبولڵای ڕاستەقینە (واتە برایەتیی ئیسلامی)تان پێك نەهێناوە؟!

کەواتـە قـەدەری خـوای گـەورە بـە دەستی ئەوانـە زللەیەکی ئاراستە کردین. خـۆ ئاشکرایە کە قەدەری خوای گەورەش دادگەرە)[1].

☐ هیچ پەیوەندییەکمان بە ڕێکخراوەکانەوە نییە

(هێرش و دەستدرێژییەکەی ئـەم جـارە لـە بازنەیـەکی یـەکجار فراوانـدا کرایـە سەرمان..

ئەوەبوو هەریەك لە سەرۆکی حکوومەت و وەزیرەکان، بـە پێـی پیلانێـك کـە لەسـەر بناغەی چەند وەهمێکی ترسناك داڕێژرابوو، هێرشیان کردە سەرمان.

بە گوێرەی ئەوەی من بیستوومە و بـە چـەند نیشـانەیەکدا، وا دیـارە کـە ئـەو هەواڵـە درۆینەیەی مونافیقانی پشتی پەردە سازیان داوە و، بەو پیلان و فێڵانەش کە لـە دژی ئێمـە

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٥٠-٧٥١.

هەڵیان بەستووە، وایان پیشان داوە کە پەیوەندی‌یەکی بەهێز و توندوتۆڵمان لەگەڵ کۆمەڵەی نهێنیی تەریقەتی نەقشبەندی و ئەو ڕێکخراوەشدا هەبێت کە بۆ زیندووکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی هەوڵ دەدات. تەنانەت ئێمەیان وا پیشان داوە کە لە پێشەنگی ئەوان، بەڵکو پێشڕەویشیان بین! بە ڕادەیەك کە لەم ڕووەوە حکوومەتیان تووشی نیگەرانی‌یەکی یەکجار گەورە کردووە..

بۆ ئەمەش کۆمەڵە گەورەکانی پەیامەکانی نووریان پیشان دان کە لە ئەستەمبووڵ بەرگیان تێ گیراوە و بۆ جیهانی ئیسلامی نێرراون و، لەوێ ڕەزامەندی و قبووڵیان بەدەست هێناوە و، ئەمەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر چالاکیی قوتابیانی نوور..

ئیتر بەم جۆرە ترس و دڵەڕاوکێیان لە دڵی حکوومەتدا بڵاوکردەوە و، دەماری غیرەت و حەسوودی‌یان لە لای هەندێ زانای ڕەسمی وروژاند و، وەهم و گومانیشیان لە لای کارمەندەکان بە ڕادەیەك هەژاند کە ئەوانیان خستە هەڵوێستی دژایەتیی ئێمە و، پێیان وابێت بەڵگەی زۆر و نیشانەی جۆراوجۆریان بە دەستەوەیە کە ئێمەی پێ تاوانبار بکەن و، لەو باوەڕەدان سەعیدی نوێ ئەم بارودۆخەی پێ قبووڵ ناکرێت و، ڕێسا و سیستەمی ئاسایش تێکدەدات!

بەڵام سوپاسێکی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە قورسایی ئەم گیروگرفتەی لە هەزارەوە هێنایە خوارەوە بۆ یەك! ئەوەبوو نەیانتوانی بیچەسپێنن کە هیچ پەیوەندی‌یەکمان بە ڕێکخراوەکان و ئەو کۆمەڵانەوە هەبێت. چونکە هەر لە بناغەدا ئەم جۆرە پەیوەندی‌یە بوونی نی‌یە، ئیتر چۆن دەتوانن پەیدای بکەن؟ بۆیە داواکاری گشتی ناچار بوو درۆ و دەلەسە هەڵببەستێت و، بوختانمان بە دەمەوە بکات و، چەند شتێکی بێ نرخ بخاتە ئەستۆمان کە هیچ بەرپرسی‌یەکیان تێدا نی‌یە.

مادەم "ڕاستی" ئەمەیە.. ئەوا ئێمە و پەیامەکانی نوور بە ڕێژەی لە سەدا نەوەد و نۆ لە گیروگرفتەکان ڕزگارمان بووە..

لەبەر ئەوە، دەبێ چاوەڕوانیی چاودێریی خوای گەورە بکەین و، بە شوکر و سەبر و لاڵانەوە لە دەرگانەی خوادا کارێ بکەین کە ئەو چاودێری‌یەی خوای گەورە بەرامبەر بە ئێمە بدرەوشێتەوە.

کەواتە دەبێ لە جیاتی سکاڵا، نەك هەر تەنها یەك جار، بەڵکو هەزار و یەك جار شوکر و سوپاس پێشکەشی خوای گەورە بکەین و، دەستی یارمەتی بۆ ئەوانەی دەڕۆن و دێنە ناو ئەم قوتابخانە یوسفی‌یەوە ڕابکێشین و، لە ڕێگای وانەی پەیامەکانی نوورەوە دڵنەواییان پێ ببەخشین)[١].

☐ دانانی پەیامی "الحجة الزهراء"[٢]

(ئەم وانەیە لە ڕواڵەتدا بە پەیامێکی بچووك دەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا پەیامێکی بەهێز و فراوانە و، میوە و بەروبوومێکی ئیمانی و قورئانی و بەهەشتی‌یە کە ژیانی بیرکردنەوەم و یەکگرتنی "علم الیقین" و "عین الیقین" لە ژیانی مەعنەوی و تەحقیقیی نووردا بەرهەمیان هێناوە)[٣].

---

(١) تیشکەکان، تیشکی چواردەهەم، ل: ٧٥٢-٧٥٣.

(٢) کە تیشکی پازدەهەمە. دانراوەکانی تری لە بەندیخانەی "ئافیوون" ئەمانەن:

١ - ئومێدی پازدەهەمی بریسکەی بیست و شەشەم (پەیامی پیران)

٢ - تیشکی چواردەهەم، کە بریتی‌یە لە چەند نامەیەکی ڕێنمایی کە ئاراستەی قوتابیانی خۆی کردوون و دەگەنە سەد و نەوەد و یەك نامە، لەگەڵ بیست و یەك بەرگری لە بەرگری‌یەکان.

٣ - مەقامی دووهەمی وتەی سیازدەهەم: کە بریتی‌یە لە بەشێکی نامەکانی بەندیخانەی ئافیون کە ئاراستەی توێژی لاوان و بەندکراوان کراون و، دوایی لە "ڕابەری لاوان"دا کۆکرانەوە.

کۆی لاپەڕەی دانراوەکانی مامۆستا لە بەندیخانەی ئافیووندا دەگاتە پێنج سەد لاپەڕە. هەروەك کۆی لاپەڕەی سەرجەمی دانراوەکانی هەتا کۆتایی بەندیخانەی ئافیون گەیشتووەتە پێنج هەزار لاپەڕە. (ب: ١٣٠٥/٣).

"بایرام یوکسەل" دەگێڕێتەوە کە: نووسینەوەی پەیامەکانی نوور و سەرقاڵ بوون پێیانەوە کاری بەردەوامان بووە لەگەڵ قوتابیانی پەیامەکانی نوور لە بەندیخانەدا. هەر کاتێ چ بە ڕۆژ و چ بە شەو لە بەندیخانەدا لە ژوورەکەی مامۆستا نزیك دەبووینەوە، دەنگێکی وەك هی پوورەی هەنگ دەهاتە گوێمان کە دەنگی زیکر و تەسبیحات و نوێژی مامۆستا بوو. بە وردی سەرنجی کارەکانی مامۆستامان دەدا. لە کاتە هەرە درەنگەکانی شەودا سەیری ژوورەکەیمان دەکرد، دەمانبینی چرا کزەکەی داگیرساوە و مامۆستا سەرگەرمی زیکر و دوعاکانیەتی. هەر لەم ماوەیەدا کە لە بەندیخانەی ئافیون دەژیاین یەکێك لە تیشکەکانی دانا کە تیشکی پازدەهەمە و ناوی "الحجـــة الزهراء"ە. هەر لە ماوەی دانانی ئەم پەیامەدا جار بە جار لە ژێر پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستاوە تێپەڕ دەبووین، هەر کە مامۆستا ئێمەی دەبینی قاپلۆخە شقارتەی بۆ هەڵدەداین کە بەشێکی لەو پەیامە تێدا بوو. ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە چەند دانەیەکمان لەم بەش بەشانە دەنووسی‌یەوە.. ئیتر پەیامی ناوبراو بەم جۆرە نووسرایەوە و پارێزگاریی لێ کرا. (ش: ٣٢/٣).

(٣) تیشکەکان، تیشکی پازدەهەم، ل: ٨١٦.

(هەرچەند قوتابیانی نوور لە بریی تۆ ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ دەکەن و لە هەموو هۆڵەکانی بەندیخانەدا بە چوست و چالاکی و لێبڕانەوە ڕاستی‌یەکانی پەیامەکانی نوور ڕادەگەیەنن، کەچی ئەم ژووری ژمارە پێنجە، کە وەك شوێنی گۆشەگیریی زاهیدەکان وایە، هەمیشە نوێ دەبێتەوە و ئاڵ و گۆڕی بەسەردا دێت، کەواتە لە هەموو ژوورەکانی تر پێویستیی زیاتری بە وانەکانی نوور هەیە.

هەروەها بێ گومان لاوان و پیرانیش گەلێ پێویستیان بە چەند وانەیەکی دڵنیایی‌بەخش و دامەزراو هەیە لە بارەی چەسپاندنی "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەوە، چونکە لە ڕۆژنامەکاندا هێرشە ئیلحادی‌یە ترسناکەکانی ڕووس بۆ سەر ئیمان و ئینکاری کردنی بەدیهێنەری مەزن، دەخوێننەوە.

ئەمە بوو کە لە دەمی خوێندنی زیکرەکانی دوای نوێژ بە دڵمدا هات و، منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەو تەهلیلەیەم خوێند کە هەر لە مێژە دوای نوێژی بەیانیان دە جار دەیخوێنم و بریتی‌یە لە:

(لا اله الاّ الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شئ قدير واليه المصير).

ئەم تەهلیلە گەورە و تەوحیدە مەزنەی کە بەپێی ڕیوایەتێك ئیسمی ئەعزەمی لەخۆ گرتووە، مەکتووبی مەزنی بیستەم بە درێژی، لە یازدە وشەیدا و لە ناوەندی یازدە بەڵگەی پێویستیی "بوون" و "یەکتایی" پەروەردگاریتیدا و، بە وێنەی خۆری درەخشان ڕوونی کردووەتەوە و، یازدە مزگێنی و مژدەی دڵخۆشکەریشی لەسەر هێناوەتەوە)[١].

[ پەیامەکە دوای ئەوەی کە بەڵگەکانی "تەوحید" دەهێنێت، تەفسیری سوورەتی "فاتیحە"ش دەکات، ئنجا چەند شایەتی‌یەك باس دەکات لەسەر پێغەمبەریتیی پێغەمبەری نازدار ﷺ ].

(١) تیشکەکان، تیشکی یازدەهەم، ل: ٨١٧-٨١٨.

# بەندی یەکەم

## دوا ساڵەکانی تەمەنی

## ١٩٤٩/٩/٢٠-١٩٦٠/٣/١٨ز

[ مامۆستا نوورسی ئەم ماوەیەی تەمەنی لە شار و شارۆچکەکانی (ئەمیرداغ، ئیسپارتە، ئەسکی شەهر، بارلا) بەسەربردووە. هاوکات لەگەڵ سەردانی جار بە جاری بۆ ئەنقەرە و ئەستەمبوڵ و قۆنیە ].

### ❑ لە دوای بەندیخانەی "ئافیوون"ەوە هەتا ساڵی (١٩٥٠ز)

دوای ئەوەی کە مامۆستا نوورسی و قوتابیانی ماوەی مەحکوومی‌یان لە "بەندیخانەی ئافیوون" بەسەربرد، لە بەرواری (١٩٤٩/٩/٢٠ز)دا ئازاد کران، لەگەڵ ئەوەشدا هەتا (١٩٤٩/١٢/٢ز) ڕێ بە مامۆستا نوورسی نەدرا کە لە "ئافیوون" بڕواتە دەرەوە.

بەڵام لەو بەروارەدا، بە هاوڕێیەتیی پۆلیسێك، بۆ نیشتەجێ کردنی زۆرەملێ ڕۆشت بۆ "ئەمیرداغ" و، دوو ساڵی تێدا بردەسەر.

لەم ماوەیەدا چەندین نامەی پیرۆزبایی بۆ قوتابیانی خۆی نارد، هەروەك کۆمەڵەیەکی پاکژکراوی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)ی بە "مستەفا صونگور"ی قوتابیی خۆیدا نارد بۆ سەرۆکی کاروباری ئایینی[١].

---

(١) Tarihce-i Hayat, Isparta Hayati.

❑ نامەیەکی کەسی و تایبەت بۆ سەرۆکی کاروباری ئایینی

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ بەڕێز جەنابی ئەحمەد حەمدی[1]!

وا لە خوارەوە ڕووداوێکی ڕۆحیتان بۆ باس دەکەم کە بەسەر خۆمدا هاتووە:

ماوەیەکی زۆری پێش ئێستا وازهێنان لە "عەزیمەت" و بیری شوێنکەوتنی "ڕوخسەتی شەرعی" لەسەر بناغەی زەروورەت، وەك ئەوەی جەنابتان و چەند زانایەکی تر لەگەڵتاندا گرتتانە بەر، لەگەڵ بیری مندا نەدەگونجا. بۆیە ڕقم لە ئێوە و لەوانیش هەڵدەسا و، تووڕە دەبووم لێتان و، دەموت:

بۆچی واز لە "عەزیمەت" دەهێنن و شوێن "ڕوخسەت" دەکەون؟

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ڕاستەوخۆ پەیامەکانی نوورم بۆ نەدەناردن.

بەڵام پێش نزیکەی چوار ساڵ، داخێکی زۆری پڕ لە ڕەخنەم هاتە دڵەوە و، یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە:

ئەو بەڕێزانە، لە پێش هەمووشیانەوە جەنابی "ئەحمەد حەمدی" دۆست و هاوڕێی خوێندنی تۆن لە قوتابخانەی شەرعیدا و، توانییان ئەو مەترسییەی کە لەسەر ئیسلام بوو تا ڕادەی چواریەك کەم بکەنەوە. ئەوەبوو بەپێی توانا بەشێکی ئەرکە زانستییەکەیان لە بەردەم وێرانکارییە سامناك و توند و تیژەکان و لە پێناوی پاراستنی موقەددەساتدا بەخت کرد و، لەمەشدا شوێن دەستووری شەرعیی "إختيار أهون الشرين" کەوتن. پشت بە خوا ئەم کارەیان دەبێت بە کەفارەتی هەندێ لەو قسوور و ناتەواوییانەیان کە بە ناچاری تووشی بوون.

---

(١) ئەحمەد حەمدی ئاقسەکی (١٨٨٧–١٩٥١ز). دوای خوێندنی قورئانی پیرۆز، زاستە جۆراوجۆرەکان و زمانەکانی فارسی و عەرەبیی خوێندووە، لە ئەستەمبوولیش لە لای شاعیری بەناوبانگ "محەممەد عاکیف" ئەدەبی عەرەبیی خوێندووە، بە تایبەت "المعلقات السبع". لە قوتابخانەی پسپۆڕەکان خوێندنی تەواو کردووە و بڕوانامەی بە دەست هێناوە و، نازناوی "مامۆستای گشتی"ی پێ دراوە. وتارەکانی لە گۆڤاری "سبيل الرشاد" و هاوچەشنیدا بڵاوکردووەتەوە. لە چەندین قوتابخانەدا وانەی وتووەتەوە. ساڵی (١٩٣٩ز) بووە بە یاریدەدەری سەرۆکی کاروباری ئایینی و لە (١٩٤٧ز)یشدا بووە بە سەرۆکی. گەلێ بەرهەمی بە نرخی بەجێ هێشتووە. (وەرگێڕ)

ئیتر لەو کاتەوە بە چاوی برایەتیی ڕاستەقینەی جاری جارانەوە دەڕوانمەوە ئێوە و زانایانی هاووێنەتان. چونکە ئێوە برایانی قوتابخانەی شەرعی و هاوڕێی خوێندنی منن.

جا لەبەر ئەوەی دوای ئەم ژەهرپێدانەی دواییم چاوەڕوانی مردنی خۆم بووم[1]، ئەوا سێ ساڵ پێش ئێستا بڕیارم دا کۆمەڵە پەیامێکی تەواوەتیتان پێشکەش بکەم، بەو هیوایەی کە لە بریی من، ئێوە ببن بە خاوەنی ڕاستەقینە و پارێزگاری پەیامەکانی نوور. کەچی ئەو کۆمەڵە ئێستا ئامادە نییە و هەڵەگیریی تەواویشی تێدا ئەنجام نەدراوە.

بەڵام نەختێ ڕاستکردنەوەم لە کۆمەڵە پەیامێکی تەواودا بە ئەنجام گەیاند، کە زۆربەی بەشەکانی پازدە ساڵ پێش ئێستا سێ قوتابیی پایەداری پەیامەکانی نوور نووسیویاننەتەوە و، گەر بۆ جەنابتان نەبوایە ئەم کۆمەڵە پەیامە بەنرخەم بە کەسی تر نەدەدا، چونکە نووسینەوەیان لە لایەن ئەو سێ کەسە ئازیزەوە نرخەکەی گەیاندووەتە ئاستی دە کۆمەڵە پەیامی تەواوەتی..

بەرامبەر بەمەش نرخی مەعنەویی ئەم کۆمەڵە پەیامە بریتی‌یە لە سێ شت:

*یەکەم:*

لەبەرگرتنەوەی سی دانە لە هەریەك لەو پەیامانە لەسەر ئامێری ڕۆنیۆ بە پیتە کۆنەکان - گەر بگونجێت - دەنا بە پیتە تازەکان و، پاشان دابەش کردنیان بەسەر لقەکانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی لە سەرتاسەری وڵاتدا، بە مەرجێك یەکێك لە برا تایبەتمەندەکانمان یارمەتیدەری هەڵەگیری و سەرپەرشتیکاری ئەم کارە بێت. چونکە بڵاوکردنەوەی ئەم چەشنە دانراوانە بەشێکە لە ئەرکی سەرشانی سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی.

*دووەم:*

لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور موڵك و کەرەسەی قوتابخانەی شەرعین و، بەڕێزیشتان بناغە و سەرۆکی قوتابیانی ئەو قوتابخانە شەرعی‌یەن، ئەوا پەیامەکانی نوور موڵکی ڕاستەقینەی ئێوەیە. کەواتە ڕاتان لەسەر بڵاوکردنەوەی هەر پەیامێك بوو پەخشی بکەن و، دواخستنی هەر پەیامێکیشتان بە باش زانی بڵاوکردنەوەی دوا بخەن.

---

(١) ئەمە جاری پازدەهەمی ژەهرپێدانیەتی. دوای ئەوەی کە خوای گەورە شیفای پێ بەخشی، پەیامی (وتاری شام)ی لە عەرەبی‌یەوە کرد بە تورکی و هەندێکیشی لێ زیاد کرد. (ب: ١٤١٢/٣).

سێهەم:

با بە وێنە گرتنەوەی فۆتۆگرافی ئەو موصحەفە پیرۆزە چاپ بکرێت کە تەوافوقەکانی لەمەڕ "لەفزی جەلالە" دەردەخات، تاکو بریسکەی ئیعجاز لەو تەوافوقانەدا ببینرێت. تکایە پێناسە تورکی‌یەکان، کە لەسەرەتای موصحەفە پیرۆزەکەدا لە بارەی تەوافوقەکانەوە نووسراون، لەگەڵ موصحەفەکەدا چاپ نەکرێن، بەڵکو باشتر وایە یان لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بە زمانی تورکی لە چاپ بدرێن، یان بە وەرگێڕانێکی ئەمین بکرێن بە عەرەبی)[١].

❐ نامەی صونگور لە ئەنقەرەوە بۆ مامۆستا:

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(بۆ مامۆستای بەڕێز و ئازیز و بە شەفەقەت و پیرۆز و خۆشەویستم!

نامە ڕەنگینەکەتان لەگەڵ کۆمەڵە پەیامێکدا بە دەستی مامۆستا "ئەحمەد حەمدی"ی سەرۆکی کاروباری ئایینی گەیاند و، ئەویش بە شادمانی‌یەکی لەڕادەبەدەرەوە خستنیە کتێبخانە تایبەتی‌یەکەی خۆیەوە و، وتی:

"پشت بە خوا ئەم کۆمەڵە پەیامە دەدەم بە برا تایبەتمەندەکانم تاکو بیانخوێننەوە و، هەوڵیش دەدەین، وردە وردە، لەسەر ئەم شێوەیە لە چاپیان بدەین".

هەروەها ئەی مامۆستای گەورە و خۆشەویستم! وتی:

"بە پێی ناوەرۆکی نامەکەی بەڕێزتان بۆ ئەو مەبەستە تێدەکۆشم. چونکە چاپکردنی ئەم کۆمەڵە پەیامانە بە یەك جار و لە کاتی ئێستادا لە تواناداا نی‌یە. بەڵام دەیاندەم بە برا تایبەتمەندەکانم تاکو بیانخوێننەوە و، بەپێی بایەخ پێدان و داواکاریی خەڵکییش پەخشیان دەکەین و، بە پشتیوانیی خوای گەورە بە جوانترین شێوە هەوڵی بڵاوکردنەوەیان دەدەین".

صونگور)[٢].

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٤٦٦-٤٦٨.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ: ٢/٤٦٥-٤٦٦.

# ساڵی ١٩٥٠ز[١]

□ بروسکەیەك بۆ سەرۆك کۆمار

(بۆ سەرۆك کۆمار.. جەلال بایار!

پیرۆزباییتان لێ دەکەین و، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان و نەتەوە یارمەتیتان بدات.

بە ناوی قوتابیانی نوورەوە: سەعیدی نوورسی[٢]

---

(١) بە نزیکبوونەوەی کاتی هەڵبژاردنە گشتییەکان، "پارتی گەلی کۆماری" ویستی بە چەند کردارێك مەیلی گەل بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، وەك بوواردان بە کردنەوەی قوتابخانەکانی لەبەرکردنی قورئان و، ڕێ دان بە وتنی "الله أکبر"ی جەژن بە زمانی عەرەبی و، کردنەوەی کۆلێجێکی شەریعە لە ئەنقەرە! بەڵام لەبەر ستەمی لە ڕادەبەدەری ئەم پارتە و دەستدرێژیی بێ ئەندازەی بۆ سەر ئایین، میللەت بەو هەنگاوانەی نەخەڵەتا و، لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگیان لە بەرژەوەندیی "پارتی دیموکراتی" دا کە ڕکەبەری ئەو بوو. ئیتر دیموکراتییەکان لە بەرواری (١٦/٥/١٩٥٠ز)دا و لە ئەنجامی بە دەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان، کە (٣٩٦) نوێنەر بوو لە بەرامبەر (٦٨) نوێنەری پارتی گەلدا، دەسەڵاتیان گرتەدەست.

حکوومەتی نوێ چەند کارێکی لە بەرژەوەندیی ئیسلامدا جێبەجێ کرد، وەك:

١ - لابردنی قەدەغەی بانگ وتن بە شێوەی شەرعی، لە بەرواری ١٦/٦/١٩٥٠ز بە دواوە.

٢ - دەرکردنی یاسای لێبوردنی گشتی لە بەرواری ١٤/٧/١٩٥٠زدا.

٣ - لابردنی قەدەغە بوونی پەخش کردنی قورئانی پیرۆز و بەرنامە ئایینییەکان لە ڕادیۆدا، لە بەرواری ٥/٨/١٩٥٠ز بە دواوە.

٤ - دانان و وتنەوەی وانەی ئایین بە ڕەسمی لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا لە ٢١/١٠/١٩٥٠ز بە دواوە.

٥ - داخستنی "پەیمانگاکانی گوندەکان" کە وانەی ئیلحادیان تێدا دەوترایەوە، لە بەرواری ١٠/٨/١٩٥٢زدا.

٦ - دانان و وتنەوەی وانەی ئایین بە ڕەسمی لە قوتابخانە ناوەندییەکاندا لە ١٣/٩/١٩٥٦ز بە دواوە. (ب: ١٤٠٣/٣)

(٢) مامۆستا نوورسی دەقی ئەم بروسکەیەی بە "زوبەیر گوندوزئالب"ی قوتابیی خۆی وت تاکو بینووسێتەوە. پاشان ڕووی تێکرد و، پێی وت: دەزانیت بۆچی ئەم بروسکەی پیرۆزباییە دەنێرم؟ زوبەیر بێدەنگ بوو. مامۆستا بۆی ڕوون کردەوە و، وتی: کۆمارییەکان بە دیموکراتییەکان دەڵێن: "ڕاستە کە سەعید لەگەڵ ئێمەدا نییە، بەڵام خۆ لەگەڵ ئێوەشدا نییە، بەڵکو ئامانجێکی دیکەی هەیە". ئیتر بەم قسەیە دەیانخەڵەتێنن و هانیان دەدەن ئەو هێزەی دەوڵەت کە ئێستا لە دەستیاندایە لە دژی دینداران و قوتابیانی نوور بەکاری بهێنن. بەڵام هەر هێندەی کە ئەم بروسکەیە دەگاتە دەستیان، دەڵێن: نەخێر، سەعید دۆستی ئێمەیە. ئیتر ئەو کاتە هێزی دەوڵەت لە ڕووی نادروستدا بەکارناهێنرێت. (ش: ٣٨٢)

سەرۆك كۆماریش ئەم بروسكە وەڵامەی خوارەوەی بۆ مامۆستا نوورسی نارد:

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی – ئەمیرداغ

پیرۆزباییەكەتان كە لە دڵەوە ناردبووتان گەلێ خۆشحاڵی كردین. زۆر سوپاست دەكەم.

جەلال بایار[1]

## ☐ مژدەی گێڕانەوەی بانگی شەرعی

باسمه سبحانه

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

(لەگەڵ ئەوەدا كە پەیامەكانی نوور بە جۆرێكی مەعنەوی و تەواوەتی سەركەوتنیان بەدەست هێناوە، كەچی ماسۆنییە مولحیدەكان و شیوعییە زەندیقەكان هەوڵی ئەوە دەدەن كە شتی بچووك لە پێش چاودا گەورە بكەن و، ڕێ لە سەربەستیی بڵاوبوونەوەی پەیامەكانی نوور بگرن.

تەنانەت ئەم جارەش بوون بەهۆی ئەوەی كە دادگایی كردنمان ماوەی سێ و پێنج ڕۆژ دوا بخەن و، قرەقرییان لەگەڵ پارێزەرەكەماندا نایەوە، تاكو نەهێڵن موصحەفە پیرۆزەكەمان بدرێتەوە.

بەڵام چاودێریی خوای گەورە هەموو نەخشە و پلانەكانی ئەوانی پووچەڵ كردەوە. چونكە پەیامەكانی نوور لە ئەستەمبووڵ و ئەنقەرەدا خۆیان خستووەتە سەردەستی لاوەكان كە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنماییان دەكەن و، ئەوانیش بە تاسە و شەوقێكی تەواوەتییەوە دەیانخوێننەوە. بە ڕادەیەك كە ئەم سەركەوتنە مەعنەوییە بوو بەهۆی ئەوەی لە لایەن سەدان لاوی ڕۆشنبیرەوە بروسكەی پیرۆزبایی و سوپاسگوزاری بۆ سەرۆك وەزیران ڕەوانە بكرێت كە هەوڵەكانی خۆی بۆ گێڕانەوەی بانگی محەممەدی ﷺ لەسەر شێوەی شەرعی، خستبووە گەڕ)[2].

---

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٤٧٣.

(٢) پاشبەندەكان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٤٧٥-٤٧٦.

❑ بروسكەیەك لە ڤاتیكانەوە

(ڤاتیكان: ٢٢/شوبات/١٩٥١

مەقامی بەرزی پاپا

سكرتێری تایبەت

سەرۆكایەتیی قەڵەمی تایبەت ژمارە ٢٣٢٢٤٧

گەورەم! لە رێی وەكالەتی مەقامی پاپاوە لە ئەستەمبوڵ، كتێبە دەستنووسە جوانەكەتان "زولفەقار" گەیشتە دەستمان و پێشكەشی جەنابی پاپا كرا. ئەویش ئومێدی ئەوەی خواست كە پێخۆشحاڵیی خۆیتان پێ رابگەیەنین بەرامبەر بەم ئاورلێدانەوە میهرەبانانەی بەرێزتان، هاودەم لەگەڵ پارانەوەیدا لە خوای گەورە كە بەر لوتف و فەزڵی خۆیتان بخات. ئێمەش ئەم هەلە دەقۆزینەوە كە رێزی خۆمانتان پێشكەش بكەین.

ئیمزا

سەرۆكایەتیی سكرتارێتیی ڤاتیكان)[1].

❑ بۆ بەرێز سەرۆك كۆمار و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران لە ئەنقەرە!

(ئێمەی قوتابیانی نوور چەندین جۆری بێ وێنەی ئەشكەنجە و سووكایەتیمان بە درێژایی بیست ساڵی رەبەق هێنرایە رێ و، هەر ئێمەش بووین كە توانیمان لە بەرامبەریەوە ئارام و خۆراگری بنوێنین، هەتا خوای گەورە ئێوەی بۆ یارمەتیدانی ئێمە نارد.

دادگای تەمییز و دادگای دەنیزلی هەردووكیان شایەتن لەسەر ئەوەی كە سووكایەتی كردن بە ئێمە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی رەبەقدا، لەسەر هیچ بناغەیەكی یاسایی نەبووە. چونكە دوای وردبوونەوە و لێكۆڵینەوەی سێ دادگا لە سەد و سێ كتێب و هەزاران نامەدا، نەیانتوانی نە لە راستیدا و نە بە شێوەیەكی ئاسایی هیچ هۆیەك بۆ ئەم سووكایەتی و ئەشكەنجە و ئازارەی ماوەی بیست و پێنج ساڵی رابوردوومان بدۆزنەوە.

---

(١) پاشبەندەكان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٤٩٢/٢.

هەرچەندە من ماوەی سی ساڵە وازم لە سیاسەت هێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیرۆزبایی خۆم پێشکەش بە سەرۆك کۆمار و ئەنجومەنی وەزیران دەکەم کە سەرۆکایەتیی ئازادیخوازان و سەربەستانیان گرتە ئەستۆ. هاودەم لەگەڵ پیرۆزباییەکەشمدا ئەم ڕاستییەی خوارەوەیان بۆ دەدرکێنم:

ئەوانەی هێرشمان دەکەنە سەر و لە دادگاکاندا ئازارمان دەدەن، بیانوویان ئەوەبوو کە دەیانوت:

"لەوانەیە قوتابیانی نوور ئایین لە پێناوی چەند ئامانجێکی سیاسیدا بەکار بهێنن".

ئێمەش لە بەرگرییەکانماندا بەو ستەمکارانەمان وت و دەشڵێین و، پشتی ئەم وتنەشمان بە هەزاران بەڵگە دەگرین کە:

ئێمە "ئایین" ناکەین بە ئامرازی دەستی "سیاسەت" و، جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ ئامانجێکی ترمان نییە و، ڕێبازەکەمان وایە کە ئایین نەکەین بە داردەستی نە سیاسەت و نە دەسەڵات و نە هەموو دنیا بە گشتی.

دوژمنانیشمان دوای لێکۆڵینەوەی ڕق لە دڵانەی سێ ساڵیان لە سێ فەردەی پڕ لە کتێب و نامەدا، بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن ئەو تۆمەتەمان لەسەر بچەسپێنن. تەنانەت هیچ بروبیانوویەك بۆ ئەو فەرمانە هەڕەمەکییانە شك نابەن کە ئێمەیان پێ حوکم داوە. جا لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان لە دژمان نەدۆزییەوە، ئەوا "دادگای تەمییز" ئەو حوکمەی هەڵوەشاندەوە.

ئێمە هەرگیز ئایین ناکەین بە ئامرازێك بۆ سیاسەت، بەڵکو سیاسەت دەکەین بە ئامرازێك لە خزمەت و بەرژەوەندیی ئاییندا و، ئاشتی و تەبایی دەخەینە نێوانیانەوە. ئەمەش تەنها لە کاتێکدا کە ناچار دەبین بڕوانینە سیاسەت لە بەرامبەر ئەوانەوە کە لە پێناوی زیان گەیاندنی زۆر و لە ڕادە بەدەر بەم وڵاتە و بە خەڵکی ئەم نیشتمانە، سیاسەتی خۆسەپێن وەك داردەستی ئیلحاد بەکاردەهێنن.

کەواتە کارەکەمان پەیوەندی و پەیوەستێکی برایانە دەهێنێتە دی بۆ سێ سەد و پەنجا ملیۆن کەس لەگەڵ برایانیان لەم وڵاتەدا.

*پوختەی ئەم قسانە:*

لە بەرامبەر ئەوانەوە کە سیاسەتی خۆسەپێنیان کردووە بە ئامرازی دەستی ئیلحاد و ئازاریان داوین، ئێمە سیاسەتمان کردووە بە ئامرازێك بۆ خزمەت و تەبایی لەگەڵ ئاییندا. بەم کارەشمان بۆ بەختەوەریی ئەم وڵات و نەتەوەیە تێکۆشاوین)[1].

☐ ئامۆژگارییەك بۆ برا دیموکراتییەکان

کۆیلەکانی سەردەمی پێشوو، لەو ماسۆنییانەی کە لە دەمی دەسەڵاتی دیکتاتۆریەت و سەرۆکایەتیی تاکەکەسدا ئایین و ئیمان و گیانەکانیان بە هەدەر دا، تیژترین چەکی دەستیان کە لە دواهەناسەیاندا ئاراستەی دیموکراتییەکانی دەکەن، هەوڵدانیانە بۆ ئەوەی دیموکراتییەکان وا پیشان بدەن کە لەچاو حاڵی پێشوویان کەمتر دیندارن.

هەندێکیشیان کاڵای ئایین دەپۆشن و، پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاو دەکەنەوە کە دیموکراتییەکان ئەو بەڵێنانە نابەنەسەر کە بە گەلیان داوە سەبارەت بە ڕەهاکردنی ئازادییە ئایینییەکان.

چەند کەسێکی دیکەیان دیموکراتییەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن کە پارێزگاری لە "کۆنەپەرستیی ئایینی" دەکەن. تاکو بەم فێڵە ڕێی پشتگیریی ئایینیان لێ بگرن و، هانیان بدەن بۆ وێرانکردنی ئایین و دامودەزگا ئایینییەکان و، سەپاندنی "توندوتیژی" بەسەر ئاییندارandا.

ڕەفتاری توندی پارتی دیموکراتی لە دژی شیوعییەکان هەر لە سەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستیەوە و، ڕەهاکردنی بانگی محەممەدی بە شێوە شەرعییەکەی و، دەستکەوتنی خۆشەویستیی گەل بەم بۆنەیەوە و، بەدەستهێنانی هێزێکی بیست هێندەی هێزی خۆی.. هەموو ئەمانە، بە تەواوی پارتی گەلی کۆماریی نیگەران کردووە!

ئێمە متمانەمان بە دیموکراتییەکان هەیە کە ناکەونە ناو تەڵەوە، چونکە باش دەزانن کە ئەو بارودۆخەی ئەوانەی تر تێی کەوتن، تەنها بەهۆی سیاسەتی ستەمکارانەی سەردەمی پێشوو بوو کە لە دژی ئایینداران و کۆمەڵی نوور و ئەهلی قورئان پیادەیان دەکرد.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٤٧٤-٤٧٥.

دروشمی ڕاگەیەنراوی ڕژێمی پێشوو لای هەموان زانراوە. کەواتە دەبێ دیموکراتی‌یەکان سیاسەتێکی تەواو پێچەوانەی ئەو دروشمە بگرنەبەر، مادەم دەیانەوێ بمێننەوە.

ئەو سیاسەتەش بریتی‌یە لە تەنگ هەڵچنین بە شیووعییەت لە لایەکەوە و، پاراستنی ئایین و ئاییندارانیش لە لایەکی ترەوە.

پێویستی سەرشانیانە کە بە ئازایی و ڕوونی ئەم ڕێگایە بگرنەبەر. خۆ ئەگەر هەر نیشانەیەکی لاوازی یاخود کەمتەرخەمی‌یان لەم ڕووەوە لێ دەربکەوێت، دەیانخاتە ناو تەڵە و داوی پارتی گەلی کۆماری‌یەوە!

ئێمەی قوتابیانی نوور بە هیچ جۆرێك لە سیاسەتدا کار ناکەین. تاقە ئاواتمان دەستەبەرکردنی ئازادیی ئایینە لەم نیشتمانەدا و، لابردنی ئەو ستەم و گوشارانەیە کە ماوەی چارەکە سەدەیەکە لەسەر ئایین و ئاییندار‌ان و کۆمەڵی نوور دانراوە، کە ئەهلی قورئانن.

ئامۆژگاریی برایانی دیموکراتی دەکەین کە بە فرتوفێڵە شەیتانی و داوەکانی ڕژێمی پێشوو نەخەڵەتێن و، خۆیان لەو گومڕاییەوە نەگلێنن کە ئەوانە ڕۆشتبوونە ناوی و، بە وێنەی ئەوانیش گاڵتە بە گیان و ویستی گەل نەکەن، بەڵکو بە غیرەت و چاونەترسی‌یەوە لەسەر ئەو ڕێگا ڕاست و دروستە بەردەوام بن کە بەرامبەر هەر یەك لە "شیووعییەت" و "ئایین" گرتیانەبەر.

لە قوتابیانی نوور:
صادق، صونگور، زیاء[1]

❑ یەکەم سەردانی ئازادانەی مامۆستا بۆ ئەسکی شەهر

دوای ئەوەی کە مامۆستا نوورسی دوو ساڵی لە "ئەمیرداغ" بردەسەر، لە بەرواری (٢٩/١١/١٩٥١ز)دا ڕۆشت بۆ "ئەسکی شەهر" و نزیکی مانگ و نیوێك لە "ئوتێلی یەڵدز" مایەوە. لەو ماوەیەدا ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ قوتابیانی نارد:

(١) Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati.

## هەر تەنها حەقیقەتە کە دەدوێت

❑ (پەیامـەکانی نـوور چەسـپاندوویانە کـە لـە دووتوێـی "سـتەم"دا "دادگـەری" سەرهەڵدەدات!

واتە هەندێ جار مرۆڤێك دووچاری ستەم و ناحەقی و گیروگرفتێك دەبێت، یـان بێ هیچ تاوانێك بڕیاری بەندکردنی لەسەر دەردەکرێت و دەخرێتە بەندیخانـەوە. بێ گومـان ئەم چەشنە بڕیارە ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە. بـەڵام کـاتی وا هەیـە کـە هـەر ئـەم ستەمە دەبێـت بەهۆی دەرکـەوتن و سـەرهەڵدانی دادگـەری! چونکـە قـەدەری خـوای گـەورە هەندێ جار ستەمکار بەکار دەهێنێت بۆ ئاراستە کردنی سزایەك بەرامبەر بە کەسێك کە لەبەر هۆیەکی تر شایستەیی ئەو سزایەی بەدەست هێناوە!

ئەمەش یەکێکە لە جۆرەکانی دەرکەوتنی "دادگەری"ی خواوەند.

جا ئێستا من لەم ڕوانگەیەوە بیر دەکەمەوە لەوەی کە:

ئایا بۆچی بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ لە دادگایەکـەوە بـۆ دادگایـەکی تـر و لـە پارێزگایەکەوە بۆ پارێزگایەکی دیکە و لەم شارەوە بۆ شارێکی تـر دەبرێـم؟ چ تۆمـەتێکم ئاراسـتە کـراوە لـە لایـەن ئـەو کەسـانەوە کـە ڕازیـن بـەم جـۆرە سـزا و ئەشـکەنجە ستەمکارانەیە مامەڵـەم لەگـەڵدا بکـەن؟ ئایـا تۆمـەتی بـەکارهێنانی ئایینـە لـە پێنـاوی سیاسەتدا؟ ئەی ئایا بۆچـی نـاتوانن بیچەسپێنن؟ دیـارە لەبـەر ئـەوە نـاتوانن تۆمەتەکـەیان بچەسپێنن کە لە ڕاستی و واقیعدا شتێکی لەم جۆرە لە ئارادا نییە..

ئەوەتا دەبینیت دادگایەك چەندین ساڵ و مـانگ لـە هـەوڵی دۆزینـەوەی بەڵگەیـەکدا کات بەسەر دەبات کە منی پێ تاوانبار بکات، کەچی نـاتوانێت بەڵگەیـەکی لـەو جـۆرە بدۆزێتـەوە.. دوای ئەوە یەکسـەر دادگایەکی تـر بـە هـەمان تۆمـەت بـۆ لێکۆڵینـەوە و دادگایی کردن دەمبات و، ئەویش ماوەیەکی تـر لـەم هەوڵـەدا و بـۆ گوشارخستنە سـەرم کات بەسەر دەبات و، چەندین جۆری ئازار و ئەشـکەنجەم دەهێنێتـە ڕێ. ئیـتر کاتـێ کـە ناگاتە هیچ ئەنجامێك بۆ تۆمەتبارکردنم، وازم لـێ دەهێنێت.. بەڵام دوای ئەو دادگایەکی تری سێهەم بە هەمان تۆمەت یەخەم پێ دەگرێتەوە!

بیست و هەشت سالی تەمەنم - بەم جۆرە - لە گرفتێکەوە بۆ یەکێکی تر و، لە کێشەیەکەوە بۆ کێشەیەکی دی بەسەر بردووە. تا لە کۆتاییدا دڵنیا بوون لەوەی کە هیچ ڕاستییەك لەو چەشنە تۆمەتانەدا نییە و هەموویان بە ناحەق دراونەتە پاڵم.

من سەبارەت بە خۆمەوە بە دڵنیاییەوە دەزانم کە هیچ پەیوەندییەکم بەم تۆمەتەوە نییە، کە چ بە ئەنقەست و چ بەهۆی وەهم و دوودڵییەوە دراوەتە پاڵم.

هەروەك هەموو کەسانی خاوەن ویژدانیش دەزانن کە من لەو جۆرە پیاوانە نیم ئایین بۆ هیچ ئامانجێکی سیاسی بقۆزمەوە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە تۆمەتەکەیان ئاراستە کردووم، لە ناخی دەروونی خۆیاندا، ئەم ڕاستییە دەزانن!

جا من دەپرسم:

کەواتە ئایا هۆی سووربوونیان چییە لەسەر ئەم ستەمەی کە دەرحەق بە من دەیکەن؟ بۆچی لەگەڵ ئەوەشدا کە من لەم مەسەلەیەدا بێ تاوانم کەچی هەر دووچاری ئەم ستەم و ئازارە بەردەوامە دەکرێم؟ بۆچی نەمتوانی لەم موسیبەتانە ڕزگارم ببێت؟ ئایا ئەم حاڵەتانە پێچەوانەی دادگەریی خواوەند نین؟

بە درێژایی چارەکە سەدەیەك بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەگەڕام و، ئەم گەڕانەشم بێ ئاکام مایەوە..

بەڵام وا ئێستا هۆکاری ڕاستەقینەی ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە بۆچی ستەمم لێ دەکەن و ئازارم دەدەن! بۆیە - بە داخەوە - دەڵێم:

گوناهەکەم لەوەدایە کە خزمەتە قورئانییەکانم دەکەم بە هۆکارێك بۆ بەرزبوونەوەی مەعنەوی و "کەماڵاتی ڕۆحی"م..

وا ئێستا بە تەواوی هەست بەمە دەکەم و لێی تێدەگەم!

بۆیە هەزاران جار شوکر و سوپاسم پێشکەش بە خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی کە لە ماوەی ئەم ساڵە دوور و درێژانەدا چەندین ڕێگری بەهێزی مەعنەویی لە دەرەوەی ویستی خۆمدا هێنایە ڕێم، تاکو خزمەتگوزارییە ئیمانییەکانم نەکەم بە هۆیەك بۆ بەرزبوونەوەی ماددی و مەعنەوی، یان بۆ ڕزگاربوون لە ئازار و ئاگری دۆزەخ، تەنانەت بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەییم یان لە پێناوی هیچ ئامانجێکی تردا.

ئەم هەستە قووڵانەی ناخی خۆم و ئەم ختووره و ئەندێشە ئیلهامی‌یانە، منیان دووچاری حەپەسان کرد. چونکە لە کاتێکدا هەموو کەسێك مافی بەدەستهێنانی ئەو پلەوپایانەی هەیە کە حەز دەکات پێیان بگات و، بواری دراوەتێ لە ڕێی کردەوە چاکەکانەوە بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، جگە لەوەش کە ئەم کارانە هیچ زیانێکیان بۆ کەس تێدا نی‌یە..

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بینیم "گیان" و "دڵ"م لەم چەشنە حاڵەتانە و لە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە قەدەغە دەکرێن و، ئەوەم لەبەر چاودا دانراوە کە هاودەم لەگەڵ بەدەستهێنانی "ڕەزامەندیی خواوەند"دا، جگە لە "خزمەتی ئیمان" بایەخ بە هیچ شتێکی تر نەدەم!

چونکە لەم زەمان و ڕۆژگارەی ئێستادا سەبارەت بەو کەسانەی کە لە ڕێی سروشتی بەندایەتیی ناو ناخی خۆیانەوە نەگەیشتوون بەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە لە سەرووی هەموو شتێکەوەن و، ئەو کەسانەش کە پێویستیان بە تێگەیشتنی ئەم ڕاستی‌یانە هەیە بە شێوەیەکی کاریگەر، وتنەوەی جۆرە دەرسێکی قورئانیی ئەوتۆ کە لە خزمەتی هیچ ئامانجێکی تردا نەبێت، کارێکی گەلێ پێویستە. بە جۆرێك کە لەم چەشنە دنیایەدا، کە هەموو شتێکی تێدا تێکەڵ و ئاڵۆز بووە، ئەو دەرسە قورئانی‌یە بتوانێت ئیمانی خەڵکی ڕزگار بکات و، قەناعەت بە سەرسەختانیش ببەخشێت و، دڵنیایی لە دەروونیاندا بووژێنێتەوە..

بەمەش ئەو دەرسە دەتوانێت پشتی کوفری موتڵەق و گومڕایی سەرسەخت و ملنەدەر بشکێنێت و، قەناعەتی تەواوەتی بە هەموان ببەخشێت.

خۆ لەم بارودۆخانەی ئێستادا هەرگیز ئەم چەشنە قەناعەتە پەیدا نابێت، مەگەر لە کاتێکدا کە هەوڵ بدرێت "ئایین" نەکرێت بە هۆیەك بۆ هیچ ئامانجێکی ماددی یان مەعنەوی، ئیتر ئەو ئامانجە: کەسی، یان دنیایی، یان قیامەتی بێت!

خۆ ئەگەر ئەمە نەیەتەدی، ئەوا لە بەرامبەر ئەو تەوژمە ترسناکەی کە لە لایەن کۆمەڵە و ڕێکخراوە نهێنی‌یەکانەوە سەرهەڵدەدەن، هەموو کەسێك - لە هەر پلەوپایەیەکی مەعنەویشدا بێت - هەر دەستەوسان دەمێنێت و، ناتوانێت هەموو گومانەکان قەڵاچۆ بکات..

چونکە لەو چەشنە کاتەدا دەروونی بەدخوازی ئەو کەسەی کە حەز دەکات بێتە ناو بازنەی ئیمانەوە بە خۆی دەڵێت:

"ئەو مرۆڤەی کە باسی ئاییمان بۆ دەکات، بە هۆی زیرەکی و ئاستی بەرزی خۆیەوە لە بەرچاودا دەیرازێنێتەوە و دەتوانێت قەناعەتمان پێ بکات".

ئەمە دەڵێت و، ئیتر شوبهە و گومانەکانی هەر لە دڵدا دەمێننەوە!

دەسا هەزاران هەزار جار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە کە ماوەی بیست و هەشت ساڵ و، لە دووتوێی تۆمەتی "بەکارهێنانی ئایین لە پێناوی سیاسەت"دا، قەدەری سەرتاپا دادگەری خواوەند - بە بێ ویست و پێزانینی خۆم - نەیهێشت ئایین بکەم بە ئامرازێك بۆ هیچ ئامانجێکی کەسی و تایبەتیی خۆم و، دەستە ستەمکارەکانی مرۆڤی بۆ زللە لێدانم و وریایی و بێدارکردنەوەم بەکار هێنا، کە چەند زللەیەکی سەرتاپا دادگەری بوون و هەڕەشەیان لێ کردم کە: هەرگیز "ڕاستییەکانی ئیمان" نەکەیت بە ئامرازێك بۆ کەس و خودی خۆت. تاکو ئەو کەسانەی پێویستیان بە ڕاستییەکانە تێبگەن و بزانن کە هەر تەنها حەقیقەت و ڕاستییەکانن لە پەیامەکاندا دەدوێن و قسە دەکەن، نەك شتی تر. هەروەها بۆ ئەوەی هیچ وەهم و گومانێکی نەفس و فڕوفێڵێکی شەیتان لە گۆڕێدا نەمێنێت و هەموویان بێ دەنگ بین!

ئەمەیە نهێنیی کاریگەریی پەیامەکانی نوور لە وروژاندنی حەماسەتی ناو "دڵ" و "گیانەکان"دا بە وێنەی شەپۆلی دەریا فراوانەکان.

بەڵێ، نهێنیی ئەو کاریگەرییە هەر تەنها ئەمەیە و هیچی تر نییە! ئەوەتا هەرچەند هەزاران زانا هەن کە ئەو ڕاستییانەی پەیامەکانی نووریان لە سەدان هەزار کتێبدا تۆمار کردووە کە زۆر زیاتر لە پەیامەکانی نوور ڕەوانبێژییان تێدایە، کەچی نەیانتوانی بەربەستی ئەو کوفرە ئاشکرایە بکەن و لە شوێنی خۆیدا ڕایبگرن!

جا لە کاتێکدا کە پەیامەکانی نوور لە ژێر سایەی ئەم بارودۆخە سەختانەدا و تا ڕادەیەك توانیبێتیان ڕووبەڕووی ئەم کوفرە ئاشکرایە ببنەوە، ئەوا نهێنیی سەرکەوتنیان لەوەدایە کە باسمان کرد. واتە نە "سەعید" و نە توانا و لێهاتنی سەعید بۆ ئەم کارە لە گۆڕێدا نییە، بەڵکو هەر تەنها "حەقیقەت"ە لە بارەی خۆیەوە دەدوێت..

بەڵێ، تەنها حەقیقەتی ئیمانە کەوتووەتە گوفتار!

جا مادەم "پەیامەکانی نوور" کاریگەرییان لەو جۆرە دڵانەدا هەیە کە تینووی "ئیمان" و "نووری حەقیقەتەکان"ن، ئەوا نەك هەر تەنها یەك "سەعید" بەڵکو هەزار و یەك سەعیدیش لەو پێناوەدا بەخت دەکرێت و.. هەرچی ئەشکەنجە و ئازاریشم لە ماوەی ئەم بیست و هەشت ساڵەدا تووش بووە، گەردنیان ئازاد بێت و.. ئەو کەسانەش ستەمیان لێ کردم و لەم شارەوە بۆ ئەو شار دەیانگواستمەوە و، ئەوانەش کە دەیانویست جۆرەها تۆمەتم بدەنە پاڵ و، چەندین جۆری سووکایەتییان هێنایە رێم و، زیندانی تاکەکەسییان بۆ ئامادە دەکردم.. وا لە هەموویان خۆش بووم و، وازم لە هەموو مافێکی خۆم هێنا لە ئەستۆیاندا!!

بە "قەدەری دادگەر"یش دەڵێم:

من شایانی زللە دادگەرەکانت بووم.. چونکە منیش وەکو خەڵکی رێگایەکم گرتەبەر کە خۆی لە خۆیدا رەوایە و هیچ زیانێکی تێدا نییە و، لەم رێیەدا بیرم لە خودی خۆم کردەوە. خۆ ئەگەر لە دەمی ئەنجامدانی خزمەتگوزارییەکانم لە پێناوی پاراستنی ئیماندا، هەست و نەستەکانی خۆمم سەبارەت بە رێژنە و بەرەکەتە ماددی و مەعنەوییەکانەوە بەخت نەکردایە، ئەوا ئەم هێزە مەعنەوییە گەورەیەم لە دەست دەدا. بۆیە هەموو شتێکم بەخت کرد و هەموو ئازارێکیشم هەڵگرت..

هەر ئەمەش بوو بە هۆکاری ئەوەی کە راستییەکانی ئیمان لە هەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەوە و، سەدان هەزار تەنانەت لەوانەیە ملیۆنەها قوتابی لە قوتابخانەی نووردا پێگەیشتن و لە سەرچاوەی زانستەکانی نووریان هەڵگۆزی و، هەر ئەوانیشن کە لەم رێگەی خزمەتی ئیمانەدا هەر بەردەوام دەبن و، لە بەختکردنی هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا لەم رێگەیەی من لانادەن، چونکە هەوڵ و کۆششیان تەنها بۆ "خوای گەورە" دەبێت، نەك بۆ هیچ شتێکی تر.

گەلێ کەس لە قوتابیانم دووچاری چەندین جۆری بەڵا و موسیبەت بوون و، گرفتاری چەندەها سەختی و ئازار و ئەشکەنجە کران و، بە فەزڵی خوای گەورەش چەندین تاقیکردنەوەی سەختیان بڕی..

من داوایان لێ دەکەم کە ئەوانیش بە وێنەی من چاوپۆشی لەو کەسانە بکەن کە ئەو ستەمانەیان لێ کردوون و مافیان خواردوون، چونکە ئەو ستەمکارانە لە نەزانیی

خۆیاندا ئەو ڕەفتارانەیان نواندووە و، ئەوانەش کە ئازار و ئەشکەنجەیان داین، بێ ئەوەی پەی بە درەوشانەوەی نهێنی‌یەکانی "قەدەری خواوەند" بەن، یارمەتیی بڵاوبوونەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمانیان داوە.. ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بەو جۆرە کەسانە ئەوەیە کە ئومێدەواری هیدایەتدانیان بین.

وەسیەتم بۆ قوتابیانم ئەوەیە کە:

هیچ کامیان بە ئەندازەی تەنانەت گەردیلەیەکیش گیانی تۆڵەسەندنەوە لە دڵی خۆیدا هەڵنەگرێت و، بە گەرموگوڕی و لێبڕانەوە بۆ بڵاوبوونەوەی "پەیامەکانی نوور" تێبکۆشن و، پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵ و پتەو بەو پەیامانەوە ببەستن!

من زۆر نەخۆشم، توانای نووسین و قسەکردنم نەماوە. لەوانەیە ئەمە دواهەمین قسەم بێت. دەسا با قوتابیانی نووری "قوتابخانەی زەهراء" ئەم وەسیەتەی منیان لە بیر نەچێت)[1]!

## ساڵی (١٩٥٢ز)[2]

☐ کێشەی "ڕابەری لاوان"[3]

دوای مانەوەی لە شاری ئەسکی شەهر، مامۆستا بەدیعوززەمان لە کۆتایی ساڵی (١٩٥١ز)دا ڕۆشت بۆ شاری ئیسپارتە و، حەفتا ڕۆژ لەوێ مایەوە.

لەو ماوەیەدا بە قوتابی‌یەکانی خۆی شاد بووەوە و، یادی ساڵەکانی دوورخستنەوەی بۆ ئەوێ، کردەوە.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٥٢٤-٥٢٩.

(٢) لێرەوە هەتا کۆتایی ئەم نەسڵە لەم سەرچاوەیەوە هێنراوە: Tarihce-i Hayat, Isparta Hayati

(٣) وێڕای ئەو گۆڕانەی لە دەسەڵاتدا ڕووی دا، کەچی هەمان جۆر بیرکردنەوەی "پارتی گەلی کۆماری" بەسەر زۆرینەی کاربەدەستاندا زاڵ بوو. لەبەر ئەوە، داواکاری گشتی لە یەك بە یەکی شارەکانی ئەمیرداغ و ئەستەمبووڵ و سامسۆن، چەندین داوای یاساییان لەسەر مامۆستا نوورسی کردەوە و، گەلێ جاریش ماڵەکەی ڕووبەڕووی پشکنین بووەوە و، خۆی و میوانەکانی و ئەوانەش کە سەردانیان دەکرد بانگ دەکران بۆ بنکەی پۆلیس و، چەندین پڕوپاگەندەی ڕق لە دڵانەی لە دژ بڵاوکرایەوە. هەموو ئەمانەش بۆ ئەوە ئەنجام دەدرا کە سێبەرێکی ئەوتۆ بهاوێتە سەر ماوەی دەسەڵاتی دیموکراتی‌یەکان کە گوایا لایەنگری ئایینداران نین. بەرامبەر بەمانەش، مامۆستا نوورسی و قوتابیانی چەندین سکاڵانامەی نارەزاییان بۆ هەریەك لە سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران نووسی، تاکو هەڵوێستی خۆیان دەربڕن. هەروەك چەندین چاوپێکەوتن لەم بارەیەوە ڕێك خرا لەگەڵ چەند پەرلەمانتارێك و سەرۆکی کاروباری ئایینیدا.

لەو ڕۆژانەدا هەندێ لە قوتابیانی نووری زانکۆ لە ئەستەمبووڵ پەیامی "ڕابەری لاوان"یان[1] بە پیتە تازەکان چاپ کردبوو، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی داوایەکی یاسایی لەسەر تۆمار بکرێت بە بیانووی دژایەتی کردنی ماددەی "١٦٣"ی دەستووری تورکیا، کە ماددەیەکە هەر چالاکییەك قەدەغە دەکات کە بیەوێت دەسەڵات لەسەر بناغە ئایینییەکان دابمەزرێنێت.

بۆ ئەو مەبەستە، مامۆستا بەدیعوززەمان بانگ کرا بۆ ئەستەمبووڵ، تاکو ڕۆژی ١٩٥٢/١/٢٢ز لە بەردەم دادگای گەورەی سزا ئامادە بێت بۆ تاووتوێ کردنی ئەو داوایە.

ئەوەبوو بەدیعوززەمان لە بەرواری ١٩٥٢/١/١٥زدا بەرەو ئەستەمبووڵ کەوتە ڕێ. ئەمەش یەکەم سەردانی ئەستەمبوولی بوو دوای لێکدابڕانێك کە بیست و حەوت ساڵی خایاند! ئیتر دۆستانی ئەویی بە نیازی سەرلێدانی، لە ئوتێلی "ئاق شەهر" پاشان لە ئوتێلی "ڕەشادییە" داباریین بەسەریدا.

لە ڕۆژی ١٩٥٢/١/٢٢زدا دادگا دەستی بە کارەکانی کرد و، مامۆستا بەرەو دادگا هات کە سەدان قوتابیی نوور دەورەیان دابوو!

هۆڵی دادگا لە جەماوەری گەل پڕ بووبوو، لەوانەی کە بۆ بەدواداچوونی ئەم کێشەیە و بینینی ئەم زانا مەزنە هاتبوون کە ماوەی ئەم ساڵانەی ڕابوردوو سەرانسەری تورکیای سەرقاڵ کردبوو. هەروەك ڕێڕەوەکانی دادگا پڕبووبوون لە ئامادەبووان و، ئاپۆرەی جەماوەر هەتا ناو شەقامەکەشی گرتبووەوە.

مامۆستا لە شوێنی تایبەت بە تۆمەتباران دانیشت.

داواکاری گشتی ڕاپۆرتی ئەو خەبیرانەی خوێندەوە کە ئەرکی لێ وردبوونەوەی پەیامی "ڕابەری لاوان"یان خرابووە ئەستۆ. پاشان پرسیار ئاراستەی مامۆستا نوورسی کرا.

ڕاپۆرتی خەبیرەکان بە کورتی بریتی بوو لەوەی کە:

---

(١) ئەم پەیامە چەند هەڵبژاردەیەکی لە "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" لەخۆ گرتووە، کە بایەخ بە ژیانی هەردوو دنیای لاوان دەدات و، یەکەم جار بووە لە دوای بیست و حەوت ساڵ، کتێبێکی ئیسلامی لەو ڕووبەرە فراوانەدا بڵاوبیێتەوە.

"دانەر لەم پەیامەیدا دەیەوێت بیروباوەڕی ئایینی بڵاوبکاتەوە و، لە ڕێی ئەم بیر و هزرانەیەوە هەوڵ دەدات ڕێیەکی دیاریکراو بۆ لاوان دابڕێژێت و، بانگهێشتی ئافرەتانیش دەکات بۆ پۆشتەیی و نەگەڕانیان بە پۆشاکێکەوە کە جەستەیان دەربخات، چونکە ئەو کارە دژی فیترەت و پێچەوانەی ئیسلام و داب و ڕەوشتی قورئانە.

هەروەك دانەر بانگەشە بۆ وتنەوەی وانەی ئایین دەکات. بەمەش پشتگیری لە دامەزراندنی سیستەمی دەوڵەت دەکات لەسەر چەند بناغەیەکی ئایینی و.. هتد".

دوای خوێندنەوەی دەقی تۆمەتبارکردنەکە، مامۆستا بەدیعوززەمان هەستایە سەرپێ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو شتانەی کە لە سەرەوە باس کران.

❑ بەرگری لەخۆکردنی مامۆستا نوورسی

"تکا دەکەم گوێ بیستی پوختەیەکی بەسەرهاتی ژیانم بن، کە لە چەندین ستەم و ڕووداوی گەورەدا بەسەرچووە".

دادگا ڕێی بە مامۆستا نوورسی دا کە بە ئازادی بەرگری لە خۆی بکات.

ئەویش بەرگرییەکی گشتگیر و فراوانی لە خۆی کرد و، وتی:

"ئەی دادوەرە بەڕێزەکان! ماوەی بیست و هەشت ساڵە دووچاری هێندە سووکایەتی و ئازاردان و چاودێری و بەندکردن کراوم کە لە ژمارە نایەن. هەموو تۆمەت و بوختانەکان لە بناغەدا پشت بە چەند خاڵێك دەبەستن:

١ - یەکەم تۆمەت ئەوەیە کە من دوژمنی ئەم دەسەڵاتەی ئێستام!

ئاشکرایە کە هەموو حکوومەتێك چەندین نەیاری هەیە. خۆ مادەم مرۆڤ خۆی لە قەرەی ئاسایش و سیستەمی وڵات نەدات، هەرگیز بەرپرس نابێت لەو بیر و ڕێبازەی کە لە دڵ و ویژدانی خۆیدا پەسەندی کردووە. ئەمەش بنەمایەکی زانراوە لە یاسا و مافەکاندا.

بۆ نموونە دادگاکانی بەریتانیا ماوەی سەد ساڵە و تا ئێستا ئەو سەد ملیۆن موسڵمانەی دادگایی نەکردووە کە لە سایەی حکوومەتی خۆسەپێنی خاوەن دەمارگیری ئایینیی ئەودا دەژین، هەرچەندەش دەسەڵاتی کافرانەی ئینگلیزیان پێ قبووڵ نییە.

لە لای خۆشمان سەرجەم حکوومەتە ئیسلامی‌یەکان هیچ کات یاساکانیان لە دژی ئەو جوولەکە و دیانانە ڕانەوەستاوە کە لە دێر زەمانەوە لە سایەی دەوڵەتەکانی ئیسلامدا ژیاون، هەرچەندەش ئەوانە دژ و نەیاری ئایینی دەوڵەت و ئەو سیستەمە بڵندە بوون کە لە سایەیدا ژیاون.

ئیمامی عومەر - خوا لێی ڕازی بێت - لە کاتی خەلافەتەکەیدا لەگەڵ کەسێکی گاور لە گشتینەی خەڵك پێکەوە لە یەك دادگادا داوەری کران. دیارە تۆمەتبار نەکردنی ئەو کەسە دیانە بەوەی کە دژی حکوومەتی ئیسلام و ئایین و یاساکانیەتی، بە ئاشکرا دەری دەخات کە "دامەزراوەی داد" هیچ تەوژمێك ڕاینامالێت و، لایەنگری هیچ دەمارگیری‌یەك نی‌یە.

ئەمەش ستوونێکی بنچینەییە لە ئازادیی ئایین و ویژداندا و، پەنجەرەیەکە سەرجەم دامەزراوەکانی داد لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای جیهاندا لێیەوە دەڕوانن، جگە لە هی شیووعیەکان.

منیش لە لایەنی خۆمەوە، بە متمانە بوونم بەم ستوونە بنچینەییەی ئازادیی ئایین و ویژدان و، بە پشت بەستن بە سەدان ئایەتی قورئانی پیرۆز، ڕەخنە لەو بەشە بێ کەڵك و گەنیوەی شارستانێتی و، خۆسەپاندنی ڕەهای ژێر پەردەی ئازادی و، ئەو ستەمە توندوتیژە دەگرم کە لە ژێر دەمامکی عەلمانیەتدا ئاراستەی ئایین و ئاییندارا ن کراوە.

ئایا من بەم کارەم لە بازنەی یاساکان دەرچووم؟ یاخود بە حەق و ڕاستی بەرگریم لە دەستوور کردووە؟

لە هیچ حکوومەتێکی دنیادا ڕەخنە گرتن لە پێشێل کردنی مافەکان و لە ستەم و سووکایەتی کردن بە یاسا، هەرگیز بە تاوان دانانرێت. بەڵکو ئەم نەیاری کردنە بۆ ئەو دیاردانە کارێکی ڕەوایە و توخمێکی ڕاستە لە هاوسەنگیی دادپەروەریدا.

٢ - دووهەم تۆمەت کە لە لایەن ئەو دەسەڵاتەی پێشوو ئاراستەم دەکرا، کە ستەم لێ کردن و ئازاردانی منی بەلاوە ئاسایی بوو، بریتی‌یە لە تۆمەتی تێکدانی ئاسایش و سیستەمی وڵات.

بە درێژایی بیست و هەشت ساڵ بەم گومانە درۆ و تۆمەتە دەست هەڵبەستە سزا دراوم و، لە دادگایەکەوە بۆ دادگایەکی دیکە و لە دوورخستنەوەیەکەوە بۆ

دوورخستنەوەیەکی تر و لە بەندیخانەیەکەوە بۆ بەندیخانەیەکی دی ڕەوانە دەکرام. تەنانەت ڕێی چاوپێکەوتنی خەڵکیان لێ گرتم و، دایان بڕیم لە جیهان و، ژەهریان دەرخوارد دام و، چەندین جۆر سووکایەتی‌یان پێ کردم.

ئێمەی قوتابیانی نوور کە ژمارەمان پێنج سەد هەزارە، چەند پارێزگارێکی مەعنەوی و خۆبەخشی ئاسایش و سیستەمی ئەم وڵاتەین. کەواتە تۆمەتبارکردنمان بەم درۆیە، گوناه و تاوانێکی یەکجار گەورەیە.

ئێمە گەلێ سووکایەتیی ستەمکارانەمان چەشت، بەڵام نەمانهێشت هەست و سۆزمان بەسەرماندا زاڵ ببێت، تەنانەت یەك چرکەش دەستبەرداری کارکردن نەبووین لە بنیاتنانی ڕێسا و ئاسایش لە دڵەکاندا و، لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا و، ڕزگار کردنی ئەوانەی کە لە ئەنجامی بێ ئاگاییدا کەوتوونەتە ناو قوڕ و زۆنگاوی ئاژاوەگێڕی‌یەوە.

ئەی دادوەرە بەڕێزەکان!

بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەم قسانەم داوایەکی بێ بەڵگە نین. چونکە ئەو شەش پارێزگایەی کە گۆڕەپانی ستەم لێ کردنی ئێمە و دوورخستنەوەمان بوون، لەگەڵ شەش دادگای ئەو پارێزگایانەدا، لە دوای لێکۆڵینەوەی ورد و دوور و درێژ، تەنانەت یەك دانە ڕووداویان نەبینی کە لە لایەن ئێمەوە ئاسایش و ڕێسای تێکدابێت. ئەم ڕەفتارەشمان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قوتابیانی قوتابخانەی عیرفان، قوتابخانەی نوور، کار لەناو دڵەکاندا دەکەن، چونکە لە ناخی ژیری و دڵەکاندا پاسەوانی ڕێسا و ئاسایش دادەنێن و، وانە ئیمانی‌یەکانمان تەنها لە دژی ئاژاوە و پشێوی و کاولکاری و ماسۆنیەت و شیوعیەتە.

فەرموون پرسیار لە سەرجەم فەرمانگەکانی ئاسایشی دەوڵەت بکەن کە ئایا تەنها یەك ڕووداو لە لایەن یەك قوتابیی قوتابخانەی عیرفان و نوورەوە، کە ژمارەیان پێنج سەد هەزار کەسە، ڕووی داوە دژی ڕێسا و ئاسایش بووبێت؟ نەخێر..

ئاشکرایە وەڵامی ئەو پرسیارە نەبوونی ڕووداوێکی لەو جۆرەیە. چونکە لە دڵی هەموویاندا بەهێزترین پاسەوانی ئاسایش و ڕاگرتنی ئارامی هەیە کە پاسەوانی "ئیمان"ە.

لە وتارێکمدا بە ناونیشانی "هەر تەنها حەقیقەتە کە دەدوێت" و لە ژمارە "١١٦"ی گۆڤاری "سبیل الرشاد"دا بڵاوکراوەتەوە، ئەم ڕاستی‌یانەم بە دووروودرێژی ڕوون کردووەتەوە.

کەسێك لە پێناوی ئایینەکەیدا هەموو دنیای خۆی، بگرە ژیانیشی گەر پێویست بکات، تەنانەت ژیانی قیامەتیشی بەخت کردبێت، کە هەموو بەسەرهاتی ژیانی شایەتی ئەوەیە.. هەروەها سی و پێنج ساڵە وازی لە سیاسەت هێناوە و، دادگاییە زۆر و زەبەندەکان، لەگەڵ پشکنینی وردا، بەڵگەیەکیان لە دژی نەدۆزیوەتەوە و، تەمەنیشی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیوە و گەیشتووەتە دەرگای گۆڕ و، لە کەرەستەی دنیادا خاوەنی هیچ شتێك نەبووە و هیچ بایەخێکیشی پێ نەداوە..

ئایا بەم کەسە دەوترێت: ئایین دەکاتە هۆکارێك بۆ سیاسەت؟

خۆ ئەگەر کەسێك شتی وای لە زار دەربچێت، ئەوا هەر لە زەوی‌یەوە تا ئاسمان و لە ئاسمانیشەوە بۆ زەوی سنووری حەق و ویژدانی بەزاندووە!

ئێمەی قوتابیانی قوتابخانەی عیرفان و نوور، وانەیەکی حەقیقەت لە قورئانی حەکیمەوە فێربووین، کە بریتی‌یە لەوەی:

دادگەریی قورئان ڕێ لە سووتاندنی خانوویەك، یان کەشتی‌یەك دەگرێت کە دە کەسی تاوانبار و یەك دانە بێ تاوانی تێدا بێت، تاکو زیان بە مافی بێ تاوانەکە نەگات.

ئیتر چۆن خانوویەك، یان کەشتی‌یەك دەسووتێنرێت کە دە کەسی بێ تاوان و یەك دانە تاوانباری تێدا بێت بەهۆی ئەو تاوانبارەوە؟ ئایا ئەو سووتاندنە ستەمێکی مەزن و خیانەتێکی گەورە نی‌یە؟!

دادپەروەریی خوایی و حەقیقەتی قورئان بە توندی ڕێ لەوە دەگرن کە نەوەد کەسی بێ تاوان بەهۆی لە سەدا دە کەسی تاوانبارەوە دووچاری تیاچوون و زیان لێدان بکرێن.

ئێمە لە ڕووی ئایینەوە و، بە مەبەستی جێبەجێ کردنی ئەم وانەیەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە وەرمان گرتووە، پابەندین بە پاراستنی ڕێسا و ئاسایشی وڵاتەوە.

دوژمنە پەنهانەکانمان، کە لە دەسەڵاتی پێشوودا ئێمەیان بەم چەشنە قسەڵۆکانە تۆمەتبار دەکرد، سیاسەتیان کردبوو بە ئامرازێك لە خزمەتی ئیلحاد و بێ ئایینیدا.

هەروەك بە خۆیان زانیبێت یان نا، تێدەكۆشان كـە پـوازی بیروبـاوەڕە چەپەڵـەكان بـەناو زەویی نیشتماندا دابكوتن. بە ئاشكرا دیارە كە ئەوانەی ڕێسا و ئاسوودەیی دەشێوێنن و، تێكدەرانی ماددی و مەعنەویی ئاسایش و ئارامیی وڵاتن، ئەوانن نەك ئێمە.

موسڵمانی ڕاستەقینە و ئیمـانداری ڕاسـت و دروسـت هـەرگیز پشـتی ئـاژاوە و وێرانكـاری نـاگرێت. ئـاییـنیش بە تونـدی ڕێ لـە ئاشـووب و ئـاژاوە دەگرێت، چونكـە "ئاژاوەگێڕی" دان بە هیچ مافێكدا نانێت و، ڕەفتارە مرۆییەكان و ئاسەواری شارستانی هەڵدەگێڕێتەوە و دەیكات بە ڕەوشت و خووی ئاژەڵی دڕندە.

لـە قورئـانی پـیرۆزدا ئاماژەیـەكی نیـان هەیـە كـە ئـەوە كـرداری سـوپای یـەئجووج و مەئجووجە لە ئاخر زەماندا!

دەسا ئەی دادوەرە بەڕێزەكان! مـاوەی بیسـت و هەشـت سـاڵە، بـەم جـۆرە، ئـازار و ستەمیان دەرخـواردی خـۆم و قوتابیـانم دا و، داواكـارە گشـتییەكانیش لـە دادگاكـاندا هەموو توانایەكی خۆیان خستەكار بۆ سووكایەتی پێكردنمان. ئێمەش لە هەموو ئەوانـەدا خۆڕاگریمـان نوانـد و، بـە ڕێـی خزمـەتی ئیمـان و قورئـاندا ڕۆشـتین و، لـە سـتەم و ئازاردانەكانی پیاوانی دەسەڵاتی پێشوو خۆش بووین، چونكـە بـە سزای شایانی خۆیـان گەیشتن و، ئێمەش ماف و ئازادیی خۆمان بەدەست هێنا!

ئێستاش سوپاسی فەزڵ و چاكەی خوای گەورە دەكەین كە نیعمەتی قسـەكردنی پێ بەخشیین لە بەردەم چەند دادوەرێكی ئیماندار و دادپەروەردا. (هذا من فضل ربی)".

بەمـەش یەكـەم دانیشـتنی دادگـا كۆتـایی پێ هـات و، بڕیـار درا لـە "١٩"ی شـوباتدا دەست پێ بكاتەوە.

بۆ دانیشتنی دووهەم لە كاتی دیاریكراودا، ئەو حەشاماتەی كە دەیانویست ئامادە بن هێنـدە زۆر بـوو لـە توانـای پۆلیسـدا نـەبوو كۆنتڕۆڵی بكـات. لـەم كـەش و هـەوای جەنجاڵی و پاڵپاڵێنەدا، ڕاپی كردنی دادگاییەكە لە توانادا نەبوو.

بۆیە سەرۆكی دادگا ڕووی لە ئامادەبووان كرد و پێی وتن:

"ئەگەر مامۆستاتان خۆش دەوێت، بوارمان بدەن تاكو لە بەڕێ كردنی دادگاییەكەدا بەردەوام بین".

لە ئەنجامی ئەم داواکاری‌یە، جەماوەرەکە کشانە دواوە و دادگاییەکەش دەستی پێ کرد.

ئەوەبوو دادگا خاوەنی ئەو چاپخانەیەی بانگ کرد کە پەیامەکەی چاپ کردبوو. هەروەك گوێی لە شایەتیی پۆلیسیش ڕاگرت.

پاشان بەدیعوززەمان هەستا و ڕەخنەی خۆی لە ڕاپۆرتی خەبیرەکان پێشکەش کرد.

کە وەختی نوێژی عەسریش هات، داوای کرد ڕێی پێ بدەن نوێژەکەی بکات.

لە لایەن دادگاوە داواکاری‌یەکەی وەرگیرا، چونکە سەرۆکی دادگا کۆتایی هاتنی دانیشتنی دووهەمی ڕاگەیاند.

لە دانیشتنی سێ‌هەمدا کە لە بەرواری ١٩٥٢/٣/٥زدا گیرا، حکومەت لە ڕووی ئەمنی‌یەوە ڕێ و شوێنی توندوتۆڵی گرتەبەر و، سەدان پۆلیسی لە بەردەم دادگا و ناوەوەیدا بڵاو کردەوە. بەمەش توانیی کۆنتڕۆڵی ئەو هەزاران خۆشەویست و قوتابیانەی مامۆستا بەدیعوززەمان بکات.

لە سەرەتادا دادگا گوێی لە شایەتیی ئەو قوتابی‌یەی زانکۆ ڕاگرت کە پەیامەکەی چاپ کردبوو. پاشان پارێزەرەکانی بەدیعوززەمان بەرگری‌یەکانی خۆیان پێشکەشی دادگا کرد و، بەرپەرچی ئەو تۆمەتانەیان دایەوە کە ئاراستەی کرابوون.

☐ **چەند بڕگەیەك لە بەرگریی پارێزەر "محەممەد میهری هیلاف"[1]**

دانەری پەیامەکانی نوور لە هەموو دانەر و نووسەرەکان خۆنەویست و خاکی ترە.. دوژمنترینی دوژمنانی ناوبانگ و خۆ بەگەورە زانینە و، پشتی لە هەموو کەرەستەیەکی

(١) محەممەد میهری (١٨٨٩-١٩٥٦ز) کوڕی زانای گەورەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان "مەلا عەبدوڵڵای دشەیی موفتیی سنە"یە. لە گوندی "دشە"ی سەر بە "پاوە" لە دایك بووە و لە "ئەستەمبوڵ" کۆچی دوایی کردووە. زانایەکی زیرەك و هەڵکەوتوو بووە. دوای تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی ئیجازنامەی زانستی، ماوەیەك هاتووەتە باشووری کوردستان و، ئنجا باکوور و، لەوێشەوە ڕۆشتووە بۆ ئەستەمبوڵ و، لەوێ "کۆلیجی مافەکان"ی تەواو کردووە. پاش دەرچوونی "یاسای نازناو" لە تورکیا نازناوی "هیلاف"ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، کە بە واتای "ڕووناکی" دێت. لە کارەکەیدا پارێزەرێکی سەرکەوتوو بووە. بە چەند زمانێك شیعر و وتاری هەیە. یەکێك لە بەرهەمەکانی فەرهەنگێکە بە زمانەکانی: "کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، فەرەنسی". (وەرگێڕ، لە چەند سەرچاوەیەکەوە)

دنیا هەڵکردووە.. نە سامان و، نە ناوبانگ و، نە دەسەڵات، هیچیان نەگەیشتوونەتە چمکی پۆشاکەکەی.. هەرگیز ناشگەن!

ئەم پیاوەی کە رۆژانە بە "٥٠" گرام نان و قاپێك شۆربا ژیان دەگوزەرێنێت، تەنها لە پێناوی خزمەتی قورئان و ئیماندا دەژی. جگە لەو خزمەتە هیچ شتێکی تر لای ئەو بایەخی نییە.

جا ئایا ئەوە لەگەڵ حەق و دادوەری و ویژدان و زانست و هزری مرۆیی و بیری یاسایی و مەنتیق و ژیریدا دەگونجێت کە بە تۆمەتی مەدح و سەنای دانراوەکەی تۆمەتبار بکرێت و، ئەوەش بخرێتە بازنەی تاوان بە پێی ماددەی "١٦٣"؟

ئەمە بەجێ دەهێڵم بۆ لێکدانەوەی دادگای بەڕێز.

ئێستا بە پوختی لە بابەتی نەیاری کردنی بۆ حکوومەت دەدوێم:

وا بەوپەڕی پاکی و دڵسۆزی لە چاوەڕوانیی بڕیاری دادپەروەرانەتاندا، مرۆڤێکی تاقانەی ڕۆژگاری خۆی لە بەردەم ئێوەدا ڕاوەستاوە..

مرۆڤێك کە لە سەرانسەری تەمەنیدا بۆ قسەیەکی پێچەوانەی ڕاستی دانەبەزیوە و، بە ئاشکرا لە یەکەم دانیشتنی دادگادا وتی کە بەم حکوومەتەی ئێستا خۆشحاڵە و دوعای سەرکەوتنی بۆ دەکات و، ئەو حکوومەتەش کە ڕەخنەی لێ گرتووە و لێی ڕازی نەبووە حکوومەتی پێشوو بووە. چونکە لەگەڵ هەموو گەلدا هەوڵی بۆ دامەزراندنی ئازادی و دیموکراسی داوە و، دڵخۆش بووە بەو دەرەنجامانەی کە لەم ڕووەوە بۆ جێگیربوونی ڕێسا و سەقامگیربوونی لە وڵاتدا هاتوونەتەدی.

چونکە هەروەك لە بواری سیاسیدا سیاسەتمەداران بۆ سەقامگیربوونی ڕێسا و دەستەبەربوونی ماف و ئازادیی نەتەوە تێدەکۆشن، ئەوا دانەری پەیامەکانی نووریش لە بواری مەعنەویدا بۆ ئەو سەقامگیربوونە تێدەکۆشێت. کەواتە لە ئامانجەکاندا هاوبەشن.

دانەری "پەیامەکانی نوور" کە قوتابخانەی عیرفانە و، قوتابیانی ئەو پەیامانەش، چەند پاسەوانێکی خۆبەخش و مەعنەوین بۆ ئاسایش و ڕێسا و ئارامی و، لە بوارە مەعنەوییەکانی دڵ و ژیرییەکاندا بۆ نەهێشتنی ئاژاوە و وێرانکاری، تێدەکۆشن.

ئەوان بە ئیخلاسی تەواوەتی و تەنها لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای گەورەدا، هەوڵ و تەقالای خۆیان بۆ سوودی گەل و نیشتمان پێشکەش دەکەن و، ئومێدەواری هیچ دەستکەوت و ئامانج و بەرامبەرێك نین لەم هەوڵەیاندا.

خۆ ئەمەش نە گوناهە و نە تاوان، بەڵکو خزمەتە بە گەل و وڵات و، دەبێت پاداشت بدرێنەوە لە سەری، نەك تۆمەتبار بکرێن.

مافی خۆمانە داوای بێ تاوانیی بکەین. بڕیاریش بۆ دادگای بەڕێزە.

❑ بەرگریی پارێزەر "سەنیەدین باشاق"

دوای ئەو، پارێزەرەکەی تر کە "سەنیەدین باشاق"ە، کورتە بەرگرییەکی لە دانەری پەیامەکە پێشکەش کرد و، وتی:

"مەسەلەکە ڕوون بووەتەوە و، حەقیقەتیش وەکو خۆر هەڵهاتووە و، دادگاش لە هەموو شتێك ئاگادارە و، من شتێکی نوێم زیاد لەوە لە لا نییە کە پێشکەشی بکەم.

بەڵام دەمەوێت لەبارەی ئەو مەنتیقەی کە پیاوانێکی بەڕێز و کارگوزارانێك بۆ گەل و نیشتمان، کە لە پێناوی خوادا بێ هیچ بەرامبەر و مەبەستێك خۆیان بەخت کردووە و، لەبارەی دانانیان لە سندووقی تۆمەتباریدا.. شتێك بڵێم..

بەڵام ئەم شوێنە جێی ئەوە نییە، بەڵکو پێویست دەکات کتێبێکی تێدا دابنرێت. چونکە بەرەنگاری کردنی ئەم بیرکردنەوەیە ئەرکی سەرشانی هەموانە.

من لە لایەنی خۆمەوە هێندە دڵنیام لە ویژدانی بەرزی دادگای بەڕێز کە بێ نیازم دەکات لە بەرگری لێکردنی و، خۆم بە شەرەفمەند دەزانم کە داوای بێ تاوانیی موەکیلەکەم بکەم".

❑ بەرگریی پارێزەر "عەبدوڕەحمان شەرەف لاچ"

پاشان پارێزەری ئیماندار و بەتوانا و ناسراو "عەبدوڕەحمان شەرەف لاچ" کە بە وێنەی هاوڕێ بەڕێزەکانی، خۆبەخشانە بەرگریی لە مامۆستا کرد، لە پێشەکیدا وتی:

"بە ئاشکرا دەرکەوت کە هیچ پەیوەندییەك لە نێوان تاوان و ئەم مرۆڤە پیرۆزەدا نییە کە تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێپەڕیوە و وەك تۆمەتبارێك لە بەردەمتاندا ئامادەیە.

ئومێدم وایە کە دادگای بەڕێزتان قەناعەتی تەواوی بەوە هەیە و، بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەردەکات. بەڵام پێم وایە بەرگری نەکردن لەم بێ تاوانەی کە بڕیارم داوە داکۆکیی لێ بکەم، مانای شکاندنی بەڵێنەکەم دەبێت، هەرچەندەش گریمانی دەرچوونی بڕیارێك لە دژمان یەك لە هەزارە.

دەبێت تێڕوانین و قەناعەتی دادگای باڵای تەمییز بەهەند وەربگیرێت و، نامەوێت هیچ ناتەواوی‌یەك لە رووی رێ و ڕەسمەوە بدۆزمەوە بە هۆی باس نەکردنیەوە. لەبەر ئەوە، تکا دەکەم دادگای بەڕێز ڕوخسەتی بەرگری‌یەکەم بدات".

- "فەرموون عەبدوڕەحمان بەگ، با گوێ بیستی دوا بەرگریتان بین".

- "ڕابەری لاوان" بریتی‌یە لە کۆمەڵێك فەرمانی قورئانی مەزن و تەفسیرەکەی و، چەند فەرمان و ئامۆژگاری‌یەکی ئایینی ئیسلامی لەخۆ گرتووە.

بە پێی ماددەی "٧٠"ی دەستوور، بێ تاوانیی زاتی مرۆڤەکان و، ئازادیی ویژدان و بیر و قسە و بڵاوکردنەوە، مافێکی سروشتی‌یە بۆ هەموو هاووڵاتی‌یەکی تورکیا. بە پێی ماددەی "٧٥"ی هەمان دەستووریش مرۆڤ بەهۆی ئایین و ڕێڕەوەکەیەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت.

لەبەر ئەوە، بەدواداچوونی دادگای سزا لە دژی موەکیلەکەم دابڕینیەتی لە مافی ئازادیی ئایین و بڵاوکردنەوە، کە دەستوور پێی بەخشیوە.

ئەگەر گریمانی ئەو مەحاڵەش بکەین کە ئەو بەڵگە یاساییانە وەرنەگیرێن کە لە سەرەوە ڕوون کرانەوە و، کار بە ماددەی "١٦٣"ی یاسای سزای تورکیا لە دژی موەکیلەکەم بکرێت، کە ماددەیەکە پێچەوانەی دیموکراسی‌یە، ئەوا بەم شێوەیەی خوارەوە ئەو تۆمەتە شی دەکەینەوە کە لە دژی ئاراستەی کراوە:

موسڵمانێك.. موسڵمانێکی بەساڵاچووی سەرسپی.. موسڵمانێك کە بە درێژایی ژیانی سەر و ڕیش و تەمەنی بە نوور سپی بووە.. موسڵمانێکی پاك و خاوێن.. سەر و تەمەن و مووی جەستەی بە نووری خوای گەورە شۆرراوە.. موسڵمانێکی مەزن ژیانەکەی خۆی، کە نیعمەتی خوای گەورەیە، لە پێناوی باشی و بەختەوەریی ڕاستەقینەی گەلی تورکیا بەخشیوە و، بڕیاریشی داوە کە هەتا کاتی بەخشینەوەی ڕۆحی

بە خوای خاوەن موڵك، لەسەر ئەم ڕێبازەی بەردەوام بێت و، تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا جەستەی خۆیشی داناوە کە تەلارێکی خواییە..

لەو کاتەدا کە دەڵێین: دیموکراسی پایەدارە، ئەم موسڵمانە هەڵدەسێت و جگە لە وشەی "خوا" و "پێغەمبەر" شتێکی تر ناڵێت و، هۆشیاری بە لاوان دەدات. هەر هێندەی ئەوەی لە زار دەردەچێت، داواکاری گشتی پەلاماری دەدات و دەیگرێت و پێی دەڵێت: "وەرە بۆ ئێرە.. تاوانێکت ئەنجام داوە"!

ئیتر چەندین تاریکایی ڕەش ئاسۆکانی گرتەوە..

بەڵام فەرموون بۆ ئەم موسڵمانە ڕەسەن و نەجیبە بڕوانن، چەندە هێمن و دڵنیایە؟!

چونکە بە "تەنیا"وە سەرقاڵە، نەك بە "زۆری"یەوە!

نە بایەخ بە تاریکیی شەو دەدات، نەك بە ڕەنگاوڕەنگی‌یەکانی ڕۆژ..

لە ناوەندی بەڵای بەندیخانەوە بۆ ساف و خاوێنی دەڕوانێت.. لەسەر سفرەی بێ ئەمەکیدا وەفا بەدەست دێنێت.. کەسێکە شارەزای ناوەرۆکی شتەکانە.. چرۆپڕی‌یەکانی گۆڕیوە بە نەرمونیانی.. خوێن بەناو دەمارەکانیدا ڕۆچووە، ئیتر ئەو دەمارانە بە ڕێژنەی حەمد و ڕووناکی پڕبوون و، لە بریی خوێن "نوور" هاتوچۆیان پێدا دەکات!

داواکاری گشتی قۆڵی ئەم موسڵمانە دەگرێت و بۆ بەندیخانە کێشی دەکات!

ئایا بۆچی؟ چ هۆکارێك هەیە؟ ئەم مرۆڤە بەتەمەنە چیی کردووە؟ ئەم موسڵمانە بەساڵاچووە گوناهەکەی چی‌یە؟

دەزانن چیی کردووە؟

فەرموون لە ڕوانینی داواکاری گشتیی سکاڵاکارەوە بڕوانن کە ئەم مرۆڤە چیی کردووە:

کتێبێکی بە ناوی "ڕابەری لاوان" بڵاوکردووەتەوە!

أ - کارێکی پێچەوانەی عەلمانیەتی کردووە.

باشە ئایا دەکرێت "خوا و ئایین و ئیمان" دژی عەلمانیەت بن؟

بەڵێ دەکرێت..

پاشان چیی تر؟

ب - بانگەشەی ئەوەی کردووە کە بناغەی سیستەمە کۆمەڵایەتی و ئابووری و رامیاری و یاساییەکانی دەوڵەت، پەیوەست بکرێن بە بنەماکانی ئایینەوە.

چۆن کاری وای ئەنجام داوە؟ بۆچی؟ مەبەستی چی‌یە؟

ج - مەبەستی دەستەبەرکردن و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی کەسی‌یە بۆ خۆی!

باشە ئایا هیچ ئامانجێکی ئەو بۆ بەدەستهێنانی سوودی سیاسی لە ئارادا هەیە؟

نەخێر، شارەزایانی حاڵی ئەو دەزانن کە ئەم ئامانجە لە ئارادا نی‌یە و، داواکاری گشتیش نەیتوانیوە ئیددیعای بوونی ئەم ئامانجە بکات..

باشە مادەم ئامانجی بەرژەوەندی‌یە سیاسی‌یەکان لەکایەدا نی‌یە، ئیتر ئەم مرۆڤە بەتەمەنە چ شتێك بۆ خۆی و جەستەی و لاشەی، لەم دنیایەدا چاوەڕوان دەکات، هەتا هەوڵی دابین کردنی دەسەڵاتی کەسی بۆ خۆی بدات؟

داواکاری گشتی دەڵێت: من نازانم و، گرنگیش نی‌یە بەلامەوە کە بزانم. خەبیرەکانیش هەمان شت دەڵێن.

زۆر باشە.. ئەی ئەم موسڵمانە چۆن هەموو ئەو کارانەی ئەنجام دا؟

ئایین و هەست و نەستە ئایینی‌یەکان و پیرۆزی‌یەکانی ئایینی وەك ئامراز و هۆکار بەکارهێناوە!

ئایا پیرۆزی‌یە ئایینی‌یەکان چین؟

ئایینی ئیسلام.. هەست و نەستە ئیسلامی‌یەکان.. چاندنی ترسی وشەی: "خوا، قورئان، تەفسیر" لە دڵەکاندا.

کەواتە داواکاری گشتی هەموو ئەم شتانە دەزانێت و، باوەڕی بەوەش هەیە کە پیرۆزیی ئایینن!

ئایا زانینی ئەمانە و باوەڕبوون پێیان و قسە لەسەر کردنیان، دەبێتە بەکارهێنانیان وەك هۆکار و ئامراز بۆ شتێکی تر؟

بە پێی ڕای داواکاری گشتی سکاڵاکار، بەڵێ!

کەواتە لەم حاڵەتەدا داواکاری گشتیش ئەم پیرۆزی‌یانەی ئایین دەقۆزێتەوە و، وەك ئامراز و هۆکار بەکاریان دەهێنێت، تەنانەت لە یاسایەکی سیاسیدا دەیانکات بە ئامراز و هۆکار بۆ بڕیاردان لەسەر موسڵمانێك.

ئایا خۆیشی ناکەوێتە ژێر سەرپێچی لە ماددەی "١٦٣"؟

داواکاری گشتی دەڵێت: نەخێر، من پڕوپاگەندە بۆ ئەوە ناکەم، بەڵام ئەو دەیکات.

ئایا ئەو چیی وتووە؟

وتوویەتی:

"لەم سەردەمەی خۆماندا کە گومڕایی و بێ باوەڕی بەرەنگاری ئیسلام بووەتەوە و لەگەڵیدا دەجەنگێت، سامناکترین تیپی هێرشبەری ئەوان بۆ سەر ئیسلام، کە بە پێی نەخشەکانی دەروونی بەدخواز کاردەکات و پێشەوایەتی‌یەکەی بە دەستی شەیتان سپێرراوە، دەستەیەك ئافرەتی "ڕووت"ن کە قاچ و قولیان دەردەخەن و دەیانکەن بە چەکێکی توندوتیژ و دژی ئیمانداران بەکاریان دەهێنن..

بەم کارەشیان دەرگای خێزانداری و مارەبڕین دادەخەن و هی داوێن پیسیش دەخەنە سەرپشت، چونکە هانیان دەدەن دووچاری تاوانی گەورەیان بکەن و بە چەشنێکی کتوپڕی دەروونی چەندەها کەس دەکەنە دیلی خۆیان و، چەندین زام و برینی بە سۆ و قووڵ لە گیان و دڵیاندا دروســت دەکەن، تەنانەت لەوانەیە هەندێ لەو دڵانە وەها بپێکن کە بە جارێ بیانکوژن و لەناویان ببەن!

کەواتە سزایەکی گەلێ دادگەرانەیە کە ئەو قاچ و قولانەی بەو جۆرە چەکی بریندارکەری فیتنەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، ببن بە سووتەمەنیی دۆزەخ و یەکەم شت دۆزەخ ئەوان بسووتێنێت. چونکە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم و لە بەردەم کەسانێکدا کە لێیان حەرام بوون، ڕووتیان کردوون و دەریانخستوون"[١].

ئایا ئەمەی دەیڵێت درۆیە؟ ئایا داواکاری گشتی سەرپێچی لە بوونی کۆمەڵە ئافرەتانی بەدڕەوشت دەکات کە هاندەری زینا و ڕێگری هاوسەرگیرین؟ ئایا دەوڵەت و غەیری دەوڵەتیش بەگژی داوێن پیسیی ئاشکرا و پەنهاندا ناچنەوە؟ ئایا پۆلیسی ڕەوشتەکان بە یاسای سزا و سیستەمی بەگژاچوونەوەی داوێن پیسی، بە ڕۆژ و بە شەو، ئافرەتانی داوێن پیس ڕاوەدوو نانێن؟

داواکاری گشتی سکاڵاکار دەڵێت:

(١) بڕوانە: ڕابەری لاوان، ل: ٢٦؛ بریسکەکان، بریسکەی بیست و چوارەم، ل: ٣٩٩-٤٠٠. (وەرگێڕ)

ئەمە ڕاستە و کاری ئێمەیە، بەڵام کارێك نی‌یە کە "خوا" دەسەڵاتی خۆی تێدا بەکاربێنێت!

داواکاری گشتی چی دەڵێت با بڵێت!

بەڵام چ پاسا و چ پۆلیس و چ داواکاری گشتی، لە دوای ڕوودانی تاوانەکە، ئەنجامدەر و ڕێکخەری تاوانەکە دەگرێت، واتە دوای تەواوبوونی کارەکە و، تیاچوونی نامووس و، مردنی کوژراوەکە!

هەرگیز ناکرێت لە ڕێی پاساوە هۆکارێك بگیرێتەبەر کە ڕێ لە ڕوودانی تاوان بگرێت. بەڵام ئەو کارە بە ئایین دەکرێت.. بە ترسان لە خوا.

ئایین فێرمان دەکات کە ترسان لە خوای گەورە ڕێی هەموو کردارە ناڕەوا و خراپەکان دەبڕێت. ئیسلام فەرمانی ئەوەمان پێ دەدات کە پێشتر هەموو ئامادەسازی‌یەك بۆ خۆپارێزی بگیرێتەبەر.

ئایا چۆن؟

بە ئامۆژگاری.. بە ورياکردنەوە.. بە ناسینی خوا.. بە چاندنی ترس و خۆشەویستیی خوا و، مەترسیی ئاگری دۆزەخ و سزای هەمیشەیی و، تامەزرۆیی بۆ بەختەوەریی هەتاهەتایی لە دڵی مرۆڤدا.. بە زانین و تێگەیشتن و ترس و خۆشەویستی، تاکو مرۆڤ لە خراپکاری هەڵبێت و خۆی ڕزگار بکات، ئنجا کۆمەڵگا و داواکاری گشتی و دەوڵەت و حکوومەت و گەل بحەوێنێتەوە.

ئایا ئەم کارە بە چی ئەنجام دەدەین؟

بە گوفتار و نووسین و خوێندنەوە.

داواکاری گشتی لەم کاتەدا دەڵێت: ئاخر ئەو پڕوپاگەندەی بۆ ئەمە کردووە!

دەڵێین: چ زیانێك لەوەدا هەیە؟ ئەوە فەرمانی خوا و حیکمەتی قورئانی پیرۆزە.

ئەی ئایا ئایین لە هەموو مافەکان ئاشکراتر و بەڵگەنەویست تر نی‌یە؟ کێ ڕێی خواتان لێ دەگرێت؟

ئایا ئەم ڕێگایە تاوانە؟ کەواتە ئەم فەرمانەی خوای گەورە بخوێننەوە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ﴾ (محمد: ٣٢).

جا ئەگەر ئەوان گوێ بیستی نەبوون، ئەوا بۆ ئەوانەی دووپات بکەنەوە کە دەبیستن و ئیمانیان هەیە، چونکە کارەکەتان خێری تێدایە بۆ خەڵك و کۆمەڵگا و گەل و حکومەت و دەوڵەت. هەروەك لە بەڵا و خراپکاری دەیانپارێزێت.

هەروەها بە ئیمانداران بڵێن:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ﴾ (محمد: ٣٣).

جا ئەگەر باوەڕیان بەوە نەهێنا، پێیان بڵێن:

مەترسیی تیاچوونی گەل و نیشتمان لە ئایین و بانگەشەی ئایینیدا نی‌یە، بەڵکو لە ئیلحاد و بێ ئایینیدایە.

ئەمە قسەیەکە تەنانەت سەرۆك وەزیرانیش وتوویەتی:

"تەوژمی ڕاستڕەوەکان مەترسی‌یەکی لەسەر نیشتمان پێك نەهێناوە و، لە کاتی ئێستا هیچ ڕێگرێك لە بانگەشەکردندا بۆ ئایین لە ئارادا نی‌یە و، پێویست بە گرتنەبەری ڕێ و شوێنی پێویست لەم ڕووەوە نەماوە".

ئەی دادوەرە بەڕێزەکان! ئێوە وەڵامەکە باشتر دەزانن. فەرموون جارێکی تر لە داواکاری گشتی سکاڵاکار بپرسن، ئەگەر دەتوانێت بە نەرێ وەڵام بداتەوە!

ئایا ئەگەر فەرمانەکانی خوای گەورە و حیکمەتی قورئانی مەزن بۆ لاوەکان ڕوون نەکرێنەوە و فێرنەکرێن، ئایا تەنها و تەنها بە یاساکانی سزادان دەتوانرێت ڕووبەڕووی نزمبوونەوەی ڕەوشت و، نەمانی داوێنپاکی و، تیاچوونی نەسەب و، بازرگانیی ناموس و، داوێن پیسی و، کوشتن ڕابووەستین؟ خۆ ئەگەر بە بیانووی ئەوەی کە "بانگەشە کردن بۆ فەرمانەکانی خوا قەدەغەیە" ڕێ لەوە بگرین، ئایا بە چی دەتوانرێت بەرەنگاری ئەو وێرانکاری‌یە پەنهان و ئاشکرا و پەرەسێن و چەپەڵەی هزرێکی بکوژی وەکو شیووعیەت بکرێت کە هەڕەشە لە هەموو دنیا دەکات؟

ئەی دادوەرە تورکە بەڕێزەکان کە پەیوەستن بە خوای پەروەردگاری خۆتان و پیرۆزی‌یەکانتانەوە!

سەیری ئەو ژەهرانە بکەن کە چەندین ساڵە دوژمنە سەرسەختەکانی ئایین بڵاوی دەکەنەوە، بۆ تێکدان و شێواندنی ژیریی ڕۆڵە پاك و خاوێنەکانی تورکە موسڵمانەکان و بۆ لەکارخستنیان..

ئنجا بزانن بارودۆخە دژ بە یەکەکانی ناو ئێمە چەندە گەورەیە!

داواکاری گشتی بایەخ بەمە نادات و، بەرامبەر سووکایەتی پێ کردن و هێرشی ترسناك لەسەر ئایینی ئیسلام و سەرجەم ئایینە ئاسمانی‌یەکان جووڵەی لێوە نایەت، بەڵام لە دژی کەسێك چالاکی دەنوێنێت کە ئامۆژگاریی پاراستنی لاوان بکات لەم هێرشە!

ئەی دادوەرە موسڵمانە تورکە بەڕێزەکان!

کارێکی مەحاڵە کە بڕیار لە دژی موەکیلەکەم دەربکەن بەهۆی "ڕابەری لاوان"ەوە کە بەشێکە لە سەرجەمی پەیامەکانی نوور، ئەو پەیامانەی کە لێوانلێون لە بریسکەکانی نووری خوایی و بڵاوکەرەوەی ئەو ڕووناکی‌یانەن.

ئەی دادوەرە بەڕێز و نەجیب و موسڵمانەکان!

بەڕێزتان باش دەزانن کە زانا ڕابەر و ڕاستگۆکان میراتگری پێغەمبەرانن، درووودیان لەسەر بێت. هەروەك دەزانن کە ئەو کەسە پیرۆزانە بە پێی فەرمانی قورئانی حەکیم ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئەو ئامۆژگاری‌یانەیان خراوەتە ئەستۆ کە لەو میراتی‌یەدایە. کاتێکیش کە ئەم ئەرکەی سەرشانیان جێبەجێ دەکەن، هیچ پاداشت و سوپاسێکیان لە کەس ناوێت و، تەنها لە پێناوی خوای گەورە و بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا و پێغەمبەر ﷺ ئەرکی سەرشانیان ڕادەپەڕێنن و، هەتا دوا هەناسەی ژیانیان سستی نانوێنن. چونکە ئەم ئەرکە ڕاسپاردەی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ لە ئەستۆیاندا.

ئیتر چۆن موەکیلەکەم دادگایی دەکرێت و ئازار دەدرێت لەسەر گەیاندنی ڕاسپاردەکەی ئەستۆی بە خاوەنەکانی؟ چۆن جەستەی لاوازی ئەم مرۆڤە بەتەمەنە ئەرکێکی قورسی دەخرێتە ئەستۆ کە قبووڵ ناکرێت، ئەویش بردنیەتی بەرەو بەندیخانە؟!

ئەمە ناشیرینترین جۆرەکانی ستەمە. ئەو ئەمانەتەش کە لە ئەستۆی ئێوەدایە ڕێ نەدانە بە سەپاندنی ئەم ستەمە.

تەنها "نوور"ە کە خراپکاری و گوناهـ و ڕەوشت نزمی و خراپکاری و ئاشووبەکان دەسڕێتەوە.

﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ (التوبة: ٣٢)".

پارێزەر
عەبدوڕەحمان شەرەف لاج

لە کۆتاییدا سەرۆکی دادگا ڕووی کردە مامۆستا نوورسی و، لێی پرسی:

- زیاد لەوەی کە پێشتر وتت، شتێکی ترت هەیە بتەوێت بیڵێیت؟
- تکا دەکەم ڕێم پێ بدەن یەك وشە زیاد بکەم.
- فەرموون.
- من شایانی ئەو پیاهەڵدان و ستایشانە نیم کە پارێزەرە بەڕێزەکانم بۆیان دانام. من جگە لە خزمەتکارێکی دەستەوسانی قورئان و ئیمان شتێکی تر نیم. لەمە زیاتر شتی ترم نی‌یە بیڵێم!

❑ ڕاگەیاندنی بڕیاری بێ تاوانی

لەسەر بناغەی ئەوانەی کە ڕابورد، دادگاییەکە کۆتایی پێ هات و، دەستەی دادوەر، دوای ڕاوێژی نێوانیان، بە کۆی دەنگ بڕیاری بێ تاوانی‌یان ڕاگەیاند!

ئەم بڕیارەش لە لایەن قوتابیانی زانکۆ و ڕۆڵەکانی گەلەوە، کە ئامادەی هۆڵی دادگا بوون، بە چەپڵەڕێزانێکی گەرموگوڕ پێشوازی کرا. هەروەك بڕیارەکەش دواپلەی قەتعییەتی بەدەست هێنا، چونکە داواکاری گشتی داوای تەمییز کردنی بڕیارەکەی پێشکەش نەکرد.

## گۆڤارە ئایینی‌یەکان لە بارەی نوورسی‌یەوە دەنووسن

لەم کاتەدا نووسەرە موسڵمانەکان گەلێ وتاریان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردەوە، کە تێکۆشانەکانی مامۆستا نوورسی و چالاکیی قوتابیانی نووریان ڕوون دەکردەوە. وا لە خوارەوەدا تەنها دوو وتاریان لێ دەهێنین.

❑ لە دوای جودایی‌یەکی درێژخایەن[1]

بە پێنووسی: مامۆستا ئەشرەف ئەدیب[2]

بیست و حەوت، یان بیست و هەشت ساڵ دەبێت کە بە دیداری مامۆستا نەگەیشتووم..

---

(١) لە گۆڤاری "سبیل الرشاد"ەوە: ٥/١١٩، ساڵی ١٩٥٢ز.

(٢) ئەشرەف ئەدیب فەرغان (١٨٨٢-١٩٧١ز). سەرنووسەری گۆڤاری "سبیل الرشاد"ە کە مامۆستا نوورسی وتاری تێدا بڵاو دەکردەوە. سێ کتێبی لەبارەی بەدیعوززەمان و قوتابیانیەوە نووسیوە، جگە لە بڵاوکردنەوەی چەندین وتار لە گەلێ گۆڤار و ڕۆژنامەدا.

چونکە وێڕای حەزی بەردەوامم بۆ سەرلێدانی و، بینینی و، تێر کردنی چاوەکانم لە سیمای موبارەکی ئەو، کەچی ئەرکە زۆرەکانم دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخساندم. بەڵام بوونی مەعنەویی بەڕێزیان هیچ کات لێم جیا نەبووەتەوە، چونکە لەناو دڵەکاندا دەژی!

لە دەمی شاد بوونم بە دیداری و لە ئامێز گرتنی، ڕادەی ئەو شەوقە ماددییە مەزنەی ئەو چێژە دەرکەوت کە هی بینینی سیمای نوورانیی ئەوە.

وا چل ساڵ بەسەر یەکەم جاردا تێپەڕی کە مامۆستام بینی. لەو ڕۆژگارە لەگەڵ بەڕێزان: عاکیف و، نەعیم و، فەرید و، ئیزمیرلی، هەموو ڕۆژێك لە بەڕێوەبەرایەتیی گۆڤارەکە ئامادە دەبووین و، پێکەوە چەند کاتێکی خۆشمان دەگوزەراند.

مامۆستا بە زارە تایبەتی‌یەکەی خۆی، لە بابەتە زانستی‌یە بەرزەکان دەدوا. ئێمەش بەرامبەر توندوتۆڵی و ویقاری گوفتارەکانی، لە خۆماندا هەستمان بە گەرموگوڕی دەکرد..

زیرەکی‌یەکی سروشتیی نائاسایی و، بەهرەیەکی خوایی هەیە.. توانای زیرەکی و مەزنی‌یەکەی لە بەرامبەر ئاڵۆزترینی مەسەلەکاندا دەردەکەوێت. ژیری‌یەکەی هەمیشە سەرقاڵی کار و بیرە. بە هێنانی قسەی کەسانی ترەوە سەرقاڵ نابێت، چونکە ڕابەری ئەو تەنها قورئانە و، قورئانیش سەرچاوەی پیت و زیرەکیی ئەوە، ئەم هەموو بریسکەیەش ڕاستەوخۆ لەو کانیاوە هەڵدەقوڵێن..

خاوەنی ڕای ڕاست و دروستی خۆیەتی و، پتر لە موجتەهیدێك یاخود لە ئیمامێك دەچێت. دڵیشی لێوانلێوە لە ئیمانێکی هێندە دامەزراو کە زیاتر بە ئیمانی سەحابەیەك دەکات. ڕۆحیشی مەردایەتی‌یەکی وەك مەردایەتیی عومەری تێدایە.. ئیماندارێکە لە ناخ و هەناوی خۆیدا سەردەمی بەختەوەریی پێغەمبەرایەتیی لە سەدەی بیستەمدا زیندوو کردووەتەوە و، ئیمان و قورئانی کردووە بە ئامانجی خۆی.

گرنگترین ئامانجەکانی ئیسلام، مەبەستم بناغەی "تەوحید" و "ئیمان بە خوا"یە، مەزنترین پاڵپشتی خۆی و پەیامەکانی نوورە. پێم وایە ئەگەر لە باشترینی سەدەکان و لە دەمی سەرهەڵدانی ئیسلامدا بوایە، ئەوا لەوانەبوو پێغەمبەر ﷺ ئەرکی شکاندنی بتەکانی کەعبەی پێ بسپاردایە! چونکە تا ئەوپەڕی پلەکانی "دوژمنایەتی" دژی شیرك و بت پەرستی‌یە!

تەمەنێکی درێژی نزیك لە سەدەیەکی بە تێکۆشان لە پێناوی جێگیر کردنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئان لە ناو دڵەکاندا، بە سەربەرزی و مەردایەتی، بەسەر بردووە.

دەبینیت لە مەیدانی جەنگدا پاڵەوانێکە پێش موجاهیدان دەکەوێت و، لەسەر پێی توندوتۆڵی دامەزراو شمشێر ڕادەکێشێت و هەڵمەت بۆ دوژمنان دەبات..

لە دیلیدا قارەمانێکە لە ڕووی سەرکردەی دوژمناندا ڕادەوەستێت و، لەسەر سەکۆی سێدارەش سەرکردەی دوژمنان دەخاتە بیرکردنەوە و بەرەو ویژدان دەیداتە بەر..

گیانفیدایەکە تەنانەت بۆ چرکە ساتێکیش دوو دڵ نی‌یە لە بەختکردنی گیانی خۆی لە پێناوی گەل و وڵاتەکەیدا..

لە ڕێی ئامانجەکەیدا، دوژمنێکی سەرسەختی ئاشووب و وێرانکاری‌یە.. لە پێناوی بەرژەوەندی‌یەکانی نەتەوەدا ئارام لەسەر هەموو ستەم و ئازاردانێك دەگرێت..

ئاسانترین شت بە لایەوە ئەوەیە کە: کەمێك شۆربا و چایەك و لەتێك نان و پەرداخێك ئاو بکاتە بژێوی خۆی و.. سیپاڵێکی کەتانی سپی بپۆشێت..

پۆشاکەکانی دەگۆڕێ و دەیشوات پێش ئەوەی چڵك بگرن و، لە ڕادە بەدەر بایەخ بە پاکوخاوێنی دەدات.. دراوی کاغەز هەڵناگرێت و دەستیشی لێ نادات!

لەم دنیایەدا خاوەنی هیچ شتێکی بەنرخی ماددی نی‌یە.. بۆ خەڵك دەژی نەك بۆ خۆی.. جەستەیەکی لاوازی هەیە، بەڵام خاوەنی هەیبەت و ویقارە.. چاوەکانی تیشکی ڕوناکی‌یەکی وەك هی خۆر پەخش دەکەن.. ڕوانینەکانیشی ڕوانینی پادشایەکە. لە جیهانی مەعنەویدا دەوڵەمەندترین پادشایە، کەچی لە دنیادا لە ڕووی سامانەوە لە هەموو کەسێك هەژارترە!

هەرچەندەش سەر و ڕیشی سپی بووە، کەچی ئازارەکانی پتر لە هەشتا ساڵ هیچ چرچ و لۆچێکیان لە دەموچاویدا بەجێ نەهێشتووە. سپی پێستێکی سووربواوە.. ڕیشی نەهێشتووەتەوە.. هێندە چالاکە دەڵێی لە تەمەنی لاویدایە.. زۆر هێمن و لەسەرخۆیە، بەڵام کاتێك دەورووژێت وەکو شێر دەردەکەوێت و لەسەر ئەژنۆکانی ڕادەوەستێت و بە وێنەی پادشایەك دەدوێت!

بێزراوترین شت بەلایەوە "سیاسەت"ە! وا ماوەی سی و پێنج ساڵە ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە نەگرتووە.

پەیوەندیی لەگەڵ کاروباری دنیادا پچڕاوە. هەر لە دوای نوێژی خەوتنانەوە هەتا دەمی نیوەڕۆی ڕۆژی دوای ئەو شەوە، تێکەڵیی هیچ کەسێك ناکات و سەرقاڵی خواپەرستییە.. کەم دەخەوێت.

ڕێی لە قوتابیانیشی گرتووە کە بە سیاسەتەوە سەرقاڵ بن. قوتابییەکانی کە ژمارەیان شەش سەد هەزار یاخود ملیۆنێك دەبێت، لە هەموو ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە پتر پابەندی ئاکارە بەرزەکانن.

سەدان یاخود هەزاران کەس لە قوتابییەکانی، لە کۆلێژەکانی زانکۆکاندا زانستە پەتییەکان دەخوێنن و، لە ناو قوتابیاندا هیممەتیان لە هەمووان بەرزتر و ڕەوشت و خوویان مەزنترە.

هیچ کاتێك ڕێ نەکەوتووە کە لە لایەن یەك قوتابیی نوورەوە، لەوانەی کە ژمارەیان سەدان هەزارە و لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا بڵاون، ڕووداوێکی تێکدەری ئارامی و ئاسایش ڕوویدابێت. هەموو یەکێکی قوتابیانی پەیامەکانی نوور پارێزەرێکی سروشتییە بۆ ڕێسا و ڕێکوپێکیی وڵات و، پاسەوانێکە بۆ ئارامی و ئاسایش.

لێم پرسی کە: ئایا ماندووی سەفەری ئەستەمبووڵە؟

وتی: "جگە لەو مەترسییانەی کە ئابلوقەی ئیسلامیان داوە، هیچ شتێکی تر نیگەرانم ناکات. چونکە جاران مەترسییەکان لە دەرەوە دەهاتن و بەرگری کردنیان ئاسان بوو، بەڵام ئێستا لە ناوخۆوە سەرهەڵدەدەن. لەبەر ئەوەی کرم لەناو جەستەدا دروست بووە و تیایدا بڵاو بووەتەوە، بەرلێگرتنی دژوار بووە..

زۆر لەوە دەترسم کە جەستەی کۆمەڵگا توانای خۆڕاگریی لە بەرامبەر ئەم دەردە ترسناکەدا نەبێت، لەبەر ئەوەی لە دوژمن ناچێت. چونکە ئەو کەسەی کە دەمارەکانی دەبڕێت و خوێنەکەی دەمژێت، بە دۆستی خۆی دەزانێت!

خۆ هەر کاتێك بینایی کۆمەڵگا هەتا ئەم ڕادەیە کوێرایی داهات، ئەوا قەڵای ئیمان لە مەترسیی هێرشێکی دەستەویەخەدایە!

لەبەر ئەوە، نیگەرانی و پەشێویی من تەنها لەمەیە. تەنانەت ئەو کاتەم نی یە کە لە بیری ماندووبوون و ئازارە کەسی یەکانی خۆمدا بەزایەی بدەم!

بریا دووچاری هەزار هێندەی دەردیسەری یەکانی خۆم ببوومایە، بەڵام داهاتووی قەڵای ئیمان پارێزراو بووایە".

وتم: ئایا ئەو سەدان هەزار قوتابیانەت نابنە پشتگیرێکی هیوا و دڵدانەوەت بۆ داهاتوو؟

وتی: "بەڵێ، بە تەواوی نائومێد و هیوابڕاو نەبووم. جیهان بە قەیرانێکی خنکێنەر و نیگەرانی یەکی مەعنەویی مەزندا تێدەپەڕێت.

ئەو نەخۆشی یەی کە لە جەستەی کۆمەڵگای خۆرئاوادا بڵاوبووەتەوە و لەرزەی بە ستوونە مەعنەوی یەکانی خستووە، بە وێنەی پەتایەکی ترسناك وایە. ئایا ئەو چارەسەرانە چین کە کۆمەڵگای ئیسلام بەرەنگاری ئەم نەخۆشی یە پەرەسێنە ترسناکەی پێ بکات؟ ئایا بە ڕەچەتە گەنیوە نارەواو و بۆگەنەکانی "خۆرئاوا"؟ یان بە بناغە زیندووەکانی "ئیمان" کە هی کۆمەڵگای قەڵای ئیسلامن؟

من دەبینم سەرە گەورەکان نوقمی بێ ئاگایی بوون. "قەڵاکانی ئیمان"یش هەرگیز بە ستوونە کرمۆڵەکانی کوفر ڕاگیر ناکرێن. لەبەر ئەوەیە کە هەموو هەوڵ و تەقالایەکم تەنها و تەنها لە ڕێی ئیماندایە و، ڕەنج و ماندووبوونیشم بە چڕی تەنها لە پێناوی ئیماندا خستووەتە کار.

ئەوان لە پەیامەکانی نوور تێناگەن، یان نایانەوێت لێی تێبگەن. پێیان وایە کە من مامۆستای قوتابخانەیەکی ئایینیم و لە کاروبارە ماددی یەکانی دنیادا وشك و بێ ئاگام!

لە ڕاستیدا من کارم لە زانستە پەتی یەکان و سەرجەم زانست و فەلسەفەکانی هاوچەرخدا کردووە و، ئاڵۆزترین مەسەلەکانیانم شی کردووەتەوە، تەنانەت کتێبیشم تێدا داناون.

بەڵام دان بە یاری و گەمەی مەنتیقدا نانێم و، گوێ لە فرتوفێڵی فەلسەفەش ڕاناگرم. بەڵکو سروودی گەوهەری ژیانی کۆمەڵگا و، بوونی مەعنەوی و، ویژدان و ئیمانی ئەوم لەسەر زارە. هەموو سەرقاڵی یەکانی خۆمم لە بناغەی تەوحید و ئیماندا قەتیس کردووە

کە قورئان دایمەزراندووە. دڵنیابە کە ستوونی سەرەکیی کۆمەڵگای ئیسلام تەنها ئەوەیە. خۆ ئەگەر لەرزەی پێ بکەوێت، کۆمەڵگا تیادەچێت.

پێم دەڵێن: بۆچی فلان و فیسار زامدار دەکەیت؟

نازانم.. هەستم نەکرد و بەرپێی خۆم نەبینی.. لەبەر ئەو ئاگرە گەورەیەی کە لە بەردەممدا بڵێسەکەی بەرز دەبێتەوە و ڕۆڵەکانم دەسووتێنێت و گڕ لە ئیمانەکەم بەردەدات. جا لەو کاتەدا کە لە هەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکە و ڕزگارکردنی ئیمانەکەمدام، کەسێك تەگەرەم دەخاتە پێش و پێی منی بەردەکەوێت.

ئایا ئەم ڕووداوە جوزئی‌یە چ نرخ و گرنگی‌یەکی هەیە لەچاو هەڵمەتی دڕندانەی ئاگرە سووتێنەرەکەدا؟ ئنجا بزانە کە ژیریی ئەوانە چەندە بچووك و تێڕوانینیشیان تا چ ڕادەیەك کەم و کۆتایە!

ئایا پێیان وایە من کەسێکی خەمباری حاڵی خۆمم و، دەمەوێت خۆم ڕزگار بکەم؟ دوای ئەوەی کە من دنیا و قیامەتی خۆم لە پێناوی ڕزگارکردنی ئیمانی کۆمەڵگادا بەخت کرد؟

لە درێژایی تەمەنمدا، کە هەشتا ساڵ زیاترە، هیچ تام و لەزەتێکی خۆشی دنیام نەچەشتووە و، ژیانم لە مەیدانەکانی جەنگ و زیندانەکانی دیلی، یان لە بەندیخانەکانی نیشتمان و دادگاکانی وڵاتدا، بەسەربردووە..

هیچ جۆرە ئازار و دەردیسەری‌یەك نەماوە نەمچەشتبێت!

لە دادگا عورفی‌یە سەربازی‌یەکاندا مامەڵەی تاوانبارانم لەگەڵدا کراوە و، وەك ئاوارەکان بۆ ئەم لا و ئەو لای وڵات دوورخراومەتەوە..

چەندین مانگ لە زیندانەکانی وڵاتدا لە تێکەڵاویی خەڵك بێ بەش کرام و، چەند جارێکیش ژەهرم دەرخوارد درا و، دووچاری چەندەها جۆری سووکایەتی بووم و، چەندین کاتی وەهام بەسەردا تێپەڕیوە کە هەزار جار مردنم لە ژیان بەلاوە باشتر بووە. خۆ ئەگەر ئایینەکەم ڕێی خۆکوژیی لێ نەگرتمایە، ئێستا سەعید گڵی ژێر خاك دەبوو!

من بە سروشتی خۆم سووکایەتی و زەلیلیم پێ قبووڵ ناکرێت.. عیززەت و غیرەتی موسڵمانێتی بە توندی ڕێی ئەم حاڵەتانەم لێ دەگرن. ئەگەر دووچاری ئەم چەشنە

حاڵەتانە ببم، ئەوا سەرم نەوی ناکەم، جا ئیتر ئەوەی بەرامبەرم هەر کەسێك بێت، چ کەسێکی بەزەبر و زەنگی لەوپەڕی ستەمکاریدا بێت، یان سەرکردەیەکی خوێنڕێژی دوژمن! بەڵکو ستەم و خوێنڕێژیەکەی بە سەروچاوی خۆیدا دەدەمەوە و، گوێ نادەم بەوەی گەر بمخاتە گۆشەی بەندیخانە، یان بمبات بۆ سەر سەکۆی سێدارە! هەر ئەمەش بوو کە لە ڕاستیدا بەسەرم هات.

خۆ ئەگەر دڵ و ویژدانی ئەو سەرکردە خوێنڕێژە[1] چەند خولەکێکی تر ئارامی بگرتایە، ئەوا سەعید لە سێدارە دەدرا و، دەگەیشتە کاروانی بێ تاوانە ستەم لێکراوەکان!

سەرانسەری ژیانم لە گرفت و ئازار و دەردیسەریدا بەم جۆرە لێ گوزەراوە. خۆم و دنیاکەمم لە پێناوی ئیمان و بەختەوەری و سەلامەتیی کۆمەڵگادا بەخت کردووە. دەسا لێی پیرۆز بێت و پێی حەڵاڵ بێت. تەنانەت لە نزاکانیشمدا دوعا لە ئازاردەرەکانم ناکەم!

"پەیامەکانی نوور" بەم حاڵەتانە بوون بەهۆی ڕزگار کردنی ئیمانی سەدان هەزار کەس بەلای کەمەوە، لەوانەیە ملیۆنەها کەسیش وەك دەڵێن. چونکە من ژمارەیان نازانم. داواکاری گشتیی ئافیوون وتی: پێنج سەد هەزار یان زیاتر دەبن.

خۆ ئەگەر بمردمایە ئەوا تەنها خۆم ڕزگارم دەبوو، بەڵام بە مانەوەم لە ژیاندا و خۆڕاگریم لەسەر سەختی و گرفتەکانی، بە ژمارەی ئەو کەسانە خزمەتم لە ڕزگار کردنی ئیماندا کردووە. دەسا هەزار جار سوپاس بۆ خوای گەورە.

لە پێناوی سەلامەت بوونی ئیمانی کۆمەڵگادا قوربانیم تەنانەت بە ژیانی ئەودنیاشم داوە؛ نە ئارەزووی بەهەشت و نە ترسی دۆزەخم لە دڵدا نییە! دەبا نەك تەنها یەك سەعید، بەڵکو هەزار سەعید بەخت بکرێن، نەك تەنها لە پێناوی ئیمانی کۆمەڵگای تورکیادا کە بیست ملیۆنە، بەڵکو لە پێناوی ئیمانی کۆمەڵگای ئیسلامیدا کە دەگاتە سەدان ملیۆن.

---

(١) مەبەست "نیقۆلا نیقۆلا فیچ"ی سەرکردەی ڕووس بووە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا. بەسەرهاتەکەی لەم کتێبەدا ڕابورد. (وەرگێڕ)

خۆ ئەگەر قورئانەکەمان کۆمەڵێکی نەبێت ئاڵاکەی لەسەر گۆی زەوی هەڵبگرێت، ئەوا تەنانەت ئارەزووم لە بەهەشتیش نییە، چونکە ئەو کاتە بەهەشت دەبێتە بەندیخانەیەك بۆم..

بەڵام گەر ئیمانی نەتەوەکەمان لە خێر و سەلامەتی و خۆشیدا بێت، ئەوا ڕازیم کە لە بڵێسەی دۆزەخدا بم، چونکە لەو کاتەدا کە جەستەم لەوێ دەسووتێت، دڵم لە خۆشی و بەختەوەریدا دەبێت"!

لەم کاتەدا ویژدانی بەڕێزیان هێندە هەڵچووبوو کە پزیسکی بە وێنەی گڕکان دەهاویشت و، دەریای دڵی وەکو تۆفان شەپۆلی دەدا و، قووڵایی ناخیشی ئاوی زەمزەمییانەی مەزنی بە وێنەی تاڤگە دەپرژاند. حەماسەتێکی هێندە زیادی دەرخست دەتوت لە سەر سەکۆی پەرلەمان وتار دەدات و نایەوێت کەسێك قسەکانی پێ ببڕێت!

هەستم بەو ماندووبوونە کرد کە دووچاری بوو.. بۆیە ویستم ئەم باسە حەماسییە بگۆڕم و، پێم وت:

ئایا بەڕێزتان لە دادگا بێزار بوون؟

وتی: "ئایا لە یاساکاندا دەقێك هەیە کە فێرکردنی ئایین و، پابەندبوونی ئافرەتان و خوشکانی بەڕێزمان بە پاراستنی داوێنپاکی و شەرەفی خۆیان، لە بازنەی پەروەردەی ئیسلامیدا، بە تاوان دابنێت؟

دەبا ئەو مامۆستایانەی زانکۆ کە بەم زانستە و بە مافەکانەوە سەرقاڵن، وەڵامی ناوەرۆکی ئەوە بدەنەوە و، ناوەرۆکی ئەوەش کە وشەی: "ئەو ڕاستییەی هاتە دڵەوە" دەکات بە بەڵگەیەك لەسەر دامەزراندنی دەسەڵاتێکی کەسی"[1]!

لەم دیدارەی مامۆستادا کاتێکی زۆرمان بەسەربرد.. کە مۆڵەتی خواحافیزیم خواست، کات زۆر درەنگ بوو.

---

(١) مامۆستا نوورسی لە چەند شوێنێکی پەیامەکانیدا بۆ گوزارشت لەو سنووحاتە ئیلهامییانەی لە ئاسۆی دڵیدا هەستی پێ دەکردن، ئەم جۆرە دەستەواژەیەی وەك: "ئەم ڕاستییە هاتە دڵمەوە"ی بەکاردەهێنا. داواکاری گشتیش لە دادگادا دەیویست ئەوە بکات بە بەڵگە بۆ تاوانبارکردنی مامۆستا نوورسی کە دەیەوێت خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە! (وەرگێڕ)

## ❑ سەعیدی نوور و قوتابیانی

به پێنووسی: شاعیر و ئەدیب "عوسمان یوکسەل"[1]

پیرێکی بە تەمەن و بەختەوەر، کە خەڵك هەر لە تەمەنی هەشت ساڵی‌یەوە هەتا تەمەنی هەشتا ساڵی لە دەوری کۆ دەبنەوە..

کەسانی دەوروبەری، تەمەن و ژیری و کاریان جۆراوجۆرە.. بەڵام لەسەر یەك شت کۆدەبنەوە، کە بریتی‌یە لە ئیمان بە خوای پەروەردگاری جیهانیان و، بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ﷺ و، بە کتێبە مەزنەکەی..

هەموو یەکێکی ئەوان بە وێنەی کەسێك دەبینیت کە شتێکی ون کردبێت و دوایی دۆزیبێتیەوە!

کاتێ دەڕوانیتە سەعیدی نوور و قوتابیانی، وا هەست دەکەیت کە لە باشترین سەدەی ئیسلامدا دەژییت، دەڵێی قورئان هەر ئێستا بە تازەیی نازڵ دەبێت.. ڕوخساریان نوورە.. ناوەوەیان نوورە.. هەموویان لە دڵنیایی و هۆشیاریدا دەژین. دەسا ئەو بەختەوەری‌یە چەندە مەزنە کە لە پەیوەست بوونی مرۆڤدا هەیە بە بەدیهێنەری بەرز و پاك و هەمیشە ئامادە و بینەری گەردووندا!

گرتنەبەری ڕێی ئەو، تەنانەت شەیدابوونیشی چەندە جوانە!

سەعیدی نوور پیرێکە شارەزای ڕووداوەکانی ڕۆژگار و، هاوچەرخی سێ سەردەم بووە کە سیستەمی مەشرووتیەت و، حکوومەتی ئیتیحاد و تەرەقی و، سەردەمی کۆماری‌یە..

ئەمانەش چەند سەردەمێکی پڕاوپڕن لە کودەتا و گۆڕانکاری و وێرانکاری! شتێك نەما کە دارمانی بەرنەکەوێت.. تەنیا پیاوێك نەبێت کە بە پێوە ڕاوەستا.. پیاوێك لە لوتکەی چیاکانی ڕۆژهەڵاتەوە کە خۆری لێ هەڵدێت، هات بۆ ئەستەمبوڵ و ئیمانێکی دامەزراوی بە وێنەی چیاکانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو.

---

(١) عوسمان یوکسەل (١٩١٧-١٩٨٣ز) ڕۆژنامەنووسێکی ئازا و بوێر بووە و، گەلێ کتێبیشی داناوە. گۆڤاری "سەردەن گێچتی" واتە "گیانفیدا"ی دەرکردووە و، لەسەر وتارەکانی لەو گۆڤارەدا براوە بۆ بەندیخانە. لە ساڵەکانی (١٩٦٥-١٩٦٩ز) بۆ ئەندامێتیی پەرلەمان هەڵبژێرراوە.

ئەم پیاوە سنگ و هەناوی پڕ لە ئیمانی خۆی کرد بە قەڵغان و بەربەستێکی توندوتۆڵ لە بەردەم خراپکارانی هەرسێ سەردەمەکەدا و، بەردەوام بانگهێشتی خەڵکی تەنها و تەنها بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکرد.

سەرێکی بڵندی وەکو لوتکەی ئاراراتی هەیە کە هیچ ستەمکارێك پێی نەوی نەکردووە و هیچ زانایەکیش بەسەریدا سەرنەکەوتووە. بە وێنەی بەردەکان توندوتۆڵە و خاوەنی ویستێکی بەهێزی سەرسوورهێن و زیرەکی‌یەکی چەشنی هەورە بروسکەیە..

ئا ئەمەیە سەعیدی نوور!

هیچ کام لە دادگا سەربازی و مەدەنی‌یەکان و، کودەتا و شۆڕشەکان و، سەکۆی سێدارەکانیش کە بۆی دانران و، فەرمانەکانی دوورخستنەوەی، نەیانتوانی ئەم مرۆڤە مەزنەی بیروباوەڕە مەعنەوی‌یەکان، لە بانگەواز و ڕێڕەوی خۆی لابدەن!

بە ئازایەتی و هێزێکی بێ کۆتایی هەڵقوڵاوی ئیمان بەرەنگاری هەموو ئەوانە بووەوە.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران: ١٣٩)..

دەڵێی ئەم گوفتارەی خوای گەورە لە سەعیدی نووردا دەدرەوشێتەوە.

بەرگری‌یەکانی ئەوم خوێندەوە کە لە دادگاکاندا کردوویەتی.. هەرگیز بەرگری لەخۆکردن نەبوو، بەڵکو بەرگری بوو لە بانگەوازێکی مەزن و، شایەتی بوو لەسەر توندوتۆڵی و بوێری و زیرەکیی ئەو!

"سوقرات" لەبەر چی پلەیەکی بەرزی بەدەست هێنا؟ ئایا هی ئەوە نەبوو کە لە پێناوی بیر و هزردا ژیانی لە پێش چاودا بچووك بووەوە؟

سەعیدی نوور لانی کەم هاوتای سوقراتە. بەڵام دوژمنانی ئیسلام هەوڵیان دا بە ناوزەدی "کۆنەپەرست" و "خۆبەزانازان" بە خەڵکی بناسێنن. چونکە لە ڕوانینی ئەواندا دەبێ مرۆڤی بەرز کەسێکی بیانی بێت!

لە دادگایەکەوە دەبرا بۆ دادگایەکی تر، بەڵام لەو کاتەدا کە مەحکووم بوو خۆی حوکمی دەکرد.. لە بەندیخانەیەکەوە دەیانگواستەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر، بەڵام بە

هیممەتی بەرزی ئەو بەندیخانەکان دەبوونە قوتابخانەی یووسفی. سەعیدی نوور بەندیخانەکانی کردە نوورخانە و دڵەکانیشی پڕکرد لە نوور.

بکوژە سەرسەختەکان و دوژمنە دڵ ڕەقەکانی ئارامی و ڕەوشت، لە بەردەم ئەم کۆشکی ئیمانەدا توانەوە.. دەڵێی بەدیهاتوویەکی سەرلەنوێن.. بوون بە چەند ئیمانداریکی ئاشتیخواز بۆ خەڵکی و هاووڵاتیی چاکەویست!

جا ئایا قوتابخانەکانتان و ڕێبازە پەروەردەییەکانتان، توانیویانە یان دەتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن؟

لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دوور خرایەوە.. کەچی بۆ هەر شارێك دوور دەخرایەوە ئەوێ دەبووە نیشتمانی! دەڕۆشتە هەر شوێنێك کۆمەڵێك ئیمانداری پاك دەورەیان دەدا. سەرجەم یاساکان و یاساغەکان و پۆلیس و جەندرمەکان و دیوارە ئەستوورەکانی بەندیخانەکان دەستەوسان مان لەوەی کە لە برا ئیماندارەکانی جیا بکەنەوە. ئیتر بەهۆی ئایین وعیشق و ئیمانەوە ئەو چرووپرییە ماددی و کەڵەکەبووە، لە نێوان ڕابەری مەزن و قوتابییەکانیدا دەبوونە ڕوونی و نەرمونیانی!

هەڕەشە و سنوور دانانەکانی هێزی نابینا و ماددەی مردوو، چەندین شەپۆلی بەردەوامیان لە دەریای جیهانی ڕۆحدا بەجێ هێشت کە سنووری ژووری گوندەکانیان بەزاند، تاکو هەموو لایەکی گۆی زەوی بگرنەوە و لە دەرگای زانکۆکانیش بدەن.

ئەو ڕۆڵانەی نیشتمان کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پیرۆزییەکانیان پێشێل کرا و، ئەو نەوە و وەچانەش کە بڕیاری لەناوبردنیان بۆ دەرکرا و تاسەمەندی ئیمان بوون، بە پەلە بەرەو ڕێگا و نوورەکەی ئەو ڕۆشتن.

پەیامەکانی نووری مامۆستا، لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی دیکە و لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی ڕۆشتن و بڵاوبوونەوە. ئیتر هەموو کەسێکی لاو یان پیر، نەخوێندەوار یان خوێندەوار، بچووك یان گەورە، لەو ڕوناکییەی وەرگرت و، هەر قوتابییەکی نووریش بە وێنەی مەکینەیەك یاخود چاپخانەیەکی لێ هات. بەمەش ئیمان تەحەددای پیشەسازیی کرد و، هەزاران نوسخە لە پەیامەکانی نوور بە دەست نووسرانەوە!

ئەو نابینایانەی کە بەسیرەت ورووناکیی گیانیان کوژابووەوە و بووبووە کەلاوە، لەم رووناکی‌یە سڵەمینەوە.

بۆیە ئەم مەردە سەربەرزەیان بە بیانووی دژایەتیی شۆڕش و عەلمانیەت - کە بێزار نابن لە جوینەوەی - بەرەو دادگاکان و بەندیخانەکان ڕاپێچ کرد. تەنانەت چەند جارێکیش هەوڵیان دا ژەهرانخواردی بکەن و کۆتایی بە ژیانی بهێنن. بەڵام ژەهرەکانیان بۆ ئەو بوو بە دەرمان و بەندیخانەکانیشیان بە قوتابخانە!

ئەو رووناکی‌یەی کە ئەم زاتە مەشخەڵەکەی هەڵگرت، واتە نووری خوا و نووری قورئان، سنووری نیشتمانی تێپەڕاند و بە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووەوە.

ئێستا لە تورکیادا هێزێك هەیە پێویستە کە هەموو دەستەیەکی کۆمەڵگا و سەرجەمی ئەو هاووڵاتی‌یانەش کە نیشتمانی خۆیان خۆش دەوێت، بەوپەڕی ڕێزەوە لە بەردەمی ڕابووەستن.. ئەویش سەعیدی نوور و قوتابیانیەتی..

ئەوان نە کۆمەڵە و نە دەستە و نە پارتن. هەروەك هیچ زەوی و بارەگایەکی دیاری کراویان نی‌یە و، دەنگی خۆیشیان بە قرە و غەڵبە و وتار و خۆپیشاندان و شەرە جنێو بەرز ناکەنەوە. ئەوان کۆمەڵێکی ئیماندار و هۆشیار و دامەزراون لەو ناسراوە نادیارانەی کە خۆیان بۆ ئەم بانگەوازە مەزنە یەکلایی کردووەتەوە.

## ساڵی ١٩٥٣ز

دوای بڕیاری بێ تاوانیی مامۆستا نوورسی لە دادگای ئەستەمبووڵ، گەڕایەوە بۆ ئەمیرداغ.

ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزان لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە و، بە تەنیا خۆی لە باخەکانی دەوروبەری شار پیاسەی دەکرد. هاوکات سێ پۆلیس و عەریفەکەیان شوێنی کەوتبوون.

نەیتوانی گەڕانەکەی تەواو بکات، چونکە ئەوانە گەیشتنە سەری و، داوایان لێ کرد "شەپقە" لەسەر بکات! کاتێکیش بردیان بۆ فەرمانگەی پۆلیس، مامۆستا نارەزایی لەم ڕەفتارە دەربڕی و، عەرزوحاڵێکی بۆ وەزارەتی داد و وەزارەتی ناوخۆ نارد لە

ئەنقەرە، کە تیایدا ئەم ڕەفتارە هەڵەشەیەی ڕیسوا کرد. هەروەك وێنەیەکی ئەم عەرزوحاڵەی نارد بۆ یەکێك لە قوتابیانی لە ئەنقەرە، تاکو لە فەرمانگە ڕەسمی‌یەکاندا بەدواداچوونی بۆ بکات و بیگەیەنێتە ئەو پەرلەمانتارانەی کە بایەخ بە ڕووداوەکە دەدەن.

لە ئەنقەرە هەندێ لە قوتابی‌یەکانی بڕیاریان دا کە وێنەیەکی ئەم عەرزوحاڵە بنێرن بۆ ڕۆژنامەیەکی ئیسلامی کە لە شاری سامسۆن بە ناوی "مەزنترین جیهاد" دەردەچوو.. ئەوەبوو لەوێ بڵاوکرایەوە.

لەم کاتەدا ڕووداوی ڕۆژنامەنووسی ناسراو "ئەحمەد ئەمین یالمان"[1] ڕووی دا، ئەوەبوو لاوێکی موسڵمان ویستی بیکوژێت و چەند فیشەکێکی پێوەنا، بەڵام هیچیان شوێنێکی ئەوی نەپێکا پێی بمرێت.

هەموو گۆڤار و ڕۆژنامەکانی دژ بە ئیسلام، کە ئەو کەش و هەوای ئازادی‌یە کەمەیان پێ ناخۆش بوو بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکانی ناو تورکیا خەریك بوو پشووی تێدا بدەن، ئەو ڕووداوەیان زۆر بە گەورەیی قۆستەوە و، ویستیان ئەوە پیشان بدەن کە بەخشینی ئازادی بەم چەشنە جموجووڵانە ئەنجامەکەی سەرهەڵدانی کۆنەپەرستی و تیرۆر و.. هتد دەبێت!

ئەوەش هەڵمەتێکی ڕۆژنامەوانیی هێندە ترسناك بوو کە پیاوانی پارتی دیموکراتیی دەسەڵاتدار نەیانتوانی خۆیانی لە بەردەمدا ڕابگرن، جگە لە بوونی باڵێکی دژ بە ئیسلامیش لەم پارتەدا. بۆیە فەرمان بە داخستنی سەرجەم ڕۆژنامە و گۆڤارە ئیسلامی‌یەکان و، دەستگیر کردنی گشت نووسەر و بیرمەندە موسڵمانە کارگوزارەکانیان دەرچوو.

لەم هەڵمەتی گرتنەدا بەڕێوەبەری بەرپرس لە ڕۆژنامەی "مەزنترین جیهاد" و یەکێك لە قوتابیانی نوور کە بەڕێز "مستەفا صونگور"ە، دەستگیر کران و، پێکەوە بران بۆ

---

(١) ئەحمەد ئەمین یالمان (١٨٨٨-١٩٧٢ز) ڕۆژنامەنووسێکی ناسراوە لە پیێری "دۆنمە" کە تیرەیەکی جوولەکەن بە ڕواڵەت خۆیان بە موسڵمان دەناساند، بەڵام بە نهێنی لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆیان مابوونەوە. ئەوانە لەبەر ئەوەی لە ڕووی ئابووری و سیاسی‌یەوە چەندین بناغەی توندوتۆڵیان لە وڵاتدا هەبوو، ئەوا توانی‌یان ڕۆڵێکی ویرانکارانەی گەورە لە تورکیادا ببینن. تۆماری ئەم ڕۆژنامەنووسەش - بە تایبەتی - پڕ بوو لە دژایەتی کردنی ئیسلام. ڕۆژنامەی "تان"ی دەرکردووە و هەر خۆیشی سەرنووسەری بووە.

دادگای شاری سامسۆن، دادگاش بڕیاری لـە دژ دەرکـردن. بـەڵام دادگـای تـەمییز ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە و لە لایەن خۆیەوە بڕیاری بێ تاوانیی بۆ دەرکردن.

هەر لەم کاتانەدا چەندین بەیاننامە و ڕا و بۆچوون لە ڕۆژنامەکاندا بـڵاو دەکرانـەوە لە دژی فراوانبوونی بزووتنەوەی نـوور لـە وڵاتـدا. هـەروەك لـە بیسـت و پێنـج ناوچـەی تورکیـادا پشـکنین دەستی پێ کـرد و، داوای یاسایی لەسـەر کرایـەوە. ئامانجیشـیان دەرکردنـی بڕیـار بـوو لـە دژی شـەش سـەد کـەس لـە قوتابیـانی نـوور، کـەچی نـە هیـچ تاوانێکیـان دۆزیـیەوە و، نـە شتێك ببێتـە مایـەی تۆمـەتبارکردنی پەیامـەکانی نـوور و قوتابیانی!

لە شاری سامسۆن داوایەکی یاسـایی لـە دژی مامۆستا بـەدیعوززەمان کرایـەوە، بـە هۆی وتارێکیەوە کە بە ناونیشانی "گەورەترین بەڵگە" لە ڕۆژنامەی "مەزنترین جیهاد"دا بڵاوکرابووەوە و، داوای لـێ کـرا ئامادەی بـەردەم دادگـای "سامسـۆن" بێـت. بـەڵام مامۆستا لەو کاتەدا گەلـێ نەخۆش بوو، وێڕای بەرەو پێش چوونی تەمەنیشی.

خۆ هەرچەندە لە فەرمانگەی پزیشکیی شارۆچکەی "ئـەمیرداغ" و شـاری "ئەسـکی شەهر"ەوە پشتگیریی پزیشکیی بەدەست هێنابوو کە توانای سـەفەرکردنی نیـیە، کـەچی دادگای سامسۆن جەختی لەسەر ئامادەبوونی دەکردەوە!

لـە ئـەنجامی ئـەم جـەخت کردنـەی دادگـادا، مامۆسـتا بـەدیعوززەمان بـەرەو ئەستەمبووڵ[1] کەوتـەڕێ بـەو نیـازەی کـە لـەوێوە بـڕوات بـۆ سامسـۆن. بـەڵام دوای

(١) مامۆستا نوورسی نزیکـی سێ مـانگ – لـە سـەرەتای مـانگی پێنجەوە بۆ کۆتایی مـانگی حـەوت – لـە ئەستەمبووڵ مایەوە، زۆربەی ئەو ماوەیەشی لـە مـاڵی یـەکێك لـە قوتابیـیە نزیکـەکانی بـردە سـەر کـە "محەممەد فرنجی"یە.

ئەو ساڵە (١٩٥٣ز) شاری ئەستەمبووڵ خۆی بۆ ئاهەنگ گێڕان ساز دەکرد بە بۆنـەی تێپـەڕبوونی پێنـج سـەد ساڵ بەسەر "فەتح کردنی"دا. لـەوەبوو ئاهـەنگێکی شـکۆدار سـازکرا و، مامۆستا بـەدیعوززەمانیش لـە نێـوان بانگهێشت کراوەکاندا بوو.

مامۆستا بـەدیعوززەمان لـەم ئاهەنگـەدا "ئاشـنۆکراس"ی "بـەتریرك"ی ڕۆمـەکانی بینـی و، ئـەم گفتوگۆیـەی خوارەوە لە نێوانیاندا ڕووی دا:

سەعیدی نوورسی: دەکرێ ڕۆژی قیامەت لە ڕزگاربووان بن، گەر باوەڕتـان بـە ئـایینی ڕاستەقینەی نەسرانی بێت، بە مەرجی دان نانتان بە پێغەمبەرایەتیی سەروەرمان محەممەد ﷺ و بەوەش کە قورئانی پـیرۆز کتێبێکـە لـە لایەن خوای گەورەوە.

بەتریرك: من دان بەوەدا دەنێم!

گەیشتنی بۆ ئەستەمبووڵ نەخۆشی‌یەکەی زیادی کرد و لە توانایدا نەبوو لە سەفەرەکەی بەردەوام بێت، بۆیە لە دام و دەستەی پزیشکی‌یەوە ڕاپۆرتێکی پزیشکیی بەدەست هێنا و ناردی بۆ دادگا.

ئەم ڕاپۆرتە پشتگیریی ئەوەی دەکرد کە حاڵی مامۆستا بەدیعوززەمان هەرگیز نە لە وشکایی و نە لە دەریا و نە لە ئاسمانەوە بواری سەفەرکردنی پێ نادەن.

وێڕای ئەم ڕاپۆرتە پزیشکی‌یە ڕوون و بێ گومانە، داواکاری گشتی بە توندی داوای ئامادەبوونی بەدیعوززەمانی لە بەردەم دادگادا دەکرد. بەڵام دادگا بە پشت بەستن بەم ڕاپۆرتە، بڕیاری دا لە بریی سامسۆن، دادگای ئەستەمبووڵ لێپرسینەوە لە مامۆستا نوورسی بکات.

❑ بەرگری لە بەردەم دادگای ئەستەمبووڵدا

"دوژمنە پەنهانەکانمان جارێکی تر لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا فەرمانگەکانی دادیان لە دژم خستەوە کار. مەسەلەکە لە ڕاستیدا پەیوەندیی بە کۆمەڵێکی پەنهانی شیووعی‌یەوە هەیە. ئەوەبوو لە کردارێکی تەواو دژ بە یاسادا سێ سەربازی چەکداری جەندرمە و عەریفێکیان ناردە سەرم کاتێ کە من بە تەنیا و بێ هیچ هاوڕێیەك لە دەشت و چیاکاندا دەگەڕام، وتیان: "تۆ شەپقە لەسەر ناکەیت"! ئنجا بە زەبر و زۆر منیان برد بۆ فەرمانگەی پۆلیس.

منیش بە هەموو دام و دەستەی داد کە دادپەروەری‌یان مەبەستە، دەڵێم:

ئەوانەی ماوەی دوو ساڵە بە بڕوبیانووە بێ نرخ و دژایەتی‌یە سەیر و سەمەرەکەیان بۆ یاسا، ئازاری ویژدانیم دەرخوارد دەدەن، لە دەست سزای دادگای هەرە مەزنی حەشر

---

سەعیدی نوورسی: زۆر باشە.. ئەی ئایا لە بەردەم سەرۆکە ڕۆحانی‌یەکانی تردا ئەمە ڕادەگەیەنیت؟

بەتریرك: بەڵێ، من ئەمە دەڵێم. بەڵام ئەوان قبووڵی ناکەن! (ش: ١/٤٠٥)

هەر لەم ماوەیەدا خۆرهەڵاتناسێکی ئینگلیز هات بۆ ئەستەمبووڵ و، موحازەرەیەکی سەبارەت بە "حەوت ئاسمانەکان" پێشکەش کرد، بە نیازی بڵاوکردنەوەی گومان لە بارەیانەوە. یەکسەر قوتابیانی نوور لە ڕۆژی دووهەمدا بڵاوکراوەیەکیان دابەش کرد لە هۆڵەکەدا کە لێکدانەوەی مامۆستا نوورسیی لەخۆ گرتبوو سەبارەت بە حەوت ئاسمانەکان لە کتێبی "ئاماژەکانی ئیعجاز"دا. کاتێ خۆرهەڵاتناسەکە ئەو بڵاوکراوەیەی بینی، موحازەرەکەی ئەو ڕۆژەی کورت کردەوە و، کۆتایی بەو زنجیرە موحازەرەیە هێنا کە بڕیار بوو پێنج ڕۆژ بخایەنێت و، ئەستەمبوولی بەجێ هێشت، بێ ئەوەی بگەڕێتەوە!

(لە شایەتی‌یەکانی محەممەد فرنجی)یەوە. (ش: ٤/٢٥٦)

دەربازیان نابێت. چونکە دەبوو لە ڕاستیدا ئەوانیان بە کرداری پێچەوانەی یاسا تۆمەتبار بکردایە، لەبەر ئەوەی لە پێنج ڕووەوە بە ناوی یاساوە هەر خۆیان یاسا پێشێل دەکەن و، لە پێنج ڕووشەوە دەستدرێژی دەکەنە سەر یاسا ئیسلامی‌یەکان.

بەڵێ.. ئایا لە سەرانسەری زەویدا یاسایەك هەیە مرۆڤێك تاوانبار بکات کە سی و پێنج ساڵە گۆشەگیر و دوور لە بازاڕ و ئاوەدانی‌یەکانە، لەبەر ئەوەی شەپقەی ئەورووپاییەکانی لەسەر نەکردووە؟

هەر کەسێك کێشی گەردیلەیەك ویژدان لە دڵیدا هەبێت، دڵگران دەبێت و نەفرەت دەکات لەوەی کە بە هێزی یاسا داوای لەسەرکردنی شەپقە لە پیاوێك بکرێت تاکو لە قەشە بیانی‌یەکان بچێت! لە پیاوێکی گۆشەگیر کە تێکەڵاویی خەڵك ناکات و، نایەوێت لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ڕۆحی خۆی بە شتێکی ناشیرینی وەك ئەمە و بە پێچەوانەی یاساوە سەرقاڵ بکات و، لە بینینی هاوڕێیانی دادەبڕێت، تاکو دنیای نەیەتەوە یاد. تەنانەت سەرباری سەختیی نەخۆشی‌یەکەی، پزیشکێك بانگ ناکات بۆ پشکنینی و دەرمانیش وەرناگرێ، تاکو دڵ و گیانی بە جەستەیەوە سەرقاڵ نەبن. لە کاتێکدا کە ماوەی بیست و هەشت ساڵە پۆلیسی پێنج دادگا و پێنج ویلایەت کاریان بەوە نەبووە کە چی لەسەر دەکات.

بە تایبەت ئەم جارەی دوایی، لە دادگای دادپەروەری ئەستەمبوولدا لە بەرچاوی زیاتر لە سەد پۆلیس و، گەڕانی بە پێ بۆ ماوەی دوو مانگ بە ویستی خۆی، کەس داوای لەسەرکردنی شەپقەی لێ نەکرد.

خۆ هەرچەندە دادگای تەمییز بڕیاری ئەوەی دا کە یاسا مۆڵەتی لەسەرکردنی "کڵاو"ی لە بری "شەپقە" داوە و.. بڕیاریشە ئافرەتان و کەسانی سەر ڕووت و سەربازەکان و کارمەندە ڕەسمی‌یەکان ناچار نەکرێن بۆ لەسەر کردنی شەپقە. کەواتە هیچ بەرپرسیارێتی‌یەکی یاسایی ناکەوێتە ئەستۆی کەسێك "کڵاو" لەسەر بکات و، بە پۆشاکێکی ڕەسمی دانراوە. ئنجا منیش کارمەند نیم.

گەر بەرپەرچی ئەمەی بەوە دایەوە کە بڵێ:

من کەسێکی کار پێ سپێرراوم و فەرمان جێبەجێ دەکەم.

ئەوا پێی دەوترێ:

ئایا بە پێی هەوا و ئارەزوو فەرمان بەسەر خەڵکدا دەدرێت، تاکو ببێتە یاسایەکی سەپێنراو، ئنجا بەوە داکۆکی لە خۆی بکات کە فەرمانی پێدراوە؟
ئایەتێکی قورئانی پیرۆز نەهی لە لاسایی کردنەوەی گاور و جوولەکەکان دەکات.
هەروەك ئەم ئایەتەش لە قورئاندا هەیە کە دەفەرموێ:
﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾ (النساء: ٥٩).
واتە فەرمان بە گوێڕایەڵیی کاربەدەست دەدات، بە مەرجێك ناساز نەبێت لەگەڵ گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەردا ﷺ. ئیتر دەتوانێت بە شێوەیەك ڕەفتار بکات کە جێبەجێ کردنی ئەو گوێڕایەڵی‌یەی تێدا بێت.

لە کاتێکدا کە یاساکانی نەریتی ئیسلامی لەم مەسەلەیەدا فەرمانی سۆز و شەفەقەت دەدات بەرامبەر نەخۆشەکان و ئازار نەدانیان، هەروەها میهرەبانی بەرامبەر کەسانی غەریب و، دوورەپەرێزی لە ئازار پێگەیاندنی ئەوان و خزمەتگوزارانی قورئان و زانستەکانی ئیمان لە پێناوی خوادا.

داوای لەسەرکردنی شەپقەی قەشەکان لە پیاوێك کە لە خەڵك دوورکەوتبێتەوە و دەستی لە دنیا تەکاندبێت، خۆی لە خۆیدا، بە کارێکی پێچەوانەی یاسا، هەڵوەشاندنەوەی یاسایە. هەروەها لە سەد ڕووەوە، نەك دە ڕوو، دەست بەسەردا گرتنی یاساکانی ئیسلامە و، دەستدرێژی‌یەکە - لە پێناوی فەرماندان بە ئارەزوو - بۆ سەر ئەو یاسا قودسی‌یانە.

جێی هیچ گومانێك نی‌یە کە ڕەفتارێکی وەکو ئەمە، لەگەڵ پیاوێکدا کە گەیشتووەتە لێواری گۆڕ و، نەخۆشی و پیری ماندوویان کردووە و، غەریب و دابڕاوە لە خەڵك و، ماوەی سی و پێنج ساڵە وازی لە دنیا هێناوە، تاکو ڕەفتاری پێچەوانەی سوننەتی پیرۆز نەکات..

بێ گومان ئەو ڕەفتارە لەگەڵ ئەم پیاوەدا، بەرهەمی پیلانێکی چەپەڵە لە دژی وڵات و گەل و ئیسلام و ئایین، لە بەرژەوەندیی ئاژاوەگێڕی و شیوعیەتی پشتی پەردەدا. هەروەها لە دژی پەرلەمانتارە دیندارەکان، تەنانەت بە شێوەیەکی گشتی لە دژی ئەو دیموکراتی‌یانەش کە نیازیان وایە خزمەتی ئیسلام و نیشتمان بکەن و، بەگژی وێرانکاری‌یە ترسناکەکانی بیانی‌یەکاندا دەچنەوە.

دەبا پەرلـەمانتارە ئاییندارەکـان وریـا بـن.. لـە داکۆکـی کردنـدا لـە دژی ئـەم پلانـە چەپەڵە، من بە تەنیا نەهێڵنەوە!

ئەو گیانفیدا خزمەتگوزارەی حەقیقەتی قورئان کە هیچ کاتێك سـوو کایەتیی قبـووڵ نەکردووە و..

ڕێزی لە سەرکردەی هێزەکـانی ڕووس نـەگرت و لـەبـەری هەڵنەسـایەوە، هەرچـەند سێ جاریش بە ئەنقەست بە بەردەمیدا هات و ڕۆشـت و، لـە پێنـاوی پاراستنی عیززەتی ئیسلامدا سـەری خـۆی بڵنـد ڕاگـرت لـە بەرامبـەر هەڕەشـەی لەسـێدارەدان و، لەبـەر پارێزگاریی شەرەفی ئیسلام گاڵتەی بە هەڕەشەی ئیعدام کرد و..

ڕووبەڕووی سەرکردەی ئەو ئینگلیزانە بووەوە کە ئەستەمبوولیان داگیرکرد و..

لە دژی ئەوانەش ڕاوەستا کە لە ژێر کاریگەریی ئینگلـیزدا فـەتوایان بـۆ دەردەکـرد، بەوەی کە لە چاپ کراوەکاندا پێی وتن:

"تف بکەنە ڕووی بێ شەرمی ستەمکاران"!!

هەروەك لە بەردەم پەنجا پەرلەمانتار و لە ئەنجومەنی نوێنەراندا ئاوڕی لە تووڕەبوونـی مستەفا کەمال نەدایەوە و، پێی وت: "کەسێك واز لە نوێژ بهێنێت خیانەتکارە." و..

لە بەردەم دادگای عورفی سەربازیدا مەرایی نەکرد و، لە وەڵامیاندا وتی:

"من ئامادەم گیانی خۆم لە پێناوی تەنها یەك مەسەلەی شەریعەتدا بەخت بکەم" و..

بیست و هەشت ساڵ ژیانی گۆشەگیریی هەڵبژارد، تاکوکارێك نەکات لـە کـافران بچێت..

ئەم کەسە.. گەر بە ڕاشکاوی و پێچەوانەی یاسا پێی بوترێت:

"دەبێ شەپقە لەسەر بکەیت، تاکو لە حاخامی جوولەکە و قەشەی گاوران بچیت و، ڕەفتار بە پێچەوانەی کۆدەنگیی زانایانی ئیسلام بکەیت، دەنا سزا دەدرێیت"..

ئەوا ئەو کەسە بێ هیچ دوودڵییەك و بە شایەتیی مێژووی ژیـانی، سـەد جـار ڕۆحـی خۆی دەکاتە قوربانی حەقیقەتی قورئان، تەنانەت گەر پارچە پارچەشـی بکـەن و بیخەنـە ئاگرێکی گەورەی وەك دۆزەخەوە، چ جای بەندیخانە و ئازار و سزای دنیا!

ئایا حیکمەتی ئەو هێزە مەعنەوییە چییە کە لـە خۆڕاگریی ئـەم گیانفیدایـەدا هەیـە بەرامبەر بە سەختترین ستەمی نەمرووديیانەی دوژمنـانی پەنـهانی نیشـتمان و ئـایین و، لـە

ڕووبەڕوو نەبوونەوەی ئەو هێزە ماددی‌یەی ئەواندا بە بەرپەرچدانەوەی وێرانکاریی ماددی؟

وا من بۆ ئێوە و سەرجەمی خاوەن ویژدانەکانی ڕادەگەیەنم کە:

قورئانی حەکیم ئەوەی فێرکردووە! تاکو نەوەد کەسی بێ تاوان بەهۆی چەند مولحیدێکەوە کە ڕێژەیان لە سەدا دە تێناپەڕێت، زیانیان پێ نەگات و، لە پێناوی پاراستنی ڕێسا و ئاسایشی ناوخۆ بە هەموو هێزێکی و، لەبەر دانانی پاسەوانێك لە دڵی هەموو مرۆڤێکدا بە وانەکانی نوور.

گەر ئەوە نەبوایە، لە ماوەی یەك ڕۆژدا تۆڵەی خۆمم لە هەموو ئەو دوژمنانەم دەسەندەوە کە ماوەی بیست و هەشت ساڵ ستەمیان لێ کردم!

دەبینیت لەبەر پاراستنی ئاسایش و لە پێناوی بێ تاوانەکاندا، لە دژی ئەوانەی سووکایەتی بە ڕێز و سەربەرزی دەکەن، بەرگری ناکات و، دەڵێت:.

"من ئامادەم لە پێناوی موسڵماناندا ژیانی دنیام بەخت بکەم، تەنانەت ژیانی ئەو دنیاشم، ئەگەر پێویست بکات"!

لە کۆتاییدا و دوای تەواوبوونی ڕێ و ڕەسمە پێویستەکان، دادگا بڕیاری بێ تاوانیی دەرکرد، چونکە شتێکی ئەوتۆی لە وتارەکەدا نەبینی کە لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت.

## چەند قۆناغێکی جۆراوجۆری ژیانی لە ئیسپارتە

قوتابی‌یە چالاکەکانی نوور لە هەریەکەی شارەکانی "ئورفە" و "دیاربەکر"دا قوتابخانەیەکی نووریان دامەزراند و، بە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور بۆ ئامادەبووان لە هەموو توێژەکانی گەل، کە زۆربەیان لە قوتابیانی قوتابخانە و زانکۆکان بوون، دەستیان کرد بە وتنەوەی وانە زانستی‌یەکان. بەمەش قوتابیانی زانستە شەرعی‌یەکانیان بووژاندەوە کە بۆ ئەو ڕۆژگارە پێویست بوو، هەروەك خزمەتێکی ئیمانیی مەزنیان لە ناوچەکانی خۆرهەڵاتدا پێشکەش کرد.

دادگای "ئافیون"یش کۆتایی پێ هات، چونکە ڕاپۆرتی دەستەی شووڕای کاروباری ئایینی، کە وردبینیی لە پەیامەکانی نوور خرابووە ئەستۆ، لە ساڵی ١٩٥٦زدا تایبەتمەندیی ئەو خزمەتەی دەرخست کە لە تەواوکاریی ئیمانی و ڕەوشتیی پەیامەکانی

نووردا هەيە. ئيتر "دادگای ئافيوون" پشتی بەم ڕاپۆرتە بەست بۆ دەرکردنی بڕياری بێ تاوانيی پەيامەکانی نـوور و قەدەغـە نـەبوونيان. بەمـەش بڕيارەکـەی دادگـا سـيفەتی قەتعييەتی بەدەست هێنا.

دوای دەرچوونی بڕياری بێ تاوانی لە شـاری ئـافيوون، دادوەری لێکۆڵينـەوەش لـە شاری ئيسپارتە بڕيارێکی دەرکرد سەبارەت بە ناياسايی دادگايی کردنی پەيامەکان!

ئيتر "پەيامەکانی نوور" بەربەستەکانی "داد"يان تێپەڕاند و، ئازادی‌يـەکی گشتی‌يان بەدەست هێنا و، بە شێوەيەکی باش لە لايەن هەمووانەوە قبووڵ کران.

هاوکـات لەگـەڵ بـەردەوامبوونی خزمـەتی پەيامـەکانی نـوور لــە سەرانســەری ئەنادۆڵدا، قوتابخانەکانی نووريش تەنها لە ئەنقەرە و ئەستەمبووڵ و ديارب‌ەکر و ئۆرفـەدا قەتيس نەمابوون، بەڵکو تەشەنەيان کرد بۆ ڕووبەرێکی فراوانی وڵات.

غيرەتمـەندان و قوتابيـانی زانکـۆ لـە ئەنقــەرە، هــەوڵی بڵاوکردنــەوەی کۆمەڵــە پەيامەکانی نووريان بۆ هـەموو لايـەکی وڵات دا، لـە ڕێـی چاپکردنيـان بـە پيتە تازەکـان (لاتينی) لە چاپخانەکاندا و، گەياندنيان بە جەماوەر بۆ ئەوەی سوودی لـێ ببينن.

❑ گەڕانەوە بۆ "بارلا"ی مەڵبەندی يادگاری‌يەکان!

دوای بەسەربردنی نزيکی سێ مانگ لە ئەستەمبووڵ، مامۆستا خوليای سەردانی ئەو شارانەی کەوتە دڵ کە چەند ماوەيەکی ئەوتۆی ژيـانی تێـدا بردبوونـە سـەر کـە هـەرگيز لەياد ناچن.

ئەوەبوو سەردانی "ئەميرداغ"ی کرد و، پاشان ڕۆشت بۆ "ئەسـکی شـەهر"، لـەوێوە بـۆ "ئيسپارتە" کـە هەشتا ڕۆژ تيـايدا مايـەوە. لەوێشـەوە بـە هاوڕێيـەتيی کۆمـەڵێك لـە قوتابيانی بۆ شارۆچکەی يادگاری‌يەکان "بارلا"..

ئەو شارۆچکەيەی کە يەکەم سەرهەڵدانی بزووتنـەوەی نـوور و پەيامەکانی نـووری بەخۆوە بينی و، هـەر لەوێشەوە "وتـەکان" و "مـەکتووبات" و "بريسـکەکان" بـە هـەموو لايەکدا بڵاوبوونەوە، کە نوورەکانی هيدايەتی قورئانی حەکيم دەنوێنن. چونکە "بـارلا" يەکەم مەڵبەندی قوتابخانەی پەيامەکانی نوورە..

ئـەو شـارۆچکەيەی کـە پێـش بيسـت و پێـنج سـاڵ بـۆ ئـەوێ دوورخرايـەوە، کـەچی خوای گەورە فەڕ و بەرەکەتی بەسەر ڕۆژگارانی دوورخستنەوەی ئـەودا بـاراند و، ئـەو

ڕۆژانەشی کرد بە ئازیزترین ڕۆژگارەکانی ژیان لە دڵیدا و، یادگارییەکانی ئەوێشی کرد بە خۆشەویستترین یادگارییەکان لە دەروونیدا.

وا ئێستا لە ڕۆژێکی سامالی بەهاردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ و، قورسایی ئەو ساڵە زۆرانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە کە لێوانلێوە لە هەڵوێست و تاقیکردنەوە و ڕووداوەکان.. دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ و هەندێ لە بەروبوومەکانی بانگەوازەکەشی لە دەورن کە چەند قوتابییەکن نوور لە ناوچاویاندا دەدرەوشێتەوە و، دڵیشیان لە خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ پڕ بووە.

خەڵکی ئەو شارۆچکەیە کە هەواڵی هاتنی مامۆستایان بیست، تێکڕا بە ژن و پیاو، منداڵ و لاویان ڕۆشتن بۆ پێشوازی و بینینی. تەنانەت منداڵە بچووکەکانیش لە خۆشیدا هەڵدەبەزینەوە و دەیانوت:

"مامۆستا هات.. مامۆستا هات"!

ئەوان ئەم مامۆستا بەویقارەیان نەدیوە، بەڵام هەواڵی ئەویان لە باوکان و دایکانیان بیستووە.

لەو کاتەدا کە مامۆستا بەرەو ئەو خانووە دەڕۆشت کە هەشت ساڵ تیایدا مایەوە و یەکەم قوتابخانەی نوور بوو، بە بەردەم ماڵی "مستەفا چاوش"ی قوتابیی دێرینی خۆیدا تێپەڕی، کە ئەو دارتاشە بوو ژوورە سەرنەگیراوەکەی لە نێوان لقەکانی ئەو درەختەدا بۆ دروست کرد، کاتەکانی پەرستش و تێڕامانی لەوێ بەسەردەبرد.

بە بەردەم خانووی قوتابییەکەیدا تێپەڕی و قوفڵێکی گەورەی بە دەرگاکەیەوە بینی! ئەو قوتابییە دێرینە بە وەفایەی لە ساڵی (١٩٣٧ز)دا و لەو کاتەی کە مامۆستا لە تاراوگەی قەستەمۆنی دەژیا، وەفاتی کردبوو. لەبەر ئەوە، لە دوای دەرچوونی مامۆستا لە بارلا بینینی ئەوی بۆ نەڕەخسا. مامۆستا خۆی بۆ ڕانەگیرا و فرمێسکەکان بە چاوانیدا هاتنە خوارەوە و سەرکوڵمی ئەویان تەڕکرد.

دواجار گەیشتە بەردەم خانووەکەی پێشووی.. بەردەم یەکەم قوتابخانەی کە درەختە خۆشەویستەکەی لە بەردەمیدا ڕاوەستابوو.. وەك بڵێی ئەویش بەخێرهاتنی بکات! لەم کاتەدا هەست و سۆزەکانی هاتنە جۆش و داوای لە قوتابیانی و لە خەڵکەکەش کرد کە ماوەیەك بە تەنیایی بەجێی بهێڵن..

پاشان ڕۆشت بەرەو ئەو درەختەی کە هەشت ساڵ زیاتری لەگەڵدا بردبووە سەر، باوەشی پێدا کرد و ماوەیەکی درێژخایەن گریا..

ئەم درەختە پارچەیەك بوو لە ژیانی.. لە یادگارییەکانی..

چەندەها شەوی لەناو لق و پەلەکانیدا بە شەونوێژ و یادی خوای گەورە بەسەربرد!

چەندین سەعاتی لەگەڵدا گوزەراند کە پەیامەکانی نووری دادەنا و، گوێی لە خشەی گەڵا و پەلەکانی و جریوەی باڵندەکانی دەبوو..

چەندەها شەوگاری تاریك و درێژخایەنی زستان لە ژوورەکەیدا خەوی لێ دەزڕا و، لەو تەنیاییەدا هیچ هاودەمێکی نەبوو جگە لە دەنگی ئەم درەختە کاتێ با هەڵی دەکرد.. یان ئەو کاتانەی کە گوێی لە دەنگی دڵۆپەکانی باران دەبوو لەسەر گەڵاکانی، ئەوەش دەبووە هاودەم و خەمڕەوێن و دڵدەرەوەی لەو تەنیاییەدا و هاوڕێی لەو غەریبییەدا..

وا ئێستا دوای بیست ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ لای و بە دەستەکانی دەیەوێت لە ئامێزی بگرێت و لە دەمی پێ شادبوونەوەیدا خۆی بۆ ڕاناگیرێت و بەکوڵ دەگری!

دوای ئەوە، ڕۆشتە سەرەوە بۆ ناو ژوورەکەی..

لەوێ نزیکی دوو سەعات بە تەنیایی مایەوە.. دەگریا و، یادی ئەو ڕۆژگارە درێژانەی دەکردەوە کە لەوێ بەسەری بردبوون..

قوتابیانی و ئەو خەڵکەش کە لە دەوری خانووەکە گوێیان لە دەنگی گریانی مامۆستا بوو، ئەوانیش چاوەکانیان پڕ دەبوو لە فرمێسك.

ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە درەوشانەوەی میهرەبانیی بێ پایانی خوا دەردەخات.

ئەوەبوو لە کاتێکی پێشووتردا لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵەوە بۆ دەورووبەری ئیسپارتە و، لەوێشەوە بۆ "بارلا"ی ناو چیاکان دوورخرایەوە، تاکو لەوێ بمرێت و ناویشی نەمێنێت. کەچی ئەو ڕووداوە گرنگانەی سەردەم کە دەورانەوری گەلان و نەتەوەکانیان دا و، ژیری و بۆچوونەکانیان گۆڕی، ئەویان لە ڕێی بانگەوازی قورئان و ئیمان نەترازاند.

چونکە لە ناخی ڕۆحی خۆیدا، بە یەقینێکی ئیمانی، دڵنیابوو لەوەی کە ڕۆژێك دێت گەل ئەو حەقیقەتە لە ئامێز دەگرێت کە بانگەوازی بۆ دەکات و، ئەو تەنیا "سەعید"ە دەبێتە هەزار بەڵکو سەد هەزار سەعید و.. فتووحات و بڵاوبوونەوەی

ڕاستی‌یەکانی ئیمان، کە لەگەڵ مرۆڤایەتیدا دەدوێن، بێ هیچ گومانێك بەڕێوەیە و.. پەڵە هەوری ئەو تاریکی‌یەی کە دەوراندەوری ئاسۆکانی ئیسلامیان داوە، بە نووری ئەو هیدایەتەی لە قورئانەوە وەری گرتووە دەڕەوێتەوە و، جارێکی تر سەرلەنوێ ئەو ئیمانەی کە پێیان وایە بەرەو مردن دەڕوات، گیانی بە بەردا دەکرێتەوە. ئیتر دەروونەکان دەبووژێنەوە و ژیان بە بەر نەتەوەی ئیسلامدا دەکاتەوە.

## ساڵی ١٩٥٦ز

❐ دادگای ئافیوون بێ تاوانیی پەیامەکانی نوور ڕادەگەیەنێت

دادگای ئافیوون لە ساڵی (١٩٤٨ز)دا لیژنەیەکی لە شارەزایان پێکهێنا بۆ وردبوونەوە لە پەیامەکانی نوور و، ڕادەربڕین لەبارەیانەوە و، دەستنیشان کردنی ئەوەی کە ئەگەر شتێکیان تێدا بێت یاسای تورکیا لێپرسینەوەی لەسەر بکات.

ئەم دادگاییە ماوەی هەشت ساڵی خایاند. دواجار لە بەرواری ١١/٩/١٩٥٦زدا، بە پشت بەستن بەو ڕاپۆرتەی لیژنەی خەبیرەکان کە لە ٢٥/٥/١٩٥٦زدا پێشکەشی کردبوو، بڕیاری دا کە ئەم پەیامانە هیچ شتێکیان تێدا نی‌یە پێچەوانەی یاسا بێت.

❐ چاپکردنی پەیامەکانی نوور

ئەم بڕیارەی دادگا ئەوەی دەگەیاند کە دەتوانرێت پەیامەکانی نوور چاپ بکرێن و بە ئاشکرا بلاوبکرێنەوە..

بۆیە قوتابیانی نوور قۆڵیان لێ هەڵماڵی و، چاپخانەکان لە ئەستەمبووڵ و ئەنقەرە و سامسۆن و ئەنتالیا دەستیان کرد بە چاپکردنی ئەم پەیامانە.

فۆرمەکان لە پێش دوا قۆناغی چاپدا دەهێنرانەوە بۆ لای مامۆستا. ئەویش ڕاستکردنەوە و هەڵەگیریی لەسەر دەکردن.

مامۆستا خۆشحاڵ بوو بە چاپکردنی پەیامەکانی نوور و، دەیوت:

"ئەمە جەژنی پەیامەکانی نوورە.. چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە بووم.. کەواتە ئەرکی سەرشانم تەواو بووە و، بەم نزیکانە کۆچ دەکەم"!

ئەگەر بۆ ئیشێك لە ماڵ دەربچوایە، خێرا دەگەڕایەوە و، بە قوتابیانی دەوت: دەبێ ئێستا فۆرمەکان لە چاپخانەوە هاتبن، نابێت بواری ئەوە بدەین چاوەڕێمان بکەن. دەبێ هەر ئێستا بگەڕێینەوە!

## ساڵی ١٩٥٧ز

□ لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا

لەم ساڵەدا هەڵبژاردنە گشتییەکان لە تورکیادا بەڕێوەچوو..

دوو پارتی سەرەکی هەبوون کە بۆ حوکمی وڵات ڕکەبەری یەکتری بوون: پارتی دیموکراتی دەسەڵاتدار و پارتی گەلی کۆماریی نەیار، لەگەڵ چەند پارتێکی بچووکدا کە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر دەرەنجامی هەڵبژاردنەکان نەبوو.

خۆ هەرچەندە پارتی دیموکراتی پارتێکی ئیسلامی نەبوو، بەڵام ئەو کەش و هەوای ئازادییەی کە لە دوای دەسەڵات گرتنە دەستی ئەم پارتە باڵی بەسەر تورکیادا ڕاکێشا و، کەمبوونەوەی شەپۆلی دوژمنایەتیی دڕندانە بەرامبەر بە ئیسلام، هەموو ئەوانە، بیانوویەکی سەروزیاد بوون بۆ بزووتنەوە ئیسلامییەکانی ناو تورکیا کە دەنگ بە پارتی دیموکراتی بدەن.

وێڕای ئەوەی کە مامۆستا سەعیدی نوورسی نەڕۆشتە ناو ژیانی سیاسی و، پارتێکی سیاسیی پێك نەهێنا و، هیچ چالاکییەکی سیاسیی ڕانەگەیاند، بەڵام بڕیاری دا کە لەو ڕۆژگارانەدا دەنگ بە "پارتی دیموکراتی" بدات، تاکو ڕێ لە هاتنی "پارتی گەل" بۆ دەسەڵات بگرێت. ئەوەبوو ڕۆشت بۆ سندووقی دەنگدان و، دەنگی خۆی لە بەرژەوەندیی "پارتی دیموکراتی" دا.

□ دوا ڕۆژەکان

مامۆستا نوورسی دوا ساڵەکانی تەمەنی لەگەڵ قوتابییەکانیدا لە شاری "ئیسپارتە" بەسەربرد. هەندێ جاریش سەردانی "بارلا" و "ئەمیرداغ"ی دەکرد. لەبەر ئەوەش کە ڕۆشتبووە ساڵەوە، زۆربەی جار لە جێگادا دەکەوت.

لەم کاتانەدا خەڵکی کەم دەبینی و، توانای ئەوەی نەبوو سەردانی ئەو سەدان کەسە قبووڵ بکات کە دەهاتن بۆ لای. دەیوت:

"خوێندنەوەی پەیامەكانی نوور سەد هێندەی قسەكردن لەگەڵ مندا باشترە".

قوتابیانی حاڵی ئەویان ڕەچاو دەكرد و، گەر خۆی داوای نەكردنایە نەدەچوونە ژوورەوە بۆ لای..

لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی لە جیهانی دەرەوە دانەبڕابوو، چونكە بەدواداچوونی هەواڵەكانی دەكرد و، یەكێك لە قوتابیانی خۆی دەستنیشان كردبوو كە گرنگترینی ئەو شتانەی بۆ بخوێنێتەوە لە ڕۆژنامەكاندا بڵاودەبوونەوە. ئەوەبوو بایەخی بە هەواڵی چاپ كردنی پەیامەكانی نوور و دادگاییە زۆر و زەبەندەكانی قوتابیانی نوور دەدا.

□ كێشەكەی ئەنقەرە

لە بەرواری ١٦/٤/١٩٥٨زدا هەموو ئەو قوتابیانەی نوور كە لە خزمەتی مامۆستادا بوون و، ئەوانەش كە لە ئەنقەرە و ئەستەمبووڵ و ئیسپارتە كاریان لە بڵاوكردنەوەی پەیامەكاندا دەكرد، دەستگیر كران.

پارێزەر "بەكر بەرق" ڕۆشتە پێشەوە بۆ بەرگری لێ كردنیان و، لە بەندیخانەی ئەنقەرە لەگەڵ قوتابیانی نووری بەندكراودا كۆبووەوە و، پێی وتن:

"پێم خۆشە ڕای ئێوە لە مەسەلەیەكی تایبەت بە خۆتان وەربگرم.. ئایا پێتان باشە هەوڵ بدەم كە بە زووترین كات لە بەندیخانە ئازاد بكرێن.. یان دەتانەوێت بۆ بەرگری لە بانگەوازەكەتان و ڕوونكردنەوەی تێبكۆشم، بێ ئەوەی بایەخ بە مەسەلەی ئازادكردنی خۆتان بدەم"؟!

هەموو قوتابیانی نوور پێكەوە وەڵامیان دایەوە كە:

"تكات لێ دەكەین هەموو هەوڵێكی خۆت بۆ ڕوونكردنەوەی بانگەوازە بەرزەكەمان بخەرە كار. ئێمە ڕازیین بەوەی چەندین ساڵ لە بەندیخانەدا بمێنینەوە"!

ئەم پارێزەرە لەم وەڵامەوە هەستی كرد لە بەردەم كەسانێكی ئاساییدا نییە، بەڵكو لە بەردەم خەڵكانێكدایە كە خۆیان بە بانگەوازەكەیان بەخشیوە[1].

---

(١) هەر ئەو وەڵامەش بوو كە ئاراستەی ژیانی ئەم پارێزەرەی گۆڕی و، كردی بە یەكێك لە قوتابییە دڵسۆز و متمانە پێ كراوەكانی مامۆستا نوورسی و، هەتا دوا ساڵی تەمەنی لە ساڵی (١٩٩٢ز)دا ژیانی خۆی بۆ بڵاوكردنەوەی پەیامەكان و بەرگری كردن لەم پەیامانە و لە قوتابیانی نوور، لە دادگاییە زۆر و زەبەندەكانی توركیادا، بردەسەر. (وەرگێڕ)

دوای ئەوە، ئەم پارێزەرە بەڵێنی دا کە ئەرکی بەرگری کردن لە هەموو ئەو دادگا زۆر و زەبەندانەدا بگرێتە ئەستۆ کە قوتابیانی نووریان بۆ دەبران!

❏ دیدارەکانی ماڵئاوایی

مامۆستا نوورسی لە دواڕۆژەکانی ژیانیدا زنجیرەیەك سەفەری ئەنجام دا، وەك بڵێی ماڵئاوایی لە قوتابیانی بکات!

ئەوەبوو لە ١٩٥٩/١٢/١٩زدا ڕۆشت بۆ ئەنقەرە و، لەوێوە بۆ ئەمیرداغ و، لەوێوە بۆ قۆنیە و، لەوێوە جارێکی تر بۆ ئەنقەرە و، لەوێشەوە بۆ ئەستەمبووڵ لە ١٩٦٠/١/١زدا..

دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە، پاشان جارێکی تر لە ١٩٦٠/١/٣زدا گەڕایەوە بۆ ئەنقەرە و، دوا وانەی بە قوتابیانی وتەوە.

هەر لەوێ پەیامنێری ڕۆژنامەی "تایمز"ی لەندەنی دیدارێکی ڕۆژنامەوانیی دووروودرێژی لەگەڵدا ساز کرد کە لە ١٩٦٠/١/٦زدا بڵاوکرایەوە.

پاشان گەڕایەوە بۆ قۆنیە و، لەوێشەوە هەمان ڕۆژ کەوتە ڕێ بەرەو ئیسپارتە.

ئەم سەردانە یەك لە دوای یەکانە.. ترس و دڵەڕاوکێی لە ناوەندەکانی دژ بە ئیسلامدا ورووژاند و، ڕۆژنامەکانیان هێرشێکی توندوتیژیان لە دژی مامۆستا دەست پێکرد و، بە هەڵبەستنی زنجیرە درۆ و بوختانێك ڕای گشتییان لە دژی دەورووژاند، وەك ئەوەی ئاشووبێکی خوێناوی ڕوو بکاتە وڵات!

لەبەر ئەوە، کاتێ لە بەرواری ١٩٦٠/١/١١زدا گەڕایەوە بۆ ئەنقەرە، حکوومەت پێی ڕاگەیاند کە باشتر وایە لە ئەمیرداغ نیشتەجێ ببێت.

ئەوەبوو مامۆستا گەڕایەوە بۆ ئەمیرداغ. بەڵام داوای لە حکوومەت کرد کە ڕێی پێ بدەن مانگێك لە ئەمیرداغ و مانگێکیش لە ئیسپارتە بمێنێتەوە.

لە ١٩٦٠/١/٢٠زدا مامۆستا بەدیعوززەمان لە ئەمیرداغەوە ڕۆشت بۆ ئیسپارتە، لەوێشەوە پاش ماوەیەك ڕۆشت بۆ ئافیوون. یەك ڕۆژی لەوێ بەسەر برد و گەڕایەوە بۆ ئەمیرداغ.

## دواهەمین وانە سەبارەت بە کاری ئیجابیی بنیاتنەر

ئەم وانەیە دواهەمین وانەکانیەتی کە پێش وەفاتی بە قوتابیانی خۆی وتووەتەوە.

(برا ئازیزەکانم!

ئەرکی سەرشانی ئێمە کاری ئیجابیی بنیاتنەرە، نەك تەقالای کاری سەلبیی رووخێنەر. هەروەها خزمەتکردنی ئیمانە لە بازنەی ڕەزامەندیی خوای گەورەدا، بێ ئەوەی خۆمان لە کارێکدا بسەپێنین کە خوای گەورە خۆی ئەنجامی دەدات.

ئێمە لە بەرامبەر هەر چەشنە تەنگانە و گرفتێك بێتە ڕێمان ئەرکی خۆڕاگری و شوکرانەمان خراوەتە ئەستۆ، ئەویش بە ئەنجامدانی ئەو خزمەتە ئیمانی‌یە بنیاتنەرەی کە پارێزگاری لە ئاسایش و ئارامی دەکات.

وا خۆم بە نموونە دەهێنمەوە:

هەر لە مێژە هیچ کاتێك سەرم بۆ خۆسەپاندنی هیچ کەسێك نەوی نەکردووە. ئەمەش چەندین ڕووداوی زۆری ژیانم دەیسەلمێنن.

بۆ نموونە: هەڵنەسانم لەبەر سەرکردەی گشتیی ڕووس، هەروەها وەك ئەوەی کە هیچ بایەخێکم بە پرسیاری پاشاکانی دیوانی دادگای سەربازی نەدا کە هەڕەشەی سێدارە و کوشتنیان لێ دەکردم..

ئەم ڕەفتارەم بەرامبەر هەر چوار سەرکردەکە، ڕوونی دەکاتەوە کە خۆسەپاندنی هیچ کەسێکم پێ قبووڵ نەکراوە..

کەچی وا ماوەی سی ساڵە بە ڕازی بوونەوە ڕووبەڕووی هەموو ئەو مامەڵە نابەجێ و ناڕەوایانە بوومەتەوە کە لەم ماوەیەدا لەگەڵم کراوە، تاکو هەوڵ و تەقالامان بۆ کاری ئیجابی بێت و، خۆمان دوور بخەینەوە لە کاری سەلبی، بۆ ئەوەی خۆم لە ئیشێکدا هەڵنەقورتێنم کە هی خوای گەورە خۆیەتی.

تەنانەت هەموو مامەڵە نابەجێ و ناشیرینەکانی ئەم ماوەیەم بە ڕازی بوون و ئارامگرتنێکی جوانەوە پێشوازی کردووە و، لەمەشدا "جەرجیس پێغەمبەر، دروودی

خوای لەسەر بێت" و هاوەڵە بەڕێزەکانم - خوایان لێ ڕازی بێت - دانراوە بە سەرمەشق و پێشەنگی خۆم. ئەوەبوو هاوەڵان لە جەنگی بەدر و ئوحوددا گەلێ سەختییان چەشت.

بۆ نموونە: دوعام لەو داواکارە گشتییە نەکرد کە بڕیاری ستەمکارانەی بۆ دەردەکردین، هەرچەندەش من هەشتا و یەك هەڵەم لێ گرت. لەبەر ئەوەی ئەرك و بابەتی سەرەکیی ئەم ڕۆژگارە بریتییە لە جیهادی مەعنەوی و دانانی بەربەستی توندوتۆڵ لە بەردەم وێرانکارییە مەعنەوییەکان و، یارمەتیدانی ئاسایشی ناوخۆ بە هەموو هێزێکمان.

بەڵێ، ڕێبازی ئێمە هێزی تێدایە.. بەڵام تەنها بۆ دەستەبەر کردنی ئاسایشی ناوخۆ بەکارمان هێنا. بۆیە بە درێژایی ژیانم و بە مەبەستی شوێنکەوتنی دەستووری ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَلا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخرى﴾ (واتە: نابێ هیچ کەسێ لەسەر تاوانی کەسی تر، تەنانەت براکەی یان خۆشەویستانی، سزا بدرێت) ئاسایشی ناوخۆم هێناوەتە دی.

ئەم هێزە لە دژی هێرشە دەرەکییەکان نەبێ ناکرێ بەکاربهێنرێت. ئەرکی سەرشانمان - بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە - یارمەتیدانی پاراستنی ئاسایشی ناوخۆیە بە هەموو توانایەکمان. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا مەگەر بە ڕێژەی لەسەدا یەك لەچاو شوێنانی تردا، دەنا ئاگری شەڕی ناوخۆ ڕووی نەداوە کە ئاسایش تێك بدات. ئەو ڕێژە کەمەش ئەنجامی جیاوازیی ئیجتیهاد و بۆچوونەکان بووە.

مەزنترین مەرجی جیهادی مەعنەوی خۆهەڵنەقورتاندنە لە کار و فرمانی خوای گەورەدا. واتە لە کارێکدا کە هی خوای گەورە خۆیەتی و بە ئێمە نەسپێرراوە. بەو واتایەی ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها خزمەتە، نەك شتی تر. بەڵام هاتنەدیی ئەنجامەکانی ئەو خزمەتە، بە دەست پەروەردگاری جیهانیانە و، دەبێ ئێمە تەنها سەرقاڵی جێبەجێ کردنی خزمەتەکەمان بین.

منیش بە وێنەی "جەلالەدین خوارەزم شا" دەڵێم:

"ئەرکی سەرشانم خزمەتی ئیمانە.. سەرکەوتن و شکست لە لایەن خوای گەورەوەیە".

هەروەها وانەی خۆ تەیارکردنم بە ئیخلاسی تەواوەتی، لە قورئانی پیرۆز وەرگرتووە.

بەڵی، هێرشە دەرەکی‌یەکان دەبێ بە "هێز" بەرگری بکرێن، چونکە ماڵ و وەچەی دوژمن لە هێرشی لەو جۆرەدا وەك دەسکەوتێکی جەنگ مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ. بەڵام لە ناوخۆدا بەو جۆرە نی‌یە، چونکە دەبێ بە شێوەیەکی ئیجابی و بنیاتنەر، واتە بە ئیخلاسی تەواوەتی مرۆڤ ڕووبەڕووی وێرانکاری‌یە مەعنەوی‌یەکان ببێتەوە و، جیهادی دەرەوە جیایە لە هی ناوەوە.

خوای گەورە چەندین ملیۆن قوتابیی ڕاستەقینەی پێ بەخشیوم، بەڵام ئێمە بە هەموو هێزێکمان و لە پێناوی دەستەبەر کردنی ئاسایشی ناوخۆدا کاری ئیجابی و بنیاتنەر ڕادەپەڕێنین. کەواتە لە سەردەمی ئێستادا جیاوازی‌یەکی مەزن هەیە لە نێوان جیهادی ناوخۆ و هی دەرەوەدا.

بایەتێکی تر هەیە لە ڕادەبەدەر گرنگە و، بریتی‌یە لەوەی کە:

داخوازی‌یەکانی مەدەنییەنی دەنی [واتە نزم سەبارەت بە فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز] لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکانی مرۆڤی لە "چوار" دانەوە زیاد کردووە و گەیاندوویەتە "بیست" دانە پێداویستی! ئەوەتا بە زیادەڕەوی و، خوو پێوەگرتن و، لاسایی کردنەوە، شتە ناپێویستەکانی خستووەتە شوێنی شتی پێویست. هەندێ کەس دەبینی کە هەرچەندەش ئیماندارە، بەڵام لەبەر سەرقاڵ بوونی تەواوەتیی بە کارەکانی گوزەرانی دنیا، کە لەو گومانەدایە پێویست بن، دەچێ فەزڵی ژیانی دنیای دەدات بەسەر هی دواڕۆژدا!

چل ساڵ پێش ئێستا "سەرکردەیەکی گشتی" چەند ئەفسەرێك و تەنانەت هەندێ زانای پێشەوای نارد بۆ لام، بەو نیازەی کە - تا ڕادەیەك - بمگێڕنەوە بۆ ناو کارەکانی سەر بە دنیا و، وتیان:

"ئێمە ناچارین".

واتە ناچارین لاسایی هەندێ بنەمای ژیانی ئەوروپایی و خواستەکانی شارستانێتی بکەینەوە، بە پێی دەستووری زانراوی:

"الضرورات تبيح المحظورات".

پێم وتن:

ئێوە تەواو خەڵەتاون! چونکە ئەو "ناچاری"یەی کە لە هەڵبژاردنی هەڵەی مرۆڤەوە پەیدا بووبێت، هەرگیز شتانی حەرام ناکات بە حەڵاڵ. بەڵام ئەگەر هۆکەی ویست و هەڵبژاردنی هەڵەی مرۆڤ نەبێت، واتە ناچاری‌یەکە لە ڕێگایەکی حەرامەوە نەهاتبێت، ئەوا زیانی نی‌یە..

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك بە کاری ویست و هەڵبژاردنی هەڵەی خۆی مەی بخواتەوە و مەست ببێت، پاشان بەو حاڵەوە تاوانێك ئەنجام بدات، ئەوا بڕیاری شەرعی لەسەر دەردەکرێت و سزا دەدرێت و بە بێ تاوان دانانرێت. بەڵام ئەگەر منداڵێك ژیریی لە دەست دابێت و لە دەمی تێکچوونی ژیری و نەمانی ئاوزانیدا کەسێکی کوشت، ئەوا چاوی لێ دەپۆشرێ و سزا نادرێت، چونکە بە ویستی خۆی تاوانەکەی ئەنجام نەداوە.

هەر بەم جۆرە.. بەو سەرکردە و پێشەوایانەم وت:

ئایا جگە لە خواردن و بژێو چی هەیە ناچاری (زەروورەت) بێت؟

خۆ هیچ کاتێ ئەو کردارانەی کە لە ئیختیاری هەڵە و لە حەز و مەیلە ناڕەواکانەوە پەیدا بووبن، نابنە بەهانە و پاساوێکی شیاو کە حەرامیان پێ حەڵاڵ بکرێت..

بۆ نموونە: ئەگەر مرۆڤێك بە زۆری خووی گرت بە شتێکی وەك بەدوادا گەڕانی فیلمەکانی سینەما و سەردانی شانۆگەری و سەما، کە هیچ کام لەوانە بە "ناچاری" دانانرێن، بەڵکو خوو پێوەگرتنێکی ئەنجامی هەڵبژاردنی هەڵەی ئەو کەسەن، ئەوا بیانوویەکی ئەوتۆ نابن کە دەست بدات بۆ حەڵاڵ کردنی شتی حەرام!

تەنانەت یاسای مرۆڤیش ئەم شتانەی ڕەچاو کردووە و، "زەروورەت"ی بێ گومانی بەدەر لە ئیختیاری مرۆڤی جیا کردووەتەوە لەو بڕیارانەی کە ئەنجامی هەڵبژاردنی هەڵەی مرۆڤن. بەڵام یاسای خوایی بە شێوەیەکی بنەڕەتی و توندوتۆڵ و تۆکمە و دامەزراو لە یەکی جیاکردوونەتەوە.

برایانم! هێرش مەکەنە سەر ئەو زانایانەی کە لەو گومانەدا بوون هەندێ ناچارکاریی سەردەم بڕواتە ناوەندی "زەروورەت"ەوە و، لایەنی بیدعەتیان گرت..

بەڵێ، ڕووبەڕووی ئەو هەژارانە مەبنەوە کە بە نەزانی لایان وابووە ئەو کارانە "زەروورەت" بن و، هەر بەو پێیەش ڕەفتاریان کرد. لەبەر ئەوەی ئێمە هێزمان لەناوخۆدا

ناخەینەکار. کەواتە یەخەیان پێ مەگرن و مەیان هەژێنن، تەنانەت ئەگەر نەیارەکانمان لە زانایانی پێشەواش بن.. من بە تەنها خۆم سەرجەم بەرهەڵست و ڕەخنە و تەگەرەکانم خستە ئەستۆمەوە و، هێندەی گەردیلەیەکیش ساردوسڕی و کەمتەرخەمیم نەنواند و، بە ئیزنی خوای گەورە لەو خزمەتە ئیمانی‌یەدا سەرکەوتنم بەدەست هێنا..

ئێستاش وێڕای بوونی ملیۆنان قوتابیی نوور، هەر بە کاری ئیجابی‌یەوە خەریکم و، هەموو ستەم و هەژاندن و سووکایەتی‌یەکان هەڵدەگرم.

ئێمە ئاوڕ لە دنیا نادەینەوە. خۆ ئەگەر سەیری دنیاش بکەین جگە لە یارمەتیدانیان هەوڵی هیچ شتێکی تر نادەین. ئەوەتا بە شێوەیەکی ئیجابی لە دەستەبەر کردنی ئاسایشدا یارمەتییان دەدەین. هەر لەبەر ئەم چەشنە ڕاستی‌یانەیە کە ئێمە هەردەم چاویان لێ دەپۆشین، تەنانەت گەر ئەوان بە ستەمیش مامەڵەمان لەگەڵدا بکەن.

بڵاوبوونەوەی پەیامەکان قەناعەتێکی تەواوەتیی پێ بەخشیوین کە "دیموکراتی‌یەکان" پشتی ئایین دەگرن و لە دژی ڕاناوەستن. لەبەر ئەوە، دەستهێنانە ڕێی پەیامەکان لە دژی سوودی نیشتمان و گەلدایە.

وا نموونەیەکی بچووکتان لەسەر ئەو دەستوورە بۆ دەهێنمەوە کە دەڵێ:

"زەروورەتێك لە هەڵبژاردنی هەڵەوە پەیدا بووبێت، نابێتە مایەی حەڵاڵ کردنی شتی حەرام":

پەیامێکی نهێنی و تایبەت هەبوو کە ڕێم بە بڵاوبوونەوەی نەدا و، وەسێتم بۆ قوتابیانم بەجێ هێشت کە دوای لە دنیا دەرچوونم بڵاوی بکەنەوە. بەڵام پشکنینی دادگاکان ئەو پەیامەی دەرخست و، بە وردی خوێندیانەوە و، پاشان بڕیاری بێ تاوانیی پەیامەکەیان دەرکرد و، دادگای تەمییزیش پشتی ئەو بڕیارەی گرت. ئنجا دوای ئەوە منیش لە پێناوی دەستەبەر کردنی ئاسایشی ناوخۆ و ڕێ نەدان بەوەی کە لەسەدا نەوەد و پێنجی بێ تاوانەکان زیانیان پێ بگات، وتم: دوای ڕاوێژ کردن بە یەکتری ئنجا دەکرێ بڵاو بکرێتەوە.

"کوفری ڕەها" ئێستا تێدەکۆشێت کە دۆزەخێکی مەعنەویی سامناك پەرە پێ بدات و بڵاوی بکاتەوە، کە دەبێ هیچ مرۆڤێك لە سەرتاسەری جیهاندا لێی نزیك نەبێتەوە.

بەڵام یەکێ لە نهێنییەکانی ئەوەی کە قورئانی پیرۆز "میهرەبانییە بۆ هەموو جیهانیان" لەوەدایە کە هەروەك میهرەبانییە بۆ سەرجەم موسڵمانان، میهرەبانییە بۆ کافران و گشت ئادەمیزادەکانیش! چونکە گریمانی بوونی قیامەت و بوونی خوای گەورەیان لە لا دەهەژێنێت و، بەم گریمانە هەندێ لە ئازارەکانی ئەو دۆزەخە مەعنەوییەیان لەسەر شان سووك دەکات کە هەر لەم دنیایەدا بە ئاگرەکەی داخ دەبن!

ئەمەش نهێنییەکی وردی ئەوەیە کە قورئان بووە بە:

"میهرەبانی بۆ هەموو جیهانیان".

بەڵام بەشی "گومڕایی" لەناو زانست و فەلسەفەدا، ئەو فەلسەفە و زانستەی کە هاوبۆچوونی قورئان نییە و لە ڕاستە شەقام لایداوە، دەستی داوەتە بڵاوکردنەوەی "کوفری ڕەها" لەسەر شێوازی شیووعییەکان. ئەوەتا لە ڕێی زەندیق و مونافیقان و بە هۆی هەندێ لە سیاسەتمەدارە کافرەکانەوە خەریکن ئەو بۆچوونەی خۆیان لە زەینی خەڵکیدا موتوربە دەکەن کە ئاژاوە و تۆقاندن بەرهەم دەهێنێت.

لە کاتێکدا کە ڕوون و زانراوە "ژیان" ناگونجێ بە بێ "ئایین" بەسەربچێت و، ئەو بنەمایەش کە دەڵێ: "هیچ نەتەوەیەك بە بێ ئایین ژیانی نییە" ئاماژە بۆ ئەم خاڵە دەکات. چونکە - لە ڕاستیدا - ناگونجێ مرۆڤ بە "کوفری ڕەها" بژی..

لەبەر ئەوە، یەکێ لە موعجیزە مەعنەوییەکانی قورئانی حەکیم لەوەدایە کە ئەم وانەیەی بە قوتابیانی نوور بەخشیوە، تاکو لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا ببنە بەربەستێکی توندوتۆڵ لە بەردەم کوفری ڕەها و تیرۆر و تۆقاندندا.

بەڵێ، بە ڕاستی "پەیامەکان" ڕۆڵی خۆیان بینی.

بەڵێ.. هەر ئەم وانە قورئانییە بوو کە ئێمەی لەم تەوژمە ڕامالەرە پاراست کە بەسەر هەموو وڵاتی چین و نیوەی ئەوروپا و دەولەتەکانی بەلقاندا زاڵ بوو.. ئەم وانەیەش بوو کە بەربەستێکی لە بەردەم ئەو هێرشەدا بنیات نا. بەم جۆرە چارەسەرێکی باش و گونجاو پەیدا بوو بۆ وەستان لە بەردەم ئەم مەترسییە کتوپڕەدا.

کەواتە هەرگیز ناگونجێ "موسڵمان" واز لە ئایینەکەی بهێنێت و ببێت بە گاور، یان جوولەکە، یان بەلشەفیك. چونکە ئەگەر گاورێك ببێت بە موسڵمان خۆشەویستیی بۆ

حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - پتر زیاد دەبێت. هەروەها جوولەکەش دوای موسڵمان بوونی زیاتر حەزرەتی مووسای - دروودی خوای لەسەر بێت - خۆش دەوێت..

بەڵام ئەگەر موسڵمان پاشگەز ببێتەوە و، پەیوەندیی ئەستۆی بە زنجیرەی پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ بپچڕێت و واز لە ئایینەکەی بهێنێت، ناتوانێ بڕواتە ناو ئایینێکی ترەوە، بەڵکو دەبێتە تیرۆریستێکی تۆقێنەر و ئاژاوەچی و، هیچ کام لە ئاکارە بەرز و کامڵەکان لەناو گیانی ئەودا نامێنێتەوە و، ویژدانیشی بە تەواوی دەڕزێت و بە وێنەی ژەهرێکی کوشندەی لێ دێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا.

لەبەر ئەوە، شوکر و ستایش و سوپاسی خۆمان پێشکەشی خوا گەورە دەکەین کە بە ناوی "پەیامەکانی نوور"ەوە یەکێ لە وانەکانی قورئانی خاوەن ئیعجاز بۆ ڕزگارکردنی ئەم چەرخە لەناو میللەتی تورك و عەرەبدا و، بە هەردوو زمانی تورکی و عەرەبی بڵاوبوونەوە.

ئەوەش بە دڵنیایی سەلماوە کە هەروەك شازدە ساڵ پێش ئێستا ئەم پەیامانە ئیمانی شەش سەد هەزار کەسیان ڕزگار کرد، ئێستاش ئەم ژمارەیە لەوە تێپەڕ بووە و گەیشتووەتە ملیۆنەها کەس.

جا هەروەك پەیامەکانی نوور - تا ڕادەیەك - بوون بەهۆی ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی لە تۆقاندن و تیرۆر، بە هەمان جۆر بوون بە هۆی برایەتی و یەکێتی لە نێوان هەردوو برا بەڕێزەکەی ئیسلامدا کە عەرەب و تورکن، تەنانەت بە تەسدیقی دوژمنانیشی بوون بە هۆکارێکی پەخش بوونی فەرمانە بناغەییەکانی قورئانی پیرۆز.

جا مادەم "کوفری ڕەها" لەم سەردەمەدا دەبێتە بەربەست لە بەردەم قورئانی پیرۆزدا و، "کوفر"یش بۆ خۆی هەر لەم ژیانەی دنیادا دۆزەخێکی مەعنەویی زیاتر لە دۆزەخی ڕاستەقینە لەخۆیدا هەڵدەگرێت، چونکە لە توانادا نییە کە "مردن" بکوژرێ و لەناوببرێت، بگرە هەموو ڕۆژێ سی هەزار تەرم شایەتی لەسەر بەردەوامبوونی "مردن" دەدات.. ئەوا ئەم مردنە سەبارەت بەو کەسەی کە دووچاری "کوفری ڕەها" بووە، یاخود پشتی دەگرێت، دەبێتە دۆزەخێکی مەعنەویی ئەوتۆ کە دەیان جار لە دۆزەخی ڕاستەقینە ئازاری زیاتر بێت..

چونکە ئەو کەسە، بە هۆی کوفرە ڕەهاکەیەوە، "مردن" بە ئیعدام و لەناودانی هەمیشەیی دەزانێت، چ بۆ خۆی چ بۆ هەموو خۆشەویستانی پێشین و داهاتووی. ئەوەتا هەروەك مرۆڤ بە خۆشی و بەختەوەریی خۆشەویستانی بەختەوەر و دڵشاد دەبێت، بە ئازار و ئەشکەنجەشیان ئازار دەچێژێت..

کەواتە ئەو کەسەی باوەڕ بە بوونی خوای گەورە ناهێنێت، هەموو ئەو بەختەوەرییانەی لەکیس دەچێت و ئازار دەچێتە جێیان.

لەبەر ئەوە، تاقانە چارەسەر لەم سەردەمەدا کە ئەم دۆزەخە مەعنەوی‌یە لەسەر دڵی مرۆڤ هەڵبگرێت تەنها هەر "قورئانی پیرۆز" و، بەشەکانی پەیامەکانی نوورە کە موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزن و، بە پێی ئاستی تێگەشتنی ئەم چەرخ و سەردەمە نووسراون.

ئێستا ئێمە سوپاسی خوای گەورە دەکەین کە - تا ڕادەیەك - یەکێك لە پارتە سیاسی‌یەکان هەستی بەمە کردووە و، ڕێی لە بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور نەگرتووە و، بەربەستی لە بەردەم بڵاوبوونەوەیان دانەناوە. ئەو پەیامانەی کە دەیسەلمێنن "ڕاستی‌یەکانی ئیمان" هەر لەم دنیایەدا تامی بەهەشتێکی مەعنەوی بە ئەهلی ئیمان دەچێژن. بەڵکو بواری بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی دا و دەستی لەوە هەڵگرت کە گوشار بخاتە سەر ئەوانەی پەخشی دەکەن.

برایانم!

نەخۆشی‌یەکەم زۆر توند بووە لەسەرم و، لەوانەیە بەم نزیکانە کۆچ بکەم. یان بە تەواوی ڕێی قسەکردنم لێ بگیرێت، وەك ئەوەی هەندێ جار لێم دەگیرا..

لەبەر ئەوە.. دەبێ برایانی ئاخیرەتم چاوپۆشی بکەن و، هێرش نەبەنە سەر هەندێ کەسی هەژار لەوانەی کەوتوونەتە هەڵەوە و، بە "أهون الشرين" (واتەسووکەڵەترین زیان)یان دابنێن و، هەمیشە کاری ئیجابی ئەنجام بدەن، چونکە کاری سەلبی ئەرکی سەرشانی ئێمە نی‌یە و، لەبەر ئەوەش کاری سەلبی لە ناوخۆدا تاوانێکە لێخۆشبوون هەڵناگرێ.

خۆ مادەم بەشێك لە سیاسەتمەدارەکان زیان بە پەیامەکانی نوور ناگەیەنن، بگرە کەمێکیش چاوپۆشی دەنوێنن، ئەوا بە چاوی "أهون الشرين" بۆیان بڕوانن و، بە

مەبەستی خۆ ڕزگـارکردن لـە زیـانی هـەرە گـەورە، هیـچ کاتێ زیـان بـەوان مەگـەیـەنن. بەڵکو هەوڵ بدەن سوودتان هەبێت بۆیان.

جیـهادی مەعنـەویی نـاوخۆ بریتی‌یـە لـــە تـەقالا و تێکۆشـان لـە دژی وێرانکـاری و ڕووخاندنە مەعنەوی‌یەکان و، هەرگیز جیهادی ماددی نی‌یە. بەڵکو داخوازی پێشکەش کردنی چەند خزمەتێکی مەعنەوی‌یە. لەبەر ئـەوە، هـەروەك ئێمـە خۆمـان لـە ئیشـو کاری ئەهلی سیاسەتدا هەڵناقورتێنین، ئەهلی سیاسەتیش مافی ئەوەیان نی‌یـە خۆیـان بـە ئێمـەوە سەرقاڵ بکەن.

بۆ نموونە: من چاوپۆشیم لە هەموو مافە خوراوەکانی خۆم کرد و، لە یـەکێکی پارتـە سیاسی‌یەکان خۆش بووم، هەرچەندەش بۆ ماوەی سی ساڵ هەزاران تـەنگ و چەڵەمـە و بەندیم لە لایەن ئەو پارتەوە هاتـە ڕێ. هـەموو ئـەو تەنگانـە و گوشـارانەش بـوون بـەهۆی ڕزگار بوونی لە سەدا نەوەد و پێنجی خەڵکانی هـەژار لـەوەی کـە دووچـاری گوشـار و ستەم و ڕەخنـە ببنـەوە. چونکـە گوناهەکـە درایـە پـاڵ لەسـەدا پێنجـی ئـەو پارتـە، بـــەپێی فەرمانی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَلا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخرى﴾.

کەواتـە ئـەو پارتـەی کـە دژایـەتیی کردین، بـە هیـچ شـێوەیەك مـافی ئـەوەی نی‌یـە سکاڵامان لە دەست بکات.

تەنانـەت داواکـاری گشتی، بـە کاریگـەریی وەهـم و گومـانی هەڵـەی هـەندێ لـە جاسووس و هەواڵگرەکان، لـە دادگایـەکدا داوای سـەپاندنی بڕیـارێکی دەکـرد لەسـەر ئێمـە کـە حـەفتا کـەس بوویـن تۆمـەتباریان کردبوویـن. لەوەشـدا پشـتی بـە تێگەیشـتنی نابەجێ و هەڵەی خۆی و، ورد نەبوونەوەی لە هەواڵەکان، بەستبوو. هەروەك واتایـەکی هەڵەی دایە پاڵ بەشێکی پەیامەکانی نوور. بـەو هەڵانـەش، کـە لـە هەشتا هەڵـە زیـاترن و هەموویانمان چەسپاند، تێدەکۆشا کە بڕیارێکمان لە دژ دەربکرێت..

یەکێ لە برایانتان کە لە هەموو کەس زیـاتر ئـەو هێرشـانەی ئاراستە کـرا و خرابـووە بەندیخانە، ڕۆژێ لە پەنجەرەی بەندیخانەکەیەوە کیژۆڵەیەکی منالی بینـی، هـەواڵی پرسـی کە منالی کێ‌یە؟ کاتێ پێیان وت: هی داواکاری گشتی‌یە، ئەوا لەبەر خـاتری ئـەو منالـە بێ تاوانە تەنانەت دوعای لەو داواکارە گشتی‌یەش نەکرد!

ئومێد وایە کە ئەو گرفت و پشێوییانەی داواکاری گشتی ئێمەی پێـوە گیرۆدە کـرد، هەموویان بووبن بە مایەی خێر و میـهرەبانی، چونکـە بـوون بـە هـۆی پـتر بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور کە موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی پیرۆزە.

برایانم!

لەوانەیە بەم نزیکانە بمرم. بزانن کە ئەم چەرخ و سەردەمە نەخۆشـییەکی هێرشبەری تایبەت بە خـۆی هەیـە، ئەویش خۆپەرستی و خۆشویستنی زات و، حـەزی بردنەسـەری ژیـانێکی خـۆش و جوانـە لـە سـایەی ئارایشـت و زرق و برقـە سـەرنج ڕاکێشـەکانی شارستانێتی و، شتانی تری هاوشێوەیان لە نەخۆشی‌یە درێژخایەنەکان.

جا مادەم ئەو وانەیەی پەیامەکانی نوور کـە لـە قورئـانی پیرۆزم وەرگرتـووە، دەسـت هەڵگرتنە لە خۆپەرسـتی و خۆشویستنی زات، تـاکو لـە ڕێـی پابەند بـوون بـە ئیخلاسـی ڕاستەقینەوە بتوانرێت "ئیمان" ڕزگار بکرێت..

ئەوا سوپاس بۆ خوای گەورە کە زۆر کەس هاتنە مەیدانەوە لەوانەی کە گەشـتوونەتە ئیخلاسی هەرە مەزنی تەواوەتی. ئەوەتا کەسانێکی زۆر هەن کە لـە پێنـاوی بچووکـترین بابەتی ئیماندا خۆویستی و مەنسەب و پلە و پێگەی خۆیان بەخت کرد.

تەنانەت لە لایەن میـهرەبانیی خـوای گـەورەوە دەنگی یـەکێك لـە قوتابیـانی لاواز و هەژاری نـوور کـز کـرا کاتێ کـە دوژمنانیشـی بـوون بـە دۆسـتی و، گفتوگۆی زۆری ئاراستە دەکرا، هەروەك ئـازاری لـە ڕوانینـی ئەوانـەوە پێ دەگـات کـە بـە چـاوی ڕێـز و سەرسووڕمانەوە بۆی دەڕوانـن، وێـڕای ئـەوەی کـە بـە ئـەندازەی ئـازاری "زللـە" تەوقـە کردنیش ئازاری پێ دەگەیەنێت و لێی بێزارە!

کاتێ کە پرسیاری لـێ کرا: بۆچی وات بەسەر هاتووە؟ خۆ هێندە هاوڕێت هەیە کـە ژمارەیان لە ملیۆنەها تێپەڕ دەبن، ئەی بۆچی پارێزگاریی ئەو ڕێزگرتنەیان ناکەیت؟

وەڵامـی دانـەوە: مـادەم ڕێبازمـان ئیخلاسـی تەواوەتی‌یـە، ئـەوا بـە پێـی خواسـتی ئـەو ئیخلاسە دەبێ نەك تەنها "خۆپەرستی" بەخت بکرێت، بـەڵکو ئەگـەر دەسـتەڵاتی هـەموو دنیاشم بدرێتێ هەر دەبێ فەزڵی بابەتێکی ئیمانیی "باقی" و هەمیشەیی بدرێت بەسەر ئـەو دەستەڵاتەدا.

لەبەر ئەوەش بوو کە لە دەمی جەنگ و لە هێڵەکانی پێشەوەدا و لـە نێـوان بۆمبـارانی دوژمناندا، ڕوونکردنەوەی سەرنجێکی وردی یەك ئایەتی قورئانی بەسەر هـەموو شتێکدا پێش خست و، فەرمانی دا بە "حەبیب"ی قوتابیی خۆی کە: "دەفتەرەکەت دەربهێنە" و، یەکسـەر بـە سـواری ئەسـپەکەی ئـەو سـەرنجە قورئانیـیـەی پـێ وت تـاکو ئـەویش بینووسێتەوە..

واتە لە بەرامبەر بۆمبارانی دوژمناندا تەنانەت یـەك دانـە پێت و ڕوونکردنـەوەی یـەك دانە سەرنجی وردی قورئانی پیرۆزی واز لـێ نەهێنا و، فەزڵی ئـەوەی دا بەسـەر پاراستنی ژیانی خۆیدا.

کاتێ لەو برایەمان پرسی:

ئەم ئیخلاسە بێ وێنە و سەرسووڕهێنەرە لە کێ فێر بوویت؟

وتی:

لە دوو خاڵەوە:

یەکەمیان:

لـە غـەزای بـەدردا کـە مـەزنترین غـەزاکانی ئیسـلامە، هـەندێ لـە موجـاهیدان چەکەکانیان لە بەردەم خۆیاندا دانا و بۆ نوێژی جەماعەت ڕیزیان بەست، ئـەوانی تریـش بە چەکەوە لە حاڵی ئامادەباشیدا ڕاوەستابوون، پاشان ئەمانیش فریای نوێژی جەماعەت کەوتن، تاکو پاداشتی نوێژی بەکۆمـەڵیان دەسـت بکـەوێ، وەك ئـەوەی کـە پێغەمبـەری ئازیز ﷺ فەرمانی پێدان.

جا مادەم لە جەنگدا ئەم ڕوخسەتە هەبێت و، مادەم فەزڵی پاداشتی نوێژی جەماعەت - کە سوننەتە - درا بەسەر گەورەترین ڕووداوی دنیادا لە پێناوی چاودێری کردنی ئەو سوننەتەی پێغەمبەر ﷺ.. ئەوا ئێمەش وانەی ئەم سەرنجە بچووکەی پێغەمبەری مەزن ﷺ وەردەگرین و، بە خۆمان و گیانمان شوێنی دەکەوین.

دووهەم:

ئیمـامی عـەلی - خـوای لـێ ڕازی بێـت - لـە چـەندین شـوێنی زۆری قەسـیدەی "البدیعـة"دا ، بە تایبـەت لـە کۆتاییەکـەیدا داوای لـە خـوای گـەورە کـردووە کـە پارێزگـارێکی بۆ بنێرێت بیپـارێزێت لە بێ ئاگـایی، کاتێ بـە خشـووعەوە لـە نوێـژدا

ڕادەوەستێ. ئەوەتا لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە کە پارێزەرێکی بۆ تەرخان بکات بیپارێزێت لە هەر ئاڵۆزی‌یەك دوژمنانی بتوانن زەفەری پێ ببەن کاتێ بە دڵنیایی و خشووعەوە نوێژ دەخوێنێت.

ئەم برا هەژارەشتان، کە پوختەی ژیانی خۆی لەناو خۆپەرستیی ئەم سەردەمەدا بەسەر بردووە، ئەم دوو سەرنجە وردەی لە سەروەری گەردوون و هۆکاری بەدیهاتنی جیهان ﷺ و، لە شێری ئیسلام "ئیمامی عەلی" - خوای لێ ڕازی بێت وەرگرت.

بەڵێ، لە زەمانەدا ئەم هەژارە لاوازە گرنگیی بە نهێنی‌یەکانی قورئان دا و، لە جەنگدا بایەخی بە پاراستنی خۆی نەدا، بەڵکو تەنها سەرنجێکی یەك دانە پیتی قورئانی پیرۆزی ڕوون کردەوە.

سەعیدی نوورسی[1]

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی لەمیرداغ ٢/٦٠٤-٦١٦.

## بەندی دووهەم

## سۆراخی ئارامگا

## ١٩٦٠/٣/١٩-١٩٦٠/٣/٢٣ز

❑ دوا کۆچ[١]

لە دوای نوێژی عەسری ڕۆژی ١٩٦٠/٣/١٩ز مامۆستا گەیشتە "ئیسپارتە". پێش گەیشتنی، پۆلیسێك بۆ هەواڵ زانینی هات، وتی:

مامۆستا لە ئەمیرداغ دەرچووە!

پێمان وت: نەهاتووە بۆ لای ئێمە.

دوای تێپەڕبوونی سەعاتێك، مامۆستا بە ئوتومبێلەکە گەیشت. هەر هێندەی دەنگی هۆڕینەکەمان بیست، خێرا دابەزیینە خوارەوە و، دەرگای گەراجەکەمان کردەوە، ئوتومبێلەکەش هاتە ژوورەوە و دەرگاکانمان داخست.

مامۆستا لە ڕیزی پشتەوە ڕاکشابوو، نەخۆشییەکەی زۆر سەخت بوو. بە باوەش هێنامانە دەرەوە.

کاتێ کە بەسەر پلیکانەکەدا سەرکەوتین ویستمان بیخەینە سەر کۆڵمان، قبووڵی نەکرد. ئیتر من و "تاهیری" ڕۆشتینە ژێر باڵی، هەتا گەیاندمانە ژوورەکە و، لەسەر شوێنەکەی دامان نا، پاشان ڕاکشا.

---

(١) ئەم یادداشتەم لە "بایرام یوکسەل" بیست. هەروەها بڕوانە: (ش: ٨٣/٣-٩٠)

پلەی گەرمیی مامۆستا زۆر بەرز بوو.. لەبەر ئەوە، لێی دوور نەدەکەوتینەوە. تەنانەت نوێژەکانمان بە یەك کەسی دەخوێند، تاکو بە نۆرە لە لای بمێنینەوە و، شەونخوونی بکەین بۆ سەرپەرشتی کردنی.

ئێمە هەر چوارمان: "من و زوبەیر و حوسنی و تاهیری" لای مامۆستا بووین.

لە نیوەی شەودا نۆرەی من و کاك زوبەیر بوو، پێکەوە لە لای مابووینەوە. یەکێکمان دەستی مامۆستای شل دەکرد و، ئەوی ترمان پێیەکانی دەشێلا.

مامۆستا بۆ منی ڕوانی، وتی: دەڕۆین.

وتم: بەڵێ مامۆستام دەڕۆین.. بەڵام بۆ کوێ؟!

وتی: بۆ "ئوورفە".. بۆ "دیاربەکر"!

چەند جارێك وشەی: "دەڕۆین"ی دووبارە کردەوە.

کاتێ من دەموت: مامۆستا گیان! بۆ کوێ؟

ئەو دەیوت: بۆ "ئوورفە".

زوبەیر وتی: لەوانەیە ئەم قسەیەی لە ژێر تین و تەوژمی ئەو "تا" سەختەدا بێت کە زوو بە زوو لێی دێت.

لە دەوروبەری سەعات دوو و نیوی شەودا مامۆستا هەمان قسەی دووپات کردەوە و، وتی:

"بەیانی زوو دەڕۆین بۆ ئوورفە".

زۆر جەختی لەسەر "ئوورفە" دەکردەوە!

پاشان برایان "تاهیری" و "حوسنی" هاتن، تاکو بە نۆرەی خۆیان لە لای مامۆستا بمێننەوە. من و کاك "زوبەیر"یش ڕۆشتین بۆ ئەوەی ژەمی پارشێو بخۆین، چونکە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بووین.

مامۆستا بە "حوسنی"شی وتبوو:

"خۆتان ئامادە بکەن.. دەڕۆین بۆ ئوورفە".

بەڵام کاك حوسنی بۆی ڕوون کردبووەوە کە تایەکانی ئوتومبێلەکە کەڵکی سەفەرکردنیان پێوە نییە. کەچی مامۆستا جارێکی تر دووپاتی کردبووەوە کە:

"چەندەشی تێبچێت دەڕۆین بۆ ئوورفە.. ئوتومبێلێك بگرن بە كرێ ئەگەر بە سەد لیرەش بووە.. من ئامادەم جوببەكەم بفرۆشم، گەر پێویست بكات"!

دەستمان كرد بە ئامادەكردنی ئوتومبێلەكە بۆ سەفەر. بینیم هەر لە ڕاستیدا تایەكانی ئوتومبێلەكە كەڵكی سەفەریان پێوە نەماوە، ناشتوانین لەم كاتەدا تایەی نوێ پەیدا بكەین.

لە دەمی سەرقاڵ بوونمان بە ئامادەكردنی ئوتومبێلەكە، كاك "تاهیری" بە پەلە هات بۆ یارمەتیمان، چونكە مامۆستا ناردبووی. ئەوەشی پێ ڕاگەیاندین كە مامۆستا دەڵێ: "پەلە بكەن".

ئوتومبێلەكە ئامادە كرا و، مامۆستاش بۆ خۆی ئامادەی سەفەر بوو. منیش چاوەڕێی ئاماژەیەكی مامۆستا بووم بۆ ئەوەی لەم سەفەرەدا بەشدار بم.

كاك زوبەیر لە شەوێوە دەیوت: خۆزگە "كاك بایرام"یشمان لەگەڵدا دەبوو، تاكو لە ڕێگادا یارمەتیمان بدات، لەوانەیە بە بێ ئەو كارەكەمان قورس بێت.

لەبەر ئەوە، لە كاتی هاتنەدەرەوەی مامۆستا لە دەرگاكەوە، كاك زوبەیر لە "تاهیری"ی پرسی:

"ئایا بایرامیش دێت"؟

مامۆستا وتی: بەڵێ، ئەویشمان لەگەڵدا دەبێت!

ئیتر مامۆستامان لە ڕیزی پشتەوە دانا، دوای ئەوەی پێخەفمان بۆ ڕاخست تیایدا، تاكو بحەوێتەوە. من و كاك زوبەیریش لە ڕیزی پێشەوە لەگەڵ شۆفێرەكەدا بووین.

سەعات نۆی بەیانی ڕۆژی ١٩٦٠/٣/٢٠ز دوو پۆلیس لەسەر شەقامەكە چاودێریی ئێمەیان دەكرد، چونكە لەو ڕۆژانەدا هێرشی ئۆپۆزسیۆن لەسەر حكومەت زیادی كردبوو، تەنانەت لە ڕادیۆدا بڵاوكرایەوە كە:

"دەبێت بەدیعوززەمان لە ئیسپارتە یان لە ئەمیرداغ بمێنێتەوە"!

پێش ئەوەی ئوتومبێلەكە بكەوێتە ڕێ، بەڕێز "فِطنة" خانمی خاوەن خانووەكە هات بۆ لای ئوتومبێلەكە، مامۆستاش خواحافیزیی لێ كرد و، وتی:

"خوشكم! بە خواتان دەسپێرم.. ئومێدەواری دوعای خێرتانم.. من زۆر نەخۆشم".

مامۆستا ئەم وتەیەی بە پەژارەیەکی زۆرەوە دەربڕی، چونکە ساتە وەختەکانی لێکدابڕان بوو، تەنانەت چاوەکانی ئەو ئافرەتە پڕبوون لە فرمێسك و، بە کاك "تاهیری"ی وت:

"بە خوا من زۆر لە سەفەری ئەم جارەی مامۆستا دەترسم.. وا دیارە دەڕوات بە شوێن ئارامگاکەیدا دەگەڕێت"!

پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ، وەسێتمان بۆ کاك تاهیری بەجێهێشت کە دەرگا لە هیچ کەسێك نەکاتەوە و بڕوات بخەوێت. ئەویش وەسێتەکەی جێبەجێ کرد.

دوای ئێمەش پۆلیس پرسیاریان لەو ئافرەتە کردبوو کە:

"ئایا نازانیت مامۆستا کەی و بۆ کوێ ڕۆشت"؟

ئەویش وەلامی دابوونەوە کە:

"بۆچی من پاسەوانم؟ من لە کوێ دەزانم گەر ئێوە نەزانن"؟

لە دەمی دەرچوونمان لە ئیسپارتە، باران بە خوڕ دەباری. لە فڕوفێڵی والیی "قۆنیە" زۆر دەترساین، چونکە لە ڕۆژنامەکاندا ڕایگەیاندبوو کە:

"ڕەگ و ڕیشەی قوتابیانی نوور لە بنج و بێخەوە هەلدەکێشم".

لەبەر ئەوە، بە درێژایی ڕێگا و بەردەوام "ئایەتەلکورسی"مان دەخوێند!

کاتێ گەیشتینە "ئەگریدیر" باران زۆر بە خوڕەمتر دای کرد، بە ڕادەیەکی وا کە یەك "پۆلیس"یش لەسەر شەقامەکاندا نەمابوو، هەموویان ڕۆشتبوونە ناو تەلاری فەرمانگەی پۆلیس. تەنانەت ئێمە بە بەردەم ئەو فەرمانگەیەدا گوزەرمان کرد و کەسێك ئێمەی نەبینی!

بەم جۆرە شارمان بەجێ هێشت و، تابلۆی ژمارەی ئوتومبێلەکەمان بە قوڕ داپۆشی، تاکو هیچ کام لە چاودێران هەستمان پێ نەکات.

کاتێ "قەرە ئاغاچ"مان بەجێ هێشت، تەندروستیی مامۆستا باش بوو. بۆیە لە ئوتومبێلەکە دابەزی و دەستنوێژی تازە کردەوە. کە چەند کیلۆمەترێکی ترمان دوای ئەو شوێنە بڕی، لە لای چەپی ڕێگا وەستاین و، مامۆستا لەسەر تاشە بەردێك نوێژی خوێند.. پاشان کەوتینە ڕێ.

پێش ئەوەی بگەینە "قۆنیە" مامۆستا زیکر و ویردەکانی خۆی تەواو کرد و، لە شوێنەکەی خۆی ڕاست بووەوە و دانیشت. بەڵام هەر هێندەی گەیشتینە باخەکانی "مەرام" لە قەراخی "قۆنیە" جارێکی تر نەخۆشی‌یەکەی زۆری بۆ هێنایەوە و وای لێ هات کە نەتوانێت قسە بکات.

ئێمە ڕۆشتینە ناو شار و، لە دوکانێکدا پەنیر و زەیتوونمان بۆ بەربانگ کڕی، مامۆستاش پارەکەی دا و، وتی:

"ڕۆڵەکانم! من زۆر نەخۆشم، ئێوە لە بری من بخۆن".

لە سایەی خوا و چاودێریی میهرەبانانەی، هیچ کەسێك نە لەم شارە و نە لە شارەکانی تری دوای قۆنیە - سوپاس بۆ خوا - ئێمەی نەبینی.

پێش ئەوەی بگەینە "ئەرەکلی" مامۆستا لە شوێنەکەی خۆی دانیشت. ئنجا دەستەکانی هێنا و، لە پشتی سەرمانەوە گوێی من و کاك زوبەیری گرت و، پێی وتین:

"ڕۆڵەکانم! هەرگیز ترستان نەبێت.. دڵنیا بن کە پەیامەکانی نوور پشتی مولحیدەکان و شیووعی‌یەکانیان شکاند. بە پشتیوانیی خوای گەورە ئەم پەیامانە هەمیشە سەرکەوتوو دەبن".

ئەم قسەیەشی چەند جارێك دووپات کردەوە. دەنگیشی هێندە نزم بوو کە بە ئەستەم دەمان بیست. پاشان وتی:

"ئەوانە لێم تێنەگەیشتن.. ئەوانە لێم تێنەگەیشتن.. ئەوانە لێم تێنەگەیشتن.. ئەوانە دەیانویست لەکەداری سیاسەتم بکەن"!

لە ئوتومبێلەکە دابەزیین بۆ نوێژی عەسر. بەڵام مامۆستا هەر لەناو ئوتومبێلەکەدا نوێژی خوێند.

لە دەمی نوێژی شێواندا گەیشتینە "ئولو قشلە".

مامۆستا وتی:

"شتێك هەیە بیخۆین"؟

من و کاك زوبەیر دابەزیین، کەمێك برنجمان لە ڕێستۆرانتەکە کڕی و ویستمان خواردن ئامادە بکەین..

بەڵام ئاگردانەکەی خۆمان کەڵکی ئەوەی نەبوو، بۆیە ئاگردانی پاسەوانەکەی سکەی شەمەندەفەرمان هێنا.. کەش و هەواش یەکجار سارد بوو.. لە پاسەوانەکە زۆر پاڕامەوە کە بە ئەمانەت ئاگردانەکەی خۆیمان بداتێ و، پێم وت: پیرێکی نەخۆشمان لەگەڵدایە و، ئاگردانەکەی خۆشمان شکاوە. ئیتر پاسەوانەکە ڕازی بوو.

دەستمان کرد بە ئامادەکردنی خواردنەکە. زوبەیریش لەناو ئوتومبێلەکە لەگەڵ مامۆستا مایەوە. شتێکی کەممان لە کەرە و هێلکە و ماست بۆ مامۆستا دانا، مامۆستاش کەوچکێکی لێ برد بۆ دەمی، بەڵام لەبەر ئەوەی بە هۆی سەختیی نەخۆشییەکەیەوە گەرووی گیرابوو، نەیتوانی هیچ شتێك بخوات!

شەو بە "ئەدەنە" و "جەیحان"دا تێپەڕیین و، نوێژی خەوتنانمان لە دەرەوەی کرد. کاك حوسنی نەختێك پاڵ کەوت، تاکو سەعاتێك بخەوێت، چونکە بەردەوام ئوتومبێلەکەی لێدەخوڕی.

لە کاتی پارشێودا گەیشتینە "عوسمانیە" و، ڕۆشتینە ناو شار تاکو بەنزین بکەینە ئوتومبێلەکە و، ژەمی پارشێویش بخۆین. بەڵام مامۆستا تامی هیچ شتێکی نەکرد. دوای ئەوە نوێژی بەیانیمان لە نزیکی "ئەڵمان بناری" کرد، مامۆستاش لە ئوتومبێلەکە دانەبەزی.

جاران خەڵك بەم چیایەیان دەوت: "گاور داغی" واتە چیای کوفر. بەڵام ئێستا پێی دەڵێن: "نوور داغی" واتە چیای نوور.

سپێدەی بەیان گەیشتینە "غازی عەنتاب" و، لە ڕێستۆرانتەکە هەندێ شۆربام کڕی. هەر لەوێ هەواڵی ڕێگام بەرەو "نزیب" پرسی، چونکە بەفر و باران بە چڕی دەباری، ڕێگاش پڕ لە مەترسی بوو، لەم لاو لەولای ڕێگا ئوتومبێلت دەبینی لەکار کەوتبوون. بەڵام ئوتومبێلەکەی ئێمە لە سایەی خواوە پێش با دەکەوتەوە، نە تایەکانی نە مەکینەکەی – سوپاس بۆ خوا – پەکی نەکەوت.

کاتێك گەیشتینە "ئوورفە" سەعات یازدە بوو. کاك "حوسنی"ش زۆر باش شارەزای شەقامەکانی ئەوێ بوو.

لە مزگەوتی "قازی ئۆغلو" نزیك بووینەوە. کە کاك "عەبدوللا یەگن" لەوێ بوو. ئۆتومبێلەکەمان لە نزیکی مزگەوتەکە ڕاگرت و، کاك زوبەیر بە پەلە ڕۆشت بۆ مزگەوت تاکو کاك عەبدوللا لە هاتنی مامۆستا ئاگادار بکاتەوە.

مامۆستا وتی: "با زوو برۆین، کاتی چاوەڕوانیمان بە دەستەوە نییە".

کاك زوبەیر لەگەڵ کاك عەبدوللا خێرا هاتن بۆ لای ئۆتومبێلەکە و، داوامان لە کاك عەبدوللا کرد ناونیشانی ئۆتێلێکی پاك و ڕێکوپێکمان پێ بڵێت. کاك عەبدوللاش ئۆتێلی "ئیپەك پالاس"ی پێ نیشان داین.

مامۆستامان هەڵگرت و، بردمان بۆ نهۆمی سێهەم، ژووری ژمارە (٢٧) و، لەسەر جێگاکەی دامان نا، تاکو هەندێ ماندوویی سەفەری دەربچێت.

لەبەر ئەوەی لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا بووین، خەڵکی ئوورفە سەرگەرمی خەتمە و خوێندنی قورئانی پیرۆز بوون. بەڵام هەر هێندەی هەواڵی هاتنی مامۆستایان بۆ شارەکەیان بیست، بە پەلە هاتن بۆ ئۆتێلەکە و، گلەیی زۆریان لێ کردین کە زووتر ئاگادارمان نەکردوونەتەوە مامۆستا تەشریف دەهێنێت، تاکو پێشوازیی لێ بکەن!

خەڵك لە هەموو لایەکەوە دادەبارین بۆ سەرلێدانی مامۆستا. کاك "زوبەیر"یش لە بەردەرگای ژوورەکەی دانیشتبوو یەك یەك ڕێی پێ دەدان بڕۆنە ژوورەوە. منیش دەستی مامۆستام گرتبوو، ئەوان ماچیان دەکرد و مامۆستاش سەری ئەوانی ماچ دەکردەوە.

مامۆستا حەزی نەدەکرد ئەوانە بەجێی بهێڵن. بەڵام دوای سەردانەکەیان، من داوام لێ دەکردن ژوورەکە چۆڵ بکەن، تاکو خەڵکی تر بێن بۆ لای مامۆستا. ئەوانیش پێیان دەوتم: نابینی مامۆستا خۆی حەز ناکات بەجێی بهێڵین!

لە ڕاستیدا من سەرسامی ئەم هەڵوێستەی مامۆستا بووم! هاوشێوەی ئەوەمان پێشتر لێ نەبینیبوو.. چونکە نە لە ئیسپارتە و نە لە ئەمیرداغ ڕێی بە کەس نەدەدا لە لای بمێنێتەوە. تەنانەت کاتێ کە لە ئیسپارتە بووین و مامۆستا نەخۆش کەوت، پێم وت:

مامۆستا گیان! ئایا برایان لە نەخۆشییەکەت ئاگادار بکەمەوە؟

وتی:

"نەخێر.. جگە لە ئێوە با کەسی تر نەیەت بۆ لام".

کەچی لەم شارەدا کەسی نەدەگیرایە دواوە.. بگرە لە ئامێزیشی دەگرتن!

هەموو خەڵکی شار و سەرجەم کاسبکاران هاتن بۆ سەر لێدانی و، دەستی بە رووی کەسەوە نەنا، بەڵکو لەبەر خوای گەورە خۆی ڕادەگرت و هیچ پشووی نەدا، تەنانەت تامی نوستنی نەچەشت. ئێمەش بە هەمان شێوە خەو نەڕۆشتە چاوەکانمان.

دوای کاك زوبەیر، نۆرەی خۆم وەرگرت و، لە بەردەم دەرگای ژوورەکەی مامۆستا دانیشتم.

یەکسەر دوو پۆلیس هاتن. یەکێکیان وتی:

ئامادە بن بۆ ڕۆشتن، کوا شۆفێرەکە؟

وتم: مامۆستا زۆر نەخۆشە.

پاشان یازدە پۆلیس هاتن. وتیان:

هەر ئێستا ئامادە بن و دەبێ یەکسەر بگەڕێنەوە بۆ ئیسپارتە.

پێم وتن:

مامۆستا لەمە ئاگادار دەکەمەوە. ڕۆشتمە ژوورەوە و مامۆستام ئاگادار کردەوە، ئەویش ڕێی بەو پۆلیسانە دا بڕۆنە ژوورەوە بۆ لای.

بە مامۆستایان وت:

گەڕانەوەتان بۆ ئیسپارتە فەرمانێکە لە وەزارەتی ناوخۆوە دەرچووە.

مامۆستا پێی وتن:

زۆر سەیرە! من بۆ ئەوە هاتم تاکو لێرە بمرم! لەوانەشە بمرم. ئێوە حاڵی من دەبینن؟ بڕۆن بەرگریم لێ بکەن.

یەکێکیان وتی:

ئێمە فەرمانبەرداری دەسەڵاتین.. چی بکەین؟

پاشان کاك "حوسنی"یان بە ئوتومبێلەکەیەوە هێنایە بەردەم ئوتێلەکە، تاکو مامۆستا لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت.

لەم کاتەدا ئاپۆرای جەماوەر بەردەمی ئوتێلەکەی گرت و، خاوەنی ئوتێلەکەش لە پلیکانەی سەرەوە دەنگی بەسەر پۆلیسەکاندا بەرز کردەوە و، پێی وتن:

"مامۆستا میوانی منه.. چۆن دەکرێت لێمی دوور بخەنەوە"؟

جەماوەر لە هەڵچوونێکی یەکجار زۆردا هاواریان دەکرد:

"چۆن میوانێکی بەڕێزی وەکو مامۆستا بە زۆر دەبرێت، لە کاتێکدا کە لەسەر پێخەفی مردندایە"؟!

خەڵکەکە ڕێیان بە پۆلیس نەدا بڕۆنە سەرەوە بۆ ناو ئوتێلەکە و، تکایان لە شۆفێرەکەش کرد ئوتومبێلەکەی لە دەرگای ئوتێل دوور بخاتەوە. ئەویش بە گوێی کردن!

دوای ئەوە، خەڵکی کەمێك هێور بوونەوە و، جارێکی تر دەستیان کردەوە بە سەر لێدانی مامۆستا. لەم کاتەدا کارمەندانی دەوڵەت و پۆلیس و سەرباز و ئەفسەرەکانی سوپا و ئەندامانی پارتەکان، هەموویان، هاتن بۆ سەرلێدانی مامۆستا!

پاشان جەختی پۆلیس جارێکی تر دەستی پێ کردەوە بۆ چاوپێکەوتنی مامۆستا و، ئاگادار کردنەوەی کە فەرمانەکە لە سەرەوە دەرچووە و، دەبێت هەر ئێستا لە ئوورفە دەربچین.

هەروەها وتیان:

ئەگەر بە ئوتومبێلەکەی خۆتان ناڕۆن، بە ئوتومبێلێکی فریاگوزاری دەتانبەین!

وەڵامیان دانەوە کە:

مامۆستامان یەکجار نەخۆشە و توانای ئەوەی نی‌یە کە ماوەی ڕۆژێکی ڕەبەقی تر لە سەفەردا بێت. جگە لەوەی کە ئێمە دەست ناخەینە کاروبارەکانی، بە تایبەت لەم حاڵەتەیدا کە زۆر لە مردن دەچێت.

یەکێکیان وتی:

فەرمانەکە لە وەزارەتەوەیە و، گێڕانەوەی نی‌یە. مامۆستاکەتان هەروەك چۆن هات بۆ ئەم شارە، دەشبێت بە هەمان جۆر بگەڕێتەوە.. هەر ئێستا ئوورفە بەجێ بهێڵن!

وتمان:

ئێمە دەست ناخەینە ناو کاری مامۆستا. فەرموون خۆتان ببینن و داواکاری‌یەکەتانی پێش چاو بخەن. جا ئەگەر ئەو پێی وتین: دەڕۆین، ئەوا دەڕۆین!

چونکە هیچ کاتێك قسەی ئەو ناگێڕینە دواوە و، ناشگونجێت ئێمە قسەکەی ئێوەی پێ ڕابگەیەنین!

لەم کاتەدا پۆلیسەکان تووڕە بوون و، وتیان:

"ئەوە یانی چی؟ ئایا ناتوانن شتێکی ئاسانی وەکو ئەمەشی پێ بڵێن"؟

وتمان:

"بەڵێ ناتوانین. ئێمە هیچ شتێك بەو ناڵێین، بەڵکو ئەو هەرچی دەڵێت بە تەواوی جێبەجێی دەکەین"!

وتیان:

"ئێمەش بە هەمان شێوە پەیوەستین بە فەرمانە ڕەسمی‌یەکانەوە. دەبێت لە ماوەی ئەوپەڕی دوو سەعاتدا ئوورفە بەجێ بهێڵن و، بگەڕێنەوە بۆ ئیسپارتە".

کاتێك خەڵکی شار دەنگوباسی دەرکردنی مامۆستایان لە ئوورفە بیست، نزیکی شەش هەزار کەس لە بەردەم ئوتێلەکەدا کۆبوونەوە.

ئێمەش لەو دەرفەتەدا ڕۆشتین بۆ نەخۆشخانە و، سەرۆکی فەرمانگەی تەندروستیمان لە حاڵی مامۆستا ئاگادار کردەوە و، تێمانگەیاند کە ناتوانێت سەفەر بکات و، داوامان لێ کرد کە هەر بۆ خۆی پشکنین بۆ مامۆستا بکات.

پزیشکەکە پشکنینی بۆ مامۆستا ئەنجام دا.. پاشان ئاوڕی لێ داینەوە و، وتی:

"چۆن پرکێشیی هێنانی مامۆستاتان بۆ ئێرە کردووە؟ پلەی گەرمیی بەرزە، لە حاڵێکدایە کە هەرگیز نابێ لە شوێنی خۆی بجوولێت. وەرن لەگەڵم تاکو ڕاپۆرتێکتان لە لیژنەی پزیشکانەوە بدەمێ کە ناگونجێ لە شوێنی خۆی بجوولێنرێت".

دوای نوێژی شێوان، لەبەر وەستانی زۆر و شەونخوونی و ماندووبوون، بڕستم لێ بڕا. بە کاك زوبەیرم وت:

"من زۆر ماندووم.. ڕاوەستانم بە پێوە لە پەلوپۆی خستووم".

وتی: بڕۆ لە ژوورەکەدا بخەوە.

ڕۆشتم و نزیکی دوو سەعاتێك نوستم. پاشان کاك زوبەیر هاتە ژوورەوە و، وتی: برام منیش ئارامم نەما، ئەم هەفتەیە خەو نەچووەتە چاوم! وەرە با بە نۆرە بخەوین.

نوێژی خەوتنانمان کرد و، کاك زوبەیر نوست. من و کاك حوسنی لای مامۆستا ماینەوە.

پاشان کاك حوسنی وتی:

لەبەر شەونخوونی و ڕاوەستانی زۆر، پێیەکانم یەکجار ئازارم دەدەن، دەمەوێت کەمێك بحەسێمەوە.

وتم:

من ئێستا پشووم داوە.. تۆیش برۆ بخەوە.

بە تەنیا خۆم لە لای مامۆستا مامەوە.

مامۆستا لەبەر ئەو "تا" قورسەی لێی هاتبوو، لە دەمەو بەیانەوە داوای پارچەیەك بەفری کردبوو.. کە بۆ بەفر گەڕاین دەستمان نەکەوت. کاتێ شەو داهات هەندێ لە هاوڕێیان بەفریان پەیدا کرد.

وتم:

مامۆستا گیان! پارچەیەك بەفریان پەیدا کردووە.

ئاماژەی کرد کە نایەوێت.

وتم:

مامۆستا گیان! ئایا چا دەم بکەم؟

ئاماژەی کرد کە نایەوێت.

لە سەعات دوو و نیوی شەودا لێوەکانی مامۆستا وردە وردە وشك دەبوونەوە، منیش بە دەستەسرێك تەڕم دەکردن. پاشان هەر کاتێك دەمویست دایپۆشم ئەو نەیدەهێشت. ئەمەش ماوەیەکی کەمی خایاند.

شتێکم دا بەسەر گڵۆپەکەدا بۆ ئەوەی ڕووناکی‌یەکەی کەم ببێتەوە و مامۆستا بێزار نەکات. ئنجا هەردوو قۆڵی مامۆستام ڕاکێشا، یەکسەر باوەشی پێدا کردم.. پاشان دەستەکانی لەسەر سنگی دانا و، خەوی لێ کەوت! منیش سۆپاکەم داگیرساند.

لەبەر ئەوەش کە پێم وابوو مامۆستا نوستووە، چاوەڕوان بووم بۆ پارشێو هەڵبسێت.

لە دڵی خۆمدا دەموت: دوایی برایانی تر دێن و، پێکەوە پارشێو دەکەین.

ئای چەندە ساویلکە بووم! نەمدەزانی کە مامۆستا ئێمەی بەجێ هێشتووە و، کۆچی بۆ جیهانی نەمری کردووە و، چاوەکانی لەم دنیا فانییە لێکناوە!

پێشتر ئەم چەشنە حاڵەتەم نەبینیبوو! ئیتر چۆن بزانم!

کاتی پارشێو زۆری بەسەردا تێپەڕی، برایان حوسنی و عەبدوڵڵا هاتن و، وتیان: "ئێمە زۆر نوستووین".

وتم: "دەڕۆم بۆ ژوورەکەی تەنیشتمان تاکو نوێژی بەیانی بخوێنم. جووڵەتان لێوە نەیەت، چونکە مامۆستا نوستووە".

ڕۆشتم بۆ ژوورەکەی تر، نوێژی بەیانیم کرد و، زیکر و ویردی ڕۆژانەم لەگەڵ جزمێکی قورئانی پیرۆزدا خوێند. هەر هێندەی چاوەکانم لێکنا تاکو بخەوم، برایان هاتن وتیان:

"برام! مامۆستا جووڵەی لێ براوە"!

وتم: "مامۆستا نوستووە خەبەری مەکەنەوە".

جارێکی تر هاتنەوە و، وتیان:

"مامۆستا هەر هیچ ناجووڵێتەوە"!

پێکەوە ڕۆشتین بۆ ژوورەکەی مامۆستا. زوبەیر لە لای سەریەوە دانیشت و، هەر چواریشمان بۆمان دەڕوانی. مامۆستا هیچ نیشانەیەکی جووڵەی لێ نەدەبینرا، بەڵام پلەی گەرمیی ئاسایی بوو! زۆر پەشۆکاین.

زوبەیر وتی: "ئەم جۆرە حاڵەتانە زۆر جار لای مامۆستا ڕوو دەدەن".

پەژارە دایگرتین. کاك زوبەیر وتی: پیاوێك هەیە ناوی "عومەر ئەفەندیی واعیز"ە، سەر لەم چەشنە مەسەلانە دەردەکات.

کاتێك ئەو پیاوە ناوبراوە هات و، حاڵی مامۆستای بینی، وتی:

﴿إِنَّا للهِ وَإِنَّـــا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾ (البقرة: ١٥٦)! برایانم! مامۆستا کۆچی دوایی کردووە!

چاوەکانم هەرگیز وەفاتی مامۆستایان نەدەسەلماند. چونکە ساڵی (١٩٤٩ز) کە لە بەندیخانەی ئافیوون بووین، مامۆستایان ژەهرانخوارد کرد و، زمانی سور هەڵگەڕا.

ئەو کاتە بەردەوام بۆ حاڵی مامۆستا دەگریاین. کاك ئەحمەد فەیزی - خوا لێی خۆش بێت - وتی:

"بۆچی وەکو منداڵ دەگرین؟ تەمەنی مامۆستا درێژە"!

لێرەشدا قسەکەی کاك "ئەحمەد فەیزی"م بیر هاتەوە. دڵی خۆمم دایەوە و، وتم: تۆ بڵێی تەمەنی مامۆستا درێژ بێت؟!

خێرا برایان ڕۆشتن تاکو هەواڵ بە پارێزگاکانی تری وڵات بدەن!

مامۆستامان بە پارچەیەك کەتانی نەرم داپۆشی..

دوای ماوەیەکی کەم خاوەنی ئوتێلەکە هات، کە سەیری مامۆستای کرد، زانیی کۆچی دوایی کردووە. ئیتر دەیکێشا بە ڕانی خۆیدا و هاواری دەکرد..

دوای ئەو، بەڕێوەبەری ئاسایش هات و، پرسیاری لە هۆی شڵەژانی خاوەن ئوتێل کرد.

وەڵامی دایەوە:

بەدیعوززەمان وەفاتی کرد!

وتی:

هەر بە ڕاستی وەفاتی کردووە؟!

وەڵامی دایەوە:

بەڵێ!

ئیتر هەموو پۆلیسەکان بەردەمی ئوتێلەکەیان بەجێ هێشت. ئنجا پزیشکی تایبەت هات تاکو لە وەفاتی مامۆستا دڵنیا ببێت، وتی:

"الله.. الله.. پلەی گەرمیی زۆر بەرزە.. ئایا ئاوێنەیەکتان لە لا هەیە"؟

ئاوێنەکەی لەسەر دەمی مامۆستا دانا و، دڵنیا بوو لە نەمانی هەناسەی بە تەواوی. پاشان وتی:

"بەڵێ وەفاتی کردووە! بەڵام حاڵەتەکەی لە هی وەفات ناچێت.. گومانم تیایدا هەیە.. بۆیە پێم باشە جارێ ئەسپەردە نەکرێت".

پاشان ڕاپۆرتی خۆی بۆ بەرپرسان نووسی.

دوای ئەو، "قازیی میرات" هات و، میراتی‌یەکانی مامۆستای نووسی، کە بریتی بوون لە:

"سەعاتێك و، بەرماڵێك و، مێزەرێکی سەر و، جوبەیەك". هەموو ئەوانەشی ڕادەستی عەبدوڵەجیدی برای مامۆستا کرد.

هەزاران کەسی خەڵکی ئوورفە لە بەردەم ئوتێلەکەدا کۆبوونەوە و، پارێزگاکانی تریان لەم هەواڵە دڵتەزێنە ئاگادار کردەوە.

دوای نوێژی نیوەڕۆ، تەرمی مامۆستا لە ئوتێلەکەوە برا بۆ "خانەقا" بە مەبەستی شۆردنی.

لەبەر زۆریی حەشاماتەکە دوای دوو سەعات یان زیاتر گەیشتینە ئەوێ، چونکە هەموو خەڵکی ئوورفە هاتبوون و دوکانەکانیان داخستبوو.

لەو کاتەدا کە تەرمەکەی مامۆستایان هەڵگرت، من و کاك حوسنی لە هۆشی خۆمان چووین.

کاك عەبدوڵڵا هاواری کرد بەسەرماندا:

بۆچی ئێوە مناڵن؟! خێرا کەن بێدار بنەوە.

کاتێ بۆ شۆردنی تەرمی مامۆستا گەیشتینە "خانەقا"، لەبەر زۆریی جەنجاڵی‌یەکە چوونە ژوورەوە ئەستەم بوو، بۆیە زۆر بە زەحمەت ڕۆشتینە ژوورەوە و، توانیمان تەرمی مامۆستا بشۆین. "مەلا حەمید ئەفەندی" کە لە زانایانی ناوداری ئوورفەیە، مامۆستای شۆرد[1].

لە شۆردنی تەرمی مامۆستادا، برایان زوبەیر و حوسنی و عەبدوڵڵا و خلووصی، یارمەتی‌یان داین.

---

(١) "مەلا حەمید ئەفەندی" ئەم یادگاری‌یە دەگێڕێتەوە:
لە مزگەوتی "قازی ئۆغلو" لە ئیعتیکافدا بووم. مامۆستام لە خەوندا بینی. پێی وتم: دەبێت ئامادەی تەرمەکەم بیت و بمشۆیت، چونکە دەمرم. پێم وت: مامۆستاکەم دروست نی‌یە کەسێك لە ئیعتیکافدا بێت بڕواتە دەرەوە. جا من چی بکەم؟ وتی: سەیری فلاَن لاپەڕەی "ملتقى الابحر" بکە دەبینیت کە دروستە. کە لە خەو هەڵسام هێشتا لە ژێر کاریگەریی خەونەکەمدا بووم، کتێبی ناوبراوم هێنا و سەیری ئەو لاپەڕەیەم کرد، بینیم بەو جۆرەیە کە مامۆستا وتی! بەم شێوەیە شەرەفی شۆردنی تەرمەکەی ئەوم دەست کەوت. (ش:٤٥١)

دوای تەواوبوونی شۆردنی، تەرمە خاوێنەکەیمان برد بۆ مزگەوتی "ئولو جامیع" تاکو خەتمەی قورئانی پیرۆز لەسەر ڕۆحی بخوێنین.

ئەو شەوە تەرمەکەی لە مزگەوت مایەوە.

هەموو خەڵکەکە تا بەیانی خەتمی قورئانیان خوێند و پاداشتەکەیان پێشکەش بە ڕۆحی مامۆستا کرد.

هەر هێندەی ڕۆژ بووەوە شاری ئوورفە یەکجار جەنجاڵ بووبوو، لەبەر ئەوەی خەڵك لە هەموو شوێنێکی تورکیاوە هاتبوون.

لەبەر جەنجاڵیی لە ڕادەبەدەر پێمان وابوو ئەمڕۆ لە تواناداە نەبێت بە خاك بسپێررێت. بەڵام والیی شار ناردی بە شوێنماندا و، بە جەختەوە تکای لێ کردین کە هەر ئەمڕۆ دوای نوێژی عەسر لە بری ڕۆژی هەینی تەرمی مامۆستا بنێژرێت. چونکە جەنجاڵی لەناو شارەکەدا گەیشتووەتە ڕادەیەك لە توانای شاردا نییە جێی ئەو هەمووەی تێدا ببێتەوە.

یەکسەر ڕاگەیەنرا کە دوای نوێژی عەسری ڕۆژی پێنج شەممە، نوێژی جەنازەی لەسەر دەکرێت.

خودی والی و سەرۆکی شارەوانی، ئامادە بوون و لە نوێژی جەنازەدا بەشداری‌یان کرد.

سەرمان لە دیاردەیەکی سەیر سوورِ مابوو، کە بریتی بوو لەوەی لە دەمی شۆردنی تەرمی مامۆستادا باران نم نم دەباری و، چەند باڵندەیەکی غەریبمان بە ژمارەیەکی زۆر دەبینی کە شکڵ و شێوەیان نامۆ و ڕەنگاوڕەنگ بوو.

بەم جۆرە، دوای نوێژی عەسری ڕۆژی پێنج شەممە، مامۆستا ئەسپەردەی خاك کرا.

زۆر کەسیش نەیانتوانی ئامادەی بەرێکردنی تەرمەکەی بن، مەگەر کەسێك کە بە ئوتومبێلی تایبەت هاتبێت. بۆ نموونە ئەوانەی ئەمیرداغ فریا نەکەوتن..

یەکێك لەوانە کاك "جەیلان" بوو کە خەفەتێکی قووڵی خوارد بۆ فریا نەکەوتنی تەرمەکەی و، وتی:

"ساڵانێکی زۆر خزمەتی مامۆستام کرد، کەچی ئەمڕۆ بە داخەوە ئامادەی وەفاتی نەبووم"!

❑ دوا یادگاری

عەبدولمەجیدی برای مامۆستا، دەڵێت:

پێنج مانگ دوای وەفاتی براکەم، بانگیان کردم بۆ دیوانی والی لە شاری "قۆنیە". لەوێ سێ جەنەڕاڵی سوپام لە لای بینیی[1].

یەکێکیان پێی وتم:

ئاشکرایە ئێمە لە بارودۆخێکی ناسکدا دەژیین. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەوانەی کە لە پارێزگاکانەوە سەردانی گۆڕی براکەتان دەکەن، لە زیادبووندان. ئێمە دەمانەوێت بە هاوکاریی ئێوە تەرمەکەی بۆ ناوەڕاستی ئەنادۆڵ بگوێزینەوە. بۆیە تکات لێ دەکەین ئەم داواکارییە ئیمزا بکەن!

ئەمەیان وت و، کاغەزێکیان دایە دەستم کە ئەو داواکارییەی بە ناوی منەوە تێدا نووسرابوو!

دوای خوێندنەوەی، پێم وتن:

"بەڵام من داوای ئەمەم نەکردووە.. تکاتان لێ دەکەم لێی گەڕێن با لانی کەم لە گۆڕەکەیدا بحەوێتەوە"!

کەچی ئەوان لەسەر هەڵوێستی خۆیان سوور بوون و، وتیان هیچ چارەیەکی ترت لە بەردەمدا نییە!

دوای ئیمزاکردنی داواکارییەکە، ڕۆشتین بۆ فڕۆکەخانە و، لەوێ فڕۆکەیەکی سەربازی بردینی بۆ "ئوورفە" و، سەعات سێی شەو ڕۆشتین بۆ لای گۆڕەکەی. دوو تابووت و چەند سەربازێك لە حەوشەی مزگەوتەکەدا ئامادە بوون.

(١) لە (٢٧/٥/١٩٦٠ز)دا کودەتایەکی سەربازی کۆتایی بە حوکمی "پارتی دیموکراتی" هێنا و، ئەندامانی حکوومەت بران بۆ ئەو دادگایەی کە ناوی "دادگای دەستوور"ی لێ نرابوو. ئەم دادگاییە بە جێبەجێ کردنی فەرمانی لە سێدارەدان بۆ "عەدنان مەندەرس"ی سەرۆك وەزیران و دوان لە وەزیرەکانی و، بە ماوەی زیندانیی جیاواز بۆ وەزیرەکانی تر و بەرپرسانی پێشووی حکومەتی پارتی دیموکراتی، کۆتایی بە کارەکانی هێنا. هەروەك بە ئاشکرا دوژمنایەتییان بۆ هەموو بزووتنەوە ئیسلامییەکانی ناو تورکیا دەربڕی، کە یەکێك لەوانە بزووتنەوەی قوتابیانی نوور بوو. وەك بڵێی ڕقی دوژمنانی ئیسلام لە مامۆستا نوورسی تەنانەت لە دوای وەفاتیشی کۆتایی پێ نەهاتبێت، بۆیە ویستیان لە گۆڕەکەیدا تۆڵەی لێ بکەنەوە. لەبەر ئەوە، تەرمەکەی ئەم زانا مەزنەیان بۆ جێیەکی نەزانراو گواستەوە!

پزیشکە سەربازی‌یەکە لێم نزیك بووەوە و، پێی وتم:

"نیگەران مەبە.. مامۆستا دەگوێزینەوە بۆ ئەنادۆڵ".

دوای ئەم قسەیەی پزیشکەکە، خۆم بۆ ڕانەگیرا و دامە پرمەی گریان.

پزیشکەکە فەرمانی دا بە سەربازەکان کە گۆڕەکە هەڵبدەنەوە، بەڵام ئەوان دوودڵ بوون لەو کارە، لە تووڕەیی خوا دەترسان!

پزیشکەکە وتی:

"ئەمە کارێکە پێمان سپێرراوە، چارەیەکی ترمان نی‌یە جگە لە جێبەجێ کردنی".

ئیتر سەربازەکان گۆڕەکەیان هەڵدایەوە و تابووتەکەیان لێ دەرهێنا.

کاتێ تابووتەکەیان هەڵپچڕی، لەبەر خۆمەوە وتم:

"دەبێ ئێسکەکانی برا خۆشەویستەکەم ئێستا بووبن بە تۆز".

بەڵام کە دەستم لە کفنەکەی دا، دەتوت دوێنێ وەفاتی کردووە! کفنەکەی وەکو خۆی مابوو، هێندە نەبێ کە لە لای سەریەوە کەمێك ڕەنگی زەرد بووبوو، هەروەك پەڵەیەکی لە شێوەی دڵۆپە ئاوێکدا پێوە بوو.

کاتێ پزیشکەکە دەموچاوی ئەوی دەرخست، شێوەی زەردەخەنەیەکم لەسەر ڕوخساری بینی!

باوەشمان بەو مامۆستا مەزنەدا کرد و، خستمانە ناو تابووتەکەی تر، ئنجا هەڵمان گرت بۆ فڕۆکەخانە.

شەقامەکانی شاری "ئوورفە" لە خەڵك چۆڵ کرابوون و، پڕبوون لە سەربازی چەکدار، چونکە لە شاردا قەدەغەی هاتوچۆ ڕاگەیەنرابوو!

لەناو فڕۆکەکەدا و لە تەنیشتی تابووتەکەوە بە دڵێکی پڕ لە پەژارەوە دانیشتبووم و، چاوەکانیشم پڕبوون لە فرمێسك.

فڕۆکەکە بەرەو "ئافیوون" ڕۆشت و، لەوێشەوە بە ئوتومبێلێکی ئامبولانس تابووتەکە برا بۆ ئیسپارتە و، لە شوێنێکدا نێژرا کە تا ئێستاش نەزانراوە!

ڕەحمەتی فراوانی خوای لێ بێت و، لە بەهەشتی بەریندا بیحەوێنێتەوە، ئامین[1].

---

(١) (ش: ٣/٤٣٧)

□ وەسیەتێك

(هەر لە مێژە مامۆستامان لەسەر ئەو ڕەفتارەی دەڕوات کە بریتییە لەوەی بە مەبەستی پاراستنی پلەی بەرزی زانست، هیچ کاتێ زەلیلیی لە بەردەم گەورەترین سەرۆکدا نەنواندووە و، بە بێ بەرامبەر دیاریی لە هیچ کەسێکیش وەرنەگرتووە.

ئێستاش لەبەر ئەو نەخۆشییەی کە لە ڕادەبەدەر لاوازی کردووە، دیاری لە کەس وەرناگرێت - کە زانایان پێیان وایە زیان لە وەرگرتنیدا نییە - بگرە لە ئێمەشی وەرناگرێت کە خزمەتی دەکەین، با زۆر بچووکیش بێت. چونکە بە چاوی خۆمان دەبینین کە هەرکات ئەو دیارییە بخوات پێشکەشی دەکەین، پێی نەخۆش دەکەوێت!

ئیتر دڵنیا بووین لەوەی کە ئیلهامی دڵی کراوە نابێ ئەو دەستوورەی درێژایی ژیانی بشکێنێت..

واتە نابێ "پەیامەکانی نوور" بکرێن بە ئامراز بۆ هیچ شتێك. ئەوەش لە پێناوی پارێزگاری کردن لە ئیخلاسی تەواوەتیدا.

ئێمە ئێستا لە وەرزە جەژنی پەیامەکانی نووردایین، کە بڵاوبوونەوەی ئەو پەیامانەیە لە هەموو لایەکدا. کەچی هێشتا دەبینین مامۆستا لە گفتوگۆ وەڕس دەبێت و، بە سەیرکردن و تەوقە لەگەڵ کردنیش تەنانەت لە لایەن تایبەتمەندترین قوتابی و برای خۆیەوە، قەڵس و بێزارە!

لەم ڕۆژە پیرۆزانەی جەژندا دەیوت:

"با گۆڕەکەم لە شوێنێکی تەواو پەنهاندا بێت و، جگە لە یەك دوو کەسی قوتابیانم کەسیتر شوێنەکەی نەزانێت. ئەمە وەسیەتمە بۆتان. چونکە ئەو ڕاستییەی کە لە دنیادا ڕێی گفتوگۆی لێ گرتم، بێ گومان دوای مردنیشم ڕێم لێ دەگرێت".

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە لە مامۆستامان پرسی:

ئەو کەسەی دێتە سەر گۆڕەکەت، فاتیحە دەخوێنێت و پاداشتی ئەو قورئان خوێندنەی دەست دەکەوێ.. ئیتر چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە ڕێ نەدەن بەوەی سەردانی گۆڕەکەت بکرێت؟

وەڵامی دایەوە:

ئەو "بێ ئاگایی"یەی کە لەم سەردەمەدا لە "خۆویستی" و "خۆشویستنی زات"ەوە سەری هەڵداوە، وا لە خەڵکی دەکات کە لە دەمی سەردانی گۆڕەکاندا بایەخ بە پلەوپایە و ناوبانگی دنیایی مردووەکە بدەن، وەك ئەوەی لە دێر زەماندا فیرعەونەکان دەچوون تەرمی مردووەکانیان بە مۆمیاکراوی هەڵدەگرت و، پەیکەریان بۆ دادەنان و، وێنەکانیان بڵاودەکردنەوە، تاکو سەرنجەکانیان بۆ ڕابکێشن.

لە ئەنجامی ئەمەشدا ئەو سەرنجانە ئاراستەی واتای ئیسمییەکە - واتە خودی کەسەکان - کران، نەك واتا حەرفییەکەی، کە لە غەیری خودی کەسەکەدایە..

بە هەمان جۆر.. ئەهلی دنیای ئەم کاتەشمان ڕووی بایەخیان ئاراستەی خودی کەسە مردووەکە و پلەوپایەی دنیای دەکەن لە دەمی سەردانی گۆڕەکەیدا، لە بریی ئەوەی - وەکو جاران - سەردانێکی شەرعیی ڕەوا و، بە نیازی ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی دواڕۆژ بێت.

لەبەر ئەوە..

وەسیەتتان بۆ دەکەم کە شوێنی گۆڕەکەم ئاشکرا نەکرێت، لەبەر پارێزگاریی نهێنیی ئیخلاسی تەواوەتی و، تاکو ئەو ئیخلاسەش زامدار نەکەم کە لە پەیامەکانی نووردا هەیە.

ئیتر کەسێ کە فاتیحە بخوێنێت لە هەر شوێنێکی خۆرهەڵات یان خۆرئاوا بێت و، هەرکەسێ بێت، پاداشتەکەی بەو ڕۆحە دەگات)[1].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٥٦٦-٥٦٧.

## (الداعي[1]

گڵکۆی ڕووخاوم حەفتا و نۆ تەرمی[2] سەعیدی گوناهبار و لەش بە ئازاری لە ئامێز گرتووە و، هەشتاهەمینیشیان بووە بە کێلی گۆڕەکەم.

هەر هەمووشیان، ئەسرین بۆ زایەبوونی ئیسلام هەڵدەڕێژن..

سەرجەم تەرمەکانی ناو ئەو گۆڕە پڕ لە مردووەم، لەگەڵ کێلەکەیدا، لە پڕمەی گریاندان. سبەینێش بە پەلە و خێرا ڕووە و گۆڕەپانی ئەودنیا هەنگاو دەنێم.

لەو دڵنیاییەشدام کە پاشەڕۆژی ئاسیا، بە زەوی و ئاسمانیەوە، تەسلیمی "دەستی سپی"ی ئیسلام دەبێت.

چونکە دەستی ڕاستی ئیسلام بەرەکەتی ئیمانی تێدایە و..

دڵنیایی و ئاسایش بە خەڵکی دەبەخشێت.)[3].

* * *

---

(١) ئەم پارچەیە ئیمزایەتی. (دانەر)

(٢) واتە لە یەك ساڵدا دوو "سەعید" دەمرن، چونکە لە ماوەی ساڵێکدا دوو جار لەش نوێ دەبێتەوە. سەرەڕای ئەوەش کە دەریدەخات سەعید ئەم ساڵ لە ساڵی حەفتا و نۆهەمینیدایە و تا ئەم بەرواره واتە ئەم ساڵە دەژی، چونکە هەموو ساڵێك سەعیدێك دەمرێت.(دانەر). (مستەفا صونگور دەڵێت: مامۆستا ئەم پەراوێزەی لە ساڵی ١٩٥١ز لێرەدا زیاد کردووە).

ئەوەش کە ئەم واتایە پتر ڕوون دەکاتەوە برگەیەکی دانەر خۆیەتی لە بەرهەمێکی دێرینیدا بەم دەقە کە تیایدا دەڵێت: (من ئێستا پوختەی هەشتا "سەعید"م کە بە ماوەی چل ساڵ بە چەندین قیامەتی یەك لە دوای یەك و زنجیرەیەکی لەبەرگرتنەوەدا تێپەڕیون و بەرهەم هاتوون. پێرستی ئەو حەفتا و نۆ "سەعید"ە مردووە، یەك زیندووی هەستیارە. خۆ ئەگەر ئاوی "زەمان" بیەستێت و ڕابووەستێت و ئەو سەعیدانەش بەرجەستە ببن و بۆ یەك بڕوانن، ئەوا لەبەر جیاوازییە زۆرەکان یەکتر ناناسنەوە. من بەسەر ئەو قۆناغانەدا تێل بوومەوە، لیتر جوانی و چێژ و چاکەکانیان پەرتەوازە بوون و، خراپە و ناشیرینی و ئازارەکانیانم بۆ مایەوە. جا هەروەك "من" ئێستا هەر ئەو "من"ەم لەو قۆناغانەدا، بە هەمان جۆر "من" هەر ئەم "من"ەم لەو مەنزڵانەشدا کە بە مردنم دێنە پێش. ئەوەندە هەیە کە لە هەموو ساڵێکدا دوو جار گەردیلەکانی ئەو مەنزڵە کۆچێکی گشتی دەکەن و، "من" پۆشاکەکەی خۆی نوێ دەکاتەوە و، "سەعید"ی نوێ دەپۆشێت و کۆنەکەی لەبەر دادەماڵێت). داوەرییەکان، ئاماژەکان، ل: ٨٢٥-٨٢٦.

(٣) بریسکەکان، بریسکەی سی و دووهەم، ل: ٧٥٤.

# بەشی چوارەم

# تایبەتمەندی یەکانی

# بەندی یەکەم

## چەند حاڵەتێکی تایبەت

١ - کرانەوە و داخران

(هەر لە منالێمەوە هەتا ئێستا حاڵەتەکانی تێگەیشتنم لە یەکتر جیاوازن. ئەوەتا کاتی وا هەیە وەکو ئەوەم کە لەسەر منارەیەك بم، کەچی لە کاتێکی تردا لە بنی بیردام.. گەلێ "ڕاستی" هەن کە خۆشەویستمن و دەمناسن، کەچی لە ماوەی چرکەیەکدا لێم دەبنە بیانی و ئینکاری‌یان لێ دەکەم. پاشان لە کاتێکی دیکەدا، بێ هیچ بانگهێشتێك، "ڕاستی"ی هێندە وردم دێنە دەست کە تەنانەت ناویشم نەبیستوون.. هەروەك هەندێ کات لە "باقل"[1] نەزانتر دەبم، کەچی لە سیاسەتدا خۆم بە وێنەی "سەحبان"[2] دەبینم)[3].

(بەڵێ، چارم نی‌یە؛ ئەم سنووحاتانە بەم چەشنە بۆ دڵم دێن. لە کاتێکدا دەبینم وەك بڵێی لەسەر منارەیەکی بەرزەوە دەدوێم، کەچی لە چەندین کاتی تردا لە بنکی بیرێکی قووڵەوە هاوار دەکەم)[4].

---

(١) باقل: ناوی کەسێکە لە ئەدەبی عەرەبیدا بە نموونەی بێ توانایی لە قسەکردندا دەیهێننەوە. (وەرگێڕ)

(٢) سەحبان: کوڕی زوفەری کوڕی ئیاسە. بە سەحبانی وائیل ناسراوە. گوتاربێژێکی زمانپاراو بووە، بە نموونەی قسەزانی و ڕەوانبێژی و حازروەڵامی دەیهێننەوە. لە پێش ئیسلام لەدایك بووە و هەتا ساڵی (٥٤کۆچی) ژیاوە. (وەرگێڕ)

(٣) داوەری‌یەکان، مونازەرات، ل: ٢٨٧-٢٨٨.

(٤) مەسنەویی نووری، خاڵێك لە نووری ناسینی خوای گەورە. هەروەها: ڕاستیی تەوحید یان تەوحیدی ڕاستەقینە، ل: ١٣٧.

٢ - وەرنەگرتنی دیاری

(هەر لە منالیمەوە پارە و پوول و دیاریی خەلکم بە هیچ جۆرێك لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە و، هەرچەندەش هەژار بووم و گەلێ پێویستم بە پارە بوو کەچی هەرگیز بە خۆمم ڕەوا نەبینیوە کە پێویستی‌یەکانم لە لای خەلك بدرکێنم. لە هەمان کاتدا زاهید و، سۆفی و، وەرزشکاری ڕۆحی و، خانەدان و خاوەن نەسەب و دارای ناوبانگیش نەبووم!

بەرامبەر بەمە، خۆم و ئەو برادەرانەش کە دەیاننناسیم سەریان سوور دەما و ئەم حالەتەمان بەلاوە سەیر بوو. پاش چەند سالێك لە حیکمەتی ئەمە تێگەیشتم. ئەوەبوو بۆم دەرکەوت کە ئەو حالەتە ڕۆحی‌یە ناوبراوەی خوای گەورە پێی بەخشیبووم، لەبەر ئەوە بووە سەر بۆ پارە و تەماع دانەنەوێنم و، پاشانیش هیچ ڕەخنەیەك ئاراستەی "پەیامەکانی نوور" نەکرێت لەو موجاهەدانەی کە ئەم پەیامانە خستوویانەتە ئەستۆیان. دەنا دوژمنە سامناکەکانم لەو ڕووەوە مشتەکۆلێکی جەرگبڕیان تێ دەسرەواندم)[1].

(برایانم! دەزانن من سەدەقە و یارمەتی وەرناگرم و، نایم بەهۆی ئەو چەشنە یارمەتی‌یانەش. لەبەر ئەوە، بەرگ و پۆشاکی تایبەتی و شمەکە پێویستەکانی خۆم دەفرۆشم، تاکو بە پارەکەیان ئەو کتێبانەم لە براکانم بکڕمەوە کە ئەوان نووسیویانەتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی نەیەڵم سوود و بەرژەوەندی‌یەکانی دنیا تێکەڵ بە "پەیامەکانی نوور" بن، تاکو زیان بەو پەیامانە نەگات و برایانی تریش پەند لەمە وەربگرن و، ئەوانیش پەیامەکان نەکەن بە "هۆکار" بۆ هیچ شتێك)[2].

(گرنگترین هۆکاری پێویست نەبوونم بە خەلك، ئەو وتەیەیە کە "ئیبن حەجەر"ی[3] باوەڕ پێ کراو - لە لای ڕێڕەوانی مەزهەبی ئیمەی شافیعی - وتوویەتی:

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ١/٣٦٢-٣٦٣.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ١/٤٥٦.

(٣) زانا و لێکۆڵەرێکی میسری‌یە و ناوی: ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی حەجەری هەیتەمی‌یە. لە نێوان سالەکانی (٩٠٩ - ٩٧٤ ك)دا ژیاوە. گەلێ بەرهەمی بەنرخی جێهێشتووە، وەك: "الفتاوى الهيتمية" و "تحفة المحتاج لشرح المنهاج" لە فیقهی شافیعیدا، هەروەها "شرح الأربعين النووية" و "شرح مشكاة المصابيح"ی تەبریزی و... هتد.. بڕوانە: "الأعلام للزركلي ١/٢٣١".

"گەر تۆ پیاوچاك نەبیت و شتێکت بە نیازی پیاوچاکی پێ ببەخشرێت، حەرامە وەری بگریت"[١].

بەڵێ، مرۆڤی ئەم چەرخە، لەبەر هەڵپە و تەماع، دیارییە هەرزانەکەی خۆی بە نرخێکی گران دەفرۆشێت! ئەوەتا کەسێکی گوناهباری کۆڵەواری وەك مـن بـە وەلییەکی پیاوچاك دادەنێت و ئنجا کولێرەیەکم بە دیاری دەداتێ!

جا ئەگەر من - خوا نەخواستە - لەو باوەڕەدا بم کە پیاوێکی چاکم، ئەوە نیشانەی لەخۆ باییبوونە و بەڵگەی ناچاکییە. خۆ گەر باوەڕیشم بەوە نەبێت کە پیاوچاکم، ئەوا وەرگرتنی ئەو ماڵە بۆ من دروست نییە.

هەروەها وەرگرتنی سەدەقە و دیاری بەرامبەر بەو کارانەی کە ڕوویان لە دوارۆژە، وەك ئەوە وایە کە مرۆڤ لەم دنیادا و بە چەشنێکی "فانی" چەند بەروبوومێکی "هەمیشەیی" ئەودنیا لێ بکاتەوە و بە فەنایان بدات)[٢]!

(گەلێ هۆکاری زۆر هەن کە ڕێی دیاری وەرگرتنم پێ نادەن، گرنگەکەیانتان بۆ باس دەکەم کە بریتییە لەوەی "وەرگرتنی دیاری" پەیوەندیی بێگەرد و گەرموگوڕی نێوان من و قوتابیانی نوور دەشێوێنێت.

سەرەڕای ئەوەی کە من، بەهۆی قەناعەت و بەرەکەت و لانەدانم لە دەست پێوەگرتن، تا ئەو ڕادەیە دەستکورت و موحتاج نیم کە وەری بگرم. بەڵکو هەر ناتوانم دەستەکانم بۆ ماڵی دنیا درێژ بکەم و، کارێکە لە توانا و ویستی خۆم بەدەرە.

وا لە نێوان هۆکارە زۆرەکانی ئەمەدا یەك هۆکاری ورد باس دەکەم:

---

(١) دەقی وتەکەی "ئیبن حەجەر" - کە مامۆستا نوورسی پوختەکەی هێنا - ئەمەی خوارەوەیە:
(هەر کەسێك گومانی سیفەتێکی وەك فەقیری و پیاوچاکی و نەسەبی پێ ببرێت و لەبەر یەکێك لەو سیفەتانە شتێکی پێ ببەخشرێت، بە چەشنێك کە بەڵگە و نیشانەی زۆر بۆ ئەوە لە ئارادا بن کە لەبەر ئەو سیفەتانە ئەو شتەی پێ بەخشراوە، یان بەخشەرەکە ڕاستەوخۆ بڵێت لەبەر ئەو سیفەتە شتەکەی پێ داوە، ئەو کەسەش لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەو سیفەتە بێت کە گومانی پێ دەبرا، ئەوا حەرامە وەری بگرێت. بە هەمان جۆر گەر سیفەتێکی نادیاری وای تێدا بێت کە ئەگەر بەخشەر پێی بزانێت، ئەو بەخشینەی نەداتێ... هتد..) بڕوانە: "تحفة المحتاج لشرح المنهاج" لابن حجر الهيتمي الشافعي ١٧٨/٧. (وەرگێڕ)
(٢) مەکتووبات، مەکتووبی دووهەم، ل: ٢١.

هاوڕێیەکی دڵسۆز کە بازرگان و کاسبکارە، ئەندازەیەك "چا"ی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنابووم کە بایی سی قورووش دەبوو، بەڵام من لێم وەرنەگرت.

وتی: مامۆستای بەڕێزم! نائومێدم مەکە و دەست بە ڕوومەوە مەنێ، چونکە لە ئەستەمبووڵەوە بۆم هێناویت!

منیش لێم وەرگرت، بەڵام بە دوو قات نرخەکەیم پێ دا!

وتی: مامۆستا! بۆچی ئەم جۆرە مامەڵەیە دەکەیت و چ حیکمەتێکی تێدایە؟

وتم: تاکو نرخی ئەو دەرسەی کە تۆ لە منی وەردەگریت و هێندەی ئەڵماس بەنرخ و بەهادارە دانەبەزێنمە ئاستی وردە شووشە بێ نرخەکان. واتە من لەبەر سوودی تۆ واز لە سوودی تایبەتیی خۆم دەهێنم!

بەڵێ، ئەو دەرسی "ڕاستی"یەی کە لە مامۆستایەك وەری بگریت بۆ بەدەستهێنانی خاشاکی دنیا دانەبەزێت و، پێی بۆ تەماع و زەلیلی نەترازێت و، لە بەرامبەر خزمەتگوزارییەکانی لە پێناوی حەق و ڕاستیدا داوای هیچ شتێك نەکات و، ناچاری مەرایی کەس نەبێت، بێ گومان ئەو دەرسە، بە وێنەی "ئەڵماس" بەهادار و بەنرخ دەبێت.

بەڵام ئەو دەرسەی کە لە مامۆستایەك وەرگیرابێت ناچاری وەرگرتنی خێر و صەدەقە و مەرایی بوویێت بۆ دەوڵەمەندان و، عیززەتی زانستیی خۆی لە پێناوی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیدا دانابێت و، لە بەردەم ئەوانەدا ڕیا و مەرایی بنوێنێت کە خێری پێ دەبەخشن و، بەم کارەشی بواری بە خۆی دابێت بەروبوومەکانی ئەودنیای لەم دنیا وەربگرێت.. نرخی ئەو دەرسە، تا ئاستی وردە شووشە دادەبەزێتە خوارەوە)[1].

٣ - پرسیارنەکردنی لە هیچ کەسێك

ئەوەش لەبەر ئەو بەڵێنەی کە لە خەونەکەیدا دای بە پێغەمبەر ﷺ. هاوکات لەگەڵ وەڵامدانەوەی ڕاست و دروستی بۆ هەر پرسیارێك ئاراستەی کرابێت. دەیوت: "من نکووڵیم لە زانستی زانایان نییە، کەواتە پێویست بەوە ناکات بۆ تاقیکردنەوەیان

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی بارلا، ل: ٧٤-٧٥.

پرسیاریان ئاراستە بکەم. بەڵام هەرکەسێك گومانی لە زانستەکەی منـدا هەیـە، دەتوانـێ هەر پرسیارێکی دەوێ بیکات، من وەڵامی دەدەمەوە"[1].

٤ - زوهد و وازهێنان لە دنیا

(سەعیدی کۆن لە نووسراوە کۆنەکانی و لە "إفادة المرام"ی "إشارات الإعجـاز"دا هەواڵی بە قوتابییەکانی دەدا و بە دووپات کردنەوەی یەك لە دوای یەك پێی دەوتن کە: بوومەلەرزەیەکی مـاددی و مەعنـەویی کۆمەڵایـەتیی یـەکجار گـەورە لـەناو گـرۆی مرۆڤـدا ڕوو دەدات، ئـەو کاتـەش خـەڵکی خۆزگـە بـە گۆشـەگیری و ژن نـەهێنانم دەخوازن)[2].

[ ئیتر خۆی بۆ خزمەتی ئیمان و قورئـان یـەکلایی کـرد، بـە تایبـەتی دوای ئـەوەی کـە بیستی پیلانێکـی چەپەڵ لـە دژی قورئـانی پیرۆز ساز دەکرێـت. تەنانـەت لـەو پێنـاوەدا ژنیشی نەهێنا و بە ڕەبەنی ژیانی بەسەربرد. خۆی بەم جۆرەی خوارەوە هۆی ئـەوە ڕوون دەکاتەوە :]

(یەکەم: لەو کاتەدا کە دەبێ بۆ بەرەنگاری کردنی هێرشی ئـەو ئیلحـادە سـامناکەی ماوەی چل ساڵە پـەلاماری ئیمـان دەدات، چـەندین فیداکـاری وا هـەبن هەرچییـەکیان هەیە بەختی بکەن، بڕیارم دا کە نەك تەنها بەختەوەریی دنیـام بـەڵکو گـەر پێویست بێـت بەختەوەریی دوارۆژیشم لە پێناوی حەقیقەتی قورئانی پیرۆزدا بەخت بکەم.

جا لەبەر ئەوەی بتوانم بە تەواوی و بە ئیخلاسی ڕاستەقینەوە بۆ خزمـەتی قورئـان لـێ بېڕێم، ناچار بووم واز لە ژن هێنانی کـاتیی دنیـا بـهێنم - کـە دەزانم سـوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبـەرە ﷺ - تەنانەت گـەر لەم دنیایەدا دە "حور العين"ی بەهەشتیشم بدەنـێ، هـەر خۆم بـە ناچـار دەزانم واز لـە هـەموویان بـهێنم، لـە پێنـاوی ئەو ڕاستییەدا. چونکـە ئەو ڕێکخـراوە سـامناکانەی مولحیدان چـەندین هێرشـی سـەروەڕ و توندوتیژ بۆ سـەر ئـەو ڕاستییە دەبەن و چەندەها پیلانی چەپەڵیشی لە دژ ساز دەکەن.

---

(١) Tarihce-i Hayat, ilk Hayati.

(٢) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/ ٥٥٠.

کەواتە ئەوپەڕی خۆبەخت کردن و فيداکاری بۆ بەربەستی ئەو هەوڵەی ئەوان پێويستە و، دەبێ هەموو کارێ کە بۆ بڵاوکردنەوەی ئايين دەکرێت خاوێن و بێگەرد و تەنها بۆ ڕەزامەنديی خوای گەورە بێت، بێ ئەوەی هۆيەك بێت بۆ هيچ شتێکی تر.

چەندەها زانای نەگبەت و کەسانی خواناس لە ئەنجامی خەمی ژيان و گوزەرانی خێزان و منالّيان، فەتوايان بۆ بيدعەت دەرکرد، تەنانەت لە شێوەی پشتگيريی بيدعەت خوازانيشدا دەرکەوتن!

لەبەر ئەمە و لە بەرامبەر ئەو هێرشە سامناك و سەختەی دەکرێتە سەر ئايين، دەبێ پێويست نەبوون بە خەڵکی و بەڵکو بە هەموو شتێك، ئەنجام بدرێت. بە تايبەت دوای ماوە نەدان و نەهێشتنی وتنەوەی وانەی "ئايين" لە قوتابخانەکاندا و، گۆڕينی بانگی شەرعی.

لەبەر ئەوە، دەستم لە ژن هێنان هەڵگرت، کە دەزانم "سوننەت"ێکی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ ئەوەی تووشی "حەرام" نەبم و، بتوانم زۆر "واجب" و "فەرز"ی ئەستۆم جێبەجێ بکەم. چونکە ناکرێت لەبەر بەجێهێنانی "سوننەت"ێك مرۆڤ دووچاری چەندين کرداری "حەرام" ببێت.

زانای زۆر هەبوون کە لە ماوەی ئەم چل ساڵەدا ئەم سوننەتەيان بەجێ هێنا، بەڵام ناچاريش بوون تووشی "دە" گوناهی کەبيرە و حەرام ببن و، واز لە بەشێکی فەرز و سوننەتەکان بهێنن!

دووهەم: ئايەتی پيرۆزی: ﴿فانكِحُوا ما طابَ لكم...﴾ (النساء:٣) و، فەرموودەی پيرۆزی: "تناكحوا نكاثروا"[1]، هەروەها فەرمانەکانی تری هاوچەشنيان، فەرمانی "واجب بوون" و هەميشەيی نين، بەڵکو فەرمانی "سوننەت"ن. جگە لەوەش کە بەندن بە

(١) تناكحوا تناسلوا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة. رواه عبدالرزاق والبيهقي عن سعيد بن أبي هلال مرسلاً بلفظ: (تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة). قال في المقاصد: جاء معناه عن جماعة من الصحابة، فأخرج أبو داود والنسائي والبيهقي وغيرهم عن معقل بن يسار مرفوعاً: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، ولأحمد وسعيد بن منصور والطبراني في الأوسط والبيهقي وآخرين عن أنس قال كان رسول الله ﷺ يأمر بالباءة وينهى عن التبتل نهيا شديداً، ويقول: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، وصححه ابن حبان والحاكم.. الخ ( باختصار عن كشف الخفاء للعجلوني ١٠٢١) والسيوطي في الجامع الصغير (٣٣٦٦). (وەرگێڕ - لە چاپی عەرەبيی "اللمعات"ەوە).

چەند مەرجێکەوە دەبێ بێنەدی. لەوانەیە هەموو ئەو مەرجانە بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو کاتێکدا کۆنەبنەوە و نەیەنە دی.

پاشان فەرموودەی پیرۆزی: "لا رهبانیة في الاسلام"[1] ئەوە ناگەیەنێت کە ژن نەهێنان و گۆشەگیری - وەك ئەوەی ڕاهیبەکان - حەرامن و نابێت ببن. بەڵکو ئەم فەرموودەیە هاندانە بۆ خەڵکی تاکو لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشدار بن، وەك لە ناوەرۆکی ئەم فەرموودەیەدا هەیە کە دەفەرموێ:

"خير الناس أنفعهم للناس"[2]..

دەنا هەزاران کەس لە پیاوچاکانی پێشین، بە جۆرێکی کاتی، لە خەڵکی دوور کەوتوونەتەوە و، تا ماوەیەك حەزیان لە گۆشەگیری بووە و، دەستیان لە جوانیی دنیای فانی داشۆردووە و خۆیان لێ داماڵیوە، تاکو بتوانن بە تەواوی و ڕاستی ژیانی دوارۆژی خۆیان بنیات بنێن.

جا مادەم کەسانێکی زۆری پیاوچاکانی پێشین، لەبەر گەیشتن بە کەماڵێکی نەبڕاوە و "تایبەت بە خۆیان" وازیان لە دنیا و هەموو ڕازاوەیی و جوانی‌یەکی هێناوە..

ئەوا دەبێ ئەو کەسەی کە بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی و نەبڕاوەی چەندەها لێقەوماو" لێ دەبڕێت و، نایەڵێت بکەونە هەڵدێری گومڕاییەوە و، بۆ بەهێزکردنی ئیمانی ئەوان تێدەکۆشێت لە پێناوی خزمەت کردنی ڕاستەقینەی ئیمان و قورئاندا و، لە بەرامبەر هێرشە ناکامەکانی دەرەوە و شاڵاوە ئاشکراکانی ناوخۆدا خۆی ڕادەگرێت..

ئەو کەسەی ئەم کارە گشتی‌یە ئەنجام دەدات - نەك کاری تایبەتی بۆ خۆی - ڕەفتاری پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناکات، بەڵکو بە پێی حەقیقەتی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەنگاو دەنێت.

پاشان ئەوپەڕی ئاواتەخوازم کە بە ئەندازەی یەك گەردیلەم لەو فەرمایشتە ڕاستەی صیددیقی مەزن - خوا لێی ڕازی بێت - دەست بکەوێت کە دەفەرموێ:

---

(١) قال ابن حجر: لم أره بهذا اللفظ، لكن حديث سعد بن أبي وقاص عند البيهقي: "إن الله أبدَلَنا بالرهبانيةِ الحنيفيةَ السمحةَ". كشف الخفاء: ٣١٥٤

(٢) حديث حسن أخرجه القضاعي في مسند الشهاب وابن عساكر في تاريخ دمشق ٢/٤٢٠/٢ وانظر الصحيحة ٤٢٦ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم ٦٥٣٨.

"با جەستەم لە دۆزەخدا ئەوەندە گەورە ببێت کە ئیتر جێی هیچ ئیماندارێکی تری تێدا نەبێتەوە"!

لەبەر ئەوەیە کە ئەم سەعیدە لاوازە "ژن نەهێنان" و پێویست نەبوونی بە خەڵکی، لە درێژایی ژیانیدا، بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

سێیەم: ئێمە بە قوتابیانی نوورمان نەوتووە: "ژن مەهێنن و وازی لێ بهێنن بۆ خەڵك".. نابێ پێیشیان بوترێ..

بەڵام قوتابیان لەناو خۆیاندا چەند پلە و چینێکن، هی وایان هەیە دەبێ تا دەتوانێت، لە ماوەیەکی تەمەنیدا، خۆی بە پێداویستییەکانی دنیاوە نەبەستێت، تاکو بگات بە خۆبەخت کردن و دامەزراویی تەواوەتی و هەرە مەزن..

خۆ ئەگەر ئافرەتێکی وەهای لێ هەڵکەوت لە خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئاندا یارمەتیی بدات، ئەوە خێرێکە خوا داویەتی. چونکە ئەم چەشنە ژن هێنانە رێی کار و خزمەتگوزاریی قورئانی لێ ناگرێت.

سوپاس بۆ خوا، زۆر کەسی وا لەناو قوتابیانی نووردا هەن و، هاوسەرەکانیشیان لە خزمەتگوزاریی قورئان و ئیماندا هیچیان لەوان کەمتر نییە. تەنانەت کاتی وا هەیە بە بۆنەی ئەو شەفەقەتە بێ بەرامبەر و بێ پاداشتەی لە سروشتیاندا هەیە، پێش مێردەکانیشیان دەکەون و، بەم پاڵەوانێتییەی پێیان بەخشراوە و بە ئیخلاسێکی تەواو کارەکانیان ئەنجام دەدەن.

ئنجا زۆربەی قوتابییە پێشینەکانی نوور ژنیان هێناوە و، بە تەواوی و رێکوپێکی ئەم سوننەتەیان جێبەجێ کردووە. پەیامەکانی نووریش ڕوو دەکاتە ئەوانە و پێیان دەڵێت:

ماڵەکانتان بکەن بە قوتابخانەیەکی بچووکی نوور و جێی وەرگرتنی زانست و فێربوونی خواناسی. تاکو ئەو منداڵانەی کە بەرهەمی ئەنجامدانی ئەم سوننەتەن، لەسەر ئیمان پەروەردە بین و، لە قیامەتیشدا شەفاعەتتان بۆ بکەن و، لە دنیاشدا کوڕ و منداڵ و جگەرگۆشەی باشتان بن. ئەو کاتە بە تەواوی ئەم سوننەتە پیرۆزەتان تێدا جێبەجێ دەبێت.

دەنا ئەگەر منداڵەکان لەسەر پەروەردەی ئەوروپایی گەشە بکەن و پێبگەن - وەك لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردوودا ڕووی دا - ئەوا زۆربەی ئەو منداڵانە لە لایەکەوە سوودیان بۆ دنیاتان نابێت و، لەو لاشەوە لە قیامەتدا سکاڵاتان لە دەست دەکەن، چونکە لەوێ پێتان دەڵێن:

"بۆچی ئیمانتان نەپاراستین"؟

ئێوەش بەم وتەیەی ئەوان پەژارە و پەشیمانی داتان دەگرێت، کاتێ کە پەشیمانی دادی مرۆڤ نادات و سوودی نابێت. ئەمەش پشتگوێ خستنی ئەو حیکمەتەیە کە لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردایە ﷺ)[1].

**٥ - ڕیش نەهێشتنەوە**

(ڕیش هێشتنەوە سوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و، هەر تەنها تایبەت نی‌یە بە زانایانەوە.

منیش هەر لە سەرەتاوە ڕیشم نەهێشتووەتەوە و، لەناو ژینگە و کۆمەڵێکدا گەورە بووم کە لە سەدا نەوەدیان ڕیش ناهێڵنەوە.

لە لایەکی تریشەوە دوژمنانمان هەمیشە هێرشمان دەکەنە سەر و، لە ڕاستیدا ڕیشی هەندێ لە خۆشەویستانی منیان تاشی..

ئیتر لەم چەشنە ڕووداوانەوە لە حیکمەتی ڕیش نەهێشتنەوەم تێگەیشتم و، زانیم کە سەبارەت بە من چاودێری‌یەکی پەروەردگارە. چونکە ئەگەر من ڕیشم بهێشتایەتەوە و پاشان ئەوان بیانتاشیبایە، ئەوا "پەیامەکانی نوور" زیانێکی گەورەیان پێ دەگەیشت، چونکە ئەم ڕەفتارەم پێ قبووڵ نەدەکرا و دەمردم!

هەندێك لە زانایان وتوویانە:

دروست نی‌یە ڕیش بتاشرێت.

مەبەستیان لە تاشینی ڕیشە لە دوای هێشتنەوەی. چونکە تاشینی دوای هێشتنەوەی حەرامە. بەڵام گەر کەسێك هەر لە سەرەتاوە نەیهێشتبێتەوە، ئەوا سوننەتێکی جێبەجێ نەکردووە.

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/٥٤٧-٥٧٨.

ئێمە لەبەر خۆپاراستنمان لـە گەلـێ گونـاهی کـەبیرە، وا مـاوەی بیست سـاڵمان بـە ژیانێکی سەختی وەك بەندیخانەی تاکەکەسی بردە سەر. لە خوای گەورە داواکارین کـە بۆمان بکات بە کەفارەتی جێبەجێ نەکردنی ئەو سوننەتە پیرۆزە.

هەروەها ئەمەش بە ئاشکرا و ڕاشکاوی و بێ گومانی ڕادەگەیەنم کە:

پەیامـەکانی نـوور مولکـی قورئـانی پـیرۆزن، مـن جورئـەتم لـە کـوێ بـوو لافـی خاوەندارێتیان لـێ بدەم!

لەبەر ئەوە، هەرگیز هەڵە و ناتەواوییەکانم نابن بە هی ئەو پەیامانە، چونکە من جگـە لـە خزمـەتگوزارێکی گوناهبـاری ئـەو نـوورە و بانگـەوازکار و دەلاڵـی ئـەو گەوهــەر و ئەڵماسانە، هیچی تر نیم. کەواتە حاڵەتە پەشێواوەکانی من هەرگیز کار ناکەنە سەر ئـەو پەیامانە، تەنانەت هەر نزیکیشیان نابنەوە)[1].

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ١/٣٥٣-٣٥٤.

"شاهیدە یوکسەل" دەگێڕێتەوە کە:

لە دەمی دادگایی کردندا، دادوەر ئەم پرسیارانەی ئاراستەی مامۆستا کرد:

- چ کارێك دەکەیت؟

- ڕزگارکردنی ئیمان. چونکە ئیمانی برایانم ئاگری تێ بەربووە.

- بۆچی ڕیش ناهێڵیتەوە؟

- تاکو ئێوە نەیتاشن!

- بۆچی سوننەتی ژنهێنانت واز لـێ هێناوە؟

- ئەوانەی کە ئەم سوننەتەیان جێبەجێ کرد، وازیان لە فەرزەکان هێنا! (ش: ٣/٤١١)

"حیلمی ئاریجی" دەڵێ:

ڕۆژێکیان مامۆستا پێی وتم:

لەوانەیە ئەو پرسیارەت بە دڵدا بێت کە بۆچی ڕیشم نەهێشتووەتەوە؟ وا هۆکاری ئەوەت بـۆ ڕوون دەکەمـەوە تاکو گومانەکەتان نەمێنێت:

هۆی کارنـەکردنم بـەم سـوننەتە ئەوەیـە کـە زیـاتر لـە ملیۆنێـك قوتـابیم هەیـە. جـا ئەگـەر مـن ڕیـش بهێڵمـەوە، ئەوانیش بە پیر و لاویانەوە دەیهێڵنەوە، ئەو کاتەش ڕیشی لاوەکان دەبێتە مایەی گاڵتـە پێکردنـی هاوڕێکانیـان. لەبەر ئەوە، جێبەجێ کردنی ئەم سوننەتەم دواخستووە. (ش: ٢/٢٦٥)

## بەندی دووهەم

## لەگەڵ ئەوانەدا کە سەردانیان دەکرد

□ دەستووریك بۆ ئەوانەی کە سەردانیان دەکرد

(با هەموان بزانن کە ئەو کەسەی سەردانم دەکات:

یان لەبەر چەند کاروبارێکی تایبەت بە "ژیانی دنیا" دێـت.. ئـەوا بـا بزانێـت کـە ئـەو دەرگایە داخراوە!!

یان لە ڕووی ژیانی "ئەودنیا"وە دێت.. ئەو ڕووەش دوو دەرگای تێدایە:

یان پێی وایە من پیاوێکی پیرۆز و خاوەن پلەوپایەم لای خـوای گـەورە و، لەبـەر ئەمـە دێت بۆ لامان.. ئەوا ئەو دەرگایەش داخراوە! چونکە من لە نەفسی خۆم ڕازی نیم و ئەو کەسەشم ناوێت منی پێ باش بێت. هەردەم حەمد و سوپاسی زۆر و زەبەندە پێشکەش بـە خوای گەورە دەکەم کە وای لـێ نەکردووم لە خۆم ڕازی بم..

ڕووەکەی تر بریتی‌یە لەوەی کە تەنها لەبەر ئەوە دێت بـۆ لام و سـەردانم دەکـات کـە مـن خزمـەتگوزار و دەلاڵ و بانگـەوازکاری قورئـانی پـیرۆزم. جـا ئـەو کەسـەی لـەم دەرگایەوە دێت، بەخێربێت و لەسەر چاوم و سەرم دایدەنێم)[1].

□ گوفتاری مامۆستا بۆ میوانەکانی

ڕۆژێکیان مامۆستا قوتابی‌یەکی خۆی نارد بۆ ئەنقـەرە بـە مەبەسـتی جێبـەجێ کردنـی هەندێ کاروباری بانگەواز..

---

(١) مەکتووبات، مەکتووبی بیست وشەشەم، ل: ٥٧٥.

کاتێ ئەو قوتابی‌یە لەوێ باروذۆخی خەڵکی بینی، لەبەر خۆیەوە وتی:

"هەیهوو! ئەوانە چ کاتێك گوێ لە ڕاستی‌یەکانی نوور ڕادەگرن؟

ئایا چۆن ئەو پەردە ئەستوورەی بێ ئاگایی دەدڕێت؟

ئەوە کارێکی یەکجار دژوارە"!

ئیتر دووچاری نائومێدی بوو.

کاتێ هاتەوە، مامۆستا پێی وت:

ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها خزمەتکردنە..

بەڵام سەرکەوتن لەم کارەدا و تێگەیاندنی خەڵك، کارێکە تایبەتە بە خوای گەورەوە.

ئێمە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەی خۆمان خراوەتە ئەستۆ و، هەرگیز پێویست بە نائومێدی ناکات.

کەواتە گرنگی لە چەندایەتیدا نی‌یە، بەڵکو لە چۆنێتیدایە، زۆر جار قوتابی‌یەکی دڵسۆزی فیداکار لە هەزار کەسی تر کە بەو جۆرە نەبێت باشترە.

بەم جۆرە "نائومێدی"یەکەی ئەوی نەهێشت.

ڕۆژانی بەهار و هاوین، هەندێ جار زستانیش، مامۆستا بە پێ لە دەوروبەری "ئەمیرداغ" دەگەڕا و پیاسەی دەکرد، هەندێ جاری تریش گالیسکەیەکی بەکرێ دەگرت کە ئەسپ ڕایدەکێشا و کرێکەشی دەدا و، دەیوت:

"من ناچارم کرێکەی بدەم، چونکە تەنانەت یەك پاروو خواردنیش کە هی دیاری بێت و نرخەکەیم نەدابێت، نەخۆشم دەخات"!

کاتێ لەناو دارستان و شیوەکاندا دەگەڕا، جەندرمەکان بە بەردەوامی شوێنی دەکەوتن.

ئەویش لە چەند شوێنێکی جیاجیادا دادەنیشت بۆ پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی دەستنووسی پەیامەکان، یان بۆ تێڕامان و بیرکردنەوە لە بەدیهاتووانی خوای گەورە.

ئەم حاڵە هەتا ساڵی (١٩٤٧ز) درێژەی کێشا.

مامۆستا لەو ماوەیەدا گەلێ بایەخی بە کاروباری نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی پەیامەکان دەدا، بە دەستنووس یان بە ئامێری ڕۆنیۆ کاتێ قوتابییەکانی پەیدایان کرد. دەیوت:

"پەیامەکانی نوور موعجیزەیەکی قورئانیی ئەوتۆن کە ئەم سەردەمە و سەردەمەکانی دوای ئەمەش ڕووناك دەکەنەوە".

هەروەها خزمەتکردنی "نوور"ی بە مەزنترین ئەرك و خزمەتەکان دادەنا لەم زەمانەدا، بەو ڕادەیەی کە کارکردن لەو پێناوەدا بووبووە خۆراکی ڕۆحی، چونکە چەندین سەعاتی درێژخایەنی لە ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەی پەیامەکاندا بەسەردەبرد و، نەیدەزانی ماندووبوون چییە، تەنانەت لە کاتی نەخۆشییە سەختەکەشیدا لەو کارەی دانەبڕا.

مامۆستا لە هاودەمی و دڵنەوایی تێکەڵ بوونی خەڵك بێ بەش بوو..

بەڵام لە ناوەندی ئەم بێ بەشییەدا سەرچاوەیەکی وشك نەبووی سامانێکی مەزنی دەست کەوت. ئەوەبوو خوای گەورە بە چاکە و میهرەبانیی خۆی "پەیامەکانی نوور"ی پێ بەخشی، کە هەموو سامان و خۆشی و شادمانی و کامەرانییەکی مامۆستا بووە و، هەموو دڵنەواییەکی لەو پەیامانەوە هەڵقوڵاون و، سەرجەمی ئەو توانا و بەهرانەش کە خوای گەورە پێی بەخشیوە بۆ ئەو پەیامانە بەکاری هێناوە.

مامۆستا پێی وایە کە ئەرکی فیتریی سەرشانی و نهێنیی بەدیهاتنی خۆی لەوەدایە کە خەڵکی لە پەیامەکانی نوور تێبگەیەنێت و بڵاویان بکاتەوە لەناویاندا.

بێ گومان لە دەمی گەڕانەکانیدا چەندین خەڵکی جۆراوجۆری دەبینی و، بە نەرمونیانی لەگەڵ هەموویاندا دەدوا.

بە بینینی ئەوانەی لە نزیکەوە ناسیویانە و شارەزای ژیانی بوون، ئەوە سەلماوە کە مامۆستا، تەنانەت لە قۆناغی پێگەیشتن و لاویشدا، لە لوتکەی داوێن پاکی و ڕاستڕەویدا بووە.

گەلێ جار دوعای بۆ منداڵە بێ گوناهەکان و ئافرەتان دەکرد کە قارەمانی سۆز و شەفەقەتن و، ئەوەی یاد دەخستنەوە کە:

ئافرەتـان لـە بـەردەم خـوای گـەورەدا بەرپرسـی پـەروەردەکردن و پێگـەیاندنی منالەکانیانن لەسەر ئیسلام و، بەو کارەیـان بەشێکیان لـە چاکـەی منالـەکانیان دەست دەکەوێت. تکای ئەوەشی لێ دەکردن کـە دوعـای بۆ بکـەن و، بـە خوشکی دوارۆژی خۆی دایدەنان و، بە کورتی لەگەڵیان دەدوا.

ئافرەتانیش بەهۆی دڵـە بێگـەردەکانی خۆیانـەوە هەستیان دەکـرد کـە تـا چ ڕادەیـەك مامۆستا نموونەیەکی بڵندی حەق و ڕاستییە.

سەبارەت بە گفتوگۆیشی لەگەڵ منالاَندا، ئەوا چەندین پەندی ورد و چێـژی قووڵـی لەخۆ دەگرت. چونکە بە وێنـەی بایـەخدانی بـە گـەورەکان بایـەخی بـەوانیش دەدا و لـە دڵەوە ڕووی تێدەکردن، ئـەوانیش تەنانـەت لـە گوندەکـانی دەوروبـەرەوە ڕایـان دەکـرد بەرەو ڕووی!

مامۆستا پێی دەوتن:

ڕۆڵەکانم!

ئێوە بەری و بێ گوناهن.. منیـش نەخۆشـم.. تکایـە دوعـام بـۆ بکـەن، بـە پشتیوانیی خوای گەورە دوعاکانتان قبووڵ دەبێت. منیش لە لایەنی خۆمەوە بەشـدارتان دەکـەم لـە دوعاکانمدا و، بە منالی مەعنەویی خۆم و قوتابیی نوورتان دادەنێم.

لە لایەنی خۆیەوە هۆی بایـەخدانی بـەو منالاَنـە دەگێڕایـەوە بـۆ ئـەوەی کـە ئـەوان لـە داهاتوودا دەبنە قوتابیی نوور و، دەیوت:

"هاتنیان بەرەو ڕووم و بایەخدانیان پێم، هی ئەوەیە کە ڕۆحە بێگەردەکانیان هەستی بەوە کردووە "پەیامەکانی نوور" بۆ یارمەتیدان و فریاگوزاریی ئەوان هـاتووە. جـا لەبـەر ئەوەی من ڕاگەیەنەری ئەو ڕووناکییانەم، ئەوا بە بێ ویستی خۆیان ئـەو خۆشەویستییە گەرموگوڕەم بۆ دەردەبڕن".

ئەو لاوانەش کە جاربەجارێ دەڕۆشتنە سەردانی، هەمیشە وەسیەتی بـۆ دەکـردن کـە "پەیامـەکانی نـوور" بخوێننـەوە و، وریـایی لەمـەڕ تیـاچوونی ڕەوشـتەکان دەدانـێ لـەم سەردەمەدا و، پێویستیی بەجێهێنانی نوێژەکانی وەبیردەهێنانەوە. بە فەزڵی خوای گـەورە زۆرێك لەوانە بێدار بوونەوە.

مامۆستا بە پێی ئاستە جیاوازەکان لەگەڵ گوێ بیستانی دەدوا، چ لە خەڵکی عەوام و چ لە زانایانی تایبەتمەند.

هەندێ جار خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر، یاخود شوانەکان دەهاتن بۆ سەردانی. مامۆستا بە هەمان ئاست و زمانی خۆیان و، بەوپەڕی خاکی بوون و خۆنەویستی‌یەوە قسەی بۆ دەکردن. ئەوانیش زۆر دڵخۆش و سوپاسگوزار دەبوون..

کەچی ئەگەر لەگەڵ پرۆفیسۆردا قسەی بکردایە، ئەوا لەبارەی گەردوونناسی، یان ڕووبەری زەوی و تیرەکەی دەدوا و، دەرەنجامەکانی بە ژمارە و ڕەنووس دەردەهێنا، یاخود حسابی جووڵەی زەویی بە خولەك وچرکە بۆ دەکرد و، ژمارەی دڵۆپەکانی باران بارینی بۆ سەر زەوی لە ماوەی خولەکێکدا بۆ لێك دەدایەوە.. هتد..

ئیتر ئەو کەسانە دووچاری سەرسامی و سەرسووڕمان دەبوون لە زانیاریی زۆری مامۆستا سەبارەت بەم چەشنە مەسەلە و باسانە[1].

لە دەمی گەڕانەکانیدا کاتێ لەگەڵ فەرمانبەر و کرێکارەکان دەدوا، چەند وانەیەکی پێ دەوتن کە لەگەڵ کارەکانیاندا بگونجێت و، بە زۆری بایەخی نوێژی بۆ دەردەخستن و، پێی دەوتن:

گەر نوێژەکانتان بکەن، ئەوا کارەکانی دنیاشتان بۆ دەبێتە چەند کردارێکی ئەوتۆ کە پاداشتی لەسەر وەردەگرن.

ئاشکرایە کە مەودای ئەو شەوق و سووربوونە لەسەر "کار کردن" چەندەیە گەر مرۆڤ بیر بکاتەوە لەوەی کە پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، بە هۆی بەجێهێنانی نوێژەکەی!

لە ڕاستیدا ئەم وەسیەتەی مامۆستا ڕابەرێك بووە بۆ هەموو کارمەندان و کرێکاران و بازرگانان و پیشەوەران.

وا چەند نموونەیەك لەوانە باس دەکەین:

لە "ئەسکی شەهر" لە ئوتێلی "یەڵدز" لەگەڵ مامۆستادا بووین. مامۆستا بە کرێکارەکانی کارگەی شەکر و سەرۆکەکانی ئەوانی وت، کە هاتبوون بۆ سەردانی:

---

(١) (ش: ١٠٣/٣).

ئەگەر فەرزەکان جێبەجێ بکەن، هەموو کارەکانتان بۆ دەبێتە عیبادەت، چونکە ئێوە خزمەتێکی گرنگ پێشکەش بە نەتەوە دەکەن کە دەستەبەرکردنی خواستێکی پێویستی خەڵکە.

جارێکیان لەسەر لێواری دەریاچەی ئەگریدیر "ڕابەری لاوان"مان دەخوێندەوە، لەو کاتەدا کرێکارێکی هێڵی شەمەندەفەر هات بۆ لامان. مامۆستا پێی وت:

ئەگەر فەرزەکان جێبەجێ بکەیت و خۆت لە گوناهە گەورەکان بپارێزیت، هەموو کارەکانت بۆ دەبێت بە عیبادەت. چونکە کارکردن لە سکەی شەمەندەفەردا کە ماوەی دە سەعات کورت دەکاتەوە بۆ یەك سەعات، خزمەتێکی هێندە گەورەیە بە مرۆڤایەتی کە هەرگیز لای خوای گەورە بە خۆڕایی ناڕوات و، لەودنیادا پاداشتەکەی بە بەختەوەریی هەمیشەیی دەداتەوە.

ڕۆژێکیان لە "ئەسکی شەهر" چەند کەسێك لە ئەفسەران و فڕۆکەوانەکان و سەربازەکان هاتن بۆ سەردانی. هەمان قسەی پێشووی بۆ کردن و، وتی:

ڕۆژێك دێت کە ئەم فڕۆکانە لە خزمەتی ئیسلامدا دەبن. جا ئەگەر فەرزەکانتان بەجێ هێنا و، ئەو فەرزانەش کە لەبەر خواستی "سەربازی" بە ناچاری دەفەوتێ بیانگێڕنەوە، ئەوا یەك سەعاتی ئێوە لە جێی دە سەعات پەرستشدایە، بە تایبەت "فڕۆکەوان" کە پاداشتی سەعاتەکانی لە جێی پاداشتی سی سەعاتدایە. هێندە بەسە کە دڵی پڕ بێت لە دڵنیایی ئیمان و، مافی تەواو بە نوێژەکانی بدات، کە ئیمان پێویستی دەکات لەسەری.

لە "ئەمیرداغ" و "ئیسپارتە" و "بارلا" بە شوانەکانی دەوت:

چاودێریی ئەم ئاژەڵانە عیبادەتێکی گەورەیە، تەنانەت خوای گەورە چەندین پێغەمبەری لە شوانەکاندا ناردووە. بەڵام دەبێ فەرزەکانتان جێبەجێ بکەن، تاکو خزمەتەکەتان بە عیبادەت بۆ دابنرێت.

ڕۆژێکیان کرێکارەکانی کارەبا و سەرۆکەکانیان لە "ئەگریدیر" هاتن بۆ سەردانی، پێی وتن:

کارەبا سوودی گەلێ زۆری بۆ هەموو خەڵك هەیە. دەسا فەرزەکانتان جێبەجێ بکەن، با سوود لەو کارەتان ببینن، چونکە هەموو کۆششێکتان دەبێتە بازرگانییەکی قازانج بەخشی قیامەتییانە.

هەروەها سەدان نموونەی تری وەکو ئەمانە[1].

❑ ئاگاداری‌یەك بۆ ئەوانەی سەردانم دەکەن

(مامۆستامان دەڵێت:

"ئەمەی خوارەوە بۆ هەموو ئەو برا بەڕێزانە ڕوون دەکەمەوە کە حەزیان لە چاوپێکەوتن و سەرلێدانمە:

ئەگەر زۆر پێویست نەکات، توانای چاوپێکەوتنی کەسم نەماوە. چونکە ئەم ژەهر پێدانەی ئێستام و، لاوازیی جەستەشم، هاودەم لەگەڵ پیری و نەخۆشیدا، برستی ئەوەیان لێ بڕیوم کە قسەی زۆر بکەم..

بۆیە بە دڵنیاییەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە هەموو یەکێك لە کتێبەکانی پەیامەکانی نوور سەعیدێکە بۆ خۆی.. کەواتە هەر پەیامێك بخوێننەوە، دە هێندەی چاوپێکەوتنی من سوودی لێ وەردەگرن..

تەنانەت بە جۆرێکی ڕاستەقینە من لەو پەیامەدا دەبینن و دیدارم لەگەڵدا دەکەن..

هەر لەبەر ئەوە، بڕیارم داوە کە هەموو بەیانی‌یەك لە دەمی خوێندنی دوعا و ویردەکانمدا، دوعای خێر بۆ ئەوانەش بکەم کە لەبەر خوای گەورە پێیان خۆشە بێنە سەرلێدان و دیدەنم، لە بریی ئەوەی کە ناتوانن بمبینن. پشت بە خوا لەسەر ئەم بڕیارەشم هەر بەردەوام دەبم".

وا ماوەی دوو مانگە مامۆستامان ناتوانێت تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسەشدا بدوێت کە لە ئیش و کارەکانیدا یارمەتیی دەدات، چونکە هەر هێندەی دەکەوێتە قسە یەکسەر پلەی گەرمی‌یەکەی بەرز دەبێتەوە. خۆیشی لەسەر بناغەی "بێدارکردنەوەیەکی قەلبی" دەڵێت:

---

(١) Tarihce-i Hayat, Emirdag Hayati.

"حیکمەتی ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە پەیامەکانی نوور هیچ پێویستی‌یەك بە من ناهێڵنەوە، کەواتە پێویست بە قسە و گوفتار نەماوە.

سەرەڕای ئەوەی کە مەگەر لەگەڵ بیست سی دانە کەس لە خۆشەویستانم، دەنا لەگەڵ کەسدا نادوێم. لەوانەیە ڕێی قسەکردنم لەگەڵ ئەوانیشدا لێ بگیرێت، تاکو هەست و سۆزی هەزاران خۆشەویستی ترمان زامدار نەبێت.

دەسا با برایانم بمبوورن لە بوارنەدانم بە چاوپێکەوتنە تایبەتی‌یەکان")[1].

* * *

---

(١) پاشبەندەکان، پاشبەندی ئەمیرداغ ٢/ ٥٦٢-٥٦٣.
مامۆستامان دەیوت: "پەیامەکانی نوور وانەیەکی قورئانیی ئەوتۆیە کە لەگەڵ تێگەیشتنەکانی ئەم سەردەمەدا یەکدەگرێتەوە". ئەم تابلۆیەشی لە پشتی دەرگای دەرەوەی شوێنی مانەوەی هەڵواسیبوو لە ئیسپارتە و ئەمیرداغ، هەر کەسێك سەردانی دەکرد، پێی دەوت: بیخوێنەرەوە. (پەراوێزی مستەفا صونگور)

# بەشی پێنجەم[٧]

# بەدیعوززەمان و پەیامەکانی لەجیهاندا

تێبینی: ئەم بەشەی پێنجەم لە کتێبە عەرەبی‌یەکەدا نی‌یە. بەڵام بە پێویســتمان زانی کە لە لایەنی خۆمانەوە لەم وەرگێڕانە کوردی‌یەدا زیادی بکەین، لەبەر ئەو زانیاری‌یانەی کە تیایدا پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز کراون. (وەرگێڕ)

# بەندی یەکەم

## ناساندنی بەدیعوززەمان و پەیامەکانی نوور
## بە نەتەوەکانی جیهان

بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی هەر لە دوای وەفاتیەوە هەتا ئێستا، لە لایەن دۆستان و قوتابیانیەوە و، بە فراوانیی گۆی زەوی، بە نەتەوەکانی جیهان دەناسێنرێت و، وەك کەسایەتییەکی گەورەی جیهانی - لە چەندین بواری جیاجیادا - بووەتە مایەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و سوود لێ وەرگرتن لە زانکۆکانی جیهان و دامەزراوە زانستییەکانیدا. هەروەك ئاستە زانستی و فیکری و فەرهەنگی و ئایینییە پەیوەندیدارە بڵندەکانی بە خۆی و پەیامەکانیەوە سەرقاڵ کردووە.

وا لە خوارەوەدا، زۆر بە کورتی، هەندێ لەو بوارانە پێش چاو دەخەین:

□ یەکەم: کۆنگرە و دیدارە زانستی و ئەکادیمییەکان.

لە وڵاتی تورکیا - چ لە کوردستانەکەی و چ لە بەشەکانی دیکەیدا - ساڵ نییە بگوزەرێت کە تیایدا چەندین کۆنگرە و دیدار و سیمیناری تایبەت بە نوورسی و پەیامەکانی ساز نەکرێت، لە لایەن زانکۆکان یاخود دەستە و کۆمەڵە رۆشنبیرییەکانەوە، کە هەندێ جار توێژەران و پسپۆڕانیان لە دەرەوەی وڵاتەوە بۆ بانگهێشت دەکرێت.

جگە لەمانەش، لە سەرەتای ساڵەکانی نەوەدی سەدەی پێشوودا قوتابیانی نوورسی دامەزراوەیەکی زانستی و ڕۆشنبیرییان بە ناوی "ئیستانبوول عیلم وە کولتور وەقفی" تەرخان کرد بۆ سازدانی کۆنگرەی گەورەی جیهانی لە ئاستێکی زانستی و ئەکادیمیی بەرزدا، کە هەموو سێ ساڵ جارێك لە شاری ئەستەمبووڵ گرێ دەدرێت و، دەیان توێژینەوەی بەپێزی تێدا پێشکەش دەکرێت، بە هەر سێ زمانی تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی، لەوانەی کە لە لایەن لیژنەی پسپۆڕ و تایبەتەوە پەسەند دەکرێن و لە نێوان سەدان توێژینەوەدا هەڵدەبژێررێن.

هەر هەمان دامەزراوەی زانستیی ناوبراو لە دەرەوەی تورکیاشدا بە هاوئاهەنگی لەگەڵ چەندین زانکۆی ئەم وڵاتانەی کە لە خوارەوە ناویان دێت، کۆنگرەی زانستیی لە بواری ناساندنی بەدیعوززەمان و پەیامەکانیدا گرێ داوە:

(مەغریب، جەزائیر، توونس، میسر، سوودان، چاد، نەیجیر، یەمەن، ئێران، ئەردەن، سووریا، لوبنان، پاکستان، هیندستان، مالیزیا، ئەندۆنیسیا، سەنگافوورە، ئوستورالیا، فیلیپین، ئەڵمانیا، بەریتانیا، هۆڵەندا، بۆسنە، بیلا ڕووسیا، بولگاریا، ڕۆمانیا، ئیتاڵیا).

هەروەها لە گەلێ وڵاتی تری وەك ئەمریکا و وڵاتانی ئەورووپا - بە تایبەت لە زانکۆکاندا - سازدانی ئەو دیدار و کۆنگرە زانستییانە بەرێوە چووە و، هەر بەردەوامیشە.

❑ دووهەم: نووسین و توێژینەوە گشتییەکان.

وێڕای ئەم کۆنگرە و دیدارە زانستییانە، نووسینی کتێب و وتار و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی جۆراوجۆریش لەبارەی نوورسی و پەیامەکانیەوە، لە ڕووبەرێکی فراوانی گۆی زەویدا، سنووری "سەدان"ی تێپەڕاندووە و، بە "هەزاران" مەزەندە دەکرێت.

❑ سێهەم: نامەی ماستەر و دکتۆرا.

لە کۆلێجە پەیوەندیدارەکانی گەلێ زانکۆی جیهاندا نووسینی نامەی ماستەر و تەیزی دکتۆرا لەم ڕووەوە بە ڕادەیەك زۆر بووە کە قوتابیانی نوورسی بە پێویستیان

زانیوە دیدارێکی ساڵانە تایبەت بکەن بۆ ئەو توێژەرانە و مامۆستایانی سەرپەرشتیاریان، کە هەتا ساڵی (٢٠١٣ز) ئەم جۆرە کۆنگرە ساڵانەیەش پێنج جار گرێ دراوە.

لەم چەشنە دیدارانەدا، "توێژەران"ی ئەو بابەتانە، بە هزر و ئەزموون و بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی شارەزا دەکرێن و، ڕێنمایی پێویستیان پێشکەش دەکرێت.

ئەم جۆرە توێژینەوە زانستییانەی ماستەر و دکتۆرا خەریکە سنووری "دەیان" تێدەپەڕێنن و، چاوەڕوان دەکرێت لە ساڵانی داهاتوودا ژمارەیان بەرەو "سەدان" بڕوات. هێندە بەسە کە بزانین ساڵی (٢٠١٢ز) "سێ سەد کەس" لەو توێژەرانە تەنها لە زانکۆکانی وڵاتی هیندستاندا خەریکی ئامادەکردنی توێژینەوەکانیان بوون لەبارەی نوورسی و پەیامەکانیەوە!

❐ چوارەم: وەرگێڕانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانەکانی جیهان.

وەك ئاشکرایە بەشی هەرە زۆری بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی بە زمانی تورکییە، کە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی عوسمانی و دواتریش هەتا ئێستا هی دەوڵەتی نوێی تورکیایە. چەند بەرهەمێکیشی بە زمانی عەرەبی نووسیوە، کە ئەمانەش - هەر لە ژیانی خۆیدا - لە لایەن مامۆستا عەبدولمەجید نوورسیی برایەوە بە پوختی خراونەتە سەر زمانی تورکی و، لە دوای وەفاتیشی، لە لایەن مامۆستا عەبدولقادر بادللیی قوتابیی دڵسۆزی خۆیەوە بە وەرگێرانێکی تێروتەسەل کراون بە تورکی.

هەوڵی وەرگێڕانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانەکانی تر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ژیانی مامۆستا نوورسی و، لەو کاتەوە دەستی پێ کردوە. چونکە هەر بۆ خۆی لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا ئەو هەوڵەی داوە و ناردوونی بۆ دەرەوەی وڵات، بە تایبەتی بۆ بەشێکی جیهانی ئیسلامی..

ئەوەبوو ئەو دەمە ئەرکی وەرگێڕانی هەندێ لە پەیامەکانی بۆ زمانی عەرەبی بە مامۆستا "عەبدولمەجید"ی برای سپارد. دەرەنجامی کارەکەی ئەویش پوختە وەرگێڕانێك بوو بۆ بەشێك لە پەیامەکان. ئنجا مامۆستا نوورسی هەندێکی لەو وەرگێڕاوانە نارد بۆ دەرەوەی وڵات، وەك میسر و شام و عێراق و پاکستان و، هەردوو شاری پیرۆزی مەککە و مەدینە. تەنانەت هەندێکیشی لێ ناردن بۆ ڤاتیکان.

دوای وەفاتیشی، تەقالای قوتابی‌یە دڵسۆزەکانی سەبارەت بە وەرگێڕانی پەیامەکان بۆ زمانە جیاجیاکانی جیهان بەردەوام بوو، هەتا ئێستاش هەر بە گەرموگوڕی کاری تێدا دەکەن.

ئەو دوو زمانە سەرەکی‌یەی کە لە دوای زمانی تورکی‌یەوە دێن بۆ بڵاوبوونەوەی پەیامەکان، زمانی "عەرەبی" و "ئینگلیزی"ن. لەبەر ئەوە، زێدە ڕوونکردنەوەیەك لەسەر وەرگێڕانی پەیامەکان بۆ ئەو دوو زمانە پێش چاو دەخەین:

◆ وەرگێڕانی پەیامەکان بۆ زمانی عەرەبی:

لە دێڕەکانی پێشوودا ئاماژەمان بەوە دا کە وەرگێڕان بۆ زمانی "عەرەبی" لە ژیانی مامۆستا نوورسیدا دەستی پێ کردووە، تەنانەت خۆی یەکەم وەرگێڕە! چونکە هەر یەك لە کتێبی "موحاکەمات" و "مونازەرات"ی لە تورکی‌یەوە کردووە بە عەرەبی.

لە دوای خۆی، مامۆستا "عەبدولمەجید نوورسی"ی برای دێت، کە وەك باسمان کرد پوختەی هەندێ لەو پەیامانەی کە مامۆستا بەدیعوززەمان بۆی دیاری کردبوو، خستە سەر زمانی عەرەبی.

دوای ئەو "دکتۆر محەممەد سەعید ڕەمەزان بوّتانی" - خوا لێی خۆش بێت - هەندێ لە وەرگێڕانەکانی مامۆستا عەبدولمەجیدی بە شێوازە بەرز و ڕەوانەکەی خۆی دارشتەوە.

ئنجا هەریەك لە مامۆستایان "خەلیل ماردینی" و "عاصم حسەینی" هەندێکیان لە پەیامەکان بە وەرگێڕانێکی جوان خستە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام بە داخەوە لەسەری بەردەوام نەبوون. کە ئەوەش هانی خەمخۆرانی تری دا ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆ.

یەکێك لەو بەڕێزانە مامۆستای دڵسۆز "محەممەد زاهیدی مەلازگوردی" بوو، خوا لێی خۆش بێت. ئەم مامۆستایە هەموو پەیامەکانی نووری بە شێوە دارشتنی عەرەبیی مەلایەکی کورد و بە وردی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی! بەڵام بە داخەوە تا ئێستا چەند بەرگێکیان لێ چاپ کراوە و هێشتا چەندین بەرگی تر ماوە کە بڵاوبکرێنەوە، ئومێد دەکەین کە قوتابیان و دڵسۆزانی بە گەرموگوڕی هەوڵ بۆ چاپکردنی بەرگەکانی تر بدەن.

دواجار و هاوکات لەگەڵ وەرگێرانەکەی مامۆستا محەمەد زاهیددا و بە بێ ئاگادار بوون لە یەکتری، مامۆستای خەمخۆر و دڵسۆز "ئیحسان قاسم سالحی" ئەرکی وەرگێرانی سەرجەمی پەیامەکانی نووری بۆ زمانی عەرەبی گرتە ئەستۆ و، لە نۆ بەرگی گەورەدا، بە چەندین چاپی یەك لە دوای یەك، لە هەردوو شاری ئەستەمبوول و قاهیرە بڵاوی کردنەوە و خستنیە بەردەستی خوێنەران.

ئەم وەرگێرانەی مامۆستا "ئیحسان قاسم سالحی" لەو ڕووەوە کە بە زمانێکی عەرەبیی هاوچەرخ و ڕەوان و پاراو دارێژراوە و، چەندین ئەدیب و پسپۆری زمانی عەرەبی پێداچوونەوەیان بۆ کردووە و، لەبەر چەندین هۆکاری تر، لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا پێشوازیی لێ کرا و، سوودێکی زۆری لە مەودایەکی بەریندا لێ وەرگیرا و هەتا ئێستاش هەر سوودی لێ وەردەگیرێت. خوای گەورە لێی قبووڵ بکات و، پاداشتێکی بداتەوە کە شایانی کەرەمی خواوەند بێت.

◆ **وەرگێرانی پەیامەکان بۆ زمانی ئینگلیزی:**

لە دوای وەفاتی مامۆستا بەدیعوززەمان، قوتابیانی هەوڵیان دا هەندێ لە پەیامەکان وەربگێڕن بۆ زمانی ئینگلیزی، کە لەم سەردەمەدا بڵاوترینی زمانەکانی جیهانە.

لە سەرەتادا چەند پەیامێکی کەمیان خستە سەر زمانی ئینگلیزی و، ئەم ئەرکەشیان بە هەندێ کەسی شارەزای ئەو زمانە سپارد.

پاشان خوای گەورە ویستی وابوو کە خوشکێکی بەریتانی بە ناوی "ماری وێڵد" کە پێشتر لەسەر ڕێڕەوی کاسولیك بوو، لە ڕێی ئەو چەند پەیامەوە بە ئایینی ئیسلام و پەیامەکان ئاشنا ببێت و، پاشتر خوای گەورە هیدایەتی بدات و ئایینی ئیسلام بۆ خۆی هەڵبژێرێت و، ناوی خۆیشی بگۆڕێت بە "شوکران واحیده".

ئەم خوشکە ئینگلیزەی کە بۆ خۆی پسپۆڕە لە زمانی تورکیدا، دوای موسڵمان بوونی، لێ برا بۆ وەرگێڕانی "پەیامەکانی نوور" بۆ زمانی ئینگلیزی!

ئیتر خوای گەورە پشتیوانیی لێ کرد و، هەتا ئێستا ئەم بەرگانەی پەیامەکانی نووری وەرگێراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، کە چەندین جار چاپ کراونەتەوە: (وتەکان، مەکتووبات، بریسکەکان، تیشکەکان، ئاماژەکانی ئیعجاز). لەگەڵ چەندین

پەیامی بچووکدا. هەروەك بەرگێکی گەورەی لە ژیانی مامۆستا نوورسیدا بەو زمانە داناوە و، دواتر بۆ چەندین زمانی تر تەرجەمە کراوە.

ئێستا ئەم سێ زمانە: (تورکی‌یەکەی خودی مامۆستا نوورسی و، وەرگێرانە عەرەبی‌یەکەی مامۆستا ئیحسان قاسم سالحی و، وەرگێرانە ئینگلیزی‌یەکەی خوشکە شوکران واحیدە) بوونەتە بناغەی سەرجەم وەرگێرانەکانی تر بە زمانە جیاجیاکانی جیهان. واتە هەموو وەرگێرانەکانی دیکەی پەیامەکان، لە یەکێکی ئەم سێ سەرچاوەیەوە دەخرێنە سەر زمانەکانی تر.

◆ وەرگێرانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانەکانی تر

کاری وەرگێرانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانەکانی تر بە گەرمو گوڕی بەردەوامە. هەر ئەمەش هانی قوتابیانی نوورسیی دا کە کۆنگرەیەکی ساڵانە بۆ وەرگێڕەکان ساز بکەن، کە تیایدا بە ڕێ و ڕەسمی وەرگێران شارەزا دەکرێن و، ڕێنمایی پێویستیان دەخرێتە بەردەست و، وەرگێڕەکانیش بۆ خۆیان سوود لە ئەزموونی یەکتر وەردەگرن و، ڕا و بۆچوون و زانیاری‌یەکانیان لە نێوان خۆیاندا دەگۆڕنەوە.

ئەو زمانانەی تر کە لە سێ زمانە سەرەکی‌یەکەوە وەرگێرانیان بۆ دەکرێت، هەندێکیان هەنگاوی باشیان ناوە و لە تەواوبوونی کاری وەرگێران نزیك بوونەتەوە، هەندێکی دی لەو ئەندازەیە کەمتر و، هەندێکی دیکەش هێشتا لە سەرەتادایە.

لەم بڕگەیەی خوارەوەدا ناوی هەندێ لەو زمان و زارانە دەخەینە پێش چاوی خوێنەری بەڕێز کە کاری وەگێرانی "پەیامەکانی نوور"یان تێدا بەردەوامە، لەوانەی کە لە سنووری زانیاریی ئێمەدان:

(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتالی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تالشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەڕەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، کازاخی، کۆری، کوردی، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).

# بەندی دووهەم

## پەیامەکانی نوور بە زمانی کوردی

لەبەر ئەوەی ئەم کتێبەی بەردەستمان بە زمانی کوردییە، ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە لەم بەندی دووهەمەدا هەندێ بە تێر و تەسەلی باس لە وەرگێڕانی پەیامەکانی نوور بۆ زمانی کوردی دەکەین.

وەك ئاشکرایە زۆرینەی نووسینی زمانی کوردی بە دوو زاری سەرەکی بڵاودەکرێنەوە:

١ - کرمانجیی ژووروو (بادینانی، شکاکی).

٢ - کرمانجیی خواروو (سۆرانی).

### پەیامەکانی نوور بە زاری کرمانجیی ژووروو

سەبارەت بە کرمانجیی ژووروو، پێی بزانم مامۆستا "عەبدولقادر بادللی" کە قوتابییەکی مامۆستا نوورسییە، یەکەم کەس بێت کە پەیامێکی نووری وەرگێڕابێتە سەر ئەو زارەی زمانی کوردی و چاپی کردبێت، کە بریتییە لە "وتە بچووکەکان" و، بە ناوی "پەیڤێن بچووك" لە لایەن دەزگای پەخشی "دار الانوار"ەوە بە پیتی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.

لـە خودی مامۆستا عـەبدولقادر بـادللیم بیسـت کـە مامۆسـتا "محەممەد زاهیـدی مەلازگوردی" - خـوا لێی خۆش بێـت - جگـە لـە وەرگێڕانـە عەرەبی‌یەکەی، هـەموو پەیامـەکانی وەرگێڕاوەتـە سـەر زاری کرمـانجیی ژووروویـش، بـەڵام هێشـتا هـەر دەستنووسن.

برای بەڕێزمان مامۆستا ئیبراهیم خەلیل ئامەدی هـەردوو کتێبی "ئاساری بەدیعییە" (داوەری‌یەکان) و "مەسنەویی نووری"ی کـردووە بـە کرمـانجیی ژووروو، لـە لایـەن دەزگای پەخشی "زەهرا"وە بە پیتی لاتینی بڵاوکراوەتەوە.

دەزگای پەخشی ناوبراو چەند پەیامێکی تری نووری بە کوردی بڵاو کردووەتەوە، کە لە لایەن چەند وەرگێڕێکەوە کراون بە زاری کرمانجیی ژووروو.

برای بەڕێزمان مامۆستا مـەلا فـەیزی زوزنجی ئامـەدی "وتـە بچووکـەکان" و "وتـەی بیست و سێهەم" و "مەکتووبی بیستەم"ی بە زاری دیاربەکر داڕشتووەتەوە و، دەزگـای پەخشی "ر.ن.ك" لە دوو توێی کتێبێکدا بڵاوی کردووەتەوە.

لەم ساڵانەی دواییشدا دەزگای پەخشی "خزمەت وەقفی" چـەند پـەیامێکی دیکـەی بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاو کردەوە کە لە لایەن چەند وەرگـێڕێکی بـەڕێزی لاوەوە کرابوون بە کوردی.

ئەم هەوڵانەی کە لە سەرەوە باسمـان کـردن سـەبارەت بـە زاری کرمـانجیی ژووروو، هەموویان لە باکووری کوردستاندا ئەنجام دراون و، ڕاسـتەوخۆ لـە زمـانی تورکی‌یـەوە کراون بە کوردی.

لە باشووری کوردستانیش، برای بەڕێزمان مامۆستا "ئیدریس غازی" تا ئێستا چـەند پـەیامێکی لـە عەرەبی‌یـەوە وەرگێڕاوەتـە سـەر زمـانی کـوردی، زاری کرمـانجی ژووروو (بادینانی). ئومێدی سەرکەوتن و بەردەوامبوونی لە خوای گەورە بۆ دەخوازین.

هیواداریـن ئـەم خزمەتـە پـەرت و بـڵاوەی کـە بـۆ وەرگـێڕانی پەیامـەکان بـۆ زاری کرمانجیی ژووروو دراوە و دەدرێت، لە لایەن ئەو دڵسۆزانەوە پەیوەسـت بکرێـت و، بـە وێنەی دەسـتەیەکی زانستیی تەواوکـەری یـەکتر هەوڵـەکانیان یـەك بخەن و کارەکانیـان دابەش بکەن، بە پێی ڕێنمایی مامۆستا نوورسی بۆ ئەو چەشنە کارانە.

## پەیامەکانی نوور بە زاری کرمانجیی خواروو

❑ وەرگێڕان و کارەکانی پێش بلاوکردنەوە

خوای گەورە بە چاکە و میهرەبانیی خۆی پشتیوانیی لە وەرگێڕی ئەم کتێبە و نووسەری ئەم چەند دێڕە کرد و، لە سالی هەشتای سەدەی بیستەمەوە دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم پەیامانە لە زمانی عەرەبی‌یەوە بۆ زمانی کوردی (زاری کرمانجیی خواروو).

خۆ هەرچەندە کاری "وەرگێڕان"ەکەم بە تەنیا کەس ئەنجام داوە، بەلام بەرەکەتی "ئیمان" لە پەیامەکانی نووردا وەرگێڕانەکەی ئێمەی لە کاری تەنیا کەسەوە کردە کارێکی بەکۆمەل، چونکە دەستەیەك ئیمانداری دلسۆز و نیاز جوان و وریای نارد بە هانای لاوازی و کەم تواناییمەوە کە هەر یەکەیان لە ڕوویەوەکەوە هاتن بۆ یارمەتیم و بەشێکی ئەم ئەرکە قورسەیان لەگەلدا هەلگرتم.

جا ئەگەر ناوهێنانی سەرجەمی ئەو بەڕێزانەی کە دەستی خاوێنی یارمەتی‌یان بۆ ئەم پەیامە کوردی‌یانە درێژ کردووە لێرەدا مەیسەر نەبێت، کە لێم ڕوونە بەو ناوهێنانە ڕازی نین چونکە بە نیازی ڕەزامەندیی لای خوای گەورە ئەو خزمەتانەیان پێشکەش کردووە، ئەوا هەرگیز ناتوانم ڕۆلی گەورەی ئەم بەڕێزانە لێرەدا باس نەکەم:

برای بەڕێزم جەنابی مامۆستا (حسەین حەسەن کەریم) مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی هەموو بەرگەکانی سەرجەمی پەیامەکانی نووری لەگەل وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکاندا بەرامبەر کردووە و، گەلێ تێبینیی سوودبەخشی پێش چاو خستووە.

هەروەها بەڕێزان (کاك عەبدولکەریم عەبدوللا، دکتۆر دیدار کامەران، دکتۆر محەمەد خالید، ئەحمەدی کوڕم) کاری بەرامبەرکردنەوەی وەرگێڕانەکەی ئێمەیان لەگەل دەقە تورکی‌یەکاندا خستە ئەستۆی خۆیان و، هەردەم ئاگادارمان دەکەنەوە لە هەر تێبینی‌یەك کە پێویست بێت بۆ یەکاویەك دەرچوونی ئەم کوردی‌یانە لەگەل دەقە ئەسلی‌یەکاندا. ئەم هەولە وردەی ئەو بەڕێزانە وای لەم وەرگێڕانە کوردی‌یانە کردووە کە وەکو ئەوە وابن ڕاستەوخۆ لە زمانی تورکی‌یەوە کرابن بە کوردی.

چەند برایەکی بەڕێزیش لە ڕێکخستنی پیتەکانی پەیامەکاندا لەسەر کۆمپیوتەر بەشداری‌یان کردووە، وەك بەڕێزان کاك (هیوا حسەین، ئوسەید ئیحسان، ئەسکەندەری حاجی شێخ قادر، ئەحمەدی کوڕم، کاك سەعید خالید) و چەندین بەڕێزی تر. بەڵام ڕۆڵی سەرەکی و ماندووبوونی زۆر لەم ڕووەوە زیاتر بەر کاك "هۆشیاری مام تۆفیق" کەوت کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرت.

پاکنووسی وەرگێڕانی پەیامەکانیش، بەشی هەرە زۆری، کاك "شازاد سەعید" خستیە ئەستۆی خەتە جوانەکەی خۆی کە تەنانەت هەندێ جار نەك هەر پاکنووسەکان بەڵکو ڕەشنووسەکانیشی دەنووسی‌یەوە.. هەندێ جاری تر نەك هەر بە نووسینەوەی دەستی بەڵکو ڕاستەوخۆ وەرگێڕانەکەی لە زاری من وەردەگرت و لە کۆمپیوتەردا دەینووسی‌یەوە! جگە لەوەی کە لە کاری تایپکردندا پشکێکی زۆری بەرکەوت.

کاك شێخ خالید بەرزنجیش، وێڕای کاری بەراوردکردن، چەندین جاریش خۆی و کوڕەکانی (دکتۆر محەممەد و مامۆستا سەعید) بە وردی ئەم پەیامانەیان خوێندەوە و لە ڕاستکردنەوە و هەڵەگیری و پێشکەش کردنی تێبینی‌یە وردەکاندا جێدەستیان نمایانە. هەر لەم کاری هەڵەگیری و پێداچوونەوەیەشدا بەڕێزانی تری وەك کاك (حامید و جەمال و هۆشیار و شازاد و هێمن و شاخەوان و فەرمان و سەیوان) بە وردی بەشداری‌یان کردووە و سوودمان لە تێبینی‌یەکانیان وەرگرتووە.

لە پێش هەموو ئەو بەڕێزانەشەوە ناتوانم ڕۆڵی مامۆستای بەڕێزم "ئیحسان قاسم ساڵحی" فەرامۆش بکەم کە هەموو مافێکی شەرعی و یاسایی ئەم پەیامانەی پێ بەخشیم.

خۆ ئەگەر لە نزیکتریشەوە ئاوڕ لە جێدەستی خاوخێزانم بدەمەوە، ئەوا لە ڕووی ئەمەکەوە هەرگیز ناتوانم ڕۆڵی هاوسەری خۆشەویستم لەیاد بکەم کە چەندین ساڵی درێژخایەن گەلێ ئەرکی خێزانیی منی خستە ئەستۆی خۆی، تاکو بتوانم بۆ ئەم خزمەتە لێ ببڕێم و بەشێکی کاتەکانمی بۆ تەرخان بکەم.

جا من لێرەدا، بە شانازی‌یەوە، پێزانین و سوپاسگوزاریی خۆم پێشکەش بە هەموو یەکێکی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە ناوم هێنان و بەوانەش کە هەر ڕۆڵێکی ئیجابی‌یان لەم خزمەتەدا بینیوە. لە هەمان کاتدا دەستی نزا و لاڵانەوەش لە دەرگانەی خوای گەورە و میهرەباندا بەرز دەکەمەوە کە پاداشتی یەك بە یەکی هەموویان بە پلەی بەرزی بەهەشتی

بەرین بداتەوە. هەروەك ناوە جوانەکانیشی دەکەم بە تکاکار کە لێمان خۆش ببێت و، لەودنیادا بە ڕەزامەندیی خۆی بەهرەمەندمان بکات و، لەم دنیاشدا نیازی خاوێن و پاکیمان لە کردار و گوفتاردا - لەگەڵ خۆی و بەندەکانی - پێ ببەخشێت. هەروەها بە ڕوانینی فەزڵ و میهرەبانیی خۆیشی ئەم ڕەنجەمان لێ قبووڵ بفەرموێت. ئامین.

تکای برایانەشم لە خوێنەری بەڕێزی ئەم کتێبانە ئەوەیە کە لە پاشملە دوعای خێرمان بۆ پاشەکەوت بکات و، هەر تێبینییەکی سوودبەخشی هەیە، چ لە ڕووی وەرگێڕان و چ لە ڕووی دارشتن و هەر ڕوویەکی ترەوە بێت، بە دیاری بۆمان بنێرێت، تاکو لە چاپەکانی داهاتوودا سوودی لێ وەربگرین و، ئەویش لەم خێرەدا بەشدار بێت.

☐ بلاوکردنەوەی ئەم وەرگێڕاوە کوردییانە.

هەروەك خوای گەورە بەو جۆرە یارمەتیی داین بۆ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی بۆ زمانی کوردی، هەر بە هەمان جۆر یارمەتیشی داین کە تا ئێستا بەم جۆرەی خوارەوە بلاویان بکەینەوە:

## یەکەم: لە شێوەی کتێب و نامیلکەی سەربەخۆدا

١ - پەیامی بیماران.
٢ - پەیامی پیران.
٣ - وتە بچووکەکان.
٤ - سروشت هونەرە یان هونەرمەند؟!
٥ - مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژ.
٦ - پەیامی ڕەمەزان.
٧ - حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان.
(لە چاپی یەکەمی کتێبی ژمارە "٢١"یشدا بلاوکراوەتەوە)
٨ - پەیامی ئیخلاس و برایەتی.
٩ - زللەی میهرەبانی.
١٠ - چارەسەری وەسوەسە.
١١- مرۆڤ و ئیمان.
١٢ - بەری درەختی ئیمان.

١٣ – موعجیزاتی ئەحمەدی.
١٤ – ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا.
١٥ – پەنجەرەکان.
١٦ – پەیامی حەشر.
١٧ – (من) خودیی مرۆڤ و بزووتنی گەردیلەکان.
١٨ – ڕابەری لاوان.
١٩ – ڕابەری خوشکان.
٢٠ – ڕابەری خزمەتگوزارانی قورئان.
٢١ – ڕاستییەکانی ئیمان.
٢٢ – ڕاستیی تەوحید.
٢٣ – شوکرانەبژێری.
٢٤ – بینینەکانی گەشتیارێك.
٢٥ – میعراجی پێغەمبەر ﷺ.
٢٦ – موعجیزاتی قورئانی
٢٧ – لاوێتیی قورئان
٢٨ – سوننەتی پێغەمبەر ﷺ پلیکانە و ڕێبازە.
٢٩ – نوورەکانی حەقیقەت
٣٠ – موناجات
٣١ – کلیلێك بۆ جیهانی نوور

## دووهەم: لە شێوەی کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورەدا

١ – وتەکان.
٢ – مەکتووبات.
٣ – بریسکەکان.
٤ – تیشکەکان.
٥ – پاشبەندەکان.
٦ – داوەرییەکان
٧ – ئاماژەکانی ئیعجاز (بە پشتیوانیی خوا، کە ئامادە کرا بۆ چاپ، بڵاودەکرێتەوە).
٨ – مەسنەویی نووری (بە پشتیوانیی خوا، کە ئامادە کرا بۆ چاپ، بڵاودەکرێتەوە).
٩ – ژياننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی (ئەم کتێبەی بەردەستت).




نەخشەیەکی وڵاتی تورکیا

ئەو شوێنانەی لەسەر دەستنیشان کراوە کە لەم کتێبەدا ناویان هاتووە




نەخشەیەکی ئەو شوێنانەی باکووری کوردستان
کە لەم کتێبەدا ناویان هاتووە




نەخشەیەك شوێنی دیل بوونی بەدیعوززەمان و، رێی هەڵهاتن و گەڕانەوەی دەردەخات



وێنەیەکی بەدیعوززەمان کاتی گەڕانەوەی لە دیلی، لە لایەن ئەڵمانیەکانەوە گیراوە لە ساڵی ١٩١٨زدا



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی لەو کاتەدا کە سەرکردەی
تیپە خۆبەخشەکانی یاریدەدەران بووە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی و عەبدوڕەحمانی برازای
دوای گەڕانەوەی لە دیلی، لە ساڵی ١٩١٨زدا



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی دوای ژەهردەرخواردانی لە بەندیخانەی ئافیوون



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی (١٩٥٢ز) لە دادگا

لە دەمی بەرگریدا لە کێشەی "ڕابەری لاوان"



وێنەی مامۆستا بەدیعوززەمان لە ساڵی ۱۹٥۲زدا لە ئەستەمبووڵ



وێنەی ئەو خانووەی کە لە بارلا مامۆستا سەعیدی نوورسی تێدا نیشتەجێ کرا، درەختێکی گەورەی پەلکی لە بەردەمدایە



وێنەی ئەو درەختی قەترانەی سەر لوتکەی چیای "چام"
کە هەندێ جار مامۆستا سەعیدی نوورسی کاتەکانی تێڕامانی لە بەدیهاتووانی
خوای گەورە لەناو لقەکانیدا دەبردەسەر



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی لە ئەستەمبوڵ لە ڕۆژی ١٩٦٠/١/١ز

# پێڕستی بابەتەکان

بابەت | لاپەڕە

بەشی دووهەم

سەعیدی نوێ

## بەشی سێهەم

## دوا ساڵەکانی ژیانی

## بەشی چوارەم
## تایبەتمەندی‌یەکانی



## بەشی پێنجەم
## بەدیعوززەمان و پەیامەکانی لە جیهاندا

بسم الله الرحـمن الرحيم

يا الله ، يا رحـمن ، يارحيم ، يا فرد ، يا حي ، يا قيوم ، يا حكم ، يا عدل ، يا قدوس!

تو حەققی ئیسمی ئـەعزەم و حورمـەتی قورئـانی خـاوەن ئیعجازی بەیان و ڕێزی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ : هـەموو ئـەو کەسانەی کە ئەم کۆمەڵە پەیامـەیان بـە چـاپ گـەیاندووە و یارمەتیدەرە بەڕێزەکانیشیان و قوتابیـانی نـوور بـە بەهەشـتی فیردەوس و بەختەوەریی هەمیشـەیی شـاد بفـەرموو. ئـامین.. هەمیشە و بەردەوام لـە خزمەتی ئیمـان و قورئـاندا تـەوفیقیان بدە. ئامین.. لـە بەرامبـەر هـەر پیتێکـی ئـەم کتێبـەدا هـەزار کردەوەی چاك لـە لاپەڕەی کـردەوە چاکـەکانیاندا بنووسـە. ئـامین.. بـە فـەزڵ و میـهرەبانیی خـۆت دامـەزراوی و بـەردەوامییان لـە بڵاوکردنـەوەی پەیامـەکانی نـووردا پـێ ببەخشە. ئامین..

یا أرحم الراحـمین! سەرجەمی قوتابییانی پەیامەکانی نوور لە هەردوو دنیـادا بەختـەوەر بفـەرموو. ئـامین.. لـە شـەڕی شەیتانەکانی ئینس و جینني بیانپارێزە. ئامین..

لـە قسوور و گوناهەکانی ئـەم "سـەعید"ە دەستەوسـان و بێچارەیەش خۆش ببە. ئامین.

بە ناوی هەموو قوتابییانی نوورەوە:

سەعیدی نوورسی

# سيرة ذاتية

لمؤلف كليات رسائل النور الأستاذ بديع الزمان سعيد النورسي

بقلمه وقلم طلابه الأقربين

ترجـمها من العربية إلى الكردية: فاروق رسول يحيـى



# AUTOBIOGRAPHY
of
**Bediuzzaman Said Nursi**

By:
Bediuzzaman Said Nursi and his deciples
Translated from Arabic into Kurdish by:
Farooq Rasool Yahya



Risale-i Nur Külliyatı Müellifi
**Bediüzzaman Said Nursi:**
**TARİHÇE-İ HAYATI**
Kürtçeye Mütercimi:
Faruk Resul Yahya



# زندگی‌نامه

**نگارش دانشمند بزرگ: بديع الزمان سعيد نورسى**

**و شاگردان نزديكش در مورد زندگانى ايشان**

**مترجم به زبان كردى: فاروق رسول يحيـى**